ناوی کتێب: فەرهەنگی خاڵ
دانانی: شێخ محەمەدی خاڵ
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٥٦
پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد + نادیە عەزیز + نسار عەبدوڵڵا
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + هەندرێن شێرزاد + ئەمیر حاجی داود
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم + حاجی دلاوەر
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی دووەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٨٧)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ



ئەمن دەمــــرم بەڵام وێنەم دەمـــێنێ
هیـوام وایە کـە خـۆشـیی گـەل ببـینێ

**پێشکەشکردن**

پێشکەش بێ بە پێشگاهی گەلی کورد، بەهەموو هۆز و تیرە و خێڵ و ئێل و، بنەچە و ڕەگەز و نەتەوە و بەرەیەکیەوە و بە پیاو و ژن و کوڕ و کچ و گەورە و بچووک و خوێندەوار و نەخوێندەوار و مردوو و زیندوویەوە، نەخوازەڵا خوێندەوارانی ئیمڕۆ و لاوانی پاشەڕۆژ کە هیوای هەموو لایەکمانن، هیوادارم کە بەدڵێکی پاک و گیانێکی ڕووناک و هەستێکی چاکەوە ئەم فەرهەنگەم بە دیارییەکی نۆبەرە لێ وەربگرن.

**شێخ محەمەدی خاڵ**

# وتەیەک

خوالێخۆشبووی باوکم وەک ڕۆشنبیرێکی دڵسۆز بەنەتەوەکەی لە زۆر زووەوە هەستی کردووە بەگرینگیی دانانی فەرهەنگێک کە زۆربەی وشەی کوردی بەهەموو لەهجەکانی کوردستانی گەورە بگرێتە خۆی بۆ پاراستنی زمانەکەمان لە فەوتان. بەتایبەتی لەو سەردەمەدا کە میللەتی کورد فەرهەنگێکی ئەوتۆی نەبوو کە ئەم کەلێنە گرینگە پڕ بکاتەوە. شێخی خاڵ لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی ڕابردوودا (١٩٣٥) چووە ژێر ئەم بارە قورسە گرینگە پڕ سەروەرییەوە. بێ ئەوەی کەرەستەیەکی ئەوتۆی لەبەردەمدا بێ کە یارمەتیی بدا و ئەرکی سەرشانی تۆزێک سووک بکات. بەڵام هیمەتی پۆڵایین و شەوقێکی بێ سنوور و خۆشەویستییەکی زۆر بۆ گەل و نیشتمانیی پاڵی پێوەنا کە ئەم ئەرکە گەورەیە بخاتە ئەستۆی خۆی. لە ماوەی ٤١ ساڵی بەردەوامدا، واتە لە ساڵی ١٩٧٦دا توانی ئەم پرۆژە گەورەیە تەواو بکات بەشێوەیەک کە ڕەزامەندیی نەتەوەی کوردی لەسەر بێ و، لەلایەن پسپۆڕانی زمانی کوردییەوە بەکورد و بێگانەکان دەستخۆشکەریی لێ کرا و، بەفەرهەنگێکی نۆبەرە لە قەڵەم درا و، بە سێ بەرگ کەوتە بازاڕەوە.

زۆرجار باوکم لە مەجلیسەکانیدا دەیفەرموو خۆزگە بمتوانیایە ئەم سێ بەرگەم بکردایە بەیەک بەرگ و، وەک (المنجد)ی عەرەبی بەوێنەوە لە چاپم بدایە. بەڵام ڕووی نەبوونی ڕەش بێت. شێخ محەمەدی خاڵ، بەداخەوە، تا ئەم جیهانەی بەجێ هێشت لە ساڵی ١٩٨٩دا نەیتوانی ئەم ئاواتەی بەجێ بێنێ.

ئێستاش وا بەهیمەت و کۆششی دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس، ئەم ئاواتەی باوکم و هەموو خوێنەرانی کورد هاتەدی. سوپاس و پێزانینم بۆ دەزگای ناوبراو، بە بەڕێوەبەر و هەموو کارمەندانی کە بەشێوەیەکی ڕەنگین ئەم ئەرکە گەورەیەیان ئەنجام دا. لە یەزدانی گەورەم داوایە کە دەزگای ناوبراو هەر لە گەشە و پێشکەوتندا بێ لە خزمەتی وێژە و هەموو بوارە جیاجیاکانی ڕۆشنبیری کوردیدا و، هەر فاکتەرێکی گەورە بێت لە خەباتی پڕ شانازی و سەروەریی نەتەوە نەبەزەکەماندا.

خالد محەممەد خاڵ

**تێبینی**: چاپی کۆنی ئەم فەرهەنگە بەڕێنووسێک نووسرابووەوە کە ئەمڕۆ باوی نەماوە. بۆیە ئێمە ناچاربووین دەستکارییەکی تەواوی ئەم ڕێنووسە بکەین و فەرهەنگەکە بە شێوەی ئەمڕۆی ڕێنووسی کوردی بنووسینەوە. وامان نەکردایە خوێنەران نەیاندەتوانی سوودی تەواوی لێ وەربگرن. ئەمە جگە لەوەی کە لە نێوان بەرگەکانی ئەم فەرهەنگەدا کە لە ساڵانی ١٩٦٠، ١٩٦٥، ١٩٧٦ چاپ کرابوون جیاوازیی ڕێنووس هەبوو. کارمەندانی دەزگای ئاراس ماندووبوونێکی بێ ئەندازیان کێشا تا توانییان ئەم فەرهەنگە لەم چاپ و شێوە تازەیەیدا بخەنە بەردەست. هیواداریین جێی ڕەزامەندی بێت.

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

# پێشەکی

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان: خوایە! نازانم بە چ زبانێک سوپاست بکەم و بە چ ئالاّ (قەڵەم)ێک ستایشت بنووسم، تۆ ئەو خوایەیت کە ئادەمیت لەناو هەموو گیانلەبەراندا بەرز کردووەتەوە، زانا و دانات کردوون، ژیری و بیرت داونەتێ و، کردووتن بەجێنشینی خۆت لەسەر زەوی. بەپێی دەستوور و باوی پەرەسەندن و بڵاوبوونەوە هەموویانت تیرە تیرە و کۆمەڵ کۆمەڵ کردوون و، هەر تیرە و کۆمەڵەیەک بەپێی ناوچەی خۆی زبانێکت داونەتێ، تا مەبەستی خۆیانی پێ بەجێ بێنن و، لەگەڵ یەکتری قسەی پێ بکەن و خستووتەتە دڵی هێندێ لە خوێندەوارانی بەرز و پێشەوایانیانەوە کە وتە کۆبکەنەوە و فەرهەنگ بنووسن و، بە یادگار بۆ دوای خۆیانی بەجێ بهێڵن، سا بەڵکو هەموو لایەکیان لەیەک بگەن و، لە یەکتری نزیک بکەونەوە و، بە ئاشتی دانیشن و، لە پاشەڕۆژدا دەست بکەنە ملی یەک بە برایەتی.

بێ گومانم کە دوو شت گەورەترین شۆڕشی هەڵگیرساند لە جیهاندا و، ئادەمی جیا کردەوە لە گیانلەبەرانی تر و لەناو هەموویاندا ئەمی لەسەر تەختی پاشایی دانا لەم جیهانەدا، یەکەم دەستی، دووەم زبانی، کە دەستی بەرەڵاکرد بەم ڕەنگە بەرزی کردەوە لە زەوی لەکاتی ڕۆیندا سەدان هەزار شتی سەیری پێ دروست کرد و، گەورەترین کەلەپووری بەجێ هێشت لەسەر زەوی. کە زبانی بەرەڵا کرد بەم ڕەنگە دەستی کرد بەقسەکردن، توانیی هەرچی بەدڵیدا بێ بیڵێ و هەموو کەسێک لەگەڵ هەموو کەسێکدا قسە بکەن و تێ بگەن و، یارمەتیی بیری یەکتری بدەن تا ئادەمی گەیشتە ئەم پایە بەرزە لە زانین و ژیری و بیر و وێژەدا کە هەرچی ئیمڕۆ دەیبینین لە دیمەنی شارستانی لە زانین و لە کردار هەمووی بەری کردەوەی دەست و زبانێتی.

بەڕاستی دۆزینەوەی پیت و وتە و وتار و قسەکردن شتێکی زۆر زۆر سەیرە. ئەگەر ڕاستت دەوێ لە دۆزینەوەی ئەتۆم گەلێ وردتر و هونەرترە، بەڵام چونکە لە منداڵییەوە فێری بووین بۆیە زۆر لێی سەرسام نابین. ئینجا لەبەر ئەمە ئادەمی لەزۆر کۆنەوە خەریکی دانانی وتە و کۆکردنەوەیەتی.

لە هەموو کەسێکەوە ئاشکرا و نمایانە کە زمان پایەی هەرە گەورە و بەهێزە لە کۆشکی کۆمەڵایەتیدا و، ڕوشتەی هەرەقایم و بەتینە بۆ یەکخستنی کۆمەڵە و گەل لە ڕۆژهەڵاتیەوە تا ڕۆژئاوای. بەڵکو زبان گیانی گەلە، کە زبان بوو گەل هەیە، کە نەشبوو گەل نییە.

هەروەها ئاشکرایە کە سەرمایەی زمان خەرمانی وتەیە و، گەنجینەکەشی فەرهەنگی وشەیە، هەر بەهۆی فەرهەنگەوەیە کە مەبەست لە وتە دەردەکەوێ و هەموو وتارێک نمایان دەبێ. کە وابوو نووسینی فەرهەنگ بۆ پاسی زمان لە هەموو شت پێویستترە بۆ مانەوەی گەلان. هەر گەلێک زمان و فەرهەنگی نەبێ لەگەڵ گەلاندا ناژمێردرێ و ناناسرێ، بەڵکو دەکرێ بە بەردەباز و پێشێل لەژێر پێی ئەو گەلانەی کە بۆ کوێستانی ژیان دەچن. تا لە ڕێ پێڵگەدا پان و پلیش دەکرێنەوە و، لەگەڵ خاکدا یەکسان دەکرێن.

بەڵام کە زمان و فەرهەنگی بوو با دیلیش بێ هەر گەلە و، بەگەل دەناسرێ و ڕۆژێک دەبێ کە لەگەڵ گەلانی خواپێداودا ڕووەو کوێستانی ژیان بڕوا و سەرکەوێ و، لە پێشکەوتن و بەرزبوونەوە دابێ، تا دەگاتە لووتکەی هەرە بەرزی ژیان و، بەسەر چڵەپۆپەی کامەرانییەوە وەک بولبولی هەزار داستان بخوێنێ و بچریکێنێ. کە وابوو ئاگاداریکردنی زمان بەنووسینی فەرهەنگ و کۆکردنەوەی وتە لە ئاگاداریکردنی گیان پێویستترە بۆ مانەوەی گەلان، چونکە بە نەمانی هەزاران گیان گەل نامرێ، بەڵام بە نەمانی زمان ڕشتەی کۆمەڵایەتی دەپچڕێ و شیرازەی گەل تێک دەچێ تا هەموو پەرەوازە دەبن و لەیەک دەبڕێن و زۆردار قووتیان دەدەن و لەناویان دەبەن.

ئەگەر بەچاوێکی وردبوونەوە تەماشای سەرگوزشتە و مێژووی گەلانی ڕابردوو بکەین، تێ دەگەین کە لەمەوپێش زۆر گەلی گەورە بوون کە لە خوێندەواری و تێگەیشتن و پێگەیشتن و تێکۆشین و پێشکەوتندا پایەیەکی بەرز و جێگایەکی بڵندیان بووە و، لەسەر

رووپەڕەی مێژوو زۆر نیشانەی مەردانە و پیاوانەیان بەجێ هێشتووە، بەڵام چونکە وەیشوومەی ڕۆژگار و، گەردشی چەرخی کەچ ڕەفتار، زمانەکەی لەناوبردوون، خۆشیان لەناوچوون، سا مەگەر لە کون و قوژبنی مێژوودا ناوێکیان مابێتەوە.

کە وابوو مانەوەی زمان مایەی مانەوەی گەلە، هەر گەلێک تا هەرچەندە دووچاری خەم و تەم و خەفەت و دەردی سەری ببێ و، تاڵی و سوێری ڕۆژگار بچەژێ و، تەنگانە و چەڵەمە کەڵەمەی بکا، ئەو گەلە هەر دەژی و دەمێنێ تا وەکو ئاگاداری زمانەکەیان بکەن و، نەیەڵن لەناو بچێ.

کەواتە زمان بۆ ئاگاداریی گەلان لە هەموو قەڵایەکی ئاسنین و قوللەیەکی سەختی بەهێزی مسین باشتر و چاکترە. چونکە قەڵا دەگیرێ و قوللە دەڕووخێنرێ، بەڵام زمان هیچی لێ ناکرێ.

هەزار ئافەرین بۆ ئەو زانایەی کە وتوویەتی: گەلی دیلی خاوەن فەرهەنگ و زمان وەک بەندییەک وایە کە کلیلی دەرگای بەندیخانەکەی لە گیرفاندا بێ. هەر حەلێک بیەوێ ڕزگار و، لە دیلی سەرفراز ببێ، بەکلیلی زمانەکەی دەرگای بەندیخانەی دیلییەکەی دەکاتەوە و، بەیداخی ئازادی و سەربەخۆیی هەڵدەدا، بەڵام گەلی دیلی بێ فەرهەنگ و زمان وەک بەندییەک وایە کە کلیلی دەرگای بەندیخانەکەی لە گیرفانی دوژمنەکەیدا بێ. ناچار دەبێ دەستەئەژنۆ دانیشێ تا دەتوێتەوە و نامێنێ و، هەموو کەلەپوور و داراییەکەی داگیردەکرێ و، ماڵی دەچێتە سەربەشی ماڵان و، بەئێجگاری چرای دەکوژێتەوە.

کە وابوو کۆکردنەوەی وتە و نووسینی فەرهەنگ بۆ کۆمەڵە و گەل لە هەموو شت پێویستتر و بەنرخترە.

***

کەس نییە لە جیهاندا بتوانێ گشت وتەی زمانی خۆی بزانێ و، لە مێشک و دڵیدا جێگای ببێتەوە، چونکە ئەمە هەر شایستەی خوایە. جا لەبەر ئەمە هەموو زمانێک ئەگەر لە چوارچێوەی فەرهەنگ نەگیرێ وەیشوومەی ڕۆژگار شەن و کەوی تێدا دەکا و بەبای دەدا و، کۆگای وتەکانی بەرەبەرە کەم دەکاتەوە تا وای لێ دێ کە نەتوانێ بەسەرمایەکەی خۆی بژی و مەبەست بەجێ بێنێ.

لەبەر ئەمانە، زانا بەرزەکان و تێگەیشتووانی هەموو گەلێک لە زۆر کۆنەوە خەریکی نووسینی فەرهەنگ و کۆکردنەوەی وتەی گەلەکەیان بوون، تا ژمارەی فەرهەنگیان گەیشتە ژمارەی زمانانی سەرزەوی، نەخوازەلا فەرهەنگی زمانە زیندووەکان کە ژمارەیان گەیشتۆتە هەزار و پێنج سەد[1] و ژمارەی وتەی هێندێک لەو فەرهەنگانەش لە سەد هەزار تێ پەڕیوە. کۆنترین فەرهەنگێک کە نووسراوە فەرهەنگی (کالیماکی غەراماتیقی إغریقی)یە کە سێ سەد ساڵ لە پێش میلاد نووسیویەتی و، ناوی ناوە (زەخیرە). لەپاش ئەم فەرهەنگە ئینجا بەرەبەرە فەرهەنگی تر نووسراوە، بەیۆنانی، ئینجا بەعەرەبی، ئینجا بە زمانەکانی ترکە یەکێکیان زمانی کوردییە.

کۆنترین فەرهەنگێکی کوردی کە نووسرابێ- بەپێی زانینی من- فەرهەنگی (ئەحمەدی خانی)یە، کە لە ساڵی ١٠٩٤ هـ بەشیعر نووسیویەتی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی و ناوی ناوە (نەوبەهار) کە لە داوێنی فەرهەنگی (الهدية الحميدية في اللغة الكردية) لە چاپ دراوە.

نەوبەهار نۆ چەکامە (قصيدة)یە، هەر چەکامەی لە وەزنێک. وا بۆ نموونە سێ شیعری دەنووسین هەر یەکەی لە چەکامەیەک:

(رجل) پێ و (ركبـة) ئەژنۆ (بطن) سک
(صدر) سنگ و(جيد) ئەستۆ (عين) چاڤ
(بيدا)، (فلاة) و (سبب)، (فيفاو) و (بدو) دەشتێ
(ينبوع) و (عين)، کانی (جب) و (قليب) بیرە
(اكحل) مرۆڤی چاڤ بەکل، (أشهل) مرۆڤی چاڤ بەلەک
(أشقر) مرۆڤی چاڤ هشین، ڕەنگی گەنم گون (أسمر)ە

لە پاشا ئینجا شێخ مارفی نۆدێیی (ئەحمەدی)ی نووسیوە بەشیعر لە ساڵی (١٢١٠هـ) لەسەر شێوەی (نەوبەهار) و لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، تا ئێستا دووجار لە چاپ دراوە، جارێکیان لە سلێمانی لە چاپخانەی (ژیان) لە ساڵی (١٣٥٤هـ)-(١٩٣٦م). جاری

دووەمیش لە (بەغدا) هەر لەوساڵەدا. (ئەحمەدی) دوو بابە (۱) بابی أسماء (۲) بابی أفعال. بابی أسماء سێ فەسڵە، هەر فەسڵەی لەسەر وەزنێکە، فەسڵی یەکەمی وەک:

(رأس) ســــەرە (عین) چاوە

(بدن) قـــــالب (إسم) ناوە

فەسڵی دووەم وەک:

(ســور) وارشــە (حـائط) حـەســار

(حـدیث) سـخن (مـسـمـار) بزمـار

فەسڵی سێیەم وەک:

(أین) لە کـوێ (من) کـێـیـە (آیان) کـەی

(إن) ئەگەر (ما) چی (متی) کەی (سم) ژار

بابی أفعال هەر یەک وەزنە وەک:

(جلس) دانیــشت (نهض) هەســتـا

(قـعـد) دانیــشت (وقف) وەسـتـا

لە دوای ئەحمەدی ئینجا فەرهەنگی جنراڵ (ئۆغۆستۆیابا)یە کە قونسوڵێکی ڕووس بووە لە شاری (ئەرزەرۆم) و، فەرهەنگەکەی ۸٤۲۸ وتەیە و، لە ساڵی ۱۸۷۹م لەلایەن (فەردیناند جوستی)یەوە لە چاپ دراوە لە شاری (پترسپۆرگ) کە ئێستا پێی دەڵێن (لەنینگراد)، لە ساڵی ۱۹٤۳م لە چەمچەماڵ ئەم فەرهەنگەم چاو پێ کەوت لای زەینەلعابدینیی کوڕی (مەلافانی).

لەدوای ئەم فەرهەنگە ئینجا (یوسف ضیا پاشای خالدی) فەرهەنگێکی نووسیوە لە کوردییەوە بۆ عەرەبی لەگەڵ سەرەتایەک لە دەستووری زمانی کوردی و، ناوی ناوە (الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة) و لە ساڵی ۱۳۱۰ی ڕۆمی لە ئەستەمبۆل لە چاپ دراوە، بەڵام وتەکانی هەر وتەی زازا و گەلێکیشی ناوی شاخ و کانی و دێهاتی ئەو ناوچەیەیە، کە ئەمانە لە فەرهەنگی وتەدا نانووسرێن، بەڵام بەڕاستی فەرهەنگێکی جوان و، کەلێنێکی زۆر گەورەی پڕکردووەتەوە. بەشی زۆری وتەی (زازا)م لەم فەرهەنگە وەرگرتووە، سا خوا بەمیهرەبانی خۆی پاداشی بداتەوە.

لەپاشا ئینجا فەرهەنگی (میجەرسۆن) دەرچوو- کە حاکمێکی ئینگلیزی بوو لە شاری سلێمانی لە کوردییەوە بۆ ئینگلیزی و، لە ساڵی ۱۹۱۹م لە لەندن لە چاپ دراوە.

لە ساڵی ۱۹٥۰م (ڕابەر) دەرچوو لە عەرەبییەوە بۆ کوردی.

لەپاش ئەم فەرهەنگانە ئینجا فەرهەنگی مەردۆخ دەرچوو لە ساڵی ۱۳۷٥هـ (۱۹٥٦م) بەڕاستی کۆششێکی گەورە و نووسراوێکی بەنرخە، شتی وا مەگەر هەر بەقەڵەمی زانا و پێشەوایەکی وەک ئایەتوڵڵای کوردستانی بنووسرێ، بەڕاستی کارەکەی پەسند و کردەوەکەی جێی سوپاس و ستایشە، بەڵام- داخەکەم چەند نەنگێکی تێدایە کە چاوی لێ ناپۆشرێ:

١- خۆی لە سەرەتای فەرهەنگەکەوە دەستوورێکی تایبەتی داناوە بۆ چۆنێتیی نووسینی کوردی، کەچی خۆی فەرهەنگەکەی بەو دەستوورە نەنووسیوە، بەڵکو بەپێی دەستووری فارسی نووسیویەتی، کەسێک فارسی زان نەبێ نازانێ بیخوێنێتەوە.

٢- لەبەرئەوەی کە بەپێی دەستووری نووسینی کوردی نەنووسراوە، وتەکانیشی بەو جۆرە ڕیز نەکراوە، لەبەر ئەمە وتەی ئێجگار بەگران تیا دەدۆزرێتەوە.

٣- نیوەی وتەکانی وتە نین، سا یا:

أ- فعلن - کە نابێ بنووسرێن - وەک (بدە، ئاما، ئێژێ، ئەوینی، ئەژیی، ئەدا، ئەدرەوشێ).

ب- یا ناوە بۆ یەکێک - کە نابێ بنووسرێ - وەک: (ئامینە).

ج- یا هەر ناویش نییە وەک: (ئامە) کە دەڵێ: کورتەی (ئامان الله)یە.

د- یا دروست کراوە وەک: (بەدشەو، بەدصبح).

هـ- یا هەر وتە نییە وەک: (ئەسپی تەمەڵ، ئەسپی سواری، ئەسپی تەڵایی، ئەسپی یاڵ چەرمگ، بارانی ورد، بارانی درشت، بارانی ناوەخت، بارانی کەم، بەن دەرگای جەواڵ، بەن دەرگای خیگە، باقلەی کوڵیاگ، بمخە، بمرە، بزانییایە، بشێلە، بگرە، بلاوێنە، بکەرە زووخاڵ، بێنە).

و- یا هەر هەڵەیە وەک: (برس) لە برسێتی و (تاقی) لە تاقیکردنەوەدا کە ئەمانە هەرگیز نەبیستراون.

٤- زۆری وتەی عەرەبی ناقۆڵایە وەک: (أصلع، إعجاز، اضطراب، إراک، إجحاف، أسد، أوج، استشمام، أصحاب الکهف، ارذل الناس).

٥- زۆریشی وتەی فارسییە، وەک: (پەزیرا، پەزیرایی، پەزیرە، پرخاش).

٦- وتەکانی هەر وتەی (ئەردەڵان)ە، زازا و بادینانی تێدا نییە، بابان و هەورامی و لوڕی و فەیلیشی مەگەر بەدەگمەن تێدابێ.

٧- زۆرتر ڕاڤە (شرح)ی وتەیەکی بەتاقەوتەیەک کردووە، بەبێ ئەمەی کە درێژەی پێ بدا و پێت بڵێ کە چۆن بەکار دەهێنرێ، یا باسی گیایەک، یا گوڵێک یا درەختێک یا یاریبیەکت بۆ بکا یا دەنگێکت لە دەنگێکی تر بۆ جیابکاتەوە.

٨- زۆر جار ڕاڤەی وتەیەکت بە وتەیەک بۆ دەکات کە خۆی ئەو وتەیەی لە شوێنی خۆیدا نەگرتووە، وەک وتەی (پاماسێ) کە ڕاڤەی دەکا بە (پاماسە) یا(چوت) کە ڕاڤەی دەکا بە (چورتکە) کەچی (پاماسە) و (چورتکە) لە فەرهەنگەکەیدا ناگرێ.

٩- زۆر وتەی وا هەیە سێ جار نووسیویەتی وەک: (نۆوەن)، یا دووجار نووسیویەتی وەک: (خورجین، نەدارا، نەزانست، نەزانکار).

١٠- زۆر وتەی وا هەیە لە دوو لاوە دەیگرێ و ڕاڤەی دەکا، بەڵام لە هەر لایەی بەجۆرێک وەک: (نەگۆمە).

لەگەڵ ئەمەشدا بەشی زۆری وتەی ئەردەڵانم لە فەرهەنگی مەردۆخ وەرگرتووە:

فەرهەنگی (نەوبەهار) و(ئەحمەدی) و (میجەرسۆن) یەکی چەند لاپەڕەیەکی بچووک و چەند وتەیەکی کەمن کە شایستەی ئەوە نین پێیان بوترێ فەرهەنگی کوردی. جگە لەوەش کە نەوبەهار و ئەحمەدی و ڕابەر لە عەرەبییەوەن بۆ کوردی، واتە فەرهەنگی عەرەبین نەک کوردی.

فەرهەنگی (ضیاپاشا)ش هەر وتەی زازایە.

فەرهەنگی (ئۆغۆستۆیابا)ش وەک (عەنقا) وایە، دەنگی هەیە و ڕەنگی نییە، جگە لەوە کە وتەکانیشی هەر وتەی ناوچەیەکی بچووکە لە کوردستاندا.

ئینجا کاتێک ورد بوومەوە و تێ گەیشتم کە زمانەکەمان هێشتا فەرهەنگێکی وای بۆ نەنووسراوە کە ڕووی بێ بچێتە ناو فەرهەنگانەوە و، ئەمە سێ چوار هەزار ساڵە کورد- کە خاوەنی زمان و نووسینە - هێشتا وتەی زمانەکەی خۆی کۆ نەکردووەتەوە و، کەس بەبیریدا نەهاتووە کە فەرهەنگێکی تێکڕاییی بۆ بنووسێ، لەگەڵ ئەمەی کە زمانی کوردی لە زمانە دەوڵەمەندە زیندووەکانە و لە ئاهەنگ و شێوە و دەنگدا لەگەڵ ناسکترین زمان- کە فەڕەنسییە- جیاوازییەکی نییە.

ئینجا هەرچەند بیرم لە دەوڵەمەندیی زمانی کوردی و جوانیی ئاهەنگەکەی دەکردەوە بزە دەیگرتم و، هەرچەند بیریشم دەکەوتەوە کەوا خەرمانی زمانەکەمان لە دەشتی بێ کەسی و لەبەر بارەشی ڕۆژگاردا ماوەتەوە و بە ڕاستە و چەپەدا شەن وکەوی تێدا دەکا و بە بای دەدا هەنسکم هەڵدەدا. بەم ڕەنگە چەند ساڵێک لە ناوەندی بزە و هەنسکدا مامەوە تا خوا هێنامیە سەر کۆکردنەوەی (وتە) و نووسینی ئەم (فەرهەنگ)ە.

لە ساڵی (١٩٣٥)وە بە هەموو هێز و توانای خۆمەوە خەریکی کۆکردنەوەی وتەی کوردیم بە هەموو ئاهەنگ و شێوەکانییەوە و، بە وتەی بابان و، سۆران و، زازا و، بۆتان و، بادینان و، لوڕ و، فەیلی و، لەک و، موکریان و، هەورامی و، ئەردەڵانەوە و، لەم ڕێیەدا زۆر ڕەنجم داوە و کۆششم کردووە، تا وتەی ڕاست و دروستم کۆ کردووەتەوە و هەزاران وتەی ناقۆڵام لە بربەنگ و هەسان داوە تا ڕاستم کردوونەتەوە.

زۆر جار وتەم لە دوورەوە بۆ هاتووە، بەڵام چونکی بەشێوەی نووسینی کوردی نەنووسراوە دڵنیا نەبووم لێی و تێکەڵی فەرهەنگەکەم نەکردووە تا خاوەنەکەم دیوە و لە دەمی خۆیم وەرگرتووە، هەروا زۆر وتەی وابووە کە زانیومە لای ژن یا لادێیی یا ڕاوکەر یا جووتیار یا جۆڵا یا دارتاش یا ئاشەوستا یا ناڵبەند یا کاڵا و زین و کورتان و کەوش درو دەست دەکەوێ بەتایبەتی لێم پرسیونەتەوە تا هیچ گومانێکم نەماوە.

ئەوی لەم فەرهەنگە ورد دەبێتەوە دەبێ بزانێ کە تا ئێستا لەم ڕووەوە سەرمەشقێکمان بۆ دانەندراوە تا چاوی لێ بکەین و، فەرهەنگێکی تێکڕاییمان بە زمانی کوردی بۆ نەنووسراوە تا لاسایی بکەینەوە و، وتەکانمان ڕیز نەکراوە و مەبەستیان بۆ دانەنراوە، مەبەست دانەوەش لە وتان بە ڕەنگێکی وا کە هەموو وتەیەک لە یەک جیا بکاتەوە و، هەموو وتەیەک ڕاڤەیەکی وای بۆ بنووسرێ کە بە تەواوی هەموو کەسێک لە مەبەستەکەی بگات. زۆر زۆر گرانە و هەروا بە ئاسانی مەزانە ڕاڤەکردن و مەبەست دانەوە لە وتەی (بەڵام) یا (تومەز) یا (مەگەر) یا (گونجان) یا (خاڵانە) یا (ئە) یا (بە) یا (ئانە) یا (ئەگینا) یا هەزاران وتەی تری وا.

هەروەک پێویستە بزانی کە ئاهەنگی زمانی کوردی و عەرەبی لە یەک جیان و، فەرهەنگی کوردی نابێ لەسەر شێوە و دەستووری فەرهەنگی عەرەبی بێ، ئنجا ئەگەر ئەم فەرهەنگە باش و پەسند بوو ئەوا ئاواتی چەند ساڵەی خۆم و گەلەکەم هاتەدی ئەگینا من درێغ و کۆتایم نەکردووە و شتی بێ نەنگیش هەر شایستەی خوایە. لەگەڵ ئەمەشدا کە دەگونجێ چەند جارێکی تر بەر و دوا لە چاپی بدەینەوە و، هەموو نۆرەیەک گەلێ وتەی تری بخەینە سەر و، کەموکوڕی و هەڵەیەکی ئەگەر ببێ چاکی بکەین.

## پەیدابوونی وتە و زمان

وتە وشەیەکە کە بۆمەبەستێک دانرابێ. وتار گوفتارێکە کە هەموو کەسێک مەبەستی دڵی خۆی پێ بەجێ دێنێ. پەیدابوونی وتە و زمان بەهۆی کۆمەڵایەتیی ئادەمییەوە بووە، ئەگەر کۆمەڵایەتی نەبوایە پێویست نەدەبوون بەتێگەیاندنی یەکتری لەو مەبەستانەی کە بەدڵیاندا هاتوچۆی کردووە و، ئەگەر پێویستیش بە تێگەیاندن نەبوونایە قسەکردن نەدەبوو و، ئەگەر قسەکردنیش نەبوایە ئیمڕۆ وتە و زمان نەدەبوو کە وابوو هەرچی وتەی ئادەمی هەیە هەمووی زادەی کۆمەڵایەتییە.

زۆر لە زانایانی زمان بەلایانەوە وایە کە وتە یەکەمجار لە دەنگەوە[٢] وەرگیراوە، واتە لە دەنگی گیاندار و با و باران و ئەوشتانەی کە لە کردەوەیەکی ئادەمیزادەوە پەیدا دەبێ وەک دەنگی لێدان و کوتان و شکاندن و گەلێ شتی تر. ئینجا مەبەستیان لە گێڕانەوەی یەکێک لەو دەنگانە باسی ئەو شتە بووە کە دەنگەکەی لێوە هاتووە یا باسی شتێک بووە کە بەخاوەنی دەنگەکەوە بووە و، لەگەڵ گێڕانەوەی ئەو دەنگانەدا جووڵانەوەی سەر و دەست و چاو و ئەندامیشیان بەکار هێناوە بۆ پیشاندانی درێژی و پانی و ئەستووری و قەبارە و چۆنێتیی ئەو شتەی کە قسەیان لێ کردووە، لەپاشا بەرە بەرە بەپێی پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی ئادەمی و زۆربوونی پێویستانی و بەهۆی سەرکەوتنی بە پلەی شارستانێتیدا وتەیان زۆر بووە و جوان بووە.

یەکێک ئەگەر باش وردبێتەوە لە وتەی (باڕە) و (باعە)ی مەڕ و بزن و(بۆڕە)ی گا و(تەقە)ی تفەنگ و (جروکە) و (جریوە)ی چۆلەکە و (جووکە) و (جیکەی) جووجەڵە و (جیڕە)ی دەرگا و (چرکە)ی بنمیچ و (حەپە)ی سەگ و (حیلە)ی ئەسپ و (خرتە)ی مشک و (خرچە)ی شووتی لە کاتی لەتکردنی و (خڕە)ی گوێز و (خرمە)ی ترۆزی لەکاتی خواردنیدا و (خشە)ی بارە قامیش و (خوڕە)ی ئاو و (خوشە)ی شیر لە کاتی دۆشینیدا و (خیزە)ی سنگ و (زڕە)ی پارە و (زرمە)ی پێی ولاخ و (زرنگە)ی پاوانە و (زیڕە)ی پڵنگ و (زیکە)ی مشک و (شڵپە)ی ئاو و (شڵقە)ی مەشکە و (شەقە)ی شووشە لەکاتی شکانیدا و (شریخە)ی هەورە تریشقە و (فیشکە)ی مار و (فیکە)ی لێو و (فڕە) و (ڤنگە)ی بەردی قۆچەقانی و (قاسپە)ی کەو و (قرتە)ی مریشک و (قرچە)ی دار لەکاتی شکانیدا و (قڵپە)ی گۆزە و (قڕە)ی بۆق و (قرمە)ی داری ئەستوور لەکاتی شکانیدا و (قۆڕە)ی مانگا و (قووقە)ی کەڵەشێر و (قوڵپە)ی شتی شل لەسەر ئاگر و (کڕە)ی بەرداش و (کزە)ی مەنجەڵ لەسەر ئاگر و (کسپە)ی شیشی سوورەوەبوو لە کاتێکدا کە بکرێ بە ئاوی سارددا و (گارە)ی مریشکە بەکڕ و (گرمە)ی هەور و (گڕە) و (گڤە)ی ڕەشەبا و (گیزە)ی مێشوولە و (لوورە)ی گورگ و (مڕە)ی سەگ و (مشە) و (منگە)ی لووت و (میاوە)ی پشیلە و (ویزە)ی ویزویزە و (هاڕە)ی تاڤگە و (هاژە)ی

بارەگەلا، ئینجا ئەگەر یەکێک لەم وتانە وردبێتەوە باوەڕ دەکا بەقسەکەی پێشوو کە وتمان سەرچاوەی وتان دەنگ بووە، نەخوازەلا کە گوێ بگرین لە منالّی ساوا لە کاتی زمان گرتنیدا و لێی وردبینەوە دەبینین کە زۆر شت ناو دەبا بەناوی ئەو دەنگەی کە لێوەی دێ وەک (بەعە) بۆ مەڕ و بزن چونکە دەباعێنێ و (جزە) بۆ گۆشت چونکە لە کاتی سوورکردنەوە و برژاندنیدا چز و هووڕی لێوەدێ و (حەبە) و (هەچە) بۆ گوێدرێژ چونکە بەم وتانە لێی دەخورن.

## جیابوونەوەی زمان و وتەی گەلان

کاتێک کە ئادەمی زۆر بوون و پەرەیان سەند و پەلوپۆیان هاوێشت و جێگایان نەبووەتەوە لەو ناوچە و شوێنانەی کە تێدابوون، بەناچاری بلاوەیان لێ کردووە و، هەر کۆمەلّەی ڕووی کردووەتە ولاتێک و، لە شوێنێکی تازە دابەزیون و جێگیر بوون، دیارە هەموو شوێنێک جۆرە چەشمەندازێک و چەشنە سەرما و گەرمایەکی بووە و، هەر قەلّەمڕەوێک جۆرە کالا و پێخەف و نوێن و خانوبەرەیەک و چەشنە ناومالّ و خانوویەکی ویستووە، نەخوازەلا کە هەزاران شتی واش بووە لە نیشتمانە تازەکەیاندا کە لە نیشتمانی پێشوویاندا نەبوو، ئینجا چەند سالّێکی دووروودرێژ خەریک بوون تا وتەیان بۆ ئەو شتە تازانە داناوە و، توانیویانە مەبەست لێ بدەنەوە لەو شتانەی کە تازە بەرچاویان کەوتووە و، یا تازە پێویست بوون پێی، جگە لە پاش و پێشکردن (قلب) و گۆڕین (ابدال)ی پیتێک بەپیتێکی تر کە ئەمانە هەمیشە لە هەموو زمانێکدا بەسەر پیت و وتە داهاتوون و دێن، جا لەبەر ئەمانە هێندێ لە وتە کۆنەکان فەرامۆش کران و، گەلێکیش تاشران و ڕێکخران و گەلێک لە جاران جوانتر کران، بەرەنگێکی وا لە وتە کۆنەکان نەدەچوون، تا وای لێ هات کە زمانەکەی پێشوویان پێچرایەوە و، هیچێکی چەندانی وای نەما مەگەر دانە دانەیەک نەبێ کە بلاوبوونەتەوە بەناو گەلێک لە زمانەکاندا و، بە ڕێکەوت لەم لا و لەولا تووشیان دەبین[٣]. جا بەم بۆنەیەوە زمانی هەموو گەلێک لەگەلّ زمانی ئەوانی تر جیابووەوە و زمان زۆر بوون بەڕەنگێکی وا کە هێندێ لەو زمانزانانەی کە لەم جۆرە شتانە دەکۆلّنەوە و ژمارەی زمانانی سەر زەوییان گەیاندووەتە (٢٦٠٠) زمان.

## لق و پۆپی زمان

زانایان و شارەزایان بە بناغە و لق و پۆپی زمان، زمانی ئادەمییان بردووەتەوە سەر چەند شتێک کە یەکێکیان (ئاری)یە، بنچینەی زمانی ئاری زمانی (هیندی)ی کۆنە کە پێی دەلّێن (سەنسکریتی)، (کوردی) لکێکە لە زمانی ئاری، هەروەک (ئینگلیزی) و (ئەلّمانی) و (فەرەنسی) و (ئیتالّی) و (ئەسپانی) و (یۆنانی) و (پەهلەوی) واتە فارسی کۆن لکەکانی تریەتی، یەکێک ئەگەر زۆر باش بچێتە بنج و بناوانی ئەم زمانانەوە گەلێ وتەی وا دەبینێ لە ناویاندا کە لەیەک دەچن؛ بەلّکو یەکن[٤]. یەکێک ئەگەر باش وردبێتەوە لەم خشتەیە تێ دەگا کە زمانی ئینگلیزی و کوردی و، فەرەنسی و کوردی چەند لە یەکەوە نزیکن!!

| ئینگلیزی | کوردی | ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|---|---|
| باد | بەد (خراپ) | ستنگ | چزووی زەردەوالّە و هەنگ کە بەبادینانی پێی دەلّێن (ئەستینگ). |
| جوو | جوو (جوولەکە) | | |
| هەراس | هەراس | چن | چەنە، چەناگە |
| جەکەل | چەقەلّ | لێک | لاق |
| برۆو | برۆ | لیپ | لێو کە پێشی دەلّێن (لەپ) |

| | | | |
|---|---|---|---|
| درۆپ | دڵۆپ (دڵۆپە) | نەیم | ناو، نام |
| ئێک | هێلکە کە بەبادینانی پێی دەڵێن (هێک) | نیو | نوێ |
| ئەسپن | ئەسپندار (سپیدار) | تو | دوو |
| پارت | پارچە | نۆ | نە ء کە بەبلباسیش پێی دەڵێن نۆ |
| شەیم | شەرم | لالابای | لای لایە |
| باند | بەند | | |
| هەنی | هەنگوین | | |
| | | فێری | پەری |
| ستار | ئەستێرە | کت، کات | پشیلە کە پێشی دەڵێن (کتک) |
| موون | مانگ | | |
| سپلین | سپڵ | فەذەر، فاذەر | باوک کە بەفارسی پێی دەڵێن (پدر) |
| دۆر | دەرگا کە پێشی دەڵێن (دەر) | | |
| بارک | بەرگ (گەڵای درەخت) | ناین | نۆ |
| برادەر | برا، برادەر | پرۆسپێراز | پیرۆزی (موبارەکبایی) |
| مەذەر، ماذەر | دایک کە بەفارسی پێی دەڵێن مادر | دۆتەر، داوتەر | کچ کە بەبادینانی پێی دەڵێن (دوێت) بەفارسیش پێی دەڵێن (دختر) |

| فەرەنسی | کوردی | فەرەنسی | کوردی |
|---|---|---|---|
| پێ | پێ | ئوێ | ئاو |
| دان | دان | پاپیلون | پەپوولە |
| ژەنو | ئەژنۆ | | |

هەروا ئەگەر بەم ڕەنگە زمانی کوردی لەگەڵ زمانەکانی تردا بەراورد بکەین، نەخوازەڵا لەگەڵ ئەڵمانیدا، گەلێ گەلێ زۆرتر و ڕێکتر دەردەچی، خۆ کوردی و فارسی هەر مەپرسە

## کورد

کورد گەلێکی ئاری زۆر کۆنە و، لە پێش سپێدەی مێژووەوە- واتە زیاتر لە هەزار ساڵی پێش میلاد- هاتوون و لە ناو ئەم شاخانی کوردستانە دابەزیون و ماونەتەوە تا ئیمڕۆ[٥]. گەلی کورد کۆنترین تیرەیەکن لەناو ئارییەکاندا[٦] و دەتوانین بەپێی مێژووی چەرخە گرنگەکان (أدواری رئیسی)ی کورد دابەش بکەین بە سێ بەش:

١- لە سپێدەی مێژووەوە تاپەیدابوونی دەوڵەتی (ماد)، واتە تا هەزار و پێنج سەد ساڵ پێش میلاد.

٢- لە پەیدابوونی دەوڵەتی مادەوە تا هاتنی ئاینی ئیسلام و موسوڵمان بوونی کورد.

٣- لە موسوڵمان بوونی کوردەوە تا ئیمڕۆ.

# پێگەیشتنی زمانی کوردی

سەرچاوەی کوردی زمانی (ماد)ی کۆنە کە ئاوێستای (زەردەشت) پێغەمبەر بەو زمانە هاتووەتە خوارەوە.

زمانی کوردی- وەک هەمـوو شتێکی زیندوو- لەدایک بووە و، بەرەبەرە پێگەیشـتووە و خۆی دارِشـتووە، ئینجا بەهەزاران تاشین و رێکخستن و بیـراز و چەکـوشکاری بەسـەردا هاتووە و، لە برِبەند و هەسـان دراوە و، بەرەبەرە بەپلەی ئاوەدانی و شـارسـتـانیـدا سەرکەوتووە، تا لە دوادەمی دەوڵەتی مـاددا گـەیشـتـووە بە پلەی هەرەبەرزی شـارسـتـانێـتی، یەکێک ئەگەر بەچاوێکی وردبوونەوە تەماشای ئەو وتە کوردییە کۆنانە بکا کە (ماد) بۆیان بەجێ هێشتووین و، ئێمەش لە داوێنی فەرهەنگەکەمانەوە هێندێکی گرنگی- کـە شـوێنیـان لە زمـانی کـوردیدا چۆلە- بلاو دەکـەینەوە، تێ دەگـا کـە زمـانی کـوردی دووسێ هەزار سـاڵ لەمـەوپێش بەرزترین و دەوڵەمەندترین زمان بووە.

# جیابوونەوەی شێوەی کوردی

کاتێک کە کورد زۆر بوون و، لە ناو خۆیاندا پەرەیان سەند و بلاوبوونەوە بەناو شاخ و کێوەکانی کوردستاندا، ئیتر لە یەکتری دوور کەوتنەوە نەخوازەڵا لە هۆی بێ رێگاییی شاخەکان و چەم و رووبارە گەورەکانەوە،ساڵەهای ساڵ رادەبوورد هەورامییەک بادینانی و، زازاییـیەک لورِی و، فەیلییـەک موکـریانی و، بابانییـەک بۆتانی و، سۆرانییـەک ئەردەڵانییـەکی نەدەدی، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تریشـەوە گەلێ لە تیـرە و خێـلاتی (مـاد) هـاتوونەتە رۆژهەڵاتی کـوردسـتـانی ئێـمـرِۆ و، هەزار و پێنج سـەد سـاڵ پێش مـیـلاد تێکەڵی تیرەکانی سپی یا ئاری کۆنتری دانیشـتووی ئەوێ بوون و، گەلێ لە وتەی تیرەکانی ئەوێ - کە ناویان (گۆتی، لۆلۆ، کاسی، ئێلامی) بووە- تێکەڵاوی زمـانی (مـاد) بووە، لە دواییدا ئێـلاتی فـارسی (مـاد)ی تێکەڵی خـۆی کرد و قـووتی دا، ئنجا زمـانی فـارسی هێـزی سەند و، وتەی فارسی کەوتە ناو زمانی کوردییەوە[٧] لەپاشا ئینجا بەچوار سەد ساڵ پێش میـلاد (ئەرمەنی)یەکـان و (رووم)ە کان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوای (ئەنادۆل) بوون بەدراوسێی کورد و، گەلێ وتەیان تێکەڵ بەزمانی کوردی[٨] بوو.

لەپاشا ئینجا ئیسلام بەهەمـوو کوردستاندا بلاوبووەوە و لە (٦٥٠) سـاڵ پاش مـیلاد، کـورد سـەرانسـەر بوو بەموسـوڵمـان و، وتەی عەرەبی کەوتە ناو زمانی کوردییەوە.

لە (٩٠٠) ساڵ پاش میلاد بەدواوە ئینجا تورکەکان پەیدا بوون و، حوکمدارییان لە کوردستاندا دەستی پێ کرد و، زۆر وتەی تورکی لە زمـانی کوردیدا مـایەوە و، بەم بۆنانەوە شـێوەی رۆژهەڵات و رۆژئاوای کـوردسـتـان لە یەک جـیـابووەوە و، گـەلێ وتەی بێگـانە لەناو زمانەکەماندا مایەوە.

بێگومـانم زمـانی کوردی لە پێش بلاوبوونەوەی ئەم زمـانانەدا، نەخوازەڵا لە پێش زمـانی عـەرەبییـەوە زمـانێکی زۆر دەوڵەمەند بووە، بەڵام لەپاش بلاوبوونەوەی زمـانی عـەرەبی ئیـتر بەرە بەرە وتەی عـەرەبی بەکار هێنراوە لە نووسین و قسـە و گفـتوگۆدا لەجیـاتی وتەی کـوردی. بەم بۆنـەیەوە گـەلێ وتەی کـوردی فـەرامـۆش کـرا و لە بیـر چووەوە، ئەمـەش رێگایەکی ناچارییـە بۆ هەمـوو گـەلێکی زەبوونی داگیرکراو کە هەمیشە بە چاوێکی زۆر بەرز و تایبەتی تەماشای گەلی زاڵ دەکا و، دەیەوێ لە هەموو شتێکدا چاوی لێ بکا و لاسایی بکاتەوە و، بە رەنگی ئەو خۆی رەنگ بکا و، خۆی لەو نزیک بخاتەوە، نەخوازەڵا زمانی عەرەبی کە زمانی ئاینمانە. لەبەرئەوەی کە تا ئێستا فەرهەنگێکی کوردی نەنووسراوە کە وتەکانمان کۆبکاتەوە و ئاگاداری بکا، گەلێ وتەمان فەرامۆش کراوە و لەبیر براوە، دەتوانم بلێم ئەمە دوو هەزار ساڵە خەرمانی زمـانەکەمان لەلایەن دراوسێکانمانەوە بەجەنجەڕی زۆر و ستەم گێرە کراوە و کوتراوە و شەن و کەو کراوە و بەبا دراوە، لەگەڵ ئەمـەشدا هێشتا لە زمانی فـارسی دەوڵەمەندترە چ جـای تورکی. بێگومانم ئەوەتی زمـانی کوردی هەیە گـەلێ زمانی تر لەدایک بوون و هاتوونەتە جیـهانەوە، لەپاشا نەیانتوانییوە لەبەر وەیشوومەی رۆژگاردا بوەستن، بەڵکو مـردوون و لەناوچوون. بەڵام زمانی کوردی وەک کێوی (پیرەمەگروون) وەستاوە و سنگی داکوتاوە و، لەبەر هیچ سێلاوێکی رۆژگار و گێژەڵووکەیەکی چەرخی

کەچ ڕەفتاردا نەلەرزیوە و دانەچڵەکیوە، ئەمەش وابزانم لەبەر دوو شتە:

١- کوردستان شوێنێکی شاخ و داخاویی زۆر سەختی کووڕی وایە کە هەرگیز بێگانە نەیتوانیوە تێیدا هەڵبکا و، بەم بۆنەیەوە گەلی کورد هەروەک خوێنی بەپاکی ماوەتەوە و زمانەکەشی بەچاکی ماوەتەوە.

٢- کورد مەردییەکیان هەیە، دووانیان کە لە شوێنێک کۆبنەوە بەزمانی خۆیان نەبێ قسە ناکەن و، هەرگیز دەست لە زمانەکەیان هەڵناگرن. نابینیت برا فەیلییەکانمان سێ سەد ساڵە لە بەغدان کەچی هێشتا زمانەکەی خۆیان فەرامۆش نەکردووە و، لەناو خۆیاندا هەر بە کوردی قسە دەکەن.

هەمـوو زمـانێک کە قـەڵەمڕەوی گـەورە بوو و، سنووری لە یەک دوور کەوتەوە نەخوازەڵا کە چەم و ڕووباری گەورە و شاخ و داخی سەخت و کووڕیشی تێدابێ ئیتر شێوەی زۆری لێ پەیدا دەبێ و، هەر شێوەیەک چەند شێوەیەکی تری لێ دەکەوێتەوە، ئینجا بەم پێیە زمانی کوردیش گەلێ شێوەی لێ پەیدابووە و، ئەو شێوانەی کە زۆر لە یەک جیا بن شێوەی (لوڕ، هەورامی، ئەردەڵان، بابان، بادینان، زازا)یە، لەگەڵ ئەم شێوانەدا گەلێ شێوەی تریشی هەیە، بەڵام زۆر لە یەک دوور نین.

بۆ ئەوەی کە شوێنی ئەم شێوانە لە کوردستاندا بزانین پێویستە باس لە سنووری کوردستان بکەین و یەک بەیەک شوێنی ئەم شێوانە جیا بکەینەوە.

## سنووری کوردستان

سنووری کوردستانی گەورە نەختێک لە ژوور ڕۆ (خلیج)ی فارسییەوە بەدیوی ئێراندا دەست پێ دەکا و، بەقەراخ شاری (شیراز) و (ئەسفەهان) و (کاشان) و (هەمەدان) و (تەورێز) و (خۆی) و (ئەریوان)دا دەڕوا و، بەلای (قارس) و (ئەرزەڕۆم)دا بادەداتەوە و، لە خوار دەریای ڕەشەوە شۆڕ دەبێتەوە و، لە ژوور شاری (ئەرزنجان)ەوە دەڕوا تا دەگاتە ڕۆی (ئەسکەندەروونە)، ئینجا دێتە خوارەوە بە ژوور (حەلەب)دا تا دەگاتە ڕۆژئاوای (سنجار) و بەڕۆژهەڵاتی (بەغدا)دا تێ دەپەڕێ تا (مەندەلی) و لەوێوە تا ڕۆی فارسی.

## لق و پۆپی زمانی کوردی

زمانی کوردی بە چواربەش دابەش دەکرێ:

١- زازا.

٢- کرمانجی دەستە چەپ (شمالی) کە (بۆتانی ) و (بادینانی) و (هەکاری) و (بایزیدی) و (شەمدینانی)یە.

٣- کرمانجی دەستە ڕاست کە (سۆرانی) و (بابانی) و (موکریانی) و (ئەردەڵانی) و (کەڵهوڕی) و (گۆرانی)یە.

٤- لوڕی کە (بەختیاری) و (لەکی) و (فەیلی)یە.

بەم ڕەنگە ڕۆژئاوای دەستـەچەپی کوردسـتان هەمـووی زازا و دەسـتەڕاسـتی لەگەڵ کـوردسـتـانی ناوەڕاست هەمـووی (کرمـانج)ە و، ڕۆژهەڵاتی دەستەڕاستی هەمووی (لوڕ)ە.

ئەگەر بمانەوێ شوێنەکانیان یەک بە یەک بزانین، بەم جۆرەیە: لە ڕۆژهەڵاتی (خانەقین)ەوە تا (عەلی غەربی) لە پانی و، لە درێژی تا (کرماشان) و (نەهاوەند) لوڕە. لە (بیجاڕ)ەوە تا (گەڕووس) و (جوانڕۆ) و (بانە) و ڕۆژهەڵاتی (سیروان) ئەردەڵانە. لە (شنۆ) و (لاجان)ەوە بەسەر (سابلاخ) و (سەردەشت)دا تا وەکو (میان دواو) موکریانە، لە (مەریوان)ەوە تا (سیروان) هەورامانە، لە (سیروان)ەوە تا (زێ)ی بچووک بابانە، لە (زێ)ی بچووکەوە تا (زێ)ی گەورە سۆرانە، لە (زێ)ی گەورە تا شاخەکانی (هەکاری) بادینانە، ڕۆژهەڵاتی شاخەکانی (هەکاری) شەمدینانە، لە ڕۆژئاوای (زاخۆ)وە تا (ماردین) و (نسێبین) بەپانی و، بەدرێژی لە (سێرت)ەوە تا (دێرزوور) بۆتانە، ڕۆژئاوای (دیاربەکر) بە(ئورفە) و (خەرپووت) و (دەرسیم)ەوە زازایە.

# پیتی کوردی

زمانی کوردی (٢٧) پیتی هەیە:

(ا، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ڕ، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ک، گ، ل، م، ن، ه، و، ی)

(ث، ذ، ص، ض، ط، ظ) لە زمانی کوردیدا نین.

(د) لەسەر دوو جۆرە: (١) گران وەک: (دار، داو، داش، دەنگ، دنگ). (٢) سووک وەک: (بدە، مەدە، هەناردان، گولاودان)، هێندێ کەس بۆ جیاکردنەوەی ئەم دوو (د)ەیە لە ژێر سووکەکەیاندا (.) یەک دادەنێ، بەلام ئێمە ئەمەمان لەم فەرهەنگەدا هەلگرت، چونکە ئەو (د)ە سووکە هەر لە ناوچەی سلێمانی هەیە، جگە لەوە کە لەم ڕووەوە هیچ مەبەست ناگۆڕێ. (ر) لەسەر دوو جۆرە، (١) بچووک وەک: (برین، کەر). (٢) گەورە وەک: (بڕین، کەڕ). بەلام (ر)ێک کە لە سەری وتەوە بێ، چونکە هەمیشە هەر گەورە دەبێ بەیەک (ڕ)ی قەلەو دەنووسرێ وەک: (ڕەنگ، ڕنگ، ڕم، ڕاو، ڕام)

(ل) دوو جۆری هەیە: (١) سووک وەک: (گول، گەل، کەل). (٢) قەلەو وەک: (گوڵ، گەڵ، کەڵ). (ل) ی قەلەو نیشانەی (٧)ی لەسەر دادەنرێ.

(و) لەسەر دوو جۆرە: (١) وشراو وەک: (بوون، چوون، ڕوون)، ئەم جۆرە بە دوو (و) دەنووسرێ. (٢) کراوە وەک: (بۆن، چۆن، ڕۆن)، ئەم جۆرەش نیشانەی (٧)ی لەسەر دادەنرێ.

(ی) لەسەر دوو جۆرە: (١) درێژ وەک: (تیر، بیر، بی، زی)، ئەم جۆرە بەدوو (ی) دەنووسرێ. (٢) کراوە وەک: (تێر، دلێر، بێرە، کولێرە)، ئەم جۆرەش نیشانەی (٧) ی لەسەر دادەنرێ. (٣) خوار وەک:

(قوتیل)- کە ئەم خوارییە هەر لە (ی)ەکەوە نییە بەلکو لە یەککەوتنی (و) و (ی)ەکەوە پەیا دەبێ ، ئەم جۆرە (ی)ەش نیشانەی (٨)ی لەسەر دادەنرێ.

بۆ ئەوەی کە وتەی کوردی چۆن دەبێژرێ وا بنووسرێ و، وتن و نووسین لە یەک جیا نەبێتەوە، هەر پیتێک سەری ببێ (ه) ی پێوە دەنووسرێ وەک: (ڕەق، شەل، دەڵ) تا لە خوێندنەوەدا نەکرێن بە (ڕق، شل، دڵ).

ئەگەر خۆی (ه)ی پێوە بوو ئەوا دوو (ه)ی بۆ دەنووسرێ وەک:

(بەهبەه)، هەروەک (ه)ی سەرداریش بە دوو (ه)دەنووسرێ وەک:(هەرمێ، هەنار).

هەر پیتێک بۆری ببێ، (و)ی پێوە دەنووسرێ وەک: (قول، کون، کولک)تا لە خوێندنەوەدا نەکرێن بە (قل، کن، کلک). ئەگەر خۆی (و)ی پێوە بوو ئەو حەلە بەدوو(و) دەنووسرێ وەک: (قووڵ، پوول، موور)، ئەمە ئەگەر (و)ەکە قووچاو بوو. بەلام ئەگەر کراوە بوو وەک: (قۆڵ، پۆڵ، مۆر) بەیەک (و) دەنووسرێ، واتە نیشانەی (٧)ەکە لە جێی (و)ی دووەم دادەنرێ.

(و) ی بۆردار بە دوو (و) دەنووسرێ وەک: (ووڕە، ووزە، ووژە) و ئەگەر ئەم (و)ە بۆردارە (و)ێکی تری پێوە بوو ئەو حەلە بە سێ (و) دەنووسرێ وەک: (وو ون) بەمەعنا خوێن، چونکە ئەگەر بە سێ (و) نەنووسرێ دەبێ بە (وون) کە مەعناکەی جیایە.

هەر پیتێک ژێری ببێ (ی)ی پێوە دەنووسرێ وەک (سیروان، جیهان) و ئەگەر خۆی (ی)ی پێوە بوو ئەو حەلە بە دوو (ی) دەنووسرێ وەک (سیر، بیر، تیر).

(ی)ی ژێردار بە دوو (ی) دەنووسرێ وەک (ییێ) و، ئەگەر ئەم (ی) ە ژێردارە (ی) ەکی تری پێوە بوو ئەو حەلە بە سێ (ی) دەنووسرێ وەک بڵێیت (یی ی) کراوە زۆرە.

ئەو پیتانەی کە ژێری سووکیان هەیە وەک (برنج، ترنج، بزن)، (ی)یان پێوە نانووسرێ.

نووسینی کوردی تا ئێستا یەکی نەگرتووە و، هەر کەسە بە جۆرێک دەنووسێ، لەم ڕووەوە دوو بیروباوەڕ هەیە:

(١) هەموو وتەیەک بەجیا بنووسرێ وەک (بێ خود، بان گوش، بان گردێن، بن باخەڵ، بن قۆڵ، بن میچ، بەجێ هێشتن، پێ لێ هەڵ برین).

(٢) هەموو وتەیەک بەقەد تەوانا پێکەوە بنووسرێ، وەک: (بێخود، بانگوش، بانگردێن، بنباخەڵ، بنقۆڵ، بنمیچ، بەجێهێشتن، پێلێ هەڵبرین).

من نووسینی دووەمم پێ باشترە لەبەر گەلێ شت:

(١) کورتکردنەوەی وەخت، چونکە دەست کەمتر بەرز دەکەیتەوە و، زووتر شت دەنووسیت.

(٢) کورتکردنەوەی نووسراو، چونکە شتێک کە بەنووسینی یەکەم دوو دێر بێ، بەنووسینی دووەم دێڕ و نیوێکە.

(٣) فارسی- کە برای کوردییە- بە ئیملای دووەم دەنووسرێ، نابینیت (بێدل)- کە لە (بێ) و (دل) دروست کراوە و، (پیغامبر) کە لە (پیغام) و (بر) دروست کراوە و بەمەعنا پێغەمبەر و، بەیەکەوە دەنووسرێن.

(٤) ئەم وتانە کاری پەیویست (مصدری مرکب)ن، واتە هەرچەندە بەدیمەن چەند وتەیەکن و لێکدراون، بەڵام لە مەعنادا یەک وتەن، نابینیت؟ (پێلێ هەڵبرین) بەمەعنا مبالغەکردنە لە کارێکدا، (چاولێقووچان) بەمەعنا بەخشین و بووردنە، (بانگوش) بەمەعنا زەلامێکە کە بان بگێڕێ، (بنقۆڵ) بەمەعنا بێچوولەیەکی سێ سووچە کە دەکەوێتە بن دەستی کالاوە.

(٥) زانای بەناوبانگی کورد (یوسف ضیاپاشای خالدی) وتەی فەرهەنگە کوردییەکەی خۆی- کە ناوی (الهدیه الحمیدیه فی اللغه الکردیه)یە، بە ئیملای دووەمی نووسیوە وەک: (نیڤیکرن، هلهلوک)

(٦) نووسینی کوردی بە ئیملای دووەم گەلێ جوانتر و ڕێکوپێک ترە لە هی یەکەم چونکە ئەو بزڕبزڕ دەردەچێ و هیچی بەهیچییەوە نانووسێ.

(٧) ئەم وتانە لە لاتینیدا بەیەکەوە دەنووسرێن، کەوابوو تا ڕۆژێک دێ کە کوردی بەلاتینی بنووسرێ، با هەر لە ئێستاکەوە پێکەوە بنووسرێن.

## دەستووری زمانی کوردی

دەستووری زمانی کوردی بە (سەرف) و (نەحو)یەوە دەستوورێکی ئێجگار دووردرێژە، کتێبێکی دووسەد لاپەڕەییم تێدا نووسیوە. لەبەر ئەوە بە پێویستم نەزانی لێرەدا بەدووردرێژی باسی ئەو دەستوورە بکەین، بەڵام ئەوەندەی کە پێویست بێ بەم فەرهەنگە بەکورتی باسی دەکەین.

## وتە و لکەکانی

وتە (کلمە) وشەیەکە کە مەبەستێکی ببێ، وەک (دار، کار، ژن، من، برین، درین).

وتە سێ جۆرە: (١) ناو (إسم)، (٢) کردار (فعل)، (٣) پیت (حەرف).

ناو و پیت وتەن و، لەم فەرهەنگەدا دەنووسرێن، بەڵام کردار وتەیەک نییە کە لە فەرهەنگی کوردیدا بنووسرێ، چونکە بنەڕەتەکەی کە کار (مصدر)ە دەنووسرێ ئیتر پێویست بە نووسینی کردار نییە.

ناو لەسەر دوو جۆرە: (١) تێکرا (عام) وەک: (دار، بەرد، پیاو، ژن، گورگ، مەڕ). ئەمانە بە وتە دەنووسرێن لەم فەرهەنگەدا. (٢) تایبەتی (خاص) وەک: (نەریمان، سیروان، کرماشان).

ناوی مرۆڤ نانووسرێ، هەر وەک ناوی دێهات و جێگایانی کوردستان نانووسرێن. مەگەر لە حەلێکدا کە ئەو وتەیە مەبەستێکی تری ببێ، وەک: (بانە، دووکان، قامیش، گەلاڵە) کە لەگەڵ مەبەستەکەی خۆیاندا ناوی جێگایەکیشن لە کوردستاندا. لەم حەلەدا ناوی جێگاکەش دەنووسرێ. هەروا کردار (فعل) نانووسین؛ مەگەر لە حەلێکا کە بەمەعنا ناو (إسم) یش هاتبێ، وەک وتەی (بۆ) کە لە هەورامیدا بە مەعنای وەرەیە.

## کار (مصدر)

کار لەسەر پێنج جۆرە: (١) ئەلفی، (٢) تائی، (٣) دالی، (٤) واوی، (٥) یائی،، چونکە لەپێش نوونی (کار)ە و هەمیشە یەکێک لەم پێنج پیتە: (ا، ت، د، و، ی) دەبێ ببێ. ئینجا بەم بۆنەیەوە هەر یەکەی ناو دەبرێ بەیەکێک لەو پیتانە.

(١) کاری ئەلفی وەک: (برژان، بێژان، پێچان، سووتان).

(٢) تائی وەک: (نوستن، کوشتن، گرتن، کەوتن).

(٣) دالی وەک: (کردن، بردن، خواردن، مردن).

(٤) واوی وەک: (بوون، چوون، دروون، گورروون).

(٥) یائی وەک: (زانین، ڕوانین، درین، برین).

کار – بەهەر پێنج جۆرەکەیەوە –یا سادە (بسیط) دەبێ یا پەیوەست (مرکب). سادە، کارێکە کە تاقە وتەیەک بێ وەک (کار)ەکانی پێشوو.

پەیوەست، کارێکە کە دروست کرابێ لە دوو وتە وەک: (هەڵماڵین، داماڵین) یا لە سێ وتە وەک: (پێ لێ خستن، پیاهەڵگەڕان، چاولێقووچان) یا لە چوار وتە وەک: (پێ لێ هەڵبرین، جێ پێ لێژبوون، چەنە بە چەنەوێستان). ئەم پەیوەستانە تا بتوانین لە وتەی فەرهەنگەکەماندا تێکیان دەخەین و لە نووسیندا بەتاقە وتەیەک پیشانیان دەدەین وەک: (ڕەشبگیر، ڕەهێڵبوون، ڕەنگوڕێس) کە (ڕەش) بەدەم(بگیر)ەوە و(ڕەهێڵ) بەدەم (بوون)ەوە و (ڕەنگ) بەدەم (و)ەکەوە نووسراون.

پارچەی ئەم کارە پەیوەستانە، ئەوی ئیشوکار دەگەیەنێ وەک: (ماڵین، خستن، گەڕان، قووچان، برین، وێستان) بێ لەم وێنانەدا پێیان دەڵێین بەشی پەیدایی (جزئی حدثی)، ئەوانی تر وەک: (هەڵ، پێ لێ، پیاهەڵ، چاو لێ، پێلێ هەڵ) پێیان دەڵێین: بەشی پەیوەستی (جزئی ترکیبی).

بەشی پەیوەستی لە پێشەوە دەبێ وەک: (هەڵکردن)، لە دواوە دەبێ وەک: (کردنەوە)، لە هەردوو سەرەوە دەبێ وەک: (هەڵکردنەوە).

ئەو بەشە پەیداییییەی کە لە دواوە دەبێ هەمیشە (و) ێک دەبێ لە ناوەندی دوو (ە)دا وەک: (هاتنەوە، چوونەوە، خواردنەوە) و، ئەم (ە و ە)یە هەمیشە یەکێک لەم سێ مەبەستە دەگەیەنێ:

١– گەڕانەوە (عودت) وەک: (هاتنەوە، چوونەوە) بۆ شوێنێک کە لەوەوپێش لێی بووبێت.

٢– کردنەوە (تکرار)ی کارێک وەک: (دانیشتنەوە، هەستانەوە، نوستنەوە).

٣– بەرە بەرە (تدریج) و هێواشی وەک: (خواردنەوە)ی شتی شل قوم قوم و، (چوونەوە)ی بەفر بەرە بەرە و، (بردنەوە)ی یاری کەم کەم و بە دزە دزە.

ئەم بەشەیان – واتە ئەوەی کە بەشی پەیوەستییەکەی لە هەردوو سەرەوە بێ– بە وتە ناناسرێ و، لە فەرهەنگەکەدا نانووسرێ، چونکە ئەمە بەدەستوورێکی تێکڕایی دەزانرێ.

ئەو بەشی پەیوەستییەی کە لە پێشەوە دەبێ، لەسەر دەستوور و باوێکی تایبەتی نییە، بەڵکو لەسەر بیستنە و، چەند وتەیەکی

تایبەتێن کە پێش هێندێ کار دەکەون. ئەو وتانە ئەمانەن: (دا، ڕا، هەڵ، لێ، تێ، ڕێ، ڕۆ، ڕاو، سەر، پیا، تیا، پێ، تێک، پێک، هێ، جێ، فرێ، پێوە، بەجێ، ڕێ پێ، پێ لێ، ڕوولێ، ڕووتێ، ڕووهەڵ، چاو لێ، سەر لێ، پێ لێ دا، پێ لێ هەڵ، پێ لێ وەر).

| پەیوەستی | پەیدایی | پەیوەستی | پەیدایی | پەیوەستی | پەیدایی |
|---|---|---|---|---|---|
| دا | هێنان | ڕا | هێنان | هەڵ | هێنان |
| دا | هاتن | ڕا | هاتن | هەڵ | هاتن |
| لێ | کەوتن | پیا | کەوتن | تێ | کەوتن |
| لێ | دان | پیا | دان | تێ | دان |
| تێک | دان | سەر | دان | پێ | دان |
| تێک | خستن | سەر | خستن | پێ | خستن |
| ڕۆ | چوون | ڕێ | کەوتن | بەجێ | هێنان |
| ڕۆ | کردن | ڕێ | خستن | بەجێ | هێشتن |
| ڕاو | نان | هێ | نان | فرێ | دان |
| ڕووتێ | کردن | ڕوولێ | نان | پێ لێ | خستن |
| ڕێ پێ | بردن | تیا | چوون | پێ لێ | نان |
| ڕێ پێ | گرتن | تیا | مان | پێوە | بوون |
| چاو لێ | قووچان | پێک | هێنان | پێوە | کردن |
| پێ لێ دا | گرتن | پێ لێ هەڵ | برین | ڕوو لێ وەر | گێڕان |
| پێ لێ وەر | گێڕان | سەرلێ | بادان | چەنە بەچەنە | وێستان |

ئەم بەشە پەیوەستییانە هێندێکیان بەتەنیا مەبەست (معنی) دارن و، هێندێکیان مەبەستیان نییە، ئینجا هەر کامێکیان بێ کە لەگەڵ بەشی پەیداییدا یەک کەوتن، زۆرجار مەبەستێکی تر دەگەیەنن کە جیاوازە لە مەبەستی بەشەکان وەک: (سەرخستن، ڕاکردن) ئێستا لە یەکەمدا (سەر) مەبەستێکی هەیە، (خستن) یش مەبەستێکی هەیە، بەڵام کە لە یەک دران مەبەستەکەیان دەبێ بەمە کە یەکێک لە نزمییەکەوە شتێک بخاتە بەرزییەک.

لە دووەمدا (ڕا) مەبەستی نییە، (کردن) مەبەستەکەی ئەمەیە کە کارێک بکەیت، بەڵام کە پەیوەست کران مەبەستەکەیان دەبێ بەهەڕاکردن، ئینجا ئەمانە بە وتە دادەنرێن و لە فەرهەنگدا دەنووسرێن. زۆرجاریش مەبەستی پەیوەستەکە هەرمەبەستی پارچەکانێتی و مەبەستێکی زیاد ناگەیەنێ وەک:

(چوونە بازاڕ) ئەمە بە وتە دانانرێ.

پەیوەست یا ئاشکرا (صریح)یە یا بریتی (کنایە)یە، ئاشکرا ئەوەیە کە مەبەستێکی ڕاست و ڕەوانی ببێ، بریتی ئەوەیە کە لەلاوە مەبەستێک بگەیەنێ وەک: (دەست درێژ، دەست بلاو، دەست سپی).

زمانی کوردی زۆر دەوڵەمەندە بەبریتی و، هەر زمانێک وابێ ناسکتر و بەنەزاکەتترین زمانە، یەکێک ئەگەر ورد ببێتەوە لە وتەی (بەدەستگرتن، دەست بەئاو گەیاندن) تێ دەگا کە زمانی کوردی چەند نازک و بەرزە. لەبەر ئەمە هەر چێکمان دەست کەوتبێ لە بریتی کۆمان کردووەتەوە و، لەگەڵ وتەدا بە ڕیزکراوی نوسیومانن.

## کاری ڕیشەیی و دەستکردی

کاری ڕیشەیی (اصل) کارێکە کە لە بنەڕەتدا هەر کاربێ و، بەهۆی هیچ جۆرە شتێکەوە نەبووبێ بەکار وەک ئەو کارانەی پێشوو.

کـاری دەسـتکردیی (جـعل)ی ناو یا سـیفـەتێکە کـە بەپاشـەکەیەوە (یی) یا (ێتی) یا (ێنی)یا (ئایەتی) یا(هتی) بنرێ وەک ئەم وێنانەی خوارەوە:

| ناو | کار | کار | سیفەت | کار | کار |
|---|---|---|---|---|---|
| پیر | پیری | پیریێتی | چاک | چاکی | چاکێتی |
| کوڕ | کوڕێنی | کوڕێتی | سوور | سووری | سوورێتی |
| دوژمن | دوژمنێتی | دوژمنایەتی | جوان | جوانی | جوانێتی |
| دۆست | دۆستی | دۆستایەتی | باش | باشی | باشێتی |
| پیاو | پیاوەتی | | | | |
| ژن | ژنێتی | | | | |

هەر وتەیەک ئەگەر خـۆی بەکاردەهێنرا و لەگـەڵ (بوون)یا (کردن) یا هەردووکیـشیـاندا بەکار دەهێنرا، ئەو وتـەیە هەر خۆی بەو وتە دەناسـرێ و لەسـەری دێرەوە دەنووسـرێ و لەگـەڵ (بوون) و (کـردنا) لەناو ڕاڤـەکـەیدا دەنـووسـرێ وەک: (بچـووک، بچـووکـبـوونەوە، بچووککردنەوە) و (ئاشکرا، ئاشکرابوون، ئاشکراکردن). بەڵام ئەگەر وتەکە خۆی بەتەنیا بەکار نە دەهێنرا و هەمیشە لەگەڵ (بوون) یا (کردن) یا هەردووکیاندا بەکاردەهێنرا، ئەو حەلە لـەگەڵ (بوون) و (کردن)دا بەوتە دەناسرێ و لەسەری دێرەوە دەنووسرێ وەک: (تەمێ بوون) و (تەمێ کردن) چونکی (تەمێ) بەتەنیا نەبیستراوە.

یاخۆ بەتەنیاش بەکار دەهێنرا و لەگەڵ (بوون) و (کردن)یشدا بەکار دەهێنرا، بەڵام لەگەڵ (بـوون) و (کردن)دا مـەبەسـتێکی تریان بووە بێجگە لە مـەبەسـتـەکـەی خۆی. لەم حەلەشدا هەر بەجیا و لە سەری دێرەوە دەنـووسرێن وەک: (بەخت بوون) و (بەخـتـکردن) کە مەبەستێکی بریتییان هەیە کە لە (بەخت)دا نییە. زۆر جار ڕاڤەی وتەیەک دەکەین بە وتەیەکی وا کە دوو سێ مـەعنای هاتووە، وەک ڕاڤەی (وژاردن) بە (بژاردن). ئەمە مەعنای وایە کە ئەو وتەیەش ئەو دوو سێ مەعنایەی هاتووە.

بۆ ڕیزکردنی وتەی ئەم فەرهەنگە، لە پیـتی یەکەمەوە تا پیتی دوایی بەرچاو خراوە، هەر وەک پیتی سەر و بۆر (إعـراب)یش بەرچاو خـراوە. بەم ڕەنگە وتەی (ئاژاژک) لە پێـش (ئاژاژیی)یەوە و، (ئاژاڵ) لـە پێش (ئاژاوە)وە نووسـراوە. (ل)ی سـووک لەبەر ئەمـەی بێ نیشـانەیە پێش (ڵ)ی قەڵەو خراوە و بەم ڕەنگە نووسراوە: (گول) ئینجا (گوڵ) ئینجا (گۆل) ئینجا (گۆڵ). یاخۆ (پچکۆڵە) ئینجا (بچکۆڵە) و (بچکەلە) ئینجـا (بچکەڵە). هەروا (و)ی سووکی بێ نیـشـانە پێش (وٚ)ی نیـشـانەدار خـراوە و بەم ڕەنگە نووسـراوە: (کـون) ئینجـا (کـۆن) و (قـول) ئینجـا (قـۆڵ). بەم ڕەنگە هەمـوو خـوێندەوارێک زۆر بەئاسـانی دەتـوانێ هەمـوو جـۆرە وتەیـەک لەم فەرهەنگەدا بدۆزێتەوە بە بێ گیروگرفت.

## نیشانەکانی ئەم فەرهەنگە

هەمـوو وتەیەک لە سەری دێرەوە لەناو دوو کەوان ( )دا نووسـراوە، ئینجـا ئەگەر وتەکـە کوردی نەبوو بەم ڕەنگە لە زمـانێکی ترەوە وەرگیرابوو ئەوا لەلای ڕاستی کەوانەکەوە نوختەیەک دادەنرێ.

هەر وتـەیەک هەورامی بێ (هـ) بادینانی بێ (با) زازا بێ (ز) ئەردەڵانی بێ (د) لوڕ یا لـەک یا فـەیلی بێ، (ل) لە تـەنیـشـتی

چەپەوە دەنووسرێ، موکریانی و پشدەری و هەولێری و گەلێ شوێنی تر وەک وتەی خۆمان- کە کرمانجییە- هیچی بۆ نانووسین، چونکە زۆر لەیەک جیانین.

ئەگەر وتەکە دووسێ مەبەستی بوو هەر مەبەستەی هی شوێنێک لەم شوێنانە، ئەو حەلە ئەم نیشانانە لە دوای کەوانەکەوە نانووسرێ بەڵکو لەدوای تەواوبوونی مەبەستەکەوە دەنووسرێ و، ئەگەر دوو یا سێ مەبەست هی شوێنێک بوو لەو شوێنانە ئەو حەلە بۆ هەر مەبەستێک نیشانەکە دەنووسرێتەوە.

زۆر لە وتەکان گەلێ مەبەستیان بۆ نووسراوە، ئینجا ئەگەر لە ناوەندی مەبەستەکاندا (.) دانرا ئەوە مەبەستێکی ترە و، ئەگەر (؛) دانرا ئەوە لە جێی وتەی (دەبێژی) بەکار دێنرێ و، وێنەیەکی بەکارهێنانی ئەو وتەیە نیشان دەدا و، ئەگەر (،) دانرا ئەوە بەستنەوەی وتارێک بە وتارەکەی پێشووەوە دەگەیەنێ.

زۆر سوپاس بۆ کاک (مەلا محەمەدی کوردی) کە لەم فەرهەنگەدا زۆر یارمەتیی دام، جارێ جگە لەوەی کە سێ جار بۆی نووسیومەتەوە لە سەرەوە تا خوار، لە وتە دۆزینەوە و مەبەست لێکدانەوەشدا زۆر یارمەتیی داوم، بەڕاستی یارمەتییەکەی شایانی سوپاس و ستایشە.

هەروا سوپاس بۆ ئەو دۆست و برادەرانەی کە یارمەتییان داوم و وتەیان بۆ ناردووم نەخوازەڵا کاک شاکر فەتاح و جەمال نەبەز کە ئەویان (١٥٠) وتەی پشتکۆ و، ئەمیان (٤١٥) وتەی کوردی سووریەی بۆ ناردووم.

**محەمەدی خاڵ**

٣٠-٨-١٩٥٩م    ٢٦-١-١٣٧٩هـ

---

(١) سەرەتای فەرهەنگی (الياس انطوان الياس).

(٢) نشأة اللغة عند الانسان والطفل.

(٣) نشأة اللغة عند الانسان والطفل.

(٤) نشأة اللغة عند الانسان والطفل.

(٥) القضية الكردية نووسراوی دکتۆر (بەلەچ).

(٦) القضية الكردية.

(٧) سەرەتای فەرهەنگی شەمسەدین سامی.

(٨) سەرەتای فەرهەنگی شەمسەدین سامی.



ئا: پیتێکە لە وەرامی کەسێکدا بەکاردێنرێ کە بانگت بکا، یا پرسیارێکت لێ بکا، بەم ڕەنگە بلێت: تۆ خوێندووتە؟ تۆش دەڵێیت: (ئا)، واتە خوێندوومە. پیتی وریاکردنەوە.
(ئا): وەرە پیتی سەرسامی. (ئا) لە وەرامی کەسێکدا کە پێت بلێ فیسار کەس مرد.
ئاغا: (ئا) محەمەد واتە ئاغا محەمەد (د).
ئائل: ز. نارەوا.
ئائلبوون: ز. زۆرداریکردن.
ئائلی: ز. ستەم و زۆرداری.
ئاب: مانگی هەشتەم لە ساڵی ڕۆژی لە ناوەندی تەمووز و ئەیلوولدا کە سی و یەک ڕۆژە و، تا بیست و یەکی ڕۆژ لە کەلووی شێردایە، لەوە بەدوا دەچێتە کەلووی سونبولە.
ئابجی: د. خوشک.
ئابخانە: ئاودەستخانە.
ئابدەست: ئاودەستخانە.
ئابدەستخانە: ئاودەستخانە.
ئابروو: شەرم: فیسار کەس زۆر بێ (ئابروو)وە، واتە زۆر بێ شەرمە.
ئابڕووبردن: ڕیسواکردن.
ئابڕووچوون: ڕیسوابوون.
ئابووری: پاشەکەوتی.
ئابوونە: بەشداربوون لە ڕۆژنامە و گۆڤاردا.
ئاپ: ز. مام.
ئاپۆ: ز. خاڵ.
ئاتاج: نەدار و داماو.
ئاتاجی: نەداری و داماوی.
ئاتر: د. ئاگر.
ئاتوون: ز. توونی حەمام.
ئاتەشپەرست: کەسێکە کە ئاگر بپەرستێ.
ئاتەشخانە: جێگای ئاگری سەماوەر و حەمام.
ئاتەشکەدە: جێگای پەرستنی ئاگر.
ئاتەشگا: جێی ئاگری ئاگرپەرست. کێوێکی سەختە لە جوانرۆ.
ئاتەشەک: جۆرە برینێکی زۆر پیسە ئەندام دادەوەشێنێ. ئاگرە (د).
ئاتەشی: مەردوومی زۆر تووڕە و ترۆ. جۆرە گوڵێکە لە گوڵەباخ سوورترە بەڵام ئەم بۆنی نییە.
ئاتەک: تەنیشت.
ئاتی: د. زێڕ.
ئاجگی: ز. بەخیل.
ئاجیل: د. چەرەسێکە کە لە کۆبوونەوەدا دادەنرێ بۆ خواردن.
ئاخ: وشەی داخ و خەفەت لە کاتی ئازار و ئێشێکی ئەندامی، یا خەفەتێکی دەروونیدا بەکاردێنرێ. خاک (ز).
ئاخاتی: ز. ئاغایەتی.
ئاخافتن: قسەکردن (ز). ئاخاوتن.
ئاخاوتن: لنگدانی ولاخ و گێرانی.
ئاخایۆک: ز. بەیەکێک دەوترێ کە حەزی لە گەورەیی بێ بەبێ ئەوەی کە لێی بێ.
ئاخبان: ز. گڵەبان.
ئاخپۆل: ز. قوڕ هەڵشێلان بۆ سواغ و قوڕەکاری.
ئاخچەباش: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک یاسەمەن وایە دەکرێتە ناو دۆکوڵیوەوە.
ئاخر: ئیتر- (ئاخر) بڵێم چی. دوایی شت: سەد ساڵ بژیت (ئاخر) هەر دەمریت.
ئاخرکە: ز. جۆرە مێشوولەیەکی زۆر وردی بەئالۆشە.
ئاخرەمین: دواترینی شت.
ئاخری: لە دواییدا: نەمدەویست بچم بەڵام (ئاخری) هەر چووم.
ئاخسبات: ز. پازدە ڕۆژەی دوایی مانگی شوبات.
ئاخش: ز. ئۆخەیش.

ئاخلـە: لێـوارێکە کە بەگـردی شتـێکدا دروست بکرێ لە قـوڕ یا شتێکی تر. خەرمانەی مانگ.
ئاخلەدان: کۆبوونەوە بەگردی. پێچ خواردنی مار.
ئاخلێف ز. خاکەلێوە.
ئاخلیڤە: با. ئاخلێف.
ئاخنین: ترنجاندن و پەستاوتنی شتێک لەناو شتێکی تردا.
ئاخۆ: وتەی پرسیار: (ئاخۆ) کەی ڕۆژمان لێ بێتەوە؟
ئاخوا: ئاخۆ.
ئاخور: ئیتر.
ئاخۆران و بخۆران: پشێوی و ئاشووب لە ولاّتدا.
ئاخوڕ: ئاخلەیەکە لە قـوڕ دروست دەکرێ بەبەرزییەوە بۆ ئەوەی کە ولاّخ ئالیکی تێدا بخوا. تەویلە (ز).
ئاخوون: پێشەوای ئایینیی شیعە.
ئاخویرک: ز. ئاخرکە.
ئاخەفتن: ئاخافتن.
ئاخ هەڵکێشان: وتنی ئاخ لە خەفەتدا.
ئاخێزکردن: هەستان و چوون بۆ شوێنێک.
ئاخیە: د. ئەو سنگەیە کە لە تەنیشت ئاخوڕەوە دادەکوترێ.
ئاخین: ز. ئاخ هەڵکێشان.
ئادار: مانگی ئازار.
ئادان: ز. زەوی بەپیت.
ئادانی: ز. بەپیتیی زەوی.
ئادوودە: ز. قامیشێکی درێژە ئاسنێک بەنووکەکەیەوەیە بنمیچی خانووی پێ پاک دەکرێتەوە.
ئادەکردن: ز. پاککردنەوە.
ئادەم: باپیرە گەورەی ئادەمی.
ئادەمی: نەتەوەی ئادەم.
ئادەمیزاد: ئادەمی.
ئادێ: هـ. ئەوان.
ئادیان: ز. تیرەیەکە لە ناوچەی بەروار.
ئار: ئاگر. ئارد (ز).
ئارا: نـاوچە و مـەیدان: فـیـسـار کـەس لەم (ئارا)یەدا نیـیـە. وتەیەکە دەنووسێ بەدوای هێندێ وشەوە، مەبەسی ئارایش و جوانکردن دەگەیەنێ: فیسار کەس بەزم (ئارا) یا مەجلیس (ئارا)یە.
ئاراستن: ز. خستنە پشتگوێ.
ئاراڤ: ز. ئاراو.
ئارام: ئۆقرە و دان بەخۆداگرتن.
ئارامگا: شـوێنێکە کە مـەردووم ئارامی تێدابگرێ. بریتـییـە لە گۆڕ: ئەمە (ئارامگا)ی فیسار کەسە واتە گۆڕی ئەوە.

ئارام گرتن: ئۆقرە و دان بەخۆداگرتن.
ئارام هەڵگیران: نەمانی ئۆقرە.
ئاران: د. زەمینی نەرمان.
ئاراندن: ز. ئێش و ئازار.
ئاراو: نـۆرەیەک لە کـەفـاو و سـابووناو کـە بەرگ و کـاڵای پێ دەشۆردرێ.
ئارایش: جوانی و ڕازاوەیی شت: فیسار کەس بە(ئارایش)ە.
ئارایشت: ئارایش.
ئارایشدان: ڕازاندنەوە و جوانکردنی شت.
ئارایشکردن: ئارایش دان.
ئارایشکەر: ئافـرەتێکە کـە ئـارایشی خـۆی بدا. ئافـرەتێکە کـە ئارایشی ئافرەتی تر بدا.
ئارایشگەر: د. کەسێکە کە ئارایشی یەکێکی تر بدا.
ئارخاڤک: ز. جۆرە ناوساجی و کولێرەیەکە کە شەکر و ڕۆنی لێ درابێ.
ئارد: هاڕواوی دانەوێڵە.
ئارداوێژ: ئەو ئاردەیە کە بەرداش لە سووڕانەوەدا فڕێی دەدا.
دەم و پل: فیـسـار کـەس (ئارداوێژ)ێکی خۆش یا ناخۆشی هەیە، واتە دراوی قسەی خۆش یا ناخۆشە.
ئاردپێچ: ز. جۆرە حەلوایەکە لە ئارد دەکرێ.
ئاردکێش: دارێکی درێژە تەختـەیەکی پانی بەسـەرەوەیە، ئاشـەوان ئاردی پێ ڕادەکێشێتە دواوە.
ئاردمـاڵک: شـتـێکە لە دوای تەواوبوونی باراش دەوروپشـتی بەرداشی پێ دەماڵرێتەوە.
ئاردن: هـ. هێنان.
ئارد و ڕۆن: د. ئاردەوا.
ئاردوو: ز. ئاگرکەوتنەوە.
ئاردەبارە: ئاردێکە خاوەن باراش بەخۆشی خۆی دەیدا بەئاشەوان و بۆی دەکاتە ناو (قووڵکە)وە.
ئاردەشـان: ئارداوێژ. شـتـێکە ئارد لە بەرداش دوور دەخـاتەوە لە کاتی هاڕینیدا (د).
ئاردەمشار:. ئاردێکە کە لە دەمی مشار دەکەوێتە خوارەوە.
ئاردەوا: پەڵوولە.
ئاردەوارە: ئاردەبارە.
ئاردی: ز. ئاردەوا.
ئاراسـتـە: شـتـێکە کـە بەرامـبـەر بە شـتـێکی تر کـرابێ، (ئاراسـتـەکـردن) بەرامـبـەرکـردنی شـتـێک بە شـتـێک بۆ تێگرتنی.
ئارۆ: د. ئەمڕۆ.
ئارزەن: ز. ئێسقانی چەناگە.

ئارزی: ز. ئارەزوو.
ئارژنگ: دارێکە وەک بەلالووک داردەستی لێ دروست دەکرێ.
ئارسم: ز. هەلامەت.
ئارسمی: ز. کەسێکە کە تووشی هەلامەت بووبێ.
ئارگا: هـ. ئاگردان.
ئارگۆن: ز. شتێکە کە ڕەنگی وەک ڕەنگی ئاگر وابێ.
ئارمانج: ز. ئامانج.
ئارمووش: ئاوریشم.
ئارنگ: ز. جۆرە نەخۆشییەکە تووشی بزن و مەڕ دەبێ.
ئارۆ: هـ. ئەمڕۆ.
ئاروانە: ز. حوشتری مێی چوار ساڵانە.
ئاروفتە: د. تەنراوێکە کە چووبێ و تانوپۆی دەرکەوتبێ. دیواری داڕووخاو.
ئارۆک: ز. جۆرە کفتەیەکی پانە وەک کولێرە لە ساوەر و گەنمەکوتاو دروست دەکرێ.
ئاروو: ز. خەیار.
ئارووشک: ز. پژمین.
ئاروێ: ئاروو.
ئارهان: ز. ئازار بەهوێ ئاگرەوە.
ئارهاندن: ز. داخکردن.
ئارهایی: ز. ئازارێکی هەمیشەییە لە ئەندامێکدا.
ئارەزوو: ویستنی شتێک و دڵ بۆچوونی، (ئارەزووکردن) حەزکردن لە شت و دڵ بۆچوونی.
ئارەزوومەند: کەسێکە کە زۆر دڵی بە شتێکەوە بێ.
ئارەزوومەندی: زۆر دڵبوون بە شتێکەوە.
ئارەق: ئاوێکە لە بن مووی ئەندامی گیاندارەوە دێتە دەرێ لە گەرماندا. ئاوێکی سپیی ڕوونە بەجۆرێکی تایبەتی لە هێندێ شت دەگیرێ و، گەلێ جۆرە هێندێکیان سەرخۆشی دەدەن.
ئارەقخۆر: کەسێکە کە ئارەق خواردنەوەی کردبێ بەخوو.
ئارەق دەردان: ئارەقکردنەوە.
ئارەقفرۆش: کەسێکە کە هەر ئارەق بفرۆشێ.
ئارەقکردن: کردنی ئارەقی زۆر لە نەخۆشیی گرانەتادا و، لەش سووکبوون و ڕزگاربوون لێی.
ئارەقکردنەوە: هاتنە دەرەوەی ئارەق لە ئەندام.
ئارەقگرتن: گرتنی ئارەقی هێندێ شت بەجۆرێکی تایبەتی.
ئارەقگیر: ژێرزین.
ئارەقە: ئارەقی جەستە. مەهاری ولاخ.
ئارێ: ئەرێ.
ئارێخ: ز. مێخ زنجیرێکە کە ولاخی پێ دەبەسترێتەوە.
ئارێنج: ز. جۆرە دومەڵێکە لەبن باخەڵ دێ.
ئارینۆک: لەتکەنۆک.
ئاری: ز. خۆڵەمێش. بەشێکی زۆرە لە ئادەمیزادی سپی پێست کە کوردیش دەچێتەوە سەر ئەو.
ئارێ: پیتی سەرسووڕمان.
ئارێ: لە وەرامی یەکێکدا کە بڵێ من ناخوێنم.
ئاز: ز. ئازا. ڕاست. ساخ.
ئازا: گیانداری نەترس. گیانداری خێرا لە کارێکدا: (ئازا) کە، واتە خێرا کە. گوێزی ساخی پڕ.
ئازاد: سەربەخۆ.
ئازادخوا: ئازادخواە.
ئازادخواە: کەسێکە کە ئارەزووی سەربەخۆیی بێ.
ئازادخواهی: ئارەزووکردنی سەربەستی.
ئازادخوایی: ئازادخواهی.
ئازادکردن: خۆشبوون لە یەکێک کە مافێکت بەسەریەوە بێ، بەرەڵاکردنی بەندەیەک کە کڕیبێتت بەڕەنگێکی وا کە ئیتر بتوانێ ئیش بکا بۆ خۆی.
ئازادە: ئازاد. فیسار کەس (ئازادە)یە، واتە سەربەستە.
ئازادی: سەربەستی و سەربەخۆیی.
ئازادیخواە: ئازادخواە.
ئازار: ئێشی ئەندام. مانگی مارت کە سی و یەک ڕۆژە.
ئازاردان: ئێش گەیاندن بە شتێک.
ئازارسی: د. دەردەبارێکە.
ئازاڵە: د. سۆختی زستان.
ئازایی: نەترسی و بێباکی لە شت.
ئازراندن: ز. ئازاردان.
ئازری: ز. برینێکە کە کێمی تێ زابێ.
ئازنگ: ز. خانوویەکە کە لەسەر یەک تاوێرەبەرد دروست کرابێ.
ئازوباز: ئۆباڵ: (ئازوباز)ی تۆم بە مل.
ئازوبەزە: ئازوباز.
ئازووخە: پێ بژیوێکە کە هەڵبگیرێ بۆ خواردن.
ئازووقە: ئازووخە.
ئازەب: عازەب.
ئازەپ: ز. بەندەی زەڕ خریدە.
ئازیز: خۆشەویست.
ئاژاژک: باوێشک.
ئاژاژی: ئاژاژک.
ئاژاڵ: مەڕ و ماڵات و گا و گۆتاڵ. سەوزەگیا و لەوەڕ.
ئاژاڵدار: خاوەن ئاژاڵ.
ئاژان: د. پۆلیس.

ئاژاوڵە: د. ئاژاوە.
ئاژاوە: پشێوی و ناکۆکی.
ئاژنی: ز. مەلەکردن.
ئاژنین: چیلکەکـــردن بەناوەندی دانددا. ســـووژن کـــردنی زۆر بەشتێکدا، داخستنی دەرگا: دەرگاکە (ئاژنە) واتە دایخە. داکەندنی کاڵا: کراسەکەم (ئاژنی) واتە دام کەند (ل).
ئاژۆ: ز. شوێن پێ هەڵگرتن.
ئاژۆتن: ز. هەڵکوتانە سەر شتێک.
ئاژۆدان: لەوەڕاندنی ئاژاڵ بەشەو: ئەو ڕانە (ئاژۆ بدە).
ئاژووان: لێخورین.
ئاژوین: بڵاوبوونەوەی شـــتـــێک لە شـــوێنێک: ئەو ڕانە لەو پاوەندەدا (ئاژین) بووە. هاژین.
ئاژینە: د. چەقچەقەی ئاش.
ئاس: جۆرە مقەبیایەکە قوماری پێ دەکرێ.
ئاسا: پیـتێکە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بە(مُشَبَّە بە): نەریمان (ئاسا) ئازا بە، واتە وەک ئەو ئازا بە.
ئاسان: کاری سووکی بێ گیروگرفت.
ئاسانە: جێی کەوش داکەندن لەبەر دەرگادا.
ئاسانی: سووکی و بێ گیروگرفتیی کاروبار.
ئاساو: هـ. ئاش.
ئاسایش: حەسانەوە و ئارامگرتنی گیاندار. بێ ئاژاوەیی.
ئاسایی: ئاسا: خۆت (ئاسایی) داوێنم لێ کرد بەلادا.
ئاست: عاست.
ئاستان: ئاسانە.
ئاستانە: دەرماڵ: خۆی خستە (ئاستانە) کەت.
ئاستن: د. هێشتنەوە.
ئاستەر: ئاسەر.
ئاستەم: عاستەم.
ئاسرم: هەڵامەت.
ئاسـرمـە: د. تیلـمـەیەکی پانە لە کـورتان دەکـەوێتـە سـەر کـلکی وڵاخ.
ئاسک: گـیـاندارێکی چاوڕەشی جـوانی خـێرایە لە (مـەڕەسـوور) پچووکترە.
ئاسکە زەڕینە: شــتــێکە لە وێنەی ئاسکێکی پچکۆلە لە پەڕۆ دروست و ڕەنگاوڕەنگ دەکرێ، منداڵ یاری پێ دەکات.
ئاسمان: لای هەرە ژوورووی سەرت.
ئاسـمـان و ڕێسـمـان: وتەیەکە بەکـاردێنرێ بۆ جـیـاوازی و دووری دوو شت لە یەکەوە: ئەمە و ئەوە (ئاسـمان و ڕێسـمان)ە واتە زۆر لە یەکەوە دوورن.
ئاسمانە: مەلاشو لەناو دەمەوە. بنمیچ.
ئاسمانی: جۆرە ڕەنگێکی شینی کاڵە.
ئاسمێن: ز. یاسەمەن.
ئاسن: جۆرە کـانێکە لـە زەوی دا دەردەهێنرێ و بەئاگر قاڵ دەکرێ و گەلێ شتی لێ دروست دەکرێ.
ئاسنجاو: قاپ و قاچاخی مسین.
ئاسندرک: دڕکە ئاسنینە.
ئاسنفرێن: د. موقناتیس.
ئاسنگەر: کەسێکە لە ئاسن شت دروست بکا.
ئاسنگەری: خەریکبوون بەپیشەی ئاسنەوە.
ئاسنی سارد کوتان: بریتییە لە خەریکبوون بەکارێکەوە کە تیایدا سەر نەکەویت.
ئاسنی: شتێکە لە ئاسن دروست کرابێ.
ئاسنینە: ئاسنین.
ئاســـۆ: ملە. جـــێگای هەڵاتن یا ئاوابوونی ڕۆژ و مـــانگ و ئەستێرە.
ئارمایی. ڕووناکی.
ئاسۆک: سێبەر.
ئاسۆگە: ئاسۆ. ئەوپەڕی هەنای چاو لە ئاسۆدا (د).
ئاسوودە: گیانداری بێ خەفەتی حەساوە.
ئاسوودەیی: بێ خەفەتی.
ئاسەر: د. بەری کاڵا. پەڕاوێزی کەوا.
ئاسیاو: ئاش.
ئاسیاوان: ئاشەوان.
ئاسیاوبازی: د. ئاشە بەتەندوورە.
ئاسیو: چورتم و چەپووکی ڕۆژگار.
ئاش: جێی هاڕینی دانەوێڵە و کرە. شۆ: ئەم کاڵایە بە(ئاش)ە، واتە شۆدارە. چێشت (د).
ئاشاخە: میوەی کۆنی ڕزیو.
ئاشـانە: دە یەکی مـزی ئاشـە کە ئاغـا لە خـاوەن ئاشی دەسـێنێت بەئاردی یا بەدراوی.
ئاشبگیر: تاڵانکردنی ئاش لەلایەن جەردەوە.
ئاشبوون: ز. ئاشتبوونەوە.
ئاشبەتاڵ: وتـەیەکە ئاشـەوان بەدەنگی بەرز دەیڵێ لە کـاتێکدا کە ئاشەکەی دانی نەمابێ بۆ ئەوەی کە باراشی بۆ بەرن.
ئاشپەز: د. چێشتکەر.
ئاشپەزخانە: د. چێشتخانە.
ئاشت: کـەسێکە کە لە گـەڵتـدا ڕێک بێ، (ئاشـتـبـوونەوە) یەک کەوتنەوەی دوو کەس لە دوای ناکۆکییان.
ئاشتکردنەوە: یەکخستنەوەی دوو کەس لە دوای ناکۆکی.
ئاشتێنی: ئاشتی.

ئاشتی: ڕێکی و دۆستایەتی.
ئاشتیخواز: کەسێک کە حەزی لە ئاشتی بێ.
ئاشچی: ئاشپەز.
ئاشخانە: چێشتخانە.
ئاشدار: د. شتی شۆدار.
ئاشدۆڵ: ئاشبەتاڵ.
ئاشرمە: هێشرمە.
ئاشک: ز. معدە.
ئاشکرا: شتی دیاری نمایان.
ئاشکرابوون: دەرکەوتنی شتی نادیار.
ئاشکراکردن: دەرخستنی شتی نادیار.
ئاشگێڕ: ئەندازەیەکە لە ئاو کە ئاش بگێڕێ.
ئاشماست: د. دۆکولێو.
ئاشنا: ناسیاوی تێکەڵ.
ئاشناس: د. ئاشنا.
ئاش نانەوە: دروستکردنی ئاش و خستنەگەڕی.
ئاشنا و ڕۆشنا: کەسانێکن کە تێکەڵ بن لەگەڵتدا.
ئاشنایەتی: شناسی و تێکەڵی.
ئاشنایی: ئاشنایەتی.
ئاشۆ: د. پشێوی.
ئاش و پاشو: قسەی شڕم بڕم.
ئاش و ماش: وتەیەکە منداڵان بەکاری دەهێنن لە کاتی قسە بڕینەوەیاندا لەگەڵ یەکتری.
ئاشوب: جەنگ و کێشەی گەورە.
ئاشووبگێڕ: کەسێکە کە زۆر ئاشووب هەڵگیرسێنێ.
ئاشووبگێڕان: ئاشووب نانەوە.
ئاشووب نانەوە: هەڵگیرساندنی ئاشووب.
ئاشووژن: ز. بەنێکە دەمی جەواڵی پێ دەدروێ.
ئاشەوستا: کەسێکە کە وەستابێ لە سازکردنی ئاشدا.
ئاشە بەتەندووره: یارییەکی دوو دەستەییە، دەستەیەکیان بەپێوە سەر بەیەکەوە دەنێن و یەکێکیان پاسیان دەکات و، دەستەکەی تر لە دەرفەتدا باز دەدەنە سەر کۆڵیان تا تێ دەکەون.
ئاشەبەتەندووری: ئاشەبەتەندووره.
ئاشەتەندووره: ئاشێکە نێوەکەی وەک تەندوور وایە بەبەرد و قسڵ دروست دەکرێ بۆ ئەوەی کە بەئاوێکی کەم بگەڕێ.
ئاشەتەندووری: ئاشەتەندووره.
ئاشەڤان: ز. ئاشەوان.
ئاشەوان: کەسێکە کە هەمیشە بەسەر ئاشەوە بێ و باراش لێ بکا.

ئاشێ: ز. کوێرەوەری.
ئاشێر: کەسێکە باراش کۆبکاتەوە و بیبا بۆ ئاش بۆ هاڕینی.
ئاشێفکرن: ز. هەڵکۆڵینی بنکی سەوزایی و کشتوکاڵ بۆ بەهێزبوونی.
ئاشێگە: ز. شوێنی سەختی ڕەق لە زەوی.
ئاشێو: د. قۆرت و بەڵا.
ئاغا: وتەیەکە کە بەهێندێ پیاوی گەورە دەوترێ.
ئاغابانوو: جامانەی سەر.
ئاغاژن: ژنی ئاغا.
ئاغایانە: شتێکە کۆدەکرێتەوە بۆ ئاغا.
ئاغایەتی: بوونی یەکێک بەئاغا.
ئاغزە: کاغەزێکی پێچراوەیە دەخرێتە قنگی جگەرەوە.
ئاغڵەویک: ز. تاوەی ڕۆن تێدا داخکردن.
ئاغە: ئاغا.
ئاغەبانوو: ئاغابانوو.
ئاغەژن: ئاغاژن.
ئاغەڵ: جێی داکردنی ئاژاڵ لە زستاندا.
ئافتابە: ئافتاوە.
ئافتاو: ڕۆژێکە کە بەئاسمانەوەیە. هەتاو.
ئافتاوگەردان: خێوەتی بچووک کە لەگەڵ خۆتدا بیگێڕیت بۆ هەڵدان.
ئافتاونیشان: بلوورییەکی سپیی ئەستوورە، وێنەی مەسینەیەکی پێوەیە.
ئافتاوە: مەسینە.
ئافتاوی بوون: د. ئاشکرابوون.
ئافتووش: ز. خۆهەڵقورتاندن لە کاری مەردوومدا.
ئافر: ز. ئاخوڕ.
ئافڕ: ز. ئاخوڕ.
ئافرەت: وتەیەکە بەکاردێنری بۆ ژن و کچی گەورە.
ئافشووژن: ز. ئاشووژن.
ئافەڕۆز: هـ. هەڵاتنی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە.
ئافەرین: وتەی پەسندکردن.
ئاڤ: ز. ئاو.
ئاڤا: ز. ئاوا.
ئاڤار: ز. چەرمی گیراوەی ئاژاڵ.
ئاڤاهی: ز. ئاوایی. کۆشک.
ئاڤپڤاز: ز. پیازاو.
ئاڤپەنگ: ز. ئاوی باران. گومێکە کە باراناوی تێدا کۆبێتەوە.
ئاڤخیز: ز. ئاوێکە کە لەسەرخۆ بڕوا.
ئاڤدار: ز. جۆرە دارێکە.

ئاڤدانک: ز. دەفری ئاو.
ئاڤدۆنک: ز. شۆربای بێ تام.
ئاڤدەڤ: ز. مەتارە.
ئاڤدین: ز. تۆڵەسەندن.
ئاڤرێژ: ز. ئاودەستخانە.
ئاڤرمیش: ز. ئاوریشم.
ئاڤزەلێلک: ز. نەخۆشی ئاوبەند.
ئاڤزەمکی: ز. شتێک یا قسەیەک کە درەنگ بگات.
ئاڤزێم: ز. کانیاوێکە کە هەر لە بەهاردا بژیەتەوە.
ئاڤزیم: ز. ئاڤزێم.
ئاڤژەن: ز. مەلەوان.
ئاڤژەنی: ز. مەلەوانی.
ئاڤس: ز. ئاوس.
ئاڤسین: ز. ئاوسبوون.
ئاڤشـۆ: ز. ئەو ئاوەیە کـە لە پاش شـوشـتنی قـاپ و قـاچاخ دەمێنێتەوە.
ئاڤشیز: ز. ئەو ئاوەیە کە لمی تێدابێ.
ئاڤشیلە: ز. ئاوی بەرسیلە.
ئاڤکینە: ز. مەسینەی شووشە.
ئاڤگیر: ز. شوێنێکە باراناوی تێدا بمێنێتەوە تا درەنگ.
ئاڤرێ: ز. لارێ.
ئاڤیاری: ز. بە سایەی.
ئاڤێتن: ز. هاویتن.
ئاڤی: ز. کشتوکاڵی ئاوی. زەمینی بەراو. شەونم، ئاوارە.
ئاڤیتن: ز. هاویتن.
ئاقار: عاستی شت.
ئاقید: ز. دۆشاوی خەست.
ئاقیق: بەردێکی سووری جوانی بەنرخە.
ئاکام: ئەنجام.
ئاگا: ئادەمیزادی وشیار. خەبەردار لە شت.
ئاگابوونەوە: بێداربوونەوە لە خەو.
ئاگـادار: کـەسـێکە کـە چاودێری و وریایی شـتـێک بـکات: خـوا ئاگادارت بێ. کەسێکە کە خەبەردار بێ بە شتێک: فیسـار کەس زانایەکی ئاگادارە، واتە خەبەردارە بەگەلێ شت.
ئاگاداری: سەرپەرشتی و چاودێریکردنی شتێک.
ئاگـا لـێ بوون: ئاگـاداریکردنی شـتـێک. ئاگـاداری بە شـتـێک: ئاگام لێی نییە.
ئاگاه: ئاگا.
ئاگاهی: هوشیاری و خەبەرداری.
ئاگایی: ئاگاهی.
ئاگر: شتێکی سووری سووتێنەری ئاشکرایە.
ئاگرباران: بریتییە لە ئاشووب و پشێویی رۆژگار.
ئاگربازی: یاریکردن بەئاگر.
ئاگربڕ: بەرهەڵستکردنی ئاگر بۆ ئەوەی کە نەتەنێتەوە. قسـەکردن بەجۆرێکی وا کە شتێکی خراپ لە خۆت دوور بخەیتەوە.
ئاگربەربوونەوە: پەیدابوونی ئاگر لە شوێنێک.
ئاگر بەردانەوە: ئاگرنان بەشوێنێکەوە کە بیسووتێنێ.
ئاگرپارە: مەردوومی زرنگی زیرەک.
ئاگرپارێز: ز. ئاگرپەرست.
ئاگـر تێ بەربوون: بەربوونی ئاگـر لە شـتـێک. بریتـیـیـە لە رق هەستان و ئالۆزبوون.
ئاگرخۆش: ز. مەردوومی قسەخۆشی گاڵتەچی.
ئاگردان: قووڵکەیەکە ئاگری تێدا دەکرێتەوە. تەقاندنی چەک.
ئاگردانک: ز. ئاگردان.
ئاگرکردن: خۆشکردنی ئاگر. بریتییە لە ئاشووب نانەوە.
ئاگرکردنەوە: هەڵگیرساندنی ئاگر.
ئاگرکوژ: ز. کەسێکە کە ئاگر بکوژێنێتەوە.
ئاگرکەوتنەوە: ئاگر بەربوونەوە.
ئاگرگرتن: بریتییە لە تووڕەبوون. داگیرسانی ئاگر.
ئاگرگووشک: ز. ئێسقانی چەناگە.
ئاگـرگـەشکەرە: د. شـتـێکە لە تەل دەتەنرێ و زریزەیەکی درێژی پێـوەیە خـەڵـووز و ئاگـری تێ دەکـرێ و بەهەڵسـووڕاندنی دەگەشێتەوە.
ئاگرگەشکەرەوە: ئاگرگەشکەرە.
ئاگرگیرە: د. دەستەچیلە.
ئاگرناک: ز. مەردوومی تووڕە و تڕۆ.
ئاگرنانەوە: ئاگر بەردانەوە.
ئاگرۆچکە: ئاگری پچووکی کز.
ئاگرۆک: ز. مـەردوومی دووزبانی ئاشووبگێڕ. شەرایەکە دەدا لە مەرەزە.
ئاگرە: جۆرە برینێکە بەدەموچاو هەڵدەپەڕێ. جۆرە یارییەکی دوو دەستەییە.
ئاگری ژێر کا: بریتییە لە یەکێک کە لە ژێرەوە بەنهێنی ئاشووب بنێتەوە.
ئاگرین: شتێک کە زۆر گەرم بێ وەک ئاگر.
ئاگە: هـ. ئەوێ.
ئال: پەنجەی (بالابەرزە)ی دەست.
ئاڵ: جـۆرە ڕەنگێکە وەک گـوڵاڵـەسـوورە. جـۆرە نەخـۆشـیـیـەکـە تووشی هێندێ زەیستان دەبێ و دەیکوژێ.
ئالاّ: قەڵەمی نووسین. بەیداخ.

ئاڵئاڵ: ز. گیایەکی بۆنخۆشە.
ئالاستن: ز. لستنەوە.
ئالان: پێچخواردنی دوو شت بە یەکدا.
ئالاندن: بادانی دوو شت بە یەکدا.
ئالانن: ئالاندن.
ئالاو: ئاڵۆزکاو. هالاو.
ئالا و والا: ئاڵ و والا.
ئالایش: ز. کۆبوونەوە لە شەودا بۆ ڕابواردن.
ئالایش: د. ئارایش.
ئالایی: د. ڕەنگاوڕەنگ.
ئاڵبردنەوە: دووچاربوونی زەیستان بەنەخۆشی (ئاڵ).
ئاڵبوونەوە: سڕبوونی ددان بەهۆی زۆر خواردنی شتی ترشەوە.
ئاڵتوون: زێڕ.
ئاڵتیرەم: شەست و چوار یەکی حوقە.
ئاڵخواج: پەنجەی دۆشاومژە.
ئاڵدووز: شتێکە کە ڕووکەش کرابێ بە زێڕ یا بە زیو یا بە شتی تر بۆ جوانی.
ئاڵدووزکاری: ڕووکەشکردنی شت بە زێڕ یا زیو و یا شتی تر.
ئاڵدووزکردن: ئاڵدووزکاری.
ئاڵشت: د. کڕین و فرۆشتن. گۆڕینەوەی شت بە شت.
ئاڵف: ئالیک. پاوەن.
ئاڵفجاڕ: د. شوێنێکە لەوەڕی زۆری بێ.
ئاڵقاڕێز: د. ئەڵقەڕێز.
ئاڵک: د. ئاڵوو.
ئاڵگۆشت: ز. نەخۆشـیـیـەکـە تووشی ڕەشـەوڵاخ دەبێ بەتایبـەتی کەر و ئێستر.
ئالنگ: ئاڵوو.
ئاڵۆ: خاڵۆ.
ئاڵوباڵوو:جۆرە گێلاسێکی دەنک وردە.
ئاڵوبوخارا: د. هەڵووژەڕەشە.
ئاڵ و بۆڵ: بەرسیلەیەکە دەنکە دەنکە شیرین بووبێ.
ئاڵ و بۆڵبوون: بوونی بەرسیلە بەئاڵ و بوڵ.
ئاڵو بەلاڵووک: د. بەلاڵووک.
ئاڵودار: داری دارەڕا.
ئاڵۆز: گیـانداری تووڕە و تـڕۆ. کـاتی سـەرمـا و وەیشـومـە: ئیـمـڕۆ زۆر (ئاڵۆز)ە.
ئاڵۆزان: بریتییە لە تووڕەبوون. ئاڵۆزکان.
ئاڵۆزاو: ئاڵۆزکاو. ئاڵۆز.
ئاڵۆزکان: شێوان و تێکچوونی بەن و دەزوو و شتی تر.
ئاڵۆزکاو: هەوداى تێکەڵاو.
ئاڵۆزکاوی: عاستی ئاڵۆزکانی شت.
ئاڵۆش: خارشتی جەستە.
ئاڵۆشاوی: شـتـێکە کە ئاڵۆش پەیدا بکات. شـتـێکە کە ئاڵۆشی ببێ. ئادەمیزادی خونک.
ئاڵۆشدار: ئاڵۆشاوی.
ئاڵوگۆڕ: گۆڕینەوەی شتێک بە شتێک.
ئاڵوو: چەند گـرێیـەکی بچووکـە لەژێر شەویلە و هێندێ جومگەی گیاندارا لە لای نەخۆشیی لایەک لە ئەندام خوێنی پیس لەو ئاڵووانەدا کـۆ دەبێـتـەوە و ئـازار پەیدا دەکـات: (ئاڵوو)م کـەوتووە، یا (ئاڵوو)ی برینەکـە داویەتیـیـە بن باخـەڵم. ئاڵوباڵوو.
ئاڵووالا: کالای ڕەنگاوڕەنگ.
ئاڵووچە: ز. هەڵووژە.
ئاڵوودە: گیرۆدەی شتێک: فیسار کەس (ئالوودە)ی جگەرەیە.
ئاڵوودەیی: گیرۆدەیی.
ئاڵووز: ز. خەم و خەفەت.
ئاڵووکەوتن: ئازار گەیشتن بەئاڵووی مل بەهۆی سەرینی خراپەوە.
ئاڵوولە: ز. باریکە کۆلان. پیاوی بێ شەرمی بێ ئابڕوو.
ئاڵە: نەخۆشییەکە تووشی ئافرەت و مـاین دەبێ، ئەندامیـان پەڵە پەڵە دەکات.
ئاڵەت: گیایەکی گەرمیانییە بەرێک دەگرێ دەنکەکەی ڕەش و خڕ و تیژ و توندە، دەکرێتە ناو هێندێ خواردمـەنییـەوە. پارچەی وردی دار لە شووشەکاری و پەنجەرەدا.
ئاڵەتکاری: خـــەریکبـــوون بەدروســـتکردنی ئاڵەتی ورد لە دارتاشیدا.
ئاڵەتە کێویلە: گیایەکی تیژ و توندی بۆندارە.
ئاڵەکۆک: هەڵەکۆک.
ئاڵهە: ئومێد.
ئالیۆر: ز. سێوە لاسوورە.
ئالی: ز. لا: ژڤێ (ئالی) واتە لەولاوە.
ئالیستن: ز. ئالاستن.
ئالیسوور: ز. هەرمێ لاسوورە.
ئالیک: مووچە کا و جۆیەکە کە بدرێ بە وڵاخ و ئاژاڵ.
ئام: ز. مام.
ئامـادە: شـتی سـازی ڕێکوپێک. گـەچی گـیـراوەی نەکـوژراوی بەهێز.
ئامادەبوون: سازکردن و ڕێکوپێککردن.
ئامادەیی: سازی و ڕێکوپێکیی شت.
ئاماس: ئاوسایی.
ئامـان: هاتن (هـ). قـاپ و قـاچاخی مسین. بوارە (أمـان): ئاو و ئاگر. ئامانیان نییە واتە بوارەی کەس نادەن. پەنا و هانا.

ئامانج: خزم و خوێش (ز). مەبەست. نیشانەیەکە کە نرابێتەوە بۆ پێکانی.
ئامان لەرزانە: بەستەیەکی کوردییە.
ئامایی: کوێری.
ئامباز: شتێکە کە ئاوقەدی شتێکی تر بووبێ. ئامبازبوون: ئاوقەدبوون.
ئامبازد: ئامباز. ئامبازدبوون: ئامبازبوون.
ئامداگرتی: ز. شتێکە کە تێکراییی بێ و هی تاقە یەکێک نەبێ.
ئامراز: هاوڕاز.
ئامرازی: هاوڕازی.
ئامسەر: هاوسەر.
ئامشۆ: هاتوچۆ.
ئامشۆکردن: هاتوچۆکردن.
ئامشۆکەر: کەسێکە کە ئامشۆت بکا.
ئامک: پووری خوشکی باوک.
ئامۆزا: منداڵی مام.
ئامۆزازا: منداڵی منداڵی مام.
ئامۆژ: ڕێ نیشاندان.
ئامۆژگار: کەسێکە کە ئامۆژگاری یەکێک بکات.
ئامۆژگاری: بەسەر یەکێک هاتن و ڕێی باش پیشاندانی.
ئامۆژن: ژنی مام.
ئامۆژیار: د. ئامۆژگار.
ئامۆژیاری: د. ئامۆژگاری.
ئامو: هەوجاڕ.
ئامە: د. دایک.
ئامەد: د. بەخت.
ئامیان: هـ. هەوێن.
ئامێتە: شتی تێکەڵ، (ئامێتەبوون) تێکەڵبوون، (ئامێتەکردن) تێکەڵکردن.
ئامێژن: د، هەوێنی پەنیر و ماست.
ئامێژەن: تێکەڵکردنی کەمێک لە شتێکی باش لەگەڵ شتێکی تر بۆ باشکردنی: ئەم ئاردەجۆیە (ئامێژەن)ێک ئاردی گەنمی لێ بدە. فریشک.
ئان: ز. یان: ئەم شتە (ئان) ئەو شتە، واتە یان.
ئانام: د. ئەندام.
ئان و ئوون: د. ناز و نووز.
ئانە: ئەوە (هـ). پیتێکە بەهەر ناوێکەوە بنرێ دەیکا بە(مُشبّـه بە): شێر(انە) هەستاوە و پیاو(انە) وەستاوە. دەبێ بەپیتی پاڵدان (نسبة) لە جێگایەکدا کە ببێ بە(موزافو الیه) لەگەڵ ئەو ناوەی کە پێوەی نووساوە: کەوای پیاو(انە) و کراسی ژن(انە)، واتە کەوا و کراسێک کە هی پیاو و ژن بێ. دایک (د).
ئانەشا: هـ. ئەوەیان.
ئانیسک: د. ئانیشک.
ئانیشک: جومگەیەکە لە ناوەندی باسک و بازوودا.
ئانیشکە: دارێکی دوو پەلە دەبەسترێ بە(خوانکە) و پێی ئاشی بەناودا دەڕوات بە بەرز و نزمکردنەوەی پێیەکە ئەویش بەرز و نزم دەبێتەوە. لوولە و گونجی کەوانەدار کە بۆ سەر سووچ بەکاردێنرێ.
ئانین: ز. هانین.
ئاو: شتێکی شلی ڕووناکی ئاشکرایە کە هەموو گیاندار و سەوزاییەک بەبێ خواردنەوەی ناژی. تۆوی گیانداری نێر و مێ.
ئاوا: ئاوەدان: ماڵتان (ئاوا) بێ. وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ پیشاندانی شتێک بەیەکێک لەسەر جۆرێکی تایبەتی: من چیت پێ دەڵێم (ئاوا) بکە. شتێکە لە ئاسۆ ون ببێ: ڕۆژ (ئاوا)یە.
ئاوابوون: پەناگرتن و ونبوونی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە لەلای ڕۆژ ئاواوە. ونبوونی هەموو شتێک لە ئاسۆ.
ئاوات: شتێکە کە خۆزگەی بۆ دەخوازرێ: فیسار کەس بە(ئاوات)ی خۆی گەیشت.
ئاواتخواستن: خۆزگەخواستن بۆ شتێک.
ئاواتەخواز: کەسێکە کە زۆر بەئاوات بێ بۆ شتێک.
ئاوار: ز. جۆرە حەلوایەکی زۆر توندە لە ئارد و دۆشاو دروست دەکرێ و، وشک دەکرێتەوە و پارچە پارچە هەڵدەگیرێ بۆ زستان. چایچی ناو ماڵ. خانووی تەپیو: فیسار کەس بوو بەژێر (ئاوار)ەوە(د).
ئاوارتن: ز. دەربواردنی شتێک لە شتێک (إستثناء).
ئاوارتە: ز. شتی دەربراو (مستثنی).
ئاواتیی: کەسێکە کە زۆر بەئاواتی شتێکەوە بێ. منداڵێکە کە ئاواتەخوازی باوک و دایکی بێ.
ئاوارخانە: شوێنێکە کە چایچی ناوماڵ چا و قاوەی تێدا لێ دەنێ.
ئاوارە: مەردوومی دەربەدەر. ئاوارەبوون: دەربەدەربوون.
ئاوارەکردن: دەربەدەرکردن. هەڵاڵەی هەنگ (هـ).
ئاوارەیی: دەربەدەری.
ئاواری: د. شتومەکی چا و قاوە کە بەبار لە شوێنێکەوە ببرێ بۆ شوێنێکی تر.
ئاواز: دەنگی بەرز.

ئاوازکردن: بانگکردن بە بەرزی.
ئـاوازنـگ: د. زڕاو: (ئـاوازنـک) بـووە، واتـە دەنـگـی زڕاوە و بڵاوبۆتەوە.
ئاوازە: ئاواز. دەنگوباس: ئاوازەیەک داکـەوتووە کـە لەمـەولا بەزۆر بە منداڵ دەخوێنرێ.
ئاوازەخوان: د. گۆیندە.
ئاوازەخوێن: ئاوازەخوان.
ئاواژ: ئاوەژوو.
ئاواق: د. کەسێکە چاوی ئەبڵەق بووبێ.
ئاواکردنەوە: خانوو دروستـکردنەوە لە دێیـەکی وێران و مەردووم تێدا دانانی.
ئاوان: جـۆرە دەفـرێکی قـوولە لە زەرد یا لە مس شـتی تێـدا دەهاڕدرێتەوە. قاپ و قاچاخی ناوماڵ. مزی ئاش. ئاوەدان. ڕەسا و گوشاد. بەدی و چۆغڵی (ز).
ئاوانتە: خواردن و بردنی شتی مەردووم بەخۆڕایی.
ئاوانتەچی: کەسێکە شتی مەردووم بخوا یا ببیا بە ئاوانتە.
ئاوۆک: ز. قەشمەری قسە زۆرکەر.
ئاوایی: چەند ماڵێکی نیشتەجێ.
ئاوبارە: ئاوێکە کە لە بەرزییـەکەوە ببرێ بۆ بەرزییـەکی تر بەهۆی لەوح یا تەنەکـەوە. جـۆگـەیەکی گـەورەیە لە ڕۆژئاوای شـاری سلێمانییەوە. هەڵاڵەی هەنگ.
ئاوباز: د. مەلەوان.
ئـاوبـڕ: دەردێکـە دووچـاری ئـاژاڵ دەبـێ لە زۆر ئـاوی سـاردخواردنەوەوە لە زستاندا و کوتوپڕ دەیکوژێ.
ئاوبەدەمـە: قـوبوولـیـیـەکی تەڕ و بڕە کـە زۆر لەسـەر ئاگـر نەمابێتەوە.
ئاوبەر: کـەسـێکە کـە ئاو بەگـۆزە و دەفـر لە شـوێنێکەوە ببـا بۆ شوێنێکی تر.
ئاوبەند: دەردێکی کوشندەیە لەناو سکدا پەیدا دەبێ.
ئاوپاش: ئاوڕشێن.
ئاوپاڵ: د. دەفرێکە شتی شلی پێ دەپاڵێورێ.
ئاوپرژێن: ئاوڕشێن.
ئاوپژاندن: د. ئاوڕشێنکردن.
ئاوپژێن: ئاوڕشێن. شتێکە کە ئاوڕشێنی پێ دەکرێ.
ئاوپەر: پوازێکە دەخرێتە پاڵ گونجی ئاشەوە بۆ ئەوەی ڕاستـەخۆ ئاوەکە بدا بەناوەڕاستی پەڕەکەدا.
ئاوجز: د. ئاودز.
ئاوجۆ: د. بیرە.
ئاوچاوسەندن: د. بریتییە لە ترساندن.
ئاوچاودان: د. زاخـاوی چاودانەوە بەتەمـاشـاکـردنی ئافـرەتی بێگانە.
ئاوچنین: د. ئاوگرتنی میوە و هێندێ شتی تر.
ئاوخانە: د. ئاودەستخانە.
ئاوخۆری: د. دەفرێکە کە ئاوی پێ بخورێتەوە. شەربە و گوزەڵەی ئاو.
ئاودار: شـوێنێکە کە کـانی و ئاوی زۆربێ. درەخت و سەوزایی و میوەی تەڕ و نازاو. تیغی جەوهەردار.
ئاودامان: کاڵای شۆڕی تا سەرپێ.
ئاودان: ئاوکـردنە بن دار و درەخت و سەوزایی. دانی ئاو بە وڵاخ و ئاژاڵ. ئاودانەوەی تیغ.
ئاودانەوە: کـردنی تیـغی سـوورەوەبوو بە ئاودا بۆ ڕەقـبـوون و برشتی.
ئاودڕ: زەوییەکە ئاو هەڵی دڕیبێ.
ئاودرکە: شوێنێکە ئاو دایدڕیبێ و ئاوی تێدا مابێتەوە.
ئاودز: تەشەنەی برین بەهۆی تەڕبوونیەوە، (ئاودزکردن) ئاودز.
ئاودزەک: ئەو پارچەیە لە شرینقە کە ئاو هەڵدەمژێ.
ئاودەر: ئاودێر.
ئاودەس: ئاودەست.
ئاودەست: ئاودەستخانە.
ئاودەستخانە: پێشاو.
ئاودەنگ: کەسێکە دەنگت بیگاتێ بۆ گفتوگۆ لەگەڵدا کردنی.
ئاودەنگی: هاودەمیی یەکێک بۆ یەکێک.
ئاودێر: کەسێکە کە ئاوی کشتوکاڵ بدا بەمانگانە یا ساڵانە.
ئاور: ز. ڕوخساری بە سامی سەنگین و گران.
ئاورای: هـ. برسێتی.
ئاوڕۆشنکەرە: گیـاندارێکی بچکۆلەی ڕەشە بەسـەر ئاودا دێت و دەچێ.
ئاوڕوو: شەرم.
ئاوڕووبردن: بەدناوکردنی یەکێک.
ئاوڕووت: ئاوەڕووت.
ئاوڕووتکردن: ئاوەڕووتکردن.
ئاوڕووچوون: بەدناوبوون.
ئاوڕوونکەرە: ئاوڕۆشنکەرە.
ئاوڕێژ: کـەسـێکە کـە ئاوی مـردوو بڕێژێ لەکـاتی شـوشـتنیـدا. ئاوەڕێژ.
ئاوڕێژگە: ئاوەڕێژ.
ئاورنگ: ئاونگ، بریسکانەوە.
ئاورنگدان: بریسکانەوە.
ئاوریشم: شـتـێکی جـوانی نەرمی بریسکەدارە لە جۆرە کـرمـێک پەیدا دەبێ و تەنراو و پـارچەی نـایابی بەنرخی لێ دروست دەکرێ.

ئاورینگ: ئاورنگ.
ئاوزان: توانین بۆ کردنی کارێک، ئەم وتەیە هەر لە وتاری نەبوون (نفی)دا بەکاردێنرێ: نەریمان نای (ئاوزێ) کە تەماشای دەرسەکەی بکات یا بزانە سالار دەیئاوزێ دەموچاوی بشوات؟ واتە نایان ئاوزێ.
ئاوزانەچاو: چاوتەڕبوون بەهۆی خەفەتێکەوە.
ئاوزانەدەم: دەم پاراوبوون لە کاتی بینینی خواردنێک و حەز لێکردنیدا.
ئاوزوونە: ئاسنێکی باریکی زبانە، دارەپشتێن و تەنگەی پێ توند دەکرێ.
ئاوزەنگی: دوو ئاسنە بە ڕاست و چەپی زینەوە، سوار پێی تێ دەخات.
ئاوزەنگی تەقێن: بریتییە لە تاودانی ولاخ: (ئاوزەنگی تەقێن) بۆی دەرچوو.
ئاوزەنگیدار: پێی هێندێ کەس کە پشتەکەی قۆقز بێ.
ئاوزەنگی لێدان: لێخوڕینی ولاخی بە زین.
ئاوزیان: ئاوزان.
ئاوزین: ئاوزان.
ئاوسان: بەرزبوونەوە و هەڵکفانی ئەندامی گیاندار لەبەر ئازارێک.
ئاوساو: شوێنێکە لە ئەندام کە هەڵکفابێ.
ئاوسێ: دراوسێ.
ئاوسیان: ئاوسان.
ئاوشار: تاڤگە.
ئاوقە: ئاوقەد.
ئاوقەد: کەسێکە کە پەلاماری شتێکی دابێ و پێیداهەڵزنیبێ، (ئاوقەدبوون) پەلاماردانی شتێک و پێداهەڵزنینی.
ئاوکردن: پڕژاندنی ئاو لە هێندێ شت بۆ نەرمبوونەوە.
ئاوکێش: کەسێکە بەمانگانە یا بەڕۆژانە ئاوت بۆ بێنێ. خواردنێکە کە ئاوی زۆر بەسەردا بخورێتەوە.
ئاوگرتن: خۆشبوونی میوە و ئاوتێزانی بەجۆرێک کە بخورێ. ئاوچنین: ئاوڵەیەکە کە ئاوی تێ زابێ.
ئاوگردان: دەفرێکی مسینی کلک درێژە ئاوی لە کوڵ و هێندێ شتی تری لە مەنجەڵ پێ هەڵدەهێنجرێ.
ئاوگیرکردن: خواردنی شتێکی کەم بۆ لابردنی برسێتی لەپێش نانخواردن بەتۆزێک: زۆرم برسی بوو (ئاوگیر)ێکم کرد.
ئاوڵە: وردە برینێکە لە ئەندامی منداڵ دێتەدەرەوە.
ئاو لە دڵ ڕۆیین: بریتییە لە برسێتیی زۆر.
ئاو لە دنگا کوتان: ئاو لە دنگا کوتاندن.
ئاو لە دنگا کوتاندن: بریتییە لە کردار و گوفتاری بێهوودە.

ئاوڵەمە: د. بێچووی ناو سکی ئاژاڵ کە لە دوای سەربڕینی دایکی دەخورێ.
ئاومالّ: دراوسێ.
ئاومالک: کۆتەرەدارێکە کە ئاو ڕاپێچێ و بگیرێتەوە بۆ سووتاندن.
ئاومروار: جۆرە ئاوێکە کە هاتە ناو چاو کوێری دەکا بەڵام بە میل لێدانی ڕووناک دەبێتەوە.
ئاومل: هاومل.
ئاوملبوون: بوون بەهاودەم.
ئاو و تام: د. جەخت: فیسار کەس بەئاو و تاوێکەوە قسەکەی دەگێڕایەوە واتە بەجەخت و بەکوڵ و دڵ.
ئاور: ئاگر. ئاوس (ه).
ئاوڕ: ه. ئاخوڕ.
ئاوڕدانەوە: لاکردنەوە بەسەر بەلای ڕاست یا چەپدا.
ئاوڕشێن: پڕژاندنی ئاو بەزەویدا.
ئاوڕلێدانەوە: بریتییە لە دەستگرتن و یارمەتیدانی یەکێک.
ئاوس: گیانداری سکپڕ.
ئاوسبوون: سکپڕبوونی گیاندار.
ئاوسکردن:سکپڕکردنی گیاندار.
ئاووگڵ: سروشت (ئاو و گڵە)کەی بەدە. وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ یەکێک کە دوور لە نیشتمانی خۆی بمرێ: فیسار کەس (ئاو و گڵ) هێنای بۆ ئێرە، واتە دەبوو ئاو و گڵی ئێرەی بەتووشەوە ببوایە.
ئاوگۆشت: چێشتی گۆشتاو.
ئاونگ: شەونم. ترێی مێلاق.
ئاوهاتنەوە: ڕەحەتبوونی گیاندار بەهاتنەوەی ئاوی.
ئاوەچۆڕ: چۆڕانەوەی ئاو لە شتێکی تەڕ، ئاوەچۆڕبوون: نەمانی چۆڕەی ئاو بە شتی تەڕەوە.
ئاوەخۆرە: سوورێنچک. ڕاوی سەرکانی. ئەو ئەندازەیەیە لە دەم و لێوی ولاخ کە لە کاتی ئاوخواردنەوەدا دەکەوێتە ناو ئاوەوە. کولۆرییەکە لە ناوەڕاستی درەختدا ئاوی لێوە دەخواتەوە.
ئاوەدان: جێگایەکە ئاوابێ.
فراوان: ئەم ژوورە یا ئەم کالایە ئاوەدانە.
ئاوەدانی: ئاوایی.
ئاوەر: باوەڕ و یەقین. دڵنیایی.
ئاوەڕۆ: جۆگەلەیەکە لە ماڵدا باراناو و چڵکاوی لێوە دەچێتە دەرەوە.
ئاوەڕۆگە: ئاوەڕۆ.
ئاوەڕووت: ڕووتبوونی سەر و پێی ئاژاڵ و باڵندەی سەربڕاو لە خوری یا موو یا پەڕ بەهۆی ئاوی لە کوڵەوە. ئاوەڕووتکردن: ڕووتاندنەوەی سەر و پێی ئاژاڵ یا باڵندە بەئاوی گەرم.

ئاوڕەش هێنانەوە: وتەیەکە دەوترێ بەیەکێک کە زۆر دەنگوباسی ناخۆشت بۆ بێنی و نوقلانەی خراپت بۆ لێ بدا:ئاوەڕەشت هێنایەوە: واتە هیوا و ڕووناکیت نەهێشتەوە.
ئاوەڕێژ: شوێنێکی لێژە کە ئاوەڕۆی شوێنێکی لێوەبڕوا:ئاوەڕێژی سلێمانی دەچێتەوە سەر تانجەڕۆ.
ئاوەڕێس: جۆرە جاوێکی سپیی تایبەتییە.
ئاوەروو: د. شوێنی ئاوەزێ.
ئاوەزا: د. ئاوەزێ.
ئاوەزێ: شوێنی تەڕ و نمدار.
ئاوەژوو: کاڵا و پۆشاکی هەڵگەڕاوە. ئاوەژووبوون: هەڵگەڕانەوەی کاڵا و پۆشاک. ئاوەژووکردن: هەڵگێڕانەوەی کاڵا و پۆشاک.
ئاوەژەنە: هـ. کەلەبەرێکە کە لە پشت ئاشەوە ئاوی لێوە دەشکێنرێ لە کاتێکدا کە ئاشەکە بخەوێنرێ.
ئاوەژێ: ئاوەژوو.
ئاوەسوو: شتێکە لەناو ئاودا سووابێ و لووس بووبێ. بریتییە لە مەردوومی بێعار. ئاوەسووبوون : سوان و لووسبوونی شت بەهۆی مانەوەی لەناو ئاودا.
ئاوەسێ: فەقیانەی کراس.
ئاوەشکێنە: ئاوەژەنە.
ئاوەکی: ئاژاڵ یا وڵاخێکە کە لە مێگەل و ڕەوەی خۆی بزربووبێ و کەوتبێتە ناو مێگەل و ڕەوەیەکی بێگانەوە. شتی تەڕ.
ئاوەکیبوون: ئاوەکیکەوتن.
ئاوەکیکەوتن: ئاوارەبوون و دوورکەوتنەوەی گیاندار لە جێ و ڕێی خۆی.
ئاوەڵ : هاودەم.
ئاوەڵانە: وەڵیفەتێکە دەدرێ بەشوان بەرامبەر بەهێنانەوەی کار و بەرخی تازەبوو لە کێوەوە بۆ خاوەنی.
ئاوەڵچنە: جۆرە کاغەزێکی فشەڵە، نووسراوی پێ وشک دەکرێتەوە. کاغەزێکی زۆر تەنکە لە هێندێ شتەوە دەپێچرێ.
ئاوەڵزاوا: مێردی خوشکی ژن.
ئاوەڵکراس: بریتییە لە دەرپێی ژن.
ئاوەنووس: د. عەبەنووس.
ئاوەنیا: گەنم و جۆی بەراو. کۆڵەبەست.
ئاوەوەرە: هـ. ڕاوی سەرکانی.
ئاوهەڵکردن: ئاو کردنە سەر شوێنێک بۆ ئاودانی.
ئاوهێنانەوە: بریتییە لە خۆ ڕەحەتکردن بەدەست.
ئاویار: د. ئاودێر.
ئاویاری: د. ئاودێری.
ئاوێتە: ئامێتە.
ئاوی ڕەش: ڕەشاوێکە کە چووە پەردەی چاوەوە کوێری دەکا و، ئیتر ڕووناک نابێتەوە.
ئاوێز: د. شتێکە کە دارۆچکە کرابێ.
ئاوێزان: ئاوێز.
ئاوێزە: چرایەکی شووشەی گەورەی پلپلەداری لق لقە بەبنی میچدا هەڵدەواسرێ بۆ جوانی و، لە هەر لقێکیدا چرایەکی تێدا هەڵدەگیرسێنرێ.
ئاویشتن: هاویشتن.
ئاوێنە: شووشەیەکی پاکی ڕووناکە دیوێکی دەرمانێکی پێوەیە و دیوەکەی تری شت دەنوێنێ.
ئاوێنەبەند: شوێنێکە کە ئاوێنەی زۆر چەسپ کرابێ بەدیوارەکانیەوە.
ئاویە: د. شتی ئاوی بەراو، سواغ.
ئاویەدان: د. سواغدان.
ئاوی: جۆرە ڕەنگێکە لە ئاسمانیی ڕوونتر. گیاندارێکە بەبێ ئاو دەژی. سەوزاییەکە کە ئاو بدرێ.
ئاوینە: ئاوێنە.
ئاه: وتەی دەربڕینی داخ و خەفەت. هەناسە: (ئاه)ی تێدانەماوە.
ئاها: پیتی سەرسوڕمان: دەڵێیت (ئاها) بەیەکێک کە پێت بڵێ ئیمڕۆ بۆمبای وا هەیە شارێک وێران دەکا.
ئاهار: د. شۆیەکە کە بە شتی تەنراوەوە بێ.
ئاهن: ل. ئاسن.
ئاهۆ: ئەی هۆ. شێتیی (ل). فێ.نەنگ.
ئاهەک: قسڵ.
ئاهەنگ: کۆبوونەوە و گۆرانی وتن و ڕابواردن لە شایی منداڵبوون یا ژنهێنان یا خەتەنەسووراندا.
ئاهەنگگرتن: پێکهێنانی ئاهەنگ و کۆبوونەوە بۆی.
ئاهەنگگێر: کەسێکە لە ئاهەنگدا گۆرانی بڵێ و خۆشیی بکا.
ئاهەنگگێران: ئاهەنگگرتن.
ئاه هەڵکێشان: ئاخ هەڵکێشان.
ئاهیر: ئاگر.
ئاهێر: ئاگر.
ئاهیستە: هێدی و لەسەرخۆ.
ئاهیستەیی: هێدیتی و لەسەرخۆیی.
ئاهی: ل. ئاسک.
ئاهێن: ز. ناڵێن.
ئای: ئاخ.
ئایا: وتەی پرسیار.

ئاياكو: ئايا.
ئايئاي: جۆرە مقامێكی خۆشی كوردییە.
ئايای: ئايئای.
ئاينده و ڕەونده: هاتوچۆكەران.
ئاينوئۆين: فرِوفێڵ.
ئايەر: هـ. ئاگر.
ئاين: چەند دەستـوور و فـەرمـانێكە كـە لەلايەن خـواوە بەهۆی پێغەمبەرێكەوە نێردرابێ بۆ ئادەمیزاد. ڕەفتار و ڕەوشت.
ئسپار: ل. هەڵگێڕانەوەی زەويی ناوباخ.
ئسترانە: با. لاوكێكە كە سەرگوزشتەی دڵداريی پێشان بدا.
ئستێرک: شوقەللەت.
ئستێنک: با. زەردەواڵە.
ئشكێڵ: ئەشكێڵ.
ئم: پیتی وەرامدانەوە.
ئمجا: ئینجا.
ئینجا: وتەیەكە بەكاردێنرێ لە پاش دەست هەڵگرتن لە شتێک و دەستكردن بە شتێكی تر: تا ئێستا من كارم كردووە ئینجا نۆرەی تۆیە.
ئینجاكو: ئینجا.
ئینجاكونێ: ئینجا.
ئۆ: ئاو (ل). پیتی بانگكردن: ئۆباب، ئۆدا، واتە ئەی بابە، ئەی دایە!. پیـتێكە ژنان لەكـاتی سـەرسـوڕمـاندا بەكـاری دەهێنن وەک پیتی (ئەیەڕۆ).
ئۆء: ز. وتەیەكـە بەكـاردێنرێ لەكـاتی سـەرسـوڕمـان و پێ ناخۆشبوونی كارێكدا.
ئۆباڵ: گوناح: (ئۆباڵ)ت بەئەستۆم.
ئۆبە: ز. هۆبە.
ئۆحە: وتەیەكە ڕەشەوڵاخی پێ لێ دەخوڕدرێ.
ئۆخ:. ئۆخەی. ئاخ (ز).
ئۆخەی: وتەیەكە بەكاردێنرێ لەكاتی دڵخۆشبوون بە شتێک.
ئۆخەیچ: ئۆخەی.
ئۆخەیش: ئۆخەی.
ئۆدە: ژووری خانوو.
ئورفـە: نـاوە بۆ جـۆرە مـقـامـێک. نـاوە بۆ شـارێكی كـورد لە ڕۆژئاوای كوردستانی توركیادا.
ئورووسی: د. عرووسی.
ئۆسا: د. وەستا.
ئۆغر: ڕۆین: (ئۆغر) بی، واتە بۆ كوێ دەچیت. ئۆغركردن: ڕۆین لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێک.
ئۆف: پیتی داخ و خەفەت.
ئوففە: دەردێكە دەدا لە سەری وڵاخی بەرزە ، ئاو بەلووتیدا دێتە خوارەوە.
ئۆقرە: ئارام.
ئۆقرەگرتن: ئارامگرتن و دابینبوون.
ئۆگر: هۆگر.
ئۆگە: هـ. دەوێ.
ئولاخ: وڵاخ.
ئولاخدار: وڵاخدار.
ئولاغ: ئۆلاخ.
ئولاغدار: ئۆلاخدار.
ئۆلاق: ز. ئەسپی نـاڕەسەن.
ئۆلی: ز. ژوور.
ئوموستیلە: ئەموستیلە.
ئومێد: هیوا. ئومێدكردن: ئومێدەواری.
ئومێدەوار: هیوادار.
ئومێدەواری: هیواداری.
ئۆمی: نەخوێندەوار. بەكەسێک دەوترێ كە لە نەتەوەی (حەسەن) و (حوسێن) نەبێ.
ئونكیرەم: سی و دوو یەكی حۆقە.
ئونیشک: با. كەرە.
ئۆحە: وتەیەكە ڕەشەوڵاخی پێ ڕادەوەستێنرێ.
ئووک: گەروو.
ئوونە: هـ. هۆ ئەوە.
ئۆی: ئۆف.
ئویف: وتەی پەسندكردن.
ئۆین: فێڵ.
ئۆینباز: فێڵباز.
ئۆیە: جـۆرە چنراوێكی تەنكی كـون كـونە بۆ جـوانی دەگـیـرێ بەقەراغی شتدا.
ئە: پیـتی لەمـەولا (مـسـتـقـبل): ئە(خوێنم) ئە(نووسم) واتە لەمـەولا. پیـتی ڕابردووی درێژەدار (مـاضي اسـتـمـراري): (ئە)م خـوێند، (ئە)م نووسی. پیـتێكە لە جـێی وتەی (بۆ) یەک بەكـاردێنرێ كە بەمەعنا پاڵدان (نسـبت) بێ: قـسـەی خراپ مەدە (ئە) پاڵ كەس، واتە بۆ لای كەس.
ئەبرۆ: برۆ.
ئەبرەش: مێینەیەكە لە پاش زانی شیری نەبێ بیدا بە بێچووی.
ئەبڵەق: بازوو. چاوی داپچڕاو كە تەماشای جێگایەكی تایبەتی نەكات.
ئەپرەخ: ز. یاپراخ.
ئەترەش: زراو.

ئەترشچوون: بریتییە لە زۆر ترسان و زراوچوون.
ئەتککردن: ئابڕووبردنی یەکێک.
ئەتۆ: تۆ.
ئەتوو: تۆ.
ئەتەر: نیشانە و بەڵگە.
ئەچنەو: ل. وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ پیشاندانی شتێک بەیەکێک لەسەر جۆرێکی تایبەتی.
ئەحئەح: ز. دەنگێکە مەڕی پێ دەردەکرێ.
ئەخترمە: ز. وڵاخێکە لە جەنگدا لە دوژمن گیرابێ.
ئەختە: ز. یەختە.
ئەخشاڵ: د. پڕ و پیتی ناوماڵ.
ئەخڵەخ: د. سوخمەی ژنانە.
ئەخمکردن: د. ناوچەوان دان بەیەکدا.
ئەدا: هـ. دایک.
ئەدابابا: هـ. گوڵێکی سووری پەنجە پەنجەیە وەک دەست.
ئەددێ: وتەی سەرسوڕمان. ئەددێ: لە وەرامی کەسێکدا کە بڵێ سالار ناخوێنێ.
ئەدەب: شـەرم: فـیـسـار کـەس زۆر بە(ئەدەبە) واتە بەشـەرمـە، ئەدەبکردن: شەرمکردن.
ئەدەبگرتن: فێربوونی ئەدەب و شەرم.
ئەدێ: وتەی وەرامدانەوە.وتەی ئاگادارکردنەوە: (ئەدێ) بابم بۆ ناخوێنێ. ئیـتـر: (ئەدێ) چیت دەوێ، واتە ئیـتـر. وتەیەکـە بەکـاردێنرێ لە جـێـی وتـەی (بەڵێ). (ئەدێ) لە وەرامی کەسێکدا کە بڵێ تۆ دەخوێنیت؟ واتە بەڵێ.
ئەر: ئەگەر.
ئەرامەند: ئەرامەندە.
ئەرامەندە: هـ. داماوی هەژار.
ئەرامەنە: د. ئەرامەندە.
ئەرخوت: لۆرە لەپ.
ئەرخە: پشتیوان.
ئەرخەوان: دارێکی گەڵاپانە لە پێش گەڵادا گوڵێکی سوور دەگرێ بەهێشوو.
ئەرخەوانسوور: کاتی سووربوونی ئەرخەوان لە بەهاردا. بریتییە لە هاتنی لافـاو بەزۆری: ئەوەندە باران باریوە تانجـەڕۆ ئەرخەوانسوور هاتووە.
ئەرخەوانی: جۆرە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی ئەرخەوان.
ئەرد: ئەرز.
ئەڕا: ل. مشار. بۆ: (ئەڕا)ی کوێ دەچیت واتە بۆ کوێ.
ئەرز: زەوی.
ئەرزان: هەرزان.
ئەرزانجان: هەرزانجان.
ئەرزانی:هەرزانی.
ئەرزن: هەرزن.
ئەرزنی: با. جۆرە هەنجیرێکە.
ئەرزەن: ز. چەناگە.
ئەرزینک: با. چەناگە.
ئەرژنگ: دارێکی بێ بەرە وەک ئەرخەوان وایە.
ئەرژنگی دێو: وتـەیەکـە گـیـانداری زلی قـەبەی ناشـیـرینی پێ دەشوبهێنرێ: دەڵێی (ئەرژەنگی دێو)یت.
ئەرغەوان: ئەرخەوان.
ئەرغەوانسوور: ئەرخەوانسوور.
ئەرغەوانی: ئەرخەوانی.
ئەرقاز: تەپۆڵکە.
ئەرک: ئیـشـوکـاری زۆر. ڕەنج و باری سـەرشـان: فـیـسـار کـەس (ئەرک)ی زۆرە.
ئەرکدار: کەسێکە کە ئەرکی زۆربێ.
ئەرکە: ئەرک. کارێکی گرنگی مەبەست کە بەیەکێک بسپێردرێ.
ئەرەبەستە: هـ. دابەستە.
ئەرەج: د. مەچەک.
ئەرەقچین: جۆرەکڵاوێکی تەنکە.
ئەرەقگیـر: ژێرزین. گومگومـەیەکی لوولەدارە گـوڵاو و ئارەقی پێ دەگیرێ.
ئەرێ: پیـتی وەرامـدانەوە. (ئەرێ) لە وەرامی یەکـێکدا کـە لێت بپـرسـێت خـوێندووتە؟ پیـتی پرسـیـار: ئەرێ مـانگ هەڵات؟ پیتی وریاکردنەوە:ئەرێ نەریمان بۆ ناخوێنێ.
ئەز: ز. من.
ئەزبولە : هەزبێلە.
ئەزبیە: د. بەهاراتی ناو چێشت.
ئەژدەر: ئەژدەها.
ئەژدەها: ماری زۆر گەورە.
ئەژدیها: ئەژدەها.
ئەژنۆ: جومگەی ناوەندی ڕان و لاق.
ئەژنەفتن: د. بیستن.
ئەژنەوا: د. گوێڕایەڵ.
ئەژنەوتن: ئەژنەفتن.
ئەژنەوین: ئەژنەوتن.
ئەسپ: گـیـانداریکی نێـری باڵابەرزی ناوپشت چاڵـی دارێژراوی بەهێـزە سـواریی پێ دەکـرێ. ناوە بۆ داشـێک لە داشـەکـانی شەترەنج.
ئەسپاردن: سپاردن.

ئەسپایی: هێواشی.
ئەسپرزە: د. کەپەک.
ئەسپیدار: سپیدار.
ئەسپۆن: گیایەکی کوێستانیی بەهارییە بنکێکی هەیە ورد دەکرێ و وەک سابوون بەکار دەهێنرێ.
ئەسپوول: ھ. سپڵ.
ئەسپەئاسنینە: پایسکل.
ئەسپەدارینە: ئەسپێکە لە دار دروست دەکرێ و منداڵان سواری دەبن بۆ یاری.
ئەسپەر: د. ئەسپەرە.
ئەسپەردن: سپاردن.
ئەسپەردە: سپاردە، ئەسپەردەکردن: سپاردن.
ئەسپەرە: دارێکی کونداره دەخرێتە کلکی بێڵەوە بۆ ئەوەی لە کاتی زەوی کێڵاندا پێی بخرێتە سەر و هێزی بدرێتێ. ئەگریجە.
ئەسپەرێز: ئەندازەیەکە کە سوار تیایدا لنگ بدا (د). ناوی دێیەکە لە هەورامان.
ئەسپەشینە: باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگە لە (کەڕەواڵە) گەورەترە، لەکاتی هەڵفڕیندا دەنگێکی لێوە دێ لە حیلەی ئەسپ دەچێ.
ئەسپەک: دەردێکە هێندێ جار دەداتەسەری گرانەتادار و دەبزرکێنێ. گیایەکە وەک (نێرگس) وایە دەگیرێتە سەری ئەسپەکدار.
ئەسپەناخ: جۆرە سەوزەیەکە وەک سلق، بەڵام ئەم گەڵای باریکترە دەکرێ بەچێشت.
ئەسپێ: دەعبایەکی بچووکی چنگاویی بەئالۆشە، دەداتە جەستەی گیاندار.
ئەسپێکوژە: بریتییە لە پەنجە گەورەی دەست.
ئەسپێون: کەسێکە کە جەستەی زۆر ئەسپێ هەڵبێنێ.
ئەسترێلک: سرێش.
ئەستری: جۆرە درەختێکە گوڵی وەک خەزێم وایە. درک.
ئەستنگ: با. چزووی دووپشک و زەردەواڵە و هەنگ. پلەی شاخ
ئەستو: ئەستۆ.
ئەستۆ: ئەستوورایی مل.
ئەستورک: ئەستورکە.
ئەستورکە: کولێرەساجی ئەستوور.
ئەستۆک: ئەستۆ.
ئەستوندەکە: کۆڵەگە.
ئەستونگ: د. ئەستوون.

ئەستوور: شتێکە کە تەنک نەبێ.
ئەستووران: لۆکە و خورییەکە کە ئەستوور ڕێسرابن.
ئەستوورایی: عاستی ئەستووریی شت.
ئەستوورک: ئەستورکە.
ئەستووری: ئەستوورایی.
ئەستوون: کۆڵەگە. کۆڵەگەی دەوار.
ئەستوونەزێرینە: پەلکەزێرینە.
ئەستێ: پارچە پۆڵایەکی کەوانەدارە کە لە بەردەئەستێ بدرێ ئاگر دەهێنێ.
ئەستێر: ئەستێڵ.
ئەستێرک: شوقەللەت.
ئەستێرک: ئەستێڵ.
ئەستێرکە: ئەستێرک.
ئەستێرۆک: ئەستێڵ.
ئەستێرە: ئەو شتە ڕووناکانەن کە شەو بەئاسمانەوە دەدرەوشێنەوە.
ئەستێرەژمێر: جۆرە مووروویەکی سوورکاری بریسکەدارە وەک ئەستێرە جریوەی دێ، ژنان لە زێڕ و زیوی دەگرن و دەیکەنە ملیان.
ئەستێرەشناس: کەسێکە- گوایە- بەهۆی ئەستێرەوە شتی نادیار بزانێ.
ئەستێڵ: گۆلێکی گەورەیە لە بەردەمی ئاوێکی کەمدا دروست دەکرێ بۆ ئەوەی کە پڕبوو بەئاسانی شینایی پێ ئاو بدرێ.
ئەستێلە باخەڵ: یارییەکە چەند کەسێک دادەنیشن و وەستاکەیان شتێک لە باخەڵیاندا دەشارێتەوە، هەر کامێکیان دۆزییانەوە دەبێ بە وەستا.
ئەستێولک: ئەستێوولک.
ئەستێوولک: ئاسنێکی دەمپانی کلک درێژە هەویری وشکەوەبووی لە (کوول) پێ دەکرێنرێ.
ئەستیو: خاکەنازی ئاگر.
ئەسر: د. فرمێسک.
ئەسرین: ھ. فرمێسک.
ئەسکڵ: سکڵی ئاگر.
ئەسکوداری: ز. جۆرە سەرپێچێکە کە کوردی تورکیا دەیبەستن.
ئەسکوێ: کەوچکێکی گەورەی دەم زلی کلک درێژە چێشتی شلەی لە مەنجەڵ پێ تێ دەکرێ.
ئەسکەری: د. جۆرە ترێیەکە.
ئەسکەمل: جۆرە کورسییەکی یەک کەسییە. یارییەکە بەجۆرە کاغەزێک دەکرێ. کاغەزێکە کە یاریی (ئەسکەمل)ی پێ دەکرێ.

ئەسکەناس: جۆرە دراوێکی ئێرانییە لە کاغەز وەک دیناری عێراقی.
ئەسکەنە: ئاسنێکی دەم تیژە دارتاش داری پێ هەڵدەکەنێ.
ئەسمەرپێچ: جۆرە چیغێکی تایبەتییە بە بەنی ڕەنگاوڕەنگ دەچنرێ.
ئەشخاڵ: ئەخشاڵ.
ئەشرەفی: جۆرە دراوێکی زێرینی بچکۆلانەیە دەکرێ بەپلپلەی هێندێ چەکی ژنانە. جۆرە گوڵێکە وەک گوڵەباخ بەڵام ئەم بۆنی کەمترە و گەڵێ ڕەنگی هەیە.
ئەشقەمە: هـ. ورگی ئاژاڵ کە هێشتا پیسییەکەی لێ فڕێ نەدرابێ.
ئەشکنج: بۆشاییی لای ڕاست و چەپی بەرموسڵدان.
ئەشکنجە: ئاسنێکی درێژە، ئاسنێکی پێچ پێچ بەسەرەکەوەیەتی، دەرگا و پەنجەرە و هێندێ شتی تری لە پێش داکوتاندا تێ دەخرێ و لێی توند دەکرێ بۆ جووتبوونی، ئینجا لە ناویدا دادەکوترێ.
ئەشکەرە: ز. ئاشکرا.
ئەشکەفت: د. ئەشکەوت.
ئەشکەڵە: د. قوڵفەکانی دەوارە کە بەیەکدا دەکرێن و داریان پیا دەکرێ و دەبەسترێن بەیەکەوە. چێوجەڵە. ئەشکنجە.
ئەشکەمدوڕیدە: شکەمدوڕیدە.
ئەشکەنجە: د. ئەشکنجە.
ئەشکەندوڕی: ئەشکەمدوڕیدە.
ئەشکەندوڕیدە: ئەشکەمدوڕیدە.
ئەشکەوت: کولۆراییەکی نارێکە لە کەژ و کێودا بە شەو دڕندە و جانەوەر ستاری تێدا دەگرن.
ئەشکێڵ: چوارپەل بەستنی وڵاخ و بەزەوی دادانی.
ئەشکیل: د. پاوەن.
ئەغز: داگیرکردنی شتێک لە یەکێک.
ئەغزە: کاغەزێکی لوولکراوە دەخرێتە قنگی جگەرەوە.
ئەفسانە: بەسەرهات و سەرگوزەشتی پڕوپووچ.
ئەفسووس: وتەی دەربڕینی خەفەت. داخ و خەفەت.
ئەفسوون: د. جادووکردن لە یەکێک.
ئەفسوونباز: جادووگەر.
ئەفشار: ناوە بۆ جۆرە مقامێک.
ئەفەرۆز: یەکێکە دەرکرابێ و دوورخرابێتەوە. ئەفەرۆزکردن: دەرکردن و دوورخستنەوەی یەکێک.
ئەفێهار: ز. وتەیەکە ئیشارەی پێ دەکرێ بۆ تەنها یەکێکی نزیک.
ئەفێهانێ: ز. وتەیەکە ئیشارەی پێ دەکرێ بۆ یەکێک یا دوو یا سێ کەس.
ئەڤ: ز. وتەیەکە ئیشارەی پێ دەکرێ بۆ تەنها یەکێکی نزیک.
ئەڤان: ز. وتەیەکە ئیشارەی پێ دەکرێ بۆ دووان یا زیاتر.
ئەڤراز: ز. هەوراز.
ئەڤینی: ز. خۆشەویستیی و دڵبوون بە شتێکەوە.
ئەک: دەک.
ئەککوو: ئەک.
ئەگرە: ئێرە.
ئەگریجە: مووی سەری ژن لە عاستی ڕوومەتی.
ئەگەر: پیتێکە بەستنەوەی شتێک بەشتێکی ترەوە دەگەیەنێ: (ئەگەر) چاک بیت چاکە دەبینیت.
ئەگین: ئەگینا.
ئەگینا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە ناوەندی دوو وتاردا بەستنەوەی بوونی وتاری دووەم بەنەبوونی وتاری یەکەم دەگەیەنێ: وەرە ئەگینا دێم، واتە کاتێک من دێم کە تۆ نەیەیت، یان مەیە ئەگینا نایەم، واتە کاتێک من نایەم کە تۆ بێیت.
ئەگینە: ئەگینا.
ئەلامەت: هەڵامەت.
ئەلف: ناوە بۆ پیتی یەکەم لە بیست و حەوت پیتەی کوردی، ئەلف لە سەرەتای وتەوە و لە ناوەڕاستیەوە و لە دواییەوە دەبێ. ئەلفێک کە لە سەرەتاوە بێ لەسەر سێ جۆرە: (١) أصلي، (٢) وصلي ،(٣) زیاد. أصلي: ئەلفێکە فرێدانی دروست نەبێ وەک (ئاو، ئاگر)، وصلي: ئەلفێکە فرێدانی دروست بێ وەک (ئەگەر) کە دروستە بڵێیت (گەر)، زیاد: ئەلفێکە کە اصلي وشە نەبێ وەک (ئەمن، ئەتۆ) کە اصلەکەیان (من، تۆ)ن.
ئەلفێک کە لە ناوەڕاستەوە بێ لەسەر دوو جۆرە:
(١) ئەلفی بەستنەوە (ربط) کە دوو وتە بەیەکەوە دەبەستێتەوە وەک (سەرانسەر، بەرامبەر، سەراپا).
(٢) ئەلفی زیاد، وەکو (خەمخوار، یێگوزار)کە اصلەکەیان (خەمخۆر، یێگوزەر)ە.
ئەلفێک کە لە دواییەوە بێ هەر أصلی دەبێ وەک: (ئینجا، کوێخا).
ئەلفوبێ: ناوە بەکورتی بۆ هەموو پیتەکان: (ئەلفوبێ)ی نەخوێندووە.
ئەلفە: ئەشکێڵ.
ئەڵڤاوێز: د. ئەڵقەڕێز. کەسێکە کە بەسێدارەدا کرابێ.
ئەڵڤایی: د. دەرگای گەورە.
ئەڵقە: چەمەرەیەکی گردی هاتووەوەیە لە ئاسن یا لە زەرد یا شتی تر.
ئەڵقە بەگۆش: بەندەی زەڕخریدە.

ئەڵقەدان: پێچخواردنی مار.
ئەڵقەڕێز: ئاسنێکی ئەڵقە ئەڵقەی تێکهەڵکێشراوە دەرگای پێ دادەخرێ.
ئەڵقەمچی: ئەڵقەیەکی زێڕینە سەرەکەی لەباتی نقێم، (غازی) یا (ئەشــــرەفی)یەکی پێـــوەیە ژنان دەیکەنە پەنجـــەی دۆشاومژەیان.
ئەڵلاوەیسی: جۆرە مقامێکی کوردیی خۆشە.
ئەللو: ل. هەڵووژە.
ئەڵـماس: جـۆرە بەردێکی سـپـیی گـران مـایـەیە شـووشـەی پێ دەبڕێتەوە.
ئەڵماستەراش: پیاڵە و پەرداخێکە کە تاشرابێ و گۆشەگۆشە بێ.
ئەلووجە: هەڵووژە.
ئەڵووژە: هەڵووژە.
ئەلۆ و جەلۆ: عەلۆ و جەلۆ.
ئەڵها: د. کەڵکەڵە و ئارەزوو. خواهیش.
ئەلیرەم: هەشت یەکی حۆقە.
ئەم: وتەیەکە تاقە شتێکی نزیکی پێ پێشان دەدرێ. ئێمە.
ئەمان: وتەیەکە چەند شتێکی پێ پێشان دەدرێ.
ئەمانە: ئەمان.
ئەمجا: ئینجا.
ئەمدیو ئەودیوکردن: هەڵگەڕانەوەی پاڵکەوتوو لەسەر لایەکەوە بۆ لاکەی تری. بریتییە لە وردبوونەوە و تێبینێ لە کارێکدا. هەڵگێڕانەوەی شت.
ئەمڕۆ: ئیمڕۆ.
ئەمڕۆکە: ئیمڕۆ.
ئەمساڵ: ئیمساڵ.
ئەمشەو: ئیمشەو.
ئەمن: من.
ئەمنە: ئەمەندە.
ئەموست: پەنجەی دەست و پێ.
ئەموستبەستە: دەستخەڕۆ.
ئەمستەچاو: بریتییە لە شەوی زۆر تاریک.
ئەموستەویلە: ئەموستیلە.
ئەموستیلە: ئەڵقەیەکی زێڕین یا زیوینە کە سەرەکەی دوگمە یا نقێمێکی بێ، دەکرێتە پەنجەی دەست بۆ جوانی. پارچە تەنەکەیەکی گرنج گرنجە کالادروو لە درووماندا دەیکاتە پەنجەی بۆ ئەوەی لە قنگی دەرزییەکەی گیر بکا.
ئەمە: ئەم.
ئەمەک: مزی چاکەی کەسێک بەسەر کەسێکی ترەوە: (ئەمەک)ی فیسار کەسم بەسەرەوەیە.
ئەمەکدار: کەسێکە کە ئەمەکی بەسەرتەوە بێ.
ئەمەندە: وتەیەکە ئەندازەیەکی نزیکی پێ پێشان دەدرێ.
ئەمەهە: د. ئەمە.
ئەمەهەی: ئەمەهە.
ئەمهەی: ئەمەهە.
ئەمێ: وتەیەکە شوێنێکی نزیکی پێ پێشان دەدرێ.
ئەمێستا: ئێستا.
ئەمێستاکە: ئەمێستا.
ئەمێستە: ئێستە.
ئەمێستەکە: ئێستەکە.
ئەنار: هەنار.
ئەنازە: ئەندازە.
ئەنبازبوون: ئەمبازبوون.
ئەنجام: دواییی کارێک.
ئەنجامدان: بڕینەوەی کارێک.
ئەنجامە: ئاسنێکی دوولاییە تای دەرگا و پەنجەرە و شتی تری پێ دادەکوترێ.
ئەنجنین: جنین و وردکردنی شت. (ئەنجن ئەنجن): شتی زۆر جنراوی ورد.
ئەنجومەن: لیژنەیەکی تایبەتییە کە پێکهاتبێ بۆ دوان و کۆڵینەوە لە شتێک.
ئەنجومەنی بەڕێوەبەری: مەجلیسی ئیدارە.
ئەنجومەنی شارەوانی: مەجلیسی بەلەدییە.
ئەنجە: د. شتی جنراو. ئەنجە ئەنجە: ئەنجن ئەنجن.
ئەنجیر: هەنجیر.
ئەنجینە: د. چیلکە و چەواڵ.
ئەنداخت: تفەنگ و تۆپهاویشتن بۆ نیشان.
ئەندازە: چەندێتیی شت لە درێژی یا پانی یا بەرزی یا قەبارەیی (هندسە).
ئەندازەگر: کەسێک کە پیشەی گرتنی ئەندازە بێ (مهندس).
ئەندازەگرتن: گرتنی چەندێتی و قەبارەی شت.
ئەندازیار: ئەندازەگر (مهندس).
ئەندام: جەستە، یەکێکە لە لیژنەیەکی چەندکەسی.
ئەندێش: مەترسی. ئەندێشی لێ مەکە.
ئەندێشە: ئەندێش.
ئەنگاوتن: لێدان و پێکانی شتێک.
ئەنگاوتە: دەردی کوتوپڕی، (ئەنگاوتە) لە گۆی دڵی دا.
ئەنگۆ: ئێوە.
ئەنگوتک: گونک.
ئەنگۆرە: لەمەوپێش.

ئەنگوس: د. ئەنگوست.
ئەنگوست: پەنجە.
ئەنگوستەویلە: ئەموستەویلە.
ئەنگوستنما: ئەنگوشتنما.
ئەنگوستیلە: ئەموستیلە.
ئەنگوشت: ئەنگوست.
ئەنگوشتنما: کەسێکە ئەوەندە ناسراو بێ بەئەنگوشت پیشان بدرێ.
ئەنگوشت نیشان: شتێکە کە نرابێتەوە بۆ دزین، ئەنگوشتنما.
ئەنگوشتەویلە: ئەنگوستەویلە.
ئەنگوشتیلە: ئەنگوستیلە.
ئەنگووتن: هەڵکردنی با بەهێواشی: بای بەیان (ئەنگووت). هەڵەنگووتن.
ئەنگوچک: فەقیانەی کراس.
ئەنگوور: ترێ.
ئەنگیر: ل. ترێ.
ئەنی: با. ناوچەوان.
ئەنێش: د. ئەندێش.
ئەنیشک: با. ئانیشک.
ئەنیسوون: بەری گیایەکە وەک کونجی وایە بەڵام ئەم تۆزێک گەورەترە بۆ دەرمان بەکاردێنرێ.
ئەو: وتەیەکە تاقە شتێکی دوور یا نادیاری پێ پێشان دەدرێ.
ئەوا: پیتی ئێستایی (أداتی حال): ئەوا دەنووسم، واتە ئێستا. ئەو(ز).
ئەواگل: د. گەڕانەوە.
ئەوان: وتەیەکە چەند شتێکی دوور یان نادیاری پێ پێشان دەدرێ.
ئەوانە: ئەوان.
ئەوانەی: وتەی پەیوەست (موصول) بۆ چەند کەسێک: (ئەوانەی) ژیرن بەبیرن.
ئەوباش: د. سەرسەری.
ئەوتۆ: وتەیەکە پەیوەستی دەخاتە ناوەندی دوو وتارەوە: پیاوی (ئەوتۆ) بووە هەرگیز درۆی نەکردووە.
ئەوتەو: ئەوتۆ.
ئەوجە: د. پێویست: (ئەوجە) بەوە ناکا. زۆرتر لە نەبووندا بەکاردێنرێ.
ئەوداڵ: د. عەوداڵ.
ئەورا: هـ. برسێتی.
ئەورە: ئەوێ.
ئەوسا: ئەو حەلە.
ئەوسار: هەوسار.
ئەوقەدبوون: ئاوقەدبوون.
ئەوکێ: ز. وتەیەکە لە جیاتی وتەی (یارو) بەکاردێنرێ.
ئەوگار: د. پەرێشان و گرفتار. بریندار.
ئەوەنە: د. ئەوەندە.
ئەوک: با. قورگ.
ئەوە: وتەیەکە تاقە شتێکی دووری پێ پێشان دەدرێ. ئەمە.
ئەوەئامای: هـ. هاتنەوە.
ئەوەتە: ئەوەتەی. وتەیەکە شتێکی لە دوورەوە پێ پێشان دەدرێ: مانگ (ئەوەتە).
ئەوەتەی: وتەیەکە سەرەتای کاتی ئیشێک دەگەیەنێ: (ئەوەتەی) بیرم کردووەتەوە درۆم نەکردووە.
ئەوەتێ: ئەوەتەی.
ئەوەجە: ئەوجە.
ئەوەندە: ز. وتەیەکە ئەندازەی شتێکی دیاری پێ پێشان دەدرێ.
ئەوهەی: ئەوەی.
ئەوەی: وتەی پەیوەست (موصول): (ئەوەی) کوردە گوردە. ئەوە: (ئەوەی) بێنە.
ئەوێ: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ پێشاندانی جێگایەکی تۆزێک دوور.
ئەوێها: ز. ئەوە.
ئەوی: وتەی پەیوەست وەک وتەی (ئەوەی): (ئەوی) زانایە بەختیارە. ئەوە: (ئەوی) بێنە.
ئەه: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتێکدا کە مەردووم شتێکی ناخۆش لە دەست خۆی یا یەکێکی تر بقەومێ: (ئەه) لە کاتێکدا شتێک بەدەستەوە بشکێت. وتەیەکە نەخۆش بەدەم نەخۆشییەوە بەبێ پەروا دەیڵێت.
ئەها: وتەی بێدارکردنەوە: (ئەها) فیسار کەس! وتەی سەرسوڕمان، (ئەها) لە کاتی بیستنی شتێکی سەیردا. وتەی تەڵفیس: (ئەها) لە وەرامی یەکێکی بێ نموودا کە هەڕەشەیەکت لێ بکات، واتە تۆ چیت؟ کە شتی وات لە دەست بێ.
ئەهاک: ل.قسڵ.
ئەهای: د. وتەی بێدارکردنەوە.
ئەهۆ: ئەها.
ئەهێو: وتەی تەڵفیس و گاڵتەپێکردن.
ئەی: وتەی بانگکردن: (ئەی) خواداد لە دەست ڕۆژگار. وتەی پرسیار: (ئەی) نەریمان لە کاتێکدا کە پێت بڵێن: (وریا) و (نەژاد) چوون بۆ دەرەوە. وتەی وەرام: (ئەی) لە وەرامی یەکێکدا کە پێت بڵێ خوێندووتە؟ واتە بەڵێ. هەی.

ئەیار: مانگی مایس کە سی و یەک ڕۆژە.
ئەیارە: عەیارە.
ئەیرۆ: هەی ڕۆ.
ئەیلوول: مانگی نۆیەمی ساڵی ڕۆژییە کە لە ناوەندی ئاب و تشرینی یەکەم دایە و سی ڕۆژە.
ئەین: ڕۆژی جومعە.
ئەینا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە وەرامی یەکێکدا کە پرسیارت لێ بکا لە کردنی کارێک کە تۆ زۆر سووربیت لە کردنیدا: (ئەینا) لە وەرامی یەکێکدا کە لێت بپرسێ ئایا تۆ ئارەزووی یارمەتیدانی هەژارانت هەیە؟ واتە چۆنم نییە؟
ئەینوو: ئەین.
ئەینە: هـ. ئەوێ.
ئەینی: ئەینوو.
ئەیە: هـ. ئەمە.
ئەیەرۆ: وتەیەکە ژنان دەیڵێن لە کاتی سەرسوڕمان و بیستنی شتێکی ناخۆشدا.
ئەیهـۆ: وتەی پێ هەڵشاخان و وەڕسبوون لە گوفتارێک یا کردارێک. (ئەیهـۆ) لە کاتێکدا کە یەکێک درێژە بدا بە وتارێک یا کردارێک، واتە بیبڕەوە.
ئەیهـوو: ئەیهـۆ. وتەی ڕابردووی هەرە دوور. (ئەیهـوو) لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی زۆر کۆندا، واتە ئەم بەسەرهاتە زۆر کۆن و دوورە.
ئەیی: وتەیەکە داوای دڵنیایی لە وتارێکدا پێ دەکرێ: (ئەیی) لە کاتێکدا کە یەکێک قسەیەکت بۆ بگێڕێتەوە، واتە بەڕاستی وایە ئەیی.
ئەیی: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە وەرامی یەکێکدا کە قسەیەکت بۆ بکا و تۆش باوەڕی پێ نەکەیت و لەگەڵ ئەوەشدا تەڵقیسی پێ بکەیت. (ئەیی) لە وەرامی یەکێکدا کە پێت بڵێ لێت دەدەم، واتە شتی وا لە دەست تۆ نایەت.
ئێ: پیتی باوەڕکردن: (ئێ) لە وەرامی یەکێکدا کە قسەت بۆ بکا، واتە ڕاست دەکەیت. ئا. پیتێکە قسەی پێ دادەمەزرێنرێ لەگەڵ یەکێکدا: ئێ فیسار کەس! لە کاتێکدا کە بتەوێ بیهێنیتە قسە. پیتی سەرسوڕمان.
ئیبراهیمی: جۆرە مقامێکە.
ئێجگار: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ زۆریی شتێک: فیسار کەس (ئێجگار) زیرەکە.
ئێجگارەکی: ئێجگاری.
ئێجگاری: وتەیەکە بڕانەوە و ئەوپەڕی شت پێشان دەدا: فیسار کەس (ئێجگاری) ڕۆیی، واتە جارێکی تر نایەتەوە.
ئیختیار: ئادەمیزادی پیر. ئیختیاربوون: پیربوون. (ئیختیاری) پیری.

ئێد: هـ. ئەمە.
ئێدەک: ز. یەدەک.
ئیدی: ئیتر.
ئێر: هـ. ئاگر.
ئیراق: هـ. بەربەڕۆچکە.
ئێرانە: ئێرە.
ئێرڤست: ز. دارێکی گەڵا وردی هەمیشەسەوزی دڕکاوییە.
ئێرۆ: ز. ئیمڕۆ.
ئێرە: وتەی پێشاندانی جێگای نێزیک.
ئێرەق: دارێکی دووپەلە، پەلە کورتەکەی گاسنی پێدادەکرێ و پەلە درێژەکەی مژانی لێ دەدرێت. ڵاخی یەکسم کە کێری ڕەپ بێ.
ئێرەقان: نەخۆشیی زەردوویی.
ئێرەقبوون: ڕەپبوونی کێری ڵاخی یەکسم، (ئێرەقکردن) ڕەپکردنی کێری ڵاخی یەکسم.
ئێرەقە: ئێرەقی جووت.
ئێزا: د. پاداش: خوا (ئێزا)ت بداتەوە.
ئیزرەم: چوار یەکی حۆقە.
ئێژگڵ: ل. پشکۆ ئاگر.
ئێسا: ئێستا.
ئێساکە: ئێستاکە.
ئیساڵ: ز. ئیمساڵ.
ئیست: وەستانێکی کەم لە کاتی کردار یا گوفتارێکدا. (ئیستکردن) وێستانێکی کەم.
ئیستا: ئێستا.
ئێستا: ئەوودەمەیە کە تۆی تێدایت.
ئیستاکانی: ئێستاکانێ.
ئێستاکانێ: ئێستاکە.
ئیستاکوونی: ئێستاکوونی.
ئێستاکوونێ: ئێستاکانێ.
ئیستاکە: ئێستاکە.
ئێستاکە: ئێستا.
ئێستر: ڵاخێکی چوارپەل قەوی و بارەبەر، دایکی ماینە و باوکی کەر.
ئێسترسوار: سوارەی ئێستری دەوڵەتی.
ئیستە: ئێستە.
ئێستە: ئێستا.
ئیستەکانێ: ئێستەکانێ.
ئێستەکانێ: ئێستا.
ئیستەکە: ئێستەکە.

ئێستەکە: ئێستا.
ئیستەکونی: ئێستەکوونێ.
ئێستەکوونێ: ئێستەکە.
ئیستیکان: پیاڵەی چای.
ئێسقان: شتێکی ڕەقی سپییە لە جەستەی گیاندارەدا گۆشت و دەماری بەسەردا دێ.
ئێسک: ئێسقان، شێوە و تەحر: فیسار کەس (ئێسک)ی سووکە.
ئێسک سووک: بریتییە لە شتی جوان کە بچێتە دڵەوە.
ئێسک قورس: بریتییە لە شتی ناشیرین کە نەچێتە دڵەوە.
ئێسک گران: ئێسک قورس.
ئێسک و پرووسک: ئێسقانی بوواوی ڕزیو: فیسار کەس ئەوەندە دەمێکە مردووە (ئێسک و پرووسک)یشی نەماوە.
ئیسلام: کەسێکە کە لەسەر ئاینی حەزرەتی محەممەد بێ.
ئێسە: ئێستە.
ئێسەتێ: ئێستە.
ئیش: د. وتەی نەفرین: ئیش لەو شتە، واتە تف لەو شتە.
ئیشک: با. بەروو لە دارێکە گوریسی شلبووەوەی پێ توند دەکرێتەوە.
ئێش: ژان و ئازار.
ئێشان: ژانکردنی ئەندام.
ئێشک: ئاگاداری و بەدیارەوەبوونی شتێک.
ئێشکچی: کەسێکە کە بەلای شتێکەوە بێ و ئاگاداری بکا.
ئێشکگر: ئێشکچی.
ئێشکگرتن: ئاگاداریکردنی شتێک و بەدیارەوەبوونی.
ئێغنی: ز. یەغنی.
ئیفتادە: ئادەمیزادی پیری کەفتەکار.
ئیفلیج: کەسێکە کە شەپڵە لێی دابێ.
ئیفلیجی: نەخۆشیی شەپڵە.
ئێڤار: ز. ئێوارێ.
ئێق: هێڵنج.
ئێقدانەوە: هێڵنجدان. قڕقێنەدانەوە. بریتییە لە شەپۆلدانی قەڵەباڵغیی زۆر بەڕەنگێکی وا کە پاشەوپاش بگەڕێتەوە لەبەر زۆری.
ئێقکردنەوە: ئێقدانەوە.
ئێقلاب: بەرکوت.
ئێک: هێلکە.
ئیگرەمبێژرەم: شانزە یەکی حۆقە.
ئێگجار: ئێجگار.
ئێگجارەکی: ئێجگارەکی.
ئێگجاری: ئێجگاری.
ئێگە: هـ. لێرە.
ئێل: عێل.
ئێلاخ: کوێستان.
ئێلاخ: ئێلاخ.
ئێلجاڕی: عیلجاڕی و گەلەکۆمەکی.
ئێلچی: سەفیر و نماینده ، پۆستەچی.
ئێلەک: هێڵەک.
ئیلیان: هـ. هێلانە.
ئیم: ئەم: ئیمڕۆ، ئیمشەو، واتە ئەمڕۆ، ئەمشەو.
ئیمچوون: دەستەیەک ناڵ و بزمار.
ئیمڕۆ: ئەو ڕۆژەیە کە تۆی تێدایت.
ئیمساڵ: ئەو ساڵەیە کە تۆی تێدایت.
ئیمشەو: ئەو شەوەیە کە تۆی تێدایت.
ئێمە: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ پێشاندانی خۆت و ئەو کەسانەی کە لەگەڵتان و بەناوی ئەوانیشەوە قسە دەکەیت.
ئێمەمانان: ئێمە و ئەو کەسانەی کە وەک ئێمە وان: (ئێمەمانان) لە یارمەتیی نیشتماندا کۆتایی ناکەین.
ئێمە و مانان: ئێمەمانان.
ئینج: دوانزە یەکی فووتێک.
ئینجا: ئنجا.
ئینجارە: ز. ئەمجارە.
ئینجاکوو: ئنجاکوونێ.
ئینجاکوونێ: ئنجاکوونێ.
ئینجانە: شتێکی گڵینی سوورەوەکراوە، وەک بنکە گۆزە وایە گوڵی تێدا دەڕوێنرێ.
ئینجە و فینجە: د. دەعیە و دەماری بەبێ جێ.
ئێنە: د. ئەوێ.
ئێوارە: کاتی ڕۆژئاوا.
ئێوارێ: ئێوارە.
ئێوە: وتەیەکە دەوترێ بەچەند کەسێک کە ڕووی قسەیان تێ کەیت.
ئێوەمانان: ئێوە و ئەو کەسانەی کە وەک ئێوە وان.
ئێوە و مانان: ئێوەمانان.
ئیهی: ئەها.
ئی: هـ. ئەم: (ئی) پیاوە، واتە ئەم پیاوە.
ئێی: وتەیەکە هەڕەشەی پێ دەکرێ: (ئێی) با ئەوەت کردبێ. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتێکدا کە چاوەڕوانی تەواوکردنی قسەی یەکێک بکەیت. (ئێی) لە کاتێکدا کە یەکێک قسەیەکت بۆ بکا، واتە دڵم لێتە.

ئیــتــر: وتەیەکــە بەکــاردێنرێ بۆ دەســتــهــەڵگرتن لە شــتــێک و دەستکردن بە شتێکی تر: (ئیتر) تەمەڵی بەسە.
ئیسا: ئێستا.
ئیساکوونێ: ئیساکێ.
ئیساکە: ئێستاکە.
ئیساکێ: ئیساکە.
ئیسال: ز. ئیمساڵ.
ئیسک: ز. قڕقێنە.
ئیسە: ئێستا.
ئیسەتێ: ئێستا.
ئیش: کار و فرمان.
ئیش بەدەست: کــەســێکە کــە فــەرمــاندەر بێ و کــارێکی لەژێر دەستدا بێ.
ئیــشــک: ز. دارێکی باریکە دەئاڵێنرێتە ئەو گوریســەی کــە باری پێ بەستراوە و شل بووەتەوە بۆ توندبوونەوەی گوریسەکە.
ئیشکردن: کار و فرمانکردن.
ئیشکەر: کەسێکە کە ئیش باش بکا.
ئیشگوزار: کەسێکە کە ئیش باش ڕاپەڕێنێ.
ئیشلک: ز. کورتەک.
ئیش لێهاتن: جوانی و ڕێکوپێکیی ئیش لە یەکێکەوە.
ئیش لێهاتوو: ئیشگوزارێکە کە ئیشەکانی زۆر ڕێکوپێک بێ.
ئیشەڤ: ز. ئیمشەو.
ئیکە: ئیتر.
ئیل: ئێل.
ئین: ز. ڕۆژی جومعە.
ئینە: هـ. ئەمە.
ئینەشا: هـ. ئەمەیان.
ئیوەر: ز. ئەوکێ.





ب: پیتێکە دەچێتە سەر ئەمری حازر و غائب: (بـ)خوێنە!، (بـ)نووسە!، (بـ)خوێنێ، (بـ)نووسێ. پیتێکە دەچێتە سەر هێندێ کار (مصدر) لەپاش فرێدانی نیشانەی کاری دەیکا بە کارکەر (اسمی فاعل): (بـ)زان، (بـ)نووس، (بـ)خۆر.

با: شتێکی نادیارە بەهۆی جووڵانەوەی قەبارەیەک لەناو بۆشیدا پەیدا دەبێ. پیتی پەلە و تەئکیدە دەخرێتە سەر ئەمری غائب: (با) بێ، (با) بڕوا. دەبێ بە وەرام بۆ پرسیار لە نەبوونی کارێک: (با) لە وەرامی یەکێکدا کە بڵێ: ئەرێ ئیمڕۆ نەریمان نەچووە بۆ قوتابخانە؟ واتە چووە. جۆرە ئازارێکە دەداتە ئەندامی هێندێ گیاندار: قاچم (با)ی تێ داوە. دەچێتە سەر مازیی ئینشائی و مضارع: (با) بچوویتایە، (با) بچیت، واتە چوونت چاکترە لە نەچوونت. ئارەزووکردنی دەڵی سەگ و بەراز بۆ نێرە: ئەو دەڵە هاتووەتە (با). تەنیشت (ز).

بائەنگێو: کونێکە بای لێ بێتە ژوورەوە.

باب: باوک.

بابا: هـ. باوکی باوک.

بابان: باوان. ناوە بۆ بەرەی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە کە ساڵەهای ساڵ فەرمانداری کوردستان بوون. ناوە بۆ قەڵەمڕەوی بابان.

بابدەست: ز. مەردوومی نابووتی بێ پارە و پوول.

بابدەستی: ز. نابووتی.

بابردوو: بریتییە لە شتی زۆر سووک.

بابردی: جۆرە قوماشێکی تەنکی گوڵگوڵییە وەک شێلە.

بابلیچک: ز. پەنجەتووتە.

بابن: ز. گوڵە بابوونە.

بابۆ: باوک. وتەیەکە وەک وتەی (باوکە) لە ڕووی خۆشەویستییەوە بەکاردەهێنرێ.

بابۆڵە: پاروەنانی پێچراوەی درێژی ئەستوور. مەلۆتکە.

بابۆڵەپێچ: د. پەتێکە مەلۆتکەی پێ دەپێچرێ.

بابوتان: ز. جۆرە یارییەکی منداڵانەیە.

بابوونە: گیایەکی بەهارییی بۆنخۆشە، گەڵای وەک گەڵای شوبیت وایە و گوڵێکی زەردی خڕ دەگرێ، وەک چا جۆش دەدرێ و دەخورێتەوە بۆ هەڵامەت و سک ئێشە.

بابوێر: بادرز.

بابە: وتەیەکە باوکی پێ بانگ دەکرێ.

بابەت: جۆر: گەلێ (بابەت) شت هاتووەتە بازاڕ. لایەن. لە (بابەت) چییەوە قسە دەکەیت؟ واتە لە لایەن چییەوە.

بابەخولێ:جۆرە یارییەکی منداڵانەیە بەگردی خۆیاندا دەخولێنەوە.

بابەعەمرە: بەیەکێک دەوترێ کە بەدیمەن منداڵکار بێ و کەچی وەکی تر زۆر بەعەمر بێ.

بابەلیسک: ز. گێژەڵووکە.

بابی بابی: یارییەکە دەستەیەک تێ دەکەون و دەستەیەک سواریان دەبن و بەدەست چاویان دەگرن، وەستاکەیان بەسەر ئەو یەکەیاندا دەماڵێ کە خۆی سواری بووە دەڵێ: (بابی بابی لە چەند بابی) و لەو حەڵەدا چەند پەنجەیەک هەڵ دەبڕدرێ، ئینجا ئەوی ژێرەوە ئەگەر هەڵی هێنا دەستەکەی ئەو دەبیەنەوە و سواردەبن و ئەو کەسەش دەبێ بە وەستا.

بابینی: د. هەڵامەت.

باپوسکە: د. خۆڵەمێشی کاغەزی سووتاو کە با بیبا.

باپووک: ز. بایەکە کە لەگەڵ بەفربارینداو بێ.

باپەڕ: دەردێکە دووچاری مەردووم دەبێ لە ساردی و گەرمی کەوتنەوە. (باپەڕکردن) دووچاربوون بە باپەڕ.

باپێچ: شوێنێکی چەپەکە کە با گێژی تێدا بخوا. پێچێکە کە بە سکی مەردوومدا بێ.

باپێچک: ز. پێچانەوە و بەستنی شت.

باپێدان: پێچدان بە شتێک.سووڕدان و سەماکردن.

باپیش: ز. چاوێشە.

باپێشک: ز. بای باران.
باپیر: باوکی باوک و باوکی دایک.
باپیره: باپیر.
باپیری: هەنارێکی مزره کە ترشی زۆرتر بێ.
باپیڤان: ز. هەتیوچە.
باپیڤانی: هەتیوچەیی.
باتزۆک: ز. مەردوومی خونکی بێ شەرم و شوورەیی.
باتسمی: ز. جەژنی گەورەی یەزیدی.
باتلاخ: د. زۆنگاو. چورتم.
باتمان: ئەندازەیەکە لە کێشان کە شەش حۆقەیە.
باتۆڤ: ز. جۆرە گیایەکی سوورە.
باتوو: گون.
باتەقا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لەباتی وتەی بە(قەد): (باتەقا)ی تۆ نەریمانم خۆش دەوێ، واتە بەقەد تۆ.
باتینک: با. خونچەی تازە پشکووتوو.
باتینۆک: با. گولالەسوورە.
باتی: بریتی: ئەمە لەباتی ئەوە.
باج: دراوێکە کـە لەلایەن گـەورەیەکی بەدەسـەلاتەوە لە هەمـوو بارێک دەسێنرێ.
باجان: ز. باینجان.
باجگر: کەسێکە کە باج کۆبکاتەوە.
باجگرتن: سەندنی باج لە شت.
باجگە: شوێنێکە کە باجگر باجی تێدا وەردەگرێ.
باج لێگرتن: بریتـیـیـە لە هەڵگرتنی شـتـێک لە شـتـێک بە ناخونەک: تۆ هەرچی ببینیت (باجی لێ دەگریت).
باجە: باجی. قەفـەزەیەکـە لە بانک و سـینەمـا و شـەمەندەفـەردا یەکێکی تێدا دادەنیشێ چەک و بلیتی تێدا دەبڕێ (د).
باجەوان: د. باجگر.
باجی: خوشکی گەورە.
باچک: ز. گەنمەشامیی سوور.
باچیک: ز. هەرزن.
باخ: شینایی لە گوڵ یا بەرزەدرەخت.
باخچە: باخی بچکۆڵە.
باخڵە: دەفرێکە تۆوی تێ دەکرێ.
باخواردن: پێچخواردن.
باخۆر: بادرز.
باخە: باقەی گیا و شتی تر. دەنگ نووساو (ز).
باخەڵ: دووتوێی کالا و بەرگ لە عاستی پەراسوو.
باخەوان: کەسێکە کە چاودێری و سەرپەرشتیی باخ بکا.
بادار: کـەسـێکە (با) دابێـتـیـە ئەندامی. خـواردنێکە کـە ببێ بەمایەی باکردن. بریتییە لە مەردوومی بەفیز.
بادارۆک: ز. جۆرە قردێلەیەکە دەدرێ لە سەری منداڵ.
باداری: دووچاربوون بە نەخۆشی (با).
باداک: ز. گیایەکە بەدار و درەختدا هەڵدەچێ.
بادام: شـتـێکە وەک چەقـالە بەلام ئەم گـەورەتر و خـۆشـتـر و سەختترە.
بادامچە: چەقالە.
بادامی: بە شتێک دەوترێ کە لە وێنەی بادام بێ.
بادان: پێچدانی شتێک. بەبادانی شت.
بادانەوە: بەیەکـدا بـادانی دوو ڕیس و کـردنیـان بەیەک هەودا. بریتییە لە پەشیمانبوونەوە لە قسەیەک یا کردەوەیەک.
باداوە: بادەوە.
بادرخان: ز. جۆرە گیایەکە.
بادرز: درزی زۆر باریک لە شت.
بادرەنگ: د. گیایەکی بۆنخۆشە بەپەنیرەوە دەخورێ.
بادگیر: جۆرە موغـەیرییەکە لە سارداوی هێندێ کۆشکدا دروست دەکرێ بۆ باکێشی هاوینان.
بادە: پیاڵەی ئاوخواردنەوە.
بادەرچوون: د. بریتییە لە لووت بەبەرخۆدا هاتنەوە.
بادەوان: د. قـومـاشـێکی ئەسـتـووری پانی گـەورەیە بە دارێکی بەرزەوە، جۆرە پاپۆرێکی پێ دەڕوا بەهێزی با.
بادەوە: تۆف و سارد و سەرما.
بادی هەڤا: ز. بادی هەوا.
بادی هەوا: خۆڕایی و فیرۆ.
بادی: جامی ئاوخواردنەوە.
بادین: بادی. زێیەکی گەورەیە لە ناوەندی هەولێر و مووسڵدا.
بادییە: هـ. جامی گەورە.
بار: شتێکی قورسی دووتاییە بەولاخ هەڵدەگیرێ. دیوی ڕاست و ڕووی ڕێکی شت: ئەم قالییە لە (بار)ی خۆی ڕانەخراوە یا ئەم بەردە لە (بار)ی خـۆی دانەنراوە. تـوێژاڵێکە دەنیـشـێـتـە سەر لێو لەبەردەم وشکی: لێوی (بار)ی گرتووە. بریـتـییـە لە ئەرک: باری قورسە.
باراش: ئەندازەیەکـە لە دانەوێڵـە کـە ئامـادەکـرابێ بۆ هاڕین و ناردنی بۆ ئاش.
باراش لێکردن: باراشکردن لە ئاش بریـتـیـیـە لە تێـهـەڵکردن و درێژەدان بە قسە: فیسار کەس (باراشی لێ کردووە).
باراشهاڕ: ئاشەوان.
باران: ئاوێکە دلۆپ دلۆپ لە هەور بکەوێتە خوارەوە.
باراناو: ئاوێکە بەهۆی بارانی زۆرەوە کۆبووبێتەوە لە شوێنێک.
بارانبـران: مـانگی حـوزەیران کـە سی ڕۆژە، ئیـتـر بارانی تێـدا نابارێ.

بارانپێو: شتێکە ئەندازەی بارینی باران پێشان دەدا.
بارانە: باجێکە لە هێندێ بار دەسێنرێ. جۆرە گۆرانییەکی کوردیی خۆشە.
بارانی: سەردەرییەکە لە باراندا دەکرێتەبەر بۆ تەڕنەبوون.
باربوو: یارمەتی و دەستگیرۆییی یەکێک لەکاتی لێقەومان و زیان لێ کەوتنێکیدا یا لە ژنهێنان و شایی و زەماوەندێکیدا. (باربووکردن) یارمەتیدانی یەکێک و شت پێ دانی.
باربوویی: باربوو، (باربوو پێکردن) باربووکردن.
بارتەقا: باتەقا.
بارخانە: شوێنێکە کە باری زۆری یەک لەسەر یەکی تێدا دابنرێ.
بارخانوو: ز. شتومەکی ناوماڵ.
بارخانی: ز. بارخانوو.
بارخستن: کردنەوەی بار و خستنی لە شوێنێک. جۆرە کەوتنێکی مریشک و کەڵەشێرە لەسەر تەنیشت.
باردار: د. گیانداری ئاوس.
باردان: ز. بادان.
باڕ: بەچکەی هێندێ پەلەور کە لە جووجەڵەیی دەرچووبێ.
باڕاندن: باڕەکردنی مەڕ و بزن.
باڕن: د. شوێنێکە با بیگرێتەوە.
باڕۆکە: مریشکی باڕ.
باڕە: دەنگی مەڕ و بزن، (باڕە باڕ) باڕەی یەک لەسەر یەک.
باڕەش: ڕەشەبا.
باڕێزە: جۆرە گیایەکی سەوزی سێ پەڕەیە لە گوێ کانیاو سەوز دەبێ. وردەیەکە کە لە شت بێتەوە.
باڕێسە: د. فڕفڕۆکەی منداڵان کە با دەیخولێنێتەوە.
بارسایی: بارست.
بارست: قەبارەیەکە لە زەوی بەرز بووبێتەوە.
بارستایی: بارست.
بارسووکی: بریتییە لە بوونی مەردووم بەسووکبار و کەم ئەرک.
بارش: بارشت.
بارشت: بارانی وردی لەسەرخۆ.
بارکردن: کۆچکردن.
بارکەوتن: بریتییە لە بەدبەختی و نەهاتی.
بارکەوتوو: بریتییە لە یەکێک کە بەدبەختی و نەهاتی ڕووی تێ کردبێ.
بارکەوتە: بارکەوتوو.
بارکێش: وڵاخ. بریتییە لە یەکێک کە ئەرکێکی قورس کەوتبێتە سەری.
بارکێشان: بریتییە لە هەڵگرتنی ئەرکێکی قورس.
بارکێشی: خەریکبوون بەهەڵگرتن و هێنان و بردنی باری ئەم و ئەوەوە.
بارگاه: بارەگا.
بارگر: دارێکە دەدرێتە بەرباری هەرە سەروو لە چەند بارێکی زۆر کە بارخانە کرابن بۆ ئەوەی کە نەڕووخێ.
بارگە: نوێن و کەلوپەلێکە کە ڕێبوار بیکا بەبار و لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرێ بەوڵاخ.
بارگەچی: کەسێکە هەر ئاگای لە بارگە بێ.
بارگیلی: ز. بارگیر.
بارگیر: ئەسپی بارەبەر.
بارگیل: ز. بارگیلی.
بارگین: بارگیر.
بارمتە: شتێکە دادەنرێ لەلای یەکێک بۆ دڵنیایی لە بەرامبەر شتێکیدا کە لە لاتە بەڕەنگێکی وا کە بارمتەکە بەنرختر بێ.
بارنامە: د. کاغەزێکە ناوی ئەو شتانەی یەک بەیەک تێدا دەنووسرێ کە دەنێردرێ بۆ شوێنێک.
بار و بنە: ماڵ و کۆچ.
بارۆشە: د. باوەشێن.
باروونە: د. بادرەنگ.
باروو: بارووت (ز). قەڵا و قولله (د).
بارووت: دەرمانێکی بەهێزی ئاگرسێنە فیشەک و گوللەی پێ پڕ دەکرێ.
بارووتپێچ: ز. کەسێکە کە بارووت دروست بکا.
باروود: ل. بارووت.
بارە: لایەن؛ لە (بارە)ی منەوە چیت بیستووە؟ مووچە و بەش. عەرەبانەی دەستی (ز).
بارهاتن: د. هاتنەبەر و پێگەیین؛ درەختەکە یا منداڵەکە بارهاتووە: واتە پێ گەیشتووە.
بارەبوو: باربوو.
بارەبەر: وڵاخێکە کە بار بەرێ.
بارەچە: د. مووچە و بەش.
بارەکی: بارەبەر.
بارەگا: کۆشک و سەرای گەورە.
بارهنگێڤ: ز. کەسێکە مەردووم تووڕە و پەست بکا.
بارێ: وتەیەکە لە جێی وتاری (هیچ نەبێ) بەکاردێنرێ: (بارێ) کە خێرت نییە شەڕیشت نەبێ.
بارێزە: د. باخۆر، درەختێکە کە با بەری وەراندبێ.
باریە: نوێڵ.
باریک: شتێکە ئەستوور نەبێ.
باریکان: ڕیسی زۆر باریک.

باریکایی: عاستی باریکیی شت.
باریکبوون: بریتییە لە لاوازبوون.
باریک و بنێسی: لاوازبوون لە نەخۆشیی دووروودرێژەوە: فیسار کەس داویەتییە (باریک و بنێسی).
باریکە: دروومانی سەر پەڕاوێزی کەوا. ناوی دێیەکە لە ناوچەی عەربەت.
باریکەڕێ: ڕێگای باریکی تەسک.
بارین: هاتنەخوارەوەی باران. هێنان (ل).
بارینە: وەنەوز.
باز: باڵندەیەکی تیژڕەوی گۆشتخۆری ڕاوکەری چاوجوانە. بازد. دووبارە: (باز) هاتەوە. وتەیەکە بەدوای هەر وشەیەکەوە نووسا دەیکا بە(صیفەتی مشبّه): قومار (باز)، فێڵ (باز).
بازاڕ: چەند دوکانێکە کە جێگای کڕین و فرۆتنی تێکڕایی بێ. سەودا: (بازاڕ)ی گەرمە.
بازاڕتیژی: د. بازاڕگەرمی.
بازاڕکەساسی: بریتییە لە بێ بازاڕی.
بازاڕگەرم: کەسێکە کە کڕین و فرۆتنی زۆر بێ.
بازاڕگەرمی: بریتییە لە فرۆتنی زۆر و برەو لە بازاڕدا.
بازاڕی: بریتییە لە ئادەمیزادی هیچ و پووچی بێ مایە. بریتییە لە شتومەکێک کە تایبەتی و چاک نەبێ.
بازبازان: د. بازدبازدێن.
بازبازۆکێ: بازبازێن.
بازبازێن: بازدبازدێن.
بازبەند: بازیبەند.
بازد: خۆهەڵدان لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر.
بازدان: ز. مردن. بەتایبەتی مردنی بزن و مەڕ.
بازدبازدۆکێ: بازدبازدێن.
بازدبازدێن: بازدی یەک لە دوای یەک.
بازدبردن: بازددان.
بازدپەڕین: د. بازدبردن.
بازددان: بازدبردن.
بازدەبەران: ناوەڕاستی بەهارە کە شەوی دوو دەقیقە درێژ دەبێ.
بازدەڵبازد: بازدبازدێن.
بازر: مەلێکی گۆشتخۆرە بەقەد ڕیشوڵەیەک دەبێ ڕەنگی بۆرە قنەیە.
بازرە: د. گەڕانەوەی گوللە لەپاش ئەوەی کە لە نیشان بدا.
بازرگان: کوتاڵفرۆش.
بازرگانی: کڕین و فرۆتنی کوتاڵ.
بازرە: د. کەوانە.
بازرەقە: لەپڕ دەرچوونی گیاندار بەچالاکی: مارەکە (بازرەقە)ی بەست، فیچقە بەستنی خوێن لە جەستە و شتی شل لە دەفرێک کە کونی تێ بێ.
بازگ: بەڵەک.
بازگوور: ز. هیوا و ئومێد. یارمەتی.
بازگووری: ز. یارمەتی.
بازگە: شوێنێکە کە بازدی لێوە بدرێ.
بازگەشت: پەشیمان.
بازگەشتی: پەشیمانی.
بازمان: د. منداڵێکە لە دوای باوکی بەجێ مابێ: (با زمانەکان) خۆش بن.
بازن: شتێکە لە زێڕ یا زیو و یا شتی تر، ژنان بۆ جوانی دەیکەنە مەچەکیان.
بازنە: تەوقێکە لە ئاسن وەک بازن دروست دەکرێ و لە شتێک دەگیرێ کە درزی تێ بووبێ.
بازۆڕ: د. واشە.
بازۆڕی: بازۆڕ.
بازۆڵە: قۆڵ و بازووی قەڵەو.
بازوو: ناوەندی شان و ئانیشک لە پەلی ئادەمیزاد. بەڵەک. لاشیپان.
بازووبەند: شتێکە لە زێڕ یا زیو و یا چەرم دروست دەکرێ و دەکرێتە بازوو.
بازە: بەڵەک: جۆرە تەنراوێکە.
بازەبەران: مانگی شوبات کە بیست و هەشت ڕۆژە و شەوگار درێژ دەبێتەوە و، هەموو شەوێک دوو دەقیقە درێژ دەبێ.
بازەڵە: شتێکە کە کەمێک بەڵەک بێ. منداڵێکە کە کزر و گەورە بووبێ.
بازەڵە خوێندن: بریتییە لە بێ شەرمی و چاونەترسیی یەکێک: فیسار کەس چاک (بازەڵەی خوێندووە).
بازەوان: کەسێکە کە باز بەخێو بکا.
بازی: یاری.
بازیبەند: بازووبەند.
باژاڕ: ز. شار.
باژاڕی: ز. شاری.
باژەڵە: دەردێکە بەمنداڵی ساوا دەگا و هەموو لەشی دەکا بە لیر.
باژێڕ: بازاڕ. شار (با).
باژێڵە: د. باژەڵە.
باژیڵە: باژەڵە.
باس: دوان لە بابەت شتێکەوە: (باس)ی کەس بەخراپە مەکە.
باستورمە: باسورمە.
باستێک: ز. باسوق.

باسـقـەندە: داردەسـتـێکە کـە لـە داری بەڵاڵووک کـرابێ. هەمـوو دارێکی باریکی لووسی کـونکراوە کـە کـرابێ بەدەسکی قەندە.
باسقەنگە: باسقەندە.
باسک: ناوەندی مووچەی دەست و ئانیشک. شانی شاخ و باڵ.
باسکردن: گفتوگۆکردن لە شتێک.
باسکە: باسک.
باسکەسەگ: جۆرە سەگێکی باریکەڵەیە باوکی گەماڵە و دایکی تانجییە.
باسکەمەلە: جۆرە مەلەیەکە بەجووڵاندنی باسک دەکرێ.
باسکێش: مژان.
باسمباز: ز. هەفتەیەکی باراناوییە لە مانگی ئازاردا.
باسمبێڵ: ز. مەردوومی بەفیزی خۆپەرست.
باسمبێڵی: ز. خودپەرستی.
باسنامە: نامیلکەیەکە کە چەند سەرگوزەشتەیەکی تێدابێ.
باسوخ: د. باسوق.
باس و خواس: دەنگوباس.
باسورمە: گۆشتی قیمەکراوی سوێرخوێیە لەگەڵ بەهاراتدا لەناو ڕیخوڵەدا هەڵدەگیرێ.
باسوق: جۆرە خواردەمەنییەکە لە نیشاستە و شیلەی ترێ دروست دەکرێ و سەلک سەلک دەبڕدرێ.
باسـەرە: شـوێنێکە کـە با زۆر بیگرێتـەوە. ناوە بۆ ڕووبارێک لە ناوچەی بازیان. ناوە بۆ دەربەندێک لە ناوچەی ناوبراو.
باسیکردن: ز. لاساییکردنەوە.
باش: شتی چاک.
باشار: ژیان. چارەکردن.
باشـقـەپان: جـۆرە مـارێکی ئەسـتـووری درێژی زەردە سـەر کلکی خڕە.
باش و بۆشی: دەست بڵاوی و ماڵ بەفیڕۆدان.
باشوکە: باڵندەیەکی دەنووک کەوانەییە لە واشە بچووکترە ڕاوە چۆلەکەی پێ دەکرێ.
باشەڵ: باشێڵ.
باشێل: باشێڵ.
باشـێڵ: چارۆکـەیەکـە ژنـان دەیگرنـە کـۆڵیـان و دوو سـەرەکـەی خوارەوەی دەبەستنە پشتیان بۆ ئەوەی شتی تێ بخەن.
باشی: چاکی.
باشیل: باشێڵ.
باشیلا: ز. مەردوومی ئاوارە.
باشی و بۆشی: باش و بۆشی.
باعاندن: باڕاندن.
باعە: باڕە، (باعەباع) باعەی یەک لە دوای یەک.
باغ: باخ.
باغـە: جـۆرە شـتـێکە لە بنێشت دروست دەکـرێ. جـۆرە برینێکی پیسە لە چوارپەلی وڵاخی بەرزە دێ.
باغەڵ: باخەڵ.
باغەوان: باخەوان.
بافت: شایستـە، فیسار کەس بافتی ئەوەیە بخرێتە سەر سەر. ریس و چنین: ئەم قاڵییە (بافت)ی کاشانە.
بافـتـە: جۆرە قـەیتـانێکی تەنراوی پانە دەگـیـرێ بەلێـواری کـەوا و سوخمەدا.
بافرە: کەتیرەی سپی.
بافلە: ز. نۆ موسڵمانی کۆنەگاور.
بافوو: د. تلیاک.
بەفیاگ: د. شتی چنراو.
بافین: د. تەنین. هۆنینەوە.
بافبرا: ز. برای باوکی.
بافی: با. بادام.
باق: با. پووز.
باقاندن: باقەکردن.
باقانن: باقاندن.
باقـر: ژەنگی دەفـری مـسـین. عـەیبی ونی نادیار: پیـاوی نەخوێندەوار کە قسەی کرد. (باقر)ی دەردەکەوێ.
باقلک: با. سڵق.
باقلە، پاقلە: بەری (لو) (ھ).
باقۆ: هەنجیری نەگەییو.
باقـە: چەپکێک لە گیـا یا لە گـوڵ. دەنگێکە وەک دەنگی بزن و ڕێوی.
باقە باق: باقەی یەک لە دوای یەک.
باقـە بەس: شـتـێکە کـە گـەنم و دەسکەگـوڵ و شـتی تری پێ بەبەسترێ. (د) شتێکە کە بە باقە بەسترابێ.
باقە بەست: باقە بەس.
باک، ترس: فیسار کەس بێ (باک)ە.
با کردن: پەیدابوونی با لە سکدا. ئاوسان، بریتییە لە تووڕەبوون.
با کۆڤە: ز. میوەی نەگەییو.
باکور: لای چەپ (شیمال).
باکوزیرک: با. بەفرێکە کە بەباوە ببارێ.
باکەش: کەڵەشاخ. بابوێر.
با کەشگرتن: کەڵەشاخ گرتن لە شوێنێک لە ئەندام بەبێ جنینی.
باکەڤ: خشتێکە کە باش سوور نەبووبێتەوە و، بەخستنە ناو ئاو هەڵ بوەرێ.

باکێش: بادگیر.
باگا: د. شوێنی باگر.
باگر: شوێنێکە کە با بیگرێتەوە.
باگردان: باگردێن.
باگردێن: شتێکی خڕی ئەستووری درێژکۆڵەی قورسە لە دار یا لە بەرد بانی پێ دەگێڕدرێ لە کاتی باران باریندا.
باگژە: د. بایەکە لە ناوەندی شەماڵ و سەبادا.
باگوردان: باگردێن.
با گونە: جۆرە نەخۆشییەکە دەداتە گونی نێرینە لە غوبابییەوە و، هەڵیدەئاوسێنێ.
باگەڕ: ز. بای بەهێز.
با گەڕێن: ز. بانگوش. باگردێن.
باگێژە: گێژەڵووکە.
باگیر: با گا.
باڵ: پەلی گیاندار. دوو ئەندامە بەڕاست و چەپی باڵدارەوە، پێی دەفڕێ.
باڵا: درێژیی شت.
باڵابەرزە: پەنجەی سێیەمی دەست.
باڵاپۆش: عەبا.
باڵادەست: کـەسـێکە کـە بەدەسـەڵاتتـر و دەست ڕۆیووتر بێ لە یەکێکی تر: ئەم (باڵادەست)ی ئەوە.
باڵاڕوان: ئاوێنەی گـەورەیە کـە بـاڵای مـەردوومی تێـدا دیار بێ. پەنجـەرەیەکـە لە نزیـک بنمیـچـەوە دەکرێتەوە بۆ ڕووناکی و باکێش.
باڵاشمە: د. باڵیشمە.
باڵاشەمە: د. باڵیشمە.
باڵافڕ: ز. فڕۆک.
باڵاڤ: ز. بەرگو. کاڵایەکە کە بۆ شوشتن ئامادە کرابێ.
باڵاڤی: ز. سوێنەی جل شوشتن.
باڵاڤ: با. جلشۆرین.
باڵاکردن: درێژبوونی قەد و باڵا. بریتییە لە گەشەکردن : گەز گەز (باڵا دەکەم) واتە لە خۆشیاندا گەشە دەکەم.
باڵاگەردان: کەسێکە کە خۆی بگێڕێ بەدەوری یەکێکدا.
باڵانوێن: ئاوێنەی باڵاڕوان.
باڵانی: جۆرە ئێسـترێکی بچکۆلانەیە کە پێی دەڵێن: (ئێسـترە گایلکە).
بالباز: سەرباز.
باڵبەست: کەسێکە هەردوو باڵی لە پشتەوە بەسترابێ.
باڵبەستکردن: بەستنی هەردوو باڵی مەردووم لە پشتەوە.
باڵبەستن: باڵبەستکردن.
بالتوز: ز. ژن خوشک.
باڵتە: ل. تەشوێ. تەور.
باڵخەنجەرە: مەلێکە لە کۆتر بچووکترە لە کاتی فڕیندا باڵی وەک خەنجەر لێ دێ.
باڵدار: گیاندارێکە کە بەباڵ بفڕێ.
باڵگرتن: فڕین.
باڵگرتنەوە: فڕینی باڵندە.
باڵگک: ز. سەرین.
باڵگە: ز. سەرین.
باڵگیڤ: ز. سەرین.
باڵندە: باڵدار.
بالنگو: د. بادرەنگ.
بالویک: با. بالووکە.
بالۆ: ز. وتەیەکـە لە جـیـاتی وتاری: (بە لای کـەمـەوە) بەکـار دەهێنرێ.
بالۆرە: جۆرە گۆرانییەکی کوردییە.
بالۆرێ: بالۆرە.
باڵۆز: باڵیۆز.
بالۆکە: بالووکە.
باڵۆن: جۆرە فڕۆکەیەکە.
بالوور: ز. قنگی مریشک.
بالووک: د. بالووکە.
بالووکە: گرێیەکی بچکۆلانەیە لە جەستەی گیاندار پەیدا دەبێ.
باڵووڵە: پاروو.
باڵە: مـەردوومی گـێلی تێ نەگـەیشـتـوو (ز). بارەی کـارژۆلە. دەسکێشی چەرم.
باڵە: دەسکێشی چەرم. پێڵاسن (هـ).
باڵەبان: بـاڵندەیەکی گـۆشـتـخـۆری خـێرای ڕاوکـەرە لە باز گـەورە ترە. جـۆرە ئێـسـتـرێکی زەلامـە. پارچەیەکـە لە پارچەکـانی مۆسیقا.
باڵەتە: ز. سەرەتای گەیینی میوە.
باڵەتەپە: باڵەتەپێ.
باڵەتەپێ: باڵەفڕێ.
باڵەخانە: سەرخان.
باڵەشنە: ز. سەرینی بچکۆلانە.
باڵەشۆرە: باڵەشۆڕی.
باڵەشـۆڕێ: جـۆرە نەخـۆشـیـیـەکـە دەگـا بەجـووجـەڵەی مـریشـک باڵەکانی شۆڕ دەکا و دەیکوژێ.
باڵەفرە: باڵندەیەکە تازە باڵی گرتبێ. فرەفرکردنی مەل بەباڵی.
باڵەفڕێ: باڵەفرە.

باڵەکرە: دارێکی درێژە تەختەیەک بە سەریەوەیە خۆڵ و خاشی پێ کۆدەکرێتەوە.
باڵەوان: باڵندەیەکی گۆشتخۆری ڕاوکەرە.
باڵێ: هـ. باڵەدارینە.
باڵیشت: ل. سەرین.
باڵیشمە: داری سەرینی گورگە و دارەڕا و سەرتاق.
باڵێف: سەرین.
بالیفک: با. سەرین.
باڵێن: د. سەرین. پشکۆڵ.
باڵیۆز: شابەندەر.
باڵیۆزخانە: کۆشکێکە شابەندەری تێدا دادەنیشێ بۆ بەجێهێنانی کاروباری مەردووم.
بالیف: باڵێف.
باڵین: د. سەرین.
باڵینە: شتێکە بەگردی لە پەڕۆ دروست دەکرێ لەسەر تەنەکەی منداڵ دادەنرێ و لە سەری ڕادەهێڵرێ، یا کرێکار دەیخاتە سەر سەری و شتی قورسی لەسەر دادەنێ.
بام: پیتی پەلە و تاکیدە دەخرێتە سەر ئەمری غائب و متکلمی وحدە و متکلمی مع الغیر: (بام) بڕوا، (بام) بڕۆین، (بام) بڕۆم.
بامجان: د. باینجان.
بامجان مەزرەنگی: د. تەماتە.
بامێ: گیایەکی بەرزی گەڵاپانە بەرێک دەگرێ وەک بەڕوو، دەکرێ بەچێشت.
بامیە: بامێ.
بان: سەر سەری شت، سەربان.
بانبارگە: بەربووکێکە کە لەسەر بارگەی بووکەوە سوار دەکرێ دەنێردرێ بۆ ماڵی زاوا.
بانبانک: مشکێکی درێژکۆلەیە دەڵێن گوایە هەر لەسەر کۆمای زێڕ دەنوێ.
بانپووشین: لاگیرە.
بانتلێن: بانگردێن.
بانجیلە: د. بانی نزمی بچووک.
بانسەر: دراوێکە دەدرێ لە تەوقەسەری کڵاوی ژنان بۆ پێداکردنی ئەڵقەی دەسماڵی.
بانق: شوێنێکی تایبەتییە پیشەی هەر پارەوەرگرتن و پارەدانە بەم و بەو بەسوود.
بانقۆ: جۆرە قومارێکە.
بانگ: چەند وتارێکی ئاینیی تایبەتییە (بانگدەر) لە سەرەتای هەموو نوێژێکەوە بەدەنگی بەرز دەیڵێ بۆ ئاگادارکردنەوەی نوێژکەران. هاوار. (بانگە بانگ) بانگی یەک لە دوای یەک. بانێ.
بانگاواز: بانگکردن بەدەنگی بەرز. ئەندازەیەکە کە دەنگی بەرز بیگاتێ.
بانگدان: وتنی بانگ بۆ نوێژکەران.
بانگدەر: کەسێکە کە بانگ بدا بۆ نوێژ.
بانگرۆزبوونەوە: گلۆربوونەوە.
بانگکردن: هاوارکردن. بانگێشتن.
بانگردێن: باگردێن.
بانگلێر: باگردێن.
بانگلێن: بانگلێر.
بانگوش: کەسێکە کە بان بگێڕێ بەپارە.
بانگەڕ: باگردێن (ز). بانگوش.
بانگەواز: بانگاواز.
بانگهەڵدان: گریان بەدەنگی بەرز.
بانگێڕ: بانگوش. باگردێن.
بانگێشتن: بانگکردن بۆ سەر شیرینی و نانخواردن.
بانگێن: د. شتێکە کە لە سەری سەرەوە بێ.
بانما: د. شتێکە ئەندازەی با و گەرمی و ساردی پێشان دەدا.
بانماڵ: د. بەفرماڵ. سەربان.
بانۆک: کەسێکە کە ساوا بەدایکە نەبانەکەی هەڵبگرێتەوە. نەبان.
بانوو: خانم: لێم بووە بە(بانوو)ی بانووان.
بانە: ئەو خانانەیە کە جووتیار لە وەردا دەیکێشێ بۆ ئەوەی کە تۆوی پێوە بکا و بزانێ کە چەندی تۆو کردووە لە زەوییەکە. جێ لەوەڕی بەهاری ئاژاڵ (ز). بەرزایی ناوەندی دوو دێراو (ل). ناوی شارێکی کوردە لە ڕۆژئاوای کوردەواریی ئێران.
بانەگا: جێی ڕووانی مووی خوار بەرمووسڵدان.
بانەناو: هـ. سواخ.
بانەوبان: بازدان لە بانێکەوە بۆ بانێکی تر.
بانی: تەپڵەسەری شاخ یا گردێکە کە تەخت بێ. سەربان.
بانیژە: بانی نزمی بچووک.
باو: دەستوور: فیسار شت بووە بە(باو). باوک. زیادەی شتێک بەسەر شتێکی تردا: ئەم کۆمەڵە گەنمە (باو)ی هەیە بەسەر ئەو کۆمەڵەدا، یا نەریمان لە زیرەکیدا (باو)ی بەسەر سالاردا هەیە، واتە لەو زیاترە.
باوا: باوکی دایک. باوک (ل).
باوام: ل. بادام.
باوان: ماڵە باوک.
باوانی: ئەو شتومەکەیە کە لە ماڵی باوکەوە لەگەڵ بووکدا دەنێردرێ.

باوبژە: بایەکە کە لەناو سکدا قۆڕەقۆڕ بکا.
باوجو: باوجوود.
باوجوود: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (لەگەڵ): نەریمان (باوجوود)ی نەخوێندەواریشی لە وشیار زیرەکترە، واتە لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا هەر ئەو وریاترە.
باودیان: د. شتێکە کەرێکی ئارەزووبێ: ئەو خواردنە یا ئەو فاسۆنە (باودیان)ی فیسار کەسە واتە بەئارەزووی ئەوە.
باو سەندن: زاڵبوون بەسەر شتێکدا: فەرهاد (باوی سەند) بەسەر ڕۆستەمدا. بوونی شت بە باو.
باوکە: چۆلەکەی نێر. وتەیەکە لە ڕووی خۆشەویستییەوە بەیەکێک دەوترێ.
باوکەڕۆ: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتی شیوەندا.
باوکەلێ: وتەیەکە دەوترێ بەیەکێک لە ڕووی خۆشەویستییەوە.
باوش: باوەش.
باوشک: باوێشک.
باوک: نێرینەیەکە کە منداڵی لێ بکەوێتەوە.
باوڵ: باوەڵ.
باوەئیرک: ز. ئەڵقەی مسین یا ئاسنین.
باوەپیاو: مێردی دایک.
باوەت: د. بابەت.
باوەجوو: باوجوود.
باوەخولێ: بابەخولێ.
باوەخون: بردنەوەی بووکی تازە لەلایەن ماڵی باوکیەوە لەپاش چەند ڕۆژێک لە گوێزانەوەی.
باوەخۆن: باوەخون.
باوەخوون: باوەخۆن.
باوەڕ: چوونە دڵی قسەیەک.
باوەڕکردن: چەسپینی قسەیەک لە دڵدا.
باوەڕپێکراو: کەسێکە کە باوەڕ بەقسەی کرابێ. کەسێکە کە بیکەی بە جێنشینی خۆت لە کارێکدا و باوەڕت پێی بێ.
باوەڕپێکردن: باوەڕکردن بەیەکێک.
باوەژن: ژنی باوک.
باوەش: کۆش و بەرسنگ.
باوەش پیاکردن: باوەشکردن بە شتێکدا.
باوەشگرتن: گرتنە باوەشی شتێک.
باوەشێن: شتێکە بەسووڕانەوە و ڕاوەشاندنی بای فێنک پەیدا بکا.
باوەقۆت: د. پیاو و ژنی بچکۆڵەی باڵا نزم.
باوەڵ: جۆرە سندووقێکە کە کاڵا و کەلوپەلی تێ دەخرێ و بەدەست هەڵدەگیرێ.
باوەڵبوون: گۆتبوونی کار و بەرخ بەهۆی نەخۆشیی (باوەڵی)یەوە.
باوەڵی: جۆرە نەخۆشییەکە دەداتە ئەژنۆی کار و بەرخ دەیئاوسێنێ و گۆتی دەکا.
باوێشک: جۆرە دەم داچەقاندنێکە بەبێ ئارەزوو لە کاتی خاوبوونەوەی جەستە و خەوبردنەوەدا.
باوێشکدان: دەم داچەقاندن لە کاتی باوێشکدا.
باویلکە: پەپوولە پایزە: (باویلکە) بایەکی بەسە.
باوی: بادام. بادار (ز).
باهاتن: هاتنەبا.
باهوڕ: ز. ڕەشەبا.
باهۆڕ: با. ڕەشەبا.
باهوو: شان و قۆڵ. دارێکی شووشەییە دەکرێ بەچوارچێوەی پەنجەرە و دەرگا و شتی تر. ئاسۆ.
باهوودار: ئادەمیزادی چوارشانەی بەخۆرە.
باهەنجیر: هەنجیرێکی بێ تامە لەپێش هەنجیری تردا پێ دەگا.
باهێر: د. زەوییەکە کە شتی تێدا نەڕوێ. سەراسیمە.
باهێف: با. بادام.
بای: شقارتە.
بایام: ل. بادام.
بایجان: د. باینجان.
بایس: بایست.
بایست: هۆ: بوویت بە(بایست)ی کوشتنی فیسار کەس.
بایستی: هۆیەتی.
بایسی: بایستی.
بایلکە: باویلکە.
بایلە: د. جۆرە تەنراوێکی زۆر تەنکی ناسکە.
باینجان: گیایەکی گەڵاپانە بەرێکی قاوەیی تۆخ دەگرێ وەک چەکەی هەلاج دەکرێ بەچێشت. تەماتە.
باینجانی: شتێکە ڕەنگی وەک ڕەنگی باینجان وابێ.
بایەخ: دەگەر و باوەڕ: (بایەخ)ت نییە یا (بایەخ)ت پێ ناکەم.
بایەف: داری چەقالە.
بایەقوش: جۆرە باڵندەیەکە لە کوندەبەبوو دەچێ.
بایەو: بایەف.
بایی: کەسێکە لە خۆی خەرۆ بووبێ. وتەیەکە پرسیاری نرخی شتی پێ دەکرێ: ئەم شتە (بایی) چەندە. بادام. جامی ئاو خواردن.
بایدە: لەگەن.
ببڕای ببڕای: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ نەکردنەوەی کارێک بەئێجگاری: (ببڕای ببڕای) ئیتر ئەو کارە بکەم.

بیلە: د. بەچکەی گیاندار.
بت: وێنەیەکی قەبارەداری دروستکراوە بۆ پەرستن.
بتپەرست: کەسێکە کە بت بپەرستێ.
بتپەرستی: پەرستنی بت.
بتخانە: شوێنێکە کە بتی تێدا بپەرسترێ.
بتر: شتێکە کە لە هاوەڵەکانی زووتر پێ بگا و بەخۆیدا بێ (ز).
بتربوون: ز. زووتر پێگەیشتن و زیاتر بەخۆداهاتنی شتێک لەناو هاوەڵەکانیدا (ز) زۆرتربوون.
بتەو: پتەو.
بتەوی: عاستی پتەویی شت.
بچڕان: پچڕان.
بچڕاندن: پچڕاندن.
بچرک: ناوساجی (ز).ناسکەنان (با).
بچڕیان: د. پچڕان.
بچڕین: د. پچڕین.
بچرک: ز. کولێرە بەرۆن.
بچکۆلانە: پچکۆلانە.
بچکۆلە: پچکۆلە.
بچکەلە: د. پچکۆلە.
بچکەڵە: پچکۆلە.
بچۆلە: د. بچکۆلە.
بچووک: پچووک.
بچووکی: پچووکی و بەندەگی.
بچەنگانی: ز. چنگەپۆپانێ.
بختیان: بوختان.
بخۆر: زۆرخۆر. کەسێکە کە خواردنی باش بخوا.
بخورد: شتێکە وەک کەتیرە دەسووتێنرێ بۆ بۆنخۆشی.
بخوردان: دەفرێکی تایبەتییە بخوردی تێدا دەسووتێنرێ.
بخوز: د. گایەکە کە لە کاتی کاردا بنوێ.
بخوور: بخورد.
بخووردان: بخوردان.
بخێری: ز. موغەیری.
بدوو: کەسێکە کە بزانێ بدوێ.
برا: نێرینەیەکە کە لە باوک و دایکت یا لە یەکێکیان بێ.
برابەش: کەسێکە کە لە شتێکدا لەگەڵتدا هاوبەش بێ.
برادەر: دۆست و ئاشنا.
برادەری: دۆستی و ئاشنایەتی.
برازا: منداڵی برا.
برازازا: منداڵی منداڵی برا.
برازاڤا: ز. برازاوا.
برازاگ: د. برازا.
برازاوا: برا یا برادەرێکی زاوایە کە لە رۆژی بووک گواستنەوەدا پشتێنی بووکەکە ببەستێ.
برازە: ز. شتێکە کە شتی قورسی پێ بەرز بکرێتەوە. برازا.
برازی: ز. برازا.
براژن: ژنی برا.
براڵوو: هـ. پەلالووک.
براله: وتەیەکە دەوترێ بەیەکێک لە رووی خۆشەویستییەوە. جۆرە گیایەکە. ناوە بۆ دێیەک لە ناوچەی پێنجوین.
براڵە: برالەی خۆشەویست.
برامازگ: د. جۆرە بەرێکە لە بەری مازوو.
برایتووتە: پەنجەی تەنشت پەنجەتووتە.
برایەتی: بوونی دوو کەس بەبرا. برادەری.
برایی: برایەتی.
برت و بۆڵ: لەبەرخۆوە بۆڵەبۆڵکردن.
برجی پیرێژن: حەوت رۆژی زۆر ساردە لە دواییی زستاندا، چواری بەر شوبات و سێی بەر ئادار دەکەوێ.
پرچی: ز. برسی.
بردن: لەگەڵ خۆدا هەڵگرتنی شتێک لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر.
بردنەبەست: رێگرتنی یەکێک یا شتێک لە یەکێک: فیسار کەس رێگای لێ (بردووینەتە بەست)، یا ئاوەکە رێگای (بردۆتە بەست).
بردنە سەر: تەواوکردنی کارێک یا وتارێک: هەرچی دەکەی (ببیەرە سەر).
بردنەوە: سەرکەوتن و زاڵبوون لە یاریدا. بردنی شتێک بۆ شوێنێک دووەم جار.
بڕ: لێ: (بڕ)ێک دار. هێند (بڕ) ێک دانیشە. گۆترە: لە (بڕ) ئەم کارەم بۆ بکە. بوار: ئەم ئاوە (بڕ) نادا.
برادە: ڕێزە ئاسنی وردە کە لە ئاسنی رنراو دەبێتەوە.
بڕان: پچڕان: گوریسەکە (بڕا). بڕینداربوون بەتیغ: دەستم بەچەقۆ (بڕا).
بڕانەوە: نەمانی شت. پچڕانەوە: تەزبێحەکەم (بڕایەوە) واتە پچڕایەوە.
بڕبڕاگە: بڕبڕەی پشت.
بڕبڕە: ئێسکی زنجیرەداری موورغەی پشت. داسێکی پچکۆلەی کەوانەدارە وەک مشار. نەتەوەی ساغی تیرەیەک: ئەم پیاوە لە (بڕبڕە)ی بابانە.
بڕبوون: جیابوونەوە و لێکبڕانی هێندێ گیاندار لە یەک.
بڕەند: پارچە پۆلایەکی درێژکۆلەی گرنج گرنج و رووشە شتی پێ دەکرێنرێ.

بڕبەنک: بڕبەند.
بڕدان: جوێکردنەوەی شتێک لە شتێکی تر.
بڕس: د. بڕست.
بڕست: هێز و هەناو: (بڕست)ت بڕیم.
بڕشت: پارچەی سەرەمەقەست. تیژیی مەقەست و تیغ: ئەم قەیچییە یا ئەم چەقۆیە بێ (بڕشت)ە. پیت و بەرەکەت: دەغڵودانی ئیمساڵ بە(بڕشت)ە. دەگەر و فەرمانڕەوایی: فیسار کەس بە(بڕشت) یا بێ (بڕشت)ە.
بڕفێن بڕفێن: د. فڕان فڕان.
بڕک: بنجی کاڵەک و شووتی و خەیار و ترۆزی. شووتی و کاڵەکی تازە لە بڕک کراوە. قرقێنە (با).
بڕکردن: توانین لە ڕێڕۆیندا: بەپێ (بڕناکەم). کارکردن و جێگیربوونی فەرمان و قسە: فیسار کەس وتە یا فەرمانێ (بڕ ناکا). جیاکردنەوەی دوو شت لە یەک.
بڕکە: پلار. بڕکی بێستان. کۆمەڵی ئاژاڵ. گیایەکی کوێستانیی بۆنخۆشە بۆ لەوەڕی ئاژاڵ زۆر باشە. پارچە (د).
بڕگە: لەلەی قەراغی هێندێ شت. (بڕگەبڕگە) شتێکە بڕگەی زۆری پێوەبێ.
بڕمەبڕم: دواندن و خوڕین بە وتاری قەبەی زبر. تۆ چ (بڕمەبڕم)ێکتە.
بڕمێن: بڕیتییە لە مەردوومی ئازادی بەدەستوبردی جوامێر.
بڕناخ: کونەلووت. لووت.
بڕناخە: بڕناخ.
بڕندە: تیغێکە کە باش شت ببڕێ.
بڕنووتی: دەرمانێکە لە تووتن دەکرێ و دەکرێتە لووتەوە بۆ پژمین.
بڕوا: باوەڕ، (بڕوابوون) بڕواکردن، (بڕواکردن) باوەڕکردن.
بڕوایی: دڵکرانەوە بەبینینی شتێک یا شوێنێک: دڵم (بڕوایی) نادا بچم بۆ لای فیسار کەس.
بڕوسک: شتی کەم: (بڕوسک)ێک ئاوم بدەرێ.
بڕۆش: بڕوێش.
بڕووش: بڕوێش.
بڕوێش: گەنمی پەڵخوردکراو.
بڕوێشکردن: بڕیتییە لە قسەکردن بەهەڵەیی: فیسار کەس کەوتە (بڕوێشکردن) واتە کەوتە قسەی بێ سەر و پێ. مووکردن.
بڕوێشین: د. چێشتی بڕوێش.
بڕۆیی: بڕوایی.
بڕە: کەڵبەی بەراز. یەکانە.قرتاندنی گوڵەزەڕات بۆ کوتاندن: زەڕاتەکە (بڕە) بکە. کەڵەمێرد.کچ (ل). بەیارێکە لە زەوی لە ناوەند دوو وەرددا (د). گۆترە (د).

بڕەک: ز. مشار.
بڕیار: پەیمان.
بڕیان: د. پچڕان.
بڕیانەوە: د. بڕانەوە. پچڕانەوە.
بڕێژ: قاڵبێکە کە شتی تواوەی تێدا دابڕێژرێ.
بڕێس بڕێس: سمڕ سمڕ.
بڕێش: د. بڕوێش.
بڕێشت: د. بڕینی کاڵا: ئەم کەوایە (بڕێشت)ێ جوانە. بڕشت.
بڕین: کەرتکردنی شتێک بەشتێکی تیژ.
بڕینەوە: هەڵپاچینی تووکی ئاژاڵ بە(برنگ). گرتنەوەی ساوا لە شیری دایکی. دووکەرتکردنی دار یا ئاسن بەمشار. دواهێنان بەگوفتار یا کردارێک.
برژان: سوورەوەبوونی هێندێ شت بەئاگر. برژانگ.
برژاندن: سوورەوەکردنی شت بەئاگر.
برژاندنەوە: تیمارکردنی برینی تازە بەدەرمانێکی تیژ بۆ ئەوەی کە تەشەنە نەکا.
برژانگ: مووی سەر پێڵووی چاو.
برژانەوە: ژانکردنی برین لە کاتی برژاندنەوەیدا.
برژاو: شتێکە کە لەسەر ئاگر برژابێ. برژانگ.
برژۆڵ: ڕیشووی خاولی و سووزەنی و هێندێ شتی تر. پژی گوڵە گەنم و جۆ.
برژیاگ: برژاو.
برژیان: برژاو.
برژیانەوە: برژانەوە.
برسێتی: پێویستی گیاندار بەخواردنێک کە بەری دڵی بگرێ.
برسی: گیاندارێکە کە پێویست بێ بەخواردنێک کە بەری دڵی بگرێ، (برسیبوون) پێویستبوونی گیاندار بەخواردن.
برشەلاتن: تەنگەنەفەس بوون و پیشەهەلاتن لە گەرماندا.
برقەندەرە: ل. چەقەڵ.
برک: ژانێکە لە دەماری پشت و کەلەکەدا پەیدا دەبێ بەهۆی سەرمابوونەوە. (برککردن) دووچاربوونی ئازاری برک. پەڵ: (برک)ێکی تێ گرت. حەوز (با).
برکدان: فڕێدان.
برکە: پەڵ: (برکە)یەکی تێ گرە.
برمە: جۆرە خواردمەنییەکە لە هەویر و شەکر و گوێز دروست دەکرێ. ناڵەی تادار. (برمەبرم) ناڵەناڵی تادار.
برن: ز. بردن.
برنج: دانەوێڵەیەکە وەک گەنم بەلام ئەم سپییە، دەکوترێ و دەکرێ بەگەڵێ جۆرە چێشت.
برنجاڕ: شوێنی مەرەزە.

برنج کوت: کەسێکە کە هەر برنج بکوتێ بۆ مەردووم بەپارە.
برنجۆک: شتێکی تەنکی کون کونی جوانە ژنان دەیکەن بەکراس و دەسماڵ.
برنجە: هـ. زەردێکە کە شتی لێ دادەڕێژرێ.
برنگ: تیغێکی دوودەمە وەک مەقەست ئاژاڵی پێ دەبڕدرێتەوە. پلار.
برنگدان: د. فڕێدان.
برنگە: برنگی ئاژاڵ بڕینەوە.
برۆ: ڕیزە موویەکی کەوانەییە بەسەر کالانەی چاوەوە.
بروسک: ز. بروسکە.
بروسکاندن: بروسکەدان.
بروسکانەوە: بریقەدانەوەی هێندێ شت لە دوورەوە.
بروسکە: چەخماخە و ئاگر هێنانێکە کە لە هەور یا لە لێکەوتنی دوو شتەوە پەیدا دەبێ.
بروسکەدان: چەخـماخـەدانی ئاسـمـان. پەیدابوونی ئازارێکی کوتوپڕی لە جەستەدا.
بروسکیان: د. بروسکەدان.
برۆش: ز. بەروش.
برووزسەندن: زۆربوون و زاڵبـوونی شـتـێک بەسـەر شـتـێکدا: ئاگرەکە یا فـیـسـار کەس بەسەر فـیـسـار کـەسـدا ( برووزی سەند).
برە: برژانێکی ناوەنجـیـیـە بۆ هێلکە و کڵ کـە نابێ لەوە زیـاتر ببرژێن: هێلکەکە یا گـۆزەکە ئەوەندە برژاوە و سـووربووەتەوە لە (برە) چووە.
برەش: ز. هەژار.
برەڤان: با. ناوبژیکەر.
برەو: بەرزبوونەوە یا زیادبوونی نرخی شت: فیسار کەس لە برەو دایە یا ئەو شتە لە (برەو) دایە.
برەوبردنەوە: برەوسەندن.
برەوپێدان: برەودان بەکەسێک یا بەشتێک.
برەوسەندن: برەوپەیداکردنی شتێک.
برێ: برە.
بریا: وتەی ئاواتخواستن: بریا کورد هەموو خوێندەوار دەبوون.
بریانی: بەرخ و مـریشکی ناوسک ئاخنراوی لە ڕۆندا سـوورەوە کراو.
برێژیا: هـ. برژاندن.
بریسکە: تیـشکی شـووشە و هێندێ شتی تر کـە خۆر لێی بدا. (بریسکە بریسک) بریسکەی یەک لەدوای یەک، (بریسک و هووڕ) بریسکە بریسکی زۆر.
بریسکەدان: بروسکەدان.
بریسکەدانەوە: تیـشکدانـەوەی شووشە و هێندێ شتی تر کە خۆر لێی بدا.
برێشتە: هـ. برژاندن.
برێشکە: دانەوێڵەی برژاو بەئاگر.
برێشگە: برێشکە.
برێنە: برنگی ئاژاڵ بڕینەوە.
بری: بریتی. برۆ (با).
بریتی: شـتـێکە کـە لە جـیـاتی شـتـێکی تر بێ: چای بۆ هەژار (بریتی) چێشتێتی. (کنایە).
بریخـە: بریقـە. بەریەخـەیە کـە بۆ قـایمی لە دیوی ناوەوە دەدرێ بەیەخەی کراسدا.
بریق: ل. مەسینە.
بریقانەوە: بریقەدانەوە.
بریقـە: درەوشـانەوەی شت لەبەر هەتاو و چرا. (بریقـە بریق) بریقەی یەک لەدوای یەک. (بریق و هووڕ) بریقە بریقی زۆر.
بریقەدانەوە: درەوشانەوەی شت لەبەر هەتاو و چرا.
بریکە: د. بریسکە.
بریکەنێ: بریا.
برین: شتێکی بەسفت و سۆیە لە جەستـەی گیاندار پەیدا دەبێ و دەم دەداتەوە.
بریندار: گیاندارێکە کە برین بەجێگایەکیەوە بێ. هێندێ شتە کە کـونی تێ بووبێ. (برینداربوون) پەیدابوونی برین لە شـتـدا. (بریندارکردن) پەیداکردنی برین لە شتدا.
برینداری: بوونی جەستە بەبریندار.
برینگە: برنگی ئاژاڵ بڕینەوە.
برینە: ژانگرتنی ژن لە کاتی منداڵ بوونیدا.
بز: چاوی زەقی داپچڕاو. کێڕێکە لە یاریی (بزێندا) دەکێشرێ.
بزن: (هـ). جۆرە ماسییەکی گەورەیە. بەز. (د).
بزان: کەسێکە کە لە کارێکدا زۆر شارەزا و زانیار بێ.
بزاوتن: بزواندن.
بزبزۆکە: هـ. و بیز و بیزە.
بز پێوەکردن: پەنجەکردن بەقنگی یەکـێکدا بەگاڵتـە. بریتـییـە لە گاڵتە پێکردن: (بزی پێوە مەکە) واتە گاڵتەی پێ مەکە.
بزدان: پچڕان (با). ترسان (ز).
بزداندن: ز. ترساندن.
بزدۆنەک: ز. ترساندن.
بزدین. بەزدین.
بزر: شـتی ون. (بزربوون) ونبـوونی شت. (بزرکـردن) ونـکردن. ڕۆنی کەتان (ز).
بزڕبزڕ: شتێکە کولۆ کولۆ و گرۆگرۆ بوەستێ وەک ڕۆندووگ.

بزڕکان: تێکچوونی شیر و ماست و هێندێ شتی تر و گرۆگرۆ وێستانی. تێکچوون و شپرزەبوونی گیاندار لە ترساندا. (بزڕ کاندن) وڕێنەکردن.
بزڕکاو: ماست و شیر و هێندێ شتی ترە کە تێکچووبێ. گیاندارێکە لە ترسا شپرزە بووبێ.
بزرکرن: ز. خۆهەنوون بەڕۆنی کەتان.
بزرۆک: ز. زیپکەی ئەندام.
بزگ: د. پزووی دەڕیێ. شیلانی سوور کە ژنان دەیکەنە ملیان.
بزگور: پارچەیەکی بێ نرخە لە بەرگ و پێخەف و ژێرەخەر. بریتییە لە دراوێکی کەم نرخ: (بزگوڕ)ێکم پێ نییە.
بزگیر: ڕژد.
بزگیلە: بەربووک.
بزڵماجی: جۆرە کولێرەیەکە لە پێشەوە دەخرێتە سەر ساج تا نیوە برژ دەبێ ئینجا دەخرێتە سەر مادە و دیوەکەی تری بەتوندی دەدرێ بەسەر ساجەکەدا.
بزڵە: هـ. کارژۆڵە.
بزماتە: توێژی ئەستووری سەر برین.
بزمار: ئاسنێکی باریکی درێژی سەرپانی لووت تیژە دادەکوترێ بە هێندێ شتدا بۆ قایمی.
بزمارڕێژ: شتێکە کە بزماری زۆرێ پیادا کوترابێ.
بزمارکوت: ترێیەکە کە هێشووی زۆر پڕبێ.
بزمارە: وردە پوازێکە دەدرێ لە گێڕی ئاش تا نەمیێزێ.
بزمک: بلامک.
بزمەتە: بزماتە.
بزن: جۆرێکە لە ئاژاڵی ماڵی.
بزنانە: سەندنی چل یەکە لە ئاژاڵی ماڵی لەلایەن دەوڵەتەوە.
بزن ترێنە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک کەوەر وایە بنکێکی خڕی هەیە وەک پیازی پچووک.
بزنلەر: مەلێکی بۆری گەورەیە وەک قاز، گۆشتی دەخورێ.
بزن مژ: دەعبایەکی کێویی کاوێژکەرە لە (قومقمۆکە) گەورەترە، چنگی وەک چنگی منداڵ وایە، گۆشتی دەخورێ و پێستەکەی دەکرێ بەکالانی خەنجەر.
بزن مژە: بزن مژ.
بزن مژەک: بزن مژ.
بزن مشک: بزن مژ.
بزنەدۆخە: بزنێکە بەکار و شیرەوە هەموو ماڵێک ساڵەوساڵ دەیدەن بەئاغا بۆ ماست و دۆ خواردنی.
بزنەڕیشە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک شوبیت وایە، بنجێکی پچووکی هەیە.
بزنەکوڕانە: بزنێکە هەموو ماڵە مسکێنێک دەینێرن بۆ ماڵی ئاغا لە حەلێکدا کە کوڕی ببێ.
بزنەکێفی: بزنە کێوی.
بزنە کێوی: گیاندارێکی کێوییە لە ئاسک دەچێ بەڵام ئەم شاخی لق لقە.
بزنەوەس: مەشکەیەکە لە پێستی بزن کرابێ.
بزواندن: جووڵاندن.
بزۆز: بزێو.
بزۆک: بزێو. گیاندارێکە کە سک و زا بکا. ئافرەتێکە کە زۆر سک و زا بکا.
بزوو: ز. داری بی.
بزووت: برە دارێکە سەرەکەی سووتابێ.
بزووتک: بزووت.
بزووتن: جووڵانی شت. هاتنەخوارەوەی شیر بەمەمکدا بۆ منداڵ.
بزووتنەوە: جووڵانەوە. بریتییە لە سەرکەوتنی نرخی شت بەرەبەرە. بریتییە لە زیادبوونی ئاو بەرەبەرە.
بزووک: د. گیانداری بزێو.
بزوێن: جووڵێنەر.
بزە: زەردەخەنە. زەقەی چاو،
بزەبز: زەقەزەقی چاو.
بزەفتن: ز. بزووتن.
بزەکردن: بریتییە لە پێکەنینی بێ دەنگ.
بزەگرتن: بزەکردن.
بزەن: مەردوومی ئازای لێهاتووی لێدەر.
بزەڵە: بەچکەی بەراز. بەچکەی گیاندارێکە کە بەخۆیداهاتبێ و گەورە بووبێ. (بزەڵەبوون) گەورەبوون و بەخۆداهاتنی بەچکەی گیاندار.
بزەلەر: بزنلەر.
بزێبزێ: گیایەکی بەهاریی کوێستانییە سێ چوار پەل دەردەکا، گوڵێکی سپیی واش دەگرێ.
بزیسک: پزیسک.
بزیشک: ز. کەرە.
بزێن: جۆرە یارییەکە منداڵان کێڕێکی گرد دەکێشن، یەکێک دەچێتە ناویەوە ئەوانی تر تێی هەڵدەدەن.
بزێو: کەسێکە کە زۆر بجووڵێ.
بزێوی: جوڵانی زۆر.
بزی: ڕەشەوڵاخێکە کە پێی نابێتە سێ تا چوار ساڵ.
بژ: مووی گیڤ. پژ.
بژار: پاککردنەوەی شینایی لەو گیایانەی کە زیانی پێ دەگەیەنێ. گیایەکە لەناو شیناییدا بژار دەکرێ.
بژارتن: ز. بژاردنی دانەوێڵە.
بژاردن: پاککردنەوەی وشکەدان لە زیوان. ژماردن. دانی نرخی شتێک بەخاوەنی کاتێک شتەکەت بەدەستەوە چووبێ.

بژارکردن: پاککردنەوەی شینایی لە گیا و سەوزی بێگانە.
بژارکەر: کرێکارێکە کە هەر بژار بکا.
بژارە: ڕاستکردنەوەی ڕایەڵی جۆڵا کە پاش و پێش بکەوێ. ژماردن.
بژارەکردن: خەوزڕان و خەیاڵکردن لەبەر مەراقێک: ئیمشەو تا بەیانی من هەر (بژارەم کردوە).
بژانگ: ڕیشووی شت (ز).
برژانگ. خۆدۆزین (د).
بژانن: هەڵبژاردن. برژاندن.
بژبژە: پەسپەسە کۆڵە.
بژنک: ز. پرشنگی ئاو و بەرد لە کاتی شکاندنیدا.
بژنیاگ: د. هەڵبژێردراو.
بژنین: د. هەڵبژاردن.
بژوون: ز. سووژن.
بژوولک: برژانگ.
بژوێن: زەبەند و لەوەڕی زۆر.
بژوین: پاک و خاوێن.
بژیاگ: د. برژاو.
بژێو: خواردەمەنییەکە کە هۆی ژیانی مەردووم بێ. بژوێن.
بژی: با. چەند موویەکە لەپێش ناوچەوانەوە دەهێڵرێتەوە لەلایەن لادێیی و کۆچەرییەوە.
بس: بستی گیاندار. بلۆسکی ئاش.
بسبسۆک: ز. گوڵە ئەستێرە.
بست: پانیی دەست لە سەری پەنجەتووتەوە تا سەری پەنجە گەورە. بلۆسکی ئاش. بستک (ز).
بستک: با، شیشی گۆشت برژاندن.
بستوو: کۆسپایی. بلۆسک.
بستە: شتێکە وەک چەقاڵە، سوێر دەکرێ و دەخورێ. چەقەنەی دەست.
بستەلێدان: چەقەنەلێدان.
بسک: با. ئەگریجە.
بسکۆک: بسک.
بسکە: ڕووخۆشی و زەردەخەنەیەکە پەیدا دەبێ لە یەکێکی سەر و دڵ خۆشەوە: فیسار کەس (بسکە)ی لێوەدێ، یا (بسکە)ی سمێڵی دێ.
بسمار: بزمار.
بسمارە: د. مێخەکە.
بسە: د. بستە.
بسێن: د. کڕیار. کەسێکە کە بەزۆر شت لە مەردووم بسێنێ.
بشکافتن: ز. هەڵپچڕاندنی دروومان.
بشکانن: د. گریان بەنووکەنووک.
بشکوژ: ز. دوگمەی کراس و شتی تر.
بشکوشک: خونچەی گوڵ.
بشێونە: د. کەسێکە ئاشووب بنێتەوە.
بشێوە: ئاشووب و پشێوی.
بشێوی: پشێوی.
بعۆک: ز. ئادەمیزادی ناشیرین.
بغورد: بخورد.
بغوردان: بخوردان.
بغوز: بخوز.
بفرۆش: د. فرۆشیار.
بڤ: وتەیەکە منداڵی ساوای پێ دەترسێنرێ لە دەستبردن بۆ شتێک.
بڤر: ز. تەور.
بڤە: شتێکە کە بەوتەی (بڤ) منداڵی لێ بترسێنرێ.
بڤێنڤێ: ز. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە باتی وتاری: (دەبێ هەروابێ).
بکوژ: شتی کوشندە: بەگرانەتایەکدا کەوتووە زۆر (بکوژ)ە. مەردوومی پیاوکوژ. مەردوومی بزەن.
بکێڵ: د. جووتیار.
بکێڵگە: د. کێڵگە.
بگار: د. ڕێگا. بوارە (بگار)م نادا واتە بوارەم نادا. بوار.
بگاردن: تێپەڕاندن. جێبەجێکردن. بواردن.
بگارە: د. بوارە.
بگارەدان: بوارەدان.
بگردگ: ڕابردوو.
بگردن: د. ڕابروودن.
بگرە: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی: (تقریباً): (بگرە) سێ ساڵە تۆم نەدیوە.
بگرەوبەردە: وتەیەکە ئاشووب و پشێوی و بەیەکداهاتنی مەردووم دەگەیەنێ.
بڵ: شتێکە زیاد لە ئەندازەی خۆی نەرم بووبێ. (بڵبوون) نەرمبوونی شت زیاد لە ئەندازەی خۆی.
بلا: ز. پیتێکە دەخرێتە سەر ئەمری غائب بۆ بەهێزکردنەوە (تاکید): (بلا) بڕوا، واتە بابڕوا.
بڵا: بلا.
بلاتە: ز. بالەتە.
بلامک: دارێکە هەردوو سەری بەنی پێوە دەبەسترێ و دەکرێتە دەمی کار و بەرخ تا دایکیان نەچەکێن.
بلاو: شتی لەیەک دوور. شاش: ئەم هێڵەکە (بلاو)ە.

بڵاوبوونەوە: دوورکەوتنەوە و جیابوونەوەی چەند شتێک لە یەکتری.
بڵاوکردنەوە: دوورخستنەوەی چەند شتێک لە یەکتری.
بڵاوە: بڵاوبوونەوە.
بڵاوەکردن: بڵاوبوونەوە.
بڵاوە لێ کردن: بڵاوبوونەوە و دوورکەوتنەوەی چەند شتێک لە یەکتری.
بلبل: باڵندەیەکی دەنگخۆشی بازەڵەیە، بەقەد چۆلەکەیەک دەبێ.
بڵتە: دەنگێکی پچووکە لە کەوتنی شتێکی ڕەق بۆ ناو شتێکی شل پەیدا دەبێ بەڕەنگێکی وا کە لە (قوڵتە) پچووکتر بێ. (بڵتەبڵت) بڵتەی یەک لەدوای یەک.
بلج: هـ. گۆێژ.
بڵح: شتی بێ کەڵک.
بڵخ: د. تڵپە.
بڵسک: بڵۆسک.
بڵفرە: باڵندەیەکی پچکۆلەی کەوەلەیە لە فڕیندا باڵی ڕەپ ناکا.
بڵق: بۆشاییەکە لەناو ئاو و هێندێ شتی تردا پەیدا دەبێ بەهۆی با تێچوونییەوە. بلۆق.
بڵقاو: د. زەلکاو.
بڵقدان: پەیدابوونی بڵق لە شتی شلدا.
بڵقە: دەنگێکە لە هاتنە دەرەوەی با لەژێر ئاودا پەیدا دەبێ. (بڵقە بڵق) بڵقەی یەک لەدوای یەک. (بڵق و هووڕ) بڵقە بڵقی زۆر.
بڵقەدەرە: دەعبایەکی زەردی پانکەڵەیە وەک مارمێلکە وایە.
بڵق هەڵدان: بڵقدان.
بڵمەبڵم: دەنگی قسە و گفتوگۆی مەردوومی پیری بێ دەم و ددان، یا نەخۆشێک کە لە سەرەمەرگدابێ.
بڵن: د. بڵند.
بڵنایی: د. بڵندایی.
بڵند: شتی بەرز.
بڵندایی: ئەندازەی بەرزیی شت.
بڵندبوونەوە: بەرزبوونەوە.
بڵندکردنەوە: بەرزکردنەوە.
بڵندەوەبوون: بڵندبوونەوە.
بڵندی: بڵندایی.
بڵۆسک: بڵووسک.
بلۆق: هەڵتۆقاوی ئەندامی گیاندار بە ئاوتێزانی لەکاتی سووتان یا ئازار پێگەیشتنێکیدا. (بلۆقکردن) هەڵتۆقینی ئەندامی گیاندار.
بڵووچە: کۆجەڵەیەکی پچکۆلەیە مزەی ئاشی پێ دەگیرێ.
بلوور: شووشەیەکە دەکرێ بەسەر چرای لەمپادا. بلوێر. شووشەی ئەستووری ساخ.
بلووری: جۆرە تەنراوێکی سپیی تەنکە، دەکرێ بەکراس و دەرپێ و شتی تر.
بڵووسک: ئاسنێکە لە هەردوو بەرداش هەڵدەکێشرێ، سەری ژوورووی دەکرێ بە(تەوەرە)دا بۆ ئەوەی کە بەرداشی سەرەوە بسووڕێنێتەوە، سەرەکەی تری دەکرێ بە(تۆپ)دا بۆ ئەوەی تۆپەکە ئەم بسووڕێنێتەوە.
بلووک: د. ناوچەیەکی گەورەیە کە چەند ئاوایی و دێیەکی تێدابێ.
بلوێر: دارێکی درێژی کون تێ کراوە لە وێنەی سەبیل منداڵ لە پێشکەدا میزی پێدا دەکاتە خوارەوە. لوولک.
بلوێربەزێن: چەنەباز.
بلوێرپێچ: پارچە پەڕۆیەکە بەلێواری بلوێری منداڵدا دەپێچرێ بۆ ئەوەی کە منداڵەکە بریندار نەبێ.
بلوێرپێچک: بلوێرپێچ.
بلوێرژەن: کەسێکە بلوێر باش لێ بدا.
بلوێرلێدان: فووکردن بەبلوێردا و دەنگ لێ پەیداکردنی.
بلەربەزێن: د. بلوێر بەزێن.
بلەکناچێ: د. پیاوی ژنانی.
بلەگاز: هەژار.
بڵەماج: جۆرە بەڵوڵەیەکی شل و شۆڵە.
بلەنگاز: ز. دەربەدەر.
بلەور: بلووری چرا.
بڵێزە: بڵێسەی ئاگر.
بڵێسە: کڵپەسەندنی ئاگر. (بڵێسە بڵێس) بڵێسەی یەک لەدوای یەک.
بلیت: پارچە نووسراوێکە دەدرێ بەکەسێک کە بەئاسانی پێی بچێتە ژوورەوە بۆ هێندێ جێگای تایبەتی بەپارە.
بلیمەت: ئادەمیزادی بەکاری لێهاتووی هەڵکەوتوو.
بم: قەڵەوی تێکسمراو.
بمکردن: خۆ گێفکردن.
بن: ژێری شت. کچێنی.
بن ئاگرە: هەویرێکە دەخرێتە بن ئاگر تا دەبرژێ.
بن ئاگری: بن ئاگرە.
بنار: داوێنی شاخ.
بناغە: چەند چینێکە لە دیوار کە لە بنەوە لەسەر ساغی دادەنرێ.
بناغەدانان: دانانی بناغەی دیوار لەسەر ساغی.
بناغەدانەوە: هەڵکەندنی بناغەی دیوار.
بناغەنان: بناغەدانان.

بناغەهەڵکەندن: بناغەدانەوە.
بناغە هەڵبەستن: بناغەدانان.
بناقاقا: د. بیناقاقە.
بناقاقە: د. بیناقاقە.
بناو: جۆرە دارێکە گۆچانی لێ دروست دەکرێ و لەبەر قورسی ژێر ئاو دەکەوێ.
بناوان: بەرهەڵستێکە لە بەردەمی ئاودا دروست دەکرێ بۆ هەستانی ئاوەکە. ئافرەتێکە کە لە ماڵدا گەورە بێ و سەرپەرشتیی ئیش و کار بکا: فیسار کەس بێ بناوانە.
بناوان هەڵبەستن: دانانی بەرهەڵست لە بەردەمی ئاودا بۆ بەرزبوونەوەی ئاوەکە و لادانی بۆ لایەکی تر.
بناوی: بناو.
بن باخەڵ: بن هەنگڵ.
بنبڕ: د. بنەبڕ.
بنبزوو: بن کلکی وڵاخ.
بن بەردووگ: گیایەکی یەک لقی بەهاریی کوێستانییە لاسکەکەی لە هێرۆ دەچێ، چەند گوڵێکی وردی سپی دەگرێ.
بنبەردەقیێ: گیایەکی کوێستانیی خۆشە وەک ڕێواس وایە.
بنبێژنگ: وردەیەکە لە بێژنگ دەکەوێتە خوارەوە لە کاتی بێژانەوەی دانەوێڵەدا.
بنپاڵ: د. تەنشت.
بنپژان: نەمانی کچێنیی کچ بەهۆی کەوتنەخوارەوەی لە جێگایەکەوە.
بنتاتی: ز. جۆرە ترێیەکە.
بنتاو: د. نەمام.
بنتل: د. یەکەم گوێزە کە منداڵان لە یاریی مووشێندا دای دەکەن و تیلی تێ دەکەن. بەرد یا لیسێکە کە بخرێتە ژێر تاوێرێکی گەورە بۆ ئەوەی کە بە ئاسانی تل بدرێ.
بنتەک: د. بنپاڵ.
بنتیان: ئەو حەلوا گەزۆیەیە کە دەنووسێ بەبنکی تیانەوە.
بنتیک: پێکەوەنانی پارچەی کاڵا بەدروومان لەپێش (هەڵپێچدا).
بنج: ڕیشەی دار و درەخت. لق و پۆپی گوڵ و گیا.
بنجبەست: شتێکە کە ڕووابێ و ڕەگی داکوتابێ.
بنجبەستکردن: بریتییە لە دامەزراندن و جێبەجێکردنی کارێک.
بنج داکوتان: ڕیشەداکوتانی درەخت و سەوزایی. بریتییە لە جێگیربوونی شتێک: فیسار کەس (بنجی داکوتا).
بنجک: بنچک.
بنج و بناوان: سەرچاوە و بناغەی کارێک.
بنج و چکە: د. کلێنچکە.
بنجۆری: د. جوست و جۆکردن بەدووی شتێکدا.
بنجوو: کەسێکە کە باو و باپیری جوولەکە بووبێ. کلێنچکە.
بنجووری: د. بنجۆری.
بنچاخ: د. قەباڵە و سەنەدی کۆن: بۆ زەویوزارەکەم (بنچاخ)ی باو و باپیرم هەیە.
بنچک: بنە دەوەن یا بنە گیایەکی ئەستوور و پڕ و چڕە لە هاویندا بەسەوزی دەمێنێ و لە پایزدا وشک دەبێ و بۆ سووتەنی هەڵدەکەنرێ. بن پاڵ (د).
بنچڵ: د. بن لق.
بنچین: دەمار و ڕەگ.
بنچینە: بناغە و تەمەڵەی دیوار.
بن خەرمان: دانەوێڵەیەکە کە لەژێر خەرماندا دەچەقێتە زەوی.
بندروو: جۆرێکە لە دروومان. جۆرێکە لە درەو کە سەپان دەست و داس لە بنەوە دادەگرێ بۆ ئەوەی کای زۆر بێ.
بندۆک: دۆووک.
بندەست: بن پەلی گیاندار.
بنقۆڵ: پارچەیەکە لە کراسی ژنان کە سەرقۆڵی پێدا دەدروێ.
بنک: خوارووی شت.
بنکدار: بازرگانێکە کە شت بەکۆمەڵ بفرۆشێ. قاپ و دەفرێکە کە بنکێک گیرابێ بەژێرەکەیدا.
بنکڕ: چێشتێکە کە بەبنی مەنجەڵدا نووسابێ.
بنکڵێشە: بندەست: فیسار کەس چۆتە (بنکڵێشە)ی فیسار کەسەوە، واتە چۆتە بن دەستی بۆ هەڵخەڵەتاندنی.
بنکۆشک: ژێرخان.
بنکەش: د. بن دەست.
بنکەشی: گرتنی درزی بەردکاری و خشتکاری بەگەچ یا چیمەنتۆ.
بنکەن: بنکەند.
بنکەند: شتێکە کە بنکی هەڵتۆڵ بووبێ. بنکەندبوون: هەڵتۆڵبوونی شت. بنکەندکردن: هەڵتۆڵکردنی بنکی شت.
بنکەوش: بن هەنگڵ.
بنگس: د. بست.
بنگست: د. بست.
بنگوس: بنگس.
بنگوست: بنگست.
بنگۆزروان: بنی گیایەکی بەهاریی گەڵا وردە وەک شوبیت، پێشی دەڵێن: سێفەزەمینە.
بنگۆزەڵە: بن گۆزروان.
بنگوڵ: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک کەرەوز وایە بەبێخەوە هەڵدەکەنرێ و دەدرێ بە ڕەشەوڵاخ.

بنگووف: با. گەڵەخان.
بنگە: بناغەی هەموو شتێک. جومگە.
بنگیری: د. بنجووری.
بن لق: وردە لقێکە لەبن لقی ئەستووری درەختەوە دەردێ.
بنۆک: گیایەکی دەشتییە وەک توێسی وایە بەوردی دەکرێتە برینی ئاژاڵەوە چاکی دەکاتەوە.
بنووس: نووسەر.
بنە: گیایەکە لە گێرەدا لە پەڕی ناوەوە دەبەستری. سووکە ماڵێکە کە ببرێ بۆ سەر ڕەز یا هەوار. گەهەک.
بنەبڕ: شتێکە کە دواییی هاتبێ و ببڕابێتەوە. (بنەبڕبوون) بڕانەوەی شتێک. (بنەبڕکردن) بڕاندنەوەی شتێک.
بنەبەنگە: د. بەستی بەردەمی ئاو.
بنەپیت: دەستمایە. سەرکۆزەری بن خەرمان کە لە پاشدا کۆ دەکرێتەوە.
بنەتۆم: بنەتۆو.
بنەتۆمە: بنەتۆم.
بنەتۆو: دانەوێڵەیەکە کە کشتیار دایدەنێ بۆ تۆوی ساڵی دوایی.
بنەجوو: د. بنجوو.
بنەجووت: بنەتۆو.
بنەجڵ: بنچین.
بنەچە: وەگەز.
بنەخڵ: د. بن باخەڵ.
بنەڕەت: بناغە.
بنەفش: ز. وەنەوشە.
بنەفشی: ز. وەنەوشی.
بنەکردن: نانەوەی شت لەلایەن دزەوە لەپێش دزینیدا بۆ ئەوەی لە هەڵێکدا بیدزێ. دۆزینەوەی ئەو شوێنەی کە شتی دزراوی تێدا حەشاردراوە. لە سەربیستن.
بنەگا: د. هەوارگە.
بنەماڵ: خانەدان.
بنەماڵە: بنەماڵ.
بنەوا: د. بناوان. بنەبەنگە.
بنەوان: بناوان.
بنەوانە: ژنێکە کە لە ماڵدا بنەوان بێ.
بنەوش: وەنەوشە.
بنەوشە: پارچەیەکی ئاوریشمیی مۆرە ژنان دەیکەن بەکڵاو. وەنەوشە.
بنەوشی: شتێکە ڕەنگی وەک ڕەنگی بنەوشە وابێ.
بنەوشیلە: بەری داری وەنەتەق.
بن هەنگڵ: بن باخەڵ.
بنیات: بناغە.
بنیسک: تەنکە سابوونێکە کە دوای کارکردن لە سەلک مابێتەوە.
بنیسکە: بنیسک.
بنێسی: دەردەباریکە.
بنێشت: شتێکی سپیی جیڕی بەکەشە لە (دارەبەن) پەیدا دەبێ.
بنیچە: بنەچە.
بنیلە: فڕێدانی کولۆش بۆ ژێرپێی گا لە کاتی گێرەدا لە دیوی خەرمانەوە.
بۆ: پیتی پرسیار لە هۆی شت: بۆ ناخوێنیت؟. پیتێکە کردنە قەبەڵ و تەرخانکردنی شتێک بەشتێکەوە دەگەیەنێ: ئەسپەکە (بۆ) تۆ، زینەکە (بۆ) ئەسپەکە. پیتێکە هۆیەتی (تعلیل) دەگەیەنێ. (بۆ) خوێندن هاتووم، واتە هۆی هاتنەکەم خوێندنە. بۆن: ئەم گوڵە (بۆ)ی خۆشە. وەرە (هـ).
بواژوو: د. بۆژوو.
بۆبا: شتێکە بەهۆی با لێدانیەوە بۆنی ناخۆش بووبێ وەک ڕۆن.
بۆبرە: بۆنبرە.
بۆبلات: ز. کۆستی گەورە.
بۆپرووز: بۆ کوڕووز.
بۆت: ئاوبارە (با). دارێکی درێژکۆلەیە ناوەکەی وەک پلوسک هەڵکەندرابێ (ز).
بۆتە: د. تەپکە خاکێک یا گوڵ و سەوزاییەکە کە لە زەویی بەرزبووبێتەوە. (بۆتە) جۆرە دەفرێکی پچووکی گڵینە، زێڕ و زیو و شتی تری تێدا دەتوێنرێتەوە.
بۆتیمار: د. خەمەخۆرە.
بۆج: بۆچی.
بۆچاڵ: بۆنێکی ناخۆشە لە دانەوێڵەیەکەوە دێ کە لە چاڵدا زۆر مابێتەوە.
بۆچرووک: بۆنی چەوری سووتاو.
بوچک: د. پچکۆلە.
بوچکە: پچووک: ئەموست. کلکی گیاندار.
بوچکەلانە: پچکۆلانە.
بوچکەڵانە: د. بچکۆلانە.
بوچە: بۆچی.
بۆچەک: بۆچرووک.
بۆچەکوهوور: بۆچەکەوور.
بۆچەکەوور: بۆچرووک.
بۆچەکەوەر: د. بۆچرووک.
بۆچی: وتەی پرسیار لە بۆنە و هۆی شت.
بوحتیان: بوختان.

بوحشت: ز. بەهەشت.
بوخاری: موغەیری.
بوختان: شتی ناشیرین هەڵبەستن بەمەردوومەوە و گێڕانەوەی بۆ ئەم و ئەو.
بوختیان: بوختان.
بوخچک: ز. بوخچەی پچکۆلە کە لەوانە بێ ببەسترێتە پشت.
بوخچە: شتێکی پانی چوار سووچە کاڵا و کەلوپەلی تێ دەخرێ و گرێ دەدرێ.
بوخچەبەگەردانە: بوخچەبەگەردانێ.
بوخچەبەگەردانێ: یارییەکە کۆمەڵێک بەگردی دادەنیشن بوخچەیەک بۆ یەکتری دەهاوون، یەکێک بەدووی بوخچەکەدا ڕادەکا لە دیوی دەرەوەیان، لە دەست هەر کەسێکدا گرتی ئەو کەسە وەکو ئەم تێ دەکەوێ.
بوخچەی گەردان: د. بوخچە بەگەردانێ.
بوخچەی نەکراوە: بریتییە لە پیاوێک کە هەر کوڕ بێ و هێشتا ژنی نەهێنابێ.
بوخورد: بخورد.
بوخوردان: بخوردان.
بۆخۆشکە: هـ. کەنێرە.
بۆخۆیی: دەردێکی بەئاڵۆشە بەچاو دەگا.
بۆدان: بۆن پێدان.
بۆدانەوە: د. بۆندانەوە.
بۆدڕ: بۆن دڕ.
بۆدڕن: جۆرە بۆنێکی ناخۆشە بەهۆی چڵکنییەوە پەیدا دەبێ.
بۆدرە: شتێکی سپیی وردی بۆنخۆشە وەک سپیاو دەکرێ بەجەستەوە.
بۆ دوکەڵ: شتێکە کە بۆنی دوکەڵی گرتبێ.
بۆر: جۆرە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی خۆڵەمێش. زەمینێکە کە ساڵێک لەوەپێش نەکێڵرابێ. نیشانەیەکە وەک واوێکی پچووک لەسەر هێندێ پیتی عەرەبی دادەنرێ.
بۆران: کاتی تۆف و سەرما و باران.
بۆرانی: جۆرە خواردەمەنییەکە لە هێلکە دروست دەکرێ.
بۆراو: چێشتێکە لە بروێشی گەنمی برژاو دروست دەکرێ و ڕۆنی داخی دەکرێ بە سەردا.
بۆرچیل: د. شتی ڕەشکەوە.
بۆرچین: د. بۆرچیل. مراویی مێ.
بۆڕ: جێگایەکی فێنکە لە ژێر پووش و گەڵایدا لە زەویدا دروست دەکرێ بۆ میوەهەڵگرتن. کەسێکە کە بۆڕی خواردبێ.
بۆڕاندن: بۆڕەکردن.
بۆڕخواردن: دەمکوتبوونی یەکێک لە قسە و گفتوگۆیەکدا. زەبوونبوونی یەکێک لە یارییەکدا.
بۆڕدان: زەبوونکردنی یەکێک بەقسە یا لە یارییەکدا.
بوڕمان: دەنکە هەناری وشکەوەبوو.
بۆڕە: دەنگی بەرزی ڕەشەوڵاخ. (بۆڕەبۆڕ) بۆڕەی یەک لە دوای یەک.
بوڕێش: د. بروێش.
بوڕێشین: د. چێشتی بروێش.
بۆڕیە: شتێکی کولۆری دەم واڵی سەرتەسکە سەرباز فووی پێدا دەکەن بۆ پێدا ڕاگەیاندنی فەرمانێک پێیان. بۆری.
بۆڕیەزەن: سەربازێکە کە بۆڕیە لێ بدات.
بۆڕی: بۆڕیە.
بۆڕێژەن: بۆڕیەزەن.
بورغوو: بزمارێکە کە سەرەکەی پێچ پێچ بێ.
بورغی: بورغوو.
بۆرە: ئەسپ و ماین و سەگێکە کە بۆر بن. بوورە.
بۆرەبنار: دەمقاڵی.
بۆرەپنە: د. قەلەباچکە.
بۆرەپیاو: پیاوێکە کە ناسراو و ناودار نەبێ.
بۆرەجرە: باڵندەیەکی بۆرە وەک (فشەکلاونە) بەڵام ئەم پچووکترە و بێ کڵاوە.
بۆرەخزم: خزمی دوور.
بۆرەسوار: سوارێکە کە ناسراو و ناودار نەبێ.
بۆرەقانی: هـ. گیای سوورەوەکراو.
بورەقنە: شتێکە کەمێ بۆربێ.
بۆرەک: باڵندەیەکی بۆری پچووکی دەشتییە. جۆرە خواردەمەنییەکە لە ئارد و هێلکە و قیمە و ڕۆن دەکرێ.
بۆرەڵووک: بۆرەقنە.
بۆریە: لوولەیەکی بۆشی کوناودەرە لە شووشە یا ئاسن یا تەنەکە یا گڵی سوورەوەکراو.
بۆری: بۆریە. بوونی شت بەبۆر.
بۆز: ڕەنگێکە لە تێکەڵبوونی ڕەش و سپی پەیدا دەبێ.
بۆزە: شتی بۆز.
بۆژانە: گیایەکی گەڵا وردی لاسک درێژە گوڵێکی بۆری پچکۆلە دەگرێ بۆنێکی توندی هەیە دەکرێتە ناو جلوبەرگەوە بۆ ئەوەی مۆرانە نەیخوا.
بۆژۆ: گیا و ئالیکێکە کە لە بەردەمی ئاژاڵ و وڵاخدا مابێتەوە.
بۆژۆکردن: بریتییە لە سەرکردنەسەر یەکێک و بێزارکردنی.
بۆژە: بۆژۆ.
بۆژەکردن: بۆژۆکردن.
بۆسار: بۆنی زۆر ناخۆش.
بۆسان: بێستان.

بۆسۆ: بۆنی پەڕوێ سووتاو.
بۆسـۆ لێ هەسـتـان: بریتـیـیـە لە بڵاوبوونەوەی دەنگوباسێکی ناشیرین لە یەکێکەوە.
بۆسۆ لێ هەڵنەستان: بریتییە لە زۆر ڕووتی و هەژاراییی یەکێک: فیسار کەس ئەوەندە ڕووتە (بۆسۆی لێ هەڵناسێ).
بۆسە: بووسە.
بۆسەخواردن: بووسەخواردن.
بۆش: شتی هەڵۆڵ. زۆز (ز).
بۆشایی: هەڵۆڵیی شت.
بۆشکە: د. بەرمیل.
بۆشناخ: گیانداری باڵابەرزی تێکسمڕاوی چوارشانە.
بۆشی: بۆشایی.
بوغمە: وتەیەکە لەباتی وتەی (قوززەقورت) دەوترێ.
بۆق: دەعـبـایەکی پانکەڵەی چوارپێی مـەلەوانە، بەقـونە دەڕوا. هەڵم: ئەم حەمامە (بۆق)ی زۆرە. چاوی زەق (د).
بۆق پێوەنان: پاڵ پێوەنان.
بۆقژە: جۆرە دەم ئێشەیەکە تووشی منداڵی ساوا دەبێ.
بوقل: ز. پووز.
بۆقلەمووت: د. بۆقلەموون.
بۆقلەمـوون: مـەلێکی مـاڵیـیـە بەقـەد قـازێک دەبێ، گـۆشـتی دەخورێ، نێـرەیان خـۆی گـیڤ دەکـا و سـەردەندووکی پارچە گۆشتێکی پێدا شۆڕ دەبێتەوە.
بۆقەبۆق: جۆرە دەنگێکی ڕەشەوڵاخە لە بۆڕە نزمترە.
بۆقەتە: پشتی مل.
بۆقە مەلە: جۆرە مەلەیەکە وەک مەلەی بۆق.
بۆقی مل: بۆقەتە.
بۆ کردن: د. بۆگەنبوون.
بۆ کرووز: بۆنی خوری و مووی سووتاو.
بۆکـر: جـۆرە بۆنـێکە لە هێندێ مـاست و چێـشت دێ بەهۆی زۆر مانەوەیەوە لەسەر ئاگر.
بوکڵە: بووکی منداڵانە.
بۆکڵیشە: بۆ دڕن.
بۆگنتگ: جۆرە بۆگەنییەکە لە میوەی ڕزیو و هێندێ شتی تر دێ.
بۆگـەن: شـتی بۆن ناخـۆش. بۆگـەنبـوون: گـەڕانی شت بەبۆگـەن. بۆگەنکردن: بۆگەنبوون: گۆشتەکە (بۆگەنی کردووە).
بۆگەنکە: خورما. سیچان. گیایەکی بۆگەنە.
بۆڵ: دەنکی ترێ. زەنگێکی زلە دەکـرێتـە ملی پێـشـەنگ. هێشووی ترێ و خورما. خۆڵەمێش.
بۆڵاندن: بۆڵەکردن.
بۆڵـمازوو: جۆرە ترێیـەکی سپییە وەک (سادانی) وایە بەڵام ئەم مزرە و لەو ناسکترە.

بۆڵە: بۆڵە.
بۆڵە: لەبەرخۆوە خوتەکـردن لەسەر شـتێک کە پێت نـاخۆش بێ. بۆڵەبۆڵ: بۆڵەی یەک لەدوای یەک. بۆڵەکردن: بۆڵەبۆڵ.
بۆڵەمر: خۆڵەمێشی گەرم.
بۆڵەمە: مـاتەدانی بەری بەرزە درەخت: ئەم مـێـوە (بۆڵەمە)ی تێ کەوتووە، واتە ماتەی داوە.
بۆڵەمێ: بۆڵەمە.
بۆم: د. بۆمبا.
بۆمارانە: سیرمۆکە.
بۆمبا: شتێکی بۆشە پڕە لە پارچە ئاسن و باڕووت، دەهاوێژرێ بۆ دوژمن.
بۆمباباران: هاویشتنی بۆمبا بەفڕۆک.
بۆمباران: د. بۆمباردومان.
مومباردومان: بۆمباباران.
بۆمباهاوێژ: فڕۆکێکە کە بۆمبا هەڵگرێ و بیدا بەسەر دوژمندا.
بۆمچ: بۆ گنتک.
بۆمچک: بۆمچ.
بۆمچە: د. بۆمچ.
بۆمچەوە: د. بۆمچ.
بۆن: هاڵاوێکی خۆش یا ناخۆشە لە هێندێ شت دەبێتەوە و دەچێ بەلووتدا.
بۆنبـڕە: چەند شـتێکی تایبـەتی بۆنخـۆشە لەگـەڵ گـڵـێکی پاکـدا تێکەڵ دەکـرێ و بەئاوەوە دەکـرێ بەدەمی منداڵێکەوە کـە بەبۆن کەوتبێ.
بۆن پێدان: نیوە برژکردنی هێندێ شت لەسەر ئاگر.
بۆنخۆشکە: با. ڕێحانە کێویلە.
بۆنخۆشکەرە: گـیایەکی بەهاریی کـوێسـتـانیی بۆنخۆشە دەخرێتە ناو کەلوپەلەوە.
بۆنخۆشی: بوونی شت بەبۆنخۆش.
بۆندار: تووتنی بۆنخۆش.
بۆندان: بۆن پێدان.
بۆندانەوە: بڵاوبوونەوەی بۆنی شت.
بۆندڕ: بۆ دڕ.
بۆندڕن: بۆ دڕن.
بۆنکردن: بۆکردن.
بۆن و بەرامـە: هاڵا و بۆنێکی خـۆشـە کـە لە شـتـێکەوە بڵاوبووبێتەوە.
بۆنە: هۆی شت: بە(بۆنە)ی تۆوە هاتم.
بوو: کوندەبەبوو.
بوار: تەنکاییی ئاو کە ڕێی هاتوچۆ بدا.

بواردن: هەڵبواردن. ڕەنگگرتنی کاڵا و پارچە بەڕەنگێکی جیاواز لە خۆی بەجۆرێک کە ئیتر لێی نەبێتەوە.
بوارەدان: ڕێدان بۆ قسەکردن: فیسار کەس (بوارەی قسەی کەس نادا).
بۆ و بەرامە: بۆن و بەرامە.
بووتک: با. پلوسک. دارێکی هەڵکۆڵراوە کــە ئاوی پێـــدا بپەڕێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.
بوودر: کونێکە لە زەوی کە هەڵکەنرابێ.
بوودەڵە: مەردوومی هیچ لێ نەهاتوو.
بوودینە: نەعنا.
بوور: زەمینێکە کە ساڵێک بێ نەکێڵرابێ.
بووراندن: ز. هێنان و بردن.
بوورانەوە: بووردنەوە و لەسەرخۆ چوون.
بووردن: خۆشبـوون و چاوپۆشی. زۆر گـەیین و تەپینی کـاڵەک و شووتی: ئەم کاڵەکە یا ئەم شووتییە بووردووە.
بووردنەوە: لە هۆشخۆچوون.
بووردوو: شووتی و کاڵەکێکە کە زۆر گەییبێ و لووس بووبێ.
بوورە: بوور.
بووری: ل. بۆرییەی سەماوەر.
بوورین: ز. ڕابووردن.
بوور: با. بوار.
بووزوو: شاڵی ڕانک و چۆغە.
بووژانەوە: ژیانەوەی گیاندار یا سەوزایی لەپاش کزی و زەبوونی.
بووسە: حەشار. کەڵەمەی جووت (ز).
بووسەخواردن: خۆحەشاردان.
بووسەلی: با. ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
بووش: با. ئاوی زۆر.
بووق: ز. نێرکە پیازێکە کە تۆوەکەی بەسەرەوەبێ.
بووک: ئافرەتێکە کە تازە شووی کردبێ. ژنی کوڕ. گوڵاڵە سوورە (با). شـتـێکە لە وێنەی بووک منداڵان دروسـتی دەکـەن لە قامیش و واڵا بۆ یاری.
بووکبووکێنە: یاریکردن بەبووکی قامیش.
بووکک: ز. سیچکە سڵاوە.
بووکڵە: بووکی منداڵانە.
بووکەبەبارانە: بووکە بەبارانێ.
بووکـەبەبارانێ: شـتــێکە وەک داهۆڵ منداڵان دەیکـەن لە دار و پەڕۆ لە حـەلی بێ بارانیـدا مـاڵەو مـاڵ دەیگێـڕن بـۆ ئەوەی ئاوی بەسەردا بکەن بۆ نوقڵانەی باران بارین.
بووکە سەماکەرە: شتێکە وەک بووکە بەبارانێ منداڵان لە بەڕۆ و لۆکە دەیکەن بۆ یاری پێ کردن.
بووکەشووشە: جۆرە بووکێکی منداڵانەیە لە شووشە.
بووڵ: هـ. خۆڵەمێش.
بوولە: مەردوومی بوودەڵە.
بووم: ساختمانی جەستە: فیسار کەس (بووم)ی باشە یا خراپە. خاک و زەویوزار: فیسار شوێن بەر و (بووم)ی باشە.
بوومەلەرزە: جووڵانەوەی هێندێک لە زەوی بەهۆی هوروژم هێنانی هەڵم و بۆقی ناویەوە.
بوون: پەیدایی و هاتنە ناوی شت لە دوای نەبوونی. بۆن (ل). بریتییە لە دارایی و دەست ڕۆین.
بوونەوە: بووژانەوەی مەردووم لە دوای لێکەوتنی.
بۆڕەتەگە: بۆنێکی ترشەڵۆکی ناخۆشە لە سابرێن و بزنەوە دێ.
بووە: کەسێکە کە دارا و دەوڵەمەند بێ. کوندەبەبوو (هـ).
بووەتەقلە: هـ. کوندەبەبوو.
بووەکوێرە: بایەقوش.
بووەکەرە: کوندەبەبوو.
بوهر: با. بەش.
بوهرزاوی: جۆرە مقامێکە.
بوهن: ز. بۆن.
بوهندار: ز. بۆندار.
بوهیشت: ز. بەهەشت.
بۆیاخ: جۆرە ڕەنگێکە شتی پێ ڕەنگ دەکرێ.
بۆیاخچی: کەسێکە بۆیەکاریی بکا.
بوێژ: گۆیندە. قسەکەر. شاعیر.
بۆیسان: بێستان.
بویش: با. شۆینی زەبەندی دێم.
بۆینباخ: شتێکی تایبەتی جوانی درێژە لە قوماش دەبەستـرێتە مل.
بۆیە: بۆیاخ. وتەیەکە لە وەرامی پرسیـارێکدا دەبێـژرێ کە وەرام دەرەوەکـە لەو پرسیــارە سـەغـڵـەت بێ. (بۆیە) لە وەرامی یەکێکدا کە پێت بڵێ بۆچی وادەکەیت؟
بۆیەچی: بۆیاخچی.
بۆیەکاری: خەریکبوون بەکاری بۆیەوە. شوێنێکە کە بۆیە کرابێ: خانووی فیسار کەس هەمووی بۆیەکارییە.
بە: بەگەلێ مەبەس هاتووە، (١) هۆیەتی و سببیـتی ئەو وتەیەی کـە ئەم دەچێتـە سـەری بۆ وتارێک کـە لە دواوە دێ: (بە) هاتنتان دڵم کرایەوە، واتە مایەی کرانەوەی دڵم هاتنتان بوو. (٢) بۆ سـوێندخـواردن: (بە) خـوا. (٣) بۆ یاریدەدان: (بە) قەڵەم دەنووسم، (بە) پارە شت دەکڕم (٤) بۆ ظرفیت: (بە) ڕۆژ کـار دەکـەم، (بە) شـەو دەنووم. (٥) بۆ بەرزێتی: کـرا (بە) دارا. (٦) بۆ هاوڕێیی: (بە) خـۆشــیـــەوە دەچم بۆ

قوتابخانە. (٧) بۆ تشبیە: کەسم نەدیوە (بە) ڕەنگی تۆ. (٨) بۆ چەندێتی و ئەندازەی شت: گەنم لە هێندێ شوێن (بە) کێشان و لە هێندێ شوێن (بە) پێوانە. (٩) بۆ پێکەوە نووسانی دوو شت: دەردی دواکەوتن (بە) گەلی نەخوێندەوارەوەیە، یا لە ڕێ گەیشتم (بە) نەریمان. (١٠) بۆ کردنی اسم بە صفەت: منداڵی (بە) هۆش، پیاوی (بە) هێز واتە منداڵی هۆشیار و پیاوی هێزدار. (١١) بۆ لێکدانی دوو وتە: ڕوو (بە) ڕوو، موو (بە) موو، دەست (بە) دەست، سەر (بە) سەر.

بەئاگاهاتن: بێداربوونەوە و هاتنەوەهۆشی ئادەمیزاد.

بەئاواتگەیشتن: گەیشتن بەمەبەست.

بەئاوادان: بریتییە لە بەفیڕۆدانی شت: فیسار کەس دارایییەکەی (دا بەئاودا)، یا ڕەنجی سەد ساڵەی باوکی (دا بەئاودا).

بهار: با. بەهار.

بهارە: ز. گەنمە بەهارە.

بەئۆک: ز. شتی خراپ و ناشیرین.

بە با: سەگ و بەراز و پشیلەیەکی مێینەیە کە ئارەزووی نێر بکا.

بەبرشت: بریتییە لە مەردوومی دەمراستی فەرمانڕەوا.

بەبک: ز. منداڵی ساوا.

بەبلوانە: بووکی پچووکی قامیشین کە منداڵ لە بووک بووکێنەدا لە تەنیشت بووکی گەورەی قامیشینەوە دایدەنێن.

بەبلە: د. منداڵی ساوا.

بەبۆکە: بووکێکە لە وێنەی منداڵ لە شووشە یا لاستیک یا قامیش دەکرێ. وتەیەکە لە خۆشەویستییەوە بەمنداڵی ساوا دەوترێ.

بەبۆلە: د. بەبۆکە.

بەبە: وتەیەکە منداڵی ساوا بەمنداڵی ساوای تری دەڵێ. تیرەی بابان.

بەپێ: ئادەمیزادێکە کە لە ڕێ ڕۆیندا ئازابێ.

بەپێچ: بریتییە لە فێڵباز، ڕێوی (بەپێچە).

بەت: باڵندەیەکی سپییە لە مراوی گەورەترە.

بەتار: ز. بینایی چاوان.

بەتارە: د. لفکە.

بەتاڵ: دەفری خاڵی. کاری بێ کەڵک. مەردوومی بێ ئیش.

بەتاڵایی: عاستی بەتاڵیی شت.

بەتاڵی: بێکاری. عاستی بۆشی شت.

بەتاناچوون: بەتاناهاتن.

بەتاناهاتن: ژمارەکردن و باسکردنی چاکە یا خراپەی شتێک بەدووروودرێژی.

بەتانوبۆداهاتن: بەتاناهاتن.

بەتانیا: جۆرە پێخەفێکی ئەستووری خوریی تەنراوی سووراوەیە.

– بەتانیە: بەتانیا.

– بەتانی: بەتانیە.

بەترپێر: بەسرپێرێ.

بەترپێرار: بەسرپێرار.

بەترەف: د. شتی لەکار کەوتوو.

بەتلاندن: لەدەستدانی شت.

بەتلانە: ز. ڕۆژی تەعتیل.

بەتلین: ز. ماندووبوون.

بەتوون: د. وتەیەکە لەجێی وتەی (قیروسیا) بەکاردێنرێ.

بەتوێکڵ: بریتییە لە وتەیەک کە دوو مەعنای بێ.

بەتەقەکەوتن: دەستهەڵگرتن لە شتێک لە شەرماندا.

بەتەنگەوەبوون: دەربایستی و مەبەستبوونی شتێک.

بەتیە: عەبای هاوینە.

بەجا: بەجێ.

بەجگە: بێجگە.

بەجووج: ز. زۆر بلێ. داوێن پیس.

بەجەرگ: بریتییە لە ئادەمیزادی ئازای چاونەترس.

بەجێ: گوفتار یا کردارێکە کە لە جێی خۆیدابێ.

بەجێگە: بەجێ.

بەجێمان: پاشکەوتنی شتێک لە شتێک.

بەجێماو: شتێکە کە پاشکەوتبێ لە شتێکی تر.

بەجێهاتن: جێبەجێ بوونی کارێک.

بەجێهانین: بەجێ هێنان.

بەجێهێشتن: دواخستنی شتێک و جوێبوونەوە لێی.

بەجێهێنان: جێبەجێکردنی کارێک.

بەچ: بەچکە. شەڵغە.

بەچاوکردن: بەدیکردن.

بەچاوەوەبوون: تووشی زیانبوون بەهۆی چاوی پیسەوە.

بەچاوەوەکردن: چاوی پیس هەڵهێنان بەشتێک و هەڵپەرداوتنی.

بەچک: د. بەچکە.

بەچکە: بێچووی گیاندار.

بەچنگ: بریتییە لە گیاندارێک کە بەپچڕ بێ لە پەیداکردنی شتدا.

بەچوو: بێچوو.

بەچوە: بێچوو.

بەچە: ل. منداڵ. زاوا. بووک.

بەچەباز: د. هەتیوباز.

بەچەبازی: نەخۆشیی گەشکە کە تووشی منداڵ دەبێ. هەتیوبازی.

بەچەخۆرە: دەردێکە تووشی گیاندار دەبێ و هەرگیز تێر ناخوات.
بەچەدان: ل. منداڵدان.
بەحەشت: بەهەشت.
بەخت: تالع و ناوچەوان و بەش.
بەختدار: بەختیار.
بەختداری: بەختیاری.
بەخترەش: بەدبەختی کولۆڵ.
بەختکردن: چوونەوەی ڕەنگ. خەرجکردن و بڵاوکردنەوەی دراو.
بەختکەنۆک: ز. بەختیاری.
بەختە: بەران و سابرێن.
بەختەباران: مانگی مایس کە سی و یەک ڕۆژە.
بەختەمام: ز. مەردوومی ئەمینی ڕاستگۆی دڵسۆز.
بەختەمامی: ز. ئەمینی و ڕاستگۆیی و دڵسۆزی.
بەختەوار: ز. مەردوومی ئەمینی بەوژدان.
بەختەوەر: بەختیار.
بەختیار: خاوەن بەخت.
بەختیاری: خۆشبەختی و کامەرانی. ناوە بۆ تیرەیەکی گەورەی کورد لە ئێران.
بەخزمەت: خزمەتگوزار.
بەخشایش: بەخشش.
بەخشش: بەخشیش.
بەخشندە: کەسێکە زۆر شت بدا بەمەردووم. کەسێکە کە چاو بپۆشێ لە مەردووم.
بەخشندەیی: شت دان بەمەردووم بەزۆری.
بەخشیش: شتێکە کە گەورەیەک بیدا بەپچووکێک.
بەخشین: شت دان بەیەکێک بەخۆڕایی، چاوپۆشیکردن لە یەکێک.
بەخشینەوە: بەشینەوە.
بەخۆداهاتن: خۆدارشتن و گەورەبوون.
بەخۆژیو: کەسێکە کە ئازا و ئیشکەر بێ و بە ڕەنجی شانی خۆی بژی.
بەخۆکردن: د. بەخێوکردن.
بەخۆنازین: بایبوون.
بەخۆوەبوون: قەڵەوی و تێکسمراوی.
بەخۆوەبەستن: بەستنی یەکێک بەخۆتەوە لە کارێکدا.
بەخوێکردن: د. بەخێوکردن.
بەخەبەر: کەسێکە کە نووستوو نەبێ. ئاگادار بە شت.
بەخەڵ: د. باخەڵ.
بەخەمکردن: گەورەکردن و پەروەردەکردنی شتێک.
بەخێوکردن: پەروەردەکردن و بەرهەمهێنانی گیاندار.

بەد: گیانداری خراپی نالەبار.
بەدانکەوتن: نەخۆشکەوتنی ئاژاڵ لە زۆرخواردنی ئالیکەوە.
بەدئەخم: د. ڕووگرژی، ڕووترش.
بەدابکردن: ناڵەناڵ و نکەنکی نەخۆش بەدەم نەخۆشییەوە.
بەدبەخت: کەسێکە کە بەختی لە هیچدا نەبێ. ستەمکار: فیسار کەس زۆر خراپ و (بەدبەخت)ە.
بەدبەختی: کولۆڵی و بێ چارەیی. ستەمکاری.
بەدبێژ: د. بەدگۆ.
بەدبێژی: بەدگۆیی.
بەدبین: کەسێکە کە ئەنجامی کار بەباش نەبینێ.
بەدبینی: بینینی ئەنجامی کار بەخراپ.
بەدتوخم: مەردوومی ناڕەسەن.
بەدتەرەف: د. بەرتەرەف.
بەدچارە: ئێسک قورس.
بەدخواە: کەسێکە کە خراپەی مەردوومی بوێ.
بەدخواهی: ویستنی خراپەی مەردووم.
بەدخوو: گیاندارێکە کە خووی خراپ بێ. (بەدخووبوون) خراپبوونی خووی گیاندار. (بەدخووکردن) خراپکردنی خووی گیاندار.
بەدخوویی: خراپی ڕەوشت و خوو.
بەد دڵ: د. دڵپیس.
بەدڕەسەن: ناڕەسەن.
بەدڕەفتار: بەدخوو.
بەدرەقە: ڕابەری شارەزا.
بەدڕەقەکردن: ڕابەریکردن لە ڕێ ڕۆیندا.
بەدرەمە: جۆرە هەنگێکە لە هەنگی ماڵی پچووکترە و، هەنگوینەکەشی لە هەنگوینی ماڵی جیرتر و خۆشتر و بەنرخترە و پێی دەڵێن: هەنگوینی (شەمەتلێنکە).
بەدزبان: کەسێکە کە چاکە بە زبانیدا نەیەت.
بەدزەرە: د. مەردوومی ئێسک قورس.
بەدسروشت: کەسێکە کە بەسکماک بەدخوو بێ.
بەدکار: کەسێکە کە کردەوەی بەد بێ.
بەدکاری: بەدیی کردەوە.
بەدکردار: بەدکار.
بەدکرداری: بەدکاری.
بەدگۆ: کەسێکە کە باشەی کەس نەڵێ.
بەدگومان: کەسێکە کە بیری دەربارەی مەردووم باش نەبێ.
بەدگۆیی: وتنی خراپەی ئەم و ئەولای مەردووم.
بەدڵبوون: چوونی شتێک بە دڵتدا.
بەدڵەوەنووسان: بریتییە لە خواردن و خواردنەوەیەک کە لەسەر پشت و بەحەسانەوە بێ: نانەکەم (بەدڵەوە نووسا).

بەدمەست: کەسێکە کە سەرخۆش بوو زۆر بێهۆش بکەوێ.
بەدمەمستی: بێهۆشیی زۆر لە سەرخۆشییەوە.
بەدناو: کەسێکە کە ناوی بەخراپە زرابێ. (بەدناوبوون) ناوزڕان بەخراپە. (بەدناوکردن) ناوزڕاندن بەخراپە.
بەدناوی: ناوزڕان بەخراپە.
بەدنگین: بەدبەخت.
بەدنگینی: بەدبەختی.
بەدنمەک: کەسێکە کە بەرامبەر بەچاکە خراپە بکا.
بەدنمەکی: سپلەیی.
بەد نهاد: بەد سروشت.
بەد نیهاد: بەد نهاد.
بەدوێژ: د. بەد بێژ.
بەدوێژی: د. بەد بێژی.
بەدەردخواردن: بەکارهاتن.
بەدەس: بەدەست.
بەدەست: مەردوومی دەست ڕۆیو.
بەدەستگرتن: بریتییە لە چوونی مێرد بۆ لای ژنی خۆی یەکەمین جار.
بەدەستەوەبوون: بریتییە لە نیازی کردنی کارێک: (بەدەستەوەم) بچم بۆ بازاڕ.
بەدەستەوەدان: دانی شتێک بەیەکێک لە ڕووی زۆر یا فڕوفێڵ لێ کردنەوە: فیسار کەس پیاوکوژەکەی دا بەدەستەوە. لاوازبوون و بەناوداچوونی نەخۆش: فیسار کەس بەم نەخۆشییە (داویە بەدەستەوە).
بەدەق: گیاندار و سەوزاییی بەکەیف.
بەدەم: ئادەمیزادی قسەڕەوان.
بەدەمار: مەردوومی بەفیز.
بەدەم و پل: بەدەم.
بەدەم و دوو: مەردوومی قسەزانی قسەخۆش.
بەدەمەوەدان: بریتییە لە لغاو شلکردن بۆ یەکێک. دەرخواردنی شتێک بەدەم شتێکی ترەوە وردە وردە: ئەو چیلکە و چەوێڵە (بدە بە دەم ئاگرەکەوە).
بەدەن: ز. شوورە و دیواری بەرز.
بەدەو: گیانداری چەسپان. جوان (ز).
بەدیارەوەبوون: ئاگاداریکردنی شتێک.
بەدێلڤانی: ز. یارمەتی.
بەدیی: خراپەکردن: (بەدی) مەکە. (بەدیکردن) خراپەکردن.
بەدیکردن: بینینی شت لە دوورەوە و کردنی خراپە.
بەدیل: ز. نۆرە.
بەر: پێش: پچۆرە (بەرەوە). بەری درەخت و شینایی و گیاندار و مەشکە. مووی خوار بەرموسڵدان. لایەک لە شتێک یا لە شوێنێک کە سنوورێک جیای بکاتەوە لە لاکەی تر: ئەم (بەر) یا ئەو (بەر). بەرد (با). بەرگ (ز). پانیی شت: چیتەکە (بەر)ی پانە. پارچەیەکە دەگیرێ بەبەری کاڵادا لە دیوی ناوەوە. پیتێکە بەهەر ناوێک (اسم)ەوە نووسا دەیکا بە اسمی فاعل: ڕەنج (بەر)، فەرمان (بەر)، ڕا (بەر). دەرگا (هـ).
بەرا: ل. بەرخ. کارژۆلە .
بەرابەر: بەرامبەر.
بەرابەری: بەرامبەری.
بەرات: مووچەیەکی ساڵانەیە کە گەورە دەیبڕێتەوە بۆ پچووک. بەڵگە (ز).
بەراتخۆر: مووچەخۆر.
بەراتە: ز. لاکە تۆپیوێکە کە لە دەشتدا فڕێ درابێ.
بەراتی: شتێکە کە بە بەرات دەدرێ.
بەراردەی: هـ. هەڵکەندن.
بەراز: دەعبایەکی کێویی مل کورتی بەزیانە بەقەد بەرانێک دەبێ. بریتییە لە مەردوومی بەهێزی بەکێش.
بەرازخۆر: تیرەیەکن لە قەراخ سیروان لە بەشی ئێراندا دادەنیشن.
بەرازە: دوو دانی گەورەیە بەرزە وڵاخ لە شەش ساڵیدا دەری دەکات. چەند دارێکە دەخرێتە بن بەرداشی ژێرووی ئاشەوە (ز). شتێکە کە شتێکی تری پێ بەرز بکرێتەوە (ز).
بەراش: ز. بەرداش.
بەراڤ: ز. بالاڤ.
بەراڤێژک: ز. حەلوا و دیارییەکە کە لە جەژندا بنێردرێ بۆ ئاشنایەک. (بەرامای) هـ. دەرهاتن.
بەرامبەر: دوو شتی ڕووبەڕووی یەک.
بەرامبەرکێ: د. بەرامبەری کردن.
بەرامبەری: وێستانی دوو شت بە ڕێکی یەک.
بەرامبەریکردن: بەرزە بلێس وێستانی یەکێک لە ڕووی یەکێکی تردا.
بەرامە: بۆن و هاڵاوێکی خۆشە کە لە شتێکەوە بێ.
بەران: شەکی نێری چوار ساڵە.
بەرانبەر: بەرامبەر.
بەرانبەری: بەرامبەری.
بەرانبەری کردن: بەرامبەری کردن.
بەرانپێچ: جۆرە بەروانکەیەکی گەورەیە ژنان لە کاتی فرماندا دەیگرن بەبەرسنگیانەوە.
بەرانپێڵ: بەرانپێچ.
بەرانگە: ز. بەچەی مەڕ و بزن.

بەرانەکێوی: جۆرە بەرانێکی کێویی سوورکاری شاخداری قوڵ هەڵکراوی تووک کورتە.
بەراو: زەمینێکە کە لەبەر ئاوابێ.
بەراوپشت: د. بەر و پشت.
بەراوردکردن: تاقیکردنەوە.
بەراوەژوو: ئاوەژوو.
بەراویتە: گیاندارێکە کە بەری بەناکامی فڕێدابێ.
بەرایی: پێشڕەویی شتێک: بەرایی ئاوەکە یا لەشکرەکە گەیشت.
بەراییدان: چاوهەڵهاتن بەبینینی شتێک یا شوێنێک و دڵ بروایی دان بۆ تەماشاکردنی: چاوم (بەرایی نادا) فیسار کەس ببینم.
بەراییهاتن: بەراییدان: چاوت (بەرایی هات) فیسار کەس ببینیت؟.
بەربا: دانەوێڵەیەکی پووچە کە لە کاتی شەنکردندا با بیبا. بەرباد.
بەرباخت: ز. کچێکە کە کاتی شووی هاتبێ.
بەرباد: شتی لەکارکەوتووی پەرێشان. (بەربادبوون) لەناوچوون و پەرێشانبوونی شت. (بەربادکردن) لەناوبردن و پەرێشانکردنی شت.
بەربار: وڵاخێکی یەک سمە کە کاتی بارکردنی هاتبێ و هێشتا نەگیرابێ.
بەربازن: بازنێکی باریکی پچووکە لە دوای بازنەکانی ترەوە لە دەست دەکرێ بۆ ئەوەی دانەماڵرێن.
بەربانگ: خواردنێکە کە ڕۆژووەوان ئێوارە بیخوا.
بەربانگ کردنەوە: خواردنی بەربانگ لە ئێواراندا.
بەربای گوێکەوتن: بریتییە لە سووسەکردنی قسەیەک.
بەربچان: ز. کەسێکە ڕەوشت و خووی لە خەڵق بەدەر بێ.
بەربر: ز. کەسێکە بەرد بشکێنێ. سەرتاش.
بەربژاری: ز. ئیمتیاز.
بەربن: د. بەربەست.
بەربوو: ز. ئەو کەسانەن کە دەچن بۆ بووک.
بەربوودی: ز. بەربووک.
بەربوورە: پێشبینین و چاوپێکەوتن: تۆ لە (بەربوورە) بڕیار مەدە، واتە تا شت بەچاو نەبینیت باوەڕ مەکە.
بەربووق: ز. گونجی ئاو.
بەربووک: ژنێکە لەگەڵ بووکدا بچێ بۆ ماڵی زاوا.
بەربوون: بەرەڵابوونی بەندی. ڕاییبوونی ئاو. بەرەڵابوونی گیاندار لە پەت یا لە قەفەس. لاچوونی ڕەشیی مانگ و ڕۆژ بەهۆی گیرانیانەوە. ترازانی دوو شتی قایمکراو لەیەک: تەختەی ئەم کورسییە، یا ئەم دروومانە (بەربووە).
بەربوونەوە: کەوتنە خوارەوە. ڕاییبوونی ئاو.
بەربەر: سەرتاش. دەنگێکە جووتیار لە گای جووتی دەکا لە کاتێکدا کە بیەوێ گاکان لابکەنەوە بۆ لای بوورەوە.
بەربەرۆچکە: شوێنی پەنابای ڕووەو هەتاو.
بەربەرۆشک: ز. مەردوومی بێ ئیشوکار. کەسێکە کە هەمیشە لە مدبەقدا بێ.
بەربەرە: دارێکی چەوتە دەخرێتە گێڕی هەوجاڕ بۆ تەختکردنی گێڕ. بەفرماڵ.
بەربەرەکانێ: ملەملەکردن و چەنەبەچەنە وێستانی یەکێک لەگەڵ یەکێکی تردا.
بەربەرەکانی: بەربەرەکانێ.
بەربەژن: ز. نوشتە.
بەربەس: بەربەست.
بەربەست: بەرهەڵستێکە لەبەر بانی ئاو یا لەسەر ڕێگا دادەنرێ بۆ نەڕۆین و هاتوچۆ نەکردن.
بەربەستکردن: بەرهەڵست دانان. هەڵکێشانی ڕیسی ڕەنگکراو لە زاخاوی گەرما بۆ ئەوەی کە ڕەنگە نەچێتەوە.
بەربەسکردن: بەربەستکردن.
بەربەسێڵ: گۆشتێکە کە لەناو ساجدا سوور دەکرێتەوە لەگەڵ ڕۆندا و ماستی دەکرێ بەسەردا.
بەربەش: ز. شتێکە کە لە مەعدەن دروست کرابێ.
بەربەق: بەربەستێکە دروست دەکرێ لە مەرەزەی (تیر) لە زەوییەکدا کە بەرز و نزم بێ بۆ ئاوخواردنەوەی مەرەزەکە بەیەکسانی.
بەربەن: د. بەربەست. جۆرە خورمایەکە.
بەربێژ: ز. چەنەباز.
بەربێڵ: بەرەجووت.
بەربین: قورقوڕاگە لە دیوی دەرەوە.
بەرپابوون: هەڵگیرسانی هەرا و ئاژاوە. (بەرپاکردن) هەڵگیرساندنی هەرا و ئاژاوە.
بەرپاش: ز. پێچەوانە.
بەرپرسیار: ز. کەسێکە بەرامبەر شتێک مەسئوول بێ و پرسیاری لەسەر بکرێ.
بەرپرسیاری: ز. مەسئولیەت.
بەرپەچدانەوە: قسە بردنەدواوەی یەکێک بەقسە هێنانەوە بەسەریدا. بەرە و بڕیی دانەوە لە ڕۆیندا.
بەرپەرچ: د. پەرژین.
بەرپەرچدانەوە: بەرپەچدانەوە.
بەرپێچ: د. مووروولەیەکە لە سەری ئەو سەری بورغو توند دەکرێ بۆ ئەوەی کە بورغوەکە دەرنەیەت.

بەرتل: د. پارە یا میچێکە کە لە یاریی (مووشێن)دا لە بەرتیلی هەڵماتدا دادەنرێ.
بەرتەرەف: شتێکە کە لە کەڵک کەوتبێ.
بەرتەلانە: بەنێلانە.
بەرتە و بۆڵە: برت و بۆڵ.
بەرتیشت: ز. بەرچایی.
بەرتێلانە: د. دیارییەکە لە ماڵی زاواوە دەنێردرێ بۆ ماڵی بووک بەر لە گواستنەوەی.
بەرتیل: شتێکە کە بیدەیت بەیەکێک کە کارێکت پێی بێ بۆ ئەمەی ئەو کارەت بۆ بکا.
بەرتیل خواردن: بریتییە لە بەرتیل وەرگرتن.
بەرتیلخۆر: کەسێکە کە بەرتیل بخوا.
بەرتیلکردن: د. قسە کێشانەوە لە یەکێک.
بەرجفت: د. بەرەجووت.
بەرجل: ز. بەروانکە.
بەرجەوەن: د. چەشمەنداز: ئەم خانووە (بەرجەون)ی خۆشە.
بەرجەوەنگکردن: لێکدانەوەی قسە لەپێش کردنیدا بۆ بەراوردی چاکی و خراپیی قسەکە: قسە تا (بەرجەوەنگ) نەکەیت مەیکە.
بەرجێنک: ز. بەرچاوگەی ژنان.
بەرچا: بەرچایی.
بەرچاڤک: ز. چاوێلکە.
بەرچاو: شتێکە کە هەمیشە لە پێش چاو بێ.
بەرچاو تاریکبوون: بریتییە لە ڕقهەستان و تووڕەبوون.
بەرچاوتەنک: مەردوومی ڕژدی چرووک.
بەرچاوتەنگی: بریتییە لە ڕژدی و چرووکی.
بەرچاوتێر: مەردوومی دڵفراوان.
بەرچاوتێری: بریتییە لە دڵفراوانی.
بەرچاوگە: پارچە خشڵێک یا چەند زەنگیانە و مووروویەکی هۆنراوەیە ژنان بۆ جوانی دەیکەن بەپێش سەریاندا.
بەرچاوە: د. بەرچاوگە. مێش ڕەوێن.
بەرچایی: خواردنێکە کە بەیانیان لەگەڵ چاییدا دەخورێ.
بەرچنۆکە: بەرچنەی پچووک.
بەرچنە: سەبەتەی تووڵینی قووڵی لاپانە میوەی تێدا دەبرێ بۆ دوور.
بەرچەپ: د. مێمڵ: فیسار کەس (بەرچەپ)ی فیسار شتە.
بەچینەک: ز. چیکڵدانەی مەل.
بەرچیخ: بەرچیغ.
بەرچیغ: سەرپەلی سپیدار کە باریک و درێژ بێ. تێلا.
بەرچێلک: با. چیقڵدانە.

بەرچین: زەوییەکە کە (خەرتە) نەکرا بێ، بەڵکو هەر تۆوی پێوە کرابێ و کێڵرابێ.
بەرچینە: بەرچنە.
بەرخ: ساوای مەڕ. چەنێرچە مێ تا کاتی برینەوەی بەرگنەکەی.
بەرخستن: فرێدانی بەچکە لە سکدا بەناکامی.
بەرخوار: خواردەمەنییەکی کەمە کە جوێ کرابێتەوە لە ئازووخەیەکی زۆر بۆ ئەوەی کە لەبەر دەستدابێ بۆ خواردن. شتی خوار و خێچ (ز).
بەرخوان: ز. بەرخەلەوان.
بەرخۆر: بەرخوار. کەسێکە کە بەمێچکە مێچکە و قسەی خۆش خۆی بباتە پێشەوە لای مەردووم بۆ ئەوەی کە بەروبوومیان بخوا.
بەرخوردار: کەسێکە کە عەمری ئەوەندە درێژ بێ لە بەری نەتەوەی خۆی بخوا. کەیفخۆش (ز).
بەرخورک: ز. تەرزەی پچووک.
بەرخۆلە: بەرخی ساوا.
بەرخەل: بەرغەل.
بەرخەلەوان: بەرغەلەوان.
بەرد: شتێکی ڕەقی تورتی قورسی ئاشکرایە لە زەویدا.
بەردار: درەخت و سەوزاییەکە کە بەری ببێ.
بەرداش: بەردێکی پانی گـردە کـونێک لە ناوەڕاستـیـایەتی، دانەوێڵەی پێ دەهاڕدرێ.
بەرداشت: گونجان.
بەردان: بەرەڵاکردنی شتی گیراو.
بەردانەوە: بەردانی ئاوی گیراو. فڕێدانی شتێک لە بەرزییەوە.
بەردانی: بەردەڵان.
بەرداوێژ: ئەندازەی هاویشتنی بەردەدەستی زەلامێک: خانووی ئێمە لە خانووی ئێوەوە (بەرداوێژێک) دوورە. (بەرداوی) بەردانی.
بەردای: بەردانی.
بەردتاش: کەسێکە کە بەرد ڕێک بخا بۆ دیوار (نقار).
بەردڕکانە: خواردەمەنییەکە ئامادە کرابێ لەلایەن یەکێکەوە کە کالایەکی تازەی لەبەر کردبێ بۆ چەند هاوڕێیەکی.
بەردڕەکانە: بەردڕکانە.
بەردکێش: کەسێکە کە بەپارە بەرد بگوێزێتەوە بۆ ئەم و ئەو.
بەردڵ: د. بەرقلیان.
بەردڵخستن: خواردنی بەرقلیان.
بەردلک: ز. خۆشەویست. توورەگەی مەمک.
بەر دڵکەوتن: حەزکردن لە شتێک و چوونی بەدڵدا.
بەردۆڵە: د. سوێنەیەکە نانی تێدا هەڵدەگیرێ. تەغاراوی پینەچی و ئاسنگەر.

بەردووخ: بەردێکە دەخرێتە سەر پێچکەی خەرەک بۆ ئەوەی کە نەبزوێ.
بەردووگ: پێستی ژێر دووگی مەڕ.
بەردە: د. بەندەی زەرخریدە چ نێر چ مێ.
بەردەئازەبە: بەردە عازەبە.
بەردەئەستێ: جـۆرە بەردێکی شینکارە بەلێـدانی ئەسـتێ ئاگـر دێنێ.
بەردەئەموستیلە: نقێمی ئەموستیلە.
بەردەبار: ز. پیاوی ژیر کە سەری لە هەموو شتێک دەرچێ.
بەردەباران: بەرد فڕێدان بۆ یەکێک بەزۆری.
بەردەباری: ز. حیکمەت و پسپۆری.
بەردەباز: بەردێکە لەناو ئاودا دانرابێ بۆ پەڕینەوە.
بەردەبیـــرۆ: بەردێکی زۆر ســەخـتــە شــتی شل کــە زۆر تونـد بووبێــتـەوە پێـی دەشـوبـهـێـنرێ: دۆشـاوەکـە ئەوەنـدە خـەست بووەتەوە بووە بە(بەردەبیرۆ).
بەردەپێ: جۆرە بەردێکی زبری سووکە لـە حەمـامـدا دەهێنرێ بەبن پێدا بۆ لابردنی چڵک.
بەردەتووتن: شیشێک تووتنە لە هەموو (کەلارێک) دەردەکرێ بۆ ئاغا لە پاش سێیەک.
بەردەرگـانـە: د. پارەیەکـە لەبەر دەرگـای مـاڵی بـووک لە زاوا دەسێنرێ بۆ ئەوەی کە دەرگاکەی لێ بکەنەوە.
بەردەساو: هەسان.
بەردەست: کـەسـێکە لەژێر دەسـتی یەکـێکدا هەڵسـووڕێ بۆ فرمـانکردن. شـتێکی سووکەڵەیە لە بەردەسـتدا دادەنرێ بۆ فرمانی هەمیشـەیی. بەرێکە دەگیرێ بەسەر قۆڵی سەڵتە و کەوادا لە دیوی ناوەوە.
بەردەسـتـە: پارچەیەکـە دەدرێ لە سـەردەستی کـەوا و سوخـمـە و سەڵتە لە دیوی ناوەوە.
بەردەستی: ئیشکردن لەبەر دەستی یەکێکدا. کرێکار (ز).
بەردەستیکردن: هەڵسووڕانی یەکێک لەبەر دەستی یەکێکدا.
بەردەشـۆرکردن: شوشـتنەوەی برنج و نیـسـک و مـاش بەڕەنگێک کە بەردەکەی لێ بگیرێ.
بەردەعـازەبە: بەردێکی قورسە کوڕانی هەرزەکار بە بەرزکردنەوەی هێزی خۆیانی پێ تاقی دەکەنەوە.
بەردەڤک: ز. یاوەر (مرافق).
بەردەقانی: قۆچەقانی.
بەردەڵان: بەردەڵانی.
بەردەڵانی: شوێنێکە کە بەردی زۆر بێ.
بەردەڵبەرد: دەربەدەری و سەرگەردانی بەڕەنگێک کە هەر دەمـەی لە جێگایەک و هەر ڕۆژەی بەشاخێکەوە بێ.

بەردەم: پێش دەمی شت.
بەردەمـۆرە: شـتـێکی پچکۆلانەی تەنکە لە قـوڕی (کـەربەلا) و (نەجـەف) سـوور دەکـرێـتـەوە، شـیـعـە لـە نوێژدا ناوچەوانی دەخاتە سەر.
بەردەنوێژ: بەردێکی پانی تەختی درێژە نوێژی لەسەر دەکرێ.
بەردەواز: بەردەباز.
بەردەهار: بەرداش.
بەردەی: هـ. بردن.
بەردێلی: ز. گۆڕینەوەی شت بەشت.
بەردیل: مەڕی سێ ساڵانە.
بەڕ: بەرە. شاڵینە.
بەڕانی: بێگانە.
بەر ڕەتخستن: بەرگیرخستن.
بەر ڕەتکەوتن: بەرگیرکەوتن.
بەرۆژوو: ڕۆژووان. (بەرۆژووبوون) ڕۆژووگرتن.
بەڕوو: بەری دارێکی گـەڵا پانی کێوییە، درێژکۆڵەیە و توێکڵ و کڵاوی هەیە. ئەو دارەیە کە بەڕوو دەگرێ.
بەڕوودار: داری بەڕوو.
بەڕوولە: دارێکی پچکۆلەیە دەکرێ بەکونی (هەپە)دا تا هەپەکـان دەرنەیەن. ترۆزی و خـەیاری ناسک. چەند سنگێکی بـاریکە تەختەی دەواری پێ لێک دەدرێ. گاینجە.
بەڕوولە خۆرە: کونی هەپە.
بەڕە: ژێرەخەرێکە لە بەن دروست دەکرێ.
بەڕەپۆ: د. کلیم.
بەڕەزا: گـیـایەکی گـەڵاوردی پڕی کـێـوی بەهارییـە لە تەڕەتیـزە دەچێ.
بەرێکردن: خستنەڕێی گیاندار و پێکهێنانی پێویستیی ڕێگای.
بە ڕێ و جێ: کردار یا گوفتارێکە کە لە جێی خۆیدابێ.
بە ڕێ و شوێن: بە ڕێ و جێ.
بەرێوەبردن: سەرپەرشتی و چاودێریکردنی شتێک.
بەرێوەچوون: بریتییە لە گوزەرانکردن.
بەرز: بڵند.
بەرزا: د. منداڵی نۆبەرە. بەرزایی.
بەرزاخـوڕ: وڵاخـێکە ئالیکی زۆری کـرابێــتـەبەر و ئەوەندەی خواردبێ خواردنی لەبەرچاو کەوتبێ، یاخۆ خواردنی خۆشی درابێتێ و خواردنی تری پێ نەخورێ.
بەرزاخ: د. دامێنی کێو.
بەرزایی: ئەندازەی بڵندیی شت. شوێنی بەرز.
بەرزبوونەوە: بڵندبوونەوە.
بەرزفڕین: بریتییـە لە کەسێک کە زیاد لە ئەندازەی خۆی بخوڕێ و قەپ دابگرێ.

بەرزڤک: ز. بەرهەڵستێکە کە لە دار دروست کرابێ.
بەرزکردنەوە: بڵندکردنەوە.
بەرزە: چێشتی پلاو. ون: (بەرزە)م کرد، واتە ونم کرد.
بەرزەبڵێس: کەسێکە لە هەمـوو قسـە و گـفتـوگۆیەکـدا تێ هەڵ بچێ بەرەنگێک کە بەرامبەرەکەی دەمکوت بکا.
بەرزەبڵێس ویستان: تێ هەڵچوون لە هەموو قسە و گفتوگۆیەکدا و بەگژ دەمدا چوونەوە.
بەرزەجرە: جۆرە ویزویزەیەکە لە بەرزەجورە گەورەترە.
بەرزەجورە: جۆرە ویزویزەیەکە هەر جرەجر دەکا.
بەرزەچرە: بەرزەجرە.
بەرزەحەوایلە: د. کۆلارەی منداڵان.
بەرزەربینە: ز. زوبەرجەد.
بەرزەکی بانان: وتەیەکـە تەشـبـیـهـی یەکـێکی پێ دەکـرێ کـە لە چورتمێک بەئاسانی رزگاری بووبێ.
بەرزەگـەوە: قـیـسـپـێکی هەڵ نەپاچراوە دەکـرێ بەپەرژین بـەبێ تەنین.
بەرزەلنگ: گـیایەکی بۆنخۆشی کوێستـانییە دەیخەنە ناو لێفە و سەرینەوە بۆ بۆنخۆشی.
بەرزەولاخ: ماین و ئەسپ و ئێستر.
بەرزەوەبوون: بەرزبوونەوە.
بەرزەهەوایلە: د. بەرزەحەوایلە.
بەرزی: بەرزایی.
بەرزیلان: د. یاریی شێر و خەت بەپارە.
بەرزین: ولاخێکە کەکاتی زینی هاتبێ.
بەرژەنە: ژەمەنێک کەرە.
بەرژەنەک: دارێکی تەنکی پانە لـە بەردەمی (دانە) و (گـــورد) دادەنرێ بۆ راگـرتنی ئەندازەی پانیی تەنراوەکـە بۆ ئەوەی کـە خوار و گێر نەبێ.
بەرستە: با. بەردە ئەستێ.
بەرستۆ: ز. بەرۆک.
بەرسڤ: ز. وەرام.
بەرسمێڵ: مـووی سمێڵە کە لە لێو تێپەرێ، (بەرسمێڵکردن) قرتاندنی مووی بەرسمێڵ.
بەرسووڤ: ز. هەموو شتێکی پاش و پێشکراوی هەڵگەڕاوە.
بەرسیڵ: جۆرە کولێرەیەکە بەساج دەکرێ.
بەرسینگ: ز. قـایشـێکە کـە دەکـەوێتە بەرسنگی ولاخی بەرزە لە کاتی زین کردنیدا.
بەرسیلە: بەری مێو کە هێشتا ترش بێ.
بەرسینە: سینەبەرە.
بەرشووش: ز. بەرسووڤ.
بەرشێو: خۆراکی ئێواران. بەرشێوکردن: نانخواردنی ئێواران.
بەرشیبیەی: هـ. دەرچوون.
بەرغەل: ڕانی کار و بەرخ.
بەرغەلەوان: شوانی کار و بەرخ.
بەرف: ز. بەفر.
بەرفخورک: ز. تەرزە.
بەرفرێدان: دانانی بەچکە و منداڵ بەنەبەکامی.
بەرفماڵک: ز. بەفرماڵ.
بەرفەشۆ: ز. بەفرێکە کە لەگەڵ باراندا بباری.
بەرفەک: ز. جۆرە پێچ و مێزەرێکە.
بەرڤالە: ز. دەست ڤالە.
بەرڤانک: ز. بەرکۆش.
بەرڤین: ز. مردن لە ڕێگایەکی ناشیرندا.
بەرقلیان: بەرچایی.
بەرک: گولله (ز). ئەستێرەیەکە بەعەرەبی پێی دەڵێن: شیعرای شامی.
بەرکار: کەرەسەی خانوو کە ئامادەکرابێ بۆ کردنی.
بەرکاز: ز. پەنجەرە.
بەرکانی: ز. بەردەقانی.
بەرکاو: د. بەرزاخ.
بەرکردن: د. لەبەرکردن.
بەرکۆ: د. قەرپووسی زین.
بەرکوت: دانەوێڵـەیەکە لە پێش کـوتانی خـەرمـاندا دەکـوترێ بۆ نان.
بەرکور: ز. گۆشتی ژێر چەناگەی مەردوومی قەڵەو کە دادەکەوێ.
بەرکۆستە: ز. پیاوی ریش تەنک.
بەرکۆسە: ز. بەرکۆستە.
بەرکۆش: پەشتەماڵێکە دەگیرێ بەبەرکۆشەوە لە کاتی فرماندا بۆ پاک و خاوێنی.
بەرکوڵ: ئەندازەیەکە لە چێشت کە لەپێش پێگەیشـتنیدا بـخورێ. (بەرکـوڵ کـردن): خـواردنی کـەمـێک لە چێـشت لەپێش پێگەیشتنیدا.
بەرگـۆڵە: دارێکە وەک (چاکڵ) دەخـرێتـە ناوەندی (مـژان) و (ئێرەق) تا کار باش بکا.
بەرکەتی: ز. شتی گران مایە و بەنرخ.
بەرکەش: ز. سینی.
بەرکەک: ز. پەیژە. پێپیلکە.
بەرکـەکردن: وتـەیەکە لە وتاری نزادا بەکـاردەهێنرێ: مـانگاکـەت (بەرکە کا) شیری زۆرە.
بەرکەڵ: نێوونێکە کە کاتی کەڵگرتنی هاتبێ.

بەرکەمەر: گیایەکی بۆنخۆشی گەرمیانییە.
بەرکەوتن: پێشکەوتن. کەوتنی شتێک لە شتێک: شووشەکە بەردێکی بەرکەوت. نۆرە هاتنە سەر: ئیمڕۆ زوو نۆرەت (بەرکەوت). پێ بران: تۆش ئەوەندەت (بەردەکەوێ).
بەرکەیە: ز. نوێنەر. یارمەتیدەر.
بەرگ: کاڵا. مقەبیای ئەملاو ئەولای کتێب. گەڵای دار و درەخت و سەوزایی. ئەو ڕێگایەیە کە مەردووم لە ڕەوشت و خوودا دەیگرێ (مبدأ). ز. پێشوو: جاری (بەرگ) هاتم، واتە جاری پێشوو.
بەرگاز: ز. درێژییەکە کە نێزیک گەزێک بێ.
بەرگایلکە: باڵندەیەکی پچکۆلەی شینە زۆرتر لە بەردەمی گای جووتدا دەنیشێتەوە.
بەرگایی: پێشکەوتنی یەکێک لە بەردەمی گایەکەوە کە تازە خرابێتە ژێر جووت یا گێرە بۆ ڕاهێنانی.
بەرگدروو: کەسێکە کاڵا بدروێ.
بەرگر: بەرگرد.
بەرگرتن: پرژاندنی ترش و خوێ بەدەموچاوی یەکێکدا کە (ئاگرە)ی پێ گەیشتبێ لەلایەن یەکێکەوە کە منداڵی بەئاگر سووتابێ بۆ ئەمەی کە چاک بێتەوە. بەربەستکردنی شتێک: بەری ئەو ئاوە یا ئەو ڕانە بگرە. هاتنە بەری درەخت. بەرگەگرتن: ئەم وڵاخە بۆ ئەم بارە (بەرناگرێ)، واتە بەرگە ناگرێ. ئاوسبوونی گیاندارێک کە ئادەمیزاد نەبێ (ز). بەربەستکردنی شتی ڕەنگکراو.
بەرگرد: شتێکە کە لەبەردەستدابێ و بەکار بێنرێ بۆ ئەمەی ئەو شتەی کە لەم باشترە جارێ بەکار نەهێنرێ و بمێنێتەوە.
بەرگن: تووکی بەرخی تازەبوو کە یەکەمجار برابێتەوە.
بەرگورد: دارێکە دەخرێتە تەونەوە بۆ ئەوەی کە ڕێک بوەستێ. بەرگرد.
بەرگەر: جامخانە و شووشەی بەردەم.
بەرگەڕەکی: گیانداری جوانی ڕێکوپێکی شۆخ و شەنگ: ئەم پیاوە یا ئەم ئەسپە یا ئەم کەڵەشێرە (بەرگەڕەکی)یە.
بەرگەش: ز. سینیی زۆر گەورە.
بەرگەشتە: بەدبەخت.
بەرگەشتەیی: بەدبەختی.
بەرگەشتەیی هاتن: بەدبەختبوون.
بەرگەشتی: بەرگەشتەیی.
بەرگەگرتن: خۆڕاگرتنی شت لەژێر بارێکی گراندا.
بەرگەل: بەرغەل.
بەرگەلەوان: بەرغەلەوان.
بەرگەمێ: هـ. کووزەڵە.
بەرگیر: ز. جۆرە مارێکی ژەهراویی کوشندەیە.
بەرگیرخستن: پەیداکردنی شتێک و خستنە ژێر دەستی.
بەرگیرکەوتن: هاتنە ژێردەستی شتێک کە بەدوویدا عەوداڵ بووبێت.
بەرگیریکردن: د. بەرهەڵست وەستان.
بەرگێن: د. پێشوو.
بەرما: ز. بەرماوە.
بەرماخ: کاغەزێکی لوولەکراوە تووتنی تێ دەکرێ و دەکرێ بەجگەرە.
بەرماغ: بەرماخ.
بەرمال: ز. ماوەیەکی تەختە لەبەر دەرگای ماڵدا.
بەرماڵ: پارچە تەنراوێکی تایبەتییە نوێژی لەسەر دەکرێ. دوو تەختە دەواری لێکدراوی ئامادەیە بۆ ئەوەی هەر کاتێک بایەکی بەهێز هات بگیرێ بەتەنیشت ڕەشماڵدا و، بەچەند (سوولە) یەک بەدەوارەکەوە قایم بکرێ بۆ بەربەستی بایەکە.
بەرماڵک: با. جاجم.
بەرماڵی: ز. کەیبانووی ماڵ.
بەرماوە: پاشماوە.
بەرموور: جۆرە ملوانکەیەکە کە ژنان بۆ جوانیی ڕاست و چەپ دەیکەنە ملیان.
بەرموورە: بەرموور.
بەرمووسڵدان: خوار ناوک.
بەرمەجێڵ: د. دەرگای چەپەر.
بەرمەمکانە: منداڵی شیرەخۆرە.
بەرمیل: جۆرە سندووقێکی گردی قووڵە لە لەوح یا تەختە.
بەرناف: ز. لەقەب.
بەرنامە: مەنهەج و پرۆگرام.
بەرنوێژ: کەسێکە پێشنوێژی بکا.
بەرنوێژی: پێشنوێژی.
بەروار: با. کوێستان. ناوە بۆ ناوچەیەک لە ئامێدی.
بەروال: ز. ڕێگای خوار و خێچی سەختی ناو شاخوداخ.
بەروان: پارچەیەکی تایبەتییە لە کاتی نانخواردندا دەدرێ بەسەر کۆشدا. بەروانکە.
بەروانک: بەروانکە.
بەروانکە: سەردەرییەکی تەنکە دەکرێ بەبەرسنگی منداڵدا بۆ ئەمەی کە کاڵاکەی پیس نەبێ.
بەرواپشت: د. بەر و پشت.
بەروبووم: پیت و فەڕی شت: یاخوا لە (بەروبووم)ی منداڵەکانت بخۆیت.
بەر و بێشکە: بەبێشکەیەک دەوترێ کە دۆشەکە و دەسرازە و شتومەکی نوستنی منداڵی تێدابێ.

بەر و پشت: ئاوەژوو. (بەروپشت کردن) وەرگێرانی یەخەی کراس بەجۆرێک کە پشتەکەی لەبەر ساغی بکەوێتە پێشەوە و پێشەکەی لەبەر دڕاوی بکەوێتە پاشەوە.
بەر و دوا: یەک لەدوای یەک: فارس و نەریمان بەر و دوا لە دایکبوون.
بەر و دواخستن: پاش و پێشکردن.
بەر و دواکردن: بەر و دواخستن.
بەر و دواکەوتن: پاش و پێشکەوتن.
بەر و دوانان: ڕاونان.
بەروڤاژی: با. شتی پێچەوانە.
بەرۆژ: ز. بەربەرۆچکە.
بەرۆش: ز. مەنجەڵۆکە.
بەرۆک: یەخە.
بەرۆک بەردان: بریتییە لە وازهێنانی یەکێک لە یەکێک.
بەرۆکگرتن: بریتییە لە شەڕ فرۆتن بەیەکێک.
بەروو: پێشوو.
بەرووج: ز. جۆرە ئاسنێکە کە تفەنگی لێ دروست دەکرێ. تفەنگ.
بەرووستا: با. شاگرد.
بەرووسێل: ز. ئاگردان.
بەرە: وتەیەکە جووتیار بەگای جووتی دەڵێ لە کاتێکدا کە گاکە پشت هێڵ بێ، واتە ڕووی لە بوورە بێ. نەتەوە: ئەمە (لە بەرە)ی فیسار کەسە. شتێکی سێ پەلە، پەلێکی بەتەنگەوە و دوو پەلەکەی تری بەقەڵتاغەوە توند دەکرێ. دەرگا (هـ). خۆشیی دوای باران (د).
بەرەبەرە: وتەیەکە کردنی کارێک یا وتنی گوفتارێک دەگەیەنێ کە لەسەرخۆ، وردە وردە بێ.
بەرەبێڵ: د. بەرەجووت.
بەرەبەیان: د. دەمەدەمی بەیانی.
بەرەبیێن: زاربێن.
بەرەتەشی: دارێکی گردی کوندارە دەکرێ بەکلکی تەشیدا لە حەلێکدا کە سووک بێ و زۆری لەسەر هەڵ نەکرابێ بۆ ئەوەی قورس بێ و باش بسووڕێتەوە.
بەرەتی: د. بریتی.
بەرەجفت: د. بەرەجووت.
بەرەجووت: بەو ئەندازە زەوییە دەڵێن کە کشتیار جووتی تێدا دەکا. بەو دەغڵودانە دەوترێ کە ساڵەوساڵ کشتیار لە زەویی خۆی هەڵی دەگرێ.
بەرەجەژنان: چەند ڕۆژێکە لەپێش جەژنەوە کە خۆی تێدا ئامادە دەکرێ بۆ جەژن.
بەرەخوار: بەرەخوارە.
بەرەخوارە: بەرەوخوارە.
بەرەخەر: د. شوێنێکی تایبەتییە کە باری وڵاخی تێدا دەخرێ. مێینەیەکە کە بەر فرێدا.
بەرەدەمووکە: دەمووکانە.
بەرەڕەت: د. چاڵێکە داوی تێدا دەنێنەوە.
بەرەزبانە: بەرەزمانە.
بەرەزمانە: د. ئاوزوونەی پشتێن.
بەرەزوانە: د. بەرەزمانە.
بەرەزە: د. وێڵ و ئاوارە.
بەرەزەی: بەری دڕکەزی کە لە (پانکە)ی مازوو دەچێ.
بەرەژان: وردە ژانێکی دەم دەمییە لەپێش منداڵبووندا بەچەند ڕۆژێک تووشی ئافرەت دەبێ.
بەرەژە: د. جەوی.
بەرەژوور: بەرەوژوور.
بەرەژوورە: بەرەوژوورە.
بەرەژەنە: بەرژەنە.
بەرەژێر: بەرەژێرە.
بەرەژێرە: بەرەوخوارە.
بەرەستە: با. بەردەئەستێ.
بەرەڤان: ز. ناوبژیکەر.
بەرەک: بەرۆک. بەروانکەی پەزیشک.
بەرەگە: د. سەرەڕێ.
بەرەگەڵا: بەرێکی سووری سپیواشە لە گەڵای مازوودار دەردەچێ.

بەرەڵا: بەڕەڵڵا.
بەرەڵڵا: گیاندار و ئاوێکە کە لە ڕۆیندا بەرهەڵستی نەبێ. بریتییە لە مەردوومی سەرسەریی بێکارە. (بەڕەڵڵابوون) بەربوونی گیاندار و ئاوێکە کە گیرابن. (بەڕەڵڵاکردن) بەردانی گیاندار و ئاو.
بەرەمۆ: کار و بەرخ و گوێلکێکە کە فێری مژینی دایکی بووبێ بەڕەنگێکی وا کە بە بەستنەوە نەبێ چاری نەکرێ.
بەرەمۆم: بەرەمێو.
بەرەمەشکە: ژەمەنەیەک کەرە.
بەرەمێو: مێوی تلێپەی هەنگوین.
بەرەنگاربوون: گەیشتنی دوو گیاندار بەیەک لووت و بزووت.
بەرەواژ: شتی ئاوەژوو.
بەرەو ئیزباربوونەوە: بەرەوڕووبوونەوە.
بەرەو ئیزبارکردنەوە: بەرەوڕووکردنەوەی دوو کەس بۆ دەرخستنی درۆ و ڕاستیی قسەیەک لە ناویاندا.

بەرەوبڕدانەوە: پێش ڕێگرتن لە یەکێک.
بەرەوبڕی دانەوە: بەرەو بڕدانەوە.
بەرەوپێڵ: بەرانپێخ.
بەرەوپیری: بەپێش دەمەوە چوونی یەکێکی گەورە.
بەرەوخوار: لای خوارووی شت.
بەرەوخواربوونەوە: ڕۆین بۆ لای خواروو.
بەرەوخوارکردنەوە: ناردنی شتێک بۆ بەرەوخوار.
بەرەوخوارکە: بەرەوخوارە.
بەرەوخوارە: شوێنی سەرەولێژ.
بەرەوخواری: بەرەوخوارە.
بەرەودوا: بەرودوا.
بەرەودوانان: بەرودوانان.
بەرەوڕووبوونەوە: هاتنەڕووی دوو کەس بۆ دەرخستنی قسەیەک کە لەناویدا کرابێ.
بەرەوڕووکردنەوە: ناردنی یەکێک کە شتێکی لە سەرت بێ بۆلای یەکێکی تر کە تۆ شتێکت لای بێ بۆ ئەمەی کە بچێ لێی وەربگرێتەوە بۆ خوێ. بەرەو ئێزبارکردنەوە.
بەرەوژوور: لای ژووروو.
بەرەوژووربوونەوە: ڕۆین بۆ لای ژووروو.
بەرەوژوورکردنەوە: ناردنی گیاندار بۆ لای ژووروو.
بەرەوژوورکە: بەرەوژوورە.
بەرەوژوورە: هەوراز.
بەرەوژێر: بەرەوخوار.
بەرەوژێرکە: بەرەوخوارە.
بەرەوژێرە: بەرەوخوارە.
بەرەولا: د. لابەلا.
بەرەولێژ: بەرەوخوارە.
بەرەولێژایی: هەڵدێرگە و بەرەوخوارە.
بەرەولێژنە: بەرەولێژە.
بەرەولێژە: سەرەولێژە.
بەرەولێژی: بەرەولێژ.
بەرهوور: ز. تفەنگی لوولە تەسک.
بەرەوەبوون: بەربوونەوە.
بەرهەڤ: با. شتی ئامادەی دەردەست.
بەرهەڵبێنە: چارەکەیەکە ژنان لە کاتی فرماندا لە پشتێن بەرەوخواریان دەیگرن بەبەریانەوە.
بەرهەڵست: شتێکە کە پەکی کارێک بخا و نەیەڵێ سەربگری.
بەرهەمهێنان: پێگەیاندن و هێنانە ناوی شتێک.
بەریان: ڕێگوزاری ئاو و با: (بەریان)ی ئاوەکە یا باکە بگرە.
بەری پەڕەگەڵا: شتێکی وردی خڕە لە پشتی گەڵای مازوو پەیدا دەبێ.

بەریڤانی: ز. شوان.
بەری: بەروو: بەڕوو (ل). شتی بەردار. گیرفان (ز).
بەریک: با. گیرفانی بەرباخەڵ.
بەرین: پان. بەروو.
بەرینایی: پانایی.
بەز: چەوریی ئەندامی گیاندار جگە لە دووگ.
بەزات: مەردوومی ئازای نەترس.
بەزاج: ز. دووزبانی و بەدی و چرغوڵی.
بەزاجکەر: ز. مەردوومی دووزبانی بەد.
بەزاندن: کۆڵپێدان و زەبوونکردنی یەکێک. هاتنە دەرەوەی میزی منداڵ لە دەمی بلوێرەوە بەرەنگێک کە ناو بێشکە تەڕ کا.
بەزتن: د. بەزین و بارخستن لە شوێنێکدا.
بەزدۆنەک: ز. ترسنۆک.
بەزدین: ز. ترساندن.
بەزرک: بزرۆک.
بەزرەک: د. گیایەکە بەرێکی وردی هەیە دەکوترێ و دەنرێ لە ئەندام بۆ نەمانی ئازاری.
بەزرەونج: گیایەکی هەمیشەییە گەڵایەکی خڕ و ورد و بۆنخۆشی هەیە.
بەزگەر: ل. جووتیار.
بەزم: یاری و ڕابواردن و کۆڕگرتنی کۆمەڵێک بەخۆشی.
بەزمژک: ز. گەنە.
بەزمگا: شوێنی بەزم و ڕەزم.
بەز و بنێشت: دەرمانێکە لە بەز و بنێشت دروست دەکرێ، بۆ برین زۆر باشە.
بەزە: ز. گوناهبار. بەهەڵەچوو.
بەزەتاو: چەورکردنی شوێنێکی قەڵەشاو یا سووتاو لە ئەندام بەبەزی داخکراو.
بەزەک: ز. نەخۆشیی زەردوویی.
بەزەوی پیاهاتنەوە: دڵسووتان بەگیاندار لەکاتی کزی و زەبوونیدا.
بەزەیی پیاهاتنەوە: بەزەوی پیاهاتنەوە.
بەزیان: د. کۆڵدان.
بەزێن: جۆرە یارییەکە منداڵان کێرێکی گرد دەکێشن یەکێک دەچێتە ناویەوە ئەمانی تریش تێی هەڵدەدەن.
بەزی: جۆرە سابوونێکە لە بەز و قڵیە دروست دەکرێ.
بەزین: کولڵدان لە کارێکدا. خستنی ماڵ و کۆچ لە شوێنێک: جاف لە شارەزوور (بەزیوە). بەڕینی ولاخی بەرزە. هەڕاکردن.
بەژ:بەشی وشکایی لە زەوی (بەڕ). شینایییەکە کە بێ ئاویی کێشابێ (ز).

بەژا: هاوتەمەن.
بەژقین: ز. وردەی شتێکە کە شکابێ بەهۆی کەوتنی شتێکی قورس بەسەریدا.
بەژک: ز. شینایییەکە کە بەبێ ئاو بڕوێ و سەوز ببێ (دێمەکار).
بەژن: بالاّ.
بەژی: ز. زەوییەکی دێم کە کشتوکاڵی تێدا بکرێ.
بەس: وتەیەکە بەدێمەن ناو (اسم) و لە مەعنای (فعل)دایە، واتە دەست لەو کارە یا لە و گوفتارە هەڵگرە. بەستێکە کە پەنای پێ ببرێ. بەستێن.
بەسات: د. پێویستیی شت: سبەینێ دەچین بۆ سەیران هەرچی (بەسات)ی هەیە تۆ ڕێکی بخە، واتە پێویستانی.
بەست: بەرهەڵست. شوێنێکی مووفەرکی خۆشەویستی وایە ئەگەر یەکێکی گوناحبار خۆی تێ بهاوێ ئیتر کەس نەتوانێ دەستی بۆ درێژ بکا. ڕووبارێکە کە لە (زێ) پچووکتربێ. حەماڵی خانوو (ز). شیوێکی وشک کە ئاوی لێ بڕابێ.
بەستران: بوونی شت بە بەستراو. پەککەوتنی پیاو لە چوونە لای ژنی لەبەر سامێک یا خورپەیەک یا شتێکی پڕوپووچ. (بەستراو) شتی گرێدراو، بریتییە لە پیاوێک کە پەکی خرابێ لە دروستبوون لەگەڵ ژنیدا.
بەستن: ڕەقبوونی شتی شل و بوونی بەسەهۆڵ لەبەر ساردی. پێچان و گرێدانی شتێک. بریتییە لە پەکخستنی پیاو لە دروستبوون لەگەڵ ژنیدا. داخستن.
بەستنەوە: بەستنی گیاندار بەپەت.
بەستوو: کووپەڵەی شین. بستوو.
بەستوورە: چەمێکە کە لە زێ پچووکتر بێ.
بەستە: جۆرە مقامێکە. چەند شتێکن کە پێکەوە بەسترابن.
بەستەک: دەستە نوێنێکی پێچراوەی بەستراوە لەناو شتێکدا. دەنگ. (ز).
بەستەگی: د. پەیوەندی.
بەستەڵۆک: شوێنێکە کە سەهۆڵی زۆر تێدا بەستبێتی.
بەستەڵەک: بەستەڵۆک.
بەستەنی: د. بەستەڵەک. دۆندرمە.
بەستی: ز. خڕی چەم. کەوێکە کە بۆ ڕاوەکەو ببرێ.
بەستیر: ز. قاڵی.
بەسرپێر: بەسرپێرێ.
بەسرپێرار: سێ ساڵ لەمەوپێش.
بەسرپێرێ: سێ ڕۆژ لەمەوپێش.
بەسزمان: گیانداری هێمنی لەسەرخۆ.
بەسزوان: بەسزمان.
بەسڵەک: د. بەستەڵەک.
بەسە: د. بەستەی شت کە پێکەوە بەسترابن. بەستەگی. بەستەی گۆرانی. (بەس)ی بەمەعنا واز بێنە!
بەسەراچوون: چوونی یەکێک بەسەر یەکێکدا لەکاتی کارێک یا گوفتارێکدا.
بەسەرادان: چوونە سەر یەکێک لە ناکاو.
بەسەراهاتن: ئامۆژگاریکردن. هاتنی یەکێک بەسەر یەکێکدا لە کاتی کارێک یا گوفتارێکدا.
بەسەربردن: بردنە سەری کات هەر چۆنێک بێ. بردنە سەری کارێک هەر چۆنێک بێ.
بەسەرچوون: بڕانەوەی کاتی شت: توو (بەسەرچوو) واتە کاتی تێپەڕی. ئاوهاتنەوەی گیاندار: فیسار کەس (بەسەرچوو) واتە ئاوی هاتەوە.
بەسەرگرتنەوە: دۆزینەوەی وڵاخ و ئاژاڵی ونبوو: بزنەکە یا مانگاکەم لای فیسار کەس (بەسەرگرتەوە). تێهەڵچوونەوە لە گوفتارێک یا کردارێک لە نووکەوە بۆ تەواوکردنی: قسەکە یا ئیشەکەم (بەسەر گرتەوە).
بەسەرگێران: بریتییە لە خەریککردنی یەکێک و سەر لێ تێکدانی: بەسم (بەسەر بگێڕە).
بەسەرهات: خۆشی و ناخۆشییەکە کە لە ژیانتدا بەسەرتدا هاتبێ.
بەسەرهاتن: هاتنی خۆشی و ناخۆشییە بەسەرتدا لە ژیانتدا.
بەسەرەوە گرتن: گرتنی پیاوێکی بێگانە بەسەر ژنێکەوە.
بەسەرەوە گەڕان: بریتییە لە مووشەکردن و خۆ بەخێوکردنی یەکێک بەم و بەو: فیسار کەس هەر (بەسەرەوە دەگەڕێ).
بەسەزمان: بەسزمان.
بەسەزوان: بەسەزمان.
بەسەڵەک: د. بەستەڵەک.
بەسیاگ: د. بەستراو.
بەسیان: د. بەستران.
بەسی: د. کەسێکە کە لە (بەستدا) بێ.
بەش: هێندێ لە شتێک کە بردرابێ بۆ یەکێک. گیانداری ناوچەوان سپی (ز). کوڵۆڵی چارەڕەش. شتێکە کە دەمی دابێتەوە: فیسار کەس دەمی (بەشە)، یا دەمی برینەکەی (بەشە) واتە کراوەیە. (بەشبوون) والاّبوون. (بەشکردن) والاّکردن. دەمت (بەش کە) واتە بیکەرەوە.
بەشاوەند: ز. قافیە.
بەشبەر: کەسێکە لە کەلەپووری مردوویەکدا خاوەن بەش بێ.
بەشدار: خاوەن بەش.
بەشکا: بەشکم.

بەشکایەک: بەشکا.
بەشکایەکم: بەشکا.
بەشکایەکوو: بەشکایەکم.
بەشکردن: دابەشکردنی شتێک بەسەر چەند کەسێکدا. بەسبوون و کفایەتکردنی شتێک بۆ کەسێک: ئەمە (بەشم دەکا).
بەشکم: تەقوو.
بەشکوو: بەشکم.
بەشکە: بەشکم.
بەشکی: بەشکوو.
بەشگا: د. شوێنێکی تایبەتییە بۆ بەشکردنی ئاو کە بۆ سەر کشتوکاڵ بچێ.
بەشگە: د. بەشگا.
بەشۆ: شتی شۆدار.
بەشووار: سابوونێکە کە زۆر کەف بکا.
بەشیری: جۆرە قوربانێکە.
بەشینەوە: دابەشکردنی شتێک بەسەر چەند کەسێکدا بەخۆڕایی.
بەعە: وتەیەکە منداڵ بەکاری دەهێنێ بۆ مەڕ و بزن.
بەعیجاندن: ز. ڕق هەڵساندن.
بەعیجین: ز. ڕق هەستان.
بەعیڤ: ز. بادام.
بەعیڤتەر: چوالە بادام.
بەغمە: د. بوغمە.
بەفاڵ: ماکەر و ماینێکە کە ئارەزووی نێرەکەر و ئەسپ بکەن.
بەفر: شتێکی سپیی وردە وەک وڕەی هەلاج لە زستاندا لە کوێستان دەبارێ.
بەفراو: ئاوێکە کە بەفری تێ کرابێ.
بەفرخۆرکە: هەورێکی خۆڵاوییە لە بەهاراندا دەنیشێتە سەر بەفری کوێستان دەیتوێنێتەوە.
بەفرماڵ: دارێکی دەم پانی کلک درێژە بەفری سەربانی پێ دەماڵرێ.
بەفرەژیلکە: بەفرە لووکە.
بەفرەسەر: کاتێکە کە بەفر باریبێ و بەستبێتی و مابێتەوە.
بەفرەلوو: بەفرماڵ.
بەفرەلووکە: بەفرێکی دەنک وردە لە تەرزە وردترە.
بەفش: ز. شتێکە وەک شانە وایە بەڕەی پێ پاک دەکرێتەوە.
بەفشک: ز. بەفشی پچکۆلە.
بەفەڕ: بەکەڵک.
بەق: نێرەکەو (هـ). بۆق (با).
بەقاڵ: تەڕەفرۆش.
بەقاڵی: فرۆشتنی تەڕە.
بەقبەقۆک: ز. بڵقەبڵقی ئاو.
بەقتاندن: ز. تەقاندن.
بەقلە: د. قەلەموون.
بەقلەمووت: د. قەلەموون.
بەقلەوا: ز. پاقلاوە.
بەقلیسۆک: ز. بێ ئابڕووی ڕووهەڵماڵراو.
بەقنگداخستن: بریتییە لە دواخستنی کارێک.
بەقنگەوە خستنە کەندەڵان: بریتییە لە دەمکوتکردنی یەکێک.
بەقنگەوەنانە کەندەڵان: بەقنگەوە خستنە کەندەڵان.
بەقەم: ڕەنگێکە کە زوو بچێتەوە.
بەقیە: جۆرە دروومانێکە لە کاڵادا.
بەقیناکەوتن: ڕق هەستان و مانەوەی لەسەر ئەو شتەی کە ڕقی لەسەر هەڵگرتووە.
بەکار: گیانداری ئیشکەری لێهاتوو.
بەکارخواردن: بەکەڵک هاتن.
بەکارهاتن: بەکارخواردن.
بەکامگەیشتن: بەکام گەیین.
بەکام گەیین: بەئاوات گەیشتن.
بەکرووک: با. کەسێکە کە چاو و ڕاو بکا لەم و لەو (موشاغب).
بەکرە: تەختەیەکی کونداری گردە دەزووی دروومانی لەسەر هەڵدەکرێ.
بەکسەمە: پسکویتێکە بۆ سەفەر هەڵدەگیرێ.
بەکسەمەد: بەکسەمە.
بەکەرەم نەمان: لە کەڵک کەوتن.
بەکەرەم هاتن: بەکەڵک هاتن.
بەکەڵ: مانگایەکە ئارەزووی کەڵەگای ببێ.
بەکەڵک: شتێکە کە بەهرە و سوودێکی لێ وەربگیرێ.
بەکەڵک هاتن: بەکارهاتن.
بەکەیف: کەیفخۆشی بەدەق.
بەکێش: مەردووم یا گیاندارێکە کە لە ئیشوکاردا بەپشوو بێ.
بەگ: وتەیەکە بۆ گەورەیی بەهێندێ کەس دەوترێ.
بەگزادە: نەتەوەی بەگ.
بەگژاپەڕین: د. بەگژاچوون.
بەگژاچوون: ئاوقەدبوونی شتێک بە شتێکدا: سالار چوو (بەگژ) نەریماندا، یا مێوەکە (چوو بەگژ) چنارەکەدا.
بەگژاهاتن: بەگژاچوون.
بەگون: نێرێکە لە گیاندار کە ئارەزووی پەڕینی زۆربێ.
بەگەن: شتی پەسند. (بەگەنکردن) پەسندکردنی شتێک.
بەگوێدادان: وتنی شتێک بەیەکێک لە پەردەدا.
بەگیر: گیاندارێکە لەژێر کەشمەکەشی ڕۆژگاردا خۆی بگرێ.

بەگیرکەوتن: دەستکەوتنی شتێک.
بەگیروەستان: هاتنە ژانی شوێنێک لە ئەندام.
بەگیروێستان: بەگیروەستان.
بەگیرهاتن: گیرۆدەبوونی گیاندارێک و دووچاربوونی بەشتێک.
بەگیرهێنان: زۆرهێنان بۆ گیاندارێک و تەنگەتاوکردنی.
بەل: بزنی گوێ لوول. شتێکە کە شۆڕ بوویێتەوە و تەکەتەکی بێ. (بەلەبەل) تەکەتەک. گیانداری گوێ قوت (ز).
بەلا: چەپۆکی ڕۆزگار.
بەلاتە: ز. بەراتە.
بەلاتیتک: با. پەپوولە.
بەلاش: شتی خۆڕایی.
بەلاشە: جۆرە تەنراوێکی هەرزانە دەکرێ بەکالا.
بەلاڤ: ز. بلاو.
بەلاگەردان: بەلاگێڕ.
بەلاگێڕ: کەسێکە کە خۆی بگێڕێ بەدەوری یەکێکدا. خێرێکە کە بکرێ بۆ گەڕانەوەی بەلایەک.
بەلالووک: ز. بەلاڵووک.
بەلاڵووک: دارێکی کێوییە بەرێک دەگرێ وەک گێلاس بەڵام وردترەوە و ناوکەکەی ڕەوانی دەدا.
بەلالیسک: ز. جۆرە گوڵێکی پچکۆلانەیە.
بەڵام: وتەیەکە دەبێژرێ لە دوای چەند وتارێکەوە بۆ لابردنی بیرێک کە بگونجێ لەوێدا ببرێ: چووم بۆلای فیسار کەس (بەڵام) لەوێ نەبوو.
بەلامک: دارێکی باریکە ئەمسەر و ئەوسەری لەلە دەکرێ و بەنێکی تێ دەخرێ و دەکرێتە دەمی کار و بەرخ بۆ ئەوەی دایکیان نەمژن.
بەلان: پیاوی کەڵەمێرد.
بەلان: بەڵام.
بەلاوەگێڕ: بەلاگێڕ.
بەلبوون: ز. بزووتن و بۆ پێشەوەچوون.
بەلبەلەگۆش: د. مەردوومی گوێ لە مشت.
بەلچم: ز. گەڵای درەخت.
بەڵخ: جۆرە چڵکێکە بەهۆی تەڕییەوە لە هەندێ شت پەیدا دەبێ.
بەڵخە: د. یەکانە.
بەلشین: ز. بەگژداچوون. قینەبەریکردن.
بەڵغ: بەڵخ.
بەڵغەم: ملتەیەکە لە دەروونەوە دێتە ناو دەم.
بەلقتین: ز. بەرقتین.
بەلک: ز. نەرمایی گوێ.
بەڵکا: بەشکا.
بەلکانک: ز. جۆرە مەلێکە.
بەڵکم: بەشکم.
بەڵکو: بەشکوو.
بەڵکە: بەڵکو: جۆرە گیایەکە (د).
بەڵکی: بەڵکو.
بەلگ: ز. گەڵای گوڵ. قەلافەت. شێوەی مەردووم. گەڵای درەخت (با).
بەڵگ: د. بەرگ.
بەڵگ و بن: لەناوبردنی شت: ماڵەکەی (بەڵگ و بن) کرد، واتە لەناوی دا.
بەڵگە: نیشانەیەکە کە لە شتێکی دزراودا دەریکەوێ: (بەڵگە)ی ماڵەکەم گرتووە.
بەڵم: لاسکی چەڵتووک. پەڵپ.
بەڵمەپڕ: تفەنگێکە کە لە قنگەوە دابگیرێتەوە.
بەڵمەریشە: بریتییە لە پیاوێک کە ڕیشێکی گەورەی گڤی ببێ.
بەلۆچە: د. شتێکە وەک ئەسپۆن کالای پێ دەشۆرێ.
بەلۆک: ز. کەسێکە نهێنی ئاشکرا بکا.
بەلۆکە: قیتکە.
بەلوو: هـ. بەڕوو.
بەلووجە: دارێکی پچکۆلەیە دوو سەرەی (وێژە)ی جووتی لە (وێژانبەر) پێ توند دەکرێ. بەڕوولەی دەوار.
بەلوور: ز. بلوور. بلوێر.
بەلوەشین: ز. نەخۆشییەکی زۆر سەختە.
بەلەباریکە: مەردوومی باریکی ڕەقەڵە.
بەلەباقە: دەردێکە تووشی بزن دەبێ و دەیکوژێ.
بەڵەبل: د. مەردوومی زبان درێژ.
بەلەپا: هـ. کەسێکە لە ڕۆیندا زۆر بەپێ و خێرابێ.
بەلەچەک: شتێکە شۆڕبوویێتەوە و تەکەی بێ. کەلەپچە. کوولەکەی پاککراوی چنراو.
بەڵەد: شارەزا. (بەڵەدبوون) شارەزابوون.
بەڵەدی: تریشقە (با). شارەزایی.
بەلەزووانە: ئاوزوونە.
بەلەسە: گیانداری یاخی. (بەلەسەربوون) یاخیبوون.
بەلەشوانە: گیایەکی کوێستانییە گەڵای وەک گەڵای (بەنا) وایە، بەڵام لاسکی باریکترە.
بەلەفیرە: نەخۆشییەکە تووشی بزن و مەڕ و گا دەبێ دەفیرێنێ بەخۆیدا.
بەلەفیرێ: بەلەفیرە.
بەلەک: جۆرە گیایەکی بەرزی شیلەداری لاسکدارە گەڵای وەک بی وایە، بەڵام پچووکترە، بنکەکەی بۆ گەلێ دەرمان دەشێ. پووزی ئادەمیزاد. بەڵەک (ز).

بەلەک: شتی بازوو.
بەلەکان: ناوی تیرەیەکە لە کورد لە ناوچەی (سێرت).
بەلەکبردێن: ز. شتی ڕەنگاوڕەنگ.
بەلەکبردێنی: ز. نەخشکردن بەچەند ڕەنگێک.
بەلەکناچێ: د. پیاوی ژنانی.
بەڵەکی: بوونی شت بەبەڵەک. دەردێکی پیسە تووشی ئادەمیزاد دەبێ ئەندامی پڵپڵ دەکا.
بەلەگوشک: ز. ئێسقانی گوێ.
بەلەم: شتێکی درێژکۆلەی قووڵە لە دار دروست دەکرێ و لە ئاودا پێی دەپەڕنەوە. دەورییەکی شووشەیی درێژکۆلەیە وەک بەلەم.
بەلەنگاز: ز. سواڵکەر.
بەلەنگازی: ز. سواڵکردن.
بەڵێ: وتەی وەرامدانەوە: (بەڵێ) لە وەرامی یەکێکدا کە لێت بپرسێ ئایا خوێندووتە؟
بەڵیاندن: ز. ڕازیبوون. پێکهاتن.
بەڵێن: پەیمان و دەستەبەربوون.
بەڵێندان: پەیمان دان.
بەم: پارچەیەکە لە دەستەی مۆزیقە. دەنگی قەبە: فیسار کەس دەنگی (بەم) بووە (د). بم.
بەمبووڵە: د. مەردوومی دەغەڵ.
بەمبوون: د. فشبوون و بەرزبوونەوە.
بەمێرد: ژنی بەشوو.
بەن: ڕێسراوی خوری. داری قەزوان. دەوروپشتی دێ (ز).
بهن: ز. بۆن.
بەنا: گیایەکی کوێستانییە لاسکی وەک کەنگر و گەڵای وەک کەرەوز وایە. وەستای دیوار.
بەناشوانە: گیایەکی بۆنخۆشە دەکرێتە ماست و تۆراخەوە.
بەناف: ز. داری بناو.
بەناڤ: ز. داری ئەستووری پتەوی قایم.
بەناو: بەدناو. (بەناوبوون) بەدناوبوون.
بەناواچوون: بریتییە لە پیربوونی مەردووم.
بەناوی: بەدناوی.
بەنبڕ: بریتییە لە تیخ: (بەنبڕ) دائمە.
بەنبوون: بەندبوون. سەندنی شتێک لە یەکێک بەبێ پارە (د).
بەنپێلاو: د. قەیتانێکە پێلاوی پێ دەبەسترێ.
بەن تفەنگ: د. قایشی تفەنگ.
بهن تەنگ: ز. مەردوومی تووڕەی تەنگەتیلکە.
بەن جگەر: بەندی جگەر.
بەند: گیرۆدەیی و گرفتاری: فیسار کەس کەوتووەتە (بەند)ەوە.
بەندبوون: مانەوە و گیربوون. جوگە گەورە. پارچەیەکی تایبەتییە لە هۆنراوە و پەخشان. بەرزاییەکە لە ناوەندی دوو زەویدا کە جیایان بکاتەوە (ز). بەربەستی ئاو (ز). قەدەغە (ز). ئەندازەیەکە لە کاغەزی سپی کە پێنج سەد تەبەقە.
بەندان: وتەیەکە بەهێندێ وتەی تایبەتییەوە دەنووسێ لەکاتێکدا کە ئەو شتە تێکڕایی بێ. خەنەبەندان: لە کاتێکدا کە خەنە لە ماڵێکدا بەتێکڕایی بەکار بهێنرێ بەبۆنەی شاییەکەوە، یا (سەهۆڵبەندان، یەخبەندان) لەکاتێکدا کە هەرچی ئاو و تەڕی هەیە بووبێ بەسەهۆڵ و یەخ.
بەندک: پەت (با). گیایەکی بۆنخۆشە تێکەڵ بەپەنیر دەکرێ لەکاتی دروستکردنیدا (ز). بۆینباخ (ز).
بەندڵ: د. بەندی دڵ.
بەند و باو: دەنگوباسێکی ناشیرین کە بکەوێتە دوای یەکێک: فیسار کەس هەر ڕۆژەی (بەند و باوێکی) بەدواوەیە.
بەندۆکە: گیایەکی بەهاریی ئاوییە گەڵای وەک کەرەوز وایە بەترشەوە دەخورێ. ژێر چەناگە.
بەندۆڵ: پانتۆڵی ساعات.
بەندە: مزوور و کارگوزارێکە کە کڕدرابێ.
بەندەخوێن: پەتێکی درێژە لە پزووی دەرپێ و شەرواڵ و ڕانک هەڵدەکێشرێ بۆ بەستن.
بەندەر: ڕۆخ و مینای قەراخ دەریا. لەنگەر. شارێکە کە لەسەر ڕۆخی دەریابێ.
بەندەقـــە: ز. ئاسنێکە لەژێر پێی ئاشـــدا دادەنرێ بۆ ئەوەی بەرداشی لەسەر بسووڕێتەوە.
بەندەگی: پچووکی و مزووریکردن بۆ یەکێک.
بەندەن: شوینی سەخت لە شاخ.
بەندەیی: بەندەگی.
بەندی جگەر: بریتییە لە کەسێکی زۆر خۆشەویست وەک منداڵ و کەسوکارت: فیسار کەس (بەندی جگەر)مە، واتە زۆر خۆشەویستمە.
بەندی دڵ: بەندی جگەر.
بەندێر: بەیداخ.
بەندی: کەسێکە کە لە بەندیخانەدا گیرابێ. بارەدار (ز).
بەندیخانە: جێگایەکە بەندی تێدا بەند و گیرۆدە بکرێ.
بهنژین: ز. پژمین.
بەنســـامـــۆتە: بەنێکی هۆنراوەیە بەلای ڕاست و چەپی زیندا پاشکۆی پێ دادەبەسترێ.
بەنسەعات: بەن یا زریزەیەکە دەخرێتە سەعاتی قەدەوە.
بەنک: ز. بەنی ڕێسراو. پەتی ژێرچەنەی ژنان. درەختی قەزوان.
پەنکەشی: بنکەشی.

بەنکەوانە: گوریسێکی باریکە بەهەردوو پێچکەی (شەخرە)وە.
بەنگ: بەری گیایەکە کێشانی سەرخۆشی دەدا. گیانداری قەتیس ماو. نیشان (ز). کات (ز).
بەنگبوون: بەندبوون.
بەنگا: هـ. کەلەبەری ئاو.
بەنگکێش: کەسێکە فێری بەنگکێشان بووبێ.
بەنگەڵە ژیلە: جۆرە گیایەکە زۆرتر لە مێرگ و تەڕاییدا دەردێ.
بەنگ و باو: بەند و باو.
بەنگۆکە: بەندۆکە.
بەنگە: د. شوێنی هەڵبەستنی ئاو.
بەنگەڵ: هـ. بەنگڵە ژیلە.
بەنگی: بەندی. بریتییە لە یەکێکی گێژ و وێژ.
بەنەخوون: ز. بەندەخوێن.
بەنەر: د. بەندەر.
بەنەری: د. کەری سواری.
بەنەن: د. بەندەن.
بەنی: ز. سوجوق. خشڵی پلپڵەدار.
بەنیر: ز. بەنی کەڵەمەی ملی گای جووت.
بەنیشت: ز. بنێشت.
بەور: جۆرە پڵنگێکی گەرمیانییە تووکی ڕەنگاوڕەنگە. بەفر.
بەورەشینکە: جۆرە برینێکی بەناسۆرە.
بەوز: جۆرە دارێکی گەورەیە وەک توو، بەڵام گەڵای باریکترە.
بەوش: دارێکی دانەداری پانە دەیخەنە ناوەندی تانوپۆی جاجمەوە بۆ ئەوەی کە پێی بکوتن و سفتی کەن.
بەوشی قۆڵ: لە ئانیشکەوە تا سەرشانی ئادەمی.
بەوون: بوورە. بۆن (ل).
بەوەرز: هـ. دەعبایەکی چوارپێی دڕندەیە لە پشیلە پچووکترە.
بەوەسیری: د. مایەسیری.
بەهـ: وتەی پەسندکردن: (بەهـ) لەو گوڵە جوانە.
بەها: نرخ.
بەهار: سێ مانگەی دوای زستان.
بەهارات: داو و دەرمانی چێشت.
بەهارارا: شیعر وتن بەسەر بەهاردا.
بەهاربەند: جێیەکی تایبەتییە کە وڵاخی تێدا ببەسترێتەوە.
بەهاروو: بەهارە.
بەهارە: گەنمێکە کە لە بەهاردا چەنرابێ. بەهاری: دەستێک جلی (بەهارە)م کردووە.
بەهاری: شتێکە کە لە بەهاردا بەکار بهێنرێ.
بەهانە: تەشقەڵە و بیانوو.
بەهانە گرتن: بیانووگرتن بەیەکێک و تەشقەڵە پێکردنی.
بەهانەهێنانەوە: بیانووهێنانەوە بۆ خۆ ڕزگارکردن لە کارێک کە نەتەوێ بیکەیت.
بەهبەهـ: وتەی پەسندکردن: (بەهبەهـ) لەم منداڵە چەند پاک و خاوێنە.
بەهر: ز. بەش.
بەهرپار: ز. بەش.
بەهرک: ز. دەریاچە.
بەهرکردن: ز. بەشکردن.
بەهرە: بەشێکی باش کە خوا بیدا بەیەکێک.
بەهرەدار: خاوەن بەهرە.
بەهرەمە: مەتکەی دارتاشی.
بەهرەمەند: بەهرەدار.
بەهرەوەر: بەهرەدار.
بەهرێز: ز. پارێز.
بەهس: ز. باس.
بەهسک: ز. مێشوولە.
بەهلنگی: ز. پشتییەکە دەخرێتە ژێر پێ بۆ پاراستنی لە شێ و تەڕی.
بەهەجاندن: ز. تووڕەکردنی یەکێک.
بەهەجۆک: ز. مەردوومی تووڕە و تڕۆ.
بەهەشت: ئەو جێگا خۆشەیە کە خوا ئامادەی کردووە لە ڕۆژی دواییدا بۆ چاکان.
بەهەشتی: کەسێکی زۆر چاکە کە شایستەی چوونە بەهەشت بێ.
بەهێ: میوەیەکی خڕی زەردی بۆنخۆشە بەقەد پرتەقاڵێک دەبێ. داری بەهێ.
بەهیڤ: ز. بادام.
بەهیڤئاژنگ: ز. بادامی تاڵ.
بەهیڤتەرک: ز. بادامی سەوز.
بەی: بەهێ.
بەیات: جۆرە مقامێکە.
بەیاتە: ڕۆنی بەز و دووگ.
بەیاخ: بەیداخ.
بەیاخدار: کەسێکە کە بەیداخ هەڵگرێ. بریتییە لە ئافرەتی بێ شەرمی شیرەت.
بەیادیکردن: بێ خەوی و بێ کەیفییەکە لە نەخۆشی یا لە ڕانەهاتنی شوێنێک پەیدا دەبێ.
بەیار: زەوییەکە کە چەند ساڵێک بێ نەکێڵرابێ. قسەی پێچراوەی نادیار.
بەیان: دەمەدەمی بەیانی.
بەیانە: بەهێ.

بەیانەکی: بەیانی.
بەیانی: کاتی دەرکەوتنی رووناکیی رۆژ.
بەیایکردن: بەیادیکردن.
بەیبوون: گوڵە بەیبوونە.
بەیبوونە: بابوونە.
بەیت: داستان: (بەیت)ی دوازدە سوارەی مەریوانم بۆ بکە.
بەیتلشا: ز. شتی بێ کەڵک.
بەیچەڵ: ئافرەتی نەزۆک.
بەیداخ: پارچە تەنراوێکی رەنگاورەنگە دەکرێ بەسەری دارێکی درێژدا و لەسەر کۆشکی دەوڵەتی هەڵدەدرێ و، هەر دەوڵەتەی جۆرە بەیداخێکی هەیە.
بەیداخدار: بەیاخدار.
بەیدەست: کەسێکە کە دەستەپاچە کرابێ. (بەیدەستبوون) دەستەپاچەبوون. (بەیدەستکردن) دەستەپاچەکردن.
بەیلووت: ز. جۆرە هەڵپەرکێیەکە.
بەینەت: د. پەیمان. وەفا.
بەینەتدار: د. بەوەفا.
بەیەخەداکێشان: بریتییە لە کردنی منداڵێکی بێگانە بەمنداڵی خۆت.
بەیەکاچوون: چوونی چەند شتێک بەناو یەکدا. بریتییە لە بەگژدا چوونی دوو کەس لەگەڵ یەک.
بەیەکادان: دانی دوو دەستە یا دوو لەشکر لە یەک. ئاوێتەکردن (د).
بەیەکگەیشتن: گەیشتنی دوو کەس یا دوو شت بەیەک.
بەیجە: پەیژە.
بهیستن: ز. بیستن.
بێ: پیتی دووەم لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. پیتی نەبوون (نفی): (بێ) کارە هەموو کەس لێی بێزارە. بەهێ. وەرە. درەختی بی. پیتی دەربواردن: ئەم ئەسپە بە(بێ) زینەکەی بەچەندە؟
بێ ئابروو: بێ شەرم.
بێ ئار: ز. بێ ئابروو.
بێ ئارام: گیاندارێکە کە ئۆقرەی نەمابێ.
بێ ئاری: ز. بێ شەرمی.
بێ ئاگا: بێ خەبەر.
بێ ئاگایی: بێ خەبەری.
بێ ئاوروو: د. بێ ئابروو.
بیابان: دەشتی چۆڵی کاکی بەکاکی. ئادەمیزادێکە دڵی چووبێ و بێ هۆش کەوتبێ. (بیابانبوون) دڵچوون و بێ هۆش کەوتن.
بیانک: بیانوو.
بیانگ: بیانوو.
بیانوو: بەهانە.
بیاوان: بیابان: بێخود.
بێ ئوورت: ز. کەسێکە کە بێ بەڵێن بێ و درۆ و هەلاتی زۆر بێ بەرەنگێک کە کەس بروای پێ نەکا.
بێ ئەنوا: بێ نەوا.
بێ ئەنوایی: بێ نەوایی.
بێ بار: مەردوومی نالەبار. شتی بێ بەر.
بێ باسک: ز. مەردوومی بێ کەسی بێ ئەنوا.
بێ باسکی: ز. بێ کەسی و بێ ئەنوایی.
بێ باڤ: ز. زۆڵ.
بێ باڤی: ز. فروفێڵ و تەڵەکە.
بێباک: نەترس.
بێباکی: ئازایی و نەترسی.
بێ بن: کچێکە کە کچێنی نەمابێ. بریتییە لە ئاو و بیری زۆر قووڵ.
بێ بەر: بریتییە لە ئافرەت و وڵاخی نەزۆک.
بێ پەڕ و باڵ: بریتییە لە هەژاری رووتی بێ دەق.
بێ پەروا: بێباک.
بێ پەروایی: بێباکی.
بێ پەی: ئاوی بێ بن. بریتییە لە شتی زۆر.
بێ پیڤان: ز. شتی زۆر و بێ ئەندازە.
بێ تابی: ز. ماندوویەتی.
بێ تار: ز. فەلاکەت و چورتم.
بێتام: بریتییە لە شتێک کە نەچێتە دڵەوە.
بێ تاوان: بێ سووچ و گوناح.
بێتر: ز. پتر.
بێ تڤاب: ز. بێ هێز.
بێ توان: ز. بێ دەرەتان.
بێ تووتە: ز. هەژاری دەربەدەر.
بێتووک: بریتییە لە مەردوومی رووتی بێ کەیف.
بێ تەرەف: مەردوومی کەنارەگیر.
بێتەرەفی: کەنارەگیری.
بێ تەشە: ز. مەردوومی بێ هێزی کەفتەکار.
بێتەل: مەکینەیەکە بەبێ تەل قسەی پێ دەدرێ و پێی وەردەگیرێ.
بێجا: شتی بێ جێ و نالەبار.
بێجاکردن: بریتییە لە وتنی قسەیەکی وا کە بەدڵت نەبێ.
بێجگە: وتەی دەرهاوێتن (استثناء): (بێجگە) لە تۆ کەس نەهاتووەتە لام.

بێ جێ: بریتییە لە کردار یا گوفتارێک کە لە جێی خۆیدا نەبێ.
بێ چارە: دەستەپاچەی هەژار.
بێچارەیی: دەستەپاچەیی و هەژاری.
بێ چاو و ڕوو: مەردوومی بێ شەرم.
بێ چاوێنی: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە نزاکردندا بۆ یەکێک کە چاوی پیس کاری لێ نەکا: فیسار کەس (بێ چاوێنی) بێ لە پۆلی خۆیدا هەمیشە یەکەمە.
بیچم: شێوە: (بیچم)ێکی جوانی هەیە. ئادەمی فێڵباز: فیسار کەس زۆر (بیچم)ە.
بێچوو: ساوای گیاندار. جۆرە دراوێکی پچکۆلەی زیوینە.
بێچوولە: ساوای گیاندار. پارچەیەکە دەکەوێتە عاستی نافەکی دەرپێی ژن.
بێچی: ز. بزن و مەڕ.
پێچیڤان: ز. شوان.
بێحاڵ: بریتییە لە نەخۆشی کەشەنگ. بریتییە لە مەردوومی کەمدەست.
بێخ: بنکی شت. گوڵێکی جوانی کوێستانییە.
بێخبڕ: د. بنەبڕ. (بێخبڕبوون) بنەبڕبوون.
بێخود: کەسێکە کە لە هۆش خۆی چووبێ.
بێخودی: لە هۆش خۆچوون.
بێخۆست: بێ هەست. بێخوستبوون: بێدەنگبوون.
بێخێر: بێ کەڵک.
بێداد: بریتییە لە زۆریی شتێک بەجۆرێکی وا کە لێی بێزار بووبیت و هاواری لە دەست بکەیت. مێـــوە لە بازاڕی سلێمانیدا (بێدادە).
بێدار: هۆشیار. (بێداربوونەوە) هۆشیاربوونەوە. (بێدارکردنەوە) هۆشیارکردنەوە.
بێداری: هۆشیاری.
بێداوی: ز. بێ دوایی و بێ بڕانەوە.
بێدۆش: ز. جامی شیر تێدا دۆشین.
بێدووندان: ز. نەزۆک.
بێدەر: بێ دەرەتان.
بێ دەرەتان: مەردوومی بێ جێ و ڕێ.
بێدەست: بریتییە لە مەردوومی نەدارا.
بێدەستی: بریتییە لە هەژاری و دەستکورتی.
بێدەم: بریتییە لە کەسێک کە قسەی ڕەوان نەبێ.
بێ دەم و پل: بێدەم.
بێ دەم و دووان: بێ دەم و پل. کەم دوو.
بێدەنگ: مەردوومی کەم قسە. ئەو پیتانەیە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی کە دەنگیان لێوە نایەت وەک (ئەلف، واو، هێ، یێ).
بێدەنگی: کەم قسەیی.
بێ دین: کەسێکە کە لە خوا نەترسێ.
بێ دینی: لە خوا نەترسان.
بێر: دارێکە دادەچەقێنرێ یەکێک لە سەری دادەنیشێ و، یەکە یەکە سەری ئاژاڵی دۆشەنی دەگرێ بۆ دۆشینی. بێڵ (ز).
بێرایی: هەیوانێکە پێشەکەی هەموو بەرەڵلا نەبێ بەڵکو لەمسەر و لەو سەریەوە دیوار هاتبێتە پێشەوە.
بێ ڕوو: شەرمن. بێ شەرم.
بێ ڕێ: لاڕێ.
بێرک: خاکەنازی گەورەی دەم پان.
بێرگ: شوێنێکی تایبەتییە مەڕی تێدا دەدۆشرێ.
بێرە: هاتنەوەی ئاژاڵ لە نیوەڕواندا بۆ دۆشین. کۆکردنەوەی ئاژاڵ بۆ دۆشینی لە نیوەڕوان یا ئێواراندا.
بێری: ز. بێرگ.
بێریڤان: ز. ئەو کەسانەن کە دەچنە (بێری) بۆ دۆشینی ئاژاڵ.
بێریکردن: ز. بیرکردن.
بێز: ڕەنگ: ئەم قاڵییە لە (بێزی) ئەو قاڵییەیە. قێز.
بێزا: گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانییە.
بێ زات: ترسنۆک.
بێزار: مەردوومی وەڕسبوو. بێزاربوون: وەڕسبوون. (بێزارکردن) وەڕسکردن. بێ دەم و پل (ز).
بێزران: لەبەرچاوکەوتنی شتێک.
بێزراو: شتێکە کە لەبەرچاو کەوتبێ.
بێزکردنەوە: دڵ هەڵشێوان لە شتێک.
بێزگ: بێزوو.
بێزگەوان: ژنێکە کە بێزوو بکات.
بێزنەهاتن: بڕوایی نەهاتنی دڵ بۆ وتن یا کردنی شتێک لەبەر هیچ و پووچیی ئەو شتە: (بێزم نایە) بچمە لای فیسار کەس، یا (بێزم نایە) ئەو شتە بڵێم.
بێزووکردن: ئارەزووکردنی ژنی تازە ئاوس بۆ خواردنی هێندێ شت.
بێزووکەر: ژنێکی سکپڕە کە بێزوو بکات.
بێزە: جۆرە دراوێکی کەم نرخە.
بێزەڕوو: گیایەکی گەڵا وردی توونی ئاوییە گەڵای وەک کەرەوز وایە دەخورێ.
بێزیاگ: بێزراو.
بێزیان: بێزران.
بێژ: وتەیەکە بەدوای هێندێ وتەوە دەنووسێ و دەیکا بەکارکەر: گۆرانی(بێژ)، وتە(بێژ).
بێژار بێژار: شتی کون کونی هەلاهەلا: بەرگ و کاڵای هەژار (بێژار بێژار)ە.

بێـژان: گیـایەکی بۆنخۆشـە، گزرە دەکرێ بۆ ئاژاڵ. قسـەکـردن. وێرانکردنی شـوێنێک: هەرچی هەسـتـاوە کـوردسـتـانی (بێژاوە). بێژانەوە.
بێژاندن: بێژانەوە. وتنی شت.
بێژانن: بێژاندن.
بێژانە: بۆژانە.
بێـژانەوە: لە هێـڵـەک و بێـژنگ و قـەڵبـیـردانی شـتـی کـوتراو یا هاڕدراو بۆ جیاکردنەوەی درشت و وردی.
بێژن: دەنگی جووڵەی شت (ز). سەرەن.
بێژنگ: شتێکی کون کونە لە هێڵەک شاشترە، دانەوێڵەی پێ دەبێژرێتەوە.
بێژۆک: ز. چەنەباز.
بێژوو: ژنی کەم شیر.
بێژەک: گیانداری کەم شیر لەپاش زانی. غەرامەفۆن.
بێسامان: شتی زۆر.
بێسان: بێستان.
بێسانەوان: بێستانەوان.
بیست: ناوە بۆ ژمارەیەک کە دوو دەیە.
بێستان: باخی شووتی و کاڵەک و خەیار و ترۆزی.
بێستانەوان: کەسێکە چاودێریی بێستان بکا.
بیستراو: دەنگێکە کە بەرگوێ بکەوێ.
بیستن: هاتنەگوێی دەنگێک یا وتەیەک.
بیستنەوە: کەوتنەوەی قسەیەک بەرگوێت کە دەربارەت کرابێ.
بیستۆک: تەلەفۆن.
بیستەم: شتێکە لە پایەی بیستەمیندا بێ.
بیستەمین: بیستەم.
بیـسـمـیلکردن: بریـتـیـیـە لە شـۆرین و ئاوی پاککردن بەسـەر شتێکدا.
بیسیرە: با. بەرسیلە.
بێسوس: ز. شتێکە مۆمی داگیرساوی تێدا دادەنرێ.
بێسوو: ز. مەکویەکە کە خۆی تێدا حەشار دەدرێ. بۆسۆ.
بێ سەر و بن: بریتییە لە شتی ناڕێکی تێکەڵ و پێکەڵ.
بێ سەر و پا: د. بێ سەر و پێ.
بێ سەر و پێ: بێ سەر و بن.
بێسی: با. ماستێکە کە تامی تێک چووبێ.
بێ سیم: بێتەل.
بێش: ز. خەرجێکە کە دەوڵەت دەیسێنێ.
بێشک: بێشکە.
بێشکە: شتێکە لە دار و تەختە دروست دەکرێ و منداڵی ساوای تێدا دەپێچرێتەوە بۆ نووستن.

بێ شۆ: د. بێ شومار.
بێ شومار: شتی زۆر و زەبەندە.
بێشە: دارستانی چڕ.
بێ شەرم: بێ ئابڕوو.
بێشەڵان: بێشە.
بێشیرە: ز. بەرسیلە.
بێعار: کەسێکە لە هیچ شتێک پەند وەرنەگرێ.
بێفرشک: ز. شتی بێ مایە و سوود.
بێفەڕ: شتی بێ کەڵک.
بێڤاج: ز. شتێکە کە بیر و عەقڵ نەیگرێ (بدون منطق).
بێڤڵ: ز. لووت.
بێڤەری: ز. ناهومێدی.
بێ کار: بێ ئیشی دەستەپاچە.
بێ کارە: گیانداری بێ کەڵکی دەستەوسان.
بێکاری: بێ ئیشی.
بیگ: ز. پیادەی شەترەنج.
بێگار: کردنی ئیشوکار بەمەردووم بەزۆر و بەبێ پارە.
بێگارچی: کەسێکە بەبێگار ئیشی پێ بکەن.
بێگاری: بێگارکردن بەمەردووم. ئیشێکە کە بەبێگار بەمەردووم بکرێ.
بێگاڤی: ز. ناچاری.
بێگانە: کەسێکە کە خزم و خوێشت نەبێ.
بێگانە بەدەر: کردنی کارێک خۆ بەخۆیی و بەپەنهانی.
بێگانە پەرست: کەسێکە کە بێگانەی لە کەسوکار و گەلی خۆی لەلا خۆشەویستتربێ.
بێ گوێ: بریتییە لە کەسێک کە ئامۆژگاری نەچێ بەگوێیدا.
بێگەڤی: ز. گەوجی و ڕاڕایی.
بێگەن: بۆگەن.
بێڵ: ئاسنێکی کلکدارینی ئەسـپـەرەدارە دەمی لە خـاکـەناز باریکترە زەوی پێ دەکێڵرێ.
بێلا: با. باڵەخانە.
بێ لانە: بریتییە لە مەردوومی بێ جێگا و ڕێگا.
بێڵەپکردن: کێلانی بنکی دار و درەخت لە بەهاردا.
بێڵچە: بێڵی پچووک.
بێڵکار: د. بێڵوچکە.
بێڵکاری: ئیشکردن بەبێڵ.
بێلۆ: د. سەرچاوەیەکە کە بەهاران بژیەتەوە.
بێڵووچکە: بێـڵێکی دارینی کلک کورتە ئاردی پێ دەکرێتە ناو دەفرەوە. بێڵچە.
بێڵووز: ز. جۆرە هەرمێیەکە.

بێڵەدارینە: بێڵووچکە.
بێڵـەکـان: دارێکی دادواو یا دارێکە ئاسنێکی دەمـپـانـی تـیـژی پێوەیە کەنگر و گیای پێ هەڵدەکەنرێ.
بێڵەهەڕ: گـیـایەکی کـوێـسـتـانـیی بەهارییە وەک (گـونۆڕ) وایە، گزرە دەکرێ بۆ ئاژاڵ.
بێلیتڤان: ز. کەسێکە کە بەگۆرانییەوە سەما بکا.
بێلێتە: ز. گۆرانی وتن بە سەماوە.
بێلیتە: ز. گۆرانیی قوتابخانە.
بێلیتەڤان: ز. کەسێکە کە گۆرانیی قوتابخانە باش بڵێ.
بێماد: ز. ڕووگرژ.
بێمرێس: ز. ڕووگرژ.
بێمەژگ: بێ مێشک.
بێمک: با. قەزوانی بنەوشیلە.
بێ مێشک: بریتییە لە مەردوومی گێل و گەوج.
بێن: بۆن.
بێنا: ز. بێ برانەوە.
بێ ناز: بێ ئەنوا.
بێناهی: ز. بینایی.
بێنایی: ز. جۆرە هەنجیرێکە.
بێندۆش: ز. بێدۆش.
بێندەر: ز. خەرمان.
بێ نوێژ: بریتییە لە ئافرەتێک کە لە حەیزدا بێ.
بێ نوێژی: چەنـد ڕۆژێکە لە هەمـوو مـانگێک کە ئافـرەت خوێنی پێ دادێ و نوێژی تێدا ناکات.
بێ نەوا: هەژاری گەدا.
بێ نەوایی: هەژاری و گەدایی.
بێ نیاز: دارای خاوەن دەسەڵات. بریتییە لە خوا.
بێوار: ز. نەزۆک.
بێوڵە: بەچکەی ورچ و بەراز.
بێوڵەت: مەردوومی هەژاری بەدبەخت.
بێـوڵەتی: بەدبەخـتـی و نەهاتی: فـیـسـار کـەس (بێـوڵەتی) گرتوویەتی.
بێوە: بێوەژن. بێوەپیاو.
بێوەپیاو: پیاوێکە کە ژنی نەمابێ.
بێ وەچ: مەردوومی کەوەدەنی بێ کەڵک.
بێ وەخت: کـاتی ترس و تەنگانە و بیم: نیوەشەو مەچۆرە دەرەوە چونکە (بێ وەختە).
بێوەژن: ژنێکە کە مێردی نەمابێ.
بێوەژنکۆشی: ڕەنجدانی بێوەژن بۆ بەخێوکردنی خۆی و منداڵی.
بێ وەی: مەردوومی بێ زیان.
بێـویژان: با. گـیـایەکی بۆن ناخـۆشـە مـار حـەزی لێ ناکـا کـەچی زۆرتر لەبەر کونەکەیدا سەوز دەبێ.
بێ هاوتا: شتی تاقانەی نایاب.
بێ هۆش: مـەردوومی کـەم بیـر. بێـخـود: (بێ هۆشـبـوون) بێ خودبوون.
بێ هۆشکردن: بێخودکردن.
بێ هۆشداروو: دەرمانێکە کە مەردوومی پێ بێ هۆش دەخەن.
بێ هۆشکەوتن: بێ خوودبوون.
بیهن: با. هەناسەدان.
بێهۆشی: بێخودی. بێ بیری.
بێهوودە: شتی بێ کەڵکی بێ قازانج.
بی: دارێکی بێ بەرە گەڵایەکی تاڵی باریک و درێژی هەیە.
بیبار: بیبەر.
بیبک: با. بیبیلەی چاو.
بیبن: هـ. پشتێن.
بیبەر: دەلوبیبەر.
بیبی: بووکی منداڵان (هـ). بیبیلەی چاو (ل).
بیبیلکە: باڵندەیەکی پچووکی بازەڵەی دەشتییە.
بیبیلە: شـتێکە بەقەد نیسکێک لە ناوەڕاستی ڕەشێنەی چاودا، بەو شت دەبینرێ.
بیبیلە گەورە: هـ. قومقومۆکەی پچکۆلە.
بیبین: هـ. بیبن.
بیتووتە: ز. مەردوومی بێ کەسی بێ پارە.
بیج: زۆڵ.
بیجا: پەچەی ژنان.
بیجادە: جۆرە زەنگـیانەیەکی ڕەشی درێژکۆلەیە ژنان دەیکەن بەژێر چەنە و بەرچاوگە.
بیر: یاد: (بیر)ت دەکەم. چاڵێکی قووڵی تەسکە لە زەویدا.
بیـرارکـردن: زبرکردنەوەی دیوی نـاوەوەی بەرداش و دەسـتـاڕ دوای سـوانی. کـەل و کـون گـرتنی دیواری وشکە کـەڵەک. دیوارکـردنی ئەمـلا و ئەولای کـاریز و گـۆڕ بەوشکە کـەڵەک. بریتییە لە لێدانی زۆر.
بیرچوون: دەرچوونی شت لە یاد لە دەمێکدا.
بیرچوونەوە: دەرچوونی شت لە یاد بەئێجگاری.
بیرخستنەوە: خستنەوەیادی شتێک بۆ یەکێک.
بیرک: ز. نەنک.
بیرکردن: یادکردنی شتێک.
بیرکردنەوە: بەدڵ وردبوونەوە لە شتێک.
بیرکەوتنەوە: هاتنەوەیادی شتی بیرچوو.
بیـرنامە: دەفـتـەرێکە کـە شـتی تێدا بنووسیت بۆ ئەوەی لەکـاتی خۆیدا بیرت بخاتەوە.

بیرۆ: جۆرە برینێکی وشکی زبرە لە ئەندامی ئادەمیزاددا پەیدا دەبێ.
بیرۆڤ: ز. بیرۆ.
بیرهاتن: لە یادبوونی شتێکی کۆن.
بیرهاتنەوە: بیرکەوتنەوە.
بیرەوەری: ماوەیەکە لە کات کە لەوانەبێ مەردووم شتی تێدا لە بیر بێ: بە(بیرەوەری) من بەفری وەک ئەمساڵ نەباریوە، واتە ئەوەتی من هەم و بیرم کردۆتەوە.
بیرەوەکردن: بیرکردنەوە.
بیزا: بەیزا.
بیژیرەڕەش: ز. گەنمێکە کە گوڵی ڕەش بێ.
بیژوک: با. بزن و مەڕێکە کە بەگیسکی و کاوڕی ئاوس بێن و بزێن.
بیژوو: زۆڵ.
بیژی: ز. زۆڵ.
بیش: با. بێشە.
بیشە: ز. پیشە.
بیشی: ز. بێشە.
بیڤر: تەور.
بیکمار: ز. مارمێلکە.
بیکۆڵ: داربییەکە لە خۆیەوە ڕوابێ.
بیلبیلە: بیبیلە.
بیلەکەڕە: هـ. شەوگەرد.
بیم: ترس لە شتێک کە لە مەولا ڕوودا.
بیمار: نەخۆش.
بیمارسان: د. بیمارستان.
بیمارستان: خەستەخانە.
بیماری: نەخۆشی.
بیمە: د. سیگۆرتە.
بیمەلەرز: با. بوومەلەرزە.
بین: پشوو: با (بینێک) بدەم. قوڕقوڕاگە: لە (بینم) گیرا.
بینا: د. کەسێکە کە چاوی تیژ بێ و شت باش ببینێ.
بینافتی: با. جۆرە هەنجیرێکە.
بیناقاقە: بینەقاقا.
بینایی: ڕووناکیی چاو.
بینایی چاوان: بریتییە لە خوا.
بینگ: د. بین و هەناسە.
بینگرتن: خولانەوەی هێندێ شت چەند هەناسەیەکی دوور و درێژ: ئەم مزراحە باش (بین دەگرێ). قوڕقوڕاگە گرتنی یەکێک.
بینەقاقا: قوڕقوڕاگە.
بینەقاقە: بینەقاقا.
بینین: چاوپێکەوتن: بەستن (هـ).
بینینەوە: دۆزینەوەی شتی ونبوو.
بیوور: تەور.
بیویژان: با. گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانیی بەهارییە.
بیهەنجیر: د. گەرچەک.



پا: د. پێ. پله. پەلەپیتەکەی تفەنگ و دەمانچە. ڕکێف.
پائەوشار: د. تەختەی ژێر پێی جۆلا.
پابەرە: هـ. دەرپێ.
پابەند: پاشبەند.
پابێڵ: پێ بێڵ.
پاپ: ز. خلّتەی شتی خواردنەوە لە بنکی پەرداخدا.
پاپا: باپیر (ل). گەورەی ئاینی گاوران. وتەیەکە منداڵی ساوا بەکاری دەهێنی بۆ پێ.
پاپاجانە: پاپەجان.
پاپاچینە: پەیژە. جێگاپێیـەکە لە دیواری بیردا دەهێلرێـتەوە بۆ پێدا چوونە خوارەوە.
پاپل: د. وردە گەلایەکە لەژێر لقەوە دەردەچێ.
پاپۆڕ: کەشتی گەورەی دەریایی کە بەئاگر بڕوا.
پاپۆڕەوان: کەسێکە کە پاپۆڕ لێ بخوڕی.
پاپۆش: ئاوەڵکراس. پێڵاو (د).
پاپووج: جۆرە پێڵاوێکە وەک پانی بەرز ژنان لەپێی دەکەن.
پاپەجانە: جۆرە کەوشێکی ئاوزوونەداری منداڵانەیە.
پاپەجانێ: پاپەجانە.
پاپەنجە: پەیژە.
پاپیاساوین: د. بریتییە لە پۆشین و چاوقووچاندن لە شتێک.
پاپی: جاسووس. مفتش.
پاتاڵ: پەڕۆی شڕ. بریتییە لە مەردوومی بێکارە.
پاتاوە: هـ. پێتاو.
پاتک: با. پشتمل.
پاتن: ز. سووتاندن.
پاتۆ: ز. کۆڵووی نان.
پاتۆف: ز. گـیـایەکە پشـتـی ڕەشـەوڵاخی پێ پاک دەکـرێـتـەوە لە تۆز.
پاتەتە: پێ تەتە.
پاتەخت: د. پایتەخت.
پاتێل: د. مەنجەڵۆکە.
پاتیل: د. مەنجەڵۆکە.
پاتیلە: پاتێل.
پاجـڤە کرن: ز. وەرگـێـڕانی شـتـێک لە شـتـێکەوە بۆ شـتـێکی تر وەک تەرجەمەی عەربی بۆ کوردی.
پاچ: ئاسنێکی لووت تیژی کلکدارینە زەویی پێ هەڵدەکەنرێ.
پاچاڵ: پێچاڵ.
پاچرا: د. چرادان.
پاچکاری: ئیشکردن بەپاچ.
پاچکە: پێچکە.
پاچولکە: پاچی پچووک.
پاچە: سەر و پێی ئاژاڵی وردە. پارچە.
پاچەچی: کەسێکە هەر سەر و پێ بفرۆشێ.
پاچەقوڵی: د. پاشقول.
پاچەکـۆڵە: جـۆرە پاچێکی دەمکوڵی پچکۆلەیە ناو دێراو و بن شـینـاییی پێ دەکـۆڵرێـتەوە بـۆ بژارکردن. کۆڵینەوەی ناو دێراو و بن شینایی بۆ بژارکردن.
پاچین: د. هەڵپاچین.
پاچینە: ل. پلیکانە.
پاخ: ز. پەڕۆ.
پاخراو: هـ. پێخاوس.
پاخستن: د. پێخستن.
پاخل: ز. باخەڵ.
پاخوا: خەرمانێکە گێرە کرابێ و شەن نەکرابێ. پێخوێیەک قوڕ.
پاخۆشە: د. پێخوست.
پاخەسوو: بەربووک.
پاخێل: ز. تەختـەیەکە لەسـەر پێچکە دەبەسـترێ بەوڵاخەوە شـتی قورسی لەسەر دادەنرێ و دەگوێزرێتەوە.

پادار: گیاندارێکە کە بەپێ بڕوا. قەدی درەخت و کۆڵەکە (د).
پایەدار (د).

پاداش: چاکەیەکە دەکرێ لەگەڵ یەکێکدا بەرامبەر بەچاکەی خۆی.

پاداشت: پاداش.

پاداشدانەوە: چاکەکردن لەگەڵ یەکێک بەرامبەر بەچاکەی خۆی.

پادان: د. پیادان.

پاداو: د. جۆرە داوێکە.

پادشا: گەورە و سەرۆکی دەوڵەت.

پادشاهی: گەورەیی و سەرۆکایەتیی دەوڵەت.

پادشایی: پادشاهی.

پادەشت: د. پێدەشت.

پار: ساڵی ڕابردوو. ماشەر.

پارازتن: د. پاراستن.

پاراستن: چاودێری و دوورخستنەوەی زیان لە شتێک: خوا بتپارێزێ.

پاراو: شتی تەڕ و تێراو.

پارپار: ز. پەڵپینە.

پارت: دەستە.

پارتی: د. دۆست و برادەر.

پارچ: د. پاچ.

پارچە: کەرتی شت. قوماش: (پارچە)ی ئەم کەوایە زۆر چاکە.
بریتییە لە لاکێش و قاڵی. پاچەی ئاژاڵ.

پارچەفرۆش: د. بازرگان.

پاردە: د. خەندەق. کەند. دیوار.

پاڕانەوە: داواکردنی شتێک لە یەکێک بەلالانەوە.

پاڕۆ: خاکەنازە دارینە.

پاڕوکڵە: د. ڕەوڕەوەیەکە منداڵی ساوا دەستی پێی دەگرێ و پێی فێری ڕۆین دەبێ.

پاڕۆکە: د. منداڵی پێڕەوکە.

پاڕوێنک: جۆگەیەکە بەقەراغی چیغ و ڕەشماڵدا هەڵدەکەنرێ بۆ ئاوەڕۆ.

پاڕەوکە: د. پاڕۆکە.

پاڕیانەوە: د. پاڕانەوە.

پارزونک: با. شاڵینەی کۆڵی ژنە لادێیی.

پارزوون: ز. شیرپاڵێوی شاڵین.

پارسکردن: ز. سواڵکردن.

پارسەک: ز. سواڵکەر.

پارسەنگ: شتێکە دەخرێتە تای سووکی تەرازوو بۆ بەرامبەر وێستانی لەگەڵ تاکەی تریدا لەکاتێکدا کە دەفرێکی بۆشی تێ بخرێ بۆ دەرکەوتنی قورساییی دەفرەکە.

پارسەنگ خستنەپاڵ: بریتییە لە ناو و نەتۆرە و شتی سووک خستنە پاڵی یەکێک.

پارسەنگ گرتنەوە: گرتنەوەی پارسەنگی دەفرێکی بۆش کە لە تایەکی تەرازووودا دانرابێ بۆ دەرکەوتنی قورساییی دەفرەکە.

پارشەو: پارشێو.

پارشێو: کاتی خواردنی ڕۆژووەوان لە بەشی دواییی شەودا. (پارشێوکردن) خواردنی ڕۆژووەوان لە بەشی دواییی شەودا بۆ بەرۆژووبوونی سبەینێی.

پارکەر: د. تەشیلەیەکە کلافەی لەسەر هەڵدەکرێ.

پارگوێر: پارێن.

پارگێن: باڕوێنک.

پارگیر: د. پارکەر.

پارگین: پارگێن.

پاروو: ئەندازەیەکە لە خواردەمەنی کە بەجارێک بخرێتە دەمەوە.

پاروگرتن: کردنی خواردەمەنی بەپاروو.

پاروو گلاندن: پارووی زل گرتن.

پارووگلێن: کەسێکە کە پارووی زل بگرێ.

پاروونەک: ز. پارێن.

پارە: پارچە. (پارە پارە) شتی هەلا هەلا. دراو. لەوێ (هـ).

پارەپیس: بریتییە لە مەردوومی ڕژدی چرووک.

پارەدار: کەسێکە کە پارەی زۆری بێ.

پارێز: پارێزگە: فیسار کەس لە (پارێز)ی مەڕە کێوییەکە دایە. نەخواردنی نەخۆش هی خواردەمەنییەک کە بۆی باش نەبێ تا چاک دەبێتەوە: فیسارکەس ئەوەتی نەخۆشە لە (پارێز)دایە یا (پارێز)ێتی. بێستانی ترۆزی و کاڵەک و خەیار (ز).

پارێزچوون: چوونە کەمین.

پارێزڤان: ز. بێستانەوان.

پارێزکردن: خۆ دوورگرتن لە شتێک: فیسار کەس زۆر (پارێز) دەکا.

پارێزکەر: کەسێکە خۆی بپارێزێ.

پارێزگا: شوێنی خۆ تێداحەشاردان.

پارێزگار: کەسێکە کە دووربین بێ و پارێز لە هەموو شتێک بکا.

پارێزگاری: دووربینی و پارێزکردن لە شت.

پارێزگە: پارێزگا.

پارێڤ: ز. گۆشتێکە کە بەتەندوور ببرژێ.

پارێن: گوێرەکەی دوو ساڵە.

پارێنە: د. پارێن.

پاری: ز. پاروو.

پاریهێ: ز. جۆرە گیایەکە دەخورێ.

پازار: جۆرە مووروویەکە دەکرێ بەتەزبیح.

پازده: بانزه.
پازدەمین: پانزەمین.
پازدەهەم: پانزەهەم.
پازدەهەمین: پانزەهەمین.
پازگە: چاڵێکە لە ناوەڕاستی بێستاندا، خاوەن بێستان بەشەو دەچێتە ناوی بۆ پاسی بێستانەکەی.
پازناوک: دارێکە وەک بێڵـەکـان دەکرێ بەنوێڵ و بەرداشی پێ هەڵدەگیرێ.
پاژ: د. هێندێک لە شتێک (جزء).
پاژنۆ: پاژنە.
پاژنە: گوڵمە گۆشتی بەشی دواوەی پێ.
پاژنەکێش: پاژنەهەڵکێش.
پاژنەهەڵکێش: شتێکی پانی لووسە پاژنەی هێندێ پێڵاوی پێ هەڵدەکێشرێ.
پاژوخ: پاسوخ.
پاژەرەژ: هـ. گۆپکە گەڵا گوێز کە تازە دەم دەداتەوە.
پاژی: د. جزئی.
پاژینە: د. کەپەک. زیوانی ناو دانەوێڵە.
پاس: پارچە کـاغـەزێکە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ سـەربەسـتی لە هێندێ شتدا وەردەگیرێ.
پاسا: د. پێشێل. سەرپۆش.
پاسار: گوێسوانە.
پاساردان: داخی دڵڕشتن بەیەکێک: (پاسار)ێکی فیسـار کەس دەدەم.
پاسارە: پاسار.
پاساری: جۆرە چۆلەکەیەکە زۆرتر لەناو پاساردا هێلانە دەکا.
پاسقاڵ: مەردوومی قەشمەری گاڵتەچی.
پاسقاڵی: قەشمەری و گاڵتەچییەتی.
پاسکردن: ئاگاداریکردنی شتێک.
پاسگە: پازگە.
پاسوخ: وەرام.
پاسە: هـ. وەها.
پاسەبان: پاسەوان.
پاسەبانی: پاسەوانی.
پاسەرنیان: د. بەشوێن شتێکدا ڕۆیین.
پاسەوان: کەسێکە ئاگاداری شت بکات.
پاسەوانی: ئاگاداریکردنی شتێک.
پاش: دوای شت.
پاشا: پادشا.
پاشاپاشایێنە: جۆرە یارییـەکی منداڵانەیە یەکێک لە خۆیان دەکەن بەپاشا.
پاشـاخـوڕ: کـا و کـۆتەڵێکە کـە لە ئاخـوڕی وڵاخ و ئاژاڵدا دەمێنێتەوە.
پاشـاراو: ئاراوێکە کـە لەپاش (سـەراراو) شـتـێکی تری پێ بشۆرێ.
پاشاگەردانێ: پاشاگەردانی.
پاشـاگـەردانی: پشـێـوییی شـوێنێک بەهۆی نەمـانی گـەورە و سەرۆکییەوە.
پاشام: پارشێو.
پاشاو: ئاوێکە کە جاری دووەم بکرێتەوە بەسەر چایی ناو قۆریە و بەسەر گوڵەباخێکدا کە ئارەقەکەی بگیرێ. قنگاو. ئاوێکە کە لە خواردنەوەی یەکێک بمێنێتەوە (د).
پاشبارە: دەستەدوو.
پاشبەن: پاشبەند.
پاشبەند: زنجیرێکە پێی وڵاخی پێ دەبەسترێتەوە.
پاشتەرک: پاشکۆ.
پاشتەرکی: پاشتەرک.
پاشتێلانە: میوانداریـیەکی تێکراییە لە ماڵی زاوا دەکرێ لەپاش سێ ڕۆژ لە گواستنەوەی بووکەکە.
پاشخستن: دواخستنی شتێک.
پاشخوان: پاشماوەی سەرخوان.
پاشخوانە: د. پاشخوان.
پاشدار: چەند سەربازێکە لە ڕۆییندا دەکەونە دوای لەشکرەوە.
پاشدز: کەسێکە کە لە دوای دزەوە بوەستێ بۆ ئاگاداریکردنی.
پاشدزە: پاشدز.
پاشقول: پێ دانە بەرپێی ئەو کەسەی کە زۆرانێی لەگەڵ دەگریت بۆ ئەوەی کە بیدەیت بەزەویدا.
پاشکۆ: شتێکە کە سوار لەپاش خۆیەوە دای ببەستێ.
پاشکەوان: پاشدز. پاشماشە.
پاشکەوتن: دواکەوتن.
پاشکەوتوو: کەسێکە کە دواکەوتبێ.
پاشکەوتە: دواکەوتووی بەجێماو.
پاشگەز: پەشـیـمـان. (پاشگەزبوونەوە) پەشـیـمـانبـوونەوە (پاشگەزکردنەوە) پەشیمانکردنەوە.
پاشل: ز. باخەڵ.
پاشڵ: پاڵوویەکە چەند زەنگوڵەیەکی پێوەبێ. پاشەڵ.
پاشماشە: پارچەیەکە لە تفەنگ کە فیشەکی پێ فڕێ دەدرێ.
پاشـمـامان: مـامـانێکە کە لە پشـتی زەیسـتـانەوە دادەنیـشێ لە منداڵبوونیدا.
پاشماوە: خواردەمەنییەکە کە لەبەردەمی یەکێک بمێنێتەوە.
پاشـمله: کـاتی باسکردنی یەکـێک کـە خـۆی دیار نەبێ: لە (پاشملە) باسی کەس مەکە.

پاشملەیی: باسکردنی یەکێک لە پاشملە.
پاشمەرگە: منداڵێکە کە لەپاش مردنی باوکی لە دایک ببێ.
پاشمەندە: د. پاشخوان.
پاشمەنە: د. پاشمەندە.
پاش و پێش: دوو شتێ کە بەنارەوا پێشوو یان پاشوویان پێش خرابێ.
پاشۆڵ: پاشەڵ.
پاشوو: هەردووپێی ولاخی یەکسم.
پاشوەن: د. پاشبەند.
پاشەبەرە: بەری دواییی بێستان. دواهەمین منداڵی ئادەمیزاد.
پاشەخورج: د. پاشکۆ.
پاشەڕۆژ: ڕۆژانی لەمەودوات.
پاشەرۆک: پاشماوەی سەوزی و کشتوکاڵێکە کە خاوەنی بەرەڵڵای کردبێ.
پاشەکەفت: د. پاشەکەوت.
پاشەکەوت: شتێکە کە گلت دابێتەوە بۆ تەنگانە و نامانگووری. (پاشەکەوتکردن) گلدانەوەی شت بۆ پاشەڕۆژ.
پاشەکەوتی: پاشەکەوتکردن.
پاشەڵ: داوێنی دواوەی کراس و کەوای درێژ.
پاشەلەقە: ڕۆژێکە دوای تەواوبوونی جەژنەکان کە قوتابییان و شاگردان لەو ڕۆژەدا ناچنەوە سەر ئیشیان.
پاشەوانە: شتێکە دەنرێ بەپاشی پلوورەی هەنگەوە بۆ ئەوەی شانی تێدا هەڵبەستێ.
پاشەوپاش: گەڕانەوەی شت پشتاوپشت.
پاشێو: د. پارشێو.
پاشێل: د. لەقەشێل.
پاشیف: ز. پارشێو.
پاقژ: ز. پاکژ.
پاقژە: پەلەقاژە.
پاقلانچکە: گیایەکی بەهارییە گەلایەکی درێژی برگە برگەی هەیە، بەرێکی وردی سوور دەگرێ و زۆر ڕەوانە.
پاقلاوە: جۆرە خواردەمەنییەکی خۆشە لە شەکر و گوێزی کوتراو و ڕۆن و نانی تەنکی چین چین دەکرێ و لە شێوەی (لەبزینە) دەبڕدرێ.
پاقلە: جۆرە گیایەکی بەهارییە، دەچێنرێ، بەرێکی کەلووداری درێژ دەگرێ، چەند دەنکێکی تیایە بەکولاوی دەخورێ.
پاقلینچکانە: د. جۆرە گیایەکە وەک پەڵپینە دەخورێ.
پاقلیر: هە. گوێزێکە کە توێکڵە سەوزەکەی لێ کرابێتەوە.
پاقولاخ: د. سمی مەڕ و بزن و ئاسک.
پاک: شتێکە کە خاوێن بێ. پیتی گشتی (عمومی): کتێبەکەی (پاک) خوێندەوە واتە هەمووی.
پاکار: د. نۆکەر.
پاکانە: دڵ پاککردنەوەی یەکێک بەسوێند بۆ خواردنی.
پاکایی: شوێنێکی پاک لە زەوی.
پاکبوونەوە: نەمانی چڵک یا پیسیی شت. بریتییە لە مردنی پیاوی خراپ: پیاوی خراپ خوا زوو (پاکی کاتەوە).
پاکردن: توێکڵ گرتنەوەی هێندێ شت: ترۆزی (پاک بکە) ئینجا بیخۆ. زیوان و خاک و خۆڵگرتن لە دانەوێڵە.
پاکردنەوە: لابردنی چڵک و پیسی لە شت.
پاکژ: پاک. لەوەڕی قەدەغەکراو.
پاکردان: نەهێشتنی گیا و خەلە لە زەویدا بەهۆی دروێنە یا دەسکەنەوە، یا بەهۆی خواردنی ئاژاڵەوە.
پاککردن: پاکردن.
پاککردنەوە: پاکردنەوە.
پاکڵ: د. ئاگر خۆشکەر. کڵێی پرد.
پاکڵە: د. پاکڵ.
پاکلیرە: پاگردنی (کەمکۆڵ).
پاک و پووککردن: بەختکردن و بەفیڕۆدانی شتێکی بەنرخ: دەست مایەکەت هەموو (پاک و پووک کرد).
پاک و پیسکردن: جیاکردنەوەی شتی چاک و خراپ لەیەک.
پاکوت: د. پێشێل.
پاکۆترە: گیایەکە لە (پاقلانچکە) دەچێ و دەخورێ.
پاکوتکێ: د. پێدان بەزەویدا.
پاکۆدان: دروێنەکردنی گژوگیا بەدەست. بریتییە لە نەهێشتنی شت.
پاکورە: کوللەی باڵ نەگرتوو. پیادە.
پاکە: د. پاکی.
پاکەپاکە: پەتاتە.
پاکەت: کاغەزێکە لە کارخانەدا پێچرابێتەوە و سرێشی لێ درابێ وەک پاکەتی جگەرە و شقارتە و شتی تر.
پاکەمی: د. ماندوویەتی.
پاکەوەبوون: پاکبوونەوە. بریتییە لە مردن و نەمانی یەکێک کە نەتەوێ.
پاکی: خاوێنی.
پاکیزە: شتی پوختەی خاوێن.
پاگرتن: د. پێگرتن.
پاگە: تەویلە (ز). بوار (د). ئاسانەی دەرگا (د).
پاگیر: د. گرفنار.
پاگیرە: د. پائەوشار.
پال: ز. تەپۆڵکە.
پالی: با. پارچە چەرمێکی پانە لە کورتان دەکەوێتە لای ڕانی گوێدرێژەوە.

پاڵ: قەد شاخ و گرد. تەنیشتی گیاندار.
پالا: هـ. پێلاو.
پالاخ: گوێرەکەی گامێش. گەلای وشکی وەریوی درکوداڵ.
پالادرانه: د. حق القدم. حق السعي.
پالافتن: د. پالاوتن.
پالافته: د. پالاوته.
پالامز: کەرەیەکە کە شوان دەیچنێتەوە لەبری مزی شوانانەی.
پالان: ز. کورتان.
پالان: پالان.
پالانته: پالانجەی گونج.
پالانچـه: مـاسـولکه گـۆشـتی پاڵ بڕبڕەی پشت. بەرد و قـوڕ و قسـڵێکە دەدرێتـە پاڵ گونجکاری. مـاسـولکە خـوربیـەکـە بەسەرپشتی هێندێ بەران و مەڕی جوانەوە دەهێڵرێتەوە بۆ جوانی.
پالانه: خوری و موویەکە لە کاتی برینەوەدا دەهێڵرێتەوە بەسەر پشتی مەڕ و بزنەوە بۆ جوانی.
پالانی: گوێدرێژێکە کەکاتی کورتان لێکردنی هاتبێ.
پالاوتن: خەوشگرتنی شتی شل بەشتێکی چنراو. بریتییە لە زۆر ترسان: فیسار کەس لە ترساندا (پالاوتوویەتی).
پالاوته: شتی پاڵێوراو.
پاڵپشت: شتێکی نەرم و شلە دروست دەکرێ بۆ پاڵپێوەدانی.
پاڵپێوەدان: پاڵدان بەشتێکەوە.
پاڵپێوەنان: پاڵنان بەشتێکەوە.
پاڵتاو: پاڵتۆ. پاڵوو (د).
پاڵتۆ: سەربەرگێکی ئەستووری زستانییە.
پاڵتـەک: دەردێکە لە قـوڕگی ڕەشـەوڵاخ پەیا دەبێ، دەئاوسێ و هەڵی دەدڕن و گەنمی تێ دەخەن و چاک دەبێتەوە.
پاڵخستن: ڕاکشاندنی گیاندار.
پاڵدان: پاڵدانەوە. پاڵپێوەنان.
پاڵدانەوە: پشت بەشتێکەوە دان بۆ حەسانەوە.
پاڵدامێن: قەراخی خوارووی داوێن. داوێنی شاخ و گرد.
پاڵداوێن: پاڵدامێن.
پاڵداینه: د. پاڵداوێن.
پاڵدم: پاڵدێم.
پاڵدوو: پاڵووی کورتان.
پاڵده: پاڵدوو.
پاڵدێم: داوێن.
پاڵشت: پاڵپشت.
پاڵفته: د. بێژراوه. پالاوته.
پاڵکەفتن: د. پاڵکەوتن.
پاڵکەوتن: ڕاکشان.
پاڵ لێدانەوە: بریتییە لە دڵنیابوون لە شتێک.
پاڵمه: د. پاڵمه.
پاڵمه: گیایەکی بەهاریی گەڵا پانە تامی (هەڵەکۆک) دەدا.
پاڵنان: پاڵپێوەنان. هەڵپەساردنی شتێک بەشتێکدا.
پاڵنگ: هـ. پڵنگ.
پاڵوانه: باڵندەیەکی ڕەشی باڵ درێژی قـاچ کـورتی تیـژڕەوە کـە کەوتە زەوی ناتوانێ هەڵفڕێ.
پاڵوبەن: د. پشتیوان و یارمەتیدەر.
پاڵوبەنی: پشتیوانی و فریارەسی.
پاڵودان: د. پاڵدانەوە.
پاڵوو: کـەلەکـە. پارچەیەکـە لە کـورتان دەکـەوێتـە ژێر کلکی وڵاخەوە.
پاڵووگیر: دارێکە دەدرێتە بەر (نێ)ی ئاش کاتێک کە بەلایەکدا لاسەنگ بێ.
پاڵه: شاری گەوره (د). کرێکار: (ز). سەپان (هـ). بریتییە لە ئەندازەیەک لە دانەوێڵـــە کـــە ســـەپانێک لە ڕۆژێکدا بیـدروێـتـەوە: (پاڵه)یەک جـۆ یا نیسکم هەیە واتە ئەوەندەی کە بەڕۆژێک بدروێتەوە لەلایەن سەپانێکەوە.
پاڵەپەستۆ: پاڵنانی زۆری بەنهێم بەگیاندارێکەوە.
پاڵەقه: د. پێلەقه.
پاڵەنگ: د. ڕەشمە و مەهار.
پاڵەوان: پیاوی بەهێزی داڕێژراوی زۆرانباز.
پاڵەوانبازی: زۆرانبازیی پاڵەوانان.
پاڵەوانه: جۆرێکە لە مازوو. فیلپایە. کوڵەکە یا پایەیەکە بدرێتە ژێر شوێنێکی زەدەداری شکست.
پاڵەهەنگ: زنجیری گەورە کە دەکرێتە پێی بەندی.
پاڵێ: هـ. کەوش.
پالیک: ز. مووی ڕیشە کە بخرێتە سەر سمێڵ بۆ درێژی.
پاڵێن: د. کەوگیر.
پاڵێوکه: دەفرێکی پانی کون کونە شتی پێ دەپاڵێورێ.
پامال: پایەمال.
پاماڵ: د. پێشێل.
پامـاڵه: شـتێکی چوارچێوەدارە بەتەیان دەتەنرێ و مـاڵەی زەوی پێ دەدرێ دوای تۆو پێوەکردنی.
پاماو: لووسکردنی سواغی گەچ بەپەڕۆی تەڕ.
پامز: د. پالادرانه.
پامـووره: جـۆره پاوانەیەکـە لە زەنگیـانەی ڕەش و شین بە سێ لیسپ دەهۆنرێتەوە و دەکرێتە پێ.

پامـێـزە: گـووی هەنگە کـە لەسـەر کـانی دەیکا دوای ئاو خواردنەوەی، سەرێکی خڕ و سەرێکی باریکە، هەنگ دۆز تەمـاشـای دەکـا سـەرە باریکەکـەی ڕووی لە هەر لایێ دوای دەکەوێ تا پلوورەکەی دەدۆزێتەوە. خوری و مووی دەست و پێی ئاژاڵ. ئاوی وشکەوەبووی ناولنگی سـابرێن لەکـاتی ئارەزووکردنی پەڕیندا.

پان: شتێکە کە تەسک نەبێ.

پانایی: ئەندازەی پانیی شت.

پانبوونەوە: پلیشانەوەی شت.

پانبەپان: بریتییە لە وتنی قسەیەک بەبێ پەردە.

پانپانۆکە: پانپانۆکێ.

پانپـانۆکێ: سـواربوونی ئافـرەتە بۆ ئافـرەتێکی تر و کـوت پێوەدانی.

پانتاو: تەپڵەسەری کێو و گردێکە کە تەخت بێ.

پانتاوی: شوێنی پان و تەخت.

پانتـۆڵ: دەمـەر قۆپان. جـۆرە دەرپێـیـەکی لنگ درێژی تەسکە لە قـومـاش دروست دەکـرێ و لەگـەڵ چاکـەت لەبەر دەکـرێ. تەلێکی زۆر باریکە لەناو سەعاتدا.

پانجەقولێ: هـ. پاشقول.

پاندان: جۆرە قەڵەمێکە مەرەکەبی تێ دەکرێ و پێی دەنووسرێ.

پانزە: ناوە بۆ ژمارەیەک کە پێنج و دەیە.

پانزەمین: شتێکە کە لەپایەی پانزەهەمدا بێ.

پانزەهەم: پانزەمین.

پانزەهەمین: پانزەهەم.

پانکردنەوە: پلیشاندنەوە.

پانکە: جـۆرێکە لە بەری دارمـازوو لە قـۆپچـە دەچێ. جـۆرە ماسییەکی پانکەڵەی گۆشت خۆشە پێستی زگی ئەستوورە. جۆرە باوەشێنێکە بەنەوت یا بەکارەبا دەسووڕێتەوە.

پانکەڵە: شتێکە کە کەمێک پان بێ.

پانوپۆڕ: شتی پانی فراوان.

پانەکی: جۆرەقفڵێکی پانکەڵەیە.

پانەوەبوون: پانبوونەوە.

پانیبەرز: پێڵاوێکی ژنانەیە وەک سۆل بەڵام پاژنەی ئەم بەرزە.

پانیبەرز دروو: کەسێکە هەر پانیبەرز دروست بکا.

پانیر: پارێن.

پانی: پاژنەی پێ. بەری شت لەلای تەسکییەوە.

پاوان: جێ لەوەڕی ئاژاڵ.

پاوانە: شتێکی زەنگوڵەدارە لە زێڕ یا لە زیو دەکرێتە پێی منداڵ بۆ جوانی.

پاوپل: د. پێ و پل.

پاووری: جۆرە مقامێکی کوردییە.

پاونە: د. پێوەندێکە دەکرێتە پێ.

پاورشک: د. بریتییە لە کەسێک کە پێ و قەدەمی خێر نەبێ.

پاوە: لەوەڕی قەدەغەکراو. ناوی دێیەکە لە هەوراماندا.

پاوەپاکردن: د. پێ دزکێکردن لە کارێکدا.

پاوەجێ: د. پایەدار.

پاوەجێکردن: د. قایمکردنی شت.

پاوەجێگە: د. پاوەجێ.

پاوەرە: هـ. دەرپێ.

پاوەرێ: دەرپێ.

پاوەمانگ: د. ژنێکی ئاوسە کە پێی نابێتە مانگی نۆیەمی.

پاوەند: لەوەڕی قەدەغەکراو. پێوەند.

پاوەیو: هـ. پێ خەسوو.

پاهەڵکەوتن: د. پێ هەڵکەوتن.

پاهەڵگرتن: د. پێ هەڵگرتن.

پای: بەخت (ز). بۆ: (پای) بالاکەت.

پایان: دواییی شت: وتەی کوردی (پایان)ی نییە.

پایتەخت: شارێکە کە پاشا یا سەرۆکی دەوڵەتی تێدا دابنیشێ.

پایدۆست: برانەوەی جـەنگی دەوڵەتی و ئاشـتـبـوونەوە یان تەواوبوونی هەموو کار و کردەوەیەک.

پایز: سێ مانگە دوای هاوین.

پایزە: جـۆرە ترێیـەکی پایزەی دەنک خـڕی سـپـیی ئاوداری مـزری ناسکی هێشوو بزمارکوتە. شتێکە کە لە پایزدا بەکار بێنرێ. میوە و سەوزییە کە لە پایزدا پێ بگا.

پایزەبرا: بەدۆستێک دەوترێ کە کەم کەم سەرت بدا.

پایزەڕێز: د. شتێکە سەرمای پایز لێی دابێ و کاری تێ کردبێ.

پایزی: جۆرە هەنجیرێکە وەک (یەحیابەگی) (با). پایزە.

پایکردن: ز. دابەشکردنی شتێک بەسەر چەند کەسێکدا.

پایناز: د. چەند وتارێکی جوانە کە لە خۆشهـاتن و بەخێرهاتنی یەکێکدا بوترێ.

پایناو: قنگاو. سەوزییەکی پاراوی نازاوە (د).

پایە: دیـوارێکی باریکی بەرزە لە خـشت یا بەرد دروست کـرابێ. ئەندازەی بەرزی و ڕیزی کۆمەڵایەتیی یەکێک: یاخوا (پایە) بەرز بێ.

پایەبەرز: بریتییە لە گەورەیەکی بەنرخی دەست ڕۆییو.

پایەدار: بەردەوام.

پایەداری: بەردەوامی.

پایەماڵ: شتێکە بەرباد بووبێ و لەناوچووبێ.

پاین: لای خوارووی شت.

پت: لووت (ل). نوختـە (ز). پەلەپیـتکەیەکـە بەپشـتی پەنجـەی دەست لە شتێک دەدرێ.

پتاپت: ز. پسە پسکردن.
پتات: ز. زۆربێژی پڕوپووچ.
پتپتووک: ز. شتێکە کە چەند خاڵێکی ڕەنگاوڕەنگی پێوەبێ.
پتر: زۆرتر.
پترو: د. پەترۆک. پترووخە.
پترووخە: د. قەتماغەی سەر برین.
پترووکە: د. پەترۆک.
پتکە: شتێکی کەم لە پیسی یا لە قوڕ.
پت و پووز: د. دەم و کاوێژ.
پتەپت: پرتەپرت.
پتەو: شتی قورسی توند و تۆڵی مایەدار.
پتیلە: ل. پلێتە.
پچ: ز. کەم: (پچ)ەک ئاڤ بینە، واتە کەمێک.
پچانن: د. چپەکردن.
پچـران: کـەرتبـوونی هەودا و تەل و هێندێ شـتـی تر. پسـانی گیاندار: (پچڕا)م.
پچراندن: پچڕین.
پچرانن: پچراندن.
پچرانەوە: پسانی کشتەکی ملوانکە و تەزبیح و هەمـوو شتێکی هۆنراوە.
پچراو: شتێکە کە پچڕابێ.
پچراوە: شتێکە کە پچڕابێتەوە.
پچرپچر: شتێکە لە گەلێ لاوە پچڕابێ. قسەی بزربزر: قسەکانت (پچرپچر)ن واتە بەیەکەوە نانووسێن. کردەوەیەکە کە سەر و مر نەبێ: کارەکەت (پچرپچر)ە واتە سەر و مر نییە.
پچرک: با. کولێرەی ناوەشکێنە.
پچرۆک: شتێکە کە زوو بپچڕێ.
پچریاگ: د. پچراو.
پچریان: د. پچران.
پچرین: کردنەوەی شتێک لە شتێک بەنهێم.
پچـرینەوە: بڕدانی یەکـێک لە یەکـێک یا لە شـتـێک: چاک لە فیـسـار کەست (پچریمەوە)، یا چاکم لە قـومـار (پچرینەوە). شاڵاوبردن بۆ یەکێک و ڕنینەوەی ئەندامی. سەندنی شتێک لە یەکێک بەزۆر: بەسم (پچرەرەوە).
پچکۆل: پچکۆلە.
پچکۆلانە: شتی زۆر پچووک.
پچکۆلە: پچکۆلانە.
پچکۆڵە: پچکۆلە.
پچکەلە: پچکۆلە.
پچکەڵە: پچکۆلە.
پچووک: شتێکە کە گەورە نەبێ.
پچـــووکـــبـــوونەوە: بوونی شـــتـــێکی گـــەورە بەپچـــووک. (پچـــووککردنەوە) کـــردنی شـــتـــێکی گـــەورە بەپچـــووک. خواردەستی گەورەیەک: من (پچووک)ی تۆم.
پچووکی: خواردەستی. بوونی شت بەپچووک.
پچە: د. چپە، (پچەپچ) چپەچپ.
پچین: ز. شەق تێ هەڵدان.
پخ: وتەیەکە کوتوپڕ و لە ناکاو دەوترێ بۆ ترساندنی یەکێک.
پخک: ز. پخ.
پخکردن: بڕینی شت بەگردەبڕ. پخەکردن.
پخمە: د. پیسی پۆخڵ.
پخەکردن: وتەیەکە منداڵ بەکاری دێنێ بۆ سەربڕینی گیاندار.
پر: ز. پرد.
پراش: د. ورد، (پراش پراش) شتی ورد و خاش.
پرپرە: پەڵپینە.
پرپریک: ز. گیایەکی بەهارییە.
پرپە: با. هەزارپێ.
پرتاپرتا: ڕاکردنی یەک لە دوای یەک بەپرتەپرت.
پرتال: ز. کوتاڵ.
پرتدان: د. فڕێدان.
پرتکردن: د. فڕێدان.
پرتکە: د. وردەی شت. (پرتکە پرتکە) شتی ڕێزە ڕێزە.
پرت و پەلا: د. شتی هیچ و پووچی بلاوبووەوەی ناو ماڵ.
پرتۆکە: د. پرتکە.
پرتوکیاک: د. شتی پواو.
پرتوکیان: د. پوان.
پرتوێژی: د. قسەی شاش و وێشکردن.
پرتە: لێدانی دەمـار. جـوولانەوەی گـڕی چرا. فـرتە، (پـرتە پرت) پرتەی یەک لەدوای یەک.
پرچ: مووی سەر کە لە عاستی پشت شۆڕ ببێتەوە.
پرچانن: د. قرتانن.
پرچن: کەسێکە کە پرچێکی زۆری ناشیرینی ببێ.
پرچنە: پرچن.
پرچە: د. دەنگی قرتاندنی شت.
پرخاندن: پرخەکردن.
پرخن: کەسێکە کە لە خەودا بپرخێنێ.
پرخە: دەنگێکە لەکاتی نووستندا لە دەم و لووتی هێندێ کەسەوە دێ. (پرخـەپرخ) پرخـەی یەک لەدوای یەک. (پرخ و هوڕ) پرخە پرخی زۆر.
پرد: شـتـێکە لە دار یا لە بەرد یا لە ئاسن دروست دەکرێ بەسـەر ئاوەوە بۆ پێدا پەڕینەوە.

پردژ: د. وچان. دەسرەس.
پردوخیاگ: د. هەڵپرووزاو.
پردوخیان: د. هەڵپرووزان.
پردوو: د. پەردوو.
پردەڵە: چەند دارێکە لەسەر (خەردار)ی ئاش ڕایەڵ دەکرێن و بەرداشیان لەسەر دادەنرێ. دارێکی درێژە لەسەر دوو سنگ داکوتراوە لە ناوەندی (مۆلەق) و (نەوەرد)دا، ڕایەڵی جۆڵا ڕاگیر دەکا.
پردی: هـ. پرد.
پڕ: دەفر یا بۆشاییەکە کە لێوانلێو شتی تێدابێ. شتی سفت: ئەو قاڵبیە تانەکەی زۆر (پڕ)ە واتە سفتە.
پڕاوپڕ: شتێکە کە بۆشاییەک پڕ بکاتەوە بەبێ کەموکوڕی: ئەم تۆپەوانەیە (پڕاوپڕ)ی دەمی گۆزەکەیە.
پڕبار: د. درەختێکە کە بەری زۆر بێ. دەغڵودانەوێڵەی قەڵەو.
پڕبوون: لێوانلێوبوونی دەفرێک یا بۆشاییەک لە شتێک. بریتییە لە تووڕەبوون و پیشخواردنەوەی یەکێک لە یەکێک.
پڕبوونەوە: لێوانلێوبوونی دەفرێک یا بۆشاییەک بەرە بەرە. بریتییە لە تێرخواردن و داکەوتن: فیسارکەس هەرگیز (پڕ نابێتەوە) واتە چاوی تێر نابێ.
پڕ بەپڕ: پڕاوپڕ.
پڕبەر: د. پڕبار.
پڕبێژ: با. سازندە.
پڕپچی: با. چاوی کزی پرووپووشاوی.
پڕپۆڵ: پارچەی کۆنی شڕ: (پڕپۆڵ)ێک شتم لە ماڵدا نییە. مەردوومی چەپەڵی بێ کەڵک.
پڕپۆڵە: ئاردێکە کە ئاوی لێ پڕژێنرابێ و دانە دانە وێستابێ بۆ ئەوەی کە بکرێ بەچێشت یا بدرێ بەجووجەڵە و مریشک. چێشتی پڕپۆڵە.
پڕپیاکردن: پەلاماردانی شتێک بەچالاکی بۆ فڕاندنی.
پڕتاف: د. پڕتاو.
پڕتافان: د. تاودانی وڵاخ.
پڕتاو: تاودانی وڵاخ بەتوندی.
پڕچەک: مەردوومێکە کە چەکی تەواوی پێ بێ.
پڕدان: هەڵمەت بردنە شتێک: پڕی دایە ئەو کارە واتە هەڵمەتی بۆ برد.
پڕزۆڵ: پارچەی پچکۆلانە کە لە شتێک بووبێتەوە. (پڕزۆڵ) شتی ورد و خاش.
پڕزۆڵە: پڕزۆڵی پچووک لە هەموو شتێک.
پڕشنگ: پرشنگ.
پڕقێنە: قرقێنە.

پڕکردن: لێوانلێوکردنی دەفرێک یا بۆشاییەک لە شتێک. بریتییە لە هاندانی یەکێک دەربارەی یەکێکی تر.
پڕکردنەوە: لێوانلێوکردنی بۆشاییەک بەرە بەرە.
پڕکێشی: زاتکردن و بەخۆدا ڕاپەڕموونی کردنی کارێک: فیسار کەس (پڕکێشی) هەموو شتێک دەکا.
پڕگۆشت: بریتییە لە گیانداری زۆر قەڵەو.
پرمە: هەناسەدان بەلووت بەتوندی بەجۆرێک کە دەنگی لێوەبێ: فیسار کەس دایە (پرمە)ی گریان، یا وڵاخەکە (پرماندی). (پرمە پرم) پرمەی یەک لەدوای یەک. پرم و هوڕ: پرمە پرمی زۆر.
پرمێشک: بریتییە لە مەردوومی زۆر ژیر.
پرنۆ: د. دەلیل و بەڵگە.
پرنۆڵ: پارچەیەک کاڵای شڕ: فیسار کەس (پرنۆڵ)ێک بەرگی لەبەردانییە.
پرۆپا: د. قاچ و قۆل.
پرۆپاتاڵ: شتومەکی پرۆپووچی بێ نرخ.
پرۆپۆشتە: د. پۆشتە و پەرداخ.
پرۆپووچ: درۆی زلی هەڵبەستراوی لە ژیری و بیرەوە دوور. شتی بێ کەڵک.
پرۆپەشێو: شوێنێکەکە پرێ لە کەلوپەلی ناوماڵ بەنارێکی.
پرۆپیت: وردە شتی ناوماڵ.
پرووزکان: پچران.
پرووزکاندن: پچراندن.
پرووزکاو: پچراو.
پرووزیان: د. سووتان.
پرووسقان: د. پچران.
پرووسقانن: د. پچراندن.
پرووسقاو: د. پچراو.
پرووسقیان: پچران.
پرووسک: د. پزیسک.
پرووسکان: پرووزکان.
پرووسکاندن: پرووزکاندن.
پرووسکاو: پچراو.
پروکیاگ: د. پچراو.
پروکیان: پچران.
پروکیاو: د. پرووکاو.
پرووز: نارێکی و چەوتیی کەناری کاغەز و پارچەی تەنراو کە هێشتا لێی نەبووبێتەوە: (پرووز)ی کەواکەم دەرکەوتووە، واتە قەراغی ناوەوەی هاتووەتە دەرەوە. بریتییە لە نەنگ و شوورەییی یەکێک: فیسار کەس (پرووز)ی دەرکەوت واتە نەنگ و و شوورەییی ئاشکرابوو. بۆ کورووز.

پرووزە: بۆ کوڕووز: لە تینوانا (پرووزە)م لێوەدێ.
پرووش: وردە تووکی دار و گەڵێ شتی تر کە هەڵی دابێ.
پرووشەکردن: بارینی بەفر بەوردی. بریتییە لە کەم کەم خواردنی منداڵی ساوا و نەخۆشێکەوە کە دەمێ بێ خواردنی نەخواردبێ.
پرووکان: پچڕان: تەزبێحەکەم (پرووکا). هەڵپرووزان لە گەرماندا.
پرووکاندن: پچڕاندن.
پرووکانن: پرووکاندن.
پرووکاو: پچڕاو.
پرەوەبوون: د. پڕبوونەوە.
پریشک: چەند پارچەیەکی وردە کە لە شتێک ببێتەوە: (پریشک)ی ئاوەکە یا بەردەکەم لێ کەوت. پزیسک.
پرزانگ: پزدان.
پرزک: ز. برین و زیپکەی ئەندام.
پرزۆڵ: پرزۆڵ.
پرزۆڵە: پرزۆڵە.
پرزە: هەناسە: (پرزە)ی بریم.
پرزەبڕاو: کەسێکە کە تەنگەنەفەس بووبێ. بریتییە لە کەسێک کە زیانێکی زۆری لێ کەوتبێ.
پرژ: پژی شت. تەرزی سەوزایی وەک مێو و لاولاو و ترۆزی. پەرش و بلاو (د).
پرژان: ڕژان و بلاوبوونەوە.
پرژاندن: ڕشتن و بلاوکردنەوە.
پرژۆڵ: پژی شت. برژۆڵ.
پرس: داواکردنی زانینی شتێک کە نەیزانیت لە یەکێک: هەرچی نازانیت (پرس کە).
پرسا: د. کەسێکە کە دوای شت بکەوێ بۆ زانینی.
پرسانە: د. شتێکە کە لە پرسەدا دەبرێ بۆ ماڵە مردوو.
پرسکردن: پرسین.
پرسە: سەرەخۆشی کردن لە خاوەن مردوو. پرسیار.
پرسەکەر: کەسێکە پرسە بکا لە خاوەن مردوو.
پرسەگورگانە: پرس کردنە بەیەکێک بۆ کارێک کە نەتەوێ بەقسەی بکەیت بەڵام هەر بۆ گلەییی دوارۆژ بێ.
پرسەگورگانێ: پرسە گورگانە.
پرسیار: پرسکردن لە شتێکی نادیار.
پرسین: پرسیار.
پرسینەوە: بەسەرکردنەوەی شت بەپرسین دەربارەی: فیسار کەس لە پچووکی خۆی (دەپرسێتەوە).
پرش: بلاو.
پرشنگ: پرشەی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە و ئەو شتانەی کە لەبەر هەتاو دەبریسکێنەوە. پریشکی ئاگر.
پرشە: بریسکانەوەی شتی بەشەوق وەک ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ و گەڵێ شتی تر. (پرشەپرش) پرشەی یەک لەدوای یەک.
پرگ: شتێکی سپییە دەکەوێتە سەر شتی شل لەبەر زۆر مانەوەی. پەڵەیەک لە زەوی یا دەغڵ.
پرگ هەڵهینان: پەیدابوونی پرگ لەسەر شتی شل یا تەڕ.
پرواندن: وەراندنی گوڵی شینایی و دانەوێڵە. وڵینی کاڵا و شتی تەنراو بۆ لێکردنەوەی شتێک کە پێوەی وشک بووبێتەوە.
پرۆت: ز. کەسێکە دەفری گڵێن دروست بکا.
پرۆژە: مەشروعێکی تێکڕایی.
پروسک: پزیسک (د). دەبێ بەتاکیدی (ئێسک): ئێسک و (پروسک).
پروسکە: د. پروسک.
پرووز: د. بۆکڕووز.
پرووش: د. پروسک.
پرووشە: د. پرووش.
پرووکە: د. پرووشە.
پرووکەپرووک: د. نووکە نووکی گریان.
پریاسکە: پارچە پەڕۆیەکە کە شتێکی تێدا گرێ درابێ.
پریسک: د. پزیسک.
پریش: د. شتی وردبوو. (پریش پریش) هەلا هەلا.
پریق و هوڕ: پێکەنینی قاقا.
پریک و هوڕ: پریق و هوڕ.
پزان: ز. پزدان.
پزدان: پێستێکی تەنکە لە سکی بزن و مەڕ و مانگادا بێچووی تێدا بەرهەم دێ.
پزگ: پزووی دەرپێ. پزوویەکە تووشی ئاژاڵ دەبێ.
پزۆر: ز. ناو سک و ڕیخۆڵەی گیاندار.
پزوسک: د. پزیسک.
پزوسکە: د. پزوسک.
پزوو: دەردێکە تووشی بزن و مەڕ دەبێ وەک هەلامەت وایە بۆ ئادەمی. نوشتاوەی دەرپێ و سەرین کە بەندەخوێن یا کشتەکی تێ هەڵدەکێشرێ. دەمی ڕەشکەی کاکێشان.
پزە: پزوو.
پزیسک: پریشکی ئاگر.
پزیشک: دوکتۆری نەخۆشی.
پزینک: بلامک.
پژ: پرژۆڵی گوڵی گەنم و جۆ. سەرلقی دار و درەخت.
پژاڵ: د. پژی سەر لقی درەخت.

پژان: وەرین و بڵاوبوونەوەی دانەوێڵە. بەربوونی خوێنی لووت و کچێنیی کچ.
پژاندن: بڵاوکردنەوەی دانەوێڵە و بەردانی خوێنی لووت و کچێنیی کچ.
پژگاڵ: کار و فرمان.
پژمە: هاتنە دەرەوەی باو تەزوویەکە لە لووتەوە بەتەکان بەجۆرێکی وا کە دەنگی لێوە بێ. (پژمەپژم) پژمەی یەک لەدوای یەک. (پژم و هوڕ) پژمە پژمی زۆر.
پژمێن: پرنووتی.
پژمین: پژمە.
پژنچە: د. فلّچە.
پژ و پۆ: د. لق و پۆپی درەخت کە برابێ.
پژوو: با. یاڵی ولاخ.
پژوون: ز. گزرەگیا.
پژوێن: پشتێن.
پژوێنە: پشتێنە.
پژە: چەند پرشەیەک لە ئاو.
پژیاگ: د. پژاو.
پژیان: پژان.
پژی: با. پژوو.
پس: کوڕ (ز). کەسێکە کە بەسەری زمان قسە بکا.
پسان: پچڕان. پڕوکانی گیاندار بەهۆی زۆر پێکەیشتنێکەوە.
پساندن: پچڕاندن پڕوکاندن.
پسانەوە: پچڕانەوە: تەزبێحەکەم پسایەوە، یا لەشکرەکە ئەوەندە زۆر بوو هەر نە(دەپسایەوە).
پسپان: ز. پارچەیەکە کاڵای پێ پینە دەکرێ. (پسپانکردن) پینە کردن.
پسپس: ز. وتەیەکە پشیلەی پێ بانگ دەکرێ وەک (پشپش).
پسپاندن: ز. بەچرپە قسەکردن.
پسپسیک: ز. پشیلە.
پسپستڵی: هـ. جاڵجاڵۆکە.
پسپۆڕ: ئاژاڵدارێکە کە لە بەسەرکردنەوە و ناسینەوەی ئاژاڵدا زۆر وریا و شارەزا بێ. کەسێکە لە کارێکدا زۆر بزان بێ.
پستان: فستان.
پسترک: ز. پەیژە.
پستوو: با. یەخە.
پستەق: ز. مێوژی خراپ.
پسک: پشیلە (با). زمان پس. پرچ.
پسکە: د. ورد ڕۆینی ڕاوچی بۆ لای نێچیر. باڵ بەیەکدادانی بەچکەی چۆلەکە و باڵندەی تر لەبەردەمی دایک و باوکیدا بۆ ئەوەی کە دانی بداتێ.
پسکەپسک: پسکەی یەک لەدوای یەک.
پسکیان: د. پسکە.
پسڵ: لووشەیەکە کە دەکرێتە ناو چێشتی دۆکوڵیوەوە.
پسمام: با. ئامۆزا.
پسمیران: با. خانەدانی میرزادە.
پسیان: د. پسان.
پسیزک: پزیسک.
پش: وتەیەکە پشیلەی پێ بانگ دەکرێ.
پشاقیک: ز. بنیسکی سابوون.
پشام: د. ئاوسان و هەوکردن.
پشپشۆکە: گیایەکی پڕپڕی زبرە وەک کلکی پشیلە.
پشپێنت: پشتێن.
پشت: لە مل بەرەوخواری گیاندار تا سەر سمتی. باوک و باپیرە: فیسار کەس لە (پشت)ەوە دەچێتەوە سەر تیرەی جاف. یارمەتیدەر و پشتیوان: تۆ بەپشتی کێ ئەمە دەکەیت؟ دیوی ئەودیوی هەموو شتێک: پشت گوێژە شارباژێرە. دیوی قۆقزی میچ. وتەیەکە پشیلەی پێ دەردەکرێ وەک (ختە).
پشت ئەستوور: کەسێکە کە پشتیوانی بەهێزی ببێ و دڵنیابێ.
پشتدار: شتی قایم و داڕێژراو: ئەم فاسۆنە (پشتدار)ە، واتە قایمە. خاوەن پشتیوان.
پشتدان: بریتییە لە وێستانی گیانداری مێینە بۆ نێرەی.
پشتدانەوە: هەڵدانەوەی ئاگری ناو تەنوور پاش دامردنی تا گەرم دابێتەوە، پاڵدانەوە.
پشترێژ: گیانداری ناوکەڕێژ.
پشتکووڵ: د. پشکۆڵ.
پشتگوێخستن: بریتییە لە بیردەرکردنی کارێک و نەکردنی.
پشتگوێکردن: هەڵپاچینی وردەتووکی بن پرچی ژنان بەمەقەست.
پشتگین: د. دواهەمین.
پشت لێدان: جۆرە یارییەکە چەند کەسێک یەک لەدوای یەک بەکووری دادەنیشن و بەرودوا بەسەر یەکدا هەڵدەچن بەلێدانی پشتیان لە پشتی ئەوی تر.
پشت لێدانەوە: بریتییە لە دڵنیابوون لە پێکهاتن یا پێک نەهاتنی کارێک: فیسار کەس لە کارەکەیدا (پشتی لێ دایەوە) واتە دڵنیابوو کە دەبێ یا نابێ.
پشت لێکردنەوە: پشت لێدانەوە.
پشتماڵە: دراوسێیەکە کە ماڵی لە پشت ماڵتەوە بێ.
پشتمێر: پشتیوان و یارمەتیدەر.
پشتووری: د. پشت ئەستووری.
پشتوێن: پشتێن.

پشته: پشتی میچی قاپێن. دەنگێکە پشیلەی پێ دەردەکرێ. ناوه بۆ دێیەک لەوبەری سیروان.
پشتەپا: د. پشتەپێ.
پشتەپێ: بریتییە لە شەق.
پشتەرێژ: د. پشترێژ.
پشتەرێشە: د. برینداربوونی پشتی وڵاخ بەهۆی بارەوە.
پشتەسەر: جۆرە خشڵێکی پلێپڵەدارە لە زێڕ یا زیو ژنان دەیدەن لە پشتی سەریان.
پشتەک: خوری و موویەکە لەکاتی برینەوەدا بەسەر پشتی مەڕ و بزنەوە دەهێڵرێتەوە. پشتیوانێکە بدرێتە بەر شتێک.
پشتەملە: بریتییە لە زۆرکردن لە یەکێک بۆ کارێک: بە(پشتەملە) ئیشی پێ دەکا.
پشتەملێ: پشتەملە.
پشتەمەلە: جۆرە مەلەیەکە لەسەر پشت دەکرێ.
پشتەوەشکێن: دیوارێکە کە بەپشتدا شکابێتەوە.
پشت هەڵکردن: بریتییە لە زویربوون لە یەکێک.
پشت هەیوان: ژوورێکە کە کەوتبێتە پشتی هەیوانەوە.
پشتەیوان: پشت هەیوان.
پشتێر: د. پشتیر.
پشتێن: شتێکە دەبەسترێتە پشت.
پشتێنە: دارێکە بەناو (بەرزەگەوە) دارەت دەکرێ بۆ ئەمەی نەجووڵێ. شتێکە بەربەستی فیچقەی ئاوی نێو ئاشی پێ دەکرێ. پشتێنێکە بەسترابێتە ناوقەدی هێندێ شت بۆ قایمی.
پشتی: جۆرە سەرینێکی درێژکۆلەی تەنکە پشتی پێوەدەدرێ. پاشەوانەی هەنگ (د). شتێکەکە بەکۆڵ هەڵبگیرێ (ز).
پشتیر: هۆدەی ئاژاڵ. گەنجینەی پشت کەلەگی.
پشتیوان: یارمەتیدەر. دارێکە لە پشت دەرگاوە دادەچەقێنرێ بۆ ئەمەی بخرێتە بەر (پشکۆڵ) بۆ قایمی. دارێکە لە باری پانی بەپشتی تای دەرگا و دەرابەدا دادەکوترێ.
پشتیوانی: یارمەتی و خاوەنداری.
پشتیوانی کردن: یارمەتیدان و خاوەنداری کردن.
پشروون: ز. چێشتی پیرخەنیلە.
پشقل: پیسی دانەدانەی خڕی ئاژاڵی وردە.
پشک: با. گۆیکەی درەخت.
پشک: چیلکەیەکە دەخرێتە کونی مەشکە و کوندە و هیزەوە بۆ ئەوەی ئەوی تیایەتی نەڕژێ. بەش: ئەم کۆمەڵە بکە بەچوار (پشک). پلێک گۆشت. جەرگ (ز). چەند شتێکە دەدرێتە دەست یەکێکی نەشارەزا لەلایەن چەند کەسێکەوە کە بەشەریکی شتێکمان کریبێ و بەشیان کردبێ بۆ ئەوەی کە هەر یەکێک لەو شتانە لەسەر بەشێک لە بەشەکان دابنێ، تا هەر کەسە بەپێی پشکەکەی خۆی بەشەکەی بێ قڕە هەڵگرێ.
پشکخستن: دانانی چەند پشکێک لەلایەن یەکێکی نەشارەزاوە لەسەر چەند بەشێک لە شتێک کە بەشەریکی کڕیبێتیان.
پشکڤین: ز. هەڵپچڕانی درومان.
پشکل: پشقل.
پشکڵ: پشقل.
پشکنین: گەڕانی جێگەیەک یا گیرفان و باخەڵی یەکێک بۆ شتێک.
پشکۆ: دەنکە ئاگری گەش.
پشکول: ز. پشقل.
پشکۆڵ: دارێکی درێژە لە دیوی ناوەوە دەدرێتە پشت دەرگا بۆ قایمکردنی.
پشکوتن: دەمدانەوەی خونچەی گوڵ. گۆیکەکردنی درەخت لە بەهاردا. وردبوونی بەردی قسڵ لە دوای ئاو پێداکردنی. هەڵتۆقینی گەنمەشامی لەسەر ساج.
پشکووڵ: د. پشکۆڵ.
پشکەڵ: پشقل.
پشکیل: د. پشکیلان.
پشکیلان: یاریی گۆرەویبازیی تاقمان لە جووت. کاڵە مستێ.
پشوو: هەناسە: (پشوو) نادا.
پشوودان: بریتییە لە حەسانەوە: ئەمڕۆ هێشتا (پشووم نەداوە).
پشووگرتن: پشوودان.
پشە: ژە (د). پشیلە.
پشیان: د. پژانی ئاو.
پشێ پشێ: وتەیەکە پشیلەی پێ بانگ دەکرێ.
پشی: پشیلە (ل). کولیچە بەڕۆن (هـ).
پشی پشی: جۆرە یارییەکی منداڵانەیە.
پشیک: ل. پشیلە.
پشیلە: دەعبایەکە لە وێنەی پڵنگ بەڵام گەلێ پچووکترە، و مێملی مشکە.
پشیلەسوورە: جۆرە یارییەکە یەکێک تێ دەکەوێ، ئەوانی تر دەست بەیەکەوە دەگرن و، ئەوی تێ کەوتووە دەیگرنە ناو خۆیان، ئەویش تەقەلا دەدا کە لەناو لنگیانەوە دەرچێ، ئەمانیش نایەڵن و دەڵێن: (پشیلە سوورە کوێرا چوو، عەرزی دڕی و پیایدا چوو) ئینجا لەناو لنگی هەر کامێکیانەوە دەرچوو ئەو کەسە تێ دەکەوێ.
پشیلەسوورێ: پشیلەسوورە.
پشیلەشۆر: بریتییە لە شوشتنی ئەندام بەناتەواوی و کەموکوڕی: ئیمڕۆ لە حەمام لەبەر ساردیی ئاوەکەی خۆم (پشیلەشۆر کرد).

پشێوینی: پشێوی.
پشێوی: ئاشووب و تێکچوونی ئاسایشی شوێنێک.
پف: فوو. وتەیەکە لەکاتی دڵ هەڵشێوان لە شتێک دەوترێ: (پف) لەم بۆنە ناخۆشە. (پفکردن) فووکردن.
پفدان: شت فوودان.
پفدریاگ: د. شتی فوودراو.
پفە: وتەیەکە منداڵی ساوا بەچێشتی دەڵێ.
پفەڵ: شتی فش و فۆڵ.
پف هەڵدان: فووکردنە شتێک و ئاوساندنی بە فوو.
پف هەڵدراو: شتی فوودراو.
پگڕ: د. گەمڕە.
پل: کوتە گۆشت. پەڕی باڵندە (د). پەنجە (د).
پڵ: خاڵێکە کە لە شتێکدا پەیدابووبێ: (پڵ)ێک لە دەستم پەیدا بووە.
پڵپڵ: شتێکە کە پڵی زۆری پێوەبێ. جۆر (د). زبان: فیسار کەس دوو (پڵ)ە، واتە دووزبانە (د). ڕوو (د).
پلار: کورتە دارێکە کە بگیرێتە شتێک. توانج.
بلارتێگرتن: بریتییە لە توانج گرتنە یەکێک.
پلاس: هـ. پەلاس.
پلاسماسی: جۆرە ماسییەکە وەک سفرە خۆی دەکاتەوە لەسەر ئاو بۆ ئەوەی هەر مێش و مەرۆشێکی لێ بنیشێ بیخوا.
پلاش: د. پووش و پەلاش.
پلان: د. ئێسقان.
پلانن: د. تلدان بەشت.
پلاننەوە: د. تلاندنەوە.
پلاو: برنجی کوڵاوی پاڵێوراوی ڕۆنی داخ بەسەردا کراو.
پلاو پالا: د. پلاو پاڵێو.
پلاو پاڵێو: دەفرێکی شوولینی پەلە برنجی پلاوی پێ دەپاڵێورێ.
پلاو پلاو: جۆرە یارییەکە هەر یەکەی دە جار لەسەر یەک دەبێ بەدەنگی بەرز بڵێ (پلاو) بەڵام جار لە جار دەنگی بەرزتربێ.
پڵپ: د. مەردوومی بێ کەڵک.
پلپسکیان: نەخۆشیی باڵەشۆڕێ.
پڵپڵە: پارچەیەکی پچکۆلانەیە لە زێڕ یا لە زیو کە بەخشڵێکەوە بەند کرابێ.
پڵپڵی: د. شتی پڵپڵ.
پڵتۆک: پەلەپیتکە بەپشتی پەنجەیەک.
پڵتە: تڵپەی شت. دەنگێکە لە کاتی بەنهێم هێنانەدەرەوەی شتێک لەناو شتێکی تردا پەیا دەبێ.
پلتەقاندن: چەقەنە لێدان بە پەنجەی دەست.
پلچ: د. پان.
پلچانن: د. پانکردنەوە.
پڵدان: لێدان و جووڵانەوەی شوێنێک لە جەستە.
پلک: پوور. پیس (ل).
پلکانن: د. پلانن.
پلکیان: د. تلخواردن.
پل لێدان: پلتەقاندن.
پڵمژیاگ: شتی پەژمردە.
پڵمە: د. پڕمە.
پڵندار: با. کورتە دارێکە دەگیرێتە درەختی گەورە بۆ ئەوەی بەرەکەی بکەوێتە خوارەوە.
پڵنگ: جانەوەرێکی گەورەی بەچنگی بەڵەکی چالاکی کوشندەیە کلکێکی باریکی درێژی هەیە.
پڵنگیان: ئاڵۆزکانی موو.
پل و پا: د. قاچ و قول. تەلاش و کۆشش.
پل و پۆ: کەوتنەسەر فاک و فیکی کارێک: (پل و پۆ)ی ژنهێنانی پێ کەوتووە.
پلوپووش: د. پڕ و پووشی ناو ماڵ.
پڵوپووش: پلوپووش.
پلۆر: ز. پەڵوولە.
پلوسک: شتێکی بۆشە ئاو و چۆڕاوگەی پێدا دێتە خوارەوە.
پلوور: پلوسک (هـ). شمشاڵ (د).
پلوورژەن: د. بلوێرژەن.
پلوورە: شتێکی بۆشە هەنگ شانی تێدا هەڵدەبەستێ.
پلووسگرد: هـ. پەڕەسێلکە.
پلە: پوور. جێگاپێی پەیژە و پێپیلکە. ڕیز و حورمەت و پایە: فیسار کەس (پلە)ی بەرزە. هەڵ: خوا هەڵتخا لە (پلە) یەکدا بتگرم. ئەنگوشت (د).
پلەپرتکێ: د. پەلەپرووزێ.
پلەترازیان: د. پەشیمانبوونەوە. شلبوونەوە.
پلەتسیان: د. پلەترازیان.
پلەزیقان: د. خۆشی خۆشی.
پلەکان: پلیکانە.
پلەکانە: پلیکانە.
پلەمەتە: د. مەتەی دارتاش.
پلەنیان: د. هانەهانەدانی یەکێک.
پلیان: د. گلان و کەوتن.
پلیکانە: پێپیلکە.
پلیتە: د. پڵیتە.

پلێته: شتێکی بادراوه که له شتێکی تر هەڵکێشرێ.
پلێتەکێش: دارێکی سەر لەلەکراوە پلێتەی لە شت پێ هەڵدەکێشرێ.
پلیسرگ: پەڕەسێلکە.
پلیشاندنەوە: پانکردنەوەی شتێک بەهۆی قورساییەکەوە.
پلیشانەوە: پانبوونەوەی شتێک بەهۆی قورساییەکەوە کە بکەوێ بەسەریدا.
پلیشاوە: شتێکە کە پان بووبێتەوە.
پلیکە: پلیکانە.
پن: زچ. نوختە (ز).
پنتک: شتێکی کەم لە قوڕ یا لە پیسی.
پنتی: کەسێکە کە زۆر گوێ نەداتە پاک و خاوێنی و خۆڕێکخستن.
پنج: دەرمانێکە لە قسڵ و لۆکە و ماست دەگیرێتەوە بۆ پینە کردنی دیزە و گۆزەی شکاو. پنجی گیا (ز).
پنجار: ز. گیای سوورەوەکراو.
پنچک: بنچک.
پنچکردن: پینەکردن بەپنج. بریتییە لە چارەکردنی کارێک.
پند: ز. قنگ.
پندر: پنر.
پندربوونەوە: پنربوونەوە.
پنر: جەستەیەکە کە بەهۆی مانەوەی زۆرەوە لەناو ئاودا ناسک بووبێتەوە.
پنربوونەوە: ناسکبوونەوەی جەستە.
بنکاف: ز. گوڵاو.
پنگ: د. پونگە.
پنگر: پندر. پەنگر.
پنگربوونەوە: پندربوونەوە.
پنگرکێش: مەقاش.
پنگە: پونگە.
پنۆک: خاڵ و پەڵەی ورد لە شتدا.
پنە: شتێکی پانی تەختە لە دار یا لە گەچ دروست دەکرێ و نانی تیری لەسەر دەکرێتەوە.
پنیـۆز: با. ڕۆیشتن لە شوێنێک بۆ چەند دەمێک: (پنیۆز) دەکەم واتە ئێستا دەڕۆم لە پاش چەند دەمێ دێمەوە.
پۆ: ئەو شتەیە کە لەسەر ڕایەڵ دەتەنرێ. لق و پۆپ (د).
پۆبر: توندکردنەوەی ڕایەڵی تەون بەجۆرێکی وا کە پۆی پێدا دەچێ.
پۆپ: پۆپنەی کەڵەشێر و مریشک. قژی ژن.
پۆپکە: پۆپە.
پۆپنە: گۆشتێکی سووری بڕگەبڕگەیە بەسەری کەڵەشێر و مریشک و بۆقلەموونەوە.
پۆپە: تەپلەسەری شاخ و درەخت. پۆپنە.
پۆپەڕەشە: دەردێکە دەگا بەکەڵەشێر و مریشک و پۆپنەی ڕەش هەڵدەگێڕێ و دەیکوژێ.
پۆپەژمێن: د. پۆپەشمێن.
پۆپەشمێن: پێخەفێکی شاشی هاوینییە لە خوریی ڕێسراوی باریک دروست دەکرێ.
پۆت: لۆچ.
پۆتلاک: سەر و پێچ.
پۆتەلاک: پۆتلاک.
پۆتێن: جۆرە قۆندەرەیەکی لاسکدارە بەقەیتان دادەخرێ.
پۆخ: گۆپکەی دار و درەخت لەپێش پشکووتنیدا.
پۆخ: با. میوەی زۆر گەیوو.
پوخت: شتی ڕێکوپێکی خاوێن.
پوختکردن: خاوێن و ڕێکوپێککردنی شت.
پوختە: پوخت. (پوختەکردن) پوختکردن.
پۆخ دەرکەوتن: بریتییە لە نەنگ و شوورەیی دەرکەوتنی یەکێک.
پۆخڵ: شتی پیسی ناخاوێن.
پۆخێن: قاووت.
پۆدای: هـ. پێوەدان.
پۆدرە: بۆدرە.
پۆدوو: ز. پووک.
پۆرتک: د. کڵاو و دەسماڵی ژنانە.
پۆرتکان: ڕزین و داوەشانی شت.
پۆرتکاو: شتی ڕزیو.
پۆرخز: گیانداری مۆنی سەهەندەی لاساری مانگر.
پۆڕ: باڵندەیەکی بۆرە لە کەو پچووکترە و گۆشتی خۆشترە.
پۆڕاو: شتی ڕێکخراو.
پۆرک: ناوماڵی کۆچەری. دوو چیغی لوولەکراوە کە کرابن بەبن بار.
پۆڕیان: ل. شتی ڕێکوپێک کە بەکار بێت.
پۆڕین: ل. پۆڕیان.
پۆرگ: توێکێکی ناسکی تەنکە بەسەر برین و هێندێ شتی ترەوە. بەرگی خونچەی گوڵی نەپشکووتوو.
پۆز: ز. لووت.
پۆرنکان: ڕزین.
پۆزە: لووت. کۆسپایی.
پۆزەبەند: د. شتێکە دەکرێتە دەمی هێندێ وڵاخەوە بۆ بەستنی دەمی.

پۆزەخووگە: جۆرێکە لە بەری دارمازوو وەک لمۆزی بەراز وایە.
پۆزەوانە: ئاسنێکە دەخرێتە سەر لووتی ولاخ و ڕەشمەی پێ بەند دەکرێ.
پۆس: پیر: هەواڵی لاو و پۆسیان دەپرسم. چەرم (د). تویک. پۆستە (د). قەرەووڵ و ئێشکچی (د).
پۆست: پێست.
پۆستکەندن: پێست گرتنەوەی گیاندار.
پۆستکەندە: بریتییە لە شتێک کە زۆر چاک لێی کۆڵرابێتەوە و ئاشکراکرابێ. (پۆستکەندەکردن) بریتییە لە لێکۆڵینەوەی شتێک و دەرخستنی.
پۆست گرتنەوە: کەوڵکردنی گیاندار.
پۆستنشین: کەسێکە کە لە تەکیە یا خانەقایەکدا دانیشتبێ و بەچاکە و ئامۆژگاریی مەردووم خەریک بێ.
پۆستە: کاغەز و پەیامێکە کە بەهۆی دەوڵەتەوە بگەیەنرێ.
پۆستەچی: کەسێکە کە پۆستە بگەیەنێ بەخاوەنی.
پۆستەخانە: شوێنێکی تایبەتییە کە پۆستەی تێدا دابەش دەکرێ.
پۆسکەندن: د. پۆستکەندن.
پۆسکەندە: د. پۆستکەندە.
پۆسەخانە: د. پۆستەخانە.
پۆسیان: د. ڕزین.
پۆسین: د. پۆسیان. کەوڵ پۆست.
پۆش: بزنی ڕەشی گوێ سپی.
پۆشاک: کاڵای لەبەرکردن.
پۆشاڵ: د. ڕیشووی شت.
پۆشان: د. پۆشین.
پۆشت: مەردوومی حیز.
پۆشتە: کەسێکە بەرگی باشی نوێی لەبەردابێ.
پۆشتەکردنەوە: کردنی کاڵا بە بەری یەکێکی ڕووتدا.
پۆشتە و پەرداخ: کەسێکە زۆر پۆشتە و ڕێکوپێک بێ.
پۆشەن: د. پۆشاک.
پۆشەنی: پۆشاک.
پۆشی: ز. پووشوو. پووشینی سەری ژنان.
پۆشین: لەبەرکردنی کاڵا. ونکردنی دەنگوباس بۆ ئەوەی بڵاو نەبێتەوە.
پۆغە: گوێرەکەی نەخەساو.
پۆک: با. پەککو.
پۆکە: گریانی نەرم.
پۆکە پۆک: سکاڵا و گلەییی لەبەرخۆوە. گریانی نەرمی یەک لەسەر یەک.
پۆکەر: جۆرە قومارێکە بەکاغەز دەکرێ.
پۆل: پشکۆ ئاگر. کۆمەڵێک گیاندار.
پۆلا: شتێکە وەک ئاسن بەلام ئەم پوختتر و بەنرخترە، تیغ و شتی برندەی لێ دەکرێ.
پۆلاخۆر: د. بریتییە لە مەردوومی ئازا و دلێر.
پۆلانیا: تیژکردنەوەی گاسن و تەور بەخستنەوەی پۆلا لەسەر دەمیان.
پۆلایین: شتێکە لە پۆلا کرابێ.
پۆلکە: گیایەکی بەهارییە بەرێک دەگرێ وەک پاقلە، بەلام ئەم وردترە.
پۆلوو: پشکۆ ئاگر.
پۆنژین: ز. وەنەوز.
پونگ: پونگە.
پۆنگ: پۆنگاو.
پۆنگاو: ئاوێکە یەقی کردبێتەوە و مەفەڕی دەرچوونی نەبێ.
پۆنگخواردنەوە: کۆمەڵبوون و دەرنەچوونی ئاو و دوکەڵ لەبەر گیرانی بەریان.
پونگە: گیایەکی بەهاریی ئاویی بۆنخۆشە وەک نەعنا وایە.
پووار: پاکژ. شتی زۆر ڕزیو: ئەو دارە ئەوەندە ڕزیوە بووە بە(پووار).
پووارتک: ڕزیویی ناو داری گەندەڵ.
پوواز: جۆرە سنگێکە لە دار یا لە ئاسن بەداردا دادەکوترێ بۆ قەڵەشتنی.
پووازناو: دارێکی تۆزێ خوارە سەرێکی پان و دادڕاوە بەرداشی سەرووی پێ بەرز دەکرێتەوە بۆ ئەوەی (گردەڵە)ی بخرێتە ژێر.
پووان: ڕزین.
پوواو: شتی ڕزیو.
پووت: پووچ، سەنگێکی کێشانەیە لە کوردەواریی ئێران. گزرەگیایەکی وشکە لەسەر یەک هەڵدەچنرێ بۆ زستانی ئاژاڵ، بت (ز).
پووتک: د. خۆرە.
پووتەڵ: پووچەڵ.
پووچ: شتی بێ ناوکی بۆشی کلۆر. بریتییە لە قسە و گفتوگۆی بێهوودە.
پووچەک: پووچەڵی دانەوێڵە و شتی تر.
پووچەڵ: شتی پووچی بێ ناو.
پووخک: ز. گوڵنگەی فێست و کڵاو.
پووخین: ز. ئاردی زۆر وردی بێژراوە.
پوور: خوشکی باوک یا دایک. پووچ (ز).
پوورت: ز. موو.

پوورزا: منداڵی پوور.
پوورزازا: منداڵی پوورزا.
پوورکە: پوور.
پوورە: کۆمەڵەی هەنگ.
پوورەدان: کۆمەڵبەستنی هەنگ.
پووز: گوڵمەگۆشتی خوار ڕەفیسک.
پووزەوان: د. پووزەوانە.
پووزەوانە: جـۆرە گـۆرەوییـەکی لاسک درێژە کـە هەمـوو پووز داپۆشێ.
پووس: ل. پێست.
پووش: گیای وشکەوەبوو.
پووشانە: دراوێکە ئاغا لە خاوەن ئاژاڵێک دەیسێنێ کە پووش بخوا.
پووشبـەقنگە: دەعـبـایەکی کلک درێژە چوار باڵی یەک لەسـەر یەکی هەیە.
پووشپەڕ: مانگی حوزەیران کە سی ڕۆژە.
پووشدانەدەست: بریتـیـە لە نابووتکردنی یەکێک: (پـووشکێت دایە دەستم) واتە نابووتت کردم.
پووشکە: تاقە پووشێک.
پووش و پەڵاش: پڕ و پووشی ناو ماڵ.
پووشوو: شتێکی نەرمی وشکی پفەڵە لە بەروو و دار و دارگوێز پەیدا دەبێ و بەبەرد و ئەستێ دادەگیرسێنرێ. شتێکی نەرمە لە کـــارگ و کـــەمکۆڵ پەیدا دەبێ و بەبەردە ئەســـتێ دادەگیرسێنرێ.
پووشەڵان: شوێنێکە کە پووشی زۆر بێ.
پووشێن: پووشەڵان. دێیەکە لە ناوچەی سرۆچک.
پووشی: جۆرە پەچەیەکی تەنکە.
پووشین: پارچەیەکی ئاوریشـمیی ڕەشی ئەستوورە ژنان دەیبەستن بەسەریانەوە. شتێکە کە لە پووش دروست کرابێ. پووشێن.
پووشینپێچ: جۆرە خشڵێکی ژنانەیە دەپێچرێ بەپووشیندا.
پووشینە: سەڵەی پووش.
پووف: ل. سیی گیاندار.
پووک: ڕیزە گـۆشـتـێکە لەناو دەمـدا کـە ددانی لەسـەر دەڕوێ. چەپۆک (ل). پووچ (د).
پووکـانەوە: کـەمـبـوونەوە و بەناوداچوون و چرچبـوون و پچـووک بوونەوەی شت.
پووکاووڵ: چەمۆڵە.
پووکـە: پۆکـە. (پووکـەپووک) پۆکـەپوک (د). بەفـری کـەڕەپوو (ز). پووگ (ز). بای بەهێز.
پوول: دراوێکی مـسـینی کەم نرخە. پارچە کاغـەزێکی چاپکراوی دەوڵەتییە دەنرێ بەپۆستە و سەنەدەوە. ئێسقانی دەفەی شان (ز).
پووڵ: دراو: دراوی مسین.
پوولاد: ل. پۆڵا.
پووڵک: د. پوولەکەی ژنانە.
پووڵکە: د. پووڵک.
پوولەزەرتکە: جۆرە دراوێکی کەم نرخە لە زەرد دروست دەکرێ.
پوولەکە: شـتـێکی گـردی زەردی تەنکی پچـووکی بریسکەداری کونداره بۆ جوانی بە کاڵای ژناندا دەدروێ. شتێکی تەنکی گردی ڕەقە بەسەر پشتی ماسییەوە.
پووڵەکە: پوولەکە. پارچە چەرمێکی پچووکی سێ سووچە دەدرێ لە ڕاست و چەپی کەوش.
پوولەکەڕێز: دەسماڵ یا کراسێکی ژنانەیە کە بەپوولەکە دروابێ.
پووڵەکەڕێز: پوولەکەڕێز.
پوولەکی: ئادەمیزادی ڕژدی پارەپەرست.
پوولی: پشکۆ ئاگر.
پووە: د. کەڕەپوو.
پوویاگ: د. پوواو.
پوویان: د. پووان.
پۆیشی: با. مێشوولە.
پۆیلانە: دیاریـیـەکـە دەبرێ بۆ ژنێک کـە تازە شـووی کـردبێ یا منداڵی بووبێ.
پۆیلە: زڕ و زەنگیانەی سەری ژنان. پۆیلانە.
پەپک: ز. قاچی مەڕ.
پەپکە: خەرمانی گێرەنەکراو کە هێشتا شەن نەکرابێ. خەروای هەنجیر و پەنیر و قیر. گونک (د).
پەپکەبەستن: پەپکەدان.
پەپکەخواردن: پەپکەبەستن.
پەپکەدان: پەپکەخواردن.
پەپکەمەلیچکانە: د. تۆڵەکە.
پەپلانیۆز: ل. نێرکی زەل کە بەناسکی کە دەخورێ.
پەپوک: ز. کـوندەبەبوو. وتەیەکـە ژنان بەکـاری دێنن وەک وتەی (هەی ڕۆ).
پەپۆکە: کولێرەی پچکۆلە کە بۆ منداڵ دەکرێ.
پەپۆلە: سەرە گونکە هەویرێکە کە لە دوای نانکردن دەمێنێتەوە و دەکرێ بەنیوە نانێک.
پەپوو: بایەقوش.
پەپووسـلـێـمـانکە: باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگی جـوانی کـڵاوداره بەقەد کۆترێک دەبێ.
پەپوسلێمانە: پەپووسلێمانکە.

پەپووقژە: باڵندەیەکە وەک پەپووسلێمانکە بەڵام ئەم بێ کڵاوە.
پەپووکەرە: کوندەبەبوو.
پەپوولە: باڵندەیەکی پچکۆلانەیە لە گوڵ و گوڵزار دەنیشێ و گەڵێ جۆری هەیە.
پەپوولەپایزە: شتێکی قژقژاوی سووکی گردە پایزان لە گوڵی درکی کەڵەوێ پەیدا دەبێ.
پەپوولەهەڵهێنان: جۆرە نەخۆشییەکە لە تینوێتی یا لە گەرمای زۆرەوە دووچاری ئاژاڵ دەبێ.
پەپە: وتەیەکە منداڵ بەکولێرەی دەڵێ.
پەت: تیلمەیەک یا پارچەیەکی باریک لە شتێک.
پەتا: درم: (پەتا) داکەوتووە، واتە درمێک هەیە لە ناودا. لەپەیەکی گەرمە دەنرێ لە جێگایەکی بەئازار لە ئەندام.
پەتاتە: سێفە زەمینە.
پەتپەتی: د. تیمار و پێچانی برین. چەرمەسەرێ.
پەتپەتی پێکردن: بریتییە لە دەردی سەری و چەرمەسەرێ دانی یەکێک.
پەترمە: با. موتوربەی دار و درەخت.
پەترۆ: توێژی تەنکی سەربرین.
پەترۆک: پارچەیەکی پچووک لە نان یان لە شتێکی تر: (پەترۆک)ێک نان لە ماڵمدا نییە.
پەتک: پارچە پەتێکی بادراوی ئەستوورە.
پەتکردن: پەت خستنە ملی گیانداریک و ڕاکێشانی.
پەتلە: ھ. ساوەری نەهاڕداو. دانەوێڵە.
پەتۆ: هەناسە: دەردێکی گرت (پەتۆی) نەدا.
پەتۆت: ز. شتی کۆنی ڕزیوی پەڕپووت.
پەتوو: پێخەفێکی خوریی ئەستووری نەرم و شلی تووکنی سووڕاوەیە.
پەتە: نانکردن (ھ). پارچە کاغەزێکی تایبەتی نووسراوە دەدرێ بەو کەسەی کە پارەیەکی لێ وەربگیرێ (وصل).
پەتەڕی: مەردوومی پەتیارەی شێتۆکە.
پەتیارە: مەردوومی شێتۆکەی بەرەڵا.
پەتی: ڕووت: پێی (پەتی)یە، یا وتارەکەی کوردییەکی (پەتی)یە، واتە ڕووتە لە وتەی بێگانە.
پەچ: بزمار یا سینگێکی ئاسنە کە سەرێکی لە دیوی ناوەوە پەرچ درابێتەوە.
پەچدانەوە: پەرچدانەوە.
پەچنین: کۆکردنەوەی خەفەت لە دڵدا: مردم ئەوەندەم خەفەت (پەچنی)یە دڵم.
پەچە: جێگای مۆڵدانی ئاژاڵ. پارچە تەنراوێکی تەنکی ڕەشە ژنان لە کاتی چوونە دەرەوەیاندا دەیگرن بەدەم و چاویاندا. نانکردن (ھ).

پەچەتە: پارچەیەکی چوارگۆشەی سپییە لە کاتی نانخواردندا دەدرێ بەسەر کۆشدا.
پەح: پەحح.
پەحتن: ز. کوڵاندن.
پەحح: وتەی سەرسوڕمان: پەحح: چەند زیرەکە.
پەححا: پەحح.
پەحلوان: ز. پاڵەوان.
پەحن: با. پان.
پەحنی: با. پاژنەی پێ.
پەخ: شتێکە کە قۆقزی و تیژییەکەی تەخت بووبێ. (پەخبوون) کۆڵبوونی قۆقزی و تیژیی شت. پەخکردن: لابردنی قۆقزی و تیژیی شت و تەختکردنی.
پەخش: بڵاو: پرچی بەسەر شانیدا (پەخش)ە.
پەخشان: پەخش. (پەخشانبوون) بڵاوبوونەوە. (پەخشانکردن) بڵاوکردنەوە.
پەخشانبوونەوە: بڵاوبوونەوە.
پەخشانکردنەوە: بڵاوکردنەوە.
پەخشە: مێش: (ل). مێشوولە.
پەخشە کوورە: ل. مێشوولە.
پەر: مەڕی دەموچاو و مل ڕەش. پەڕ (ز).
پەراسوو: چەند ئێسقانێکی کەوانەدارە لە ڕاست و چەپی گیاندار سەرێکیان بەئێسقانی سنگ و سەرەکەی تریان بەمووڕەغەی پشتەوەیە.
پەراسووە: ڕایەڵی زنج.
پەراگندە: پەراگەندە.
پەراگەندە: گیاندارێکە کە لە چەند گیاندارێکی تر بڕبووبێ و بڵاو بووبێتەوە.
پەراوێز: پارچەیەکی باریکە دەنرێ بەقەراغی کەواوە لە دیوی ناوەوە.
پەڕیتن: ز. ڕووتاندنەوەی پەڕی باڵندە.
پەڕپەڕۆک: ز. پەپوولە.
پەرینە: پەڵپینە.
پەرت: بڵاو: بیرم (پەرتە). (پەرتبوون) بڵاوبوون. (پەرتکردن) بڵاوکردنەوە. فڕێدان (ھ). پەل.
پەرتەوازە: پەڕەوازە.
پەرچ: سەر پەلی بەرزەدرەخت کە قرتابێ. پەچ. پەرژین (د).
پەرچان: با. پەرژین.
پەرچاندنەوە: د. پەرچدانەوە.
پەرچانن: د. پەرچدانەوە.
پەرچاوە: شتی پەرچدراوە.

پەرچدانەوە: نوشتاندنەوەی لووتی بزمار لە دیوی ناوەوە.
پەرچەم: بەرچاوگە. مووی ناوچەوان کە بە(قەیچی) خشت کرابێ بۆ جوانی.
پەرداخ: پیـاڵـەیەکی گـەورەی درێژکـۆلەیە ئـاوی پێ دەخـورێتـەوە. شتی پەرداخکراو.
پەرداخـکـردن: لـووسـکـردن و ڕێـکـوپـێـککـردنـی شـــتـــێـک: گەچکارییەکە (پەرداخ کە).
پەرداغ: پەرداخ.
پەرداغکردن: پەرداخکردن.
پەردوو: زەل و هەلاشێکە کە لەسەر دارەڕاوە دادەنرێ و گڵەبانی لەسەر دەکرێ.
پەردە: پارچەیەکە دەگیرێ بەدەرگا و پەنجەرەدا. تویی شت: پیاز (پەردەپەردە)یە. بەستە (د).
پەردەپلاو: جـۆرە پلاوێکە پڕ لـە کـشـمـیـش و بادام و کـفـتـەی ورد لەنـاو دەفـرێکـی مـسـیـنی قـووڵی تایبـەتیـدا دادەچێنرێ و پەردەیەکی لە هەویر بۆ دەکرێ.
پەردەدار: کـەسـێکە کـە هەر هەڵدانەوە و دادانەوەی پەردەی پێ سپێردرابێ.
پەردەدڕان: بریتییە لە ئاشکرابوونی شتێکی نهێنی.
پەردەک: موعەمما و مەتەڵ.
پەردەگیر: زاوایەکە کە لە پەردەی زاواییدا بمرێ یا نەخۆش کەوێ.
پەردەیی: د. ئافـرەتێکە کـە هەمـیـشـە لە پەردەدا بێ و نەیەتە دەرێ.
پەڕ: شتێکی نەرمە بەئەندامی باڵندەوە کە بەهۆی ئەوەوە دەفڕێ. کەناری شت: فیسارە شوێن (پەڕ)ە.
پەڕاندن: بواردنی شت. پەیکردنی شت. چاکـردنی ولاخی نێـری یەکسم لە مێی.
پەڕاندنەوە: تێـپـەڕاندنی یەکـێک بەسـەر ئاوێکدا. بریتـیـیـە لە ڕزگارکردنی یەکێک لە چورتمێک.
پەڕانن: پەڕاندن.
پەڕانەوە: پەڕینەوە.
پەڕبـازی: یاریکردنـی باڵندە بەپەڕ و بـاڵی خـۆی بۆ شـۆخی یا بۆ ئەوەی کە خـۆی فـێری فـڕین بکا. بریتـیـیە لە شۆخـیکردن و بەخۆدا نازینی یەکێک.
پەڕبوون: دەرکەناربوون و گۆشەگیربوونی یەکێک.
پەڕپووت: شـتی کـۆنی بێ هێزی لە یەک بەبوو: ئەم کالایە یا ئەم خانووە یا ئەم پیاوە (پەڕپووت) بووە. جۆرە مراوییەکە.
پەڕش: جۆرە گەنمێکی سوورە وەک چەڵتووک لە پۆرگدایە، وەک ساوەر دەهاڕدرێ و دەکرێ بەچێشت.
پەڕشت: پەڕش.
پەڕشە: پەڕش.
پەڕگار: ئاسنێکی دووپەلە کێری گرد و کەوانەییی پێ دەکێشرێ.
پەڕلەپێ: جۆرە کۆترێکە هەردوو قاچی پەڕ داپۆشیوە.
پەڕندە: باڵندە.
پەڕۆ: پارچە تەنراوی کۆن.
پەڕۆک: با. کوتاڵ.
پەڕوو: کالایەکە کە ببەخشرێ.
پەڕە: چەند دارێکە سەرێکیان وەک کەوچک وایە سەرەکەی تریان دادەدرێ و دەکرێ بەتۆپی ئاشدا بۆ ئەوەی کە ئاوەکە لێیدا و تۆپەکـە بسـووڕێتـەوە. گـەڵای دار و درەخت و گـوڵ. تەبەقی کـاغـەز. شـتێکـی تـەنکە بەسـەر کلک و پشـتی مـاسـیـیـەوە. نەرمایی لووت. نەرمایی گوێ. تویی دڵ.
پەڕەپا: د. پەڕ لە پێ.
پەڕەخـەڕەک: پەڕەیەکی گـەورەیە لە خـەڕەکـدا بەبادانی دەسکە لووجەکەی دەخولێتەوە.
پەڕەسلێنکە: پەڕەسێلکە.
پەڕەســێلکە: بـاڵندەیەکی باڵ و ســەر ڕەشی ژێر سک ســپــیی بەرچەنە سووری کلک دوو فاقی پچکۆلەیە.
پەڕەکە: پەراسوو (د.). پەڕەی شتی پەڕەدار.
پەڕەکەر: کەسێکە کە بەچەک و کەوان لۆکە بکاتەوە.
پەڕەناو: هەڵدانەوەی کولۆش بۆ ژێرپێی گاگێڕە لە کاتی گێرەدا لە دیوی دەرەوە.
پەڕەوازە: گیانلەرێکە لە شوێن خۆی دوور کەوتبێتەوە. (پەڕەوازە بوون) دوورکەوتنەوە و ئاوارەبوونی گیاندار. (پەڕەوازەکردن) ئاوارەکردن.
پەڕین: هەلاتنی نێـر لە مێ. ترازان و دەرچوونی شت لە جـێـیێ خۆی. لە گۆچوونی ئەندام بەهۆی سەرماوە.
پەڕینەوە: تێـپـەڕین بەسـەر ئاودا. بریتـیـیـە لە ڕزگـاربوون لە چورتمێک.
پەرژان: دەست گەیشتن بۆ کردنی کارێک.
پەرژیان: پەرژان.
پەرژین: پەرژان. ڕیزە درکەزیی یا قامیش یا شتێکی ترە دروست کرابێ بەگردی شتێکدا بۆ پاراستنی.
پەرستش: پەرستن.
پەرستن: بەندەگیکردن بۆ خوا و بەجێ هێنانی فەرمانەکانی.
پەرش: بلاو: گـورگ پێـی نایە ناو ڕانەکـەوە (پەرش) و بلاوی کردەوە.
پەرکال: ز. جوانی و بریقە و ڕێکوپێکیی شت.
پەرکولۆڵ: مەڕی دەموچاو و مل ڕەشی سەرلووت سپی.
پەرکەم: فێ.

پەرگ: هەودایەکی بادراوە لە دەزوو یا بەن سەری کەلاشی پێ دەچنرێ. پەرگ.
پەرگەما: دەزوویەکە بەکەناری بنکی کەلاشدا دادەدروێ و پەرگی لەسەر دەچنرێ.
پەرموون: پەرموونەوە.
پەرموونەوە: هیوای لێ شێوانەوەی شتێکی چاک یا خراپ لە یەکێک: پیانا (دەپەرموومەوە) یا (ناپەرموومەوە) بۆ کردنی ئەو کارە. کۆکردن و سڵەمینەوە لە شتێک: فیسار کەس لە هیچ نا پەرموێتەوە.
پەروا: ترس و بیم: (پەروا)م لە کەس نییە.
پەروار: دابەستە.
پەرواری: پەروار.
پەرواز: فرینی باڵندە.
پەروانە: جۆرە پەپوولەیەکە بەگردی چرادا دەسووڕێتەوە. هەموو شتێک کە بەگردی چەرخێکدا بسووڕێتەوە.
پەرۆش: پەرێشانی و سەغڵەتیی دڵ.
پەروەردگار: ناوێکە لە ناوەکانی خوا.
پەروەردە: گیاندار یا دار و درەخت و سەوزاییی یا هێندێ شتی ترە کە بەرەنج و کۆشش بەرهەم هێنرابێ: ئەم منداڵە یا ئەم درەختە یا ئەم گوڵە یا ئەم دەرمانی چاوە (پەروەردە)ی خۆمە. (پەروەردەبوون) بەرهەم هاتنی شت. (پەروەردەکردن) بەرهەمهێنان.
پەروەرش: د. پەروەردەکردن.
پەروەری: مامۆستای بەرهەمهێنان (تربیة).
پەرە: بۆ: (پەرە)ی دیدەی یار غەریب جەشارم (هـ). پارە (ز).
پەرەبەستن: پەرەسەندن.
پەرەسەندن: تەنینەوە و زۆربوونی شت.
پەرەسێن: شتێکە کە زوو بتەنێتەوە.
پەرەکردن: شیکردنەوەی لۆکە و خوری.
پەرەگرتن: پەرەسەندن.
پەرەنێشک: گیای نووسەنەک.
پەرهێز: پارێز. (پەرهێزکردن) پارێزکردن.
پەرهێزگار: کەسێکە لە کاروباری خۆیدا هەمیشە بەپەرهێز بێ. بریتییە لە خوا، چونکە هەمیشە بەندەی خۆی دەپارێزێ.
پەرهێزی: پارێزکردن.
پەرێ: پێرێ (د)، بەمەعنا (بۆ)یە کە بۆ تەرخان بی: ئاوم (پەرێ)بێنە واتە بۆم بێنە (هـ).
پەرێپتاندن: ز. پەرێتێن.
پەرێز: شوێن دروێنەی دەغڵودان. پارێزگە: فیسار کەس لە پەرێزی مەرە کێویدایە.

پەرێشان: گیانداری شپرزە. شتی شێواو. (پەرێشانبوون) شێوان و شپرزەبوون. (پەرێشانکردن) شێواندن و شپرزەکردن.
پەرێشانی: شپرزەیی. شێواوی.
پەری: جۆرە گیاندارێکی خەیاڵیی زۆر جوانە گوایا دەتوانێ خۆی بەهەموو رەنگێک بگۆڕێ.
پەریبر: منداڵێکی نێرینەیە کە سکماک چەرمی چووکی نەبێ.
پەز: مەڕ. ڕانی مەڕ یا بزن (با).
پەزاو: ئاودانی سەوزاییی دووەم جار.
پەزە کێفی: د. مەڕەکێوی.
پەزێرە: د. خواردەمەنییەکە کە شەو مابێتەوە.
پەزیشک: پزیشک.
پەزیزانک: سیقەتۆرەی کەڵەشێر.
پەژارە: خەفەت و پۆکەپۆک بۆ شتێک.
پەژراندن: با. بەپیرەچوون.
پەژک: ز. دەستەچیلەی ئاگر.
پەژم: هـ. خوری.
پەژمردە: پەژموردە.
پەژموردە: گیاندار و سەوزایی و درەختی سیسی ژاکاوی بێ کەیف
پەژیراندن: ویستن و قبووڵکردن.
پەژێو: د. پەشێو.
پەژیوان: پەشیمان.
پەژیوانی: پەشیمانی.
پەس: مەڕ (ل). پەست.
پەسا: د. پێخوتییەک قوڕ.
پەساپۆرت: جۆرە پاسێکە دەدرێ بەیەکێک کە بیەوێ بچێ بۆ شارێکی بێگانە.
پەساخوڕ: د. پاشاخوڕ.
پەساکردن: د. خووساندن.
پەساو: د. پاشاراو.
پەسپۆر: ز. ژنی چەنەباز.
پەسپەسکەرە: دەعبایەکی زەردی چنگ چنگاوییە وەک جاڵجاڵۆکە وایە.
پەسپەسەکۆڵە: پەسپەسکەرە.
پەسپەسەکەرە: پەسپەسەکۆڵە.
پەسپەندە: ز. پیاوی کەم نرخی بێ ناو.
پەست: شوێنی نزمی تەنگ. مەردوومی بێ مایە و نرخ. مەردوومی زویر. (پەستبوون) زویربوون. (پەستکردن) زویرکردن.

پەستاپەستا: وتەیەکە ڕۆین یا هاتن یا ناردنی شت پێشان دەدا یەک لە دوای یەک و بێ پسانەوە: عێلی جاف (پەستاپەستا) دەچن بۆ کوێستان، یا ئاوەکە (پەستاپەستا) دێ.
پەستان: پەستانەوە.
پەستاندن: پەستان.
پەستاندنەوە: پەستانەوە.
پەستانەوە: کوتانەوە و لە یەک توندکردنی شتی فشی هەڵۆڵ.
پەستاوتن: پەستانەوە.
پەستراو: شتی کوتراوەی لە یەک توندکراو.
پەستراوە: پەستراو.
پەستن: پەستانەوە.
پەستنەوە: پەستانەوە.
پەستەک: جۆرە کاڵایەکە وەک سوخمەی بێ قۆڵ لە مەرەز یا کورک دروست دەکرێ و لەسەر هەموو کاڵایەکەوە لەبەر دەکرێ.
پەستەکۆڵە: کۆبوونەوەی ژن و پیاوی دێیەکە لەناو تیرەی (ئاکۆ)، هەر شەوە لە ماڵێک بۆ سۆونەوەی پەستەک و فەرەنجی.
پەستی: نزمی. خەفەتباری.
پەسقەلە: ز. ئادەمیزادی پاسقاڵ.
پەسمەندە: شتی ماوەوەی بەسەر یەکدا کەوتوو.
پەسمەنە: د. پەسمەندە.
پەسن: ز. مەدح و ستایش.
پەسند: پەسەند.
پەسندان: ز. ستایشکردن.
پەسە: د. ئەو شتانەن کە خواردنیان لێ دروست دەکرێ وەک ئاو و ئارد بۆ نان.
پەسەک: د. پەستەک.
پەسەن: د. پەسەند. (پەسەنکردن) پەسەندکردن.
پەسەند: شتی هەڵبژاردە لەبەر باشی. (پەسەندکردن) هەڵبژاردنی شتێک لەبەر چاکی.
پەسێو: پەنا و قوژبن.
پەسیرە: بەرسیلە.
پەسیسە: چێشتێکە زۆر کولابێ و چنگی دابێتە یەک.
پەسیڤ: با. هەلامەت.
پەسیو: پەسیڤ.
پەش: ز. دەنگێکە گاجووتی پێ دەردەکرێ.
پەشتەماڵ: تەنراوێکی چوارگۆشەی درێژکۆلەیە لە حەمامدا دەگیرێتەوە بەناوەندی ناوک و ئەژنۆدا. خاولی دەست سڕین.
پەشک: ز. دڵۆپەی ئاو و شتی تر.
پەشم: خوری. بریتییە لە قسەی بێ نرخ: ئەم قسەیە لەلام (پەشم)ە.
پەشمەک: جۆرە شیرینییەکی ڕیشاڵ ڕیشاڵە وەک خوری شی کراوە.
پەشمین: شتێکە لە خوری دروست کرابێ.
پەشمینە: پەشمین.
پەشۆکان: شپرزەبوون و سەر لێ شێوان.
پەشۆکاندن: شپرزەکردن.
پەشۆکاو: گیانداری شپرزەی سەر لێ شێواو.
پەشۆکیان: د. پەشۆکان.
پەشووش: ز. شتی شل و شێواوی نەرم.
پەشە: مێشوولە.
پەشەبەند: د. پەردە و کوڵلەی نووستن.
پەشیلاندن: ز. ڕووخاندن.
پەشیلین: ز. ڕووخان.
پەشێو: سەر لێ شێواوی شپرزە.
پەشێوان: پەشۆکان.
پەشێواو: پەشۆکاو.
پەشێویان: د. پەشێوان.
پەشێوی: شپرزەیی و سەر لێ شێوان.
پەشیمان: مەردوومێکە کە لە کردنی کارێک یا گوفتارێک پاشگەز بووبێتەوە. (پەشیمانبوونەوە) پاشگەزبوونەوە. (پەشیمانکردنەوە) پاشگەزکردنەوە.
پەشیمانی: پاشگەزی لە کارێک یا گوفتارێک.
پەقرەج: جۆرە سەتڵێکە.
پەقژک: با. بڵقی زۆری وردی ناو ئاو.
پەک: دەستەوسانی: ئەگەر ئەم کارە وا بێ ئیتر (پەک)مە، واتە دەستەوسان دەمێنم.
پەکخستن: دەستەوسانکردن و لە کارخستنی شتێک.
پەکک: پەککو.
پەککو: وتەی سەرسامبوون. (پەککو) لە پیت و فەڕی کوردستان چەند زۆرە.
پەککەفتن: د. پەککەوتن.
پەککەوتن: دامان و لە کارکەوتن.
پەککەوتوو: پەککەوتە.
پەککەوتە: داماوی دەستەوسان.
پەکەر: د. پەشێو.
پەل: دەفری دەم واڵ. قۆڵ و باسکی گیاندار: (پەل)م بگرە. شیو و دەرە: پەڕی پەلەور (هـ). پشکۆ ئاگر (با). لک: درەختەکە (پەل)ی لێ بۆتەوە. پارچە: (پەل)ێ نانم بەرێ، (پەل پەل) پارچەپارچە.

پەڵ: بەرد یا کوڵۆیەکی گەورەیە کە بهاوێژرێ.
پەڵاس: جۆرە ژێرەخەرێکە لە جاجم ئەستوورتر و لە بەڕە تەنکترە.
پەڵاش: پووشێکە لە بنجەکەی بووبێتەوە و کەوتبێ.
پەلامار: هەڵمەت: فیسار کەس زۆر بە(پەلامار)ە.
پەلاماردان: هەڵمەتبردن.
پەڵان: د. ئێسقان.
پەڵپ: بیانو.
پەڵپگرتن: بیانوگرتن بەیەکێک.
پەڵپەڵان: د. پەلهاویشتن بۆ یەکتری.
پەڵپینە: گیایەکی ئاوییە لەناو سەوزاییدا پەیدا دەبێ گەڵایەکی ورد و ئەستوور و ترشی هەیە، دەکرێ بەچێشت.
پەڵتەک: پاڵتەک.
پەلچقاندن: ز. هارین. شێلان.
پەلچم: ز. گەڵایەکە گزرە کرابێ بۆ ئاژاڵ.
پەڵخ: گوێرەکەی گامێش. بەچکەی بەراز.
پەڵخوورد: شتی نیوە وردکراو. پەڵخوردبوون: نیوە وردبوونی شت. (پەڵخوردکردن) نیوە وردکردنی شت.
پەلک: پرچ. گەڵای درەخت و گوڵ (ه). لقی درەخت. داری پەڵک (ز).
پەڵک: درەختێکی باڵابەرزی ئەستوورە گەڵای لە گەڵای گوێز دەچێ. پێڵووی چاو (د).
پەلکدار: ئاسنێکی دووپەلی لووت تیژە نەخش و کێڕی پێ دەکێشرێ.
پەلکردن: بڕین و بەیکردن.
پەلکوتان: دەست کوتانی کوێر یا چاوساغ لە تاریکیدا. بریتییە لە ڕەنج و هەوڵدان.
پەلکە: پرچی هۆنراوە.
پەلکەڕەنگینە: پەلکەزێڕینە.
پەلکەزێڕینە: شتێکی ڕەنگاوڕەنگی کەوانەییە پەیدا دەبێ لەسەر ڕووی هەور بەهۆی تیشکی ڕۆژەوە کە دەدا لە دڵۆپی بارانەکەی و، حەوت ڕەنگی لێ بەدی دەکرێ، بنەوشەیی، لاجیوەردی، شین، سەوز، زەرد، پرتەقاڵی، سوور.
پەڵگرک: با. مەقاش.
پەڵماو: ئاوساو.
پەل و پۆ: لق و پۆپی دار و درەخت. پەڕ و باڵی باڵندە. بریتییە لە وەچە و نەتەوەی زۆر.
پەڵۆخ: پۆخڵ.
پەڵۆش: پەڵۆشە.
پەڵۆشە: بنکە گیایەکی ئەستوور و درێژە و قژقژاوییە، دەردەهێنرێ و بەدەست شی دەکرێتەوە و دەکرێ بەچاوگی ئاگر. گەوون.

پەڵوو: پەڵوولەیەکی بێ چەورییە دەکرێ بۆ کار و بەرخ.
پەڵوولە: جۆرە خواردەمەنییەکی شلە لە ئارد و ڕۆن دروست دەکرێ.
پەلە: دەستوبردی لە فرماندا، پەلە پەل: پەلەی یەک لە دوای یەک. داوێنی کاڵا (د). داوێنی شاخ و گرد (د). پەڕەی کاغەز (د) تای شت وەک تای بار و تەرازوو (د).
پەڵە: بارانێکی تێکراییە لە ناوەڕاستی پایزدا دەبارێ و دەغڵودان و گیای پێ دەڕوێ و جووتی پێ دەکرێ. پارچەیەک لە هەور یا لە دەغڵ یا لە هێندێ شتی تر: (پەڵە) یەک بێستان یا تووتنم هەیە. خاڵێکی گەورە یا پچووکە لە کاڵا یا لە جەستە کە لە ڕەنگی کاڵا و جەستەکە نەبێ و تازە لێی پەیا بووبێ. پەڵە (د).
پەلەپچوڕکێ: پەلەپەلکردن بۆ خۆ ڕزگارکردن لە شتێک.
پەلەپرووزکێ: پەلەپچوڕکێ.
پەلەپرووزە: پەلەپچوڕکێ.
پەلەپرووزێ: پەلەپرووزە.
پەلەپرووسکە: پەلەپرووزە.
پەلەپرووسکێ: پەلەپچوڕکێ. خۆکوتان بۆ گەیشتن بەشتێک: بە(پەلەپرووسکێ) لە تینواندا خۆم گەیاندە کانییەکە.
پەلەپسکێ: د. باڵە شۆڕێ.
پەلەپفە: نانێکی تیرییە کە بەئاگر گەرم بکرێتەوە بۆ ئەوەی سووربببێتەوە و ناسک ببێ.
پەلەپیتکە: شت هاویشتن بەپەنجەی دۆشاومژەی هەردوو دەست. پڵتۆک: پێی تفەنگ و دەمانچە کە پەنجەی دەخرێتە سەر و ئاگر دەدرێ.
پەلەپیتک: د. پەلەپیتکە.
پەلەتک: پارچەیەکی درێژە لە گوریس یا گوش یا شتێکی تر.
پەلەخ: با. شوێن پووش و پاوەن.
پەلەسیسە: جۆرە نەخۆشییەکە لە مێو دەدا، هێندێ پەلی سیس دەکا.
پەلەفرتکێ: پەلەقاژە.
پەلەفرتێ: پەلەفرتکێ.
پەلەفرتە: پەلەفرتکێ.
پەلەقاژە: چنگ قژکردنەوە و شاڵاوبردن لەکاتی زۆر بۆ هاتندا.
پەلەکردن: خێراکردن لە کارێکدا.
پەلەکوتێ: دەست کوتانی کوێر یا چاوساغ لە تاریکیدا.
پەلەنگ: ل. پڵنگ.
پەلەور: باڵندە.
پەلەورگ: پارچە ورگی ئاژاڵ.
پەلەوەر: پەلەور.

پەڵیک: با. خواردەمەنییەکە کە بووبێ بەپەسیسە.
پەم: د. بم.
پەمبی: با. پەموو.
پەمگ: لۆکە.
پەمڵەپڕێ: د. تفەنگێکە داگیرابێ بەباڕوت و پەڕ و بەبێ گوللە.
پەموانە: تۆوی لۆکە.
پەموو: گیایەکە دەچێنرێ قاوخێک دەردەکا لە پایزدا بەقەد گوێزێک، ناوەکەی پڕە لە لۆکە.
پەموودانە: پەموانە.
پەمووره: شتێکە ژنان بۆ جوانی دەیکەنە پێیان لە زێڕ یا لە زیو یا لە زەنگیانە و موورروو.
پەمە: د. پەمگ.
پەمەتۆمە: ھ. پەموانە.
پەمەدانە: د. پەموانە.
پەمەیی: ئاڵی ڕووناک.
پەمیان: ئاوسان.
پەمین: د. ئاوسان.
پەن: د. پەند. کەتن.
پەنا: قوژبن و پەشێو. بریتییە لە داڵدە: فیسار کەس (پەنا) یە بۆ لێقەوماوان.
پەنابات: جۆرە دراوێکی کەم نرخە.
پەناباد: پەنابات.
پەنابردن: هانابردنی لێقەوماوێک بۆ لای یەکێک بۆ کارێک.
پەنابەر: کەسێکە پەنا ببا بۆ یەکێک.
پەناپەسێو: سووچ و قوژبنێکە کە لەبەر چاو نەبێ.
پەناگا: د. داڵدە.
پەناگرتن: خشتبوونی مانگ و هەڵاتنی بەجۆرێک کە بکەوێتە دوای ئاوابوونی ڕۆژ. چوونە پەنا و داڵدە.
پەناگە: د. پەناگا.
پەنام: د. ئاوساو. خۆحەشاردان.
پەنامگا: د. مەکۆی خۆحەشاردان.
پەناهێنان: هاناهێنانی لێقەوماوێک بۆ لات بۆ پاراستنی.
پەنای بێدەنگ: یارییەکە کۆمەڵێک بەگردی دادەنیشن، وەستاکەیان لە یەکێکیان دەدا ئەویش لەوەی تەنیشتی خۆی دەدا، هەر بەو جۆرە تا دەگاتەوە لای وەستاکە.
پەنجا: ناوە بۆ ژمارەیەک کە پێنج دەیە.
پەنجاهەم: شتێکە کە لە پایەی پەنجادا بێ.
پەنجاهەمین: پەنجاهەم.
پەنجایی: دراوێکی زیوینە بە پەنجا فلس دەچێ.
پەنجوولە: د. چەپۆڵە.
پەنجە: ئەموست.
پەنجەتووتە: پەنجەی پچکۆلەی دەست و پێ.
پەنجەر: د. پەنجەرە.
پەنجەرە: شتێکی چوارچێوەدارە بۆ ڕووناکی دەخرێتە کەلەبەری ژوورەوە. چەند کونێکە دەکرێتە تۆپی ئاشەوە بۆ ئەمەی کە زبانەی (پەرە)ی پێدابکرێ.
پەنجەشیر: ز. شێرپەنجە.
پەنجەکێشیی: کولێرەیەکی درێژکۆلەیە کە لەکاتی پێوەدانی بەتەنووردا پەنجەی پێداهێنرابێ بەجۆرێک کە جێگا پەنجەکان لە کولێرەکەدا چاڵ ببێ.
پەنجەی مریەم: گیایەکە وەک پەنجەی دەست.
پەنچ: با. چنگی دڕندە.
پەنچک: پەترۆک.
پەنچەر: تایە و چووپی ئۆتۆمۆبێل و پایسکل و شتی ترە کە کون بووبێ. (پەنچەربوون) کونبوونی تایە و چووپی ئۆتۆمۆبێل و پایسکل و شتی تر.
پەند: ئامۆژگاری.
پەندپێدان: بریتییە لە تەڕنکردن بەیەکێک.
پەندەمووسکردن: وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بەنووستنی یەکێک: (پەندەمووس) کە یا (پەندەمووس)ی کرد واتە نووست.
پەنک: ز. ریسێکە کە لەسەر ماشەر هەڵکرابێ.
پەنگ: پەند. مەنگ.
پەنگاو: پۆنگاو.
پەنگ پێدان: پەندپێدان.
پەنگخواردنەوە: پۆنگخواردنەوە.
پەنگر: پشکۆ ئاگر.
پەنگرکێش: مەقاش.
پەنگل: پەنگر.
پەنگلکێش: پەنگرکێش.
پەنمان: ئاوسان.
پەنمین: ئاوسان.
پەنهان: شتی ونی نادیار.
پەنهانی: وتنی گوفتار و کردنی کردارێک بەڕەنگێک ئەوی کە بتەوێ لێی بشاریتەوە نەیزانێ.
پەنەرشکە: د: نووسەنەک.
پەنەرێشکە: د. پەنەرشکە.
پەنەمیان: ھ. ئاوسان.
پەنەمیاو: ھ. ئاوساو.
پەنەمین: ئاوسان (ھ). پەندە مووسکردن (د).

پەنی: با. پڵ. (پەنی پەنی) شتی پڵپڵ.
پەنێر: پەنیر.
پەنێرۆکە: پەنیرۆکە.
پەنێرە: پەنیرە.
پەنیر: خواردەمەنییەکە لە شیر دروست دەکرێ و بەهەوێن دەمەیەنرێ.
پەنیرۆکە: گیایەکی گەڵاباریکە گوڵێکی پچووک دەگرێ شتێکی سپیی تێدایە وەک پەنیر وایە دەخورێ.
پەنیرە: دەغڵێکە کە شیرەی وەک پەنیری لێ هاتبێ: دەغڵەکەم (پەنیرە) بووە. تۆڵەکە (د).
پەوکی: هـ. وتەیەکە بەکاردێنرێ لەباتی وتەی (بۆیە).
پەهن: ز. پان.
پەی: وردە دەماری جەستە کە بەئەندامدا بڵاوبوونەتەوە و جەمسەریان بەمێشکەوەیە. پیتی پرسیار لە هۆی شت: (پەی) چێش واتە بۆچی (هـ). لای پشتەوە لە هەموو شت (ز). شوێن ئەتەر: (پەی) هەڵگرتووە واتە شوێن ئەتەری هەڵگرتووە (د). بن و بێخ: (پەی) هەیە یا (پەی) نییە.
پەیا: پەیدا. پیادە (ز).
پەیاپەی: پەی دەرپەی.
پەیام: دەنگوباسێکە کە بنێردێ بۆ یەکێک.
پەیامبەر: کەسێکە کە پەیام ببا.
پەیامنێر: کەسێکە کە دەنگوباس بنێرێ بەملا و بەولادا.
پەیبردن: د. پەی پێ بردن.
پەی پێ بردن: دۆزینەوەی شتی شارراوە یا شتی زۆر ورد و گران: فیسارکەس (پەی برد) بەو شتەی کە لێی شاردراوەتەوە یا بەو فێڵەی کە لێی کرابوو.
پەیتاپەیتا: پەستاپەستا.
پەیتووکە: باڵندەیەکی وریای چوست و چالاکە.
پەیجۆ: کەسێکە کە جوست و جۆ بکا لە شتێکدا.
پەیجۆر: پەیجۆ.
پەیجۆری: جوست و جۆکردن.
پەیجوور: پەیجۆر.
پەیخام: پەیام. کەسێکە کە پەیامت بۆ بێنێ.
پەیخامبەر: پێغەمبەر.
پەیخەمبەر: پێغەمبەر.
پەیدا: شتی دیاری ئاشکرا. (پەیدابوون) دیاردان و دەرکەوتن. (پەیداکردن) دەرخستن و دەردەستکردن.
پەیدان: ڕێدانی ئاو بۆ پێدا پەڕینەوەی: ئەم ئاوە (پەی دەدا) یا (پەی نادا).
پەیدەرپەی: پەیاپەی.
پەیڕەو: کەسێکە کە لە گوفتار یا کردارێکدا چاو لە یەکێک بکا. (پەیڕەویکردن) چاوکردن لە یەکێک لە گوفتار یا کرداریدا.
بەیزەن: گیاندارێکە لە ڕۆیندا قاچی لە یەک بکەوێ.
پەیزەنی: پێ لە پێدان لە ڕۆیندا.
پەیژە: دوو داری درێژی پلەپلەیە مەردوومی پێدا سەر دەکەوێ بۆ جێی بەرز.
پەیغام: پەیخام.
پەیغەمبەر: پێغەمبەر.
بەیغەمەر: پێغەمبەر.
پەیڤین: ز. قسەکردن.
پەیک: کەسێکە نامەی مەردووم ببا بۆ خاوەنی. ئەستێرەیەکە لە هێزی کێشندەدا بەدوای ئەستێرەیەکی گەورەتر لە خۆیەوە بێ وەک مانگ بۆ زەوی. بریتییە لە بەردەستێکی پچووک کە هەمیشە لە گەورەکەی جیانەبێتەوە.
پەیکار: پەیکان. جەنگ و ئاژاوە.
پەیکان: نووکێکی تیژی ئاسنینە دەکرێ بەسەری تیر و ڕمەوە.
پەیکردن: برین و داهێنانی شتێک: فیسارکەس ڕەزەکەی (پەی کرد).
پەیکوڵ: گیایەکی بەهاریی بۆرە تەرزە فرێی دەدا و دەنکێکی درکاوی دەردەکا.
پەیمان: بەستنی شتێک لە ناوەندی دوو کەس یا دوو دەوڵەتدا: من و تۆ پەیمانی برایەتیمان بەستووە.
پەیمانە: پەیمان. پێوانە.
پەیوەس: د. پەیوەست.
پەیوەست: شتێکە کە بەشتێکی ترەوە نووسابێ. (پەیوەستبوون) نووسانی شتێک بەشتێکی ترەوە. (پەیوەستکردن) نووساندنی شتێک بەشتێکی ترەوە.
پەیوەستی: نووساوی شتێک بەشتێکی ترەوە.
پەیوەند: پەیوەستی و ئاشناییی دوو شت بەیەکەوە.
پەیوەندکردن: موتوربەکردنی درەختێک لە درەختێکی تر.
پەین: پیسیی وڵاخی بەرزەی یەکسم.
پەینجە: پەیژە.
پەینچی: کەسێکە کە هەر پەین کۆ بکاتەوە بۆ سۆختی حەمام.
پەینکە: ئاردێکە دەکرێ بەگونکەوە لەکاتی کردنەوەیدا بەنان.
پەینکێش: پەینچی.
پێ: ئەندازەیەکە لە قاچ کە دەچێتە ناو پێڵاوەوە. پیتی سێیەم لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. دارێکە سەرێکی لە ژێرەوە دەبەسترێ بە(خوانکەی) ئاشەوە و سەرەکەی تری بەدەرەوە دەبێ بەرداشی پێ بەرز و نزم دەکرێتەوە. پەلەپیتکەی چەک. کەسێکە کە بەڕۆژوو بێ: ئیمساڵ فیسارکەس (پێ)یە واتە

بەرۆژووە. وتەیەکە بەمەعنا (لەگەڵ) بەکاردێنرێ: فیسارکەس پارەی (پێ)یە. وتەیەکە بەمەعنا (بە): (پێ)ی بڵێ واتە بەو بڵێ.
پیابردن: بردنی شتێک بەناو شتێکدا.
پیاپەڕیگ: د. بریتییە لە شێت و دێوانە.
پیاچزان: چزانی شوێنێک لە ئەندام بەشتێکی داخدا.
پیاچزاندن: چزاندنی شوێنێک لە ئەندام بەشتێکی داخدا یا چزاندنی شتێکی داخ بەجەستەدا.
پیاچوون: چوونی شتێک بەناو شتێکدا.
پیاچوونەوە: وتنەوەی شتێک لەبەر یا لەناو نووسراودا: بەدەرسەکەتدا پچۆرەوە. دووبارە پاتکردنەوەی هەموو شتێک: ئەم دروومانە یا ئەو گەچکارییە (پیابچۆرەوە) واتە بەسەریدا برۆرەوە.
پیاچەقاندن: چەقاندنی شتێک بەشتێکدا.
پیاچەقین: چەقینی شت بەشتێکدا.
پیادان: ماڵینی شتێک بەشتێکدا: دارێکی (پیا دا). داپۆشینی شتێک بەشتێک: لێفەکەی (پیا دە). بریتییە لە شەق هەڵدان لە یەکێک: هەر کە دی دەستی کرد بە(پیادان)ی. بریتییە لە دزینی شتێک: هەرچی بەردەست کەوێ (پیا دەدا).
پیادروون: دروونی شتێک بەسەر شتێکی تردا.
پیادە: کەسێکە کە بەپێ بڕوا. داشێکە لە یاری شەترەنجدا. بریتییە لە مەردوومی کەودەنی نەزان لە کارێکدا: فیسار کەس لە خوێندندا (پیادە)یە واتە هیچ نازانێ.
پیادەیی: بوونی مەردووم بەپیادە.
پیاڕاگەیاندن: دابەشکردن و گەیاندنی شتێک بەشتێکدا بەکەموکوڕی: ئەم چێشت و نانە بەمیوانەکان (ڕاگەیەنە) لە کاتێکدا کە نانەکە کەم و میوانەکان زۆربن. فریاخستنی شتێک بەشتێکدا بەچالاکی: ئەم ئاوە (ڕاگەیەنە) بەو ئاگرەدا واتە زوو بیگەیەنە ڕێ و پێی بکوژێنەرەوە.
پیارزک: پریاسکە.
پیاز: گیایەکی توونە دەچێنرێ، بنکێکی خڕی توێ توێی هەیە، چەند گەڵایەکی کلۆر دەردەکا.
پیاراو: جۆرە گۆشتاوێکە کە بەشی زۆری پیاز بێ.
پیاز پاکردن: بریتییە لە ڕووپامایی کردن بۆ یەکێک.
پیازۆکە: گیایەکی کوێستانیی بەهارییە سەلکی وەک پیازی فیسقە و گەڵای وەک (کنیواڵ) وایە بەڵام ئەم هەر لە شاخدا دەڕوێ.
پیازەخووگانە: گیایەکی کێوییە لە پیاز دەچێ بەڵام ئەم ناخورێ.
پیازی: شتێکە کە ڕەنگی وەک پیاز وابێ.
پیاساوین: پیاسوون.
پیاسوون: هەڵسوونی شتێک بەشتێکدا.
پیاسە: ڕاوێچکە.
پیاکردن: کردنی شتێک بەناو شتێکدا.
پیاکێشان: ماڵینی شتێک بەشتێکدا.
پیاگ: پیاو.
پیاگرتن: گرتنی شتێک بەڕووی شتێکی تردا.
پیاگەیاندن: فریاخستنی شتێک بەشتێکدا.
پیاگەیشتن: فریاکەوتنی شتێک بەشتێکدا.
پیاگێڕان: گێڕانی شتێک بەسەر شتێکدا.
پیاڵە: دەفرێکە لە شووشە، ئاو و چای و هێندێ شتی تری پێ دەخورێتەوە.
پیاماڵین: ماڵینی شتێک بەشتێکدا.
پیان: پیادەیی لە ڕۆیندا.
پیانان: دانانی شتێک لەسەر شتێک بەنهێم.
پیانۆ: پیانوو.
پیانوو: پارچەیەکە لە پارچەکانی مۆزیقە.
پیانووسان: لکانی شتێک بەشتێکدا.
پیانووساندن: لکاندنی شتێک بەشتێکدا.
پیاو: ئادەمیزادی نێرینە کە لە منداڵی تێپەڕیبێ. بریتییە لە مەردوومی جوامێری مەرد: فیسار کەس زۆر (پیاو)ە. نۆکەر: نەریمان (پیاو)ی جوامێرە.
پیاوانە: کردەوە یا شتێکە کە هەر لە پیاو بوەشێتەوە.
پیاوچاک: مەردوومی خواپەرستی بێ زیان.
پیاوخراپ: مەردوومی بەزیانی ستەمکار.
پیاوفرۆش: بریتییە لە ئافرەتی زمان لووسی بەفڕوفێڵ.
پیاوەتی: مەردایەتی.
پیاهاتن: باسکردنی شتێک بەدوورودرێژی: فیسار کەس (بەباسی فیسارە شتدا هات). هاتنی شتێک لە شوێنێکەوە: ئەم ڕێگایە (پیاهاتووم) یا ئەم جۆگەیە ئاوی (پیاهاتووە).
پیاهاتنەوە: پیاچوونەوە.
پیاهانین: هێنانی شتێک بەشتێکدا.
پیاهاڵپژان: هەڵپژانی شتێک بەشتێکی بەرزدا.
پیاهەڵپژاندن: هەڵپژاندنی شتێک بەشتێکی بەرزدا.
پیاهەڵپەڕین: هەستان و ئاوقەدبوونی یەکێک بەیەکێکدا. پیاهەڵپژان.
پیاهەڵپەساردن: هەڵپەساردنی شتێک بەشتێکدا.
پیاهەڵتەقان: پیاهەڵپەڕین.
پیاهەڵتەقین: پیاهەڵتەقان.

پیاهەڵچوون: هەڵگەڕانی گیاندار یا تەرزی سەوزایی بەشتێکی بەرزدا.
پیاهەڵچەقین: چەقینی شتێکی تیژ بەشتێکی تردا.
پیاهەڵخزاندن: پیاهەڵخوێندن.
پیاهەڵخوێندن: هاتن بە تانی یەکێکدا بەخراپی.
پیاهەڵدان: هاتن بە تانی یەکێکدا بەباشی.
پیاهەڵڕوانین: سەر بەرزکردنەوە و تەماشاکردنی شتێکی بەرز.
پیاهەڵزنین: هەڵگەڕانی گیاندار بەشتێکدا.
پیاهەڵسپاردن: پیاهەڵپەساردن.
پیاهەڵشاخان: تووڕەبوون و قسەی ناخۆش وتن بەیەکێک و تەریق کردنەوەی.
پیاهەڵشاخین: پیاهەڵشاخان.
پیاهەڵکاڵان: پیاهەڵشاخان.
پیاهەڵکاڵین: پیاهەڵشاخین.
پیاهەڵگەڕان: پیاهەڵچوون.
پیاهەڵمیزان: میزکردن بەپێوە بەقەد شتێکی بەرزدا.
پیاهەڵمیزتن: پیاهەڵمیزان.
پیاهەڵمیزین: پیاهەڵمیزان.
پیاهەڵنان: پیاهەڵپەساردن.
پیاهەڵواسین: هەڵواسینی شتێک بەشتێکی بەرزدا.
پیاهێنان: پیاهانین.
پێباز: بەردەباز. ناوە بۆ ناوچەیەک لە گوێ ڕووباری سیروان.
پێبازە: گیایەکە گەڵای وەک پێی باز وایە.
پێبڕان: بەرکەوتنی بەشێک بەکەسێک: منیش ئەمەم (پێ دەبڕێ) واتە بەرم دەکەوێ.
پێبژیو: ئازووقەیەکە کە مەردووم پێی بژی.
پێبوون: بەرۆژووبوون.
پێبەتاڵ: پێڵاوی گەورەی فراوان.
پێبەدارە: ئێسقانێکە بەدەم ڕان و قوڵی گیاندارەوە سەرەکەی وەک چاکڵ وایە.
پێبەقنگە: دەعبایەکی ئاویی پێ پەڕەدارە وەک مراوی بەڵام ئەم پچووکترە.
پێپلیکانە: پێپیلکە.
پێپیلکە: چەند پلەیەکە لە بەرد و قوڕ یا لە تەختە و دار دروست دەکرێ بۆ پێدا سەرکەوتن لە نزمایییەوە بۆ بەرزایی.
پێ پێوەنان: بریتییە لە ڕۆین بە چالاکی.
پێت: ز. بڵێسەی ئاگر.
پێتاو: پارچە تەنراوێکە لە پێوە دەپێچرێ و کالای لەسەر لە پێ دەکرێ.
پێتاوە: د. پێتاو.
پێتەتە: دوو تەختەیە لەناو پێچاڵدا جۆڵا پێی دەخاتە سەر و بەرز و نزمی دەکاتەوە.
پێتەک: ز. شتێکی کەم.
پێتەک: کەلوپەلێکە لەگەڵ بووکدا دەنێردرێ بۆ ماڵی زاوا.
پێتێ: ز. وتەیەکە وەک وتەی (کچێ) و (کەنی) ژنی پێ بانگ دەکرێ.
پێجامە: جۆرە کالایەکە لەکاتی نووستن و حەسانەوەدا لەبەر دەکرێ وەک چاکەت و پانتۆڵ وایە بەڵام ئەم بێ بەرە.
پێچ: چەوتی و خواری لە هەموو شتێک: ئەم ڕێگایە (پێچ)ی تێدایە. (پێچ پێچ) شتێکە کە پێچی زۆری تێدابێ. سەرپێچ: فیسار کەس (پێچ)ی جوان دەبەستێ.
پێچاڵ: چاڵێکە لەکاتی کارکردندا جۆڵا قاچی تێدا شۆڕ دەکاتەوە و ئاسنگەر تێیدا دەوەستێ.
پێچان: ئاڵاندنی شتێک لە شتێکی تر. زۆر بۆ هێنانی یەکێک بۆ یەکێک لەسەر شتێک: فیسار کەس (پێچامی).
پێچاندن: ئاڵاندنی شتێک لە شتێکی تر.
پێچاندنەوە: پێچانەوە.
پێچانن: پێچاندن.
پێچانەوە: قەدکردن و لوولکردنی شت. بریتییە لە شاردنەوەی قسە لە یەکێک: ئەو قسەیەم لێ (مەپێچەوە).
پێچاوپێچ: شتی پێچ پێچ.
پێچیان: بادانی شتێک. بریتییە لە دەربازبوون و خۆ گومکردن: فیسار کەس لەلام بوو ئەوەندەی نەبرد (پێچێکی پیادا) و دەرچوو. بریتییە لە سووڕدان.
پێچ پیاهاتن: ژانێکە لەناو سکدا پەیدا ببێ و بجووڵێ و پێچ بخوا.
پێچپێچۆکە: شتێکە کە پێچی زۆری تێ کەوتبێ.
پێچخواردن: لوولبوون و با خواردنی شتێکی درێژ لە خۆیەوە.
پێچدان: لوولکردن و بادانی شتێک.
پێچران: ئاڵان و پێچخواردن.
پێچراو: شتێکە کە پێچ درابێ.
پێچراوە: شتێکە کۆکرابێتەوە و پێچرابێ.
پێچک: گوڵۆڵە: (د) پێچکە.
پێچکردنەوە: لادان لە ڕێڕەودا بەلای ڕاست یا بەلای چەپدا.
پێچکە: دەست و پێی ئاژاڵی وردە. پێی تەخت و کورسی و شتی تر.
پێچ لێدان: بریتییە لە فێڵکردن و قوماربازی.
پێچ و پلووچ: شوێنێک یا شتێکە کە نارێک بێ و پێچی زۆری تێدابێ.
پێچ و پەنا: شوێنی نارێکی پێچ و پلووچ.

پێچۆلەکە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک کەرەوز وایە گوڵێکی زەردی پچووک دەگرێ.
پێچوون: مانەوەی کەسێک لە کردنی کارێکدا. فیسار کەس لەو کارەدا زۆری (پێ چوو). تەریقبوونەوە: فیسار کەس بەقسەکە (چوو) واتە زۆر تەریق بووەوە. مردنی یەکێک بەدەردێک: فیسار کەس گرانەتێی گرت و (پێی چوو).
پێچە: پەچەی ڕووپۆش.
پیچەک: ز. شتی کەم.
پێچەک: شتێکە کە شتی تری پێ بپێچرێتەوە.
پێچەکولوو: لۆکەیەکی کراوەیە کە پارچە پارچە کرابێ بەدرێژکۆلەیی بۆ ئەوەی کە بەخەرەک برێسرێ.
پێچەڵپاچ: گوفتار یا کردار یا شتێکی نارێکی نالەبار.
پێچەڵپێچ: پێچەڵپاچ.
پێچەن: پێچانەوەی دەوار بەدوو بەش بۆ بارکردنی. ئیشک. دارێکە ڕیسی لەسەر هەڵدەکرێ (د).
پێچەوانە: شتی پاش و پێش یا ئاوەژوو.
پێچیاگ: د. پێچراو.
پێچان: پێچران.
پێچیاو: پێچراو.
پێخاووس: مەردوومی بێ پێڵاو.
پێخستن: پەککەوتن لە ڕێ ڕۆیندا لەبەر ماندوویەتی.
پێخواس: پێخاووس.
پێخۆر: شتێکە کە بەنانەوە بخورێ.
پێخۆست: شوێنێکە کەزۆر بەسەریدا ئامشۆ بکرێ.
پێخۆشبوون: دڵخۆشبوون بەشتێکی خۆش. خۆشبوون بەناخۆشیی یەکێک.
پێخۆشحاڵ: کەسێکە بەشتێک دڵخۆش بێ.
پێخولە: منداڵی پێرەوکە.
پێخوێ: کۆمەڵێک لە قوڕی گیراوە. خەرمانێکە کە گێرە کرابێ و شەن نەکرابێ.
پێخەسوو: بەربووک.
پێخەف: نوێنێکە کە مەردووم پێی بنوێ.
پێخەنین: پێکەنین.
پێدان: دانی شتێک بەیەکێک.
پێدزکێ: هەنگاو پچووککردنەوە و خۆ دواخستنی یەکێک لە هاوڕێی لە ڕێ ڕۆیندا.
پێدزە: پێدزکێ.
پێدەشت: عاستی تەختی لە داوێنی کەژ و کێو.
پێر: پێرێ.
پێرار: دووساڵ لەمەوپێش.
پێرارەکە: پێرار.
پێران: د. وەناق.
پێرەوک: پێرەوکە.
پێرەوکە: منداڵێکە تازە کەوتبێتە سەر پێ.
پێروو: کۆمەڵە ئەستێرەیەکە کە پێی دەڵێن (کۆ).
پێرەکە: پێرێ.
پێرێ: دوو ڕۆژ لەمەوپێش.
پێرێ شەو: دوو شەو لەمەوپێش.
پێز: کەشی هەویر: ئەم هەویرە بە(پێزە).
پێزانین: زانینی شتێکی شاراوە. لەبەرچاوبوونی چاکەی یەکێک.
پێزە: د. کەمێک لە شتێک. گەوهەری یەکدانە.
پێس: د. پێست.
پێست: چەرمی سەر ئەندامی گیاندار.
پێسترک: با. پەنجەرە.
پێستە: پێستی گیراوەی گیاندار.
پێسە: بێزە. پێستە (د). وەها (ه).
پێسیر: ز. گیرفانی بەرباخەڵ.
پێسیرە: ز. بەرسیلە.
پێش: بەردەم. کاتی ڕابردوو: (پێش) نیوەڕۆ هاتم.
پێشانگ: د. پێشەنگ .
پێشانی: ناوچەوان.
پێشاو: بریتییە لە ئاودەستخانە.
پێشبار: چەند بارێکە لەپێش ماڵ و کۆچدا بنێردرێ بۆ هەوارگە.
پێشبەست: بەرهەڵستێکە لەبەردەمی ئاودا دروست بکرێ.
پێشبەند: زنجیرێکە دەکرێتە دەستی وڵاخەوە.
پێشتەرکی: جۆرە فیشەکبەندێکە بەسەر قەڵبووسی زیندا شۆڕ دەکرێتەوە و بەقایش و ئاوزوونە بەند دەکرێ.
پێشخانە: د. جێی چاوەڕوانی کردن (صالون انتظار).
پێشخڕ: د. سەوزخڕ.
پێشخزمەت: نۆکەر.
پێشخستن: خستنەپێشەوەی شتێک.
پێشخۆر: د. پارەیەکی پێشەکییە لە دوای کڕین و لە پێش وەرگرتندا دەدرێ.
پێشدار: چەند کەسێکن لەپێش لەشکرەوە دەڕۆن.
پێشدەستی: دەستپێشکەری.
پێشڕەو: پێشدار.
پێشقلیان: بەرقلیان.
پێشک: ز. پاشەڵ.
پێشکار: د. یارمەتیدەر (معاون).
پێشکۆ: قەڵپووزی زین.

پێشکە: با. مێشوولە.
پێشکەشکردن: دانی شتێک بەیەکێک بەخۆڕایی.
پێشکەوتن: چوونە پێشەوە.
پێشکەوتوو: کەسێکە چووبێتە پێشەوە.
پێشمامان: ئافرەتێکە لەبەردەمی زەیستانەوە دادەنیشێ بۆ لەنگەرگرتنی لەکاتی منداڵبوونیدا.
پێشمەرگ: پێشمەرگە.
پێشمەرگە: چەند کەسێکن لەپێش لەشکرەوە دەنێردرێن بۆ جوست و جۆ و تاقیکردنەوەی ڕێگا.
پێشنوێژ: بەرنوێژ.
پێشنوێژی: نوێژکردنی بەرنوێژ (إمام) بۆ مەردووم.
پێشنیار: سەرەتایەکە بەتایبەتی بۆ نووسراوێک بنووسرێ.
پێشنیاری: پێشنیار.
پێشواز: بەپیرەوەچوون.
پێشوازی: پێشواز.
پێشۆر: لێوارێکە لەناو حەوزدا پێی دەخرێتە سەر.
پێشوو: شتی ڕابردووی کۆن. مێشوولە (ز).
پێشوولە: مێشوولە.
پێشە: ئێسقان. ناوکی ڕەقی میوە. پیشە (د).
پێشهاتن: د. ڕێکەوت.
پێشەخۆرە: د. هوما.
پێشەقان: بێڵەکانێکە سەرەکەی ئاسن بێ.
پێشەکی: وتن یا کردنی کارێک لەپێش کاتی خۆیدا: (پێشەکی) بەڵێن مەدە.
پێشەنگ: وڵاخێکی شۆخ و شەنگی جوانی بەنرخە پێش کاروان دەخرێ.
پێشەوا: کەسێکە کە بەرنوێژی بکا. زانای گەورەی وەها کە مەردووم پەیڕەوی بکەن.
پێشێل: شوێنێکە کە بەهۆی هاتوچۆی زۆرەوە بەسەریدا شێلرابێ.
پێشی: مێشوولە (با). بەردەم (ز).
پێشین: لەمەپێش: (پێشین) پێم وتی ئەم کارە مەکە. شتێکە کە پێشەکی بدرێ (سلفە).
پێشینان: باو و باپیری کۆنی ڕابردووی هۆزێک.
پێشینیان: پێشینان.
پێغەمبەر: کەسێکە لەلایەن خواوە بەڕابەر و پێشەوا نێردرابێ بۆ سەر مەردووم لەگەڵ چەند دەستوورێکی جواندا بۆ ئەوەی کە بیانگێڕێتەوە لە خراپە و بیانبا بۆ چاکە.
پێغەمەر: پێغەمبەر.
پێغەمەر: پێغەمبەر.

پێقۆتکە: هەڵپەڕکێی گەرم. سەرچڵی و هەڵبەز هەڵبەز.
پێقەلە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک کەڵەوێ وایە تامی گەڵاتوور دەدا.
پێک: ئەندازیەکە لەو شتانەی کە دەخورێنەوە و سەرخۆشی دەدەن کە بکرێنە ناو پیاڵەوە بۆ خواردنەوە.
پێکان: لە شتدان بەتێگرتنی شتێک بۆی. بریتییە لە دۆزینەوەی مەبەست لە نووسراوێکی گرانی نادیار: مەعنای شیعرەکەی نالیم (پێکا).
پێکانین: پێکهانین.
پێکاهاتن: هاتوچۆکردنی چەند کەسێک بەناڕێکی و پەرێشانی.
پێکراو: ئەنگێوراو.
پێکرا: تێکرا.
پێکمانەوە: وتەیەکە دەبێژرێ لە وەرامی یەکێکدا کە جەژنە پیرۆزەت لێ بکا کە خۆشی هاوبەش بێ لەو جەژنەدا واتە جەژنی هەردووڵامان پیرۆزبێ.
پێکورە: بەچکەی باڵ نەگرتووی کوللە. بریتییە لە پیادەی لەشکر. بریتییە لە دەست و پێوندی یەکێک.
پێکهاتن: جێبەجێبوونی شتێک.
پێکهانین: جێبەجێکردنی شتێک.
پێکەنین: دەم کردنەوە و گەشانەوەیەکە لە دەم و ڕووی مەردوومدا پەیدا دەبێ بەهۆی بینین یا بیستنی شتێکی خۆشەوە.
پێکەوتن: ڕێکەوتن و دەستدانی شتێک بۆ شتێک: دەرمانەکەم (پێ کەوت).
پێکەوەبوون: لەگەڵ یەکدابوونی دوو شت.
پێکهێنان: پێکهانین.
پێکیان: ئەنگێوران: (پێکیام) واتە ئەنگێورام.
پێکێشان: سەر کێشانی کارێک بۆ کارێکی تر: ئەم کارە (پێ دەکێشی) بۆ زویری و دڵ یەشان.
پێگرتن: کەوتنە سەر پێی گیانداری ساوا.
پێگوتن: پێ وتن.
پێگەیاندن: گەیاندنی قسەیەک یا شتێک بەیەکێک. بەرهەمهێنان: منداڵەکە یا باخەکەی باش (پێ گەیاند).
پێگەیشتن: گەیشتنی شتی کاڵ لە میوە و چێشت و شتی تر. تووشبوونی دووگیاندار بەیەک: نەرێمانم پێ گەیشت. گەورەبوونی منداڵ بەڕەنگێک کە لە خەم بڕەخسێ. گەیشتنی مەردووم بەپایە و ئاواتی خۆی: فیسار کەس باش (پێ گەیشت). گەورەبوونی درەخت و سەوزی و هاتنەبەری: باخەکە یا بێستان و دەغڵەکە باش (پێ گەیشت).
پێگەیشتوو: شتێکە کە بەرهەم هاتبێ و پێ گەیشتبێ.
پێگەیگ: د. پێگەیو.

پێگەین: پێگەیشتن.
پێگەیو: پێگەیشتوو.
پیل: ز. شەپۆلی ئاو. ئەندازەیەکە لە کات کە بەرودوابێ.
پێڵ: کۆپارەی سەرملی گاجووت. شان و ملی مەردووم. پرد (د).
پێلا: د. پێلاو.
پێلاف: ز. پێلاو.
پێلاو: شتێکە لە ڕۆیندا لە پێ دەکرێ.
پیلکە: تیلکردنی هەڵمات بەپەنجە: فیسار کەس (پیلکە)ی راستە.
پێڵوو: قەراخی چاو کە برژانگی لەسەر دەڕوێ. پشکۆ ئاگر.
پێڵە: ڕەشەوڵاخێکە کە شاخی بۆ لای چەنەی هاتبێتەوە. مەردوومی بەدمەست (د). قۆزاخەی کرمی ئاوریشم (د). پێڵوو (د).
پێ لە زەوی نەکەوتن: بریتییە لە کەیفخۆشی.
پێلەقە: لەقە وەشاندن بەیەک پێ.
پێلەوار: پێڵەوار.
پێڵەوار: برەداری سووتاندنی ئەستووری گەورە.
پێ لێ برین: وازهێنان لە ئامشۆکردنی یەکێک.
پێ لێ پاراستن: چاودێریکردنی شتێک بۆ ئەوەی کە پێی پێدانەنێیت.
پێ لێ خستن: بریتییە لە چاوقوچاندن لە شتێک و لەسەر نەرۆینی.
پێ لێ داگرتن: بریتییە لە زۆرکردن لە کەسێک و میچ لەسەر گرتنی بۆ کارێک. دانەواندنی پێی ئاش بۆ ئەوەی کە ورد بهارێ.
پێ لێ راکێشان: بریتییە لە پشت دانەوە لە کارێک.
پێ لێنان: بریتییە لە ڕاستی وتنی شتێک. پێنان بەشتێکدا.
پێ لێ وەرگێڕ: تەنراوێکە لەکاتی تەنینیدا جۆڵا پێی بەلایەکدا وەردەگێڕێ ئیتر ئەو تەنراوە دووباد دەردەچێ.
پێ مریشکە: گیایەکی بەهاریی لق لقە لە چنگی مریشک دەچێ.
پێمەرە: بێڵ.
پێمەلە: جۆرە مەلەیەکە بەپێوە و بەجووڵاندنی هەردوو پێ دەکرێ.
پێمێو: با. دارێکە کە بدرێتە بەرمێو بۆ بەرزبوونەوەی.
پێنازین: خوڕین و نازین بەیەکێک.
پێناسین: ناسینی شتێک بەیەکێک.
پێناو: ڕێ و بۆنە: لە (پێناو)ی تۆدا دووچاری زیان بووم، واتە لە ڕێی تۆوە و بەبۆنەی تۆوە.
پێنج: ناوە بۆ ژمارەیەک کە لە ناوەندی چوار و شەش دایە.
پێنجتیر: تفەنگ و دەمانچەیەکە کە پێنج گوللە بخوا.
پێنج چاوگەی دڵ: د. پێنج هەستە (حەواسی خەمسە) کە بینین و بیستن و بۆنکردن و تامکردن و لێک کەوتنە.
پێنج خشتەکی: شیعرێکە کە سێ نیوە شیعری تری خرابێتە سەر و، دواییەکەیان لەسەر وێنەی دوایی نیو شیعری یەکەم بێ.
پێنجدەری: ژوورێکە کە پێنج پەنجەرەی لە ڕیز یەکەوە تێدابێ.
پێنج شەممە: پێنج شەموو.
پێنج شەموو: ڕۆژی شەشەی حەفتە لە هەینی بەدواوە.
پێنج شەمە: پێنج شەموو.
پێنجگا: ناوە بۆ جۆرە مقامێکی کوردی.
پێنجگۆشە: شتێکە کە پێنج سووچی ببێ.
پێنج گەنج: د. پێنج چاوگەی دڵ.
پێنج گەنجینە: د. پێنج گەنج.
پێنجوار: پێشبار.
پێنجە: ز. پەنجا.
پێنجەم: شتێکە کە لە پایەی پێنجدا بێ.
پێنجەمین: پێنجەم.
پێنجهەم: پێنجەم.
پێنجهەمین: پێنجەمین.
پێنجەیتار: پێنج ڕۆژە لە ناوەندی زستان و بەهاردا کە ساڵ تەواو دەبێ ئەم پێنج ڕۆژە دەمێنێتەوە. پێشینان ساڵیان بەدوانزە مانگ و مانگیان بە سی ڕۆژ داناوە، بەم پێیە ساڵ دەکاتە سێ سەد و شەست ڕۆژ، پێنج ڕۆژ دەمێنێتەوە لە ساڵی راستەقینە کە لەسەر هیچ مانگێک نییە.
پێنج یەک: لە پێنج بەش بەشێک.
پینکی: د. وەنەوز.
پینگ: پیشخواردنەوە. پونگە.
پێنۆکە: د. گیایەکی بۆنخۆشە گوڵێکی سپیی هەیە.
پێنوواندن: بەسەر هانینی کارە ڕەهاتێک بەسەر یەکێکدا لە تۆڵەی کردەوەیەکی خراپیدا: فیسار کەس سوێندی درۆ (پێی نوواند).
پێنەزان: سپڵە.
پێنەزانین: سپڵەیی.
پێواز: پێباز.
پێوان: ئەندازەگرتنی شتێک بەگەز یا بەبست یا بەشتێکی تر بۆ دەرخستنی پانی یا درێژییەکەی. پێوانەکردنی شتێک بەدەفر.
پێوانە: پێوان. (پێوانەکردن) پێوانی شتێک بەدەفرێک.
پێ و پل: قاچ و قول.
پێ و شوێن: شوێنپێی شتێک کە خۆی لە ئارادا نەبێ: (پێ و شوێن)ی دزەکەم هەڵگرت. بریتییە لە سۆراخکردن: کەواکەم دزرابوو چووم بە(پێ و شوێن)یەوە، واتە بۆ سۆراخکردنی.

پێ وتن: وتنی قسەیەک بەیەکێک.
پێوور: ز. ئەستێرەی کۆ.
پێورچە: گیایەکی کوێستانییە گەڵای وەک کاهوو وایە وڵاخ دەیخوا.
پێوشک: د. پاووشک.
پێوەبوون: گیرخواردنی شتێک بەشتێکەوە یا لە شتێکدا: بەم کارەوە چاک (پێوەبووم) یا ئەو گەماڵ و دێڵە (پێوەبوون). نیازکردنی شتێک: (پێوەم) بچم بۆ بەغدا.
پێوەچوون: ڕۆین بەدەم شتێکەوە: بوو بەهەرا منیش (پێوەچووم). چوونی شتێک بەشتێکەوە.
پێوەدان: گەستنی مار و چەقاندنی چزوودار چزووەکەی بەگیاندارا. جووتکردنی دەرگا و پەنجەرە. ناندان بەتەنوور و ساجەوە بۆ برژاندنی.
پێوەڕوێشتن: هەڵوەشان یا دڕانی شوێنێک کە کەمێک لە خۆیدا هەڵوەشابێ یا دڕابێ: کەواکەت بدرووەوە با لەوە زیاتر (پێوەنەڕوا). چوونی گیاندار بەدەم شتێکەوە.
پێوەرکردن: وێڵکردن.
پێوەژەنن: د. تێوەژەندن.
پێوەکردن: کردنی شتێک بەشتێکدا. بریتییە بە لە دووچارکردنی یەکێک بەچورتمێکەوە: چاک فیسار کەست (پێوەکرد).
پێوەن: د. پێوەند.
پێوەنان: نووساندنی شتێک بەشتێکەوە.
پێوەند: ئاسنێکی زنجیرداره دەکرێتە پێی بەندی و وڵاخەوە.
پێوەندکردن: پەیوەندکردن. کردنی پێوەند بۆ پێی گیاندار. چووز کردنی درەختێک لە درەختێکی تر.
پێوەنیشتن: ڕووکردن و چوونی مەردووم بەزۆری بۆ سەر شتێک: شایییەکە مەردوومی زۆری (پێوە نیشت). نیشتنی مێش و مەرۆش لە شتێک.
پێوەهاتن: هاتنی مەردووم بەدەم شتێکەوە: پرسەی فیسار کەس مەردوومی زۆری (پێوەهاتبوو). پێ و قوودووم چاکیی شتێک بۆ کەسێک: فیسار کەس خانووەکەی (پێوەهات).
پێویس: د. پێویست.
پێویست: کەسێکە کە شتێکی پێ بوێ: (پێویست)م بەدراوە. شتێکە کە پێت بوێ: دراو لە هەموو شت (پێویست) ترە.
پێویستی: نامانگوری بۆ شتێک.
پێهاتن: پێگەیشتن و بەخۆداهاتن. داننان بەشتێکدا (أعتراف).
پێ هەڵپەڕین: گەیشتنی برین بەیەکێک: ئەندامم برینی (پێ هەڵپەڕیوە).
پێ هەڵگرتن: بریتییە لە خێرا ڕۆین. هەڵگرتنی شتێک بەیەکێک.

پی: پیوو. پووک (با). وتەیەکە لە جیاتی وتەی (بەو) بەکاردێنرێ: وەشڵەی (پی) کەسەی، واتە خۆزگە بەو کەسە (ه).
پیبک: ز. بیبیلەی چاو.
پیبەر: ز. بیبەر.
پیپ: جۆرە دەفرێکی خڕی گەورەیە لە تەختە یا لە لەوح.
پیت: حەرف: فیسار کەس دوو (پیت) و لەتێکی خوێندووە. خێر و بەرەکەت: کشتوکاڵی ئیمساڵ بە(پیت)ە. پەنجە تووتە.
پیتاک: کۆکردنەوەی شت لەلایەن چەند کەسێکەوە بۆ باربوویی کردنی یەکێک. کۆکردنەوەی دراو لەلایەن چەند کەسێکەوە کە شتێکی پێ بکڕن بەهەموویان بیخۆن. پڕ و پیتی ناو ماڵ (د).
پیتدانەوە: خێردانەوە.
پیتک: پەلەپیتکە (د). شوورەیی.
پیتکخستن: د. پەلەپیتکە هاویشتن.
پیتووکە: د. جۆرە گیایەکە دەکرێ بەگزرە بۆ ئاژاڵ.
پیتە: پووشی چەڵتووک و گاڵ. چێشتی گۆشتاو.
پیتەبڕە: کرمێکی پچکۆلانەیە لەناو قەفی گەنم و جۆدا پەیدا دەبێ گوڵەکەی لە بندا دەقرتێنێ.
پیتەپیتە: د. وردە وردە.
پیچ: پێچ (با). بیچ (ز).
پیچان: ز. پێچان.
پیچک: گیایەکی یەک لقی سێ کووزی یەک ڕیشەیییە دەکرێ بەکەلانە. کوببەی ساوەری بێ ناو (ز).
پیچی: ز. پەنجەی دەست.
پیداروو: د. جۆرە دەرمانێکە لەنێو و لۆکە و قسڵ دروست دەکرێ و گونجی پێ پینە دەکرێ.
پیر: گیاندار و درەختی بەساڵاچوو. پیاوی باشی خواپەرست کە بەئامۆژگاری مەردووم بێنێتە سەر ڕێی چاکە.
پیران: لە هۆش خۆ چوون: (پیران)ی کردووە. ناوی دێیەکە لە سنووری ئێران لە ناوەندی هەورامان و مەریواندا.
پیرانبردنەوە: هۆش ڕۆین لەبەر لێکدانەوەی خەفەتێک.
پیرایی: د. بەپیرەوە چوون.
پیرپنتک: منداڵێکە کە کردار و گوفتاری لە گەورە بچێ.
پیرخەنی: پیرخەنیلە.
پیرخەنیلە: شۆربای وردە ساوەر.
پیراندن: پرمەکردنی ئەسپ و ماین.
پیرانن: پیراندن.
پیرک: ئەستێرک.

پیره: پرمە. (پیرەپیر) پرمەی یەک لەدوای یەک.
پیرسوز: شتێکە وەک فانۆس بەڵام لەباتی شووشە بلووری مێو لێدراوی تێ دەپێچرێ و مۆمی تێدا دادەگیرسێنرێ.
پیرۆز: شتی بەپیت و فەڕ: جەژنت (پیرۆز) بێ.
پیرۆزانە: شتێکە یەکێک بتداتێ لە کاتێکدا کە کاڵایەکی تازەی لەبەر کردبێ یا بەپایەیەک گەیشتبێ لە پاداشی ئەوەی کە پێت وتبێ (پیرۆزت) بێ.
پیرۆزبایی: پیرۆزانە.
پیرۆزە: بەردێکی شینی بەنرخە دەکرێ بەنقێم. هوما.
پیرۆزی: وتنی وتاری (پیرۆزت بێ) بەیەکێک.
پیرۆک: د. پیرەڵۆک.
پیرە: وتەیەکە بەهێندێ شت دەوتری لە ڕووی سەرسوڕمان لەو شتەوە: (پیرە) چەقۆ زۆر تیژە، یا (پیرە) ئاو زۆر بەهێزە.
پیرەباب: پیرپنتک. ناوی دێیەکە لە ناوچەی شارباژێر.
پیرەزا: منداڵێکە کە لە کاتی پیریی باوکی یا دایکیدا بووبێ.
پیرەژن: پیرێژن.
پیرەک: شتی چرچی کۆنی پیر. ژن (ز).
پیرەڵۆک: داری پیری گەندەڵ. ئەندامێکە لەبەر زۆر مانەوە لەناو ئاودا پنر بووبێتەوە.
پیرەمێر: ز. پیرەمێرد.
پیرەمێرد: ز. پیاوی پیری بەساڵاچوو.
پیرهەڤوک: ز. جاڵجاڵۆکە.
پیرێژن: ژنی پیری بەساڵاچوو.
پیرێژنە سەرئاسنینە: دەعبایەکی پچووکە بەقەد (زچ)ێک دەبێ لەژێر خاکدا هێلانە دەکا.
پیری: بوونی شت بەپیر. پیرایی (د).
پیزپیزاک: ز. جۆرە چۆلەکەیەکی کلاو درێژە.
پیزڵ: گیایەکی ئاویی هەمیشەییە گەڵای وەک کەوەر وایە ڕیشەکەی دەکوترێ و گەرم دەکرێ و لەبەر مووسڵدان دەنرێ بۆ میزگیران.
پیزۆکە: زیپکەیەکی پچووکە لە جەستە دەردێ.
پیزی: د. قنگ.
پیژان: د. بێژانەوە.
پیژگ: ز. پیشۆک.
پیس: شتێکە کە پاک نەبێ.
پیسار: د. خوێنی حەیزی ژن.
پیسایی: گووی ئادەمیزاد.
پیسبوون: بوونی شت بەپیس. تێکچوونی هێلکە.
پیس پیسۆک: پەسپەسەکۆڵە.
پیسکردن: لابردنی پاکیی شتێک. هەڵنەهێنانی هێلکە و بۆگەنکردنی.
پیسکە: ڕژدی چرووک.
پیسکەیی: ڕژدی و چرووکی.
پیسۆ: ز. بۆسۆ.
پیسۆز: د. پیرسۆز.
پیسی: پیسایی.
پیشان: پوختەبوونی هێندێ شت لەژێر ئاگردا. تەنگبوونی هەناسەی گیاندار لەژێر قورساییەکدا.
پیشاندان: بەرچاوخستنی شتێک بۆ گیانداریێک.
پیشاندن: پوختەکردنی شت لەژێر ئاگردا.
پیشانگا: شوێن ڕانوواندنی شت بۆ تەماشاکردنی (معرض).
پیشانن: پرماندنی وڵاخ (د). پیشاندن.
پیشاو: شتێکە لەژێر ئاگردا پوختە بووبێ.
پیشخواردنەوە: خەفەت پەچنینە دڵ بەدەست شتێکەوە و دەسەڵات نەبوون بۆ دەربڕینی.
پیشکان: بێڵەکان.
پیشکردن: پیشخواردنەوە.
پیشن: د. کەسێکە کە هەمیشە پیش بخواتەوە.
پیشۆک: گیایەکی بەهاریی سەلکدارە دەخورێ.
پیشە: کاری پێ بژێو (صنعت). کردەوە و ڕەوشت: تا لەسەر ئەم (پیشە)یەبیت سەر ناکەوێت.
پیشەگەر: کەسێکە کاری وا بزانێ کە پێی بژی.
پیشەوەر: پیشەگەر.
پیشیاگ: پیشاو.
پیشیان: پیشان.
پیف: ل. شتی پووتی پف هەڵدراو.
پیفک: پووشوو.
پیفۆک: بیشۆک.
پیفوو: پووشوو.
پیفیاگ: شتی ئاوساو.
پیفیان: ئاوسان.
پیفی: پیفوو.
پیڤاز: ز. پیاز.
پیڤۆک: ز. بیشۆک.
پیک: چەکوشێکی قورسی ئاسنینە بەردی پێ دەشکێنرێ. لاسکی گەنم و جۆ و ئەو گیایانەی کە لاسکدارن. فیقەنە.
پیکە: قامیشێکی باریکی پتەوە چیغی لێ دروست دەکرێ.
پیکەبرە: پیتەبرە.
پیل: پەلی گیاندار.
پیلاف: با. پلاو.
پیلان: فێڵ.

پیلانباز: فێڵباز.
پیلانبازی: فێڵبازی.
پیلانگێڕ: کەسێکە کە پیلان باش بگێڕێ.
پیلک: پۆستەچی (با). پەنجە.
پیم: پیو.
پینۆک: وەنەوز.
پینە: پارچەیەکە بدرێ لە شتی دڕاو. کەپەک (با).
پینەپەڕۆ: پینە و پەڕۆ.
پینەچی: کەسێکە کە هەر پێڵاو پینە بکا.
پینەدۆز: پینەچی.
پینەساز: پینەچی.
پینەک: پینۆک.
پینەکردن: گرتنی پینە بەسەر شتی دڕاودا. بریتییە لە بەسەرگرتنەوەی وتارێک بەلادانی بەجۆرێکی تر: فیسار کەس لە قسەکەی نەریمان دڵگیربوو بەڵام باش بوو ئەمیش زوو (پینە)ی کرد.
پینە و پەڕۆ: پینەکردنی کاڵای دڕاو بەپارچەی کۆن.
پیو: چەورییەکە لە بەز و ناوسکی گیاندار بگیرێ.
پیوار: د. پاشملە.
پیواز: پیاز.
پیوە: پووشوو.
پییە: ل. پیو.
پێین: لای خوارووی شت.



ت: (ضمیر)ی تاکی قسە لەگەڵکراو (مفردی مخاطب): کالاکە (ت)، بۆ نەهاتی(ت)؟
تا: بۆ دوایی شتێکە کە خاوەنی برانەوە بێ: (تا) کرماشان چووم واتە دوایی ڕۆینم کرماشان بوو. هۆیەتی شتێک بۆ شتێک دەگەیەنێ: زمانت شیرین بێ (تا) خۆشەویست بیت، واتە زمان شیرینیت مایەی خۆشەویستییە لای مەردووم. بۆ بەستنەوەی شتێکە بەشتێکەوە (شرط): بەخێوت دەکەم (تا) بخوێنیت، واتە بەخێوکردنت بەستراوە بەخوێندنتەوە. بۆ بەستنەوەی شتێکە بەکاتێکەوە: (تا) لە جیهاندا بیت خواردن و خواردنەوەت دەوێ. هاتووە بەمەعنا (بۆ ئەمەی): هەستە (تا) دەرچین، واتە بۆ ئەمەی دەربازبین. گەرمییەکە لە نەخۆشییەوە پەیدا دەبێ لە ئەندامی گیاندارا. لایەک لە بارێک. هەودا و تاڵ: (تا)یەکم لەو دەزووە بدەرێ واتە تاڵێک. تاک (د). هاولف: ئەمە هاو(تا)ی ئەوەیە (د).
تا: با. لقی درەخت.
تابار: تاقە تایەکە بخرێتە سەر پشتی وڵاخ.
تابان: درەخشان.
تابگە: شوێنێکی تایبەتییە لە گوێ ڕووبار و دەریا کە کەڵەک یا کەشتیی تێدا بوەستێ.
تابەرە گلگل: شتێکی گردی تەنکی لووسە منداڵان لەسەر شان تلۆری دەکەنەوە.
تاپر: تفەنگی ڕاو.
تاپۆ: تارمایی شت. جۆرە قەباڵەیەکی دەوڵەتییە دەدرێ بەخاوەن زەوی و خانووبەرە.
تاپوو: د. تاپۆ.
تات: ئافرەتێکە کە ئێسقان یا پارچە گۆشت لەبەر زێیدا بێ. تەلەبەردی پانی درێژ. شاخ و کێوی سەخت. عەرەبی: من زبانی (تات) نازانم.
تاتا: ل. مام.
تاتک: خوشکی گەورە.
تاتۆ: هـ. باوک.
تاتە: تاتۆ (هـ). خوشکی گەورە.
تاتەبەرد: بەردی تەنکی پانی گەورە.
تاتەشۆر: تەختەیەکی پانی درێژی پێچکەدارە مردووی لەسەر دەشۆرێ.
تاتی: لبادی ڕاخستن. سەر و بۆر و ژێر و زەنە (د). تاتە (د).
تاج: کڵاوێکی تایبەتییە پاشایان دەیکەنە سەریان. شتێکە لە وێنەی تاجێکی پچکۆلە هێندێ گەورەی سەرباز دەیدروون بەسەر شانیاندا.
تاج خورووس: جۆرە ترێیەکی سووری دەنک خوار و خێچە لە پۆپنەی کەڵەشێر دەچێ. جۆرە گوڵێکی سوورە وەک پۆپنەی کەڵەشێر پێی دەڵێن گوڵە قەیفە.
تاجی: تانجی.
تاخورک: ز. جۆرە عەرەبانەیەکی قۆقزی بێ پێچکەیە بەسەر بەفردا ڕادەکێشرێ.
تاخە: باقەیەک لە گەڵای تووتن و شتی تر.
تار: شتێکە وەک کەمانچە لێ دەدرێ و دەنگێکی خۆشی لێوەدێ. نان. تاریک. پێنجەی تار. تاڵێک لە دەزوو. گیاندارێکە کەتەرەبووبێ. (تاربوون) تەرەبوون. (تارکردن) تەرەکردن. کەمەی دەف و شتی تر (ز).
تارا: شتێکی ئاوریشمیی ئاودامانی جوانە دەدرێ بەسەر بووکدا لەکاتی گواستنەوەیدا بۆ ماڵی زاوا.
تاراج: تاڵان.
تاراندن: تەراندن.
تارانن: د. تەراندن.
تارانی: جۆرە دراوێکی زیوینی ئێرانییە.
تارچی: ز. کەسێکە کە شتێک بەش بکا. تارژەن.
تارژەن: کەسێکە کە تار باش لێ بدا.

تارکردن: تەرەکردن.
تارکرن: ز. بەشکردن.
تارگان: ز. جۆرە گەنمێکی خراپە.
تارم: خەرمانی هەڵدراوە دوای کوتاندنی رووەو با بۆ شەنکردنی. بەرهەیوان. جەڵەب (د).
تارمایی: قەبارە و تاریکاییی شت.
تارمە: تارم.
تارومار: پەرش و بڵاو. (تاروماربوون) پەرش و بڵاوبوونی شت. (تاروماركردن) بڵاوە پێکردن.
تاریاگ: د. گیاندارێکە کە تار بووبێ.
تاری: با. تاریک.
تاریک: شوێنێکە کە رووناک نەبێ.
تاریکایی: تاریکی.
تاریک داهاتن: پەیدابوونی تاریکی لە رۆژئاوا بەدواوە.
تاریک و روون: تاریکیی دوای شەو کە لەگەڵ رووناکیی بەیاندا تێکەڵ دەبێ، یا رووناکیی دوای رۆژ کە لەگەڵ تاریکیی ئێوارەدا تێکەڵ دەبێ.
تاریک و روونە: تاریک و روون.
تاریک و لێڵ: تاریک و روون.
تاریک و نووتەک: شوێنی زۆر تاریک.
تاریکە: تاریکایی.
تاریکەشەو: شەوی زۆر تاریک.
تاریکی: نەبوونی رووناکی. شوێنی تاریک: وەرە ئەم (تاریکی)یە.
تازە: شتی نوێ. شتی جوان کە ئادەمیزاد نەبێ (با).
تازەبرین: بریتییە لە یەکێک کە تازە مردوویەکی مردبێ.
تازە بەتازە: خواردەمەنییەکە لەگەڵ پێگەیشتنی بخورێ: میوە (تازە بەتازە) خۆخە.
تازەپیاکەوتوو: بریتییە لە کەسێک کە لە پاش هەژاری دەوڵەمەند بووبێ.
تازەقەڵلا: شتی تازەداهاتوو.
تازەکردنەوە: نوێکردنەوەی شتی کۆن.
تازەگی: شتی تازەی نوێ.
تازێ: ز. رووت و قوت.
تاری: تازە (ز). عەرەبی.
تازیلە: بزۆیش.
تاژانگ: ز. قامچی.
تاژی: تانجی.
تاس: جۆرە جامێکی دەم واڵی تەنکە.
تاسان: هەناسە لێ برانی گیاندار بەجۆرێک کە بخنکێ یا نیوە خنکاو بێ.

تاساندن: دەست نانە بەربێن و هەناسەبڕینی گیاندار بەجۆرێک کە بخنکێ یا نیوە خنکاو بێ.
تاسانن: تاساندن.
تاساو: گیاندارێکە کە تاسابێ.
تاس بردنەوە: واق ورمانێکە دێ بەسەر مەردوومدا لە کاتی بیستن یا بینینی شتێکی سەیردا.
تاس بەسەرداهاتن: تاس بردنەوە.
تاسکردن: تاسان.
تاسکڵاو: جۆرە کڵاوێکی پۆڵایینە لە جەنگدا دەکرێتە سەر.
تاسکەباب: دەفرێکە تاسکەبابی تێدا لێ دەنرێ. تاسکەبابی.
تاسکەبابی: جۆرە چێشتێکە لە گۆشت و ئاو و پیاز و بەهارات دروست دەکرێ.
تاسکەچەڵە: هـ. سیسارکە کەچەڵە.
تاسکەواو: تاسکەباب.
تاسنای: هـ. تاساندن.
تاسوخ: تاسوق.
تاسوق: خواردەمەنییەکی نایابە کە کەم دەست بکەوێ.
تاسولکە: تاسی پچکۆلە.
تاسە: بیر و ئارەزووی شت. تاسەکردن: ئارەزووکردنی شتێک.
تاسەخوار: کەسێکە کە تاسە و ئارەزووی یەکێک بکا.
تاسەمەند: تاسەخوار.
تاسەوی: بەرچنەی گەورەی ترێ.
تاسین: تاسان.
تاش: بەردی گەورە.
تاشتێ: ز. خواردنی نیوەرۆ.
تاشین: رێکخستن و لووسکردنی شتێک بەتیغ. (تاشراو) شتێکە کە بەتیغ لووس کرابێ.
تاف: ئاوێکی زۆرە کە بەخوڕ برژێتە شوێنێکەوە: کارێزەکە (تاف)ێک ئاوی پێدادێ. (تافەتاف) رژینی ئاوی زۆر بەگوڕ. ناوەڕاستی جوانی: لە (تاف)ی جوانیمدا کۆڵم نەدەدا. تۆف (د).
تافاڵ: ل. گوێسوانە.
تافاو: تافە ئاوی زۆر.
تافتە: جۆرە چنراوێکی ئاوریشمیی جوانە.
تاڤ: با. تیشکی رۆژ.
تاڤگە: جێگایەکی بەرزە کە ئاوێکی زۆری بەخوڕی لێ بێتە خوارەوە.
تافە: د. دەنگی ئاو و با.
تاڤ: ز. مانگ. رۆژ.
تاڤل: دەستبەجێ.

تاڤی: ز. تاوەبارانێک.
تاق: تاک. کەلەبەرێکی تایبەتییە لە دیوار دەهێڵرێتەوە بۆ شت تێدادانان. سەر پەنجەرە و دەرگا و پردی بەکەوانەیی هێنراوە. بەشێک لە بیست و چوار بەشی ئاو، هەموو ئاوێک بەبیست و چوار بەش دەژمێردرێ هەموو بەشێکی ناو دەبرێ بە(تاق)ێک: لە بیست و چوار (تاق)ەی ئەم کارێزە هەشت (تاق)م هەیە. رێی نیوەرۆژێک: لێرەوە تا چەمچەماڵ رۆژ و (تاق)ێکە. پێستی مەڕ و بزن.
تاقانە: منداڵێکە کە برا و خوشکی نەبێ.
تاقچە: تاقی پچکۆلە.
تاقتاقکەرە: باڵندەیەکی شەو بێدارە بەشەو هەر دەڵێ: (تاق).
تاقم: دەستەیەک لە شتێک.
تاقمان لە جووت: جۆرە یارییەکە یەکێک چەند شتێک دەخاتە دەستییەوە و بەهاوڕێکەی دەڵێ: (تاقمان لە جووت)، ئەویش ئەگەر وتی تاق یا جووت و بەتاق دەرچوو یا بەجووت ئەوی ناو مشتی دەباتەوە، ئەگەر وادەرنەچوو ئەوا بەقەد ئەوەی ناو مشتی دەدۆڕێنی.
تاقمانجفت: د. تاقمان لە جووت.
تاق و لۆق: چەند شتێکە لەپاڵ یەکدا بن و نارێک وەستابن: برژانگی (تاق و لۆق) وەستاوە، یا ڕایەڵی جاجمەکە تاق و لۆق کەوتووە. تاک و تووک.
تاقە: جۆرە پارچەیەکی جوانی بەنرخە لە ئاوریشم و سورمە دروست دەکرێ.
تاقەت: هێز و تەوانا.
تاقەتچوون: بێ تاقەتبوون لە شتێک.
تاقەتکردن: حەوانەوەی گیاندار: میوانەکان (تاقەت کە). دامەزراندنی شتومەک بەرێکوپێکی لە شوێنی خۆی.
تاقەتگرتن: ئارامگرتن.
تاقە و لۆقە: تاق و لۆق.
تاقیکردنەوە: بەراوردکردنی شتێک.
تاک: شتێکە کە دووەمێکی نەبێ.
تاکاننەوە: د. تەکاندنەوە و جیاکردنەوە.
تاکانە: د. تاقانە.
تاکبوونەوە: جوێبوونەوەی گیاندارێک لە کۆمەڵێک.
تاکتاک کەرە: تاقتاقکەرە.
تاکمان لە جووت: تاقمان لە جووت.
تاک و تووک: یەکەیەکەی پەراگەندە لە هەموو شتێک: تووتنەکەم (تاک و تووک) سەوز بووە، واتە چڵەچڵە.
تاک و تەرا: تاک و تووک.
تاک و لۆ: تەک و لۆ.
تاکە: تارانی.

تاکەوتاک: جووتە پێڵاو یا گۆرەوییەکە کە لە یەک ئەندازەدا نەبن، بەم ڕەنگە تاکێکیان گەورە و ئەوی تریان پچووک بێ. جووتە پێڵاوێکە ڕاست و چەپ لە پێ کرابێ.
تاکە و لۆکە: تاقە و لۆقە.
تاڵ: شتێکە تامی وەک تامی تاڵیشاری وابێ. جەوت یا مازووی کوتراوە کە مەشکەی پێ خۆش دەکرێ. هەودای دەزوو. شەو یا ڕۆژێکی هەورلەسەری بەبار. شتی سارد و سەرما: ئەمشەو شەوێکی (تاڵ)ە. پارچەیەک گۆشتی ڕەشە وا لە ناوەندی سی و جگەردا. گیانداری ڕەشکەڵە: (حەمەتاڵ). تووڕە.
تاڵان: شتومەکێکە بەزۆر و ستەم لە مەردووم بسێنرێ. (تاڵانکردن) ماڵی مەردووم بەزۆر و ستەم.
تاڵان و برۆ: ئاخۆران و بخۆران و تاڵانکردنی ئەم و ئەو.
تاڵانە: د. باخچە.
تاڵانی: ماڵێکە کە بەتاڵان برابێ.
تاڵاو: بریتییە لە جەخار و خەفەت: ئەگەر نەخوێنیت (تاڵاو) دەکەم بەدەمتدا.
تاڵاوی: تاڵاو.
تاڵبوون: بریتییە لە تووڕەبوون و گرژبوون.
تاڵخ: سنوور.
تاڵدان: کردنی جەوت و مازووی کوتراو بەمەشکەوە.
تاڵشاری: د. تاڵیشاری.
تاڵگ: د. تاڵیشک.
تاڵگە: د. تاڵک.
تاڵو: گیایەکی گەورەی گەڵاپانی تووکنە بنکێکی توێ توێی هەیە.
تاڵووکە: پەلەپەل و دەستوبردکردن. (تاڵووکەکردن) پەلەپەلکردن.
تاڵە: گیانداری ڕەشی دێز. مەڕی لەش سپیی دەموچاو بۆر. تاڵو.
تاڵەکە: د. مرۆر.
تاڵەوکەرەی خۆشەوەکەرە: بریتییە لە کەسێک دەمێک کەیف خۆشت بکا و دەمێکیش دڵتەنگ.
تاڵیشاری: دەرمانێکی زەردباوی زۆر تاڵە.
تاڵیشک: گیایەکی تاڵی گەڵاپانی درێژکۆلەی بەهارییە دەدرێ بەکەو.
تالینتووس: گیایەکە لە تاڵیشک دەچێ.
تاڵی: بوونی شت بەتاڵ.
تاڵیش: تاڵیشک.
تام: چۆنێتیێکی خۆش یا ناخۆشە لە خواردن یا خواردنەوەی شت پەیدا دەبێ لە دەمدا. ڕۆنێکە کە بکرێتە چێشتەوە: ئەم چێشتە (تام)ی کەم تێ کراوە.

تامازرۆ: د. تامەزرۆ.
تامان: تەیمان.
تامدان: ز. ئالّدووزکردن بە زێڕ.
تامژاندن: ز. فێرکردنی منداڵی شیرەخۆرە بەخواردن.
تامژین: ز. تازە دەستپێکردنی منداڵی شیرەخۆرە بەخواردن.
تامسار: ز. خواردن و خواردنەوەی شتی ناخۆش.
تام و بۆ: بۆن و بەرامە.
تامەتیتک: ز. خواردەمەنیی خۆش.
تامەزرۆ: کەسێکە کە زۆر ئارەزووی خواردنی شتێک بکا لەبەر ئەمەی کە دەمێ بێ نەیخواردبێ.
تامی تامیدان: خواردنی شتێکی خۆش لەبەرچاوی یەکێک بۆ ئەوەی حەزی لێ بکا و بەشی نەدەیت.
تامیسک: زیپکەیەکە لە دەم و لێوی مەردووم پەیدا دەبێ.
تامێسک: تامیسک.
تان: با. تەیمان.
تان: ڕایەڵی شتی تەنراو. چەند دارێکە وەک پەنجەرە لە ناوەڕاستی ژووردا دادەنرێ بۆ ئەوەی کە بیکا بەدوو بەش (ز).
تانج: تاج.
تانجۆکە: مووی ناوچەوانی کچی پچکۆلە کە بهۆنرێتەوە و بەسەریەوە ببەسترێتەوە بۆ ئەوەی کە نەچێتە ناو چاوی.
تانجی: جۆرە سەگێکی باریکی تیژڕەوی ڕاوییە.
تانجیی پێغەمەرانە: جۆرە کوللەیەکی لۆقنی باریکی بێ زیانە.
تانجییەوان: کەسێکە کە هەر خزمەتی تانجی بکا.
تانشین: د. خڵتەیەکە کە بکەوێتە بن ئاو.
تانوپۆ: بریتییە لە بنەچە و ڕەگەز: (تانوپۆ)یان دەناسم.
تانوپۆ ئاوریشم: بریتییە لە کەسێک کە لەلایەن باوکیشی و دایکیشیەوە ڕەسەن بێ.
تانووت: توانج.
تانە: پەڵەیەکی سپییە دەکەوێتە سەر بیبیلەی چاو تاریکی دەکا. تەشەر.
تاو: بارانێکی لێزمەی کەم. هەودایەک لە بەن و دەزوو و شتی تر. دەمێکی کەم: (تاو)ێک دانیشە.
تاوتاو: دەم دەم. غارکردنی وڵاخ و خێرا ڕۆینی مەردووم: بە(تاو) هات. هەتاو. ترس و بیم: لە (تاو) تۆ نازانم چی بکەم. تای نەخۆشی (د).
تاوا: ل. تاوە.
تاوان: گوناح: بێ (تاوان) کوژرا. تواندنەوە: (ه). پاداش (د).
تاواندان: د. بژاردنی شتێک. پاداش دانەوە.
تاواندن: تواندنەوە.
تاواندنەوە: تواندنەوە.
تاواندەر: د. کەسێکە کە شتێک بپژێرێ.
تاوانن: د. تواندنەوە.
تاوتوکردن: سەنگ و سووککردنی دوو دەفر کە شتێکیان تێدابێ بۆ ئەوەی کە بەقەد یەکیان لێ بێ.
تاوتێ: تایەکە بەهۆی ئازارێکەوە لە ئەندامدا پەیدا دەبێ: ئەمە (تاوتێ)ی دوومەڵەکەیە.
تاودان: غارکردن بەوڵاخ. پێچدان (د). خولخواردن و گەڕان (د). سوورکردنەوە بەئاگر.
تاوسان: هاوین.
تاوسەندن: گەرمبوون و سووربوونەوەی شت.
تاوکردن: لاسدانی یەکێک بۆ کردنی شتێک.
تاوکێش: تەنراوێکە کە ناوبەناو تاوی لێ دەرهاتبێ. (تاو کێشبوون) دەرهاتنی تاوی شتی تەنراو ناوبەناو،
تاوکێشکردن: دەرهێنانی تاوی شتی تەنراو ناوبەناو.
تاوگرتن: تاوسەندن.
تاوڵە: تەویلەی وڵاخی بەرزە. نەرد. گیای گژنیژ (د).
تاوڵەمە: ئاگر گەشکەرەوە.
تاولێهاتن: د. بێ تاقەتبوون. تا لێهاتن.
تاونیان: د. ڕاونان.
تاووس: باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگی ئێجگار جوانە کلکی وەک چەتر لێ دەکا.
تاووشت: د. تاقەت و توانایی.
تاووک: تایلە.
تاووڵ: ڕەشماڵ.
تاوە: دەفرێکی پەلە شفتە و هێندێ شتی تری تێدا سوور دەکرێتەوە. بەردێکی پانە ئاشەوان کولێرە ئاشی پێ دەبرژێنێ.
تاویار: د. تاوێرێک لە برێشکە و شتی تر.
تاویان: د. توانەوە.
تاویانەوە: د. توانەوە.
تاوێر: تاشەبەردی زۆر گەورە. بەشێک لە قاوە و قاورمە و شتی تر کە بەنۆرەیەک سوور بکرێتەوە یا لە کەشک کە بەجارێک لە سوێنەدا بسوورێتەوە.
تاویلکە: تاوەی پچووک.
تاویەتی: د. تایبەتی.
تاوی: جۆرە دارێکە.
تاوین: د. توانەوە.
تاوینە: توانەوە.
تایبەتی: شتی دانسقە.

تایله: دارێکی دێمـیـیــه گـەڵای وەک هەڵووژە وایە، بەرێکی شیرینی پایزەی زەردی خڕی هەیە وەک نۆک دەخورێ.
تاینچە: تایەکی پچووک.
تایە: گـزرە گـیـایەکـه کـەڵەک کـرابێ بۆ زسـتـانی ئاژاڵ. چەند مـەلۆیەکـه لەسـەر یەک دانرابن بۆ ئەوەی بکرێن بەخـەرمـان. لاستیکی پێچکەی ئۆتۆمۆبێل و هێندێ شتی تر.
تایەفی: جۆرە ترێیەکی سووری درێژکۆلەیە.
تایەن: وتەیەکـه بەکـاردێنرێ بۆ کـەسـێک کـە لەسـەر کـارێک سـەرزەنشـتی بکەیت و ئەویش بەرهەڵسـتت بووەسـتێ: من دەڵێم بخوێنە کەچی کابرای(تایەن) یەخەم دەگرێ.
تبل: با. پەنجە.
تخل: د. مەردوومی کەنەفتی لە پێش چاو کەوتوو.
تخووب: سنوورێکە دوو دێ یا دوو زەوی لە یەک جیا بکاتەوە.
تر: پیـتـێکە بـاوی ناو (اسم)ێک بەسـەر ناوێک یا بەسـەر چەند ناوێکی تردا دەدا لە صـفـەتێکدا کـە هەردووکـیـان تێـدا بەشــداربن: نەریمان لە کــامــەران یا لە هەمــوو براکــانی زیرەک(ترە). پیـتـێکە جـیـاوازیی شـتـێک لە شـتـێکی تر دەگـەیەنێ: پیـاوەکـەی (تر)م بۆ بانگ کـە. کـەسـێکە کـە لە قسـەدا پەلەپەل بکا و بیدا بەسـەر یەکدا. ترەتر: قسـەکردن بەپەلەپەل.
ترار: با. جامی ئاوخواردنەوە.
تراک: با. دەوری.
تراز: د. جۆرە گـیـرە و ئەشکنجـەیەکە کـە شـتی پێ توند دەکرێ. تەرازووی بەنا.
ترازان: دەرچوونی شتێک لە جێی خۆی.
ترازاندن: دەرپەڕاندنی شتێک لە شوێنی خۆی.
ترازاو: شتێکە کە لە شوێنی خۆی دەرچووبێ.
ترازوو: شـتـێکی دوو تایە شـتی تری پێ دەکـێـشـرێ. شـتـێکە شووشـەیەکی تێ براوە دڵۆپێک جیوەی تێدایە بەرزی و نزمی و ڕاستی و چەوتیی دیوار و شتی تری پێ دەردەکەوێ. چەند ئەسـتـێـرەیەکی ڕێکی بەرامـبـەری یەکن لە نـاوەندی (کـۆ) و (گــەلاوێژ)دا. نـاوی کــەلـوو (برج)ێکە لە دوانزە کــەلـووی ئاسمان. دوو شتێ کە لە کێشدا بەرامبەر بن. شـتی تەخت و ڕێک: ئەم شـوێنە یا ئەم دیوارە (تەرازوو)وە واتە تەخت و ڕێکە.
تەرازووباز: کەسێکە لە کێشان بەتەرازوودا فێڵ بکا.
تەرازووبازی: فێڵکردن لە کێشان بەتەرازوودا.
ترازیان: ترازان.
تراش: تەراش.
تراشە: د. تەلاش.
تراشین: تاشین.
ترافانن: د. فڕاندن.
ترافیاگ: د. ترافیدە.
ترافیدە: گیاندارێکە کە تار بووبێ.
ترانە: ز. قەشمەری و یاری لە قسە و گفتوگۆدا.
تراو: شتی زۆر شل و ڕوون کە بەشی ئاوی زۆرتر بێ.
تربێ: هـ. شەوی ناوەڕاستی زستان.
ترپ: توور. ترپە. گۆڕ (ز).
ترپۆکە: د. شێلم.
ترپە: دەنگی کــەوتنەخــوارەوەی شــتــێکی نەرمی قــورس لە جــێگایەکی بەرزەوە. ترپەترپ: ترپەی یەک لە دوای یەک. ترپ و هوڕ: ترپەترپی زۆر.
ترت: تورت. پەنجە (د).
ترترۆک: ز. سوورێنچک.
ترترە: ز. پیاوی درێژی قەڵەو.
ترتری: با. مەردوومی تر.
ترچماق: مەردوومی زۆر درێژ.
ترخان: ل. ترخێنە.
ترخـە: تێکچوونی دەروون و ترشانی خـواردەمـەنی تیـایدا بەهۆی زۆر خواردنەوە.
ترخێنە: شـتـێکی مزرە دەگـیـرێتەوە لە بروێش و شێلمی چنراو و، سـەلک سـەلک وشـک دەکرێتـەوە. چێشـتـێکە لە ترخـێنەی وشک و نیسک و نۆک و چەوەندەر و گۆشت دروست دەکرێ.
ترِ: بایەکی بۆگەنە دێتە دەرێ لە قنگی گیاندار بەدەنگەوە.
تراندن: بریتییە لە زەبوونکردن و زیان گەیاندن بەیەکێک.
ترترە: دەردێکە لە هێندێ سـەوزایی دەدا وشـکی دەکا. گـیـایەکـە لەناو پەمـوودا سەوز دەبێ و چواردەوری زەبوون دەکا.
ترتەپان: د. گیانداری تەمەڵی تەوەزەل.
ترحێو: ترهێو.
ترِ زل: بریتییە لە مەردوومی بەفیز.
ترشکێن: کــەســێکە کــە شکابێ و تەریق بووبێــتــەوە. (ترِ شکێنکردن) تەریقکردنەوەی یەکێک.
ترکەن: گیاندارێکە کە زۆر ترِ بەربداتەوە.
ترکەندن: ترِبەردانەوە.
ترلەیلی: بریتییە لە مەردوومی بێ نموودی هیچ و پووچ.
ترلێدان: ترکەندن. بریتییە لە خۆهەڵکێشان.
ترن: ترکەن. بریتییە لە گیانداری بێ کارەی هیچ و پووچ.
ترنوسـقـاو: چەورییـەکی کـەمـە کـە بکەوێتـە سـەر ئاوی گـۆشـتی کولاو: گۆشتەکە ئەوەندە لەڕە (ترنوسقاو)ی بەسەرەوە نییە.
ترنیسق: کۆترە باریکە.

ترۆ: تووره.
تر و زڕ: دەعیە و دەماری بێ جێ.
ترۆکردن: دەرکردنی یەکێک بەسووکی.
ترۆڵ: ل. شیاکە.
ترولاق: ل. ترۆڵ.
ترەتر: فیز و دەمارکردن بەسەر یەکێکدا: چ (ترەتر)ێکتە، یا چ (ترەتر)ێکم بەسەردا دەکەیت؟
ترەک: ز. پیاو و ژنی داوێن پیس.
ترەکەڵەکی: بریتییە لە کارێک کە باش بنج و بناوانی نەبەسترابێ و لەوانەبێ کە سەر نەگرێ و برووخێ.
ترەمەرۆ: بریتییە لە تفەنگ و دەمانچەیەکی خراپ کە کەم گوللەی بڕوا.
ترەوراوێ: د. چەنەبازی سازندە.
ترهێو: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە ڕووی گاڵتەکردن بەکەسێکەوە کە قسەیەک یا کارێک بکا و جێی خۆی نەگرێ.
تریزە: د. قنگ.
ترین: ترکەندن.
ترس: چونێتییەکە دێ بەسەر گیانداردا لە کاتی بینین یا بیستنی شتێکەوە کە گیانی لێی سڵ بکا و دڵی بکەوێتە گورپە گورپ.
ترسان: هاتنی ترس بەسەر گیانداردا.
ترساندن: ترس خستنە دڵی یەکێکەوە.
ترسانن: ترساندن.
ترساو: گیاندارێکە کە ترسابێ.
ترسناک: شتێک یا شوێنێکە کە مەترسی لێ بکرێ.
ترسنۆک: گیاندارێکە کە زۆر بترسێ.
ترسەترس: پارێزگاری لە شتێک بەترسەوە: بۆچی بە(ترسەترس) دێیتە ژوورەوە؟
ترسیان: د. ترسان.
ترسێن: ترسێنەر.
ترسێنەر: شتێکە کە مەردووم بترسێنێ.
ترش: بەری دارێکە بەهێشوو دەیگرێ دەنکی وەک نیسک وایە. شتێکە لە دەمدا تامی وەک سماق وابێ. بریتییە لە مەردوومی ڕووگرژ.
ترشان: ترشبوونی شت بەهۆی کۆنبوون و مانەوەیەوە. وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بەیەکێک کە نووستبێ: فیسار کەس (ترشاوە) واتە پەندەمووسی کردووە.
ترشاو: شتێکە لەبەر کۆنی ترش بووبێ. چێشتی مزرۆکە. ئاوی کان (معدن) کە لە خۆیدا ترش بێ. نوستوو.
ترشتە: د. ترێشتە.
ترشک: ز. هەموو خواردەمەنییەکی شلی ترش.
ترشکە: ترشۆکە.
ترش و تاڵ: بریتییە لە مەردوومی ڕووگرژی مۆن.
ترش و تەلاش: چێشتی چەوەندەر بەترش.
ترش و شیرین: شتی مێخۆش. جۆرە شەربەتێکە لە دۆشاو و ترشی سماق دروست دەکرێ.
ترشۆک: ز. ترشۆکە.
ترشۆکە: گیایەکی بەهاریی گەڵاپانی درێژکۆڵەی ترشە.
ترشەڵۆک: شتی ترشاوی ناخۆش.
ترشەڵووک: ترشەڵۆک.
ترشیات: جۆرە ترشییەکە لە سرکە و سەوزەواتی چنراو دەگیرێتەوە.
ترشی: لەپە برنجێکە ترشی تێ کرابێ. تامێکە وەک تامی بەرسیلە.
ترغەل: ز. شلەپەتە.
ترفاڵ: د. تلپەی شت.
ترفە: ترپە.
ترقە: هەڵووژە سیقەتۆرەیی.
ترکانی: جۆرە سەمایەکە لەگەڵ جوولاندنی ئەندامدا.
ترکەش: تەنیشت.
ترنج: نارنج، ترنجۆک: جۆرە نەقشێکە لە قالی و شتی تر دەکرێ.
ترنجان: گیربوون و چەسپبوونی شتێک لەناو شتێکدا.
ترنجاندن: گیرکردنی شتێک لە شتێکدا.
ترنجانن: ترنجاندن.
ترنجۆک: جۆرە گیایەکی گەڵاپانە بۆنی وەک نارنج وایە.
ترنجوو: تیغی برندە.
ترنجە: ز. پەیژە و پێپیلکە.
ترنجەبین: جۆرە شەربەتێکی مزرە وەک سکەنجەبین.
ترنجەمین: ترنجەبین.
ترنجیان: د. ترنجان.
ترنگ: تراو: پلە و پایەی بەرز (د). پلتۆک (د).
ترنگە: دەنگێکە وەک دەنگی تەلی تار و عوود. (ترنگەترنگ) ترنگەی یەک لە دوای یەک. (ترنگ و هوڕ) ترنگەترنگی زۆر. پلتەقاندن (د).
ترۆزی: خواردەمەنییەکە وەک خەیار.
تروسک: گیانداری چالاک.
تروسکان: تروسکانەوە.
تروسکاندن: تروکاندنی چاو.
تروسکانن: تروسکاندن.

تروسکانەوە: ڕووناکیدانەوەی چرا و ئاگر و بروسکە لە دوورەوە.
تروسکایی: ڕووناکیـیـەکی کـەم: چاوی بەئاسـتـەم (تروسکایی) دەکا.
تروسکە: تروسکایی: بروسکە.
تروسکیانەوە: تروسکانەوە.
ترووشکە: د. ترشۆکە.
تروقیان: د. ترووقە.
ترووقانن: د. ڕەتاندن.
تروقە: د. شکان و ڕاکردن.
تروکـــاندن: هەڵبـــڕین و دانانی پێـــڵـــووی چاو. دەست بەپەلەپیتکەداهێنانی چەک بەبێ فیشەک. کونکردنی هێلکە بەدەنووک لەلایەن مریشکەوە بۆ دەرهێنانی جـووجـەڵەکـەی. دەرهێنانی ناوکی تۆکوولەکە و تۆ بێستان بەددان.
تروکایی: تروسکایی.
تروکە: تروکایی.
تروم: د. نەژاد و ڕەسەن.
ترە: ز. ترێ.
ترەقە: تریقەی پێکەنین (د). تەرەقە.
ترەقیان: د. پێکەنین.
ترەک: د. درز و قلّیشی شت.
ترەکان: درزبردنی شت. بریتییە لە زانی سەگ و بەراز.
ترەکاندن: قەڵەشاندنی شت.
ترەکیان: ترەکان.
ترەکین: ترەکان.
ترەو: هـ. توور.
ترەوکە: هـ. خەرتەلە.
ترەوەژە: کۆرکۆرە.
ترێ: بەری درەختی مێوە کە بەهێشوو دەیگرێ.
تریاک: تلیاک.
تریاکخۆر: کەسێکە هۆگری خواردنی تلیاک بووبێ.
تریاکی: کەسێکە کە زۆر تریاک بخوا.
تریان: قووڵینە.
تریانە: سەبەتە.
تریسکە: شەوقی شـووشـە و گـەڵێ شـتی تر، (تریسکەتریسک) تریسکەی یەک لە دوای یەک. (تریسـک و هوڕ) تریسـکە تریسـکی زۆر. مـۆڕبوونەوە و گـوێ قـوتکردنەوەی ئێـسـتـر لە کاتێکدا کە بگاتە شیوێک یا کەندەڵانێک.
تریشتە: تەشوێ.
تریشقە: بروسکەی هەور کە بدا لە شتێک.
ترێقە: د. تریقەی پێکەنین.

تری: ز. ترێ.
تریت: نانێکە کە گوشرابێتە شتی شلەوە.
تریفە: شـەوقی مـانگ. (تریفەتریف) تریفەی یەک لەدوای یەک. نەخۆشییـەکی ئاژاڵە سییـەکەی دەنووسێ بەلای ورگـیـەوە. ناوی دێیـەکـە لە تەنیـشت هەڵەبجـەوە. جـۆرە دەردێکە لە تینوێتییەوە تووشی ئاژاڵ و وڵاخ دەبێ ڕیخۆڵەی ڕەش دەکا.
تریفەتێکەوتن: بریتییە لە زۆر تینووبوون.
تریقـە: دەنگی پێکەنینی بەرز. تریقـەتریق: تریقـەی یەک لەدوای یەک. (تریق و هوڕ) تریقەتریقی زۆر.
تریکاندن: قیژاندن.
تریکە: قیژە.
تریـن: پیـــتـــێکە باوی ناوێک لەناو چەند ناوێکدا دەدا لە صفـەتێکدا کە لە هەمـوویاندا ببێ بەڵام لەمیـانـدا زیاتر بێ: سـەردار زیرەکـتـرینی کـورەکـانمە، واتە ئەم لە هەمــوویان زیرەکترە.
تزبە: ز. تەزبێح.
تژی: زۆر. شتی پڕ: چاڵەکە تژی بوو (با). پرد (ز).
تس: بایەکی بۆگەنە لە قنگی گیاندار بەبێ دەنگی دێتە دەرێ.
تسدانەوە: بریتییە لە سەرنەکەوتنی یەکێک لە ئەنجامی کارێکدا و دەست لێ هەڵگرتنی.
تسقل: د. جۆرێکە لە بەری دار مازوو.
تسقـڵە گورگـانە: گـیـایەکە وەک قـارچک ناوەکـەی بەتەڕی وەک سیرێژ و بە وشکی وەک خەنە وایە.
تسکەن: کەسێکە زۆر تس بکەنێ.
تسکەندن: تس بەردانەوە.
تسڵەگورگانە: هـ. تسقڵە گورگانە.
تسن: تسکەن. بریـتـیـیـە لە مـەردوومی تەمـەڵی تەوەزەل. ناوی دێیەکە لە ناوچەی کەرکووک.
تسوێ: توێسی.
تسەک: کەوش.
تسی: ز. نانی بێ پێخۆر.
تسین: تسکەندن.
تش: هـ. ترش.
تشاو: هـ. مزرۆکە.
تشت: ز. شت.
تشـــرین: ناوە بۆ دوو مـــانگ لە ناوەندی ئەیلوول و کـــانوونی یەکـەمـدا لە سـاڵی ڕۆژی، تشـرینی یەکـەم مـانگی دەیەمـە و سی و یەک ڕۆژە، تشـرینی دووەم مـانگی یازدەهەمـە و سی ڕۆژە.
تشلّەکەین: هـ. شۆربای ترشی.

تشین: هـ. لەپەترشی.
تف: ئاوێکی لینجە هەمیشە لە ژێر زبان و ناودەمدا هەڵدەقوڵێ
تفاق: پێویستانی ناوماڵ لە ئازووقە و شتی تر.
تفاندنە ناودەم: بریتییە لە دەرسدانی یەکێک: منداڵەکانی نەریمان هەموو دایکیان (تفاندوویەتیە دەمیانەوە) واتە فێری ڕەوشتی خۆی کردوون.
تفاندنە دەم یەک: بریتییە لە دوو کەس یا زیاتر کە لە قسەیەکدا هەموو وەک یەک وابن: دارا و دلێر دەڵێی (تفاندوویانەتە دەم یەک) واتە دەڵێی خەبەریان لە یەک گێڕاوەتەوە لە قسەکەدا.
تفاندنەوە: فڕێدانی خواردەمەنی ناو دەم لەگەڵ تفدا لەبەر شتێک.
تفت: تامێکە لە ناوەندی تاڵ و ترشدا وەک تامی مازووی هاڕاوە، دەم تورت دەکا.
تفتی: دانوولە: (ز). بوونی شت بەتفت.
تفسک: با. هەنجیرە کێویلە.
تفک: ز. سێکوچکەی ژێر مەنجەڵ.
تفکردن: ڕۆکردنی تف.
تفکردنەوە: تف فڕێدانی زۆر لەبەر شتێکی ناخۆش.
تف لێکردن: تفکردن لە یەکێک لەسەر شتێکی خراپ.
تفەڕەوەن: هـ. شاتوو.
تفەک: ز. تفەنگ.
تفەنگ: چەکێکی درێژی سووکی لوولەدارە گوللەی پێ دەتەقێنرێ.
تفەنگاوێژ: ماوەی هاویشتنی گوللەیەک بەتفەنگ: لێرەوە تا بناری گۆیژە (تفەنگاوێژێکە).
تفەنگتەقێن: تفەنگاوێژ.
تفەنگچی: کەسێکە کە نیشان بەتفەنگ باش بپێکێ.
تفەنگساز: کەسێکە کە تفەنگ بەدەست دروست بکا.
تفی: هـ. توو.
تفیریک: ز. گوێزەپانە.
تفینەوە: تفکردنەوە.
تڤر: با. توو.
تڤیلک: ز. پۆڕ.
تک: بریتییە لە ئەندازەیەکی کەم لە شت. دڵۆپێک لە شتی شل.
تکا: ڕوونان لە یەکێک بۆ شتێک.
تکاکار: تکاکەر.
تکاکردن: تکا.
تکاکەر: کەسێکە کە تکایەک بکا.
تکاندن: شتی شل کردنە ناو شتێک بەدڵۆپ.
تکانن: تکاندن.
تکە: دڵۆپەی هەموو شتێک. تکەتک: تکەی یەک لە دوای یەک.
تکەکردن: دڵۆپەکردن.
تگر: تەرزە.
تگە: سابرێن. ئارەزووکردنی بزن بۆ سابرێن: بزنەکە هاتووەتە (تگە).
تگەگرتن: جووتگرتنی بزن لەگەڵ سابرێندا.
تل: تاوێرەبەرد. پەنجە (ز).
تل: با. ورگ.
تڵ: چلێک لە سەوزایی. پیسیی شلی ئاژاڵی وردە. سەگی توولە. شتی بێ هاوتا (د). شتی هەڵبژاردە (د).
تلا: ل. تەلا.
تلار: ز. تەمەڵ.
تلان: د. گلان. تلخواردن.
تلاندنەوە: تلدان بەشت.
تلانن: تلاندنەوە. گلاندن (د).
تلاننەوە: تلاندنەوە.
تلانەوە: تلخواردنی گیاندار لە پاڵەوە.
تلاوتل: تلبوونەوەی شتێک لە لێژاییەکەوە.
تڵبژێن: د. هەڵبژاردن.
تلبوونەوە: خلبوونەوەی شتێک لە بەرزییەکەوە.
تڵپ: ز. تڵپە.
تڵپە: توێکڵ و گەڵای شتێک کە ئاو و تامی گیرابێ وەک ترێ و تەماتە.
تلتای: هـ. خلبوونەوە.
تلخواردن: تلبوونەوە.
تلدان: پاڵنان بەشتێکەوە بەڕەنگێک کە تل بخوا.
تڵف: د. تڵفە.
تڵفار: د. تڵفە.
تڵفە: د. تڵپە.
تڵقە: شڵقەی مەشکە و کوندە و شتی تر. (تڵقەتڵق) تڵقەی یەک لەدوای یەک.
تلک: تیلماسکێک لە ترێ.
تلکردنەوە: تلۆرکردنەوەی شتێک لە لێژییەکەوە.
تاوخوێ: شتی زۆر سوێر.
تلۆر: شتی گلۆربووەوە.
تلۆربوونەوە: گلۆربوونەوەی شتێک لە لێژییەکەوە.
تلۆل: ز. لیتە و قوڕ.

تلۆلۆک: ز. حەلوای شەکر کە بەئاردی برنج کرابێ.
تلووخ: ز. ژنی کاوڵیی بێ شەرم. شتێکی تایبەتییە سەهۆڵ و بەفری تێ دەخرێ.
تڵە: د. نێڵەی ئاگر. (تڵەتڵ) نێڵەنێڵ.
تلیاک: شیرەی گوڵی خاشخاشە خۆش دەکرێ و بۆ گەلێ شت بەدەرمان دەشێ.
تلیاکخۆر: کەسێکە کە هۆگری خواردنی تلیاک بووبێ.
تلیاکی: کەسێکە زۆر تلیاک بخوا.
تلیاگ: د. کەسێکە کە گلابێ. شتێکە کە گلۆر بووبێتەوە.
تلیان: قوولێنەیەکە لە تووڵ دروست دەکرێ. ناوی دێیەکە لە ناوچەی (قەڵاسێوکە). تلخواردن (د). گلان (د).
تڵیان: د. تڵێن.
تلیانە: تلیانی قووڵینە.
تلێر: د. تلۆر.
تلێران: هـ. تلۆربوونەوە.
تلێربوونەوە: گلۆربوونەوە.
تلی: ز. پەنجە.
تلیس: تڵیس.
تڵیس: د. شتی تەڕی خووساوە.
تڵیسان: تڵیسانەوە.
تڵیساندن: تڵیساندنەوە.
تڵیسانن: تڵیساندن.
تڵیساننەوە: تڵیساندنەوە.
تڵیسانەوە: خووسانەوەی هێندێ شت بەهۆی تەڕبوونییەوە. بریتییە لە مردنی یەکێک.
تڵیسانەوە: تلیسانەوە.
تلیساو: شتی تەڕبووی خووساوە.
تڵیساو: تلیساو.
تلیساوە: تڵیساو.
تڵیساوە: تڵیساو.
تلیسیانەوە: د. تڵیسانەوە.
تڵیش: قڵیش.
تڵیشان: قڵیشان.
تڵیشاندن: قڵیشاندن.
تڵیشانن: قڵیشانن.
تڵیش بردن: تڵیش تێبوونی شتێک.
تڵیشیان: د. قڵیشان.
تلیلی: ز. تلیلیلی.
تلیلیلی: هەلهەلەکێشان لە شاییدا.
تڵێن: د. هێشتن. دووچاربوون.

تما: ز. تەمەع.
تماشا: تەماشا. (تماشاکردن) تەماشاکردن.
تماق: هـ. جامی ئاوخواردنەوە.
تماندن: نەواندنی شتێک: سەری خۆی (تماند) واتە نەواندی.
تمەز: تومەز.
تمەن: ناوە بۆ دە قرانی ئێرانی.
تن: قنگ (د). توند: (تن) بەستم واتە توند بەستم.
تناز: ز. نانکردن.
تناور: ز. گیانلەبەر.
تنراو: چنراو.
تنگێلکە: کوندە و مەشکەیەکە زۆر پڕکرابێ لە ئاو یا شتی تر. بریتییە لە گیاندارێک لەبەر زۆرخواردن تەنگەتیلکە بووبێ: خۆی (تنگێلکە) کردووە.
تننە: ز. نییە.
تنۆک: دڵۆپ.
تنە: ز. تننە.
تۆ: بەکەسێک دەوترێ کە قسەی لەگەڵ بکەیت. کەرە (ز).
توێ (د). تۆو: هیشتا خەیار (توێ)ی نەکردووە.
توانا: تەوانا.
توانایی: تەوانایی.
توانج: سەرکۆنەکردن و قسە هاویتن بۆ یەکێک.
توانین: تەوانایی و دەسەڵات بەسەر شتێکدا.
توایهم: پیتی پەسندکردن وەک ئافەرین.
تۆپ: تەمووی ئاش. شتێکی خڕی سووکە منداڵان یاری پێ دەکەن. چەکێکی گەورەی لوولەدارە گوللەی پێ دەهاوێژرێ. دارێکی درێژە سەرەکەی پەڕۆی پێوە دەبەستن و گونجی ئاوی پێ تۆپکەشی دەکەن. پیتی تێکرایی: (تۆپ)ی جاف چوون بۆ کوێستان واتە هەموویان. ئەندازەیەکی تایبەتییە لە قوماشی قەدکراو: (تۆپ)ێک فاسۆنم کڕی.
تۆپ ئاگردان: بریتییە لە نابووتبوونی یەکێک.
تۆپان: د. تۆپ تۆپێن.
تۆپاندن: وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بۆ کوشتنی گیاندارێک.
تۆپانن: تۆپاندن.
تۆپتاو: د. تۆپتۆپێن.
تۆپتۆپێن: یاریکردن بەتۆپ.
تۆپچی: کەسێکە کە تۆپ ئاگر بدا. بریتییە لە مەردوومی هیچ نەزان.
تۆپز: داردەستێکە وەک کوتەک بەڵام ئەم سەرەکەی قیر و بزماری پێدا دادەکوترێ.

تۆپقاڕ: یاریی قەلەمرداریێ.
تۆپقاڕێن: تۆپقاڕ.
تۆپکەشی: تۆپدان لە گونجی ئاوی گیراو بۆ بەردانی.
تۆپلاخ: کۆسپایی.
تۆپلاخە: تۆپلاخ.
تۆپەڵ: قوڕ و گەچ و هێندێ شتی تر کە بەدەست خڕ هەڵدرابێ.
تۆپەڵە: تۆپەڵ.
تۆپەڵەبوون: گرمۆڵەبوونی شت.
تۆپەڵەشەڕێ: شەڕەتۆپەڵ.
تۆپەوانە: پارچە پەڕۆیەکی پێچراوەی خڕ هەڵدراوە دەئاخنرێتە دەمی کووپە و گۆزە.
تۆپێن: یاریکردن بەتۆپ.
تۆپیگ: تۆپیو.
تۆپین: وتەیەکە لە باتی وتەی مردن بەکاردێنرێ لە رووی سووکییەوە بۆ سەگ و بەراز و هێندێ گیانداری تر. بریتییە لە نووستن (لە رووی سوکییەوە دەوترێ بەیەکێک).
تۆپیو: مردارەوەبوو. نوستوو، (لە رووی سووکییەوە دەوترێ).
توت: ز. دەنگێکە سەگی پێ دەردەکرێ.
تۆت: ز. کوندەبەبوو.
تۆتکە: ئارام و سرەوت.
تۆتکەخواردن: توێتکەخواردن.
تۆتکەگرتن: توێتکەگرتن.
تۆتۆبی: کولێرەیەکە توێ توێ دروست دەکرێ و پیاز و کاکڵە گوێزی تێ دەکرێ.
تۆتیا: کل. ڕۆح تۆتیا. بریتییە لە شتی زۆر ورد: ئاردەکە بووە بەتۆتیا واتە وەکو تۆتیا وردە.
تۆخ: هەموو جۆرە ڕەنگێکی تێر.
توخس: گیانداری چەمووش.
توخم: تۆو. نەژاد و ڕەسەن (د).
توخن کەوتن: قەرەکەوتن و نزیکبوونەوە لە شتێک.
توخوب: با: سنوور.
توخوت: ز. ئیزرەم لە شت.
تور: مەردوومی تر. (تورەتور) ترەتر.
تۆر: تۆران: (تۆر)ی کردووە واتە تۆراوە.
تۆراخ: ماستێکە کرابێتە کیسەوە و ئاوەکەی ڕۆیی بێ. هیزە (د). مەشکە (د).
تۆراغ: تۆراخی ماست.
تۆراغان: د. تۆراغدان.
تۆراغدان: دەفرێکە تۆراغی ماستی تێ دەکرێ.
تۆران: دڵگیربوون لە شتێک و دەست لێ هەڵگرتنی.
تۆراندن: دڵگیرکردنی یەکێک بەڕەنگێک کە بتۆرێ.
تۆرانی: ز. تۆرتۆرە. سەگێکە کە تۆرا نەتەیەوە ماڵی خاوەنی.
تۆراو: کەسێکە کە تۆری کردبێ.
توربە: جۆرە کیسەیەکی گەورەی تەنراوە شتومەکی تێ دەکرێ.
تورت: شتێکە لە شکانا زوو بپەڕێ. جۆرە تامێکە لە تفت کەمتر.
تورتبوونەوە: پنربوونەوەی شت.
تۆرتۆر: ز. جۆرە ترێیەکی ڕەشی دەنک پچووکە.
تۆرتۆرە: ز. کەسێکە لەبەر تەمەڵی هەڵنەسووڕێ و نان پەیا نەکا.
تۆرتەماڵ: د. لاپاڵ و هەڵدێرگە.
تۆڕ: ولاخی بزێو. شتێکی چنراوی کون کونە ماسی و پەلەوری پێ ڕاو دەکرێ. کەوباڕ. پەردەیەکە لە چاویەشەوە پەیدا دەبێ بەسەر چاودا دەکشێ.
تۆڕتۆڕاویلکە: شتی زۆر تراو.
تۆڕتۆڕکاو: تۆڕتۆڕاویلکە.
تۆڕتۆڕە: تۆڕتۆڕاویلکە.
تۆڕەوان: کەسێکە بە تۆڕ ماسی و پەلەور بگرێ.
تۆڕی: گیانداری خوێڕی.
تورش: ترش.
تورشیات: ترشیات.
تورشیاگ: د. شتێکە کە ترشابێ.
تورشیان: د. ترشان.
تورشی: ترشی.
تۆرکردن: تۆران.
تورمە: زیوی پاکی بێ خەوش. ئاوریشم: ئەم کاغەزە یا ئەم شاڵە (تورمە)یە.
تورنتە: باڵندەیەکە لە واشە پچووکترە ڕاوی چۆلەکە و کۆتر دەکا.
توروەتە: د. هەلەکە سەما.
تۆرینۆک: کەسێکە کە زۆر بتۆرێ.
تۆری: ز. چەقەڵ.
تۆرین: تۆران.
تۆز: گەرد و وردە خۆڵێکە کە لە شت ببێتەوە. شتێکی زۆر کەم: (تۆز)ێ ئاوم بەرێ واتە کەمێک.
تۆزاڵ: تۆزقاڵ.
تۆزقاڵ: کەمێک لە شتێک.
تۆزکردن: بریتییە لە ئاژاوەنانەوە: فیسارکەس لەهەر شوێنێک بێ (تۆز دەکا) یا خۆی لێرەیە و کلکی لەوێ (تۆز دەکا).
تۆزلانە: د. تۆزاڵ.
تۆزلقان: تۆزقاڵ.

تۆسی: د. توێسی.
تۆسقاڵ: تۆزقاڵ.
تۆشل: ز. توێکڵی دار.
تۆشە: توێشوو.
تۆشەبەرە: توێشەبەرە.
تۆشەدان: تێشوودان.
تۆف: کاتی سەرما و بەفر و با.
تۆفاڵ: د. تلّپە.
تۆفڵ: د. تۆشل.
تۆفە: مووری دیوار: ئەم دیوارە (تۆفە)یە، واتە بەموور کراوە.
تۆڤ: ز. تۆو.
تۆقاندن: ترساندن. تەقاندنی بلۆق.
تۆقانن: تۆقاندن.
تۆقکردن: ماندووبوونی منداڵی ساوا لەبەر زۆر گریانی.
تۆقلە: شوێنێکە لە ئەندام کە هەڵتۆقیبێ.
تۆقلەکردن: هەڵتۆقین.
تۆقیان: د. تۆقین.
تۆقین: زۆرترسان. تەقین.
تۆک: د. توێک.
تۆکل: د. توێکڵ.
تۆکمە: شتی قورسی پتەو.
تۆکمەچی: کەسێکە شتی تۆکمە داڕێژێ.
تۆل: جۆرە تەنراوێکی دەستییە سەوز دەکرێ و دەکرێ بەکالا. کوڕی لاو. سەگێکە کە تووکی کورت بێ (ز). حەیف (ز).
تۆڵ: د. توولە.
تۆلا: تەلاشێکی ئەستوورە لە پەنیر و گەزۆی داگیراو. تەلا.
تۆلاز: ز. کەسێکە هیچ شتێکی پێ نەنگ نەبێ.
تۆلاش: تەلاش.
تۆلاشە: د. تەلاش.
تولە: ل. تۆڵەکە.
تۆڵە: توولە.
تۆڵە: پاداشی چاکە یا خراپەدانەوە. بژاردنی شتێک: لە (تۆڵە)ی ئەسپێکدا ماینێکم دا.
تۆڵەک: گیاندارێکە کە تووکی وەربێ. (تۆڵەککردن) هەڵوەرینی تووکی گیاندار.
تۆڵەکە: گیایەکی بەهاری گەلا گردە دەکوڵێنرێ و بۆ ڕەوانی دەخورێ.
تۆم: تۆو.
تۆماتێز: تەماتە.
تۆمار: چەند کاغەزێکی نووسراوی جوانی خەتخۆشە کە بە سرێش لە یەک درابێ و لوولەکرابێ بۆ ئەوەی کە قوتابی بەر و دوا بیخوێنێ و لە بەری بنووسێتەوە و لە سەری فێری کاغەزنووسین و خوێندنەوە بێ.
تۆمانی: ز. جۆرە هەرمێیەکە.
تۆمپز: هـ. مستەکۆڵە.
تۆمە: تۆو.
تومەز: وتەیەکە دەبێژرێ لە کاتێکدا کە بەتەمای شتێک بووبیت و کەچی بەپێچەوانەی ئەوە شتەکە بووبێ: چووم بۆ لای فیسار کەس کەچی لەوێ نەبوو (تومەز) لەپێش مندا چووبووە دەرێ، یا چووم بۆ فیسارە شوێن کەچی فیسار کەس لەوێ بوو (تومەز) ئەویش بانگ کرابوو.
تون: توند.
تونبوون: توندبوون.
تونجک: ز. پەرچەم.
توند: شتێکە شل نەبێ. شتی قایم کە لە شوێنی خۆی نەلەقێ: ئەم سنگە (توند)ە واتە نالەقێ. مەردوومی تووڕە. شتی کەسکین. خێرا: (توند)بڕۆ واتە خێرا بڕۆ.
توندبوون: تووڕەبوون. قایمبوونی شت.
توندبوونەوە: خەستبوونەوەی شتی شل. قایمبوونەوەی شتی لەقیو.
توندکردن: تووڕەکردن.
تاودانی وڵاخ: تاریکبوونی بەری ئاسمان بەهەوری تاڵ. قایمکردنی شت.
توندکردنەوە: قایمکردنەوەی شتی لەق. خەستکردنەوەی شتی شل.
توندە: بریتییە لە چێشتی قوبووڵی و پلاو.
توندی: کەسکوونی. سەختی و ئاڵۆزی. تووڕەیی.
تونگ: توند. گۆزە (د). شەربە (د).
تونگبوون: توندبوون.
تونگبوونەوە: توندبوونەوە.
تونگکردنەوە: توندکردنەوە.
تونگە: بەن یا دەزوویەکە جۆلا لەپاش ڕایەڵکردنی دەیکا بەگڵۆڵە. پارچەیەکی تەنراوی سفتی هەڵدرواوە وەک جەوەندە ئاوی تێ دەکرێ. توندە. شەربە و گۆزە.
تونگی: توندی.
تونی: توندی.
تونەوبوون: د. توندەوەبوو.
تونەوکردن: د. توندکردنەوە.
توو: درەختێکی بەرزی گەلاپانە بەرێکی وردی شیرین دەگرێ لە بەهاردا. بەری داری توو. تۆو. تۆ: توێژ (د). توێی شت (د).

تۆو: چەند دەنکێکە لەناو بەری هەموو میوە و سەوزییەکدا هەر حەلێ بنێژرێ دەڕوێ.
تووا: د. شتی توێبوو. تواکردن توێکردنی شت.
تواشا: د. تەماشا.
تواشاخانە: د. تەماشاخانە.
توانا: د. تەوانا، تەوانایی: (توانا)م نییە.
توانایی: د. تەوانایی.
تواندنەوە: شلکردنەوەی شت بە ئاگر.
توانشت: د. تەوانایی.
توانەوە: شلبوونەوەی شت بە هۆی گەرمی یا تەڕییەوە.
تووبرە: ل. توورەکەی سەری وڵاخ.
تووبەرە: د. توورەکەیەکە تۆوی تێ دەکرێ بۆ سەر زەویوزار بۆ چەندن.
تۆوبێستان: تۆوی کاڵەک و شووتی.
تووت: ل. توو.
تووتاک: ز. قومری.
تووتانن: د. دواندن و سەرنانە سەر بۆ هێنانە قسە.
تووترک: جۆرە دڕکێکی هەمیشە سەوزە لە گەڵا و باڵادا وەک گوڵەباخ وایە بەرێکی مێخۆشی خڕ دەگرێ وەک شاتوو بەڵام ئەم وردترە.
تووترواسک: مەلێکە وەک چۆلەکە بەڵام ئەم کلکی درێژترە و زۆر بزێوە.
تووتک: بەچکەی سەگ. تووتی (د).
تووتکە: تووتک. کرمێکە کەسێک کە هاربووبێ دایدەنێ.
تووتم: د. ترشی سماق.
تووتن: گیایەکی گەڵاپانی تاڵە دەچێنرێ لە پاشا وشک دەکرێ و بە جگەرە یا قەندە یا سەبیل یا نێرگەلە دەکێشرێ.
تووتنانە: شەکر یا دراوێکە ئاغادێ لە خاوەن تووتنی دەسێنێ.
تووتنەوان: کرێکارێکە تووتن بەرهەم بێنێ.
تووتە: پەنجە پچکۆلەی دەست و پێ. تووتکە سەگ. سەگ (ه). گۆشتێکی زیادە لەسەر پێڵووی چاو پەیدادەبێ (د).
تووتەکۆڵە: ه. تووتکە سەگ.
تووتەڵە: تووتک.
تووتی: باڵندەیەکی سەوزی سەر خڕی دەندووک کەوانەییە بەقەد واشەیەک دەبێ دەڵێن فێری هێندێ وتە دەبێ.
تووجی: د. بڵاوکردنەوە. بەشکردن.
تۆوچان: چارەکەیەکە تۆوکەر تۆوی تێ دەکا بۆ چاندنی.
تووچانن: د. فلیقاندنەوە. پانکردنەوە. کوتان.
تووچن: د. شتی لینج.
تۆوچێن: کەسێکە کە تۆو بووەشێنێ بەزەوییدا.
توودرک: تووترک.
توور: گیایەکی پایزیی توونی گەڵاپانە سەلکێکی گەورەی توونی کلکداری هەیە دەخورێ. جەواڵی پچووک (ز).
تووراق: ز. تۆراخ.
تووڕاندن: فیڕاندن. هەڵتیزاندنی وڵاخ.
تووڕدان: فڕێدانی شتێک.
تووڕک: تووترک، توورک.
تووڕکە: زەویی سوورکاری دادڕ دادڕ.
تووڕە: کەسێکە زۆر زویر ببێ و هەڵچێ. (تووڕەبوون) زویربوون و دڵگیربوون. (تووڕەکردن) زویرکردن و دڵگیرکردن.
تووڕە و ترۆ: کەسێکە لە خۆیەوە هەڵچێ و زویر ببێ.
تووڕەیی: بوونی مەردووم بەتووڕە.
توورک: ز. چەقەڵ.
توورە: ز. لقی مێو و شتی تر.
توورەکانە: بەشێکە لە خەرمان کە دەدرێ بە سەرکاری ئاغادێ.
توورەکە: دەفرێکە هەڵدەدروێ بۆ شت تێکردن.
توورەکەڕێژ: گردێکە لە گڵ کە بەکۆڵی مەردووم دروست کرابێ.
تووز: درەختێکە چووز کرابێ. تۆز (ز).
تووزان: خلیسکان. چووزانەوە (د).
تووزانن: د. چووزانەوە.
تووزانەوە: چووزانەوە.
تووزک: ز. گیای توون.
تووزکردن: پەیوەندکردنی درەخت.
تووزیان: کسپە و چووزانەوە. هەڵخلیسکان.
تووزیانەوە: د. چووزانەوە.
تووژ: توێژ (د). تیژ (ز).
تووژاڵ: د. توێژاڵ.
تووژگ: توێژ (د). خەنجەر (ز).
تووژی: د. تووجی.
تووش: گیانداری چەتوون. ڕۆژی سەرما و سۆڵە. ڕێوبانی سەخت.
تووشاڵ: د. توێژاڵ.
تووشبوون: گەیشتنی دوو شت بەیەک. بریتییە لە دووچاربوون بەچورتمێک.
تووشک: د. تووژگ.
تووشکردن: دووچارکردنی یەکێک بەچورتمێک.
تووشیار: د. دووچار. گەیشتنی دووکەس بەیەک. (تووشیاربوون) دووچاربوون. بەیەکگەیشتن.
تووفانە: د. مێشوولە.
تووک: مووی گیاندار. ڕەوشت و خوو (با). کەیف: فیسار کەس بە (تووک)ە.

تووکانن: د. ترووکاندنی هێلکه.
تووکڕوونی: بریتییه له بوون و دڵنیایی و بێ خەفەتیی یەکێک: فیسار کەس زۆر (تووکی ڕوون)ه.
تووککردن: دەرهاتنی پەڕ لە بەچکەی باڵندە.
تووکن: شتی تووکدار.
تووکنه: تووکن. زەڕنەقووته.
تووکە: د. پرووشەی باران. تووکەتووک: پرشەکردنی باران.
تووکەکردن: بارانی وردبارین.
تووکەسەر: کەسێکە بە سەرنانەسەری تووڕە بووبێ. (تووکەسەربوون) تووڕەبوون و ڕق هەستان. تووکەسەرکردن: تووڕەکردن و ڕق هەستاندن.
تووکەی سمێڵ هاتن: بریتییه له کەیفخۆشی و بزەگرتن.
توول: جۆرە برنجۆکێکە.
تووڵ: لقی باریکی تازەی نەرمی درەخت. قەڵەم (د).
تووڵبڕ: بریتییه له کەسێک کە بەدیمەن بەشتێکەوە خەریک بێ و کەچی بەدڵ گوێی بۆشتێکی تر هەڵخستبێ: فیسار کەس و فیسار کەس قسەیان دەکرد من خۆم لێ کردن بە(تووڵبڕ).
تووڵکێش: ڕاکێشانی تووڵی مێو بەسەر زەویدا و داپۆشینی لە هێندێ لاوە بەگڵ تا لەو جێگایانەوە ڕەگ دابکوتێ و بڕوێ، ئینجا ناوەندەکانی ببڕێ تاکو هەریەکە ببێ بەمێوێکی سەربەخۆ.
تووله: جۆرە سەگێکی پچووکە.
توولەزەڕە: تووڵەزەڕە.
تووڵەزەڕە: گیایەکی هاوینییە بەرێکی سووری وردی مزری ناسکی هەیە.
توولەک: مەردوومی گەنجی تازە پێگەیشتوو. گیاندارێکە کە تووکی وەربێ.
تووڵەک: ڕێوییەکە تووکی وەربێ. (تووڵەکبوون) وەرینی تووکی ڕێوی. (تووڵەککردن) تووڵەکبوون.
توولەمار: ماری باریکی پچووک.
تووڵی سەوز: گیایەکی لق لقە بەرێک دەگرێ وەک گۆێژ بەڵام ئەم درێژکۆلەیە.
تووڵینه: قووڵینەیەکە کە لە تووڵی باریک دروست کرابێ.
تووم: د. تۆو.
تووماته: د. تەماته.
توومه: د. تۆمه.
توومەدان: د. تۆمەدانه.
توومەدانه: د، توومەدان.
توون: شوێنی ئاگرکردنی حەمام. شتی کەسکوون.
توونا: گیانداری دەربەدەر.
توونابوون: دەربەدەربوون. (تووناکردن) دەربەدەرکردن.
توونـاوتوون: توونا.
توونچی: کەسێکە لە تووندا ئاگر بکا.
توونخانه: توونی حەمام.
تووەڕەشه: شاتوو.
تووەسووره: جۆرە توویەکی سووری مزره.
تۆی: لۆیەک لە شتێک: (توێ)یەک بەرگم لەبەردایە.
توێانە: نوقڵێکە دەخرێتە ناو کاڵای بووکەوە لە ماڵی زاواوە دەنێردرێ.
توێتکه: دانیشتن و سرەوتن.
توێتکەخواردن: ئارامگرتن و سرەوتن.
توێتکەگرتن: توێتکەخواردن.
توێتوێ: جۆرە گۆرانییەکە دەوترێ بۆ مانگا لە کاتی دۆشینیدا. شتی توێ لەسەر توێ.
توێخ: توێکڵێکی تەنکە بەسەر هێندێ شتەوە.
توێژ: چەورییەکی تەنکە دەکەوێتە سەرماست و شیر بەهۆی کوڵاندنیانەوە. قەتماغەیەکە دەکەوێتە سەر برین و هێندێ شتی تر.
توێژاڵ: توێژی تەنک.
توێژگرتن: پەیدابوونی توێژ لەسەر هێندێ شت. گرتنەوەی توێژی شت.
توێسوو: توێسی.
توێسی: گیایەکی دڕکاوییە لا قەدەکەی بریندار دەکرێ تا جەوی دەربدا.
توێشوو: خواردەمەنییەکە کە ڕەفتەنیی لەگەڵ خۆیدا بیبا بۆ ڕێگا.
توێشووبەره: تویشوودان.
توێشوودان: شتێکە کە توێشووی تێ دەخرێ.
توێشووکردن: دروستکردنی توێشوو. نانخواردنی بەیانی.
توێشەبەره: توێشوودان.
توێک: توێخ.
توێکردن: توێژاڵ توێژاڵکردنی گۆشت بۆ برژاندنی.
توێکڵ: پێستێکە بەسەر دار و درەخت و میوە و هێندێ شتی ترەوە.
توێڵ: د. تەوێڵ.
توێڵاش: تەڵاش.
توێڵبەن: د. دەسرۆکەیەکە ژنان دەیبەستن بەناوچەوانیانەوە.
تویری: ز. چەقەڵ.
تویل: ناوچەوان.
ته: ز. تۆ.

تەبا: کەسێکە کە لەگەڵتدا ڕێک بێ: فیسار کەس لەگەڵتدا (تەبا)یە.
تەباخچە: ز. سینی فنجانی قاوە.
تەبارە: کەڵەکێک یا نیشانەیەکە لە ناوەندی دوو شوێندا بکرێ بۆ جیاکردنەوەیان لە یەکتری. دەغڵێکە کە هێشتا بەپێوەبێ و دروێنە نەکرابێ. قەبارە.
تەبانە: ز. بانگردێن.
تەبر: ل. تەور.
تەبوور: ز. شەن.
تەبەتۆر: ز. خانووی جاڵجاڵۆکە.
تەبەرزین: تەورزین.
تەبەش: ز. جۆرە مەڕێکە.
تەبەق: دەردێکە وەک (شەلکە) تووشی ڕەشەوڵاخ دەبێ و ژێر سمی بریندار دەکا.
تەبەقە: تەبەق.
تەبەقەترانە: شتێکە دەسێنرێ لە یەکێک کە لەناو مەردوومدا تری لێ بەربووبێتەوە.
تەبەک: لەنگەریی.
تەبەلیە: ل. جۆرە پشتێنەیەکە پێی سەر دەکەون بەدارخورمادا.
تەبەنە: سووژنی کڵاش چنین.
تەپ: پیسیی ئادەمی یا ڕەشەوڵاخ کە پان بووبێتەوە. فروفێڵ (ز). فێ (با). تەپۆڵکە و گرد (د). کۆمەڵەیەک لە شت.
تەپارک: ز. قوڕ و شیاکەیەکە تێکەڵ کرابێ و دەمی کوورەی هەنگی پێ سواغ درابێ.
تەپاڵە: شیاکەی وشکەوەبوو.
تەپان: گرێژەنەی دەرگا. خوانکەی ئاش. گەڵا کوتک (ز).
تەپاندن: قوپاندنی بان و هەموو شتێک کە ژێری بۆش بێ. ئاخنین و پڕکردنی شت: لەکاتی خواردندا زۆری تێ (مەتەپێنە).
تەپانن: تەپاندن.
تەپاوتل: تلدان بەپاڵکەوتنەوە.
تەپە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی پێی وڵاخ و زەلام.
تەپتەپان: د. تەپەتەپکردن.
تەپتەپە: ئەسپە ئاسنینێکە کە بەئاگر دەڕوا و تەپەتەپی لێ دێ.
تەپخ: شوێنێکە کە ڕووخابێ و تەخت بووبێ. (تەپخبوون) ڕووخان و تەختبوون. (تەبخکردن) ڕووخاندن.
تەپدان: د. خڕکردنەوە و کۆمەڵکردنی شت. تەپدانەسەر.
تەپدانەسەر: هەڵمەت بردنەسەر شتێک و داگیرکردنی.
تەپرەش: ز. فێڵباز.
تەپس: د. تەپین.
تەپشوو: تێشوو.
تەپک: ز. تەپکە.
تەپکردن: ز. خۆ متکردن لە ترسی شتێک.
تەپکە: گەمرە یابەردێکە لەسەر چاڵێک بەچیلکەیەک بەئاستەم ڕادەگیرێ بۆ ئەوەی ئەگەر باڵندەیەک بچێتە ناویەوە تەپکەکە بەسەریدا بکەوێ و بیگرێ. تەپاڵە. تەپۆلکەی پچووک.
تەپل: نەقشی سەر پەنجەی دەست کە لەسەر کاغەز دەگیرێ.
تەپڵ: چەرمێکی خاوە دەگیرێ بەدەمی دەفرێکی قووڵدا بۆ ئەمەی کە بەدار لێی بدەن و دەنگی لێوە بێ.
تەپڵژەن: کەسێکە کە تەپل باش لێ بدا.
تەپلک: ز. تەپڵ.
تەپلۆس: مەردوومی تەمەڵی کارلێ نەهاتوو.
تەپلە: جۆرە کڵاوێکی قووڵی یەک پارچەیە لە خوری یا مەرەز یا کورک یا بەرگن دروست دەکرێ. تەپکە (د). تەپڵەکی جگەرە.
تەپڵە: کەلارە.
تەپڵەسەر: تەوقەسەری هەموو شتێک.
تەپلەقوو: دارێکی کێوییە لە بەلاڵووک دەچێ.
تەپڵەقوو: تەپلەقوو.
تەپڵەک: سەرە دارێکی درێژکۆلەیە دەخرێتە سەر کۆڵەکە و نیرگەی لەسەر دادەنرێ. پارچەیەکی گردە لە ناوەڕاستی کلاودا. مێزێکی پچکۆلەی بەرزە لەبەردەمی کورسیی دانیشتندا دادەنرێ بۆ جگەرە و چایی لەسەر دانانی. دەفرێکی پچکۆلەیە جگەرەی داگیرساوی لەسەر دادەنرێ. خانوویەکە سەربانەکەی گڵەبان نەکرابێ بەڵکو هەر زەلی لەسەر دانرابێ بەڕەنگێکی وا کە ئاو بڕژێ.
تەپۆ: جۆرە مێشوولەیەکی گەورەیە.
تەپ و تل: تەپاوتل.
تەپ و تۆز: تۆز و گەردی زۆر.
تەپوخ: د. مەردوومی سەرەنگرێ.
تەپ و کۆ: کەوتن و هەستانەوە: فیسار کەس بەشەو هەر (تەپ و کۆ)یەتی واتە لەبەر کزیی چاوی هەر دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە.
تەپۆکە: تەپۆڵکە.
تەپۆڵکە: کۆسپاییی زەوی.
تەپۆڵە: تەپۆڵکە.
تەپۆنکە: تەپۆڵکە.
تەپونم: بارانی هێواشی لەسەرخۆ لەکاتێکدا کە تەمومژ دای دابێتە سەر زەوی.
تەپە: تەپپە. (تەپەتەپ) تەپەی یەک لەدوای یەک. (تەپ و هوڕ) تەپەتەپی زۆر. گردی پچکۆلە. دارێکی گردی لووسە بەبنمیچەوە ڕایەڵی تەونی دەخرێتە سەر.

تەپەترە: بریتییە لە منداڵی تازە پێ گرتوو کە زوو زوو بکەوێ.
تەپەدان: د. تەپدان.
تەپەدۆر: جۆرە دارێکی نەرمە وەک پووشوو سەرقاپی شووشەی لێ دروست دەکرێ.
تەپەدوکەڵ: چەرەدوکەڵ.
تەپەکلاو: د. تەپڵەکی کولەکە و ستوونی دەوار.
تەپەڵۆک: تەپاڵەیەکە کە بۆ سووتاندن پان کرابێتەوە.
تەپیان: د. تەپین.
تەپین: قـوپانی بان و هەمـوو شـوێنێک کـە ژێری بۆش بێ لەبەر قورسی. قـوپانی کاڵەک و شـووتی لەبەر کـۆنی. بریتـییـە لە بەناوداچوونی مەردووم لەبەر پیری. لێدانی دەمار (د).
تهتاڤک: ز. نەعنا.
تەتک: ز. دەستکێش.
تەتڵەمیران: کرمێکی بازەڵەی بەهارییە دوو ریز قاچی هەیە.
تەتن: قوڕ.
تەتە: وتەیەکە منداڵی ساوا بەشتی جوانی دەڵێ. بوکڵەیەکە لە هەویر یا قـوڕ دروست دەکـرێ و منداڵان یـاریی پێ دەکـەن. تەختـەیەکی تەنکە گـۆزە و دیزەی پێ لـووس دەکـرێ لەکـاتی دروستکردنیدا.
تەتەر: کەسێکە بەدەستوبرد نامەی مەردووم ببا بۆ خاوەنی.
تەتەشۆر: د. تاتەشۆر.
تەتەڵە: پارچە تەختـەیەکی لووسە ئەلفوبێی تێدا نووسرابێتەوە بۆ منداڵ. سێبـەندە (هـ). ڕوومـەت (د). پاککردنی دانەوێڵـە بەهەڵتەکاندنی بەلەنگەری.
تەتەڵەکـــردن: پاککـردنی دانەوێڵـــە و بەرد لێ گـــرتنی بەهەڵتــەکـاندنی بە سـینی یا بەلەنگەری. هەڵەکـردن لە گفتوگۆدا. سەرکردنی گوللە و پلار لە نیشان شکاندندا.
تەتەڵەمیران: تەتڵەمیران.
تەجەنەر: سابرین.
تەحاتەحا: باس و خـواسێکە کە بەسـەر دەمی هەمـووانەوە بێ و مایەی سەرسوڕمانیان بێ.
تەحت: شاخ و داخی بەردین.
تەحح: پەحح.
تەححا: پەححا.
تەحر: شێوە.
تەحرە: ز. قرچەی نیوەڕۆ.
تەحسین: ز. پێ هەڵخلیسکان.
تەحفیل: ز. شوشتنی شتی گڵاو حەوت جار.
تەحل: با. تاڵ.
تەحلک: ز. پیاوی ڕەشتاڵە.
تەحلەسیف: ز. کاڵەکە مارانەیەکە دەخورێ.
تەحلیشک: ز. ئاوی تاڵی سوێر.
تەحلی: ز. گیایەکی تاڵە. تاڵیی هەموو شتێک.
تەحین: با. دۆشاوی کونجی.
تەخ: ز. دەنگێکە گاجووتی پێ دەگێڕدرێتەوە.
تەخار: تەغار.
تەخاراو: تەغاراو.
تەخت: شـتی پانی ڕێکی بێ گـرێ و قـۆرت. جـۆرە کورسـیـیەکـە لەسەری دادەنیشن. چارپایە (ل).
تەختان: تەختایی.
تەختانی: شوێنی تەخت لە زەوی.
تەختایی: تەختانی.
تەختبوون: ڕێکبوونی شوێنێک. بریتییە لە نەمانی گرێ و قۆرت و بەرهەڵست لە کارێکدا.
تەخترەوان: د. تەختەرەوان.
تەختکردن: ڕێکخسـتنی شـوێنێک. بریتـیـیـە لە بەزەویدا دانی یەکێک.
تەختە: دارێکی پانی تەنکی داهێنراوە. پارچەی دەوار و جاجم و پۆپەشمین و بەرماڵ و مەوج کە لە یەک دەدرێ: جاجمەکە یا دەوارەکە چوار (تەختە)یە.
تەختەبەن: تەختەبەند.
تەختەبەند: جۆرە کورسییەکی گەورەی بەرزە لێک دەدرێ و خێزان لەسەری دەنوێ.
تەختـەپۆش: شـوێنێکە کـە بەتەلەبەرد داپۆشـرابێ. فـەرشکردنی شوێنێک بە تەلەبەرد.
تەختـەرەوان: ژوورێکی پچکۆلەیە لە تەختـە لەسـەر پشـتی دوو ولاخ یا زیاتر هەڵدەگیرێ و چەند کەسێکی تێدا دادەنیشێ.
تەختـەزەنگ: د. پارچە ئاسنێکی هەڵواسـراوە لە مـەکـتـەب و کارگەدا هەر ساتە ناساتێ لێی دەدرێ بۆ پێشاندانی کات.
تەختەسڕ: شتێکە تەباشیری سەر تەختەی ڕەشی مەکتەبی پێ دەسڕدرێتەوە.
تەخدەمە: ز. بەرکوت.
تەخسیر: ز. نچەتا.
تەخشک: با. ڕفەی سەرتاق.
تەخشەلاکوم: د. جووڵەجووڵ.
تەخلیت: ز. نەوع: ئەمە دوو (تەخلیت)ی هەیە واتە دوو نەوعی هەیە.
تەخنک: ز. لەنگەری.
تەرابوون: ز. کەوتنە خوارەوە لە بەرزییەوە.
تەرات: د. سەڵەفکردن و تاودان.

تەراتێن: هاتوچۆکردنی گیاندار بەهەرا کردنەوە.
تەراخومە: جۆرە دەردێکی پەرەسێنە دەگا بەچاو.
تەرار: با. جامی ئاوخواردنەوە.
تەرازوو: ترازوو.
تەرازووباز: ترازووباز.
تەراش: تاشینی سەر یا ڕیش: (تەراش)بووم یا (تەراش)م کرد.
تەراشتن: ز. تاشین.
تەراف: ز. قوناری مێو.
تەرافکرن: قونارکردنی مێو.
تەرکرن: ز. هاویشتنی شت لە بەرزییەوە.
تەرال: ز. پیاوی تەمەڵ.
تەرانە: ز. یاری و گاڵتە.
تەری: دارێکی کوێستانیی هەمیشە سەوزە بەرێکی خڕی سوور دەگرێ وەک بەلاڵووک بۆ ڕەوانی دەخورێ.
تەرپلین: ز. سەرسمدانی وڵاخ.
تەرپۆش: د. تەڕپۆش.
تەرتوول: ز. هاریە.
تەرچک: د. گیای تازە دەرهاتووی ناسکی نازاو.
تەرح: جۆر: ئەم (تەرح)ەم دەوێ. تاحر. شووتیی نەگەییو.
تەرحەک: کۆڵە درک.
تەرحی: ز. سەرپۆشی ژن.
تەرخان: ترخێنە. شوێنێک یا شتێکە کە قەدەغە کرابێ. (تەرخانکردن) جیاکردنەوە و قەدەغەکردنی شتێک یا شوێنێک بۆ کارێک.
تەرخوون: گیایەکی توونی خۆشی گەڵا باریکە بەگۆشتەوە دەخورێ.
تەردەس: د. تەڕدەست.
تەردەسی: د. تەڕدەستی.
تەڕ: شتێکە کە شێی ئاوی ببێ. شتی ڕوون: ئەم دۆیە (تەڕ)ە واتە ڕوونە. تەڕە (د).
تەڕاد: ڕمبازیکردنی چەند سوارێک. سمت.
تەراف: پارچە گۆشتێکی تەنکی پانە وا لە ناوەندی ڕیخۆڵە و جەرگ و سیدا. گۆشتی بۆشاییی خوار کەلەکە.
تەراڵ: د. تەمەڵ.
تەراو: سپیکردنەوەی ناوماڵ بەگڵەسپی گیراوە.
تەرا و بەرابوون: با. پەرشوبڵاوبوونەوە.
تەرایی: شوێنی تەڕ.
تەربوون: بریتییە لە عارنان و پەند وەرگرتن: فیسار کەس هەرگیز (تەڕ نابێ) هەر لە نەبووندا بەکاردێنرێ.
تەربوونەوە: بریتییە لە ژنهێنانی پیاوێکی بەساڵاچوو لە پاش مردنی ژنی پێشووی یا تەڵاقدانی.
تەڕپوش: بریتییە لە یەکێکی بەساڵاچوو کە بەرگ و کاڵای جوان لەبەر بکا.
تەڕدەست: بریتییە لە یەکێک کە بەدەستوبردبێ لە ئیشوکاردا.
تەڕدەستی: بریتییە لە چالاکی لە ئیشوکاردا.
تەڕدەم: بریتییە لە مەردوومی قسەزانی قسەڕەوان.
تەڕزمان: د. تەڕدەم.
تەڕفرۆش: تەڕەفرۆش.
تەرک: داری تەری ئەستوور.
تەرکردنەوە: بریتییە لە گیادان بەوڵاخی بەرزە لەباتی کا و جۆ لە بەهاردا.
تەرلان: گیانداری شۆخ و شەنگ. بازی گەورە
تەرلە: گیایەکی بەهارییە لەناو دار و دەوەندا دەڕوێ و بەسەوزی دەخورێ.
تەڕن: زیان گەیاندن بەیەکێک بەبێ ئەمەی کە خۆی پێی بزانێ: فیسار کەس (تەڕن)ێکی پێ دام یا (تەڕن)ێکی پێ کردم. فیرۆ: بە(تەڕن) خانووەکەم لە دەست چوو.
تەڕ و بڕ: شتی تەڕ بەجۆرێک کە ئاوی لێ بتکێ.
تەڕ و تازە: شتی تەڕ و بڕ.
تەڕ و تووشی: کاتی باران و قوڕ و چڵپاو.
تەڕە: بریتییە لە سەبزە و میوە.
تەڕەبنە: د. جۆرە گیایەکە ئاژاڵ دەیخوا.
تەڕەپیاز: پیازی سەوزی گەڵادار.
تەڕەتۆڵەکە: بریتییە لە شتی هەرزان: گەنم بووە بە(تەڕەتۆڵەکە).
تەڕەتوو: تووی تازە و تەڕ.
تەڕەتوورە: تەڕەتیزە.
تەڕەتیزە: گیایەکی گەڵا وردی توونە بەگۆشتەوە دەخورێ.
تەڕەزەن: گیانداری تازە زاو کە شیری زۆر ڕوون بێ. گیایەکی کوێستانیی بۆنخۆشە بۆ مەڕ زۆر باشە.
تەڕەژەن: د. تەڕەزەن.
تەڕەساز: خواردەمەنییەکی مزرە لە بروێش و شێلمی جنراو دروست دەکرێ، لە ترخێنەی تەڕ تراوترە.
تەڕەساڵ: ساڵێکە کە بەفر و بارانی زۆر بێ.
تەڕەسڵێمانە: د. جۆرە گیایەکە.
تەڕەفرۆش: کەسێکە کە میوە و سەوزە بفرۆشێ.
تەڕەکاڵ: گەنمی بەراو.
تەڕەماست: با. کەرە. سەرتوێی ماست و شیرە کە لە پایزاندا چین چین لە دیزە یا لە پێستەدا دادەنرێ و لە زستاندا دەخورێ.
تەڕەماش: فەریکە ماش. وتەیەکە شتی هیچ و پووچی پێ دەشوبهێنرێ: (تەڕەماش)م خواردووە لە وەرامی یەکێکدا کە لێت بپرسێ چیت خواردووە؟ واتە شتێکی هیچ و پووچم خواردووە.

تەڕەماڵە: د. هێلەساوکردنی سواخ.
تەڕەماڵێ: د. تەڕەماڵە.
تەڕەنداز: تەڕپۆش.
تەڕەوکردن: د. تەڕکردنەوە.
تەڕەوون: دارێکی پچووکی تاڵی ئاوییە.
تەڕیانە: هـ. سەبەتەیەکە لە شووڵ دروست کرابێ.
تەڕی: تەڕایی.
تەڕیزە: بۆشاییی کەلەکە.
تەڕینە: هـ. دارێکی کوێستانییە گەڵای لە گەڵای هەنار وردترە و زۆر تاڵە، بەرێکی هەیە وەک (ڕەزڵە) بۆ ژانە سک زۆر چاکە.
تەرز: سەرلقی ناسکی هێندێ سەوزاییی وەک مێو و کاڵەک و شووتی. تەرزە.
تەرزە: شتێکی سپیی خڕی وردی ساردە وەک بەفر، هێندێ جار دەبارێ.
تەزرەشکێن: تەرزەکوت.
تەزرەکوت: بریتییە لە سەرزەنشت و ئامۆژگاری یەکێک یەک لەسەر یەک: (تەرزەکوت) دایگرت.
تەرزەلووکە: شتێکە نە وەک تەرزە ڕەقە نە وەک بەفر نەرمە و زۆر زوو دەتوێتەوە.
تەرس: پیسیی ماین و ئەسپ و ئێستر. کاری پێچەوانەی ناڵەبار: ئەم کارە (تەرس) هاتووە.
تەرسەقول: پیسیی کەر.
تەرفک: ز. پارچە گوریس.
تەرفین: ز. چاوپەشان بەهۆی شتێکەوە کە تێی بکەوێ.
تەرک: تەنیشت. تەرزەی دەنک گەورە. برین و دڕینی شت لە باری درێژی. پاشکۆ. خشڵی ژنان (د). چەکی جەنگ (د).
تەرکبەن: د. بەن سامۆتە.
تەرکبەند: تەرکبەن.
تەرککەوتن: لەجێ چوونی دەستی کەر.
تەرکە: پیکە. تووڵی تەڕ (د).
تەرکیبەس: بەن سامۆتە.
تەرکیبەن: د. تەرکبەن.
تەرکی: پاشکۆ.
تەرلان: تەڕلان (ز). بازی گەورە (د).
تەرم: حەوتەوانەی گەورە (ز). گوڵێتی مێو (ز). لاشەی گیانداری مردوو (ز). دارەمەیت.
تەرماڵ: ز. کەفەڵی گیاندار. شێوە و کاڵا.
تەرو: تەربی. تەڕەوون. کفر.
تەرواڵ: د. تەرواڵە.
تەرواڵە: هـ. هەرزاڵ.
تەروو: تەرو.
تەرووزی: د. ترۆزی.
تەروەندە: شتی نایاب.
تەرە: گیاندارێکی ماڵییە کە ڕەهندە بووبێ. (تەرەبوون) دەربەدەربوونی گیاندار. (تەرەکردن) دەربەدەرکردنی گیاندار.
تەرەجە: ل. تاق.
تەرەدوا: د. تەرەکردن و ڕاونان.
تەرەدین: ز. مەردوومی دەلووکار.
تەرەس: وتەیەکە لە وتەکانی جنێو و هەر بەپیاو دەوترێ.
تەرەقە: شتێکە وەک پوولەکە بەسەر قەوانی فیشەکەوە بەتروکاندنی دەمانچە و تفەنگ دەتەقێنرێ.
تەرەوون: تەڕەوون.
تەریڤین: ز. تووڕەبوون و ڕق هەستان.
تەری: ز. کلێنچکە. دووگ.
تەریب: ڕاستە درومانێکە چەپ و چێر بەسەر (باریکە) و (جوستە)دا دەڕوا.
تەریبدان: درووونی شت بەتەریب.
تەریدە: جەردە.
تەریق: شەرمەزار: (تەریقبوونەوە) شەرمەزاربوون. (تەریقکردنەوە) شەرمەزارکردنی یەکێک.
تەریقی: شەرمەزاری.
تەریک: مەردوومی کلای کەنارەگیر.
تەریکی: کەنارەگیری.
تەز: د. تەزوویەکە بەجەستەدا دێ.
تەزان: تەزین.
تەزاندن: بریتییە لە ئازاردان و دڵگیرکردنی یەکێک بەجۆرێک کە چاوترسێن ببێ. سارد و سڕکردنی شت بە بەفر یا بەسەهۆڵ.
تەزرە: تەرزە.
تەزگ: تەزوو. تەرزەی دەنک گەورە (با).
تەزوو: مووچڕک و لەرزینێکی بێ پەروایە دێ بەسەر ئەندامی گیانداردا لە سەرما یا لە ترسا یا لە بیستنی کیرەی هێندێ شتەوە. تەرزە.
تەزی: با. شتی زۆر سارد.
تەزیگ: تەزیو.
تەزین: سڕبوونی ئەندام لە سەرما یا لەبەر زۆر کەوتن بەسەریدا.
تەزیو: شتێکە کە زۆر ساردبووبێ. شتێکە کە سڕبووبێ.
تەژاندن: با. گوشین: دەستیم (تەژاند).
تەژگ: هەژگ. جۆرە کاڵایەکە کە لە کەتان کرابێ (ز).
تەژنە: هـ. تینوو.

تەژە: ڕایەڵی بنمیچ. بریتییە لە مەردوومی درێژی زەلام.
تەژی: با. پڕ. تێر.
تەس: وتەیەکە بزنی پێ لێ دەخوڕدرێ. وتەیەکە ئەسپ و ماین و ئێستری پێ لێ دەخوڕدرێ.
تەسک: شتێکە کە پان نەبێ.
تەسک و تروسک: شتی زۆر تەسک.
تەسە: نانگێن (ھ). کوولی هەویر تێدا شێلان.
تەسەل: گیانداری تێر. (تەسەلبوون) تێربوون. (تەسەلکردن) تێرکردن.
تەشاوی: د. کلاوڕۆژنە.
تەشبی: د. تەبەقەترانە.
تەشبی ترانە: د. تەبەقەترانە.
تەشپی: دەفرێکی پەلی دارینە.
تەشپی ترێن: بریتییە لە مەردوومی زۆرخۆر.
تەشپیلۆکە: تەشپی پچووک.
تەشت: دەفرێکی گەورەی دەم واڵی لێوداره لە مس یا تەنەکە یا لەوح.
تەشتولکە: تەشتی پچووک.
تەشتۆلکە: تەشتولکە.
تەشتیر: ز. گیسکە مێ.
تەشخەڵە: د. تەشقەڵە.
تەشق: تەوژمی ساردی: بەم بارانە (تەشق)ی ساردیی شکا.
تەشق شکان: نەمانی تەوژمی ساردی.
تەشقەڵە: گەڕ و فێڵ. (تەشقەڵەکردن) گەڕکردن بەمەردووم و بەگیرهێنانی بەناڕەوا بۆ داگیرکردنی شتێک لێی. بەڵا و چەپۆکی ڕۆژگار. بەرهەڵست و گرییەکە کە ئیشوکارت قەتیس بکا.
تەشقەڵەباز: مەردوومی گەڕکەر.
تەشک: تەنیشت. قەوارە و قەڵافەت (د). لاق (ز).
تەشککەوتن: تەرککەوتن.
تەشکەبەرە: وتەیەکە نووسراوی دووردرێژی پێ دەشوبهێنرێ لە کاتێکدا کە لەسەر پارچە کاغەزی گەورە نووسرابێ: فیسار کەس (تەشکەبەرە)یەکی نووسیبوو.
تەشگاھ: ل. مەقەڵی.
تەشوو: تەشوێ.
تەشوێ: ئاسنێکی مۆدەداری دەمپانی تیژی کلک دارینە داری پێ دەتاشرێ.
تەشە: د. تەشاوی.
تەشەر: توانج.
تەشەنەکردن: خۆخواردنەوە و تەنینەوەی برین.
تەشی: دارێکی کلک باریکی سەرخڕە قولاپێکی پێوەیە لۆکە و خوری بەدەست پێ دەڕێسرێ.
تەشی ڕستن: ڕستنی مووخوری و لۆکە بەتەشی. بریتییە لە مێچکە مێچکەکردن بۆ یەکێک.
تەشیرِیس: کەسێکە کە تەشی بڕێسێ.
تەشیرێسی: گوزەرانکردن بەڕستنی تەشی.
تەشیلان: ل. هەڵماتێن.
تەشیلە: لۆکە یا خورییەکە کە بەخەڕەک ڕێسرابێ و لە دووخ دامالرابێ. خولخولۆکەیەکی دارینە ماشەری پێدا دەکرێ و لەسەری دەکرێ بەگولۆلە. هەڵمات (ل).
تەشی هەڵکەر: دووداره یەکی کونێکی تێدایە ئەمسەر و ئەوسەری تەشیی پێدا دەکرێ و ڕێسراوی لەسەر هەڵدەکرێ.
تەعل: ز. تەحل.
تەعەد: ز. جۆرە گۆیژێکە.
تەغار: ئەندازەیەکە لە کێشان و پێوانی دانەوێڵە. سی ڕبە لە گەنم و جۆ و برنج (تەغار)ێکە. سی دانەیە لە هێندێ شت: سی گورگە (تەغار)ێکە.
تەغاراو: دەفرێکە پینەچی ئاوی تێ دەکا و چەرم و پێڵاوی کۆنی تێدا دەخووسێنێتەوە.
تەف: دیوێکە لە میچ.
تەفاری: ز. جۆرە هەنجیرێکی نایابە.
تەفاریک: ز. کەسێکە کە لە دێیەک دانیشتبێ و خەڵکی ئەوێ نەبێ، یا خەڵکی ئەوێ بێ و زەویوزاری لەوێ نەبێ.
تەفتیک: ز. کورک.
تەفر و توونا: کەسێکە لە شوێنێک ئاوارە و دەربەدەر بووبێ. (تەفر و توونابوون) دەربەدەربوونی گیاندار لە شوێنێک. (تەفر و تووناکردن) دەربەدەرکردن.
تەفرە: فریو.
تەفرەخواردن: فریوخواردنی یەکێک.
تەفرەدان: هەڵخەڵەتاندنی یەکێک.
تەفشۆ: ز. تەشوێ.
تەڤ: کۆمەڵ (ز). لەگەڵ (با).
تەڤتەڤیک: ز. کەمانچە.
تەڤدان: ز. تێکدانی چێشت لەسەر ئاگر.
تەڤدیر: با. تەگبیر.
تەڤر: ز. تەور.
تەڤز: ز. تەوس و گاڵتەپێکردن.
تەڤزین: ز. تەژین.
تەڤژین: با. شیاکەی شل.
تەڤلیهەڤ: ز. چەند شتێکن دانرابن بۆ ئەوەی کە ئامێتە بکرێن.

تەڤن: ز. تەون.
تەڤەر: ز. تەورزین.
تەڤالا: تەقەلا.
تەڤالک: ز. ولاڵە.
تەڤاندن: ئاگردانی چەک.
تەڤاندنەوە: لە بێژنگ و قەڵبیردانی دانەوێڵە بۆ گرتنی وردەی.
تەڤـانـن: تەقـانـدن. تەقـانـدنەوەی دانـەوێڵـە (د). چەسـپـانـدنـی شتێک بەشتێکەوە.
تەڤاننەوە: تەقاندنەوە.
تەڤاویت: کەسێکە کە ماوەی کارگوزاریی دەوڵەتی تەواو بووبێ.
تەڤتەڤووک: ز. چەقەنەی ئاش.
تەڤکردن: بریتـیـیـە لە زۆر گـریـان و مـاندوبوونی منداڵی سـاوا. وتەیەکـە بەمنداڵی سـاوا دەوترێ لە جـیـاتی وتەی (لێدان): (تەڤی کە) واتە لێی دە.
تەڤلە: کڵاو. یەکەم بەری هەنجیر کە بەنەبەکامی هەڵدەوەرێ.
تەڤڵە: خۆهەڵگێڕانەوە بە سەردا.
تەڤڵەباز: کۆترێکە بەئاسمـانەوە تەقڵە لێ بدا. کەسێکە تەقڵە باش لێ بدا.
تەڤن: با. قوڕ.
تەڤن: ز. قوڕی زۆر.
تەڤ و پۆق: د. تەق و تۆق.
تەق و تۆق: چەند دەنـگێکی بەرز و نزمـن کـــە هەر دەنگەی لەلایەکەوە بێ.
تەق و دەو: د، تەق و ڕەو.
تەق و ڕەو: نەمانی ئاسایش و ڕەوکردن لە ترساندا.
تەقوو: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ گەیاندنی بیمی بوون یا نەبوونی شتێک: بۆچی بنووم (تەقوو) خەبەرم نەبووەوە.
تەقـە: دەنگێکە لە بەیەککەوتنی دوو شـتـی زەق پەیدا دەبێ. (تەقـــەتەق) تەقـــەی یەک لەدوای یەک. (تەق و هوڕ) تەقەتەقی زۆر.
تەقـەتێکەوتن: بریتـیـیـە لە چۆڵـبـوونی شـوێنێـک لە مـەردووم بەرەبەرە: بازاڕ تەقەی تێ کەوت: واتە چۆڵ بوو.
تەقـەداکـەوتن: پەیدابوونـی تەقـە لە چەند لایەکـەوە. بریتـیـیـە لە پەیدابوونی قسەی ڕەق لەناو چەند کەسێکدا.
تەقەفیرە: د. سکچوون.
تەقەڵ: دانەی دروومان.
تەقەلا: هەوڵ و کۆشش بۆ شتێک.
تەقەڵبەست: د. کۆکی دروومان.
تەقەڵ تێهەڵدان: دروومان بەدەرزی.
تەقەمەنی: فیشەک و گوللە و بۆمبایە کە دانرابن بۆ تەقاندن.

تەقیاگ: د. دانەوێڵەیەکە کە تەقێنرابێتەوە.
تەقیلین: ز. هەڵخلیسکان.
تەقیلە: تەقلە.
تەقیلە لەسەر تەقیلە: ناوە بۆ یارییەک کە چەند کەسێک بەگردیی دادەنیـشـن، وەسـتـاکـەیان لەو کـاتەدا دەڵـێ (تەقـیلە لەسـەر تەقیلە، هەر کەس نەیبێ زەلیلە، پشکۆ لەسەر سەبیلە).
تەقین: دەرچوونی چەک. درزبردنی پیـاڵە و بۆریە و هێندێ شـتی تر لە گـەرمـا یا لە سـەرمـا. لەتبـوونی بەرد و هێلکە و بەڕوو لەناو ئاگردا بەڕەنگێک کە دەنگیـان لێوەبێ. دەنگی ترازانی جومگەی گیاندار: پشتم (تەقی). لە قـوڕ چەقین (ز). شـەق بردنی شت.
تەقینەوە: تەقینی گوللە لەو کاتەدا کە لە شت دەکەوێ. بریتییە لە بلاوبوونەوەی دەنگوباسێک زۆر بەگـورجی. چەوسـانەوە و هەوڵدان: هەر چەند بەشـەو و بەڕۆژ (دەتەقـێـمەوە) پێـبـژێوی خۆم پەیا ناکەم.
تەک: تەنیشت. تەنها. قووڵ. تەیکە (د).
تەکان: تەوژم. بریتییە لە شەق: دایە بەر (تەکان).
تەکانخواردن: جووڵانی شت لەجێی خۆی بەهۆی تەوژمێکەوە.
تەکاندان: خۆکوتان بەتەوژم.
تەکـاندن: ڕاوەشـاندنـی شت: درەخـتـەکـە (بتـەکـێـنە) بۆ کـەوتنە خـوارەوەی بەرەکـەی، یا بەڕەکـە (بتـەکـێـنە) بۆ لێـبـوونەوەی تۆزەکەی.
تەکانەوە: تەکینەوە.
تەکبەند: پشتێن.
تەکـدان: چوونەپێـشــەوە بەنهـێـم: فـیـسـار کـەس (تەکی دایە پێشەوە). تەکەدان.
تەککەوتوو: کەسێکە کە دوای یەکێک کەوتبێ.
تەککەوتە: تەککەوتوو.
تەکمە: جۆرە لبادەیەکی ناوداری پڕ تەریبە تا سەر ئەژنۆ، لەسەر کاڵاوە لەبەر دەکرێ.
تەک و دەو: تەق و دەو.
تەکووز: با. شتی تەواو و ئامادە.
تەکە: پاڵدانە یەکی چەند کەسێک بۆ جێکردنەوەی یەکێک.
تەکەدان: پاڵدان.
تەکەکردن: تەکەدان. تەگە (د). هاتوچۆ و جووڵەی شتی شۆڕەوە بوو. (تەکەتەک) بەلەبەلی شتی شۆڕەوەبوو.
تەکەڵتوو: چەند قەد لبادێکە لەژێر قەڵتاغی زیندا دادەنرێ.
تەکەمە: لبادێکی پچووکی یەک کەسییە.
تەکـیـە: سـەکـۆیەکی باریکە لە سـەری دادەنیـشن. جـێـیـەکی تایبەتییە کە دەروێشان یادی خوای تێدا دەکەن.

تەکیەگا: تەکیەی دەروێشان.
تەکیمە: لبادەی ژێرەخەری پچووک.
تەکینەوە: دەست هەڵگرتنی یەکێک لە یەکێک یا لە کارێک و لێ دوورکەوتنەوەی بەرەبەرە.
تەگرگ: ل. تەرزە.
تەگە: تگە.
تەگەرە: تێکدانی کارێک و دواخستنی. دار یا ئاسنێکە دەخرێتە ناوەڕاستی بەرداشی خواروو (د).
تەگەرەتێخستن: تێکدانی کار و دواخستنی.
تەگەرەتێکەوتن: تێکچوونی کار و دواکەوتنی.
تەگەرەدان: تەگەرەلێدان.
تەگەرەلێدان: تەگەرەتێخستن.
تەل: شتێکی باریکی درێژە لە ئاسن یا لە مس یا لە شتی تر دروست دەکرێ.
تەڵ: داوێک موو یا دەزوو یا شتێکی تر. چڵێک لە شتێک: (تەڵ)ێک دار.
تەلا: شتێکی زەرد یا سپی گران مایەیە لە کان دەردەهێنرێ دراو و چەکی ژنانەی لێ دروست دەکرێ.
تەلار: باڵەخانە. کۆشک.
تەلاسابوون: دەرچوونی مەردووم لە ئەندازەی خۆی: فیسار کەس (تەلاسا بووە).
تەلاش: تەقەلا، (تەلاشکردن) هەوڵدان.
تەلاش: با. تەڵاش.
تەڵاش: تەڵەزمی تەنک لە شت. تەلاش (د). (تەڵاشکردن) تەلاشکردن.
تەڵاکاری: ئاڵدووزکردن بە ئاڵتوون.
تەڵاکفت: د. تەڵاکاری.
تەلان: تەڵان. ناوی دێیەکە لە ناوچەی سوورداش.
تەڵان: پلەی شاخ و کێو و هەرد. (تەڵان تەڵان) شوێنی پلە پلە لە شاخ.
تەلانترە: گیایەکی بەهاریی قەفقەفە بەشوێنی تەڵانەوە سەوز دەبێ.
تەلبەند: شوێنێکە چواردەوری بەتەل تەنرابێ.
تەڵخ: شتی ڕەشی تاریک. ژینی بەئازار و سزا: فیسار کەس گوزەرانی (تەڵخ)ە. ڕووگرژ: فیسار کەس پیاوێکی زۆر (تەڵخ)ە.
تەلسز: بێ سیم.
تەڵفیز: گاڵتە.
تەڵفیس: تەڵفیز.
تەڵمیت: کۆتەڵی شیوەن. وڵاخی زینکراوی بارگە لێ نراوی ڕازاوەیە کە ژنی ئاغا یا کوێخا سواری دەبێ.
تەل لێدان: نامەناردن بەتەل.
تەلوار: ز. تەرواڵ.
تەڵۆک: چەند تووڵێکی دارینە دەخرێتە ئەمسەر و ئەوسەری چیخ بۆ قایمی.
تەڵووک: دڕکێکە وەک زی بەڵام ئەم بێ بەرە. دڕکەزی (د).
تەڵووکە: د. تاڵووکە.
تەڵە: داوێکە بۆ گرتنی ڕێوی و مشک و هێندێ جانەوەری تر دەنرێتەوە.
تەڵەبەرد: بەردی پانی تەنکی درێژ.
تەڵەتەقێن: بریتییە لە مەردوومی فێڵباز.
تەڵەڕێوی: تەڵە و ڕێوی.
تەڵەزم: پارچەیەکی تەنکە کە لە دار یا بەرد بێتەوە.
تەڵەکە: فروفێڵ.
تەڵەمەشکێنە: چەڵەمەشکێنە.
تەڵە و ڕێوی: جۆرە یارییەکە بە دوو کەس دەکرێ، یەکێکیان دەبێ بەتەڵە و هەردوو دەست و قاچی دەبەستن، ئەوی تریان دەبێ بەڕێوی قاچێکی دەکەن بەناوەندی هەردوو دەستی تەڵەکەدا و قاچەکەی تری دەکەن بەناوەندی هەردوو قاچیدا و سەری دەکەن بەژێر سکیدا و پاڵێک دەنێن بەتەڵەکەوە.
تەلهە: با. تەڵە.
تەلیس: ز. تێر.
تەلیسە: د. سووکە بارێکە دەنرێ لە وڵاخ و لە سەریەوە سوار دەبن.
تەم: هەڵمێکی سپییە لە زەوی تەڕ یا لە ئاو هەڵدەستێ. تۆز (د). خەم (د). لێڵاییی سەرچاو (د).
تەما: هیوا و چاوەڕوانی.
تەماتم: ز. قسەکردن بەتورەتور لەکاتی تووڕەبووندا.
تەماتە: باینجانی سوور.
تەمادار: کەسێکە بەهیوای شتێک بێ.
تەماداری: هیواداریی شتێک.
تەمار: ز. ڕەگ و پەیی جەستە.
تەمارتن: ز. شاردنەوەی شت لەژێر گڵدا.
تەماشا: ڕوانین.
تەماشاخانە: پێشانگا.
تەماشاکردن: ڕوانین بۆ شتێک. خوێندنەوەی شتی نووسراو بەوردی: لە پێش وتنەوەی دەرسدا (تەماشای) کە.
تەماکار: تەمادار.
تەماکۆ: توتن.
تەماڵ: دیاریکردنی گیاندارێک کە ڕاودەکرێ و بەدیکردنی.
تەمباف: با. شوێن گێژاو لە ئاوی زۆر کە مەلەوان نەوێرێ خۆی لێدا.

تەمتەراق: د. گەورەیی و پایەبەرزی.
تەمتەم: زەویی سەختی بەردەڵانی دەمار دەمار.
تەمـتـەمـە: بزمـارێکی سـەرخـڕی نووک تیـژە بەلووتی مـزراحـدا دادەکوترێ بۆ ئەوەی باش بخولێتەوە.
تەمربین: ز. تۆپین.
تەمشوو: تەشوێ.
تەموخ: تاوێرە بەردێکە لە لم پەیدا بووبێ.
تەمـوو: دارێکی ئەسـتـووره هەڵدەکـۆڵرێ و پەڕەی ئاشی پێـدا دەکرێ.
تەمووره: پارچەیەکە لە پارچەکانی مۆزیقە ملێکی درێژی هەیە.
تەموورەژەن: کەسێکە تەمووره باش لێ بدا.
تەمەرە: د. قۆرت و بەڵا.
تەمەزی: ز. دەستەسڕی ئاوریشم.
تەمەسی: ز. تەمەزی.
تەمەڵ: گیانداری لەش قورسی فرمان نەکەر.
تەمەڵخانە: شوێنێکە تەمەڵی تێدا بەخێو دەکرێ.
تەمەڵە: بناغەی دیوار.
تەمەڵی: لەشقورسی و تەوەزەلیی گیاندار.
تەمەڵیت: شتێکی پێچراوەیە کە بەپاشکۆی وڵاخدا دابەسترێ. تەمەڵە.
تەمەن: ماوەی ژیانی گیاندار لە جیهاندا (عومر).
تەمیان: د. خەم داگرتن.
تەمێبوون: عارنان و پەند وەرگرتن لە شتێکەوە.
تەمێ خواردن: تەمێبوون.
تەمێخۆر: کەسێکە کە تەمێ بووبێ.
تەمیشک: د. توورک.
تەمێکردن: عار بەیەکێک نان.
تەمیز: شتی پاکی خاوێن.
تەمیس: تەمیز.
تەمین: د. تەمیان.
تهن: ز. تینوو.
تەن: جەستە. ڕەشیی مەنجەڵ.
تەناباز: د. تەنافباز.
تەنابازی: تەنافبازی.
تەناف: پەت یا تەلێکە کـە بە بەرزییـەوە بگێـڕدرێ بۆ شت پیادانی.
تەنافباز: کەسێکە لەسەر تەناف یاری بکا.
تەنافبازی: یاریکردن لەسەر تەناف.
تەنانە: تەنانەت.
تەنانەت: وتەیەکـە بەکـار دێنرێ لە جـێی وتەی (بەتایبـەتی): (تەنانەت) بۆ لای تۆ هاتم.

تەنبوو: گەنە (ز). تەموو.
تەنبوور: ز. تەمووره.
تەنبووری: ز. کاکۆڵی پیاو.
تەن بەتەن: وتەیەکە بەکـاردێنرێ بۆ بەرامبـەریکردنی دوو کـەس لەگـەڵ یەک بەبێ ئەمـەی هیـچیـان یارمـەتیـدەرێکیـان لەگەڵ بێ: نەریمان (تەن بەتەن) دەرەقەتی سالار نایەت.
تەنبەکی: ز. تووتنی نێرگەلە.
تەنبەڵە: تەمەڵە.
تەنپەروەر: کەسێکە هەمیشە بەخواردن و پۆشین و حەسانەوەی خۆیەوە خەریک بێ.
تەنپـەروەری: پەروەردەکـردنی جـەسـتـە بەخـواردن و خـواردنەوە و پۆشین و حەسانەوە.
تەنتەنە: فیز و دەمار.
تەنخوا: تەنپەروەر. سەرمایە (د). بریتی (عوض) (د).
تەندروست: لەشساغ.
تەندروستی: لەشساغی.
تەندوور: تەنوور.
تەندوورە: تەنوورە.
تەنراو: شتی تانوپۆدار کە تەنرابێ.
تەنشت: لای شان لە ڕاست و چەپی شت.
تەنشەدر: ز. لاشیپانی دەرگا.
تەنک: شتێکە ئەستوور نەبێ. شتی شاش.
تەنکاو: بووار.
تەنک و تیواڵ: شتی زۆر تەنک.
تەنکەکردن: شاشکردنی شینایی پڕ بەهەڵکێشانی لقی ناو بەناو.
تەنگ: شـــتی تەسکی بێ دەرەتان: ئەم ژووره یا ئەم پێـــڵاوە (تەنگ)ە تەنگە(د). (د) پشتیوان (د).
تەنگەنەفەسی: هەناسەتوندی.
تەنگانە: کاتی تەنگ و چەڵەمە.
تەنگاو: گـیـانداری‌کە لە تەنگانەدا بێ. (تەنگاوبوون) زۆر بۆ هاتنی گیاندار و تەنگەتاوبوونی.
تەنگ پێ هەڵچنین: زۆر بۆهێنان و لا لێ برینەوە.
تەنگدان: د. تەنگەدانی وڵاخ.
تەنگدەس: بریتییە لە مەردوومی هەژاری نەدارا.
تەنگدەست: تەنگدەس.
تەنگدەستی: بریتییە لە نەدارایی.
تەنگدەسی: تەنگدەستی.
تەنگز: درەخـتـێکی باڵا پچـووکی دڕکـاوییـە بەرێکی هەیە وەک چواڵە بەڵام ئەم تاڵە بەخۆشکراوی دەخورێ.
تەنگوچەڵەمە: کاتی سەغڵەتی و بێ دەرەتانی.

تەنگە: قایشێکی پانە زین یا کورتانی پێ قایم دەکرێ لەژێر سکی ولاخەوە. دەرووی تەنگی دەریا.
تەنگهاتن: د. زۆر بۆهاتن.
تەنگەبەر: شوێنی تەنگی تەسک.
تەنگەبەری: بوونی شوێنیک بەتەنگەبەر.
تەنگەتاو: گیاندارێکە لە رووبەکەوە زۆری بۆ هاتبێ و گیری خواردبێ. (تەنگەتاوبوون) بەگیرهاتن. (تەنگەتاوکردن) بەگیرهێنان.
تەنگەتیلکە: کەسێکە زووتوورە ببێ. گیاندارێکە لەبەر قەڵەوی و خڕ و پڕی نەتوانێ زۆر بجووڵێ.
تەنگەدان: تەنگە بەستنی ولاخ.
تەنگەکێشان: تەنگەدان.
تەنگەگرتن: بریتییە لە دڵگیربوونی یەکێک لە وتار یا کرداری یەکێکی تر، (لە رووی سووکییەوە دەوترێ).
تەنگەلان: د. دەرووی تەنگی دەریا.
تەنگەنەفەس: کەسێکە کە هەناسەی توونـد بووبێ.
تەنگ هەڵچنین: زۆرهێنان بۆ شتێک و لا لێ برینەوەی.
تەنگەهەڵکێش: چەرمێکی باریکە تەنگەی پێ قایم دەکرێ.
تەنگی: بێ دەرەتانی.
تەنواوی: مەردوومی چڵکنی بۆرەڵووک.
تەنوور: شتێکی گەورەی دەم واڵە لە قوڕ دروست دەکرێ و لە زەویدا دادەنرێ و ئاگری تێدا دەکرێتەوە بۆ نان پێ برژاندنی.
تەنووردا خستن: هەڵگیرساندنی ئاگر لە تەنووردا بۆ نان پێکردنی. بریتییە لە کۆبوونەوەی چەند کەسێک و باسی یەکێک کردنیان بەخراپە.
تەنوورشێوێن: کۆڵەوژ.
تەنوورە: دۆڵیانی ئاش کە لە بەرد و قوڕ و قسڵ دروست کرابێ. ئاخڵە (د). گێژەڵووکە (د). جۆرە کراسێکی ژنانەیە.
تهنووشک: ز. ئازار بەهۆی ئاڵوو کەوتنەوە.
تهنوویی: ز. تینوێتی.
تەنە: د. تەن.
تەنها: تاقە یەکێکە لە شتێک کە هاووێنەی خۆی لەگەڵ نەبێ: (تەنها) دانیشتبووم.
تەنهایی: بوونی شت بەتەنها بەبێ هاووێنەی خۆی: (تەنهایی) هەر بۆ خوا باشە.
تەنەکە: شتێکی تەنکی سووکی سپییە سەماوەر و هێندێ شتی تری لێ دروست دەکرێ.
تەنەکەچی: کەسێکە کە تەنەکەکاریی بکا.
تەنەکەساز: تەنەکەچی.

تەنێ: تەنیا.
تەنیا: تەنها.
تەنیابال: بریتیە لە کەسێک کە بێ یارمەتیدەر بێ. تاقانە.
تەنیاگ: چنراو.
تەنیایی: تەنهایی.
تەنیشت: تەنشت.
تەنی: ڕەشیی مەنجەڵ. تەنیا (د).
تەنین: چنین و تێکهەڵکێشانی ڕایەڵ و پۆ.
تەنینەوە: پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی شت.
تەو: مەڕێکە دەم و چاو و لەشی بۆرەڵووک بێ.
تەوا: د. تەما و ئومێدەواری.
تەوات: ز. لەسەرخۆ.
تەوادار: د. تەمادار.
تەوار: بازی مێچکە. گیانداری هەراش: بەرخەکە (تەوار) بووە.
تەواسان: د. دڵ ساردکردنەوە.
تەواسیان: د. دڵ ساردبوونەوە.
تەواسیانەوە: د. تەواسیان.
تەواش: ز. ڕۆن.
تەواشا: تەماشا.
تەواشیر: د. تەباشیر.
تەوانا: گیانداری بەهێز و دەسەڵات. هێز و دەسەڵات: (تەوانا)م نییە.
تەوانایی: هێز و دەسەڵات.
تەوانج: توانج.
تەوانچە: د. دەمانچە.
تەواو: شتێکە کە دواییی هاتبێ. تەواوبوون: دوایی هاتن و برانەوەی شتێک. (تەواوکردن) دوایی هێنان و برینەوەی شتێک.
تەواوی: بوونی شت بەتەواو.
تەوتین: ز. لەسەرخۆیی.
تەوخ: ژێر زەمینێکی گەورەیە زستانان لە کوێستان ئاژاڵی تێ دەکرێ.
تەور: ئاسنێکی تیژی دەم لەسەر شانە داری پێ لەت دەکرێ.
تەوراس: تەورداس.
تەورداس: ئاسنێکی کلکداری دەم پانی کەوانەداری تیژە، داری پێ دەبڕێتەوە.
تەورزین: ئاسنێکی تیژی دەم لەسەر شانی کەوانەییە کلکێکی درێژی دارینی تێ دەبرێ.
تەوریزی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک. سەنگێکی کێشانەیە لە کوردەواریی ئێران.

تەوزە: گاڵتە.
تەوزە پێکردن: گاڵتەپێکردن.
تەوزیم: پێویستی (واجب) و ناچاریی (ضرورة): (تەوزیم) نییە ئەو کارە بکەم واتە واجب و ضرورە نییە.
تەوس: پلارهاویشتن لە گفتوگۆدا بۆ یەکێک بەڕەنگێک کە هەموو کەس تێی نەگات.
تەوشوو: تەشوێ.
تەوشوێ: تەشوێ.
تەوغێن: جۆرێکە لە یاریکردن بەمیچ.
تەوقە: شتێکی دووفاقە لە زێڕ یا لە زیو یا لە باغە، ژنان دەیدەن لە ئەگریجەیان کە تێک نەچێ.
تەوقەتە: د. تەپلەسەری شت.
تەوقەسەر: شوێنی هەرەبەرز لە شت.
تەوقەکردن: دەست خستنە ناو دەستی یەکێک و گوشینی لە ڕووی تاسە و خۆشەویستییەوە.
تەوقەن: تەوقەتە.
تەوقەتە: د. تەوقەن.
تەومان: ز. دەمەرقۆپان.
تەون: ڕایەڵی بەڕە و قاڵی کە بەدارەوە بێ بۆتەنین.
تەونگەر: کەسێکە تەون بکا.
تەوژم: هێزی شت لەگەڵ هاتن و جووڵانیدا: ئاوەکە بە(تەوژم) هات.
تەووسکە: هەنجیرە کێویلە.
تەووشق: تەشق.
تەوەرگ: تەرزە.
تەوەر گەژیلە: تەرزەلووکە.
تەوەرە: دارێکی کوندارە لە کونی بەرداشی سەرووی ئاش گیر دەکرێ و بلووسکی تێ هەڵدەکێشرێ. ئاشووب و بەڵا (د).
تەوەزەل: گیانداری زۆر تەمەڵ.
تەوەق: تەبەق. تەبەک.
تەوەل: مەردوومی سەرسەری.
تەوەن: هـ. بەرد.
تەوەنە: د. کۆمەڵە.
تەوەنەدان: د. کۆمەڵەدان.
تەوێڵ: ناوچەوان.
تەویلە: هۆدەی وڵاخی یەکسم.
تەی: د. ڕامبووی دەرهاتوو: فیسارکەس (تەی) بووە واتە ڕام بووە.
تەیاخ: د. تێڵا.
تەیار: د. ئامادە.
تەیارە: د. شوێنێکە کە باز لێی دەنیشێتەوە. فڕۆک.
تەیان: کارەکەر. تیان.
تەیجە: د. تەیکە.
تەیرۆک: ز. تەرزە.
تەیکە: سەلەی تووڵێن.
تەیمان: خەڵفەدارێکی باریکی درێژە ناوەندی قیسپی پێ دەتەنرێ. چەپەرێکە کە بەتەیمان و قیسپ چنرابێ.
تەیوانە: د. خواردەمەنییەکە کە لە ماڵی زاواوە دەنێردرێ بۆ ماڵی بووک لە ڕۆژی گواستنەوەیدا.
تەیەوبووگ: د. مەردوومی قاڵی دەرهاتوو.
تەیەوبوون: قاڵبوون و دەرهاتن.
تێ: پیتی چوارەمە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. تای ناساغی. پیتێکە ظرفیتی شتێک بۆ شتێک دەگەیەنێ: (تێ) فڕێدان واتە فڕێدانی شتێک بۆ ناو شتێک. ناوەوەی شت: بیکە (تێ)ی واتە بیکە ناوی.
تێئاخنین: ئاخنینی بۆشاییەک بەشتێک.
تێئالان: ئالانی شتێک لە شتێکەوە.
تێئالاندن: ئالاندنی شتێک بەشتێکەوە.
تیابردن: د. لەناوبردن.
تیاترۆ: ژنێکە کە پیشەی یاری و سەماکردن و گۆرانی وتن بێ لەناو پیاواندا.
تیاترۆخانە: شوێنێکە کە تیاترۆ سەمای تێدا دەکا.
تیاچوون: لەناوچوون یا تووشی زیانبوونی یەکێک لە پێناوی کارێکدا.
تیاڕامان: سەرسامان لە کارێکدا.
تیامان: تیاڕامان.
تیان: مەنجەڵی زۆر گەورە وەک مەنجەڵی حەلواچی و حەمام.
تیانچکە: مەنجەڵۆکە.
تیانچە: تیانچکە.
تیانە: تیان.
تێبردن: زیادکردنی وتەیەک یا زیاتر لە ناوەڕاستی نووسراوێکەوە، یا خستنی دارێکی ساغ لە شوێنی دارێکی شکاو لە دارەڕادا بەبێ هەڵگرتنی بانەکە: ئەم شوێنە لەم کتێبە ناتەواوە پێویستە ئەم دێرەی (تێ ببرێ) یا ئەم داری دارەڕایە شکاوە پێویستە دارێکی ساغی (تێ ببرێ). قایمکردنی شتێک لەناو شتێکدا وەک نقێم لەناو ئەموستیلەدا.
تێبڕین: کردنی شتێک بەشتێکی تردا بەتوندی و پڕبەپڕ.
تێبەربوون: بەربوونی کار و بەرخ بۆ مژینی دایکیان. سواربوونی نێر بۆ مێیەکەی لەکاتی خۆیدا بەتێکڕایی.

تێبــەردان: بەردانی کـار و بەرخ لە دایکیــان بۆ مـژینی. بەردانی گیـانداریک لە گیـانداریکی تر بۆ بەگژداچوونی: تانجییـەکەی لە کــەرویشکەکــە (بەردا). بەرەڵاکــردنی نێــر بۆ ســەرمێ: ماینەکەی بەتەڵەب بوو (ئەسپەکەی تێ بەردا).

تێبین: کەسێکە لە ئاکامی شت ورد بێتەوە.

تێبینی: وردبوونەوە و دووربینی لە کاردا.

تێبینین: تێبینی.

تێپـەڕاندن: ڕافـڕاندن و بردنی شـتـێک بۆ شـوێنێک بەگـورجی. بریتییـە لە جێبەجێکردنی کارێک بەدەستوبردی: فرمـانەکە زوو (تێپەڕێنە).

تێپەڕبوون: گوزەرکردن بەشوێنێکدا. بەسەرچوونی کاتی شتێک.

تێپەڕکردن: تێپەڕبوون.

تێپەڕین: تێپەڕبوون.

تێپەستان: تێ ئاخنین.

تێپـێـچان: پێـچانی شـتـێک لە شـتێک. بریـتـیـیـە لە تکاکـردن بەجـەختی لە یەکـێک: فـیـسـار کـەس زۆرم (تێ پێـچـا) تا کارەکەی پێ کردم. ئاڵاندنی کەسێک بەکارێکەوە.

تێپـێـچاندن: ئاڵاندنی شـتـێک لە شـتـێک. ئاڵاندنی کـەسـێک بەکارێکەوە.

تێتراندن: بریتییە لە زۆرخواردن، ئەم وتەیە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ.

تێترنجان: گیرخواردنی شتێک لە شوێنێکی تەنگەبەردا.

تێترنجاندن: گیرکردنی شتێک لە شتێکی تەنگەبەردا.

تێتکان: تکانی شتێکی شل بۆ ناو شتێک لە خۆیەوە.

تێتکاندن: کردنی شتێکی شل بۆ ناو شتێک بەدڵۆپ دڵۆپ.

تێتلێسک: گـیـایەکی ئاویی هەمـیـشـە سەوزە گەڵای وەک کەوەر وایە دەدرێ بە ئاژاڵ.

تێـچاندن: کـردنی شـتـێکی ورد بۆ ناو شـتـێکی شل کـەم کـەم بۆ ئەوەی کـە باش تێکەڵ ببێ: ئاردەوا لەسـەر ئاگـر ئاردەکـەی (تێ دەچێنرێ). بریـتــیــیــە لە قــســەی خــراپکردن دەرباری یەکێک لای گەورەیەک.

تێـچران: کۆبوونەوە و بەسـەر یەکدا کەوتنی مـەردووم بەزۆری لە شوێنێک، شاییی فیسار کەس ئەوەندەی (تێ چرابوو) شـان دەسوا.

تێــچــراندن: کــۆکــردنەوەی گــیــاندار بەزۆری و بەنـارێکی لە شوێنێکدا.

تێـچوون: شـان دانە ژێر کـارێک و هەوڵدان بۆ کـردنی بەگـەرم و گوڕی: فیسار کەس بۆ یارمەتی هەتیوان باش (تێ چووە).

تێچەقاندن: چەقاندنی شتێک لە شتێکی تردا.

تێچەقین: چوونی شتێکی تیژ بەشتێکی تردا.

تێچەندن: تێچاندن.

تێچین: تێچاندن دەربارەی یەکێک لای گەورەیەک. ئەندازەیەکی کەمە لە دانەوێڵە کە لە ناوەندی دوو باراشدا بهاڕدرێ لەبەر پەلەپەل.

تێخ: تیغ.

تێخزان: چوونە شوێنێکی تەنگ و بەزۆر جێی خۆکردنەوە.

تێـخـزاندن: ترنجــاندن و چراندنی شــتــێک بۆ ناو شــوێنێک بەپاڵەپەستۆ.

تێخزین: تێخزان.

تێخستن: خستنی شتێک بۆ ناو شوێنێک. داکردنی هێندێ کەس لە یاریدا: فیسار کەسم لە کەوشەکدا تێ خست.

تێخورین: دەنگکردن لە گیـاندار بەتوندی بۆ ڕۆینی: لە وڵاخەکەی (خـوڕی). دەنگکردنی یەکـێک لە یەکـێک بۆ وێسـتـانی لە قسەکردن یا ڕۆیندا: شەو چەرخەچی (تێی خوڕی) یا نەریان قسەی دەکرد باوکی (تێی خوڕی).

تێخونجان: لەباربوون و گونجانی شتێک لە شوێنێکدا.

تێدان: درێژکردن یا پانکردنی پارچەیەک لە کـاڵا یا شـتـێکی تر بەخـسـتـنی پارچەیەک لە سەری: کـەواکەم یا لێفـەکەم کورت بوو بسـتـێکم (تێـدا). دانی شـتـێک لە شـتـێک: ئەو گـەنمە ئەسپێ (تێی داوە).

تێدانەوە: تێدانی پارچە لە شتێک. دەستکردنەوە بەشتێک کە لەوە پێش دەســــتت لێ هەڵگرتبێ: دەســــتم لە جگەرە هەڵگرتبوو کەچی (تێم دایەوە).

تێر: گیاندارێکە کە لە خواردەمەنی تەسەل بێ. هەموو ڕەنگێکی تۆخ بێـجگە لە سـپی. ئەم ڕەنگە سـوورە یا سـەوزە یا شـینە (تێر)ە. تێر (ز). بریتییە لە مەردوومی دەوڵەمەند.

تێراو: دار و درەخت و شینایی تەڕ و پاراو.

تێراوی: بوونی دار و درەخت و شینایی بەتەڕ و پاراو.

تێربوون: بەسـەرچوونی برسـێتی بەهۆی خـواردنەوە. بریـتـیـیـە لە کەسێک کە بێ نیاز بووبێ لە شتێک.

تێرپ: ل. توور.

تێرخواردن: تێربوون لە خواردنی شت.

تێـــڕ: دەفــرێکی دوو لاییـــــە وەک جــەواڵ بەڵام ئەم دەمی لە تەنیشتەوەیە. مەردوومی مۆڕەوەبوو (د).

تێڕادان: ئاوکردنە ناو دەفرێک و تێوەردانی.

تێڕاکردن: تێڕۆکردن.

تێڕامان: تیاڕامان.

تێرتێرە: هـ. قومقمۆکەی گەورە.

تێرک: تێر.

تێرکە: خورجی گەورە.

تێڕوانین: تەماشاکردنی شتێک و لێ وردبوونەوەی.
تیرۆکردن: کردنی شتێک بەشتێکی تردا.
تێرەوەبوون: د. مۆربوونەوە.
تێروو: دارێکە بەرێکی وەک تووڵەزەرە دەگرێ گەڵای وەک چواڵە تاڵە وایە. گیاندار و دڕندەی کێویی وەک شێر و پڵنگ و گورگ و ورچ.
تێرویی: تەربی.
تێرەخۆر: تێرەخۆرە.
تێرەخۆرە: ئەندازەیەکە لە خواردن کە زەلامێک تێری پێ بخوا.
تێریتی: تێری.
تێری: بوونی گیاندار بەتێر. بوونی هێندێ ڕەنگ بەتۆخ.
تێـز: کـونێکە لای پێی هێندێ تفـەنگ و دەمـانچـەوە باروتی دەخرێتە سەر و ئاگری پێوە دەنرێ.
تێزاب: دەرمـانێکی شلی زۆر تیـژە بەسـەر هەر شـتێکدا بکرێ دەیسووتێنێ.
تێزاو: تێزاب. تیژاو.
تێزە: د. نووکی شتی تیژ. قوتکە.
تێزکە: تێز.
تێزەتێزەدان: پەلەپەلکردن لە یەکـێک بۆ کـردنی کـارێک: بەس (تێزەتێزە)ی بدە، واتە بەس پەلەی لێ بکە.
تێژ: تیژ. گورج و گۆڵ.
تێژک: بەچکەی ساوای دڕندە.
تێساوین: تێ هەڵسوون.
تێسرەواندن: لێدان لە کەسێک بەکوتوپڕی.
تیسک: چەند دانە خوری یا موویەکی درێژە.
تیسکن: شتێکە کە توون بێ و تیسکی پێوە بێ.
تەیسین: با. بریقەدانەوە.
تێسکە: تێز.
تێسمرپاگ: تێکسمراو.
تێسمرپان: تێکسمرپان.
تێسوون: تێ هەڵسوون.
تێشت: با. نانخواردنی نیوەڕۆان. چێشت.
تیـشک: ڕووناکـیی ڕۆژ یا مـانگ یا چرا یا شـتێکی تر کـە لە دوورەوە بدا لە شوێنێک.
تێـشکان: هەڵـخـەڵەتان لە کـارێکدا. شکانی شـتـێک لەناو شتێکدا.
تێشکاندن: هەڵخەڵەتاندن. شکاندنی شتێک لەناو شتێکدا.
تێشکاو: هەڵخەڵەتاو: شتێکە بەسەر یەکدا شکابێ.
تێشوو: توێشوو.
تێشووبەرە: تێشووودان.

تێشووودان: شتێکە کە تێشووی تێ بخرێ.
تێشووکردن: نانخواردنی بەیانی. دروستکردنی تێشوو.
تێغ: تیغ.
تێغە: تیغەی دیوار. دەمەی تیغ (د).
تێ فڕێدان: فڕێدانی شتێک بۆ ناو شتێکی تر.
تێ قلێپاندن: قلێپکردنەوەی شتێک بۆ ناو شتێکی تر.
تێ قوپان: بریتییە لە لاوازبوون و بەناوداچوونی گیاندار.
تێ قوپاو: گیانداری لاوازی بەناوداچوو.
تێکبردن: تێک پەڕاندنی دوو شت بەناو یەکدا.
تێکبەربوون: بەگژیەکداچوونی دوو گیاندار یا زیاتر.
تێک بەردان: بەگژیەکداکردنی گیاندار.
تێک پەڕاندن: تێکبردن و تێکخستنی شت بەناو یەکدا.
تێکـچـوون: نەمـانی ڕێکوپێکیی هەمـوو شـتـێک: خـانووەکـە تێکچوو یا دۆستایەتی ئەو دوو برایە (تێکچوو) یا فیسار کەس بەتەریقکردنەوەکەی (تێکچوو).
تێکخراو: دوو شت یا چەند شـتێکن کـە برابێـتنە نـاو یەکـەوە: پارچەکانی ئەم دەرگایە پاش (تێکخراون).
تێکخستن: تێکبردنی چەند شتێک بەیەکدا.
تێکدان: شێواندنی هەموو شتێک.
تێکردن: کردنی شتێک بۆ ناو شتێکی تر. تێبەردانی کار و بەرخ لە دایکیان بۆ مژینی.
تێکرا: وتەیەکە لە جیاتی وتەی (هەموو) بەکاردێنرێ.
تێکرایی: تێکرا.
تێکسمران: قەڵەوی و داڕێژراویی گیاندار.
تێکسمراو: گیانداری قەڵەوی داڕێژراو.
تێکشان: تێپەڕین بەبێ خشە.
تێکشکان: شکانی شتێک و تێکەڵبوونی پارچەکانی.
تێکشکاندن: شکاندنی شتێک بەسەر یەکدا.
تێکشکاو: شـتـێکە بەسـەر یەکـدا شکابێ و پـارچەکـانی تێکەڵ بووبێ.
تێکلهەڤ: ز. تێکەڵاو.
تیکمە: د. شتی پڕ.
تێکوتان: کوتان و پیابردنی شتێک بەشوێنێکدا بەنهێم.
تێکوتاندن: تێکوتان.
تێکوتانن: تێکوتاندن.
تێکۆشان: تێکۆشین.
تێکۆشی: هەوڵدان و پەلەکردن بۆ شتێک.
تێکۆشین: تێکۆشی.
تێکەڵ: چەند شتێکن کە ئاوێتەی یەک بووبن. ئاشنا و دۆست.
تێکەڵاو: شـتی تێکەڵ، (تێکەڵاوبوون) تێکەڵبـوون. تێکەڵاو کردن) تێکەڵکردن.

تێکەڵبوون: ئاوێتەبوونی چەند شتێک بەیەک.
تێکەڵدان: تێکهەڵدان.
تێکەڵکردن: ئاوێتەکردنی چەند شتێک بەیەک.
تێکەڵ و پێکەڵ: شتی بەیەکداچووی نارێک و نالەبار.
تێکەڵی: ئاشنایەتی و هاتوچۆکردنی دووکەس لەگەڵ یەکدا بەگەرم و گوڕی.
تێکەوتن: دۆڕاندنی هێندێ یاری: فیسار کەس لە قەلەمردارێدا (تێکەوت). چوونە ناو ئاو و مەلەکردن. خەریک و وێڵبوون بەدوای شتێکدا بۆ پەیداکردنی: بۆت (تێ دەکەوم) تا ڕزگارت دەکەم.
تێکەولێکە: بێ سەر و پێیی شوێنێک بەجۆرێک کە پرسینەوەی تێدانەبێ.
تێکهەڵچوون: بەگژیەکداچوونی دوو گیاندار.
تێکهەڵدان: ئاوێتەکردنی دوو شت بەیەکدا.
تێکهەڵشێلان: شێلانی چەند شتێک بەسەر یەکدا.
تێگرتن: هاویشتنی شتێک بۆ شتێکی تر. نانی نیوەنمەک و موشەمما لە ئەندام. گرتنی خەنە و وسمە و بۆیە لە سەر و ڕیش یا دەست و پێ. گرتنی بەرگ یا شووشە بەهێندێ شتدا: ئەو وێنەیەم لە چوارچێوە و شووشە (بۆ بگرە) یا ئەو نوشتەیەم لە بەرگ و موشەمما (بۆ بگرە).
تێگرا: تێکرا.
تێگڕایی: تێکڕایی.
تێگرماندن: تووڕەبوون لە یەکێک و هەڵشاخان بەسەریدا.
تێگوشین: تریتکردنی نان بۆ ناو خواردەمەنیی شل. بریتییە لە بەختکردنی دراو لە ئەندازە بەدەر لە شتێکدا: فیسار کەس ئەمساڵ لە تووتن کڕیندا زۆری (تێ گوشیوە) واتە دراوێکی زۆری بڵاوکردۆتەوە.
تێگەیاندن: وادارکردنی کەسێک لە شتێک.
تێگەیشتن: وادارب‌وون و زانینی شتێک کە لەوەپێش نەزانرابێ.
تێگەیشتوو: مەردوومی زیرەک و ژیر.
تێگەین: تێگەیشتن.
تێگەیو: تێگەیشتوو.
تێگیران: بریتییە لە زۆر هاتن بۆ یەکێک. بریتییە لە دەمقاڵی دوو کەس.
تێگیرکردن: گیرکردنی شتێک لە شتێک. بریتییە لە زۆرهێنان بۆ یەکێک.
تێگیریان: تێگیران.
تێل: تەل.
تێلا: دارێکی ڕاستی لووسە لە گورگە درێژترە.
تێلاترین: بریتییە لە لێدانی یەکێک بەدار بەزۆری.
تیلکە: دیزە.
تیلماسک: پارچەی باریکی درێژکۆلەی پچووک لە هێندێ شت. چەند دەنکێک لە هێشوویەک ترێ بەلاسکەوە.
تیلمە: پارچەی باریکی تەسک لە شت.
تێلەگە: هـ. کۆلێکی بەستراو بۆ ئەوەی کە بەکوڵ هەڵبگیرێ.
تێمرووکان: تێورووکان.
تێنان: خستنی شتێک لەناو شتێکدا.
تێنوارین: تێڕوانین.
تێنەوین: دەست دانە شتێکی قورس بۆ هەڵگرتنی یا هەڵکەندنی بەنهێم.
تێنیشتن: تێوەچوون لە کارێک و شان دانەبەری.
تێوولە: د. تەویلە.
تێورووکان: کۆبوونەوەی چەند گیاندارێک لە شتێک.
تێووشین: تێگوشین.
تێووڵین: تێووشین.
تێوەپێچان: پێچانی شتێک بەشتێکدا. لە دەمەوەدانی یەکێک لە کارێکی خراپدا.
تێوەچوون: تێوەگلانی شتێک لە شتێکی شل: کەواکەم لە ماستەکەوە (چوو). تێوەگلان و شان دانەبەر کارێک بۆ کردنی: فیسار کەس بۆ کردنی شتی باش چاک (تێوە دەچێ).
تێوەدان: دەرخواردنی شتێکی کەم لە شتێکی تر بەتێکەڵکردنیان: هەویرەکە شلە کەمێ ئاردی (تێوەدە)، یا واغێنەکە گوێزی تری (تێوەدە)، یا ئەو پارەیەی کە بڵاوت کردووەتەوە پارەی تری (تێوەمەدە) نەوەک بۆت کۆ نەبێتەوە. هەڵسوونی شتێکی شل لە شتێکی تر: کە دەستت سووتا ماستی (تێوەدە). دووچارکردنی یەکێک لای گەورەیەک بەگوناهێک: لای زۆردار کەس (تێوەمەدە).
تێوەردان: ئاو کردنە ناو دەفرێک و ڕاوەشاندن و ڕشتنیەتی بۆ پاکبوونەوەی.
تێوەژاندن: ئاگادارکردنەوەی گیاندار بەدەست یا بەشتێکی تر.
تێوەژەندن: تێوەژاندن.
تێوەشاندن: ڕاوەشاندنی بەرگ و کاڵا لەسەر ئاگر بۆ کەوتنە خوارەوەی مۆریان لێی.
تێوەگلان: دووچاربوونی کەسێک بەکارێکەوە کە حەزی لێ نەکا: ئیمساڵ بەتووتن کڕینەوە (تێوەگلام). تێوەچوونی شتێکی شل.
تێوەگلاندن: دووچارکردنی کەسێک بەشتێک کە حەزی لێ نەکا. تێوەدانی شتێکی شل لە شتێکی تر.
تیویڵ: ل. تەوێڵ.

تێهاتن: هاتنی شتێک بۆ ناو شتێکی تر: حەوزەکە ئاوی (تێ هات). داهاتن و هەڵمەتدانی شتێک بۆ شتێک.

تێهانین: سەرفرازی و سەرکەوتنی یەکێک لە کارێکدا: فیسار کەس باش (تێی هانی).

تێهەڵچۆ: کەسێکە بەبێ بیرکردنەوە پەلاماری هەموو کارێک بدا.

تێهەڵچوون: پەلاماردان و باوەشکردن بەکارێکدا.

تێهەڵچەقین: هەڵچەقینی شتێکی تیژ بەشتێکی تردا.

تێهەڵدان: لێدان لە گیاندار بەشەق. تێکەڵکردنی شتێک لە شتێکی تر: برنجەکە لەتکەنۆکی (تێ هەڵدە). بریتییە لە دەرکردنی یەکێک.

تێهەڵساوین: تێهەڵسوون.

تێهەڵسوون: سوونی شتێک لە شتێکی تر: ڕۆنەکە لە کولێرەکە (هەڵسوو)، یا خۆتم (تێ هەڵمەسوو).

تێهەڵقورتان: لە خۆوە چوونە ناو کاری ئەم و ئەو.

تێهەڵکردن: تێهەڵچوون لە قسە یا کردەوەیەک بەبێ پرس و ڕا.

تێهەڵکێش: تێبردنی شتێک بەناو شتێکی تردا.

تێهەڵکێشان: هەڵکێشانی شتێک لەناو شتێکدا.

تێهەڵنگان: هەڵەنگوتن.

تێهێنان: تێهانین.

تی: با. لێوار و قەراغی شت.

تی: تینوو. کۆنە شووبرای ژن (ز). پیتێکە دەبێ بەپاشداری هێندێ ناو مەعنای (مصدر) دەگەیەنێ: پیاوە(تی)، مەردایە(تی) واتە بوونی بەپیاو، بوونی بەمەرد.

تیپ: کۆمەڵێک لە گیاندار.

تیپەن: کۆمەڵێک لە سوار.

تیت: پرچ (هـ). توو (ل).

تیتاڵ: د. گاڵتە.

تیتاڵباز: د. گاڵتەچی.

تیتاڵی: د. گاڵتەکردن.

تیترواسک: تووترواسک.

تیتک: ئەگریجە. تووتکە سەگ (ل). نوشتە و مووورووی ناوچەوانی منداڵ (با). خوشکی باوک.

تیتکزا: پوورزا.

تیتلە بیجاغ: تیترواسک.

تیتە: د. چەکی ژنانە.

تیتی: وتەیەکە بزنی پێ بانگ دەکرێ.

تیتیلە و بیبیلە: بەچکەی وردی گیاندار. داستانی بزن و گورگە کە بۆ منداڵ دەکرێ.

تیر: شتێکی ڕاستی لووت تیژە بەکەوان دەهاوێژرێ وەک گوللە. چەند جۆگەیەکی باریکی ڕاستە بەناو مەرەزەدا دەبرێ بۆ ئاودانی.

تیراوێ: برینێکی زۆر پیسە چاکبوونەوەی نییە ئەگەر سارێژیش ببێ هەر هەڵدەداتەوە.

تیراوێژ: ئەندازەی هاویشتنی تیرێک.

تیر ئەناز: د. تیرئەنداز. تیراوێژ.

تیرئەنداز: کەسێکە کە تیر باش بهاوێ.

تیرئەندازی: تیرهاویشتن.

تیرباران: نانەوەی یەکێک بەنیشانە و، بە تیر یا تفەنگ دەسترێژ لێ کردنی.

تیردان: شتێکە تیری تێدا هەڵدەگیرێ.

تیرک: د. دیرەگ.

تیرکێش: د. تیردان.

تیرۆژ: ز. ڕووناکیی ڕۆژ کە لە کلاوڕۆژنەوە بێتە ژوورەوە.

تیرۆژوو: پارچەیەکە لە کراس سەرێکی پان و سەرێکی باریکە لەکاتی لەبەرکردندا دەکەوێتە لای قەبرغەوە.

تیرۆک: دارێکی باریکی ڕاستی لووسی خرتە نانی تیری پێی دەکرێتەوە.

تیروو: جۆرە دارێکی دێمییە وەک (تەروو)، بەشاخەوە دەڕوێ و هەرگیز زۆر زل نابێ.

تیرە: چەند هۆزێکە کە بچێتەوە سەر ئێلێک. چەند زوبیلێکە لە چەرمی خاو کە وەک ڕایەڵ پلێتەکانی ژێری کڵاشی تێ هەڵدەکێشرێ. کندر (ز). بروسکە و چەخماخەی ئێشی ئەندام (د).

تیرەباران: تیرباران.

تیرەشان: شانە هەنگوینێکە کە لەسەر لا هەڵبەسترابێ. تیغە شان.

تیرەغە: بڕبڕەی پشت.

تیرەمار: جۆرە مارێکی زەردی باریکی تیژڕەوە بەقەد تیرۆکێک دەبێ.

تیرەنان: نانی تیری. تیرۆک.

تیرەنداز: تیرئەنداز.

تیرەندازی: تیرئەندازی.

تیرێژ: تیرۆژوو.

تیرێژوو: تیرۆژوو.

تیری: نانێکە کە بەتیرۆک کرابێتەوە.

تیز: تیتاڵی.

تیزانگ: د. میزڵدان.

تیزپێکردن: گاڵتەکردن بەیەکێک.

تیزپێوەکردن: تیز پێکردن.

تیژ: شتی بڕندە. شتی کەسکوون. بریتییە لە کەسێک کە زۆر سوور بێ لە کردنی کارێک.
تیــژاو: ئاوی قــڵــیــە کــە ســابوونی پێ دروست دەکــرێ. خۆڵەمێشاوێکە ژنان لەگەڵ سابوون کاڵای پێ دەشۆن.
تیژبوون: بریتییە لە سووربوونی یەکێک لەسەر کارێک. بوونی شت بەتیژ.
تیژکردن: بریتییە لە هانەهانەدانی یەکێک لەسەر کردنی کارێک. خۆشکردنی ئاگر: ئاگرەکە (تیژ) کە. بڕشت پەیداکردن بەتیغ.
تیژی: بوونی شت بەتیژ. بوونی شت بەکەسکوون.
تیش: ز. کێو.
تیشە: ل. تەشوێ.
تیغ: ئاسنی تیژی بڕندە.
تیغە: خشتی لەسەر شان دانراو بەگەچ یا بەقوڕ.
تیغەرە: تیرەغە.
تیغەشان: زنجیرەی شاخ. تیغەی دیوار.
تیفتیفە: شەوق و بریقەیەکە کە لەدوای تەراش پەیدا دەبێ.
تیفتیفەدان: خۆ لووسکردن و ئارایشدان.
تیفتیفەکردن: تیفتیفەدان.
تیڤرگ: ز. کڵاو کوڕە.
تیڤل: با. توێکڵ.
تیک: جـۆرە دروومـانێکە لەپێشـدا دوو پارچە لە یەک دەدرێ و هەڵدەدروێ و لەپاشان جەمسەری هەردووکیان دادەگیرێتەوە.
تیکلە: د. مەنجەڵۆکەی پچووکی مسین. جەڕە.
تیـکە: پاروو. پـارچەیەک لە قـاڵی. پارچەی شت. (تیـکە تیـکە بوون) پارچەپارچەبوون، (تیکەتیکەکردن) پارچەپارچەکردن، (تیکەتیکە) پارچەپارچە.
تیـل: کـەسـێکە کـە بەگـۆشـەی چاو تەمـاشـا بکا. هاویشـتـنی هەڵـمات بەپەنجە بۆ دانی لە شتێک: فـیـسـار کـەس (تیلی) ڕاستـە. (تیلکردن) هاویشـتـنی هەڵمات بەتیـل. مەردوومی خێل.
تیلاک: کەسێکە کە پێشی سەری مووی پێوە نەبێ.
تیلایی: ڕوانین بەگۆشەی چاو.
تیلیمە: تیلمە.
تیلە: د. ڕەشتاڵە.
تیلی بەرامبەرێن: تیلکردنی دوو کەس بۆ هەڵماتی یەکتری.
تیلێن: تیلی بەرامبەرێن.
تیماج: د. تیمانج.
تیمار: دەرمانی برین. ناوی دوو دێیە لە قەرەداغ و سورداش.
تیمارخانە: شوێنێکە کە هەموو جۆرە دەرمانێکی تێدابێ.
تیمارکردن: دەرمانکردنی برین. ڕنەک و قاشاوکردنی وڵاخ.
تیمارکەر: کەسێکە دەرمانی برین بکا. کەسێکە ڕنەک و قاشاوی وڵاخ بکا.
تیمارکردن: د. شاڵ و قاشاوکردنی وڵاخ.
تیـمـانج: چەری مـەڕ و بزن و گـوێرەکـە کـە خـۆش کـرابێ و ڕەنگ کرابێ.
تیمچە: د. کاروان سەرا.
تین: هێز. تینوو (ز).
تینشیر: با. شیرتێن.
تینگ: تینوو. ئاڵوو.
تینگکەوتن: ئاڵووکەوتن.
تینگی: تینوێتی.
تینوو: گیاندارێکە ئارەزووی خواردنەوەی ئاو بکا. گەروو.
تینوێتی: ئارەزووکردنی خواردنەوەی ئاو.
تیوتیوە: تیفتیفە.
تیوتیوەدان: تیفتیفەدان.

# ج

جا: وتەیەکە قسـەکەر بێباکیی خۆی پێ پیشـان دەدا لە بوون یا نەبوونی شتێک: (جا) بابێ یا با نەیەت لەکاتێکدا کە بڵێن فیسـار کەس دێت یا نایەت، واتە بێ یا نەیەت باکم نییـە. کات: کە تۆ هاتی ئەو(جا) من دەڕۆم. بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (ئیتر): (جا) چی بکەم واتە ئیتر. جێگە (د).

جا ئاستە: هـ. بەجێهێشتن.

جاپلووس: ڕیاکاری زبانلووس.

جاپلووسی: ڕیاکاری و زبانلووسی.

جـاترە: گـیـایەکی گـەڵاباریکە وەک تەرخـون وایە دەچێنرێ و دەکرێتە ناو هێندێ چێشتەوە.

جاترە کێویلە: گیایەکی بەهاریی کێوییە لە جاترە دەچێ بۆ ژانە سک جۆش دەدرێ و دەخورێتەوە.

جاجر: ز. خواردەمەنییەکە لە گوێزی کوتراو و هەنگوین دروست دەکرێ.

جاجک: بنێشت.

جاجکەتاڵە: بنێشتەتاڵ.

جاجکەخۆشە: بنێشتی خۆشکراو.

جاجگ: د. جاجک.

جاجم: پێخەفێکی تەنراوی سفتی ڕەنگاوڕەنگی خورییە.

جاچک: جاجک.

جاچکە: جاجک.

جاخ: توورەکەیەکی پچووکە لە موشەمما تووتنی تێدا دادەگیرێ. دیوارێک کـە لە دار دروست کـرابێ (ز). زێد و نیـشـتـمـان (د). چاخ (د).

جاخولکە: جاخی پچووک.

جادار: د. جێنشین.

جـادوو: چاو بەندیکردنی شـتی درۆ و دەلەسـە لە پەردەی شـتی ڕاسـتـدا وەک کـردنی پارچە کـاغـەزی براو لە شـێـوەی دراودا بەدراو لەپێش چاوی مـەردووم. جـادووگـەر: چی بکەم لە دەست ئەم (جادوو)ە.

جادووباز: جادووگەر.

جـادووبەند: تەنەکـەیەکـە لە زێڕ یا لە زیو نوشـتـەی چاوەزاری لێ دەنووسرێ.

جادووگەر: کەسێکە کە جادووبکا.

جادووگەری: خەریکبوون بەکردنی جادووەوە.

جـار: نۆرە: ئەوەتی هەم (جـار) یێک چووم بۆ بەغـدا. (جـارجـار جارجارە) نۆرەنۆرە.

جاران: وتەیەکە دەمی ڕابردوو پێشان دەدا: (جاران) برایەتی زۆر خۆش بوو.

جارجیم: ز. جاجم.

جـاڕ: جـێگـای هەمـوو دانەوێڵـەیەک کـە دروابێـتـەوە. بانگەواز: جـاڕچی (جـاڕ) دەدا. وتەیەکـە بەهێندێ ناوەوە دەنرێ دەیکا بە(اسمی مکان): نێرگسـە (جاڕ) مەرەزە (جاڕ) واتە جێی نێرگس و مەرەزە. زەمینی سەختی نەکێڵراو (د).

جاڕچی: کەسێکە پیشەی هەر جاڕدان بێ.

جاڕدان: بانگەوازکردن بۆ شتێک.

جاڕ ڕاهیشتن: جاڕدان.

جاڕس: کـەسێکە لە کـارێک وەڕس بووبێ. (جاڕسـبـوون) وەڕس بوون، (جاڕسکردن) وەڕسکردن.

جاڕوو: شـتێکە لە قسـلی بێژراوە و خۆڵەمێشی پەینی سووتاو دەگیرێتەوە و حەوزی پێ سواغ دەدرێ. گەسک (د).

جاڕووبەند: شوێنێکە کە بەجاڕوو سواغ درابێ.

جاڕووکاری: جاڕووبەند.

جارماز: د. بەرماڵی نوێژ.

جاروبار: جارجارە.

جارە: د. تاوێر. سینەکەمان (جارەجارە) جارجارە.

جـارێ: وتەیەکـە بەدیمەن (إسم) و وەکی تر فـعلە: (جـارێ) لە وەرامی یەکێکدا کە بڵێ دەڕۆم، واتە مەڕۆ. جارێک.

جاری جاران: وتەیەکە چەند دەمێکی ڕابردوو پیشان دەدا.
جارێک: نۆرەیەک.
جارێکیان: د. جارێک.
جاسووس: کەسێکە کە بەدزییەوە هەواڵ و باسی یەکێک یا شوێنێک ببا بۆ یەکێکی تر.
جاسووسی: بردنی هەواڵ و باسی یەکێک یا شوێنێک بۆ یەکێک بەدزییەوە.
جاش: بەچکەی کەر.
جاشک: جاشولکە.
جاشکۆڵە: جاشولکە.
جاشولکە: جاشی پچووک.
جاگە: هـ. جێگا.
جاڵجاڵۆکە: دەعبایەکی چنگ چنگە لە کون و قوژبنی دیوار و بن میچدا بەداوێکی زۆر باریک هێلانە دەتەنێ بۆ گرتنی مێش و مەرۆش.
جام: دەفرێکی مسین یا زەردی قووڵی دەم پەلە. ئاوێنە. شووشە.
جامانە: پارچەیەکی تەنراوی بەدەزووچنراوی گوڵ گوڵییە، جۆرێکیان پیاو دەیبەستێ بەسەریەوە و جۆرێکیشیان ژنان دەیکەن بەکراس و دەسماڵ.
جامباز: کەسێکە دەست بەدەست شت بکڕێ و بفرۆشێتەوە. بریتییە لە مەردوومی فێڵباز.
جامبازە: یاریکردن و هەستانە سەر پاشووی وڵاخ و حوشتر.
جامبازی: کڕین و فرۆتنەوەی شت دەست بەدەست.
جامخانە: هۆدەی شووشەبەند.
جامدانە: د. جامانە.
جامولکە: جامی پچووک.
جامۆلکە: جامولکە.
جامۆڵە: د. جامولکە.
جامەدانە: جامانە.
جامەدانی: جامانە.
جامەلووس: مەردوومی دەم تەڕی زبانلووس.
جامەلووسی: زبانلووسی و کلکە لەقێ کردن.
جامیر: با. جوامێر.
جامێر: ز. جوامێر.
جان: گیان.
جانانە: مەردوومی زۆرزانی فێڵبازی زبانلووس. دۆستی گیانی گیانی.
جانباز: جامباز.
جانبازە: جامبازە.
جانبازی: جامبازی.
جانتا: شتێکی چەرمینی دەسکدارە وەک سندووق کەلوپەلی تێ دەخرێ و بەدەست هەڵدەگیرێ.
جانفاس: کاڵای ئاوریشمینی ڕووت (ز). جۆرە تەنراوێکە وەک گونیە.
جانکووشک: ز. کەسێکە بەبانگکردن یا بەتەقەکردن گاوران لە خەو هەستێنێ بۆ چوونە کڵێسە.
جانگ: جاو.
جانگی: د. ناوەندی چاو و گوێ.
جانماز: بەرماڵی نوێژ لەسەرکردن.
جانەر: ز. گیایەکی بۆنخۆشە گوڵێکی سپیی بۆرەڵووک دەگرێ.
جانەوەر: گیانداری دڕندەی بە زیان.
جانی: ز. جوانوو.
جاو: تەنراوێکە وەک بلووری بەڵام ئەم ڕیسەکەی ئەستوورترە و بەخەرەک دەڕیسرێ و جۆڵا دروستی دەکا.
جاوپێچک: نەوەرد.
جاوراوە: جووراوە.
جاونانەوە: ڕایەڵکردنی جاو. بریتییە لە کەسێک کە زۆر هاتوچۆ بکا.
جاووگ: د. جاو.
جاهێڵ: لاوی گەنج.
جاوین: جوونی شت.
جاوینەوە: جوونەوە.
جاینگ: لاجانگ.
جبۆ: ز. وتەیەکە وەک وتەی (کابرا) و هەر بۆ نێرینە بەکاردێنرێ.
جبە: کاڵایەکی ئاودامانی قۆڵدارە زانایان و دادپرسان و هێندێ پیاوی گەورەی تر لەبەری دەکەن لەباتی (باڵاپۆش).
جبەخانە: کۆگای چەکی جەنگی.
ججە: ز. دەنگێکە مەڕی پێ دەردەکرێ.
جدەو: جۆرە برینێکە لەناو شانی وڵاخ پەیدا دەبێ بەهۆی گرتنی بار یا زین و کورتانەوە. (جدەوبوون) بریندارbوونی پشتی وڵاخ لەبەر بار یا زین یا کورتان. شتی عەیبدار (د).
جدەوبوون: عەیبداربوون و لە کارکەوتنی شت.
جر: ز. هاودەمی و ڕابواردن.
جراجر: ز. دەمقاڵی لەسەر شتێک.
جرپن: مەردوومی دەلووکاری بزێو.
جرپ و جۆپ: جرت و فرت.
جرت: جڕت. مەردوومی هەرزە (د).
جرتاو: جەرەتاو.
جرت و فرت: هاتوچۆکردن بەپەلەپەل و بەبێ جێ.

جرته: پاڵتۆی لەبەرکردن.
جرتەکردن: جرپنی و بزیۆیکردن.
جرج: دەعبایەکی چوارپێیە لە مشک گەورەترە.
جرجەکوێرە: مشکەکوێرە.
جرد: ز. جرج.
جر داهێشتن: د. جرتکێشان.
جــر: د. وتەیەکــە بۆ گــاڵتــەپێکردن بەکــاردێنرێ: (جــر) لە خوێندەواریت.
جرپۆزە: وتەیەکە بەرازی پێ لە کون دەردەپەرێنرێ.
جرت: ترکەندن بەدەم.
جرجرە: د. بەرزەجرە.
جرجونگانێ: د. مەردوومی توورە و ترۆ.
جرجینگانێ: د. جرجونگانێ.
جر و جانەوەر: پر و پیتی بێ کەڵک.
جر و جیاز: پر و پیتی ناوماڵ.
جر و جیاری: جر و جیاز.
جرە: باڵندەیەکی پچکۆلەیە کە پێی دەڵێن (جورە).
جرها: د. جر.
جرهاتن: د. تەنگەتاوبوون.
جرەبەگزادە: باڵندەیەکی جوانی رەنگاورەنگە بەقەد پۆرێک دەبێ بەڵام ئەم باریکترە.
جرنگاندن: بریتییە لە دانی دراوێک کە پێت ناخۆش بێ.
جــرنگە: جــۆرە دەنگێکە وەک دەنگی پارە. (جــرنگە جــرنگ) جرنگەی یەک لەدوای یەک.
جرووکە: دەنگی مەلی پچووکی وەک چۆلەکە. (جرووکە جرووک) جرووکەی یەک لە دوای یەک.
جریتان: د. جریتبازی.
جریتبازی: جلیتێن.
جریتێن: جلیتێن.
جریکە: د. جرووکە، (جریکە جریک) جرووکە جرووک.
جــریوە: دەنگی چۆلەکــە. جــوولانەوەی ئەســتــێــرە لەپێش چاو. (جریوە جریو) جریوەی یەک لەدوای یەک.
جز: د. چزەی شیشی سوورەوەکراو کە بکرێ بەئاودا.
جزدان: کیفێکی چەرمینە دراوی تێ دەکرێ.
جززە: جزە.
جــزم: بەشــێکی تایبــەتی ســەربەخــۆ لە نووســراوێک: مــێــژووی کوردستان دوو (جزم)ە.
جزوبەند: بەیەکەوە بەستنی جزمی کتێب و لە بەرگ گرتنی.
جزمە: پێڵاوی لاسک درێژی چەرمین یا لاستیکی زستانییە وەک چەکمە وایە.
جزە: وتەیەکە منداڵی ساوا بەگۆشتی دەڵێ. کزە.
جعێتنی: جۆرە ولاخێکی بەرزی رەسەنە.
جعــیــدۆک: ز. گــیــایەکی بۆنخۆشــە دەخرێتــە ناو کــالاوە لەبەر مۆرانە.
جغارە: جگەرە.
جغـز: کـێـرێکی گـردە لە یاریی جغـزێندا دەکـێشـرێ، دەسـتـەی تێکەوتوو دەچنە ناویەوە.
جغزێن: جۆرە یارییەکی دوو دەستەییە، (جغز)ێک دەکێشرێ هەر دەستـەیەکیان تێکەوت دەچێتە ناویەوە و دەستـەکەی تر لە دەرەوە تۆپیان تێ دەگرن.
جغەرە: جگەرە.
جغەرەچی: جگەرەفرۆش.
جغەرەخۆر: جگەرەخۆر.
جغەرەکێش: جگەرەکێش.
جفت: جووت (د). (جفتبوون) جووتبوون. جەوت (ل).
جفتە: شتێکە وەک مووکێش بەڵام ئەم لووتی باریکە سەعاتچی پارچەی وردی سەعاتی پێ هەڵدەگرێ. جووتەی ولاخ (د).
جفتەقزمیر: جۆرە چۆغەیەکی تەنکی سفتی ساغە.
جفتەوەشانن: د. جووتە وەشانن.
جفتەوەشێن: جووتە وەشێن.
جفتەهەڵخشتن: د. جووتە وەشاندن.
جفتیار: د. جووتیار.
جقە: جۆرە چۆلەکەیەکی بۆرەڵووکە لە پاساری کەمێک گەورەترە. پەرێکە کە پاشایان و پیاوی گەورە دەیدەن لە سەریان. گوڵی بادامی (د).
جک: د. میچ.
جگ: دیوی چاڵ لە میچ.
جگانێ: میچێن.
جگەر: جەرگ. بریتییە لە رۆڵەی ئادەمیزاد.
جگەر ئۆنی: گیایەکە جۆش دەدرێ و بۆ کۆکە دەخورێتەوە.
جگەرچی: کەسێکە پیشەی هەر جگەر برژاندن بێ.
جگەرسـۆز: بریتـیـیـە لە یەکـێک کـە بەتەنگـتـەوە بێ و دڵـی پێت بسووتێ.
جگەرسووتان: بریتییە لە مردنی رۆڵەی جگەرگۆشە.
جگەرسووتاو: بریتییە لە کەسێک کە رۆڵەی مردبێ.
جگەرگۆشە: بریتییە لە رۆڵەی مەردووم.
جگەرە: کــاغــەزێکی باریکی درێژی لوولەی پر لە تووتنە دادەگیرسێنرێ و دەکێشرێ.
جگەرەچی: کەسێکە کە پیشەی هەر فرۆشتنی جگەرە بێ.
جگەرەخۆر: جگەرەکێش.

جگەرەکێش: کەسێکە ئالوودەی جگەرە بێ.
جگێن: میچێن.
جل: کالا و بەرگی ئادەمیزاد. پەلاسێکە لە ولاخ دەکرێ.
جلبڕ: کەسێکە کە بەرگ و کالا بۆ مەردووم ببڕێ.
جلبڕان: د. جلبڕین.
جلبڕۆکە: مزرۆکە.
جلبڕین: بانگێشتن (دەعوەت)ێکی تێکڕاییی ژنانەیە لەلایەن ماڵی بووکەوە بۆ بڕینی جلی بووک.
جلدان: چارۆکەی کۆڵی ژنان.
جلدروو: کەسێکە بەرگ و کالا بدروێ بۆ مەردووم.
جلشتن: شوشتنی بەرگ و کالا لە ماڵدا بەتێکڕایی.
جلشۆر: کەسێکە کە لە ماڵدا جلوبەرگ بشوا.
جلشۆرک: شوێنێکە بەرگ و کالای تێدا دەشۆرێ. گەلا کوتک.
جلڤڕ: جرین.
جلق: ناوە بۆ دراوێکی کەم نرخی بابانی.
جلقاو: د. چلکاو.
جلک: بەرگ و کالا.
جلکار: بەرگێکە هەر لەکاتی کاردا لەبەر دەکرێ.
جلگا: د. جۆرە ماسییەکە.
جل و جۆڕ: شڕەی ناوماڵ.
جلە: گیاندارێکی ئاوییە وەک مادە لەناو ئاودا خۆی پان دەکاتەوە بۆ مڵ و مووش.
جلەشڕە: گیایەکی ئاوییە وەک بەڕە بەسەر ئاودا پان دەبێتەوە. جلە.
جڵەو: دەستە ڕەشمە. دانە لغاو. کۆمەڵێک لە ئاژاڵ.
جڵەودار: سەرۆکی کاروان.
جڵەو شلکردن: بریتییە لە بەرەڵاکردنی منداڵ و بەردەست و گوێ نەدانیان.
جڵەوکێش: جڵەودار.
جڵەوکێشان: ڕاکێشانی جڵەوی ولاخ.
جڵەوگیر: کەسێکە کە جڵەوگیریی یەکێک بکا.
جڵەوگیری: بریتییە لە ڕێ نەدان بۆ کردن یا وتنی شتێک: (جڵەوگیری) کوڕەکەت بکە لە هاوڕێی پیاوی خراپ.
جڵەوهەڵتەکاندن: بریتییە لە جڵەوگرتنی یەکێک.
جڵەوهەڵکێشان: جڵەوهەڵتەکاندن.
جلیتبازی: جلیتێن.
جلیتێن: یاریکردن بەگۆ بەسەر سوارییەوە.
جم: جووڵە.
جمان: جوولان: خوێن (جمان)ە.
جمدان: جوولان بەتەکانەوە.
جمس: د. جووڵە.
جمشرگ: د. مەچەک.
جمک: دووانەی منداڵ یا گیانداری تر.
جمکانە: جمک.
جمکوت: د. شتێکە کە چێوئاخن کرابێ. شوێنی جەنجاڵ.
جمگە: جومگە. پارچەی شت. (جمگەجمگە): شتی کوت کوت.
جموجووڵ: جووڵە جووڵ.
جممە: جمە.
جمە: وتەیەکە بۆ کۆبوونەوە و بەسەر یەکدا کەوتنی مەردووم لە شوێنێکدا بەکاردەهێنرێ: ئیمرۆ بازاڕ (جمە)ی دەهات.
جمیان: جمان.
جمین: جمان.
جناور: ز. جانەوەر.
جنچک: د. ناوکی میوە. جنچک. جینچکە.
جنچکان: د. هەڵتووتان بەچیچکانەوە.
جنچکە: د. جنچکان.
جنراو: شتێکە بەتیغ وردکرابێ.
جنکە: د. ڕێزەیەک لە شتێک.
جنگدان: جمدان.
جنگز: مەردوومی توند و تووڕە.
جنگن: جنگز.
جنگ و جووڵ: جموجووڵ.
جننە: د. ژنی سۆزانی حەشەری.
جننەباز: پیاوێکە بەشوێن ئافرەتی حەشەریدا بسووڕێتەوە.
جننەخانە: د. شوێنێکە ئافرەتی حەشەریی تێدابێ.
جنۆکە: جۆرە گیاندارێکی نادیاری ونە کە هەرگیز نابینرێ.
جنیاگ: شتی جنراو.
جنێو: وتەی ناشیرین کە بە یەکێک بدرێ.
جنێودان: وتەی ناشیرین وتن بە مەردووم.
جنێوفرۆش: بریتییە لە یەکێک کە زۆر جنێو بدا.
جنین: ورد کردنی شت بەتیغ.
جۆ: دانەوێڵەیەکە وەک گەنم بەڵام ئەم زبر و گەورەترە. جۆگە.
جوار: ز. تووڕەکەی ولاخ.
جوال: ز. جەواڵ.
جواڵ: د. جەواڵ.
جوامێر: پیاوی شۆخی ئازای دەرهاتوو.
جوان: شتی ڕێکوپێکی دڵگیر.
جواناو: ئارەقێکی ساردە نەخۆش لەکاتی گیانەلادا دەری دەدا.
جوانچاک: مەردوومی گەنجی زۆر جوان.
جوانکە: جوانی خۆشەویست.

جوانکەلە: جوانی خنجیلە و پچووک.
جوانکیلانە: جوانکەلە.
جوانکیلە: جوانکیلانە.
جوانن: د. جوولاندن.
جوامەرد: د. جوامێر.
جوامەردی: د. جوامێری.
جوانوو: بێچووی ماین.
جوانوولکە: جوانووی ساوا.
جوانەزووە: عازەبە.
جوانەزەوە: جوانەزووە.
جوانەگا: پارێنێکە پێی نابێتە سالی سێیەم.
جوانەمەرگ: کەسێکە کە بەگەنجی بمرێ.
جوانەمەرگە: جوانەمەرگ.
جوانی: تافی گەنجی. بوونی شت بەجوان: (جوانی) بەهرەیەکی خۆشە. جوانوو: (ز).
جۆبار: د. جۆگە.
جوتکە: جووتەی ولاخ.
جوچکە: کلێنچکەی گیاندار. کلکی گیاندار. جووجەلە.
جوچکەبریاگ: د. وتەیەکە بەکاردێنرێ لەباتی وتەی (دوابراو).
جوچکەلەقێ: د. کلکەلەقێ.
جوچکە ناو گەلگرتن: د. بریتییە لە ڕەوکردن و شکان و خۆشاردنەوە.
جوجمێ: ز. تۆپێن.
جۆخۆرە: جۆرە بالندەیەکە وەک چۆلەکە.
جۆخێن: خەرمان.
جودا: جیاواز.
جۆداس: گیایەکی کێویی زبرە وەک جۆ وایە بەلام ئەم شیرەی کەمە.
جۆدان: جۆرە گرنجییەکە لە دانی ولاخی یەکسمدا کە جۆی پێ دەهارێ.
جۆدانە: د. جۆدان.
جودایی: جیاوازی.
جۆدرەو: کاتی دروێنەی جۆ.
جۆر: تەحر.
جوردە: ل. بەرگ و کالا.
جۆرک: توورەکە.
جۆرکە: هـ. جۆرک.
جورنە: قوولکەیەکە بە بەرزییەوە لە حەمامدا ئاوی گەرمی تێ دەکرێ بۆ خۆ پێ شوشتن.
جورە: بالندەیەکی بۆرە لە چۆلەکە پچووکترە. جۆرە دەنگێکە وەک جیرەی دەرگا.
جورەکلاونە: د. جورە.
جوریان: د. گۆران.
جورکە: توورەکە.
جۆری: گولێکی بۆنخۆشی جوانە وەک شەسپەر بەلام ئەم پچووکتر و ڕەنگی تێرترە.
جۆزەرد: جۆزەردان.
جۆزەردان: مانگی حوزەیران.
جوستوجۆ: دووکەوتنی شتێک و هەول و تەقەلادان بۆ پەیاکردنی یا بۆ زانینی.
جوستە: ڕیزە دروومانی تەنیشت (باریکە). جەستە.
جوسوجۆ: د. جوستوجۆ.
جۆش: جۆرە خشتێکی قورسی شین کارە کە زۆر سوور بووبێتەوە. چەسپ: ئەم دوو دانە (جۆش)ن واتە بەیەکەوە نووساون.
جۆشخواردن: تووانەوە و بەسەر یەکداچوونی هێندێ شت بەهۆی ئاگرەوە.
جۆشدان: هێنانە کولی هێندێ شت لەسەر ئاگر.
جۆش سەندن: هاتنە کولی شتی شل لەسەر ئاگر. بریتییە لە تاوسەندنی جیهان لە هاویندا. بریتییە لە گەرمبوونی یەکێک لە کارێکدا.
جۆشن: کەسێکە بەجۆش بێ خۆی لەم و لەو هەلسوێ.
جۆشیان: هاتنە جۆش.
جۆشیرە: جۆیەکی سەوزە کە تازە شیرەی تێپەڕیبێ.
جۆشیلە: جۆشیرە.
جوقنە: بالندەی زۆر پچووکی نابووت.
جۆگا: جۆگە.
جوگمە: جومگە.
جۆگە: هێلێکی گەورەیە کە ئاوی پێدا بڕوا.
جۆگەلە: جۆگەی باریکی پچووک.
جۆل: گیایەکە لە مێرگدا دەڕوێ ئاژال باشی دەخوا (با). چەند سەرێک لە مەڕ (ز).
جۆلا: کەسێکە کە بەدەست شت بتەنێ لە پێچالدا.
جۆلانە: شتێکە لە دار و تەختە یا لە گوریس و پەڕۆ دروست دەکرێ و مندالی تێدا ڕادەژەنرێ.
جۆلانێ: جۆلانە.
جۆلایی: تەنیی شت لەلایەن جۆلاوە.
جۆلایی کەرە: جالجالۆکە.
جولحا: ل. جۆلا.
جۆم: شوێنێکە لەناو شاخ و داخدا کە ئاو دایدڕیبێ.
جۆمال: پاککردنەوەی جۆگەی گەورە و قوولکردنی.
جومبوش: جوولانەوە و هاتوچۆی شت بەزۆری.

جومگە: جەمسەری دوو ئێسقان لە ئەندامی گیاندار.
جۆمەرد: جوامێر.
جۆن: جوێن.
جونگ: بزێکە کە دەکرێ بەیەکێکەوە. گیانداری تۆڕ (د). قین (د).
جۆنگ: لە جێچوونی پاشووی گوێدرێژ.
جونگ پێوەکردن: بزپێوەکردن.
جونگکردن: د. قینگرتن.
جونگە: دەنگی ترِی باریکی پچووک. (جونگە جونگ) جونگەی یەک لەسەر یەک.
جۆنەگا: ز. جوانەگا.
جۆنی: ز. دۆلّی دار یا بەرد کە شتی تێدا دەکوترێ.
جوو: جوولەکە: جۆگەلە (ل). جۆگە (ز).
جووبرک: ز. ملّە.
جووت: شتێکە کە تاک نەبێ. دوو ئێستر یا دوو گا یا دوو کەرە کە زەوی پێ بکێلّرێ.
جووتانە: شتێکە کە سالّی جارێک لە خاوەن جووت بسێنرێ.
جووتبوون: جووتگرتن. ڕێکبوونی دوو شت بەقەد یەک.
جووتکردن: کێلاّنی زەوی بەجووت. پێوەدان و داخستنی دەرگا و پەنجەرەی دوو دەری. خستنە پالّ یەکی دوو شت.
جووتگرتن: یەککەوتنی نێر و مێ.
جووتە: لەقەی وڵاخی یەکسم بەهەردوو پاشووی. دوو گیاندارن کە بەیەک سک بووبن. وڵاخێکە کە دوو شارەگ لە ناوچەوانیدا بەرز بووبێتەوە کە ئەمەش گوایا نیشانەی بەدبەختیی خاونیەتی. دراوێکی زیوینی ئێرانییە بەدوو قران دەچێ.
جووتەوەشاندن: لەقەوەشاندنی وڵاخی یەکسم بەهەردوو پاشووی.
جووتە وەشێن: بریتییە لە ئادەمیزادی قسە ترِن.
جووتەی سەران: وتەیەکە کە دوو کەسی بێ (تشبیە) دەکرێ کە هەمیشە بەیەکەوە لە جێگایەک حازر بن.
جووتەی هەنجیران: دوو ئەستێرەن لە تەنیشت یەکەوە وەک چزوو وان بۆ چەند ئەستێرەیەک کە لە دووپشک دەچن، حەلێک کە لە ئێوارانـدا کەوتنە قیبلە ئیتر ئەوە کاتی پێگەیشتنی هەنجیرە.
جووتیار: کەسێکە کە بەساڵانە جووتت بۆ بکا.
جووتیاری: جووتکردن بۆ یەکێک بەساڵانە.
جووجک با: چۆلەکە.
جووجوو: وتەیەکە منداڵی ساوا بۆ هەموو گیاندارێکی پچووک بەکاری دەهێنێ.
جووجە: جووچکێکە کە کزر بووبێ و هێشتا نەبووبێ بەبارۆکە. جووجوو.
جووچەقۆرە: فرِوجاوێکە بەئاوی بەرسیلە کرابێ.
جووجەڵە: بێچووی مریشک.
جووچک: جووجەڵە.
جووخێن: جۆخێن.
جوور: جۆر.
جووراو: شتێکە کە لە دەمدا جوورابێ: ئەم بنێشتە (جووراو)ە.
جووراوە: ئاسنێکە کە بەهۆی لێدان یا پیاکەوتنی شتێکی قورسەوە زەدەدار و گرنج گرنج بووبێ.
جوورک: جۆرک.
جوورکردن: سەندنی شتێک لە یەکێک بەقومار یا بە فرِ و فێڵ.
جووز: د. جووزە.
جووزان: ز. گوێزان.
جووزپێوەکردن: بزپێوەکردن.
جووزە: دەنگێکی باریک و پچووکە وەک دەنگی سەماوەر. (جووزەجووز) جووزەی یەک لەدوای یەک.
جووزەلە: دووزەلە.
جووش: د. جۆش. خەڵفی درەخت کە لە بنەوە دەری دەکا.
جووشانن: د. جۆشدان.
جووشخواردن: د. جۆشخواردن.
جووقن: جوقنە.
جووک: بزێکە کە دەکرێ بەیەکێکەوە. جۆگەلە (با). جووکی (د).
جووکاندن: جووکەکردنی چۆلەکە.
جووک پێوەکردن: جونگ پێوەکردن.
جووکن: گیاندارێکە کە زۆر بجووکێنێ.
جووکە: دەنگێکە وەک دەنگی جووچک. (جووکەجووک) جووکەی یەک لەدوای یەک.
جووکەبرِین: بریتییە لە خەفەکردنی یەکێک.
جووکی: کەسێکە کە بە فرِ و فێڵ مەردووم هەڵخەڵەتێنێ و چاوبەستی لێ بکا و نوشتەی رِەشی و دێوبەند و شتی هیچ و پووچی بۆ بنووسێ.
جوولاّن: بزووتن.
جوولاّندن: بزواندنی شت لە شوێنی خۆی.
جوولاّندنەوە: بزواندنەوەی شت.
جوولاّنن: جوولاّندن.
جوولاّنەوە: بزووتنەوە. بریتییە لە زیادبوونی شت: فیسار شت نرخی (جوولاّوەتەوە) یا ئاوەکە (جوولاّوەتەوە) یا رِۆژ یا شەو (جوولاّوەتەوە) واتە زیادیان کردووە.
جوولک: د. جووجەڵە.
جوولگ: هـ. جۆلاّ.

جوولگی: ھ. جۆلایی.
جوولە: جوولان. (جوولەجوول) جوولەی یەک لە دوای یەک.
جوولەکردن: جوولانەوەی شت.
جوولەکە: کەسێکە کە لەسەر ئاینی مووسا پێغەمبەر بێ.
جوولەمەرەسێ: جۆرە یارییەکە کە بەمیچ دەکرێ.
جوولیان: د. جوولان.
جوولیانەوە: د. جوولانەوە.
جوومەرد: ز. جوامێر.
جوون: داننان بەشتێکدا نان بۆ وردکردنی. دۆلی بەرد کە شتی تێدا دەکوترێ. جوێن. جۆر.
جوونەوە: زەدەداری و گرنجبوونی ئاسن و تەنەکە و شتی تر بەهۆی لێدان یا پیاکەوتنی شتی قورسەوە.
جوێ: جیا.
جوێبوونەوە: دوورکەوتنەوەی شتێک لە شتێک.
جوێکردنەوە: دوورخستنەوەی شتێک لە شتێک.
جوێن: جنێو.
جوێندان: جنێودان.
جوێنفرۆش: جنێوفرۆش.
جوین: جوونی شت بە ددان. جوولان.
جە: وتەیەکە لە جێی وتەی (لە) بەکار دەهێنرێ (ھ). جۆی دانەوێلە. جێ (ز).
جەباری: جۆرێکە لە کەتیرە. ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد کە لە لیوای کەرکووک دادەنیشن.
جەبە: گیانداری یاخی: ئێسترەکەم (جەبە)یە. دەربوێردراو (مستثنی) لە شتێک: فیسار کەس لە هەموو کارێک (جەبە)یە. (جەبەبوون) یاخیبوون. دەرچوون. (جەبەکردن) یاخیکردن. دەربواردنی شتێک لە شتێک.
جەبەرە: سەرما و سۆلە.
جەبەرەنواندن: خۆهەلکێشانی چۆلەکە لە ئاو لە زستاندا کە نیشانەی سەرما و کرێوەیەکە.
جەبەش: ز. کالەک.
جەترەقە: جۆرە کولێرەیەکە بەساج دەبرژێنرێ.
جەحری: ز. زەهر.
جەحشک: ز. جاش.
جەحفەری: ز. جۆرەپۆلایەکە کە شیری لێ دروست دەکرێ.
جەحێل: با. جەهێل.
جەحێل: جەهێل.
جەخار: خەفەت.
جەخت: هەوڵ و کۆششی پەیدەرپەی بۆ کارێک: فیسار کەس بە(جەخت) ئەو کارە دەکا. پژمەی یەک لەسەریەک.
جەخت هێنان: دووجار پژمین یەک لەسەر یەک لەکاتی قسەکردن لە کارێک و بڕیاردان لەسەری، کە ئەمەش نیشانەی فەڕی ئەو کارەیە.
جەختی: چالاکی و چاپووکی: بە(جەختی) هات.
جەدەو: ز. جدەو.
جەرابوون: رزگاربوونی گیانداری ئاوس کە جەڕابێ بەجیابوونەوەی سکەکە لێی.
جەربەزە: گیانداری بزێوی چەتوون.
جەربەزەیی: بزێوی و چەتوونی.
جەرجەر: ز. جەنجەڕ.
جەرجەڤان: ز. کەسێکە کە جەنجەڕ بگێڕێ.
جەرخەتوو: ز. ئاوگردان.
جەرخەتوون: ز. جەرخەتوو.
جەرد: ز. مشک.
جەردە: کەسێکە رێگا بەمەردووم بگرێ و بەزۆر رووتی کاتەوە.
جەردەیی: رێگا بەمەردووم گرتن و رووتکردنەوەی بەزۆر.
جەڕ: جۆرە بزمارێکە بەبادانی توند دەبێ.
جەڕان: گیربوونی شتێک لەناو شتێکی تردا بەڕەنگێک کە زۆر بەگران بێتەدەرەوە: فیسارە ئافرەت بەمندالەوە (جەڕاوە): یا فیسار کەس بەمیزەوە (جەڕاوە).
جەڕاندن: بەستن و شەتەکدانی شتێک.
جەڕانن: جەڕاندن.
جەڕبادەر: ئاسنێکی لووت پانی کلک درێژە جەڕی پێ با دەدرێ.
جەڕجەڕە: د. جەنجەڕی بیر.
جەڕدان: پێچدان بەتوندی.
جەڕومەنگەنە: دوو تەختەی ئەستووری پانە لە هەردوو سەرەوە جەڕی پێوەیە کتێبی تێ دەخرێ و جەڕەکانی توند دەکرێتەوە بۆ ئەوەی تەختەکان بێنەوە یەک و کتێبەکە لە ناویدا دەق بگرێ.
جەڕەباپەدان: بەستن و شەتەکدانی شتێک زۆر بەتوندی.
جەڕین: جەڕان.
جەرگ: سێ پارچە گۆشتی مۆری ناسکە لە خوار سییەوە و، بەقوڕقوڕاگەی گیاندارەوە نووساوە. بریتییە لە رۆڵە.
جەرگاووس: بریتییە لە کەسێک کە تەنگەتاو کرابێ و وەڕس بووبێ.
جەرگبڕین: بریتییە لە کوشتن.
جەرگ سووتان: جگەرسووتان.
جەرگسووتاو: جگەرسووتاو.
جەرگ قایم: بەجەرگ.
جەرگە: جەنگە: فیسار کەس لەناو (جەرگە)ی هەراکەدا بوو.

جەرگەبەز: ز. جەرگێکە لەگەڵ بەز و چەوریدا لە شیش بدرێ بۆ برژاندن.
جەرەتاو: چڵکاو.
جەریفک: با. گەسک.
جەریە: دوو تەختەیە وەک جەڕ و وەک مەنگەنە چەرمەدروو چەرمی پێ دەگرێ لە کاتی دروونیدا.
جەزرەبە: ئازارێکە لە یەکێکەوە بگات بەیەکێکی تر.
جەزرەبە پێگەیاندن: جەزرەبەدان.
جەزرەبەدان: ئێش گەیاندن بەیەکێک و زریکە لێ هەڵساندنی.
جەزرەوە: د. جەزرەبە.
جەزوە: دەفرێکی تایبەتییە قاوەی تێدا لێ دەنرێ.
جەژن: ڕۆژی شایی و خۆشیی گەلێک.
جەژنانە: دراوێکە جەژنان بدرێ بەم و بەو.
جەژنە: جەژن. جەژنی گەلێکە کە موسڵمان نەبێ: جوولەکە یا گاور ئیمرۆ (جەژنە)یانە.
جەژنەپیرۆزە: پیرۆزیکردن لە یەکتری لە جەژندا.
جەژنەپیرۆزی: جەژنەپیرۆزە.
جەژنەچەقاڵە: جەژنێکە جوولەکە هەر چەقالە و دەنکە کوولەکەی سوێری تێدا دەخوا.
جەژنەفەتیرە: جەژنێکە جوولەکە نانی فەتیری تێدا دەکەن.
جەسە: د. جەستە.
جەعبە: سندووقی پچکۆلە. فیشەکگیر.
جەعێتنی: جعێتنی.
جەفات: ز. جێی دانیشتن و کۆبوونەوەی مەردووم.
جەفت: جەوت.
جەگەر: ز. جگەر.
جەلاقی: ز. دۆشاوێکە بەکوڵاندن توند بووبێتەوە.
جەلالی: ز. تیرەیەکە لە کورد لە نزیک شاری (بایزید)ەوە.
جەلاوی: ز. جلە.
جەڵد: مەردوومی ئازا و خێرا.
جەڵغە: دوو دارە کە سەریان وەک قەڵەم دادرابێ و لەیەک درابن و کرابن بەیەک. کاری ناتەوای ناپوخت.
جەڵغەمە: جەڵغە.
جەلە: پیشۆک و بنکە قومامێکە کە منداڵان وەک فیشەک لغ دەیهۆننەوە و دەیکەنە ملیان. جەڵەب و کۆمەڵە گاگەلێکە کە بەیەکەوە بەسترابن.
جەڵە: جەلە.
جەلەب: کۆمەڵێک لە ئاژاڵ یا وڵاخ کە بۆ فرۆشتن کردرابێ. چەشن و بابەت (ز).
جەڵەب: جەلەب.
جەڵەبچی: کەسێکە کە جەڵەب بکڕێ و بیفرۆشێتەوە.
جەڵەبدار: جەڵەبچی.
جەڵەبی: شتێکە هەڕەمە بێ و تایبەتی نەبێ.
جەلەکردن: ڕیزکردنی ڕەشەوڵاخ و بەستنەوەیان بەگوریس بەیەکەوە.
جەڵەکردن: جەلەکردن.
جەلەو: ز. جڵەو.
جەڵەو: جەڵەب.
جەڵەوی: جەڵەبی.
جەم: ز. تابار. وتەیەکە هاتووە بەمانای (لەکن).
جەمام: ئەندامێکە لە جەستە کە بەهۆی ماندووبوونەوە هاتبێتە ئێش. (جەمامبوون): ماندووبوون و هاتنە ئازاری یەکێک لە ئەندام.
جەمامی: ماندوویەتی و ئازاری جەستە بەهۆی زۆر کارکردنیەوە.
جەماوەر: کۆمەڵێک لە مەردووم کە لە شوێنێک کۆبووبنەوە.
جەمبلەیی: ز. تووتنی توند.
جەمجتین: ز. شڵەقانی شتی شل.
جەمجقاندن: ز. شلەقاندنی شتی شل.
جەمسەر: سەری دوو شت کە بگەنەوە یەک.
جەمک: ژەمک.
جەمک: با. دووانە.
جەمەدانی: جامانەی سەر.
جەمیداندن: ز. ساردکردنەوە.
جەمیدین: ز. ساردبوونەوە.
جەناب: وتەیەکە لە ڕووی گەورەیییەوە بۆ کەسێک بەکاردێنرێ کە لە گەڵیدا قسە بکەیت یا ناوی ببەیت یا کاغەزی بۆ بنووسیت.
جەنتک: ز. جەواڵی پچووک.
جەنجاڵ: کۆبوونەوەی مەردووم بەزۆری و ناڕێکی. سەرقاڵی و دەست نەپەرژان: سەرم (جەنجاڵ)ە.
جەنجەڕ: چەرخی ئاو پێ هەڵگواستن لە بیر. ئاسنی ئەمسەر و ئەوسەری بانگردێن. دارێکی ئەستووری گردە چەند دەمەتەورێکی پێدا کوتراوە خەرمانی پێ دەکوترێ.
جەندەرە: ز. شتێکە تەنراوی پێ دەقاق دەدرێ.
جەندەک: ز. لاک.
جەنگ: بەگژ یەکداچوونی دوو کەس یا زیاتر و هەرا و کێشەیان.
جەنگاوەر: مەردوومی ئازای شارەزا لە جەنگ.
جەنگە: ناوەڕاست و گەرمەی شت: پایز (جەنگە)ی میوەیە.
جەنگەڵ: دارستانی چڕ.
جەنگەڵی: کەسێکە زوو تووڕە ببێ و جەنگ بکا.

جەنگەنە: ز. کەسێکە شتی خراپی پێ نەنگ نەبێ.
جەنگی: جەنگاوەر.
جەنیقاندن: ز. ڕەتاندنی گیاندار.
جەنیقین: ز. هاژیانی گیاندار.
جەو: جۆ (ل). برنگ.
جەواڵ: دەفرێکە لە بەن و مــوو دروست دەکــرێ بۆ کــێــشــەی دانەوێڵە.
جەوان: جوان. گۆخڵ.
جەوبڕ: کەسێکە کە ئاژاڵ ببڕێتەوە.
جەوت: کڵاوی بەڕوو.
جەوتک: ز. هەگبەی چەرمین.
جەوز: شتێکی خڕی کووز کووزی درێژکۆلەیە لە مـازوو گەورەترە بەری درەختێکی گەرمیانییە بۆ گەلێ دەرمان بەکاردێنرێ.
جەوسەق: ز. ڕێگایەکە هەمیشە هاتوچۆی پێدا بکرێ.
جەوکەر: ز. جۆڵا.
جەوکی: د. جووک.
جەوورک: با. توورەکەی ئالیک.
جەووک: جەوی.
جەوەرە: د. ئاشووب و سەختی. جەبەرە.
جەوەندە: پارچە کوندەیەکی هەڵدرواوە ئاوی تێ دەکرێ.
جەوەنە: جەوەندە.
جەوهەر: گەوهەر. خــاڵ و کــێــڕێکە لەســەر دەمی هێندێ تیــغی نایاب دەبریسکێــتــەوە. هەمــوو جــۆرە ڕەنگێکی وردە کــە لە قــوتوودا دەفــرۆشــرێ. زرنگی و لێــهــاتن: فــیــســار کــەس بە(جەوهەر)ە واتە هەموو شتێکی لێ دێ. چنار (د).
جەوهەردار: شتی بەجەوهەر.
جەوی: شتێکە وەک کەتیرە لە هێندێ درەخت و گیا پەیدا دەبێ.
جەهخوەرک: ز. لارەی ناو ئاو.
جەهداسی: ز. جۆداس.
جەهزەرا: جۆزەرد.
جــەهەننەم: ئەو جــێگا ناخــۆشــەیە کــە لە ڕۆژی دواییــدا گــیــانی خراپانی تێدا سزا دەدرێ. شوێن ئاگری حەمام.
جەهەننەمداشی: جۆرە بەردێکی شینکاری سووتێنەرە بەپێڵووی چاوی تەراخومەدا ڕادەهێنرێ بۆ ئەوەی کە بیسووتێنێ.
جەهەننەمی: کەسێکی خراپە کە شایستەی سزای جەهەننەم بێ.
جەهێڵ: گیانداری گەنجی تازە پێگەیشتوو.
جەیران: ئاسک.
جەینک: ز. زڵفی کوڕی گەنج.
جێ: شوێنێکە بگونجی شتی تێدا دابنرێ.
جیــا: دوو شت یا زیاتر کە پێکەوە نەبن: ئەم دوو برایە (جیــا)ن واتە پێکەوە نین. دوو شتێ کـــە وەک یەک نەبن: ئەم دوو قــومــاشــە (جیــا)ن واتە پێکەوەنین. دوو شتێ کـە وەک یەک نەبن: ئەو دوو قوماشە (جیا)ن واتە لەیەک ناچن.
جیابوونەوە: جوێبوونەوە.
جیــازی: ناوماڵ و کەلوپەلێکە کە لەگەڵ بووکدا بنێردرێ بۆ ماڵی زاوا.
جیاکار: د. جیاواز.
جیاکردنەوە: جوێکردنەوە.
جیاواز: شتی جوێی سەربەخۆ.
جیاوازی: جوێیی لە ناوەندی دوو شتدا.
جیاوەبوون: جیابوونەوە.
جیاوەکردن: جیاکردنەوە.
جیایی: بوونی دوو شت بەجیا.
جێبوونەوە: دامەزرانی شتێک لە شوێنێکدا.
جێبەجێ: کوتوپڕ. ناردم بەشوێنیدا (جێبەجێ) هات. کارێکە یا شــتــێکە کــە تەواو بووبێ: ئەم کــارە (جــێــبــەجێ)یە. (جــێــبــەجــێــبــوون) ڕاپەڕین و پێکهــاتنی کــارێک. (جێبەجێکردن) ڕاپەڕاندن و پێکهێنانی کارێک.
جیپرک: با. مڵە.
جێپێ لەقبوون: جێپێ لێژبوون.
جێپی لەقکردن: جێپێ لێژکردن.
جــێــپێ لێــژبوون: بریــتــیــیــە لە نەتوانینی مــانەوەی کــەسێــک لە شــوێنێک بەهۆی شــتــێکەوە: بەهۆی زۆردارەوە (جــێی پێی لێژبووە).
جــێــپێ لێــژکــردن: بریــتــیــیــە لە دەرپەڕاندنی یەکــێک لە شوێنێک بەزۆر بۆ هێنانی.
جێپێ هەڵگرتن: دۆزینەوەی شوێنێکە کە ماڵی دزێتیی تێ برابێ بەهۆی جێگاپێی دزەکەوە.
جێ خۆشکردن: جێگە خۆشکردن.
جێخوون: جۆخێن.
جێدار: وەکیل. نوێنەر.
جێز: خەرمانی سوورکراو.
جێژن: جەژن.
جێژنانە: جەژنانە.
جێژنە: جەژنە.
جێژنەپیرۆزە: جەژنەپیرۆزە.
جێژنەپیرۆزێ: جەژنەپیرۆزێ.
جیقنە: ڕیقنەی پەلەوەری دەشتی. ڕیپۆقی چاو.
جــێکردن: جــێگاکــردنەوە. چاڵــبــوونی جــەســتــە بەهۆی گــیــربوونی شتێک لێی: لەسەر حەسیرەکە نوستبووم کە هەستام دانەی حەسیرەکە لە کەلەکەم (جێی کردبوو).

جێکردنەوە: دامەزراندنی شتێک لە شوێنێک.
جێگا: جێ.
جێگاگۆڕکێ: گۆڕینی جێگا.
جێگرتن: دامەزران و چەسپانی شتێک لە شوێنێ خۆیدا: ئەم پیاوەتییەی کە کردت (جێی گرت).
جێگرتنەوە: دانیشتنی یەکێک لە جێی یەکێکی مردوو و، پڕکردنەوەی جێگەکەی.
جێگە: جێگا.
جێگە بەجێگە: د. جێبەجێ.
جێگە بەجێگەکردن: د. جێبەجێکردن.
جێ گەرمکردن: جێگە گەرمکردن.
جێگە خۆشکردن: بریتییە لە نیازی مانەوەی یەکێک لە شوێنێک.
جێگەدار: جێنشین.
جێگەگۆڕکێ: جێگۆڕکێ.
جێگە کردنەوە: جێکردنەوە.
جێگەگەرمکردن: جێگە خۆشکردن.
جێگەماگ: جێماو. کەلەپوور.
جێگەمان: جێمان.
جێگەماو: جێگەماگ.
جێگەنشین: جێنشین.
جێگەهاوردن: بەجێهێنان.
جێگەهێشتن: بەجێهێشتن.
جێگیر: شتێکە کە جێی خۆی گرتبێ. (جێگیربوون) دامەزرانی شتێک لە جێگایەک. (جێگیرکردن): دامەزراندنی شتێک لە شوێنێک.
جێڵ: د. جەهێڵ.
جێمان: بەجێمان.
جێماو: بەجێماو.
جێمک: ز. جمک.
جێنچک: تۆزێک لە گۆشت.
جێنشین: کەسێکە کە لەجێی یەکێکی تر دانیشتبێ. قائمقامی قەزا.
جێوە: ل. دێراو.
جێووک: ز. جێمک.
جیهان: ئەم شەو و ڕۆژ و چوار فەسڵە و چۆنێتییەی کە بەسەر زەویدا دێ بەهۆی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە گەڕۆکەکانەوە بەم جۆرەی کە گیاندار تێیدا دەژی.
جێهێشتن: بەجێهێشتن.
جێ: ز. جێ.

جیبوون: ز. جیابوونەوە.
جیچک: ل. جووجەڵە.
جیردۆ: ئاژاڵی کەم شیر.
جیر: شتی بەهێزی بەکێش.
جیراندن: جیرەکردن.
جیربوونەوە: ڕیچبوونەوە (د). بەهێزبوونەوە و بەکێشبوونی شت.
جیرجیروک: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک تووتن وایە گزرە دەکرێ بۆ وڵاخ و ئاژاڵ.
جیرە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی دەرگا لەکاتی کردنەوە یا پێوەدانیدا. (جیرەجیر) جیرەی یەک لەدوای یەک. (جیر و هوڕ) جیرەجیری زۆر.
جیرە: بەشێکی هەمیشەییە کە یەکێک بۆ یەکێکی بڕیبێتەوە.
جیرەخۆر: کەسێکە کە جیرەی یەکێک بخوا.
جیزە: د. گیزە. (جیزەجیز) جیزەی یەک لەسەر یەک.
جیقاندن: جیقەکردن.
جیقانن: جیقاندن.
جیقڵدان: چیکڵدانە.
جیقڵدانە: چیکڵدانە.
جیقن: گیانداری لاوازی زەبوون. کەسێکە کە بجیقێنێ.
جیقنە: ڕیقنە. مەردوومی جیقن.
جیقە: جۆرە دەنگێکە لە هێندێ گیاندارەوە پەیدا دەبێ لەکاتی نقاندنیدا. (جیقەجیق): جیقەی یەک لە دوای یەک. (جیق و هوڕ) جیقەجیقی زۆر.
جیک: پاژنە.
جیکاندن: جیکەکردن.
جیکانن: جیکاندن.
جیکڵدان: چیکڵدانە.
جیکڵدانە: چیکڵدانە.
جیکنە: خەڕەک.
جیکە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی بێچوە چۆلەکە. (جیکەجیک) جیکەی یەک لەدوای یەک.
جیکەدان: ل. چیکڵدانە.
جیکەنە: شتێکەپەموانەی پێ لە پەموو جوێ دەکرێتەوە.
جیلەبڕین: د. جووکە بڕین.
جیم: پیتی پێنجەمە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
جیوە: دەرمانێکی شلی جووڵە جووڵکەری سپییە بۆ گەلێ شت بەکاردێنرێ.
جیوەجیو: جریوەی چۆلەکە.



چ: پیتێکە لە هەورامی دادەنری بەدوای هێندی وتەوە وەک (ش) لە کوردی تردا: (منیچ) واتە منیش (ە). پیتێکە بەدووبارەپاتی دەکەوێتە ناوەندی دوو ناو یا دوو کردارەوە یەکسانییان پیشان دەدا: بەمنداڵ بخوێنە (چ) نێر (چ) مێ، یا خۆشم دەوێیت (چ) بێیت (چ) نەیەیت، واتە هاتن و نەهاتنت وەک یەک وایە. زۆر: (چ) خۆشە واتە زۆر خۆشە.

چا: چای. لەوی (ە). کورتکراوەی (چاک): (چا) بووە واتە چاک بووە.

چابک: د. چابوک.

چابوک: گیانداری چالاکی ئازا.

چابوکی: چالاکی و ئازایی.

چابوون: چاکبوون.

چابوونەوە: چاکبوونەوە.

چاپ: مەکینەیەکە شتی پێ دەنووسرێ. درۆ و دەلەسە. پێوانەیەکە شتی پێ دەپێورێ. لە شاری (وان) (ز). شەقڵ (د).

چاپاڵێو: شتێکی کون کونە لەکاتی چا تێکردندا چای پێ دەپاڵێورێ.

چاپباز: د. فێڵباز.

چاپخانە: شوێنێکە نووسراوی تێدا لە چاپ دەدرێ.

چاپکردن: نووسینی شت بەچاپ.

چاپکەر: کەسێکە بەچاپ شت بنووسێ. فێڵباز.

چاپ لێدان: چاپکردن. درۆ و دەلەسە هەڵبەستن: (چاپ لێ مەدە) واتە درۆ مەکە.

چاپ و چووپ: د. چاپ و گووپ.

چاپ و گووپ: بردنی شتی ئەم و ئەو بەناخونەک.

چاپەز: شتێکی دەسک و لوولەدارە لە مس یا لە فافۆن، چای تێدا لێ دەنرێ. چایچی.

چات: ز. پەڕۆ.

چاتکیش: ز. ئاسنێکی باریکی پێچراوەیە پەڕۆی پێ رادەکێشرێ لە لوولەی تفەنگەوە بۆ پاککردنەوەی.

چاتۆڵ: داهۆڵ. چاتۆڵە.

چاتۆڵە: دەواری بەهارە و هاوینەیە کە لە دەواری زستانە تەنکترە.

چاچک: جاجک.

چاچۆڵە: د. تەشقەڵە.

چاچۆڵەباز: د. تەشقەڵەباز.

چاچەقولێ: چێشتەقولێ.

چاچی: چایچی.

چاخ: ئاژاڵی قەڵەو. شتی ساز و لەبار: سەعاتەکەم (چاخ)ە. تاف: لە (چاخ)ی کوڕێنیمدا. کات (ز). چەک (د). قەباڵە (د).

چاخان: د. درۆ و دەلەسە و فیشاڵ.

چاخانە: شوێنێکە کە چای لێنراوی تێدا بفرۆشرێ.

چاخکردن: سازکردنی شت.

چاخمە: ئەڵقەیەکە دەخرێتە ناو کونی قایشەوە بۆ ئەوەی کە هەڵ نەقڵیشێ.

چاخوچڵ: د. وتەیەکە لەجیاتی وتەی (خانومان) بەکاردێنرێ: فیسار کەس ئافرەتێکی (چاخوچڵ)ە واتە خانومانە.

چاخەوکردن: د. دابەستنی ئاژاڵ بۆ قەڵەوبوونی.

چادان: چاییدان.

چادر: خێوەت.

چادرگا: د. شوێنێکە کە خێوەتی زۆری تێدا هەڵ درابێ.

چار: مەڕی گوێ سپی. چارە: (چار)م نییە. چوار.

چارانچەقیلە: گوڵاڵە سوورە.

چارپا: چارپایە.

چارپایە: شتێکی چوارپێی تەختی بەرزە لە ئاسن یا لە دار وەک کورسی لە سەری دەنوون.

چارپێ: ز. چوارپێ.
چارچەک: ز. پیاوی پڕ چەک.
چارچیق: ز. زەوییەکە کە قوڕی زۆر بێ.
چاردار: ز. دارتەرم.
چاردە: چواردە.
چارشەب: ز. سەرپێچ.
چارشەمب: با. چوارشەممە.
چارشەو: د. چارشێو.
چارشێو: شتێکی چوارگۆشەی گەورەیە لە ئاوریشم و سورمە دروست دەکرێ ژنان لەجیاتی باڵاپۆش دەیگرنەوە.
چارک: برنگ.
چار کولۆڵ: مەڕی گوێ سپیی ناوچەوان ڕەش.
چارگۆشە: ز. چوارگۆشە.
چارمەشقە: چوار مەشقی.
چارۆکە: شتێکی چوارگۆشەیە ژنان دەیگرنە کۆڵیان. گیایەکە وەک بامێ بەڵام ئەم نزمتر و گەڵاکەی وردترە گوڵێکی زەرد دەگرێ ئاژاڵ باش دەیخوا. سەرپۆشی ژنان.
چاروە: ز. چەند ئاسنێکە سەماکەر دەیخەنە پەنجەیان و چەقەنەی پێ لێ دەدەن.
چارە: ڕەنگ و ڕوخسار: فیسار کەس (چارە)یەکی ناشیرینی هەیە. ڕێی دەرەتان و ڕاییکردنی کار: (چارە)ی خۆت بکە واتە دەرەتان بۆ خۆت بدۆزەرەوە.
چارەچەقیلە: چاران چەقیلە.
چارەڕەش: بریتییە لە مەردوومی کوڵۆڵی بەدبەخت.
چارەسەر: چارەدۆزینەوە بۆ خۆرزگارکردن لە چورتمێک: (چارەسەر) م نییە یا (چارەسەر)ی خۆت بکە.
چارەک: چواریەکی شت.
چارەکردن: دۆزینەوەی دەرەتان.
چارەکە: چارۆکەی گرتنە کۆڵ.
چارەگران: شتی ناشیرینی ئێسک قورس.
چارەنووس: بەخت و ناوچاوی مەردووم بەچاکی یا بەخراپی: هەر چیم بێتەڕێ (چارەنووس)ی خۆمە.
چارەوا: ماین و ئەسپ.
چارەوێ: چارەوا.
چاری: چارەک.
چاریچی: ز. چەرچی.
چاریک: ز. چارەک.
چازوو: ز. فێڵباز.
چاشبوون: سەرسوڕمان لە کارێکدا.
چاشت: هـ. چێشت.
چاشتن: هـ. چەشتن.
چاشتێنگا: د. چێشتەنگاو.
چافکەر: ز. مەردوومی چاوپیس.
چاڤ: با. چاو.
چاڤک: با. چاویلکە.
چاڤزک: ز. بەرچاڤک.
چاڤی چیچەکی: با. جۆرە ترێیەکە.
چاڤیگایی: با. جۆرە ترێیەکە.
چاڤینوک: ز. چافکەر.
چاق: ز. لاق.
چاقۆ: چەقۆ.
چاک: شتی باش و پەسند. داوێن.
چاکبوون: باشبوونی شت کە خراپ بووبێ. چاکبوونەوە.
چاکبوونەوە: باشبوونی شتێک کە خراپ بووبێ بەرەبەرە لەسەرخۆ.
چاککردن: باشکردنی شتێک کە خراپ بووبێ. بریتییە لە ئەسپ خستنە سەر ماین.
چاککردنەوە: باشکردنی شتێک کە خراپ بووبێ بەرەبەرە.
چاکڵ: دارێکی دوو پەلە سەری گوریسی پێ دەبەستریێ و تەنگەی ولاخی پێ دەدرێ لەسەر بارەوە.
چاکڵە: چاتۆڵ و خانووی پچکۆلە. چاکڵ.
چاک و چۆنی: هەواڵپرسینی ناسیاو.
چاکووچ: چەکوش.
چاکە: کردەوەی باش.
چاکەت: جۆرە کاڵایەکی قۆڵدارە لەسەر پانتۆڵ یا کەواوە لەبەر دەکرێ.
چاکەکردن: کردەوەی باش لەگەڵ مەردوومدا.
چاکەل: قلێشی ئەملا و ئەولای داوێنی کەوا و هێندێ کاڵای تر.
چاکەڵ: چاکەل.
چاکێتی: بوونی شت بەچاک.
چاکی: چاکێتی.
چاگە: هـ. لەوێ.
چال: ز. جەواڵ.
چاڵ: جێگای نزم و نەوی لە زەوی. قووڵکە.
چالاڤ: ز. سەرشۆرک.
چالاک: گیانداری ئازای بەدەست و برد.
چالاکی: دەستوبردی و ئازایی.
چاڵاو: بیری ئاو. گۆل.
چایی لا: چالی.
چاڵچاڵان: د. یاری چاڵێن.

چاڵک: ل. دنگ.
چاڵمە: د. کیسەی تووتنی نێرگەڵە.
چاڵ و چۆڵ: شوێنی بەرز و نزم لە زەوی.
چاڵۆک: تەنگژ.
چاڵوێنک: چاڵێکە ئاو یا دۆی تێ دەکرێ بۆ ئەمەی کە سەگ لێی بخواتەوە.
چاڵەبەفر: چاڵێکی تایبەتیی گەورەی قووڵە لە کێو. لە زستاندا پڕ دەکرێ لە بەفر و دادەپۆشرێ بۆ هاوین.
چاڵەچەقیلە: چارەچەقیلە.
چاڵەقووتە: چاڵێکی پچووکی کەمێ قووڵ لە زەوی.
چاڵەکە: دەعبایەکی قەڵەوی پانکەڵەی چوار پێیە گۆشتی دەخورێ.
چاڵێن: جۆرە یارییەکە منداڵان چاڵێک هەڵ دەکەنن گوێز یا بادام یا شتی تری تێ فرێ دەدەن ئەگەر جووت یا تاقی تێ کەوت لایەکیان دەیبەنەوە.
چاڵی: شوێنی نەوی و چاڵ.
چان: جۆرە چەپەرێکی شوولێنە خەرمانی پێ دەکوترێ. جۆرە چەپەرێکی سێ سووچی شوولێنە بەگوریس بەناو جۆگەدا ڕادەکێشرێ و جۆماڵی پێ دەکرێ. زەنگێکە بۆ ئاگاداریکردنەوە لێ دەدرێ.
چاندن: وەشاندنی تۆو بەزەوییەوە.
چاندنی: ز. کشتوکاڵ.
چانفدا: ز. جانفیدا.
چانکۆچ: ز. زەنگی گاوران.
چانن: د. چاندن.
چانە: ه. چاگە.
چاو: ئەندامی بینین لە هەموو گیاندارێک. تووڵی تەڕ کە پێچرابێ بەشتێکدا (ز).
چاوان: ز. چۆن.
چاوانە: چاڵاو.
چاوئێشە: چاوێشە.
چاوباز: چاوباشقاڵ.
چاوبازە: گیایەکی دڕکاویی بازەڵەی بەهارییە گوڵێکی سپی دەردەکا.
چاوبازی: چاوبڕکێ.
چاوباشقاڵ: پیاوێک یا ژنێکە بەناپاکی تەماشای یەکتر بکەن.
چاوباشقاڵی: تەماشاکردنی پیاو و ژن بۆ یەکتری بەناپاکی.
چاوبڕ: کەسێکە چاو ببڕێ.
چاوبڕکێ: تەماشاکردنی پیاو و ژنێک بۆ یەکتری بەناپاکی لەگەڵ چاو لە یەک هەڵتەکاندنیان.
چاوبڕین: بڕینی چاوی پێڵوودار و موودار لە ناوەوە.
چاوبرسی: بریتییە لە کەسێک کە بەرچاوی تەنگ بێ لە شتی خواردندا.
چاوبز: چاوزەق.
چاوبۆرە: گیایەکی دڕکاویی بەهارییە وەک چاوبازە وایە بەڵام ئەم بۆرە و ناخورێ.
چاوبۆق: د. چاوزەق.
چاوبەرەژێر: بریتییە لە مەردوومی تەریق بەرامبەر بەیەکێک.
چاوبەرەوژێر: چاوبەرەژێر.
چاوبەس: چاوبەست.
چاوبەست: دەسرۆکەیەکی تایبەتییە چاوی منداڵی پێ دەبەسترێتەوە. بریتییە لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێک لە کارێکدا: ئەم قسانەی تۆ (چاوبەست)ن. بریتییە لە مەردوومی دەستبڕ: فیسار کەس پیاوێکی (چاوبەست)ە.
چاوبەستی: هەڵفریوان و هەڵخەڵەتاندنی مەردووم: فیسار کەس زۆر (چاوبەستی) دەکا لە مەردووم.
چاوبەسی: چاوبەستی.
چاوبەن: چاوبەند.
چاوبەند: چاوبەست.
چاوبەندی: چاوبەستی.
چاوبەنی: چاوبەندی.
چاوپۆشان: د. چاوپۆشی.
چاوپۆشی: بریتییە لە بووردنی تاوانی یەکێک.
چاوپۆشین: چاوپۆشی.
چاو پیاخشاندن: تەماشاکردنی شتێک بەخێرایی.
چاو پێ کەفتن: چاوپێکەوتن.
چاو پێکەوتن: چاوکەوتن بە شتێک.
چاو پێ هەڵهێنان: تەماشاکردنی مەردووم بەچاوی پیس و دڵی پیسەوە بۆ زیان پێ گەیاندنی.
چاوپیس: کەسێکە کە چاو بەهەر شتێک هەڵبێنێ زیانی پێ بگەیەنێ.
چاوتاریکبوون: بریتییە لە تووڕەبوون.
چاوترسێن: بریتییە لە گەورەیەک کە لە ماڵدا لێی بترسن.
چاوترووکاندن: تروکاندن و بەیەکدا دانی چاو.
چاوترووکانن: چاوترووکاندن.
چاوترەکاندن: چاوترووکاندن.
چاوترەکانن: چاوترووکاندن.
چاوتەڕبوون: بریتییە لە گریان.
چاوتەنگ: بەرچاوتەنگ.
چاوتێبڕ: کەسێکە چاو ببڕێتە یەکێک بۆ وردبوونەوە لە گوفتار و کرداری (ڕەقیب).

چاو تێبڕین: تەماشاکردنی شتێک و چاو لێ نەترووکاندنی.
چاوتیژ: کەسێکە کە چاوی زۆر هەنا بکات.
چاوچڵە: د. چاوپیس. بازیبەندێکە کە نوشتەی چاوەزاری تێ دەکرێ.
چاوچنۆک: چاوبرسی.
چاوچوونەخەو: خەو لێکەوتن.
چاوچەپ و چێڵ: چاوچەپ و ڕاست.
چاوچەپ و ڕاست: مەردوومی خێل.
چاوچێڵ: د. خێل.
چاوحیز: بریتییە لە یەکێک کە ڕووی نەیەت چاو هەڵبڕێ.
چاوحیزکردن: بریتییە لە چاو داخستن لە شەرما.
چاوحیزی: سەرشۆڕی و شەرمەزاری.
چاوداخستن: بریتییە لە شەرمەزاربوونی یەکێک.
چاوداری: د. چاودێری.
چاوداگرتن: ئیشارەتکردن بەچاو.
چاوداگیرسان: چاو هاتنە ئێش بەکوتوپڕی.
چاوداگیرسێن: چاوگی ئاگر.
چاودەرپەڕاندن: بریتییە لە تووڕەبوون.
چاودێر: کەسێکە ئاگاداری شتێک بکا.
چاودێری: ئاگاداریکردنی شتێک.
چاوڕاو: چاو و ڕاو.
چاوڕۆشنکەرە: چاو داگیرسێن. بریتییە لە شتێک کە هۆی چاوڕوونی بێ.
چاوڕۆشنی: چاوڕوونی.
چاوەڕوان: بریتییە لە زۆر چاوەڕوانیکردنی کەسێک بۆ شتێک: (چاوم ڕووا) فیسار کەس هەر نەهات.
چاوڕونی: پیرۆزی کردن لە یەکێک و وتنی (چاوت ڕوون) پێی لەکاتێکدا کە خۆشەویستێکی هاتبێتەوە لە دوور.
چاوسپیلکە: چاوبازە.
چاوسووتک: د. چاوپیس.
چاوسوور: کەسێکە کە پشتیوان و گەورەی یەکێک بێ: فیسار کەس (چاوسوور)ی فیسارە.
چاوسوورکردن: د. چاوسوورکردنەوە.
چاوسوورکردنەوە: بریتییە لە هەڕەشەکردن لە یەکێک.
چاوسوورکەر: چاوسوورکەرە.
چاوسوورکەرە: گەورە و سەرپەرشتیکەری یەکێک.
چاوشارکێ: یارییەکی منداڵانەیە یەکێکیان چاو دەقوچێنێ و ئەوانی تر خۆیان دەشارنەوە.
چاوشارەکێ: د. چاوشارکێ.
چاوشلکانێ: چاوشارکێ.
چاوشۆر: شووشەیەکە دەمەکەی بەقەد دەمی چاوێکە ئاوی تێ دەکرێ و چاوی پێ دەشۆرێ.
چاوشۆڕ: چاوحیز.
چاوشۆڕکردن: چاوحیزکردن.
چاوشۆڕی: چاوحیزی.
چاوفڕین: لێدانی دەماری چاو.
چاوقایم: بریتییە لە یەکێک کە چاوی لە هیچ نەترسێ.
چاوقایمی: بریتییە لە ئازایی و لە هیچ نەترسان.
چاوقرتانن: د. چاوداگرتن.
چاوقرتکێ: د. چاوقرتانن.
چاوقووجاندن: د. چاوقووچاندن.
چاوقووجانن: د. چاوقووچاندن.
چاوقووچاندن: نووقاندنی چاو. بریتییە لە چاوپۆشی لە شتێک.
چاوکردن: بەدیکردن.
چاوکردنەوە: بریتییە لە شارەزابوون و بەڵەدبوونی یەکێک.
چاوکوتکە: گیایەکی گەڵا خڕی گوڵ زەردە.
چاوکە: د. چاوگەی کانی. دەستەچیلە.
چاوکەڵەشێر: د. چاوکەڵەشێرە.
چاوکەڵەشێرە: تۆوی گیایەکە دەنکەکانی سوورە وەک چاوی کەڵەشێر.
چاوگە: سەرچاوە. چاوگی ئاگر. دەلاقەی برین.
چاوگە داکەوتن: دەمدانەوە و قووڵبوونی برین.
چاوگەرمکردن: بریتییە لە سەرخەو شکاندن.
چاوگێڕان: بەملا و بەولادا ڕوانین بۆ شتێک.
چاولەدوا: شتێکی خۆشەویستە کە لە دەست تۆ چووبێ و چاوت هەر لە دوای بێ.
چاولێبڕین: د. چاوتێبڕین. چاولێکەری.
چاو لێ بزکردنەوە: مۆڕبوونەوە لە یەکێک.
چاو لێ قووچاندن: چاوپۆشی لە یەکێک.
چاولێکردن: لاساییکردنەوەی یەکێک لە شتێکدا.
چاولێکنان: بریتییە لە نووستن یا مردنی یەکێک.
چاولێکەری: چاولێکردن.
چاو نەترس: چاوقایم.
چاونەترسی: چاوقایمی.
چاونەزیر: مەردوومی ڕژد.
چاو و ڕاو: بڵاوکردنەوەی قسەی باش یا خراپ دەربارەی شتێک.
چاوگ: تەڵاش و پووشێکە کە ئاگری پێ بکرێتەوە. سەرچاوە. مصدر.
چاوە: سەرچاوە. ڕووپامایی.
چاوەچاو: چاوەڕوانیکردن بۆ شتێک.

چاوەدوا: د. چاولەدوا.
چاوەڕاو: چاو و ڕاو.
چاوەڕوان: کەسێکە کە هیواداری شتێک بێ و چاوەچاوی بۆ بکا.
چاوەڕوانی: چاوەچاو و بەتەمابوونی شتێک.
چاوەڕێ: چاوەڕوان.
چاوەڕێگە: د. چاوەڕێ.
چاوەزار: ئازار و زیانێکە کە لە چاوی پیسەوە بەشتێک بگا. موفەڕکێکە کە بۆ چاوەزار هەڵدەگیرێ.
چاوەش: شایەر و دەهۆڵ و زوڕناژەن. کەسێکە لە پایەی سەربازیدا بیست سەربازی بەدەست بێ.
چاوەقووڵە: دەردی ڕشانەوە.
چاوەنداز: چەشمەنداز.
چاوەنواڕ: چاوەڕوان.
چاوەنواڕی: چاوەڕوانی.
چاوەنووڕ: چاوەڕوان.
چاوهەڵاتن: د. بڕوایی هاتن بۆ تەماشاکردنی شتێک. چاوکردنەوە.
چاوهەڵتەکاندن: ئیشارەتکردن بەچاو.
چاوهەڵتەکانن: چاوهەڵتەکاندن.
چاویار: د. چاودێر.
چاویاری: د. چاودێری. چاوەڕوانی.
چاوێری: چاودێری.
چاوێشە: دەردێکە تووشی چاو دەبێ و گل دەکا.
چاویلکە: دوو شووشەیە لە چوارچێوەدا بۆ شت بینین یا پاراستنی چاو لە تەپوتۆز دەکرێتە چاو. برینێکە لە لەش پەیدابووبێ و چاوگەی داکەوتبێ.
چاوێنی: چاوەزار.
چای: سارد (ل). چایی.
چاپیالّوون: ل. چاپالێو.
چایخانە: چاخانە.
چایدان: قۆریەی چا.
چایگ: د. سارد.
چایمانی: د. باپەڕبوون.
چایەر: لەوەڕ.
چایی: گیایەکی گەرمیانییە گەڵاکەی بەوشکی لێ دەنرێ و بەشەکرەوە دەخورێتەوە.
چایچی: کەسێکە پیشەی هەر چالێنان بێ.
چاین: د. سەرمابوون.
چپاندن: چپەکردن.
چپانن: چپاندن.
چپچپ: ز. دەنگی تکەی ئاو.
چپە: قسەکردن بەسرپە. (چپەچپ) چپەی یەک لە دوای یەک، (چپ و هوڕ) چپەچپی زۆر.
چت: شت.
چتۆف: ز. وتەی پرسیار لە چۆنێتی شت: (چتۆف)ی واتە چۆنی؟!
چتوور: د. چتیر.
چتیر: بێچووی بزن لە تەمەنی یەک ساڵەوە تا دوو ساڵە.
چچک: با. مەمک.
چخ: چغ.
چخە: چغە.
چر: ز. شتی لینجی کەشدار.
چرا: شتێکە بۆ ڕووناککردنەوەی شوێنێکی تاریک دادەگیرسێنرێ.
چرابوون: فێربوونی ساوا بۆ خواردنی لەوەڕ.
چراخ: گیانداری بەدەماخ. کشتوکاڵی باشی نازاو.
چراخان: چرای زۆری داگیرساو لە شوێنێک.
چرادان: شوێنێکی تایبەتییە کە هەر چرای تێدا دابنرێ. قوتیلەی چرا.
چراغ: ز. قوتابیەکە کە پێی بخوێنیت و ڕەوشت و خووی فێر بکەیت.
چراکەران: د. کاتێکە کە چرای تێدا دادەگیرسێ.
چراموشی: د. دەستەچرا.
چراو: هـ. چرا.
چراوڵە: چیلکەیەکی پچووک یا پووشێکە کە منداڵ سەرەکەی داگیرسێنێ و یاریی پێ بکا.
چراووک: چۆڵەچرا.
چرپ: د. دزین.
چرپاندن: چرپەکردن بەگوێی یەکێکدا. دزین (د).
چرپانن: چرپاندن.
چرپایە: چارپایە.
چرپ و چاپ: چاپ و گووپ. دزی (د).
چرپە: قسەکردن بەسرپە. دەنگی پێی زەلام کە سووک بڕوا و چاوت تێوە نەبێ. (چرپەچرپ) چرپەی یەک لەدوای یەک. (چرپ و هوڕ) چرپەچرپی زۆر. (چرپی) دارێکی داچەقاوە کە لقی مێوی خرابێتەسەر (ز). زەل و هەڵاشی ناوبان.
چرتوون: ز. دۆزەقەی ئاش.
چرتین: ز. دڕانی کاڵا.
چرچ: شتێکە کە لۆچی تێ کەوتبێ.

چرچە: جۆرە ترێیەکی توێکڵ ئەستووری درێژکۆلەیە بەڕەنگ هەر لە بەرسیلە دەچێ.
چرچهەلاتن: چرچبوونی شت.
چرچهەڵهاتن: چرچهەلاتن.
چرچیان: د. چرچبوون.
چڕ: دار و درەختــی زۆری بەیەکــداچوو. چارە: (چڕ) و چاوی خــواتەوە. وتەیەکــە بەکــاردێنرێ لە جیــاتی وتەی (بێــژ): گۆرانی (چڕ) واتە گۆرانی بێژ (د).
چڕاندن: بانگکردن.
چڕک: دۆشاوی دووجار کولاو. خورما و ڕۆنێکە لە جیاتی هێلکە پەنیری تازەی شیرینی تێ کرابێ. چێرگ.
چڕنووک: بەنینۆک شت بریندارکردن.
چڕوچاو: وتەیەکە لە ڕووی سووکیــیەوە بەکــاردێنرێ لە جیــاتی وتەی دەموچاو: چڕوچاوی خواتەوە.
چڕ و چەنە: د. چڕوچاو.
چڕە: بەیەکداچوونی مەردووم لەبەر زۆری. بێشەلان.
چڕەبەندان: کۆبوونەوەی مەردوومی زۆر لە شوێنێکدا بەناڕێکی.
چڕین: بانگکردن. هۆرەکردن.
چرک: چڵک (ل). چەکەی هەلاج. چێرگ (ز). شاهۆ.
چرکاندن: تەقاندنی دەمانچە و تفەنگ بەبێ فیشەک. کردنەوەی لۆکە (ز).
چرکن: چڵکن.
چرکــە: جــۆرە دەنگێکە وەک دەنگی ســەعــات یا بنمــیچ. (چرکــەچرک) چرکــەی یەک لەدوای یەک. (چرک و هوڕ) چرکەچرکی زۆر. دۆشاوی دووجار کـولاو. جـوولە: (چرکـە) نەکەیت. (چرکەکردن) جوولانەوە.
چرکیان: د. چرکە.
چرکیانەوە: د. جوولانەوە.
چرۆ: گۆپکە.
چروسکە: تریسکە.
چرووســان: لاوازبوون لەبەر خــەفــەتخــواردن یا کــاری زۆر کــردن: فیسار کەس زۆر (چرووساوە) واتە لاوازبووە.
چرووسانەوە: چرووسان.
چرووساو: گیاندارێکە کە چرووسابێ.
چرووساوە: چرووساو.
چرووک: مــەردوومکی ڕژدی پیــسکە. شــتی ناقــایم: ئەم چیــتــە (چرووک)ە.
چرووکانن: د. ترووکاندن.
چرورکە: د. دەنگێکە لە چرووکاندنەوە پەیدا دەبێ.
چروونەک: ز. پلوسک.
چریائێکی: با. تشرینی یەکەم.
چریاپاشی: با. تشرینی دووەم.
چریسکە: تریسکە.
چرێش: سرێش.
چریک: چیکەنە.
چریکە: دەنگی زۆر تیژی بەرز. (چریکە چریک): چریکەی یەک لەدوای یەک. (چریک و هوڕ) چریکە چریکی زۆر. جــریوەی چۆلەکە (د).
چز: چزوو. کلک (د).
چزان: کــەوتنی شــوێنێک لە ئەندام بەئاگــر یا لە شــتــێکی داخ: دەستم (چزا) بەئاگرەکەدا.
چزاندن: نانی شتێکی داخ بەئەندامدا. پێوەدانی چزوودار.
چزانن: د. چزاندن.
چزپێدان: د. بریتییە لە درێژکردنەوەی قسە.
چزکردن: کوژاندنەوەی نووسراو بەهێنانی خەت بەسەریدا.
چزڵیک: بەز و دووگی بەئاگر هەڵکزاو.
چزوو: نووکێکی تیژە بە کلکی دووپشک و هەنگ و زەردەواڵە و زەردەزیرە و بەهەر گیاندارێکیدا بچەقێنێ ئێشێکی زۆری پێ دەگەیەنێ.
چزە: جــۆرە دەنگێکە وەک دەنگی گــۆشــتی ســوورەوەکــراو لەســەر ئــاگــر. چزەچز: چزەی یەک لە دوای یەک. (چزوهوڕ): چزە چزی زۆر.
چزەپێڵە: دووپشکی نە زۆر زلی نە زۆر پچووک.
چزە و پێڵە: چزەپێڵە.
چزە لێ هەســتــان: بریتــیــیــە لە ئازار یا زیانێکی کــوتوپڕی بەیەکێک.
چزە لێ هەستاندن: بریتییە لە پێوەدانی چزوودار بەگیاندارەوە. بریتییە لە ئازار یا زیان گەیاندنێکی کوتوپڕ بەیەکێک.
چزە لێ هەڵسان: چزە لێ هەستان.
چزە لێ هەڵساندن: چزە لێ هەستاندن.
چزیان: د. چزان.
چزیلک: چزڵیک.
چش: وتەیەکە لەکاتی دڵگیربوون لە شتێک و قیروسیا لێکردنی بەکاردێنرێ: (چش) با ئەو کارە وابێ.
چشت: شت.
چغ: وتەیەکە سەگی پێ دەردەکرێ.
چغاچغ: ز. گێرانەوەی دەنگی هێندێ باڵندە.
چغڵ و بەد: مەردوومی زبان بەد.
چغە: چغ.
چف: د. چغە.

چفاندن: د. چغه کردن.
چفانن: د. چفاندن.
چفه: قسەکردن بەسرپە. (چفە چف) چغەی یەک لەدوای یەک.
چڤات: ز. کۆمەڵ.
چڤیک: ز. چۆلەکە.
چق: ز. لقی درەخت.
چقاس: ز. وتەیەکە لەجێی وتەی (چەند) بەکاردێنرێ.
چقڵ: درکی تیژی ڕەقی گەورە.
چقە: گرێیەکە لە قاچی هێندێ باڵندەدا. پەڕێکە پاشایان دەیکەن بەسەریاندا.
چقەچق: ز. گێڕانەوەی دەنگی جووڵانی هێندێ شت.
چک: کـەمـێک لە شـتـێـک: (چک)ێک ئاو واتە کـەمـێک. شەپازللە (د). دڵۆپێک لە شتی شل.
چکان: وشکبوونی ئاوی بیر و کارێز (ز). تکان.
چکاندن: ڕواندنی شت (ز). تکاندن.
چکاندەرە: جۆرە یارییەکە.
چکانەوە: مانەوەی شتی شل لەسەر ئاگر بەڕەنگێک کە خەست و ئاوەکەی کەم ببێتەوە.
چکچکە: شـوێـنێـکە لە شـاخ کـە دڵۆپ دڵۆپ ئاوی لێ بێـتـە خوارەوە.
چکرم: شتێکە بەقنجی بەزەویدا چەقێنرابێ.
چکڵـەچزێ: بریتییە لە پەیاکردنی شت بەکەمـوکوڕی و بەڕەنجی شان و ئارەقی ناوچەوان.
چکمەساو: باقەیەکی گەورە لە گیا.
چکۆلە: پچکۆلە.
چکۆڵە: چکۆلە.
چکە: تکە. (چکەچک) تکەتک. چک (د).
چکەکردن: تکەکردن.
چکەلە: پچکۆلە.
چکەڵە: چکەلە.
چل: ناوە بۆ ژمارەیەک کە چوار جار دەیە.
چڵ: لقی درەخت و گیا.
چلاسک: د. چلۆسک.
چلاک: د. نەمام.
چلانن: د. دەرسکردنی شـتـێـک و ئامـادەکـردن و وردکـردنەوەی. شێلان.
چلاو: جۆرە پلاوێکی سووکە بۆ نەخۆش دەکرێ لە جـیـاتی ڕۆنی ڕووت ئاو و ڕۆنی بەسەردا دەکرێ.
چلبـەردە: هەسـتـان و دانیـشتنی چل جـار لەسـەر یەک لە مـاوەی هەنگاوێکدا بۆ هەڵگرتن و دانانی بەردێک لە چل بەرد تا تەواو دەبێ.
چڵـپـانن: د. چەکـاندنی مەمک. دەنگی ئاوخـواردنەوەی سەگ و پشیلە.
چڵپاو: قوڕاو و پیساو.
چڵپ و لێس: د. دەنگی لستنەوە و هەڵلووشینی شت.
چڵپە: خواردنێکە کە بەچاوچنۆکی و ڕووهەڵماڵراوی پەیدا بکرێ و بهـێنرێ بە لچدا. دەنگی خـواردن و هەڵلووشین. (چڵـپـە چڵپ): چڵپەی یەک لە دوای یەک.
چڵتووک: ز. چەڵتووک.
چلچـرا: چەند پارچە ئاوێنەیەکـە دەگـیـرێـتـە تەنەکـە و چرای پێـدا دەکرێ بۆ ڕووناکی.
چلچنگ: هـ. شانە.
چلچەنگ: چنگاڵێکە دەکرێ بەتەڵەوە بۆ ئەوەی ئەگەر نێچیرەکە بڕوا و تەڵەکە ببا چنگاڵەکە لە شتێک گیر ببێ تا ڕاوچییەکە دەیگاتێ.
چلفرە: گۆشتی سوورەوەکراو.
چڵک: چەوری و پیسیی ئەندام. کێم و زووخی برین.
چڵکاو: ئاوێکی لێـڵـی چەوری پیـسـە لە شـتـی چڵکنی شـۆراو پەیدا دەبێ.
چڵکاوخۆر: بریتییە لە مەردوومی پاشماوەخۆر.
چڵک مردە: د. شتێکی چڵکنە کە ناپوخت شۆرابێ.
چڵکن: شتێکە کە چڵکی زۆری پێوەبێ.
چللە: ز. چلەی هاوین و زستان.
چڵم: تەڕییەکی سوێر و لینجە لە لووت پەیدا دەبێ.
چلمسێن: ز. سیسبوونی گوڵ.
چڵمن: گیاندارێکە کە چڵمی زۆری ببێ.
چڵمەلەتە: د. ناوکی میوەیەکە هێشتا کامڵ نەبووبێ.
چلمێردە: نیرگەیەک و چەند دیرەگێکە کە درابێتە ژێر بانێک بۆ بەرزکردنەوەی.
چلمیرە: ز. پشکۆڵی دەرگا.
چلۆ: ز. گەڵای داربەڕوو کە بۆ زستانی ئاژاڵ هەڵگیرابێ.
چڵۆسک: سەرەبزووت.
چلوفل: مەردوومی نەوسنی چڵێس.
چلۆک: چڵەپۆپەی دار.
چلۆن: وتەی پرسیار لە چۆنێتیی شت.
چلۆنهـا: وتەیەکە بەکـاردێنرێ لە جـێی وتـەی (دەگـمـەن): بەڕۆژ نانووم مەگەر (چلۆنها).
چلوورە: سـەهۆڵێکە کـە زسـتـانـان بەگـوێسـوانە و شوێنی بەرزدا شۆڕ دەبێتەوە. جۆرە خواردەمەنییەکی سارد و شیرینە بەپارچە تەختەیەکی باریک و تەنکەوە هەر دانەی لە ڕەنگێکە.
چلووک: د. مەردوومی چڵکنی پیس.

چلە: ناوە بۆ چل ڕۆژ لە ناوەڕاستی هاوین و زستان. ناوە بۆ مانگی کانوونی دووەم. ڕۆینی چل ڕۆژە بەسەر بوونی منداڵێکدا یا مردنی یەکێکدا یا هێنانی بووکێک. چل ڕۆژە کە لە جێگایەکی تایبەتیدا هەر خواپەرستیی تێدا بکرێ.
چڵە: چڵەگە. زیادەخۆریکردن. ترووکە و هەنایی چاو: (چڵە)ی چاوی دێ واتە بەئاستەم چاوی ترووکە دەکا (د).
چلەبڕکردن: هاتنەوەی حاجی لەق لەق لە چلەی زستاندا: ئیمساڵ حاجی لەق لەق (چلەبڕیی کردووە).
چڵەپایە: دیلانێ.
چلەپچووک: چل ڕۆژ لە بەشی دوایی زستانەوە.
چڵەپۆپە: شوێنی هەرە بەرز لە درەخت.
چڵەچڵ: د. نێڵەنێڵی ئاگر.
چلەخانە: شوێنێکە چلەی تێدا بگیرێ بۆ خواپەرستی.
چلەدار: منداڵێکی تازە بووە کە چلەی نەچووبێ. زستانێکە کە چلەی نەچووبێ.
چڵەدان: د. چیقڵدانە.
چڵەک: ز. چڵێس.
چڵەگە: دارێکی درێژی دووپەلە دەدرێتە بەر ئەو گوریسانەی کە بەمێخی دەوارەوە بەستراون لە حەلی شلبوونەوە یا داتەپینی دەوارەکەدا بۆ ئەوەی کە گورجی بکاتەوە.
چلەگەورە: چل ڕۆژ لە سەرەتای زستانەوە.
چلەمین: چلهەمین.
چڵەوەزی: چزڵیک.
چلەم: شتێکە کە لە پایەی چل دابێ.
چلەمین: چلەم.
چلیان: د. دروستبوون و جێبەجێبوونی کارێک: فیسار کەس کارەکەی بۆ (ناچلێ) واتە بۆی دروست نابێ. گلان.
جڵیان: د. ترووکانی چاو.
چلی چلی: ز. شەمشەمە کوێرە.
چڵێس: نەوسنی چاوچنۆک.
چڵێسی: نەوسنی.
چلیک: ز. ئاسنی سەختی ساغ.
چما: وتەی پرسیارە وەک (بۆچی).
چمان: چما (د). شکانی شت (ز).
چمچم: کالا. کەلاشێکە ژێری چەرم بێ.
چمچمە: جۆرە پێلاوێکە لە سیرمە دروست دەکرێ.
چمچە: د. چەمچە.
چمک: گۆشەی کالا و بەڕە و شتی تر.
چمکە: د. چونکە.
چمە: چما.

چنار: درەختێکی جوانی بالابەرزی گەلا پانی لووس و پووسی ڕاستە.
چنارەکڵە: گیایەکە گەلای وەک چنار وایە بەکوتراوی دەخرێتە سەر بالووکە و برین زوو دەری دەکا.
چناگە: چەناگە.
چناکەدان: د. چەنەدان و قسە زۆرکردن.
چناکەشکیاگ: د. بریتییە لە مەردوومی سازندە.
چناوە: ل. چەناگە.
چنجرووک: چڕنووک.
چنچڕووک: چڕنووک.
چنچک: برێشکە. ناوکی میوە (ل). جینچک.
چنراو: شتی تەنراو.
چنگ: پەنجە و نینۆکی هێندێ باڵندە و گیانداری تر.
چنگاڵ: قولابیی ئاسن. نانی گەرمی لە ڕۆنی داخدا گوشراو. ئاسنێکی چنگدارە گۆشت و هێندێ شتی پێ هەڵ دەگیرێ بۆ خواردن.
چنگانە: جۆرە چنگاڵێکە هەنگوینی پێ لە کوونی بەرد دەردەهێنرێ.
چنگاووڵ: د. چەمۆڵە.
چنگ پانکردنەوە: بریتییە لە سواڵکردن.
چنگ قژکردنەوە: دەست بلاوکردنەوە لەگەڵ کووڕیی پەنجەکاندا بەهۆی ئازار یا ترسەوە.
چنگکەوتن: دەستکەوتنی شت.
چنگگرتن: چڕنووک گرتن.
چنگڵە: هـ. سەبەتۆڵکەیەکە لە قامیش یا لە تووڵی باریک دروست کرابێ.
چنگڵەچزێ: چکڵە چزێ.
چنکڵەسەرە: د. سەرقژن.
چنگنە: گیاندارێکی زۆر ورد و بەئالۆشە دەداتە بنکی مووی پیسی چڵکن. گیایەکی گەلا وردی خڕە، ڕیشەی زۆرە هاوینان لە گەنکاودا دەڕوێ. ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد.
چنگنەسەرە: د. چنگڵەسەرە.
چنگنی: دەعبایەکی چنگ چنگە لە دووپشک زلترە.
چنگەپۆیان: دەستبازی و شەڕە چنگ کردن.
چنگەپۆیانێ: چنگەپۆیان.
چنگەڕنێ: چنگ لە زەوی گیرکردن لەبەر ئازارێکی زۆر.
چنگەکرە: چنگەکرێ.
چنگەکرێ: سەرکەوتن بۆ شوێنێکی بەرز بەهۆی گیرکردنی چنگەوە. چنکڵەچزێ.
چنگەڵە: هـ. باڵندەیەکی بۆری کلاودارە لە چۆلەکە گەورەترە.

چنگەمریشکە: پێ مریشکە.
چنۆک: نەوسنی چاوبرسی.
چنۆکی: نەوسنی و چاوبرسێتی.
چنوندەر: چەوەندەر.
چنوور: گیایەکی کوێستانیی بۆنخۆشە لە شویت دەچێ.
چنەچن کـردن: هەڵپـەکـردن بۆ پەیاکـردنی شت بەسـوکی و ریسوایی.
چنەو: ل. وتەیەکە لەباتی وتەی (ئا ئاوا) بەکاردێنرێ.
چنیک چنیک: با. شتی رەنگاورەنگ.
چنین: تەنین. کـردنەوەی بەری درەخت و هێندێ سـەوزایی: شـاتووەکـە یا بامـێکە (بچنە). بژاردنی دانەوێڵـە (د). پەستاوتن: (د).
چنینەوە: کۆکردنەوەی شتی رژاو دەنک دەنک.
چۆ: لەوێ (هـ). دەنگێکە کەر و ئێستری پێ لێ دەخورڕدرێ (ز).
چوار: ناوە بۆ ژمارەیەک کە لە ناوەندی سێ و پێنج دایە.
چوارئاوێنە: جۆرە زرێیـەکی جەنگییـە لەبەر دەکرێ، چوار تەختـە ئاسنی پێوەیە دەکەونە پێش و پاش و هەردوولای ئەو کەسەی لەبەری دەکا.
چوارئایێنە: د. چوارئاوێنە.
چوارپا: د. چوارپێ.
چوارپاچکە: د. چارپایە.
چوارپاڵوو: شتی ئەستووری چوارگۆشەی رێک (مكعب).
چوارپایە: د. چارپایە.
چوارپووڵەکە: چوار پارچە چەرمی قـەبزە نوشـتـەییـیـە بۆ قـایی دەدرێ لە ڕاست و چەپی کەوش لە ئاستی جەمسەرەکانی.
چوارپەل: هەردوو دەست و هەردوو قاچ.
چوارپەل قەوی: بریتییە لە گیانداری قەڵەوی پتەو.
چوارپێ: گیاندارێکە بەچوار پێ بروا.
چوارپینە: چوارپینەیە دەدرێ لەسەر پەنجە و پاژنەی کەوش.
چوار چابوخ: چوارچاک. چوار بێـچـوولەی بچـووکە دەکـەوێتـە بن باخەڵی کەواوە.
چوارچاک: هەڵدڕاوی چوار چمکی ئەملاو ئەولای کەوا.
چوارچاو: بریتییە لە پیاوێک کە دوو ژنی بێ.
چوارچاوبوون: بریتییە لە سەر لێ شێوان.
چوارچاوکردن: بریتییە لە سەر لێ شێواندنی یەکێک.
چوارچمک: چوارچاک.
چوار چنگۆڵە: ڕۆین لەسـەر چوار چنگ یا هەڵگەڕان بەشـتـێکدا بەچوار چنگ.
چوارچەقەڵ: د. چوار چنگۆڵە.
چوارچێوە: دارێکی چوار پارچەی چوار سووچە دەرگا و پەنجەرە یا ئاوێنە یا نووسراوێکی جوان یا وێنەیەکی تێ دەخرێ.

چوار خـاڵ کـێـشـان: ڕەشکردنی ناوچەوان و هەردوو رووومـەت و چەناگەی یەکێک بۆ ڕیسواکردنی.
چوار خرت: بزن و مەڕی چوار ساڵە (د). بریتـییـە لە مەردوومی قەڵەوی تێکسمڕاو.
چوارخـشـتـەک: چوار پارچەی پچـووکـە لە کـەوا هەر دووانیـان دەکەوێتە بن دەستێک.
چوارخشتەکی: چوار نیوە شیعرە کە دوایی نیو شیعری یەکەم و دووەم و چوارەمی وەک یەک وابێ.
چواردانگ: برنجـێکی کـوتراوی وردەیە لە ناوەندی پلاوی و خاکەدا.
چوار دانگی: چواردانگ.
چواردە: ناوە بۆ ژمارەیەک کە چوارە لەگەڵ دەدا.
چواردەخانەی ڕەمڵ: چواردەخانە لەسەر کاغەز دەکێشرێ ڕەمڵی پێ دەگیرێتەوە.
چواردە ڕێیان: شوێنێکە کە ڕێگای زۆری لێ بیێتەوە.
چواردەستەکی: هەڵگرتنی شتێک بەچوار دەست.
چواردەمین: شتێکە کە لە پایەی چواردەدا بێ.
چواردەم: چواردەمین.
چواردەهەمین: چواردەم.
چواردیوار: بریتـییـە لە خـانوو: هەمـوو کـەس لە (چوادیوار)ی خۆیدا دەحەسێتەوە.
چوار ڕێگان: چوار ڕێیان.
چوار ڕێیان: شوێنێکە کە چوار ڕێی لێ بیێتەوە.
چوار سروشت: بەچوار شت دەڵێن کە بناغەی دروستبوونی هەموو شتێکن وەک با و ئاو و خاک و ئاگر بێ.
چوار سووچ: شتی چوارگۆشە.
چوارشانە: مەردوومی ئەستووری قەڵەوی داڕێژراو.
چوارشەم: چوارشەموو.
چوارشەموو: ڕۆژی پێنجەمی حەفتە لە هەینی بەدواوە.
چوارشەممە: چوارشەموو.
چوارشەمە: چوارشەموو
چوارقـورنە: شـوێنی چوار سـووچ. ناوە بۆ دێیـەک لە ناوچەی پشدەر.
چوارقـەد: شـتـێکە کـە چوار جـار قـەد کـرابێ. (چوار قـەدکـردن) نوشتاندنەوەی شتێک چوار جار.
چوار قـەمچ: د. کـەسـێکە کـە مـووی ڕیشی و سـمـێڵ و برۆ و برژانگی کرابێ. (چوار قەمچکردن): تاشینی مووی ڕیش و سمێڵ و برۆ و برژانگ.
چوارگا: ناوە بۆ جۆرە مقامێکی کوردی.
چوارگۆشە: شتـێکی چوار سووچە کە پانی و درێژیی بەقـەد یەک بێ.

چوارلا: پێش و پاش و ڕاست و چەپی هەموو شتێک.
چوارلوو: چوالوو.
چوارمەشقان: د. چوارمەشقی.
چوارمەشقی: جۆرە دانیشتنێکە بە تێک پەڕاندنی هەردوو قاچ بە نوشتاوەیی.
چوارمێخە: چوار سنگی داکوتراوە بەزەویدا بۆ ئەوەی کە چوار پەلی یەکێکی پێوە ببەسترێتەوە.
چوارمێخە کێشانەوە: بەزەویدا دانی مەردووم لەسەر گازی پشت و بەستنەوەی چوارپەلی بەچوار مێخەوە بۆ سزادانی.
چوارمێردەکی: چوار مەشقی.
چوارناڵ: چوارناڵە.
چوارناڵە: ئاخاوتنی وڵاخ لە ناوەندی لۆقە و پرتاودا.
چوارنان: کەسێکە لە یاریی (قەلەمرداریێ)دا دەستەی بەرامبەری تێ خستبێ.
چوارە: د. چوارناڵە.
چوارەم: شتێکە لە پایەی چواردابێ.
چوارەمین: چوارەم.
چوارهەم: چوارەم.
چوارهەمین: چوارەمین.
چوارهەنگڵ: شتێکە کە چوار هەنگلی ببێ وەک خێگە و هەمانە.
چوارهەنگۆڵ: د. چوارهەنگڵ.
چواریەک: لە چوار بەش بەشێک.
چواریەکی: چواریەک.
چوالوو: چالەکە.
چوالە: درەختێکە گەڵای وەک بی وایە. بەری داری چوالە.
چوالەبادام: چوالەی ناوک شیرین.
چوالەتاڵە: جۆرە چوالەیەکی تاڵە.
چۆبەچۆ: د. بەرامبەر.
چۆپ: د. درۆ.
چۆپ چۆپان: کاتی باڵاکردنی گیا لە بەهاردا بەڕەنگێکی وا کە شوان ئێوارە داردەستەکەی فڕێ بداتە ناو گیا و بەیانی نەیدۆزێتەوە.
چۆپ چۆپێن: چۆپ چۆپان.
چۆپر: ز. کوێر.
چوپلمە: ز. ئازارێکە لە سنگی وڵاخدا پەیدا دەبێ.
جۆپی: جۆرێکە لە هەڵپەڕین.
چۆپی کێش: کەسێکە کە سەرچۆپی بکێشێ.
چۆپیک: ز. مەردوومی بێ عەقڵ.
چوترم: پشوودان.
چوتورمە: د. ئاشووب.
چۆجەڵە: ڕیزێک قولفەیە بەتەختە دەوارەوە لەسەر باری درێژی لە کاتی هەڵدانیدا بەیەکدا دەکرێن.
چوچڵە: قیتکە.
چۆچەک: جۆرە چەکێکی ژنانەی پانی پلێپلەدارە بەلای ڕاست و چەپی سەریدا شۆڕدەبێتەوە.
چوخ: ز. چۆغە.
چوختی: مەردوومی چەقاوەسوو.
چوخک: با. چۆغەی شاڵی لەبەرکردن.
چوخم: تاقێکی گەورەیە کە بەسەر کۆڵانێکدا هاتبێتەوە و، سەرەکەی کرابێ بەژوور.
چوخمە: چوخم.
چوخور: د. چەم و چوغورد.
چۆخە: چۆغەیەکە لەگەڵ ڕانکدا لەبەر دەکرێ.
چورت: وەنەوز. چوارچێوەیەکە چەند تەلێکی بەرایەڵ تێ هەڵکێشراوە، یەکی چەند دارێکی گردی تێدایە ژمارەی پێ دەکرێ. شەوژەن (هـ).
چۆرتان: ز. کەشک.
چورتاندن: د. ترووکاندنی پەلەپیتکەی تفەنگ و دەمانچە.
چورتانن: د. چورتاندن.
چورتدان: وەنەوزە کوتێ.
چورتک: د. چوڕ.
چورتکە: د. چورتی حسابکردن.
چورتم: نووچبردنی دانیشتوو بەدەم وەنەوزەوە. سەغڵەتی و دەردی سەری: فیسار کەس تووشی (چورتم)ێکی گەورە بوو.
چورتم بردن: نووچبردن بەدەم خەوەوە.
چورتمدان: چورتم بردن.
چورتە: جوولە: (چورتە) ناکا، واتە ناجوولێتەوە. (چورتە چورت) جوولە پێکەوتنێکە کە لە ترسەوە بێ.
چورخ: ز. چەرخی چەقۆ تیژکردن.
چوڕ: سپێتیی شت: دەڵێی (چوڕ)ی شیرە. پاسخ و وەرام.
چۆڕ: دڵۆپێک لە شتی شل. دێیەکە لە مەریوان.
چۆڕانەوە: هاتنە خوارەوەی شتێکی شل لە شتێکی تر بەخوارکردنەوەی بەرەبەرە. (چۆڕەچۆڕ) چۆڕانەوەی یەک لە دوای یەک.
چۆڕاوگە: باراناوێکە بە گوێسوانەدا بێتە خوارەوە.
چۆڕبڕ: وشکبوونی ئاو لە شوێنێک کە چۆڕی نەمێنێ: کانییەکە. (چۆڕبڕە). (چۆڕبڕبوون) وشکبوونی ئاو لە شوێنێک. (چۆڕبڕکردن) وشککردنی ئاو لە شوێنێک.
چوڕدانەوە: د. وەرامدانەوە.

چۆرکە: شوێنێکە کە ئاوی لێ بچۆڕێتەوە. لوو.
چورنوسقاو: ترنوسقاو.
چۆڕە: دەنگی چۆڕانەوەی ئاو.
چۆڕیان: د. چۆڕانەوە.
چۆڕیانەوە: د. چۆڕانەوە.
چۆرەک: جۆرە خواردەمەنییەکە لە هەویر دروست دەکرێ.
چوریسک: با. پریشکی ئاگر.
چوست: گیانداری چالاک.
چوستی: چالاکی.
چۆش: د. وتەیەکە وەک (هۆش) گوێدرێژی پێ دەوەستێنرێ.
چوشتر: چتیر.
چوشتیر: چتیر.
چۆغان: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک کەرەوز وایە وەک ئەسپۆن دەکوترێ و کاڵای پێ دەشۆرێ.
چوغڵ: بەدی چەپخوون.
چوغڵی: بەدی و چەپخوونی.
چوغورد: چەم و دۆڵی چڕ.
چۆغـە: جۆرە تەنراوێکی خوریی خـاوداری جـوانی بەنرخە. جـۆرە کاڵایەکی شاڵینی چاکەلدارە لەگەڵ ڕانکدا لەبەر دەکرێ.
چۆغەبازەڵە: بزەڵە.
چۆغەڕەش: بریتییە لە چێشتی ماشی ڕەش.
چۆغەڵ: چۆغەیەکە لەگەڵ ڕانکدا لەبەر دەکرێ.
چۆڤ: ز. داردەست.
چۆقـاندن: هێنانە لەرزەی مـەردووم لەلایەن لەرز یا ترسـەوە. هەڵقرچاندن لەلایەن تاوە.
چۆقانن: چۆقاندن.
چۆقل: ز. قاچی گیاندار.
چۆقـە: دەنگی لە یەککەوتنی ددان لەکـاتی لەرز یا ترس یا سـەرمـادا. (چوقـەچۆق) چۆقـەی یەک لەدوای یەک. گـرە و تەوژمی تا: تا دەی(چوقێنێ).
چۆقیان: د. هاتنە چۆقە بەددەم لەرزەوە. هەڵقرچان بەددەم تاوە.
چۆقین: چۆقیان.
چۆک: ئەژنۆ.
چۆکانی: ز. دانیشتن لەسەر ئەژنۆیەک و هەڵنانی ئەوی تر.
چۆکدان: بریتییە لە خواردنی شتێک بەتەواوی و نەهێشـتنی. لەسەر ئەژنۆ دانیشتن.
چوکدادان: لەسەر ئەژنۆ دانیشتن.
چوکدانەسەر: تەپدانە سەر شتێک.
چوکڵە: پارچە دارێک یا چیلکەیەکی پچووک. نووکێکی بەرزی تیژە بۆ هێندێ پیت دەنووسرێ وەک (بێ) و (تێ) کە بەددەم پیتی ترەوە بنووسرێن.
چوکڵەخیگە: پشکی هیزە و مەشکە.
چوکـڵـەشکێن: د. بریتـییـە لە یەکـێک کـە چەڵـتـووک بخـاتە کاروباری ئەم و ئەوەوە.
چۆکڵەشکێنی: بریتییە لە چەڵتووک خستنە کاری مەردوومەوە. چەڵەمەشکێنە (د).
چۆک هەڵنان: دانیشتن لەسەر قاچێک و هەڵنانی قاچەکەی تر.
چۆگە: هـ. لەوێ.
چۆل: چۆڵ.
چۆڵ: شوێنێکە کە ئاوەدانیی تێدا نەبێ.
چۆڵاوە: هـ. چەند دارێکی دوو پەلن دادەچەقـێنرێن و ڕایەڵیـان لەسەر هەڵدەکرێ.
چوڵبڕ: ڕۆیشتن بەبێ ڕێ.
چۆڵبوون: نەمانی ئاوەدانی لە شوێنێک.
چۆڵپەرست: کەسێکە بەتەنیا هەر لە چۆڵدا بژی.
چۆڵپەرستی: ژیان و ڕابواردن لە چۆڵیدا.
چۆڵچڕ: د. هۆرەیەکە هەر لە بیاباندا دەکرێ.
چۆڵک: ز. ئاودەستخانە.
چۆڵکردن: بەجێهێشتنی شوێنێک و مانەوەی بەچۆڵی.
چۆڵگە: دەشت و بیابان.
چوڵوسک: د. چلۆسک.
چۆڵ و هۆڵ: شوێنێکە کە لە هەموو گیانلەبەرێک خاڵی بێ.
چۆڵەچرا: دارێکی تەڕە بەقەد گەزێک سەرەکەی دەکوترێ تا شی دەبێتـەوە کە وشک بوو لە تاریکیدا دادەگیرسێنرێ لە باتی چرا.
چۆڵەچراو: هـ. چۆڵەچرا.
چۆلەکـە: باڵندەیەکی بچکۆلەی بۆرە. دارێکە بەقـەد مـەچەکـێک دەبێ دوو کـونی تێـدایە هەر کـونەی چەرخـێکی تێ براوە (گورد)ی جۆلای لەسەر هاتوچۆ دەکا لەکاتی کارکردندا.
چۆلەکە بکوژ: بریتییە لە ئادەمیزادێک: (چۆلەکە بکوژ)ی تێدا نییە واتە هیچ کەسێکی تێدا نییە.
چۆڵەمە: قووڵاییی خوار قوڕگ.
چۆڵەمێ: چۆڵەمە.
چۆلی: چۆڵی.
چۆڵی: شوێنی چۆڵ.
چۆم: چەمی ئاو.
چۆماخ: تێلا.
چومە: ز. هیچ.
چۆمی: چەم.
چون: د. چونکە.
چۆن: وتەی پرسیار لە چۆنێتی شت: (چۆنیت)؟

چونکو: چونکە.
چونکە: وتەیەکە بۆ هۆیەتی (علت)ی شتێک بۆ شتێک بەکاردەهێنرێ: چووم بۆ بازاڕ (چونکە) کارم بوو.
چونکی: چونکە.
چۆنەر: د. چەوەندەر.
چۆنەرقەند: د. چەوەندەری شەکر.
چۆنەرین: چێشتی چەوەندەر بەترش.
چۆنێتی: بوونی شت بەجۆرێکی تایبەتی.
چونیەک: وتەیەکە لە جێی وتەی (وەک یەک) بەکاردێنرێ: ئەگەر لەکین هەموو (چون یەکین).
چوو: میچ.
چۆو: د. داردەست.
چواندن: نەکردنی نوێژ لە کاتی خۆیدا: نوێژەکەی بەیانیت (چواند).
چوواو: نوێژێکە کە لەکاتی خۆیدا نەکرابێ.
چووپ: ز. داگیرکردنی شت.
چووتن: ز. جوونی شت.
چووچ: ز. چووکی کوڕی پچکۆلە.
چووچک: ز. کەوچکی ماستاو. چۆلەکە.
چووچی: ز. وتەیەکە وەک: (چی چی) بۆ دانیشتنی منداڵ بەکاردێنرێ.
چوور: ز. مەردوومی شەل. جۆرە مەرێکە.
چووز: لقی ناسکی تازەی سەوزی درەخت. درەختێکە موتوربەکرابێ.
چووزاندنەوە: سۆڵاندنەوەی ئەندام.
چووزانم: وتەیەکە لە شوێنی وتاری (نازانم) بەکاردێنرێ.
چووزانەوە: جۆرە ئازار و سۆڵانەوەیەکە هێندێ جار لە لەشدا پەیدا دەبێ: دەستم (چووزایەوە) لە کاتێکدا کە قەڵەشابێ یا لووتم (چووزایەوە) لە کاتێکدا کە سەرما لێی دابێ، یا دەمم (چووزایەوە) لە کاتێکدا کە شتێکی توونت خواردبێ. (چووزەچووز) چووزانەوەی زۆر.
چووزکردن: موتوربەکردنی درەختێک لە درەختێکی تر.
چووزە: د. چووەر.
چووزەرە: لاسکی ناسکی گیا.
چووزەشوانە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک بەرەزاوایە لاسکەکەی بەناسکی دەخورێ.
چووک: بریتییە لە کێری ئادەمیزاد. بچووک: من برا (چووکی) تۆم. چۆک (با). چۆلەکە (ز).
چووگان: ز. گۆچان.
چوول: ل. دار.
چوولە: ز. ئادەمیزادی قەشمەر.
چوون: ڕۆین لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. پەڕینی وڵاخی یەکسم. تەقینی هێلکە و ڕژانی بۆ ناو ئاگر. دامردنەوەی ئاگری گڕ: ئاگرەکە (چوو) واتە دامردەوە. تەزین و لە گۆچوونی ئەندام لە سەرماندا: دەستم (چوو) واتە تەزی. بوونی دراو بەڕەنگێکی وا کە لە شت کڕیندا لێت وەربگیرێت: ئەم دراوە (دەچێ) یا (ناچێ). شوبهانی شتێک بەشتێک: ئەم شتە لەو شتە (دەچێ) واتە وەک ئەو وایە.
چوونەبەست: نەتوانینی چوون بۆ شوێنێک بەهۆی شتێکەوە: بەهۆی فیسار کەسەوە ماڵەکەمان لێ چۆتە بەست، واتە لەبەر ئەو ناتوانین بچین.
چوونەژێر: دانان بەشتێکدا (اقرار).
چوونەسەر: بریتییە لە سەرگرتنی کارێک و برانەوەی بەئێجگاری.
جوونە سەراو: بریتییە لە چوونەسەر پێشاو.
چوونەلا: بریتییە لە دروستبوونی پیاو لەگەڵ ژنیدا.
چوونەوە: بەختکردنی ڕەنگی شت. چوونی یەکێک بۆ شوێنێک جاری دووەم.
چوونەیەک: کرژبوونی هێندێ تەنراو بەهۆی تەڕبوونییەوە.
چووەر: د. ژوور.
چوێ: ز. برین.
چوێدار: ز. بریندار.
چوێشکە: چۆلەکە.
چوێل: وڵاخێکە هەردوو پاشووی گێڕ و کەوانەداربێ و لە ڕۆیندا لە یەک بدەن.
چویت: جۆرە دەرمانێکی شینە دەکرێتە ئاوەوە مەتیلی سپی و هێندێ کاڵای تری تێوە دەدرێ بۆ جوانی.
چویتلی: شتێکە ڕەنگی وەک چویت وابێ.
چویک: ز. چۆلەکە.
چوین: ل. چۆن.
چە: وتەیەکە پرسیاری پێ دەکرێ لە شتێک کە ئادەمیزاد نەبێ: (چە) دەکەیت؟ واتە چی دەکەیت. پیتی پچووککردنەوە: (باخچە، دەریاچە). کەچی: هاتم بۆ لات (چە) لەوێ نەبوویت، واتە کەچی (د).
چەبت: ز. جەوت.
چەپ: لای بەرامبەری ڕاست لە شت. وتەیەکە هەمیشە لە نەفیدا بۆ جیاوازییەکی کەم لە ناوەندی دوو شتدا بەکاردێنرێ: ئەم خانووە (چەپ)ی نییە لەگەڵ ئەو خانووەدا واتە زۆر لە یەک جیاواز نین. چەپڵە (د). شتی کلا و کەنار: فیسار کەس خانووەکەیان زۆر (چەپ)ە.

چەپاڵ: پارچە تەنراوێکی ئەستووری کۆنی کەم نرخ.
چەپاڵک: چەپاڵ.
چەپاڵە: پارچەیەک لە هێندێ شت: (چەپاڵە) یەک بەرەم نییە. بریتییە لە زۆر و سزای زۆردار: خوا لە (چەپاڵە)ی زۆردار بەدوورت کا. چەپۆڵە (د). زللە (د).
چەپاڵەدان: پەنادان بەیەکێک کە پەنات بۆ بێنێ.
چەپانن: د. تێ تەپاندن.
چەپاو: تالآن.
چەپاوکردن: تێکدانی ئاسایشی شوێنێک و شێواندنی. تالآنکردن.
چەپخون: د. شەبەیخوون.
چەپخوون: گیانداری نەگریسی هار و هاج.
چەپک: دەسکێک لە گوڵ و گیا. دەستپێچێک لە خوری.
چەپکوتان: چەپڵەلێدان.
چەپکوتانن: د. چەپکوتان.
چەپکە: چەپک.
چەپگەرد: بریتییە لە رۆژگاری ناهەموار.
چەپکەن: د. کونێکی ئەمسەر و ئەو سەرە دەکرێ لەژێر شاخدا بۆ هاتوچۆ پێداکردن.
چەپل: ز. قۆڵی گیاندار.
چەپڵە: بەیەکدادانی هەردوو بەری دەست بەرەنگێک کە دەنگی لێوەبێ.
چەپلەر: مەردوومی چەپە.
چەپڵەرێزان: چەپڵەلێدانی چەند کەسێک بەیەکەوە.
چەپڵەقوزێ: بریتییە لە دەرکردنی یەکێک لە شوێنێک بەسووکی و بەقاڵەی دەم.
چەپڵەکوتان: چەپڵەلێدان.
چەپڵەلێدان: لێدانی چەپڵە بە بەری هەردوو دەست.
چەپڵە لێ کوتان: بریتییە لە بەدناو و ریسواکردنی یەکێک.
چەپ و چێر: شتی خوار و گێر.
چەپ و راست: چەلیپای گاوران. هەموو شتێک کە راست و چەپ تێک پەڕیبێ.
چەپ و راستکردن: راکێشانی دەستی راست و قاچی چەپ، یا دەستی چەپ و قاچی راست بۆ چاکبوونی ئازاری دەماری پشت. برینی دەستی راست و قاچی چەپ یا وەکی تر بۆ سزادان.
چەپوغان: کارکردن بەنهێنی.
چەپۆک: دەست بەسەردا مالێن لەگەڵ کردنەوەی پەنجەکاندا.
چەپۆکان: هەردوو دەست بەزەویدادانی وڵاخی بەرزە.
چەپ و گووپ: چاپ و گووپ.
چەپۆڵە: دەست و پەنجەی گیاندار.
چەپۆڵەشێرە: گیایەکی کوێستانییە لقەکانی روو دەکەنەوە یەک وەک چنگی شێر.
چەپە: گیاندارێکە کە بەدەستی چەپ کاربکا. چەپک (د). دەست بەندی وڵاخ. سەوڵی بەلەم لێخورین (د).
چەپەجاخ: ئاسنێکی دەم پانی تیژی کلکدارە گۆشتی پێ قیمە دەکرێ.
چەپەر: دەرگایەکە بەتەیمان چنرابێ. پۆستەچی (د). سوپەر (ز).
چەپەربەن: د. ملپێچ.
چەپەربەندان: بریتییە لە وێستانی چەند کەسێکی زۆر بەگردی شتێکدا بەجۆرێک کە وەک تووڵی چەپەر بەتەنشت یەکەوە بن.
چەپەک: شوێنێکە رێی هاتوچۆی کەم تێ بکەوێ. چەند جۆگایەکی کەوانەدارە بەناو مەرەزەیەکدا رادەکێشرێ کە زەوییەکەی لێژبێ بۆ ئەوەی کە مەرەزەکە هەمووی ئاو بخواتەوە.
چەپەڵ: شتی چڵکنی پیس.
چەپەڵووک: چەپۆک.
چەپەڵی: پیسی و پۆخڵی.
چەپەوانە: شتی پێچەوانە.
چەپی: جۆرە هەڵپەرکێیەکە هەر قاچی چەپی تێدا پێش دەخرێ. چەپەوانە.
چەت: کۆزەری دەغڵودان.
چەتارە: ز. کاڵای ئاوریشمین.
چەتاڵ: دارێکی دووپەلە دەچەقێنرێ و لوولەی تفەنگی دەخرێتە سەر بۆ ئەوەی لە حەلی تەقاندنیدا نەجووڵێ. دەواری پچووک. چنگاڵی ئاسن کە نانی پێ دەخورێ.
چەتاڵانە: بەشێکە لە خەرمان کە دەدرێ بەو سەرکارانەی دەغڵودان کۆ دەکەنەوە بۆ خاوەنی.
چەتان: پەردەی سەری عەرەبانەیەکە کە خەرمانی پێ دەگوێزرێتەوە.
چەتاوەروو: مەردوومی بێ شەرمی روو هەڵماڵراو.
چەتر: شتێکە لە ژوور سەرەوە هەڵدەدرێ لە کاتی باران یا گەرمادا.
چەترکردن: هەڵپاچینی درەخت بۆ ئەوەی سەرەکەی وەک چەتری لێ بێ. خۆگیفکردنی قەلەموون و تاوس.
چەترەقی: جەترەقە.
چەترهەڵدان: بریتییە لە خۆگیفکردنی قەلەموون و تاوس.
چەتفە: چەفتە.
چەتڵەمەز: مەردوومی بزێوی فێڵباز.

چەتۆر: د. قرانی زیوینی زنجیرەدار. تیغی کولی ژەنگن.
چەتوو: ز. وتەیەکە وەک وتەی (کابرا) بۆ پیاو بەکاردێنرێ.
چەتوون: گیانداری هار و هاج.
چەتە: جەردە. پۆلیس (د).
چەتەکاری: جەردەیی.
چەتەگەری: چەتەکاری.
چەتەوولّ: مەردوومی درێژی زەبەللاح.
چەتەیی: چەتەکاری.
چەتیو: کچی بێ باوک.
چەتیوە: ئافرەتی ناکەس بەچە.
چەچ: د. چەچە.
چەچلە: د. چەچ.
چەچە: وتەیەکە منداڵی ساوا بۆ دەست بەکاری دەهێنێ.
چەخماخ: شتێکە پلێتەی تێ هەڵدەکێشرێ و جۆرە بەردێکی تێ دەخرێ و ئاگری پێ دەکرێتەوە: ئەستێ. بریتییە لە تفەنگ: دوو سەد (چەخماخ)م هەیە.
چەخماخچی: چەخماخساز.
چەخماخساز: کەسێکە تفەنگ و دەمانچە دروست بکا.
چەخماخە: بروسکەی ئاسمان.
چەخەر: ز. نیشانەی شت کە لە رێدا بەجێ مابێ.
چەدەنە: رێحانە کێویلە.
چەرپا: چارپایە.
چەرپایە: چارپایە.
چەرچی: کەسێکە وردەواڵا بەرێتە لادێ و بەرۆن و دانەوێڵە بیگۆرێتەوە.
چەرخ: ئاسنێکی کەوانەدارە کە لەسەر شان بسوورێتەوە. گەردشی جیهان و سوورانەوەی: چی بکەم لە دەست (چەرخ)ی کەج رەفتار؟ تەختەیەکە لەسەر بیر دادەنرێ و ئاوی پێ هەڵدەگۆزرێ. چەخماخی ئاگرکردنەوە. سەدە (قرن).
چەرخان: سووران.
چەرخاندن: سووراندن.
چەرخانن: چەرخاندن.
چەرخ خواردن: خولخواردن.
چەرخدان: چەرخاندن.
چەرخ لە چەمەر کێشان: بریتییە لە بەیدەستکردن و سزادانی یەکێک.
چەرخە: سوورانەوە بەکەوانەیی.
چەرخەچی: زەلامێکە کە بۆ ئاسایش ئاوەدانیدا بسوورێتەوە. ئاوگردان.
چەرخەدان: سوورانەوە بەگردی شتێکدا.
چەرخەکردن: چەرخەدان.
چەرخەمە: جۆرە سەبەتەیەکی گەورەیە لە قامیش دروست کرابێ.
چەرخیان: د. خولخواردن.
چەرخی: جۆرە دراوێکی زیوینی پچووکە.
چەرخین: چەرخیان.
چەرداخ: کەپر.
چەرداوەروو: چەتاوەروو. ناوە بۆ تیرەیەکی کورد لە ناوەندی سنە و هەمەداندا.
چەراگا: شوێن لەوەر.
چەرەدوکەڵ: دوکەڵێکی رەشی زۆرە کە پۆنگی خواردبێتەوە و بەجارێک بێتە دەرەوە.
چەرم: پێستی گیاندار.
چەرمچی: د. کەسێکە کە پێستە خۆش دەکا.
چەرمقین: د. چرچ و لۆچی کاڵا و شتی تر.
چەرمگ: شتی سپی.
چەرمگسوور: مەری دەموچاو و مل سووری لەش سپی.
چەرمگی: د. سپێتی.
چەرموو: چەرمگ.
چەرمووسوور: چەرمگ سوور.
چەرمە: هـ. سپی.
چەرمەچەقاڵتە: گۆشتی لەڕ و لاواز.
چەرمەسەرێ: دەردی سەری.
چەرمەڵ: سپیکەلە.
چەرمەلانە: د. چەرمەڵە.
چەرمەڵە: چەرمەڵ.
چەرمێنە: د. سپێنەی هێلکە.
چەرمی: ل. سپی.
چەرمیلە: د. چەرمەڵە.
چەرمین: شتێکە لە چەرم کرابێ.
چەرمینە: د. چەرمین.
چەرندە: گیاندارێکە کە بلەوەرێ.
چەروەدار: ل. قەتارچی.
چەرەخۆرە: دارێکی کولۆرە سەرێکی دەبرێتە دۆڵیانەوە و سەرەکەی تری (کەوچکە)ی پێوە دەبەسترێ.
چەرەز: ز. خواردنی خۆش.
چەرەس: دۆشاو و باسوق دروستکردن لەناو رەزدا. چەند خواردەمەنییەکی وشکەیە لە کۆبوونەوەدا دادەنرێ بۆ خواردن بەدەم گفتوگۆوە.
چەرەگە: بەرچیغ.

چەرەن و پەرەن: ورێنەکردن.
چەرین: با. لەوەڕین.
چەس: چییە؟
چەسپ: سەرێک لە تلیاک. شتێک کە بەشوێنێک توند و پڕ بەپڕی بێ.
چەسپان: خێرا. چەسپین.
چەسپاندن: جێگیرکردنی شتێک لە شوێنێک. لکاندنی شتێک بەشوێنێکەوە.
چەسپانن: چەسپاندن.
چەسپیان: د. چەسپین.
چەسپین: جێگیربوونی شتێک لە شوێنێک پڕ بەپڕ. لکانی شتێک بە شتێکی ترەوە.
چەسن: ل. چەس؟
چەش: گیاندارێکی ڕاوییە کە دەمی بەگرتن و خواردنی نێچیر شیرین بووبێ. خواردنێکە دەکرێ بەتەڵەوە بۆ گرتنی نێچیر: بەرازەکە (چەش)ی بۆ دانێ.
چەشبوون: دەم شیرینبوونی گیانداری ڕاوی بەگرتن و خواردنی نێچیر.
چەشتن: تاقیکردنەوەی تامی شت بە زبان.
چەشتە: گیانداری چەش. چەشەیەکە دەکرێ بەتەڵەوە بۆ گرتنی نێچیر.
چەشتەخۆرە: چەشەخۆرە.
چەشکردن: فێرکردنی گیاندار بە ڕاو بەدەرخواردانی چەشە.
چەشکە: چەشە. مێلاک.
چەشکەکردن: چەشتنی خواردەمەنی.
چەشم ئەناز: د. چەشمەنداز.
چەشم ئەنداز: د. چەشمەنداز.
چەشمە: کانی و سەرچاوە. ئاودەستخانە (ز).
چەشمەنداز: شوێنی بەرچاوی خۆش.
چەشمیک: ز. جۆرە دەرمانێکی چاوە.
چەشن: تەحر و جۆر: بەم (چەشن)ە واتە بەم تەحر و جۆرە.
چەشنی: تەرەقەی دەمانچە و تفەنگ. مەزە و تام (د).
چەشە: خواردنێکە کە بکرێ بەتەڵەوە بۆ گرتنی نێچیر. چەش.
چەشەبوون: چەشبوون.
چەشەخۆرە: گیاندارێکە کە چەشە بخوا و بەتەڵەوە نەبێ.
چەشەکردن: چەشکردن.
چەعف: ز. چاو.
چەعفک: ز. چاویلکە.
چەفت: ل. چەوت.
چەفتە: پارچەیەکی ئاوریشمی بە سیم یا بە سورمە چنراوە. داڵیت (د).
چەفتە ڕێز: ئەڵقەڕێز.
چەفتەکەل: د. گای چوار ساڵە.
چەفتەلی: ئەنجامەی دەرگا. جۆرە باڵا پۆشێکی ژنانەیە وەک چەفتەی بەسورمە چنراو.
چەفتە و شیرە: د. چەوتە و چیلە.
چەفتیاگ: د. شتی چەوتاوە.
چەفیە: چەفتەی ئاوریشمین.
چەڤرەیی: ز. درەختێکە وەک بی وایە.
چەق: گۆشتی لەڕی لاواز. ناوەڕاستی ڕێگا: لە (چەقی) ڕێگا مەوەستە. دیوێکە لە میچ. کەسێکە کە گیربێ لە کڕین و فرۆتندا (د).
چەقاڵ و بەقاڵ: بریتییە لە مەردوومی هەرزەی بازاڕی.
چەقالە: شتێکە وەک بادام بەڵام ئەم پچووکترە و ناوکەکەی تاڵە، خۆش دەکرێ و دەخورێ.
چەقاندن: داکوتانی شتێک بەشوێنێکدا.
چەقانن: چەقاندن.
چەقانە: د. چەقەنە.
چەقانەژەن: د. کەسێکە چەقەنە لێ بدا.
چەقاوەسوو: مەردوومی بێ شەرمی چوختی.
چەقچەقۆک: گیایەکی بەهاریی گەڵا خڕە بەرێک دەگرێ وەک گوێز بەڵام پچووکترە.
چەقچەقە: چەقەنەی ئاش. گیایەکە گەڵای لە گەڵا بی باریکترە جۆش دەدرێ و بۆ دەنگ بەربوون دەخورێتەوە. قەزوان (ل).
چەقلانقۆچ: ل. دەنگی قەزوان قرتاندن.
چەقلماست: ز. ماستاوی خەست.
چەقۆ: تیغێکی مشتووداره دەمەکەی دەنوشتێتەوە بۆ ناو مشتوەکەی.
چەقۆگەر: کەسێکە چەقۆ دروست بکا.
چەقە: قسە زۆرکردن بەبێ هوودە. (چەقەچەق): چەقەی یەک لەدوای یەک.
چەقەچەناو: چەنەباز.
چەقەخانە: جێگایەکی تایبەتییە بۆ کۆبوونەوە و قسە تێداکردنی.
چەقەسوو: چەقاوەسوو.
چەقەڵ: دەعبایەکی کێوییە لە سەگ دەچێ. بریتییە لە گیانداری لەڕ. پێچکەی شت: ئەو کورسییە چوار (چەقەڵ)ە واتە چوار پێچکەیە.
چەقەن: زەویی ڕەقەن.
چەقەنە: دارێکە سەرێکی دەخرێتە ناو (کەوچکە)ی ئاش و سەرەکەی تری دەخرێتە سەر دیوار و دارێک بەناوەڕاستیدا شۆڕدەبێتەوە بۆ سەر بەرداش، بەسووڕانەوەی بەرداش

چەقەنەکە دەجووڵێتەوە و دان دێتە خوارەوە. پل تەقاندن بەپەنجەی دەست. درەختێکە بەرێک دەگرێ وەک بەری مۆرد (ز). چەقەوانە.

چەقەوانە: چوار شتە لە زەرد یا لە شتێکی تر دروست دەکرێ شەکەرۆکە دەیکا بەسەری چوار پەنجەی دەستیەوە لەکاتی سەماکردندا چەقەنەی پێ لێ دەدا.

چەقیان: د. چەقین.

چەقێن: زەویی ڕەقەن. یاریی میچێن.

چەقین: ڕۆچوونی شتێکی ڕەق لە شتێکی نەرمدا.

چەقیو: شتێکە کە ڕۆچووبێ بە شتێکی نەرمدا.

چەک: هەر شتێکە لە ئاسن دروست بکرێ و جەنگی پێ بکرێ. زێڕ و زیوێکە ژنان بۆ جوانی دەیدەن لە خۆیان. نۆاڵەیەک لە ئاوریشمی ڕەشی خاو. پێڵاوی کۆنی سۆل کە دەکرێ بەسەرپێوە. چەکەی هەلاج. باریکە پینەیەکە بدرێ لە لایەکی پێلاو بۆ ڕاستکردنەوەی. چەرمی پاژنەی کلاش. پارچە کاغەزێکی نووسراوی چاپکراوی تایبەتییە بەپارە دەگۆڕدرێتەوە لە بانک. دار و بەرد (د). مەردوومی ڕووت و قووت (د). حوکمی حاکم.

چەکاندن: زۆر مژینی مەمک لەلایەن ساواوە.

چەکانن: چەکاندن.

چەکبەردە چەکبەردە: بەگیرهێنان و بگرە و بەردە: سالار و نەریمان ئەمڕۆ (چەکبەردە چەکبەردە): یەکیان بوو ئەوسەری نەبێ.

چەکبەند: ز. کالآیەکی قۆڵ کورتە دەدرێ بەسەر شاندا و قۆڵی پێدا ناکرێ.

چەکدراو: کەسێکە کە حاکم حوکمی دابێ.

چەکمە: پێلاوێکی چەرمی لاسک درێژە لە قوڕ و چڵپاودا لە پێ دەکرێ.

چەکمەبوون: بریتییە لە زۆر سووتانی شوێنێک لە ئەندام و داماڵینی پێستەکەی: نەریمان قاچی وا سووتاوە (چەکمە بووە).

چەکوپووش: د. شڕەی ناوماڵ.

چەکوچ: چەکوش.

چەکوچڕدان: مژینی مەمک بەجۆرێ کە هیچی تێدا نەمێنێ.

چەکوش: ئاسنێکی لووتداری مۆدارە کلکێکی دارینی تێ دەخرێ بزماری پێ دادەکوترێ.

چەکوشکاری: کارکردن بەچەکوش.

چەکە: دارێکی خڕی لووسی دەسک دارە هەلاجی پێ دەکرێ. مەردوومی ڕووتە (د).

چەکە چەک: تەکەتەک.

چەکەرداسی: مەردوومی زەبەللاحی شەپ و شۆڕ.

چەکەرە: شینایییەکە تازە سەری دەرهێنابێ. شتێکی سپییە لە باسوق و هەنجیر و هێندی شتی تری شیرین پەیدا دەبێ بەهۆی مانەوەیانەوە.

چەکەرەشکێن: د. کێڵانی زەوی و هەڵگێڕانەوەی بۆ ئەوەی بەهێزببێ.

چەکەرەکردن: سەوزبوونی شینایی و سەر دەرهێنانی. پەیدابوونی شتێکی سپیی وەک شەکر لە باسوق و هەنجیر بەهۆی مانەوەیانەوە. بریتییە لە دووڵبوون.

چەکەرەهێنان: چەکەرەکردن.

چەکەوڕ: بۆچرووک.

چەل: نۆرەدانەوەی یاری بەو کەسەی کە دۆڕاندبێتی. هەل: بەسەر ئەم (چەل)ەتەوە مەڕۆ. چەل و مل.

چەلاخ: ئەسپی بزێو.

چەلاک: ز. چەلاک.

چەلاک: دارێکی درێژە گوێز و مازووی پێ دەتەکێنرێ.

چەلاکە: با. قەلانگ.

چەلاکە: چەلاک.

چەلاو: گۆشتاو. ئاوی سەروپێ.

چەلتک: ز. جەواڵی پچووک.

چەڵتک: چەڵتووک.

چەڵتووک: برنجێکە کە هێشتا لە پووشدا بێ و کرە نەکرابێ.

چەڵتووک تێ فڕێدان: بریتییە لە قسەی خراپکردن لە کاری ئەم و ئەودا.

چەڵتووک جاڕ: د. مەرەزە جاڕ.

چەڵتە: سازندەییکردن. (چەڵتە چەڵت) چەڵتەی یەک لەدوای یەک. چوغڵی (د).

چەڵماس: ل. چڵێسی نەوسن.

چەڵماسک: ل. چەڵماس.

چەل و چۆمبوونەوە: پەلاماردان.

چەل و مل: کەسێکە کە بووبێ بەبار بەسەر شانتەوە.

چەلووز: ز. سواڵکەری نووزەدرێژ.

چەلە: گوریس (ل). نۆرەکایە لە یاریدا: ئەم جارە (چەلە)ی منە.

چەلەپایی: جۆرە هەڵپەرکێیەکە.

چەلەک: با. ڕەهوان.

چەلەکوڕە: هـ. باڵندەیەکی ڕاوکەری گۆشتخۆرە لە واشە پچووکترە.

چەڵەم: چاکڵ. تەپەی جۆلایی.

چەڵەمە: ئێسقانێکی باریکی دووپەلە لەبەر سنگی باڵندەدا. چاکڵ. کەشاکەش و سەغڵەتی: یاخوا کەس تووشی (چەڵەمە) نەبێت.

چەڵەمەشکانێ: د. چەڵەمەشکێنە.
چەڵەمـەشکێنە: گـرەوێکە دەکـرێ بۆ تاقـیکردنەوەی یاد و بیـر بەشکاندنی (چەڵەمە)ی باڵندەیەک.
چەلەنگ: لەنجە و لار. جوان (ز).
چەڵەوان: ل. یاریی چاڵێن.
چەلی: ھ. گیای دەرزیلە.
چەلیپا: شتی ڕاست و چەپ. ڕاست و چەپێکی تایبەتییە بەلای گاورانەوە مووفەڕکە.
چەلی: ز. وتەیەکە مانگای پێ لێ دەخوڕدرێ.
چەم: ئاوێکی گەورەیە کە لە چەند ئاوێکی تر پەیدا بووبێ. چاو (ھ). شتێکە کە چەوتابێتەوە (د).
چەم ئاخوڕە: تەیمان.
چەماندن: چەماندنەوە.
چەماندنەوە: چەماننەوە.
چەمانن: چەماندن.
چەماننەوە: چەوتاندنەوەی شت.
چەمانەوە: چەمینەوە.
چەماو: چەمیلە ترۆزی. ئاوی چەم.
چەماوە: شتێکە کە چەوتابێتەوە.
چەمبل: ز. قوڵفەی دەفر و شتی تر.
چەمبۆڵە: چەمۆڵە.
چەمبەر: چەمەر.
چەمپال: ز. سەربار.
چەمپل: ز. پەلی گیاندار لە پەنجەیەوە تا بن باخەڵی.
چەمتاوە: چەماوە.
چەمچک: کەوچک.
چەمچـور: ز. جۆرە مێشـێکی گەورەیە گـاز لە لقی ناسکی مـێو دەگرێ و وشکی دەکا.
چەمچە: کەوچک.
چەمچیر: ز. ترێ ڕەشکە. مێلووی منداڵ.
چەمسووتەکە: چەنسووتەکە.
چەمک: د. چمک. مەعنا و مەبەستی شت.
چەموچو خمۆ: د. چەم و چوغورد.
چوم و چوغورد: چەم و دۆڵێکە کە زۆر زەبەند و چڕ بێ.
چەم و خەم: د. ناز و نووز.
چەمـۆڵە: ڕاسـتکردنەوەی دەست بەبلاوکـردنەوەی پەنجـەکـانی بەرامبەر بەڕووی یەکێک بۆ تەریقکردنەوەی.
چەمۆڵەگرتن: چەمۆڵەنان لە یەکێک.
چەمۆڵەلێنان: نانی چەمۆڵە لە یەکێک.
چەمۆڵەنان: چەمۆڵەگرتن.
چەمووش: گیانداری سرکی چەتوون.
چەمە: چاوگەیەک لە خانوو یا لە کەپر. سەرچاوە (ھ). کـەمەی بێژنگ و شتی تر (د).
چەمەر: شیوەن و گریان بۆ مردوو بە کۆمەڵی. چەمەرە.
چەمـەرانە: دەھۆڵ و زوڕنایەکە لە شـیوەن و چەمـەردا لێ بدرێ. شـیوەنێکی دوو دەسـتەییە دەسـتەیەک پیـاو و دەسـتەیەک ژن بەپێوە وەک ئەڵقەی چەمەرە دەوەستن بۆ شیوەنکردن.
چەمەرچۆپی: ھەڵپەڕین بەکۆمەڵ بەدەم گریان و شیوەنەوە.
چەمەرە: دارێکە کە بەتەڕی چەمێنرابێتەوە بەڕەنگێک کە ھەردوو سەری گـەیشـتبـێـتەوە یەک. ھەمـوو شـتـێک کە وەک ئەڵقـە وابێ.
چەمەری: د. دەھۆڵێکە کە بۆ شیوەن لێ دەدرێ.
چەمەسیاوڵە: ھ. قەیتەران.
چەمەن: د. چیمەن.
چەمەنتۆ: د. چیمەنتۆ.
چەمیاگ: چەوتاوە.
چەمیانەوە: چەمینەوە.
چەمیحانی: ز. شوێنێکە درەختی تووی زۆر تێدابێ.
چەمیش: ل. کەوش.
چەمیلە: بەڕوولە ترۆزیی ناسک کە لە بەرئاودا کرابێ.
چەمین: چەمینەوە.
چەمینەوە: نوشتانەوەی شت بەکەوانەیی.
چەن: چەند. دەرزی (ھ). چەناگە (ز).
چەناخ: د. چەناگە.
چەناکە: چەناگە.
چەناگە: جەمسەری ھەروود شەویلە لە خوار لێوەوە.
چەناگەدان: بریتییە لە زۆر قسەکردن.
چەناگە درێژ: بریتییە لە چەنەباز.
چەناگە کوتان: چەناگە کوتێ.
چەناگە کوتێ: بریتییە لە گیاندان.
چەنتک: با. توێشەبەرە.
چەنچووز: ز. ڕژدی چرووک.
چەند: وتـەی پرسـیـار لە ژمـارە یا ئەندازەی شت: پارەت (چەند) پێیە؟ یا ئەو ئاوە (چەند) قـووڵە؟. وتەیەکە زۆرێتی شتێک پێشان دەدا: (چەند)م پێ وتیت واتە زۆرم پێ وتیت.
چەندان: وتەیەکـە ھەمـیـشـە لە نەفـیـدا بۆ گـەیاندنی شـتـێک بەکاردێنرێ کە زۆر نەبێ: فیسار کەس پارەیەکی (چەندان)ی نییە، واتە زۆری نییە.
چەند و چوون: گیرەگیری زۆر لە سەودادا.
چەند و چونی: چەندوچوون.

چەندە: چەند.
چەندەوەر: چەوەندەر.
چەندێتی: ئەندازەی شت لە رووی ژمارە یا زۆر و کەمییەوە (کمیە).
چەنسووتەکە: چێشتێکە لە ترخێنەی وشک و ساوەر یا برنج دروست دەکرێ.
چەنک: ز. چنگی ئادەمیزاد. باڵی باڵدار.
چەنگ: چەند. ناوە بۆ پارچەیەکی مۆسیقا.
چەنگاڵ: ز. چنگاڵ.
چەنگان: چەندان.
چەنگە: چەندە.
چەنگەک: د. قولاپ.
چەنە: چەناگە.
چەنەباز: زۆربڵێ. فێڵباز (با).
چەنەبازی: زۆر قسەکردن.
چەنەبەچەنەوێستان: بەرامبەری کردنی یەکێک بۆ یەکێکی تر بەقسە لە رووداکردنەوەی.
چەنەچەن: چەنەدان.
چەنەدان: چەنابازی.
چەنەوەر: چەوەنەر. چەنەباز.
چەنەوەری: چەنەبازی.
چەنی: دەرزی (هـ). لەگەڵ (هـ). چۆنی؟ (هـ). بۆچی (د).
چەو: وردە بەرد و زیخ و لم.
چەوا: با. چۆن؟
چەواشە: گیانداری سەرلێشێواو.
چەوت: شتی لار و خوار.
چەوتاندنەوە: چەماندنەوەی شت.
چەوتانەوە: خواربوونەوەی شت.
چەوتاوە: شتێکە کە خوار بووبێتەوە.
چەوتە: با. رێگای قەدپاڵ.
چەوتەک: شەقەمێو.
چەوتەکەل: گای چوار ساڵانە.
چەوتە و چیلەگرتنەوە: وردبوونەوە لە شت بەرەنگێک کە جوانی و ناشیرینی ئەو شتە دەرکەوێ.
چەوتی: خواری و گێڕیی شت.
چەودار: چەودەر. جامبازی رەشەوڵاخ.
چەودان: گیایەکی قەف قەفە وەک گەنم بەڵام ئەم دەنکی لەڕە.
چەودەر: شتێکە وەک جۆ بەڵام ئەم گیاکەی بەرزتر و دەنکی لەڕترە.
چەور: شتێکە کە رۆناوی بێ. (چەوربوون) رۆناویبوونی شت. (چەورکردن) رۆناویکردنی شت.
چەورێژ: رێگایەکە کە چەوی زۆری تێدا راخرابێ.
چەورسان: چەورستان.
چەورستان: چەوری: (چەورستان)م لە ماڵدا نییە.
چەورستانی: چەورستان.
چەورکە: جۆرە گیایەکە.
چەور و چلیک: د. شتی چڵکن و چەور.
چەورۆکە: گیایەکی بەهارییە گەڵاکانی بەسەر زەویدا پان دەبێتەوە. نێرکێکی دڕکاویی هەیە بەپاککراوی دەخورێ. گیایەکی گەڵا وردە گوڵێک دەگرێ تۆوێکی وردی تێدایە. دەسرۆکەی پچووک.
چەورە: دەسەسڕ. مەردوومی بێ شەرمی هار و هاجی بەرەڵا.
چەورەسان: تۆزێک چەوری کە بکرێتە سەرهەسان. کەڵەشاخ یا قوتوویەکی پچووکە دارتاش چەوریی تێ دەکا بۆ تیغ پێ تیژکردنەوە.
چەوری: دووگ و رۆن یا پیوی ناو سک.
چەوریدان: چەورەسانی دارتاش.
چەوسان: رەتان و ماندووبوونی مەردووم و گیاندار. (چەوساندن) رەتان و ماندووکردنی گیاندار.
چەوسانەوە: چەوسان.
چەولگ: شوێنێکە کە زیخ و چەوی زۆربێ.
چەولۆک: سەرکۆزەری دانەوێڵە.
چەوە: ل. چاو.
چەوەڵ: پاشاخوڕی وڵاخ.
چەوەندەر: گیایەکی گەڵاپانی پاییزییە بنکێکی گەورەی پانی شیرینی هەیە.
چەوەندەر بەترش: چێشتێکە لە چەوەندر و برنج و ئاوی ترش دروست دەکرێ.
چەوەنەر: چەوەندەر.
چەوێڵ: شتی چەوتی لار.
چەهرە: ز. چارە.
چێ: لێرە (هـ). گیاندارێکە کە چەش بووبێ بەشتێک. شتی چاک (با).
چیا: کێو. سارد (هـ).
چیاگ: ئاوێکە کە زۆر سارد بووبێ: ئاوەکە (چیاگ) ە.
چێبوون: چەشبوونی گیاندار. چاکبوون (با).
چیچکان: لەسەر هەردوو پێ دانیشتن بەجۆرێک کە قنگ لە زەوی نەکەوێ.
چیچکە: نەرماییی گوێچکە.
چیچکەکردن: دانیشتنێکی کەم بە چیچکانەوە.
چیچڵە: چیچکە.

چیچڵەمەچان: د. جۆرە یارییەکە منداڵان بەچیچکانەوە قونە دەکەن و بۆ یەکتری دەچن.

چێخ: چیغ.

چێر: ژێری هەموو شتێک (هـ). دۆست و برادەر (د). شێر (د).

چێرت: ز. ڕیقنە.

چێر چێر: ز. جیرەجیری قەڵەم.

چێڕ: د. تێڕ.

چێرۆک: چیرۆک.

چێرگ: باڵندەیەکی گەورەی قاچ و مل درێژە لە قەلەموون دەچێ و گۆشتی دەخورێ.

چێرۆک: ز. چیرۆک.

چێر و مێر: د. دۆست و برادەر.

چێرە: لەوەڕ (ز). دەموچاو (د). قەرەبوو (د).

چێژیلە: چۆلەکە.

چێشت: خواردەمەنییەکە بەئاگر کوڵابێ.

چێشتانە: شتێکە لە ڕووی وەڵیفەتەوە دەدرێ بەپیشەگەر لە پاش ئەوەی کە کارێکت بۆ تەواو بکا.

چێشتخان: چێشتخانە.

چێشتخانە: جێگایەکە هەر چێشتی تێدا لێ بنرێ.

چێشتکەر: کەسێکە پیشەی هەر چێشت لێنان بێ.

چێشتن: چەشتن.

چێشتە: گیانداری چەش.

چێشتە خۆشە: د. بریتییە لە تفاقی چێشت.

چێشتەقولێ: کۆکردنەوەی چەند جۆرە خواردەمەنییەکە لەلایەن چەند منداڵێکەوە و دابەشکردنیەتی لەناو خۆیاندا.

چێشتەکولێن: د. چێشتە خۆشە.

چێشتەنگاو: کاتی هەتاو گەرمبوون لە پێش نیوەڕۆدا.

چێشتەنوێژ: نوێژێکە کە لە چێشتەنگاواندا دەکرێ.

چێشکەکردن: چەشکەکردن.

چێکردن: چەشکردنی گیاندار. چاکردن (با).

چێکلە: د. چوکڵە.

چێکنە: ل. چنینی شت بەوردی.

چێکە: هـ. لێرە.

چێل: ز. تاوێرەبەرد.

چێڵ: مانگا. چەوت.

چێڵک: د. داری سووتەنی.

چێڵکڕ: د. باڵندەی کڕ.

چیلکە: داری باریکی سووتاندن.

چیلکەچنێ: کۆکردنەوەی چیلکە بۆ چاوگی ئاگر.

چێلەک: ز. مانگا.

چینچک: شتێکی کەم.

چینچکە: چیچکە.

چینچینگ: نوقورچ.

چێنراو: تۆوێکە کرابێ بەزەوییەوە.

چینکۆ: جۆرە تەنەکەیەکی ئەستوورە. جۆرە چیتێکە.

چێو: برەدار.

چێوبەس: چێوبەست.

چێوبەست: داربەست. کەپر.

چێوتاش: د. دارتاش.

چێوجەڵە: دارێکی خوارە بستێک دەبێ دەکرێ بەقوڵفەی گوریسێکدا کە ڕەشەوڵاخی پێ بەسترابێتەوە. بەڕوولەی دەوار. پێنج پارچە داری تایبەتییە دەخرێتە ناوەندی پەنجەی دەستی تاواندارەوە بۆ ئازاردانی.

چێودەس: د. چێودەست.

چێودەست: د. داردەست.

چێوشەقە: د. دارشەق.

چێوکاری: د. دارکاری.

چێوکوت: د. سیخناخ. دارکاری..

چێوەتەقێ: د. گۆچان کوتانی کوێر بۆ ڕێگا دۆزینەوە.

چێوەزمە: چلوورەی گوێسوانە.

چی: وتەیەکە پرسیاری پێ لە شت دەکرێ: (چی) دەکەیت؟. نیشانەی (فاعل)ە واتە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بەفاعل: پینە(چی)، تەنەکە(چی)، شەکر(چی). شت: (چی)م پێ نییە (د). وتەیەکە لە جێی وتەی (هێ) بەکاردێنرێ (چی) یەکەم لەبیرچوو واتە هینەکە.

چیاو: شتی سارد.

چیت: جۆرە پارچەیەکی ڕەنگاوڕەنگە ژنان دەیکەن بەکاڵا. قامیشبەندێکە کە لە زستاندا بەگردی ڕەشماڵدا دەکرێ (ز).

چیتک: ز. لوولەی قامیش و ئاسن.

چیتۆکە: چیتی خراپی کەم نرخ.

چیجک: با. چیچک.

چیچرک: ز. سیسرک.

چیچک: چۆلەکە (با). مەمک. جووجەڵەی مریشک (ز).

چیچە: هـ. گۆی مەمک.

چیچی: مەمک (هـ). چیچکان (د). وتەیەکە بەمنداڵی ساوا دەوترێ بۆ ئەوەی دانیشێ: (چیچی) واتە دانیشە.

چیچیلە: نەرمایی گوێ.

چیخ: چیغ.

چیخکردن: خشانی گوللە بەسەر شوێنێک لە جەستەدا و ڕووشاندنی. بریتییە لە وێستانی مەردووم بەگردی شتێکدا بەزۆری و سغی: بۆچی وا (چیختان کردووە) لە دەورم؟

چیر: با. نووزدرێژ.
چیرچیرۆک: چیرۆکی پچووک.
چیر: د. ریچ.
چیراندن: د. زیقەی کەو.
چیرە: د. جۆرە دەنگێکە لە کەوەوە دێ.
چیرەوەبوون: د. ریچبوونەوە.
چیرەوەکردن: د. ریچکردنەوە.
چیرک: ز. لەتکەی سێو و هەڵووژە و هەرمێ.
چیرۆک: سەرگوزەشتە و داستان.
چیرۆکە: چیرۆک.
چیرین: ز. لەوەڕاندنی ئاژاڵ.
چیز: ز. خەرەنگەزە.
چیغ: شتێکە لە قامیشی باریک دروست دەکرێ و بەبەن دەچنرێ.
چیغکردن: چیخکردن.
چیق: ز. قاچی گیاندار.
چیقاڵ: ز. گیانداری لاواز.
چیقڵدانە: چیکڵدانە.
چیک: ز. تانەی سەرچاو.
چیکڵدانە: توورەکەیەکە لەبەر سنگی باڵندەدا خواردنی تێ دەچێ.
چیکەنە: شتێکە لە دار دروست دەکرێ لۆکەی تێ دەخرێ و پەموانەکەی پێ جوێ دەکرێتەوە.
چیل: ماکەو. پووشی کورتان (ز). ڕەشی بازوو (د). فێڵ (ز).
چیڵ: هـ. ماکەو.
چیلان: ز. سۆرانیی باریکی درێژ.
چیلک: ز. بەلۆکە.
چیلە: تەپان. شوێنێکە کە بەرز بێ و گژوگیای زۆر بێ. شوورە (ز).
چیلەچەپ: ز. زەلامەڕێ لە شاخ و کێودا.
چیم: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. ڕەنگ و قورێکە کە هەڵکەنرابێ بۆ ناشتنی لە شوێنێکی تر (ز). مێرگ (د).
چیمن: ل. ڕۆیشتن.
چیمەن: زەمینێکی سەوزە کە فریز داپیۆشیبێ.
چیمەنتۆ: جۆرە لمێکی شینکارە لەگەڵ لمی تردا تێکەڵ دەکرێ و دەگیرێتەوە و، لە قسڵ بەهێزترە.
چین: ریزێک لە شتێک.
چیناوی: جۆرە پارچەیەکی ئاوریشمیی جوانی ڕەنگاوڕەنگە ژنان دەیکەن بەکالا.
چین چین: شتی خاڵدار. چین لەسەر چین.
چینک: ز. ئەگریجە.
چینە: ملومووشی باڵندە لە زەویدا. پشتی مەردووم لە باو و باپیرەوە.
چینی: جۆرە دەفرێکی گڵینی زۆر لووس و پووس و تەنکە وەک شووشە وایە. دانە مریشک (ز).
چییە: چی. پۆپەی شت (د). تەوێڵ (د). نیشانەی شت (د).
چێیی: سارد.
چێییگ: سارد.



حا) وتەی پیاهەڵشاخان: (حا) لە کاتێکدا کە یەکێک شەش حەوت جار بانگت بکا لە سەریەک، واتە چیت کرد؟ سەرت لێ سەندم.

حاپولک: ڕێدان بەدوورخستنەوەی هەڵماتێک- کە لە تیلکردندا لە بەرهەڵستێک کەوتبێ و وێستاندبێتی- لە هەڵماتی یاریکەرەکانی تر بۆ ئەمەی کە نەیکوژن.

حاپوول: حاپولک.

حاتۆر: ز. دارێکە کە گەچی پێ بکوترێ.

حاجەت: قاپ و قاجاخی ناوماڵ. شتومەکێکە کە پیشەگەر پیشەکەی پێ دەکا وەک تەشوێ بۆ دارتاش.

حاجی: کەسێکە کە حەجی کردبێ.

حاجی بادام: خواردەمەنییەکی شیرینی ناسکە لە زەردێنەی هێلکە و نیشاستە دروست دەکرێ.

حاجی بایەف: جۆرە چەقالەیەکی دەنک وردە.

حاجی بایف: حاجی بایەف.

حاجی بایڤ: با. چەقالە.

حاجی بەیان: بەری گیایەکە لەناو دەغڵدا دەڕوێ.

حاجی ڕەش: ز. پەڕەسێلکە.

حاجی ڕەنگ: با. حاجی ڕەش.

حاجی لەقلەق: مەلێکی گەورەی ڕەش و سپیی دەنووک و قاچ و مل درێژە.

حاجیلە: گوڵێکی بەهاریی لاسک بەرزە وەک نێرگس وایە بەڵام ئەم چاوە زەردەکەی بەرزە. بەری گیایەکە لەناو دەغڵدا دەڕۆی و تاڵە.

حاچە: ئەمسەر و ئەوسەری درێژاییی ڕەشماڵ یا خانوو: لە (حاچە)ی ڕەشماڵەکەوە وەستابووم، واتە لە سەری درێژاییەوە. پەل و لقی شت: ئەم دارە دوو (حاچە) واتە دوو لقە (د).

حاحا: وتەیەکە ڕەشەوڵاخی پێ لێ دەخوڕرێ.

حاش: ز. شتی بێ کەڵک.

حان: کەسێکە کە دنیای دیبێ و بەتەجرەبە بێ: فیسار کەس زۆر (حان)ە واتە خاوەن بەراوردە. عاست: لەم (حان)ەوە تەماشاکە واتە لەم عاستەوە.

حانەحەپەشێ: دەمەوەری و چەنە بەچەنە وەستانی یەکێک بۆ یەکێک.

حرچ: ل. ورچ.

حرحر: ز. لاساییی دەنگی ئەسپ.

حسکە: جۆرە تفەنگێکە بەدەست دروست بکرێ.

حشک: ز. وشک.

حل: د. حێل.

حلکردن: پەسندکردن و بەیاخکردن بەشتێک: ئەگەر تۆ گزی بکەیت لەم کایەدا من (حلی ناکەم).

حلحایی: گۆرانییەکە منداڵان بەدەم جۆرە یارییەکەوە دەیڵێن.

حلەلاوی: جۆرە مقامێکی مۆسیقییە.

حلێب: شتێکە کە پەسند کرابێ و وەرگیرابێ: ئەم کارە (حلێبە یا حلێب) نییە.

حلێرک: با. لووی ناو گۆشت.

حلێو: حلێب.

حنگل: ل. سنجووق.

حنگل حنگل: ل. سنجووقێن.

حوبێ: هـ. بزمژە.

حوزەیران: مانگی شەشەم لە ساڵی ڕۆژیی لە ناوەندی مایس و تەمووزدا و، سی ڕۆژە.

حوژە: گیایەکی کوێستانیی بنکدارە بنکەکەی دەبێ بەئەسپۆن.

حوشتر: گیاندارێکی چوارپێی تووکنی پێ پانی قاچ و مل درێژی بەهێزی بارەبەرە.

حوشتر ئالووک: حوشترخوار.

حوشترانەقولقولێ: جۆرە یارییەکی منداڵانەیە لە کاتی کردنیدا ئەم وتارەی بەدەمەوە دەڵێن.

حوشترخوار: جۆرە گیایەکی گەرمیانیی دڕکاوییە حوشتر دەیخوا.
حوشترگەروو: چەند گونجێکە سەر بەرەوژوور لەسەریەک دادەنرێن لە گـونج کـاریدا بۆ بەرزبوونەوەی ئاو لەو ئەندازەیەی کـە ڕاکێشراوە.
حوشترمرغ: باڵندەیەکی گەرمیانیی گەورەی مل درێژە لە حوشتر دەچێ.
حوشترەوان: کەسێکە کە حوشتر لێ بخوڕێ و بیلەوەڕێنێ.
حوققە: د. فێڵ و کەڵەکە.
حوققەباز: د. فێڵباز.
حوققەبازی: فێڵبازی.
حۆقـە: سـەنگێکە شـتی پێ دەکـێشـرێ و، قـورسی و سـووکیی بەپێی شوێن دەگۆڕێ.
حۆل: گیانداری گێژ و وێژ. مەردوومی زل و زەبەللاح (د). خێل (د).
حۆلبوون: گێژ و وێژبوون.
حولحولی: مەردوومی ڕاڕا.
حوللەسێ: وتەیەکە لە کاتێکدا بەکاردێنرێ کە یەکێک قسـەیەک یا کردەوەیەکی ناشیرین بکا و لەلایەن یەکێکەوە پێی وترابێ بەنەکـردنی کـەچی ئەم هەر بچـێـتـەوە سـەری و بیکا، لەو حەلەدا پێی دەوترێ: واچووەوە سەر (حوللەسێ) کەی خۆی.
حولووک: با. هەڵووژە.
حولویسک: با. شیلاوگ.
حولوویی: با. لووس.
حولە: پشقلی حوشتر.
حولەسێ: حوللەسێ.
حۆلی بیابان: دێوێکە وەکو دەڵێن گوایا خۆی لە چۆڵدا لە ڕێبوار دەگۆڕێ و سواری دەبێ.
حولیچەک: با. هەڵووژە.
حولی: با. شتی لووس.
حولیک: با. حولیچەک.
حونجی: د. حینجە.
حوننەر: حونەر.
حوننەری: کردنی شتی هونەر.
حونەر: هونەر.
حونەری: کردنی شتی هونەر.
حووحانە: گۆرانییەکی کچانەیە دەیڵێن لە کاتێکدا کە بەرامبەری یەک هەڵدەقونن بەچیچکانەوە.
حوود: گڵێنەی لێوشکاو.
حویل: ل. سوور.
حۆیلانێ: جۆرە گۆرانییەکی جافەکییە.

حەبحەب: ز. وتەیەکە پاڵەوانان و ئازایان لە جەنگدا دەیڵێن بۆ دەرخستنی هێز و تواناییبان.
حەبیشاندن: ز. زۆرخواردن بەپەلە.
حەبی: ز. لۆکەی نەکراوە.
حەپلەری: با. ناوە بۆ جۆرە هەنارێک.
حەپۆل: مەردوومی گێژ و وێژی قەپۆلە.
حەپۆل مێشخۆر: کەسێکە کە زۆر گێژ و وێژ بێ لەبەر گێژی مێش لە خۆی دەرنەکا.
حەپۆلە: حەپۆل.
حەپوو: هەموو.
حەپە: وەڕینی سـەگ بەهێـواشی. حەپە حـەپ: حـەپەی یەک لە دوای یەک.
حەپەسان: سەرسامبوون.
حەپەساندن: سەرسامکردن.
حەپەساو: گیاندارێکە سەرسام بووبێ.
حەپەنگ: د. مەردوومی حەپۆلە.
حەتار: ز. کەسێکە کە گەچ بکوتێ.
حەتحەتۆکە: چەند تووڕەکەیەکی پچکۆلەیە دەرمانی بۆنخۆشی تێ دەکرێ و دەکرێتە ملی منداڵ بۆ ئەوەی کە بەبۆن نەکەوێ.
حەترەک: ز. لێدان بەنهێم.
حەتۆتە: حەتحەتۆکە.
حەج: چەند کردەوەیەکی تایبەتی ئاینییە لە شاری (مەکە) و لە مانگی قورباندا بەجێ دەهێنرێ.
حەجامەت: خوێنگرتن لەناو شان بەکەڵە شاخ.
حەجـامـەتگا: د. ئەو شـوێنەیە لە جەسـتـە کـە حەجـامـەتی لێ دەگیرێ.
حەجامەتگر: کەسێکە کە حەجامەتت لێ دەگرێ.
حەجامەتگرتن: گرتنی خوێن بەکەڵەشاخ.
حەجکردن: دواترین مووشێکە کـە لە یاریی مـووشـێندا دەخورێ. چوون بۆ حەج.
حەچ: دارێکی سەرخوارە لە یاریی حەچاندا لە گۆی یارییەکەی پێ دەدرێ.
حەچان: یارییەکی دوو دەستەییە بەگۆ و بە(حەچ) دەکرێ.
حەچاندن: هێنانەوەڕینی سەگ و هێنانە چەڵتە چەڵتی یەکێک.
حەچچە: وتەیەکە کەری پێ لێ دەخوڕێ.
حەچولوور: چەند حەچە و لوورەیەکە کە یەک بگرن.
حەچە: حـەچچە. وەڕینی سەگ بە خێرایی لە کـاتی تووڕەبوون و نزیکبـوونەوەی دوژمن لێی. (حـەچەحـەچ) حـەچەی یەک لەدوای یەک. چەڵتە. سابرێن (د).
حەچەل: د. گێچەڵ.

حەچیکە: ز. وتەیەکە لە شوێن وتەی (ئەگەر) بەکاردێنرێ.
حەدەف: ز. تەپۆڵکە.
حەراج: ز. هەڕاج.
حەرام: شتێکە کە خوا قەدەغەی کردبێ لێت لە کردنی یا وتنی یا خواردنی یا گوێ بۆ گرتنی.
حەرامخۆر: کەسێکە ماڵی ئەم و ئەو بەناڕەوا بخوا.
حەرامزادە: زۆڵ. جاڕوو.
حەرامزادەیی: زۆڵی و قوماربازی.
حەریلێن: ز. گرێخواردنی گوریس.
حەرسیلە: با. بەردێکی گۆشەدارە لەسەر سیلەی دیوار دادەنرێ لە کاتی دروستکردنیدا لەلایەن وەستاوە.
حەرماندن: ز. پیسکردن.
حەری: ز. قوڕ.
حەریر: ز. حەلوایەکە لە دۆشاو و ئارد دروست دەکرێ بەپارچەکراوی وشک دەکرێتەوە و هەڵدەگیرێ بۆ زستان. ناوە بۆ دێیەک لە ناوچەی دزەیی.
حەریف: هاولف.
حەز: ئارەزوو: (حەز)م لە پیاوی درۆزن نییە. (حەزکردن) ئارەزووکردن. (حەزلێکردن): ئارەزووکردن و ویستنی شتێک.
حەزیا: ئەژدەها.
حەزایرانی: ز. جۆرە هەرەمێیەکە لە مانگی حوزەیراندا پێ دەگا.
حەژ: با. حەز.
حەژدە: هـ. هەژدە.
حەژدەهی: کاتێکە کە مەردووم تێیدا کۆ دەبنەوە بۆ دیدەنی یەکتری.
حەژمەت: خەفەت.
حەژێکرن: ز. حەزلێکردن.
حەس: وتەیەکە لە کاتی سەرسوڕماندا بەکاردێنرێ.
حەسار: دیواری حەوش.
حەساندنەوە: بەسەربردنی ماندوویەتیی یەکێک.
حەسانن: د. حەساندنەوە.
حەسانەوە: بەسەرچوونی ماندوویەتی.
حەساو: حەساوە.
حەساوە: گیاندارێکە ماندوویەتیی نەمابێ.
حەسپن: د. دڵداری شێت و شەیدا.
حەسحەس: کەسێکە بەشەو ئێشکی ئاوایی بگرێ.
حەسس: حەس.
حەسیان: حەسانەوە.
حەسیانەوە: حەسانەوە.
حەسیر: ژێرەخەرێکە لە پووش دەچنرێ و دادەخرێ.
حەسیرباف: د. کەسێکە کە حەسیر دروست دەکا.
حەسیرمەیدان: ڕاخستنی یەکێک بەسەر زەویدا لەسەر دەم و لەبەرچاوی مەردووم دارکاری کردنیەتی.
حەش: ورچ.
حەشار: گەهەک.
حەشاردان: شاردنەوەی شتێک.
حەشاردراو: ز. شتێکە کە شاردرابێتەوە.
حەشت: ز. هەشت.
حەشتێ: ز. هەشتا.
حەشەرەڵا: د. هەراهەرا.
حەشەری: ئافرەتێکە کە ئارەزووی پیاوی زۆربێ.
حەشەنوورە: د. گیایەکە لەکاتی بێ تووتنیدا لە جیاتی تووتن دەکێشرێ.
حەشیفاندن: ز. نووسین.
حەفت: د. حەوت.
حەفتا: ناوە بۆ ژمارەیەک کە حەوت جار دەیە.
حەفتاد: د. حەفتا.
حەفتار: ز. کەمتیار.
حەفتانە: مووچەیەکە حەفتە و حەفتە بدرێ.
حەفتامین: حەفتاهەم.
حەفتاو: د. گلاودەرکردنی شتێک کە گلاو بووبێ بەحەوت ئاو.
حەفتاهەم: شتێکە لە پایەی حەفتادا بێ.
حەفتاهەمین: حەفتاهەم.
حەفتجۆش: د. حەوجۆش.
حەفت ڕەنگ: ز. غەزەلی حەوت ڕەنگ.
حەفت ڕەنگیلە: د. باڵندەیەکی پچووکی ڕەنگاوڕەنگە بەقەد چۆلەکەیەک دەبێ.
حەفت ڕنگە: چێشتێکە لەگەڵێ سەوزی دروست دەکرێ.
حەفتە: ناوە بۆ حەوت ڕۆژ کە لە یەکێک لە ڕۆژەکانەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتەوە ڕۆژێکی تر وەک خۆی، واتە لە هەینییەوە بۆ هەینی یا لە شەممەوە بۆ شەممە... هەتاد.
حەفتەکۆک: جۆرە سەعاتێکە حەفتە و حەفتە کۆک دەکرێ.
حەفتەکێش: چاککردنی ماین و ماکەرە لە یەکەم حەفتەی زانیاندا.
حەفتەوانان: د. حەوتەوانە.
حەفتێ: ز. حەفتا.
حەفتی: ز. حەفتە.
حەفجۆش: د. حەوجۆش.
حەفک: با. ئەستۆ.
حەفی: د. ئەژدەها.
حەفیان: حەفی. زۆرخۆر.

حەڤدە: ناوە بۆ ژمارەیەک کە حەوت و دەیە.
حەڤدەم: حەڤدەمین.
حەڤدەمین: شتێکە لە پایەی حەڤدەدا بێ.
حەڤدەهەم: حەڤدەهەمین.
حەڤدەهەمین: حەڤدەمین.
حەقحەقکەرە: تاقتاقکەرە.
حەقلێمەمان: د. حەقلی مەقۆ.
حەقلی مەقۆ: د. یاریی کاڵەمستێ.
حەقەپەڵە: ناوەڕاستی پایزە کە دەبێ بارانی پەڵەی تێدا بیارێ.
حەقەوەسێن: شتێکە کە تۆڵەی کەموکوڕی شتێکی پێش خۆی بکاتەوە.
حەل: کات.
حەلان: با. تاوێری بەرد.
حەلانە: دەفرێکی پووشینی چنراوە خورمای تێدا دادەگیرێ.
حەڵقەبەگۆش: بریتییە لە بەندە.
حەڵقەدان: دانیشتنی چەند کەسێک بەگردی. پێچخواردنی مار.
حەلکی: شتی بایەخ پێ کراو: ئەم کارە (حەلکی)یە واتە بایەخی پێ دەکرێ.
حەللەق مەللەق: حەلەق مەلەق.
حەللەلا: وتەیەکە لە کاتێکدا بەکاردێنرێ کە یەکێک قسەیەکت بۆ بکا و تۆش بەلاتەوە وانەبێ و زۆر دووربێ.
حەڵوا: خواردەمەنییەکە لە ئارد و ڕۆن و شەکر یا دۆشاو دروست دەکرێ.
حەڵواچی: کەسێکە کە حەلوا بۆ فرۆشتن دروست بکا.
حەڵوایی: شتێکە کە ڕەنگی وەک ڕەنگی حەڵوا سووربێ.
حەلووکە: هەڵووژە.
حەڵەبی: تەنەکە.
حەلەق مەلەق: قسەی هیچ و پووچی بی سەر و پێ. وتەیەکە لە یاریی کاڵەمستێدا دەوترێ.
حەلەل: وتەیەکە بۆ تێبەردانی سەگ لە گیاندارێکدا بەکاردێنرێ.
حەلێو: حلێب.
حەلیووچەک: با. هەڵووژە.
حەلیم: کەشکەکی شل.
حەلیماو: ئاوی پلاو. ڕنگاوی چێشتی شل.
حەماڵ: نیرگە. کۆڵکێش.
حەمام: شوێنێکی تایبەتی گەرمکراوە کە مەردووم خۆی تێدا بشوا.
حەمامچی: خاوەن و سەرپەرشتیکەری حەمام کە دراو وەرگرێ.
حەمامکردن: بریتییە لە خۆ شوشتن لە حەمامدا.
حەمامۆکە: حەمامۆکێ.
حەمامۆکێ: شتێکە منداڵان لە خۆڵ دروستی دەکەن وەک گومەزی حەمام و ئاوی لێ دەپرژێنن و دەیپەستنەوە و لە پاشا بەچیلکە هەڵۆڵی دەکەن وەک گومەز.
حەمایەڵ: چەرمێکە کیفێکی پێوەیە نوشتەی تێ دەخرێ و ڕاست و چەپ لە مل دەکرێ.
حەمایەلکردن: کردنە ملی حەمایەڵ و شیر و شتی تر ڕاست و چەپ.
حەمتز: ز. کەری پچکۆلەی بەکار.
حەمحەم: چنگنە.
حەمزک: ز. جۆرە خواردەمەنییەکە.
حەمکە: هەموو.
حەمل: ز. ڕابواردن بەقسەی خۆش و گفتوگۆی شیرین.
حەموو: هەموو.
حەمەدەشێن: تەرەقی.
حەمەرەمزێ: د. بەربەرەکانێ.
حەمیسەن: ز. جۆرە بزنێکە.
حەمی: ز. هەموو.
حەن: شوێن و عاشت.
حەنا: حەن.
حەندەرحۆ: یارییەکی منداڵانەیە دارێکی درێژی ئەستوور لەسەر قۆقزاییەک دادەنێن دوو منداڵ هەریەکە سواری سەرێکی دەبن و هەرجار یەکێک خۆی قورس دەکا و ئەویتریان بەرزدەبێتەوە.
حەندەف: ز. تەپۆڵکە.
حەندەگۆ: ز. ناوی جۆرە گیایەکە.
حەنەپەشێ: حانەحەپەشێ.
حەنەک: ز. گاڵتە و گەپ.
حەو: وتەی سەرسووڕمان: (حەو) ئەمە کاربوو تۆ کردت؟ وتەیەکە شوان لەپێش ڕانەوە دەیڵێ بۆ ئەوەی کە دوای کەوێ.
حەوا: لای ژوورووی سەر.
حەوادان: فڕێدانی شت بەرەوژوور.
حەواق: بەرزی: بەو (حەواق)ەوە دای مەنێ واتە بەو بەرزییەوە.
حەوان: ز. حەوانەوە.
حەوانچە: د. شتێکە بەحەوادا فڕێ درابێ.
حەوانچەدان: د. فڕێدانی شت بەحەوادا.
حەواندنەوە: حەساندنەوە.
حەوانن: د. قەدرگرتن و بەمرۆڤ ژماردنی یەکێک.
حەوانەوە: حەسانەوە.
حەواویلکە: حەوانچە.
حەواویلکەیی: هاویشتنی شت بەحەوادا.

حەواوی: کەسێکە هەمیشە سەرەوژوور بڕوانێ.
حەوایی: حەواوی.
حەوبرا: حەوتەوانە.
حەوت: ناوە بۆ ژمارەیەک لە ناوەندی شەش و هەشتدا.
حەوتا: حەفتا.
حەوتبەند: حەوت غەزەلە کە لەلایەن شاعیرێکەوە لە باسێکدا وترابێ و هەر غەزەلەی جۆرە قافیەیەکی هەبێ.
حەوت خشتەکی: چەند شیعرێکە هەر بەندێکی حەوت نیوە شیعرە.
حەوتگۆشە: شتێکە حەوت سووچی ببێ.
حەوتم: ڕەشەوڵاخ یا مەڕ یا بزنێکە کە بەخێر بۆ منداڵ سەرببڕێ.
حەوتە: حەوت ڕۆژە بەسەر بووکدا دەڕوا دوای گواستنەوەی یا بەسەر زەیستاندا دەڕوا دوای منداڵبوونی. حەپەی سەگ. (حەوت حەوت) حەپە چەپ.
حەوتەحەمام: چوونە حەمامی بووکی تازە و زەیستانە لە ڕۆژی حەوتەیاندا.
حەوتەکێش: حەفتەکێش.
حەوتەم: شتێکە لە پایەی حەوتدابێ.
حەوتەمین: حەوتەم.
حەوتەوانە: حەوت ئەستێرەی گەشە چواریان بەرامبەر و سیانیان بەر و دوا لە نزیک قوتبی شیمالییەوە.
حەوتهەم: حەوتەم.
حەوتهەمین: حەوتەمین.
حەوتیر: جۆرە دەمانچەیەکە حەوت فیشەک دەخوا.
حەوجۆش: شتێکە وەک ئاسن بەڵام ئەم تورتە.
حەوحەو: دەنگی سوار لەکاتی تاودان و هەڵمەتبردندا.
حەودەڵ: ز. پەڵوولە.
حەوز: قووڵکەیەکی تایبەتییە ئاوی دێتە ناو.
حەوزانە: پارەیەکە کە میراو ساڵە و ساڵ لە خاوەن حەوزی دەسێنێ لە مزی ئاوەکەدا.
حەوش: ماوەیەکە لە بەردەمی خانوو یا لە چواردەوریدا کە دیواری بەدەوردا کرابێ.
حەوشە: حەوش.
حەوشێ: حەوش.
حەوق: ز. پلەی پەیژە.
حەوێق: حەواق.
حەوینج: شتێکی بۆنخۆشە وەک ڕازیانە دەکرێتە ناو نانەوە.
حەوینەوە: حەوانەوە.
حەی: حەو.
حەیاز: با. چقەی باڵندە.
حەیتە: مەردوومی زرتەبۆزی سەرسەری.
حەیچە: د. داد و فوغان. (حەیچە حەیچ) حەیچەی یەک لە دوای یەک.
حەیران: جۆرە گۆرانییەکی کوردییە. باڵاگەردان: ئەز (حەیران)ە تەمە، واتە من باڵاگەردانی تۆم.
حەیرانۆکێ: گۆرانیی حەیران.
حەیرانە: حەیرانۆکێ.
حەیزە: ترخە. بەئاوکەوتن (د). سکچوون (د).
حەیزەران: جۆرەدارێکی نەرمی قەفقەفە وەک قامیش بەڵام ئەم پتەوە.
حەیشۆ: حەیا و شەرم: (حەیشۆ)ی لێ هەڵگیراوە، واتە حەیا و شەرمی نەماوە.
حەیشە: د. حەیچە. (حەیشە حەیش) حەیشەی یەک لە دوای یەک.
حەیف: وتەی داخ و خەفەت: (حەیف) بۆ کەسێک کەماڵی خۆی بدا لە بەرد.
حەیفێ: حەیف.
حەینە: وتەیەکە لە جیاتی وتەی (وس) بەکاردێنرێ.
حەیوە: ل. بەهێ.
حێ: پیتێکە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. وتەیەکە وڵاخی پێ لێ دەخودرێ.
حیجران: ز. بەڵا و مسیبەت.
حێچ: ز. گیانداری یاخی.
حێز: هێز.
حیشتر: حێشتر.
حێشتر: حوشتر.
حیشی: ز. گوریسی پانی ئەستوور.
حێل: بەرێکی خڕە وەک دەنکی پرتەقاڵ چەند دانەیەکی ڕەشی بۆنخۆشی تێدایە، لە وڵاتی زۆر گەرمدا دەبێ.
حیلکە: دەنگی پێکەنین. (حیلکەحیلک) حیلکەی یەک لە دوای یەک. (حیلک و هوڕ): حیلکەحیلکی زۆر.
حێلم: بەنێکە لە قاڵی هەڵدەپێچرێ وگرێ دەدرێ و دەقرتێنرێ لە کاتی تەنینیدا.
حینجە: خوێندنەوەی شت لەگەڵ خوێندنەوەی سەر و بۆر و ژێریدا.
حێولانە: حێولانێ.
حێولانێ: جۆرە یارییەکە کچان دەستی یەکتر دەگرن و بەگردی هەڵدەپەڕن و ئەم وتەیە دەڵێن.
حیت: ز. جۆرە بزنێکە.
حیز: گاندەر. پیاوی مێباز (با). مەردوومی گەمژی هیچ لێ نەهاتوو.
حیزانە: کردەوەیەکە هەر لە حیز بوەشێتەوە.

حیزبگیر: کەسێکە کە بەنامەردی و لە ناکاو بگیرێ.
حیزەڵ: ئادەمیزادی هیچ لە باردانەبوو.
حیزەڵە: حیزەڵ.
حیزێتی: بوونی مەردووم بەحیز.
حیزی حیزانگاو: بریتییە لە کەسێک کە لەبەردەستی حیزیشدا زەبوون بێ.
حیزی: حیزێتی.
حیش: ز. زەوییەکە خاکەکەی سوور یا شین بێ.
حیلە: دەنگی ئەسپ و ماین و جوانوو. (حیلە حیل): حیلەی یەک لە دوای یەک.
حیلەباز: فێڵباز.
حیلەبازی: فێڵبازی.
حیناوە: ل. چەناگە.
حینە: د. حیلەی ولاخ.
حیوەکێ: جۆرە یارییەکی کچانەیە.

# خ

خا: خاتوون: (خا) پیرۆز. هێلکە (ل).
خاپاندن: ز. هەڵفریواندن. خلافاندن.
خاپۆرە: خۆڵەپەتانی کردنی منداڵ.
خاپوور: شوێنی وێران. (خاپووربوون) وێرانبوون. (خاپوورکردن) وێرانکردن.
خاپەرۆک: پاشەرۆک و وردەی شتێکە کە مابێتەوە.
خات: خاتوون.
خاتر: خۆشەویستی و گەورەییی یەکێک لەلای یەکێک: فیسار کەس (خاتر)ی هەیە لە لام.
خاترانە: زیادەیەکە دەدرێ بەکڕیارێکی خۆشەویست لەکاتی شت پێ فرۆشتنیدا.
خاترجەم: دڵنیا.
خاترخۆیی: کردنی کارێک بۆ یەکێک لەبەر خاتری. بوونی یەکێک بەموختار و سەرپشک لە کردنی کارێکدا.
خاترگرتن: خاترخۆیی.
خاترلێکردن: تکاکردن لە یەکێک.
خاتر و خۆتر: کردنی ئیش بەخاترانە.
خاتو: خاتوون: (خاتوو) نازدار هات.
خاتوو: د. خاتوون.
خاتوون: خانم.
خاتە: خاتوون.
خاچ: دوو شتی ڕاست و چەپە لە زێڕ یا لە زیو یا لە شتێکی تر نیشانەی گاورییە.
خاچرگان: ز. سێپای ئاسن.
خاد: خاتوون.
خار: د. لم و قوم. ئەشکەوت (د).
خارا: د. غارا.
خاران: خارین.
خاراندن: پوختەکردنی گۆزە و دیزە و چەرم.
خاراو: شتی پوختەی دەرهاتوو وەک گۆزە و دیزە و کووپەیەک کە زۆر شتی شلی تێ کرابێ. چەرمێکە لەناو ئاودا زۆر مابێتەوە.
خارچک: ل. قارچک.
خارخار: شتی لەت لەت و بریندار.
خارسک: ز. ژنەگاور.
خارش: خارشت.
خارشت: ئاڵۆش.
خارووف: ز. گڵێنەی دەم پەل.
خارووک: ز. پێڵاوێکە لە گیایەکی ڕێسراو دروست کرابێ.
خاریز: ز. پەڵووڵە.
خارین: پوختەبوونی گۆزە و دیزە و چەرم.
خاریو: خاراو.
خاز: کاردوو. کێڕێکە کە لەسەر زەوی بکێشرێ (ز).
خازگینی: ز. خوازبێنی.
خاس: شتی باش. (خاسبوون) چاکبوون. (خاسکردن) چاککردنی شتێک.
خاسبوونەوە: چاکبوونەوە لە نەخۆشی.
خاسەڕەنگ: جۆرە گڵێکی سوورە بۆ دەرمان بەکار دەهێنرێ.
خاسەکی: د. خاسەیی.
خاسەیی: د. تایبەتی.
خاسی: باشی.
خاش: هـ. قاش.
خاشاڵ: د. خۆڵ و خاشی ناو ماڵ.
خاشخاش: تۆوی خەرتەلە. گیایەکە گوڵێک دەگرێ وەک گوڵە باخ تلیاکی لێ دروست دەکرێ. جۆرە پاوانەیەکی ژنانەیە.
خاشە: چڕنووکێکە کە بریندارت بکا: (خاشە)ی لێ هێنا. خاشاڵ (د).
خاشیل: ز. چێشتێکە لە بروێش کە ڕۆنی بکرێ بەسەردا.

خافۆ: قەراغ و کەناری شت.
خاڤ: ز. خاو.
خاڤر: ز. گیایە کە ڕەگی بۆ مایەسیری باشە.
خاڤک: ز. کاڵای دڕاوی ڕزیو. کەلەکە.
خاک: گڵ.
خاکبازی: د. یاریکردن بەخاک.
خاک بەتوورەکە بێـژان: بریتـیـیـە لە وێرانکردنی شـتـێـک یا شوێنێک.
خاکبێژ: لەوحێکی کون کونە خاکی پێ دەبێژرێتەوە.
خاکڕن: د. ماڵەدانی زەوی دوای کێڵانی.
خاکڕێز: دەرگایەکە لە دیوی ژوورەوە خڕ داخرابێ.
خاکڕێ: ل. خۆڵەمێش.
خاکسار: بریتییە لە مەردوومی هەژاری بێ نەوا.
خاکساری: هەژاری و بێ نەوایی.
خاکنشین: د. خاکسار.
خاکـوپا: پەنا و داڵدە: چووە (خـاکـوپای) واتە خـۆی فـڕێ دایە لای.
خاکەچەرمگە: د. گڵەسپییەکە کە تەڕاوی ناو ماڵی پێ دەدرێ.
خاکەسار: خاکسار.
خاکەساری: خاکساری.
خاکشیـر: گـیـایەکی بەهاریی باڵابەرزە بەرێکی هەیە وەک تۆوی تووتن لەگەڵ شیری کچاندا دەدرێ بەمنداڵ بۆ فێنکی.
خاکە: وردەی برنج. جۆرە مێشوولەیەکی زۆر وردە.
خاکەڕۆ: کۆکردنەوەی بن خەرمان لە پاش هەڵگرتنی.
خاکەڕۆک: خاکەڕۆ.
خاکەلێو: مانگی مارتە کە سی و یەک ڕۆژە.
خاکەلێوە: دوایـیی زسـتـان و سەرەتای بەهار کە لەوەڕ تازە سەر دەردێنێ و ئاژاڵ لە دەم بۆ بردنیـدا لێوی خۆڵاوی دەبێ. خاکە لێو.
خاکـەناز: ئاسنێکی دەم پانی کلک دارینی درێژە قـوڕەکـاری پێ دەکرێ.
خاکی: جۆرە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی خاک. بریتییە لە مەردوومی بێ فـیـز و دەمار کـە ئارەزووی پۆشـینـی کاڵای جـوانی نەبێ. جۆرە تەنراوێکی تایبەتی خاک ڕەنگە.
خاڵ: برای دایک. پڵێکی ڕەشی سروشـتـییـە بەئەندامی هێندێ گـیـاندارەوە. پڵێکی شینی دەسـتکردە بۆ جوانی لە ئەندامی ئادەمیزاد دەکوترێ. پەڵەی ڕەش بەهەمـوو شـتـێکەوە: بەفـری کـوێسـتـان (خـاڵ)ی تێ کـەوت واتە جێ جێ ڕەش بووەوە، (خاڵخاڵ) شتێکە خاڵی زۆری تێدابێ. نیشـانەیەکە وەکو: (.) لە شوێنێکدا دادەنرێ کە باسێک ببڕێتەوە.
خـاڵانە: وتەیەکـە دەوترێ بەیەکـێـک لە حـەلێکدا کـە کـارێک یا قسـەیەک بکا و، ئەو کار و قسەیە یەکێکی تر کردبێتی و تۆ پـێـت نـاخـۆش بـووبـێ: دەبێــژرێ بە یەکــێـک کـــە بـڵـێ مـن ناخوێنم– (خاڵانە)ی فیسار کەستە کە ئەویش وادەڵێ، واتە تۆش وەکو ئەو وایتە کە هەردووکتان خراپ دەکەن.
خاڵی بریتی: نیشـانەیەکە وەکو: (...) لە بریتی چەند وشـەیەک دادەنرێ کە لەبەر ئاشکرایی یا شتێکی تر نەنووسرێن.
خاڵبەندی: دانانی چەند خاڵ و نیشـانەیەکە لە میـانەی نووسراودا دادەنرێ بۆ جیاکردنەوەی ڕستەیەک لە ڕستەیەک یا وشـەیەک لە وشەیەک.
خاڵخاڵۆک: ز. گیاندارێکە وەک ئەسپێ بەڵام ئەم پچووکترە.
خاڵخاڵۆکە: دەعـبـایەکی باڵداری پچـووکی ڕەش و سـوورە بەقـەد مێشێـک دەبێ.
خاڵدار: شتێکە کە خاڵی زۆری پێوەبێ.
خاڵکوت: د. کەسێکە کە خاڵ بۆ ئەم و ئەو بکوتێ.
خاڵکوتان: خاڵکوتاندن.
خاڵکوتاندن: خاڵ پەیداکردن بەنووکی دەرزی لەسەر جەستە.
خاڵکوتانن: خاڵکوتاندن.
خاڵۆ: برای دایک.
خاڵوان: بەرەی خاڵ.
خاڵۆزا: منداڵی خاڵ.
خاڵۆزازا: منداڵی منداڵی خاڵ.
خاڵۆزە: خەڵووزە.
خاڵۆژن: ژنی خاڵ.
خاڵومیل: نەقشی بەر سنگ و سەرباڵی کەو.
خـاڵومـیـل ڕشتن: خـاڵکوتانی ژنانە لەسـەر ڕوومـەت و چەناگـە و گەردنیـان. بریتـییە لە خۆ جوانکردنی ژن. دەرکـەوتنی خاڵ و میلی کەو لەکاتی گەورەبوونیدا.
خاڵوو: ل. خاڵۆ.
خاڵەڕەشە: گـیایەکە گەڵای وەک کەرەوز وایە لاسکێکی باریکی ڕەشی هەیە.
خالیگە: بۆشاییی کەلەکە.
خام: تەنراوێکی سپییە لە جاو سفتترە. شتی ناپوخت. فیـسـار کەس (خامە). خاوێکە کە کرژ نەبێ.
خاماجی: د. خامباجی.
خامباجی: د. پووری خوشکی دایک.
خامۆش: گیانداری بێدەنگ. (خامۆشبوون): بێدەنگبوون.
خامـۆشکردن: کـوژاندنەوەی ئاگـر و چرا. بریتـیـیـە لە کـوشـتنی یەکێک.
خامۆشی: بێ دەنگی.

خامووغ: ز. یەکەم ئاودانی زەویی داچێنراو.
خامە: قەڵەمی نووسین.
خامەک: جۆرە تەنراوێکی ئاوریشمی یەک ڕەنگی تەنکە.
خامەکی: شتێکە کە ڕەنگی وەک ڕەنگی خامەک وابێ.
خامینە: هـ. کاڵە.
خان: وتەیەکە بەهێندێ کەس دەوترێ لە ڕووی گەورەیییەوە: ڕۆستەم (خان)، گوڵچین (خان). چەند دوکانێکی زۆرە لە حەوشەیەکدا بازرگان تێیدا دادەنیشن بۆ کڕین و فرۆتن. خانوویەکی گەورەی هۆدە هۆدەیە کەر و وڵاخی تێ دەکرێ.
خانچی: کەسێکە سەرپەرشتی خان بکا.
خانخانکێ: د. پاشا پاشایانەی منداڵان.
خاندووق: ز. بنکی گیایەکە دەخورێ.
خانک: پنە (با). زەمیلە (ز). خانوو.
خانگ: خانوو.
خانم: وتەیەکە لە ڕووی گەورەیییەوە بۆ ژنان بەکاردێنرێ.
خاننک: با. پنە.
خانوچکە: خانووی پچکۆلە.
خانومان: ئافرەتی شۆخی جوان. خانەدان.
خانوو: جێگای حەوانەوەی مەردووم کە لە دار و بەرد و قوڕ دروست دەکرێ.
خانوبەرە: خانووی گەورە.
خانە: خانوو (ل). بۆشاییی هێندێ شت: هەزار پیشەکە (خانەخانە)یە.
خانەبگیر: گرتنی یەکێک و بەیدەستکردنی لە خانووی خۆیدا.
خانەبێزار: کەسێکە لە ماڵی خۆی وەڕس بێ.
خانەخراپ: ماڵوێران.
خانەخوێ: خاوەن خانوویەکە کە تۆ مێوانی بیت.
خانەخوێگ: خانەخوێ.
خانەدان: کەسێکە لە بنەماڵەیەکی گەورەی دیاربێ.
خانەدانی: بوونی مەردووم بەخانەدان.
خانەزا: گیاندارێکە لە دەرماڵی خۆتدا زابێ.
خانەزاد: خانەزا.
خانەزاو: خانەزا.
خانەشاری: دەست بەسەر.
خانەقا: شوێن و بارەگایەکە کە نەقشبەندی خەتم و خواپەرستیی تێدا بکەن.
خانەکولانە: وتەیەکە بەمریشک دەوترێ بۆ ئەوەی کەپچێتە کولانەکەیەوە.
خانەکی: د. گیانداری ماڵی.
خانەگا: خانەقا.
خانەگومان: بریتییە لە مەردوومی دڵپیس و بەدگومان.
خانەنشین: د. کەسێکە لە ماڵ دەرنەچێ.
خانەوادە: خانەدان.
خانەوخان: بازددان لە بانێکەوە بۆ بانێکی تر.
خانەی زین: ئەو شوێنەیە لە زین کە سوار لە سەری دادەنیشێ.
خانی: با. خانووی گڵین.
خاو: شتێکە کە کرژنەبێ. چەرمی خۆش نەکراو. خەو. گیانداری سست. (خاوەخاو): سستەسست. تووکی چۆغە و قاڵی. گیایەکی گەڵا تووکنی گوڵ زەردی بۆنخۆشە دەکرێ بەمەشکەیەکەوە کە بۆگەن بووبێ.
خاوان: خاوەن. خەڵەفان بەکارێکەوە: فیسار کەس بەنووسینەوە (خاواوە).
خاواندن: خەڵەفاندنی یەکێک بەکارێکەوە: منداڵەکە (بخاوێنە).
خاوانن: خاواندن.
خاوانە: بەنێکە کە بۆ پۆی بەڕە و شتی تر دانرابێ.
خاوبوونەوە: سستبوونی جەستە. نەمانی کرژیی شت. بریتییە لە ساردبوونەوەی یەکێک لە کارێک.
خاوپەڕ: بەنێکە نە زۆر خاو و نە زۆر کرژبێ.
خاوزان: د. کەسێکە مەبەستی خەو باش لێک بداتەوە.
خاوکردنەوە: نەهێشتنی کرژیی شت. شلکردنەوەی شتی توند: ماستەکە یا قوورەکە (خاوکەرەوە). بریتییە لە ساردکردنەوەی یەکێک لە شتێک.
خاوکەر: جۆرە مقامێکی خاوی خۆشی کوردییە لە مقامی ئەڵڵاوەیسی خاوترە.
خاولی: جۆرە تەنراوێکی نەرم و شلی تووکنی پەمووییە مەردووم خۆی پێ وشک دەکاتەوە.
خاونامە: د. خەونامە.
خاو و خلیچک: مەردوومی سستی شل و شێواو.
خاووخێزان: خێزانی ماڵ بەورد و درشتییەوە.
خاوە: سەرانەیەکە بەناڕەوا لە مەردووم بسێنرێ.
خاوەن: خێوی شت.
خاوەند: خاوەن. کەسێکە کە زەویوزار و خانووبەرەی زۆر بێ (ملاک).
خاوەندار: خاوەنی شت.
خاوەنداری: خاوەندی و چاودێریی شت.
خاوێن: شتی پاک.
خاوێنی: پاک و تەمیزی.
خاویر: گیانداری گێل و وێل. خەواڵوو (د).
خایاندن: پێچوونی کارێک بۆ چەند دەمێک: چوون و هاتنەوەم بۆ بازاڕ نیو سەعاتی (خایاند). هەڵخەڵەتاندن.

خایانن: خایاندن.
خایە: ل. هێلکە.
خایە و مایە: بریتییە لەسەر و ماڵ: فیسار کەس (خایە و مایەی) تێدا چوو واتە سەر و ماڵی.
خپ: گیاندارێکە لەبەر نووستن یا بێهۆشی بێدەنگ بووبێ: منداڵەکە (خپ)ە یا (خپ) خەوی لێ کەوت. (خپبوون) بێدەنگبوونی گیاندار بەهۆی نووستن یا بێهوشییەوە.
خپکردن: بریتییە لە کوشتن: دارێکم کێشا بەمارەکەدا (خپم) کرد.
خپلاک: ز. کورسی و دەرگای ڕزیوی کۆن.
خپەکردن: خۆ ماتدان.
خپ هەلاتن: خپبوون.
خت: وتەیەکە پشیلەی پێ دەردەکرێ.
ختە: خت.
ختک: پشیلە.
ختکە: خوتووکە.
ختکێ: د. خوتووکە. پشیلە.
ختکێنە: د. ختووکە.
ختووکە: جۆرە تەزوویەکە لە کەوتنی شتێک لە جەستەتدا پەیدا دەبێ.
ختووکەدان: دەستدان لە کەلەکە و بەری پێی مەردووم بۆ ئەوەی کە تەزوو بێ بەلەشیدا.
ختە: ختتە.
ختەختەدان: ختووکەدان. بریتییە لە هانەهانی مەردووم.
ختەدان: ختووکەدان.
ختێ: د. پشیلە. ختووکە.
ختیلکە: ختووکە.
خجڵ: ز. خەریک.
خدووک: ز. ختووکە.
خراپ: شتی بێ فەڕی بێ کەڵک. (خراپبوون): لە کەڵک کەوتنی شت. (خراپکردن) لە کەڵک خستنی شت.
خراپە: کردار و گوفتاری ناپەسند. ناوی دێیەکە لە ناوچەی عەربەت.
خراپەکردن: کردنی شتی خراپی ناپەسند.
خراپەکەر: کەسێکە هەر کرداری خراپ بکا.
خراپی: بێ فەڕی و بەدی.
خرار: ز. خەرار.
خرارک: با. خرار.
خرامان: ئافرەتی شەنگ و شۆخ. بژاردنی شتێک لەلایەن یەکێکەوە کە ئەو شتەی لەناو بردبێ.
خراو: خراپ.
خراوە: کەلاوە. خراپە.
خراوی: خراپی.
خرپ: زەمینی چەولگ. وتەیەکە بۆ کەسێک بەکاردێنرێ کە کوتوپڕ خەوی لێ بکەوێ: فیسار کەس هەر کە سەر بنێتە سەر سەرین (خرپ) خەوی لێ دەکەوێ.
خرپن: خەپەتۆڵە.
خرپنۆکە: خرپن. خرپنە: خرپن.
خرپە: پرخەی خەو. دەنگی پێ لە دوور (د). گەلەکۆمەکێ (ز).
خرت: گیسکە نێرێکە پێی نابێتە ساڵی دووەم. شتی گردی خڕ. ساڵ: ئەم بەرانە سێ (خرت)ە یا چوار (خرت)ە، واتە سێ ساڵە یا چوار ساڵە.
خرتک: گرتکە گۆشت. نەخۆشییەکە تووشی منداڵ دەبێ (ز). خڕک: (خرتک)ێک بگرە ئەو سەگە.
خرتکە: جومگەی ئەندام.
خرت و پرت: دوودڵی لە کارێکدا.
خرتۆڵ: کۆبوونەوە و کۆمەڵبوونی مەردووم (ز). شتی گردی خرتی پچکۆلە (د).
خرت و مرت: د. مەردوومی شل و مل.
خرتە: جۆرە دەنگێکی پچووکە وەک دەنگی خواردنی مشک. (خرتەخرت) خرتەی یەک لە دوای یەک. (خرت و هوڕ) خرتەخرتی زۆر.
خرتەخرتە: د. کڕکڕاگە.
خرتەک: د. خرتکە. پێچکەی عەرەبانە و شتی تر.
خرتەگل: د. گلۆربوونەوەی شت.
خرتەڵە: خڕیلە.
خرتیلانە: گیانداری خرتەڵە.
خرتیلە: خرتیلانە.
خرچ: د. کاڵەکی زرک.
خرچە: جۆرە کاڵەکێکی شیرینی نەگەییوە. جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی لەتکردنی شووتیی نازاو. (خرچەخرچ) خرچەی یەک لە دوای یەک. (خرچ و هوڕ) خرچەخرچی زۆر.
خڕ: شتی گرد. جێ لافاوێکە کە خڕەبەردی زۆر بێ. وتەیەکە بۆ داخستنی کلۆمی دەرگا بەئێجگاری بەکاردێنرێ: دەرگاکە (خڕ) داخە واتە شمشێرەکەی تەواو ڕەت کە.
خڕبوون: گردبوون و تۆپەڵبوونی شوێنێک لە ئەندام لە نەخۆشییەکەوە.
خڕخاڵ: بازن. خاشخاشی پێ.
خڕخاڵە: چەند دارێکە وەک بازن دەکرێتە ئەمسەر و ئەوسەری بێشکە بۆ ئەمەی خڕەی بێ و منداڵ پێی ژیر بێ.

خڕخاڵەدار: بێشکەیەکە خڕخاڵەی ببێ.
خڕخڕە: د. بەکرە. پێچکەی عەرەبانە و ئۆتۆمۆبیل. خڕخاڵ.
خڕک: خڕەبەردە.
خڕکردن: تۆپەڵکردنی شتێک و خڕ هەڵدانی. خڕکردنەوە.
خڕکردنەوە: کۆکردنەوەی شت.
خـڕکـە: نیـوە نانێکی ئەسـتـوورە کـە لەسـەر تەنوور دەکـرێ بۆ خواردن. خڕەبەرد.
خڕکەلە: شتی خڕی پچکۆلە.
خڕکەڵە: خڕکەلە.
خڕناکە: بێچوە کەروێشک.
خـڕنووک: جـۆرێکە لە بەری مـازوودار، لە مـازوو پچـووکـتـرە. گـیایەکی دەشتـییـە بەرێکی درێژکـۆلەی تفت دەگرێ. ناوی دێیەکە لە ناوچەی پێنجوین.
خڕ و خەپان: ئافرەتی قەڵەوی خڕ و نەرم و شل.
خـڕە: دەنگێکە وەک دەنگی گـوێز و کـاڵای شـۆدار و ڕووخـانی دیوار. (خـڕەخـڕ) خـڕەی یەک لەدوای یەک. (خـڕ و هوڕ) خڕەخڕی زۆر.
خڕەڵە: خڕیلە.
خڕهەڵدان: خڕکردن و تۆپەڵکردن.
خڕید: کڕینی شت بۆ فرۆتنەوەی بەقازانج.
خڕیدار: کڕیار.
خـڕیدنامـە: د. نووسـراوێکە دەیدەیت بەو کـەسـەی کـە شـتـی لێ بکڕدرێ بۆ ئەوەی کە ئاگای لە خڕید و فرۆختەکەی خۆی بێ.
خڕیلانە: گیانداری خڕی کولەبنە.
خڕیلە: خڕیلانە.
خرس: ورچ. گیانداری تەمەڵی لەش گران.
خرستیان: گاور.
خرسـەک: کاڵای ئەسـتـووری قـورس. قـاڵیـی ئەسـتـوور. کـولێرەی ئەستوور.
خرماندن: کرماندنی شت.
خرمووتک: د. کورکورۆژە.
خرمووچک: د. خرمووتک.
خرمووشەک: ز. چڕنووک.
خرمە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی خواردنی ترۆزی. (خرمەخرم): خرمەی یەک لەدوای یەک. (خرم و هووڕ): خرمەخرمی زۆر. دەنگی پێی کۆمەڵەسوار.
خرندال: ز. جۆرە گیایەکە دەخورێ.
خرندوول: ز. فرۆ.
خرنگ: ز. ژنی جوان.
خـرنگە: جـۆرە دەنگێکە وەک دەنگی پـاوانە. (خـرنگە خـرنـگ) خرنگەی یەک لەدوای یەک. (خرنگ وهوڕ) خرنگە خرنگی زۆر.
خرۆش: خورۆش.
خرۆشان: خورۆشان.
خرۆشاندن: خورۆشاندن.
خرۆشاو: خورۆشاو.
خرۆشیان: د. خورۆشیان.
خرووسەک: خورووزەک.
خروێلکە: ئاوڵە.
خروێنکە: خروێلکە.
خرەفان: گەوجبوون لەبەر پیری.
خرەفاو: کەسێکە لەبەر پیری گەوج بووبێ.
خرەفیاگ: د. خرەفاو.
خرەفیان: د. خرەفان.
خرەفیو: خرەفاو.
خرێ: ددانی سەر و خواری هەردوو لاشەویلە.
خریپ: خرێ.
خرێشکە: ڕەشەبا.
خریکاندن: ز. ڕاکێشانی شت بەسەر زەویدا.
خریکین: ز. پێ هەڵخلیسکان.
خرێنە: بەنێکی سێ چوار لۆی بادراوە دوو تای باری پێ دەدروێ و لێک دەدرێ. خرێ.
خرین: بەڵغەم.
خز: شوێنی لووس کە گیانداری لێ هەڵخلیسکێ. شتی لووس.
خزان: هەڵخلیسکان.
خزاندن: خلیسکاندن.
خزانن: خزاندن.
خزبردنەوە: بەگازی پشتداکەوتن لەبەر قاقای پێکەنین.
خزخزۆک: ز. تەرزەلووکە.
خزگە: شوێنێکە گیانداری لێ هەڵخزێ.
خزلک: ز. هێشووی پچووکی ترێ.
خزم: کەسوکاری مەردووم.
خزمایەتی: نزیکی و کەسایەتی یەکێک لەگەڵ کەسێکدا.
خزمدۆست: کەسێکە نرخی خزمایەتی و دۆستایەتی بزانێ.
خزمەت: کارکردن بۆ یەکێک و قازانج پێ گەیاندنی.
خزمەتچی: کەسێکە هەر خزمەت بکا.
خزمەتکار: خزمەتچی.
خزمەتکاری: بوونی مەردووم بەخزمەتکار.
خزمەتکردن: کردنی خزمەت بۆ یەکێک.
خزمەتگوزار: کەسێکە خزمەت باش بکات.
خزن: د. قسن.
خزیان: د. خزان. هاتن بەهێواشی و بەبێ هەستی.

خزیلک: شوینی خز.
خزین: خزان.
خستن: بەزەویدادانی شت. بریتییە لە زەبوونکردن و شکاندنی یەکێک: فیسار کەسیان (خست) واتە شکاندیان. فڕێدان.
خستنەکار: هێنانەکاری هێندێ شت: سەعاتەکەم (خستەکار).
خستنەگەڕ: خستنەکار.
خستنەوە: زاین و خستنە دنیای چەند منداڵێک: فیسار کەس منداڵی زۆری خستەوە.
خسکە: پیازی فیسقە.
خشان: بەسەر زەویدا کشان.
خشاندن: کێشکردنی شتێک بەسەرزەویدا.
خشانن: خشاندن.
خشپە: خشەیەکی پچکۆلەیە کە لە شتێکەوە پەیدابێ کە نەبینرێ: گوێم لە (خشپە)یەک بوو، (خشپەخشپ) خشپەی یەک لەدوای یەک. (خشپ و هوڕ): خشپە خشپی زۆر.
خشپیلانە: گیانداری نەشمیلانەی ئێسک سووک.
خشپیلە: خشپیلانە.
خشت: شتی ڕێک و تەخت. قوڕێکە بەقالب بڕابێ بۆ دیوار پێ دروستکردن. شتی گرد: سینییە (خشت)ەکە بێنە.
خشتبڕ: کەسێکە بەقوڕ و قالب خشت دروست بکا.
خشتبڕین: دروستکردنی خشت بەقالب.
خشتبوون: ڕێکبوون: دەغڵەکە. (خشت بووە): واتە هەموو گوڵەکانی ڕێک وەستاوە.
خشتکردن: قرتاندنی شت بەڕێکی.
خشتە: نیوە شیعر.
خشتەنداز: کەسێکە خشت هەڵدا بۆ وەستای سەر دیوار.
خشتەک: پارچەیەکی پچکۆلەیە دەکەوێتە بن دەستی کەواوە.
خشتیلە: شتی خشتی (پچکۆلانە).
خشر: ز. خشڵ.
خشرووک: ز. خەرکانە.
خشک: هەزارپێ.
خشکۆک: با. ژن و کچ و منداڵی جوان.
خشکە: د. خشک. دەنگێکە لە خشانی شتێکەوە پەیدا دەبێ.
خشکەیی: ڕۆیشتنی شت بەحەوادا بەنزمی و نزیک لە زەوی: پەڕەسێلکەکە بە(خشکەیی) فڕی. ڕۆیشتنی گیاندار بەتیژی و بێ هەستی: فیسار کەس بە(خشکەیی) بەتەنیشتمدا تێپەڕی.
خشڵ: زێڕ و زیوێکە ژنان بۆ جوانی بیدەن لە خۆیان.
خشندە: گیاندارێکە لەسەر سک بڕوا وەک کرم و مار.
خشۆک: خشندە.
خشە: دەنگێکە وەک دەنگی ڕاکێشانی شتێکی نەرم بەسەر زەویدا. (خشەخش) خشەی یەک لەدوای یەک. (خش و هوڕ) خشەخشی زۆر.
خشیان: د. خشان. خزان.
خشی: ل. هەزارپێ.
خشین: خشان.
خشینەک: ز. شوێنی ڕاکێشانی شت بەسەر زەویدا.
خفتان: ز. کەوا.
خگ: لێدانی کوشندە.
خلافاندن: خلەفاندن.
خلافانن: خلافاندن.
خلانکە: خڕخاڵی بێشکە.
خلانە: چاڵێکە میوەی وەک لیمۆ و پرتەقاڵی تێدا دادەپۆشرێ بۆ هەڵگرتن.
خلبوونەوە: گلۆربوونەوەی شتێک لە لێژییەوە.
خلت: د. خڵتە.
خڵتە: ملتەیەکە لە دوای پالاوتنی شتی شل دەمێنێتەوە.
خلکردنەوە: گلۆرکردنەوە.
خلنزەر: ز. مارمێلکە.
خلۆربوونەوە: خلبوونەوە.
خلۆرتە: هـ. باڵینەیەکە لەژێر کورتانەوە دەنرێ بەملاو بەولایەوە بۆ ئەوەی بار نەنیشێتە سەر کولۆکی ولاخەکە.
خلۆرکردنەوە: خلکردنەوە.
خلولیک: ز. تەرزەلووکە.
خلەتان: هەڵفریوان.
خلەتاندن: فریودان.
خلەتانن: خلەتاندن.
خلەتیاگ: د. کەسێکە کە هەڵخەڵەتابێ.
خلەخل: وتەیەکە بۆ گێڕانەوەی ڕۆینی منداڵی تازە پێ گرتوو بەکاردێنرێ: نەریمان سەر پێ کەوتووە (خلەخل) دەڕوا.
خلەفان: خەریکبوون بەشتێکەوە بۆ بەسەربردنی کات. تێکچوونی مێشک لەبەر پیری.
خلەفاندن: خەریککردنی یەکێک بەکارێکەوە.
خلەوبوون: د. خلبوونەوە.
خلێ: د. وتەیەکە وەک (نۆنە) منداڵی ساوا بەمێوژ و برێشکەی دەڵێ.
خلیانەوە: د. تلۆربوونەوە.
خلێران: د. شتێکە کە تلۆربووبێتەوە.
خلێرە: د. شتی گردی گلۆڵە.
خلێرەوبوون: د. گلۆربوونەوە. گردبوونەوە.

خلێرەوکردن: د. تلۆرکردنەوە. گردکردنەوە.
خلیسک: شوێنێکە کە پێی لێ هەڵخزێ. پیازی فیسقە.
خلیسکان: هەڵخزانی پێ لە شوێنی خز.
خلیسکاندن: هەڵخزاندن.
خلیسکە: پیاز.
خلیسکیان: د. خلیسکان.
خلێف: توێک و کاژێکە کە ئەندامی گیاندار هەڵی دەدا.
خلێنکە: قالۆنچەیەکی زلی دەشتییە شیاکە خڕ هەڵدەدا و خلی دەکاتەوە بۆ ناو کونەکەی خۆی.
خلێنە: پیسی ئاژاڵ کە بەپاشیەوە وشک دەبێتەوە.
خلێنە و بلێنە: تەگبیر و ڕایەکە کە چەند کەسێک بەنهێنی بیکەن بۆ پێکهێنانی کارێک.
خلیچک: کەسێکە زۆر خاو بێ لە ئیشوکاردا.
خلیرە: د. دانەوێڵەیەکی ڕەشی زەردباوی خڕە.
خلینە: دار یا ئاسنێکی سێ پەلە ماستاوی پێ دەکرێ.
خم: خوم.
خمخانە: خومخانە.
خمخمک: با. کونەلووت.
خمخۆرک: شوێنێکە لە زەوی کە لە خۆیەوە ڕۆچووبێ.
خمگەر: خومخانەچی.
خمەگەروو: قومقمۆکە.
خناف: با. شەونم.
خنانەوە: جۆرە پێکەنینێکی نەرمە: فیسار کەس لە خۆشیاندا (خنایەوە).
خنج: خنجیلانە.
خنج و خۆڵ: د. شتی جوانی خنجیلانە.
خنج و منج: د. خنج و خۆڵ.
خنجەر: خەنجەر.
خنجەرە: د. کێلێکە لەبەردەمی گۆڕی مردوو دادەچەقێنرێ بۆ ئەوەی کە بزانرێ مردووەکە پیاوە و ژن نییە.
خنجەڵە: خنجیلە.
خنجیلانە: شتی پچکۆلەی ئێسک سووک.
خنجیلە: خنجیلانە.
خنچکە: د. خنج.
خنکان: مردنی گیاندار بەهۆی دەرنەچوونی هەناسەیەوە.
خنکاندن: کوشتنی گیاندار بەگرتنی هەناسەی.
خنکانن: خنکاندن.
خنکاو: گیاندارێکە بەهۆی دەرنەچوونی هەناسەیەوە مردبێ.
خنگلین: ز. شەلین.
خنەخن: دامان و نقاندن بەدەست کارێکەوە: فیسار کەس بەکارەکەیەوە (خنەخن) یەتی.
خنیە: ل. خەنە.
خنینەوە: خنانەوە.
خۆ: ئاشنا و ناسیاوی تێکەڵ. ناوی شارێکە لە کوردستانی ئێران. پیتێکە لە سەرکۆنە و سەرزەنشتدا بەکاردێنرێ: (خۆ) تۆ لای خۆت پیاویت، واتە نەدەبوو ئەو کارە بکەیت، یا (خۆ) من زیانم نەسووتا، واتە نەدەبوو دڵگیرببیت.
خوا: ئەو کەسەیە کە بووە و هەر دەبێ و خاوەن و دروستکەری هەموو جیهانە. خوێ. داواکەر بویست: فیسار کەس کورد (خوا)یە، واتە قازانجی کوردی دەوێ. ئەگەر: (خوا) نا (خوا) دەبێ بخوێنیت.
خواپەرس: د. خواپەرست.
خواپەرست: کەسێکە کە لە خوا بترسێ و بیپەرستێ.
خواپەرستی: پەرستنی خوا و بەجێهێنانی فەرمانی.
خواپێدان: میهرەبانی خوا لەگەڵ بەندەیەکی خۆی بەدانی بەهرەیەک پێی.
خواپێداو: کەسێکە کە خوا بەبەهرەیەک خوێندبیەتیەوە.
خواجا: وتەیەکە بەگاور و جوولەکە دەوترێ.
خواجە: خواجا. پیری گەورە.
خواجەنشین: دوو سەکۆی پچووکە لای ڕاست و چەپی دەرگای حەوش لە دیوی دەرەوە لە دیوار دەهێڵرێتەوە بۆ دانیشتن.
خواخواست: قەزا و قەدەر.
خواداد: د. بەشێکی باش یا بەهرەیەکە خوا پێی دابیت.
خواداگ: د. خواداد.
خوادان: خوێدان (د). بەشی خوا.
خوار: شتی گێڕی چەوت. (خواربوون): چەوتبوونی شت.
خواربوونەوە: چەوتبوونەوەی شت.
خواردن: جوون و وردکردن و قووتدانی شت.
خواردنەوە: قووتدانی شتی شل قوم قوم.
خواردە: کەسێکە زۆر حەز لە خواردن بکا و هەمیشە پێوەی خەریک بێ.
خواردەس: خواردەست.
خواردەست: کەسێکە لەژێر فەرمانتدا بێ و چاوی لە دەستتەوە بێ.
خواردەستی: بوونی یەکێک بەژێردەستی یەکێک.
خواردەسی: خواردەستی.
خواردەمەنی: شتی خواردن.
خوارزا: خوشکەزا.
خوارزی: ز. خوشکەزا.
خوارگ: د. خواروو.
خوارگێن: د. خوارگ.

خوارن: ز. خواردن.
خواروو: لای خوارووی شت.
خوارەمرێ: ئاشووب و ئاژاوە: جیهان پڕە لە (خوارەمرێ).
خواری: بوونی شت بەخوار. ئاستی خواریی شت.
خواز: خواست: فیسار کچ داوا (خواز)ی هەیە.
خوازبێنی: داواکردنی ژن بۆ مارەکردنی.
خوازبێنیکەر: کەسێکە کە خوازبێنی بکا.
خوازتن: د. خواستن.
خوازدراو: خوازراو.
خوازراو: شتێکە بەخواستن وەرگیرابێ.
خوازگار: د. کەسێکە کە شتێکی بوێ.
خوازگاری: د. ویستنی شتێک. خوازبێنی.
خوازلۆک: د. خوازەلۆک.
خوازمەنی: د. خوازگاری.
خوازە: د. خوایشت.
خوازەلۆک: کەسێکە زۆر داوای شت لە مەردووم بکا.
خواس: خواز (د). خاوس.
خواست: ئارەزوو: (خواست)م وایە کە بخوێنم.
خواستن: داواکردنی شتێک لە یەکێک بۆ چەند دەمێک.
خواستەمەنی: شتی خوازراو.
خواکرد: شتێکە کە دەستکردی خوا بێ و هی بەندە نەبێ.
خواگرتن: بەندەیەکە خوا بە دەردێکەوە گرفتاری کردبێ.
خواگرتوو: کەسێکە کە خوا گرفتاری دەردێکی کردبێ.
خواگیر: خواگرتوو.
خوان: تەختێکی درێژە نانی لەسەر دەخورێ. خوانکە.
خواناس: کەسێکە خوا باش بناسێ و لە فەرمانی دەرنەچێ.
خواناسی: ناسینی خوا و بەجێهێنانی فەرمانی.
خواناسین: خواناسی.
خوانچە: تەشپی گەورە. خوانی نان. خواردن (د).
خواندن: د. خوێندن.
خونزایین: د. خانەی زین.
خوانکە: دارێکی ئەستوورە (مووره سەنگ)ی ئاشی تێ دەبرێ. دەرخۆنە.
خوانووس: چارەنووس.
خوانە: پنە.
خوانەخواستە: وتەیەکە لە شوێنی (دوور بێ) بەکاردێنرێ، واتە ئەو شتە خوا نەیکا.
خوانەکا: خوانەخاستە.
خواوەن: د. خوای پەروەردگار.
خواوەند: خواوەن.

خواهیش: تکا: (خواهیش)ت لێ دەکەم. ئارەزوو: ئەگەر (خواهیش)تە ببی بەپیاو بخوێنە.
خواهیشت: خواهیش.
خوایش: خواهیش.
خوایشت: خواهیشت.
خوای: پێکەنین.
خوای هەوری: خوێی هەوری.
خۆبان: مەردوومی ناهومێد.
خۆبردنە پێشەوە: بریتییە لە خۆ خۆشەویستکردن بەکردن یا وتنی شتێک بەپێی دڵی یەکێک.
خۆبڕین: بریتییە لە لەخۆدان.
خۆبزە: نۆکەر.
خۆبەردان: بریتییە لە زیادە خەرجکردنێک کە لەوە پێش نەتکردبێ.
خۆبینی: خۆپەسندکردن.
خۆپاراستن: خۆ دوورگرتن لە شتێک و پارێزگاری لێی.
خۆپارێزی: دفاع.
خۆپان: ز. کەلاوە. خراپە.
خۆپەرس: خۆپەرست.
خۆپەرست: کەسێکە کە خۆی زۆر پەسند بکا.
خۆپەرستی: پەسندکردنی مەردووم بۆ گوفتار و کرداری خۆی.
خۆپەسەن: خۆپەسەند.
خۆپەسەند: کەسێکە کە بەخۆی بنازێ لە هەموو کارێکدا.
خۆپەسەندی: بەخۆنازین لە هەموو کارێکدا.
خوت: د. خاڵی، زۆرتر لەگەڵ وتەی خاڵیدا دەوترێ: (خوت) و خاڵی.
خۆت: بریتییە لەو کەسەی کە قسەی لەگەڵ دەکەیت.
خوتا: خوای گەورە.
خۆتان: بریتییە لەو کەسانەی کە قسەیان لەگەڵدا دەکەیت.
خوترەک: بەرچیغ.
خوتن: کەسێکە زۆر بۆڵە و خوتە بکا.
خوتووکە: ختووکە.
خوتە: بۆڵە. (خوتەخوت) خوتەی زۆر.
خۆتە: وتەیەکە بەمەڕ و بزن دەوترێ لەکاتی دۆشینیاندا بۆ ئەوەی کە بووەستن.
خوتەخوتکەر: کەسێکە کە خوتەخوتی زۆر بکا.
خوتەک: خوترەک.
خوتەکردن: بۆڵەکردن.
خۆتێگرتن: بریتییە لە خۆهاویشتنە شتێکەوە بۆ پچڕینی سوودێک.

خۆ تێ هەڵقورتاندن: خۆ قوتکردنەوە لە کاروباری مەردوومدا.
خوچۆک: ز. شتی پچووک.
خۆخلافاندن: سستەسست کردن و خۆ خەریککردن بەشتێکەوە.
خۆخلافانن: خۆخلافاندن.
خۆخلافکێ: د. خۆخلافاندن.
خۆخواردنەوە: پیشخواردنەوە و ڕقخواردنەوە. چکانەوەی چێشت لەبەر زۆر کــوڵانی. شێ وەرگــرتنی زەوی لەکــاتی ئاو خواردنەوەیدا بەجۆرێک کە بەتەواوی وشکیی تێدا نەمێنێ.
خۆخۆر: بریتییە لە کەسێک کە زیانی بۆ ناوخۆ بێ.
خۆخوراندن: بریتییە لەخۆ ئامادەکردن بۆ بەخشینی شتێک.
خودا: خوای گەورە.
خۆداری: دان بەخۆداگرتن.
خۆداکوتان: بریتییە لە خۆ دامەزراندن.
خۆداگرتن: خۆحەشاردان بۆ گوێگرتن لە قسەی مەردووم.
خۆداگیرکردن: دان بەخۆداگرتن و خۆڕاگرتن.
خودان: با. خاوەن.
خۆدانان: بریتییە لە سەر بەختکردن لە کارێکدا.
خوداوەند: خودا.
خودبینی: خۆپەسندکردن.
خودپەسەند: د. خۆپەسند.
خودپەسەندی: د. خۆپەسندی.
خودتەراش: مەکینەیەکە مەردووم ڕیشی خۆی پێ دەتاشی.
خودداری: دان بەخۆداگرتن.
خۆدزینەوە: خۆشاردنەوە.
خودسەر: کـەسێکە هەر لە خـۆیەوە بەبێ ڕاوێژ و پرسـیـار ئیش بکا.
خودسەری: تێهەڵچوون لە ئیشوکار بەبێ پرس و لێکدانەوە.
خودگیری: خودداری.
خودێ: با. خودا.
خۆر: ڕۆژێکە کە جیهان ڕووناک دەکاتەوە. هەتاو. پیتێکە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بە(أسمی فـاعل): نان (خـۆر)، گـۆشت (خۆر)، پیاو (خۆر).
خۆرا: بخۆر.
خـۆراک: خـواردەمـەنی. ئەندازەیەکی تایبـەتیـیـە لە چای وشک دەکرێتە ناو قۆریەوە بۆ لێنان.
خۆراکی: د. خواردەمەنی.
خوران: ئالۆشی ئەندام.
خوراندن: نینۆکدان لە شوێنێک کە ئالۆشی بێ.
خۆرانگاز: شوێنێکە لە ئەندام کە تیشکی خۆر سووتاندبێتی.
خورانن: خوراندن.
خورانەوە: کلۆربوون و بۆشبوونی شت وەک د،دان.
خوراو: شتێکە کە مۆرانە لێی دابێ یان گیاندار خواردبێتی.
خـۆراوا: کـاتی ئاوابوونی ڕۆژ. شـوێنێکە کـە لەبەرچاوی تۆ ڕۆژ لێی ئاوا دەبێ.
خۆراوایی: کەسێکە کە لە خۆراوا لە دایک بووبێ.
خوریە: داچڵەکینی دڵ لە شتێکی ناخۆش.
خوریبان: د. داخوریانی دڵ.
خـورت: وڵاخی بزێوی سـەرکـێش. گـیـانداری قـەڵـەوی تەنگە تیلکە. دەوڵەمەند (ز). کوڕی گەنجی جوان (ز).
خورتی: با. زۆر و دەگە نەگ: بە(خورتی) هێنای واتە بەزۆر.
خـورج: دەفـرێکی دووڵای تەنراوە وەک قـاڵی شـتـی تێ دەکـرێ و بەپاشکۆی وڵاخدا دادەبەسترێ.
خورجەزین: ز. هەگبەی پشتی سوار.
خورجین: د. خورج.
خوردە: وردە لە پارە و شتی تر.
خوردەگیر: ڕەخنەگر.
خوردەگیری: ڕەخنەگیری.
خوڕ: ئاوێکە خێرا بڕوا و مەنگ نەبێ.
خۆڕاگرتن: دان بەخۆداگرتن لەبەر شتێکی ناخۆشدا.
خۆڕایی: شتی بێ پارە.
خـورگـە: جـێگـایەکی لێـژە کـە ئـاوی بەتوندی پێـدا بڕوا. ناوی جۆگایەکە لە خوار شاری سلێـمانییەوە کـە ئاوەڕێژی شاری ناوبراو دەچێتەوە سەری.
خوڕم: خوڕەم.
خوڕە: دەنگی ئاو و شتی شل کە هەڵبڕژێ. (خوڕەخوڕ) خوڕەی یەک لە دوای یەک.
خوڕەم: هاتنەخوارەوەی باران بەلێزمە.
خــوڕین: نازین بەیەکــێـک: تۆ بەکێ دە(خــوڕیت) واتە بەکێ دەنازیت؟.
خورزم: خوڕەم.
خۆرزەدە: د. خۆرئەنگاز.
خۆرسک: درەختێکە لە خۆیەوە ڕوابێ.
خۆرش: خۆرشت.
خۆرشت: چێشتێکی شلەیە کە لەگەڵ چێشتی توندەدا بخورێ.
خۆرشید: خورشید.
خورشید: خۆر.
خورشیدی: جۆرە گۆرانییەکی خۆشی کوردییە. جۆرە کاغەزێکی سپیی لووسە وێنەی خورشیدی تێدایە.
خۆرکەوتن: کاتی خۆرهەڵاتن. هەڵاتنی ڕۆژ.
خۆر لە زەردە: کاتی زەردەپەڕ.

خورما: بەری دارێکی بەرزی گەرمیانییە زۆر شیرینە و بەهێشوو دەیگرێ.
خورماسیچان: گیاندارێکە وەک ڕێوی بەڵام ئەم گەلێ پچووکترە.
خورما و ڕۆن: جۆرە خواردەمەنییەکە لە ڕۆنی داخکراو و خورما دروست دەکرێ.
خورمایی: جۆرە ڕەنگێکی سوورکارە وەک خورما.
خورمایلە: گیایەکی بەهارییە وەک هەڵەکۆک بەڵام ئەم سەلکەکەی شیرینتر و گەڵای شینترە.
خورمە: ز. خورما.
خۆرنشین: ئەو شوێنەیە کە بەدیمەن ڕۆژی لێ ئاوا دەبێ. کەسێکە لە خۆراوا لە دایک بووبێ.
خۆرنەوەزان: شوێنێکی سەختی نسرمە لە شاخ کە هەتاوی تێ نەکەوێ و گیای تێدا سەوز ببێ و دلۆپ دلۆپ ئاوی لێ بتکێتە خوارەوە.
خورۆش: ئالۆشی بەتین. خورۆشان.
خورۆشان: هەرا و هوریا و بەیەکداچوونی مەردووم.
خورۆشاندن: ورووکاندن و تێکدانی کۆمەڵێک.
خورۆشاو: چەند گیاندارێکن کە خورۆشابن.
خورۆکە: د. خورووکە.
خورو: ئالۆش.
خوروزەک: دەردێکە لە گەرووی پەیدا دەبێ و دەیهێنێتەوە یەک و پەکی هاتوچۆی هەناسە دەخا.
خورووک: ئالۆش.
خورووکە: د. خورووک.
خۆروەزان: د. بەر بەرۆچکە. خۆرهەڵات.
خۆرە: جۆرە برینێکە بەهەر شوێنێک بگا دای دەوەشێنێ.
خۆرەتاو: هەتاو.
خۆرەزەرد: د. زەردەی ئێواران و بەیانیان.
خۆرەن: د. خۆراک.
خۆرەنگاز: شتێکە کە خۆر زەردەی کردبێ.
خۆرهەڵات: دەمی خۆرکەوتن. شوێنێکە کە خۆر لێی هەڵبێ.
خوریان: خورانی جەستە (د). خواردن.
خوریانەوە: د. خورانەوە.
خورێن: مەردوومی زۆرخۆر: فیسار کەس بەدەورییەک چێشت (خورێن)ە.
خورێنی: ناشتا: بە(خورێنی) جگەرە مەکێشە.
خوری: تووکی مەڕ. ئاوڵە (ز).
خوریکە: ئاوڵە.
خورین: خورانی جەستە. خورین (د).
خوز: بۆشاییێکە لە کەناری ئاودا کە ماسی دەچێتە ژێری.
خۆزگا: خۆزگە.
خۆزگایەکوو: خۆزگە.
خۆزگە: وتەی ئاواتخواستن: (خۆزگە) هەمموو وتەی کوردیم کۆدەکردەوە.
خۆزگە: شوێنێکە لە چەم و ڕووبار ماسی قوڵاغەی تێدا دەدا.
خۆزگەبردن: ئاواتخواستن.
خۆزگەخواستن: خۆزگەبردن.
خۆزە: د. خۆزگە.
خوزی: تف.
خوژە: گیایەکی بەهاریی کوێستانییە گەڵای باریک و سێ کووز و کولۆرە سرێش لە بنکەکەی پەیدا دەبێ.
خوژیلک: گیایەکی گەڵا ئەستووری هەمیشە سەوزی شیردارە، شیرەکەی بۆ (بیرۆ) زۆر باشە.
خوس: وس. (خوسبوون) وسبوون.
خوسپ: ناوبردنی مەردووم لە پاشملە بەخراپی.
خوسن: د. خۆسن.
خۆسن: د. جنێو.
خۆسەر: د. مەردوومی سەرەخەر.
خۆسەری: د. سەرەخەری.
خۆش: شتی دڵگیر لە خواردەمەنی و بیستراو و بینراو و بۆنکراودا: ئەم میوەیە یا ئەم دەنگە یا ئەم شوێنە یا ئەم بۆنە خۆشە.
خۆشا: خۆزگە: (خۆشا) بەحاڵی فیسار کەس، واتە خۆزگە بەحاڵی خۆشی.
خۆشاب: ز. خۆشاو.
خۆشاتن: د. بەخێرهاتن کردن.
خۆشاردنەوە: خۆ دزینەوە.
خۆشاو: جۆرە شەربەتێکە لە میوژ و لەتکەی کوڵاو دروست دەکرێ.
خۆشاواز: دەنگخۆش.
خۆشاوازی: دەنگخۆشی.
خۆشباوەڕ: کەسێکە زۆر زوو بەهەموو شت باوەڕ بکا.
خۆشبوون: زۆربوونی گڕی ئاگر و چرا. پێگەیشتنی هێندێ خواردەمەنی: ترێ خۆش بووە: واتە ترشیی نەماوە. دووربوون لە ئازار و سزای ڕۆژگار: یاخوا هەر (خۆش بیت). بووردن لە گوناحی یەکێک: لە قەرزاری هەژار (خۆش بە). ڕێکوپێکبوونی شوێنێک: سلێمانی (خۆش بووە). پوختەبوونی قوڕ.
خۆشبوونەوە: چاکبوونەوە لە نەخۆشی.
حۆشبەخت: خاوەن نگێن و بەختیار.

خۆشبەختی: بەختیاری.
خۆشبەز: ولاخی خۆش ڕەوت.
خۆشحاڵ: مەردوومی دڵشاد.
خۆشحاڵی: دڵشادی و شادمانی.
خۆشخۆش: خێرا خێرا.
خۆشخوو: خۆشڕەفتار.
خۆشڕوو: مەردوومی ڕووخۆش.
خۆشڕوویی: ڕووخۆشی.
خۆشڕەفتار: کەسێکە ڕەوشتی جوان بێ.
خۆشڕەفتاری: جوانیی ڕەوشت و خوو.
خۆشڕەو: ولاخی خێرا.
خۆشڕەوت: خۆشڕەو.
خۆشزبان: مەردوومی زبان شیرین.
خۆشزووان: د. زبان شیرین.
خوشک: مێینەیەکە لە باوک و دایکت یا لە یەکێکیان بێ.
خوشکایەتی: بوونی دوو ئافرەت بەخوشک.
خۆشکردن: زۆرکردنی گڕی ئاگر و چرا. شیرینکردنی چەقالە و بنێشتەتاڵ بەکوڵاندنیان. ڕازاندنەوە و ڕێکوپێککردنی شوێنێک: ژوورەکەت (خۆش کردووە). شێلان و پوختەکردنی قوڕ. خۆشکردنەوە: بارانەکە (خۆشی کرد). پوختەکردنی پێستە و هەمانە بەدەرمان.
خۆشکردنەوە: وەستانەوەی باران و بەفر و تەرزە.
خوشکۆک: ز. شتی جوان.
خوشکەزا: منداڵی خوشک.
خوشکەزازا: منداڵی منداڵی خوشک.
خوشکەڵێ: وتەیەکە لە ڕووی خۆشەویستییەوە بەخوشک دەوترێ.
خوشکێ: خوشکەڵێ.
خوشکێش: ز. ولاخی ڕەهوان.
خۆش لێ هاتن: خۆشبوونی شتێک لەلات: (خۆشیم لەو شتە دێ) یا نایەت.
خۆشناو: جۆرە ترێیەکی ڕەشی دەنک گەورەیە تا پایزێکی درەنگ دەمێنێ. ناوچەیەکە لە لیوای هەولێر.
خۆش نەکەر: دیوێکە لە میچ.
خۆش و چۆنی: هەواڵ پرسینی دوو کەس لە یەکتری.
خۆش و دشی: د. خۆش و چۆنی.
خۆشویستن: ویستنی شتێک بەدڵ و بەگیان.
خۆش هاتن: خۆشاتن.
خوشە: دەنگێکە وەک دەنگی دۆشینی شیر. (خوشەخوش) خوشەی یەک لە دوای یەک.
خۆشە: چەرمێکە کە پوختە کرابێ.
خۆشەبوون: پوختەبوونی چەرم و هەمانە. بریتییە لە دەرهاتن و قاڵبوونی کەسێک لە فرمانێکدا.
خوشەتاڵوو: کاهووە کێویلە.
خۆشەچین: گوڵەوەچن. بریتییە لە یەکێک کە لە یەکێکی ترەوە بەهرەمەند بێ: من (خۆشەچین)ی زانینی تۆم.
خۆشەکردن: پوختەکردنی چەرم و هەمانە. بریتییە لە قاڵکردن و پوختەکردنی یەکێک لە فرمانێکدا.
خۆشەکراو: شتێکە پوختە و خوشە کرابێ.
خۆشەوبوون: د. خۆشبوونەوە.
خۆشەویس: خۆشەویست.
خۆشەویست: کەسێکە کە زۆرت خۆش بوێت.
خۆشەویستی: بوونی شت بەخۆشەویست.
خۆشەویسی: خۆشەویستی.
خۆشەوی: با. خۆشەویست.
خۆشێ: وتەیەکە لە جێی وتەی خێرا بەکاردێنرێ: (خۆشێ) هاتەوە، واتە خێرا هاتەوە.
خۆشیان: چەند ڕۆژێکی خۆشە لە زستاندا کە باران و قوڕی تێدا نەبێ.
خۆشی خۆشی: شادمانی و کەیفخۆشی.
خوشیلک: خوژیلک.
خوشیلکە: د. خوژیلک.
خۆشی: دڵشادی و نەبوونی خەفەت.
خۆشیرین کردن: بریتییە لە وتن و کردنی شتێک لای یەکێک بەڕەنگێک کە پێی پچێتە پێشەوە.
خوشیل: د. خوژیلک.
خۆکوشتن: بریتییە لە لەخۆدان.
خۆکێشانەوە: پاشگەزبوون و دەست هەڵگرتن لە کارێک. کێشمانی جەستە. وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بۆ مردنی یەکێک.
خۆکێشکردن: ڕۆیشتن بۆ شوێنێک بەبێ هێزی و بێ کەیفی.
خۆگرتن: گوێگرتن بەنهێنی لە قسەی مەردووم. خۆداری.
خۆگورجکردن: خۆهەڵکردن.
خۆگێلکردن: بەدرۆ خۆ بێگانەکردن لە شتێک.
خۆگیر: د. کەسێکە کە دان بە خۆیدا بگرێ.
خۆگیری: دان بەخۆداگرتن لە کارێکدا.
خول: سوور و چەرخەی شت: ئەو تەشیە (خول)ی خۆشە، (خولە خول) خولی یەک لە دوای یەک. گیاندارێکە ملی خواربێ و نەتوانێ بەرزی کاتەوە (ز).
خوڵ: د. خۆڵ.

خۆل: خۆڵ.
خۆڵ: خاکی وردی وشک.
خولا: خوا.
خولام: د. بەندەی کەمەربەستە.
خولامانە: کاکۆڵ.
خۆشەخانە: د. دەباخانە.
خولاندنەوە: سووڕاندنەوەی شت بەگردی خۆیدا.
خولانەوە: سووڕانەوەی شت بەگردی خۆیدا.
خۆڵاو: تیژاوی خۆڵەمێش.
خولخواردن: خولانەوە.
خولخولۆکە: شتێکە منداڵان دەیخولێننەوە.
خولخولە: خولخولۆکە. فرفرۆکە (د).
خولخۆلە: ملی شەربە و جەڕە و گۆزەی شکاو.
خولخولە: غولغولە.
خولدان: خولاندنەوە.
خولۆپانن: د. گولۆفتنەوەی شت: تانجییەکە کەروێشکەکەی (خولۆپانەوە).
خولۆربوونەوە: گلۆربوونەوەی شتێک لە لێژییەکەوە.
خولە: د. سووڕانەوە: چییە هەر (خولە)ت دێ.
خولەپۆت: د. خۆڵەپەتانی.
خۆڵەپۆت: د. خۆڵەپەتانی.
خولەپۆتێ: د. خۆڵەپۆتێ.
خۆڵەپۆتێ: د. خۆڵەپۆت.
خۆڵەپەتانی: یاریکردنی منداڵ بەخۆڵ.
خۆڵەژان: د. ژانێکە لە خواردنی خۆڵەوە تووشی منداڵ دەبێ.
خۆڵەکەوە: خۆڵەمێش.
خۆڵەمر: خۆڵەمێش.
خولەمێش: خۆڵەمێش.
خۆڵەمێش: خۆڵی شتی سووتاو.
خولیا: مەراق پەڕینە سەر بۆ شتێک.
خولیانەوە: د. خولانەوە.
خولێنکە: خولخولۆکە.
خولی: ز. خۆڵەمێش.
خۆڵی: با. خۆڵەمێش. خوری.
خوم: جۆرە ڕەنگێکی شینی لاجیوەردییە بەن و کالای پێ ڕەنگ دەکرێ.
خۆم: بریتییە لە قسەکەرێکی تەنیا کە خۆی بەخۆی بلێ.
خومار: مەردوومی مەستی سەرخۆش. هەڵم و بوق و تۆزی ئاسمان.
خوماری: مەستی و سەرخۆشی.
خومالیک: ز. جەڕەی گەورە.
خومالی: ز. شتی خۆماڵی.
خۆماڵی: شتی تایبەتی کە بۆ ماڵی خۆتت کردبێ.
خۆمان: بریتییە لە قسەکەرێک کە چەند کەسێکی لە گەڵدا بن و خۆی لە زمان ئەوانیشەوە بیڵێ.
خۆمانە: شتی تایبەتی خۆیی.
خۆمانەخۆمانە: بریتییە لە ماڵ جیایی کردنی یەکێک لەگەڵ یەکێکی تردا.
خۆمانی: خۆمانە.
خومچی: خومخانەچی.
خومخانە: جێگایەکە شتی تێدا لە خوم بدرێ.
خومخانەچی: وەستایەکە کە شت لە خوم بدا.
خومخۆرک: قڵێشی زەوی.
خومری: ز. سووری تۆخ.
خوم شێوان: بریتییە لە بلاوبوونەوە و بیستنی درۆیەکی زلی دوور لە ژیری و بیر: لەکاتێکدا کە درۆیەکی زۆر زل بلاوبێتەوە (خوم شێواوە).
خومگەر: خومخانەچی.
خومین: ز. دەنگی ڕووخانی شت.
خومەڕژە: باڵندەیەکی سەوزی شینکارە بەقەد (قژاڵکە)یەک دەبێ.
خومەڕەژە: د. خومەڕژە.
خومەشوێنکە: د. خومەشێونە.
خومەشۆینە: د. خومەشێونە.
خومەشێونە: د. مەردوومی بەئاشووب.
خومیزین: ز. کوژانەوەی ئاگر.
خومی: شتێکە ڕەنگی وەک ڕەنگی خوم وابێ.
خومین: خومی.
خۆناسین: بریتییە لە ناسینی مەردووم بۆ ئەندازە و پایەی خۆی: فیسار کەس (خۆی نا ناسێ). بریتییە لە بلووغبوون: (ئەوەتی خۆم ناسیوە) واتە ئەوەتی بلووغم بووە.
خوناف: شەونم (با). ئاوێکە لە شەودا هاتبێتە سەر شینایی (ز). بارانی ورد (ز).
خوناو: ئاوونگ.
خوناوکە: خوناو. بارانی ورد.
خونجان: گونجان.
خونجاندن: گونجاندن.
خونجانن: گونجانن.
خونجگا: د. شوێنێکە کە مەردووم بتوانێ تێیدا بسرەوێ.
خونجگە: د. خونجگا.

خونجیان: د. خونجان.
خونچە: گوڵێکە کە هێشتا نەگەشابێتەوە.
خونخوار: بریتییە لە زۆرداری ستەمکاری دڵڕەق.
خۆندن: خوێندن.
خۆندنخانە: خوێندنخانە.
خۆندنگا: خوێندنگا.
خۆندنگاە: خوێندنگاە.
خۆندنەوە: خوێندنەوە.
خۆندەوار: خوێندەوار.
خۆندەواری: خوێندەواری.
خونقین: ز. باران بارین بەوردی.
خونک: کەسێکە زۆر ئارەزووی دەستبازی و خۆ تێهەڵسوونی بێ. گونک ژمێر.
خونکار: وتەیەکە بەپاشایان دەوترێ.
خۆنمایی: د. خۆنواندن.
خۆنن: د. خۆندن. بریتییە لە گۆرانی وتن.
خۆننەوە: د. خۆندنەوە.
خۆنواندن: بریتییە لە خۆ دەرخستنی مەردووم بەکردنی شتی باش.
خۆنوانن: خۆنواندن.
خۆنووس: قەڵەمی قورقوشم.
خۆنوێن: کەسێکە کە خۆی بنوێنێ.
خۆنوێنی: خۆپیشاندان و خۆبردنە پێشەوە.
خۆنەوار: خوێندەوار.
خۆنەواری: خوێندەواری.
خۆنیشاندان: خۆنواندن.
خوو: ڕەوشتێکە کە گیاندار هۆگری بووبێ.
خووانچە: سینی.
خووز: هێز. نەخۆشەکە بێ (خووز)ە. زوقم.
خووز تێگەڕان: هاتنەوەی هێزی نەخۆش و کەوتنەوە سەرخۆی.
خووز تێگەڕانەوە: خووز تێگەڕان. ژیانەوەی درەخت.
خووز هێنانەوە: هاتنەوەیەکی برینی ئەندام و درەخت.
خووسار: ز. زوقمی سەر زەوی کە ببینرێ.
خووسان: نەرمبوونەوەی شتی ڕەق بەهۆی تەڕبوونیەوە. بریتییە لە دڵ نەرمبوونی کەسێک بەرامبەر بەیەکێک بۆ شتێک کە هیوای لێ نەکرێ.
خووساندن: نەرمکردنی هێندێ شت: سەرت (بخوسێنە) ئینجا بیتاشە. بریتییە لە دڵ نەرمکردنی یەکێک بۆ شتێک.
خووساندنەوە: نەرمکردنەوەی هێندێ شتی ڕەقەوەبوو.
خووسانەوە: تلیسانەوە و نەرمبوونی هێندێ شت.
خووساو: شتێکە بەهۆی تەڕبوونیەوە نەرم بووبێتەوە.
خووساوە: شتی خووساو.
خووسیاگ: د. خووساو.
خووسیان: د. خووسان.
خووگ: بەراز.
خووگەملە: گوریس کێشەکێ.
خوول: با. خۆڵ.
خوولی: با. خۆلی.
خوون: ز. خوێن.
خووهرا: ز. زۆرخۆر.
خووهری: ز. خۆزگە.
خووهستن: ز. خواستن.
خووهستەک: ز. خوازەڵۆک.
خووهستی: ز. خوازبێنی.
خۆ وێڵکردن: خۆگێلکردن.
خوە: با. ئارەقی ئەندام: من (خوە) دایە، واتە ئارەقم کردۆتەوە.
خۆە: ز. خوشک.
خۆهر: ز. خوار.
خۆهەڵبەست: شتێکی درۆیە کە یەکێک لە خۆیەوە هەڵی بەستێ.
خۆهەڵتراندن: بریتییە لە خۆ هەڵکێشانی یەکێک بۆ شتێک کە لێی نەوەشێتەوە.
خۆهەڵخستنەوە: هەڵپەڕ و داپەڕکردن.
خۆهەڵدان: خۆ هەڵکێشان.
خۆهەڵشرنگاندن: خۆ هەڵتراندن.
خۆهەڵکردن: چاککردن بەلادا و خۆ گردکرنەوە.
خۆهەڵکێش: کەسێکە کە زۆر خۆی هەڵبکێشێ بەقسەی پف هەڵدراو.
خۆهەڵکێشان: بریتییە لە مەدحکردنی یەکێک بۆ خۆی.
خوێ: شتێکی سپی زۆر سوێرە دەکرێتە ناو چێشت و نانەوە. خاوەن (د).
خۆی: بریتییە لە کەسێکی نادیار یا یەکێک کە ڕووی قسەت لێی نەبێ. ناوی شارێکە لە کوردستانی ئێران.
خۆیابوون: ز. پەیدابوون.
خۆیان: بریتییە لە چەند کەسێکی نادیار یا چەند کەسێک کە ڕووی قسەت لێیان نەبێ. پەیدابوون (ز).
خۆیانی: با. ئاشنا.
خوێ چەشتن: خواردنی کەمێک لە چێشت لەپێش تێکردنیدا بۆ ئەوەی کە بزانیت خوێی تەواوە یا نا.
خوێدار: د. خاوەندار. بریتییە لە شتی جوانی دڵچەسپ: ئەم شتە (خوێدارە) واتە جوانە.

خوێداری: د. خاوەنداری.
خوێدان: دەفرێکی تایبەتییە هەر خوێی تێ دەکرێ. ڕۆکردنی خوێ بۆ ئاژاڵ.
خوێدانە: دەفری خوێ.
خوێرایی: د. خۆرایی.
خوێری: گیانداری بەرەڵای سەرسەری.
خوێرڕێژگە: چەند بەردێکی پانە خوێی لەسەر ڕۆ دەکرێ بۆ ئاژاڵ.
خوێز: د. زوقم.
خوێزا: خوشکەزا.
خوێس: د. سەهۆڵ.
خوێسە: د. زوقم.
خوێش: خزم.
خوێشایەتی: خزمایەتی.
خۆێشک: خوشک.
خۆێشکەزا: خوشکەزا.
خوێشی: خزمایەتی.
خوێگ: خاوەن.
خوێل: خێل.
خوێن: شتێکی سووری شلی گەرمە لەناو دەماری گیانداردا دێت و دەچێ. وتەیەکە بەدوای هێندێ ناوەوە دەنووسێ و دەیکا بە(فاعل): قورئان (خوێن)، شانامە (خوێن)، داستان (خوێن). پارەیەکە لە خوێنی کوژراودا بدرێ.
خوێناوی: شتێکە خوێنی تێوە چووبێ.
خوێنبایی: پارەیەکە لە خوێنی یەکێکدا دەدرێ.
خوێنبەردان: بەرەڵاکردنی خوێنی هێندێ دەمار بەنەشتەر.
خوێن تال: بریتییە لە مەردوومی ئێسک قورس.
خوێن تاڵی: ئێسک قورسی.
خوێنجمان: خوێن جومان.
خوێن جومان: کاتی بەهارە کە جیهان گەرم دەبێ و خوێنی تێدا دەجووڵێتەوە.
خوێنخوا: د. کەسێکە داوای خوێن لە پیاوکوژ دەکا.
خوێنخوار: بریتییە لە دوژمنێکی وا کە بەخوێنی سەرت تینوو بێ.
خوێنخواری: د. داواکردنی خوێن لە پیاوکوژ.
خوێنخۆر: بریتییە لە پیاوکوژ.
خوێندن: فێربوونی نووسراو لای مامۆستا لەبەر یا لە پەڕاودا.
خوێندنخانە: جێگای خوێندن.
خوێندنگا: خوێندنخانە.
خوێندنگاه: خوێندنگا.
خوێندنەوە: دەورکردنەوەی شتی نووسراو.
خوێندەڤان: با. خوێندەوار.
خوێندەوار: کەسێکە کە خوێندبێتی.
خوێندەواری: بوونی مەردووم بەخوێندەوار.
خوێن ڕژاندن: بریتییە لە کوشتنی مەردووم.
خوێن ڕژانن: خوێن ڕژاندن.
خوێن ڕشتن: بریتییە لە کوشتنی مەردووم.
خوێنرێژ: بریتییە لە یەکێک کە مەردووم زۆر بکوژێ.
خوێنرێژی: بریتییە لە زۆر کوشتنی مەردووم.
خوێنسارد: بریتییە لە یەکێک کە دەنگ ڕقی هەستێ.
خوێنساردی: بریتییە لە درەنگ ڕق هەستان.
خوێن شیرین: بریتییە لە مەردوومی ئێسک سووک.
خوێنشیرینی: بریتییە لە ئێسک سووکیی مەردووم.
خوێنکردن: بریتییە لە کوشتنی مەردووم.
خوێن کردنە کاسە: بریتییە لە ڕەشکردنی یەکێک لای یەکێکی تر بەجۆرێکی زۆر خراپ.
خوێن کوژاندنەوە: بریتییە لە ئاشتی خستنە ناو کۆمەڵێکی خوێنە خوێ.
خوێنکەر: خوێنرێژ.
خوێنگرتن: گرتنی خوێن لە هێندێ ئەندام بەهۆی جنینی بەگوێزان و هەڵمژینی بەکەڵەشاخ.
خوێنگەرم: بریتییە لە خوێن شیرین.
خوێنگەرمی: بریتییە لە خوێن شیرینی.
خوێنمژ: بریتییە لە زۆرداری ستەمکار.
خوێنمژی: بریتییە لە زۆرداری و ستەمکاری.
خوێنمژین: خوێنمژی.
خوێنەخوار: خوێنەخوارە.
خوێنەخوارە: دوژمنی خوێنی.
خوێنەخوێ: خزمی نزیکی کوژراو.
خوێن هەڵهێنانەوە: هێنانەوەی خوێن بەدەم.
خۆیەتی: تێکەڵی و دۆستایەتی.
خوێهدان: ز. ئارەقکردنەوە.
خۆیی: خۆیەتی. خاوەن (ز).
خویرک: با. مۆرانە.
خویسان: خووسان.
خویساو: خووساو.
خویساوە: خووساوە.
خویل: با. خێل. شتی خوار.
خوین: ل. خوێن.
خەبات: با. کۆشش و هەوڵدان.
خەبەر: با. جوین: بۆچ (خەبەر) دبێژیت، واتە جنێو دەدەیت.

خەپار: وتەیەکە لەگەڵ وتەی (خڕ)دا بەکاردێنرێ: فیسار کەس منداڵ خڕ و (خەپار)ە، واتە خەپەتۆڵەیە.
خەپراندن: ز. خۆشکردنی زەوی بۆ چاندنی.
خەپکە: شتێکی درێژە کە هەردوو سەری هاتبێتەوە یەک و ئەڵقەی دابێ. خەپلە.
خەپلە: جۆرە کولێرەیەکە لە گەنم نەبێ.
خەپوولێ: د. پوولپەرست.
خەپەتۆڵە: گیانداری خڕ و قەڵەو.
خەپەخەپ: دەنگی گاگۆڵکێی منداڵ.
خەپەرە: گیانداری ساوای قەڵەو.
خەپەرەبوون: قەڵەوبوونی ساوا.
خەپەرەکردن: نوستنی هێندێ گیاندار وەک تووتکە سەگ و پشیلە بەگرمۆڵەیی.
خەت: کێری سەر کاغە یا سەر زەوی.
خەتات: دەرمانێکە لە برۆ دەدرێ بۆ ڕەشبوونی.
خەتاتی: ئارایش بەخەتات.
خەتدان: بریتییە لە دەرهاتنی مووی ڕیش و سمێڵ.
خەتکێش: ڕاستەیەکە خەتی ڕاستی پێ دەکێشرێ.
خەتەنەسووران: شاییەکە کە بۆ خەتەنەکردن بکرێ.
خەتەنەکردن: برینی چەرمی سەر چووکی کوڕ.
خەتیرە: ز. چۆڵەچرا.
خەجیجووک: ز. گیایەکی گوڵ سوورە دەخورێ.
خەرار: جۆرە تەنراوێکی شاشی زبری مووینە زۆرتر تووتنی تێدا دادەگیرێ.
خەرامان: ئافرەتی شەنگ و شۆخ.
خەربەند: گیایەکی بەرزە تۆوێکی وردی هەیە دوکەڵەکەی بۆ ئەندامی قڵیشاو باشە.
خەربەندە: با. قەتارچی.
خەربەنگ: د. جۆرە گەرچەکێکە. خەربەند.
خەریشت: قوڕ و بەردێکە دەدرێتە پشت دیوار بۆقایمی.
خەرینگ: خەرپونگ.
خەرپونگ: گیایەکی بەهاریی ئاوییە وەک پونگە وایە بۆ برینی پشتی وڵاخ باشە.
خەرپونگە: خەرپونگ.
خەرت: مەتە و کەوان و تیغێکە دارتاش داری پێ خڕ و لووس دەکا.
خەرتا: جۆرە شەڵتەیەکی گەورەیە.
خەرتە: زەویی دووجار کێڵراو.
خەرتەلە: گیایەکی گەڵاپانی بەهارییە وەک گەڵا توور وایە بەڵام ئەم سەلکی نییە.
خەرجی: جۆرە بافتەیەکی پانە دەنرێ بەقەراغی کەوا و سوخمەی ژنانەوە. ڕۆژانەیەکە دەدرێ بەمنداڵ.
خەردار: دوو داری ئەستوورە (پردەڵە) یان لەسەر ڕایەڵ دەکرێ.
خەرداڵ: پەلەوەرێکی گەورەی بۆری گۆشتخۆری کێوییە.
خەرات: دارتاشێکە کە دار خەرت بکا و کاسە و کەوچک و کەمۆڵەی لێ دروست بکا.
خەراتی: خەریکبوون بەخەرت و تاشینی کەوچک و کاسەوە.
خەرک: د. هەرگ.
خەرۆ: کەسێکە کە بایی بووبێ: بەکێ (خەرۆ) بوویت؟. کەسێکە کە تەفرەی خواردبێ. (خەرۆبوون) بایبوون. تەفرە خواردن: من بەقسەی تۆ (خەرۆ) بووم. (خەرۆکردن) تەفرەدان.
خەرە: د. مەردوومی خودسەری سەرڕەق.
خەرەک: شتێکی دارینە پەڕەیەکی گەورەی هەیە دووخێکی پێوەیە بەدەسکەڵووجەیەک بادەدرێ و لۆکە و خوری پێ دەڕێسرێ. بەردکێشی دارینە.
خەرەمە: د. نێرەکەر.
خەری: ل. قوڕ.
خەرز: جووتگرتنی گیاندار بێجگە لە ئادەمی (ز). گەرای کوللە و شتی تر (با).
خەرسانن: د. خەسانن.
خەرسکردن: قەبڵاندنی بەری بەرزە درەخت بۆ وەرگرتنی دەیەک لێی.
خەرسەک: سیپاڵی ئەستوور. کولێرەی ئەستووری زبر.
خەرکان: د. خەرکانە.
خەرکانە: برینێکی بەئێشی تەڕی پەرەسێنە بەدەموچاوی منداڵ هەڵدەپەڕێ.
خەرکاو: وتەیەکە هەمیشە لەگەڵ وتەی (خەریک) دەوترێ: خەریک و (خەرکاو)ی کردم.
خەرکۆڵ: کەرکۆڵ.
خەرکەمان: شتێکە وەک چیکەنەکەمەی دەف و بێژنگ و هێندێ شتی تری پێ دەچەمێنرێتەوە.
خەرکەوان: د. خەرکەمان.
خەرگۆلک: کەرەکێوی.
خەرمان: هێندێ شتی درواوەی کۆمەڵەکراوی بەئاخڵە بۆ گێرەکردن و کوتانی وەک گەنم و جۆ و شتی تر دانراوە.
خەرمانان: مانگی حوزەیران.
خەرمانگا: جێ خەرمان.
خەرمان لۆخە: دانەوێڵەیەکە لەسەر خەرمان بدرێ بەهەژاران.
خەرمانلۆغە: خەرمان لۆخە.
خەرمانە: کێرێکە لە هەورێکی تەنک هێندێ جار بەگردی مانگا پەیدا دەبێ و نیشانەی باران بارینە.

خەرمشک: د. مشکی دەشتی.
خەرموورگ: د. مووروەکەرانە.
خەرناز: نازکردنی یەکێک کەلێی نەیەت.
خەروا: شتی پەپکەی پانەوەبوو وەک پەنیر و هەنجیر و قیری پان کراوە. تۆتۆییە کە لەژێر ئاگردا برژێنرابێ.
خەروار: ناوە بۆ سەدمەن وشکەدان.
خەرە: ز. دیواری وشکە کەڵەک.
خەرەبەنگ: د. خەربەنگ.
خەرەفان: تێکچوونی ژیری و بیر لەبەر پیری.
خەرەفاو: کەسێکە کە خەرەفابێ.
خەرەفیاگ: د. خەرەفاو.
خەرەفیان: د. خەرەفان.
خەرەفین: د. خەرەفان.
خەرەنگەز: جۆرە مێشێکی زلی سەوزە.
خەرەنگەزە: خەرەنگەز.
خەریتە: شتێکە ڕاوچی بارووتی تێ دەکا لەکاتی ڕاوکردندا. نەخشەی جیهان.
خەریک: کەسێکە بەکارێکەوە ئالابێ. (خەریکبوون): ئالان بەکارێکەوە. (خەریککردن) ئالاندنی یەکێک بەکارێکەوە.
خەریکە: د. خەریک.
خەزام: ز. گەڵای زەردبووی درەخت لە پایزدا.
خەزن: د. ژن خوشک.
خەزوور: باوکی ژن و مێرد.
خەزووران: بەرەی خەزوور.
خەزوورە: خەزوور.
خەزەڵ: بزنێکە کە تووکی دەست و شانی زەردباوبێ.
خەزێم: قوڵفەیەکی زێڕینە ژنان دەیکەنە لووتیان بۆ جوانی.
خەزیووک: ز. چێشتی ترخێنە.
خەس: خەست.
خەسارە: ز. نیرگەی خانوو.
خەساس: کەسێکە گیاندار بخەسێنێ.
خەسان: خەسین.
خەساندن: کوتاندن یا دەرهێنان یا فلیقاندنەوەی گونی گیاندار بۆ ئەوەی کە نەپەڕێ. شکاندنەوەی تەرزی تەماتە بۆ ئەوەی پەل بهاوێ و بەر دابێڵێ. خەرسکردن (د).
خەسانن: خەساندن.
خەساو: گیاندارێکە خەسێنرابێ.
خەست: شتی شل کە ڕوون و تراو نەبێ.
خەستبوونەوە: توندبوونەوەی شتی شل.
خەستە: دۆیەکە کە کرابێتە ناو کیسەوە و توند بووبێتەوە. نەخۆش.
خەستەخانە: شوێنی دەرمانکردنی نەخۆش.
خەستەک: وتەیەکە شتی زۆر شینی پێ دەشوبهێنرێ: بووە بە(خەستەک)ی شین.
خەستەوی: جۆرە خورمایەکی نەرمە دەکرێتە حەلانەوە.
خەستی: بوونی شت بەخەست: چا بە(خەستی) مەخۆرەوە.
خەسرەوانی: د. جۆرە کووپەیەکی زۆر گەورەیە.
خەسوو: دایکی ژن و مێرد.
خەسە: د. خەستەی توورەکە. نەخۆش. ماندووی شەکەت.
خەسەخانە: د. خەستەخانە.
خەسیاگ: د. خەساو.
خەسیان: د. خەسان.
خەسیاو: د. خەساو.
خەشۆ: مەردوومی شێتۆکەی گێل.
خەشیل: ز. جۆرە گیایەکە.
خەشیم: مەردوومی گێلی نادان.
خەفاندن: د. سەرداخستن.
خەفانن: د. خەفاندن.
خەفتان: خەفتیان. داری ناخودای کەشتی (د). کەشتیوان (د).
خەفتگ: خەوتوو.
خەفتن: د. نوستن.
خەفتوو: د. خەفتگ.
خەفتیان: چلەی زستانە کە تۆوی تێدا ناڕوێ.
خەفگ: ز. فاقە.
خەفگە: د. شوێنی نوستن. چاڵێکە شیشە تووتنی تێدا دادەنرێ (د).
خەفۆک: گایەکە لە جووتکردندا بخەوێ. کەسێکە زۆر خەفەت بخوا.
خەفە: شوێنێکە کە کپ بێ و بابوێری نەبێ. سەماوەرێکە کونی گیرابێ و ئاگرەکەی ڕەش بووبێتەوە. گیانداری تاساو، (خەفەبوون) کپبوون.
خەفەت: خەم و دڵتەنگی.
خەفەتبار: کەسێکە کە خەفەتێکی ببێ.
خەفەتباری: دڵتەنگی.
خەفەتخواردن: بریتییە لە خەفەت پەچنینە دڵ.
خەفەکردن: کپکردنی شت بەڕەنگێک کە بابوێری نەمێنی. بریتییە لە کوشتن و سەرنگوون کردنی یەکێک.
خەفیاگ: د. لقی درەختێکە کە لەژێر زەوی تووڵکێش کرابێ بۆ ئەوەی کە بنجێکی تری لێ سەوز ببێ.
خەل: با. کەڵەکە بەرد.
خەڵات: شتێکە کە یەکێکی گەورە بیبەخشێ بەیەکێکی بەرەو خوارتر لە خۆی لە ڕووی پیاوەتییەوە.

خەڵاتی: شتێکە کە بەخەڵات بدرێ.
خەلان: ز. شکانی دەست و پێ.
خەڵپێت: ژەکێکە کرابێتە ئاگردانی گەرمەوە و مەیی بێ.
خەڵتان: شوێنێکە لە ئەندام یا شتێکە کە زۆر خوێناوی بووبێ: سەری یا کراسەکەی (خەڵتان)ی خوێنە. خەلیلە.
خەلتانە: خەلیلە.
خەڵف: لقی یەکسالەی درەخت.
خەڵوا: خەروا.
خەڵووز: پشکۆ ئاگری کوژاوە.
خەڵووزان: شوێنێکی تایبەتییە لە ماڵدا کە هەر خەڵووزی تێ بکرێ.
خەڵووزدان: خەڵووزان.
خەڵووزە: دەردێکە تووشی بێستان دەبێ ڕەشی هەڵدەگیرێ. ناوی دێیەکە لە مەریوان لە سنووری شلێر.
خەلوول: میچی قاچی ڕەشەوڵاخ.
خەلە: دەغڵ.
خەڵەتان: تەفرەخواردن.
خەڵەتاندن: تەفرەدان.
خەڵەتانن: خەڵەتاندن.
خەڵەتاو: کەسێکە کە تەفرەی خواردبێ.
خەڵەف: د. توێکڵی درەخت.
خەڵەفاگ: خەڵەتاو.
خەڵەفان: تێکچوونی مێشک لەبەر پیری.
خەڵەفاو: کەسێکە لەبەر پیری خەڵەفابێ.
خەلەفرۆش: کەسێکە پیشەی هەر خەلەفرۆشتن بێ.
خەڵەفیاگ: خەڵەفاو.
خەڵەفین: خەڵەفان.
خەلەندوور: ز. جۆرە گیایەکی شیرینە دەخورێ.
خەڵێف: پلوورەی تووڵینی هەنگ.
خەلیت: ز. دەرمان و ئەسبابی تفەنگی شینکە.
خەلیلە: گیایەکی بەهارییە گوڵێکی پژپژی دانەدانە دەگرێ پژەکانی دانی پێ دەئاژنرێ.
خەم: خەفەتی دڵ و دەروون. پێچی شت: ئەم دارە (خەم)ێکی تێدایە واتە پێچێک.
خەمازە: د. چاکڵە.
خەمبا: ئاوسانێکی کەمە کە بکەوێتە جەستە و ئەندامی ئادەمیەوە.
خەمباتێکەوتن: کەوتنی خەمبا بۆ ناو جەستەی ئادەمی.
خەمبار: خەفەتبار.
خەمباری: خەفەتباری.
خەمخوار: کەسێکە کە بەخەم شتێکەوە بێ.
خەمخواری: بەتەنگەوەبوونی شتێک و خەم بۆ خواردنی.
خەمخۆر: خەمخوار.
خەمخۆرک: قلێش و کونێکە کە لە هاویناندا لەبەر وشکی لە زەوی پەیدا دەبێ.
خەمخۆرکە: خەمخۆرک.
خەمخۆرە: خەمەخۆرە.
خەمخۆری: خەمخواری.
خەمرەوێن: کەسێکە یا شتێکە کە خەم لە دڵدا لابەرێ.
خەمزە: غەمزە و ناز (د). ناوی دێیەکە لە شارباژێر.
خەمشەسەرێ: وتەیەکە بۆ کردنی کارێک بەکاردێنرێ کە بە ناپوختی و نارێکی بکرێ: تۆ کار (بەخەمشەسەرێ) مەکە.
خەمگین: خەفەتبار.
خەمل: ز. ئەسبابی جوانی لە چەک و کاڵا و خشڵ.
خەملان: خەملین.
خەملاندن: خەملکردن.
خەملانن: خەملاندن.
خەملکردن: دانانی ئەندازەیەک لە بڕ بۆ وشکەدان و بەری ڕەز و باخ بۆ باج لێ سەندنی.
خەملین: پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی هەموو شتێک.
خەملیو: شتێکە کە بەخۆیدا هاتبێ.
خەمناک: د. خەمبار.
خەمۆش: خامۆش.
خەمۆشی: خامۆشی. سەبووری: زووزوو وەرە لام چونکی (خەمۆشی)م پێت دێ.
خەموور: ز. مەرێکە کە ناوچەوانی خاڵخاڵ بێ.
خەمەخۆرە: باڵندەیەکی گەورەی قاچ و مل درێژە هەمیشە بەماتی لە کەناری ئاو هەڵدەنیشێ.
خەمیلاندن: ز. جوانکردن.
خەمیر: ل. هەویر.
خەن: گەردن.
خەناوکە: ز. ملوانکە.
خەناووک: خەناوکە.
خەنجۆک: خەنجەر.
خەنجەر: تیغێکی تیژی کەوانەداری دەم پانی لووت باریکی دووخداری مشتووداره دەخرێتە کێلانەوە و دەکرێ بەبەر پشتێندا.
خەنجەربازی: جۆرە یارییەکە هێندێ کەس بەخەنجەری ڕووت دەیکا.
خەنجەربالا: باڵ خەنجەرە.

خەنجەربالّە: خەنجەربالا.
خەنجەردەم: دار کونکەرە.
خەنجەردەمە: خەنجەردەم.
خەنجەرەدمە: جۆرە کوللەیەکی کلک درێژە.
خەنجەلیس: ز. بنکی گیایەکە دەخورێ.
خەندەق: چالّێکی قوولّی درێژە کە لە زەوی هەلّکەندرابێ.
خەندەق دانەوە: بناغەدانەوەی دیوار. هەلّکەندنی خەندەق.
خەنزراندن: ز. هەلّکرووزاندنی مووی سەر و پێی ئاژالّ لەسەر ئاگر بۆ پاککردنی.
خەنۆک: تانجییەکە لەبەر پیری بێ هێز بووبێ و نەتوانی ڕاو بکا و، لەبەرچاوی خاوەنەکەی خۆی بکوتێ و پەلاماری نێچیر بدا بەلّام کە دوور کەوتەوە خۆی بخلافێنێ. بریتییە لە کەسێک لەبەر بێهێزی خۆی بخلافێنێ لە کارێکدا.
خەنە: گەلایەکی سەوزە دەهاڕرێتەوە و ژنان بۆ جوانی لە سەر و دەست و پێیانی دەگرن. پێکەنین (د).
خەنەبەندان: بەکۆمەلّی خەنە تێگرتن لە شاییدا.
خەنەک: خەنۆک. خەندەق (د).
خەنیم: کەسێکە کە وەک یەکێکی تر وابێ لە دەسەلات و هێز و تەواناییدا: فیسار کەس (خەنیم)ی دە کەسە واتە دەرقەتی دەکەس دێ، یا تۆ (خەنیم)ی فیسار کەس نیت، واتە هاوشانی ئەونیت.
خەنین: پێکەنین.
خەنینەوە: پێکەنین بەکولّ کە بەدەنگی بەرز نەبێ.
خەو: بێ هۆشییەکە بەسەر گیانداردا دێ و دەبێ بەمایەی حەسانەوەی.
خەوار: ز. گیاندارێکە کە زۆر بنوێ.
خەوالّوو: کەسێکە کە خەو گرتبێتی.
خەوبردنەوە: نووچبردن بەدەم خەوەوە.
خەو بەسەر چوون: خەوزڕان.
خەوبینین: بینینی شت لە خەودا.
خەوپەڕین: خەوزڕان.
خەوتن: نوستن.
خەوتنان: کاتی نوستن لە شەودا.
خەوتوو: نوستوو.
خەوتەقین: خەوزڕان.
خەوخۆش: کەسێکە زوو خەوی لێ بکەوێ و درەنگ بێداربێتەوە.
خەوڕەوێن: شتێکە کە خەو نەهێلّێ.
خەوڕەوین: ڕەوینەوەی خەو و نەمانی.
خەوزڕان: خەوڕەوین.
خەوش: زیوان و پیسی ناوخەلە.
خەوگا: د. شوێنێکە بۆ نوستن دانرابێ.
خەوگران: کەسێکە کە خەوی قورس بێ و درەنگ بێداربێتەوە.
خەوگرتن: سەردانی خەو لە یەکێک و خەوالّووبوونی. قەدەغەکردنی خەو لە یەکێک بۆ سزادانی.
خەو لێکەوتن: هاتنی خەو بەسەر گیانداردا.
خەون: خەو.
خەوۆک: کەسێکە کە زۆر بنوێ.
خەوون: ز. خەوبینین.
خەوەنوچکە: وەنەوزەکوتێ.
خەوەنوچکێ: خەوەنوچکە.
خەیات: کالادروو.
خەیاتە: جۆرە هەودایەکی ڕەنگاوڕەنگی ئاوریشمە.
خەیاتەکێش: جۆرە دەرزییەکی باریکی کون پچووکە زۆرتر خەیاتەی پێوە دەکرێ.
خەیاتی: خەریکبوون بەدروومانی کالاوە.
خەیار: خواردەمەنییەکی سەوزە وەک ترۆزی.
خەیار چەمەر: جۆرە درەختێکی گەرمیانییە بەرێکی هەیە وەک لوولە قامیش وایە ناوەکەی خانەخانەیە چەند پەڕەیەکی تێدایە لەناویاندا دانەیەکی زەردی تێدایە پەڕەکانی لە ئاودا دەسووڕێنەوە بۆ ڕەوانی دەدرێ بەمندالّ.
خەیارە: جۆرە دومەلّێکی گەورەیە لە ئەندام پەیدا دەبێ و بەقەد خەیارێک دەبێ.
خەیانن: د. خایاندن.
خەیر: وتەیەکە لە وەرامی پرسیاردا دەوترێ و نەبوون دەگەیەنێ: (خەیر) لە وەرامی یەکێکدا کە لێت بپرسێ خوێندووتە؟ واتە نەمخوێندووە.
خێ: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. خوێ.
خێت: د. کێڕ لەسەر کاغەز یا لە سەر زەوی.
خیپشنە: خیپشەملە.
خیپشەملە: مەردوومی کولّەبنەی مل کورتی تێکسمراو.
خێچ: وتەیەکە هەمیشە لەدوای وتەی خوارەوە بەکاردێنرێ و، هەر مەبەستی ئەو دەگەیەنێ: خوار و (خێچ).
خێر: چاکە بەکردار یا بەگوفتار لەگەلّ مەردووم یا گیانداری تر.
خێرا: گیانداری گورج و گۆلّ.
خێراتن: د. بەخێرهاتن کردنی کەسێک.
خێراندار: خێرەومەند.
خێراو: ئاوێکە لە سەرەڕێدا دابنرێ لە شوێنێکی دوور لە ئاو بۆ خواردنەوەی ڕێبوار بەخێر.
خێرایی: چاپوکی و گورج و گۆلّی.

خێردانەوە: بەهرە و کەڵکی شتێک بۆ یەکێک: ئەم باخە زۆر (خێر)ی دایەوە.
خێروو: خوێری. سەوزاییەکە لە جاری پێشووی خۆی سەوز بووبێتەوە.
خێرکردن: چاکەکردن.
خێر لێ بینین: بەهرە و کەڵک دەستکەوتن لە شتێکەوە.
خێرهاتن: خێراتن.
خێرەومەن: خێرەومەند.
خێرەومەند: کەسێکە زۆر خێر بکا.
خێرەوەدەر: شتێکە کە بەهرە و کەڵکی زۆری لێ وەچنگ بکەوێ.
خێز: ز. کێڕ.
خێزان: ژنی مەردووم. ئەو کەسانەن کە لەناو ماڵدا بەخێویان دەکەیت.
خێزاندار: کەسێکە خێزانی زۆری ببێ.
خێزەرە: چیلکە و چەواڵێکە لەسەر قامیشبەندی خانووەوە دادەنرێ.
خێزیان: د. هەستان.
خێسەکردن: مۆڕبوونەوە.
خێل: کەسێکە کە چاوی خوار و گێرِبێ. ئەو ژنانەن کە دەچن بۆ بووک (ز).
خێڵ: چەند ماڵێکی کۆچەری.
خێڵاتی: کەسێکە کە خێڵنشین بێ.
خێڵەوخوار: کاتێکە کە خێڵاتی پایزان لە کوێستانەوە دێن بۆ گەرمیان.
خێڵەوژوور: کاتێکە کە خێڵاتی لە هاویناندا دەچن بۆ کوێستان.
خیلی: ز. سەرپۆش.
خێو: خاوەن. درنج.
خێوکردن: د. بەخێوکردن.
خێوەت: پارچە تەنراوێکی گەورەیە لە دەشتدا هەڵدەدرێ وەکو خانوو.
خێوەتگا: شوێنێکە کە خێوەتی زۆری تێدا هەڵبدرێ.
خیچ: خێل. کێڕ (با). ژەک (ز).
خیز: زیخ.
خیزار: ز. مشاری گەورە.
خیزان: هەژار.
خیزخوڕ: با. کەناری چەم و ڕووباری گەورە کە هاوینان ئاوەکەی کشایەوە بکرێ بەشینایی.
خیزە: دەنگێکە لە سنگەوە دێ لە کاتی هەناسەداندا لەبەر نەخۆشی. (خیزەخیز) خیزەی یەک لە دوای یەک.
خیسار: با. سیخوار.
خیشکردن: متبوون و خۆ گیڤکردن لە قیندا.
خیشەخیش: نیخەنیخ و دامان بەدەست شتێکەوە.
خیگۆلکە: د. خیگەی پچووک.
خیگە: هیزە.
خین: خوێن.



دا: پیتێکە بۆ بەستنەوەی دوو وتار بەیەکەوە بەکاردێنرێ: لەگەڵ نەریمان(دا) بچۆ بۆ قوتابخانە، یا پیاوی باش لە جیهان (دا) خۆشەویستە. پیتی وریاکردنەوە: (دا) وەرە. پیتێکە دەکەوێتە پێش هێندێ ناو (اسم)ەوە مەعنای جووڵانەوەیەکی سەر بەرەوخوار دەگەیەنێ: (دا)ماڵین، (دا) درین، (دا) خستن. دایک (ز)،

داب: ز. گوریسێکە لە مووی کلکی ولاخ دروست کرابێ.

دابارین: کۆبوونەوەی چەند کەسێک یا چەند گیاندارێک بەسەر شتێکدا.

داباش: ز. باسکردنی شتێک.

دابران: جوێبوونەوەی شتێک لە شتێک: مەڕەکە لە ڕانەکە (دابرا). لەتبوونی شتێک بەهۆی شتێکی تیژەوە.

دابرکردن: برکردنی شتێک لە شتێک.

دابڕین: بڕدان و جوێکردنەوەی شتێک لە شتێک: لایەکی لە زەوییەکەم (دابڕی).

بڕین: چەقۆکە یا دەزووەکە پەنجەی (دابڕیم). لەلەکردنی شتێک.

دابوون: سەرقەلانکردن و پشت دانەواندن لە هێندێ یاریدا لەکاتی تێکەوتندا.

دابەرزین: ز. سنگدانە پێشەوە بۆ جەنگ.

دابەزاندن: هێنانەخوارەوەی سوار لەسەر پشتی ولاخ.

دابەزین: هاتنەخوارەوە لەسەر پشتی ولاخ.

دابەستن: بەستنەوەی هێندێ ئاژاڵ و ئالیک پێدانی و چاودێریکردنی بۆ قەڵەوبوونی. بەستنی شتێک بەسەر شتێکی ترەوە: پاشکۆکەت (دابەستە). نییەت هێنان و چوونە ناو نوێژەوە: نوێژەکەی دابەست.

دابەستە: ئاژاڵێکە کە بۆ قەڵەوبوون بەسترابێتەوە.

دابەشکردن: بەش بەش کردنی شتێک بەسەر چەند کەسێکدا.

دابەلاندن: ز. قووتدان.

دابێژان: بێژانەوەی دانەوێڵە و ئارد بەبێژنگ و هێڵەک. کون کون بوونی شت بەهۆی گوللە یا مۆرانەوە.

دابێژدابێژ: شتێکە کە کون کون بووبێ.

دابین: گیاندارێکە کە ئارامی گرتبێ. (دابینبوون): ئارامگرتنی گیاندار. (دابینکردن) ئارام پێ گرتن.

داپاچین: داهێنانی لق و پۆپی درەخت بەرەنگێک کە تیغەکەی سەر بەرەوخوار لێ بدرێ.

داپچران: داچەقان و دەمدانەوەی چاو و دەم و هێندێ شتی تر.

داپچراندن: داچەقاندن و دەمدانەوەی هێندێ شت.

داپچرین: داپچراندن.

داپرووزقان: داپرووسقان.

داپرووزقانن: د. داڕووتاندن.

داپرووزقیان: د. داڕووتان.

داپرووسقان: د. داڕووتان.

داپرووسقانن: د. داپرووزقانن.

داپرووسقیان: د. داپرووزقان.

داپژان: ڕژان و پژان و بڵاوبوونەوەی دانەوێڵە و شتی تر.

داپسکیان: د. فسدانی مریشک بۆ کەڵەشێر.

داپسیان: د. داپسکیان.

داپلۆخان: سووتان و داماڵانی شوێنێک لە جەستە بەهۆی ئاگر یا ئاوی لە کوڵەوە.

داپلۆخاندن: سووتاندن و داماڵینی شوێنێک لە ئەندام بەئاگر یا بەئاوی لە کوڵ.

داپلۆخین: داپلۆخان.

داپلۆسان: داپلۆساندن.

داپلۆساندن: داپلۆستن.

داپلۆستن: داپلۆسین.

داپلۆسکان: د. داڕووتان.

داپلۆسکانن: د. داڕووتانن. ڕووتکردنەوە.

داپلۆسکیان: د. ڕووتبوونەوە. داڕووتان.

داپلۆسین: داگرتنی یەکێک بەلێدانی یەک لەسەر یەک.
داپۆشین: شـاردنەوەی شـتـێک بەدانی شـتـێکی تر بەسـەریدا. بریتییە لە ونکردنی دەنگوباسێک یا نەنگی یەکێک.
داپەڕین: هاتنە خـوارەوەی گـیـاندار بەچالاکی لە بەرزییـەوە بۆ نزمی.
داپێچان: پێچانی شتێک بەسەر شتێکی تردا.
داپیرۆشکە: ز. جاڵجاڵۆکە.
داپیر: نەنک.
داپیرک: با. مامان.
داپیرۆکە: داپیرۆشکە.
داپیرە: داپیر.
داتاشراو: شتێکە کە تاشرابێ.
داتاشین: تاشینی شتێک سەر بەرەوخوار. دروستکردنی وشەیەک لە وشەیەک.
داتروسکان: داچڵەکین.
داتروسکاندن: داتروسکانن.
داتروسکانن: داچڵەکاندن.
داتروسکیان: د. داتروسکان.
داتسیان: داتەپین.
داتسین: داتسان.
داتلیشان: تلیشان و لەتبوونی هێندێ شت لەباری درێژی.
داتلیشاندن: تلیشاندن و لەتکردنی هێندێ شت لە باری درێژی.
داتورسکان: ترسان و ڕاچەنینی گیاندار.
داتورسکاندن: ترساندن و داچڵەکاندن.
داتەپین: نزمـبـوونەوە و داتسـانی بـان و گـوێسـوانە. بریـتـییـە لە پیربوون و بەناوداچوونی گیاندار.
داتەقـانـدن: کـردنی نوێژ بەپەلە و دەسـتـوبرد: نوێژەکـەت (داتەقێنە).
داتەکاندن: تەکاندن و ڕاوەشاندنی هێندێ شت سەر بەرەوخوار بەجۆرێک کە هیچی تێدا نەمێنێ.
داتەکیان: د. داتەکین.
داتەکین: بریتـیـیـە لە نابووتبـوونی مـەردووم: ئەوەندەم لە منداڵەکانمدا بەخت کرد (داتەکیم): واتە هیـچم بەدەسـتـەوە نەما. چۆڵبـوونی دەفر لەو شتـەی کە تیایەتی بەجۆرێک کە هیـچی تێـدا نەمـێنێ. بریتـیـیـە لە پیـربوون و بەناوداچوونی گیاندار.
داتەمیان: د. داتەمین.
داتەمین: د. نیشتنی تەم و خەم لە یەکێک.
داچاندن: تۆووەشاندن بەزەوییەوە. چین لەسەر چین دانانی هێندێ شت: بامێکە داچێنە: واتە لەگەڵ گۆشت و تەماتەکەدا چین چین داینێ.

داچزان: چزانی شوێنێک لە ئەندام بەئاگر یا بەشتێکی داخ.
داچڵەکان: داتروسکان.
داچڵەکاندن: داتروسکاندن.
داچڵەکیان: د. داچڵەکین.
داچڵەکین: داچڵەکان.
داچنین: چنین و ڕیزکردنی شت لەسەر شت.
داچۆڕان: هاتنەخوارەوەی شتێکی شل لە شتێکی تر.
داچۆڕاندن: خـوارکـردنەوەی دەفـرێک بۆ هاتنەخوارەوەی شـتـێکی شل لێی بەڕەنگێک کە هیچی تێدا نەمێنی.
داچۆڕانن: داچۆڕاندن.
داچۆڕیان: د. داچۆڕان.
داچۆڕین: داچۆڕان.
داچوون: ڕۆچوون.
داچەقان: داچەقین.
داچەقـانـدن: بردنەخـوارەوەی شـتـێک بەشـتـێکی تردا بەنهـێم. داپچڕاندن.
داچەقانن: داچەقاندن.
داچەقیان: د. داچەقان.
داچەقین: چەقینی شتێک بەشتێکی تردا.
داچەکان: نارێکی و خواروخێچیی شان و مل.
داچەکاو: شان و ملی نارێکی خواروخێچ.
داچەکین: داچەکان.
داچەندن: داچاندن.
داحلاندن: داهێشتن.
داخ: خەفەت. پیتی دەربڕینی خەفەتی دەروون: (داخ) لە دەست ڕۆزگـار. شـوێنێکە لە جەسـتـەی گـیـاندار کـە سـووتێنرابێ: لاجـانگی (داخ)ی پێـوەیە. شـتی زۆر گـەرم: چایەکـە زۆر (داخ)ە، واتە زۆر گـەرمـە. ئاسنێکی سـەرپانە جـەسـتـەی گیانداری پێ داخ دەکرێ.
داخدار: داخ لە دڵ.
داخـراو: شـتی ڕاخـراو. شـتی فـرێدراو. دەرگـا و پەنجـەرەی هەڵپێکراو.
داخریاگ: د. داخراو.
داخزان: ترازان و خلیسکانی شتێک لە شوێنێک.
داخزین: داخزان.
داخستن: ڕاخستن: قایمکردنی ئەڵقەرێز و قفڵ و شمشێرەی دەرگا و هێندێ شـتی تر. هەڵکەندن و چاڵکردنی شـوێنێک لە زەوی: بناغـەی دیوارەکـە (داخـە). گـەرمکردنی حـەمـام و تەنوور. فرێدان.
داخکردن: سووتاندنی شوێنێک لە جەستەی گیاندار. گەرمکردن و قرچاندنی ڕۆن لەسەر ئاگر.

داخ لە دڵ: کەسێکە دڵی پڕ بێ لە داخ و خەفەت لە دەست شتێک.
داخم ناچێ: داخەکەم.
داخۆ: ئاخۆ.
داخوا: داخۆ.
داخواز: کەسێکە شتێکی بوێ و هەوڵی بۆ بدا.
داخوازی: ویستنی شتێک و هەوڵدان بۆی. شتێکە کە بەدوایدا دەگەڕێیت.
داخواستن: خواستنی شتێک.
داخوران: داڕووخان و کەلەبەر تێکەوتنی شوێنێک لە سەرەوە بۆ خوارەوە: ئەم دیوارە (داخوراوە).
داخورپان: داتروسکان.
داخورپاندن: داتروسکاندن.
داخورپیان: د. داخورپان.
داخوزین: د. دابەزین لەسەر وڵاخ.
داخوستن: د. داخوزین.
داخۆم: د. داخۆ.
داخەکەم: وتەی دەربڕینی خەفەت.
داخی بەجەرگم: داخەکەم.
داخی داخانم: داخەکەم.
داخی گرانم: داخەکەم.
داد: نەکردنی جەور و ستەم. وتەی دەربڕینی داخ و خەفەت: (داد) لە دەست پیاوی خراپ.
دادا: نەنک (ل). دایک (د). دایەن (د).
دادار: خوا.
دادان: تیژکردنی سەری دار و قەڵەم. قوڕ ڕۆکردن لەسەر چینی دیوار. چوونە خوارەوە و دەڵاندنی شتی شل: حەوزەکە ئاو (دادەدا) یا کووپەکە ڕۆن (دادەدا). دامەزراندنی کەلووی گۆڕەوی و لفکە: سەری لفکەکە یا گۆرەوییەکە (دادە). دامەزراندنی مەشق بەنووسینی دێرێک لە سەری لاپەڕەوە بۆ ئەوەی کە لەبەری بنووسرێتەوە: مەشقم بۆ (دادە). داخستنی دەرگا (ز).
دادانەوە: شۆڕکردنەوەی پەردە و دەڕابە و هێندێ شتی تر.
دادبەر: کەسێکە کە شکات لە یەکێک بکات و داد بباتە لای داد پرسێک.
دادپرس: کەسێکە هاواری جەور و ستەم بپرسێ.
دادپەروەر: کەسێکە کە جەور و ستەمی پێ ناخۆش بێ.
دادخوا: د. دادبەر.
دادخواز: د. دادخوا.
دادخوازی: د. دادخوایی.
دادخوایی: د. سکاڵاکردن.
دادڕان: دڕانی کاڵا و هێندێ شتی تر لەسەر باری درێژی.
دادڕ دادڕ: کاڵایەکە لە گەڵێ لاوە سەربەرەوخوار دڕابێ. شوێنێکە لە زەوی کە ناوبەناو ئاو دایدڕیبێ.
دادڕەس: فریاڕەس.
دادڕەسی: فریاڕەسی.
دادڕین: دڕاندنی شت لەسەر باری درێژی.
دادروون: دروونی شتێک بەسەر شتێکی تردا. بریتییە لە خەنجەردان لە یەکێک.
دادگە: مەحکەمە.
دادنووس: کاتبی عدل.
داد و بێداد: داد و فوغان.
دادۆشین: دۆشینی گوانی گیاندار بەنهێتم. دەست بەئەندامی لەجێچووودا هێنان لەناو ئاوی گەرمدا بۆ هێنانەوەجێی خۆی. بریتییە لە داڕووتاندنی مەردووم بەناخونەک.
داد و فوغان: هاوار و کڕووزانەوە.
دادوەر: قاضی.
دادوەری: قضاء.
دادە: خوشکی گەورە. دایک (د).
دادی: د. دایەن.
دار: لقی گەورەی درەخت کە لێی بووبێتەوە. درەخت: لەژێر سێبەری دارەکەدا نوستم. ئەندازەیەکە وەک ڕبە خوێی پێ دەپێورێ. پیتێکە دەنرێ بەدوای هێندێ ناوەوە، خاوەنداریی یەکێک دەگەیەنێ بۆ ئەوناوە: دەفتەر (دار)، کلیل (دار)، خەزنە (دار)، تاج (دار).
دارا: دەوڵەمەند. جۆرە دەرمانێکی تیژە لەگەڵ دەرمانی چاودا بەکاردێنرێ.
دارانەوە: بووردنەوە و بەلاداهاتن: فیسار کەس کوتوپڕ (دارایەوە).
دارایی: دەسەڵات و دەست ڕۆیشتن. جۆرە پەشتەماڵێکە. دەرمانێکی تیژە بۆ چاو بەکاردێنرێ کە پێی دەڵێن (دارا).
داربا سقەندە: جۆرە دارێکە دارجگەرە و داردەستی لێ دروست دەکرێ.
داربا سقەنگە: داربا سقەندە.
داربڕ: ز. گیاندارێکی پچکۆلەیە لە دڕندە.
داربڕ: دارکەر.
داربۆکردن: بریتییە لە تۆڵەسەندن لە یەکێک: فیسار کەس دارێکی بۆ فیسار کەس کرد، واتە تۆڵەی خۆی لێ سەند بەتەواوی.
داربەس: داربەست.
داربەست: چەند دارێکە لە شوێنی بەرز لێک دەدرێن وەستا کاری لەسەر دەکا.

داربەند: داربەست.

داربەندخوێن: دارێکی لووسی باریکی کورتە بەندە خوێنی پێ هەڵدەکێشرێ لە دەرپێ و ڕانک و شەرواڵ و دەمەرقۆپان.

داربێرە: دوو داری دوو پەلە سەرە دوو پەلەکانیان دەخرێتە سەر زەوی، سەرەکەی تریان یەکێکیان بستێک بەرەوخوار کونێکی تێدایە، سەری ئەوی دیکەیانی پێدا دەکرێ بەرەنگێک کە سەری هەردووکیان تێکپەڕێ، ئەم دارە لە مۆڵگەی ئاژاڵ دادەنرێ بۆ ئەوەی کە شوان لە سەری دانیشێ و سەری ئاژاڵە دۆشەنییەکان بگرێ بۆ دۆشین.

دارپاچ: د. تەورداس.

دارتاش: وەستایەکە لە دار و تەختە شت دروست بکا.

دارتاشخانە: شوێنێکە کە دارتاشیی تێدا بکرێ.

دارتاشی: پیشەی دارتاش.

دارتەپان: تەپەی جۆلایی.

دارتەرم: شتێکی درێژی لاوانەداری دەسک دارینە مردووی پێ هەڵدەگیرێ.

دارتەقێنە: د. دار کونکەرە.

دارتەل: کۆڵەکەیەکی دار یا ئاسنە کە تەلی کارەبا یا تەلەفۆنی پێدا ڕائەنگێورابێ.

دارجگەرە: دارێکی کون تێکراوە جگەرەی پێ دەکێشرێ.

دارچین: دارچینی.

دارچینی: توێکڵە دارێکی سوورکاری بۆنخۆشی گەرمیانییە لێ بەچایی دەنرێ و لەگەڵ بەهاراتیشدا بەکاردێنرێ.

داردەست: دارێکی ڕاستی لووسە کە بگیرێ بەدەستەوە.

داڕزان: ڕزان و داوەشانی شت.

داڕزاو: شتی ڕزاوی داوەشاو.

داڕزیاگ: د. داڕزاو.

داڕزیان: د. داڕزان.

داڕزین: داڕزان.

داڕژان: هاتنە خوارەوەی باران بەلێزمە.

داڕژاندن: داڕشتنی هێندێ شت بەقاڵب.

داڕژیان: د. داڕژان.

داڕسان: پەلاماردان.

داڕسکاندن: ڕاپسکاندن.

داڕشتن: تواندنەوەی شتێک و کردنە ناو قاڵبی. داڕژان.

داڕشتە: شتی داڕێژراو.

داڕنین: دەستهێنان بە لق و پۆپی درەختدا بۆ داماڵینی گەڵای. داتاشینی سواغی کۆنی دیوار.

داڕۆچکە: شتی شۆڕەوەبوو، (داڕۆچکەکردن): شۆڕکردنەوەی شتێک لە بەرزییەوە.

داڕوو: دەرمانێکی تیژە لە قسڵ و زەڕنیق دروست دەکرێ لە هەر شوێنێکی موودار بدرێ دەیڕووتێنێتەوە.

داڕووتان: ڕووتبوونی درەخت لە گەڵا و لق و پۆپ. ڕووتبوونی سەر و پێ لە موو.

داڕووتاندن: ڕووتاندنەوەی لقی درەخت لە گەڵا. ڕووتکردنەوەی یەکێک و هیچ پێ نەهێشتنی. کردنەوەی موو لە سەر و پێ.

داڕووتانن: داڕووتاندن.

داڕووجان: گیایەکی باڵا بەرزە زۆرتر لەناو مەرەزەدا دەڕوێ، دەنکی وەک دەنکی (کەردر) وایە.

داڕووخان: ڕووخانی دیوار و کۆسپایی سەربەرەوخوار. داڕووخانە (د).

داڕووخاندن: ڕووخاندنی دیوار و کۆسپایی سەربەرەوخوار.

داڕووخانە: شوێنێکە لە حەمام کە داڕووی تێدا دەگیرێ.

داڕووخیان: د. داڕووخانی دیوار و شتی تر.

داڕووگرتن: هەڵسوونی داڕوو لە موو لە حەمامدا.

داڕێژگە: قاڵب.

داڕێژی: داڕشتن.

دارژمێر: ژماردنی هێندێ شت بەدار وەک ئاژاڵ و خشتی هەڕەکراو.

دارستان: شوێنێکە کە درەختی زۆری تێدا بێ.

دارسان: دارستان.

دارشەق: دوو دارە دەدرێتە بن باخەڵ بۆ پێ ڕۆیشتنی لەکاتی شەلیدا.

دارشەقێن: دارێکی تایبەتییە یاریی (شەقێن)ی پێ دەکرێ.

دارڤان: با. دارکەر.

دارقەپان: دارێکی گردی لووسە دوو کەس دەیخەنە سەر شانیان و شتی پێ لە قەپان دەدەن.

دارقەندە: دارێکی درێژی کونکراوە دەکرێ بەکونی قەندەدا.

دارقەوام: ز. شتێکە داری خواری پێ ڕاست دەکرێتەوە.

دارک: لاسک و دەماری وشکەوەبووی توتن.

دارکاری: لێدانی گیاندار بەدار یەک لەسەر یەک.

دارک بژێر: کەسێکە دارک لە توتن جیا بکاتەوە.

دارکردن: بڕینی دار بۆ سووتاندنی.

دارکنێر: درەختێکی بۆنخۆشی کوێستانییە دارەکەی لە داری چواڵە دەچێ.

دارکونکەرە: باڵندەیەکی دەنووک درێژی سەر سووری بەرسنگ زەردی سەر باڵ ڕەش و سپییە بەقەد ڕیشۆڵەیەک دەبێ.

دار کەپیچان: وتەیەکە مەردوومی زۆر لەڕ و لاوازی پێ دەشوبهێنرێ: فیسار کەس دەڵێی (دار کەپیچان)ە، واتە وەک دارێکی ڕەق وایە کە پەڕۆی تێوە پێچرابێ.

داركەر: كەسێكە كە دار بەزۆری ببڕێ بۆ سووتاندن.
دارگــوڵ: دارێكە ڕەنگی لە داری بناو دەچێ گــوڵێكی ســپی دەگرێ. شتێكە لە وێنەی بنجی گوڵەباخ لە دار و كاغەزی ڕەنگاوڕەنگ دروست دەكرێ.
دارگەز: دارێكی باریكی جیرە لە داری سەرو دەچێ لە قەراغ رووبار شین دەبێ، گــەڵای ریشــاڵ ریشــاڵە و بەتەڕی دەسووتێ، لقەكانی لە گەزی پێوان دەچێ.
دارماڵ: بریتییە لە دەفرێك كە لیوانلێو بێ لە شتێكی وشك بەبێ قەڵاكردنی. دارماڵكردن: لیوانلێوكردنی دەفرێك لە شتێكی وشك.
داروبار: بریتــیــیــە لە قــەڵافــەت و قــەبارەی شت: نەریمان (داروبار)ێكی بەهێزی هەیە.
دارودەسە: د. دەستە و دایەرە.
دارۆغــە: كەسێكە لەلایەن دەوڵەتەوە پاسەوانی ئاسایشی پێ سپێردرابێ.
دارۆغەبازاڕ: حەسحەسی بازاڕ.
دارەبەن: درەختــێكی بۆنخۆشــە قــەزوان دەگرێ و بنیشــتــەتاڵ دەردەدا.
دارەت: چونێتی و حاڵەت: خۆت لەو (دارەت)ە مەدە واتە خۆت واپێـــشـــان مـــەدە، ئەم وتەیە هەر لە نەبوون (نفی)دا بەكاردێنرێ.
دارەتەرم: د. دارتەرم.
دارەدار: د. دارەدارە.
دارەدارە: هەستانە سەرپێی منداڵی ساوا لەپێش پێ گرتنیدا.
دارەڕا: ئەو دارانەیە كە ڕایەڵی خانووی پێ دەكرێ.
دارەڕەش: داری بناو.
دارەسمە: د. داركونكەرە.
دارەشكێنە: دەرمانێكی سەوزی تیژی سووتێنەرە دەكرێ بەهێندێ برینی پیسەوە.
دارەكەوە: هـ. داركونكەرە.
دارەگەز: دارگەز.
دارەگەڵ: درەختێكی گەورەیە كە لە سەرەوە دوو ناوپەلی قووڵی ببێ گەڵای داربەڕووی تێدا هەڵچنرێ بۆ ئاژاڵ.
دارەمەیت: دارتەرم.
دارەوان: گیاندارێكە لە هەڵگەڕان بە دار و درەختدا چالاك بێ.
دارەوەن: درەختــێكی تۆپی چڕی گــەڵا وردی خــڕە، قــۆزاخــەیەك دەگرێ ناوەكەی پڕە لە مێشوولە.
دارهەلووك: دارێكە لە هەلووكی پێ دەدرێ.
دارێ: هـ. داس.
داریانەوە: د. دارانەوە.

داریلانك: بـا. گوڵێكی جوانی كوێستــانییــە كە (ئستــرانە)ی لەسەر بوترێ یا لەسەری بلاوێنرێتەوە گوڵەكەی هەڵدەوەرێ.
دارین: شتێكە لە دار دروست كرابێ.
دارینە: دارین. نانەشان.
دارینەوە: دارانەوە.
داژەنین: كــردنەوە و لەیەك هەڵوەشــاندنی پارچەی ســەعــات و تفەنگ و دەمانچە و شتی تر.
داس: ئاسنێكی كلك دارینی دەم كــەوانەییــیــە دروێنەی پێ دەكرێ.
داسپارن: د. ڕاسپاردن.
داستان: بەسەرهات و سەرگوروشتە.
داسخاڵە: داسێكە هەرگیای پێ دەدروێ.
داسرەفتن: د. سرەوتن.
داسرەوین: د. داسرەفتن.
داسك: دەزوو: فیسار كەس بووە بە(داسك) و دەرزی.
داسماڵ: باكۆدانی گیا بەداس.
داسولكە: داسی پچووك.
داسووك: ز. داسولكە.
داسەكنان: ئارامگرتن و دامركان.
داش: چەند پارچەیەكە لەسەر تەختەی دامە و شەترەنج یارییان پێ دەكرێ. كوورەی ئاگر (د).
داش بەداش: دانی داشێك بەداشێك لە یاری دامەدا. بریتییە لە وتن یا كردنی شتێك بەرامبەر بەشتێكی تر.
داشت: هێشتنەوەی ئاژاڵی مێینە بۆ سك و زا.
داشتن: داشۆرین.
داشدیار: بنەوانی مەردووم لە ماڵدا.
داشكاندن: شكاندنی ئاو بۆ سەر زەویوزار. حیسابكردنی شتێك لەباتی شتێكی تر: لەو پارەیە كە لەلاتە ڕۆژانەكەی ئیمڕۆتی لێ (داشكێنە).
داشكانن: داشكاندن.
داشكەلەرم: قومری.
داشۆڕیان: د. شۆڕبوونەوەی شتێك بەجۆرێك كە تەكەتەكی بێ.
داشۆرین: شۆڕینی شتێك بەبەرزییەكەوە سەربەرەوخوار.
داشەهارە: تاقە داشێكە بەدەست یەكێك لە یاریكەرانی دامەوە دەمێنێتەوە و، لە ڕاستە دەتوانێ بەهەموو لایەكدا بجووڵێ.
داشێ: د. برای گەورە.
داشــێلان: شــێلانی هەویر و قــوڕ و هێندێ شــتی تر بەدەست یا بەپێ.
داغ: داخ.
داغانكردن: بەربادكردنی شت.

داغدار: داخدار.
دافرەقان: داوەشان.
دافرەقیان: د. دافرەقان.
دافرەقین: دافرەقان.
دافەتان: دافرەقان.
دافەتین: دافرەقین.
داقرچیان: د. هەڵقرچان.
داقڵیشان: قڵیشانی شت لەباری درێژی.
داقڵیشاندن: قڵیشاندنی شت لەباری درێژی.
داقنین: دافەتان: یاخوا (داقنییت) واتە داوەشێیت.
داقەڵەشان: داقڵیشان.
داقەڵەشاندن: داقڵیشاندن.
داک: دایک.
داکاسیان: د. داکاسین.
داکاسین: هێدیبوونەوە و دامرکان.
داکتن: ز. شۆڕکردنەوەی شتێک.
داکردن: ڕۆکردنی وشکەدان لە دەفرێکەوە بۆ دەفرێکی تر. دامەزراندن و تاقەتکردنی گیاندار: میوانەکان یا ئاژاڵەکە (داکە). دەستپێکردنی باران: باران (دایکرد). تێخستنی یەکێک لە یاریدا. دانانی دراو یا گوێز لە یاریی مووشێندا بەڕیز: مووشەکان (داکە).
داکرمان: داکرماندن.
داکرماندن: وردکردن و هاڕینی شتی ڕەق بە ددان.
داکشان: هاتنەخوارەوەی شتێک لە بەرزییەوە بەگورجی.
داکشاوی: ئەلفێکی پچکۆلانەیە لەژێر پیتێکی عەرەبیدا دەنووسرێ کە (ی)ی بەدەمەوە بێ.
داکوتان: بردنەخوارەوەی سنگ و بزمار بەشوێنێکدا بەنهێم.
داکوتاندن: داکوتان.
داکورۆژین: داکورۆشتن.
داکورۆشتن: خواردن و وردکردنی شتی ڕەق بە ددان.
داکوژان: بڕانەوەی چنینی گۆرەوی و لفکە و هێندێ شتی تر.
داکوژاندن: بڕینەوەی چنینی گۆرەری و لفکە: لفکەکە (داکوژێنە) واتە ئیتر لێی مەچنە.
داکوژانن: داکوژاندن.
داکوژیان: د. داکوژان.
داکۆکی: د. پشتیوانداری. کۆشش و هەوڵ و تەقەلا.
داکەسین: داسەکنان.
داکەفتن: د. داکەوتن.
داکەندن: دامالینی کالا یا هێندێ چەک لە ئەندام وەک ئەموستیلە و گوارە.
داکەنن: داکەندن.
داکەوتن: کەوتنە خوارەوەی شتێک لە بەرزی. نزمبوونەوەی شتێکی بەرز: نیرگەکە (داکەوتووە) واتە نەویوە. دەست هەڵگرتن و وازهێنان لە کارێک: (داکەوە) واتە وازبێنە. بریتییە لە پیربوون و بەناوداچوونی گیاندار. قەناعەتکردن بەو بەشەی کە هەتە.
داکەوتوو: شتێکە کە داکەوتبێ.
داکێشان: ڕاکێشانی شتێک لە سەرەوە بۆ خوارەوە.
داگا: نەنگ.
داگرتن: هێنانەخوارەوەی شتێک لە بەرزییەوە. داپۆشین و داگیرکردنی شتێک بۆ شتێک: هەور ئاسمانی داگرت. پڕکردنی هێندێ شت لە وشکەدان و هێندێ شتی تر. باری خۆت (داگرە). بریتییە لە لێدانی یەکێک بەزۆری: فیسار کەس فیسار کەسی (داگرت) واتە دەستی کرد بەلێدانی. بریتییە لە قسەکردن بەزۆری: فیسار کەس فیسار کەسی بەقسە (داگرت).
داگرتنەوە: پەستانەوە و گێڕانی بان بۆ ئەوەی توند ببێتەوە و دڵۆپە نەکا. هەڵپێچانی سەری دوو پارچە بەدروون کە لە پێشەوە لە یەک دڕابن. پڕکردنەوەی قەوانی فیشەک بەباڕووت و تەرەقە.
داگوشین: گوشین و دەستهێنان بەشتێکی نەرمدا سەربەرەوخوار.
داگەڕان: هاتنەخوارەوە لە شوێنێکی بەرز.
داگیرسان: هەڵگیرسانی ئاگر و چرا. بریتییە لە داهێزران و تا لێ هاتنی جەستە: لەشم (داگیرساوە).
داگیرساندن: هەڵگیرساندنی ئاگر و چرا.
داگیرسانن: داگیرساندن.
داگیرسیان: د. داگیرسان.
داگیران: گرانبوونی گوێ. قورسبوونی جەستە لە نەخۆشییەوە. داگیرسان.
داگیراندن: داگیرساندن.
داگیرانن: داگیراندن.
داگیرکراو: شوێنێکە کە دەوڵەتێکی بێگانە داگیری کردبێ. شتێکە کە یەکێک داگیری کردبێ.
داگیرکردن: بڕدان و بردنی شتێک بەزۆر.
داگیرکەر: کەسێکە کە شتێکت لێ داگیر بکا. دەوڵەتێکی بێگانەیە کە خاکی دەوڵەتێکی تر داگیر بکا.
داگیریان: د. داگیران.
دال: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
داڵ: مەلێکی گەورەی گۆشتخۆری بەسزمانە. هێشوە تریی شاش. بریتییە لە گیانداری لاواز.

دالاش: مەلێکی گۆشتخۆرە لە دالّ پچووکترە.
دالان: جێگایەکی سەرگیراوە بەدەم قاپیی حەوشەوە.
دالاندار: ل. خانچی.
دالان دووڕەپ: ژنی قووچی لۆقنی لاواز.
دالّبوون: بریتییە لە لاوازبوونی گیاندار.
دالّدە: پەنا و پشتیوان: فیسار کەس (دالّدەیەکی) باشە.
دالّدەدان: پشتیوانیکردن و پەنادان.
دالّدەهێنان: پەنابردنی یەکێک بۆ یەکێک.
دالستن: لستنەوەی شت.
دالّک: ل. دایک.
دالّکان: د. نووسان و لکانی شتێک بەسەر شتێکی تردا.
دالّکاندن: نووساندن و لکاندنی شتێک بەسەر شتێکی تردا.
دالّکانن: دالّکاندن.
دالّکەدزان: د. دەستەک دز.
دالّکیان: د. دالّکان.
دالّۆچکە: شتێکە لە شوێنێکی بەرزەوە داهێلّرابێتە خوارەوە.
دالّۆزکە: د. دالّۆچکە.
دالّووت: د. دالّیت.
دالّووچانن: د. دارۆچکەکردن.
دالّووچکە: د. دالّۆچکە.
دالّووچە: د. دالّۆچکە.
دالّووچیان: د. شۆڕبوونەوەی شتێک لە بەرزییەکەوە.
دالّووزان: د. دالّۆچکە.
دالّووزکە: د. دالّۆچکە.
دالّووسکە: د. دالّووزکە.
دالّەڕۆچکە: دارۆچکە.
دالەقاندن: ز. هەلّواسینی شتێک بەشتێکدا.
دالّەکەرخۆر: مەلێکی گۆشتخۆرە و لە هەموو جۆرە دالّێک گەورەترە.
دالّە کەرخۆرە: دالّە کەرخۆر.
دالّیە: ل. سی پێوانە یا سی ژمارەیە لە شتێک.
دالّیت: مێوێکە کە چووبێ بەقەد درەختێکدا.
دام: داو.
داماگ: د. داماو.
داماگی: د. داماوی.
داما‌لان: لێبوونەوەی شتێک لە شتێک: پەتەکە لە ملی دابەستەکە (داما‌لاوە). بریتییە لە لاوازبوونی یەکێک: فیسار کەس پەنچەتایەک (داما‌لاوە).
داما‌لّیاگ: د. داما‌لاو.
داما‌لّیان: د. داما‌لان.
داما‌لّین: داکەندنی شتێک لە شتێک. لابردن و مالّینی شتێک لە شتێک بەدەست: مەنجەلّە ماستاوییەکە (داماڵە).
دامان: دەستەوسانبوونی مەردووم و پەککەوتنی لەسەر شتێک.
داماو: کەسێکە کە لەسەر شتێک پەکی کەوتبێ.
داماوی: دەستەوسانی.
دامردن: نەمانی گڕی ئاگر.
دامردنەوە: دامردن.
دامرکان: لە بزووتن و جوولّەکەوتنی شتێک.
دامرکاندن: لە بزووتن و جوولّەخستنی شتێک.
دامرکانن: دامرکاندن.
دامرکیان: د. دامرکان.
داملەچەقان: نێوونی بەرکەلّ.
دامۆچانن: د. تیژکردن و هانەهانەدان.
دامۆچیاگ: د. کەسێکە کە تیژ کرابێ و هانەهانە درابێ.
داموسک: مووی کلکی ولاخی یەکسم.
دامووچانن: د. دامۆچانن.
دامووچیاگ: د. دامۆچیاگ.
داमووس: داموسک.
دامووسک: داموسک.
دامە: جۆرە یارییەکە بەدوو کەس دەکرێ لەسەر تەختەیەکی شەست و چوار خانەیی و، هەریەکەی بەشانزە داش.
دامەرزان: د. دامەزران.
دامەرزاندن: د. دامەزراندن.
دامەرزانن: د. دامەزراندن.
دامەرزیان: د. دامەزران.
دامەزران: جێگیربوونی شتێک لە شوێنێک.
دامەزراندن: جێگیرکردنی شتێک لە شوێنێک.
دامەزرانن: دامەزراندن.
دامەزراو: شتێکە کە لە شوێنێک جێگیربووبێ.
دامەلاغاسی: کەسێکە کە ڕووت کرابێ هیچی پێ نەهێلّرابێ. (دامەلاغاسیکردن) ڕووتکردنی مەردووم و هیچ پێ نەهێشتنی.
دامەن: دامێن.
دامێن: لای خوارووی هەموو شتێک. چمکی کەوا.
دامێنگرتن: بریتییە لە هانابردن بۆ یەکێک.
دامێنگیر: بریتییە لە کەسێک کە هانات بۆ بێنێ.
دامێنگیری: دامێن گرتن و هانابردن.
دان: دووڕیز ئێسقانی دانەدانەیە کە لەسەر پووکی گیاندار دەڕوێ و خواردەمەنیی پێ ورد دەکا. بەخشینی شتێک بەیەکێک. دانەوێلّەیەکە بدرێ بەبالّندە. بەری چێشتی شل: ئەم چێشتە

(دان)ی کەمە. بریتییە لە کەمێک لە هەموو شتێک: (دان)ێک گۆشتم بەرێ، واتە کەمێک. پیتێکە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بە(اسمی مکان): ئاگر(دان)، خوێ(دان)، گوڵ(دان). پیتێکە دەنرێ بەهێندێ ناوەوە دەیکا بە(مصدر): فڕێ(دان)، ئاو(دان)، ئازار(دان).

دانا: مەردوومی تێگەیشتووی وریا.

دانار دانار: شتێکە کە دانەدانە وەستابێ و نەچووبێ بەسەر یەکدا: ئەم قوبوڵییە (دانار دانار)ە.

دان ئاڵبوونەوە: سڕبوونی ددان بەهۆێ خواردنی شتی ترشەوە.

دانامە: د. مووی ڕەش و سپی.

دانان: جێگیرکردنی شتێک لە شوێنێک.

داناو: د. ئاودانی گەنم لە کاتی دان گرتنیدا.

دان بەخۆداگرتن: بریتییە لە ئارام و خۆگیری لەبەر بارێکدا.

دانپیانان: بریتییە لە ڕاستی وتنی شتێک.

دان جیڕکردنەوە: دان ڕیچکردنەوە.

دان چوونەکلیلە: دەم چوونەکلیلە.

داندۆک: دۆینە.

دان ڕیچکردنەوە: لچ هەڵقورتاندن و دەرخستنی ددان.

دانساز: کەسێکە کە ددان دروست بکا.

دانسازی: خەریکبوون بەپیشەی ددان دروستکردنەوە بۆ ئەم و ئەو.

دان سپیبوونەوە: بریتییە لە سام لاچوون و ترس شکانی یەکێک لە یەکێک: دانی خۆت (سپی مەکەرەوە) لە منداڵەکانت.

دانسقە: شتی تایبەتی و نایاب.

دانشتن: د. دانیشتن.

دانکردن: د. دانگرتن: گەنمەکە دانی کردووە: واتە دانی گرتووە.

دانکە: دەردێکە تووشی هێندێ باڵندە دەبێ.

دانگ: بەشێک لە شەش بەشی زەویوزار: سێ (دانگی) ئەو دێیە هی منە. شەش یەکی قڕانێک. ئەندازە و پلە: فیسار کەس سی ساڵ لەمەوپێش چۆن بووە ئێستاش هەر لەو (دانگە)دا ماوە.

دانگا: دەمێک: مەڕەکان (دانگا)یەک لەوەڕین واتە کەمێک.

دانگە: لای خواروی شت.

دانگیر: دانەوێڵەیەکە کە نیوەکوڵ بووبێ. چیکەنە (د).

دان لێ تیژکردن: بریتییە لە چاوبڕینە شتێک و بەتەمابوونی.

دانوشتان: نوشتانەوە و ڕەقبوونی شت.

دانوشتاندن: دوو قەدکردن و دەقکردنی هێندێ شت.

دانوشتانن: دانوشتاندن.

دانوشتاو: شتی نوشتێنراوەی دەقکراو.

دانۆکە: دانکە. دانە چۆلەکە.

دانوو: دانکە. ساوەر (ز). پەلکە.

دانووکە: دانۆکە.

دانوولە: گەنمی کوڵاو. چێشتی گەنم و نۆک. جۆرە گیایەکە ئاژاڵ دەیخوا (د).

دانە: دەنکێک لە شتێک. لای ژووروی مەرەزە. ددانە: دانەی مشارەکە مەشکێنە (د). شتێکە وەک شانە بەڵام گەورەتر و درێژترە هەودای ڕایەڵی تەنراوی پێدا هاتوچۆ دەکا لەکاتی جۆلاییدا.

دانەچۆلەکە: گیایەکی بەهارییە بەرێک دەگرێ وەک کەلووی نۆک پڕە لە تۆوی ورد.

دانەخۆرە: دانەیەکە دەکرێ بەفاقە و تەڵەوە بۆ گرتنی پەلەور.

دانەدوو: هـ. دۆینە.

دانەدەم: خستنی شتێک بۆ سەر شتێک و پێیدادرووبی: پەردەکە کورتە قولاپچێکی (بدە دەم).

دانەر: کەسێکە شتێک لە شوێنێک دابنێ. کەسێکە بناغەی شتێک دابنێ کە لەوەپێش نەبووبێ. کەسێکە کتێبێک دابنێ.

دانەڕۆکە: چێشتێکە لە گەنم و نۆک دروست دەکرێ و دەبەشرێتەوە بەسەر دراوسێدا لە کاتێکدا کە منداڵی ساوای ئەو ماڵە تازە ددانی ڕوابێ.

دانەڕێز: فڕێدانی ئاش دانەوێڵە بۆ ناو ئاردەکە.

دانەقەتێ: گیایەکی بەهارییە بەرێکی خڕ دەگرێ وەک دانە چۆلەکە پڕە لە دانەی ورد.

دانەکوڵانە: دانوولە.

دانەواندن: نزمکردنەوەی شت لە زەوی.

دانەوانن: دانەواندن.

دانەوە: دانی شتێک بەیەکێک دووبارە. هەڵکەندن: زەوییەکە (بدەرەوە).

دانەوێڵە: هەموو جۆرە وشکەدانێک.

دانەوین: چەمینەوە و خۆ نزمکردنەوەی گیاندار.

دانەوینەوە: دانەوین.

دانهێڕ: با. گەنمە کوتاو.

دانهێڕک: با. دانهێڕ.

دانەیەک: چنگدانەیەک و پڕبوون و چڕبوونی هێندێ شت: هەرێزەکە (داویەتە یەک).

دانیان: د. دانان.

دانیشتن: قنگدانەوە لەسەر زەوی یا لەسەر شتێکی تر.

دانیشتوو: کەسێکە قنگی دابێتەوە. کەسێکە ماوەی مووچەخۆریی میریی تەواو کردبێ.

دانی: دابەستە.

دانین: ز. دانان.
داو: جۆرە تەڵەیەکە بۆ گرتنی هێندێ گیاندار دەنرێتەوە. تاوێک لە دەزوو. داوێن (ز).
داوا: ویستن و خواستن بەزمان.
داواچی: کەسێکە کە دەعوا لەسەر یەکێک بکا.
داواخواز: کەسێکە داوای ئافرەتێک بکا بۆ مارەکردنی. کەسێکە داوای شتێک بکا.
داواخوازی: داواکردنی ئافرەتێک بۆ مارەکردنی. داواکردنی شتێک.
داواکار: داواخواز.
داواکردن: ویستنی شتێک لە یەکێک.
داواکەر: داواخواز.
داوباز: د. ڕاوچی. بریتییە لە فێڵباز.
داوبازی: د. ڕاوچێتی. فێڵبازی.
داوداخستن: داونانەوە.
داوکەفتن: د. کەوتنە ناو داوەوە.
داوگە: د. جێگایەکە داوی لێ دەنرێتەوە. جێی بەهەڵەچوون.
داولێدەر: د. ڕاوچی. کەڵەکباز.
داونانەوە: نانەوەی داو بۆ نێچیر. کەڵەک و فێڵ دروستکردن بۆ مەردووم.
داوودەرمان: بەهاراتی چێشت..
داوودێرونکل: ز. پەپووسلێمانە.
داووڕداووڕ: د. دابڕدابرد.
داووڕین: دابڕین. قسە بڕینەوە.
داووڵ: داهۆڵ.
داووڵین: وڵینی شت بەزۆری بەسەریەکدا.
داوەت: با. شایی و هەڵپەرکێ.
داوەر: خوا.
داوەراندن: وەراندنی شت بەزۆری.
داوەرانن: داوەراندن.
داوەرێس: ئاوەرێس.
داوەزاندن: دابەزاندن.
داوەزین: دابەزین.
داوەستن: دابەستن.
داوەشان: هەلا هەلا و پارچەپارچە بوونی شت.
داوەشـاندن: دەست هەڵهـێنانەوە بۆ لێـدانی شـتـێک: دەست (دامەوەشێنە). تێوەشاندنی بەرگ و کاڵا لەسەر ئاگر. هەلا هەلاکردنی شتێک.
داوەشاو: شتی هەلاهەلابوو.
داوەشیاگ: داوەشاو.
داوەشیان: د. داوەشین.
داوەشین: داوەشان.
داوەکۆسـتـە: باڵندەیەکی کـێـوییـە لە کـەو پچـووکـتـرە بەهەنگاو دەڕوا، دوو تەڵ مـــوو بەپشت ملیـــەوەیە لە حـــەلی ڕۆیندا مووەکان قنج دەبنەوە.
داوێن: دامێن.
داهاتگ: داهاتوو.
داهاتن: ڕامبـوونی گـیـاندار. دوولەتبـوونی دار بەمـشـار. سـوور بوونی چاو و هاتنە گلی. دانەدانە و ڕێک وەسـتـانی مـووی سەر و ڕیش بەهۆی داهێنانی بە شانە. تازە پەیدابوون و باو سەندنی شتێک: ئەم گۆرانییە تازە (داهاتووە). ڕووتبـوونی درەخت بەهۆی داپاچینی لقەکانییەوە.
داهاتوو: گـیـانداری ڕامبـوو. دارێکە بەمـشـار دوولەت کـرابێ. چاوێکە هاتبێـتە گـل. مووی شانەکراو. شـتـێکە تازە باوی سەندبێ. درەختی هەڵپاچراو.
داهانین: داهێنان.
داهاوردن: داهێنان.
داهۆڕ: د. شتی دەڵبی شەپ و شۆڕ.
داهۆڵ: شـتـێکە وەک زەلام لە دار و پەڕۆ دروست دەکـرێ لەناو کـشـتـوکـاڵدا دادەچەقـێنرێ بۆ لێ سـڵـەمـینەوەی باڵندە و جانەوەر.
داهێـزران: لەش قـورسبـوون و تێکچـوونی بەهۆی نەخۆشـییـەوە. شلبوونەوە و ئاودانەوەی هەویر لەبەر زۆر مانەوەی. هەویرەکە داهێزراوە: نانی لێ نایەت.
داهێزیان: داهێزران.
داهێشتن: شۆڕکردنەوەی شت.
داهێنان: ڕامکردنی گیاندار. لەتکردنی دار بەمشار. شانەکردنی موو. کردنی شتێک بەباو. داپاچینی دار و درەخت.
دایان: د. دایەن.
دایانی: د. دایەنی.
دایک: مێینەیە کە منداڵی ببێ.
دایکە: چۆلەکەی مێ. دایک.
دایکەلێ: وتەیەکە لە ڕووی خۆشەویستییەوە بەدایک دەوترێ.
دایکەمارانە: دەعبایەکە لە ڕەنگدا وەک مارمێلکە و لە شێوە و گەورەییدا وەک قومقومۆکە وایە.
دایکێن: جۆرێکە لە یاریی شەقێن.
داینە: د. داوێن. بناری شاخ.
دایە: دایک. دایەن.
دایەخ: کەڵک: بە(دایەخ)م دەرنایەت.
دایەق: دایەخ.

دایەڵکە: بەتێکە سەرێکی بە(کەوچکە)ی ئاشەوە دەبەسترێ و ناوەڕاستیشی دەبەسترێ بە(مەچەکە)وە و سەرەکەی تری بەردێکی پێوە دەبەسترێ بۆ کەم و زۆرکردنی دان.
دایەن: ژنێکی بە شیرە کە مەمک بدا بەمندالی شیرەخۆرە.
دایی: ز. دۆوکە.
داین: ز. دایەن.
دبدب: د. وتەیەکە پەلەور و مەڕ و بزنی پێ بانگ دەکرێ.
دبێدبێ: د. دبدب.
ددان: دانی گیاندار.
ددانە: ددانەی چەرخ و مشار.
دددۆ: ز. دوو.
دراخە: ز. مەلۆ.
دراف: ز. شوشتنی کالای خێزان. قلیشی دیوار. دراو.
دران: ز. ددان.
دراو: پارەی دەوڵەتی. جۆرە تامێکی خۆشە کە لە سەبیل و گۆزە و گلێنەی تازەوەدێ: گۆزەکە (در)ی خۆشە.
دراوسێ: کەسێکە کە مالی لە مالتەوە نزیک بێ.
دراوسێ وەزن: کەسێکە کە ئازاری دراوسێ بدا.
دریشە: درەوش.
دردۆنگ: کەسێکە لە یەکێک دلگیربووبێ.
دردۆنگی: دلگیریی لە یەکێک.
دڕ: شتی زۆر زبر. گیانداری هار و هاج.
دڕان: لەتبوون و کون تێبوونی شت. بریتییە لە بلاوبوونەوەی باسێکی شاراوە: فیسار باس (دڕا) واتە هەمووکەس پێی زانی. بریتییە لە قەلەوبوونی گیاندار: مەڕەکە ئەوەندە قەلەوبووە (دڕاوە). بریتییە لە مردنی بێ دینی بێ باوەڕ: هامان (دڕا).
دڕاندن: پارچەکردنی شت.
دڕاو: شتێکە پارچە بووبێ.
دڕاوی: ئاستی دڕان لە شت.
دڕدان: تەکەکردن و جێ کردنەوە.
دڕک: شتێکی تیژە وەک دەرزی لە هێندێ درەخت و سەوزایی پەیدا دەبێ.
دڕکاوی: شتێکە دڕکی زۆری پێوە بێ.
دڕکە: دەردێکە وەک گرمژنە مندال دەری دەدا و سەری زیپکەکانی وەک دڕک تیژ دەبێ.
دڕکەئاسنینە: کەلەوێ.
دڕکەزی: جۆرە دڕکێکی قایمی بالابەرزی هەمیشە سەوزە دەکرێ بەپەرژین.
دڕکی مەموزین: بریتییە لە یەکێک کە بەشتێکەوە ئالا ئیتر لێی نەبێتەوە.
دڕکین: د. دڕکاوی.
دڕکینە: د. دڕکین.
دڕگە: د. دەرە.
دڕن: چلک: فیسار شت بۆ (دڕن)ی لێ دێ.
دڕنالَ: گڕنالَ. (دڕنالَ دڕنالَ): شتی گڕنال گڕنالَ. دەروویەکە لە ئاو کە دوو دەریا بەیەک بگەیەنێ.
دڕندە: گیانداری گۆشتخۆری چوارپێی بە زیان.
دڕننە: دڕندە.
دڕوو: دڕک.
دڕەی: هـ. تووترک.
دڕیاگ: دڕاو.
دڕیان: دڕان.
دڕێلە: گیایەکی بەهارییە وەک چاوبازە. بەلام ئەم بنجی پچووکترە. دڕکە.
دڕی: دڕک.
دڕین: لەتکردنی تەنراو و هێندێ شتی تر.
درز: قلیشی باریکی شت.
درزبردن: قلیش تێبوونی شت.
درزدان: درزبردن.
درزین: ز. درزبردن.
درژ: د. شتی خاو کە کرژ نەبێ. مەردوومی تووڕە و تڕۆ.
درشت: شتێکە کە ورد نەبێ. بریتییە لە مەردوومی قەبەی تێ نەگەیشتوو.
درشتی: قەبەیی و تێ نەگەیشتوویی.
درکاندن: دەربڕینی شتێک کە پێویست نەبێ بەوتن. دەربڕین.
درگا: د. دەرگا.
درگابوون: د. کونبوونی برین.
درگاژەنانە: د. کۆبوونەوە و قسەکردن بەبۆنەی کردنەوەی (إفتتاحية) شتێکەوە.
درگاکردن: د. دەرگابوون.
درگانە: د. دەرگانە.
درگە: وشکاییەکە کە هەر چوار لای ئاوبێ (جزيرة).
درم: جۆرە دەردێکی سووکی تێکڕاییە وەک هەلامەت: (درم) داکەوتووە.
درم داکەوتن: بلاوبوونەوەی درم لە شوێنێکدا.
درنج: دێو.
درنگانەوە: دەنگی درنگەی شت لە گوێدا.
درنگە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی مس. (درنگە درنگ) درنگەی یەک لە دوای یەک.
درنە: ز. کرمی ناو سکی مەڕ.

درۆ: قسەی هەڵبەستراوی بێ بناغە.
درۆخەدرۆخ: چووزانەوەی سەر سنگ و دەروون لەبەر سەرمابوون.
درۆزن: کەسێکە زۆر درۆ بکا.
درۆزنانە: شتێکە کە ڕاستەقینە نەبێ: ئەم سەعاتە (درۆزنانەیە) واتە سەعاتی ڕاستەقینە نییە.
درۆزنە: درۆزنانە. ناوی دێیەکە لە نزیکی سلێمانی.
دروس: د. دروست.
دروسبوون: د. دروستبوون.
دروست: شتێکە کە ڕێکی دەستووری ئاسمانی یا زەمینی بێ: نوێژەکەت یا هەڵگرتنی دەمانچەکەت (دروست) نییە. شتی بەجێ: ئەمە کارێکی (دروست)ە، واتە بەجێیە.
دروستایی: سەر و بن بەستن و گەڵاڵەکردنی فرمانێک: بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ (دروستایی) کراوە.
دروستبوون: پێکهاتنی کارێک. بریتییە لە کۆبوونەوەی پیاو لەگەڵ ژنی خۆیدا.
دروستکردن: ڕێکخستنی شتێک لە چەند جۆرە کەرەستەیەک: خانوو یا کورسیەکەی (دروست کرد).
دروستی: ساغی و بێ گەزەندی: بە(دروستی) سەری تۆ.
دروسکردن: د. دروستکردن.
دروسی: د. دروستی.
دروشم: نیشانەیەکی تایبەتییە کە هەموو دەوڵەتێک هەیەتی.
درۆشم: شێوە: بە(درۆشم) دەیناسمەوە. وێنە.
درۆڤ: ز. ڕوخسار.
درۆکردن: وتنی شت بەدرۆ.
درۆو: د. درۆ.
درووتن: ز. دروون. دروێنە.
درووخە: د. چووزانەوە و کاوەکاوی قورگ و دەروون.
درووخیان: د. چووزانەوە.
درووزن: د. درۆزن.
درووشم: درۆشم.
درووشن: د. شتێکە کە بدرەوشێتەوە.
درووشە: د. ورشە.
درووشێ: ز. ئێسقانی خوار ئەژنۆ تا قولەپێ.
درووشیان: د. درەوشانەوە.
درووشین: د. درووشیان.
درووماn: درونی شت بەتەقەڵ.
دروون: تەقەڵ هەڵدان لە شت بەدەرزی و دەزوو یا بەشووژن و بەن. بڕینی گیا بەداس.
دروونەوە: دروێنە. دووبارە دروونی شتی هەڵپچڕاو یا دڕاو.
دروێنە: دروونەوەی دەغڵودان بەداس.

دروین: دروون.
درەخت: دارێکی بەرزی سەوزە کە بەپێوە بێ.
درەخشان: شتێکە کە زۆر پرشنگ و ڕووناکی بداتەوە.
درەخشانەوە: بریسکەدانەوە و پرشنگدانی شتی درەخشان.
درەخشینەوە: درەخشانەوە.
درەم: درهەم. چل و هەشت حەببە لە زیو.
درەنگ: دوایی کاتی شت: ڕۆژ (درەنگە) واتە هاکا بڕایەوە.
درەنگان: کاتی درەنگ: بەم (درەنگان)ە بۆچی دەڕۆیت؟
درەنگی: درەنگان.
درەو: دروێنە. درۆ.
درەوان: د. دروێنەکەر.
درەوش: دەرزییەکی ئەستووری گەورەیە چەرمی پێ کون دەکرێ بۆ دروونی.
درەوشانەوە: درەخشانەوە.
درەوشە: درەوش.
درەوشینەوە: درەوشانەوە.
درەوکەر: سەپان.
درێخ: د. درێغ.
درێژ: شتێکە کە کورت نەبێ.
درێژا: د. درێژایی.
درێژایی: باری درێژیی لە شت.
درێژبوون: بریتییە لە پاڵکەوتن و ڕاکشان.
درێژبوونەوە: دواکەوتنی کارێک و قەتیسبوونی: ئیشەکەم چاک (درێژبووەوە).
درێژدادڕ: بریتییە لە مەردوومی سازندە.
درێژدادڕی: سازندەیی و چەنەبازی.
درێژ داهۆڵ: مەردوومی درێژی لەڕ و لاواز.
درێژکردن: بریتییە لە بەزەوی دادانی یەکێک.
درێژکردنەوە: درێژەدان بەقسەیەک یا کردەوەیەک.
درێژکۆلە: شتێکە کەمێک درێژبێ.
درێژەپێدان: درێژکردنەوە.
درێژەوکردن: د. درێژکردنەوە.
درێژی: باری درێژاییی شت.
دریسمە: گرێژەنە.
درێشک: ز. درەوش.
درێغ: حەیف: (درێغ) بۆ نەخوێندەواری کورد. کۆتاهی و قسوور.
درێغا: درێغ.
درێغکردن: کۆتاییکردن لە کارێکدا.
درێغی: درێغکردن.
دری: ز. تووترک.

دز: کەسێکە بەپەنهانی شتی ئەم و ئەو ببا.
دزدەسەک: د. دەستەک دز.
دزراو: شتێکە کە دز بردبێتی.
دزکۆشکە: شوێنێکە کە دز خۆی تێدا حەشار بدا.
دزگا: د. دزکۆشکە.
دزگێن: ز. دەستەجڵەو.
دزنەبەر: شتێکی بێ نرخە کە دز نەیبا.
دزە: پەنهانی: بە(دزە) کاری خۆی دەکا.
دزەخورجێنی: کردنی شتێک بەدزییەوە و پەنهانکردنی لەم و لەو.
دزەخەنە: د. زەردەخەنە.
دزەکردن: خۆدزینەوە.
دزیاگ: د. شتی دزراو.
دزێو: شتی ناشیرین.
دزی: دزیکردن: فیسار کەس پیشەی هەر (دزی)یە.
دزیکردن: دزینی شتی مەردووم.
دزین: بردنی شت بەپەنهانی.
دزینەوە: دزین و کەمکردنەوەی شت بەرەبەرە: لفکەکە لە ئاستی دەمەکەی هەر دەورەی دوو کەلووی لێ (بدزەرەوە).
دڕ: گیانداری وەڕس لە شت: ئەو وڵاخە (دڕ) ئاوە. رووگرژ. چەپەڵ (د).
دژایەتی: بوونی دوو شت بەجۆرێک کە هەرگیز کۆنەبنەوە (تضاد).
دژبوون: د. کرژبوون. رق هەستان. پیسبوون.
دژمان: جوێن.
دژمن: دوژمن.
دژمنایەتی: دوژمنایەتی.
دژمنی: دوژمنی.
دژمێن: د. دژمان.
دژمین: ز. دژمان.
دژوار: شتی سەخت و گران. توونی کەسکوون.
دژواری: سەختی و گرانی.
دژوون: ز. چڵکن.
دژوێن: جوێن. چڵکن.
دژوێنی: چڵکنی.
دژهۆنی: کۆکردنەوەی دوو وشە کە دژایەتی بێ لە ناوەندیاندا لە ڕستەیەکدا (طباق).
دژی: جۆرە نەخۆشییەکە بەئاژاڵ دەگا.
دش: خوشکی مێرد. دژ (د).
دشکردن: خۆکێشانەوە لە کارێک و دەست لێ هەڵگرتنی: (دشکەم).
دشمن: د. دوژمن.
دشمنی: د. دوژمنی.
دفن: با. لووت.
دڤمری: ز. مەردوومی بێ دەم و پل.
دڤنزەم: ز. مەردوومی زبان شیرین.
دڤێل: ز. کونێکە چەرمی سەرپەنجەی نەعلی تێ هەڵدەکێشرێ.
دک: ز. سەکۆ.
دکین: ز. چڵکنیی کاڵا بەجۆرێک کە بواردبێتی.
دگدگە: مزراحێکە لە خولانەوەدا نەیەتە سەر دەست.
دگمە: ز. دوگمە.
دگەل: ز. لەگەڵ.
دل: با. دڵ.
دڵ: پارچە گۆشتێکی سوورە لەژێر گۆی مەمکی چەپی گیاندار و ناوەندی هەردووسیدا و، جەمسەری هەموو شادەمارێکە و خوێن لەوەوە هاتوچۆ دەکا.
دڵارا: شوێنێکە دڵی تێدا بکرێتەوە.
دڵازار: مەردوومی دڵ شکست.
دڵازاری: دڵشکان.
دڵ ئاوخواردنەوە: بریتییە لە باوەڕکردن بەشتێک بەدڵ.
دڵ ئاودان: بریتییە لە گەیاندنی خۆشی یا ناخۆشییەکی زۆر بەدڵی یەکێک: فیسار کەس بەو مژدەیە (دڵی ئاودام) یا بەو توانجە (دڵی ئاودا).
دڵ ئاوڕشێنکردن: بریتییە لە دڵخۆشکردنی یەکێک بەمژدە پێدانی.
دڵ ئاوەدان: بریتییە لە مەردوومی وریای زۆرزان.
دڵبردن: بریتییە لە تێکچوونی دڵ بەخواردنی شتێک: هەنگوینەکە (دڵی بردم) ئارەزووکردنی خواردنی شتێک و توانینی: (دڵم هیچ نابا).
دڵ بەجێهێنان: بەجێ هێنانی ئارەزووی دڵی یەکێک.
دڵبەر: خۆشەویستێکە دڵت ڕاکێشێ بۆ خۆی.
دڵبەستە: کەسێکە ئارەزووی شتێک بکا و دڵی پێوەی بێ.
دڵبەند: دڵبەستە.
دڵ بەیەکاهاتن: دڵ تێکەڵاتن.
دڵبی: ز. جۆرە هەنجیرێکە.
دڵپاک: بریتییە لە کەسێک کە دڵی خاوێن بێ دەربارەی مەردووم.
دڵپاکی: بریتییە لە پاکیی دڵ و بێ خەوشی دەربارەی مەردووم.
دڵپڕ: کەسێکە لەبەر خەفەتێک دڵی تەنگ بووبێ و نزیک بێ بەگریان. کەسێکە ئەوەندەی خواردبێ سەر دڵی کەوتبێ. کەسێکە کە قینی لە یەکێک بێ پڕ بەدڵ. (دڵپڕبوون):

بریتـییـە لە دڵ تەنگبوون بەجـۆرێک کـە نزیک بێ بەگـریان. زۆر خـواردن بەجـۆرێک کـە سـەر دڵ بکەوێ. ڕقـهـەسـتـان لە یەکێک پڕ بەدڵ.
دڵپـڕی: بریتـیـیـە لە دڵتـەنگی. قـورسـبـوونی دڵ بەهۆی زۆر خواردنەوە.
دڵ پیاچوون: بریتییە لە حەزکردن لە شتێک.
دڵ پیاکاهاتن: دڵ پێکاهاتن.
دڵ پێ سووتان: بریتییە لە بەزەیی هاتنەوە بە گیاندارێکدا.
دڵ پێکاهاتن: دڵ تێک هەڵاتن.
دڵ پێوەبوون: حەزکردنی دڵ لە شتێک.
دڵپیس: بریتییە لە کەسێک کە دڵی باش نەبێ لەگەڵ مەردووم.
دڵپـیـسکردن: بریتـیـیـە لە گـومـان پەیاکـردن دەربارەی یەکـێـک بەخراپی.
دڵپیسی: بریتییە لە ناپاکی و خراپی دڵ لەگەڵ مەردوومدا.
دڵتەڕ: بریتییە لە کەسێک کە حەز لە کاڵا و شتی جوان بکا.
دڵتەڕی: بریتییە لە حەزکردن لە بەرگ و کاڵای جوان.
دڵتەنگ: خەفەتبار.
دڵتەنگی: خەفەتباری.
دڵ تێچوون: حەزکردن لە شتێک.
دڵ تێکچوون: دڵ تێکهەڵاتن.
دڵ تێکهـەڵاتـن: دڵ بەیەکـداهاتن بەجـۆرێک کـە نزیک بێ لە ڕشانەوە.
دڵچوون: بێخوودبوونی دڵ و سستبوونی.
دڵچوونەسەر: بریتییە لە حەزکردن لە شتێک.
دڵچەسپ: شتێکە کە بچێتە دڵتەوە و جێگیربێ تێیدا.
دڵ خاوبوونەوە: سستبوونی دڵ و تێکچوونی.
دڵخوا: د. دڵچەسپ. دڵخواز.
دڵخواز: شتێکە کە دڵت ئارەزووی بکا. دڵدار.
دڵخوازی: دڵداری.
دڵخۆر: د. دڵتەنگ.
دڵخورد: د. کەسێکە لە یەکێک دڵگیر بووبێ.
دڵخوردی: دڵگیری.
دڵخۆری: د. دڵتەنگی.
دڵخـۆش: کـەسـێکە خـۆشـیی لە دڵیـدا بێ. (دڵخـۆشـبـوون) پەیابوونی خـۆشی لە دڵدا. (دڵخـۆشکردن) خـۆشی گـەیاندن بەدڵێک.
دڵخۆشکەرە: شتێکە ببێ بەمایەی خۆشیی دڵ.
دڵخۆشی: کەیف و خۆشیی دڵ.
دڵخـۆشیـدانەوە: بەسـەر یەکـێکداهاتن و خـەفـەت ڕەواندنەوە لە دڵی. لاواندن و ڕامکردنی یەکـێک کـە کـارێکت پێی بێ: جوتیارەکە تۆراوە (دڵخۆشیی بدەرەوە).

دڵداخوریان: دڵڕاچەنین.
دڵداخورپیان: د. دڵداخوریان.
دڵدار: دڵبەر.
دڵدارانە: هۆنراوە و پەخشانی دڵداری.
دڵداری: عاشقێنی و دڵخوازی.
دڵداکەفتن: د. دڵداخوریان.
دڵداگ: د. کەسێکە دڵی دوای شتێک کەوتبێ و شێت و شەیدا بووبێ بۆی.
دڵدزی: با. نهێنی ناودڵ.
دڵڕاگیرکردن: پارێزگاریکردنی دڵی یەکێک لە زویربوون.
دڵڕفێن: دڵفرێن.
دڵڕوون: بریتییە لە دڵخۆش.
دڵڕۆین: بریتییە لە بێخودبوون.
دڵڕەش: دڵڕەق.
دڵڕەشی: دڵڕەقی.
دڵڕەق: بریتییە لە مەردوومی بێ باکی نا میهرەبان.
دڵڕەقی: بریتییە لە بێ باکی و نامیهرەبانیی دڵ.
دڵڕەنجان: زویربوون.
دڵڕەنجاندن: زویرکردنی دڵی یەکێک.
دڵسـارد: بریتییە لە کەسێک لە کارێکدا دوو دڵ بێ و گەرموگوڕ نەبێ. (دڵ سـاردبوونەوە) دوودڵبـوون لە کـارێکدا. (دڵ ساردکردنەوە) دوودڵکردنی یەکێک لە کارێکدا.
دڵساردی: بریتییە لە دوودڵی و سارد و سڕی لە کارێکدا.
دڵسۆز: کەسێکە کە میهرەبان و دەربایستت بێ.
دڵسۆزی: میهرەبانی و بەتەنگەوەبوون.
دڵسووتان: بریتییە لە بەزەیی هاتنەوە بەیەکێکدا.
دڵسووتاو: مەردوومی خاوەن بەزەیی.
دڵسووتیاگ: د. دڵسووتاو.
دڵسووتیان: د. دڵسووتان.
دڵسەخت: دڵڕەق.
دڵسەندن: بریتییە لە هۆگرکردنی یەکێک و دڵ لێ سەندنی.
دڵشاد: کەسێکە کە بەئارەزوویەک گەییبێ و سەر و دڵی خۆشبێ پێی.
دڵشادی: سەر و دڵخۆشی.
دڵشکان: ڕەنجانی دڵ.
دڵشکاندن: دڵڕەنجاندن.
دڵشکست: کەسێکە کە دڵی لە شتێک ڕەنجابێ.
دڵشکستە: دڵشکست.
دڵشکستی: بریتییە لە دڵ ڕەنجان.
دڵشکیان: د. دڵشکان.

دڵفراوان: بریتییە لە مەردوومی هێمنی لەسەرخۆ.
دڵفراوانی: بریتییە لە هێمنی و لەسەرخۆیی مەردووم.
دڵفڕێن: شت یا شوێنێکی خۆشە کە دڵی مەردووم ڕابکێشێ.
دلق: جۆرە دڕکێکە لە (وڵ) دەچێ بەرێکی سووری ڕەوانی هەیە.
دڵکرانەوە: گوشادی دڵ بەهۆی هەر شتێکەوە بێ.
دڵکرمن: کەسێکە کە لە شتێک بەدگومان بووبێ.
دڵکرمۆڵ: دڵکرمن.
دڵکرمێ: دڵکرمۆڵ.
دڵکریانەوە: د. دڵکرانەوە.
دڵکورکان: ئارەزووکردنی شتێک و دڵ لێدان بۆی.
دڵکورکیان: دڵکورکان.
دڵگران: بریتییە لە مەردوومی زویر لە شتێک.
دڵگرانی: زویری.
دڵگوشا: دڵگوشاد.
دڵگوشاد: شوێنێکە کە دڵ تێیدا بکرێتەوە.
دڵگوشادی: کرانەوەی دڵ بەشوێن یا بە شتی دڵگوشاد.
دڵگەرم: بریتییە لە کەسێک کە لە کارێکدا سەرگەرم بێ.
دڵگەرمی: بریتییە لەسەرگەرمی لە کارێکدا.
دڵگیر: دڵگوشاد. کەسێکە کە لە یەکێک زویر بووبێ.
دڵگیران: دڵتەنگ بوون.
دڵگیری: دڵتەنگی.
دڵ لە دڵدان: بریتییە لە دوودڵی و گومان لە کارێکدا: (دڵ لە دڵ مەدە) واتە بێگومان بە و دوودڵ مەبە.
دڵ لێچوون: حەزکردن لە شتێک.
دڵ لێ سەندن: ڕاکێشانی دڵی یەکێک بەگوفتار و کرداری جوان.
دڵماین: ز. دڵشکان.
دڵمردگ: دڵمردوو.
دڵمردوو: بریتییە لە کەسێک کە ئارەزووی شتی خۆش و جوانی نەبێ.
دڵنەوایی: ئاشتکردنەوەی دڵی یەکێک کە زویر بووبێ.
دڵنیا: کەسێکە کە بێگومان بێ و دوودڵ نەبێ لە کارێکدا. (دڵنیابوون) بێگومانی و یەک دڵی لە کارێکدا.
دڵنیایی: دڵنیابوون.
دلۆپ: ز. دڵۆپ.
دڵۆپ: تکەی ئاو و شتی شل.
دڵۆپە: تکەی بنمیچی بان.
دلۆرە: هـ. ڕاکشان.
دلۆڤانی: با. بەزەیی.
دلووڤان: ز. دۆستی خۆشەویست.
دڵەتەپێ: دڵەخورپێ.
دڵەخورپێ: دڵەگورپێ.
دڵەخورت: هێزی دڵ.
دڵەڕاوکێ: دوودڵی لە کارێکدا.
دڵەڕەپێ: د. دڵەخورپێ.
دڵهشتن: ز. دڵشکاندن.
دڵەکزە: دڵەکزێ.
دڵەکزێ: جۆرە دڵ تێکچوونێکە هێندێ جار لە خواردنی هێندێ شتەوە پەیدا دەبێ.
دڵەکوتێ: لێدانی دڵ یەک لەسەر یەک بەهۆی خورپە یا ماندووبوونەوە.
دڵەکەڵەشێر: جۆرە ترێیەکی سپیی دەنک درێژی بنک ئەستووری سەر باریکە یەک دەنک ناوکی پچووکی تێدایە.
دڵەگورپێ: دڵەکوتێ.
دڵەلەرزە: دڵەگورپێ.
دڵەلەرزێ: دڵەلەرزە.
دڵ هەڵشێوان: دڵ تێکهەڵاتن.
دڵ هەڵشێوانەوە: دڵ هەڵشێوان.
دڵ هەڵشێویان: د. دڵ هەڵشێوان.
دڵ هەڵکەفتن: د. دڵ هەڵکەوتن.
دڵ هەڵکەنران: دڵ هەڵکەوتن.
دڵ هەڵکەنیان: د. دڵ هەڵکەنران.
دڵ هەڵکەوتن: لەپێش چاوکەوتنی شت.
دڵ هێنانەجێ: دڵنەواییکردنی یەکێک.
دلێ: هـ. پیتی تێدابوون (ظرفیت) وەک وتەی (ناو): (دلێ) دەر، واتە ناوچەم.
دلێر: پاڵەوان.
دلێری: پاڵەوانی.
دلێق: دلیق.
دلیق: دلق.
دلیوان: تەبەنە.
دم: کێر (هـ). کلک (ل). کات (ز).
دما: هـ. پاش.
دەمارەکۆڵ: دەمارەکۆڵە.
دەمارەکۆڵە: دووپشک.
دمانکردن: ز. بەئیجارەگرتنی دەیەکی دێهات و شتی تر.
دمە: هـ. دووگ.
دمەد: ز. شیشەتووتن.
دمەک: د. دومەک.
دمەڵ: د. دومەڵ.
دمەڵان: د. دومەڵان.

دمەهۆسنگنێ: کلک هەڵسەنگێنە.
دنان: ل. ددان.
دمبەک: د. دومەڵەک.
دندان: ز. ددان.
دندک: ز. تۆوی کاڵەک و شووتی و شتی تر.
دنگ: دۆڵێکی دارینە برنج و ساوەری تێدا دەکوترێ. دەنگ (ز).
دنگبوون: بریتییە لە تێرخواردن و توندبوونی ورگ.
دنگبێژ: ز. گۆیندەی دەنگ خۆش.
دنگچی: کەسێکە بەدەسک و دیبەگ برنج بکوتێ.
دنگکوت: د. دەسگی دنگ.
دنیا: ئەم جیهانەی کە تۆی تێدا دەژیت.
دنیاداری: خەریکبوون بەپەیداکردنی ماڵی دنیاوە.
دنیادیدە: کەسێکە لە دنیا شارەزا بێ.
دنیاری: دنیاداری.
دنیایی: هـ. کاوڕ و بەرخ.
دو: ز. دۆ.
دۆ: ماستی ژەنراوی کەرە لێ گیراو.
دوا: پاش: (دوا) ڕۆژت لە بیربێ.
دوابران: بڕانەوەی شتێک و کۆتایی هاتنی.
دوابڕاو: بریتییە لە شتێک کە حەزی لێ نەکەیت و نەتەوێ ناوی ببەیت: ئەم گرانییە (دوابڕاوە) هەر نەبڕایەوە.
دوابڕیاگ: د. دوابڕاو.
دوابەدوا: کردنی کارێک لە دوای کارێکی ترەوە بەگورجی: (دوابەدوا)ی تۆ هاتم.
دوابینی: د. دووربینی و خوێندنەوەی ئاکامی کار.
دوابینین: دوابینی.
دواپێهێنان: بڕینەوە و کۆتایی هێنان بەشتێک.
دواجەنگ: د. پاشداری لەشکر.
دواچۆڕ: دوادواییی هەموو شتێک.
دوادوایی: ئاخر و ئۆخری شت.
دواڕۆژ: پاشەڕۆژ.
دوازدە: دوانزە.
دوازدەمین: دوانزەمین.
دوازدەهەم: دوانزەهەم.
دوازدەهەمین: دوانزەهەمین.
دواکەوتن: پاشکەوتن. دووکەوتنی شتێک.
دواکەوتوو: دواکەوتە.
دواکەوتە: پاشکەوتوو.
دواگین: د. دوایین.
دوان: دووجار یەک لە شتێک.
دوانزە: ناوە بۆ ژمارەیەک کە (دە) و (دوو)وە.
دوانزەمین: شتێکە لە پایەی دوانزە دابێ.
دوانزەهەم: دوانزەمین.
دوانزەهەمین: دوانزەمین.
دوانە: دووگیاندارن کە بەسکێک بووبن.
دواوان: شوێنێکە کە دوو ئاوی تێدا تێکەڵ ببێ.
دواوەدان: د. گێڕانەوە و ناردنەوەی شتێک.
دواهێنان: تەواوکردن و بڕینەوەی شتێک.
دوایەک: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (هەموو): (دوایەکیان) هاتن واتە هەموویان.
دوایی: ئاخری شت: (دوایی)مە، واتە ئاخرمە. لە پاشان: تۆ بڕۆ من (دوایی) دێم. دوایین (د).
دوایی پێهێنان: دوایی هێنان و بڕینەوەی شتێک.
دوایین: د. دواهەمینی شت.
دوایی هاتن: تەواوبوون و بڕانەوەی شت.
دوایی هێنان: دواهێنان.
دوبارە: ز. فێڵ.
دۆبە: ز. خلتە و لێڵەی هەنگوین کە دەکەوێتە بنکی.
دۆپ: دۆڵ و دەرە. نزم.
دۆپەڕۆ: پشکی مەشکە.
دۆت: با. کچ.
دۆتن: ز. دۆشین.
دۆچ: گیایەکی بەهاری درە بەگژ دەغڵ و داندا دەچێ و کزی دەکا.
دۆچن: د. شتی لینج.
دۆخ: چۆنێتی شت: جیهان بە(دۆخ)ی خۆی نەماوە واتە تێک چووە. تاف و هەڕەتی شت: لە (دۆخ)ی گەنجیمدا واتە لە تافی لاویدا. شتی تیژی کەسکوون (د).
دۆخاو: گەچی شلی گیراوە.
دوختەر: پەزیشک.
دوختەر کەیبانوو: ئافرەتی ژیری دەست ڕەنگین.
دوخشار: د. شتی سەخت و گران.
دۆخوا: د. دۆخەوا.
دۆخە: دانی ئاژاڵی دۆشەنی بەیەکێک بۆ بەخێوکردنی، سەری بەئەندازەیەک ڕۆن.
دۆخەوا: چێشتی دۆکوڵیو.
دۆخیان: هەڕەت و تافی شت.
دۆخیانەت: دۆخیان.
دۆخێن: بەندەخوێن.
دۆخین: ز. دۆخێن.

دۆدان: دۆدانە.
دۆدانە: توورەکەیەکە دۆی تێ دەکرێ.
دور: توخن: (دور) ئەم شتە مەکەوە، واتە توخنی مەکەوە.
دۆر: دەهۆڵ.
دۆراخ: شویت.
دوردی: قەیچی.
دوڕ: دور. بەردێکی جوانی گران بەهایە لە دەریا دەردەهێنرێ.
دوڕاجی: هۆزێکە لە کورد.
دۆڕان: لە دەست چوونی شتێک لە گرەو یا لە یارییەکدا.
دۆڕاندن: لە دەستدانی شتێک لە گرەو یا لە یارییەکدا.
دۆرژنگ: تۆز و دووکەڵی بنمیچە کە شۆڕ دەبێتەوە.
دۆرنج: دۆرژنگ.
دوروست: دروست.
دوروستایی: دروستایی.
دوروستبوون: دروستبوون.
دوروستکردن: دروستکردن.
دوروستی: دروستی.
دوروومان: دروومان.
دوریش: با. لە ئەژنۆوە تا قولەپێ.
دۆریە: دۆری.
دۆری: گونۆڕ.
دورین: دروون.
دورینەوە: دروونەوە.
دۆز: ئامانج.
دۆزراوە: شتێکە کە دۆزیبێتتەوە.
دۆزکرن: با. داواکردن.
دۆزەخ: ئەو جێگا ناخۆشە ئاگرینەیە کە خوا لەو جیهانەدا ئامادەی کردووە بۆ تاوانباران.
دۆزەخە: دۆزەقە.
دۆزەق: د. دۆزەخ.
دۆزەقە: کونێکە لەژێر ئاش ئاوەکەی لێوە دەردەچێ.
دۆزین: گەڕان لەناو نوێن و کالاّدا بۆ کێچ و مۆریان. دۆزینەوە.
دۆزینەوە: دەستکەوتنەوەی شتی ون بوو. پەی بردن بەشتێک کە لەوە پێش نەزانرابێ.
دوژ: شتێکە پێچەوانە و دژی شتێکیتر بێ.
دۆژ: د. دووری.
دۆژزر: ز. دۆزەقە.
دوژمن: کەسێکە کە ناحەزت بێ.
دوژمنایەتی: ناحەزی و ڕقەبەری کردن.
دوژمنی: دوژمنایەتی.
دوژوار: شتی گران و سەخت.
دۆژە: ز. دۆزەخ.
دۆژەن: د. دۆژەنک.
دۆژەنک: دارێکی درێژی زبانەدارە دەکرێ بەلۆرەلەپەکانی مەشکەدا لەکاتی ژەندنا.
دۆژەنکە: دۆژەنک.
دۆژەنگ: د. چرچی ناوچەوان کە لە ڕق هەستاندا پەیدا دەبێ.
دوژێن: د. جنێو.
دوژێندان: د. جنێودان.
دوژێنفرۆش: د. جنێوفرۆش.
دۆس: د. دۆست.
دۆسایەتی: د. دۆستایەتی.
دۆست: کەسێکە ئاشنا و خۆشەویستت بێ. دۆستک.
دۆستایەتی: ئاشنایی و تێکەڵی لەگەڵ یەکێکدا.
دۆستک: ز. دۆستی دڵداری.
دۆستی: دۆستایەتی.
دۆسی: د. دۆستی.
دۆش: هـ. گۆشتی پاش ڕان و نزیک دووگ.
دۆشاب: ز. دۆشاو.
دۆشاف: با. دۆشاو.
دۆشانی: ز. ئاژاڵی دۆشەنی.
دۆشاو: شیلەی کوڵیوی ترێ یا توو یا خورما یا هێندێ شتی تر.
دۆشاومژە: پەنجەی تەنیشت پەنجە گەورەی دەست.
دۆشاوی: جۆرە ترێیەکی سپی درێژکۆلەی زۆر شیرینە. شتێکە ڕەنگی لە ڕەنگی دۆشاو بچێ.
دوشت: د. درشت.
دوشتە: د. درشتە.
دۆشدامان: دامان و بیرکردنەوە لە شتێک.
دۆشداماو: کەسێکە دامابێ و بیربکاتەوە لە شتێک.
دۆشراو: گیاندارێکی مێینەی شیردارە کە شیرەکەی دۆشرابێ.
دوشک: با. سەکۆ.
دوشمن: دوژمن.
دوشمنایەتی: دوژمنایەتی.
دوشمنی: دوژمنی.
دۆشەک: ژێرەخەرێکی پڕ لە لۆکە یا خوری یا پەڕۆیە.
دۆشەکڵە: دۆشەکی پچکۆلانە.
دۆشەکە: دۆشەک.
دۆشەمە: دۆشەکێکە کە دابکوترێ بەکورسی دانیشتندا.
دۆشەنی: ئاژاڵی شیردار.
دۆشیاگ: د. دۆشراو.

دۆشیدەنی: د. دۆشەنی.
دۆشین: دەرهێنانی شیر لە گوانی شیردار.
دۆغاو: دۆخاو.
دۆغرەمە: خواردەمەنییەکە لە ماست و خەیاری چنراو دروست دەکرێ.
دۆغەوا: دۆخەوا.
دۆق: سورمە یا سیمێکی چنراوی پانە دەگیرێت بەملیوانی عەبادا بۆ جوانی. پارچە تەنراوێکی رەشە ژنان دەیکەن بەعەبا. کوتەک (ز).
دۆک: د. دۆوک.
دوکان چەفتی: ل. شتی شەفتول و قەنگاس.
دوکتۆر: مامۆستایەکی زانیارە کە لە دوای سانەوی حەوت سالّی خوێندبێ. پەزیشکێکە کە دەرمانی نەخۆش بکا.
دوکلە: د. دوکەڵ.
دۆکولیو: چێشتێکە لە دۆ یا ماستاو لەگەڵ برنج یا ساوەردا دروست دەکرێ.
دۆکەشک: دۆی کەشکی سووراوە. چێشتێکە لە دۆی کەشک و برنج دروست دەکرێ.
دوگمە: جۆرە گرێیەکی گەورەی گردە بەیەخەی سوخمەدا دەگیرێ بۆ داخستن.
دوگمە و دۆلاب: چەکێکی زێرین یا زیوینی پلّپلّەدارە ژنان دەیدەن لە گۆشەی سوخمە و لە خوار مەمکیانەوە دای دەخەن.
دوگمە و قەیتان: دەستەیەکە لە دوگمە لەگەڵ قەیتاندا دەگیرێ بەقەراغی سوخمەدا بۆ داخستنی.
دوگون: ل. گرێ.
دوگەم: ه. پارچە دەوارێکە کە بەگردی دەواری زستانەدا دەگیردرێ بۆ بەرهەڵستی باران.
دۆڵ: شیو و دەرە. شتێکی قوولّە دروست دەکرێ لە دار یا لە بەرد شتی تێدا دەکوترێ. دەهۆڵ.
دۆلاب: تاقێکی قوولّی دوودەری دار یا سنووقێکی بالابەرزی دوودەری داری خانەخانەیە شتی تێ دەخرێ.
دۆلابە: کونێکی گەورەیە لەسەربانی ئاش دەهێلّرێتەوە بۆ ئەوەی لەوێوە (نێ)دا بهێلّرێتەوە خوارەوە.
دۆلاو: بەردی چالّی پڕ لە ئاو.
دۆڵ ئەنگێو: دەهۆڵ ژەن.
دولبەر: دلبەر.
دۆلّچە: شتێکە وەک سەتڵ لە چەرم یا لە خامی ئەستوور دروست دەکرێ ئاو یا قوری ناو بیری پێ هەلّدەهێنجرێ.
دۆلکە: دەفرێکی پچووکی قوولّە لە مس یا لە تەنەکە ئاوی پێ دەخورێتەوە.
دۆلکە: دۆلکە.
دۆلّمە: یاپراخ.
دۆلّە: کوول.
دۆلّەدرێژ: پەنجەی بالا بەرزە.
دۆلّەمێ: دەلّەمەی هێلکە.
دۆلّیان: نێی ئاش.
دۆلّیانە: ئەو جێگایەیە کە دانەی ئاشی تێ دەکرێ.
دۆم: تیرەیەکە لە کورد زۆرتر پیشەیان کلاش دروستکردنە.
دوما: ه. دوای شت.
دۆمانە: د. گورگەلۆقە.
دومبەلان: د. دومەلان.
دومدووک: دەندووک.
دومەک: د. دومەلّەک.
دۆمە: بەرمالّی دەوار.
دومەڵ: جۆرە برینێکی خڕی بەسوێیە لە جەستە دەردێ.
دومەلان: جۆرە قارچکێکی بەهاری خڕی گەرمیانییە لە زەوی هەلّدەتۆقێ.
دومەلّەک: جۆرە دەهۆلّێکە سەرێکی پان و سەرێکی تەسکە چەرمی خاو دەگیرێتە سەرە پانەکەی، دەخرێتە بن دەست و لە زەماوەند لێ دەدرێ.
دومەلّەک ژەن: کەسێکە دومەلّەک لێ بدا.
دۆمینە: ناوە بەجۆرە قومارێک.
دون: د. چیچکان. چۆک.
دۆن: د. توخن و قەرە.
دوندووک: دەندووک.
دوندە: لووتی هەوجاڕ کە گاسنی پێدا دەکرێ.
دونگ: دووگ.
دونگلّەفسە: کەلّەشێر و مریشکێکە کە یەک پەڕی درێژ بەکلکیەوە بێ.
دۆنێ: دوێنێ.
دوو: ناوە بۆ ژمارەیەک کە لە ناوەندی یەک و سێ دایە. دوکەڵ (ز). کلک (د).
دوو ئاوکردن: برینی ئاو خواردنەوە بەیەکێک.
دوو ئاوکەوتن: نەخۆشکەوتنی یەکێک بەهۆی ئاوی جێگایەکەوە کە تازە بۆی چووبێ و پێی ڕانەهاتبێ.
دووارد: ه. قەیچی.
دووادگ: دووارد.
دووان: گفتوگۆ کردن.
دوواندن: گفتوکۆکردن لەگەڵ یەکێکدا.
دوواندەر: کەسێکە کە خوتبە بدا.

دوواندەری: خوتبەدان.
دووانگە: جێیەکی تایبەتییە کە خوتبەی لەسەر دەدرێ.
دووانن: دوواندن.
دووباد: ڕیسی دوولۆنە. تەنراوێکە کە ڕیسەکەی دوولۆنە بێ: ئەم فاسۆنە (دووباد)ە. بریتییە لە مەردوومی قەڵەوی داڕێژراو.
دووبارە: وتەیەکە وتنەوە یا کردنەوەی کارێک دەگەیەنێ: (دووبارە) باسی فیساری کردەوە، یا (دووبارە) هاتەوە. ئارەق و گوڵاوێکە کە دووجار بگیرێتەوە.
دووبارەپات: وتە یا کردەوەیەکە کە دووجار وترابێ یا کرابێ.
دووبارەکردنەوە: دووبارەپات.
دووبرا: باڵندەیەکی ڕاوکەرە وەک هەڵۆ وایە هەمیشە دوانیان پێکەوە دەفڕن.
دووبراڵە: دووبرا. سەلکە پیازێکە کە دوو نێرکی ببێ.
دووبڕە: جۆرە خشڵێکە ژنان دەیکەن بە سەریاندا.
دووبڕیاگ: د. دوابڕاو.
دووبەختی: فرمانێکە کە ئەنجامی بگونجێ باش یا خراپ بێ.
دووبەرە: شتێکی گردی کولۆرە لە دار یا لە قوڕ دروست دەکرێ و دەنرێ بەپاشەوانەی هەنگەوە کە شانی تێدا هەڵبەستێ.
دووبەرەکی: بەربەرەکانی و ملەملە وێستانی دوو کەس یا زیاتر لەگەڵ یەکدا.
دووپاتە: دووبارە.
دووپایلکە: دەعبایەکی کێوییە لە سمۆرە پچووکتر و لە مشک گەورەترە.
دووپایلە: د. دووپایلکە.
دووپشک: دەعبایەکی چنگ چنگی کلک گرێ گرێی چزووداره بەگیاندارەوە دەدا.
دووپڵ: شتێکە کە ڕەنگی پڵپڵ وەستابێ. بریتییە لە مەردوومی دووڕوو (د).
دووپڵی: د. دووڕوویی.
دووپەڕە: گیایەکی بەهارییە وەک سێپەڕە بەڵام ئەم پەڕەکانی دوان دوانە.
دووپەلان: د. شتی دووفلیچقانە.
دووپەللە: هـ. قنگاوڵە.
دووپەلەبوون: ڕووانی هێندێ سەوزایی و پەل دەرکردنی.
دووتا: ز. گیانداری بەهێز لەسەر ئیشوکار.
دووتایی: جەواڵ یا هۆڕێکە کە هەردوو تاکەی پێکەوە بێ.
دووچار: گیاندارێکە گرفتاری چورتمێک بووبی، (دووچاربوون) گرفتاربوونی گیاندار، دووچارکردن: گرفتارکردنی گیاندار.
دووچاری: گرفتاری.
دووچەرخە: عەرەبانەی دەستی کە خاک و خۆڵی پێ فرێ دەدرێ. پایسکل.
دووچەنانە: د. دووچەندانە.
دووچەندان: دووچەندانە.
دووچەندانە: شتێکە کە دوو ئەوەندەی شتێکی تر بێ: نەریان (دووچەندانە)ی ساڵار زیرەکە، یا بەشەکەی تۆ (دووچەندانە)ی بەشەکەی منە.
دووحاچە: د. دووپەلان.
دووخ: شتێکی لووت تیژە بەخەرەکەوە ڕێسراوەکەی لەسەر هەڵدەکرێ.
دوو خاڵ: نیشانەیەکە وەکو: (:) لە شوێنێکدا دادەنرێ کە پاشەکەی ڕاڤەی پێشەکەی بێ.
دوو خشتەکی: تاقە شیعرێک.
دوو خەت: نائب عەریف.
دووخەوبوون: بێدارییەکی زۆر لە ناوەندی دوو خەودا.
دوو خەوی: دووخەوبوون.
دووخێن: بەندەخوێن.
دووخێن: با. دووخێن.
دوودانگ: دانەوێڵەیەکە کە دەنکەکانی دوو جۆر بێ: ئەم برنجە (دوودانگ)ە.
دوودک: با. شمشاڵ لێدان.
دوودڵ: بریتییە لە کەسێک لە وتن یا کردنی کارێکدا ڕاڕابێ.
دوودڵی: بریتییە لە ڕاڕایی لە کردن یا وتنی کارێکدا.
دوودووکەرە: جۆرێکە لە گۆزروان بەڵام ئەم ناخورێ.
دوودە: د. دوکەڵ.
دوودەری: دەرگا و پەنجەرەی دووتایی.
دوودەست بەناڵە: بریتییە لە یەکێک بەکڕین و فرۆتنی شتی هیچ و پووچ دەسمایەیەکی باش پێکەوە بنێ و دەست بکا بەکڕین و فرۆشتنی شتی گەورەتر.
دوودەسماڵە: د. جۆرە هەڵپەرکێیەکە دوودەسەسری تێدا هەڵدەسووڕێنن.
دوودەمان: هۆزی گەورە. بنەماڵەی گەورە.
دوودی: د. دوودە.
دوور: شتێکە کە نزیک نەبێ.
دووراندوور: لە دوورەوە: (دووراندوور) تۆم دی.
دووراندن: د. دروونی شت.
دوورانەوە: د. دروونەوەی کاڵا.
دووراودوور: بوونی دوو کەس بەدوور لەیەک.
دوورئەندێش: کەسێکە زۆر بیر لە ئەنجامی شت بکاتەوە.
دووربا: وتەیەکە لە شوێنی (خوانەکا) بەکاردێنرێ.

دوور بەدوور: دووراودوور.
دووربیێ: دووربا.
دووربین: دوور ئەندێش. شتێکە کە تەماشای شتی دووری پێ بکرێ نزیکی بخاتەوە.
دووربینی: وردبوونەوە لە ئەنجامی کارێک.
دوورخستنەوە: گێڕانی شت بەدوور لە خۆت.
دووردەس: دووردەست.
دووردەست: شتێکە کە دووربێ لێت و دەستت نەیگاتێ.
دووڕاز: د. مەردوومی دووڕوو.
دووڕوو: کەسێکە لە ڕوو جۆرێک و لەپاش ملە جۆرێکی تر بێ.
دووڕوویی: قسەکردن لە ڕوو جۆرێک و لە پاشملە بەجۆرێکی تر.
دووڕەگ: گیاندارێکە کە باوک و دایکی لە جۆرێک نەبن. بریتییە لە ئادەمییەک کە باوکی لەگەلێک و دایکی لە گەلێکی تر بێ.
دووڕەنگ: بریتییە لە مەردوومی دووڕوو.
دووڕەنگی: دووڕوویی.
دووڕیان: شوێنێکە کە دووڕێی لێ بووبێتەوە.
دووڕێویلە: گیایەکە دوو لقی لێ دەبێتەوە سەر بەرەوژوور، لە کلکی ڕێوی دەچێ.
دوورک: با. لەواشە. شمشێرەی دەرگا.
دوورکوژ: بریتییە لە شتێک ئەوەندەی لە دوورەوە جوان دەنوێنێ لە نزیکەوە وانەبێ.
دوورکەوتنەوە: جوێبوونەوەی شتێک لە شتێک و پێکەوە نەمانیان.
دوورنوار: د. دووربین.
دوورنیازی: کنایە.
دووروا: د. دووری.
دوور و نزیک: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ دواکەوتنی یەکێک بۆ گیاندارێک بەجۆرێک کە نەدووربێ لێی بەتەواوی و، نەنزیکیش بێ بەتەواوی: (دوور و نزیک) دوای فیسار کەس بکەوە.
دوورەبەرد: هاویشتنی بەرد لە دوورەوە: ئیمڕۆ بە(دوورەبەرد) مارێکم کوشت.
دوورەپەرێز: سڵکردن و هاتنە پێشەوەی یەکێک لە یەکێک بەپارێزەوە.
دوورەدەس: دوورە دەست.
دوورە دەست: دوور دەست.
دوورەوپەرێز: دوورە پەرێز.
دوورەوە کەفتن: د. دوورکەوتنەوە.
دوورەوەکەوتن: دوورکەوتنەوە.
دووریاگ: د. درواو.
دووری: بوونی شت بەدوور. جۆرە تەنراوێکی تەنکی کون کونە ژنان دەیکەن بەسەرپۆش.
دوورین: دروون.
دوورینەوە: درووونەوە.
دووز: با. بووزوو.
دووزاخەدان: سەغڵەت کردن و بەگیرهێنانی یەکێک.
دووزبان: دووڕوو.
دووزبانی: دووڕوویی.
دووزمان: دووزبان.
دووزمانی: دووزبانی.
دووزوان: د. دووزمان.
دووزوانی: د. دووزمانی.
دووزەلە: دوو لوولە قامیشی باریکە لەپاڵ یەکدا بەقیر پێکەوە دەنرێن و هەر یەک چەند کونێکی تێدایە فووی پێدا دەکرێ و دەنگێکی لێ پەیدا دەبێ.
دووژ: ز. دۆزەخ.
دووژنە: پیاوێکە دوو ژنی ببێ.
دووژەنگ: دۆژەنک. چینی برۆ و ناوچەوان.
دووسم: بریتییە لە گا و مانگا و مەڕ و بزن.
دووسمە: د. دووسم.
دووشاخە: د. شتی دوو لپ.
دووشک: مەردوومی دوودڵ.
دووشەمب: با. دووشەممە.
دووشەممە: ڕۆژی سێیەمی حەفتە لە هەینی بەدواوە.
دووشەموو: دووشەممە.
دووشەمە: دووشەممە.
دووشەویلە: هەردوو لای شەویلە.
دووفاق: شتی دووپەل.
دووفلیچقانە: شتێکە دوو پەلی لێ بووبێتەوە و پەلەکانی لەیەک نزیک بن.
دووفلێقان: د. دووقلیچقانە.
دووفلیقان: د. دووفلیچقانە.
دووڤ: ز. کلکی گیاندار.
دووڤرەیک: ز. چۆلەکەیەکی کلک ڕەپی بۆرە.
دووڤسنک: ز. جۆرێکە لە کوللە کلکێکی هەیە وەک بەرد ڕەقە.
دووڤسۆرک: ز. ئالیسۆر.
دووڤ مەساس: ز. جۆرە مەلێکە شەو بەچنگ خۆی هەڵدەواسێ بەدرەختدا و دەفیکێنێ بۆ ئەوەی کە خەوی لێ نەکەوێ نەوەک بیگرن.

دووقات: تەنراوی دووباد: ئەم فاسۆنە (دووقات)ە. خانووی دوو نهۆم.
دووقۆچکە: د. جۆرە کڵاوێکە دەکرێتە سەر وەک کلێتە وایە.
دووقەد: شتی دوو توێ.
دوو قەدەرە: بڵقەدەرە.
دوو قیمەکردن: دوو نیمەکردنی شتێک.
دووک: خەرەک (هـ). لقی وردی داربەڕوو کە لە قەدەوە دەری دەکا.
دووکان: ژوورێکی دەرابەدارە لە بازاڕ شتی تێدا دادەنرێ بۆ فرۆشتن. خانەیەکی چوارگۆشەی بڕدراوە لە زەوی بۆ شت تێدا چەندنی: باخەکەی هەموو (دووکان دووکان) کردووە. ناوی دوو دێیە لە ناوچەی سورداش و قەرەداخ.
دووکاندار: کەسێکە لە دووکان دابنیشێ بۆ شت فرۆشتن.
دووکایچ: هـ. دووخ.
دووکلکە: دەعبایەکی ڕەش و سووری درێژکۆلەی شاخدارە لە قالۆنچە دەچێ کلکێکی دووفاقی هەیە.
دووکڵە: تەشیلە.
دووکوڕ: جۆرە مراوییەکە.
دووکولّیە: هـ. دووکڵە.
دووکۆیی: د. شتی دوو بەشی لە ناوەندی دوو کەسدا (مشترک).
دۆکە: شتێکی سپی لینجە دەدا لە هێندێ شینایی لە کەڵکی دەخات.
دووکەک: هـ. چیکەنە.
دووکەڵ: هەڵمێکی ڕەشی تاریکە لە شتی سووتاو بەرز دەبێتەوە.
دووکەڵدان: دووکەڵکێش.
دووکەڵکێش: بۆرییەکە دووکەڵی لێوە دەردەچێ.
دووکەڵگیر: دووکەڵکێش.
دووکەوتن: لەپاش شتەوە ڕۆیشتن.
دووگ: چەورییەکی نەرم و شلی سپییە بەپاشی مەڕەوە.
دووگاسنە: زەوییەکە دووجار کێڵرابێ.
دووگرد: پێخەفێکە وەک جاجم بەڵام ئەم لە لۆکە دەرێسرێ.
دووگردی: جاجم و مەوجی پێ لێ وەرگێڕ.
دووگور: ز. دووگردی.
دووگورد: دووگردی.
دووگوردی: دووگردی.
دووگومان: دوودڵ.
دووگومانی: دوودڵی.
دووگونە: تۆوێکی تاڵی پچووکی شەنکۆڵە لەناو خەلەدا دەبێ.
دووگوە: ز. دارێکی دوو پەلە دڕکی پێ دەشکێنرێتەوە.
دوولا: دوولۆنە.
دوولازەن: د. دووڕوو.
دوولانە: دووقەد.
دوولایی: لووتەوانەیەکە دەدرێ لە دەرگا بۆ داخستن و هەڵپێکانی.
دوولۆ: دوولانە.
دوولۆرە: د. کەسێکە کە بەسەر دەمدا کەوتبێ.
دوولۆنە: دوولۆ.
دوولەپان: د. شتی دووپەل.
دوولەقان: د. دوولەپان.
دوومالّەکی: ماڵ جیایی کردن لەگەڵ یەکێکدا.
دوومان: ز. تەم و تومان.
دووموهر: ز. وڵاخی جووتە.
دوومەشقان: د. دانیشتن بەچۆکدا.
دوومەڵ: دومەڵ.
دوومەڵان: دومەڵان.
دومەڵەک: دومەڵەک.
دوونان: کەسێکە لە یاری (قەلەمرداریێ)دا دوو جار لەسەر یەک لە تۆپ بدا.
دوونیمە: شتێکە بووبێ بەدوولەتی ڕاستەوە، (دوونیمەبوون) بوونی شتێک بەدوولەتی ڕاستەوە، (دوونیمەکردن) کردنی شتێک بەدوولەتی ڕاستەوە.
دۆوشکە: دۆینە.
دۆوک: چڵکی کەرەی گەرم کراو.
دووە: هـ. هەڵمێکە لە کەناری ئاسماندا پەیدا دەبێ لە گەرمادا.
دووەم: شتێکە لە پایەی دوودا بێ.
دووەمین: دووەم.
دووهۆیی: د. دووڕوویی.
دووهەم: دووەم.
دووهەمین: دووهەم.
دوهێشە: د. وەرد.
دووینە: د. دۆینە.
دووین: دوێنێ.
دۆە: دوێنێ.
دوهی: ز. دوێنێ.
دوێ: دوێنی. دوو (هـ).
دوێت: شتێکی پچکۆلەی قووڵە مەرەکەبی نووسینی تێ دەکرێ. کچ.
دوێتە: کچ: دادە ببینە و (دوێتە) بخوازە.

دوێداندۆک: خەستەی توورەکە.
دوێرد: دوێردگ.
دوێردگ: قەیچی.
دوێردە: قەیچی.
دوێردی: دیاری کردن.
دویساندن: ز. ئاخنین و داگرتنی شت.
دوێشەو: شەوی پێش ئەو شەوەی کە تۆی تێدایت.
دوێکە: دوێنێ.
دوێکەرە: دوودووکەرە.
دوێڵ: ز. زویلی چەرم کە درومانی پێ بکرێ.
دوێڵ: د. تەلەبەرد.
دوێڵبەن: د. شوێنی تەختەپۆش کراو بەتەلەبەرد.
دوێن: دۆینە (با). دوێنێ.
دۆینە: بروێشێکە لەگەڵ دۆدا تێکەڵ کرابێ و وشک کرابێتەوە. دۆکولیو.
دوێنە: د. دوێنێ.
دوێنێ: ڕۆژی پێش ئەو ڕۆژەی کە تۆی تێدایت.
دوێنێ شەو: دوێ شەو.
دویر: با. دوور.
دوین: دۆینە (با). گفتوگۆ کردن (د).
دۆین: چێشتی دۆینە.
دە: ناوە بۆ ژمارەیەک کە لە ناوەندی نۆ و یازدە دایە. پیتی هاندانە دەچێتە سەر (فعلی ئەمر)ی حازر لە ئێستادا: (دە) بنووسە، (دە) برۆ، واتە ئێستا. پیتی ڕابووردووی درێژەدار (ماضی استمراری)ە: پار (دە)م خوێند، واتە هەموو پار لە خوێندندا بووم. پیتی لەمەولا (استقبال): (دە) خوێنم، واتە لەمەولا.
دەبا: پیتی هاندانە دەچێتە سەر (فعلی ئەمر)ی حازر و غائب بۆ لەمەولا: (دەبا) بچیت، (دەبا) بڕوا، واتە لەمەولا.
دەباخانە: شوێنێکە پێستەی تێدا دەباخ بدرێ.
دەباخچی: کەسێکە پێستە دەباخ بدا.
دەباخدان: خۆشکردنی پێستە بەجەوت و مازوو.
دەباخکردن: دەباخدان.
دەباشیر: شتێکی سپییە وەک گەچ لەسەر تەختەی ڕەش پێی دەنووسرێ.
دەبان: جۆرە پۆڵایەکی جەوهەرداره خەنجەری لێ دروست دەکرێ.
دەبدەبە: هەرا و زەنا لەگەڵ کۆبوونەوەی مەردوومدا: فیسار کەس بە(دەبدەبە) ژنیان بۆ هێنا.
دەبر: ز. ژیان و گوزەران.
دەبلاخ: بەچکە وشتری یەک ساڵە.
دەبوقان: ز. دەمووکانە.
دەبووش: ز. شتی لینج.
دەبە: سواغ یا دیوارێکە هەڵتۆڵ بووبێ و ورگی دابێ. بریتییە لە هێندێ گیانداری سکپڕ. بریتییە لە مەردوومی قۆڕ. بەرمیل.
دەبەنگ: مەردوومی وڕی گێژ و وێژ. مەردوومی دەویت (د). قەحبە (د).
دەبیش: با. لینج.
دەپ: ز. لەوحی دار.
دەتیر: دەمانچە و تفەنگێکە کە دە گوللە بخوا.
دەحادەحا: د. تەحاتەحا.
دەحبە: ز. دڕندە.
دەحشک: ز. جاش و جوانوو.
دەحل: دارستانی کەم (با). باخ و بێستان (ز).
دەخس: ز. مەردوومی ڕژد.
دەخسین: ز. حەسادەت و قین.
دەخڵ: د. دەغڵ.
دەخڵودان: د. دەغڵودان.
دەر: دەرگا. دەرەوە: بچۆرە (دەر) واتە بچۆرە دەرەوە. دەشت (د).
دەرابدان: ز. قارسکردنی کاڵا.
دەرازینک: با. ئاستانەی دەرگا.
دەرامەد: دەستکەوتێکە گوزەرانی پێ بکرێ.
دەرانین: ز. دەرهانین.
دەراو: دەربەند: (دەراو)ی گۆیژە فێنکە. دراوی گۆزە و دیزە و سەبیلی تازە. شوێنێکە کە ژنان بەرگی تێدا بشۆن.
دەربات: ز. هاوشان لە هێز و بازوودا.
دەربار: دەربارە.
دەربارە: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (لەلایەن): (دەربارە)ی مەردووم باش بدوێ.
دەرباز: کەسێکە لە چورتمێک ڕزگار بووبێ، (دەربازبوون) ڕزگاربوون، (دەربازکردن) ڕزگارکردن.
دەربازگە: شوێنێکە کە مەردووم لێوەی دەرباز ببێ.
دەربان: دەرگەوان.
دەربایست: دەربەست.
دەربایستی: دەربەستی.
دەربردن: هەڵکردن و گوزەران کردن. دەربوواردن.
دەربڕین: درکاندنی شتێک کە لە دڵتدا شاردبێتتەوە.
دەربک: ز. دارێکی پچکۆلەی کولۆرە بارووتی تێ دەکرێ بۆ هەڵگرتن.
دەربوواردن: دەربردن و فرێدانی شتێک لەناو چەند شتێکی تردا: لە نووسینەکەدا دێرێکت (دەربووارد).

دەربوون: گەیین و دەرگا تێ بوونی دومەڵ.
دەربوونە: کۆڵانی تەسکی باریک کە دەر نەچێ.
دەربەدەر: کــەســێکە کــە لە شــوێنی خــۆی ئاوارە بووبێ، (دەربەدەربوون) ئاوارەبوون، (دەربەدەرکردن) ئاوارەکردن.
دەربەدەری: ئاوارەیی.
دەربەس: د. دەربەست.
دەربەست: کەسێکە بەتەنگ شتێکەوە بێ.
دەربەستە: دەربایست.
دەربەستەیی: دەربایستی.
دەربەستی: دەربەستەیی.
دەربەسە: د. دەربەستە.
دەربەن: دەربەند (د). قوڵفەی دەفر (ز).
دەربەندن: دەرەیەکە لە ناوەند دووکێودا.
دەربێن: د. دەم بێن.
دەرپاچە: د. دەرەلنگ.
دەرپوشک: با. سەرقاپ.
دەرپۆقین: هاتنەدەرەوەی گلێنەی چاو.
دەرپۆقیو: گلێنەی چاوێکە کە دەرپەڕی بێ.
دەرپەڕاندن: دەرکـردن و دوورخــستنەوەی شـتـێک لە شـوێنێک بەزۆر. زەقکردنەوەی چاو یا قــوتکردنەوەی شــوێنێک لە ئەندام: چاوی یا سمتی (دەرپەڕاند).
دەرپەڕان: دەرپەڕاندن.
دەرپەڕین: دەرچوونی شتێک لە شوێنێک.
دەرپەڕیو: شتێکە کە لە شوێنێک دەرچووبێ.
دەرپێ: کاڵایەکی پزووداری دوو لنگە دەکرێتە پێ.
دەرتەقێن: د. ئاسنێکە بەدەرگاوە پێی لێ دەدرێ.
دەرچاو: ز. دەسەسڕ.
دەرچڕاندن: د. دەرکردن.
دەرچک: ز. ژێردەرگا.
دەرچوون: دەربازبوون بەچالاکی. تەقینی چەک لە خۆیەوە. پوختە و قالبوونی هێندێ شت: پیالەکە یا گۆزەکە (دەرچووە) واتە لە تەقین و شکان ڕزگــاربووە. لە خــرتکە چوونی ئەندام: دەســتم (دەرچووە) ڕزگــاربوون و ســەرکــەوتنی یەکـێـک لە تاقیکردنەوە (امتحان)دا.
دەرحەسین: با. خلیسکان.
دەرخستن: ئاشکراکردنی شتێک.
دەرخوارد: هاوشان و هاولف: من (دەرخوارد)ی تۆ نیم.
دەرخـواردان: پێ خـواردنی شـتـێک بەیەکـێک بەزۆر. وردە وردە تێوەدان و تێکەڵکردنی شتێکی ورد لەگەڵ شتێکی شلدا: ئاردەکە (دەرخواردی) سەمەنیەکە بدە.

دەرخون: ز. دەرخۆنە.
دەرخۆنە: سـەرپۆشـێکی گـڵـینی دەسکدارە دەخرێتـە سـەر دەمی مەنجەڵ لەسەر ئاگر. جۆرە پنەیەکە.
دەرخوینک: دەرخۆنەی دار.
دەرد: نەخۆشی.
دەردان: هەڵ هێنجـانی شـتـێک لە دەفـرێک یا لە شـوێنێک. دەرکـردنی لق و پۆپی سـەوزایی: مـێـوەکـە چرۆی (دەرداوە). پەیابوونی ئاوڵە و سوورێژە و شتی تر لە جەستە.
دەردانک: ز. پەڕۆیەکـە کە پەنیـری تازەی تێ دەکـرێ بۆ ئاوە چۆڕ بوونی.
دەرداوی: شتێکە کە دەردێکی پێوە بێ.
دەردمردە: گیانداری دەغەزاری دەردەدار.
دەردۆک: د. دەردۆنگ.
دەردوو: د. دەربێن.
دەردەباریکە: دەردی سیل.
دەردەدار: گیاندارێکە کە دەردێکی پێوەبێ.
دەردەداری: بوونی گیاندار بەخاوەن دەرد.
دەردەست: شتێکە کە لەژێر دەستدابێ، دەردەستبوون: هاتنە ژێر دەستی شتێک، دەردەستکردن: هێنانە ژێر دەستی شتێک.
دەردەکـــۆیان: دەردێکی گــرانە تـووشی هێندێ منداڵ دەبێ لە عەزرەتدا کەف دەچێنێ و چنگ قژ دەکاتەوە.
دەردی سـەر: بریتـیـیـە لە ڕەنج و سـەغـڵـەتی: تـووشی (دەردی سەر)م مەکە. سەرئێشە.
دەردی سەری: دەردی سەر.
دەردی کاری: دەردی بێ دەرمان.
دەڕ: مالۆس. دەڵ (د). دڕندە (د).
دەڕابە: شـتـێکی پانە لە تەختـە یا لە چینکۆ دەگـیـرێ بەپـێـشی دوکاندا.
دەڕاشۆ: د. ژنی بێ حەیا.
دەرز: ئەندازەیەکە لە نووسراو کە بەقوتابی دەوترێ.
دەرزە: هـ. کۆمەڵێک لە (لۆ).
دەرزەن: دوانزە دانە لە هێندێ شت.
دەرزی: ئاسنێکی باریکی نووک تیـژە سەرێکی کونێکی تێدایە هەودای تێ هەڵدەکێشرێ و دروومانی پێ دەکرێ.
دەرزی ئاژن: دەرزیکردن بەشتێکدا یەک لەسەر یەک.
دەرزی دان: شتێکی کولۆری باریکە دەرزی تێ دەخرێ.
دەرزی لۆکە: گیایەکی بەهارییە بەرێک دەگرێ وەک دەرزی وایە.
دەرزیلە: دەرزی لۆکە.
دەرسۆک: با. دەسەسڕ.
دەرشۆ: ز. شاڵی کاسە و کەوچک شووشتن.

دەرفەت: هەل: لە (دەرفەت)ێکدا وەرە.
دەرڤە: ز. چوونە دەرەوەی شتێک لە شوێنێک.
دەرقیل: ز. چاکڵ.
دەرک: دەرگا.
دەرکـردن: ڕۆیاندن و دوورخـسـتنەوەی یەکـێک لە شـوێنێک. خوێندنەوەی نووسراوێک بەئاسانی: فیسار کەس کاغەزەکە (دەرناکا) واتە نازانێ بیخوێنێتەوە. دەربازکردنی شتێکی قاچاغ و ڕزگارکردنی. دەرگا تێکردنی برین. پەیابوونی گەڵا و لق و پۆپ لە درەخـتـدا. دەردانی ئاوڵە و سـوورێژە. جیاکردنەوەی مووچەخۆر لە پیشەکەی.
دەرکـردە: ئەو بەروبوومـەیە کـە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەنێـردرێ بەبازرگـانی. ئەو نووسـراوانەیە کـە ژمـارەیەکی تایبـەتی دەخـرێتـە سـەر و لە دائیـرەیەکـەوە دەنێـردرێ بۆ دائرەیەکی تر (صادره).
دەرکوت: د. دەرتەقێن.
دەرکودوو: دەرماڵ: یاخوا لە هیچ (دەرکودوو)یەکدا نەبیت.
دەرکە: دەرگا.
دەرکەتن: ز. دەرکەوتن.
دەرکەفتن: د. دەرکەوتن. تەڕەبوون.
دەرکەفتە: گیانداری تەڕە و توونا بوو.
دەرکـەنار: مـەردوومی گـۆشـەگـیـر. چەند دێڕێکی کـورتە کـە نووسرابێ لە داوێنی نووسـراوێکی ترەوە لەلایەن گـەورەیەکی دەوڵەتییەوە.
دەرکەناری: گۆشەگیری.
دەرکـەوتن: ئاشکرا و نمایانبـوونی شت. چوونە دەرەوە لە شوێنێک.
دەرکەوتوو: شتی ئاشکرا و ئمایان. کەسێکە چووبێتە دەرەوە.
دەرکەوتە: دەرکەوتوو.
دەرکێشان: هێنانە دەرەوەی شتێک لە شتێک بەزۆر.
دەرگـا: دەلاقـەیەکـە لە ژوور و حـەوشـدا هاتوچۆی پێـدا دەکـرێ. چوارچێوە و تەختەیەکە کە بگیرێ بەدەلاقەی دەرگادا. دەمی هەموو دەفر و کونێک.
دەرگابوون: کونبوونی برین لە خۆیەوە: دومەڵەکە (دەرگای بووە).
دەرگابێن: پەتێکە دەرگای هەمانە و شتی تری پێ دەبەسترێ.
دەرگاخن: پڕکردنی دەفرێک لە شتێک و ئاخنینی تا دەرگاکەی.
دەرگاکردن: دەرکردنی برین.
دەرگاکەل: دەرگا.
دەرگڤانک: با. سەرقاپی کووپە و گۆزە.
دەرگوشادانە: د. درگاژەنانە.
دەرگە: دەرگا.
دەرگـەوان: کـەسـێکە هەمـیـشـە ئاگـای لـە دەرگابێ بۆ کـردنەوە و داخستنی.
دەرگیل: ز. چەپەر.
دەرماڵ: خانووبەرە: لە (دەرماڵ)ی فیسار گەورە بووە. دۆمە.
دەرماڵە: ز. دابەستە.
دەرماڵی: کـار و بەرخـێکە بەهۆی درەنگ لە دایکبـوونیـەوە لەناو ماڵدا بەخێو بکرێ. خانەزا.
دەرمـان: شـتـێکە بۆ چاکـبـوونەوە بدرێ بەنەخـۆش. بریتـیـیـە لە داڕوو.
دەرمانخانە: کۆگای دەرمان.
دەرمانخوار: د. دەرمان خوارد.
دەرمانخوارد: کەسێکە زەهری درابێتێ. باڕووت.
دەرمانخوارد کردن: زەهردان بەیەکێک بۆ کوشتنی.
دەرمانخواز: چاوێکە کە بیەشێ و پێویست بێ بەدەرمان.
دەرمانساز: کەسێکە دەرمان دروست بکا بۆ نەخۆش (صیدلی).
دەرمانک: با. ئاڵەت.
دەرمانکردن: تیمارکردنی نەخۆش.
دەرمانکوت: کەسێکە پیشەی هەر باڕووت دروستکردن بێ.
دەرمانکەر: د. پەزیشک.
دەرمانگە: شوێنێکە کە دەرمانی تێدا دەفرۆشرێ.
دەرمانگەر: کەسێکە کە دەرمان بگرێتەوە (صیدلی).
دەرمانگەری: خەریکبوون بەگرتنەوەی دەرمانەوە (صیدلە).
دەرمەجێل: د. دەرمەنجەڵە.
دەرمەجێلە: د. دەرمەجێل.
دەرمەنجلە: هـ. دەرمەنجەڵە.
دەرمەنجەڵە: چەپەر.
دەرمەنە: د. داماو.
دەرنخوون: د. دەمەونخوون.
دەروازە: دەرگای گەورەی دووتاییی حەوش.
دەروازەوان: د. دەرگەوان.
دەروان: د. دەرگەوان.
دەروبان: دەوروبەری خانوو: نەخۆشەکە (دەروبان) دەکا.
دەروبانکردن: دەرودەشت کردن.
دەرودراوسێ: دراوسێی نزیکی دەوروبەرت.
دەرودوو: دەروبان.
دەرودەشت کـردن: هاتـوچۆکـردنی دەشت و دەر: فـیـسـار کـەس (دەرودەشت دەکا).
دەرۆر: هـ. سەرکەوتن بەناوشیو و دەرەدا.
دەرۆزان: خاکەڕۆ.
دەروژوور کـردن: هاتنە دەرەوە و چوونـەوە ژووری منداڵی تـازە پێ گـرتوو، نەخـۆشی تازە چاکـەوە بوو: منداڵەکە یـا نەخـۆشەکـە (دەروژوور) دەکا.

دەرۆم: د. ژەقنە.
دەروو: دەربەند. دەرەتان: خوا (دەرووت) لێ بکاتەوە.
دەروون: دیوی ناوەوەی بۆشی جەستە.
دەروەن: د. دەربەند و دەرە.
دەروەنجەڵە: د. دەرمەنجەڵە.
دەروێش: کـەسـێکە کـە بەڕاسـتی خـواپەرست و بەبەشی ئەو دابکەوێ.
دەروێشی: خواپەرستی و بەبەشی ئەو داکەوتن.
دەرە: ناوشیوی قووڵ.
دەرهاتن: هاتنە دەرەوەی شـتـێک لـە شـوێنێک. پوختـەبوون و پێگەیشتنی شتێک: منداڵەکە باش (دەرهاتووە) واتە ژیر و زرنگ بووە، یا گۆزەکە (دەرهاتووە) واتە باش دەرچووە.
دەرهاتوو: مەردووم یا شتێکە کە پوختە بووبێ.
دەرهانین: دەرهێنان.
دەرهاوردن: دەرهێنان.
دەرهاوێژران: دەرهاویشتن.
دەرهاوێژراو: شتێکە لە شتێکی تر فڕێ درابێ.
دەرهاویشتن: فڕێدانی شتێک لەناو چەند شتێکی تردا.
دەرەبۆڵە: جۆرە ترێیەکی سووری دەنک گەورەی خڕە.
دەرەبەگی: ئاژاوە و تێکچوونی ئاسایشی وڵات بەهۆی زۆرداری ئاغا و دەست ڕۆیشتووەوە.
دەرەتان: ڕێگای ڕزگـاری و دەرچوون: (دەرەتان)م نییـە، یا بێ (دەرەتان)م.
دەرەوە: هـ. باخی ناو چەم و دۆڵێکە کە کەوتبێتە لای خواروو.
دەرەقەت: توانین و دەسەڵات.
دەرقـەت هاتن: توانایی و دەست ڕۆیشتن بەسـەر شـتـێکدا: (دەرقەت)ی ئەو فرمانە یا ئەو زەلامە نایەم.
دەرەک: ز. جێگای نەزانراو.
دەرەکی: گـیـاندارێکە کـە بێگانە بێ لەناو ئەو کـۆمـەڵەدا کـە تێدایەتی.
دەرەلنگ: کونی خوارووی دەرپێ و شەرواڵ و ڕانک و پانتۆڵ کە پێی پێدا دەکرێ.
دەرەنگ: ز. درەنگ.
دەرەو: درۆ (ز). دەرەوە (د).
دەرەوری: هـ. باخی ناوچەم و دۆڵێکە کە کەوتبێتە لای ژووروو.
دەرەوە: دیوی ئاشکرا و بینراو لە شت کە لە ڕووی ناوەوە نەبێ.
دەرهێنان: هێنانە دەرەوەی شتێک لە شتێکی تر.
دەرهێنراو: شتێکە کە لە شتێکی تر هێنرابێتە دەرێ.
دەرێ: دەرەوە.
دەریا: ئـاوێکی ئێـجگار زۆری بێ پەیە کـە ئەم پەڕ و ئەو پەڕی دیار نەبێ و لەوانە بێ کـە کـەشـتی و پاپۆڕی بەسـەرەوە بگەڕێ.
دەریاچە: دەریای پچووک.
دەریاگر: جەردەی ناو دەریا.
دەریایی: کەسێکە کە هەر لە دەریادا ئیش بکا.
دەرێخستن: ز. دەرخستن.
دەریزان: ز. بەردەمی قاپی.
دەری: ز. دەرگا.
دەریچە: دەرگا یا پەنجەرەی پچووک.
دەزبێنک: د. بازن.
دەزگ: دەزوو.
دەزگا: شتێکی پانە لە ئاسن یا لە دار دروست دەکرێ و ئاسنگەر یا کاڵادروو کاری لەسەر دەکا.
دەزگر: پەڕۆیەکی درێژی ئەم سەر و ئەوسەر پانە مەنجەڵی لەسەر ئاگـر پێ دادەگـیـرێ. کـارێکە زوو بەدەسـتـەوە نەیە و دەست بگرێ.
دەزگێڕ: فرۆشیارێکە شت بەدەست بگێڕێ بۆ فرۆشتن.
دەزگیر: دەستگیر. دەزگر.
دەزگیـران: کوڕ یا کچێکە کە ناویان بۆ یەکتری برابێ و خوازبێنی کرابێ و بەتەمای یەک بن.
دەزوو: هەودای باریکی ڕێسراو لە لۆکە.
دەزووران: دەزگیران.
دەزوولە: شتێکە وەک دەزوو لە کشانی شتی لینج پەیدا دەبێ.
دەزوولەبەستن: دەزوولەکردن.
دەزوولەکردن: پەیدابوونی دەزوولە لە شتی لینجـەوە: شەربەتەکە یا دۆشاوەکە دەزوولە دەکا: واتە خەست بووەتەوە.
دەزی: ز. دەزوو.
دەزیران: دەزگیران.
دەژ: شتی دەست نەزەدە.
دەژاندن: داخکردنی دانی کولۆر بۆ ژان شکانی.
دەس: دەست.
دەسـا: وتـەیەکـە بـەکـاردێنرێ لە نـاوەندی دوو وتاردا هۆیەتـی (علیت)ی پێشووەکەیان دەگەیەنێ بۆ پاشووەکەیان: (دەسا) بخۆ لە وەرامی یەکێکدا کە بڵێ زۆرم برسییە.
دەس ئاژۆ: د. دەستەمۆ. دەسەسر.
دەس ئاگر: د. دەستەچیلە.
دەس ئاوان: د. دەسکەوان.
دەس ئاوێژ: د. هەڵمەت: فـیـسـار کەس (دەس ئاوێژ) بوو، واتە هەڵمەتی دامێ. وچان.
دەسان: د. داستان.
دەساندەس: د. بەرامبەر. دەستاو دەست.
دەساو: د. دەستاو. دەستیاو.

دەساودەس: د. دەستاودەست.
دەسبازی: د. دەستبازی.
دەسبڕ: د. دەستبڕ.
دەسبڕی: د. دەستبڕی.
دەسبڕین: د. دەست بڕین.
دەسبەجێ: د. دەستبەجێ.
دەس بەدەس: د. دەست بەدەست.
دەسبەن: د. دەستبەند.
دەسپەرژان: د. دەستپەرژان.
دەسپەرژیان: د. دەستپەرژان.
دەسپێچ: د. دەسرازە. پەڕۆیەکە نان پێوەدەر لە دەستی دەئاڵێنێ لەکاتی نان پێوەداندا.
دەسپێچک: دەسپێچ. ئەندازەیەکە لە خوری شیکراوە کە لە دەستەوە بئاڵێنرێ بۆ ڕستن.
دەسپێچەنە: دەسپێچک.
دەسپێکردن: د. دەست پێکردن.
دەست: پەلی گیاندار لە شانیەوە تا پەنجەکانی. بریتییە لە دەسەڵات: فیسار کەس (دەست)ی هەیە. بریتییە لە قاتێک کاڵا. جۆر و چەشن: کەواکەم لە (دەست)ی کەواکەی تۆیە، واتە لە چەشنی ئەوە. وتەی پەسند و ئافەرین: لە کاتێکدا کە یەکێک کارێکی جوانی لە دەست دەرچێ دەڵێت (دەست) واتە ئافەرین دەستت خۆش بێ.
دەست ئاژۆ: د. دەس ئاژۆ.
دەستار: دوو بەردی پانی گردە بەدەست دەگێردرێ و دانەوێڵەی پێ دەهاڕدرێ.
دەستان: داستان.
دەستاو: مەلوولاوێکی شلە دەگیرێتەوە لە ئارد و ئاو بۆ کار و بەرخی ساوا. دەست بەئاو گەیاندن (ز).
دەستاوبرد: دەستوبرد.
دەستاودان: دەست تەڕکردنی هەویرشێل بۆ ئەوەی کە هەویرەکەی باش بۆ بشێلدرێ یا بۆی شل ببێتەوە. دانی دەستا و بەکار و بەرخ.
دەستاودەست: چوونی شتێک لە دەستی ئەمەوە بۆ دەستی ئەو.
دەستاوێز: جێگە دەست لە شت بۆ دەست پێوەگرتنی.
دەستاوێژ: ماوەی هاویشتنی بەردێک بەدەست: ماڵی ئێمە تا بازاڕ (دەستاوێژێکە).
دەستبازی: چنگە پۆپان و یاریکردن.
دەستبڕ: بریتییە لە فێڵبازی مەردووم خەڵەتێن.
دەستبڕی: دەستبڕین.
دەستبڕین: بریتییە لە فێڵبازی و مەردووم خەڵەتاندن.

دەست بڵاو: بریتییە لە کەسێک کە ماڵی خۆی بەفیڕۆ بدا.
دەست بڵاوی: ماڵ بەفیڕۆدان.
دەست بووری: ز. کەسێکە کە هەر قسەی ببێ و کردەوەی نەبێ.
دەستبوون: بریتییە لە دەسەڵات و دەسترۆیشتن: یاخوا زۆردار هەرگیز دەستی نەبێ: بریتییە لە بەشداربوون لە شتێکدا: فیسار کەس دەستی هەیە لەو کارەدا، یا دەستی کەریەتی هەیە، واتە بەشدارە تیایاندا.
دەست بەئاو گەیاندن: بریتییە لە چوونە سەر پێشاو.
دەست بەتاڵ: بریتییە لە مەردوومی بێ کار.
دەست بەتاڵی: بریتییە لە بێ ئیشی.
دەست بەجێ: کوتوپڕ.
دەست بەدەست: دەست بەجێ.
دەست بەدەستادان: بریتییە لە پەشیمانی و دەرچوونی هەلێک لە دەستت.
دەست بەردار: بریتییە لە کەسێک کە دەستی لە کارێک هەڵگرتبێ، (دەست بەرداربوون) بریتییە لە دەست هەڵگرتن لە کارێک.
دەست بەرداری: دەست بەرداربوون.
دەست بەردان: بریتییە لە جیابوونەوەی دوو کەس لە یەک: ژن و مێردەکە (دەستیان لە یەک بەردا) واتە لە یەک جیابوونەوە.
دەست بەڕووەوەنان: بریتییە لە جوابدان و ناهومێدکردنی یەکێک کە داوای شتێکت لێ بکا.
دەست بەزاخا کردن: بریتییە لە دەست بڕین و هەڵخەڵەتاندنی یەکێک.
دەست بەستن: بریتییە لە دەست خەڕۆکردن: فیسار کەس چاک (دەستی بەستم).
دەست بەستە: بریتییە لە مەردوومی دەست خەڕۆ.
دەست بەسەر: کەسێکە بەفەرمانی دەوڵەت لە شارێک یا لە شوێنێک نەتوانێ بچێتە دەرەوە.
دەست بەسەراگرتن: بریتییە لە داگیرکردنی شتێک.
دەست بەقرپ: کەسێکە هەر شتێکی بێتە دەست زوو لە ناوی ببا.
دەستبەند: گوریس یا زنجیرێکە کە دەستی وڵاخی پێ ببەسترێتەوە.
دەست پانکردنەوە: بریتییە لە سواڵکردن.
دەستپەڕ: خۆ ڕەحەت کردنی ئادەمی بەدەست.
دەستپەرژان: دەست نەگیران و فریاکەوتن بۆ کردنی کارێک.
دەستپێچک: دەسپێچک.
دەست پێشکەری: دەست پێشخستن لە یەکێک لە کردار یا گوفتارێکدا کە ئەو کەسە بەتەمای کردن یا وتنی بێ لەپێش تۆدا.

دەست پێکردن: دەستـدانە کـردار یا گـوفـتـارێک و لەسـەر ڕۆیشتنی.
دەست پێوەنان: بریتییە لە دەربازکردنی یەکێک یا شتێک.
دەست پیس: بریتییە لە مەردوومی گەندەدزی ناو ماڵ.
دەست پیسی: بریتییە لە وردە دزی ناو ماڵ.
دەست تەنک: بریتییە لە مەردوومی کەم دەست.
دەست تەنکی: بریتییە لە کەم دەستی.
دەست تەنگ: دەست کورت.
دەست تەنگی: دەست کورتی.
دەستچن: شتێکە بەدەست و تەقەڵ چنرابێ.
دەستچێن: شتێکە بەدەست چێنرابێ لە زەویدا.
دەستخورێنە: گەزگەزۆک.
دەستخۆشانە: د. بەخشیشێکە کە بدرێ بەیەکێک لە ئەنجامی کارێکدا.
دەستخەت: شتێکە کە بەدەست نووسرابێ.
دەستـخـەڕۆ: کـەسـێکە تەفـرە درابێ و دەسـتـەشکێن کـرابێ، (دەستخەڕۆبوون) تەفرەخواردن، (دەستخەڕۆکردن) تەفرەدان و دەستەشکێن کردنی یەکێک.
دەستخەڕۆیی: تەفرەخواردن و دەستەشکێن بوون.
دەستدار: بریتییە لە مەردوومی دارای بەدەسەڵات.
دەستداری: دارایی و دەسەڵات.
دەستدان: بەکارهاتنی شتێک بۆ شتێک: ئەم زینە بۆ ئەم وڵاخە (دەست دەدا).
دەست دروو: کاڵایەکە بەتایبەتی دروابێ.
دەست درێژ: دەستدار.
دەست درێژی: دەستداری. زۆر و ستەم.
دەستڕاست: کەسێکە شت زوو بئەنگێوێ.
دەستڕۆیشتن: بریتییە لە دەسەڵات بەسەر شتێکدا.
دەستڕۆین: بریتییە لە دەوڵەمەندی.
دەستڕۆیو: دەوڵەمەند.
دەستڕەس: شتێکە دەستکەوتنی ئاسان بێ.
دەستڕەش: بریتییە لە کەسێک کە هەر شتێکی لێوە دەستکەوێ فەڕی لێ نەبینرێ.
دەستڕەنگین: بریتییە لە کەسێک کە بەدەستی خۆی پیشەی جوان بزانێ.
دەسـتـڕێژ: تەقـاندنی چەند گـوللەیەک بەجـارێک لەلایەن چەند کەسێکەوە ڕووەو شتێک.
دەست سپی: بریتییە لە کەسێک کە پیشـەیەکی وا نەزانێ خۆی پێ بژیەنێ.
دەستشۆر: شوێنێکی تایبەتییە کە هەر دەستی لێ بشۆری.
دەسشۆرک: دەستشۆر.
دەستشێل: هەویر یا قوڕێکە بەدەست شێلرابێ.
دەستفرۆش: دەزگێڕ.
دەستقاڵە: ز. دەست بەتاڵ.
دەستقلێپ: دەست بەقرپ.
دەستقووچان: بریتییە لە ڕژدی و چرووکی.
دەستقووچاو: بریتییە لە مەردوومی چرووک.
دەستقەرز: قەرزێکە کە دەست بە دەست بدرێ بەیەکێک.
دەستک: ز. چەپکێک لەگوڵ یا لە گیا.
دەستکار: دەستکرد.
دەستکاری: زۆر دەستدان لە شتێک.
دەستکراوە: بریتییە لە مەردوومی دڵفراوانی بەخشندە.
دەستکرد: شتێکە بەدەست دروست کرابێ، شتی تایبەتی دروست کراو.
دەستکردنەوە: بریتییە لە دەست وەشاندن لە جەنگدا.
دەستکوتان: دەستگێڕانی کوێر یا چاوساغ لە تاریکیدا.
دەستکورت: بریتییە لە مەردوومی نەدارا.
دەستکورتی: بریتییە لە نەدارایی.
دەستکەلا: هەڵمات یا گوێزێکە کە هەمیشە تیلی پێ بکرێ.
دەستکەوت: دەرامەتێکە کە گوزەرانی پێ بکرێ.
دەستکەوتن: شت هاتنە دەست.
دەستکێش: تەنراو یا چەرمێکە دەکرێتە دەست. چاوساغێکە کە پەلی کوێر بکێشێ.
دەستکێشان: ڕاکێشانی دەستی کوێر.
دەسـتـکێـشـاندنەوە: کـارسـەندنەوە لە یەکـێک کـە کـارێکی پێ سپێردرابێ.
دەستکێشانەوە: دەست هەڵگرتن لە کارێک.
دەستگر: دەزگر.
دەسـتگـرتن: دەزگـیـرۆیی. بریـتـیـیـە لە جلـەوگـیـری یەکـێک لە کارێک.
دەستگرتنەوە: دەست کێشانەوە. دەست پانکردنەوە. خوێندنەوەی بەری دەست. بریتییە لە پاشەکەوتی کردن.
دەستگرتی: ز. خەریکی بەکارێکەوە.
دەستگەیشتن: دەست پەرژان..
دەستگێڕ: دەزگێڕ.
دەستگێڕانەوە: گێڕانەوەی دەست لە کارێک و پەشیمان بوونەوەی لێی.
دەستگیر: پیرێکی خواپەرستی خوێندەوارە کە بەئامۆژگاری جوان دەستی مەردووم بگرێ بۆ ڕێی ڕاست. یارمەتیدەر.
دەستگیران: خەریکی بەکارێکەوە. دەزگیران.

دەستگیربوون: دەستکەوتن.
دەستگیرۆیی: یارمەتیدانی یەکێک بەشت پێدانی.
دەست لێدان: دەستکاری کردنی شتێک.
دەست لێک بەردان: بریتییە لە جوێبوونەوەی دوو کەس لەیەک بەئێجگاری.
دەست لێ کێشانەوە: کێشانەوەی دەست لە شتێک.
دەست لێنان: دەست نانە سەر شوێنێک لە ئەندامی ئادەمی بۆ ئەوەی کە بزانرێ لێ دەدا یا نا.
دەست لێ وەشاندن: دەستکردنەوە لە یەکێک.
دەست لێ هەڵگرتن: وازهێنان لە کارێک.
دەستمایە: دراوێکە کە خرید و فرۆختی پێ بکرێ.
دەستمایەدار: کەسێکە دەستمایەی بەدەستەوە بێ.
دەستمز: حەقدەست.
دەستمیز: خۆ ڕەحەت کردنی گیاندار بەهێنانەوەی ئاوی.
دەستنوێژ: دەموچاو و دەست و سەر و قاچ شووشتنە بۆ نوێژ کردن.
دەست نەزەدە: شتی دەست لێ نەدراو.
دەستنێژ: نەمامێکە کە بەتایبەتی نێژرابێ. بریتییە لەیەکێک کە پێت گەیاندبێ و داتمەزراندبێت.
دەستنیشان: شتێکە لەبەر نایابی دەستنیشانە کرابێ کە دەستکاری نەکرێ. نانەوەی شتێک بۆ دزینی. نامزەدکردنی یەکێک بۆ کارێک.
دەستوبرد: خێرایی لە فرمان و کاردا.
دەستوپێوەند: ئەو کەسانەن کە لەژێر دەستتدا کارت بۆ دەکەن.
دەستومشتاخ: دەستومۆچ.
دەستومۆچ: ماچکردنی دەستی یەکتری لە رووی خۆشەویستییەوە.
دەستوور: باوی کۆمەلایەتی. شتێکە سابووناوی لە کۆمی نەخۆشەوە پێ تێ دەکرێ بۆ ڕەوانبوونی. یاسای بنەڕەتی دەوڵەت.
دەستووردان: فەرماندان بەکارێک.
دەستووركردن: ڕاییکردنی گرفتی نەخۆش بەهۆی دەستوورەوە.
دەستە: کۆمەڵێک لە گیاندار. دەرزەنێک لە هێندێ شت. ژمارەیەکی تایبەتییە لە سەرباز (فصیل).
دەستەئەژنۆ: بریتییە لە مەردوومی پەک کەوتە.
دەستەبرا: چەند کەسێکن کە دۆستایەتی و برادەرییان خۆش بێ.
دەستەبوخچە: دەسەبوخچە.
دەستەبوخچەڵە: دەستەبوخچە.
دەستەبەر: کەسێکە کە بەڵێنی بەشتێک دابێ، (دەستەبەربوون) بەڵێندان بەکردنی کارێک.
دەستەبەرە: شتێکە لە تەختە دروست دەکرێ و بەچوار دەستەکی شتی پێ دەگوێزرێتەوە.
دەستەبەری: بوونی یەکێک بەدەستەبەری شتێک.
دەستەپاچە: مەردوومی دەستەوسان.
دەستەپارچە: دەستەپاچە.
دەستەجڵەو: قایشێکە لە لغاو هەڵدەکێشرێ.
دەستەچرا: چرای دەستی.
دەستەچیلکە: دەستەیەکە لە چیلکەی وشکی باریک کە ئاگری پێ بکرێتەوە.
دەستەچیلە: دەستەچیلکە.
دەستەخورد: لۆرە لەپ.
دەستەخوشک: چەند کچێکن کە دۆستایەتییان خۆش بێ.
دەستەدز: دەستەک دز.
دەستەدوو: دارێکە دەکوترێ بەسەر هەوجاڕدا و دەستی پێ دەگیرێ لەکاتی جووت کردندا.
دەستەر: شەقڵ.
دەستەرە: دەستەر.
دەستەریقانە: د. دیارییەکە کە بەدەستی خۆت بیبەیت بۆ کەسێک.
دەستەسر: دەسەسر.
دەستەسوار: ئەندازەیەکە لە سەربازی سوارە (کتیبە).
دەستەشکێن: مەردوومی دەستخەڕۆ.
دەستەک: داری دارەڕا لە داربەڕوو.
دەستەکچ: کچێکە لە تەمەنی هەشت و نۆ ساڵەدا بێ، واتە نە زۆر منداڵ و نە تەواو پێگەیشتبێ.
دەستەک دز: کەسێکە کە ماڵ بنێتەوە بۆ دزینی.
دەستەکردن: کردنی شت بەدەستە.
دەستەکوڕ: کوڕێکە لە تەمەنی هەشت و نۆ ساڵەدا بێ، واتە نە زۆر منداڵ و نە تەواو پێگەیشتبێ.
دەستەکەوشە: دەستەدوو.
دەستەگوشە: دەستەکەوشە.
دەستەگیرە: گیرگەیەکە مۆر هەڵکەن مۆری پێ دەگرێ بۆ هەڵکەندنی.
دەستهلانێن: ز. دەستکردنەوە.
دەستەڵە: گۆزەی پچووکی بێ لوولە.
دەستەمۆ: گیاندارێکی ماڵییە کە ڕام بووبێ و هەر دەمێک دەستی بۆ ببرێت بگیرێ.
دەستەنک: دەست تەنک.
دەستەنکی: دەست تەنکی.
دەستەنگ: دەست تەنگ.

دەستەنگی: دەست تەنگی.
دەستەوا: دەستیاو: شین و شایی (دەستەوا)یی.
دەستەوارە: چەند نان یا چەند کولێرەیەکە کە لەسەر یەک دانرابن.
دەســـتـــەوانە: چەند مـــوورووویەکی هۆنراوەیە منداڵان دەیکەنە دەستیان.
دەستە و ئەژنۆ: دەستەئەژنۆ.
دەستەوسار: هەوسار.
دەستەوسان: مەردوومی دەستەپاچە.
دەســـتـــەوکـــێـــرد: گـــیـــاندارێکە کـــە کـــەوتبێ و چرچی لنگی لێ راکێشابێ.
دەستەوناو: رێگایەکە کە تۆزێک سەر بەرەوخوار بێ.
دەستەویەخە: دەستدانە یەخەی یەک لەکاتی جەنگدا. شوێنی زۆر نزیک: فیسارە شوێن (دەستەویەخە)یە، واتە زۆر نزیکە.
دەست هەڵبەست: درۆیەکە بەتایبەتی رێکخرابێ.
دەست هەڵگرتن: بریـتـــیـــیـــە لە وازهێنان لە کـــردارێک یا گوفتارێک.
دەستەی فەقێیان: سفرەی فەقێیان.
دەستیار: یارمەتیدەر (معاون).
دەستیار ئەفسەر: (نائب ضابط).
دەستیاو: چاکەکردن لەگەڵ یەکێک بەرامبەر بەچاکەی ئەو.
دەستی دەستی: تەفرەدان و هەڵفریواندن.
دەستی: شتێکە دەست بەدەست بدرێ بەیەکێک. دەسک (ز).
دەسچەپەڵ: د. دەس پیس.
دەســخـۆش: بەیەکـێک دەوترێ کـە کـارێکی جـوانی کـردبێ، واتە ئافەرین.
دەســخـۆشـانە: د. مـزێکە دەدرێ لەباتی کـارێکی باش کـە بۆت کرابێ.
دەسخەت: دەستنووس.
دەسخەرۆ: دەستخەرۆ.
دەسخەرۆبوون: دەستخەرۆبوون.
دەسخەرۆکردن: دەستخەرۆکردن.
دەسخەرۆیی: دەستخەرۆیی.
دەسخەرە: د. دەستخەرۆ.
دەسدار: دەستدار.
دەسداری: دەستداری.
دەسدرێژ: دەستدرێژ.
دەسدرێژی: دەست درێژی.
دەسرازە: پـەتێک یا بەنـێکی هۆنراوەیە منداڵی لە بێـشـکەدا پێ دادەپێچرێ.
دەسرۆیگ: د. دەستدار.
دەسرۆین: دەسترۆین.
دەسرەس: دەسترەس.
دەسرەش: دەست رەش.
دەسرۆک: دەسەسر.
دەسرۆکە: پارچەیەکی رەشی چوار سووچی تەنکی قەراخ سپییە. دەسەسر.
دەسفرۆش: دەست فرۆش.
دەسقووچان: دەست قووچان.
دەسقووچاو: دەستقووچاو.
دەسقووچیاگ: د. دەسقووچاو.
دەسقووچیان: د. دەسقووچاو.
دەسقووچیاو: دەسقووچاو.
دەسقەرز: دەست قەرز.
دەسک: جێی دەست پێوەگرتن لە هەموو شتێک. دەزگ (د).
دەسکاری: دەستکاری.
دەسکراوە: دەستکراوە.
دەسکوتان: دەست کوتان.
دەسکە: چەپکەیەک لە گوڵ یا شتی تر.
دەسکەجۆنی: دەسکە دۆڵ.
دەسکەفتن: د. دەسکەوتن.
دەسکەڵووجە: جێی دەست پێوەگرتنی خەرەک لە کاتی بادانیدا.
دەسکەنە: رنینەوەی گـیـا و خـوری و مـوو و هێندێ شـتـی تر بەدەست.
دەسکەوان: شـتـێکی قـووڵە لە زەرد دادەرێژرێ و دەسکێکی سەر خڕی هەیە شتی تێدا دەکوترێ.
دەسکەوت: دەستکەوت.
دەسکەوتن: دەستکەوتن.
دەسکێش: دەستکێش.
دەستکێشان: دەستکێشان.
دەسکێشانەوە: دەست کێشانەوە.
دەسکیسی: ز. یارمەتیدانی یەکێک بەدزییەوە.
دەسگا: دەزگا.
دەسگر: دەزگر.
دەسگرتن: دەستگرتن.
دەسگرۆیی: د. دەسگیرۆیی.
دەسگوشاد: دەست کراوە.
دەسگیر: دەزگیر. یارمەتیدەر. دەزگر.
دەسگیران: دەزگیران.
دەسگیرۆیی: دەستگیرۆیی.
دەسگیری: دەست گیرۆیی.

دەس لەملان: دەست لەملان.
دەسلێدان: دەست لێدان.
دەس لێ کێشانەوە: دەست لێ کێشانەوە.
دەس لێ هەڵگرتن: دەست لێ هەڵگرتن.
دەسماشانن: د. لەپەکوتێی کوێر.
دەسماڵ: جۆرە لە چکێکی سێ سووچە کلک درێژە ژنان دەیگرنە کۆڵیان. دەسەسڕ. جامانەی سەر (هـ).
دەسمایە: دەستمایە.
دەسمایەدار: دەستمایەدارا.
دەسمەڕێزانە: د. دەسخۆشانە.
دەسمێژ: ز. دەستنوێژ.
دەسمیز: دەستمیز.
دەسندە: شت دان بەمەردووم بەئەندازە و کەموکوڕی.
دەسندەخۆر: کەسێکە هەر بەدەسندە شتی بدرێتێ.
دەسنگە: دەسندە.
دەسنگەخۆر: دەسندەخۆر.
دەسنووس: دەستخەت.
دەسنوێژ: دەستنوێژ.
دەسنویس: دەسنووس.
دەسنیشان: دەستنیشان.
دەسوبرد: دەستوبرد.
دەسوبۆس: دەستومۆچ.
دەسوپەیمان: د. دەسوپێوەند.
دەسودیم: هـ. دەستنوێژ.
دەسوکار: د. دەستکرد.
دەسومشتاق: دەسوبۆس.
دەسومۆچ: دەستومۆچ.
دەسوور: د. دەستوور.
دەسووشک: د. پیاوی ڕژد.
دەسە: د. دەسکی شت. دەستەیەک لە شتێک: (دەسە)یەک گوێزانم کڕی. چەپک: (دەسە)یەک گوڵم بۆ بکە. دەستوپێوەند.
دەسها: د. دەستاو.
دەسهاوردن: پەیداکردنی شت و هێنانە ژێر دەستی.
دەسەبرا: دەستەبرا.
دەسەبوخچە: توورەکەیەکی پچکۆلەیە ژنان وردە شتومەکی ناو گیرفانی تێ دەخەن.
دەسەپاچە: دەستەپاچە.
دەسەپارچە: دەستەپارچە.
دەسەجڵەو: دەستەجڵەو.
دەسەچرا: د. دەستەچرا.
دەسەچڵەو: د. دەستەجڵەو.
دەسەچینە: د. سەبەتولکەیەکی دەسکدارە میوەی تێ دەکردرێ.
دەسەخڵافکێ: خڕخاڵەی ئەم سەر و ئەوسەری بێشکەیە کە منداڵی ناو بێشکە خۆی پێ دەخڵافێنێ.
دەسەخوشک: دەستەخوشک.
دەسەداس: د. تەورداس.
دەسەداو: د. داو.
دەسەژەن: لۆرەلەپ.
دەسەسڕ: پارچە تەنراوێکی چوارگۆشەیە هەڵ دەگیرێ بۆ دەست سڕین.
دەسەسەر: د. سەرگەردان.
دەسەشکێن: دەستەشکێن.
دەسەک: د. دەستەک.
دەسەکردن: د. دەستەکردن.
دەسەکەشتی: کەشتی پچکۆلانە.
دەسەکەوشە: د. دەستەکەوشە.
دەسەگیرە: د. دەستەگیرە.
دەسەڵات: تەوانایی و دەست ڕۆین.
دەسەڵقوت: هـ. لۆرەلەپ.
دەسەناو: د. دەستەناو.
دەسەنە: د. بەخشش.
دەسەنەدار: د. کەسێکە خاوەنی پیاوەتی و بەخشش بێ.
دەسەوار: د. دەستەوارە.
دەسەوارە: د. دەستەوارە.
دەسەواکردن: د. پەلەکردن.
دەسەوانە: د. دەستەوانە.
دەسەوەدەس: د. دەساوەدەس.
دەسەوسار: د. دەستەوسار.
دەسەوسان: د. دەستەوسان.
دەسەوەرە: د. دەستەبەرە.
دەسەویەخە: د. دەستەویەخە.
دەسهەرە: د. جۆرە مشارێکی پچکۆلەیە وەک چەقۆ دەنوشتێتەوە، لقی گوڵی ناو باخی پێ دەبڕدرێ.
دەسهەڵبەس: د. دەستهەڵبەست.
دەسەهەوسار: د. دەستەوسار.
دەسیاری: د. دەستگیرۆیی.
دەسیدەسی: د. دەستیدەستی.
دەسی: دەستی.
دەشت: شوێنی چۆڵی تەختی رووتەن.

دەشتان: دەشتانی.
دەشتانی: جێگای تەختی پانی ڕووت لە دار و درەخت.
دەشتایی: دەشتانی.
دەشتەکی: گیاندار و گوڵ و گیای دەشت کە ماڵی نەبێ.
دەشتی: جۆرە مقامێکی خۆشە. دەشتایی. شتی دەشتی.
دەشۆ: ز. دەڤشۆ.
دەعبا: بریتییە لە گیاندارێک کە ناوی نەزانرێ.
دەعجانی: دەعەجانی.
دەعەجانی: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ گیانداری زۆر ناشیرین: فیسار کەس دەڵێی (دەعەجانی)یە، واتە زۆر ناشیرینە.
دەغڵ: گەنم و جۆ.
دەغڵکردن: دەستدان لە شتێک و توخن کەوتنی: (دەغڵی مەکە).
دەغڵودان: دانەوێڵەیەکە کە چێنرابێ.
دەغمە: د. ئەشکەوت.
دەغەزار: گیاندار و درەختی لەڕ و لاوازی دەردەدار.
دەغەڵ: گیانداری بلّحی بێکارەی فێڵباز.
دەغەڵباز: د. فێڵباز.
دەغەڵە: د. دەغەڵ.
دەغەڵی: بلّحی و بێکارەیی و فیلّبازی.
دەف: کەلە بێژنگێکە چەرمی خاو گیرابێتە دیوێکی بۆ ئەوەی کە بەلەپی دەست لێی بدەن تا دەنگی بێ.
دەفتەر: سیپارەیەکی پەڕە پەڕەی سپییە شتی تێدا دەنووسرێ.
دەفتەرخانە: د. نووسینگا.
دەفتەردار: نووسەر.
دەفر: شتێکە کە شتێکی تری تێ بکرێ.
دەفزک: د. بریتییە لە مەردوومی زگ زل.
دەفزەن: کەسێکە کە دەف باش لێبدا.
دەفک: با. دەف.
دەفگەم: ز. ئاستی لغاو کە دەکەوێتە ناو دەمی وڵاخەوە.
دەفن: ز. لووت.
دەفە: تەختەیەکی پانە جۆلا لە کارکردندا تەنراوی پێ سفت دەکا. ئێسقانی شانی گیاندار.
دەفەزکە: د. دەفزک.
دەڤ: با. دەم. کەناری شت.
دەڤخۆر: ز. دەسەلات بەسەر ئەم و ئەودا.
دەڤشۆ: ز. ئاڤشۆ.
دەڤە: ز. حوشتری نێر.
دەڤەدەشتی: ز. تەپاڵە کێویلە.
دەڤەر: ز. ڕێزەی دەمی تیغ. شوێن.
دەڤی: ز. درەختی پچووکی لە یەکەوە نزیک.
دەق: قەدی شتی قەدکراو، کەیف: وڵاخەکە بە(دەق) یا بێ (دەق)ە. تەواو: بە دە ڕۆژی (دەق) گەیشتمە کرماشان، واتە بە دە ڕۆژی تەواو. میچ (ز). ئەندازە و پایە: فیسار کەس لە (دەق)ی خۆیدا ماوە، واتە هەر وەک خۆیەتی.
دەقاق: کەتیرە یا جەوییەکە دەدرێ لە ڕووی هێندێ تەنراو بۆ دەق بەستن و جوانی.
دەقاقدان: وتوودان (د). کەتیرەدان لە شتی تەنراو بۆ جوان وێستانی.
دەقاقلی: تەنراوێکە دەقاقی لێ درابێ.
دەقاودەق: شتێکە لەپاش کێشانەوەی یا دابەشکردنی دەق دەرچێ: گەنمەکەم کێشایەوە (دەقاودەق) دەرچوو یا گۆشتی قوربانییەکەم دابەش کرد بەسەر گەڕەکدا (دەقاودەق) دەرچوو.
دەقبەستن: دەق گرتنی شتی قەدکراو.
دەقدان: سافکردن. قەدکردن.
دەقدانەوە: دووبارە بێژانەوەی دانەوێڵە بەبێژنگ بۆ وردە لێ برینی. دووبارە کوتانەوەی برنجی نیوەکوتراو. بریتییە لە لێدانی یەکێک: ئەمڕۆ نەچیت بۆ مەکتەب (دەقت دەدەمەوە).
دەقکردن: قەدکردنی شتێک.
دەقکراو: شتی قەدکراو.
دەقگرتن: نوشتانەوەی شتی قەدکراو بەڕەنگێ کە شوێنی دەقەکەی دیاربێ. وێستانی نرخی شت لە ئەندازەیەکدا: نرخی گۆشت (دەقی گرتووە) واتە ناجووڵێ.
دەقل: ز. شوێنی زۆر سەخت لە زەوی کە نەکێڵرێ.
دەقلووس: ز. سەرمەوقولات.
دەقلووک: ز. مازوو.
دەقنە: ئازووخەیەکە قوتابیانی مزگەوت کۆی دەکەنەوە بۆ زستانیان.
دەقۆر: ز. مەڕێکە کە خورییەکەی لە ناوەندی کورک و خوریدا بێ. بزنێکە کە مووەکەی لە ناوەندی مەرەز و مووداو بێ.
دەقەقاندن: ز. خوتووکەدان.
دەک: وتەیەکە نزیکی شتێک لە شتێک دەگەیەنێ: (دەک) لە کاتێکدا کە بەردێک بگریتە شتێک و نزیک بێ لێی بدەیت، واتە وەختە بوو بەری بکەوێ. پیتی نزا: (دەک) بەرخوردار بیت، یا (دەک) دەستی شکێ.
دەکووش: ز. بێشکەی منداڵ.
دەگمە: ز. دەگمەن.
دەگمەن: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ کەمی و نایابی شتێک: فیسارە شت دەست ناکەوێ مەگەر بە(دەگمەن).

دەگـەر: لێ هاتنی کـاری گـەورە و گـران لە یەکـێک و ڕەوایـیی فەرمانی: فیسار کەس بە(دەگەر)ە.
دەگەل: ز. گاڵتە.
دەگەڵ: لەگەڵ. ناخوای کەشتی (د).
دەگەنەگ: زۆر: بە(دەگەنەگ) کارت پێ دەکەم، واتە بەزۆر.
دەل: د. گیانداری ڕووقایمی ئازا.
دەڵ: سەگی مێ.
دەلاقـە: کـونی گـەورە لە شت: دیوارەکە یا کـەواکـەم (دەلاقـە)ی تێکەوتووە. دەرگا.
دەلاک: کەسێکە کە سەر بتاشێ یا چاکی بکا. ناتری حەمام.
دەلاکخانە: شوێنێکە سەری تێدا چاک بکرێ.
دەلاڵ: کەسێکە شتی مەردووم بفرۆشێ.
دەلاڵانە: مزێکە کە بدرێ بەدەلاڵ.
دەلاڵخانە: شوێنێکە کە دەلاڵ شتی تێدا بفرۆشێ.
دەلاڵی: بوونی مەردووم بەدەلاڵ.
دەلاڵانە: (دەلاڵییەکە)ی لێ بسێنە.
دەلاندن: نمدانی ئاو لە گۆزە و حەوز و شتی تردا.
دەلانن: دەلاندن.
دەڵب: پێڵاو و کاڵای زۆر فراوان.
دەڵپ: دەڵب.
دەڵپ و دۆپ: شتی زۆر دەڵب.
دەلقین: ز. ئابڕووچوون و نەمانی شەرم.
دەلە: ز. جبە.
دەڵمە: ز. دەڵەمە.
دەلنگ: دەرپێ (ز). دەرەلنگ (با).
دەلوبیـبـەر: بەری گـیـایەکـە توونە و ناوەکـەی کـولـۆرە و زۆرتر بەترشیاتەوە دەخورێ.
دەلوقەل: مەردوومی ڕووهەڵماڵراوی ئازای چەنەباز.
دەلوو: شێتۆکە. لۆتی.
دەلووکار: کەسێکە کەمێک دەلووبێ.
دەلۆیی: ل. دەلوو.
دەڵەبا: سەگی مێ کە هاتبێتە با.
دەڵەچە: مەردوومێکی پەستە کە مێچکە مێچکە بۆ ئەم و ئەو بکا.
دەڵەچەیی: پەستی و مێچکە مێچکە کردن بۆ ئەم و ئەو.
دەڵەدەڵ: زەردبوون و نەرمبـوونی دوومـەڵ بەڕەنگێک کـە کـاتی دەربوونی هاتبێ.
دەلەسە: درۆ و فیشاڵ.
دەڵەق: دەڵەبەبا.
دەڵەک: دەعـبـایەکی سـووری تاریکە پێسـتـەکەی زۆر بەنرخـە. دەڵەبەبا.
دەڵەکدان: ل. پاڵ پێوەنان: (دەڵەکدە) واتە پاڵی پێوە نێ.
دەڵەمـە: شـیـرێکە لەبەر کـەم کـوڵاندنی ترش نەبووبێ و کـەمـێک مەیی بێ. هێلکەیەکە کە شل بێ و نیوە برژ بووبێ.
دەلیا: دەریا، بریـتـییـە لە شتی زۆر: فـیـسـار کـەس (دەلیـا) یەک دەخوا.
دەلیالووش: بریتییە لە گیانداری زۆرخۆر.
دەڵیان: د. دەلاندن.
دەلیقانی: ئافرەتی بێ شەرم.
دەلینگ: دەرەلنگ.
دەلیـدوومـان: ز. کـەسـێکە کـە لەسـەر زەوی لاسـایـی پاڵەوان بکاتەوە لەکاتی تەنافبازیدا.
دەم: کـونێکە لە ناوەندی هەردوو لێـودا شـتـی پێ دەخـورێ. کاتێکی کەم. دەمە (د).
تیغ: (دەم)ە خەنجەرێکم بوو دەسکێکم تێخست.
دەماخ: لووت: فـیـسـار کـەس (دەماخ)ی کـردووە، واتە بەرلووتی هەڵبەستووە. کەیفخۆشی: فیسار کەس (دەماخ)ی هەیە.
دەماخ تەختکردن: بریـتـیـیـە لە خـۆ نواندن و هەوەس تەخـتکردن بەسەر مەردوومدا.
دەماخ شکاندن: بریتییە لە لووتدان و نەهێشتنی کەیف و خۆشی یەکێک.
دەماخ کردن: هەڵبەستنی دەم و لووت بەلەچک.
دەماخ هەڵبەستن: دەماخ کردن.
دەماخ هەڵدان: دەماخ کردن.
دەمـار: ڕەگ. لاسکی گەڵا تووتن. فـیـز و دەعـیـە: فـیـسـار کـەس زۆر بە(دەمار)ە.
دەمــار دەرهاتن: بریـتــیــیــە لە تێن پێگەیین و تەنگەتاوبوونی مەردووم لە شتێکەوە: بەدەست منداڵەوە (دەمارم دەرهات).
دەمارە کۆڵ: دووپشک.
دەمـانچـە: چەکـێکی ئاگـرینی پچکۆلەیە دەکـرێ بەقـەددا وەک تفەنگ دەتەقێنرێ.
دەماندن: گەشاندنەوەی ئاگر بەمووشە دەمە.
دەمانن: دەماندن.
دەماودەم: بڵاوبوونەوەی قسە لەم دەمەوە بۆ ئەم دەم.
دەماودەم کەوتن: دەماودەم.
دەماوەر: دەمەوەر.
دەمبڕ: بڕینەوەی ئیشـێک لەگەڵ یەکێکدا بەگۆترە: (دەمبڕ) ئەم کارەم بۆ بکە.
دەمبوون: پێگەیشتنی چایی و قووبوولی و پلاو.
دەمبوونەتاقیچرا: بەیەکێک دەوترێ کە لە شتێکی کوتوپڕییەوە واقی وڕمابێ و قسەی پێ نەکرێ.

دەمبوونە تەڵەی تەقیو: دەمبوونە تاقیچرا.
دەم بەدەم: د. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە باتی وتەی هەمیشە.
دەم بەردان: هەرزە چەنەیی کردن.
دەمبەس: دەمبەست.
دەمبەست: پەتێکە دەمی گای پێ دەبەسترێ لەکاتی گێرەدا بۆ ئەوەی هیچ نەخوا و باش گێرە بکا و، دەکرێتە دەمی کار و بەرخیش بۆ ئەوەی دایکیان نەمژن.
دەم بەیەکاهاتن: دەم پیاکاهاتن.
دەمبێن: چەڵەمەیەکە وەک دەمبەست دەمی گای پێ دەبەسترێ لەکاتی گێرەدا. پەتێکە دەمی هەمانە و جەواڵی پێ دەبەسترێ.
دەم پوخت: چێشتێکی شلەیە لە کشمیش و لەتکە نۆک و کفتەی ورد دروست دەکرێ.
دەم پووچ: دەم پووچەڵ.
دەم پووچەڵ: مەردوومی بێ دان.
دەم پیاکاهاتن: دەم تێکەڵبوون لە قسەدا لە ترسا یا لە شەرما.
دەم پیس: بریتییە لە مەردوومی جنێوفرۆش
دەم تاڵ: بریتییە لە مەردوومی قسەڕەق
دەم تەڕ: بریتییە لە یەکێک کە هەر بەدەم پیاوەتی بکا: فیسار کەس (دەم تەڕ)ی کاسە وشکە.
دەم تەڕکەرە: بریتییە لە میوە و هەرچی دەم تەڕ بکا.
دەم تێژەندن: دەم نانی گیاندار لە خواردەمەنی: پشیلەکە (دەمی ژەندە) ناو چێشتەکە. سەرکردنە شتێک و لەناودانی: فیسار کەس (دەمی ژەندە) دەوڵەتەکەی باوکی هیچی نەهێشت.
دەم تێکەڵبوون: دەم پیاکاهاتن.
دەم تێوەدان: دەم بردن بۆ قسەیەک و دووان لە بابەتییەوە.
دەمجاو: ئەندازەیەکە لە بنێشت کە لە دەمدا بجوورێ.
دەم چوونەکلیلە: بریتییە لە بەسترانی دەم و نەکرانەوەی لە ترساندا.
دەم چەپەڵ: د. دەم پیس.
دەمچەرخدان: بریتییە لە چەنەدان.
دەم چەفت: د. دەم چەوت.
دەم چەوت: بریتییە لە یەکێک کە قسەی بایەخی نەبێ و بەگوێی نەکەن.
دەم خاو: کەسێکە قسە بەخاوی بکا.
دەمخۆش: بەیەکێک دەوترێ کە قسەیەکی باشی کردبێ، واتە ئافەرین.
دەمخۆشانە: د. مزگێنی.
دەم داچەقاندن: دەم کردنەوە.
دەمدار: مەردوومی بەدەم و قسە و گفتوگۆ.
دەمدان: بریتییە لە لەوەڕینێکی کەمی ئاژاڵ: ئاژاڵەکە بەربدە با (دەم)ێک بدەن. دەماندنی کوورە و شتی تر (د).
دەمدانەوە: گەشانەوەی گوڵ. دەرگا بوون و واڵا بوونی برین.
دەمدڕاو: بریتییە لە یەکێک کە قسە لە دەمیدا نەوەستێ.
دەمدروون: بریتییە لە دەمکوتکردنی یەکێ.
دەمدرێژ: بریتییە لە مەردوومی درێژ دادڕی بێ شەرم.
دەمدرێژی: درێژدادڕی و بێ شەرمی.
دەمدوور: زاربێن.
دەمدەمی: مەردوومی ڕاڕا. شتێکە کە ناو بەناو ببێت: سەرێشەکەم (دەمدەمی)یە.
دەمڕاس: د. دەمڕاست.
دەمڕاست: مەردوومی قسەزان و فەرمانڕەوا.
دەم ڕاستبوونەوە: بریتییە لە دەوڵەمەند بوون و تێرخواردنی یەکێک لەپاش برسێتی و هەژاری.
دەم ڕووت: بریتییە لە پیاوی منداڵکاری بێ نموود کە شەرمی لێ نەکرێ.
دەم ڕەش: بریتییە لە یەکێک کە هەر نوقڵانەی خراپ لێ بدا و شووم بێ.
دەم سپی: بریتییە لە پیاوی قسە ڕەوا کە شەرمی لێ بکرێت.
دەم سوور: د. بریتییە لە یەکێک کە پشت ئەستوور بێ لە کارێکدا.
دەمشڕ: دەمدڕاو.
دەمقاڵێ: مشتومڕی دوو کەس لەسەر شتێک.
دەمقڕە: دەمقاڵێ.
دەمکار: چینی دیوارە بەرووکاری دیوی دەرەوەیدا.
دەمکردن: لێنانی چایی، (دەمکراو) چایی لێنراوی ئامادەکراو، دەمگرتن.
دەمکوت: کەسێکە لەبەر شتێک لە قسە و گفتوگۆ خرا بێ، (دەم کوتبوون): لە گفتوگۆ کەوتن لەبەر شتێک، (دەم کوتکردن): لە گفتوگۆ خستن.
دەمکێشان: دەمبوون.
دەمگرتن: بریتییە لە رووشکان و کردنی قسە بەبێ شەرم: فیسار کەس چاک (دەمی گرتووە).
دەم گرتنەوە: بریتییە لە خۆگێڕانەوە لە خواردن.
دەم گەرم: بریتییە لە مەردوومی قسەڕەوان.
دەم لارە: د. ئەو جۆرە سوراحییەیەکە تۆزێک دەمەکەی لارە.
دەم لێدان: سازندەیی.
دەم لێکنان: بریتییە لە مردن و هەناسەبڕان.
دەمنە: شتێکی درێژکۆلەی کون تێکراوە جگەرەی پێ دەکێشرێ.
دەمنێ: تەختەیەکە دەدرێ لە سەری خوارووی نێ و کونێکی تێ دەکرێ و (شاگونج)ی تێ دەبرێ.

دەم و پل: دەمـوچاو: (دەمـوپـل)ی خـواتەوە. بریتـیـیـە لە قـسـە ڕەوانی: فیسار کەس بە(دەموپل)ە.
دەموچاو: ڕووی گیاندار.
دەموچاوهەڵگر: ئافرەتێکە کە موو لە دەموچاوی ژنان بکاتەوە و جوانی بکات.
دەموچاوهەڵگرتن: موو هەڵکەندن لە دەموچاوی ژن بۆ جوانی.
دەم و دوو: بریتـیـیـە لە قـسـە و گفـتـوگۆ: فـیـسار کـەس (دەم و دوو)ی خۆشە.
دەم و دووان: دەم و دوو.
دەمودەس: دەمودەست.
دەمودەست: کوتوپڕ.
دەم و فڵچ: دەم و فڵق.
دەم و فڵق: دەم و دووی ناشیرین.
دەموقەوچە: د. دەم و فڵق.
دەموکانە: جۆرێکە لەبەری مازوودار وەک دەنکی بەلاڵووک وایە دەکوترێ و ناوە لینجەکەی خۆش دەکرێ و بۆ هێندێ شت بەکاردێنرێ.
دەم و کاوێژ: دەم و فڵق.
دەموکە: دەموکانە.
دەمووکە: دەموکانە.
دەمـە: شـتـێکە ئاسنگەر و چەقـۆگـەر و مـسـگەر ئاگـری پێ دەگەشێننەوە. ڕۆژی با و بۆران.
دەمهاتن بەیەکا: دەم بەیەکاهاتن.
دەم هار: دەم هەراش.
دەمەتەقێ: بریتییە لە قسە و گفتوگۆ کردن بۆ ڕابواردن.
دەمەجاو: ئەندازەیەکە لە بنێشت کە لە دەمدا بجوورێ.
دەمـەداچەقێ: دەمـدانی گـیـاندار بەیەکـدا لەکـاتی گـیـانەڵاکـە هەناسەی درەنگ دەردەچێ.
دەمـەدەم: سـەرەتای هەمـوو کـاتێک: (دەمـەدەمی) بەیانیـان یا ئێواران خۆشە.
دەمـەڕێزە: تیـغـێکە کـە دەمی هەڵوەری بێ، (دەمـەڕێزەبوون) هەڵوەرینی دەمی تیغ.
دەمەرقۆپان: جۆرە شەرواڵێکە لەسەر دەرپێوە لەپێ دەکرێ.
دەمـەزەردکـردنەوە: تیـژکـردنەوەی دەمی تیـغ بەبڕەبند لەگـەڵ ئاودانەوەی.
دەمەقڕە: دەم قڕە.
دەمەقەیچی: د. بڕشتی مەقەست.
دەمەکوتێ: دەمەداچەقێ.
دەمەلاسکە: لاسایکردنەوەی قسەی یەکێک و دەم خواردنەوە لێی لە ڕووی گاڵتە پێ کردنیەوە.

دەمەلاسکێ: دەمەلاسکە.
دەمـەڵبێن: پارچە مـسـقـاڵیـیـەکی درێژکـۆڵەیە دەمی مـردووی پێ هەڵدەبەسترێ.
دەمەنی: هەلامەت.
دەمەوخوار: شتی دەمەونخون.
دەمەوڕوو: دەمەوخوار.
دەمەوژێر: دەمەوخوار.
دەمەونخون: دەفرێکە کە نخون بووبێتەوە.
دەمەونخونبوون: بەدەمداکەوتنی دەفر.
دەمەونخونبوونەوە: دەمەونخونبوون.
دەمەونخونکردن: بەدەمداخستنی دەفر.
دەمەونخونکردنەوە: دەمەونخونکردن.
دەمەوەر: خوار دەستێکە لە گفتوگۆدا بەگژ دەمتدا بێتەوە.
دەمەوەری: بەگژدەمدا چوونەوەی خواردەست بۆ گەورەی.
دەم هەراش: مەردوومی دەم گەرمی سازندە.
دەم هەراشی: سازندەیی.
دەم هەڵبەس: دەم هەڵبەست.
دەم هەڵبەست: قسەیەکە لە خۆتەوە هەڵت بەستبێت.
دەم هەڵپچڕان: بریتـیـیـە لە قـسـەکردن: بۆچی (دەم هەڵناپچڕێت) واتە قسە ناکەیت؟
دەمهەڵە: د. دەمشڕ.
دەم هەڵهـێنانەوە: بریتـیـیـە لە خـۆ ئامـادەکـردنی مـەردووم بۆ قسەکردن.
دەمـێکە: وتەیەکـە بەکـاردێنرێ بۆ کـاتێکی ڕابردووی زۆر دوور: (دەمێکە) کورد نوستووە.
دەمیەکنیان: د. دەم لێکنان.
دەن: هـ. پەراسوو.
دەنا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لەجێی وتەی ئەگینا.
دەند: زبانەی ئێرەق.
دەندوکچە: با. ناوە بۆ جۆرە هەنارێک.
دەندووک: دوو ئێسقانی باریکە بەدەم باڵندەوە شتی پێ دەخوا.
دەنک: دانەی دانەوێڵە و هەنار و ترێ و گەڵێ شتی تر.
دەنکە: دەنک.
دەنگ: ئاوازێکە پەیدا دەبێ لە لێکەوتنی دوو شت لە یەکـتـری بەتوندی و بەگـوێ ببیـسـترێ، (دەنگە دەنگ) دەنگی یەک لەدوای یەک. باس و خـەبەر: (دەنـگ) بلاوە کـە کـارگـەی شەکر لە سلێمانی دادەنرێ.
دەنگ بەرز: گیانداری دەنگ زل.
دەنگخۆش: گیاندارێکە ئاوازێکی دڵگیری بێ.
دەنگخۆشی: خۆشی دەنگ و دڵگیری.
دەنگ دابڕین: قسە بڕینەوە لەگەڵ یەکێکدا.

دەنگدار: شتێکە کە دەنگی لێوەبێ. چوار پیتە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی کە دەنگیان لێوە دێ وەک (ا،و،ە،ی).
دەنگدان: بانگێشتنێکی تێکراییە بۆ سەر شتێک: فیسار کەس شاییەکەی کرد ئاواییەکانی دەوری خۆی هەموو (دەنگ دا).
دەنگدانەوە: بڵاوبوونەوەی دەنگوباس بەجۆرێک کە گەلێ کەس بیبیستێ. هاتنەوەی دەنگ لەناو شاخ و دۆڵ و گومەزدا.
دەنگ دڕان: بریتییە لە زۆر هاوارکردن.
دەنگ دەرچوون: چوونە دەرەوەی قسەیەک لە یەکێکەوە بۆ ناو مەردووم.
دەنگ دەرهاتن: دەنگ دەرچوون بەجۆرێک کە ئەم و ئەو بیبیستن.
دەنگکردن: قسەکردن: (دەنگ) ناکەم یا (دەنگ) مەکە.
دەنگ لێکردن: بانگکردن یا دەرکردنی شتێک: نەریمانم پێویستە دەنگی لێ بکە، یا وڵاخەکەم مانی گرتووە (دەنگێکی لێ بکە) با بڕوا.
دەنگ نووسان: کپبوونی دەنگ و دەرنەهاتنی، (دەنگنووساو) گیاندارێکە کە دەنگی کپ بوو بێ.
دەنگنێر: کەسێکە دەنگی گڕ و قەبەبێ.
دەنگوباس: قسە و گفتوگۆیەکە کە بکەوێتە سەر دەمان و بڵاوبێتەوە.
دەنگەشە: د. دەنگە دەنگ و ژاوەژاو.
دەنگەوەرە: کەسێکە دەنگی یەکێک بەیەکێک یا بەچەند کەسێکی دوور بگەیەنێ وەک ئەو کەسانەی کە دەنگی پێشەوای نوێژ (امام) لە مزگەوتێکی زۆر گەورەدا دەگەیەنن بەو نوێژکەرانەی کە دوورن لێی.
دەنووک: دەندووک.
دەنووک کەوچکە: جۆرێکە لە مراوی.
دەنووکە: د. دەموکانە.
دەو: پەلە و دەستوبرد: بە (دەو) هات. جۆرە ژمارەیەکە لەناو چەند کەسێکدا دەکرێ بەم ڕەنگە دوانیان یەکێ چەند پەنجەیەک دەهێنێتە پێشەوە و یەکێکیان دەڵێ (دەو) لە تۆ، ئینجا پەنجەکان لێکدەدەنەوە و دە ژمارەی تری دەخەنە سەر، کردییە هەر چەند لەو کەسەوە کە دەوی لێ کراوە دەژمێردرێ. لەسەر هەر کامیان تەواو بوو ئەو دەیباتەوە. دەم. دوو (با).
دەو: دردۆنگ و زویر و دڵگیر.
دەواخ: د. دەباخ.
دەواخانە: د. دەباخانە. دەرمانخانە.
دەوار: پەلاسێکی پانی درێژی تەختە تەختەی لێکدراوە لە موو دەچنرێ کۆچەری هەڵی دەدەن و لەباتی خانوو دەچنە ناوی. چارەوێ. وڵاخ (با).
دەواساز: د. دەرمانساز.
دەوافرۆش: د. دەرمانفرۆش.
دەوان: گیانداری چەسپان. تیغی جەوهەردار.
دەوانچە: دەمانچە.
دەوردان: ئاخڵەدانی شتێک.
دەورگرتن: ئاخڵەدان. پارچەگرتن بەلێواری پێڵاودا.
دەوروپشت: ناوچە و دەوروبەر.
دەورەدان: دەوردان.
دەورەگرتن: دەورگرتن.
دەوری: دەفرێکی پەلی لێودارە.
دەوش: با. شوێن پێ.
دەوکیس: ز. خەستەی توورەکە.
دەوڵ: ز. دەهۆڵ.
دەوڵەت: دارایی. حکومەت.
دەوڵەتی: شتێکە کە هی حکومەت بێ.
دەوڵەمەن: دەوڵەمەند.
دەوڵەمەند: کەسێکە دارایی زۆر بێ.
دەوون: د. دەوەند.
دەوە: تەپاڵە. دەبە.
دەوەڵان: ڕیزە تەپاڵەیەکە بەگردی دادەنرێ و ناوەکەی پڕ دەکرێ لە تەپاڵەی ورد.
دەوەن: بنکە دار بەڕوو یا مازوو کە بڕدرابێ و هەڵی دابێتەوە.
دەوەن بەئاش: بریتییە لە قسە و گفتوگۆکردنێکی بێ هوودەی زۆر لەسەر شتێک.
دەوەند: دەوەن.
دەویقاندن: ز. تاقیکردنەوەی سەختی و ناسکی هێلکەیە بەماڵینی بەپێشی دداندا.
دەویک: ز. دۆوک.
دەویت: کەسێکە ژنان تاو بکا بۆ ئەم و ئەو. دوێتی نووسین (د).
دەوین: با. دۆینە.
دەهۆ: جاجمێکە وەک شەڵتە هەڵدەدروێ و دەغڵی لەسەر خەرمان پێ دەگوێزرێتەوە.
دەهۆڵ: شتێکی بۆشی گەورەیە چەرمی خاو دەگیرێ بەهەردوو ڕوویدا و لێی دەدرێ.
دەهۆڵژەن: کەسێکە کە دەهۆڵ لێ بدا.
دەهۆڵکوت: دەهۆڵژەن.
دەهەم: شتێکە لە پایەی دەدابێ.
دەهەمین: دەهەم.
دەهیە: ز. دڕندە.
دەهیەک: دەیەک.

دەی: وتەی هاندان.
دەیز: ز. گەڵای گزرە بۆ ئاژاڵ.
دەیلەم: د. نوێڵ. تیرەیەکی گەورەیە لە کورد.
دەیم: دێم.
دەیمەڕۆ: د. دێمەزار.
دەیمەکار: دێم.
دەیەک: لە دە بەش بەشێک.
دەیەم: دەهەم.
دەیەمین: دەهەمین.
دێ: چەند خانوویەکی ئاوای دوور لە شارە. گەڵای دار بەڕوو و مازووەکە لە پایزدا دادەپاچرێ و لەناوپەلی درەختدا هەڵ دەگیرێ بۆ زستانی ئاژاڵ. دەنگێکە لە وڵاخ دەکرێ بۆ گێڕانەوەی لە کارێک. دایک (ز).
دیار: شتی بینراوی نمایان. دیدار (د). تەنیشت: دانیشت بە(دیار)یەوە، دیاربوون: دەرکەوتن و لەبەرچاوبوونی شتێک.
دیاردی: وتەیەکە لەکاتی بەدیکردنی کەروێشک و بەدەورداهاتنیدا ڕاوکەر دەیڵێ.
دیاردیکردن: بەدیکردنی نێچیر لەکاتی ڕاودا.
دیارناو: ناوی یەکێکی تایبەتی (علم).
دیار و ئاخربوون: مردنی یەکێک لە پێش بینینی خۆشەویستێکیدا.
دیارە و ئاخربوون: دیار و ئاخربوون.
دیاری: شتێکە ببرێ یا بنێردرێ بۆ دۆستێک.
دیاریدان: دەرکەوتنی شتێک.
دیاری کردن: نیشانەکردنی دەزگیران بەناردنی دیارییەک بۆی لە دوای خوازبێنی.
دیان چەرمگەوبوون: دان سپیبوونەوە.
دیانرۆکڵە: د. دانەڕۆکە.
دیان کلێڵەبوون: د. دەم چوونە کلیلە.
دیان لێ تیژکردن: دان لێ تیژکردن.
دیانە: د. دانەی شت. ناوی دێیەکە لە نزیک مووسڵ.
دیانەریکێ: د. دانەچیرێ.
دیباچە: چەند گوفتارێکی ڕێکوپێکە کە لە سەرەتای هێندێ کتێبەوە دەنووسرێ.
دێبکە: جەوەندە.
دێبەر: ڕۆژە جووتێکە لە زەوی.
دێدک: با. سپلی گیاندار.
دێدەکانێ: هـ. دیلانێ.
دێدێ: هـ. خوشکی گەورە.

دێر: درەنگ.
دێران: جێبوونەوەی شتێک لە شتێکدا: ئەم دەفرە دوو مەن (دەدێرێ) واتە دوو مەنی تێدا جێ دەبێتەوە (د). تەتەڵەکردنی دانەوێڵە (ز). ئاودانی زەوی.
دێرانن: د. ئاودانی زەوی.
دێراو: جۆرە جۆگەلەیەکی هەڵدراوەیە هێندێ سەوزی لەم بەر و ئەو بەری دەڕوێنرێ.
دێر: ڕیزێکە لە نووسراو.
دێرس: د. درەنگ.
دێرسی: د. درەنگی.
دێرندێز: ز. ئاگرێکی گەورەیە کە گاوران لە ڕۆژی چواردەی شوباتدا دەیکەنەوە.
دێری: درەنگی.
دێرین: شتێکە کە زۆر کۆن بێ و ساڵی زۆری دی بێ.
دێرینە: دێرین.
دێز: شتی بۆزی ڕەشتاڵە. دیزە (ز).
دیزداشە: شەوکراس.
دێزک: شتی دێز.
دێزگ: دێزک. مەردوومی کلۆڵ.
دێزە: دیزە.
دیسک: با. سوێنەیەکی پچکۆلانەیە لە قوڕی سوورەوەکراو بەقەد لەگەنێک دەبێ ماستی تێدا دروست دەکرێ.
دێسە: ز. مەڕەکێوی.
دێق: د. دیق.
دێکانە: با. دەمۆکانە.
دێکانی: لادێیی.
دێگە: پوور.
دێل: ز. دێڵ.
دێڵ: سەگی مێ.
دێڵە: د. دوێڵ.
دێڵەبەبا: دەڵەبەبا.
دێڵەبەن: د. دوێڵ بەن.
دێلەکانێ: د. دێڵەکانێ.
دێڵەکانێ: دیلانێ.
دێلەمار: ز. بزنمژە.
دێڵێ: چەند تەلەبەردێکە لەسەر دارەڕاوە دادەنرێ و قوڕپەستی لەسەر دەکرێ (هـ). ناوی دێیەکە لەوبەری سیروان.
دێم: زەوی بێ ئاو.
دێمکە: جۆرە جەوەندەیەکە ئاوی تێ دەکرێ.
دێمونایە: جۆرە یارییەکە چەند منداڵێک بەر و دوا دەست بەپشتی یەکەوە دەگرن و گۆرانی دەڵێن.

دێمەرۆک: شوێنی دێم.
دێمەرووک: دێمەرۆک.
دێمزاز: د. دێمەرۆک.
دێمەکار: دێمەزار.
دێمی: شتێکە لە شوێنی دێم پەیابووبێ.
دێمیلە: کەردر.
دینج: ئاسوودەی بێ خەفەت.
دێو: شتێکی ونی سامداری هەڵبەستی پروپووچە. ڕووی شت.
دێواچە: د. دێباچە.
دێوان: د. کوێخا.
دێواندەر: دیواندەر.
دێواندێوکردن: دیواندیوکردن.
دێوانە: شێتۆکە. ناوی ڕووبارێکە لە ناوچەی قەرەداخ.
دێوبەند: نوشتەیەکە دەڵێن گۆیا بەهەر کەسێک بێ دێو و درنج زیانی پێ ناگەیەنێ.
دێوجامە: پارچەیەکی ڕەنگاوڕەنگە ڕاوکەر لەکاتی ڕاوە کەودا هەڵی دەواسێ بۆ ئەوەی کە کەو لێی کۆببنەوە و بیان کوژێ.
دێودڵ: د. دڵ قایم.
دێوەدەر: د. شتی کون بووی دیواودەر.
دێوەرژەن: دۆرژنگ.
دێوەڵووکە: وتەیەکە بەهێندێ مەردوومی زلی کوڵکنی چڵکن دەوترێ.
دێوی: کردەوەیەکە لە کردنەوەی دێو بچێ.
دێە: وتەیەکە وڵاخی بەرزی پێ دەردەکرێ.
دیهات: دێهات.
دێهات: چەند دێیەک.
دیهاتی: دێهاتی.
دێهاتی: لادێیی.
دی: وتەیەکە لەجێی وتەی (تر) بەکاردێنرێ: ئەوی (دی) یا جارێکی (دی).
دیان: گاوور.
دیای: هـ. تەماشا کردن.
دیبەگ: دنگی گەورەی برنج کوتان.
دیتن: چاو پێکەوتن.
دیتنەوە: دۆزینەوەی شتی ونبوو.
دیخوون: بەندەخوێن.
دیدار: ڕوخسار.
دیداربینی: د. دیدەنی.
دیدە: چاو.
دیدەن: دیدەنی.
دیدەنی: چوون بۆ لای یەکێک بۆ چاوپێکەوتنی و تازەکردنەوەی دۆستایەتی.
دیرەک: کۆڵەکە.
دیرەکی: با. جۆرە هەنجیرێکە.
دیرەگ: دیرەک.
دیزە: دەفرێکی گلێنی خڕی سوورەوەکراوە.
دیزە بەدەرخۆنە: بریتییە لە داپۆشین و شاردنەوەی کارێک: ئەم کارە با هەر دیزە بەدەرخۆنە بێ.
دیزە بەکوڵ: بریتییە لە کەسێک کە خاوەنی ماڵ و منداڵ یا داراییەکی زۆر بێ و نەتوانێ بەئاسانی کۆچ و بار بکا.
دیزەڵۆکە: دیزەی پچکۆلانە.
دیزەڵە: دیزەڵۆکە. چالاییی ژوور هەردوو سمت.
دیسا: ز. دیسان.
دیسان: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (دووبارە).
دیسانەوە: دیسان.
دیش: د. پڕ و پیتی ناوماڵ.
دیشلەمە: چای بێ شەکرە کە شەکرەکە بخرێتە دەمەوە و چا تاڵەکەی بکرێ بەسەردا.
دیڤ: با. کلک.
دیڤەلان: با. یەکێکە کە هەمیشە وەک کلک بەدوای یەکێکەوە بێ.
دیق: سوێ و خەفەتی دەروون.
دیق پێکردن: سوێ خستنە ناودڵ.
دیق چوونەدڵ: سوێ چوونەدڵ.
دیقکردن: سوتبوونەوە.
دیقە دیقەدان: قینەقینەدانی یەکێک.
دیکل: ز. کەڵەشێر.
دیل: یەکێکە لە جەنگدا دوژمن گرتبێتی.
دیلان: د. مەردوومی گێل و گەمژ و شێتۆکە.
دیلانە: دیلانێ.
دیلانێ: لە گوریس نیشتن. زەماوەند.
دیلباز: ز. مەردوومی کارامەی شارەزا.
دیلۆک: ز. گۆرانی هەڵپەڕکێ.
دیلۆکڤان: ز. گۆرانیبێژی هەڵپەرکێ.
دیلەک: ز. تکا.
دیلەکچی: ز. تکا کەر.
دیم: هـ. ڕوخسار.
دیماتی: ز. دێکانی.
دیماری: ز. باوەژن.
دیمان: تەحر و شێوە.

دیمانە: دیمان: (دیمانە)ت بەخێر.
دیمەشۆر: دیمە شۆرە.
دیمەشـۆرە: شـتـێکی سـپـییـە وەک سـابوون ژنان دەمـوچاوی پێ دەشۆن بۆ جوانی.
دیمەک: زیانەی ئێرەق کە گاسنی پێوە دەکەن. مووری چوار پاڵوو کە بۆ قایمی دەخرێتە چینی دیوارەوە.
دیمەن: دیمان.
دین: بینین. شێت: مـرۆڤـێکی (دین)ە واتە شـێـتـە (با). ئاین. زان: ئەمشەو کوڕێکی (دی) واتە بووی.
دینار: جۆرە دراوێکی بەنرخی دەوڵەتییە.
دینج: دینج.
دیندار: کەسێکە لە دینی خۆیدا قایم بێ. درەختێکە وەک مازوو دار بەڵام گەڵای ئەم زەردە (ز).
دینە: دۆزینەوە.
دینەوە: دۆزینەوە. بینینی شتێک جاری دووەم و سێیەم.

دیو: ژوور. ڕووی جوانی کاڵا و پێخەف و هێندێ شتی تر: ئەم قوماشە یا ئەم قاڵییە دیوی خۆی نییە.
دیواخان: شوێنێکە لە خانوو کە تەرخان کرابێ بۆ میوان.
دیواخانە: دیواخان.
دیوار: بارستاییەکی ئەستووری ڕێکی بەرزە دروست دەکرێ لە خشت و قوڕ یا بەرد و گەچ.
دیواربڕ: ئاسنێکی لووت تیژە دز دیواری پێ دەبڕێ.
دیوارە: د. زێواری شت.
دیوان: دیواخان. کتێبی شیعری شاعرێک.
دیوانخانە: دیواخان.
دیواندڕ: مەردوومی دەمڕاست.
دیواندەر: دیواودەر.
دیواندیوکردن: هەڵگێڕانەوەی شت ئەم دیو بۆ ئەو دیو.
دیوانی: جۆرە خەتێکی تێهەڵکێشە وەک خەتی شکستە.
دیواودەر: دیواندەر.

# ڕ

ڕا: جار: ئیمڕۆ لە دوو (ڕا) هاتمە لات. ڕێگە. ڕای: (ڕا)م لێ نییە.
ڕائەسپاردە: ڕاسپاردە.
ڕائەنگاوتن: ڕایەڵکردنی دار یا ئاسن بەسەر شوێنێکدا.
ڕابردوو: ڕابوردوو.
ڕابگار: د. ڕێبوار.
ڕابگردن: د. ڕابواردن.
ڕابواردن: کات بەسەر بردن.
ڕابوردن: تێپەڕینی شتێک: فیسار کەس بە بەردەممدا (ڕابورد).
ڕابوردوو: شتێکە کە تێپەڕی بێ.
ڕابوردە: ڕابوردوو: قسە لە (ڕابوردوو) مەکە.
ڕابوون: ز. هەستان.
ڕابەر: کەسێکە نامە یا ڕاسپاردەی مەردووم بەیەک بگەیەنێ.
ڕابەری: گەیاندنی نامە یا ڕاسپاردەی مەردووم بەیەکێک
ڕابەریکردن: ڕێ نیشاندان.
ڕابین: با. ڕابوون.
ڕابینین: ڕاپەرموون.
ڕاپسکان: ڕاپسکاندن.
ڕاپسکاندن: فڕاندنی شتێک لە دەست یەکێک لە ناکاو.
ڕاپۆرت: نامەیەکی پەنهانییە کە بنووسرێ لە یەکێک.
ڕاپۆرتچی: کەسێکە نامەی پەنهانی لەم و لەو بنووسێ.
ڕاپەڕاندن: جێبەجێکردنی کار بەدەستوبردی. داچڵەکاندنی یەکێک لەناکاو.
ڕاپەڕین: ڕاستبوونەوە لە پڕ، داچڵەکین.
ڕاپەرموون: ئومێدکردنی شتێک لە یەکێک کە لە باریدا بێ: وات پێدا (ڕادەپەرمووم) کە هەر دەستی هەژار بگریت.
ڕاپێچان: ڕاپێچکردن.
ڕاپێچکردن: فڕاندنی شتێک بە خێرا لەلایەن با، یا ئاو، یا گیاندارێکەوە.
ڕاپیتە: پیاسە و هاتوچۆکردنی زۆر لە شوێنێکدا.
ڕاتڵەقان: ڕاتڵەقاندن.
ڕاتڵەقاندن: ژەندنی مەشکە. ڕاژەندنی بێشکە. ئاو تێوەردانی دەفرێک.
ڕاتوو: ڕۆژانە لە خەرجی یا نان کە دەدرێ بەهەژار.
ڕاتەکان: ڕاچڵەکین: دڵم ڕاتەکی جووڵانەوەی شت بەهۆی ڕاتەکاندنیەوە.
ڕاتەکاندن: ڕاکێشانی شت بەتوندی.
ڕاجە: د. داری درێژ وەک بەرچیخ.
ڕاچڵەکان: داچڵەکان.
ڕاچڵەکاندن: ڕاپەڕاندنی گیاندار لە ناکاو.
ڕاچڵەکین: ڕاچڵەکان.
ڕاچوون: ڕۆچوون.
ڕاچەنین: ڕاچڵەکین.
ڕاخستن: بڵاوکردنەوەی ژێرەخەر لەسەر زەوی، (ڕاخراو) شتێکە کە ڕاخرابێ. خستنە ڕێ (د).
ڕاخوڕین: خوڕین: بەکێ وا (ڕادەخوڕیت).
ڕاخوستن: ز. پەنابردن.
ڕاخەر: ژێرەخەر.
ڕادار: د. کەسێکە کە ئاگاداری ڕێ و بان بکات. جەردە. باجگر.
ڕادارانە: د. باج.
ڕادارخانە: د. باجگە.
ڕاداری: د. باج.
ڕاداشتن: ڕاهێشتنی منداڵ.
ڕادان: ڕامالینی شت سەر بەرەو خوار: ئەو لیتەیە بەخاکەناز (ڕادە). بریتییە لە دڕینی ورگی یەکێک: بەخەنجەر سکی (ڕادا).
ڕاددە: ئەندازە و پلە: فیسار کەس بە(ڕاددە)یەک چرووکە مشک لە ماڵیدا کلکی چەور نابێ.

رادووکەوتن: دواکەوتنی ئافرەت بەشوێن پیاوی بێگانەدا.
رادوونان: راونان.
رادیۆ: جۆرە سندوقێکە بەهۆی هێزی کارەبا یا پیلەوە گۆرانی و قسە و گفتوگۆ وەردەگرێ لە ئێستگەی شارانەوە.
رار: سەگی یاخی. شتی زۆر کوڵاو (د).
رارا: کەسێکە هەردەمە لەسەر ئارەزوویەک بێ.
رارایی: بوونی مەردووم هەردەم لەسەر ئارەزوویەک.
رارفان: هەراکردنی گیاندار بەهۆی رارفاندنیەوە.
رارفاندن: راوەدوونان و دواکەوتنی گیاندارێک.
رارفین: رارفان.
رارەو: داڵانێکە کە هاتوچۆی بەسەردا بکرێ.
راز: قسەی نهێنی: (راز)ی دڵی خۆت لای کەس مەڵێ. داستان و سەرگوزەشت. قسە و گفتوگۆ: چووم بۆ ماڵی فیسار کەس (راز) یان لێ گرتبوو، واتە کۆڕی قسەیان گەرم کردبوو.
رازان: ئامادە و سازبوون: (براز)ێ. واتە ئامادەبە. پاڵکەوتن (با). نووستن (ز).
رازاندن: رازاندنەوە.
رازاندنەوە: جوان کردن و رێکوپێک کردنی شت.
رازانن: د. رازاندن.
رازاننەوە: رازاندنەوە.
رازانەوە: جوانبوون و رێکوپێک بوونی شت: باخەکە جوان رازاوەتەوە.
رازاوە: شتی رازێنراوە.
رازقی: جۆرە ترێیەکە وەک سپیکە بەڵام ئەم نەختێ تفتە. جۆرە گوڵێکی بۆنخۆشی پەسەندە گەڵای وەک گەڵای بامێ وایە.
رازیانە: بەری گیایەکە لە زیرە دەچێ بۆنی خۆشە و دەکرێتە ناو نانەوە گەڵای وەک شوبیت وایە، بۆ ژانە دڵ باشە. ناوی دێیەکە لە دەستەراستی رۆژهەڵاتی سلێمانییەوە.
رازیانەوە: رازانەوە.
رازێنەر: کەسێکە یەکێک یا شتێک برازێنێتەوە.
رازین: رازان و ئامادەبوون. راکشان (با).
راژە: کاریتەی کەپر. دەستەک و داری دارەڕا.
راژەندن: راوەشاندنی بێشکە و جۆڵانە
راژەنین: راژەندن.
راس: د. راست.
راسا: د. راستەوخۆ: لەم (راسا)یە برۆ، واتە راستەوخۆ.
راسایی: د. تەختایی.
راسپاردن: ناردنی وتەیەک بەیەکێکدا بۆ یەکێکی تر.
راسپاردە: کەسێکە کە وتەی یەکێک ببا بۆ یەکێکی تر. وتەیەکە بەیەکێکدا بنێردرێ بۆ یەکێکی تر.
راسپارە: راسپاردە.
راسپێر: کەسێکە کە یەکێک راسپێرێ.
راسپێراو: کەسێکە کە راسپاردەی یەکێک بگەیەنی بەیەکێکی تر.
راسپێرە: راسپێردراو.
راسپێری: وتەیەکە بەیەکێکدا بنێردرێ بۆ یەکێکی تر.
راست: شتێکە کە خوار نەبێ، وتەیەکە درۆ نەبێ، ئاقار: لەو (راست)ە واتە لەو ئاقارە. جۆرە مقامێکی کوردییە. راستگۆ. لای بەرامبەری چەپ لە شت.
راستاڵ: کەسێکە کە زۆر راستگۆ بێ.
راستان: راستایی.
راستایی: عاستی راستی شت.
راستبوونەوە: هەڵسان لە پاڵکەوتنەوە بۆ دانیشتن یا لە دانیشتنەوە بۆ سەر پێیان. لاچوونی چەوتی و خواری شت.
راستبێژ: راستگۆ.
راستبێژی: راستگۆیی.
راسترۆ: راسترەو.
راسترۆین: قسەی راست کردن. دانان بەقسەیەکی پەنهانا و دەرخستنی.
راسترەو: راستگۆ.
راستکار: راستگۆ.
راستکردن: وتنی قسەی راست.
راستکردنەوە: لابردنی چەوتی و خواری شت. هەڵساندنی گیاندار لە پاڵکەوتنیەوە بۆ دانیشتن یا لە دانیشتنەوە بۆ سەرپێیان.
راستگوتن: راست وتن.
راستکەرەوە: کەسێکە هەڵەی شتی نووسراو راست بکاتەوە.
راستگۆ: کەسێکە لە گفتوگۆدا درۆ نەکا.
راست گوتن: راستگۆیی.
راستگۆیی: درۆنەکردن لە گفتوگۆدا.
راست و چەپ: ز. ئاسنێکی خواری لووت دارە زمەی تفەنگی پێ دەردەهێنرێ لە کاتێکدا کە گیر ببێ.
راست و چەپکردن: بەدەمەوەخستنی یەکێک و دەستی راست و قاچی چەپ یا دەستی چەپ و قاچی راستی لە یەکدان بۆ ناوک هێنانەوەی یا بۆ نەرمکردنی پشتی.
راستوێژ: راستگۆ.
راستوێژی: راستگۆیی.
راستە: دارێکی دوو پەلە دەکرێ بە(بلۆسکە)دا بەرزی و نزمی بەرداشی پێ تاقی دەکرێتەوە. دار یا ئاسنێکی راستە کێری راستی پێ دەکێشرێ. جۆرە هەڵپەڕینێکە قاچی راستی تێدا پێش دەخرێ و بەلای راستدا سووڕدەخورێ. کۆڵانێکی راستە چەند دەرگا یا دوکانێکی لەسەربێ.

ڕاستەڕێ: ڕێگای ڕاستی بێ پێچ و پەنا.
ڕاستەقینە: شتێکە کە درۆزنە نەبێ.
ڕاستەک: ز. ڕاستە.
ڕاستەکی: ڕاستەقینە.
ڕاستەکینە: ڕاستەقینە.
ڕاستەوانە: شتێکە کە پێچەوانە نەبێ.
ڕاستە و چەپە: جۆرە یارییەکە لە هەلووکێندا بەدەستی ڕاست و چەپ لێی دەدرێ.
ڕاستەوخۆ: وتەیەکە کردن یا وتنی کارێک دەگەیەنێ، بەبێ پێچ و پەنا (ڕاستەوخۆ) برۆ واتە هیچ لامەدە، یا (ڕاستەوخۆ) قسەکەت بکە واتە درۆی تێدا مەکە.
ڕاستە و ڕاست: ڕاستەوخۆ.
ڕاستەوڕێ: ڕاستەوڕاست.
ڕاستەوە بوون: ڕاستبوونەوە.
ڕاستەوەکردن: ڕاستکردنەوە.
ڕاستی: بوونی وتە بەڕەنگێک کە درۆ نەبێ. بوونی شت بەجۆرێک کە خوار نەبێ.
ڕاسرۆین: د. ڕاست ڕۆین.
ڕاسوێژ: ڕاستگۆ.
ڕاسە: د. ڕاستە.
ڕاسەقانی: د. ڕاستەقینە.
ڕاسەوبوون: د. ڕاستبوونەوە.
ڕاسەوکردن: د. ڕاستەوەکردن.
ڕاسی: د. ڕاستی.
ڕاشوڕووت: د. ڕەشوڕووت.
ڕاشەکان: ڕاشەکاندن.
ڕاشەکاندن: ڕاوەشاندنی شت.
ڕافڕان: ڕاڕفان.
ڕافڕاندن: ڕاڕفاندن.
ڕافڕین: ڕاڕفین.
ڕاڤە: ز. شرح.
ڕاڤەکار: ز. ڕاڤەکەر.
ڕاڤەکرن: ز. شەرحکردن.
ڕاڤەکەر: ز. کەسێکە کە ڕاڤەی شتێک بکا. دوو خالی لەسەریەکە لە هەر شوێنێک کە دانرا پێشان دەدا کە پاشووەکەی ڕاڤەی پێشووەکەی دەکا.
ڕاکردن: ڕۆینی گیاندار بەتاو هەلگرتن (با).
ڕاکردن: ز. مانەوە لە شوێنێکدا.
ڕاکشان: پالکەوتن.
ڕاکشاندن: پالخستن.
ڕاکشاو: بریتییە لەگیانداری درێژی بەقەلافەت. پالکەوتوو.
ڕاکەوتن: ز. نووستن.
ڕاکەوتن: خۆئامادەکردن بۆ دزین یا فڕاندنی شتێک.
ڕاکێشان: گرتنی شتێک و بەزۆر کێشکردنی.
ڕاگر: شتێکە کە مایەی وێستانی شتێکی تر بێ. سەرۆکی خێزان. سەرۆکی دانشگای بەرز (عمید).
ڕاگرتن: بەندکردنی شت: کەس لە سەرەڕێ (ڕامەگرە).
ڕاگوزار: ڕێیەکە کە هاتوچۆی پێدا بکرێ.
ڕاگوزەر: ڕاگوزار. ڕێبوار (د).
ڕاگە: هـ. ڕێگا.
ڕاگەیاندن: گەیاندنی قسەیەک یا شتێک بەیەکێک.
ڕاگەیشتن: گەیشتن بەشتێکدا.
ڕاگەیێن: کەسێکە کە دەنگوباس بلاوبکاتەوە.
ڕاگیربوون: بەندبوون مانەوە.
ڕاگیرکردن: ڕاگرتن.
ڕام: گیاندارێکە کە هۆگری شتێک بووبێ.
ڕامان: بێدەنگبوون و بیرکردنەوە لە شتێک.
ڕامالبوون: ڕاپێچبوونی قوڕ و لیتە. ڕافڕانی گیاندار.
ڕامالدان: ڕامالین.
ڕامالکردن: ڕاپێچکردنی قوڕ و لیتە و ڕادانی لەسەر زەوی. ڕافڕاندنی گیاندار.
ڕامالین: ڕامالکردن.
ڕامان: بیرکردنەوە لە شتێک.
ڕاماو: کەسێکە کە بێ دەنگ بووبێ و بیر لە شتێک بکاتەوە.
ڕامبوون: ڕاهاتن.
ڕامکردن: ڕاهێنانی گیاندار بەشتێک.
ڕامکە: ڕاوکە.
ڕامووز: با. ماچ.
ڕامووس: ڕامووز.
ڕامووسان: با. ماچ.
ڕامووسین: ڕامووسان.
ڕامە: د. ڕاوکە.
ڕامیار: مەردوومی سیاسی.
ڕامیاری: سیاسەت.
ڕان: ئەستوورایی لاق لە سمت بەرەوخوار تا ئەژنۆ. گەلەی بزن و مەڕ.
ڕانان: ڕاونان.
ڕاناو: ضمیر.
ڕاندن: لێخوڕین.
ڕانک: جۆرە دەرپێیەکی شالینی شاشە.

ڕانکە: مـووی لا ڕانی بزنە کـە لە بەهاراندا لە کـاتی بڕینەوەی ئاژاڵدا دەهێڵرێتەوە بۆ ئەوەی کە درک لە گوانی نەدا.
ڕانما: د. ڕابەر.
ڕانموونی: د. ڕێ نموونی.
ڕانواندن: پیشاندانی شت بەمەردووم.
ڕانە: ڕانک.
ڕانەکی: د. پاڵدوو.
ڕاو: هەوڵدان بۆ گرتن یا کوشتنی گیاندارێک کە گۆشتی بخورێ لە دەشت یا لە ئاودا. فێڵ و تەڵەکە (د).
ڕاوار: د. خۆشڕەوت.
ڕاوبان: ڕێوبان.
ڕاوچی: کەسێکە کە بزانێت ڕاو بکات.
ڕاوکردن: نێچیرکردن لە دەشت یا لە ئاودا.
ڕاوکە: هێلکەیەکە کە دانرابێ بۆ مریشـک بۆ ئەوەی کە هێلکەی لە لاوە بکات.
ڕاوکەر: ڕاوچێ.
ڕاوگە: جێی ڕاو.
ڕاونان: بەر و دوانانی گیاندار.
ڕاونیان: د. ڕاونان.
ڕاووڕوو: د. ڕووپامایی.
ڕاووڕووت: ڕووتکردنەوەی مەردووم لەلایەن جەردەوە بەزۆری.
ڕاوڕێس: ڕایەڵ و ڕیسی شـــتی تەنراو: ئەم جــاجـــمـــە (ڕاوو ڕێسێکی) جوانی هەیە.
ڕاووڕیو: د. کەلەک و فێڵ.
ڕاووک: توورەکەیەکی شاڵینە دەنکە ترێ و هەناری تێ دەکرێ و لەســەر (کـۆلیت) دادەنرێ و بەپێ دەشـێلرێ بۆ ئەوەی کـە ئاوەکەی بگیرێ.
ڕاوەدوونان: ڕاونان.
ڕاوەڕاوە: ڕاونانی گیاندار وردە وردە بۆ گرتن یا دەرکردنی.
ڕاوەڕێوی: برێتییە لە پێچ و پەنا هێنانەوە لە کاروباردا.
ڕاوەستان: بەپێوە وەستانی گیاندار و هێندێ شتی تر. مـانەوەی ئاو لە شـوێنی خـۆی بەبێ ڕۆین. لە جـوولەکـەوتنی هێندێ شت: سـەعـاتەکـەم یا ئاشـەکـەم (ڕاوەسـتـاوە)، یا دەبێـژرێ بەیەکـێـک کـە قـســە بکا یا بنووسێ یا کــارێکی تر بکا (ڕاوەستە) واتە مەدوێ یا مەنووسە یا مەکە.
ڕاوەستاندن: بەپێوە ڕاگیرکردن. لە جووڵە خستنی شت.
ڕاوەستاو: شتێکە کە وەستابێ.
ڕاوەشان: ڕاوەشاندن.
ڕاوەشاندن: جووڵاندنەوەی شتێک بەتوندی.
ڕاوەک: توورەکەی دۆ.
ڕاوەکانی: جۆرە ڕاوە کەوێکە کە لەسەر کانی دەکرێ.
ڕاویار: ڕێبوار (د). ڕاوچی.
ڕاوێچکە: هاتوچۆکردن. بیرکردنەوە لە شتێک.
ڕاوێژ: لێکدانەوەی ئەنجامی کارێک لەگەڵ یەکێکدا: هاتووم کە (ڕاوێژ) ێکت پێ بکەم، بیـرکـردنەوە لە شـتـێک: تا لە دڵی خۆمدا (ڕاوێژ) نەکەم هیچ کارێک ناکەم.
ڕاوێژکردن: ڕاوێژ.
ڕاوێژکە: ڕاوێچکە.
ڕاوێژگا: د. شوێنێکە کە هەر ڕاوێژی تێدا بکرێ.
ڕاوێژگە: ڕاوێژگا.
ڕاوێژەر: کەسێکە کە ڕاوێژی لەگەڵ بکرێت (مشاور).
ڕاوێژیار: ڕاوێژەر.
ڕاوێستان: ڕاوەستان.
ڕاوێستاندن: ڕاوەستاندن.
ڕاوێستاو: ڕاوەستاو.
ڕاوێشکە: ڕاوێچکە.
ڕاوی: توولە و تاجی و باڵندەیەکە کە ڕاویان پێ بکرێ.
ڕاە: ڕێگا.
ڕاهاتن: ئاشنابوون بەشتێک کە لەوە پێش پێی ئاشنا نەبووبێت.
ڕاهاتوو: گیاندارێکە کە ڕاهاتبێ.
ڕاهانین: ڕاهێنان.
ڕاهشتن: ز. پەلاماردانی شتێک.
ڕاهێشتن: دانانی منداڵی ساوا بۆ میز و گو کردن.
ڕاهێڵان: ڕاهێشتن.
ڕاهێڵبوون: ڕەهێڵبوون.
ڕاهێڵکردن: ڕەهێڵکردن.
ڕاهێنان: ڕامکردن.
ڕاهی: ڕایی، (ڕاهیبوون) ڕاییبوون، ڕاهیکردن: ڕایکردن.
ڕایاخ: ڕایخ.
ڕایج: شتی خراپی ناپەسند: زێڕەکە یا قوماشەکە (ڕایج).
ڕایخ: ژێرەخەر.
ڕایە: دەســەڵات و تەوانایی و ســزاواری یەکـێـک بۆ قـســە یا کردەوەیەک، ئەم وتەیە هەر لە نەبوون (نفی)دا بەکـاردێنرێ: کەس (ڕایە)ی نییە دەربارەی تۆ خراپە بکات.
ڕایەخ: ڕایخ.
ڕایەکــەوتن: شـایانی و لێـهــاتن، ئەم وتەیە هەر لە نەبووندا بەکاردێنرێ: فیـسار کەس (ڕایەی ناکەوێ) جوێن بەفیـسـار بدا.
ڕایەڵ: چەند هەودایەکی ڕاسـتـە کـە پۆی شـتی لەسـەر دەتەنرێ. دارەڕا.

ڕایەڵکردن: کـردنی هەودا بەڕایەڵ. دانانی داری دارەڕا بەسـەر دیواردا.
ڕایەڵکە: ڕاویچکە.
ڕایەڵە: د. ڕایەڵکە.
ڕایی: شـتێکە خرابێـتە ڕێ، ڕایی بوون: نەمـانی بەرهەڵست و کـەوتنە ڕێی شت، (ڕاییکردن) خسـتنە ڕێ و ڕەوانەکـردنی شتێک بۆ شوێنێک.
ڕایی ڕایی: ڕاڕا.
ڕایێڵ: ڕایەڵ.
ڕبە: ناوە بۆ ئەندازەیەک لە وشکە دان. جۆرە دەفرێکە دانەوێڵەی پێ دەپێورێ.
ڕبەنار: دۆشاوی هەناری گوشراو.
ڕپارپ: ز. ڕەپەڕەب.
ڕپن: ز. باقەیەک لە گیا.
ڕپندان: ز. بنج داکوتانی گیا.
ڕتل: با. گون.
ڕتورۆین: شـێـوەی ڕۆین: فـیـسـارە کـەس (ڕتورۆینێکی) جـوانی هەیە.
ڕجرجین: ز. سووربوونەوەی شوێنێک لە ئەندام لەگەڵ زەردبوونی بەهۆی لێدانی یا کەوتنی لە شتێک بەنهێم.
ڕجوا: ڕەوا: من ئەم کارە بەتۆ (ڕجوا) نابینم.
ڕجوا بینین: ڕەوا بینین.
ڕجوادین: ڕجوابینین.
ڕچ د. بەستەڵەک و سەهۆڵ.
ڕچان: بەستنی بەفر و ئاو بەهۆی زۆر ساردییەوە.
ڕچاندن: بەستن و مەیاندنی سەرماهی شتێکی تەڕ.
ڕچانن: د. ڕچاندن.
ڕچە: باریکە ڕێگایەکە کە کرابێتەوە لەناو بەفردا. بەفرێکە کە بەستبێتی (د).
ڕچە شکاندن: ڕێگاشکاندن لەناو بەفـردا. بریـتـیـیـە لە کـردنی کارێک لەلایەن یەکێکەوە بۆ ئەوەی کە چاوی لێ بکرێ.
ڕچەکوتانن: د. ڕچەشکاندن.
ڕچیان: د. ڕچان.
ڕچین: ڕچان.
ڕچیو: شتی مەیو لەبەر سەرمای زۆر.
ڕدۆز: ڕۆز.
ڕدێن: ڕیش.
ڕزان: ڕزین.
ڕزاندن: پوواندن و هەلاهەلاکردن.
ڕزانن: ڕزاندن.
ڕزدە: ز. ئەڵقەڕێز.
ڕزق: دەعـبـایەکی سـپـیـیـە لە مـشـک گـەورەتر و لە سـمـۆرە پچووکترە.
ڕزگـار: گـیـاندارێکە لە چوورتمێک قـوتار بووبێ، (ڕزگـاربوون) قوتاربوون.
ڕزگارکردن: قوتارکردن.
ڕزگارگە: جێگای ڕزگاری.
ڕزگاری: گوشادی و دەروو لە چوتم.
ڕزن: د. قەتارە و ڕێچکەی شت. دێر.
ڕزۆک: مێوژێکە کە ڕزی بێ و کرم تێی دابێ. ڕزەڵۆک.
ڕزەک: د. ڕزۆک.
ڕزەڵ: د. بریتییە لە مەردوومی کەنەفت.
ڕزەڵۆک: شتێکە لەبەر ڕزیوی لەخۆیەوە هەڵوەرێ.
ڕزیاگ: ڕزیو.
ڕزیان: د. ڕزین.
ڕزیانک: ز. ڕازیانە.
ڕزین: پۆرتکان و لە کارکەوتنی شتێک لەبەر کۆنی.
ڕزیو: شتی پۆرتکاو.
ڕژان: پەرش و بڵاوبوونەوەی شتی شل یا دانەوێڵە.
ڕژاندن: پەرش و بڵاوکردنەوەی شتی شل یا دانەوێڵە.
ڕژانن: د. ڕژاندن.
ڕژانە یەک: بەیەکدادانی دوو دەستەی گەورە و تێکەڵاوبوونیان.
ڕژاو: شتی شل یا دانەوێڵەیە کە پەرش و بڵاوبووبێتەوە.
ڕژتن: ڕشتن.
ڕژد: مەردوومی چرووک.
ڕژدکردن: د. باڵاکردن.
ڕژدی: چرووکی.
ڕژیاگ: ڕژاو.
ڕژیان: د. ڕژان.
ڕژیانە یەک: د. ڕژانە یەک.
ڕژێم: نظام.
ڕژی: ز. خەڵووز. چێشتی بێ ڕۆن.
ڕژین: ز. ڕژان.
ڕس: ڕست.
ڕست: ڕیزێک شـتـی هۆنراوە: (ڕست)ێک مـوورووو یـا بامێ. تەناف. پەتێکە دەکرێتە ملی تانجی کە ببرێ بۆ ڕاو.
ڕستک: ملوانکە (ز). تەناف.
ڕستکردن: هۆنینەوە و بەپەتەوەکـردنی هێندێ شت. پەت خسـتنە قەڵاتەی ملی تانجی بۆ ڕاکێشانی.
ڕستگ: با. تەناف.

ڕستگار: ڕزگار، (ڕستگاربوون) ڕزگاربوون (ڕستگارکردن) ڕزگارکردن.
ڕستگاری: ڕزگاری.
ڕستن: بادانی لۆکە و خوری بەخەرەک یا بەتەشی بۆ کردنیان بەدەزوو یا بەن. بریتییە لە زۆر قسەکردن.
ڕستە: گوریس. هەر شتە (ز). بریتییە لە چەند وشەیەک کە مەبەستێکی تەواو بگەیەنن (جملە). ڕشتە.
ڕسق: ڕزق.
ڕسکان: گیرسان و لکانی خەڵفی درەخت کە موتوربە کرابێ. بەستن (تجمد). لکان.
ڕسکاو: خەڵفێکە لەپاش موتوربەکردن پەیوەست بووبێ.
ڕسگار: د. ڕزگار.
ڕسگارکردن: د. ڕزگارکردن.
ڕسگاری: د. ڕزگاری.
ڕشاندن: ڕژاندن. ئاو ڕشێن کردن.
ڕشانەوە: هێنانەوەی خواردەمەنی بەدەم. وەرینی گوڵی بەرسیلە لەپێش خڕبوونیدا.
ڕشتن: ڕژاندن. کل بەچاودا هێنان بەکلچێوک.
ڕشتنەوە: بەدەمەوەدانی مەردووم و تێوەگلاندنیان لە چورتمێکدا: فیسار کەس ئەم شارەی (ڕشتەوە).
ڕشدە: ل. هەرشتە.
ڕشک: گەرای ئەسپێ.
ڕشکن: مەردوومێکە کە ڕشکی زۆری پێوەبێ.
ڕشێنە: بارانی وردی لە سەرخۆ.
ڕفاندن: پەلاماردانی شتێک و بردنی بەدەستوبردی.
ڕفانن: د. ڕفاندن.
ڕفۆک: چنگ.
ڕفە: تاقێکی بەرزە لە دیوار ڕا بۆ شت تێدا دانانی.
ڕفیاگ: فڕێنراو.
ڕفێدە: مادەی نان پێوە دان.
ڕفین: باڵ گرتنەوە و کەوتنە ئاسمانی باڵندە و فڕۆک.
ڕق: توندی و تووڕەییی گیاندار.
ڕقاوی: ڕق ئەستوور.
ڕق ئەستوور: کەسێکە کە ڕقی هەستا درەنگ هێواش بێتەوە.
ڕق جوین: ڕق هەستان.
ڕق خواردنەوە: دان بەخۆداگرتن و ڕق بەسەربردن لە کاتی هەستاندا.
ڕقدار: ڕق ئەستوور.
ڕقرقۆک: ز. خڕە خڕی کاڵای تازە.
ڕق گرتن: قین گرتن و دانەمرکانەوەی مەردووم.
ڕق لە سک: کەسێکە ڕقێکی لە دڵدابێ.
ڕق لێکێشان: قینەبەریکردن لەگەڵ یەکێکدا.
ڕق لێ هەڵگرتن: ڕق هەڵگرتن لە دڵدا لە یەکێک بۆ تۆڵە لێ کردنەوەی لە هەلێکدا.
ڕقن: د. مەردوومی ڕقاوی.
ڕقەبەری: بەربەرەکانی کردن لەگەڵ یەکێک لە ڕقی ئەو.
ڕقە کێشان: هەڵگرتنی ڕق لە دڵدا بەرامبەر بەیەکێک.
ڕق هەستان: توند و تووڕەبوونی گیاندار.
ڕق هەڵسان: ڕق هەستان.
ڕق هەڵساندن: ڕق هەستاندن.
ڕک: ڕق. پەتێکە دەکرێتە ملی کار و بەرخ بۆ بەستنەوەیان.
ڕکدابردن: د. ڕق گرتن.
ڕککۆیی: ز. ڕق ئەستوور.
ڕکگرتن: د. ڕق گرتن.
ڕکن: د. ڕقن.
ڕکە: لاپاڵی سەرەولێژ لە شاخ و گرد. قەفەز (با).
ڕکەو: ز. قەفەز.
ڕکێشە: گیایەکی گەڵا پانی ڕەگ ڕەگاوییە بۆ برین باشە.
ڕکێف: ئاوەزنگی وڵاخ. بریتییە لە دەسەڵات: فیسار کەس لە (ڕکێف)ی کەسدا نییە.
ڕکێف دواڵ: د. قایشی ئاوزەنگی.
ڕکێو: ڕکێف.
ڕم: دارێکی درێژی قەفقەفی لووسە ئاسنێکی لووت تیژی بەسەرەوەیە لە جەنگدا بەکاردێنرێ.
ڕمان: ڕووخان.
ڕماندن: ڕووخاندن.
ڕمانن: د. ڕماندن.
ڕمباز: ز. کەسێکە باش ڕم بوەشێنێ.
ڕمبازی: یاریکردن بەڕم لەکاتی وڵاخ تاوداندا. غارکردن بەوڵاخ.
ڕمبە: ڕمە.
ڕمبێز: ز. ڕێواس.
ڕمبێشک: دەفرێکی پچکۆلەی گوێچکەدارە چێشتی تێدا لێ دەنرێ.
ڕمووده: گیانداری هۆگر.
ڕمووزن: وتەیەکە گیانداری ئێسک قورسی پێ دەشوبهێنرێ.
ڕمە: دەنگێکە وەک گرمە. (ڕمە ڕم) ڕمەی یەک لە دوای یەک.
ڕمیاگ: ڕووخاو.
ڕمیان: د. ڕمان.
ڕمین: د. ڕمان.
ڕنک: لاسکی کەنگرە کە بەناسکی وەک ڕێواس پاک دەکرێ و دەخورێ.

رِنگ: شێلەی خەستی بێ گرێ و قۆرتی شیرین.
رِنگاڵ: هەنگوین و دۆشاوی پوختی پالاوتە.
رەنگانەوە: وتنەوەی قسەیەک چەند جارێک بەبێهوودە.
رِنگاو: سرکەیەکە کە هێشووە ترێی رەشی تێ خرابێ بۆ خواردنی لە زستاندا.
رِنگە: رەندە.
رِنوو: پارچە سەهۆڵ و بەفری گەورە.
رِنە: وردە بارانێکە کە دەوار دای دەدا. چنین و کردنەوەی بەری هێندێ شت (د).
رِنەک: ئاسنێکی درێژکۆلەی کولۆری گرنج گرنجە ولاخی پێ پاک دەکرێتەوە.
رِنیاگ: شتی رِنراو.
رِنین: رووشاندنی شتێک بەنینۆک یا بەشتێکی تر. کردنەوەی بەری هێندێ درەخت و سەوزایی: میوەکە یا بامێکە کاتی (رِنین)ی هاتووە.
رِنینەوە: دروونەوەی گیا و خەلە بەدەست.
رِۆ: وتەیەکە لە شیوەنی خۆشەویستێکدا دەوترێ: باوکە (رِۆ) یا برا (رِۆ). رِۆژ (هـ). جۆگەی پچووک. شوێنێکە لە دەریا کە چووبێتەوە ناو زەوییەوە (خلیج).
روانین: تەماشاکردن.
رِۆب: جۆرە بالاپۆشێکی قۆڵداری فراوانە هەر لەناو ماڵدا لەبەر دەکرێ.
رِۆبنار: ربە نار.
روت: د. رووت.
رِۆت: ز. داری درێژ.
رِۆجیار: د. رِۆژگار.
رِۆجیار پەرس: د. گوڵەبەرِۆژە.
رِۆچن: رِۆشن (هـ). کلاورِۆژنە (د).
رِۆچنایی: هـ. رِۆشنایی.
رِۆچنە: هـ. کلاورِۆژنە.
رِۆچوون: چوونە خوارەوەی شتێک بەناو ئاو یا بەناو زەویدا.
رِۆچە: رِۆژوو.
رِۆچەوان: رِۆژووەوان.
رِۆچێ:س هـ. رِۆچە.
رِۆچیار: رِۆژگار.
رِۆچی: هـ. رِۆچێ.
رِۆحتۆتیا: کانێکە جۆرە دەفرێکی لێ دروست دەکرێ، ناسکە زوو دەپەرِێ.
رِۆح چوون: بریتییە لە ترسان.
رِۆح زل: بریتییە لە مەردوومی بەفیز.

روخ: ناوە بۆ دوو داش لە داشەکانی شەترەنج.
رِۆخ: کەنار و قەراغی دەریا.
رِۆخان: د. رووخان.
روخانن: د. رووخاندن.
روخانە: هـ. چەمی ئاو.
روخسار: دەموچاو.
روخسارە: د. روخسار
روخە: د. روخەک
روخەک: د. شتی دارِوخاو.
روخیاگ: رووخاو
رووخیان: د. رووخان.
رِۆدی: ز. رێخۆڵە.
رِۆز: لە یەک دان و دروونی پارچەی کالا لە دوای برِینی.
روزقە: گیایەکی بەهارییە لە گێلاخە دەچێ و بەبرژاوی دەخورێ.
رِۆزگار: کات و دەمێکە کە بەرەبەرە دێت و دەرِوا.
رِۆزی: پێ بژیوو.
رِۆژ: خۆر. لە خۆرهەلاتنەوە تا خۆرئاوابوون.
رِۆژاڤا: با. رِۆژاوا.
رِۆژانە: مووچەیەکە لە دراو کە دەدرێ بەکرێکار یا بەیەکێکی تر.
رِۆژاوا: کاتی ئاوابوونی رِۆژ. شوێنێکە کە بەدیمەن کەوتبێتە لای ئاوابوونی رِۆژەوە.
رِۆژاوایی: ئەو کەسانەن کە لە خۆرنشین دادەنیشن.
رِۆژبر: رِۆژانە: (بەرِۆژبر) ئەم کارەم بۆ بکە.
رِۆژبوونەوە: نەمانی شەو و هاتنی رِۆژ.
رِۆژ بەسەربردن: بریتییە لە دان بەخۆداگرتن و گوزەرانکردن هەر چۆنێک هەڵسوورا.
رِۆژپەرست: گیاندارێکە وەک مارمێلکە بەلام لەو گەورەترە هەمیشە روو دەکاتە رِۆژ، لەبەر هەتاو بەگەڵێ رەنگ دەنوێنێ. گوڵەبەرِۆژە. کەسێکە کە رِۆژبپەرستێ.
رِۆژ رەش: بریتییە لە بەدبەخت.
رِۆژ رەشی: بەدبەختی.
رِۆژکردنەوە: نەنووستن و دانیشتن لە شەو تا بەیانی.
رِۆژگ: رِۆژوو.
رِۆژگار: درێژاییی رِۆژ لە بەیانییەوە تا ئێوارە. رِۆزگار.
رِۆژگارپەرست: گوڵەبەرِۆژە.
رِۆژگەوان: رِۆژووەوان.
رِۆژگیران: نەمانی رووناکی رِۆژ بەهۆی بەرگرتنی لەلایەن مانگەوە.
رِۆژمژ: د. رِۆژبر.
رِۆژن: ز. کلاورِۆژنە.

ڕۆژنامە: نووسراوێکە ڕۆژ و مانگ و ساڵ پیشان دەدا. نووسراوێکی چاپ کراوە ڕۆژبەڕۆژ دەردەچێ بۆ بڵاوکردنەوەی دەنگوباس.
ڕۆژنامەچی: کەسێکە ڕۆژنامە دەرکا.
ڕۆژنامەگەری: خەریکبوون بەدەرکردنی ڕۆژنامەوە (صحفي).
ڕۆژنامەنووس: کەسێکە کە لە ڕۆژنامەدا بنووسێ.
ڕۆژناهی: ڕۆشنایی.
ڕۆژنایی: ڕۆژناهی.
ڕۆژنشین: ڕۆژاوا.
ڕۆژوو: نەخواردن و نەخواردنەوە و نەکردنی هێندێ شتی تری تایبەتییە لە شەبەقی بەیانەوە تا ڕۆژئاوا بەنیازی خواپەرستی.
ڕۆژووگر: ڕۆژووەوان.
ڕۆژووگرتن: بەڕۆژووبوون.
ڕۆژووەوان: مەردوومی بەڕۆژوو.
ڕۆژە جووت: ئەندازەیەکە لە زەوی کە بەڕۆژێک بەجووت بکێلرێ.
ڕۆژە ڕێ: ئەندازەیەکە لە ڕێگا کە بەڕۆژێک بەپێ ببردرێ.
ڕۆژەن: کلاو ڕۆژنە.
ڕۆژهەڵات:س دەمی هەڵاتنی ڕۆژ. شوێنێکە کە بەدیمەن کەوتبێتە لای هەڵاتنی ڕۆژەوە.
ڕۆژهەڵاتی دوور: ئەوپەڕی ئاسیا بەلای ڕۆژهەڵاتەوە.
ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست: ناوەڕاستی ئاسیا.
ڕۆژهەڵاتی نزیک: قەراغی ئاسیا بەدیوی دەریای سپیدا.
ڕۆژی: پێ بژیوێکە کە خوا بتداتێ. ڕۆژوو (ز).
ڕۆژیدەر: ئەو خوایەیە کە ڕۆژیت دەدا.
ڕوشتە: هەودای بادراو.
ڕۆشن: ڕووناک.
ڕۆشنا: ڕۆشن (د). وتەیەکە زۆرتر لەگەڵ وتەی (ئاشنا)دا بەکاردێنرێ: ئاشنا و (ڕۆشنا).
ڕۆشنایی: ڕووناکی.
ڕۆشنبوونەوە: ڕووناکبوونەوە. بریتییە لە دەرکەوتنی مەبەستی شتێکی نادیار: دەرسەکە (ڕۆشن بووەوە).
ڕۆشنکردن: د. داگیرساندن.
ڕۆشنکردنەوە: ڕووناک کردنەوە. دەرخستنی مەبەست لە شتێک.
ڕۆشنی: ڕۆشنایی.
ڕۆغان: ل. ڕۆن.
ڕۆڤک: ز. مووی بەر.
ڕۆڤی: ز. ڕێوی.
ڕۆکردن: داکردنی شتێک لە دەفرێک بە سەربەرەوخوار کردنەوەی، (ڕۆکراو) شتێکە لە دەفرێکدا کرابێ.
ڕۆکەوتن: پاڵکەوتن.
ڕۆڵە: منداڵ.
ڕۆڵە خوای: هـ. ڕیخۆڵە
ڕۆمان: چیرۆکی گەورە (رواية).
ڕۆمەڵغەزا: د. هۆمەڵغەزا.
ڕۆن: چەورییەکە لە ماست و گەڵێ شتی تر دەگیرێ. ڕوون.
ڕۆنان: دانان: (ڕۆی نێ) واتە داینێ.
ڕۆناو: چەورییەکە لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بێ.
ڕۆناهی: ڕووناکی.
ڕۆنایی: ڕووناکی.
ڕۆنتک: فرمێسک.
ڕۆندان: شوێنێکە کە ڕۆنی تێدا دادەنرێ.
ڕۆندک: با. فرمێسک.
ڕونگ: خوری دابەستەیە کە لەپاش برینەوەی دووبارە برابێتەوە.
ڕۆنگرتن: گرتنی ڕۆنی گوێز و بادام و هەموو شتێکی تر کە ڕۆنی ببێ.
ڕۆنە کەرە: کەرە.
ڕۆنیاس: گیایەکی کوێستانییە بەنی پێ سوور دەکرێ.
ڕۆنیاسی: شتێکە کە ڕەنگی وەکو ڕەنگی ڕۆنیاس وابێ.
ڕۆنیشتن: دانیشتن.
ڕۆنی: ز. ڕووناکی. شتی ڕووناک.
ڕۆنین: ڕۆنیشتن (با). ڕوانین.
ڕوو: دەموچاو. دیوی دەری شت. گوستاخی و زاتکردن: فیسار کەس بە(ڕوو)ە یا (ڕووی) نایە.
ڕووار: د. ڕووبار.
ڕوواس: هـ. ڕێوی.
ڕوواڵ: هەرزەکار.
ڕوواڵەت: وتن و کردنی گوفتار و کرداری چاک بۆ چاوەی مەردووم.
ڕوواڵەتباز: د. ڕیاکار.
ڕوواڵەتبازی: د. ڕیاکاری.
ڕووان: ڕەگ داکوتان و سەوزبوونی درەخت و گیا و مووی لەش و دانی گیاندار.
ڕوواندن: چەقاندنی گوڵ و درەخت و سەوزایی بۆ ڕیشە داکوتانی.
ڕووانگە: جێگایەکی تایبەتییە کە بەئاسانی مانگی یەک شەوە و ئەستێرەی تێدا بدۆزرێتەوە.
ڕووانەکردن: د. ڕەوانەکردن.
ڕووانەوە: خەستبوونەوە و توندبوونی دۆشاو و هیندێ شتی تر.
ڕوواو: شتێکە کە سەوز بووبێ و ڕەگی داکوتابێ.

رووواوە: شتێکە کە خەست بووبێتەوە.
رووبار: چەمی گەورە.
رووباربوونەوە: د. بەرەو رووبوونەوە.
رووباز: د. ڕیاکار.
رووبازاڕی: بریتییە لە ئافرەتی جوان. بریتییە لە شتی بەدیمەن جوان کە زوو بفرۆشرێ.
رووبازی: د. ڕیاکاری.
رووبال: ز. بەرەو رووبوونەوە.
رووبەروو: بوونی دووشت بەجۆرێک کە روویان لە یەک بێ.
رووبەرووبوونەوە: بەرەو رووبوونەوەی دوو کەس.
روو بەروویی: بەرامبەری.
رووبەند: رووپۆش.
رووبەنە: د. رووبەند.
رووپامایی: رووالەتکردن.
رووپۆش: پارچە تەنراوێکی تەنکە ژنان لە کاتی چوونە دەرەوەیاندا روویانی پێ دەپۆشن.
رووپەڕە: دیوێک لە پەڕەیەک کاغەز.
رووپێدان: رووخۆشی لەگەڵ یەکێکدا و زۆر دواندنی.
رووت: شتی بێ کالا و بەرگ.
رووتاڵ: رووگرژ.
رووتاندن: د. دارووتاندن.
رووتاندنەوە: کردنەوەی گەڵای دار و دەسکەنەی مووی گیاندار و هەڵکێشانی پەڕی باڵندە. بریتییە لە شت سەندن لە یەکێک بەزۆر: زۆردار پیشەی هەر رووتاندنەوەی مەردوومە.
رووتان: د. رووتاندن.
رووتانەوە: هەڵوەرینی گەڵای دار و مووی گیاندار و پەڕی باڵندە.
رووتاوە: درەخت و گیاندار و باڵندەیەکە کە گەڵا یا موو یا پەڕی وەری بێ.
رووتبوون: نەمانی گەڵای دار و مووی گیاندار و پەڕی باڵندە.
رووتبوونەوە: داکەندنی کالای بەر.
رووترش: بریتییە لە مەردوومی روو گرژ.
رووترشیاگ: د. رووترش.
رووتکردن: رووتکردنەوە. هەڵوەشاندنی تفەنگ و دەمانچە بۆ پاککردنەوەی. کردنەوەی لق و پۆپی درەخت و رووتانەوەی مووی سەر و پێ.
رووتکردنەوە: داماڵینی بەرگ و کالا لەبەر یەکێک.
رووتوقووت: شتی زۆر رووت و بێ بەرگ.
رووتە: مەردوومی لاتی بێ ناونیشان
رووتەخت: د. تارایەکە دەدرێ بەسەر ئەو تەختەی کە بووکی تێدا سوار دەکرێ.
رووتەڵ: رووتەڵە. دارو درەخت و گوڵی کزی کەم گەڵا.
رووتەڵە: مەردوومی ڕەش و رووتی کزی بێ بەرگ.
رووتەن: شوێنێکە کە گژ و گیا و درەختی پێوە نەبێ.
رووتەنی: رووتەن.
رووتەوبوون: د. رووتەوەبوون.
رووتەوکردن: د. رووتەوە کردن.
رووتەوەبوون: رووتبوونەوە.
رووتەوەکردن: رووتکردنەوە.
رووتیانەوە: د. رووتانەوە.
رووتێکردن: رووکردنە شتێک.
رووتی: بوونی شت بەرووت.
رووچک: دەموچاو.
رووخان: هەرەسهێنان و کەوتنی دیوار و شاخ و شتی بەرز.
رووخاندن: ڕماندنی دیوار و شتی بەرز.
رووخانە: ڕۆخانە.
رووخاو: شوێنێکە کە هەرەسی هێنابێ.
رووخۆش: بریتییە لە یەکێک کە زبانی شیرین و ناوچەوانی روون بێ لەگەڵ مەردوومدا.
رووخۆشی: بریتییە لە زبان شیرینی و ناوچەوان روونی لەگەڵ مەردوومدا.
روودار: نەترس و خاوەن روو.
رووداماڵراو: رووهەڵماڵراو.
رووداماڵیاگ: د. رووداماڵراو.
روودان: قەومان و پەیدابوونی شتێک: ئیمڕۆ شتێکی سەیر (روویدا). رووپێدان (د).
رووداو: شتێکە کە رووی دابێ.
روودەربایست: رووگیر.
رووڕەش: بریتییە لە مەردوومی شەرمەزاری تەریق.
رووڕەشی: بریتییە لە شەرمەزاری و تەریقی.
رووزەرد: بریتییە لە مەردوومی شەرمەزار.
رووزەردی: بریتییە لە شەرمەزاری.
رووسارد: بریتییە لە کەسێک کە سارد و سڕ بێ لەگەڵتدا.
رووساردی: بریتییە لە ساردی لەگەڵ یەکێک.
رووسپێتی: بریتییە لە کچێنیی بووک.
رووسپی: بریتییە لە ئافرەتی سۆزانی.
رووسوور: بریتییە لە یەکێک کە سەری بەرز بێ و هیچ جۆرە نەنگێک رووی تێ نەکردبێ.
رووسووری: بریتییە لەسەربەرزی و بێ نەنگی مەردووم. رووسپێتی.
رووسەخت: رووقایم.

رووسەختی: رووقایمی.
رووش: شتی زبر. بریتییە لە مەردوومی دەموچاو ئاڵاوی. جۆرێکە لە بەری دار مازوو کە چڵ چلاوییە. پرووش: تەختەکە (رووش)ی هەڵداوە.
رووشاڵ: د. رووش.
رووشان: برینداربوونێکی کەمی جێ جێیە لە جەستەی گیاندار و هێندێ شتی تر بەهۆی کەوتنیان لە شتێکی زبر.
رووشاندن: برینداركردنێکی کەمی جێ جێیە لە جەستەی گیاندار و هێندێ شتی تر.
رووشانن: رووشاندن.
رووشاو: شتێکە کە جێ جێ کەمێک بریندار بووبێ.
رووشاوی: شتێکە کە رووشی هەڵدابێ.
رووشکان: بریتییە لە تەریق بوونەوەی مەردووم.
رووشکاندن: بریتییە لە تەریق کردنەوەی مەردووم.
رووشکانن: رووشکاندن.
رووشکێن: بریتییە لە کەسێک کە زۆر مەردووم تەریق بکاتەوە.
رووشکێنی: رووشکاندن.
رووشیان: د. رووشان.
رووڤی: رێوی (با). رێخۆڵە (ز).
رووقایم: بریتییە لە کەسێک کە هەرگیز تەریق نەبێتەوە.
رووقایمی: تەریقنەبوونەوە.
رووک: د. رووش.
رووکار: دەمکار.
رووکان: د. رووشان.
رووکانن: د. رووشاندن.
رووکرانەوە: بریتییە لەلاچوونی شەرم: فیسارە کەس (رووی کراوەتەوە) واتە شەرمی شکاوە (رووکراوە) کەسێکە شەرمی شکابێ.
رووکراوەیی: بریتییە لە شەرم شکان.
رووکردن: بریتییە لە شەرم کردن.
رووکردنەوە: بریتییە لە شەرم شکاندنی یەکێک.
رووکرن: ز. رووکردن.
رووکە: د. رنە.
رووکەش: شتێکی جوانە کە بەدیوی ناشیرینی شتێکی تردا بگیرێ لە دیوی دەرەوە.
رووکەش کردن: داپۆشینی دیوی ناشیرینی شتێک بەشتێکی جوان.
رووکیان: د. رووکان.
رووکێش: د. رووکەش.
رووکێشکردن: رووکەش کردن.
رووگرتن: بریتییە لە شەرم کردن و لە روودا دامان.
رووگرتی: ز، قالب بەستنی ماست و شتی تر.
رووگرژ: بریتییە لە مەردوومی توورە و ترۆ.
رووگرژی: بریتییە لە توورە و ترۆیی.
رووگە: ئەو شوێنەیە کە لە نوێژدا دەبێ رووی تێکەیت (قبلە).
رووگەش: رووخۆش.
رووگیر: کەسێکە کە لە رووی یەکێکدا دامابێ.
رووگیری: لە روودا دامان.
روول: ژاڵە (با). گیایەکی سەوزە بەدرەختدا هەڵدەگەرێ.
روولک: ژاڵە.
روولکەن: ز. رووخۆش.
روولە: منداڵێکە هێشتا لە سکی دایکیدا بێ.
روولێنان: بریتییە لە تکاکردن لە یەکێک بۆ کردنی کارێک.
روولێ وەرگێران: بریتییە لە زویربوون لە یەکێک.
رووم: مووی بەر.
روومەت: تەختاییەکی بێ مووە لە خوار چاو و تەنیشت لووتەوە. شەرەف (ز).
روومەتگرتن: د. دەموچاو هەڵگرتن.
روومەتگیر: دەموچاو هەڵگر.
روون: شتی شلی تراو. رووناک. رۆن. بریتییە لە کەسێک کە سەر و دڵی خۆش بێ. فیسار کەس (روونە)ە واتە دڵی خۆشە.
رووناک: شوێنێکە کە بە باشی چاو تێیدا ببینێ.
رووناکایی: رووناکی.
رووناکبوونەوە: رۆشنبوونەوە.
رووناککردنەوە: رۆشن کردنەوە.
رووناکی: شەوقێکە کە بە هۆی ئەوەوە تاریکی لابچێ.
رووناهی: با. رووناکی.
روونبوونەوە: رۆشنبوونەوە.
روونبێژی: زانینێکە کە بەهۆی ئەوەوە بتوانیت تاقە یەک مەبەست بەچەند دەستەواژەیەکی جوێ جوێ لێک بدەیتەوە (بیان).
روونکردنەوە: رۆشن کردنەوە.
روونووس: د. وێنەگرتنی شتی نووسراو.
روونویس: د. روونووس.
روونی: رووناکی. بوونی شت بەشل و تراو.
روو وەرگێران: لادانی روو لە شتێک لەبەر نارەزایی لێی.
رووه: د. بەری کاڵا.
رووهاتن: بریتییە لە شەرم نەکردن لە گوفتار و کرداردا.
رووهن: رۆن.

رووهەلچەرخاندن: ڕوو وەرگێڕان.
رووهەڵماڵاو: بریتییە لە مەردوومی بێ شەرم.
رووهەڵماڵراو: رووهەڵماڵاو.
رۆهستێن: گیان ستێن (ئیزرائیل).
روهن: ز. ڕۆن.
رۆهن: شتی شلی ڕوون.
روهنی: ز. ڕووناکی.
رویال: با. شوێنی کرێن.
رۆێز: گومان.
رۆیشتن: چوون لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر.
رۆین: ڕۆیشتن.
رۆینە: جۆرە هەڵپەڕکێیەکە بەهێواشی سووڕدەخۆن بەبێ خۆ بەرز کردنەوە و، پێشڕەوە بۆ (سێ پێیی).
روی: ڕێوی (ل). ڕوو (با).
رویت: (با). ڕووت.
رویس: با. ڕویت.
رویڤک: با. ڕیخۆڵە.
رویل: با. جۆرە دارێکی بچکۆلانەیە گولێکی سوور دەگرێ.
روین: ڕۆیشتن.
رۆین: ڕۆیشتن.
روینیشتن: با. دانیشتن.
رە: لە: (رە) گەڵی خە، واتە لەگەڵیدا بینێرە.
رە: با. ڕیش.
رەبەت: جێگایەکە کە ڕاوچی خۆی تێدا حەشار دەدا بۆ نێچیر. ناوی دێیەکە لە ناوچەی قەرەداخ.
رەبەق: وتەیەکــە بەکــاردێنرێ بۆ ئەندازەیەک لە کــات بەبێ کــەمــوکــوڕی: ئەمــە مــانگێک یا ســاڵێکی (ڕەبەق)ە تۆم نەدیوە.
رەبەن: زەلامی گــەنجی بێ ژن و مــاڵ. کــەســێکە ســەری خــۆی هەڵگرتبێ و ئاوارە بووبێ. هەژاری بێ نەوا (ز). گــەمــژ (با).
رەبیت: ز. گیاندار یا گیایەکە کە خێرا پێ بگا.
رەپ: شتی ڕاستی ڕەق.
رەپال: ز. کاڵای کۆنی دڕاو.
رەپاندن: تەپە هەســتــاندن لە شــتێک بەدەست پێــدانی: خــۆ تۆ قورئانت (ڕەپاند) کە درۆ نەکەیت.
رەپاوڕەپ: بریتییە لە وتنی شت بەبێ پەردە.
رەپبوون: ئێرەقبوونی کێر. ئاوسانی جەستە بەجۆرێک کە گرێ و قۆرتی تێدا نەمێنێ.
رەپرەپان: د. تەپەتەپ کردن.
رەپکردن: ئێرەق کردن.
رەپە: تەپە، (ڕەپەڕەپ) تەپەتەپ.
رەپەڵ: د. دەستەیەک لە یاریکەران.
رەپەڵگا: د. جێی یاری. ڕەپێڵگە.
رەپەڵە: د. ڕەپەڵ.
رەپێڵگە: ڕێیەکە کە زۆر هاتوچۆی پێدا کرابێ.
رەت: گــەهەک. بیــر: (رەت)ت لێ تێک داوم. شــتــێکە کــە لە شــوێنی خــۆی تێــپــەڕیبێ: کــولۆمی دەرگــاکــە (ڕەت)کــە. دەستکەوتن: فیسار کەس بەر (ڕەت) ناکەوێ. ڕووت (د).
رەتان: ماندووبوونی گیاندار لە بەر زۆر لنگدانی.
رەتاندن: هێنان و بردن و ماندووکردنی گیاندار.
رەتانن: ڕەتاندن.
رەتاو: گیاندارێکە کە لەبەر زۆر هێنان و بردنی ماندوو بووبێ.
رەتبردن: نووچ بردنی گیاندار.
رەتبوون: تێپەڕین.
رەتدان: ڕەتبردن.
رەتکردن: تێپەڕاندنی شتێک لە شوێنێک.
رەتن: ز. ڕشتن.
رەتەوە: د. بنەچە: ڕەسەن نامە (شجرە).
رەتەوی: د. بەچکەی مەڕێکە کە لە ناوەندی کاوڕی و شەکیدا بێ.
رەتیاگ: ڕەتاو.
رەتیان: د. ڕەتین.
رەتیماندن: ز. پڕکردنەوەی چاڵ بەقوڕ.
رەتین: ڕەتان.
رەجاڵ: مەردوومی هەژاری ڕووتی بێ نەوا.
رەجاڵی: نەبوونی و بێ نەوایی.
رەجڵ: شــتێکە کە شــایــســتــە بێ و بشێ: ئەم کــارە (ڕەجڵ)ی تۆ نییە واتە بۆ تۆ ناشێ. هەر لە نەبووندا بەکاردێنرێ.
رەجوا: ڕجوا.
رەجوان: ز. وڵاخی ڕەهوان.
رەچەڵەک: بنەچە.
رەچەڵەکناس: کەسێکە بنەچەی مەردووم باش بناسێ.
رەحت: ز. ماندوو.
رەحەتی: شــتێکی دەمــپــانی کلک تەسکە نەوت و شــتی شلی پێ تێ دەکرێ بۆ ئەوەی کە نەڕژێ.
رەخ: ز. قەراغی شت. ڕوخی شەترەنج. بەرێک لە شــوێنێک: ڤی ڕەخی، واتە ئەمبەر، یاوی ڕەخی واتە ئەوبەر.
رەخت: جۆرە خشڵێکی زێوینە بۆ جوانی دەدرێ لە وڵاخ.
رەختە: شتی ساغی توند و تۆکمە.

ڕەخدار: ز. قۆڵچی «انحصار».
ڕەخسان: گەیشتنی شتێک لە لایەکەوە کە چاوەڕوانی نەکرابێ.
ڕەخساندن: گەیاندنی شتێک لەلایەن خواوە بۆ بەندەی خۆی لە لایەکەوە کە هیچ بەتەمای نەبووبێ.
ڕەخساو: شتێکە کە لەلای لابەلاوە گەیشتبێ.
ڕەخسین: ڕەخسان.
ڕەخسیو: ڕەخساو.
ڕەخش: ڕەخت.
ڕەخشان: درەخشان.
ڕەخنە: ڕەغنە. کەلەبەر (د).سستی (ز).
ڕەخنەگر: ڕەغنەگر.
ڕەخنەگرتن: ڕەغنەگرتن.
ڕەخنەگری: ڕەغنەگری.
ڕەدبوون: ڕەتبوون.
ڕەدە: پیتاکێکە کۆ دەکرێتەوە لەلایەن چەند کەسێکەوە بۆ شتێک.
ڕەدکردن: ڕەتکردن.
ڕەدووخستن: هەڵگرتنی ئافرەت و بردنی لەلایەن یەکێکەوە.
ڕەدووکەوتن: ڕادووکەوتن.
ڕەدووکەوتوو: ئافرەتێکە کە دووی پیاوێکی بێگانە کەوتبێ کە هەڵی گرتبێ.
ڕەدیماندن: ز. پڕکردن و سەرڕێژکردنی شت.
ڕەز: باخی مێو.
ڕەزا: شێوە و تەحر: (ڕڕەزا)ی قورسە.
ڕەزاتاڵ: ئێسک قورس.
ڕەزا سووک: ئێسک سووک.
ڕەزا شیرین: ڕەزا سووک.
ڕەزا قورس: ئێسک قورس.
ڕەزاقی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
ڕەزاگران: ڕەزاقورس.
ڕەزانە: باجێکە ساڵەوساڵ لە بەری ڕەز دەسێنرێ.
ڕەزبەر: مانگی ئەیلوول.
ڕەزڕەزۆک: تووڵە زەڕە.
ڕەزڤان: ز. ڕەزەوان.
ڕەزەڵە: تووڵە زەڕە موورغەی پشت. ناوە بۆ دێیەک لە سنووری سرۆچک.
ڕەزم: بەزم.
ڕەزەڵخوا: کەسێکی داماوە کە شایستەی شت پێدان بێ.
ڕەزەڵخوایی: داماوی و بێ نەوایی.
ڕەزەوان: کەسێکە کە ڕەز بەخێو بکا.
ڕەزیل: مەردوومی چرووک.
ڕەژتن: د. ڕشتنی چاو.
ڕەژتنەوە: د. ڕشتنەوە.
ڕەژمیری: ڕەشمیری.
ڕەژوو: خەڵووز.
ڕەژی: با. خەڵووز.
ڕەسا: شتی پانوپۆڕ.
ڕەسایی: پانوپۆڕی.
ڕەسەن: مەردوومی خانەدان. ولاخی بەناوونیشان.
ڕەسیدە: کوڕ و کچێکە کە قەدرە بووبن.
ڕەش: جۆرە ڕەنگێکی تاریکە وەک ڕەنگی خەڵووز. جۆرە هەنجیرێکە.
ڕەشاو: جۆرە ئاوێکی ڕەشە دەچێتە ناو پەردەی چاوەوە و کوێری دەکا. خەڵووزاوێکە دارتاش داری پێ خەت دەکێشێ بۆ داهێنانی.
ڕەشایی: تارماییەکە لە دوورەوە ڕەش بکاتەوە. لادێییەکە کە جووت و بەرەی نەبێ (د). پارچەیەکە لە زەوی کە لەناو بەفردا دیار بێ.
ڕەشایی داهاتن: بریتییە لە تاریکبوونی چاو.
ڕەشباز: ڕەشبازوو.
ڕەشبازگ: ڕەشبازوو.
ڕەشبازوو: شتی ڕەش و سپی.
ڕەشبام: د. ڕەشباو.
ڕەشباو: شتێکی بۆرەڵووکە کە بەسەر ڕەشدا بڕوانێ.
ڕەشبگیر: گرتن و کۆکردنەوەی مەردوومە لەلایەن دەوڵەت یا گەورەیەکەوە بۆ فرمانێکی قورس.
ڕەشبۆرە: ولاخی بەرزەی بۆرە کە بەسەر ڕەشدا بڕوانێ.
ڕەشبوون: بریتییە لە ئێسک قورسبوون لە پێش چاوی یەکێک.
ڕەشبوونەوە: دامردنەوەی ئاوڵە و سووریژە. چوونەوەی بەفر. بوونی ئاگر بەخەڵووز لە خۆیەوە. بریتییە لە کوژانەوەی چرای دەروون: ئەوەندەت سوێندی درۆ خوارد (ڕەشبوویتەوە).
ڕەشبەڵەک: هەڵپەڕنی ژن و پیاو بەتێکەڵی. شتی ڕەش و سپی (د).
ڕەشبین: بریتییە لە مەردوومی بەدبین.
ڕەشپۆش: کەسێکە سەرتاپا کالای ڕەشی لەبەر کردبێ لە ماتەمدا.
ڕەشتاڵ: ڕەشتاڵە.
ڕەشتاڵە: مەردوومی ڕەشباو.
ڕەشتن: چاوڕەشکردن بەکل و کلچێوک.
ڕەشتنەوە: د. ڕشتنەوە.

ڕەشتی: مشکی سەرپێچ یا کۆڵی ژنان.
ڕەشخوێن: کەسێکە کە قورئان بە ناپوختی بخوێنێ.
ڕەش داگەڕان: ڕەش هەڵگەڕان.
ڕەش داگەڕیان: ڕەش داگەڕان.
ڕەش داگیرسان: ڕەشبوونی ئەندام لەبەر هەتاو یا لە ڕقاندا.
ڕەش ڕاهاتن: ونبوون و نەمانی شتێک بەکوتوپڕی.
ڕەشڕەشک: ز. زیزانە.
ڕەشک: کلاشی پەڕۆ (ز). کالا و پێتاوی لباد.
ڕەشکار: ڕەشباو.
ڕەشکردن: بریتییە لە ئێسک قورسکردنی یەکێک لای یەکێک. بریتییە لە زەردکردن و مراندنی کاردوو بەترش و خوێ.
ڕەشکردنەوە: داپۆشینی زەلی سەربانی تازە بەگڵ. دیاربوونی شتێک لە دوورەوە بەڕەشی: ئەو شتە لە دوورەوە (ڕەش دەکاتەوە). نووسینەوەی مەشق بەپڕی.
ڕەشکوژ: بریتییە لە یەکێک کە ئازاری مەردووم بدا بەبێ لێکدانەوە و کۆڵینەوە: فیسارە کەس (ڕەشکوژ)ە یا هەر لە (ڕەشی دەکوژێ) واتە دەست ناپارێزێ.
ڕەشکۆیی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
ڕەشکە: گیایەکی بەرزی گەلا وردە دەنکێکی ڕەش دەگرێ و دەکرێتە ناو نانەوە. جۆرە ترێیەکی ڕەشی پێست ئەستوورە. دەفرێکی کون کونی گرێ چنە لە موو دروست دەکرێ کا و کولۆشی پێ دەگوێزرێتەوە.
ڕەشکەلە: ڕەشتاڵە.
ڕەشکەڵە: ڕەشکەلە.
ڕەشکەن: د. ڕەشایی ناو بەفر.
ڕەشکە و پێشکە کردن: تارمایی ڕەش و سپی هاتن بەپێش چاودا بەجۆرێک کە شت باش نەبینیت.
ڕەشکە و سپیکە: بریتییە لە شتی نووسراو: خۆ تۆبە (ڕەشکە و سپیکە)تدا ڕوانیوە، واتە خوێندووتە.
ڕەشکەووگ: ڕەشکەوە.
ڕەشکەوە: ڕەشێکە کە بەسەر بۆردا بڕوانێ.
ڕەشکەوەگ: د. ڕەشکەوە.
ڕەشمار: جۆرەمارێکی زۆر ڕەشە.
ڕەشماڵ: دەواری ڕەشی هەڵدراو.
ڕەشمە: شتێکە دەکرێ بەسەر ولاخی بەرزەدا گوریسێکی پێوەیە بۆ ئەمەی کە پێی ببەسترێتەوە.
ڕەشمێو: با. مێوی زۆر ڕەش.
ڕەشمیری: جۆرە ترێیەکی دەنک گەورەی درێژی ڕەشی هێشوو شاشە.
ڕەشوبازگ: ڕەشبازگ.

ڕەشوڕووت: مەردوومی ڕووتی هەژاری کەساس.
ڕەشۆکی: شتێکە کە تایبەتی نەبێ.
ڕەشۆڵە: ڕیشۆڵە.
ڕەشوە: ڕەشمە.
ڕەشە ئۆلاخ: د. ڕەشەولاخ.
ڕەشەبا: بایەکی بەهێزە لە هێندێ شوێن لە ڕۆژهەلاتێکی دەستە چەپەوە ناو بەناو هەڵ دەکا.
ڕەشەجوو: جوولەکەیەکە کە زۆر باوەڕی بەدینی جوولەکە بێ.
ڕەشەخێزان: خێزانی زۆر.
ڕەشەداڵ: جۆرە داڵێکە.
ڕەشەڕێحانە: جۆرە ڕێحانەیەکی ڕەشی گەلا پانە.
ڕەشە ساڵ: وشکە ساڵ.
ڕەشە سیل: دەردی سیلە کە بگاتە ئەندازەیەک چاکبوونەوەی نەبێ.
ڕەشەک: باسێکە کە یەکەمجار نووسرابێ و لێی کووژابێتەوە (مسودە).
ڕەشەگاوڕ: گاورێکە کە زۆر باوەڕی بەئاینی خۆی بێ.
ڕەشەگرانەتا: ڕەشەگرانەتێ.
ڕەشەگرانەتێ: تایەکی زۆر گرانە پەیدا دەبێ لە ئەندامی مەردوومدا بەڕەنگێکی وا لە گرانەتا قورستر و لە مردن نزیکترە.
ڕەشەگەوون: جۆرە گەونێکی ڕەشە.
ڕەشەموسڵمان: موسڵمانێکی سادەیە کە زۆر باوەڕی بەئاینی خۆی بێ.
ڕەشەمە: ڕەشەمێ.
ڕەشەمێ: مانگی شوباتە کە (٢٨) ڕۆژە.
ڕەشە نەخوێندەوار: مەردوومی زۆر نەخوێندار.
ڕەشەوبوون: د. ڕەشبوونەوە.
ڕەشەولاخ: گا و مانگا و گامێش.
ڕەش هەڵگەڕان: ڕەش داگیرسان.
ڕەشێلە: ز. چۆلەکەیەکی ڕەشی دەنگ خۆشە.
ڕەشێنە: ڕەشیی گلێنەی چاو.
ڕەشی: بوونی شت بەڕەش. ڕەشایی.
ڕەغنە: نەنگ.
ڕەغنەگر: کەسێکە نەنگ لە شت دەربێنێ.
ڕەغنەگرتن: نەنگ گرتن لە شت.
ڕەغنەگری: خەریکبوون بەنەنگ گرتن لە شت.
ڕەف: جوێن دان بەمەردوومی زۆر موسڵمان.
ڕەفتار: کردارێکە کە خووی پێوە گیرابێ.
ڕەفتەنی: کەسێکە لەسەر ڕۆیشتن بێ.

ڕەفک: ز. ڕفە.
ڕەفکە: ڕفە.
ڕەفە: ڕفە.
ڕەفیسک: قوولایی ژێر ئەژنۆ.
ڕەفیسکە: ڕەفیسک.
ڕەفی: با. قەراغ و کەناری شت.
ڕەڤاندن: ز. شکاندنی دوژمن.
ڕەڤدە: ز. گەلەی سەگ و گورگ.
ڕەڤۆ: ز. ڕەووک.
ڕەڤین: ز. شکانی لەشکر و ڕەوکردنی.
ڕەق: شتی زۆر توندی سەخت. ڕەقە.
ڕەقالە: پێچکەی بێشکە.
ڕەقان: شوێنی ڕەق.
ڕەقاندن: لە دەرگادان.
ڕەقــاندنەوە: گــەلالــە کــردن و ڕێکخــســتنی ئاسن لە پاش ساردبوونەوەی.
ڕەقانن: ڕەقاندن.
ڕەقاننەوە: ڕەقاندنەوە.
ڕەقانی: ڕەقەن.
ڕەقایی: ڕەقانی.
ڕەقبردنەوە: ڕەقبوونەوەی گیاندار.
ڕەقبوون: ڕەقیتە کردن لە سەرما. توندبوون و سەختبوونی هێندێ شت: چیمەنتۆ یا قوڕ و قسڵەکە (ڕەقبووە).
ڕەقبوونەوە: مردن لە سەرماندا.
ڕەقشاندن: ز. ئاوڕشێن کردن.
ڕەقفاندن: بەردڕێژکردن.
ڕەق و تەق: شــوێنی خــالّی: لە خــانوویەکی (ڕەق و تەق)دا دانیشتووە. شتی ڕەق و وشک.
ڕەق و ڕەواڵ: د. ڕەقوتەق.
ڕەق و فیق: د. ڕیق و فیق.
ڕەق و وشک: شتی لەڕ و لاواز.
ڕەقە: دەعبایەکی ئاوی ڕەقی کلکدارە وەک کیسەڵ وایە.
ڕەقەڵ: ڕەقەڵە.
ڕەقەلاتن: ڕەق هەلاتن.
ڕەقەلاتوو: ڕەق هەلاتوو.
ڕەقــەڵە: گــیــانداری ڕەقی لاوازی بێ گــۆشت. کــەشکە ئەژنۆ و لوولاقی گیاندار.
ڕەقەن: زەوی سەختی بەردەلان.
ڕەقەنی: شوێنی ڕەقەن.
ڕەقەوبووگ: د. گیانداری ڕەق بووەوە.
ڕەقەوبوون: د. ڕەقبوونەوە.
ڕەق هەلاتن: وشکبوونەوە و ڕەقبوونی شت.
ڕەق هەلاتوو: شتی وشک و ڕەقەوە بوو.
ڕەق هەڵگەڕان: ڕەق هەلاتن.
ڕەق هەڵهاتن: ڕەق هەلاتن.
ڕەقیاو: ڕەقە.
ڕەقێلە: د. کەمێڵ.
ڕەقێن: ڕەقان.
ڕەقێنە: ڕەقەڵەی قاچ. کەمێڵ. کورکورۆژە.
ڕەقی: سەختی. جۆرە سابوونێکە.
ڕەقیــتــە: دەردێکە لە ساردی و گــەرمــییــەوە تووشی گــیــاندار و، ئەندامی ڕەق دەبێ.
ڕەگ: چەند لــوولەیەکــە لە جــەســتــەی گــیــانداردا کە خــوێن پێیــدا هاتوچۆ دەکا. ڕیشەی دار و درەخت و سەوزایی.
ڕەگ داکوتان: چوونە خوارەوەی ڕەگی دار و درەخت و سەوزایی. بریتییە لە مانەوە و جێگیربوونی یەکێک لە شوێنێک.
ڕەگەز: بنەماڵێکە کە (عێل)ی لێ کەوتبێتەوە. جنس.
ڕەگەزناس: ڕەچەڵەکناس.
ڕەم: سڵ.
ڕەمکار: گیاندارێکە سڵ بکا.
ڕەمکردن: سڵکردن.
ڕەمڵکردن: ڕەشکە و پێشکەکردنی چاو.
ڕەمڵگرتنەوە: گرتنەوەی ڕەمڵ بۆ دۆزینەوەی شتێکی نادیار.
ڕەمڵ لێــدان: قــســەکــردن لە شــتــێکی نادیار کــە هێــشــتــا ڕووی نەدابێ.
ڕەمڵگرەوە: کەسێکە ڕەمڵ بۆ مەردووم بگرێتەوە.
ڕەمەدانە: جۆرێکە لە گاڵ.
ڕەمەکی: شتی ڕەشۆکی.
ڕەمەن: گیاندارێکە لە ترسا هەلاتبێ.
ڕەن: زنجیرە کوڵۆشێکە بەگردی لە جێ خەرمان دادەنرێ و لە پاشا ناوەکەی پڕ دەکرێتەوە و دەکرێ بەخەرمان. ڕەند (د).
ڕەنج: ماندوێتییەکە کە لە هەوڵ و تاقەلایەکەوە تووشی مەردووم دەبێ.
ڕەنجان: دڵشکان لە شتێک.
ڕەنجاندن: دڵشکاندنی یەکێک.
ڕەنجانن: ڕەنجاندن.
ڕەنجاو: دڵشکاو.
ڕەنجبەر: کرێکارێکە کە گیرابێ بەمانگ یا بەساڵ.
ڕەنجبەری: کردنی کارێک بۆ یەکێک بەمانگانە یا بەسالانە.
ڕەنجدان: خۆ ماندووکردن و تەقەلادان لە کارێکدا.

ڕەنجدەر: ڕەنجبەر.
ڕەنجەڕۆ: کەسێکە زۆر ڕەنج بدا لە کارێکدا کەچی بێ هوودە دەرچێ.
ڕەنجەڕۆیی: ڕەنجدان لە کارێکدا و بێ هوودە بوونی.
ڕەنجیاگ: ڕەنجاو.
ڕەنجیان: د. ڕەنجان.
ڕەنجیدە: د. ڕەنجاو.
ڕەنجین: ڕەنجان.
ڕەند: مەردوومی ڕوو خۆشی قسە خۆش. زەمینێکە کە پەیا بووبێ لەناو چەمدا بەهۆی لافاوەوە.
ڕەندە: ئاسنێکی دەمپانی تیژە براوەتە ناو دارێک و دارتاش داری پێ لووس دەکا. تەنەکەیەکی کون کونی زبرە پەنیر و چەوەندەر و هێندێ شتی تری پێ ورد دەکرێ.
ڕەنگ: چۆنێتی شت لە ڕەشێتی و سپێتی و سوورێتی و... هتد. جۆر: بەم (ڕەنگ)ە واتە بەم جۆرە.
ڕەنگار: شتی پڕ ڕەنگ.
ڕەنگاڵ: ڕنگاڵ.
ڕەنگاڵە: مەلێکی ڕەنگاوڕەنگی جوانە بەقەد ڕیشۆڵەیەک دەبێ.
ڕەنگاندن: جوانکردنی شتێک بەگەلێ جۆر ڕەنگ.
ڕەنگاو: ڕنگاو.
ڕەنگاوڕەنگ: شتێکە کە گەلێ ڕەنگی پێوەبێ.
ڕەنگ بەستن: بەربەستکردنی ڕەنگ بۆ نەچوونەوەی. سەرگرتنی کارێک: ئەوکارە (ڕەنگی بەست) واتە جێگیربوو.
ڕەنگپەڕیگ: د. ڕەنگ پەڕیوو.
ڕەنگپەڕین: تێکچوونی ڕەنگ و دیمەن لە ترسا یا لەبەر نەخوشی. کاڵبوونەوەی ڕەنگی شت.
ڕەنگپەڕیو: کەسێکە ڕەنگی تێکچووبێ.
ڕەنگدانەوە: لێبوونەوەی ڕەنگ لە شتێک.
ڕەنگڕژاندن: ڕەنگرشتن.
ڕەنگڕژانن: د. ڕەنگڕژاندن.
ڕەنگرشتن: نیشانەکردنی بناغەی خانوو بەشتێک بۆ هەڵکەندن و بناغە دانەوەی.
ڕەنگرەز: د. کەسێکە کە شت ڕەنگ بکا.
ڕەنگرێژ: نقاش.
ڕەنگکردن: ڕەنگدان لە شت.
ڕەنگگرتن: بریتییە لە سەرگرتنی کارێک.
ڕەنگوارەنگ: د. ڕەنگاوڕەنگ.
ڕەنگ و ڕێس: شێوەی تەنراو بەڕەنگ و تەنینەوە: ئەم قوماشە (ڕەنگوڕێس)ێکی جوانی هەیە.
ڕەنگ و ڕێسە: د. ڕەنگوڕێس.
ڕەنگ و ڕوو: شێوە و ڕەنگی ڕوخسار.
ڕەنگە: ڕەندە. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (دەگونجێ): (ڕەنگە) بێمەلات.
ڕەنگە ڕژیلە: ه. گوڵە عەمرۆکە.
ڕەنگ هەڵبزرکان: ڕەنگ پەڕین لە ترس یا لە شەرما.
ڕەنگین: شتی ڕەنگاوڕەنگی جوان.
ڕەنە: ڕنە. ڕەندە.
ڕەو: گوریز و ڕاکردن.
ڕەوا: شایستە: ئەمە (ڕەوا) نییە. بڕکردنی قسە و فەرمانی یەکێک: فیسار کەس قسەی یا فەرمانی (ڕەوا)یە.
ڕەوابینین: بینینی شتێک بەشایستە.
ڕەوادیتن: ڕەوابینین.
ڕەواڵ: ز. کوڕێکە کە مووی لێ نەهاتبێ.
ڕەواڵ: ڕەجاڵ.
ڕەوان: شتی بێ گیروگرفت: ئەم وڵاخە (ڕەوان)ە، یا دەرسەکەم (ڕەوان)ە. گیاندارێکە کە گووی شل بێ.
ڕەوانبوون: زانین و خوێندنەوەی نووسراو بێ گیروگرفت. گوو شلبوونی یەکێک.
ڕەوانبێژ: کەسێکە نووسین و گفتوگۆی زۆر جوان و ڕەوان بێ (بلیغ).
ڕەوانبێژی: جوانی و ڕەوانی لە نووسین و گفتوگۆدا (بلاغة).
ڕەواندن: بڵاوکردنەوەی شت و تەفر و تووناکردنی: نێچیرەکان (مەڕەوێنە).
ڕەواندنەوە: بڵاوکردنەوەی شتی هاتووەوەیەک وەک پزووی سەرین و دەرپێ و قەفی گۆچان.
ڕەوانکردن: زانینی شت بەهۆی زۆر پێداچوونەوەیەوە: دەرسەکەم (ڕەوان کرد). ڕەوانەکردن.
ڕەوانن: ڕەواندن.
ڕەواننەوە: ڕەواندنەوە.
ڕەوانەکردن: ناردنی شتێک یا کەسێک بۆ شوێنێک. بەڕێ کردنی میوانێک و لە گەڵیا چوونی تا ئەندازەیەک.
ڕەوانەوە: ڕەوینەوە.
ڕەوانی: شلبوونی گووی گیاندار.
ڕەوت: ڕۆینی وڵاخ.
ڕەوڕەوە: پێچکەیەکی خڕە دەخرێتە هێندێ شتەوە بەئاسانی دەخولێتەوە و دەڕوا بەسەر زەویدا.
ڕەوسە: سوور.
ڕەوش: ز. ڕەونەق و جوانی شت.
ڕەوشەن: ڕۆشن.
ڕەوق: د. قەبارە.

ڕەوکردن: ڕۆین و بەجێ هێشتنی جێیەک لە ترسا.
ڕەوکەوان: ڕەوگەوان.
ڕەوگ: د. ڕەووگ.
ڕەوگە: شوێنێکە لە نیشتمانی یەکەمەوە بۆی بچێت و بیکەیت بەنیشتمانی دووەم (مهجر).
ڕەوگەوان: د. ڕەووگەوان.
ڕەونە: د. ڕەووندە.
ڕەووز: د. ڕێ پێڵگە.
ڕەووش: ڕەوشت.
ڕەووشت: خوو.
ڕەووگ: گەلەی وڵاخی بەرزە.
ڕەووگەوان: کەسێکە کە ڕەووگ بلەوەڕێنێ.
ڕەوونج: ڕەقیتە.
ڕەووندە: ڕێبوار.
ڕەوە: ڕەووگ. لیسێکی گەورەیە گەزۆی پێ دەتەکێنرێ.
ڕەوەک: ڕەوەکی.
ڕەوەکی: د. گیاندارێکە کە بەدەمی خۆی بلەوەڕێ و شوانی نەبێ.
ڕەوەن: کۆچەری (با). ڕێبوار (د).
ڕەوەند: ڕەوەن.
ڕەوەوان: کەسێکە کە بەدارگوێز بتەکێنێ.
ڕەویانەوە: د. ڕەوینەوە.
ڕەوێتن: ز. تاشینی شت.
ڕەویژەک: ز. تیغێکی کەوانەییە ناوی کەوچک و کاسەی پێ هەڵ دەکۆڵرێ.
ڕەوین: ڕەوکردن.
ڕەوینەوە: کرانەوە و بڵاوبوونەوەی پزووی دەرپێ و سەرین و قەفی گۆچان. لاچوونی خەو. بڵاوبوونەوەی هەور و لاچوونی. بڵاوبوونەوەی شوێنێک لە جەستە کە خرپووبێ. بڵاوبوونەوەی ژەمەنەکەرە لە مەشکەدا لە حەلێکدا کە لەکاتی کەف و کوڵدا دەستی لێ بەردرێ. قەڵەوبوون یا ئاوسانی زۆر.
ڕەه: ڕەگ (با). پەی (ز).
ڕەها: شتی ڕایی. ڕەگ (ز).
ڕەهابوون: ڕاییبوون.
ڕەهاکردن: ڕ اییکردن.
ڕەهبەر: کەسێکە کە پەیام یا ڕاسپاردەی یەکێک بەیەکێک بگەیەنێ.
ڕەهبەری: گەیاندنی پەیام و ڕاسپاردەی مەردووم.
ڕەهڕەو: ڕاڕەو. ڕێبوار.
ڕەهندە: دەربەدەر.
ڕەهندەیی: دەربەدەری.
ڕەهواڵ: ز. ڕەهوان.
ڕەهوان: وڵاخی خۆش ڕەوت.
ڕەهەنە: د. ڕەهندە.
ڕەهیسیابۆ: با. لاسکی گیایەکی تام خۆشە دەکرێتە ناو ماستەوە.
ڕەهێڵ: ڕەهێڵە.
ڕەهێڵبوون: لنگە و قووچکەوتن بەهۆی هەڵەنگووتنەوە.
ڕەهێڵکردن: لنگە و قووچخستنی یەکێک.
ڕەهێڵە: بارانی لێزمە و بەخوڕ.
ڕێ: ڕێگا. پیتێکە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
ڕیاڵ: جۆرە دراوێکی دەوڵەتییە.
ڕیان: گووکردن.
ڕێبار: با. باخ.
ڕێباری: با. هاوڕێیی.
ڕێباز: ڕێگا.
ڕێبازگە: مذهب.
ڕێبڕ: جەردە.
ڕێبڕی: جەردەیی.
ڕێبڕین: ڕێبڕی.
ڕێبگار: ڕێبوار.
ڕێبوار: کەسێکە بە ڕێگادا بڕوا.
ڕێ بەدیکردن: بریتییە لە شارەزایی و سەر لێ دەرچوون لە شتێک: فیسار کەس لە خوێندندا (ڕێ بەدی) دەکا واتە شتێکی لێ دەزانێ.
ڕێبەر: باخچە. جەردە (ز). ڕەهبەر (با).
ڕێ بەرخستن: ڕێگا خستنە بەر یەکێک کە پێی گران بێ.
ڕێ بەرنان: پیشاندانی ڕێگایەکی خراپ بۆ یەکێک: ئەم (ڕێیە مەنێرە بەرم). ڕێ بەرخستن.
ڕێ بەندان: کانوونی دووەم.
ڕێ بیر: بیروباوەڕێکە کە مەردووم لە سەری بێ (مبدأ).
ڕێ پێبردن: دۆزینەوەی نهێنی شاراوە.
ڕێ پێگرتن: چوونە سەر ڕێی یەکێک بۆ بەگژداچوونی.
ڕێ پێڵگە: ڕەپێڵگە.
ڕێتن: ڕیتن.
ڕێ تێچوون: گونجان و بەرداشتی شتێک بۆ شتێک: (ڕێی تێ دەچێ) کە نەریمان ببێ بەپیاوێکی گەورە.
ڕێ تێکەوتن: چوونە جێگایەک بەرێکەوت. دۆزینەوەی مەبەستی شتێکی نادیار بەرێکەوت.

ڕێجە: د. ڕێژە.
ڕێچ: ز. جێگا پێ. ڕۆینی گیاندار.
ڕێچکە: ڕیزێکە لە گیاندار کە قەتارەیان بەستبێ. باریکە ڕێ.
ڕێچکەبەستن: قەتارە بەستنی گیاندار.
ڕێچکەکردن: ڕێچکەبەستن.
ڕێحانە: گیایەکی گەڵا پانی ڕەشی بۆنخۆشە.
ڕێحانە ئەستەمووڵی: جۆرە ڕێحانەیەکی گەڵا وردی سپییە.
ڕێحانە کێویلە: جۆرە ڕێحانەیەکی دەشتی بۆنخۆشە.
ڕێخ: د. وردە چەو.
ڕێخت: د. سروشت.
ڕێختمان: ئەو کەرەسەیەیە کە شتی لێ دادەڕێژرێ: فیسار کەس (ڕێختمان)ێکی باشی هەیە.
ڕێختە: ڕەختە.
ڕێخستن: ڕێکخستن.
ڕێخەر: کەسێکە کە شت ڕێک بخا.
ڕێخەڵۆ: ڕیخۆڵە.
ڕێدار: ڕێبوار.
ڕێ داگرتن: مل نان و بەئاسانی بەڕێدا ڕۆیشتن.
ڕێدان: ڕێگا کردن.
ڕێدەر: مفتی.
ڕێرۆ: ڕێبوار.
ڕێرەو: کاتی بەڕێدا ڕۆین: مەگەر بە(ڕێرەو) بتبینم، واتە مەگەر لە ڕێ ڕۆیندا. ڕێبوار.
ڕێرێ: زەوییەکە کە ئاو ناوبەناو دریبێ. تەنراوێکە ناوبەناو چووبێ و ڕایەڵی دەرکەوتبێ. تەنراوێکە کە پویەکەی ناو بەناو جووت نەبووبێ.
ڕێز: ڕیز (ز). وردە بەرد (د). حورمەت.
ڕێزاڵ: پارچەیەکی پچووک لە شتێک.
ڕێزاڵ ڕێزاڵ: شتی هەلا هەلا.
ڕێزان: شارەزای ڕێگاوبان.
ڕێزاڵانە: د. ڕێزاڵێک لە شتێک.
ڕێزۆڵە: د. ڕێزاڵانە.
ڕێزە: نەختێک لە شتێک: ڕێزەیەک نانی بەرێ. ئەندازە: تۆ نەگەیشتوویتە ئەو (ڕێزە)یەی لە خۆتەوە شت بکەیت.
ڕێزەڕێزە: هەلا هەلا.
ڕێزەڵۆک: بەردێکە کە لە خۆیەوە هەڵوەرێ.
ڕێزەڵە: ڕەزەڵە
ڕێزە و پێزە: د. وردەیەکە کە لە شت دەبێتەوە.
ڕێزەووڵ: شتێکە کە بە وڵێن ڕێزە ڕێزە بووبێ.
ڕێژاف: با. ڕێژاو.
ڕێژان: ڕشتنی شت: ئاوەکەی (ڕێژا). پیت و بەرەکەت (د).
ڕێژاو: تاڤگە.
ڕێژگاو: ڕیژگاو.
ڕێژگە: جێگای لێوە ڕژانی شت.
ڕێژوو: خەڵووز.
ڕێژە: د. بەردێکە کە شووشەی لێ دروست دەکرێ. بۆتە.
ڕێژەن: پیت و برشت: خەلەی ئیمساڵ بە(ڕێژەن)ە.
ڕێژەو: ڕێژەن.
ڕێس: ریس: ئەم قاڵییە ڕەنگ و (ڕێس)ێکی جوانی هەیە، (ڕێسراو) خوری یا دەزوو یا موویەکە کە بەتەشی یا بەخەرەک ڕێسرابێ. ئەستووراییی مل: پێی نایە (ڕێس)ی ملی.
ڕێسپی: ز. گەورەی دێ. ریش سپی.
ریسوا: کەسێکە کە ئابرووی چووبێ، (ریسوابوون) ئابرووچوون (ریسوا کردن) ئابرووبردن.
ریسوایی: نەمانی ئابروو.
ڕێسە: درێژە دان بەشت (اطناب).
ریشوە: ریشوو.
ڕێڤینگ: با. ڕێبوار.
ریڤیگ: با. ریخۆڵە.
ریڤینگ: با. ڕێڤنگ.
ڕێڤینگ: با. ریڤینگ.
ڕێق: د. ریق.
ریقنە: گووی باڵندە. بریتییە لە ریپۆقی چاو.
ڕێک: شتی ڕاستی بێ گرێ و قۆرت. ڕێگا (با).
ڕێکایی: عاستی ڕێکی و تەختی شت.
ڕێکبوون: بێ گرێ و قورتبوونی شت. بریتییە لە ئاشنایەتی و تێکەڵی لەگەڵ یەکێکدا.
ڕێکخستن: ڕاستکردنەوە و ریزکردنی شت. جێبەجێکردنی کارێک بەڕێکوپێکی.
ڕێککردن: ڕێکخستن.
ڕێککەڤتن: د. ڕێککەوتن.
ڕێککەوتن: ڕێکەوتن.
ڕێکوپێک: شتی ئامادەی ڕێکخراو.
ڕێکۆک: کۆڵانی باریک.
ڕێکەوت: هەل: مەگەر بە(ڕێکەوت) بتبینم.
ڕێکەوتن: یەککەوتنی چەند کەسێک. جێبەجێبوونی کارێک. هەڵکەوتنی هەل (تصادف).
ڕێکەوتوو: شتی ئامادە و ساز. شتی جێبەجێ بوو.
ڕێکی: بوونی شت بە ڕێک. تێکەڵی.

ڕێگا: شوێنێکە کە گیاندار پێیدا بڕوا.
ڕێگاوبان: ڕێ و بان.
ڕێگا کردن: ڕێدان بەیەکێک بۆ ڕۆیشتن.
ڕێگر: جەردە.
ڕێگرتن: بەرهەڵست وەستانی شتێک لە ڕێیەکدا.
ڕێگری: جەردەیی.
ڕێ گومکردن: ڕێ ونکردن.
ڕێگە: ڕێگا. کێڕێگە لە چیغ دروست دەکرێ لە چەشنی ڕێگا.
ڕێگەخستن: د. خستنەڕێ.
ڕێگەکەفتن: د. کەوتنە ڕێ.
ڕێگەگیر: د. ڕێگر.
ڕێگەوبان: ڕێگاوبان.
ڕێگیر: جەردە.
ڕێگیری: ڕێگری.
ڕێل: با. لێڕەوار.
ڕێ لەبەرچوون: ڕێ بڕین بەئاسانی.
ڕێڵە خۆ: د. ڕیخۆڵە.
ڕێلی: گۆێژ.
ڕێن: ڕدێن.
ڕێنامە: بەرنامە.
ڕێنج: ڕەنج.
ڕینجبەر: ڕەنجبەر.
ڕینجەبر: ز. ڕەنجبەر.
ڕینک: لەڕی لاوازی بێ هێز.
ڕێنکە: د. کۆبوونەوەی چەند کەسێک.
ڕێنکەدان: د. کۆمەڵەبوونی گیاندار.
ڕینگ: ڕنگ.
ڕێنگ: خورییەکی کورتە کە لە پێستە دەسکەنە کرابێ.
ڕێنگاڵ: د. ڕنگاڵ.
ڕینگانەوە: ڕینگە ڕینگ کردن. ڕنگاڵ: دەردانی شتی شیلەدار، هەنگوینە کە بخەرە سەر سەبەتەکە با (بڕنگێتەوە).
ڕینگەڕینگ: زۆر وتنەوەی شتێک بەبێ هوودە: بەس (ڕینگە ڕینگ) بکە.
ڕینگەڕینگکەر: کەسێکە زۆر ڕینگە ڕینگ بکا.
ڕێنما: د. نیشانەیەکە لەسەر ڕێگا دادەنرێ بۆ پیشاندانی ڕێبوار.
ڕێ نوێن: ڕێ نیشاندەر.
ڕێنوێنی: ڕێ نیشاندان.
ڕێ نیشاندان: بریتییە لە ئامۆژگاری کردن بۆ سەر ڕێی ڕاست.
ڕێو: د. کەڵەک و فێڵ.
ڕێوار: د. ڕێبوار.
ڕێواز: د. ڕێ پێڵگە. ڕێباز.
ڕێواس: گیایەکی کوێستانی بەهاری گەڵاپانە نێرکێکی خڕی ناسکی خۆشی هەیە.
ڕێواسی: گیایەکی کوێستانی بەهارییە گەڵای لە (کاڵا قنگ) دەچێ بەڵام ئەم لاسکی باریکترە گەڵاکەی بۆ کوشتنی کرم دەخورێ.
ڕێوان: پۆلیسی سەر ڕێگا.
ڕێوبان: ڕێگایەکە کە هاتوچۆی زۆری بەسەردا کرابێ.
ڕێوڕا: ڕێوڕاست.
ڕێوڕاست: ڕاستەوخۆ: ئەگەر وا بڕۆیت. (ڕێوڕاست) دەچیتە فیسارە شوێن.
ڕێوشوێن: پلان و نقشەی شت.
ڕێ ونکردن: بریتییە لە سەر لێ شێوان.
ڕێوەنگی: ز. ڕێبوار.
ڕێوی: گیاندارێکی کێوی چوار پێی تووکنی کلک فشی گوێ قوتی فێڵبازە لە کەروێشک گەورەترە. ڕێبوار. (ز).
ڕێوی پێچ: فێڵ و تەڵەکە.
ڕیە: با. ڕیش.
ڕیەسپی: با. ڕیش سپی.
ڕێهەڤ: هاودەم.
ڕیپ: فێڵ (ز). تەکان (د).
ڕیپاڵ: شتی دڕاوی چڵکن.
ڕیپۆ: فێڵباز.
ڕیپۆق: چڵکی چاو. چڵمی وشکەوە بوو.
ڕیپوکار: ڕیپۆ.
ڕیپۆڵ: مەردوومی پۆخلی بێکارە. کالای شڕی هەلا هەلا: (ڕیپۆڵ)ێک کالای لەبەردا نییە.
ڕیت: د. تەکان. شڕە و کۆنە.
ڕیتاڵ: شیاکە. کەسێکە کە هەر گەشتوگوزار بکا (سیّاح).
ڕیتاڵە: ڕیتاڵ.
ڕیتک: د. ڕیت.
ڕیتک و پیتک: د. پڕ و پیت.
ڕیتکە: فریشک.
ڕیتن: ڕشتنی شت. ڕیان (ز).
ڕیت و پیت: د. ڕیتک و پیتک.
ڕیتە: شتێکە کالای خوری پێ دەشۆرێ.
ڕیچ: دانی گڕ. گیانداری گڕ.
ڕیچال: ز. میوەی پەروەردە لەناو شیلەی شەکردا کە پێی دەڵێن (مرەبا).

ڕیچبوونەوە: دان چیرکردنەوە. چاو بزکردنەوە لە یەکێک.
ڕیچکردنەوە: ڕیچبوونەوە.
ڕیچەو کردن: د. ڕیچکردنەوە.
ڕیخ: شیاکە. لم.
ڕیخن: گیانداری پیسی گەمژ.
ڕیخنە: ڕیخن. ڕیپۆق.
ڕیخۆڵە: شتێکی باریکی درێژە لە سکی گیانداردا پیسی تێ دەچێ.
ڕیخۆڵە ئەستوورە: ڕیخۆڵەیەکی گەورەیە بەدەم ڕیخۆڵەی باریکەوە.
ڕیخۆڵەباریکە: ڕیخۆڵەیەکە لە پێش ڕیخۆڵە ئەستوورەوە.
ڕیخۆڵە کوێرە: سەرە ڕیخۆڵەیەکی پچکۆڵەیە بەڕیخولەی گەورە و، ئەو سەری بێ کونە کە شتی تێ چوو بۆگەن دەکا و ئەگەر فریای نەکەون گیاندارەکە دەکوژێ.
ڕیخەخۆرە: د. باڵندەیەکە هەر زیخ دەخوا.
ڕیخەڵان: زیخەڵان. شوێنێکە کە شیاکەی زۆری تێدا بێ.
ڕیخەڵۆک: ڕیخۆڵە.
ڕیخەڵوو: ل. ڕیخۆڵە.
ڕیز: چەند شتێکە بەقەتارە کە پاڵیان دابێتە یەک. حورمەت و پایەی مەردووم.
ڕیزبوون: پاڵدانی چەند شتێک بەیەکەوە بەڕێکی.
ڕیز پێوەگرتن: بەڕیزهاتن بەسەر چەند شتێکدا بەبێ بوواردنیان.
ڕیزکردن: دانانی چەند شتێک لە تەنیشت یەکەوە بە ڕیز.
ڕیزکێن: ڕیزێن.
ڕیزلێگرتن: ڕیز پێوەگرتن. حورمەتگرتنی یەکێ.
ڕیزلێنان: حورمەتگرتن.
ڕیزێن: یاری سێ ڕیزکێن یا نۆ ڕیزکێن کردن.
ڕیژگاو: کەسێکە بەخۆڕایی دووی مەبەستێکی هیچ و پووچ کەوتبێ.
ڕیژگاوی: خەڕۆیی و دواکەوتنی شتی هیچ و پووچ: ئەمە (ڕیژگاوی) پێ دەڵێن.
ڕیس: خوری یا موو یا لۆکەی ڕێسراو.
ڕیس و گوریس: بریتییە لە کردار یا گوفتارێکی دوور و درێژ: من تاقەتی ئەم (ڕیس و گوریسە)م نییە.
ڕیسی: ز. گزرەگیا.
ڕیش: مووی عاستی سەر شەویلە و چەناگە. زیبکەی ئەندام (ز).
ڕیشاڵ: ڕیشووی بەربووەوەی شتی دڕاو، (ڕیشاڵ ڕیشاڵ ڕیشاڵی زۆر.
ڕیشالۆک: تەرخون.
ڕیشاڵە: ڕیشاڵ.
ڕیشبابا: جۆرەترێیەکی سپییە.
ڕیشباوا: د. ڕیشبابا.
ڕیشخەن: گاڵتە و قەشمەری: (ڕیشخەن) بەکەس مەکە.
ڕیشدار: گیانداری خاوەن ڕیش.
ڕیش سپی: بریتییە لە دەمڕاست و قسەڕەوای کۆمەڵێک.
ڕیشگاو: ڕیژگاو.
ڕیشگاوی: ڕیژگاوی.
ڕیشۆڵ: د. ڕیشوو.
ڕیشۆڵە: باڵندەیەکی ڕەشی کونجی دەنوک درێژە لە چۆلەکە گەورەترە و بەگەڵێک جۆر دەخوێنێ. ڕیشۆڵ (د).
ڕیشوو: تاوی بادراوی جامانە و مشکی و هێندێ شتی تر.
ڕیشە: ڕەگی سەوزایی و درەخت. ڕەگی ئەندام. ڕیشوو (د).
ڕیشە بڕبوون: بریتییە لە بڕانەوەی خێزان یا تیرەیەک.
ڕیشەبن: د. شتێکە لە بنج و بن هاتبێتە دەرەوە.
ڕیشەداکوتان: ڕوان و ڕەگ داکوتانی سەوزایی. بریتییە لە جێگیربوونی یەکێک لە شوێنێکدا.
ڕیشەدەرهاتن: بریتییە لە کەنەفت بوونی یەکێک بەهۆی شتێکەوە: (ڕیشەم دەرهات) بەدەست تۆوە.
ڕیشە دەرهانین: بریتییە لە کەنەفتکردنی یەکێک.
ڕیشە دەرهێنان: ڕیشە دەرهانین.
ڕیشەکەشکردن: ڕیشەکێشکردن.
ڕیشەکەن: ڕیشەکێش.
ڕیشەکێش: گیاندار یا درەختێکە کە ڕیشەی دەرهاتبێ، (ڕیشەکێش بوون) ڕیشە دەرهاتنی شت، (ڕیشە کێشکردن) ڕیشە دەرهێنان.
ڕیشەی جگەر: بریتییە لە منداڵی خۆت.
ڕیشی: ز. ڕیشوو.
ڕیڤیک: ڕیخۆڵە.
ڕیق: شتی نەرمەلیقەی تەنک.
ڕیق و فیق: شتی زۆر تەنکی نەرمەلیقە.
ڕیقووڵە: د. شتی ڕەقەڵە.
ڕیکە: د. کیرەی دان یا قەڵەم.
ڕیکەڕیک: ڕیکەی یەک لە دوای یەک.
ڕیگ: شتێکی وشکی وردی بریسکەدارە دەکرێ بەسەر نووسراوادا بۆ وشک بوونەوەی.
ڕیگی بیابان: جۆرە لمێکە لە دوورەوە دەبریسکێتەوە وەک ئاو.
ڕیل: ژاڵە.
ڕین: ڕیان. دەنگدانی سەگ (ز).
ڕیواو: هـ. ڕێواس.

ریبۆن: هـ. ڕێحانە.
ریوەریوو: رینگەرینگ.
ریوەریوکەر: کەسێکە قسە زۆر برینگێنێتەوە.
ریوەڵە: گیانداری لەڕی لاواز.
ریوەن: بنکی ڕێواسەکە بۆ ڕەوانی دەدرێ بەمەردووم.



زا: بەچکە: (زا)ی لە سکدایە.
زابووق: ز. سەرە نوێلک. دۆڵ و دەرەیەکە کە ئاوی باراناوی پێدا بڕوا.
زابەند: دەفــتــەرێکە کــە هەر ناوی منداڵی تازەبووی تێــدا بنووسرێ.
زاپان: ل. سافسافێن.
زات: نەترسان و ئازایی: فیسار کەس زۆر بە(زات)ە.
زاتبردن: بریتییە لە ترساندنی یەکێک.
زاتچوون: بریتییە لە ترسان.
زاتدار: گیانداری بەجەرگی چاو قایم.
زاتکردن: نەترسان و وێران بۆ کردنی شتێک.
زاج: دەرمانێکی سپییە دەکرێتە ئاو و چەرمی پێ ڕەش دەکرێ.
زاج و پەرچەم: پەرچەم و ڕیزەمووەیەکە دەهێـڵـرێتـەوە بەکـەناری سەری کوڕی منداڵدا بەرێکی لەبەر جوانی.
زاخ: شـتـێکی سـپی یا زەردی ترش و تفـتـە وەک خـوێ لە کـان دەردەهێنرێ. کەورگ (د). تاوێری گەورە (د).
زاخـاو: بریتـییــە لە داخ و خـەفـەت: ئەوەندە (زاخـاو) مـەکـە بەدڵمدا. دەرمانێکە دەگیرێتەوە بەزاخ بۆ مشتومالّی تیغ.
زاخاودان: زاخاودانەوە.
زاخاودانەوە: مشـتومالّکردنی شیر و خەنجەر بەزاخاو. بریتـییـە لەپێ خۆشبـوونی دڵ بەتووشبـوونی دوژمنت بەناخۆشییـەک: بەدەرکردنی فـیـسـار کەس دڵم (زاخاو درایەوە). بریتـییـە لە تەمـاشـا کردنی یەکـێک بۆ یەکـێکی جـوانی دڵـبـەر: ئەوەندە تەماشای فیسارە ئافرەتی کرد (زاخاوی) چاوی خۆی دایەوە.
زاخدار: تیغی جەوهەردار. بریتییە لە مەردوومی بەجەوهەر.
زاخڕ: ناودەرەیەکی سەرەولێژی بەردەڵانی.
زاخــۆ: جــۆرە پاڵـتــۆیەکــە لەبەر دەکــرێ. ناوە بۆ شــارێک لە کوردستانی عێراق.
زاخۆن: زاخە.
زاخوور: ئەشکەوت.
زاخە: ژێرزەمین.
زاخێ: د. قشقەرە.
زاخێر: زاخڕ.
زاد: ئەو خواردنەیە کە پێی بژیت.
زاد دان: توێشەبەرە.
زادە: زا.
زادەگان: نەوەی خانەوادە.
زار: دەم. دوو بەری شەش ڕووە هەر ڕووەی چەند خاڵێکی تێدایە یـاری پێ دەکــرێ. دەنگی گــریان. ژار: (زار)ی چاوی تێ ڕشت. خەفەتباری دڵتەنگ. وتەیەکە بە دوای هێندێ وشەوە کە نرا شـوێنی ئەو شتە پێشـان دەدا: گوڵ (زار)، لالە (زار) میرغو (زار) واتە شوێنی گوڵ و لالە و مێرگ.
زاراوە: اصطلاح.
زاربەست: زاربێن.
زاربێن: پەتێکە دەمی مەشکە و هیـزە و کوندە و هەمـانە و شـتی تری پێ دەبەسترێ.
زارخەنە: د. پێکەنینێکە کە بە ڕق و قینەوە بێ.
زاردڕاو: دەم دڕاو.
زارۆ: با. منداڵ.
زارۆک: ز. منداڵ.
زارۆڵە: هـ. منداڵ.
زارگا: بەرموسڵدان.
زارنەرم: ز. زبان لووس.
زار نەرمی: ز. زبان لووسی.
زارۆ: ز. منداڵی پچووک.
زارۆک: با. زارۆک.
زاروو: زەروو.
زارووک: با. منداڵدان.

زاره: د. گەنمی نیوە هاڕدراو (د). زراو. بریتییە لە مەردوومی بەجەرگ.
زارە ترەک: کەسێکە لە ترساندا تۆقی بێ، (زارەترەکبوون) تۆقین لە ترساندا، (زارەترەککردن) ترساندن و تۆقاندن.
زارەزار: دەنگی گریان.
زارەگا: زارگا.
زارەوانە: زاربێن.
زاریان: د. گریان.
زاری: شیوەن و گریان.
زازا: بەچکەی بەچکە. تیرەیەکە لە کورد لە ڕۆژاوای کوردستانی تورکیا دایە.
زاغ: ز. کێڕ و خەت.
زاغۆر: ز. زاخڕ.
زاغوری: ز. مشکی سەر.
زاڤا: ز. زاوا.
زاق: د. زەق. ڕەنگی کاڵ.
زاق و رووق: دەنگە دەنگی منداڵ.
زاقوزیق: زاق و زووق.
زاکوزووک: زاق و زووق.
زاکوزیک: زاقوزیق.
زاکە: جۆرە دەنگێکە دێ لە هێندێ گیاندارەوە لەکاتی زۆر بۆ هاتنیدا، (زاکە زاک) زاکەی یەک لە دوای یەک.
زاگ: د. زا.
زال: ز. هەزار.
زاڵ: گیانداری زۆردار.
زاڵبوون: زۆر سەندنی گیاندارێک بەسەر گیاندارێکی تردا.
زالۆ: زراو.
زالوو: زەروو.
زاڵە: د. زراو.
زاڵی: زاڵبوون.
زام: برین.
زاما: زاوا.
زامار: بریندار.
زامدار: زامار.
زامەت: کێم.
زان: بەچکە بوونی گیاندار. وتەیەکە بە هێندێ وشەوە کە نرا دەیکا بە(اسمی فاعل) زۆر(زان)، فرە(زان)، هیچ نە(زان)، پێ نە(زان).
زانا: خوێندەواری شارەزا.
زاناندن: زانین.
زاناهی: زانایی.
زانایی: شارەزایی و خوێندەواری.
زانست: زانای شارەزا. زانین و شارەزایی: فیسار کەس بە(زانست)ە.
زانستگا: زانستگە.
زانستگە: زانستگایەکە دوای سانەوی تێدا دەخوێنرێ.
زانستی: علمی.
زانوو: زەنگۆڵ. گونج یا لوولەی ئانیشکەدار.
زانەخرۆ: زیانەخرۆ.
زانەر: زانا.
زانیار: زانا.
زانیاری: مەعاریف.
زانین: ئاشکرایی و نمایانییەکە پەیدا دەبێ بۆ مەردووم لە کاتی بینین یا بیستنی شتێکدا.
زاو: گیانداریکی مێینەیە کە تازە بەچکەی بووبێ.
زاوا: کەسێکە تازە ژنی هێنا بێ. مێردی خزمی نزیک: فیسار کەس (زاوا)مانە لە کاتێکدا کە خوشکت یا خوشکەزات یا یەکێکی نزیکت ژنی بێ.
زاوزۆ: زاوزێ.
زاوزوو: سککردن و منداڵبوون.
زاوزووە: زاوزوو.
زاوزێ: سککردنی مێینە یەک لە دوای یەک.
زاوما: تێکەڵکردنی کار و بەرخی ساوایە لەگەڵ دایکیاندا لە بەیانییەوە تا ئێوارە: ئیمرۆ مەڕ و بەرخ (زاوما)یە.
زاوور: زراو. زات: فیسار کەس بە(زاوور)ە.
زاوورچوون: زراوچوون.
زاوە: د. تیر. ئەستێرەی عەتارید.
زاوەرە: د. زاوور.
زای: زاخ.
زایڵە: د. زایەڵە.
زایە: زا: فیسار کەس (زایە)ی لە سکە.
زایەبوون: بریتییە لە مردن.
زایەکردن: بەخشینی شتێک بەکەسێک.
زایەڵە: گریان و زاری.
زایچە: ڕاپۆرتی لە دایکبوونی منداڵ.
زایگە: شوێنێکی تایبەتییە کە منداڵی تێدا لە دایک دەبێ.
زاین: زانی گیاندار.
زبارە: ز. هەرەوەز.
زبان: پارچە گۆشتێکی پانی پفەڵە لە دەمدا قسەی پێ دەکرێ و پارووی پێ ئەم دیو و ئەودیو دەکرێ و تامی خواردەمەنی پێ دەچێژرێ. وتاری تایبەتی هەموو گەلێک کە قسەی پێ دەکەن و شتی پێ دەنووسن: زبانی کوردی (زبان)ێکی خۆش و زیندووە.

زبان بەد: کەسێکە کە دەربارەی مەردووم هەر بەد بڵێ.
زبان بەدی: بەدی وتن دەربارەی مەردووم.
زبانپاک: کەسێکە دەربارەی مەردووم هەر باش بڵێ.
زبانپاکی: بریتییە لەناو نەبردنی کەس بەخراپە.
زبانپیس: بریتییە لە جوێن فرۆش.
زبانپیسی: بریتییە لە جوێن فرۆشی.
زبانتاڵ: د. بریتییە لە مەردوومی قسە ڕەق.
زباندرێژ: بریتییە لە کەسێک کە لە ئەندازەی خۆی زیاتر و بەرەو ژوورتر دەربارەی مەردووم بدوێ.
زباندرێژی: بریتییە لە قسەی ناشیرین کردن دەربارەی یەکێک.
زبانزان: کەسێکە کە چەند زبانێک بزانێ.
زبانشکان: لە قسەکەوتنی مەردووم بەهۆی نەخۆشییەکی زۆر قورسەوە.
زبانشیرین: بریتییە لە یەکێک کە قسەی خۆشبێ لەگەڵ مەردوومدا.
زبانگرتن: هاتنە زبانی منداڵ. بریتییە لە قسەکردن بەبێ شەرمی: فیسار کەس چاک (زبانی گرتووە) واتە قسە بەبێ پەروا دەکات.
زبانگەستن: بریتییە لە پەشیمانبوونەوە و خەفەتخواردن بۆ شتێک کە لە دەستت چووبێ.
زبانگیران: زبان شکان. گیرانی زبان بە هۆی لاڵییەوە: فیسار کەس لە قسەکردندا (زبان دەگرێ).
زبان لووس: بریتییە لە کەسێک کە بەزبانی خۆش مەردووم لاس بدا.
زبانە: سەری دارێکی لە لە کراوی دادراوە بۆ ئەوەی کە بکرێ بەکونی دارێکی تردا، ئاسنێکی باریکە لە ئاوزوونەدا دەچێ بەکونی قایشدا. بڵێسەی ئاگر.
زبانە بچکۆلە: پارچە گۆشتێکی باریکە لەناو قوڕگدا.
زبر: شتێکە کە لووس نەبێ. شتی درشت: ئەم ساوەرە (زبرە) واتە درشتە.
زبران: شوێنی بەردەڵانی.
زبرە: سەر کۆزەری ساوەر و قەرەخەرمانی هاڕراو: (زبرە)ی ساوەرەکە بهاڕەرەوە.
زبری: بوونی شت بەزبر.
زبڵ: خۆڵ و خاش و پووش و پەلاشی ناوماڵ.
زبڵچی: کەسێکە کە زبڵی ئاوایی کۆ بکاتەوە و فڕێی بدا.
زبڵدان: سەرە نوێلک.
زبڵڕێژ: زبڵچی.
زبڵکێش: زبڵچی.
زبڵگە: زبڵدان.

زپکە: زیپکە.
زپک: ز. زیپکە.
زچ: دەعبایەکی سوورکەڵەی پچووکی چنگنە بەئاژاڵەوە دەنووسێ.
زر: ز. زل.
زرازر: ز. زەڕەزەڕ.
زراف: باریک (با). شتی ورد (ز).
زرانی: ئەژنۆ.
زراو: ئاوێکی زەردی تاڵە و لەناو توورەگەیەکدا بەدەم سی و جگەرە و هەمیشە دڵۆپ دڵۆپ دەڕژێ بەسەر خواردنی ئاشک (معدە)دا بۆ ئەوەی کە زوو بتوێتەوە.
زراوبردن: بریتییە لە تۆقاندن.
زراوتۆقین: بریتییە لە زۆر ترسان.
زراوچوون: زراوتۆقین.
زرب: د. زبر. شتی زل و قەبە.
زربان: د. شوێنی بەردەڵانی.
زربە: د. زبرەی شت.
زربی: د. زبری.
زرت: خۆهەڵکێشان (ز). مەردوومی زیت.
زرتۆڵە: گاڵتەکردن بە یەکێک.
زرتە: زەقەی چاو: (زرتە)ی چاوی دێ، (زرتەزرت) زەقە زەقی چاو.
زرتەبۆز: بریتییە لە مەردوومی زەبەللاح.
زرتەک: ز. کەسێکە کە خۆی هەڵبکێشێ.
زرتی: د. بێکارەیی و هیچ لێ نەهاتوویی.
زڕ: درەختی بێ بەر. شتی وشک: قەرە خەرمانەکە (زڕ) بووە.
زڕان: بڵاوبوونەوە و دەنگدانەوەی باسێک لەناو مەردوومدا.
زڕاندن: بڵاوکردنەوەی باسێک بەناو مەردوومدا. زرنگە زرنگ کردن بەشت.
زڕانەوە: دەنگدانەوەی زەنگوڵە و جام و هێندێ شتی تر.
زڕباب: زڕباوک.
زڕباوک: باوەپیارە.
زڕبرا: برای دایکی.
زڕت: جڕت.
زڕخوشک: خوشکی دایکی.
زڕخەسوو: باوەژنی ژن بۆ مێرد و باوەژنی مێرد بۆ ژن.
زڕداک: زڕدایک.
زڕدایک: باوەژن.
زڕزڕە: د. شتێکە منداڵان بەدەستییەوە دەگرن و زڕەزڕی پێ دەکەن.
زڕکتک: زڕکێتک.
زڕ کچ: کچی ژن لە مێردێکی تری و کچی مێرد لە ژنێکی تری.

زڕ کوڕ: کوڕی ژن لە مێردێکی تری و کوڕی مێرد لە ژنێکی تری.
زڕکێتک: با. زەردە زیڕە.
زڕگوێز: دارێکی گەورەیە وەک دارگوێز بەڵام گەڵای باریکە و بێ بەرە. ناوە بۆ دوو دێی خـوار و ژوور لە دەسـتـە ڕاسـتـی ڕۆژئاوای سلێمانییەوە.
زڕمام: برای دایکی باوک.
زڕنا: زوڕنا.
زڕنوچقاو: چەورییەکی کەمە کە دەکەوێتە سەر چێشتی شلە.
زڕنووقاو: زڕنوچقاو.
زڕ و زنگیانە: متوموورووو.
زڕە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی پارە لە کاتی ژماردنیدا، (زڕە زڕ) زڕەی یەک لە دوای یەک (زڕ و هووڕ) زڕەزڕی زۆر.
زڕە بلبل: جۆرە باڵندەیەکی بۆرە لە فیسقەگولە گەورەترە وەک بلبل دەخوێنێ.
زڕەکەو: سوێسکە. پۆڕ (د).
زڕەوەلی: هـ. گیایەکی درێژی تۆکمەیە وەک قامیش وایە لە گوێ ئاو دەڕوێ.
زڕیان: د. زڕان.
زڕیانەوە: د. زڕانەوە.
زرقتک: ز. جۆرە مێشێکی زەردە بەقەد هەنگێک دەبێ.
زرک: کاڵەکی نەگەیو.
زرکۆ: د. گزرە گیایەکە بۆ ئاژاڵ دابنرێ.
زرکوزینگ: د. چوست و چالاک.
زرکە: زرک.
زرکەتاڵ: جۆرە کاڵەکێکی زرکی تاڵە.
زرکێتک: با. زڕکێتک.
زرم: د. زرمە.
زرم و کوت: تەپ و هووڕ.
زرمە: دەنگێکە لە لێکەوتنی شتێکی قورس لە شتێکی تر کە دەنگ نەداتەوە پەیدا دەبێ، (زرمەزرم) زرمەی یەک لە دوای یەک. (زرم و هووڕ): زرمەزرمی زۆر.
زرمەزلێ: خۆ بەسەریەکا دان و زرمەزرمکردنی چەند کەسێک.
زرنگ: مەردوومی زیرەکی وریا. ڕۆنی قاڵی شل.
زرنگانەوە: زڕانەوەی دەفرێک کە لە مس یا لە زەرد یا لە زیو دروست کرابێ. زڕانەوەی گوێ. ڕوونبوونەوەی شتی شل بەنیشتنی خڵتەی: ئاوەکە یا ڕۆنەکە (زرنگاوەتەوە). بەناودا چوون و دەرنگبوونی شەو: شەو تا (نەزرنگێتەوە) خەوم لێ ناکەوێ. کزربوونەوەی شتی تەڕ.
زرنگە: دەنگدانەوەی زێڕ و زیو و مس و زەرد لە کاتی کەوتنی شتێک لێیان (زرنگە زرنگ) زرنگەی یەک لە دوای یەک (زرنگ و هووڕ) زرنگە زرنگی زۆر.
زرنگی: وریایی و چالاکی.
زروو: د. زبری ڕووش. درشت.
زرووقان: ز. ڕەوکردنی گیاندار لە ترساندا.
زرووقانەوە: پێکەنینی منداڵ.
زرووکە: دەنگی باڵندەی پچووک.
زرووکە زرووک: زرووکەی یەک لە دوای یەک.
زروە: گیایەکی کوێستانییە گەڵای وەک (تەری) وایە (هـ). درشتەی شت (د).
زروێ: زروی.
زروی: هـ. ئەسپۆن.
زرۆیی: ئەسپۆن.
زرە: ز. زرێ.
زرەقیان: د. پێکەنین بەدەنگی بەرز.
زرەک: ولاخێکە کە ڕەشێنەی چاوی سپی بێ.
زرەکبوون: بەشەوارەکەوتنی بزن و مەڕ بەهۆی بروسکەوە.
زرێ: کالایەکی جەنگییە لە زریزەی ئاسن دەتەنرێ و لە جەنگدا لەبەر دەکرێ بۆ ئەوەی شیر و تیر نەیبڕێ. زەریا.
زریان: ڕەشەبا. بەفر و بارانی زۆر کە بەبای ساردی بەهێزەوە بێ. گۆیکەکردنی درەخت (د).
زرێبـار: زەمـینێکە کـە ڕۆچوو بێ و بووبێ بەدەریاچە. ناوە بۆ دەریاچەکەی مەریوان.
زرێپۆش: کەسێکە کە زرێی لە بەردابێ.
زرێچە: دەریاچە.
زرێدار: زرێپۆش. فڕۆکە و ئۆتۆمبیل و کەشتی جەنگی پۆڵاین.
زریسک: زریشک.
زریشک: درەختێکی زۆر دڕکاوییە دەکرێ بەپەرژین، هێندێکیان بەرێکی خۆش دەگرێ و دەکرێ بەسەر پلاودا.
زرینچک: زرینچکاو.
زرینچکاو: ئاوێکی زەرد باوە لە برین دێ.
زرینگانەوە: زرنگانەوە.
زرینگە: زرنگە.
زرێوار: زرێبار. تەپۆڵکە.
زرێوان: کەشتی وان.
زریە: دەریا.
زریچ: ز. قورقوشم.
زریزانە: زیزانە.
زریزە: چەند پارچە تەلێکی لێک هەڵکێشراوی درێژە.
زریسک: مۆرد.
زریکاندن: توند قیژاندنی گیاندار.
زریکانن: زریکاندن.

زریکە: دەنگی بەرزی تیژی توندی گیاندار، (زریکە زریک) زریکەی یەک لە دوای یەک، (زریک و هووڕ) زریکە زریکی زۆر.
زریکە کردن: زریکاندن. بریتییە لە تۆقین و ترسان: دەک (زریکە کەیت). پلدانی ئەندام بەئازارەوە.
زریکە لێ هەڵساندن: ئازار گەیاندن بەیەکێک بەجۆرێ کە بزریکێنێ.
زرین: ز. زەڕین.
زرینگ: زرنگ.
زرینگە: زرنگە.
زریوە: دەنگێکە وەک دەنگی چۆلەکە و سیسرک (زریوە زریو) زریوەی یەک لە دوای یەک. ورشە و پرشەی شت (د).
زسان: زستان.
زستان: سێ مانگەی دوای پایز.
زستانە: زستانی.
زستانەوار: زستانە هەوار.
زستانەیی: زستانی.
زستانی: شتێکە کە هەر لە زستاندا بەکار بهێنرێ.
زغاڵ: ل. خەڵووز.
زغرک: ز. وردە بەرد.
زفت: جۆرێکە لە قیر بەڵام ئەم بۆرەڵووکە.
زڤار: با. پارچەی شت.
زڤر: ز. زبر.
زڤران: با. سووڕدان.
زڤرک: با. شەنگە سوورە.
زڤرین: گەڕانەوە (با). سووڕانەوە (ز).
زڤستان: با. زستان.
زڤنگ: با. ئەشکەوتێکە کە بشێ بۆ ئەوەی تێیدا بحەسێیتەوە.
زڤاف: ز. گاسنێکە کە دەستی لێ هەڵبڕابێ بۆ ئەوەی کە زۆر بچەقێ.
زک: سک.
زکئێشە: سک ئێشە.
زکبەردان: بریتییە لە زۆر خواردن.
زکپڕ: گیانداری ئاوس.
زکچوون: بریتییە لە ڕەوان بوون و سەرپێیی کردن.
زکدڕاو: بریتییە لە گیانداری زۆرخۆر.
زکڕۆین: زکچوون.
زکرەش: ز. قین ئەستووری دڵ پیس.
زکزل: زکدڕاو.
زککردن: ئاوسبوونی مێینە و زانی.
زک لەوەڕاندن: بریتییە لە کەسێک کە بەهەوانتە خۆی بژیەنێ.
زک لەوەڕین: کەسێکە بەهەوانتە خۆی بژیەنێ.
زکماک: دەردێکە کە تووشی گیاندار بووبێ لە سکی دایکیدا.
زکن: د. نەوسن.
زکوزا: سکوزا.
زکوونی: ز. نەوسنی چلێس.
زکە شۆرە: زکە شۆرێ.
زکە شۆرێ: سکچوون.
زکە شۆرێ پێکەوتن: بریتییە لە ماندووبوونی یەکێک بەهۆی هاتوچۆی زۆرەوە.
زکەماسێ: د. ئاوبەند.
زگ: زک.
زگار: هەرەوەزکردن بۆ تووتن شکاندنەوە. چنینەوەی خورما و مێوەی تر لەژێر دارەکەیدا (ل).
زگ ئێشە: سک ئێشە.
زگپڕ: سکپڕ.
زگچوون: سکچوون.
زگدڕاو: سکدڕاو.
زگڕۆین: سکچوون.
زگزل: سک زل.
زگسووتان: سکسووتان.
زگماک: سکماک.
زگەڕۆ: سکەڕۆ.
زگەشۆرە: سکەشۆرە.
زگەشۆرێ: سکە شۆرێ.
زل: شتی گەورە. پەلوپۆی گیای هەڵوەریو (ز).
زلان: ڕەشەبا.
زلبوون: بەرزبوونەوە و ئەستووربوونی گیاندار و درەخت و سەوزایی. بریتییە لە بەرزبوونەوەی پایەی یەکێک.
زلچە: دەنگێکە لە خواردن یا تێکردنی پلاو و قبوولی زۆر چەورەوە دێ: پلاوەکە (زلچە)ی دێ، (زلچە زلچ) زلچەی یەک لە دوای یەک.
زلحۆ: زلحۆرت.
زلحۆرت: بریتییە لە مەردوومی قەبەی زەبەللاح.
زلحۆل: زلحۆرت.
زلزلە: جەرە تاو و زەرداوێکە کە لە برین دێتە دەرەوە. ناوی دێیەکە لە ناوچەی سرۆچک.
زلف: ئەگریجە.
زلفگیر: د. شتێکە دەدرێ لە زلف بۆ ئەوەی تێک نەچێ.
زلفنج: گیایەکی زۆر تاڵی بەهارییە گەڵای وەک کەرەوز وایە بەهارڕاوەیی دەکرێ بەبرینی کرمە ژنەی ئاژاڵەوە. قوززەڵقورت.

زڵفنجکردن: وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بەیەکێک لە جیاتی وتەی قوززەڵقورت.
زڵێ: سلێ.
زڵقاو: قوڕاو (د). سلّقاو.
زڵقیاک: د. قوڕی شلّەقاو.
زلکوێر: چاوشلّەقاو.
زلکە: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
زللە: لێدان بەبەری دەست لە بناگوێی یەکێک.
زلۆبی: ناوساجی.
زلووبیا: جۆرە شیرینییەکی کون کونە وەک پەنجەرە لە هەویر دەکرێ و شیلەی شەکری بەسەردا دەکرێ.
زلووک: ز. دەنک: (زلووک)ە شقارتەیەک واتە دەنکێکی.
زلووکە: ز. شقارتە.
زلە: زل: ئەم شتە (زلە)یە. زللە.
زڵە: دەنگی چەند کەسێک بەکۆمەڵی، (زڵە زڵ) دەنگە دەنگی چەند کەسێک.
زڵە قیاگ: د. زڵقیاگ.
زڵەقیان: د. شلّەقانی قوڕ و شتی تر.
زلیی: زەلامی و گەورەیی شت.
زماک: ز. شوێنی نسرم لە شاخ کە هەتاو نەی گرێ.
زمان: زبان.
زمانبەد: زبانبەد.
زمانبەدی: زبانبەدی.
زمانپاک: زبانپاک.
زمانپاکی: زبانپاکی.
زمانپیس: زبانپیس.
زمانپیسی: زمانپیسی.
زمانتاڵ: زبانتاڵ.
زماندار: مەردوومی بەدەم.
زماندرێژ: زباندرێژ.
زماندرێژی: زباندرێژی.
زمانزان: زبانزان.
زمان شڕ: دەم شڕ.
زمانشکان: زبانشکان.
زمانشیرین: زبانشیرین.
زمانکێشان: بریتییە لە تینوێتی یا ماندوێتی.
زمانگرتن: زبانگرتن.
زمانگەستن: زبانگەستن.
زمانگیران: زبانگیران.
زمانلووس: زبانلووس.
زمانە: زبانە.
زمانە پچکۆلە: زمانێکی پچکۆلانەیە لە قوڕگی گیاندار.
زمانە چکۆلە: زمانە پچکۆلە.
زمڕووت: جۆرە بەردێکی سەوزکاری جوانی بەنرخە.
زمرق: چزووی دووپشک و زەردەواڵە و زەردە زیڕە.
زمسان: زستان.
زمسانە: زستانە.
زمسانی: زستانی.
زمە: تەلێکی ڕاستە وا بەژێر لوولەی تفەنگەوە گیروگرفتی ناو لوولەکەی پێ ڕایی دەکرێ. لوولە ئاسنێکی دەم تیژە چەرمی پێ کون دەکرێ بۆ تێ هەڵکێشانی (چاخمە).
زمهاڕ: د. ئاردێکە کە بۆ زستان دەهاڕدرێ و هەڵدەگیرێ.
زمهەڕ: زمهاڕ.
زن: ز. ژن.
زنار: ز. بەردی گەورە. ماهی زەرد (با).
زنتۆت: ز. پێکەنین بەمەردووم.
زنج: هۆدەیەکە لە قامیش و چیلکە و پووش و قوڕ دروست کرابێ. چەناگە (د). دووتاسە کە لە مۆسیقادا لە یەک دەدرێ.
زنجاف: ل. پەراوێزی کەوا.
زنجیر: چەند پارچە ئاسنێکی ئەستووری تێکهەڵکێشراوی درێژە.
زنجیرە: هەڵبەستنی لێواری چەفتە و بەرماڵ و مشکی و هێندێ شتی تر بەدەزوو یا بەئاوریشم. چەند شتێکە کە لە تەنیشت یەکەوە بەقەتارە وەستابن. برگە برگەی لێواری شت.
زنجیرەبەستن: وێستانی چەند شتێکی زۆر بەگردی بەتەنیشت یەکەوە.
زنجیرەدار: شتێکە کە زنجیرەی ببێ وەک پەنجا فلسی.
زنجیرەدان: زنجیرە بەستن.
زنچکاو: زرینچکاو.
زنگازنگ: ز. دەنگی زەنگ.
زنگرین: ز. تۆپینی سەگ.
زنگل: ز. زەنگوڵە.
زنێر: ماهی زەرد.
زۆ: گیایەکی بەهاری کوێستانی بۆنخۆشە دەخورێ و گەڵای لە گەڵای چنوور دەچێ.
زوان: زبان. زیوانی ناو دەغڵ.
زوبەرجەد: جۆرە بەردێکی جوانی بەنرخە.
زۆپا: سۆپا.
زۆپە: سۆپا.
زۆتک: ز. لێواری کونی قنگ.

زوخ: د. هێز و تەوانایی.
زۆخ: زووخ.
زوخاڵ: خەڵووز.
زوخاڵدان: خەڵووزدان.
زوخم: د. بنکی گیایەکی تاڵی بۆنخۆشە.
زۆر: شتێکە کە کەم نەبی. هێز: بە(زۆر) شت لە کەس مەسێنە. ستەم: (زۆر)داری خراپە.
زۆران: باوەشکردنی دوو کەس بەیەکدا و هێنان و بردنی یەکتری بۆ دان بەزەویدا.
زۆرانباز: کەسێکە کە زۆران باش بگرێ.
زۆرانبازی: زۆرانگرتن.
زۆرانگرتن: ئامبازبوونی یەکتری بۆ زۆران.
زۆربگیر: شتێکە کە بەیەکێکی بکەی بە زۆر.
زۆربگیری: بێگاری.
زۆربلێ: کەسێکە کە قسە زۆر بکا.
زۆر بلێیی: سازندەیی و قسە زۆر کردن.
زۆر بۆ هاتن: تەنگەتاو بوونی گیاندار.
زۆر بۆ هێنان: تەنگەتاوکردنی گیاندار.
زۆربە: بەشی زۆر لە شت: مەڕەکان (زۆربە)ی زاوە. شتی زۆر: فیسار کەس نان و چێشتێکی (زۆربە)ی دا.
زۆربەسەندن: زۆربوون و پەرەسەندنی شت: ئاگرەکە یا ئاوەکە (زۆربەی سەند).
زۆربێژ: زۆر بلێ.
زۆربێژی: زۆر بلێیی.
زۆرخانە: جێگایەکی تایبەتییە هێندێ جۆرە یاری تێدا دەکرێ بۆ بەهێزبوونی ئەندام و جەستە.
زۆرخۆر: گیاندارێکە کە زۆر بخوا.
زۆرخۆری: خووگرتن بەخواردنی زۆرەوە.
زۆردار: ستەمکار.
زۆرداری: ستەمکاری.
زۆردە: د. فەریکی جۆ و گەنم و نۆک.
زوڕات: زەڕات.
زوراتە کێویلە: جۆرێکە لە زورات.
زوڕنا: لوولەیەکی کون کونە سەرێکی خڕ و واڵە سەرەکەی تری باریکە (فیقەنە)یەکی پێوەیە فووی پێدادەکرێ و دەنگێکی زیقنی لێ پەیدا دەبێ.
زوڕناتک: گیایەکی بەهاری گەڵا وردی پڕە دۆشاوەکەی بۆ دەردی شوقاقی باشە.
زوڕناژەن: کەسێکە کە باش زوڕنا لێ بدا.
زوڕناسەقەتە: زەڕنەقووتە.
زۆرزان: بریتییە لە مەردوومی فێڵباز.
زۆرزانی: فێڵبازی.
زۆرگ: زنجیرە گردێکە کە خڕە بەردی زۆر بێ.
زۆرلێکردن: پێ نانە ڕێسی ملی یەکێک بۆ کردن یا وتنی شتێک بەزۆر.
زۆرم: د. زورمە.
زۆرملێ: د. زۆرەملێ.
زورمە: زوربە.
زۆرمە: زورمە.
زۆر و زەبەند: شتی زۆر.
زۆروەڕ: هەڵەوەڕ.
زۆر وێژ: زۆر بێژ.
زۆرە زمێ: د. زرمە زلێ.
زۆرەکی: زۆر بگیری.
زۆرەملە: زۆرە ملێ.
زۆرەملێ: زۆر لێکردن.
زۆرەملی: زۆرە ملێ.
زۆرەوانی: زۆرانبازی.
زۆرێتی: زۆری.
زۆری: بوونی شت بەزۆر.
زۆزان: با. کوێستان.
زوسان: زستان.
زۆسان: د. زستان.
زۆڤ: ز. هەزار پێ.
زوقم: شتێکی سپییە وەک بەفر لە شەوی سایەقەی زستاندا پەیدا دەبێ.
زۆڵ: منداڵێکە کە لە باوکێکی هاوسەری شرعی پەیا نەبووبێ. زوێڵ. بریتییە لە مەردوومی زۆرزانی فێڵباز.
زولاڵ: شتی بێ گرێ و قۆرت: دەنگی (زولاڵ)ە یا ئاوەکە (زولاڵە)ە واتە ڕوون و بێ خەوشە.
زوڵف: زلف.
زۆڵەک: جۆرە دەنکێکە لەناو گەنمەشامی و نۆک و بەڕودا کە نابرژێ و ناکوڵێ. زۆڵ.
زۆنپ: پیکی بەرد شکاندن.
زۆنکاو: زونگاو.
زۆنگ: زەمینێکی چاڵە کە ئاوی تێدا وەستابێ.
زونگاو: زۆنگ.
زوو: پێش وەخت: (زوو) هاتیت. خێرا: (زوو) کە، واتە خێراکە.
زووالە: د. زوێڵ. هەڵماتێکە کە لە قووڕ دروست کرابێ.

زووان: زبان.
زووانباز: د. درۆزن.
زووانبەد: زبانبەد.
زووانبەدی: زبانبەدی.
زووانبەس: دەمبەست.
زووانبەسە: د. بریتییە لە گیانداری بێ زبان.
زووانپاک: زبانپاک.
زووانپاکی: زبانپاکی.
زووانپیسی: زبانپیسی.
زووانتاڵ: زبانتاڵ.
زووانخۆش: زبان شیرین.
زووانددرێژ: زباندرێژ.
زووانددرێژی: زباندرێژی.
زووواندار: بریتییە لە مەردوومی دەم هەراش.
زووانزان: زبانزان.
زووانشکان: زبانشکان.
زوانشیرین: زبانشیرین.
زووانگرتن: زبانگوتن.
زووانگەستن: زبانگەستن.
زووانگیران: زبانگیران.
زووانلووس: زبانلووس.
زووانمەلیچک: د. تۆوی درەختی بناو.
زووانە: زبانە.
زووانە پچکۆلە: زبانە پچکۆلە.
زوواو: با. شتی وشک.
زووبەزوو: شتی زۆر زوو: من دەرۆم تۆش (زوو بەزوو) وەرە.
زووخ: کێماوی برین.
زووخاڵ: خەڵووز.
زووخاڵدان: خەڵووزدان.
زووخاو: زرینچکاوێکە لە دەروون دێتە دەرەوە. بریتییە لە تاڵاو: زۆرم (زووخاو) بەدەستتەوە چەشت.
زوور: زبر. زەوی کرێنی کەم گڵ.
زووران: زبران.
زوورە: دەنگی گریانی منداڵ کە بەجەختی بگری (زوورە زوور) زوورەی یەک لە دوای یەک.
زوورەز: جۆرە ترێیەکی پێست ئەستووری ڕەشە زوو پێ دەگا. ترێی یاقووتی.
زوورەس: زوورەز.
زوورە: زبرە.
زوورەبا: ئازارێکی کوتوپڕییە هێندێ جار دەداتە جەستەی مەردووم.
زوورە زوور: ز. قوورە قووری سەگ.
زووری: زەروو (ز). زبریی.
زووز: گیایەکی ئاوییە گەڵای لە (پیزڵ) دەچێ بەڵام ئەم نەرمتر و باریکترە.
زووسان: زستان.
زووشک: دووپشک.
زووگین: د. لەمەپێش.
زووم: با. هاوینەهەوار.
زوونا: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک ڕێحانە وایە گوڵێکی شین دەگرێ.
زووە: د. زەوە.
زوهم: ز. ڕۆن و پیو.
زوهۆر: د. شوێنی ئاوەزێ.
زوێڵ: پارچە چەرمێکە لەسەر باری درێژی هەڵ هێنرابێ. زبڵی ناو ماڵ (د).
زویر: گیانداری زیزی دڵگیر لە شتێک
زویربوون: دڵگیربوون، (زویرکردن) دڵگیرکردن.
زویری: دڵگیری.
زویڵ: زوێڵ.
زەب: ز. شتی زۆر ڕەق.
زەبر: هێز و نهێم: (زەبر)ی مەدەرێ.
زەبردار: زەبر بەدەست.
زەبر بەدەست: بریتییە لە مەردوومی دەست درێژی زۆردار.
زەبرگەیاندن: نهێم گەیاندن بەشتێک.
زەبروزەنگ: توندوتیژی لە ئیشوکاردا.
زەبرەقوون: هێلکە.
زەبرەقوونە: زەبرەقوون.
زەبڵۆق: ز. شتی لووس.
زەبوون: گیانداری کزی لاوازی بێ هێز، (زەبوونبوون) بێ هێز بوون، (زەبوونکردن) بێ هێزکردن.
زەبوونی: کزی و بێ هێزی.
زەبەر: ز. ژێر.
زەبەرجەد: زوبەرجەد.
زەبەردەست: زەبر بەدەست.
زەبەش: ز. شووتی.
زەبەللاح: گیانداری زلی چوارپەل قەوی.
زەبەن: زەبەنگ.
زەبەند: زەبەنگ.
زەبەنگ: شوێنی چڕی پڕ لە قامیش و دڕک و داڵ.
زەحف: ز. زۆر لە هەموو شتێک.

زەحفکردن: دڵچوون.
زەحفەران: زەعفەران.
زەحفەرانی: شتێکە کە ڕەنگی وەک ڕەنگی زەحفەرغان وابێ.
زەخت: ز. نەقیزە.
زەختە: زەخت.
زەخم: برین.
زەخماوی: بریندار.
زەخمدار: بریندار.
زەخم دەرکردن: پەیابوونی برین لە ئەندام.
زەخمک: ز. قایشێکە کە ئاوزەنگی پێ توند دەکرێ لە زین.
زەخمکردن: برینکردن لە یەکێک.
زەخمە: با. سوخمە.
زەخەڵ: قومارباز.
زەد و خورد: دانی دوو کەس یا زیاتر لە یەکتری.
زەدە: شتی شکست.
زەر: ز. زەرد.
زەرا: شتی زۆر کەم.
زەراڤە: ز. کونی پچووکی دیوار.
زەرانی: ئەژنۆ.
زەراهی: زەردی.
زەرایی: زەراهی.
زەربەژ: یا. زەبەش.
زەرپچی: ز. مەردوومی لەڕی زەردەڵە.
زەرتک: گیایەکی بەهارییە بەتەڕی ڕەشباوە کە وشک بوو زەرد دەبێ و بەنی پێ زەرد دەکرێ. گەڵایەکی پچکۆلەیە لەبن گەڵای پانی تووتنەوە وشک دەبێ. ناوە بۆ جۆرە ترێیەک (با).
زەرتکە: جۆرە گەنمێکی زەردی دەنک قەڵەوە.
زەرد: جۆرە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی زەردێنەی هێلکە. جۆرە شتێکی زەردە لە کان دەردەهێنرێ و دەکرێ بەسەماوەر و هێندێ شتی تر. شاخی زۆر سەخت.
زەردالوو: هەڵوژە زەردە.
زەرداو: شتێکی تاڵی زەردە لە دەروونی هێندێ کەس دێتە دەرەوە کە پێی دەڵێن (سەفرا).
زەردایی: زەردێنە. زەردێتی شت.
زەردایی کردن: بەئاستەم تروسکە کردنی چاو.
زەردباو: شتێکە کە بەسەر زەرددا بروانێ.
زەردبوون: ڕەقبوونی گەنم و جۆ. گەینی برین و دوومەڵ. بریتییە لە ترسانی یەکێک.
زەردکردن: بریتییە لە زۆر ترسان. نیوە کوڵاندنی هێندێ سەبزە: بامێکە یا کاردووەکە (زەردکە).
زەرد و زۆڵ: شتی زەردی جوان.
زەرد و سوور: بریتییە لە منداڵ: فیسار کەس کۆشێک (زەرد و سوور)ی لە پاش بەجێ ماوە.
زەردۆیی: ناوە بۆ تیرەیەکی کورد لە ڕۆژهەڵاتی سیروان.
زەردویی: جۆرە مووروویەکی زەردە ژنان دەیکەنە مل و دەستیان. دەردێکە تووشی مەردووم و مەڕەزە دەبێ زەردیان هەڵ دەگێڕێ.
زەردە: جۆرە ماسییەکە وەک (قاشنە) بەڵام پوولەکەکانی ڕەق و زل نییە و، لە خواردندا فرێ نادرێ. ناوە بۆ جۆرە ترێیەک تیشکی هەتاو لە بەیانیان و ئێواراندا: (زەردە) کەوتووە یا (زەردە) ماوە. زەردەخەنە. حەڵوای شەکر (ز).
زەردەپەڕ: کاتی ئاوابوونی خۆر کە زەردە بەسەر کەلەوە بێ.
زەردەچۆ: د. زەردەچەوە.
زەردەچوو: زەردەچەوە.
زەردەچەوە: دەرمانێکی زەردە دەهاڕێتەوە و دەکرێتە ناو هێندێ چێشتی شلەوە.
زەردەچێو: زەردە چەوە.
زەردەخەنە: پێکەنینی بێ دەنگ.
زەردەدڕک: د. دڕکە زەردە.
زەردە زیڕە: باڵندەیەکی پچووکی سەر ڕەشە لە هەڵفڕیندا دەزیڕێنێ. جۆرە مێشێکی چزووداری هێلانە لە بنمیچ و پاڵ دیواردا دەکات.
زەردەسیری: گیایەکی گەڵا وردی دڕکاوییە بۆ کەچەڵی زۆر باشە.
زەردەکەنی: زەردەخەنە.
زەردەڵپەڕ: زەردەپەڕ.
زەردەلوو: هەڵووژەزەردە (با). قەیسی (ل).
زەردەلە: مێوەیەکە بەهەتاو وشک کرابێ.
زەردەڵە: مەردوومی زەردباو.
زەردەمار: جۆرە مارێکی زەردی ڕەقی پیسی کوشندەیە.
زەردەواڵە: گیانداریکی چزووداره لە هەنگ گەورەترە نیوەی زەرد و نیوەی ئاڵە.
زەردەوەلی: هـ. باڵندەیەکی زەردی جوانی باڵ ڕەشە.
زەردەی: هـ. زەردووییەکە ژن دەیکاتە دەستی.
زەردیوەرە: هـ. باڵندەیەکی زەردی پچووکە.
زەردەیی: د. زەردوویی.
زەردێنە: شتێکی زەردە لەناو سپێنەی هێلکەدا.
زەردی: زەردێتی شت.
زەردینە: بریتییە لە زێڕ و چەکی ژنان: (زەردینە) لە ماڵمدا نییە.
زەردیوی: زەردویی.

زەڕ: زێڕ. وتەیەکە بەرامبەر بەگوێدرێژ دەوترێ بۆ ئەوەی کە بزەڕێ.
زەڕات: گەنمەشامی.
زەڕاندن: زەڕینی کەر.
زەڕ خڕی: د. زەڕ خرید.
زەڕ خریده: بەندەیەکە کە بەپارە کڕابێ.
زەڕکفت: شتێکی زەردی جوانە دەگیرێتەوە و دەدرێ لە ڕووی هێندێ شت بۆ جوانی.
زەڕکەش: جوانکردنی دیوی دەری شت بەزێڕ.
زەڕکەشی: ئاڵدۆزکاری شت بەزێڕ.
زەڕگەر: زەڕەنگەر.
زەڕناس: سەنگی مەحەک (د). بریتییە لە مەردوومی دانای شارەزا لە شت.
زەڕنەقووتە: بەچکەی باڵندەی پەڕ دەرنەکردوو. پەنجەی باڵا بەرزە (د).
زەڕنیخ: د. زەڕنیق.
زەڕنیق: دەرمانێکی زەردی قورسە لە کان دەردەهێنرێ و بۆ گەلێ شت بەکاردێنرێ.
زەڕە: دەنگی زەڕینی کەر، (زەڕە زەڕە) زەڕەی یەک لە دوای یەک. تەحر و شێوە: فیسار کەس (زەڕە)ی تاڵە، واتە ئێسکی قورسە.
زەڕهاتن: بریتییە لە یاخیبوونی یەکێک بەجۆرێ کە بەرزتر لە خۆی بدوێ و قسە بکا.
زەڕەتاڵ: ئێسک قورس.
زەڕە شیرین: ئێسک سووک.
زەڕەنگەر: کەسێکە کە زێڕکاری بکا.
زەڕین: تێ هەڵکردنی کەر بەزەڕە. بریتییە لە بایی بوونی یەکێک بەشتێک: فیسار کەس (زەڕیوە) واتە لە خۆبیایی بووە.
زەرزانیق: ز. دارێکی درێژە ناوەڕاستەکەی لەسەر قۆقزاییەک دادەنرێ. دوو منداڵ سواری ئەم سەر و ئەو سەری دەبن هەر دەمەی یەکێکیان بەرزدەبنەوە.
زەرزەڤات: سەبزەوات.
زەرسک: جۆرە دارێکە توێکڵەکەی دەکرێ بەدەرمانی چاو.
زەرف: پاکەتێکە کە کاغەزی نووسراوی تێ دەخرێ. بریتییە لە هوشیاری و زرنگی لە کاروباردا: فیسار کەس بە (زەرف)ە یا بێ (زەرف)ە.
زەرقی: شتی جوانی ڕەنگاوڕەنگ.
زەرک: توێکڵی سەوزی گوێز. زەرگ. ناوە بۆ جۆرە ترییەک (با). زەردێنەی هێلکە (ز).

زەرکەتاف: ز. زەردی ئێواران.
زەرگ: شیشێکی درێژە وەک دووخی خەرەک، سەرێکی تیژە و سەرەکەی تری دەکرێ بەگۆیەکی داری ناو زریزەی بەبزمار لێ دەدرێ.
زەرگاڵ: با. کاڵەیەکە لە موو دروست کرابێ.
زەرگۆز: ز. پەڵک.
زەرگەتە: زەردەزیرە. ناوی دێیەکە لە سەرچناری خواروو لە سلێمانی.
زەروو: کرمێکی ڕەشی ئاوی دەم تیژە دەگیرێتە جەستە بۆ هەڵمژینی خوێنی پیس.
زەرووربی: ئاودەستخانە.
زەرووگر: کەسێکە بە پارە زەروو بنێ بەجەستەی مەردوومدا.
زەرەبی: ز. جۆرێکە لە داری بی.
زەرەک: ز. ملوانکەی کارەبا. نەخۆشی زەردوویی.
زەرەکەت: گیایەکە تۆوەکەی دەچێنرێ و گزرە دەکرێ بۆ ئاژاڵ.
زەرەکەو: ز. زرەکەو.
زەرەنگ: گیایەکی بەهاری گەڵا پانە دووبەر دەگرێ یەکێکیان وەک گوێچکە و ئەویتریان وەک شەمامە وایە بۆ کوشتنی کرم دەکرێ بەبرینی ئاژاڵەوە.
زەریا: دەریا.
زەریقین: ز. هەڵاتنی ڕۆژ و تریسک و هووڕی.
زەریف: شتی باش.
زەریلە: ز. باڵندەیەکی پچکۆلەی زەردە.
زەربوەن: هـ. گیایەکی کوێستانییە بنجەکەی وشک دەکرێ و دەهاڕێ و دەکرێ بەبرینەوە بۆ گۆشتە و زوون زۆر باشە.
زەعفەران: گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی سووریاوە زۆر بەنرخ و بەکەڵکە.
زەعفەرانی: شتێکە کە ڕەنگی وەک زەعفەران وابێ.
زەغەڵ: مەردوومی چاوکراوەی زیت و وریا.
زەفت: د. زفت.
زەڤی: ز. زەوییەکە کە کشتوکاڵی تێدا بکرێ.
زەق: شتی قۆقز. چاوی بز.
زەقکردنەوە: چاو بزکردنەوە.
زەقنە: شتی زۆر تاڵی ناخۆش.
زەقنەبووت: زەقنەمووت.
زەقنەپووت: ز. زەقنەمووت.
زەقنە کردن: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە ڕووی سووکییەوە بۆ خواردنی شتێک لەلایەن یەکێکەوە.
زەقنەمووت: ڕەقنە.
زەقنەمووتکردن: زەقنە کردن.

زەقە: بزەی چاو (زەقەزەق) بزەبزی چاو.
زەقەڵ: زەغەڵ.
زەقە هاتن: بزەبزی چاو: چاوی (زەقەی دێ).
زەقین: د. پێکەنین بەدەنگی بەرز.
زەگر: ز. وردە بەردی لەت بوو.
زەل: گـیـایەکی لق درێژی سێ کـووزە لە گـوێ ئاو دەڕوێ. جـۆرە قورە ڕەشێکە بەنی پێ ڕەش دەکرێ.
زەلاتە: جۆرە خواردەمەنییەکە دروست دەکرێ لە ترۆزی و تەماتە یا لە سرکە و هێندێ شتی چنراوی تر.
زەلاڵ: د. زۆلاڵ.
زەلام: وتەیەکـە بەکـاردێنرێ بۆ کـەسـێک کـە ناوی نەزانرێ یا بزانرێ و لەبەر بێ نموودی نەوترێ: (زەللام کـــێـــیت)؟ بەکەسـێک کـە نەیناسـیت یا (زەلام)ێکم نارد حـەلێک کـە نەتەوێت ناوی ببەیت. شتی گەورە.
زەلامەڕێ: ڕێگـایەکە کـە هەر زەلام بتـوانێ پێـیدا بڕوا و سـوار و ولاخ نەتوانێ پێیدا بڕوا.
زەلان: ڕەشەبا (هـ). ناوی دێیەکە لە ناوچەی سرۆچک.
زەلاندنەوە: حـەواندنەوەی یەکـێک بەسـەر یەکـێکەوە بەهەوانتـە: مێوانەکەت بەسەر منەوە (زەلاندەوە).
زەلانەوە: ڕابواردن و حەوانەوە بەتێروپڕی: فـیـسـار کـەس بەسـەر ئەم سـامـانەیەوە چاک (دەزەلێـتـەوە). حـەوانەوەی یەکـێک بەسەر یەکێکەوە بەهەوانتە.
زەلکاو: شـوێنێکە کـە ئاوی بۆگـەنی تێدا وەسـتـابێ و نـاو بەناو زەل و گیای تێدا ڕوابێ.
زەلکۆ: د. زەلکاو.
زەلکە: شـۆربـای برنجی بێ تام. ناوی دێیـــەکـە لە هەورامـــانی ئێران.
زەلوو: زەروو.
زەلە: ز. زللە.
زەلەویان: شلەژان.
زەلیقاندن: ز. نووساندنی شتێک بەشتێکەوە.
زەلینەوە: زەلانەوە.
زەما: هـ. زاوا.
زەماخوا: د. شیرینی زاوایی.
زەماوەن: د. زەماوەند.
زەماوەند: شایی.
زەمبەلەک: زەنبەلەک.
زەمبیلە: دەفرێکی پووشینی دەم پەلە شتی تێدا هەڵدەگیرێ.
زەموورەک: تەنوورەی ئاش.
زەمـەق: جـۆرە گـولێکی زەرد و سـوور و سـپـیـیـە گـەلاکـەی وەک گەلای قامیش وایە بەلام پانترە.
زەمیلە: زەمبیلە.
زەمین: زەوی.
زەنبوور: ل. زەردەواڵە.
زەنبەلەک: تەلێکی پانی تەنکی درێژی هەڵکراوە لەناو سەعـاتدا بەخـاوبوونەوەی سـەعـاتەکە دەنوێ و بەکـۆککردنی دەکەوێتـە کار.
زەنبیل: د. زەمبیلە. ناوی دێیەکە لە موکریان.
زەنبیلە: زەمیلە.
زەنجەفێل: د. زەنجەفیل.
زەنجەفیل: ڕەگی گیایەکی گەرمیانییە زۆر توونە.
زەنجیر: زنجیر. ئەڵقەڕێز (ل).
زەندە زیرە: زەردە زیرە.
زەندەق: ورە: (زەندەق)ی چوو، واتە ورەی بەردا.
زەندەقچوون: تۆقین لە ترسانا.
زەندەک: ز. قۆڵ پێچێکە لە کاتی کاردا دەکرێتە قۆڵ.
زەنگ: شـتـێکی بۆشی دەم واڵە لە ئاسن یا لە زەرد یا لە مس دروست دەکـرێ پارچە ئاسنێکی تێـدایە بەکـەوتنی لە کـەنارەکـانی دەزرێتـەوە. ڕۆنی زرنگ. ئاو زەنگی (با). ژەنگ (ز). درز.
زەنگاڵ: ترێی هێشو و داڵ (ز). زەندەک (د).
زەنگبردن: درز بردنی شت، زەنگ زەنگ: شتێکە درزی زۆری تێ بووبێ.
زەنگزڕان: بریتییە لە ئابڕووچوون.
زەنگڵە: زەنگوولە.
زەنگن: د. زەنگەن.
زەنگۆ: ز. ئاوزەنگی.
زەنگ و قـۆڕ: زەنگێکی گـەورە و چەند زەنگێکی پچکۆلانەیە دەکرێتە ملی پێشەنگ و دەشکرێ بەداری چەرخ و فەلەکدا بۆ ئەوەی کە دەنگی بێ.
زەنگوڵ: تەپڵـــە ســـەری شـــاخ. زەنگوولە (ل). دڵۆپی ئارەق و فرمێسک.
زەنگۆڵ: ئەژنۆ.
زەنگۆڵە: د. زەنگوولە.
زەنگۆڵە و پنچک: گیایەکی بنجدارە وەک گەسک تۆوێک دەگرێ وەک زەنگوولە.
زەنگووڵ: زەنگۆڵ.
زەنگوولە: زەنگی پچووک.
زەنگوون: ز. زەنگین.
زەنگەتە: زەردەواڵە.
زەنگە سوورە: زەردەواڵە.

زەنگەقڵیشە: داری وشکی بەتەور لەتکراو.
زەنگەن: جۆرە پاچێکی گەورەی لووت درێژی کەوانەدارە.
زەنگیانە: جۆرە مووروویەکی زۆر وردە و گەلێ ڕەنگی هەیە.
زەنده: مەردرمی بەزەبر و زەنگ.
زەنە: چاو سپییەکی پچکۆلەیە لەسەر پیتێکی عەرەبی دادەنرێ کە سەر و بۆر و ژێری نەبێ.
زەنەق: د. زەندەق.
زەنەقدار: نەترس.
زەو: زاوزێ.
زەوتکردن: داگیرکردنی شتی مەردووم بە ناڕەوا. دەرەقەت هاتن: هەر چەند دەکەم (زەوت)ی ناکەم.
زەوتی: شتی داگیرکراو.
زەود: ز. بێگار.
زەوزان: هاوینەهەوار.
زەوک: ئافرەتێکە کە زۆر منداڵی ببێ.
زەوونج: د. زۆنگ.
زەوونگ: د. زوونج.
زەوە: برینێکی پیسە لە خواردنی گۆشتی ئاژاڵی دەرد مردەوە پەیدا دەبێ و، جێگاکەی دوای چابوونەوە چاڵ دەبێ. عارەبە (د).
زەوەن: گورگەی گوێسووانە (هـ). زەبەنگ.
زەوی زار: د. زەویوزار.
زەوی: ئەم ئەستێرە گەورە گەڕۆکەیە کە ئێمە لەسەری دەژین. پارچەیەکە لە دەشتێک، ئەم (زەوی)یە بەراوە.
زەوی بەچنگ هەڵکەندن: بریتییە لە ئێش و ئازاری زۆر.
زەوی پێو: مووچەخۆرێکی میرییە کە هەر زەوی بپێوی (مساح).
زەویوزار: کێڵگە.
زەوین: د. کێڵگە.
زەوین: د. زەمین.
زەوینگیر: د. بریتییە لە مەردوومی کەفتەکاری گردەنشین.
زەها: د. زێی گیانداری مێینە.
زەهاو: شوێنی ئاوەزێ (د). ناوە بۆ ناوچەیەک لە کوردستان.
زەهر: شتێکە کە خواردن و خواردنەوەی کوشندە بێ.
زەهراوی: شتێکە کە زەهری پێوە بێ.
زەهرەخەنە: د. زارخەنە.
زەهردار: شتێکە کە زەهری ببێ.
زەهرکردن: زەقنەکردن.
زەهرەترەک: زارەترەک، (زەهرەترەکبوون) زارە ترەکبوون، (زەهرە ترەک کردن). زارە ترەک کردن.
زەهرەمار: ژاری مار. وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە بەخواردەمەنی یەکێک دەوترێ: دە (زەهرەمار)ە کەت بخۆ.
زەهرەمار کردن: زەهرکردن.
زەهری هەلا هەل: زەهری هەلا هەلا.
زەهری هەلا هەلا: جۆرە زەهرێکی کوشندەیە لە گیا دروست دەکرێ.
زەهلک: ل. زراو.
زەی: ل. زەوی.
زەیتوون: جۆرە درەختێکە بەرێکی چەور دەگرێ، بەخۆشکراوی دەخورێ.
زەیسان: زەیستان.
زەیستان: ئافرەتێکە کە تازە زابێ.
زەین: هێزی بیر و تێگەیشتن: فیسار کەس زۆر بە(زەین)ە.
زەین ڕوون: کەسێکە لە شت زوو بگا.
زەین کوێر: کەودەنی نازیرەک.
زێ: ناوی پیتێکە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. ژێ. جۆگە ئاوی زۆر گەورە. ناومالّی مێینە. ڕێگە. ڕەوشت. ئەندازە.
زیاد: شتێکە لە ئەندازەی خۆی بەدەربێ (زیادبوون) زۆربوون، (زیادکردن) زۆرکردن.
زیادە: شتێکە لە ئەندازە بەدەر بێ و پێویست نەبیت پێی. سیانزە.
زیادی: زیادە و لە ئەندازە بەدەری شت.
زیارەت: د. بریتییە لە گۆڕ.
زیارەتان: د. بریتییە لە گۆڕستان.
زیارەتگا: شوێنی زیارەت.
زیان: لەکیسچوونی ماڵ: خوا بکەم (زیان)ت لێ نەکەوێ. گەزەند و ئازار: (زیان)ت بۆ کەس نەبێ.
زیاندار: شتی بەزیان.
زیانداری: بوونی مەردووم بەجۆرێک کە زیانی لێ بووەشێتەوە.
زیانکار: گیاندار بەزیان.
زیانکردن: زیان گەیاندن.
زیانگەیاندن: لە کیسدانی شتی مەردووم. ئێش و ئازار گەیاندن بەمەردووم.
زیانە خورۆ: گیاندارێکە کە گیاندارێکی تر بخوا بەزیان یا شت بخوا بە زیان.
زیانی: زیانکردن.
زیپکە: وردە برینێکی سەر تیژە لە ئەندام دەردێ.
زیتکە: زیپکە. جۆرە ماسییەکی پچووکە بەقەد پەنجەیەک و هەرگیز لەوە گەورەتر نابێ.
زێچ: ژەک. زیت (د).
زیچکاو: زرینچکاو.
زێد: نیشتمان. گۆڕ. شوێنێکە کە مەردووم تێیدا بحەسێتەوە.

زێدەوان: پاسەوانی گۆڕ. پاسەوان (د).
زێر: ز. زبر.
زێراب: گۆڕیچەیەکە لەناو ماڵدا ئاوی پیسی لێ دەربچێ.
زێراو: د. زێراب.
زێر: تەلا.
زێرباف: زێربافت.
زێربافت: تەنراوی گوڵ سورمە.
زێرکار: زەڕەنگەر.
زێرکفت: زەرکفت.
زێرگەر: زەڕگەر.
زێرین: شتێکە لە زێڕ دروست کرابێ.
زیرگ: د. چلک.
زیرگن: د. چلکن.
زێروو: زەردوو.
زێسان: د. زەیستان. ژێرزەمین.
زیڤار: ز. هەژار.
زێڵ: هـ. دڵ.
زێلکە: جۆرە ترێیەکی ناسکی مزری سپی بزمارکوتە ساڵی دووجار بەر دەگرێ.
زێلوو: زەروو.
زینات: ز. زۆر و ستەم.
زیناتکار: ز. زۆرداری ستەمکار.
زینان: زیندان. گوێکە کردن (د).
زینچکاو: زرینچکاو.
زیندان: بەندیخانەی قووڵی تاریکی ناخۆش لە زەویدا.
زیندانەوان: پاساوڵی زیندان.
زیندانی: کەسێکە کە لە زینداندا بێ.
زیندگ: زیندوو.
زیندوو: گیانلەبەر.
زیندووبوونەوە: بریتییە لە بەخۆداهاتنەوەی گیاندار و سەوزایی.
زیندووکردنەوە: بریتییە لە تازەکردنەوەی شتێک کە کۆن بوو بێ.
زیندوویی: زیندووێتی.
زیندووێتی: بوونی شت بەزیندوو.
زیندەبەچاڵ: گیاندارێکە کە بەزیندوویی نێژرابێ، (زیندەبەچاڵ کردن) مەردووم ناشتن بەزیندوویی.
زیندە بەگۆڕ: زیندەبەچاڵ.
زیندەچاڵ: د. زیندەبەچاڵ.
زیندەگانی: ژیان.
زیندەگی: زیندەگانی.
زیندەماڵ: ئاژاڵی ناو ماڵ.
زیندەوار: زیندەوەر.
زیندەوەر: زیندووی گیانلەبەر.
زیندەوان: سەرۆکی بەندیخانە (مدیری سجن).
زیندی: زیندوو.
زینگان: زیندان.
زینگانی: زیندانی.
زینگانەوان: زیندانەوان.
زینگوو: زیندوو.
زینگووبوونەوە: زیندووبوونەوە.
زینگووکردنەوە: زیندووکردنەوە.
زینگە بەچاڵ: زیندەبەچاڵ (زینگە بەچاڵ کردن) زیندەبەچاڵ کردن.
زینگەچاڵ: زیندەچاڵ.
زینگەوبوون: د. زیندووبوونەوە.
زینگی: د. زیندەگی.
زینان: د. زیندان.
زینە: د. زیندوو.
زێو: زیو.
زێوار: شتێکە کە گیرابێ بە قەراغی شتێکی تردا.
زێوارگرتن: گرتنی زێوار بەقەراغی شتدا.
زێوارە: زێوار.
زێوان: زێدەوان.
زی: زریشک. تەحرە کشتەکێکە کەوشدروو کەوشی پێ دەدروێ. بەرۆک. حەواس: بەهەر پێنج (زی) خەریکە، واتە بەهەر پێنج حەواس. جۆرە دڕکێکی قایمی هەمیشە سەوزە دەکرێ بەپەرژین.
زیپ: ڕۆژانی ڕەشی شووم لە ساڵدا (ز). زۆر هێنان و تەنگەتاو کردن (-) زیپە.
زیپک:. تەرزە (ز). زیپکە.
زیپلک: ژیلەمۆ.
زیپە: با. برجی پیرێژن.
زیت: گیانداری وریا.
زیتبوونەوە: وریابوونەوەی گیاندار.
زیتک: لەقەی ولاخ.
زیتە: دارێکی باریکە لە فاقەدا سەرێکی بەکشتەکێک بەستراوە بەژێیەکەوە سەرەکەی تری کە دوو فاقە ئەو دەنکە گەنمەی پێدا دەکرێ کە بەدەزوویەکەوە بەستراوە بەژێکەوە.
زیتەڵ: زیت.
زیتەڵە: زیت.
زیتەوبوون: د. زیتبوونەوە.
زیخ: بەردی زۆر ورد. زیرەک (با).

زیخەڵان: شوێنێکە کە زیخی زۆر بێ.
زیخەڵانی: زیخەڵان.
زیراڤ: ئارد. شتی دوور.
زیراندن: قیژاندنی زۆر بەتوندوتیژی.
زیرە: دەنگی تیژی گەورەی گیاندار، (زیرەزیرە) زیرەی یەک لە دوای یەک، (زیر و هوور) زیرەزیری زۆر.
زیرەکردن: بریتییە لە ترساندنی یەکێک بەجۆرێک کە بزیرێنێ.
زیرە لێ هەستاندن: پەیدابوونی زیرە بە هۆی لێدان یا شت پێوەدانەوە.
زیرە: دەرمانێکی دەنک وردی سەوز کاری بۆنخۆشە دەکرێتە ناو هێندێ چێشتەوە.
زیرەڤان: با. پاسەوان.
زیرەک: مەردوومی وشیاری زرنگی تێگەیشتوو.
زیرەکی: وشیاری و زرنگی.
زیرەوان: جاسووس.
زیز: گیانداری زویر. دڵی نەرم (ز).
زیزانە: گیایەکە لەناو دەغڵدا دەڕوێ بەرێکی ڕەشی تاڵی هەیە وەک زەنگیانە.
زیزیک: ز. جۆرە مێشێکی سەوزە بەقەد هەنگێک دەبێ دەنووسێ بەلقی مێو و دەمرێ.
زیڤ: ز. زیو.
زیڤار: هەژار.
زیڤاری: هەژاری.
زیڤزیڤ: هەزار پێ.
زیقاندن: زیقەکردن.
زیقانن: د. زیقاندن.
زیقاوڵە: مەلێکی سووریاوە لە کۆتر پچووکترە کە دەنیشێتەوە دەزیقێنێ. گیاندارێکی بۆری چوار پێیە لە دەڵەک گەورەترە پێستی بەنرخە.
زیقن: گیاندارێکە کە دەنگی زیقەی لێوە بێ.
زیقە: دەنگێکە لە زیلە گەورەتر و ناخۆشترە (زیقەزیق) زیقەی یەک لە دوای یەک (زیق و هوور) زیقە زیقی زۆر.
زیک: ز. کشتەکی مێوکراو.
زیکاندن: زیکەکردن.
زیکانن: زیکاندن.
زیکن: گیاندارێکە کە دەنگی زیکەی لێوە بێ.
زیکە: دەنگی تیژی ناسکی باریک (زیکەزیک) زیکەی یەک لە دوای یەک.
زیل: دەنگێکە کە زیلەی لێوە بێ. سەری گیا کە لە زەوی دەردێ. شتێکە کە دەستی پێدانرا دەنگێکی لێوە دێ بۆ بانگکردنی بەردەست. پارچەیەکە لە مۆسیقا.
زیڵ: د. دەنگی زیل.
زیلک: ز. قیتکە.
زیلۆ: ز. زەروو.
زیلە: دەنگێکە لە زیکە گەورەترە.
زیلەزیل: زیلەی یەک لە دوای یەک. زللە (د).
زیڵە: د. زیلە.
زیڵەمۆ: ژیڵەمۆ.
زین: شتێکە لە چەرم و تەختە دروست دەکرێ و لەسەر پشتی وڵاخی بەرزە توند دەکرێ و سوار لەسەری دادەنیشێ.
زینپۆش: پەردەیەکی جوانە دەدرێ بەسەر زیندا.
زیندروو: کەسێکە کە زین دروست بکا.
زیندوور: د. زین دروو.
زینکردن: زین بەستن لە وڵاخ.
زینکۆ: د. قەڵپووسی زین.
زینگ: زیندوو.
زینگیر: د. سنگێکە لە تەویلەدا زینی پێدا هەڵدەواسرێ.
زینو: باسکی شاخ و یاڵ.
زینەماڵ: د. زیندەماڵ.
زینی: تەپۆڵکە (ز). تیغی تیژ.
زیو: شتێکی ڕەقی سپی گران مایەیە لە کان دەردەهێنرێ دراو و چەکی ژنان و گەلێ شتی تری لێ دروست دەکرێ.
زیوا: گوڵە زەنبەق.
زیواڵ: ڕیشووی کاڵا و شتی دڕاو.
زیوان: زیزانە.
زیوانن: د. جووڵاندن.
زیوزیوە: ویزویزە.
زیوور: زیڤزیڤ.
زیوە: د. جووڵە.
زیویان: د. جووڵان.
زیوین: شتێکە لە زیو دروست کرابێ.
زبیە: دڕکەزی.



ژ: با. لە: (ژ) بەختیمە، واتە لە بەختی ئێمە.
ژار: زەهر. لەڕ و لاواز (ز).
ژاراو: تالاو.
ژاراوی: شتێکە کە ژاری پێوەبێ.
ژاردار: ژاراوی.
ژارقەندە: ژارقەنگە.
ژارقەنگە: ژارێکە لە کلکی سەبیل و قەنگەدا کۆدەبێتەوە.
ژارماسی: جۆرە زەهرێکە ماسی پێ دەکوژرێ لە ئاودا.
ژاروژەنگ: ئاژاوە و ناکۆکی.
ژاژ: قامیش. قەرەم. گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانییە تێکەڵی پەنیر و سوێرەکە دەکرێ.
ژاژک: بنێشت.
ژاژکە: د. جاچکە.
ژاژەلان: قامیشەلان.
ژاژی: شیرێژێکە کە لە پێستەدا هەڵگیرابێ بۆ زستان.
ژاژبیـرۆن: ز. خـواردەمـەنیـیـە کـە لـە ژاژی و ڕۆن و ئارد دروست دەکرێ.
ژاکان: چرچبوون و تێکچوونی شت: ئەم کەوایە یا ئەم کاغەزە یا ئەم گوڵە یا ئەم منداڵە (ژاکاوە).
ژاکاندن: چرچکردن و دەق شکاندنی شت.
ژاکانن: ژاکاندن.
ژاکاو: شتی چرچبووی دەقشکاو.
ژاکیاگ: ژاکاو.
ژاکیان: د. ژاکان.
ژاکیاو: ژاکاو.
ژاڵ: ژار.
ژاڵە: درەختێکی هەمیـشە سەوزی تاڵە، گەڵای وەک گەڵای بی وایە گوڵی زەرد یا سوور یا سپی دەگرێ. ناوی دوو دێیە لە ناوچەی سەنگاو و تانجەرۆ.

ژان: ئازار و ئێشێکە هێندێ جار تووشی گیاندار دەبێ.
ژان بژاردنەوە: ژانێکی دەم دەمییـە لە پێش منداڵ بووندا بەچەند دەمێک تووشی ئافرەت دەبێ.
ژان پێدا هاتن: ژانێکە بەگیانداری ئاوسدا دێ لە پێش زانیدا.
ژاندار: گیاندارێکە تووشی ژان بووبێ.
ژاندن: ژەندن.
ژانکردن: هاتنە ژانی سکی گیاندار.
ژانگرتن: جۆرە ژانێکی سەختە لە کاتی زاندا تووشی گیانداری ئاوس دەبێ.
ژانوژوور: بەرەژانی پێش منداڵبوون.
ژانە زراف: ز. سیل.
ژانەسک: سک ئێشە.
ژانەسەر: سەر ئێشە.
ژاوە: دەنگە دەنگی زۆری تێکەڵ، (ژاوەژاو) ژاوەی یەک لەسەر یەک.
ژاوین: جووینی شت بە دان.
ژبل: وتەیەکە لەباتی وتەی بێجگە بەکاردێنرێ.
ژبۆ: ز. لەبەر.
ژبەر: ز. لەباتی.
ژبەر ئاخەفتن: با. بزرکاندن و وڕێنەکردن.
ژبەرکردن: ز. لەبەرکردن.
ژبەش: ز. کاڵەک.
ژ بیرکردن: ز. لەبیرچوون.
ژ ژۆ: ز. ژیژک.
ژڤژی: ژیشک.
ژلووق: شلووق.
ژلووقاندن: د. شێواندنی شوێنێک و پشێوی تێخستنی.
ژلووقانن: د. ژلووقاندن.
ژلووقاو: د. شڵەژاو. شڵەقاو.

ژلووقیاگ: د. ژلووقاو.
ژلووقیان: د. شڵەقان. شڵەژان.
ژلیقانن: د. ژلووقانن.
ژلیقیاگ: د. ژلووقیاگ.
ژلیقیان: د. ژلووقیان.
ژڵیوان: ژڵیویان.
ژڵیوانن: د. شێواندن.
ژڵیوه: د. پشێوی.
ژڵیویان: د. شێوان.
ژمار: ژماردن: له (ژمار) نایەت.
ژمارتن: ژماردن.
ژماردن: بەسەرکردنی شتی زۆر دانەدانه بەوتنی (یەک، دوو، سێ، چوار) تا تەواو دەبێ.
ژمارده: شتی ژمێردراو.
ژماره: ژماردن.
ژمارەگر: ژماریار.
ژمارەگری: بەسەرکردنی ژمارەی شت (محاسبة).
ژماریار: کەسێکه پیشەی هەر ژماره بێ (محاسب).
ژمێره: ژماره.
ژن: مێینەی ئادەمیزادێکه که شووی کردبێ.
ژنانه: شتێکه که بەتایبەتی هینی ژن بێ. گوفتار یا کردارێکه که هەر له ژن بوەشێتەوه.
ژنانی: پیاوێکه که خووی له خووی ژن بچێ.
ژناوژن: د. ژن به ژن.
ژنباز: مێباز.
ژنباڤ: باوەژن.
ژنبرا: برای ژن. ژنی برا.
ژن بەژن: ژندان بەیەکێک بەرامبەر به ژن لێ خواستنی.
ژن خوشک: خوشکی ژن.
ژن خوێشک: ژن خوشک.
ژنک: ژن.
ژنۆ: ئەژنۆ.
ژنواژن: د. ژن به ژن.
ژن و ژنخوازی: ژنهێنانی دوو تیره له یەکتری.
ژن هاوردن: ژنهێنان.
ژنەبی: ز. بێوەژن.
ژنەفتن: بیستن بەگوێ.
ژنەوا: د. کەسێکه که گوێی سووک بێ و باش شت ببیستێ.
ژنەوایی: د. بیستن بەگوێ.
ژنەوتن: د. ژنەفتن.
ژنەوین: د. ژنەفتن.
ژنهێنان: مارەکردنی ژن و گواستنەوەی بۆ خێزانی.
ژنیای: ه. ژنهێنان.
ژنێتی: بوونی ئافرەت بەژیری دەرهاتوو.
ژۆ: با. وتەیەکه له جێی وتەی (لەبەر).
ژۆر: ز. لای ژووروو.
ژۆرین: لای ژووروی شت.
ژوماره: ژماره.
ژووان: بەڵێن. جێگایەکه که ڕاوێژ و پەیمانێکی تێدا گیرابێ.
ژوور: هۆده. ژووروو. بەرسیله (ز).
ژووران: کاتی چوونه ژوورەوه له سەرما
ژوورگ: ژووروو.
ژووگێن: ژوورگ.
ژوورنگ: ژووروو.
ژووروو: لای بەرەو ژوور.
ژووری: ژوورەوەی شت: بچۆره (ژووری).
ژووژانن: د. حەساندنەوه.
ژووژک: ژیشک.
ژووژوو: ژیشک.
ژووژیان: د. حەسانەوه.
ژووژیانەوه: د. حەسانەوه.
ژووژی: ژیشک.
ژووشک: ژیشک.
ژووڤان: پەشیمان.
ژوولان: جوولان.
ژووله: د، جووله.
ژووڵیاگ: د. شتی ژاکاوی تێکەڵ و پێکەڵ.
ژووڵیان: د. تێکچوون و دەق شکانی شت.
ژووم: کات.
ژه: ز. ژێ.
ژەبەژ: ز. شووتی.
ژەحر: ز. زەهر.
ژەرەژ: ه. کەو.
ژەقنه: زەقنه.
ژەقنەبووت: زەقنەمووت.
ژەقنەمووت: زەقنەمووت.
ژەقنه مووتکردن: زەقنه مووتکردن.
ژەک: شیرێکی خەسته له گوانی گیاندار پەیدا دەبێ لەپاش زانی تا دوو سێ ژەم.
ژەم: نۆرەیەک تێرخواردن یا تێرخواردنەوه. نۆره: ئیمڕۆ دوو (ژەم) هاتمه لات.

ژەمبوردوو: ژەمبوردە.
ژەمبـــوردە: کـەســێکە لەپاش نەخـۆشی و نەخـواردنێکی زۆر ئارەزووی خواردنی کرابێتەوە.
ژەمک: ئەندازەیەکە لە ماست کە دانرابێ بۆ ژەندن.
ژەمەن: کەرەی بەرە مەشکەیەک.
ژەمەنبردە: ژەمەن بوردە.
ژەمەنبگردگ: د. ژەمەن بوردە.
ژەمەنبوردوو: ژەمەن بوردە.
ژەمەنبوردە: ژەمبوردە.
ژەمەنە: ژەمەن.
ژەن: وتەیەکە لە دوای هێندێ وتەوە دێ دەیکا بە(فاعل): زورنا (ژەن) بۆڕیە (ژەن).
ژەندن: هێنان و بردنی ماست لەناو مەشکەدا بۆ گرتنی کەرەکەی. داخستنی دەرگا و پەنجەرە: دەرگاکە (بژەنە) واتە دایخە. لێدانی زوڕنا و شمشاڵ. کردنی شتێک بە شتێکدا: نانەکە (بژەنە) بەئاوەکەدا. کردنەوەی لۆکە (ز). ئاگرکردنەوە بە بەرد و بەئەستێ. بریتییە لە هەڵپەڕین.
ژەنگ: جۆرە چڵکێکی سوورکارە دەکەوێتە سەر ئاسن و زەرد و مس و گەلێ شتی تر.
ژەنگار: ڕەنگی سەوزی تێر. موورووە شین.
ژەنگاری: جۆرێکە لە هەنجیر (با). ژەنگاڵی.
ژەنگاسن: د. گووراسن.
ژەنگاڵ: د. چەرمێکە دەپێچرێتە پێ.
ژەنگاڵی: د. ڕەنگی ئاسمانی.
ژەنگاوی: شتێکە کە ژەنگی پێوە بێ.
ژەنگ لێدان: ژەنگ کەوتنە سەرشت.
ژەنگن: شتی ژەنگاوی.
ژەنگ هاووردگ: د. ژەنگاوی.
ژەنگە سوور: زەردەواڵە.
ژەنگ هەڵهێنان: ژەنگ لێدان.
ژەنگ هێنان: ژەنگ هەڵهێنان.
ژەنن: ژەندن.
ژەنوو: ئەژنۆ.
ژەنیای: هـ. ژەندن.
ژەنی: هـ. ژن.
ژەنین: داخستنی دەرگا و پەنجەرە. هەڵپەڕین. ژەندن.
ژەهردار: زەهردار.
ژێ: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. ڕیخۆڵەی بادراوە کە دەکرێ بەکەوانی هەلاجەوە. ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد.
ژیان: مانی گیاندار و گوزەرانی لە جیهاندا.
ژیاندار: گیاندار.
ژیاندن: گوزەران دانی گیاندار.
ژیانن: ژیاندن.
ژیانەوە: تازەبوونەوەی هێندێ شت پاش کزی و زەبوونی.
ژێر: بنی شت. نیشانەیەکی پچکۆلەی ڕاستە لەبن هێندێ پیتی عەرەبیدا دادەنرێ.
ژێر ئاگرە: بن ئاگرە.
ژێر ئاوی: ژێر دەریایی.
ژێر باڵخستن: بریتییە لە دەست بەسەر یەکێکدا گرتن و پەنادانی.
ژێر بەرەو ژوور: چاوێکە لەبەر بێ هۆشبوون ڕەشێنەکەی چووبێتە بەرەو ژوور.
ژێر پیاڵە: دەفرێکی پەلە پیاڵەی لەسەر دادەنرێ.
ژێر جلەکی: د. بریتییە لە شتی پەنهانی.
ژێر چەپۆکە: بریتییە لە کەسێک کە لەژێر دەستی زۆردارێکدابێ.
ژێر چەناکە: ژێرچەنە.
ژێرچەنە: مـــوورووە یا پەتێکە ژنان دەیگرن بەژێر چەنەیاندا بۆ ئەوەی کلاوەکەیان دانەماڵێ.
ژێرخان: نهۆمێ هەرە خوار لە خانوو.
ژێرخستن: بریتییە لە قەرزارکردنی یەکێک. بریتییە لە زەبوونکردنی یەکێک لە کارێکدا.
ژێرخوان: خوانکە.
ژێردار: پیتێکە کە ژێری ببێ. هێندێ دەفری بنکدار.
ژێر دەرگا: دارێکە لەژێر دەرگادا گرێژەنەی لێ هەڵ دەکەنرێ.
ژێر دەرگانە: ژێر دەرگا.
ژێر دەریایی: جۆرە پاپۆڕێکی جەنگییە بەژێر دەریادا دەڕوا (غواصة).
ژێردەست: کەسێکە کە خواردەست و فەرمانبەرت بێ.
ژێردەستە: ژێردەست.
ژێردەستی: بوونی مەردووم بەژێردەست.
ژێردەسە: د. ژێردەست.
ژێر ڕاخەر: پارچە شتێکە کە ڕاخرابێ بۆ لەسەر دانیشتن.
ژێر زریە: ژێر دەریایی.
ژێر زووان: د. بریتییە لە بەرتیل: فیسار کەس (ژێر زووانی ناگە) واتە بەرتیلی داوەتێ.
ژێرزەمین: ژوورێکە لە زەویدا دروست کرابێ.
ژێرزەوین: د. ژێرزەمین.
ژێرزین: لبـــاد یا پەتۆیەکە لەژێر زین و لەسەر پشتی وڵاخ دادەنرێ.

ژێر سەماوەر: خشت یا تەنەکەیەکی تایبەتییە لەژێر سەماوەردا دادەنرێ.
ژێر قلیان: د. بەر قلیان.
ژێر قلیانی: د. خۆراکێکە کە بەیانیان لە ناشتا دەخورێ.
ژێر کـراس: کـراسـێکی کـورتی بێ قـۆڵە منداڵ و ژنان لەژێر کراسەوە لەبەری دەکەن.
ژێرکە: ژیشک.
ژێرکۆڵ: د. شێرکۆڵ. بەچکەی شێر.
ژێرکەفتن: ژێرکەوتن.
ژێرکەوتن: بریتییە لە زەبوونبوونی یەکێک لە کارێکدا. بریتییە لە قەرزار بوون.
ژێر کێرە: بریتییە لە ژێردەستێکی سووک.
ژێرگ: ژێروو.
ژێرگین: د. ژێرگ.
ژێر لچەکی: د. چپەکردن.
ژێرماڵە: ماڵێکە کە بەکرێ لە دەستەی خانوویەکتدا بێ کە خۆتی تێدا بیت.
ژێرەوژووربوون: وێرانبوونی شوێنێک بەجۆرێک کە سەرەونگوون بووبێ.
ژێرەخەر: ژێر ڕاخەر.
ژێرین: ژێرگین.
ژێڵ: د. گوڵووکی بەرسیلەی کە دەوەرێ لە کاتی ڕشانەوەیدا.
ژێهاتن: ز. قاڵبوونی گیاندار.
ژێهاتن: ز. گیانداری دەرهاتوو.
ژی: ز. ژیان.
ژیبوون: ز. جوێبوونەوە.
ژیدەرکەفتن: با. ڕابووردنی کارێک: ژی دەرکەفت: واتە ڕابوورد.
ژیر: مەردوومی تێگەیشتووی بەبیر.
ژیربوون: بێ دەنگبوونی منداڵی ساوا و نەگریانی.
ژیربوونەوە: دەست هەڵگرتنی منداڵ لە گریان و بێ دەنگبوونی.
ژیرکردن: خلافاندنی منداڵ و مەیدان نەدان بەگریانی.
ژیرکردنەوە: بێدەنگ کردنی منداڵ لە گریان.
ژیرکەلە: منداڵی ژیری جوانکیلە.
ژیرکەڵە: ژیرکەلە.
ژیرەوبوون: د. ژیربوونەوە.
ژیرەوکردن: د. ژیرکردنەوە.
ژیری: تێگەیشتن و وریایی.
ژیژو: ژیشک.
ژیژی: ژیشک.
ژیشک: گیاندارێکی خرپنەی ئەندام درکاویەیە گۆشتی دەخورێ.
ژیڤان: با. پەشیمان.
ژیڤانی: با. پەشیمانی.
ژیکەلە: ژیرکەلە.
ژیل: ئاگـرێکە کـە بووبێ بەخـۆڵەمـێش و تین و وردە پشکۆی مابێ.
ژیڵ: ژیل.
ژیلاووک: شیلاووگ.
ژیللک: ژیلاوک.
ژیلەمۆ: ژیڵ.
ژیڵەمۆ: ژیلەمۆ.
ژین: ژیان.
ژیوار: د. گوزەران و ژیان.
ژیوان: پەشیمان.
ژیوانی: پەشیمانی.



سا: پیتێکە دەچێتە سەر وەرامی شەرتێکی فڕێدراو لەبەر ئاشکرایی: (سا) منیش نایەمە لات لە وەرامی یەکێکدا کە پێت بڵێ ئیتر هاتوچۆت ناکەم، واتە ئەگەر نەیەیتە لام منیش نایەمە لات. سایەقە (هـ). سێبەر: لە (سا)ی تۆدا حەسامەوە (د). وەخت و کات: ئەو (سا) (ئێسا) لەو (سا)وە.

سابات: کەپرێکە کە بۆ سێبەر دروست کرابێ.

ساباق: شوێنی گەورەی وراقی بەر بەرەڵا.

سابرین: بزنە نێرێکە کە پێی نابێتە ساڵی سێیەم و هێڵرابێتەوە بۆ تۆو.

سابوون: شتێکە لە چەوری و قلیە دروست دەکرێ شتی چڵکنی پێ دەشۆرێ.

سابوناو: کەفاوێکە لە وردە سابوون و ئاوی گەرم دەگیرێتەوە بۆ کاڵا پێ شووشتن.

سابونچی: کەسێکە کە سابوون دروست بکا.

سابوونی: جۆرە کۆترێکە.

سابین: سابوون.

ساپ: ز. کۆمەڵەی گەنم و دانەوێڵە.

ساپیتک: با. ڕووی سەریان لە دیوی ژوورەوە.

ساپیتە: ساپیتک. چڵەپۆپە. بنمیچ.

سات: دەمێکی کەم.

ساتان: دەرپێ.

ساتاندن: ز. برنج کوتان.

ساتمەکردن: هەڵەنگوتن لە ڕۆیندا. هەڵەکردن لە گفتوگۆدا.

ساتۆر: ز. کێردی گەورە.

ساتۆرە: ساتۆر.

ساج: ئاسنێکی گردی لووسی قۆقزی تەنکە دەخرێتە سەر ئاگر و نانی پێ دەبرژێنرێ. جۆرە دارێکی سەختی جوانی بەنرخە لە دارتاشیدا بەکاردێنرێ.

ساجاخ: ساچاخ.

ساجلەخ: چەند پلپەیەکی زێڕین یا زیوینە دەکرێ بەسەر پرچدا.

ساچاخ: جۆرە ڕیشوویەکی بادراوی جوانە دەهێڵرێتەوە لە چوار کەناری سووزەنی و گۆشەی تاق و زین. بافتەی کەناری سەڵتە و کەوا.

ساچمە: وردە پارچەی قورقوشمە لەناو قەپاغی فیشەکدا، بەتفەنگ باڵندە و هێندێ نێچیری تری پێ دەکوژرێ.

ساچ و پەرچەم: زاج و پەرچەم.

ساخ: ساغ.

ساخت: د. کاری دەست: ئەم خانووە (ساخت)ی فیسار وەستایە.

ساختمان: کۆشکی گەورە.

ساخت و باخت: د. خلێنە و بلێنە.

ساختە: فڕوفێڵ و تەڵەکە.

ساختەچێتی: کردنی کاری ساختە و فێڵ.

ساختەچی: مەردوومی فێڵبازی درۆزن.

ساختەکار: ساختەچی.

ساختەکاری: ساختەچێتی.

ساخکردنەوە: ساغکردنەوە.

سادانی: جۆرە ترێیەکی سپی دەنک خڕی ناسکی هێشتوو شاشە.

سادە: شتی یەک ڕەنگ. بریتییە لە مەردوومی ساویلکە. کوڕێکە کە هێشتا مووی لێ نەهاتبێ.

سادەکار: سادە لۆح.

سادەکاری: سادەلۆحی.

سادەلۆح: مەردوومی بێ هۆش و بیر.

سادەلۆحی: سادەیی و بێ هۆش و بیری مەردووم.

سار: سارد (ز). وتەیەکە بە دوای هێندێ وتەی ترەوە کە نووسا زۆری مەعنای وتەکەی پێشوو دەگەیەنێ: کۆ (سار)، سەنگ (سار)، واتە شوێنێک کە کێو و سەنگی زۆربێ.

سارا: دەشت.

ساراکردنەوە: کردنی شوێنێک بەدەشت و تەختکردنی.
سارانشین: دەشت نشین.
سارد: شتێکە جگە لەوە نەبێ لە فێنکیش بەولاوە ترەوەبێ.
سارداو: ژێرزەمین، چاڵێکە لە دەشت هەڵکەنرابێ و سەرەکەی گیرابێ و ئاوی تێکرابێ بۆ خواردنەوە.
سارداوە: ل. حەوز.
ساردایی: تینی شتی سارد.
ساردبوون: نەمانی گەرما و هاتنی سەرما. بریتییە لە لووتەلابوونی یەکێک لە یەکێک.
ساردبوونەوە: لاچوونی گەرمی شت. بریتییە لە خاوبوونەوە لە کردنی کارێک. بریتییە لە مردن: فیسار کەس لە شەوەوە (ساردبۆتەوە) واتە مردووە.
ساردکردن: پەیدابوونی سەرما: پایز هات و دنیا (ساردی کرد).
ساردکردنەوە: نەهێشتنی گەرمی شت. بریتییە لە کوشتنی گیاندارێک. بریتییە لە پەشیمانکردنەوەی یەکێک لە کارێک.
سارد و سڕ: شتی زۆر سارد. بریتییە لە کەسێک کە ڕووی خۆش نەبێ لەگەڵ مەردوومدا.
سارد و سڕی: بریتییە لە ڕوو پێ نەدانی یەکێک بەیەکێک.
سارد و سەرما: کاتی سەرما و سۆڵە.
ساردۆنیا: گوڵێکی سووری جوانی گەلا پانە.
سارد و گەرم: شتی شیرتێن.
سارد و گەرمکەوتن: بریتییە لە با پەڕکردن.
ساردە: برنجێکە کە ئاوی پایزی خواردبێتەوە.
سارده سنگان: وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بەیەکێک بانگت کا. ئازارێکە لە سەرماوە پەیدا دەبێ و ناو سک کرژ دەکا.
ساردەمەنی: هەموو شتێکی سارد کە بۆ خواردن و خواردنەوە ئامادە کرابێ.
ساردی: سەرما و سۆڵە: نەخۆشی بەشی زۆری لە (ساردی)یەوەیە. شتی سارد: (ساردی) مەخۆ.
سارێژ: برینێکە کە گۆشتە و زوونی هێنابێتەوە.
سارێژبوون: چاکبوونەوە و پێست بەسەردا هاتنەوەی برین.
سارێژکردن: بریتییە لە ئاشتکردنەوەی یەکێک و دڵهێنانەوە جیێ.
سارمە: گیایەکی پایزییە گەلای وەک شنگ وایە گوڵێکی زەردی پچووک دەگرێ. جۆرە تەقەڵێکی تێ هەڵکێشە زیندروو بۆ جوانی دەیکا لە زین. قۆزاخەی ئاوریشمی هەڵکراو (د).
سارۆخ: د. سەرپۆش.
سارومار: وتەیەکە شتی زۆر بۆگەنی پێ دەشوبهێنرێ: ئەو شتە بۆنی (سارومار)ی لێ دێ، واتە زۆر بۆگەنە.

سارە: سبەینێ.
سارەما: تێ بەردانی کار و بەرخ لە بەیانیاندا لە پێش دۆشینی دایکەکانیان.
سارەوان: حوشترەوان.
ساری: با. ساردی.
ساز: شتی جوانی ڕێکخراو. قامیش. پارچەیەکە لە پارچەکانی مۆسیقا.
سازان: ڕێکەوتنی یەکێک لەگەڵ یەکێکی تردا: فیسار کەس و فیسار کەس (سازان). ناوی دێیەکە لە ناوچەی هەڵەبجە.
سازاندن: ڕێکخستنی یەکێک یا شتێک.
سازبوون: ڕێکەوتن.
سازبەند: ز. کەسێکە کە (ساز) باش لێ بدا.
سازدان: سازکردن.
سازکردن: ڕێکخستنی شتێک.
سازگار: ئاووهەوایەکە کە سووک بێ و بەئەندام بکەوێ.
سازگاری: سووکی و خۆشی ئاووهەوای شوێنێک.
سازندە: چەنەباز. کار و فرمان ڕێکخەر.
سازندەیی: چەنەبازی.
سازنە: د. سازندە.
ساز و سەودا: کەڵکەڵەی شتێک: تۆ منت خستە سەر ئەم (ساز و سەودا)یە.
سازیان: د. سازان.
سازین: سازان.
ساغ: شتی دروستی بێ کەل و کۆم. گیاندارێکە کە نەخۆش نەبێ. بریتییە لە مەردوومی ڕاستی بێ فڕ و فێڵ.
ساغبوونەوە: چاکبوونەوەی نەخۆش. فرۆشرانی شتێک و نەمانەوەی: تووتنەکەم هەموو بۆ (ساغ بووەوە) واتە فرۆشرا. دەرچوونی شەریک لە شتێکدا و مانەوەی بۆ تۆ: خانووەکەم بۆ (ساغ بووەوە) واتە هەموو بەشەکانی بوو بەهی خۆم.
ساغکردنەوە: چاککردنەوە. فرۆشتنی شتێک و نەهێشتنەوەی. دەرکردنی شەریک لە شتێکدا و هێشتنەوەی بۆ خۆت.
ساغڵەم: ساغ.
ساغی: بێ کەلوکۆمی شت. نەخۆش نەبوونی گیاندار. ڕاستی و بێ فڕوفێڵی مەردووم.
ساف: شتی لووس. شتی پاکی بێ خەوش: ئەم ئاوە (ساف)ە کندر (د).
سافسافێن: یارییەکە منداڵان بەردێک بەقنجەوە دادەنێن و لە دوورەوە بەردی پانی سافی بەخشکەیی تێ دەگرن.
سافیلکە: ساویلکە.
ساف: زوکام.

ساڤا: با. ساوا.
ساڤار: ز. ساوەر.
ساق: ساغ. ڕیقنەی شلی پەلەوور. قەدی درەخت و سەوزایی.
ساقۆ: پاڵتۆ.
ساقۆڵ: سەبەتەی ترێ. لولاق (د). باسکی دەست (د).
ساقەتە: د. قەدی درەخت و سەوزایی.
ساقی: ساغی.
ساقی و باقی: گـۆڕینەوەی شـتـێک بە شـتـێک لەگـەڵ باقی دانەوەدا.
ساک: ز. بەچکەی گامێش.
ساکار: شتی یەک ڕەنگی بێ گوڵ.
ساکۆ: د. سەکۆ. کێوی سادە کە بەرد و داری پێوە نەبێ.
ساکۆل: ز. گیانداری گەمژ.
ساکوول: قووڵ.
ساڵ: ناوە بۆ دوانزە مانگ کە ڕۆژ چەرخەیەکی تەواوی تێدا دەکا لە کـەلووی بەرخ (حـمـل)ەوە تا دوایی کـەلووی مـاسی (حوت).
سالار: سەرداری هۆزێک.
سالاری: سەرداری.
ساڵانە: مووچەیەکە ساڵە و ساڵ بدرێ بەیەکێک. خێرێکە دەکرێ بۆ مردوو لە پاش تێپەڕینی ساڵێک بەسەر مردنیدا.
سالم: د. سالمە.
سالمە: گـیـایەکی سـەلکداری بەهارییـە سـەلکەکـەی بەنرخـە و بەکاری گەلێ شت دێ.
ساڵنامە: نووسراوێکە باسی هەموو ڕۆژێک دەکا لە ساڵ.
ساڵنما: د. ساڵنامە.
سالۆس: ز. ڕیاباز.
سالۆغ: سۆراخکردن.
سالووس: شتی سادەی ساف و لووس.
سالووق: تووکی نەرمی گیاندار.
ساڵیان: د. ساڵیانە.
ساڵیانە: ساڵانەی مردوو.
سالیس: تێلای لووسی بێ گرێ.
سام: ترس و بیمێکە کە هێندێ جار لە گیاندار دەنیشێ.
سامال: . سایەقە.
سامالکردن: لاچوونی هەور و پەیدابوونی سایەقە.
سامالە کردن: ماڵەکردنی دووبارەی زەوی.
سامان: دارایی و دەست ڕۆیشتن. ئامان: ئاو و ئاگر (سامان)یان نییە، واتە بێ ئامانن.
ساماندار: دەوڵەمەند.
ساماندن: د. ڕێکخستنی شت.
سامانگە: شوێنێکە دراو و سامانی تێدا دابنرێ.
سامتین: جۆرە دەزوویەکی پوختی بریقەداری قایمە.
سامدار: شتی بە سام.
سامکردن: ترسان.
سام لێ کردن: ترسان لە شتێک.
سام لێ نیشتن: زۆر ترسان لە شتێک.
سامۆتک: تارمایی.
سامۆتە: بەن سامۆتە.
سامناک: شتی بە سام.
سامیتیل: ز. بەنێکە کە هەر دوو سەری نیلی پێ دەبەسترێ.
سامیر: ز. جۆرێکە لە هەرزن.
سـان: وتەیەکـە بەدوای هێندێ وتەوە دەنووسێ زۆربەی مـەعنـای وتەی پێـشـوو دەگـەیەنێ: کـیـو (سـان)، گـوڵ (سـان) کـورد (سـان) واتە جێگای کێـو و گـوڵ و کـوردی زۆر. وتەیەکـە لە ڕووی گەورەییەوە دەوترێ بەهێندێ پیاو (هـ).
سانا: ئاسان.
ساناڵە: هـ. شوێنێکە کە سواغدرابێ و هێلەساو کرابێ بۆ میوە لەسەر هەڵخستن.
ساناهی: با. ئاسان.
سانایی: ساناهی.
سـانبـەستن: کـۆبوونەوە لە شـوێنێک بۆ ڕۆین لەو شـوێنەوە بۆ جێگایەکی تر: لەشکرەکە (سانی بەستووە).
سانتیمتر: سەد یەکی مەترێک.
سانتیم: سانتیمتر. سامتین.
سانجۆر: ز. ژانەسک.
سانجۆل: ز. قەلاتەی ملی سەگ.
سـاو: مـەودای تیغ: ئەو تیـغـە لە (سـاو) چووە، واتە مـەودای نەماوە. هەتاو. سێو (هـ).
سـاوا: بەچکەی کـۆرپەی گـیـاندار. سـەوزاییی تازە دەرهاتوو. لێکەوتنی ئەندام لە شـتـێک: ئەم شـتـە (سـاوا)ی زبرە یا لووسە یا ساردە یا گەرمە (د).
ساوار: ساوەر.
ساویان: ساوین.
سـاوایی: هەسـتـی لێکەوتن (قـوەی لامـسـە). کـاتی منداڵی گیاندار. سێو.
ساودان: سوونی تیغ.
ساورێن: سابرێن.
ساوور: د. ساوەر.
ساوورمە: داری سووتەمەنی وشکی لووسی بێ قەڵبە.

ساوورین: د. چێشتی ساوەر.
ساوون: د. سابوون.
ساوەر: گەنمی کوڵاوی کوتراوی هاڕراو. سابرێن (د).
ساوەرکوت: کەسێکە ساوەر بکوتێ.
ساوەرین: سابرێن.
ساوەڵ: چوارچێوەیەکی دارینە دەخرێتە سەرپشتی ولاغ بۆ دار پێ کێشان.
ساویاگ: چەقۆیەکە سوورابێ. شتێکە کە ورد کرابێ و سوورابێتەوە.
ساویلکە: مەردوومی بەسەزمان.
ساوی: ز. خواردەمەنییەکە لە دێهات کۆبکرێتەوە.
ساوین: سوونی تیغ بۆ تیژبوونی. هاڕینەوە و وردکردنی شت.
ساوینەوە: سوونەوە.
ساهی: ز. سایەقە.
سای: سایەقە. سێبەر.
سایقە: د. سایەقە.
سایلە: پەڵوولە.
سایە: سێبەر. خوێندنەوەی شت بەحەینجە. ژەنگی ئاسن. ژمارەیەکە لە یاری ئەسکەملدا: پاپاز چوار (سایە) ڕادەکێشێ.
سایەبان: سایەچەور. شتێکە کە سێبەری بێ.
سایەچەور: بریتییە لە مەردوومی بەرچاو تێر کە مەردوومی تر لە سایەیدا بحەسێتەوە.
سایەدار: بریتییە لە کەسێک کە مەردووم لە سێبەریدا بحەسێتەوە.
سایەقە: ئاسمانی بێ هەور و تەم و مژ.
سایەک: ل. سێبەر.
سایەوان: د. سایەبان.
سایەوشک: بریتییە لە مەردوومی ڕژدی چرووک.
ساین: ساوین.
سبحەینی: سبەینێ.
سبزوو: سبەینێ زوو.
سبە: ز. سبەینێ.
سبەی: سبەینێ.
سبەینان: دەمەدەمی بەیانیان.
سبەینە: د. سبەینێ.
سبەینێ: ڕۆژی پاش ئەو ڕۆژەی کە تێیدایت.
سبەینیان: سبەینان.
سبیل: سمێڵ (ل). سەبیل.
سپا: لەشکر.
سپات: شتێکە کە ڕەنگی سپی واش بێ.
سپارتن: ز. سپاردن.
سپاخانە: جێی سۆپا.
سپادار: سەرلەشکر.
سپاردن: دانانی شتێک لەلای یەکێک بۆ ئاگاداری کردنی. بەڕێکردن.
سپاردە: شتێکە لەلای یەکێک دانرابێ بۆ ئاگاداری کردنی. بەڕێکراو.
سپاردەیی: شتی سپاردە.
سپاڕانی: لەشکرگێڕی (قیادة).
سپارده: سپاردە.
سپاردەیی: شتی سپاردە.
سپاس: د. سوپاس.
سپاسالار: سپادار.
سپاسکار: کەسێکە کە سوپاسی یەکێک بکا.
سپاگا: سپاخانە.
سپایی: ئەسپایی. سەرباز.
سپر: هەڵۆ.
سپڵ: لەپارە گوشتێکی شینکارە بەلای جەرگی گیاندارەوە.
سپڵۆ: ل. سەگ.
سپڵۆت: د. سپڵۆک.
سپڵۆتی: د. گڵاوی.
سپڵۆک: سەگ. گڵاو.
سپڵوێنک: دارێکی وشکی کەوتووە کە لەبەر کۆنی سپی هەڵگەڕابێ.
سپڵە: کەسێکە کە چاکەی لەبەرچاو نەبێ.
سپڵەیی: لە پێش چاونەبوونی چاکەی مەردووم.
سپڵی لاورگ: بریتییە لە کەسێک کە نەتەوێ و هەمیشە لووتیشی بەلووتتەوە بێ.
سپۆن: ئەسپۆن.
سپە: ئەسپێ (ز). سەگ.
سپەر: قەڵغان. سەنگەر.
سپەردە: د. سپاردە.
سپەناخ: ئەسپەناغ.
سپەهی: با. شتی زۆر چاک.
سپێ: ئەسپێ.
سپیاڤ: ز. سپیاو.
سپیان: مەڕ. گۆشتی مەڕ.
سپیاو: جۆرە دەرمانێکی وردی سپییە لە قەڵایی و هێندێ شتی تر دروست دەکرێ ژنان دەموچاوی پێ جوان دەکەن.

سپیاوکردن: سپیاودان لە دەموچاو.
سپیاوۆکە: هێلکاو.
سپیاهی: سپیایی.
سپیایی: بریتییە لە شیر و ماست و دۆ و کەرە.
سپێتی: بوونی شت بەسپی.
سپێدە: با. سپیدە.
سپێر: سپەر.
سپێرراو: سپاردە.
سپیلک: گلە سپی. ئەسپی سپی.
سپیلکە: جۆرێکە لە مازوو کە پێستەی پێ خۆش دەکرێ.
سپێناغ: ئەسپەناغ.
سپیندار: سپیدار.
سپێنە: بەشی سپی لە هێلکە. بەشی سپی لە گلێنەی چاو.
سپێوون: ئەسپێ ون.
سپی: جۆرە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی بەفر.
سپی بوون: سپی هەڵگەڕان. بریتییە لە ترسان.
سپی بوونەوە: کاڵبوونەوەی ڕەنگی شت و سپی واشبوونی.
سپیدار: چنار.
سپیدبالا: ڕووناکییەکە لە پێش بەیانیاندا بەرزدەبێتەوە بۆ ناوەڕاستی ئاسمان (فجری کاذب).
سپید پەهنا: ڕووناکییەکە دوای سپید بالا بەکەناری ئاسماندا بلاو دەبێتەوە (فجری صادق).
سپیدە: کاتی بەری بەیان کە کەناری ئاسمان ڕووناک دەبێتەوە.
سپیکاری: گەچکاری: هۆدەکانم هەموو (سپیکاری)ن.
سپیکردن: گوروونی پێستی ئاژاڵی سەربڕاو. پاککردنی بادام و هێندێ شتی تر لە توێکڵە تەنکەکەی.
سپیکردنەوە: گەچکاریکردنی شوێنێک. پاککردنەوەی قاپی مسین بەقەلایی.
سپیکە: جۆرە ترێیەکی دەنک درێژکۆلەی پێست ئەستووری سپی زۆر شیرینە.
سپیواش: شتێکە کەمێک سپی بێ.
سپی هەڵگەڕان: سپیبوون لە ترسا یا لەبەر نەخۆشی.
ستار: ئارام: منداڵەکە ئەمشەو (ستار)ی نەداوە.
ستارخانی: جۆرە کالایەکە وەک (مرادخانی) بەلام ئەم یەخە بەرەلا و چەسپترە.
ستار کردن: ئارامگرتن.
ستارگرتن: ئارامگرتن.
ستارە: دیوارێکی نزمی کون کونە بەگردی سەربانەدا دەکرێ. ئەستێرە. ستار.
ستاف: هەتاو.

ستان: پیتێکە بەدوای هێندێ ناوەوە دەنرێ و دەیکا بە(اسمی مکان) کورد(ستان)، دار(ستان)، گۆڕ(ستان) واتە جێی ئەمانە.
ستاندن: سەندن.
ستاندنەوە: سەندنەوە.
ستانک: با. زەردەواڵە.
ستایش: مەدح و پیاهەڵدان.
ستایشت: د. ستایش.
ستر: با. پەیژە.
ستران: ز. گۆرانی.
سترانبێژ: ز. گۆرانیبێژ.
سترانڤا: ز. سترانبێژ.
سترد: ستر.
سترۆ: ز. سترۆە.
سترۆە: ز. شاخی گیاندار.
سترە: سترۆ.
ستری: با. تووترک. دڕک.
ستریبرک: ز. دارێکی دوو پەلە دڕکی پێ دەشکێنرێتەوە.
ستک: گیایەکە لە کاتی جۆدرەودا پەیدا دەبێ، بەرێکی شیرین بەهێشوو وەک ترێ دەگرێ.
ستۆ: با. ئەستۆ.
ستۆپارێز: ملپێچ.
ستوو: ز. ئەستۆ.
ستوور: ز. ئەستوور.
ستووری: ئەستووری.
ستووڤدان: گەواهیدان.
ستوون: ئەستوون. ڕیزە نووسینێکە کە لەسەر شان بێتە خوارەوە.
ستوونە: کۆڵەکە.
ستوونی: شتی ڕاستی عامووودی.
ستە: با. ئەستێ.
ستەرک: مێزی لەسەر نووسین.
ستەکان: ئیستیکان.
ستەم: ئازار و سزا بەناڕەوا. شتی گرانی بەئەرک: بەزستانان زۆر (ستەم)ە بێتمە دەرێ.
ستەمدیدە: کەسێکە ستەمی لێ کرابێ.
ستەمکار: کەسێکە زۆر ستەم بکا لە مەردووم.
ستەمکاری: ستەمکردن بەپیشە.
ستەمکردن: ئازاردان و زیان گەیاندن بەمەردووم بەناڕەوا.
ستەمگەر: زۆردار.
ستەنک: با. زەردەواڵە.

ستەو: با. ئەستێ.
ستەور: نەزۆک.
ستێر: ز. ئەستێرە.
ستێرە: ز. ئەستێرە.
ستینک: با. کۆڵەکە.
ستینگ: شەنگە سوورە.
سج: زێ.
سجووق: شتێکی درێژکۆلەی شیرینی پڕ لە بادام و کاکڵە گوێزە لە نیشاستە و شیلەی ترێ دروست دەکرێ.
سجەمار: جۆرە مارێکە لە تیرەمار درێژترە هەر حەلێ ڕقی هەستا قەڵەمبازد دەبا بەقەد گوریسێک.
سچ: زێ.
سحالە: ل. ئاردە برنج.
سخ: سفت.
سخان: ل. ئێسقان.
سخمە: سوخمە.
سخێف: جوێن.
سر: ز. بای سارد.
سرپە: قسەکردن لەژێر لێوەوە بۆ ئەوەی کە کەس گوێی لێ نەبێ، (سرپە سرپ) سرپەی یەک لەدوای یەک (سرپ و هووڕ) سرپە سرپی زۆر.
سرت: هـ. دڕک.
سرتە: سرپە.
سرد: ز، گیانداری سرک.
سردی: هـ. پەیژە.
سردین: ز. کەوتنە قەف و گوڵی جۆ و گەنم و دانەوێڵە.
سڕ: شوێنێکە لە ئەندام کە تەزیبێ. گیاندارێکە کە لە سەرما کەسیرە بووبێ.
سڕبوون: تەزین. کەسیرە بوون.
سڕکردن: تەزاندن و بێ هەستکردنی ئەندام بە دەرمان.
سڕکەوان: سەرەنوێلک.
سڕنا: زورنا.
سڕناتک: زۆرناتک.
سڕناژەن: زوڕناژەن.
سڕوار: ڕیتاڵە.
سڕە: گەمڕە.
سڕی: تەزینی ئەندام.
سڕین: لابردنی شتێک لەسەر شتێک. بەهۆی لێ خستنی دەست یا پەڕۆیەکەوە. فمکردنی لووت و پاککردنەوەی.
سڕینەوە: هەڵگرتنەوەی نووسراو بە زمان یا بەپەنجە.

سرشت: د. سرووشت.
سرەفتن: د. سرەوتن.
سرک: گیانلەبەرێکە کە لە شت زۆر بسڵەمێتەوە.
سرکاسن: د. ڕەنگێکی ڕەشە کەوشدروو لە سرکە و ئاسن دروستی دەکا و چەرمی پێ ڕەش دەکا.
سرکاندن: چرپاندن بەگوێی یەکێکدا.
سرکانن: د. سرکاندن.
سرکە: شتێکی شلی ترشە لە ترێ و میوە دروست دەکرێ. سرپە، (سرکە سرک) سرکەی یەک لەدوای یەک، (سرک و هووڕ) سرکە سرکی زۆر.
سرکەی دە ساڵە: د. بریتییە لە قینی کۆن کە لە دڵدا مابێ.
سرکەیی: پارچە ئاوریشمێکی ڕەنگاوڕەنگی زۆر تەنکە ژنان دەیبەستن بە سەرەوە.
سرگ: سرک.
سرمە سرم: هەرا و زەنا.
سروشت: طبیعت.
سروشتی: سووروشتی.
سرووت: لاسکی گەنم و جۆ.
سروود: گۆرانی نیشتمانی.
سرووش: فەرمانێکە بەهۆی فریشتەوە لە خواوە بێ بۆ پێغەمبەران (وحي).
سروە: دەنگی بای سووک. سووسەکردنی دەنگوباسێکی تازە.
سرەوان: سرەوتگرتن.
سرەوانن: د. سرەوتگرتن بەیەکێک.
سرەوت: ئارام: نەخۆشەکە ئەمشەو (سرەوت)ی نەبوو.
سرەوتکردن: سرەوتگرتن.
سرەوتگرتن: سرەوتن.
سرەوتن: ئارامگرتن.
سرەوین: سرەوتن.
سرێش: شتێکی لینجی کەشدارە دەهاڕدرێتەوە و بەئاو دەگیرێتەوە بۆ بەیەکەوە لکاندنی کاغەز و هێندێ شتی تر.
سرێشلەمە: بریتییە لە کاری جەڵغەمەی ناپوخت.
سرینچک: د. سنجوو.
سرینچکەتاڵە: د. جۆرێکە لە سنجوو.
سریوە: سروە.
سزا: ئازار و دەردی سەری.
سزاچەشتن: سزا خواردن.
سزاخواردن: داخ و خەفەت چوونە دڵ.
سزادان: ئازار و دەردی سەری دانی گیاندارێک.
سزک: ئاوی پەنیرە کە دەکرێ بە لۆرک. ئاوی دۆیە کە سیرێژی لێ دەکرێ.

سژ: زچ.
سس: د. سست.
سست: گیانداری بێ دەستوبرد، (سستبوون) نەمانی تەوژم و دەستوبردی.
سستەپەلە: کەسێکە کە لە کاروباردا سست و دەسەپاچە بێ.
سستەک: زەوی فشی بێ بەرد.
سستی: خاو و خلیچکی و بێ دەستوبردی، (سستەسست) خاوەخاوکردن لە کارێکدا.
سسە: د. سستەک.
سسێ: ز. سێ.
سسی: د. سستی.
سغ: سخ.
سفارش: سفارشت.
سفارشت: د. قسەیەکە بەیەکێکدا بنێردرێت بۆ یەکێک.
سفت: چنراوێکە کە شاش نەبێ.
سفتاح: فرۆشتنی شتێک یەکەم جار سەرلەبەیانی لەلایەن شت فرۆشێکەوە بە پارەی دەستی.
سفتبوون: د. سەختبوونی شت.
سفتۆ: ز. شتی بۆگەن.
سفت و سۆ: سفتوسوێ.
سفت و سۆڵ: شتی زۆر سفت.
سفت و سوێ: ئازار و ئێشی برین: ئەم دەرمانە (سفتوسوێ)ی برین دەشکێنێ.
سفتە: د. شتی سووراوەی لووس.
سفرە: پارچە تەنراوێکی چوارگۆشەی درێژە نانی لەسەر دەخورێ.
سفرە برە: جۆرە قالۆنچەیەکی رەشی خێرایە سفرە کون دەکا.
سفرەچی: کەسێکە کە چاودێری نان و خوان بکا.
سفرە مار: جۆرەمارێکی کورتی کوێرە لۆچێک لە سکیدا هەیە کاتێک کە برسی بوو وەک سفرە یەکالای دەکاتەوە، مێش و دەعبای لێ دەنیشێ و دەیهێنێتەوە یەک و دەیانخوا.
سفرەی فەقێیان: د. هەشت ئەستێرەن لە ناوەندی ئەستێرەی دووپشک و ترازوودا.
سفرەی فەقیران: د. سفرەی فەقێیان.
سفری: ز. بەردە ئەستێی چەخماخی تفەنگی شینکە کە درێژکۆلە بێ.
سفک: با. هەیوانی خانووی یەک نهۆم .
سفکی: سووکی.
سفن: ز. بنج و بناوانی هەموو شتێک.
سفۆری: ز. کەولێکە لە پێستی سەگلاو دروست کرابێ.
سفەت: چاکە لە بەرچاو بوون (وفا): فیسار کەس بە(سفەت)ە.

سفی: د. سپی.
سفیدە: د. سپیدە.
سڤدەهـ: ز. سەر دەرگای خانوو کە بە خشت بەرزدەکرێتەوە.
سڤسڤیلک: ز. جۆرە چۆلەکەیەکی رەنگاورەنگە.
سڤک: با. سووک.
سڤنک: ز. گەسکێکە دەهێنرێ بەپشتی گادا بۆ پاککردنەوەی.
سڤۆک: سماق.
سڤووری: سمۆرە.
سڤیشک: ز. گومان و دوودڵی لە شتێکدا.
سڤیک: بنمیچ.
سقان: د. ئێسقان.
سک: بۆشاییەکە لە گیاندارادا ریخۆڵە و ورگی تێدایە. بریتییە لە منداڵی ناو سک: فیسارە ئافرەت (سک)ەکەی دانا. شتی ناشیرین لە هەموو شتێک.
سکاسن: د. سرکاسن.
سکاڵا: هەڵرشتنی داخ و خەفەتی دڵ لای یەکێک، (سکاڵا کردن) سکاڵا.
سکاڵانامە: پێشکەشکردنی سکاڵا بەنووسین بۆ فەرمانبەرێک.
سکانن: د. چەسپانن. جوێن دان.
سک ئێشە: ئازاری سک.
سکبەردان: زکبەردان.
سکپ: د. داری گرێژەنەی دەرگا.
سکپڕ: گیانداری ئاوس.
سک پڕبوون: ئاوسبوونی ئافرەت.
سکچوون: زکچوون.
سکدار: سکپڕ.
سکدڕاو: بریتییە لە گیانداری زۆرخۆر.
سکر: با. بەرهەڵستێکە دروست دەکرێ لە بەریانی ئاودا بۆ هەڵسانی بۆ شوێنێکی بەرز.
سکڕژین: سکچوون.
سکزل: زکزل.
سکسووتان: بریتییە لە مردنی رۆڵە.
سکف: د. سکپ.
سککردن: زککردن.
سکڵ: پشکۆی ئاگر.
سکڵفوو: جۆرە یارییەکە پشکۆیەک ئاگر بەدەرزییەک و تاوێ دەزوو هەڵدەواسرێ بەبنمیچدا چەند کەسێک بەدەوریدا فووی لێ دەکەن، هەریەکە بەرەورووی ئەویتر.
سکماک: زکماک.
سکن: سکزل.

سکنانەسەر: بریتییە لە خواردنی شتێک بەهەڵمەت و ئارەزووەوە.
سکور: ملی گیاندار.
سکورد: سکور.
سکوزا: زاوزێ.
سکووم: ڕووخسار.
سکە: دراوی هەڵکەنراوی دەوڵەتی.
سکەڕۆ: سکدڕاو.
سکەشۆرە: سکەشۆرێ.
سکەشۆرێ: ڕەوانی مەردووم بەجۆرێک کە هیچی لە سکدا نەمێنێ.
سکەڵ: سکڵ.
سکەلێدان: دراولێدان بەزۆری.
سکەنجەبین: شەربەتێکە لە سرکە و هەنگوین دەگیرێتەوە.
سکێشە: ئازاری سک.
سکەنجەمین: سکەنجەبین.
سگار: د. جگەرە.
سگێن: د. پێوەبوونی سەگی نێر و مێ.
سل: پێسی توندی درێژکۆڵەی مەردووم و سەگ و هێندێ گیانداری تر. سیل (د). (سڵ) ز. تووڕە.
سڵ: ترسان و کۆکردن، (سڵکردن) سڵ.
سلاربوونەوە: تلۆربوونەوە.
سلاڤ: با. سەلام.
سلاو: زیادەیەکە کە دەخرێتە سەر ئەو شتەی کە بەترازوو دەکێشرێ بۆ ئەوەی کە لە سەنگەکە قورستر بێ. سەلام.
سلاودانەوە: کێشانی شت بەترازوو بەڕەنگێک کە قورستر بێ لە سەنگەکە. لە نوێژبوونەوە بەئاوردانەوە بەلای ڕاستدا.
سلبوون: با. تۆران و زویربوون.
سلپ: د. مەردوومی تەمەڵ.
سلساردبوونەوە: بریتییە لە مردن.
سلساردکردنەوە: بریتییە لە کوشتن.
سڵسڵە: پۆیلە و پلپلەیە کە ژنان دەیدەن لە خۆیان.
سلسەردەوەبوون: د. سلساردبوونەوە.
سلف: د. تلپەی شت.
سلق: گیایەکی گەڵا پانی بنکدارە دەکرێ بەچێشت.
سلقاو: شۆربایەکە لە ئاو و سلق و گۆشت دەکرێ.
سلقی ڕووت: وتەیەکە مەردوومی بێکەسی پێ دەشوبهێنرێ: فیسارکەس وەک (سلقی ڕووت) وایە، واتە بێ کەسە.
سلک: ز. سلق.
سڵ کردن: سڵەمینەوە لە شتێک.
سلۆرت: بێ ئیش.
سڵەمانەوە: سڵەمینەوە.
سڵەمە: د. سڵەمینەوە.
سڵەمیانەوە: د. سڵەمینەوە.
سڵەمینەوە: کوتوپڕ گەڕانەوە لە شتێک و وردبوونەوە لێی.
سلەوجە: جۆرە نەخۆشییەکە دەدا لە مەڕ و بزن خواردەمەنی بۆ قووت ناچێ و دەچێتە ناوەندی گووپ و دانیەوە.
سلەوجێ: سلەوجە.
سلێمانی: جۆرە مووروویەکی ڕەشی پانە کێڕێکی سپی لە ناوەڕاستدایە، ژنان دەیگرنە زێڕ و دەیکەنە ملیان. ناوە بۆ جۆرە ترێیەک (با). ناوە بۆ شارێکی گەورە لە کوردستانی عێراق کە پایتەختی حاکمانی بەبە بووە.
سلێمانی: د. مووروی سلێمانی.
سم: شتێکی ڕەقە بەژێر چوارپەلی ئاژاڵ و وڵاخی بەرزەوە وەک نینۆک بۆ ئادەمی وایە.
سماتە: سمارتە.
سمارتە: کاغەزێکی زبرە وەک برپەند ئاسن و گەلێ شتی تری پێ دەکرێنرێ.
سماق: داری ترش. بەری داری ترش.
سماق پالان: ز. سووزگییەکە برنجی پێ دەپاڵێورێ.
سماق دەرهێنان: بریتییە لە ئازار گەیاندنێکی زۆر بەیەکێک.
سماقە: د. ڕەوونج.
سمبر: ز. سم تەراش.
سبۆرە: سمۆرە.
سمبێل: سمێڵ.
سمبێڵ: سمێڵ.
سمبیلەک: ز. جۆرە ماسییەکی زەردە.
سمپارە: کاغەز.
سمت: دوو گوڵمە گۆشتی گەورەیە بەلای ڕاست و چەپی کۆمی گیاندارەوە.
سمتاش: سم تەراش.
سمت و ساتان: سمت و نەرمایی هەردوو ڕان کە لە پشتەوە دەردەکەوێ.
سمتۆڵ: د. سمت.
سمتەجۆڵە: ئێسقانی جەمسەری هەردوو سمتی گیاندار.
سمتەراش: ئاسنێکی پانی تیژە ناڵبەند سمی وڵاخی پێ دەتاشێ.
سمتەکڵ: گلمتک.
سمدار: بریتییە لە گیاندارێک کە سمی بێ.
سمڕ: هەرا و هوریا و دەنگە دەنگ: لە فیسارە شوێن (سمڕ) بوو، (سمڕ سمڕ) هەرا و هوریای زۆر.

سمقه: ڕاسته زەوییەکه بکریّ به مەرەزە بەبێ کێڵان.
سمکاک: ز. دەنکی گیایەکی سووره لەگەڵ بەزدا دەکوترێ و دەنرێ لە گوێچکەی منداڵ کە بیەشێ.
سمکۆ: د. سمکۆڵ.
سمکۆت: کەوچکی ماستاوی پچکۆله .
سمکۆڵ: دەست بەزەویدا دانانی وڵاخی بەرزه و هەڵکۆڵینی.
سمکۆلان: سمکۆڵ.
سمەکوتێ: سمکۆڵان.
سمڵ: بنکی گیایەکی بەهاری بۆنخۆشه.
سمنج: چرووک.
سمۆ: قەڵەمێکی پۆڵایینه ئاسنی پێ کون دەکرێ.
سمۆرچکه: سمی ئاژاڵی وردەیه که دەرهاتبێ.
سمۆره: دەعبایەکی چنگ تیژی کێوییه له ڕێوی دەچێ بەڵام گەلێ پچووکتره پێستەکەی دەکرێ بەکیسه پاره.
سمووچک: سمۆرچکه.
سمه: سمۆ.
سمەخرته: د. گیانلەبەرێکی دەست و پێ کورته.
سمەر: ه. کا.
سمەری: کا. کای کۆن.
سمەسا: ملّەما: (سمەسا)ی بری واته ملّەمای بری.
سمه شەله: د. شەلکه.
سمیارک: ز. سیسارک.
سمیتک: با. پیرخەنیله.
سمێریان: د. تێکسمران و قەڵەوبوون.
سمێڵ: مووی سەر لچ و بەرلووتی گیاندار.
سمێڵ بابڕ: مەردوومی سمێڵ زل.
سمێڵه: جۆره ماسییەکی سمێڵداره.
سمین: کونکردنی شت.
سن: دەعبایەکی پچکۆلەی پشت قۆقزی بۆرەقنەی باڵداره له هەر گەنم و جۆیەک بدا بێ پێزی دەکات.
سنان: د. سندان.
سنپنک: ز. گیایەکی بۆن خۆشه تێکەڵی پەنیر دەکرێ.
سنتر: ز. منداڵی هەتیوی بێکەس.
سنجاخ: سنجاق.
سنجاف: پەراوێز.
سنجاق: دەرزییەکی سەر خڕ له یەخه دەدرێ.
سنجراندن: ز. تەنوور داخستن.
سنجک: ز. دەفرێکی درێژکۆلەیه له قوڕ دروست دەکرێ لەژێر بێشکەی منداڵ دادەنرێ بۆ پیسی تێچوونی.
سنجۆق: ز. ڕیخۆڵه گەورەی گیاندار.
سنجوو: دارێکه گەڵای وەک بی وایه بەرێکی شیرینی هەیه وەک خورما بەڵام تۆزێک پچووکتره.
سنجووق: دارێکی تیژی سەر دادراوه منداڵان بەزەویدا دای دەکوتن له یاری سنجووقێندا.
سنجووقێن: یاری کردن بەسنجووق.
سنجەق: سنجاق.
سنجەی: ه. عەنناب.
سنجێری: ز. جۆره ترێیەکی شیرینه دەکرێ بەدۆشاو.
سنجی: ز. درەختێکه دەنکێکی ترش دەگرێ.
سندان: سنگان.
سنداناوی: سنگاناوی.
سندانک: کووپەڵه.
سندان لێدراو: سنگان لێدراو.
سندک: ز. پیرخەنیله.
سندم: پێوەندی ئاسن.
سندمکردن: پێوەندکردن.
سندۆڵ: دۆڵی بەرد که شتی تێدا دەکوترێ.
سندووق: شتێکی چوار سووچی سەر قاپداره له تەخته یا ئاسن دروست دەکرێ بۆ شت تێخستن. غەرامەفۆن.
سنده: گڵمتک.
سندەگڵ: سنده.
سنسل: بربڕەی پشت.
سنک: سەمەندۆک.
سنک کردن: سەمەندۆک کردن.
سنگ: دار یا ئاسنێکی سەر تیژه بەدیوار یا بەزەویدا داکوترێ. پانایی ناوەندی هەر دوو مەمک و خوار چۆڵەمەی مل. کرمی ناوسک (د). شووژن (د).
سنگان: جۆره نەخۆشییەکی کوشندەیه تووشی گیاندار دەبێ. جۆره نەخۆشییەکه دەدا له کاڵەک و شووتی و ترۆزی و ڕەقی دەکا.
سنگاناوی: میوەی سنگان لێدراو.
سنگان لێدراو: سنگاناوی.
سنگدانه پێشەوە: دڕدان به مەردووم و چوونه پێشەوە بۆ شتێک.
سنگ زەرده: مەلێکی پچکۆلانەی ژێر سک زەردی سەرپشت ڕەنگاوڕەنگه بەقەد چۆلەکەیەک دەبێ زۆرتر له کاتی جۆ درەودا دەبینرێ.
سنگک: ز. زیپکه.
سنگ کوتان: بەسنگداماڵین له داخی شتێک.
سنگگ:: سنگ.
سنگ لیّ کوتان: بەسنگداماڵین لەگەڵ نزاکردن له یەکێک.

سنگە سنگ: د. نیخە نیخ و خۆ خەڵافاندن بەشتێکەوە.
سنگەوباز: سنگەوبازد.
سنگەوبازد: هەڵچوون بەسەر یەکێکدا کە لە یاری کەوشەکدا تێکەوتبێ.
سنگ هەڵکێش: بریتییە لە مەردوومی بێ شەرمی نالەبار.
سنان: د. سندان.
سنوور: کەنار و قەراغی شوێنێک کە جیای بکاتەوە لە شوێنێکی تر.
سنوورچە: تازە گەڵا دەرکردنی درەخت و گژوگیا.
سنووردار: شتێکە کە سنووری ببێ.
سنووق: سندووق.
سنەوبەر: درەختێکی تۆیبی گەڵا وردی باڵا بەرزی هەمیشە سەوزی جوانە.
سنەیی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک کە لە پێش (زوورەز)دا پێ دەگات.
سنیتر: ز. شتێکە وەک قیر هەنگ لەبەردەمی پلوورەکەیدا دایدەنێ.
سۆ: کونی دەرزی. سوێ. بنەماڵە و وەچە: (سۆ)شیان هەر برە و ئازایە. گیایەکی بۆنخۆشە دەکرێتە پەنیرەوە بۆ تام و بۆنخۆشی. سبەینێ (د). کەپەک.
سوا: د. سبەینێ.
سواخ: سواغ.
سواخدان: سواغدان.
سواخکێشان: سواغدان.
سوار: کەسێکە بەسەر پشتی وڵاخەوە بێ. بریتییە لە شتێک کە بەسەر شتێکی تردا بڕوانێ و زاڵ بێ: بانی ئێوە بەسەربانی ئێمەدا (سوار)ە. منداڵێکە لەکاتی لەدایکبوونیدا لەپێشەوە قاچی بێ.
سواربوون: پەڕینە کۆڵی گیاندار.
سوارچاک: کەسێکە کە سواری باش بزانێ.
سوار خاس: سوارچاک.
سوارخە: ز. چیلکە.
سوارکردن: بریتییە لە ڕاپەڕاندنی کارێک: ئەو کارە زوو (سوارکە).
سوارە: کەسێکە کە بەسواری بڕوا. کۆمەڵە سوار.
سوارەی شەترەنج: ناوە بۆ شەش داش لە یاری شەترەنجدا کە پێیان دەڵێن: شا، وەزیر، فیل، ئەسپ، ڕوخ، پیادە.
سواری: بوونی مەردووم بەسوار: بە(سواری) چووم: ناوە بۆ دێیەک لە ناوچەی خورماڵ.
سواغ: قوڕ یا گەچێکە کە بەدەست یا بە ماڵە درابێ لە شوێنێک.
سواغدان: تێ هەڵسوونی قوڕ یا گەچی گیراوە لە شوێنێک بەدەست یا بەماڵە.
سواغکێشان: سواغدان.
سواف: تافگە.
سواڵ: داواکردنی شت لە مەردووم.
سواڵک: کۆتەرە دارێکە هەڵکەنرابێ بۆ ئاو تێدا خواردنەوەی سەگ.
سواڵکردن: داواکردن و خوازەڵۆکی شت لە مەردووم.
سواڵکەر: کەسێکە داوای شت لە مەردووم بکا.
سواڵە: قولێک گەنم یا جۆ یا مەرەزەیە کە سەپان بەداس درووبێتیەوە و هێشتا دای نەنابێتە زەوی.
سواڵەت: پارچەی شتی سوورەوەکراو وەک گۆزە و دیزە.
سوان: بڕیەند.
سواندۆکە: سواندووکە.
سواندولکە: سواندۆکە.
سواندووکە: چۆلەکە پاساری.
سواندە: سوانە.
سوانە: گوێسوانە.
سۆبە: سۆپا.
سوپا: لەشکر.
سۆپا: کوورەیەکی لوولەداری لەوح یا تەنەکەیە زستانان لە ژووردا ئاگری تێدا دەگرێتەوە.
سوپاخانە: سپاخانە.
سوپاران: سپارانی.
سوپارانی: سپارانی.
سوپاس: ستایشی یەکێک لە پاداشی چاکەیەکیدا.
سوپاسالار: سپاسالار.
سوپاسکردن: سوپاس.
سوپاگە: سپاگە.
سۆپە: سۆپا.
سوپەر: سپەر.
سوپێر: سپەر.
سۆتک: سەرەبزووت.
سۆتکە: سمڵ. ناوە بۆ دێیەک لە ناوچەی سەرچنار.
سۆتن: سووتان.
سۆتە: بێ باوەڕی بێ ئاین. داوێن پیس.
سۆتەک: سووتک.
سۆتەی: سووتان.
سوچیای: سووتان.
سوخاڵ: د. زوخاڵ.

سوخاڵدان: د. زوخاڵدان.
سوخت: مەردوومی بێ پارە و پوول. پەستی زویر. سۆخت (د).
سۆخت: سووتەمەنی.
سوختبوون: بێ پارە و پوول و سامانبوون.
سوختكردن: داماڵە غاسیكردنی یەكێک و هیچ پێ نەهێشتنی.
سوختە: كەسێكە كە تازە دەستی كردبێ بەخوێندن لە مزگەوتدا و ئیشوكار بكا بۆ مامۆستای.
سۆختە: د. سوختە.
سوخرە: وغرە.
سوخمە: جۆرە كاڵایەكی دوگمەداری كورتە لەسەر كراسەوە لەبەر دەكرێ. دارێكە دادەچەقێنرێ و مێوی دەخرێتە سەر (ز).
سۆر: سوور. سوێر.
سوراحی: جۆرە شەربەیەكی شووشەیە ئاوی تێ دەكرێ.
سۆراخكردن: سووسەكردن و بەڵگەگرتنی شتی ون بوو.
سۆراغكردن: سۆراخكردن.
سۆراڤ: با. ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
سۆران: ناوە بۆ بەشێک لە كورد كە دادەنیشێ لە ناوەندی زێی گەورە و زێی پچووكدا.
سۆرانی: فەقیانەی كراس. كوردی سۆران. هەرمێ لاسوورە (ز).
سۆرپاز: ز.جۆرە سیرێكی كێوییە.
سورخ: دەرمانێكی سوورە وەک كل وایە. دەگیرێتەوە و شتی پێ دەنووسرێ.
سورخكاری: جوانكردنی نووسراو بەسورخ.
سوڕ: د. شوێنی لێژ و خز و سەر بەرەوخوارە.
سوڕسوڕە: باڵندەیەكی پچكۆلەی گێژ و وێژی نازیرەكە.
سوڕنا: زوڕنا.
سوڕناتک: زوڕناتک.
سوڕناژەن: زوناژەن.
سوڕیان: د. خلیسكان.
سۆرسۆرک: سوورێنچک.
سۆرک: سوورێژە (ز). هەرزن.
سۆركە: سوورێژە.
سورمە: شتێكی باریكە وەک دەزوو لە زیو دروست دەكرێ بۆ دۆقی عەبا و گوڵەنگەی چەفتە و شتی تر. كل.
سورمەدان: ئەڵقە ئاسنێكە بەم سەر و بەو سەری تۆپی جەنجەڕە و میلەكانی ئەم سەر و ئەو سەری پێدا دەچێ. كلدان.
سورمەڕێژ: كاڵا یا پارچەیەكە كە بەسورمە جوان كرابێ.
سورمەیی: ڕەنگی شینی تاریک.
سۆرنجان: جۆرە گیایەكە.
سوروشت: تەبیعەت. خووی مەردووم.
سوروشتی: شتی طبیعی.
سۆرە: بۆنە: بە(سۆرە)ی تۆوەهاتم واتە بەبۆنەی تۆوە. بێگانە: (سۆرە) هەر (سۆرە)یە. هەنەزا (د).
سۆرە و تۆرە: خزم و خۆشی ژن بۆ پیاو و، هی پیاو بۆ ژن.
سۆریاس: گیایەكی كوێستانییە گەڵای وەک كەوەر وایە بەڵام باریكترە دەكرێ بەچێشت.
سۆریچک: ز. سوورێنچک.
سورین: سمتی ئادەمی.
سۆز: شەوق و كەیف: فیسار كەس زۆر بە(سۆز)ە.
سۆزان: سووتان.
سۆزانی: ئافرەتێكە كە لەناو پیاواندا سەما بكا و سووڕ بدا. ژنی بێ شەرم.
سۆزرەت: شتی سەیر.
سۆزكردن: گۆرانی وتن بەسەر خۆشەویستێكدا بەدڵێكی گەرمی بەكوڵەوە.
سۆزمانی: د. سۆزانی.
سۆزە: كزە بای سووک. سۆز (د).
سۆزەكردن: سۆزكردن.
سۆزیاگ: سووتاو.
سۆزیان: سووتان.
سۆزیاو: سووتاو.
سۆزی: سبەینێ.
سۆژە: بێگار.
سۆس: كەپەک.
سۆست: سۆس.
سۆسرەت: سۆزرەت.
سۆسک: د. سۆس. سوێسكە.
سۆسكە: سوێسكە.
سۆسن: سۆسەن.
سۆسەن: جۆرە گوڵێكی جوانی بۆنخۆشە گەڵێ ڕەنگی هەیە.
سوغرە: بێگاركردن بەمەردووم.
سۆغین: ز. ئەنجامی كار.
سۆفەقیتە: كڵاو كوڕە.
سۆفیلكە: كڵاو كوڕە. مەردوومی سۆفی خواپەرست.
سۆفیلە: دارێكە دادەچەقێنرێ بەخەرماندا دوای سووركردنی.
سۆڤ: ز. گرانی.
سۆقان: ئێسقان.
سۆک: كوت، (سۆكە سۆک) كوت پێوەدانی یەک لەسەر یەک. سووک.
سۆكدان: د. كوت وەشاندن.

سوکوم: ز. تەحر و شێوە.
سۆکی: د. سووکی.
سوڵ: د. سڵ.
سۆل: پێڵاوێکە دەکرێ بەسەر پێوە.
سـۆڵ: سـوێر. وتەیەکـە هەمـیـشـە لە دوای وتەی (سـفت)ەوە بەکاردێنرێ: سفت و (سۆڵ) واتە زۆر سفت.
سۆلاڤ: تاڤگە. ناوی شوێنێکە لە ناوچەی ئامێدی.
سۆلان: د. نەژاد و ڕەسەن.
سۆڵان: د.گوڵی سەوڵ.
سۆڵاندنەوە: چووزاندنەوە.
سۆڵانەوە: د. سۆڵاندنەوە.
سۆڵانەوە: چووزانەوە.
سۆلاوکە: پلوسک.
سولتان: جۆرێکە لە زاخە.
سۆلدروو: کەسێکە کە سۆل بدروێ.
سۆلکەر: سۆلدروو.
سۆلۆلە: بەچکە دووپشک.
سۆڵوخوا: د. شتی سوێر خوێ.
سولوسات: ز. کۆبوونەوەی پیاوان بەزۆری.
سـۆڵە: سـەرمـای بەتین. شـەوقـێکی کـەم کە لە دوورەوە دیار بێ (د). بلـێـسـە (د). ناوە بۆ چوار دێ لە نـاوچەی بـازیان و قەرەداخ و مەریوان.
سۆڵەچرا: د. چۆڵە چرا.
سۆڵەسۆڵ: د. چووزە چووزی ئەندام: ناو دەمم (سۆڵەسۆڵ)ی لێوە دێ.
سۆڵکە: سوێرەکە.
سوڵیانەوە: د. چووزانەوە.
سۆلینە: با. گونجی ئاو.
سۆڵینەوە: سۆڵانەوە.
سۆما: بینایی چاو. ئاسۆ (د). ڕۆشنایی (د).
سۆمایی: بیبیلەی چاو.
سۆمایی داهاتن: بریتییە لە کوێر بوون .
سون: سن.
سوند: سوێند.
سۆند: سوێند.
سـونکە: وردە کـەشکێکە دوای سـوونەوە مـابێـتـەوە. بنیـسـکە سابوون (د).
سۆنگە: د. دەست پەرژان.
سوننی: نێزە. کەسێکە لەسەر پەیڕەوی پێغەمبەر و یارانی بێ.
سۆنە: مراوی.

سوو: د. سوود: ئەم ئیشەبێ (سوو)ە.
سووان: لەکارکەوتنی تیغ بەڕەنگێک کە بەهەسان تیژ نەبێتەوە. هەسان. لووسبوون و نەمانی زبری شت.
سوواندن: نەهێشتنی زبری شت.
سوواندنەوە: سوونەوە.
سوواندەر: ز. گوێسوانە.
سووانن: سوواندن.
سـووانەوە: توانەوەی کـەشک و هێندێ شـتـی تر بەهەڵگـلـۆفتن و خسـتنی لە شتێکی تر: کەشکەکە (سوواوەتەوە). لووسبوون و چوونە یەکی لباد و فەرەنجی لەبەر زۆر سوونەوەی.
سوواو: شتێکە کە لووس بوو بێ و برگەی نەمابێ.
سوواوە: شتی سووراوە.
سووبا: ز. مەلەوان.
سووباهی: ز. مەلەکردن.
سـووپ: ز. چەند بەردێکە لە بەریانی ئاودا دادەنرێ و داری پێدا ڕادەنگێورێ بۆ ماسی گرتن.
سـووت: ز. چاڵێکە تەپکەی لەسـەر دادەنرێ بۆ گـرتنی هێندێ باڵندە.
سووتار: مەردوومی سەرسەری (ز). قووڵ.
سووتاڵ: سووتار.
سووتان: ئاگر تێبەربوونی شتێک و نەمانی.
سووتاندن: ئاگربەردان لە شتێک و نەهێشتنی.
سووتانن: سووتاندن.
سـووتـانەوە: سـووربـوونەوە و هەڵ زڵەپیـنی شـوێنێک لە ئەندام بەهۆی تەڕبوون و زۆر مانەوەیەوە لە تەڕیدا.
سووتاو: شتێکە کە ئاگری تێ چووبێ.
سووتاوە: شوێنێکە کە سووتابێتەوە.
سووتک: سووتوو.
سووتوو: خۆڵەمێشی شتی سووتاو.
سۆوتە: د. شتی سووتاو.
سووتەڵ: شتێکە کە لایەکی سووتابێ.
سووتەمەرۆ: داری نیوە سووتاوی هەڵپرووزاو.
سووتەمەنی: شتێکە کە ئامادە کرابێ بۆ ئاگرکردنەوە.
سووتەنی: سووتەمەنی.
سووتیان: د. سووتان.
سووتیانەوە: د. سووتانەوە.
سووتێن: شتێکە کە بسووتێنێ.
سووتێنەر: سووتێن.
سووجگەر: د. سیوجگەر.
سووجەرگ: د. سیوجگەر.

سووچ: گوناح و تاوان. قوژبن.
سووچدار: تاوانبار. شتی گۆشەدار.
سووچنای: هـ. سووتان.
سووچەر: سووچەڕ.
سووچەڕ: گیانداریکە بەقەد قەلەموونیک کە ڕقی هەستا پەڕەکانی دەهاویژێ بەر هەر شتیک بکەوێ برینداری دەکا و، گۆشتی دەخورێ.
سووچیو: مەقەلّی.
سووخار: ز. بەلّمی برنج.
سووخالّ: خەلّووز.
سووخالّدان: خەلّووزدان.
سووخۆر: د. سوود خۆر.
سوود: قازانج. کرێی پارەیەکە کە بەسالّ یا بەمانگ بدرێ بەیەکێک.
سوودخۆر: کەسێکە کە پارە بدا بەسوود.
سووددار: شتی بەکەلّک.
سوودکردن: پارەدان یا وەرگرتنی بەسوود.
سوور: جۆرە ڕەنگێکە وەک خوێن. شایی. سوێر.
سووراڤک: ز. سووراو.
سووران: شایی.
سوورانچک: سوورێنە.
سوورانە: پارەیەکە ئاغادێ دەیسێنێ لە زاوا لەکاتی ژن هێنانیدا.
سووراو: جۆرە ترێیەکی سوورە وەک (کاژاوی) بەلاّم ئەم ناسکترە. دەرمانێکی سوورە ژنان بۆ جوانی سەر کولّم و لێوی پێ ئالّ دەکەن.
سووراوە: شتێکە کە سوورابێتەوە.
سووریاش: گزیر.
سووریاو: شتێکە ڕەنگی سوور کرابێ.
سووربلەتی: گۆێژە سوورە.
سووربۆرە: ولاّخی بۆری سووریاو.
سووربوونەوە: سوور هەلّگەڕانی مەردووم لە کاتی تەریقی یا تووڕەبوونیدا. سوور هەلّگەڕانی گۆشت و شتی تر لە ڕۆنی داخدا.
سوور بەسوور: وتەیەکە وتنی شتێک بەیەکێک بەبێ پەردە نیشان دەدا: (سوور بەسوور) قسەکەم پێ وت.
سوورپرنۆلّ: شتی سووری شلی ناشیرین.
سوور پیاز: هـ. زەردەوالّە.
سوورچک: سوورێنچک.
سوورچی: ناوە بۆ تیرەیەکی گەورە لە کورد.

سوورخون: سوورفل.
سوورداگەڕان: سوور هەلّگەڕان.
سوور داگەڕیان: سوورداگەڕان.
سووڕ: چەرخە و خول. سەما.
سووڕان: چەرخان و خولخواردن.
سووڕاندن: چەرخدان بەشتێک و خول پێدانی.
سووڕاندنەوە: خولاندنەوەی شتێک.
سووڕانگە: شوێنێکە تێیدا بسووڕێیتەوە.
سووڕانن: سووڕاندن.
سووڕاننەوە: سووڕاندنەوە.
سووڕانەوە: خولانەوە. گەڕانی مەردووم بەبێ ئامانج.
سووڕخواردن: خولخواردن.
سووڕدان: خولدان. سەماکردن.
سووڕک: با. جوڕنە.
سووڕگە: سووڕانگە.
سووڕناتک: سوورێنچک.
سووڕنەخۆش: مەردوومی جۆشنی سووڕدەر.
سووڕە: خولە و چەرخە بەگردی شتێکدا، (سووڕە سووڕ) سووڕ خواردنی یەک لەدوای یەک.
سووڕیان: د. سووڕان.
سووڕیانەوە: د. سووڕانەوە.
سوورسات: خەرج و باجێکە کە ئاغادێ بیسێنێ.
سوورشامی: جۆرە ترێیەکی سوورە دەنکی لە سادانی گەورەترە.
سوورفل: سوور پرنۆلّ.
سوورک: با. مۆرانە.
سوورکردن: پاککردنی دانەوێلّە لە خەرماندا بەجیاکردنەوەی کاکەی.
سوورکردنەوە: ئەم دیو ئەودیو کردنی گۆشت و شتی تر لە ڕۆنی داخدا تا سوور هەلّدەگەڕێ. پشت ڕاگرتن بەڕووتی لەبەر ئاگر و دەست پێداهێنانی لە کاتی سەرمابووندا تا سوور دەبێتەوە. خستنی خشت و گۆزە و دیزە و شتی تر بۆ ناو ئاگر تا سوور دەبێتەوە.
سوورکە: جۆرە مێوژێکی سوورە لە ترێ سپیکە دروست دەکرێ. برنجێکە کە دەنکی سووری زۆر بێ. شوێنێکە لە زەوی کە سووربێ و سەوزی تێدا نەبێ. بریتییە لە مندالّی وردە.
سوورکەلە: ئادەمی سووریاو.
سوورکەلّە: سوورکەلە.
سوورکەووگ: د. سوورکەوە.
سوورکەوە: ولاّخی کەوەی سووریاو.
سوورگوم: شتی ونی بێ سەر و شوێن.

سوورگومکردن: ونکردن و بێ سەر و شوێن کردنی شتێک.
سوورگی: ئاسنێکی زبانە دارە لە دیوی ناوەوە پەنجەرە و دەرگای پێ دادەخرێ.
سوورم: د. زەوی سووری بێ گژوگیا.
سوورۆونە: گیایەکی کوێستانییە کە سەر دەردەهێنێ وەک چنگی کەو سوورە.
سووره‌بنە: گیایەکی بەهاری کوێستانییە دەکرێتە ناو دۆکوڵیوەوە.
سوورەبی: جۆرە بییەکە.
سوورەپیاز: جۆرە پیازێکی سوورە.
سوورەتا: جۆرە تایەکی بێ موچرک و لەرزە سێ شەو و سێ ڕۆژ دەخایەنێ.
سوورە چنار: پەڵک.
سوورە چێو: دارێکی سووریاوە بەقەد دار هەناریک بەرز دەبێتەوە گەڵای وەک بەهێ وایە.
سوورەداڵ: جۆرێکە لە داڵ بەڵام ئەم گۆشت خۆر نییە.
سوورە داڵە: سوورە داڵ.
سوورەڕێوی: جۆرە ڕێوییەکی سووریاوە.
سوورەقانگ: جۆرێکە لە مراوی.
سوورەماسی: جۆرە ماسییەکی سوورکارە گۆشتی زۆر خۆشە.
سوورە مۆزە: شەنگە سوورە.
سوورە و بووگ: د. شتی سووربووەوە.
سوورەوبوون: د. سووربوونەوە.
سوورەوکردن: د. سوورکردنەوە.
سوورەوکریاگ: د. شتی سوور کراوە.
سوورهووڵ: د. شلّی سوور پڕ نۆڵ.
سـوور هەڵگەڕان: سـوووربوونەوەی مـەردووم لە تووڕەبوون یا تەریقبـوونەوە یا سەرمـابوونیـدا. ئاڵ و بۆڵبـوونی خـورمـا و هێندێ شتی تر.
سوورێتی: سووری شت.
سوورێجە: د. سوورێژە.
سوورێچکە: د. قوڕگ.
سوورێژە: دەردێکە وەک ئاوڵە بەڵام ئەم ئاو ناگرێ.
سوورێکە: سوورێژە.
سوورێنجە: سوورێژە.
سوورێنچک: سوورێنە.
سوورێنچکە: سوورێنچک.
سـوورێنە: لوولەیەکـە لە قـوڕگی گـیـانداردا ئاوی پێـدا دەچێـتـە خوارەوە.
سووری: بوونی شت بەسوور.
سووریجە: د. سوورێژە.

سووزان: سووتان.
سووزاندن: سووتاندن.
سـووزمە: چێشـتێکە کە بەرەکـەی گـوشرا بێ و تلّـپـەکـەی فـڕێ درابێ.
سووزن: سووژن.
سووزن ئاژن: سووژن ئاژن.
سووزەنەک: دەردێکی پیسە زۆرتر دەگا بەجێی میـزی ئادەمی و بەئازارەوە میزی بۆ دەکرێ.
سـووزەنی: دۆشکڵـەیەکی جـوانی پڕ تەرِی بێ سـاچاغـداراه لە حەمامدا خۆی لەسەر پۆشتە دەکرێتەوە.
سـووزیان: گـڕی دەروون: (سـووزیان)م دەگـرێ، واتە دەروونم جۆشی سەندووە.
سووزیاو: سووتاو.
سووژن: ئاسنێکی درێژی لووت تیـژە کورتان و هێندێ شـتی تری پی دەدرورێ.
سووژن ئاژن: سووژن کردن بەشتێکدا بەزۆری.
سووژندان: چەرمێکی درێژکۆلەیە سووژنی تێ دەخرێ.
سووژیان: سووتان.
سووژیاو: سووتاو.
سووسک: ز. سوێسکە.
سووسکە: سوێسکە.
سووسە: دەنگوباسێکە کە هێشـتا بڵاونەبووبێتـەوە: (سووسە) یەک هەیە لەلایەن فـیسـارە باسەوە، واتە دەنگوباسێکی کزی هەیە. بای سووک.
سووسە کردن: دەنگوباس وەرگرتنێکی کەم لە شتێکی نهێنییەوە.
سووسەلێ: بزنی ڕەشی دەموچاو سوور.
سووسەمار: بزنمژە.
سووسەن: ز.سۆسەن.
سووسی: هـ. سوێسکە.
سووش: ز. جۆرە گیایەکی بۆن خۆشە.
سووقان: ئێسقان.
سووک: شتێکە کە قورس نەبێ. بریتییە لە مەردوومی بێ مایەی بێ نرخ.
سووکبار: بریتییە لە کەسێک کە ئەرکی کەم بێ.
سووکباری: بریتییە لە کەم ئەرکی.
سووکرە: دیزە.
سووککردن: بریتییە لە ئابڕووبردنی یەکێک.
سووکە: د. شیشێکە کە گۆرەوی پێ دەچنرێ.
سووکەڵە: شتێکە لە هەڵگرتندا سووک بێ.
سووکی: بوونی شت بەڕەنگێک کە قـورس نەبێ. بریتـییـە لە بێ نرخی و بەدناوی یەکێک.

سوول: با. جورنە. تاڤگە. پلوسکی ئاو.
سوولاف: تاڤگە.
سوولاووک: سوولاوگە.
سوولاوگە: پلوسکی سەربان.
سوولک: منداڵی ساوا. سوولاووک.
سوولکە: بنیسکە سابوون. بریتییە لە منداڵ: دوو (سوولکە)م هەیە، واتە دوو منداڵ.
سوولگە: شوێنی لێژ.
سوولە: چەند سنگێکی باریکی نووک تیژە (بەرماڵ)ی دەواری لە دەواردا پێ قایم دەکرێ. لاسکی هەرزن (ز).
سوولەڕمە: چلوورە.
سوولین: با. زێراب.
سوون: سن. ساوین.
سوونەوە: هەڵگلۆفتن و دەستهێنانی زۆر بەشتێکدا: کەشکەکە یا لباد و فەرەنجییەکە بسوورەوە.
سووەیل: د. ئەستێرەی سیوەیل.
سوویاگ: د. سواو.
سوویان: سووان.
سوویە: سپڵ.
سوهتن: ز. سووتان.
سوهون: ز. سام و ترس.
سوەی: سبەی.
سوێ: خەفەت و داخ: (سوێ)ی برد بەدڵیدا. ئێش و ئازار: ئەم برینە بە(سوێ)یە. تەماشا.
سوێبوونەوە: مردن لە داخا یا لە ئازارێکدا.
سۆێتەلی: مەردوومی هەڵەشەی سەرسەری.
سویجگەر: سیوجگەر.
سوێر: خواردنێکە کە تامی وەک تامی خوێ وابێ.
سوێر خوێ: خواردنێکە کە مەزەی سوێری بێ.
سوێرۆ: د. ڕیشۆڵە.
سوێرەکە: جۆرە خواردەمەنییەکە لە خەستەی دۆ دروست دەکرێ. جۆرێکە لە مازوو دەباخی پێ دەدرێ.
سوێرەڵووک: شتی سوێری ناخۆش.
سوێرێژک: سووریێژە.
سوێس: تارمایی.
سوێسکە: مەلێکە وەک کەو بەڵام ئەم پچووکتر و گۆشتی خۆشترە.
سوێسن: سۆسەن.
سوێسنایەتی: ناوە بۆ ناوچەیەک لە کوردستانی ئێران.
سوێسنە: گوڵێکی جوانی بۆنخۆشی کوێستانییە.
سوێگە: ئاسۆ.
سوێل: سمێڵ.
سوێڵ: سمێڵ.
سوێن: سوێند.
سوێند: پاکانە بە ناوی خوا.
سوێند خوار: دوو کەس یا زیارترن کە پاکانەیان بۆ یەکتری کردبێ لە شتێکدا و بووبن بەیەک.
سوێندخواردن: پاکانەکردن بەناوی خوا.
سوێندخواری: یەکێتی دوو کەس یا زیاتر بەهۆی سوێند خواردنەوە.
سوێندخۆر: کەسێکە کە سوێند بخوا.
سوێنددان: پاکانەکردن بە یەکێک.
سوێندگیر: کەسیکە کە سوێندی درۆ پێی نواندبێ.
سوێنکە: سونکە.
سوێنگ: سوێند.
سوێنگخوار: سوێندخوار.
سوێنگخواردن: سۆێندخواردن.
سوێنگخورایی: سوێندخواری.
سوێنگخۆر: سوێندخۆر.
سوێنگدان: سوێنددان.
سوێنگ گیر: سوێندگیر.
سوێنە: دەفرێکی گلێنی سوورەوەکراوی پەلە بەرگ و کاڵای تێدا دەشۆرێ.
سۆیە: سبەی.
سویر: ل. شایی.
سویل: ل. سمێڵ.
سویلاڤ: با. تاڤگە.
سوین: سوونی شت.
سە: سەگ. سێ (ز). سێبەر (ز).
سها: سێبەر.
سەبا: ناوە بۆ جۆرە مقامێک.
سەبارەت: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (لەبەر): (سەبارەت) بەنەخوێندەوارییە کە کورد پاش کەوتووە.
سەبرگە: ڕیخ و شیاکە.
سەبرگەچی: کەسێکە ڕیخ و شیاکە پاک بکاتەوە و فڕێی بدا.
سەبزە: سەوزاییەکە بە کاڵی یا بە کوڵاوی بخورێ. هەموو جۆرە شینایییەک کە ڕوابێ.
سەبوون: بای گەرم.
سەبەتولکە: سەبەتەی پچکۆلە.
سەبەتە: دەفرێکی توولینی دەم پەلە.

سەبەتە بەسەرێ: جۆرە يارييەكە ئەوی تێ بكەوێ دادەنیشێ و يەكێك دەبێ بەوەستا بەژوور سەريەوە پاسی دەكا و ئەوانی تر دێن لێی بدەن وەستاكەش نايەڵێ لەو حەڵەدا دەستی بەر هەركامێكيان بكەوێ تێ دەكەوێ.

سەبەتچن: كەسێكە كە سەبەتە دروست بكا.

سەبەل: جۆرە دەردێكە بەچاو دەگا زيادە گۆشتی تێدا پەيدا دەبێ.

سەبەڵ: د. سەبەل.

سەبیل: شتێكی خواری كونداری گڵێنە سوور دەكرێتەوە و توتنی پێ دەكیشرێ.

سەبیلچی: كەسێكە كە سەبیل دروست بكا.

سەبیل خۆر: سەبیل كێش.

سەبیل ساز: سەبیلچی.

سەبیل كێش: كەسێكە كە سەبیل بكێشی.

سەبیلە: شتێكە وەك سەبیل ئەمسەر و ئەوسەری بۆريەی ئاوی پێ قايم دەكرێ.

سەپان: كەسێكە كە بە يازدە يەك دانەوێڵە بدروێتەوە و بيهێنێتە ناو بۆ خاوەنی.

سەپاندن: جێكردنەوەی شتێك لە شوێنێك بەزۆر.

سەپانی: وەرزێری.

سەپك: تێلا. دارێكە وەك چنگی ئادەمی دەواری پێ دەكوترێ لە كاتی تەنیندا بۆ سفتی. كولێرەيەكە لە كەپەك دروست دەكرێ بۆ سەگ.

سەپلە: جۆرە كولێرەيەكە بۆ سەگ دەكرێ.

سەپۆڵە: مەردوومی گەلحۆی گێژ و وێژ.

سەپوول: د. سەپۆلە.

سەپەل: د. مەردوومی سەپۆلە.

سەپەلیك: سپڵ.

سەتك: گيايەكی بەهارييە بەرێك بەهێشوو دەگرێ دەنكەكانی وەك نۆك وايە تام و بۆنی خۆشە.

سەتڵ: دەفرێكی قوڵفداری گەورەيە لە مس يا لە تەنەكە يا لەوح دروست دەكرێ و ئاو و هێندێ شتی تری پێ دەهێنرێ.

سەتماندن: ز. پركردنەوەی بیر. وێرانكردنی شوێنێك.

سەتمە: ز. ساتمە.

سەحكردن: ز. گوێگرتن.

سەحەری: جۆرە مقامێكی كوردييە.

سەحەن: دەفرێكی مسينە وەك دەوری پەلە بەڵام ئەم قووڵترە.

سەحەنچە: سەحەنی پچووك.

سەچیتن: ز. تەفتیش.

سەخت: شتی زۆر ڕەق. ڕۆژی سەرماو باوە. مەردوومی توورە بوو.

سەختبوون: توورەبوون. ڕەقبوون.

سەختكردن: توورەكردن.

سەختەگرێ: د. گرێ كوێرە.

سەختەوبوون: د. ڕەقبوون. توورەبوون.

سەختيان: كەوڵی نانكردن. شەقە چەرم.

سەختی: ڕەقی. سەرما و سۆڵە: بەم (سەختی)يە مەچۆرە دەرەوە. ڕاسپاردن: فيسار كەسم (سەختی) كرد واتە ڕام سپارد. توورەيی.

سەخڵەت: د. سەغڵەت.

سەخڵەتكردن: د. سەغڵەتكردن.

سەخڵەتی: د. سەغڵەتی.

سەخوڕ: ڕيخی ناوسكی ئاژاڵ.

سەخوڕدان: توورەكەيەكە لەناو سكی ئاژاڵدا سەخووڕی تێدايە.

سەخوڕگا: د. شوێنێكە كە سەخوڕی تێ فڕێ بدرێ.

سەخورمە: د. سیخورمە.

سەخەری: د. پێستی كەفەڵی گا و گامێش و وڵاخی بەرزە كە ژێری پێڵاوی لێ دروست دەكرێ.

سەد: ناوە بۆ ژمارەيەك كە دە جار دەيە.

سەدارە: جۆرە كڵاوێكی لا پانە، هێندێ لە كارگوزەرانی دەوڵەتی عێراق دەيكەنە سەر.

سەدان: ئەو ژمارانەن كە لە پلەی سێيەمدا دەنووسرێن لە ژمارەدا. چەند سەدێك لە شتێك: فيسار كەس بە(سەدان) مەڕی هەيە .

سەدری: جۆرە برنجێكی دەنك باريكی درێژكۆلەيە و بۆنێكی خۆشی هەيە.

سەدە: چەرخێكە كە بريتييە لە سەد ساڵ (قرن).

سەدەف: شتێكی سپی سەختی بريقەدارە قۆپچە و شتی تری لێ دروست دەكرێ.

سەدەم: سەدەمێن. وتەيەكە بەكاردێنرێ لە جياتی وتەی (لەبەر) (ز).

سەدەمێن: شتێكە لە پايەی سەددا بێ.

سەدهەم: سەدەمێن.

سەدهەمێن: سەدەمێن.

سەر: ز. زڕ.

سەر: سەلكی گیاندار. لای ژووروی هەموو شتێك. نيشانەيەكی پچكۆلەی ڕاستە لە بان هێندێ پيتی عەرەبی دادەنرێ. جار: بەيانی (سەر)ێك هاتم بۆ لات. سەرقاپی شت: (سەر)ی شووشەكە شكاوە. دەمی دەفر: (سەر)ی دەفرەكە بنێرەوە. بريتييە لە تاقە گياندارێك: خێزانی فيسار كەس چوار (سەر)ن. ئەندازەيەكە لە ئاو كە كشتوكاڵی پێ ئاو بدرێ: كارێزەكەم (سەر)ێك ئاوی هەيە.

سەرا: کۆشکێکی گەورەی دەوڵەتییە کە سەرۆک و فەرمانڕەوای دەوڵەت و بەردەستەکانی پیشەی دەوڵەتی تێدا دەبین.
سەراپا: وتەیەکە لەباتی وتاری (لە سەرەوە تا خوار) بەکاردێنرێ: کتێبەکەم سەراپا خوێندەوە، واتە لە سەریەوە تا خواری.
سەرا پەردە: پەردەیەکە بەدەرگای سەرا و ژووری پیاوی گەورەدا بگیرێت.
سەراپیتە: بنمیچ.
سەراراو: کەف و سابووناوێکە کە یەکەم جار بەرگی پێ دەشۆرێ.
سەرازا: سەربەخۆ.
سەرازایی: سەربەخۆیی.
سەرا سوێ: سەرە تاتکێ.
سەراسەر: سەراپا.
سەراسێ: سەرێشە: دراوسێ لە دراوسێ دەگرێ (سەراسێ).
سەراسیمە: کەسێکە کە سەری سوڕمابێ لە کارێک.
سەراک: ز. سەرۆک.
سەرامەد: مەردوومی قاڵی زیرەکی دەرهاتوو.
سەرانسەر: سەراپا. توێژاڵی سەرەوەی شت: (سەرانسەر)ی ماستەکە بگرە.
سەرانگوێلک: سەرەنوێلک.
سەرانە: باجێکە لە مەردووم بسێنرێ لە جیاتی سەری خۆی.
سەراو: پێشاو. ئاوێکی زەردە ئافرەت لە پێش منداڵ بوونیدا بەچەند دەمێک لە بەری دەڕوا، سەرچاوەی گەورە.
سەراو تۆقین: تەقینی ئەو پەردەیەی کە منداڵی تێدایە لە سکی دایکیدا و هاتنە دەرەوەی ئاوەکەی کەمێک لە پێش منداڵ بووندا.
سەراوورد: سەرەتا و بناوانی هەموو شتێک: جاف لە (سەراوورد)ەوە کۆچەری بووە. لای ژووروویی شت.
ساراوەرد: د. سەراوورد.
سەرئەژمێری: سەر ژمێرە.
سەرئەناز: د. لاکێشێکە لە ژوورقاڵییەوە ڕادەخرێ لەسەر باری پانی.
سەر ئەنجام: ئەنجام و ئاکامی کار.
سەر ئەنناز: ز. سەرپۆشێکە کە بدرێ بەسەر شتدا.
سەر ئێشان: سەر ئێشە.
سەرئێشاندن: بریتییە لە سەرکردنە سەر یەکێک.
سەر ئێشە: ژانەسەر.
سەرئێلچی: نوێنەری هەرە گەورەی دەوڵەتێک لە پایتەختی دەوڵەتێکی تردا.
سەربار: بریتییە لە ئیشوکارێکی لاوەکی کە خرابێتە سەر ئیشوکارێکی تایبەتیت. شتێکە کە خرابێتە سەر دووتای بار.
سەربارە: سەربار.
سەرباز: کەسێکە کە چووبێتە ژێرچەکی دەوڵەت بۆ پاسی نیشتمان.
سەربازخانە: شوێنێکە کە سەربازی دەوڵەت تێیدا دانیشێ.
سەربازکاری: خزمەتی سوپایی.
سەربازگە: سەربازخانە.
سەربازگیری: گیرانی لاوان بۆ سەربازی.
سەرباس: باسێکە کە قسەی لێ بکرێ (موضوع).
سەرباڵ: سێ پەڕی گەورەیە بەسەر باڵی باڵندەوە.
سەربان: سەری ژوور و خانوو.
سەربڕ: د. قەد بڕ.
سەر بڕاو: گیاندارێکە کە سەری لە لەشی کرابێتەوە.
سەر بڕیاگ: سەر بڕاو.
سەر بڕین: بڕینی سەر و جیاکردنەوەی لە لەش.
سەربزێو: بریتییە لە مەردوومی جەربەزەی هار و هاج.
سەر بزێوی: بریتییە لە جەربەزەیی و هار و هاجی.
سەربڵن: د. سەر بڵند.
سەر بڵند: بریتییە لە یەکێک کە نەنگ ڕووی تێ نەکردبێ.
سەر بڵندکردنەوە: سەربەرزکردنەوە.
سەربڵندی: بریتییە لە بێ نەنگی.
سەربڵنی: د. سەربڵندی.
سەر بە: وتەیەکە ئاشنایەتی یەکێک دەگەیەنێ بەکەسێک کە لە دوایەوە دەوترێ: (سەربە) من، (سەربە) تۆ، (سەربە) ئەو، واتە ئاشنای من یا تۆ یا ئەو.
سەر بەتاک: سەر بە تاڵ.
سەر بە تاڵ: شتی دانەپۆشراو.
سەربەخۆ: مەردوومێک یا گەلێکە کە لە کاروباری خۆیدا ژوور دەستی نەبێ.
سەربەخۆیی: بوونی مەردووم یا گەل بەڕەنگێکی وا کە ژوور دەستی نەبێ لە کاروباری خۆیدا.
سەر بەدوو: ز. چێشتی دۆینە.
سەر بەدەرەوە: کەسێکە کە هاتوچۆی دەرەوە زۆر بکا.
سەربەرز: سەربڵند.
سەربەرزکردنەوە: بریتییە لە دووبارە پەیدابوونەوەی کارێک: جەردەکان (سەریان بەرز کردۆتەوە).
سەربەرزی: سەر بڵندی.
سەربەرەخوار: سەربەرەوخوار.

سەربەرەخوارە: سەربەرەوخوارە.
سەربەرەژوور: سەربەرەو ژوورە.
سەربەرە ژوورە: سەر بەرەو ژوورە.
سەربەرەژێر: سەربەرەوژێر.
سەربەرەژێرە: سەربەرەوژێرە.
سەربەرەوخوار: سەر بەرەوخوارە. شتێکە سەری کەوتبێتە خوارەوە و خۆی کەوتبێتە سەرەوە.
سەربەرەوخواربوون: دەمە و ژێربوونی شت.
سەر بەرەوخـواربوونەوە: ڕۆین بەرێگایەکی لێـژدا لە سـەرەوە بۆ خوارەوە.
سەربەرەوخوارکردن: دەمە و ژێرکردنی شتێک.
سەربەرەوخوارکردنەوە: ناردنی شـتێک لە سـەرەوە بۆ خـوارەوە. سەر بەرەوخوار کردن.
سەربەرەوخوارە: هەڵدێرگە و لێژی.
سەربەرەوژوور: شوێنێکە کە بەرز بێ و ژوور تۆ کەوتبێ.
سـەربەرەوژووربوونـەوە: ڕۆین بەرێگایەکی لێـژدا لە خـوارەوە بۆ سەرەوە.
سەربەرەوژوورکردنەوە: ناردنی شتێک لە خوارەوە بۆ سەرەوە.
سەربەرە و ژوورە: شوێنی هەوراز.
سەربەرەوژێر: سەربەرەوخوار.
سەربەرەوژێربوون: سەر بەرەوخوار بوون.
سەر بەرەو ژێربوونەوە: سەر بەرەوخواربوونەوە.
سەربەرەوژێرکە: سەربەرەوژێرە.
سەربەرەوژێرە: سەربەرەوخوارە.
سەربەس: سەربەست.
سەربەست: کەسێکە لە هیچ سڵ نەکا و شەرم نەکا. سـەرپێچ. سەربەخۆ.
سەربەستکردن: نرخێکی زۆر دانانە لەسەر شتێک بۆ ئەوەی کە خاوەنەکەی دەستـخەڕۆ ببێ و لەو نرخە کەمـتر نەیفرۆشێ و دابمێنێ بەدەستیەوە.
سەربەستە: بریتییە لە شتی پۆشراوی شاراوە.
سەربەستی: شەرم و سڵ نەکردن. سەربەخۆیی.
سەربەسە: د. سەربەستە.
سەربەسەر: گۆڕینەوەی دوو شت بەیەکتری بەبێ باقی دانەوە.
سـەر بەسـەرێ: سـواربوونی دوو نێـرینەی ئادەمی بۆ یـەکـتـری و ئارەزوو بەجێ هێنانیان بەیەکتری.
سەربەسی: سەربەستی.
سەربەش: بەشێکی سەرپشکە لەناو چەند بەشێکدا لە شتێک.
سـەر بەفـارەتدان: تووشکردنی یەکـێک بەچورتمێک بەرێکخـستنی هەلاتێک بۆی بەڕەنگێک کـە سـەری تێـدا بچێ.

سـەربەکـڵاوە: کـاتی هاتنە خـوارەوەی بـاران و بەفـر بەلێـزمـە و رەهێڵە.
سـەربەگـۆبەنگ: کـەسـێکە لە هەمـوو شـوێنێک هەر گـۆبەنگ بنێتەوە.
سەر بەگێچەڵ: سەر بەگۆبەنگ.
سەر بەمۆر: قوتوو یا شووشەیەکە کە پڕ بێ لە شتێکی بەنرخ و سەرەکەی مۆر کرابێ.
سەربەن: ز. چەرمی سەر پەنجەی نەعل.
سەربەند: تاقە شیعرێکە کە لە (حەوت بەنددا) بوترێتەوە.
سەر بەهەوێ: ژنێکە کە هەوێی ببێ.
سەربێشکە: پەردەیەکە دەدرێ بەسەر بێشکەی منداڵدا.
سـەرپاچ: دروونـەوەی گـیـایەکـە کـە لەناو مـەرەزەدا ڕوابێ و کەوتبێتە سەر مەرەزەکە.
سەرپارێزەر: محامی.
سـەرپاک: وتـەیەکـە بەکـاردێنرێ لە جـیـاتی وتەی (هەمـوو): مەرەزەکەم (سەر پاک) درووەوە.
سەر پاڵان: سەر کورتان.
سـەرپاڵـە: سـەپانیکە لەکـاتی دروێنەدا پێش سـەپانەکـانی تر بکەوێ.
سەرپایی: د. سەرپێیی.
سەرپڕ: دەفرێکە لێواولێو پڕبێ لە شت. سەر جەنجاڵ.
سەرپزوو: شوێنی بەندە خوێن لە دەرپێ و ڕانک و دەمەر قۆپان.
سەرپشک: شتێکی زۆر باشە لەناو چەند شتێکی تردا کە پشک خرابێ و بەر یەکێک کەوتبێ.
سەرپۆت: کردنی کارێک بەناپوختی: (سەرپۆت)ێک تووتنەکەم دارک بژێر کرد.
سەرپۆرت: د. سەرپۆت.
سـەرپۆش: پارچەیەکی تەنراوی چوارگـۆشـەیە کـە بدرێ بەسـەر شتدا. تەنراوێکە کە ژنان دەیدەن بەسەریاندا.
سەرپەتی: مەردوومی سەر ڕووت.
سەرپەرچەم: جۆرە چەکێکی ژنانانەیە دەکەوێتە سەر پەرچەم.
سەرپەڕ: شتێکە لەوپەڕی چەند شتێکی ترەوەبێ.
سەرپەڕە: پارچە کاغەزێکی ڕەنگاوڕەنگە کە بۆ جوانی دەدرێ لە رووی شت.
سەرپەرشت: کەسێکە چاودێری شتێک بکا.
سەرپەرشتی: چاودێری کردنی شتێک.
سەرپەل: سەر لقی درەخت.
سەر پەڵە: مانگی تشرینی دووهەم کە سی ڕۆژە.
سەرپەنجە: جومگەی یەکەمی پەنجە.
سەر پێ سپاردن: بریتییە لە دڵنیایی و پشت بەستن بەیەکێک: فیسار کەس لە وانەیە کە (سەری پێ بسپێریت).

سەرپێچ: شتێکە کە ببەسترێ بە سەرەوە. بریتییە لە کەسێک کە ئەو فەرمانەی پێ دراوە نەیکا.
سەر پێچانەوە: بریتییە لە سڵەمینەوە و کۆکردن: فیسار کەس لە هیچ شتێک (سەر ناپێچێتەوە) واتە کۆ ناکا.
سەرپێچی: خۆ دزینەوە لە کارێک و نەکردنی.
سەرپیل: سەرشان.
سەرپێوەنان: بریتییە لە ملنان و ڕاست ڕۆیشتن: لەشکرەکە (سەری پێوەنا) واتە ڕاست ڕۆیشت.
سەر پێیی: گوزەران پەیداکردن بەبۆنەی هاتوچۆکردنی دەرەوە.
سەر پێیی کردن: بریتییە لە ڕەوانبوون و زۆرچوونە سەر پێشاو.
سەرتا: میوەیەکی جوانە دەخرێتە سەر دەمی تا.
سەرتاپا: سەراپا.
سەرتاسەر: سەرانسەر.
سەرتاش: وەستای سەر تاشین. چەقۆیەکە کە سەر بتاشێ.
سەرتاشین: تاشینی سەر بەگوێزان.
سەرتاق: دارێکە ڕایەڵ دەکرێ بەسەر تاقدا و دیواری لەسەر دروست دەکرێ. پەتێکە دەبەسترێ بەدەمی جەواڵەوە بۆ دروونی.
سەرتاڵ: سەری تاوی بەکرە و کندر.
سەرتڵ: بریتییە لە شتی نایابی هەڵبژاردە.
سەرتلیک: ڕەحەتی. ئەموستیلەی دورمان.
سەرتۆ: د. سەرتوێ.
سەرتۆپ: چەند قەدێکە لە تۆپی تەنراو لە سەرەوە کە لەوانی دیکە باشترە. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (هەموو): (سەر تۆپ)ی گەڕەک چوونەتە سەیران.
سەرتوو: با. توێژی قەیماغ.
سەرتوێ: توێژی ماست.
سەرتوێژ: سەرتوێ.
سەرتەرز: تەرزی هەرە ناسکی هێندێ گیا و درەخت.
سەرتەریدە: گەورەی جەردە.
سەرتەریە: سەرتەریدە.
سەرتەڵ: د. شتی هەڵبژاردەی نایاب.
سەرتەنگ: تەنگەیەکە بەسەر باری وڵاخدا دەکێشرێ.
سەرتەنوور: سەرتەنوور.
سەرتەندوور: شوێنێکە کە تەنووری تێدا دانرابێ بۆ نانکردن.
سەرتیاچوون: بریتییە لە مردن لە پێناوی شتێکدا.
سەرتێشت: با. بەرچایی.
سەرتێکردن: بریتییە لە هاتوچۆکردن بۆ لای یەکێک: فیسار کەس (سەری تێ کردووم). بریتییە لە دەم ژەندنە شتێک و لەناوداني: فیسار کەس (سەری کردووەتە) داراییيەکەی.
سەرتیپ: قائدی فرقە.
سەرتیل: چەند گوریسێکە سەرێکیان دەبەستری بەدەوارەوە و سەرەکەی تریان بەمێخەوە.
سەر تیلک: سەر تلیک.
سەرجل: پارچە هۆرێکە دەدرێ بەسەر کورتاندا بۆ ئاگاداری کورتانەکە.
سەرجەم: وتەیەکە لە جێی وتەی تێکڕا بەکار دێنرێ: جاف (سەرجەم) چوون بۆ کوێستان، یا (سەرجەم) ئەم کاڵەکانە بەچەند؟
سەرجەنجاڵ: کەسێکە کە زۆر خەریک بێ بەشتەوە و، نەپەرژێتە سەر شتی تر.
سەرجێیی کردن: بریتییە لە دروستبوونی پیاو لەگەڵ ژنی خۆی.
سەرچاوکە: د. سەرچاوگە.
سەرچاوگە: سەرچاوە.
سەرچاوە: شوێنێکە کە ئاوی کانی یا کارێزی لێ دەرکەوتبێ.
سەرچڵ: مەردوومی جەربەزەی چەتوون کە ئەنجامی کار لێک نەداتەوە.
سەرچڵی: سەرپێچی و سەر ڕەقی.
سەرچۆپی: هەڵپەڕین لە پەڕی لای ڕاستی ڕیزەوە.
سەرچۆپی کێش: کەسێکە لە پەڕی لای ڕاستی ڕیزەوە چۆپی بکێشێ.
سەر چەشمە: سەرچاوە.
سەرچەوت: کەسێکە لە پەیمان و بەڵێندا ڕاست نەبێ.
سەرچەوتی: ناڕاستی لە پەیمان و بەڵێندا.
سەرحەد: سنووری شوێنێک کە دووخاک لەیەک جوێ بکاتەوە.
سەرحەد دار: کەسێکە کە چاودێری سەرحەدێکی پێ سپێردرابێ.
سەرخان: نهۆمی سەرەوە لە خانوو.
سەر خستن: خستنی شتێک لە نزمییەوە بۆ بەرزییەک. بریتییە لە پەڕاندنی وڵاخی نێر. زاڵکردنی یەکێک بەسەر یەکێکدا یا بەسەر مەبەستێکدا.
سەرخستنە سەر: سەر نانەسەر.
سەرخواردن: بریتییە لە مردنی یەکێک دوای پەیدابوونی یەکێک: فیسار منداڵ (سەری باوکی خوارد).
سەرخوران: بریتییە لە ئارەزووکردنی یەکێک بۆ کارێک: فیسار کەس (سەری دەخورێ) لە ئاژاوە.
سەرخۆش: کەسێکە بە هۆی خواردنەوەی ئارەق و مەیەوە مەست و بێ هۆش بووبێ .
سەرخۆشبوون: بێ هۆشبوون بەهۆی خواردنەوەی ئارەق و مەیەوە.
سەرخۆشی: مەستی و بێ هۆشی.
سەرخۆشی کردن: دڵنەواییکردنی یەکێک کە مردووی مردبێ یا تووشی چورتمێک بووبێ لەگەڵ دڵخۆشی دانەوەی.

سەرخەو شکاندن: بریتییە لە نووستنێکی کەم بۆ حەسانەوە.
سەرخەو کردن: سەرخەو شکاندن.
سەرخێڵ: گەورە و سەرۆکی خێڵ.
سەرد: سارد (د). بریتییە لە مەردوومی بێ هەوەس لە شتێک.
سەرداب: سارداو.
سەرداخستن: بریتییە لە شەرمەزاری و تەریقی.
سەردار: گەورەی کۆمەڵێک.
سەرداری: گەورەیی کردنی کۆمەڵێک.
سەردان: دیدەنی کردنی یەکێک. بەسەرکردنەوەی شتێک.
سەر دانان: بریتییە لە گیان بەختکردن لە ڕێی شتێکدا.
سەردانەواندن: بریتییە لە شەرمەزارکردنی یەکێک: فیسار کەس چاک (سەری بەفیسار دانەواند).
سەرداو: د. سارداو.
سەرداهاوردن: سەرداهێنان. سەری قسە دامەزراندن (د).
سەر داهێنان: شانەکردنی مووی سەر.
سەر دڕ: شتێکە کە مەردووم بەدەستی خۆی تەنیبێتی: جۆلا بە(سەر دڕی) خۆی ناڕازیایە.
سەردروو: کۆکی دروومان.
سەردۆشەک: تەنراوێکی جوانە دەدرێ بەسەر دۆشەکدا.
سەرد و گەرم: د. سارد و گەرم.
سەردولکە: ئەو وتارانەن کە لە پرسەی ژناندا سەردولکەبێژ دەیانڵێ و ئەوانی تر بۆی دەسێننەوە.
سەردولکەبێژ: ژنێکە کە لە پرسەی ژناندا بەچەند وتارێکی دڵگیر دەلاوێنێتەوە بەسەر مردووەکەدا و ژنەکانی تر بۆی دەسێننەوە.
سەردۆڵە: کەوڵی نان لەسەر کردن.
سەر دەرچوون: بریتییە لە شارەزایی لە شتێکدا: فیسار کەس لە هەموو شتێکدا (سەری دەردەچێ).
سەر دەرکردن: خۆ ڕزگارکردن لە چورتمێک.
سەردەرکەر: ڕابەری شارەزا.
سەر دەرگا: چەند دارێکە ڕایەڵ دەکرێ لەسەر دەرگا و دیواری لەسەر دروست دەکرێ.
سەردەرهاتن: بریتییە لە سەوزبوونی گیا.
سەردەرهاوردن: سەر دەرهاتن.
سەردەرهێنان: سەر دەرهاتن.
سەر دەری: کالآیەکی قۆڵدارە لەسەر کالآی ترەوە لەبەر دەکرێ.
سەردەست: سەر قۆڵی هێندی کالآ.
سەردەستان: کاتی منداڵبوونی ئافرەت کە مامان دەیخاتە سەر دەستی. سارده سنگان.
سەردەستە: شتی هەڵبژاردەی نایاب: سەعاتەکەم: (سەردەستە)یە. سەر دەست.
سەردەسێر: د. کوێستان.
سەردەفتەر: یەکەمین کەسێکە کە ناوی نووسرابێ لە سەرووی چەند ناوێکەوە.
سەردەق: دەقی دەست لێ نەدراوی هەموو شتێک.
سەردەق شکاندن: بریتییە لە کردنی کارێک یا وتنی قسەیەک کە هێشتا کەس نەیکردبێ یا نەیوتبێ: (سەردەقی) ئەم کارە یا ئەم وتارە مەشکێنە.
سەردەم: کات و حەلێکی تایبەتییە کە کارێکی تێدا کرابێ و ئێستا باسی بکەوێتەوە: لەو (سەردەمە)دا کە من دەمخوێند خوێندەوار زۆر بوو. (عصر).
سەردەمە: تەنراوێکی تەنکە دەدرێ بەدەمی منداڵدا لە ناو بێشکەدا.
سەردەمی: شتی دەمدەمی. (مؤقت).
سەردەنشت: سەرزەنشت.
سەردەوبوون: د. ساردبوونەوە.
سەردەوکردن: د. ساردکردنەوە.
سەردی: ساردی.
سەڕاد: ز. کەوی بێژانەوە.
سەڕاندن: زەڕاندن.
سەرڕا: سەرەڕا.
سەرڕاست: بریتییە لە کەسێک کە لە پەیمان و ئیشوکاردا ڕاست بێ.
سەر ڕاستی: بریتییە لە پەیمان دروستی و ڕاستی.
سەر ڕوشتە: بەڵگە: لە بابەت شتە دزراوەکەوە (سەر ڕوشتە)یەکم دەستکەوتووە. دەستمایەیەکی کەم لە خوێندەواری و ژیری: فیسار کەس لە خوێندندا (سەر ڕوشتە)یەکی هەیە، یا فیسار کەس بە(سەر ڕوشتە)، واتە ژیرە.
سەر ڕەق: بریتییە لە مەردوومی ڕق ئەستوور کە لە کێشی کەسدا نەبێ.
سەر ڕەقی: تووڕەیی و ڕق ئەستووری.
سەڕە: زەڕەی کەر، (سەڕە سەڕ) زەڕەی یەک لە دوای یەک.
سەڕهاتن: زەڕهاتن.
سەڕین: زەڕین.
سەرزارەکی: سەرزاری.
سەر زاری: قسەیەکە هەر بەدەم بووترێ و لە دڵ نەیەتە دەرەوە.
سەر زەردە: خشتێکە لە نیوەی کەمتری کەل بێ. کەسێکە بێ پرس و بێ پەروا بچێتە شوێنێک.
سەرزەنش: سەرزەنشت.
سەرزەنشت: تەریقکردنەوەی یەکێک لە ڕووی ئامۆژگارییەوە.

سەرزین: شتێکی جوانی ڕەنگاوڕەنگە دەدرێ بەسەر قەڵتاغی زیندا.
سەرژماردن: ژماردن و نووسینی سەری ئادەمی یا گیانداری تر بەتێکڕایی.
سەرژمێر: ئەو کەسەیە کە سەر دەژمێرێ.
سەرژمێرە: سەر ژماردن.
سەرژمێری: سەرژمێرە.
سەرژنانی: پیاوێکە کە خووی ژنانە بێ.
سەرساڵ: ز. ساڵیانە.
سەرسام: کەسێکە لە شتێک سەری سوڕمابێ.
سەرسامبوون: واق وڕمان.
سەرسامە: نیشانەیەکە وەکو: (!!) لە دوای ڕستەیەکەوە دەنووسرێ کە واتای سەرسامی ببەخشێ.
سەرسامی: سەرسوڕمان.
سەر سپاردن: خۆ بە دەستەوەدان و سەر تەسلیم کردن.
سەرسپی: ژنێکی پیرە کە ژنانی تر پرس و ڕای پێ بەکەن.
سەر سکڵی: هەویرێکی پانەوە کراوە وەک کولێرە کە لەسەر پشکۆ برژابێ.
سەرسم: نووچ.
سەرسم بردن: سەرسم دان.
سەرسم دان: هەڵەنگووتنی گیاندار.
سەرسواڵکەر: کەسێکە کە چاوی لە دەستی مەردوومەوە بێ.
سەرسوڕمان: سەرسامبوون لە شتێک.
سەرسووت: ز. سەرەبزووت.
سەرسووک: بریتییە لە مەردوومی کەم ئیش.
سەرسووکبوون: بریتییە لە کەمبوونەوەی ئیشوکار.
سەرسووکی: بریتییە لە کەمی ئیشوکار.
سەرسەخت: بریتییە لە گیاندارێک کە بەکێش بێ.
سەرسەختی: بریتییە لە بەرگە گرتن و بەکێشی گیاندارا.
سەرسەری: مەردوومی بەدخووی بێ وێڵی بەرەڵا. بێ موبالاتی و هۆش نەدانە شت: هەروا (سەرسەری) تەماشای نووسراوەکەم کرد.
سەرسەنگ: زیادەیەکە دەخرێتە سەر شتێکی فرۆشراوی کێشانە کراو بۆ خاترانە.
سەر شابەندەر: نوێنەری تێکڕایی دەوڵەتێک لای دەوڵەتێکی تر (قنصلی عام).
سەرشار: شوێنێکی تایبەتییە لە یاری چاوشارکێدا کە لەوێوە دەچن بۆ خۆشاردنەوە. سەر ڕێژکردنی لافاو (د).
سەرشان: سەریاڵ و تەپە و کێو. ئەندازەیەکە لە شت کە بەسەر شان هەڵ بگیرێ: (سەرشان)ێک ڕێواسم بۆ هات. بریتییە لە توێشە بەرەیەک کە تێشووی تێدا بێ.

سەرشکێنە: د. سەرەشکێنە. دابەشکردنی پاشماوەی شتێکی بەشکراو بەسەر خاوەن بەشەکاندا.
سەرشۆر: ناتری حەمام کە مەردووم بشوا. سەر شۆرک.
سەرشۆڕ: بریتییە لە یەکێک کە لەبەر نەنگ و بەدناوییەک تەریق بێ.
سەر شۆڕبوون: بریتییە لە تەریقبوونەوە.
سەر شۆڕکردن: بریتییە لە بەدناو کردنی یەکێک.
سەرشۆڕی: بریتییە لە بەدناوی.
سەرشۆرک: شوێنێکی کەناری تایبەتییە لە ماڵدا بۆ خۆ تێدا شوشتن لە هاویناندا.
سەر شۆرکە: سەر شۆرک.
سەر شوو: ز. سەر شۆرک.
سەر شەقێن: جۆرێکە لە یاری شەقێن.
سەر شێت: مەردوومی سەرلێشێواو.
سەرشێتبوون: سەرلێشێوان (سەر شێتکردن) سەر شێواندن لە یەکێک.
سەرشێو: د. بەربانگ.
سەرشێوان: سەر لێ تێکچوون.
سەرفراز: مەردوومی ڕزگار.
سەرفرازبوون: ڕزگاربوون لە چورتمێک.
سەرفراز کردن: ڕزگار کردن لە چورتمێک.
سەرفرازی: ڕزگاری.
سەرقاپ: شتێکە بخرێتە سەر دەمی هێندێ قاپ بۆ پاکی و خاوێنی.
سەر قاپ نانەوە: دانانی سەرقاپ لەسەر دەفر.
سەرقاڵ: کەسێکە لەبەر ئیشوکار زۆری نەپەرژێتە سەر هیچ (سەرقاڵبوون) نەپەرژان لەبەر کار زۆری.
سەرقاڵکردن: سەرشێواندن لە یەکێک بەسەرخستنە سەری.
سەرقاڵی: سەر قاڵبوون.
سەرقۆتی: سەرقۆتین.
سەرقۆتین: سەر ڕووت.
سەرقۆڵ: پارچەیەکە لە کراس بەسەر (بن قۆڵ)دا دادەدروێ. سەرۆکی حەسحەسی شەو.
سەر قوولە: جۆرە ترێیەکی سوورە وەک (مام برایمە) وایە سەری دەنکەکانی کەمێک قوولە.
سەر قەبلاندن: دانی ئەندازەیەک لە ئازووقە بەهەژار بەنیازی (سەرفیترە) لە جەژنی ڕەمەزانانەدا.
سەرقەپاغ: سەرقاپ.
سەرقەل: د. لوتکەی شاخ.
سەرقەڵەم: سەرۆکی نووسەران.

سەرقەڵەمانە: وەڵیفەتێکە دەدرێ بەو کەسەی کە نوشتە دەنووسێ.
سهرک: ز. نیشانگای تفەنگ. زڕ.
سەرکار: کەسێکە کرابێ بە سەرگەورە و چاودێری چەند کەسێک لە فرمانێکدا.
سەرکارانە: شتێکە دەدرێ بەسەرکاری ئاغادێ.
سەرکاری: گەورەیی و سەرپەرشتی یەکێک بۆ چەند کەسێک لە فرمانێکدا.
سەرکاوان: د. کۆساران.
سەرکردن: لاسەنگبوونی تەرازوو بەجۆرێک کە لایەکی سووکتر بێ. لێ نەدانی گوللە لە نیشانە و بەسەردا ڕۆیشتنی.
سەرکردن بەگوما: بریتییە لە لەناوبردنی شتێک.
سەرکردنەسەر: سەر نانە سەر.
سەرکردنەوە: بیرکردنەوە و ئەندێشکردنی یەکێک لە شتێک: فیسار کەس لە هەموو شتێک (سەر دەکاتەوە).
سەرکردە: فەرماندەری لەشکر.
سەرکردەیی: فەرماندەریتی لەشکر.
سەرکز: بریتییە لە مەردوومی بێ دەنگ.
سەرکزی: بریتییە لە بێ دەنگی.
سەرکل: د. سەر کلۆم.
سەرکلاو: تەنەکەیەکە وەک کلاو کونێکی درێژکۆلەی تێدایە دەکرێ بەسەر بلێتەی لەمپای چرادا.
سەر کلۆم: دەرگایەکە داخرابێ و کلۆمەکەی ڕەت کرابێ.
سەرکلاوە: سەرکلاو.
سەرکلە: د. سەرکل.
سەرکۆ: د. سەردەنشت.
سەرکورتان: سەرجل.
سەرکۆزەر: پووش و پەلاشێکە دەکەوێتە سەر دانەوێڵە لە گێژ و تەتەڵە کردنیدا.
سەرکۆل: با. مەردوومی سەر ڕووت.
سەرکۆڵ: د. تەپڵەکی کۆڵەکە.
سەرکولۆم: سەر کلۆم.
سەرکۆمار: گەورەی چەند خێڵێکی کۆچەری. ڕەئیسی جمهوور.
سەرکۆنە: سەرزەنشت.
سەرکوێر: بریتییە لە مەردوومی سەر لێ تێکچوو، (سەر کوێربوون) بریتییە لە سەرلێشێوان، (سەرکوێرکردن) بریتییە لە سەرشێواندن لە یەکێک.
سەرکوێری: سەر کوێربوون.
سەرکەتن: با. سەرکەوتن.
سەرکەچ: د. مل کەچ.
سەرکەش: سەرکێش.
سەرکەشی: سەرکێشی.
سەرکەف: کەفێکی خەستە لە کوڵانی سابوونی بەزی پەیدا دەبێ و دەگیرێ و لە دەفردا دەمەیەنرێ و دەبێ بەسابوون. خوێیەکی سپییە کە لە سەرەوە دەگیرێ.
سەرکەفتن: د. سەرکەوتن.
سەرکەل: تەپڵەسەری شاخ.
سەرکەڵ: بەرچیغ.
سەر کەللە: شتێکە لە چەرم یا بەنی هۆنراوە دروست دەکرێ و سەرێکی بەلغاو یا بەرەشمەوە قایم دەکرێ و سەرەکەی تری لە سەری ولاخ هەڵدەکێشرێ. پارچە دەوارێکە کە خرابێتە سەر تەختە دەوارێکی کورت لەسەر باری درێژی.
سەرکەنە: ز. چەند هەودا بەنێکی ئەستوورە دەبەسترێن بەچەند دارێکەوە کوڵۆشەی پێ دەگوێزرێتەوە.
سەرکەوتن: چوون لە نزمایییەکەوە بۆ بەرزایییەک. زاڵبوون لە کارێکدا.
سەرکەوتوو: کەسێکە لە نزمییەکەوە چووبێ بۆ بەرزییەک. کەسێکە کە لە کارێکدا زاڵ بووبێ
سەرکێش: ولاخێکە کە لە غاردا بۆت نەوەستێتەوە. بریتییە لە مەردوومی سەر ڕەق.
سەرکێشان: سەرەتاتکێ کردن. پێ کێشانی شتێک بۆ شتێک: ئەم کارە (سەر دەکێشێتە) فیسار شت.
سەرکێشک: د. سەرۆکی پاسەوانان.
سەرکێشی: نەوەستانەوەی ولاخ لە غاردا. سەر ڕەقی.
سەرکێف: د. سەرکەل.
سەرگ: د. لای سەروو.
سەرگاویک: هـ. گیایەکی سەلکدارە وەک پێشۆک بەلام گەلای ئەم کورتترە و دەخورێ.
سەرگران: بریتییە لە مەردوومی سەرخۆش.
سەرگرتن: دارەڕا و گڵەبانکردنی سەربان. دروستبوون و پێکهاتنی کارێک: فیسار کار (سەری گرت).
سەرگندان: ز. سەرگەردان.
سەرگۆ: ز. سەرە نوێلک.
سەرگوروشتە: بەسەرهاتی یەکێک یا گەلێک.
سەرگوزەشت: سەرگوروشتە.
سەرگوزەشتە: سەرگوروشتە.
سەرگوڵ: یەکەم چا لە قۆریەی تازە دەم بوو کە هێشتا ئاوی بەسەردا نەکێشرابێتەوە.
سەرگوم: سووڕگوم، (سەرگوم کردن) سووڕگوم کردن.
سەرگۆم: گیسکی گەمژ.

سەرگوێلک: سەرە نوێلک.
سەرگەرد: بریتییە لە کەسێک کە خۆی کردبێ بەبالا گەردانی یەکێک: بە(سەرگەرد)ت بم.
سەرگەردان: گیانداری سەرلێشێواو.
سەر گەردان بوون: سەرلێشێوان، (سەرگەردان کردن) سەرلێشێواندن.
سەرگەردانی: سەرگەردان بوون.
سەرگەڕ: سیسارک.
سەرگەرم: بریتییە لە کەسێک کە لە کارێکدا گەرموگوڕ و بەجەخت بێ. بریتییە لە سەرخۆش.
سەرگەرمی: بریتییە لە گەرموگوڕیی یەکێک لە کارێکدا. بریتییە لە مەستی.
سەر گەڤار: ز. سەر گەورە.
سەرگەورە: سەرۆک.
سەرگێجە: د. سەرە خولێ.
سەرگێن: سەرگ (د). شیاکە.
سەرلق: لقی سەرەوەی درەخت. جۆرە هەنارێکە کە تویکڵی لای قنچکەکەی زۆر ئەستووربێ.
سەرلە: وتەیەکە یەکەم دەمی کات پێشان دەدا: (سەرلە) ئێوارێ بنوو، (سەرلە) بەیانی هەستە.
سەرلەشکر: قائدی فیرقە.
سەرلەنوێ: وتەیەکە لە باتی وتەی (دووبارە) یا (دیسان) بەکاردێنرێ: برینەکەم (سەرلەنوێ) هەڵی داوەتەوە.
سەر لێ بادان: بریتییە لە نارەزایی لە کارێک یا لە وتارێک.
سەر لێ تێکچوون: سەر لێ شێوان.
سەر لێ تێکدان: سەر لێ شێواندن.
سەر لێ خوران: سەر خوران.
سەرلێدان: سەردان لە شتێک.
سەر لێ دەرچوون: سەر لێ دەرکردن.
سەر لێ دەرکردن: بریتییە لە شارەزایی یەکێک لە کارێک.
سەر لێ سەندن: وەڕسکردنی یەکێک بە زۆر چوونەلای یا بەزۆر وتن لە گەڵیدا.
سەرلێشێوان: تێکچوونی بیر و ڕاوێژ لە یەکێک لە کارێکدا.
سەر لێ شێواندن: تێکدانی بیر و ڕاوێژ لە یەکێک.
سەر لێ شێواو: کەسێکە سەری لێ تێکچووبێ.
سەر لێ شێویاگ: د. سەر لێ شێواو.
سەر لێ شێویان: د. سەر لێ شێوان.
سەر لێ کردن: سڵەمینەوە لە کردنی کارێک لەبەر شتێک.
سەرکردنەوە: سەر لێ کردن.
سەرما: ساردی و سۆڵە.
سەرما بردگ: سەرما بردوو.
سەرمابردن: کارکردنی سەرما لە شتێک.
سەرمابردوو: شتێکە کە سەرما کاری تێکردبێ و ژاکاندبێتی.
سەرما بردە: سەرما بردوو.
سەرما بردەڵە: کەسێکە کە سەرما زوو کاری تێ بکا.
سەرمابوون: کارکردنی سەرما لە مەردووم.
سەرمازەڵە: قومقومۆکە.
سەرما و سۆڵە: کاتی سەرما و بادەوە.
سەرماوەز: تشرینی یەکەم.
سەرمایە: دەستمایە.
سەرمایەدار: دەسمایەدار.
سەرمایەداری: بوونی مەردووم بەخاوەن سەرمایە.
سەرمک: د. سەرجەم.
سەرملە: تەوقەسەری گرد و شاخ.
سەرملەگیر: د. جەردە و ڕێگر.
سەرمەلا: د. سەر وەستای یاری.
سەرمۆر: شتی سەر بەمۆر.
سەرمەس: سەرمەست.
سەرمەست: سەرخۆش.
سەرمەستی: سەرخۆشی.
سەرمەشق: نووسراوێکی جوانە لە سەری لاپەڕەوە بۆ ئەوەی لەبەری بنووسرێتەوە بۆ جوانبوونی خەت.
سەرمەشقانە: دراو یا پارچە زێڕێکە کە زاوا یەکەم شەو دەیدا بەبووک.
سەرمەشکانە: سەر مەشقانە.
سەرمەقولات: سەرمەوقولات.
سەرمەوقولات: سەر لە زەوی دانان و بەپشتدا خۆ هەڵگێڕانەوە.
سەرمیان: ز. سەرمایە.
سەرمێز: شتێکی جوانە دەدرێ بەسەر مێزدا.
سەرمێکوتە: دەعبایەکی سەرخڕی کلک باریکی پچکۆلەیە لەناو زەلکاودا دەژی.
سەرمێوژە: جۆرە مارێکی پچووکی بۆرە سەری وەک مێوژ وایە.
سەرناز: سەرەنداز.
سەرنامە: عنوانی نامە.
سەرنانە سەر: بریتییە لە قسە زۆر کردن لەگەڵ یەکێکدا بۆ تووڕەبوونی.
سەرنانەوە: بریتییە لە دەربەدەری و دوورکەوتنەوەی یەکێک لە شوێنی خۆیدا. پۆشینی سەری شتێک.
سەرناو: لەقەب.
سەرناوکانە: دراو یا دیارییەکە کە لە حەوتەی زەیستاندا دەبرێ و دەدرێ بە مامان لە لایەن دۆست و ناسیاوەوە.

سەرنج: تەماشاکردن بەوردی (تەدقیق).
سەرنجدان: وردبوونەوە لە شت بۆ لێ تێگەیشتن.
سەرنجدەر: وردبین (مدقق).
سەرنجە: سەرنج.
سەرنخوون: شتی دەمەونخوون.
سەرنزم: سەرشۆڕ.
سەرنزمی: سەرشۆڕی.
سەرنقاب: ز. عینوانی کاغەز.
سەرنوخوون: سەر نخوون.
سەر نڤیشت: (قەزا و قەدەر).
سەرنگوم: سەرنگوون.
سەرنۆگە: د. سەرۆکی یاساوڵ و حەسحەس.
سەرنووس: سەرژمێر.
سەرنەوی: سەرشۆڕ.
سەرنێ: دیوارێکە (نێ)ی ئاشی تێدا هەڵدەسپێنردرێ.
سەرنیان: د. سەرنانەوە.
سەرو: درەختێکی ڕاستی بەرزی هەمیشە سەوزە گەڵای ورد و خڕە.
سەروا: د. قافیە.
سەرواز: د. سەرباز.
سەروازخانە: د. سەربازخانە.
سەر و بن: جۆرە نەخۆشییەکە لە سەر و بنی مانگا دووچاری منداڵی ساوا دەبێ.
سەروبەر: شتێکە بەقەد پێویست بێ بەبێ زیاد و کەم: نان و چێشتەکە (سەروبەر) دەرچوو.
سەروبەند بەستن: ڕێکخستن و ئامادەکردنی شت.
سەروبەند گرتن: سەروبەند بەستن.
سەر و پاچک: سەروپێ.
سەر و پۆتلاک: سەر و پێچ.
سەر و پۆتەلاک: سەر و پۆتلاک.
سەر و پۆرت: د. سەر و پۆرتک.
سەر و پۆرتک: د. سەر و پۆتلاک.
سەر و پەچک: د. سەر و پۆتلاک.
سەر و پێ: کەلە پاچە.
سەر و پێچ: شتێکە کە ببەسترێ بەسەرەوە: ئەو (سەر و پێچ)ەم بۆ بێنە. چۆنێتی بەستنی سەر و پێچ: فیسار کەس (سەر و پێچ)ێکی جوانی هەیە.
سەروچاو: بریتییە لە ڕووخسار.
سەر و دەروو: پەی بردن بەزانینی شتێکی ورد: ئەم کارە ئەوەندە گرانە (سەر و دەروو)ی لێ دەرناکەم.

سەروژێر: پێڵاوی بن کۆنی سەرتازە. ئاسنێکی نێر و مێی پچووکە وەک قرتێنە لە هێندێ چەرم هەڵ دەکێشرێ. خانووی دوو نهۆم.
سەروژێر بوون: ڕووخان و کەوتنی شوێنێک.
سەر وێژکردن: ڕووخاندن و وێرانکردنی شوێنێک.
سەروساخت: ناسیاوی و ئاشنایی لەگەڵ یەکێک: لەگەڵ فیساردا (سەروساخت)م هەیە.
سەروساختی: سەروساخت.
سەروسەکوت: وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ لە جێی وتەی سەروچاو.
سەروسەمەنە: سەروسەنەمە.
سەروسەنەمە: پێ و قەدووم: فیسار کەس منداڵەکەی (سەروسەنەمە)یەکی باشی نەبوو.
سەروسیما: شێوە و قەد و باڵا و ڕووخساری یەکێکی بەڕاورووە کە شەرمی لێ بکرێ.
سەرۆک: گەورە و پێشەوای گەلێک.
سەروکار: سەرەوکار.
سەرۆکایەتی: گەورەیی و پێشەوایی گەلێک.
سەر و گوێلاک: سەر و سەکوت.
سەرومڕ: وتەیەکە لە جیاتی وتەی (هەمیشە) بەکاردێنرێ لە هێندێ شوێندا: فیسار کەس مانگێکە (سەرومڕ) کەوتووە.
سەر و مێقل: سەر و پۆتلاک.
سەر و میت: وتەیەکە لە یاری مووشێندا دەوترێ لە کاتێکدا کە لە پاش یەکێکەوە تیل بکەیت، واتە ئەگەر بەر مووش و بەر هەڵماتی هاوڕێکەت بکەوێ هەر حەل بێ.
سەر و ناوکردن: داکوتانی سنچووق لە ژوور سەر و پاین و ئەم دیو و ئەو دیوی سنجووقی هاوڕێکەت کە تێکەوتووە.
سەروو: لای ژووروو.
سەروونگ: سەرنگ.
سەروەر: گەورەی خۆشەویست.
سەروەری: گەورەیی.
سەروەستا: سەرۆکی وەستایان.
سەر وە سەرێ: سەر بەسەرێ.
سەرە: نۆرە: (سەرە)م هاتووە. مەردوومی نە زۆر گەنج و نە زۆر پیر. گای سەرپەڕ.
سەرهات: د. بەسەرهات.
سەرهاتن: د. بەسەرهاتن.
سەرە بزووت: بزووتی ئاگر.
سەرەتا: دێباچەی نووسراو. پێشرەوی شت.
سەرەتاتکێ: سەر خوارکردنەوە و تەماشاکردنی یەکێک.

سەرەتایی: (ابتدائی).
سـەرەتەشی: سـەرێکی دارینی ئەسـتـووری گـردە بە سـەری تەشییەوە.
سەرەتیر: پەیکانی تیر.
سەرەخۆرە: بریتـییـە لە منداڵێک کە لە پاش بوونی، باوکی یا دایکی مردبێ.
سەرەخولێ: نەخۆشییەکە تووشی مەردووم دەبێ سەری گێژ دەبێ.
سـەرەخـەر: مـەردوومی لاسـار کـە قـسـەی کـەس نەچێـتـە گوێچکەیەوە. پێخەف. داهۆڵ (د).
سەرەخەری: لاساری.
سەرەد: بێژنگ.
سەرەدووگ: بەرە تەشی.
سەرەڕا: سەر بارە.
سەرە ڕم: ئاسنێکی تیژە دەکرێ بەسەری ڕمەوە.
سەرە ڕۆ: گیاندارێکە ناو بەناو بڕوا بۆ شوێنی دوور.
سەرەڕێ: ناوچەقی ڕێگا.
سەرە ڕێگە: سەرەڕێ.
سەرەسوڕێ: د. سەرەسووڕێ.
سەرەسوڕە: سەرەسووڕێ.
سەرەسووڕێ: سەرەخولێ.
سەرە سەرنیان: د. سەر نانە سەر یەکێک.
سەرهشک: ز. ولاخی سەرکێش.
سەرە شکێنە: لابردنی سەری فەردە توو‌تن و ڕێکخسـتنەوەی. کردنەوەی کـارێکە کە لەوە پێش کرابێ بەسـووکـتر لە جاری پێشوو.
سەرەشۆرگا: د. سەر شۆرک.
سەرەقەنگە: شتێکە وەک سەرە سەبیل لە زەرد یا ئاسن دروست دەکرێ و دارقەنگەی پێدا دەکرێ و توو‌تنی پێ دەکێشرێ.
سەرەقەنە: سەرەقەنگە.
سەرەک: سەرۆک. دارێکی درێژە چەند مەلۆیەک گزرە گیای پێ هەڵ دەگـیـرێ. شـتـێکە کـە مـەلەوان لە ئاودا بەسـەر بیپەڕێنێتەوە. سەرۆک.
سەرەگێجە: د. سەرە خولێ.
سەرەگێجێ: سەرەگێجە.
سەرەمر: مریشکی سەرە.
سەرەمڕ: د. سەر و مڕ.
سەرەمـژان: ئاسنێکی دەم پەلە دەکـرێ بەسـەری مـژاندا دەمی گاسنی پێ پاک دەکرێتەوە لە کاتی جووت کردندا.
سەرەمەرگ: کاتی گیانەڵاو.

سەرەمـەقـەست: بڕشـتی کـاڵایە کـە لە کـاتی بڕیندا پەیدا دەبێ. سـەرە پارچەی حـەڵوا کـە بەمـەقـەست دەبڕدرێ. بریتـییـە لە ناخونەک.
سەرەن: کەوی شت بێژانەوە.
سەرەناز: لاکێشی باریکی درێژ.
سەرەند: سەرەن.
سەرەنگا: سەرین.
سەرهەنگافتن: دەست خستنە سەر سەر بۆ گەورەییی یەکێک.
سەرەنگرێ: گیاندارێکە کە بەسەردا کەوتبێ. بریتییە لە یەکێک کـە تووشی چورتمێکی گـەورە بووبێ، (سـەرەنگرێ بـوون) بەسـەردا کـەوتن و ڕەهێـڵـبـوونی گـیـاندارێک، دووچاربوونی گـیـاندارێک بەچورتمێک، (سـەرەنگرێ کـردن) ڕەهێـڵـکردنی گیاندارێک. بریتییە لە دووچارکردنی یەکێک بەچورتمێک.
سەرەنگیا: د. سەرەنگا.
سەرەنوێلک: جێگایەکە زبڵ و پیسی لێ فڕێ بدرێ.
سەرەوخوار: سـەر بەرەوخوار (سەرەو خواربوون) سـەر بەرەوخوار بوون، (سەرەو خوار کردن) سەر بەرەوخوار کردن.
سەرەو خواربوونەوە: سەر بەرەوخواربوونەوە.
سەرەوخوارکردنەوە: سەر بەرەوخوارکردنەوە.
سەرەوخوارە: سەر بەرەوخوارە.
سەرەوژوور: سەر بەرەوژوور.
سەرەوژووربوونەوە: سەر بەرەو ژووربوونەوە.
سەرەوژوورکردنەوە: سەر بەرەو ژوورکردنەوە.
سەرەوژوورە: سەر بەرەوژوورە.
سـەرەوژێر: سـەر بەرەو ژێر (سـەرەوژێربـوون) سـەر بەرەوژێربوون، (سەرەوژێر کردن) سەر بەرەوژێرکردن.
سەرەوژێر بوونەوە: سەر بەرەوژێربوونەوە.
سەرەوژێرە: سەر بەرەوژێرە.
سەرهوستە: سەرەوەستا.
سـەرەوکـار: خـەریک بوون بەکـار و فـرمـانی خـۆتەوە: بڕۆ بە(سەرەوکار)ی خۆتەوە.
سەرەوکاری: سەرپەرشتی کردنی کارێک.
سەرەولێژ: سەر بەرەوخوارە.
سەرەولێژە: سەر بەرەوخوارە.
سەرەولێژی: سەرەولێژە.
سەرەوناو: دەستە و ناو.
سەرەوناوە: دەستە و ناو.
سـەرەونخـوون: شـتی دەمـەونخـوون، سـەرەونخـوونبـوون: هەڵگەڕانەوەی دەفر و بەدەمدا کەوتنی، (سەرەونخوون کردن) هەڵگێڕانەوەی دەفر و بەدەمداخستنی.

سەرەونگوون: گیاندار یا شتی ونی بێ سەر و شوێن، (سەرەو نگوونبوون) ونبوون و بێ سەر و شوێنێ شت، (سەرەونگوون کردن) ونکردن و بێ سەر و شوێنکردنی شت.
سەرەوگرد: گەورەیەکە بەسەر منداڵێکی بێ باوکەوە دانرابێ بۆ سەرەو کاری و چاودێری تا گەورە دەبێ (وصی).
سەرەویر: پارچە خامێکی چوارگۆشەیە دەدرێ بەسەر هەویردا.
سەرهەڵدان: بریتییە لە پەیدابوونی شتێک: کوللە (سەری هەڵدا).
سەرهەڵگرتن: بریتییە لە ڕۆین و بەجێ هێشتنی شوێنێک.
سەرهەنگ: عقید.
سەرهەویر: سەرەویر.
سەریاڵ: هاشرمە. سەرملە.
سەرێش: ناوە بۆ هەموو پارچەکانی جووت.
سەرێشان: سەر ئێشە.
سەرێشە: ژانە سەر.
سەرینگا: سەرین.
سەرێنی: کاتی بوونی تۆ لە شتێکدا یا لە حەلێکدا: بە(سەرێنی) من دوو جەنگی تێکڕایی بووە.
سەرین: شتێکی نەرمە سەری دەکرێتە سەر لە کاتی نووستن یا پاڵکەوتندا. لای سەرووی شت.
سەعات: ماوەی شەست دەقیقە. شتێکە کۆک دەکرێ و کار دەکا و کات پێشان دەدا.
سەعدانی: سادانی.
سەعلەب: گیا ساڵە.
سەغڵەت: مەردوومی دڵتەنگ.
سەغڵەتبوون: دڵتەنگ بوون، شوێنی تەنگەبەر.
سەغڵەتکردن: دڵتەنگ کردن.
سەغڵەتی: دڵتەنگی.
سەفان: زنجیرە شاخ.
سەفتە: شتی یەک لەسەر یەک دانراو.
سەفتەکردن: دانانی شت یەک لەسەر یەک.
سەفەربەر: جەنگێکی تێکڕاییە کە هەرچی گیرا ڕاپێچ بکرێ و بنێردرێ بۆ جەنگ.
سەفین: سەفان.
سەفۆری: با. سمۆرە.
سەڤی: ز. سەوی.
سەقادان: د. ڕێکخستن.
سەقاقوش: باڵندەیەکی گەورەی درێژی قورگ ئەستوورە چیقڵدانەکەی ئاو زۆر هەڵدەگرێ.
سەقام: ڕێکی.
سەقامدان: ڕێکخستنی شت.
سەقامگیر: شتێکە کە لە شوێنێک جێگیر بووبێ.
سەقاو: د. دەردێکە لە (مقاو) قورسترە تووشی وڵاخی یەک سم دەبێ.
سەقا هەڵگرتن: پاراوبوونی زەوی بەهۆی زۆری بارانەوە.
سەقی: ز. جۆرە بەردێکی سەختی زەردباوە.
سهک: با. سرکە.
سەکار: سەلەیەکی گەورەیە هەنجیری تێدا دادەنرێ (ز). کورتان.
سەکاڤ: ز. سەگلاو.
سەکالا: د. سکالا.
سەکتین: ز. تۆپین.
سەکرە: ز. جامێکە هەر دۆی تێ دەکرێ.
سەکسار: مەیموونی نێری قنگ سوور .
سەکۆ: بەرزاییەکە لە قوڕ و بەرد دروست دەکرێ بۆ لەسەر دانیشتنی.
سەکوت: شێوە و سیما، ئەم وشەیە هەر لەگەڵ وشەی (سەر) بەکاردێنرێ: (سەر و سەکوت).
سەکوم: ز. سەر و سەکوت.
سەکەتبوون: مردن: فیسار کەس (سەکەت بوو) واتە مرد.
سەکەماتی: پیاوی سەرسەری.
سەگ: گیاندارێکی چوار پێی درە.
سەگاو: سەگلاو.
سەگاوی: د. سەگلاو.
سەگبەحەسار: سەگبەحەوش.
سەگبەحەوش: بریتییە لە خستنە ناوی یەکێک و لێدانی.
سەگپسێنکە: کەروێشکی یەک ساڵە.
سەگسار: سەکسار.
سەگلاو: دەعبایەکی ئاوی درێژی چوارپێیە لە گوێرەکەی ساوا دەچێ، چنگی وەک چنگی سەگ وایە و پێستی زۆر بەنرخە.
سەگلاوی: جۆرە ئەسپ یا ماینێکی ڕەسەنە.
سەگ لوور: لوورەی زۆری سەگ.
سەگماسی: د. سەگی دەریایی.
سەگمان: نیشانێکە دەنرێتەوە بۆ ئەنگاوتنی.
سەگمان ئەنگێو: نیشان شکێن.
سەگمەرگ: بریتییە لە مەردوومی گیان سەخت.
سەگمەرگی: بریتییە لە گوزەرانکردن بە تاڵی.
سەگوەڕ: وەڕەی سەگی زۆر.
سەگە سەگە: بریتییە لە مێبازی.
سەگەناز: دەردێکی گرانە تووشی سەگ دەبێ و دەیکوژێ.
سەگەناس: سەگەناز.

سەگەوان: کەسێکە کە هەر سەگ بەخێو بکا.
سەگەوانی: کردنی سەگ بەخێوکردن بەپیشە.
سەگێتی: قوماربازی و زۆرزانی و بەدی.
سەل: ز. تەلەبەرد.
سەلار: سەلارە.
سەلارە: ژنی شۆخ و شەنگ.
سەلارێ: سەلارە.
سەلاقوچکان: سەرمە و قولات.
سەلان: سەرەوە: فیسار کەس لە (سەلان)ە.
سەلبەند: ز. وشکە سی.
سەلپاندن: لێخوڕینی بەلەم لە ئاودا بەسەوڵ.
سەلپی: سەوڵی بەلەم لێخوڕین.
سەڵت: مەردوومی تەنهای بێ کەس. گۆشتی لایەکە لە ئاژاڵ کە دەست و ڕانەکەی لێ کرابێتەوە.
سەڵتە: جۆرە کالآیەکی قۆڵداری کورتە لەسەر کەواوە لەبەر دەکرێ.
سەڵتە دروو: وەستایەکە کە هەر سەڵتە بدروێ.
سەڵتەزەلام: ڕێبوارێکی سەڵتی بێ چەک.
سەلک: سەری گیاندار. بنکی خڕی هێندێ سەوزایی وەک پیاز و توور و شێلم و چەوەندەر. سەبەتە (ز).
سەلکە بزووت: سەرەبزووت.
سەلکدار: سەوزاییەکە کە سەلکی ببێ.
سەلک کردن: خڕبوونی سەلکی سەوزایی.
سەلکە: گوڵێکە لە تەوندا دروست دەکرێ لە وێنەی سەلکی گیاندار. سەلک (د).
سەلمان پیسە: ل. شەوگەرد.
سەڵمکە: گیایەکی بەهاری گەڵا پانە بەسوورکراوەیی دەخورێ.
سەلە: دەفرێکی پەلی پووشینە.
سەلەشیرک: با. جۆرە سەلەیەکی گەورەیە قاپ و قاچاخی تێدا دادەنرێ.
سەڵەف: لغاو. سوود: فیسار کەس (سەڵەف) خۆرە. غاری ولآخ: (سەڵەف) کە.
سەڵەفکردن: غاردانی ولآخ.
سەلەندە: ز. گوێسوانە.
سەڵیتە: ئافرەتی بێ شەرمی بێ ئابڕوو.
سەلیلانک: ز. ڕەوڕەوەی منداڵ کە پێی دەڕوا تا فێری پێگرتن دەبێ.
سەلین: ز. بەردی دەمەڵبێنی گۆڕ.
سەما: هەڵپەڕین و قنگ سووڕدان و چەقەنە لێدان، (سەما کردن) سەما.
سەمار: بزمۆژ.
سەماکار: سەماکەر.
سەماکەر: کەسێکە کە سەما بکا.
سەماگە: شوێنێکە بەتایبەتی دروست کرابێ بۆ سەما تێداکردنی.
سەما نەک: ز. جۆرە چۆلەکەیەکی گەورەی قەڵەوە.
سەماوەر: دەفرێکی دوو توێیە لە زەرد یا تەنەکە، توێیەکی ئاو و توێیەکی ئاگری تێ دەکرێ بۆ هاتنە کوڵی ئاوەکە.
سەمتوور: شتێکە وەک کەمانچە لێ دەدرێ و دەنگێکی خۆشی لێوە دێ.
سەمسیر: ز. تلّپەی ترێی گوشراو.
سەموور: گیاندارێکە پێستەکەی زۆر بەنرخە و دەکرێ بەکەوڵ.
سەمەت: ز. لەسەرخۆیی و هێمنی.
سەمەرە: ئازار و چەرمەسەرێ. سەرگوزەشتە.
سەمەن: درەختی یاسەمەن.
سەمەندۆک: پەتێکە سەرێکی دەخرێتە ملی سەگ یا تانجی و سەرەکەی تری دەبەسترێ بەدارێکەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی کە سەری دارەکە دەگرێ سەگەکە نەیگەزێ، (سەمەندۆک کردن) پەتکردنی سەگ بەسەمەندۆک.
سەمەنگوڵ: کەسێکە کە گێژ بێ و کولۆکێکی ساغ نەبێ.
سەمەنی: جۆرە خواردەمەنییەکە لە ئارد و قەرسیلی گەنمی ناسک دروست دەکرێ و بەئاگر دەکولێنرێ.
سەناهی: با. ئاسان.
سەندن: وەرگرتنی شتێک لە یەکێک بەزۆر. کڕین.
سەندنەوە: وەرامدانەوە بۆ گۆرانی یەکێک لە چەشنی گۆرانییەکەی. وەرگرتنەوەی شتێک کە لێت سێنرابێ بەزۆر.
سەندەڵ: جۆرە دارێکی بۆن خۆشی گەرمیانی بەنرخە.
سەندەڵی: جۆرە کورسییەکی دانیشتنە.
سەنگ: بەرد. ئەندازەیەکە لە بەرد یا ئاسن کە شتی بەتەرازوو پێ بکێشرێ. جۆرە یارییەکی پاڵەوانانەیە.
سەنگاتی: د. سەنگایی.
سەنگانن: د. هەڵسەنگاندن.
سەنگایی: قورسایی شتێک: (سەنگایی) تۆ پارەی هەیە.
سەنگباران: بەردەباران.
سەنگتراش: کەسێکە کە بەرد بتاشێ و ڕێکی خا.
سەنگتراشی: بەردتاشین و ڕێکخستنی.
سەنگدادان: لاسەنگبوونی شتێکی قورس: ئەم دیوارە (سەنگی داداوە).
سەنگزاوەر: د. بەردی پازار.
سەنگتەراش: سەنگتراش.
سەنگتەراشی: سەنگتراشی.

سەنگکێش: جۆرە دارێکە لەسەر پشتی وڵاخ دادەنرێ بەردی پێ دەکێشرێ.
سەنگ گا: د. سەنگزاوەر.
سەنگ لێنان: بریتییە لە حورمەت نان لە یەکێک.
سەنگ لێنیان: د. سەنگ لێنان.
سەنگ و بەردنان: بەردی زۆر دانان لەسەر شتێک بۆ دەقگرتنی.
سەنگ و سووکی: بریتییە لە چەند و چوونی کردن لە سەودای شتێکدا بۆ کەمکردنی نرخی. وەکو یەک لێکردنی چەند شتێک لە قورسی و سووکیدا بەزیاد و کەم کردنیان. بارەکان (سەنگ و سووک) بکە تا وەکو یەکیان لێ دێ.
سەنگوڵ: ز. شتی ناشیرینی ئێسک قورس.
سەنگەر: چاڵێکە مەردووم خۆی تێدا حەشار بدا لە کاتی جەنگ کردندا.
سەنگەربەستی: دروستکردنی سوپەر بەگردی شوێنێکدا بۆ پاراستنی لە دوژمن.
سەنگەربەندی: سەنگەربەستی.
سنگەسار: کەسێکە ئەوەندەی بەردەباران کرابێ مردبێ، (سەنگە سارکردن) کوشتنی یەکێک بە بەردە باران کردنی.
سەنگەکی: جۆرە نانێکی گەورەی درێژکۆلەیە.
سەنگەلا: لاسەنگ.
سەنگەڵقۆ: شەیتان: دەڵێی (سەنگەڵقۆ)یە لە هەموو شتێکدا ئامادەیە.
سەنگیا: ل. سەرین.
سەنگی مەحەک: جۆرە بەردێکە کە زێڕ و زیوی پێ تاقی دەکرێتەوە.
سەنگین: شتی قورس و گران. بریتییە لە مەردوومی لەسەرخۆی ئاغر.
سەنگین و گران: مەردوومی لەسەرخۆی بەحورمەت.
سەنگینی: قورسی و گرانی. بریتییە لەسەربەخۆیی و ئاغری مەردووم.
سەنن: د. سەندن.
سەننەوە: د. سەندنەوە.
سەنەڵ: د. سەندەڵ.
سەنەڵی: د. سەندەڵی.
سەنیار: کەسێکە کە شت بکڕێ.
سەنێر: شیاکە.
سەنێرکێش: پەین کێش.
سەنێرگا: سەرەنوێلک.
سەنێروانک: سەرەنوێلک.
سەوا: سبەینێ (د). سەوداکردن.
سەواد: هێزی شت نووسین و شت خوێندنەوە: فیسار کەس بێ (سەواد)ە واتە ناتوانێ بنووسێ و بخوێنێتەوە.
سەوادار: د. خوێندەوار.
سەوادە: د. پیادەیەکی سەڵتی بێ تفاقی لەسەر سەفەر.
سەواڵە: چەپکێ گەنمی درواوە.
سەوچیان: پۆڕیان.
سەودا: دەردێکی زۆر بەئاڵۆشە لە جەستەی مەردوومدا پەیدا دەبێ و دەست و پێی شەقار شەقار دەکا. کەڵکەڵە: (سەودا)ی ژن هێنانی کەوتۆتە سەر. چەند و چوون لە کڕینی شتدا، (سەوداکردن) چەند و چوون کردن لەسەر کڕینی شتێک.
سەودادار: سەودایی.
سەوداسەر: کەسێکە کەڵکەڵەی شتێک کەوتبێتە سەری.
سەوداگەر: کەسێکە کە سەودا بکا.
سەوداگەری: خەریکبوون بە کڕین و فرۆشتنەوە.
سەوداوی: شتێکە بۆ دەردی سەودا خراپ بێ. سەودایی.
سەودایی: کەسێکە دەردی سەودای پێوە بێ.
سەودە سەر: ز. سەوداسەر.
سەور: د. سەنێر.
سەورگا: د. سەنێرگا.
سەورگە: د. سەبرگە.
سەورۆ: هـ. شیاکە.
سەوز: جۆرە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی گیا.
سەوزاو: جۆرە ئاوێکی سەوزە دەچێتە ناو پەردەی چاوی هێندێ کەسەوە کوێری دەکا و میلی لێ نادرێ.
سەوزایی: شینایی.
سەوزبوون: ڕوانی گیا. بریتییە لە سەرگرتنی کارێک: کارەکەی فیسار کەس (سەوز بوو).
سەوزخەر: کڕینی دانەوێڵە و میوە و شینانی لەپێش پێگەیشتنیدا.
سەوزفرۆش: د. سەوزەفرۆش.
سەوزکردن: بریتییە لە بنیاتنانی شتێک: شتێکم (سەوز کردووە) واتە بنیاتم ناوە.
سەوزە: مەردوومی گەنم ڕەنگ. سەبزە.
سەوزەکۆ: د. خومەڕەژە.
سەوزەڵان: شوێنێکە کە سەوزاییی زۆر بێ.
سەوزەڵانی: سەوزەڵان.
سەوزەوات: چەند جۆرێک لە سەبزە.
سەوزی: سەبزە. بوونی شت بە سەوز.
سەوقات: د. دیاری.

سەوقاتی: د. قەرتاڵە. ئەو شتەیە کە بەدیاری بنێردرێ.
سەوک: گیایەکی گەڵا پانی بەرزە گوڵێکی پانی سوور دەگری وەک پۆپنەی کەڵەشێر. دوو داری درێژە سەریان کەمێ پانە بەلەم و کەڵەکی لەناو ئاودا پێ دەبرێ بەرێوە.
سەوولک: ئەستێوولک.
سەوە: د. گۆزە.
سەوەتە: سەبەتە.
سەویک: ز. کولێرەی باوەشکێنە.
سەوی: بەرچنەی گەورە.
سەویک: گۆزە.
سەویل: سەبیل. گۆزە (ز).
سەوین: د. دەفر.
سەهندە: مەردوومی لاساری نەگریس.
سەهندەیی: لاساری و نەگریسی.
سەهنگە: سەهندە.
سەهنگەیی: سەهندەیی.
سەهۆڵ: ئاوێکە لەبەر ساردی مەیی بێ.
سەهۆڵاو: ئاوی سەهۆڵی تواوە.
سەهۆڵبەنان: د. سەهۆڵبەندان.
سەهۆڵبەندان: کاتێکە لەبەر زۆر ساردی ئاو بیبەستێ و ببێ بەسەهۆڵ.
سەهۆڵخانە: ژوورێکی سەر نەگیراوە لە بەرد و قوڕ و قسڵ دروست دەکرێ لە زستاندا پڕ دەکرێ لە ئاو و دەیبەستێ و لە هاویناندا سەهۆڵەکەی بەکاردێنرێ. شوێنێکە کە سەهۆڵی تێدا دروست بکرێ.
سەهەن: د. سەهەند.
سەهەند: سێبەری چڕ.
سەهەندە: سەهندە.
سەهەنگ: سەهەند.
سەهەنە: سەهەندە.
سەی: سەگ.
سەیاف: با. سەگلاو.
سەیدا: مامۆستا.
سەیدک: چلەی زستان.
سەیدۆکە: د. ستک.
سەیر: تەماشا: چووم بۆ (سەیر)ی شایی. شتێکە کە سەرت لێی سوڕ بمێنێ: یەکێک دەستی بڕوا نەخوێنێ زۆر (سەیر)ە.
سەیرارا: گوڵێکی باریکی لاسک درێژە، پەڕەکانی رووی دەرەوەیان سوورە و رووی ناویان نیوەی سەوزە و نیوەی ڕەشە.
سەیران: چوونە دەشت لە کاتی خۆشیاندا بۆ گەشت.
سەیرانکردن: چوون بۆ سەیران.
سەیرانکەر: کەسێکە بچێ بۆ سەیران.
سەیرانگا: شوێنێکە سەیرانی لێ بکرێ.
سەیرانگە: سەیرانگا.
سەیرکردن: تەماشاکردنی شت.
سەیرکەر: کەسێکە کە تەماشای شتێک بکا.
سەیزان: د. ژێرزەمین.
سەیڤان: ڕاوچی (ز). سەیوان.
سەیوان: چەتر. خێوەت. گردێکە لە قەراخ شاری سلێمانی کە گۆڕستانی شارەکەیە.
سێ: ناوە بۆ ژمارەیەک لە ناوەندنی دووان و چواردا.
سیا: ڕەش: بەختی (سیا)یە.
سیاتاڵە: د. ڕەشتاڵە. بەدبەخت.
سیاچارە: بەدبەخت.
سیاچەمانە: جۆرە گۆرانییەکی هەورامیانەیە.
سیار: د. یارمەتیدەر. شاگرد. بەرزاییەک لە ناوەندی شوێنێکی نزمدا (با).
سیاڕێحان: د. ڕێحانە کێویلە.
سیارە: ز. جۆرە گەنمێکە. زیادەی چوارچێوەی دەرگایە کە دەچێتە دیوارەوە. ناوی دێیەکە لە ناوچەی وارماوا.
سیا زاخ: گیایەکی بەهاری گەرمیانی کەم تەمەنە لە پێش هەموو گیایەکدا پێ دەگا و وشک دەبێ وەک چەوەدەر وایە بەڵام کەم گەڵا و باڵای کورت و گوڵێکی پڕپڕی هەیە. زاج (د).
سێازدە: سیانزە.
سیازدەمین: سیانزەمین.
سیازدەهەم: سیانزەهەم.
سیازدەهەمین: سیانزەهەمین.
سیا زووخاڵ: بریتییە لە شتی زۆر ڕەش.
سیا زەندوق: گیانداری ڕەش هەڵگەڕاوی ڕەق و تەق.
سیا ساڵ: وشکە ساڵ.
سیا ساڵی: وشکە ساڵی: بەم (سیا ساڵی)یە دەست بلاوی مەکە.
سیا ماڵ: د. ڕەشماڵ.
سیان: سێ شتی ژمێرراو: میوانەکان (سیان)ن.
سیانزە: ناوە بۆ ژمارەیەک کە دە و سێیە.
سیانزەمین: شتێکە لە پایەی سیانزەدا بێ.
سیانزەهەم: سیانزەمین.
سیانزەهەمین: سیانزەهەم.
سیانکە: قوڕ.

سیاو: هـ. ڕەش.
سیاوا: هـ. ڕەشەبا.
سیاوپووزە: گیایەکی لاسک ڕەشی ئاوییە گەڵای وەک کەرەوز وایە.
سیاو سەدە: هـ. سمڵ.
سیاوڵە: د. ڕەشکەی ناو نان.
سیاوون: بزن.
سیاهە: د. ڕیزە نووسراوێکە لەسەر باری درێژی کە باسی تاکەتاکەی شتی کڕدراو و فرۆشراو بکا.
سیاهی: د. سیاهە.
سیایی: سیاهی.
سێبارە: وتەیەکە وتنەوەی کارێک یا کردنەوەی کارێک دەگەیەنێ بۆ جاری سێهەم.
سێبارەپات: وتە یا کردەوەیەکە کە سێ جار وترابێ یا کرابێ.
سێباز: سێبازد.
سێبازد: جۆرە یارییەکە کە سێ بازدی تێدا دەبرێ.
سێبکۆک: سێ پەڕە.
سێبکۆڵە: گێلاخە.
سێبسکە: سێبسکۆک.
سێ بنهەرد: سێوی بن عەرد.
سێبەر: جۆرە تارماییییەکە پەیدا دەبێ لە قەبارەیەک کە بەری ڕووناکی گرتبێ.
سێبەردە: بریتییە لە سێ تەڵاقە: فیسار کەس (سێبەردە)ی فرێدا واتە سێ بە سێ تەڵاقی خوارد: سێ کوچکە.
سێ بەڕۆ: لەرز و تایەکە کە ڕۆژە نە ڕۆژێک بتگرێ.
سێبەندە: ناوەندی هەردوو سمت و موورغەی پشت.
سێبەندی: لۆتی.
سێپ: ز. دەستە دووی جووت.
سێپا: ئاسنێکی سێ پێیە لەسەر ئاگر دادەنرێ و مەنجەڵی دەخرێتە سەر. سێپک.
سێپاڵوو: شتی سێ سووچ. جۆرە درکێکی سێ سووچە.
سێپایە: سێپا.
سێپک: ز. سێپایە کە مەشکەی پێدا هەڵدەواسرێ بۆ ژەندن.
سێپەڕە: گیایەکی سێ پەڕی لووسی گەڵا خڕە لە هێندێ شوێن دەچێنرێ و دوو سێ جار دەدرویێتەوە و گزرە دەکرێ بۆ ئاژاڵ.
سێپێ: سێپا.
سێپێیی: جۆرە هەڵپەڕکێیەکە لە هەموو قونەیەکدا دووجار دەچێتە پێشەوە و جارێک دەچێتە پاشەوە.
سێتاش: با. هەتاو.
سیتکە سلاوە: سیچکە سلاوە.
سێتە: پەتک.
سێتەبەسەر: ناوە بۆ تیرەیەک لە هەمەوەند کە (سێتە) دەبەستن بەسەرەوە.
سێ جرتەکی: سێ مرەکی.
سیچکە: جۆرێکە لە بەری دارمازوو بەقەد (گزگل) دەبێ و چڵ چڵە بەڵام چڵەکانی کۆڵن.
سیچکە سلاوە: برینێکی پچکۆلەیە لە پێڵووی چاو دێ.
سێ چوار: ناوە بۆ دوانزە ڕۆژەی دوای (سێ شەش).
سێ چوکڵە: شتێکە سێ ددانەی ببێ وەک ددانەکانی پیتی سین و شین.
سێ حاچە: د. سێپاڵوو.
سیخچوولە: ل. سیخوڕ.
سیخناخ: شتی پڕی ئاخنراو (سیخناخبوون) پڕبوونی شتێک لە شتێکی تر، سیخناخکردن: پڕکردن و ئاخنینی شتێک لە شتێکی تر.
سێدارە: قەنارەی زەلام پێ خنکاندن.
سێدەری: ژوورێکە کە سێ پەنجەرەی لە ڕیز یەکەوە تێدابێ.
سێر: هـ. تێر.
سێرمەکی: سێ مرەکی.
سێڕۆژگانە: خواردەمەنییەکە بەخێر بۆ مردوو دەکرێ دوای سێ ڕۆژ لە مردنی.
سێڕۆژە: سێ ڕۆژگانە.
سێڕیان: ڕێگایەکە سێ قۆڵی لێ بوویێتەوە.
سێڕیزکێن: جۆرە یارییەکە وەک دامە.
سێڕیزێن: سێڕیزکێن.
سیرمە: چەرمی خاوی زویڵ زویڵ کراو. وێژەی جووت.
سیرمەکێش: شیشێکی باریکی درێژە سیرمەی بنکی کلاشی بێ هەڵدەکێشرێ.
سێرۆچکە: قوڕقوڕاگە.
سێروو: ڕیشۆڵە.
سێرە: تەمەن: لە (سێرە)ی تۆدا شەو و ڕۆژ خەریکی خوێندن بووم.
سێزدە: سیانزە.
سێزدەمین: سیانزەمین.
سێزدەهەم: سیانزەهەم.
سێزدەهەمین: سیانزەهەمین.
سێزۆ: د. سۆزی.
سێ سووچ: شتی سێگۆشە.
سێ سێخە: د. سێ پاڵوو.
سێ شەش: ناوە بۆ هەژدە ڕۆژ لە هەوەڵی بەهاردا.

سێشەمب: با. سێ شەممە.
سێشەممە: چوارەم ڕۆژی حەفتە لە هەینی بەدواوە.
سێشەموو: سێشەممە.
سێشەمە: سێشەممە.
سێف: سێو. ناوی دوو دێیە لە مەریوان.
سیفتۆ: ز. شتی بۆگەن.
سێفزەمین: سێفەزەمین.
سێفۆکە: گیایەکە ئاژاڵ دەیخوا.
سێفە زەمینە: شتێکی خڕە وەک سێوی بن ئەرز تامی زەردێنەی هێلکە دەدا و دەکرێ بە گەلێ جۆر خواردەمەنی.
سێفەڵووکە: گیایەکی بەهاری گەڵا پانە بەرێکی خڕی شیرینی هەیە.
سێڤ: ز. سێو.
سێڤسێڤۆک: پیازە خووگانە.
سێک: ز. سرکەی ترێ.
سێکوچکە: سێپای ئاگر.
سێکووزە: گیایەکی ئاوی سێ سووچە گەزێک بەرز دەبێتەوە، گوڵێکی توپ دەردەکا بەدەوری گوڵەکەیدا گەڵایەک دەردەکا وەک گەڵای کەوەر.
سێگا: جۆرە مقامێکی خۆشی کوردییە.
سێگۆشە: شتی سێ سووچ.
سێگوە: ز. شەن.
سێل: با. ساج.
سێڵ: ساج.
سێلاخ: ز. لم.
سێلاو: لافاو.
سێڵخان: ز. لمی ناو جۆگە.
سێلک: دارێکی سێ پەلە کای پێ ئەم دیو و ئەو دیو دەکرێ.
سیلکە: نێرەکەر.
سێلگا: شوێن لافاو.
سێلمی: جۆرە حەڵوایەکە دروست دەکرێ لە ئارد و دۆشاو و پەنیری کولاو.
سێلۆقی: سێبازد.
سێلوولە: لوولە و زنجیری ملی ژنان.
سێڵە: بەردێکی پانە لە جیاتی ساج ئاشەوان کولێرە ئاشی پێ دەبرژێنێ.
سێمڕەکی: هەڵپەڕین و هەڵقونین بەکوڵ و بەجەخت.
سێن: وتەیەکە بەدوای هێندێ وتەی ترەوە دەنووسێ و دەیکا بە(اسم فاعل): مەڕ (سێن) حەقەوە (سێن).
سێنج: ز. پەرژینی باخ بە درک.
سینچکە: سیچکەی پچووک.
سینچکە: زیپکەی پچووک.
سینچکە سلاوە: سیچکە سلاوە.
سێنزە: سیانزە.
سێنزەمین: سیانزەمین.
سێنزەهەم: سیانزەهەم.
سێنزەهەمین: سیانزەهەمین.
سینگ: سنگ.
سینگە و بازد: سنگە و بازد.
سێنیک: با. دەوری.
سێنی: ز. سینی.
سێو: میوەیەکی خڕی گەورەی توێکڵ جیری تام و بۆن خۆشە.
سیوادبوونەوە: چاوکردنەوە لە خوێندن یا لە کاروباردا.
سێ و دووکردن: بریتییە لە دوو دڵی کردن لە کارێکدا.
سێوورسات: خەرج و باج.
سێوونگ: سیاوون. ناوە بۆ دێیەک لە شارباژێڕ.
سێ وەختە: بریتییە لە بەیانیان و نیوەڕۆان و ئێواران: فیسار کەس (سێوەختە) نان دەخوا.
سێوەر: سێبەر.
سێوەڕۆ: سێبەڕۆ.
سێوەزەمینە: پەتاتە.
سێوە لاسوورە: جۆرە سێوێکە لایەکی سوورە.
سێوەنگ: د. سێبەندە.
سێوەنگی: د. سێبەندە.
سێوهەرمێ: جۆرە هەرمێیەکە وەک سێو وایە.
سێوێ: سێوی.
سێویاگ: د. شتی سواو.
سێویان: د. سوان.
سێوی بن ئەرز: گیایەکی گەڵا پانی بەرزە بنکێکی خڕی خۆشی هەیە وەک پەتاتە.
سێوی: هەتیو (ز). کەسێکە کە دایکی مردبێ (با).
سێهەم: شتێکە لە پایەی سێدا بێ.
سێهەمین: سێیەم.
سی: ناوە بۆ ژمارەیەک کە سێ دەیە. پارچە گۆشتێکی سووری دوو پەلی پفەڵە لە ژوور جگەرەوە. جۆرە قازێکی کێوییە.
سیپ: ڕەبەت.
سیپارە: سی جزمەی قورئان کە جزم جزم بێ.
سیپاڵ: پارچە جلی کۆنی چڵکن.
سیپاڵ بە ڕۆن: شلکێنەیەکە کە لە دۆشاو و ڕۆن هەڵکێشرابێ.
سیپە: ڕەبەت. پارچە ئاسنێکە بەسەر پشتی تفەنگەوە بۆ ئەنگاوتنی نیشان بەرز و نزم دەکرێتەوە. (ز).

سیپه کوورِ: جۆره تفەنگێکە کە سیپەکەی کووڕە.
سیپەل: شەپۆل.
سیپەلاک: سیپەلک.
سیپەلک: سی گیاندار.
سیتاڤک: با. سێبەری ئادەمی.
سیتل: ز. مەنجەڵی مسین.
سیتە: با. تەپکەی ڕاو.
سیچک: سیچکە.
سیخ: شیشی ئەستووری لووت تیژ. سیخوار.
سیخ ئاخن: سیخاخن.
سیخاخن: شتی سیخناخ.
سیخن: گیانداری سیسی نەخۆش.
سیخوار: زوقم.
سیخوڕ: سووچەڕ. پیسی ناوسکی ئاژاڵ.
سیر: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک کەوەر وایە دەچێنرێ و بنکێکی سپی بۆن ناخۆشی هەیە وەک پیاز.
سیراج: هـ. سیرێژ.
سیر ئەنجن: بریتییە لە شتێک کە زۆر ورد چنرابێ.
سیرە: جیرە. دەنگی سەماوەرێکە کە تازە هاتبێتە جۆش، (سیرە سیر) سیرەی یەک لە دوای یەک، (سیر و هووڕ) سیرە سیرِی زۆر.
سیرک: ز. جۆرە سیرێکە دەکرێتە ناو پەنیرەوە.
سیرکۆ: دیبەگی برنج کوتان.
سیرم: د. سیرمە.
سیرمۆکە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک گەڵای سیر وایە بەڵام وەک ئەو بۆنی ناخۆش نییە.
سیرمووک: ز. سیرمۆکە.
سیرۆ: د. باڵندەیەکی دەنگ خۆشە.
سیر و ماست: نانی وردکراوە کە ڕۆنی داخ و ماستی کرابێ بەسەردا.
سیرە: وتەیەکە زەردەواڵەی پێ دەردەکرێ.
سیرەکۆ: هـ. بەردێکی پانی قورسی لووسە هێلەساوی پێ دەکرێ.
سیرە مۆزە: جۆرە زەردەواڵەیەکی زەردباوە.
سیرەمۆکە: سیرمۆکە.
سیرەنجن: سیر ئەنجن.
سیرێژ: جۆرە خواردەمەنییەکە وەک (سوێرەکە) بەڵام ئەم خوێی تێ ناکرێ.
سیس: سەوزایی و گیانداری لاوازی چرچەڵە، (سیسبوون) چرچ بوون و ژاکانی سەوزایی و گیاندار.
سیسارک: سیسارکە کەچەڵە.
سیسارکە کەچەڵە: باڵندەیەکە لە کۆلارە دەچێ بەڵام گەورەترە و سەری بێ تووکە.
سیسپەست: کردنی ئیشی ژن و مێردایەتی بەتێ ئاخنینی بەسیسی.
سیسرک: دەعبایەکی زەردی پچکۆلانەیە وەک کوللە بەقەڵەمبازد دەڕوا.
سیسرگ: سیسرک.
سیسرە: سپیسرک.
سیس عەمەر: سیس عەنبەر.
سیس عەنبەر: گیایەکی سەوزی گەڵا پانی تاڵی بۆنخۆشە.
سیسکە: سیسەمارە.
سیسۆڵە: د. سیسەڵە.
سیسەڵە: گیانداری سیس.
سیسە مار: جۆرە مارێکی زەردی ڕیوەڵەیە.
سیسە مارە: مەردوومی سیسی لاواز.
سیسەمرۆ: سیسە مارە.
سیسووک: دەعبایەکی زەردی پچکۆلەی چنگ چنگی دەنگ زلە.
سیسی: وتەیەکە هانەهانەی گەماڵی پێ دەدرێ بۆ پەڕینی لە دێڵ. بەری کەنگرە کە بەسوێرخوێیی و برژاوی دەخورێ.
سیڤاندە: با. گوێسوانە.
سیڤلە: ز. جرج.
سیق: معدە.
سیقەتۆرە: پارچە گۆشتێکی بۆشە لە سکی باڵداردا خواردەمەنی تێ دەچێ و لەوێوە دەچێتە ڕیخوڵەوە.
سیک: بای قنگ (ز). قنگ (د).
سیکارد: کێرد.
سیکەتۆرە: سیقەتۆرە.
سیکەنە و سەرخان: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتی زۆر وتنەوەی قسەیەک یا زۆر کردنەوەی کارێکدا: ئەیهوو دیسان (سیکەنە و سەرخانە).
سیل: دەردێکی کوشندەی زۆر گرانە تووشی مەردووم دەبێ و دەیکوژێ.
سیلاوی: سیلدار.
سیلایی: سیلە.
سیلدار: کەسێکە دەردی سیلی پێوە بێ.
سیلکردن: پاککردنەوەی سەعات و قاپ و قاچاخ لە ژەنگ و چڵک. بریتییە لە دیقکردن.
سیلە: سەر سووچی کۆڵان. ڕەقە.
سیم: شتێکە وەک سورمە بەڵام ئەم زیو نییە. تەل.
سیماسین: بریتییە لە ڕق هەستان.

سیمبەند: تەلبەند.
سیمر: سیمرغ.
سیمرخ: سیمرغ.
سیمرغ: جۆرە باڵندەیەکی زۆر گەورەیە کە هەر ناوی هەیە.
سیمگڵ: جۆرە گڵێکی سپی زەردباوە بە کای ورد دەگیرێتەوە لە جیاتی گەچ ژووری پێ سواغ دەدرێ.
سیمورغ: سیمرغ.
سین: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
سینگ: سنگ.
سینە: سنگی گیاندار.
سینەباز: د. سنگە و بازد.
سینەبەرە: بەرەی وڵاخ. بەروانکە.
سینەبەن: سینەبەرە: گەردن بەند. (د).
سینەبەند: سینەبەرە. بەروانکە.
سینەپاڵوو: دەردی تەنگەنەفەسی.
سینەپۆش: بەروانکەیەکە دەگیرێ بە بەرۆکدا.
سینەک: جۆرێکە لە کاغەزی قومار.
سینە کەمان: پارچەیەکە لە مۆزیقە چەند تاڵێک ژێی لێ چەسپ کراوە بەکەوانەیەکی ژێدار لێ دەدرێ و دەنگێکی خۆشی لێ پەیدا دەبێ.
سینەما: مەکینەیەکە کە وێنەی شت بەگەورەیی بەهۆی کارەباوە پێشان دەدا.
سینەمەکی: گیایەکی گەرمیانی گەڵا وردی درێژکۆلەیە بۆ ڕەوانی دەخورێ.
سینی: دەفرێکی پانی لێوداره نان و چێشتی لەسەر دادەنرێ لە کاتی نان خواردندا.
سیوا بوونەوە: چاو کرانەوە و ترس شکان: تازە ئامۆژگاری کەڵک ناگرێ چونکە (سیوای بووەتەوە).
سیواخ: سواخ.
سیواغ: سواخ.
سیواق: سیواخ.
سیوان: چەتر (ز). خێوەت.
سی و جگەر: جەرگ و سی گیاندار.
سیوسیوە: تیغ هێنانەوە بەسەر ڕیش و سەردا دوای تاشینی.
سیە: سێبەر.
سییە: ناوە بۆ سەنگی کێشانەیەک لە وڵاتی موکریان.
سییەک: د. سێ یەک.
سێ یەک: لە سێ بەش بەشێک.
سێ یەکی: سێ یەک.
سێیەم: سێیەم.
سێیەمین: سێهەمین.
سییەوشکە: جۆرە نەخۆشییەکە بەهێندێ گیاندار دەگا هەمیشە دەم و قوورگی وشک دەبێ.



ش: پیتێکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (وەک): منیش دەخوێنم واتە وەک تۆ.
شا: گەورەی دەوڵەتێکە کە نەگۆڕێ و لە دوای خۆی کوڕی بکرێ بە شا. هەنگ و زەردەواڵەیەکی گەورەیە کە شان هەڵ دەبەستێ و گەرا دادەنێن. ناوە بۆ داشێک لە داشەکانی شەترەنج. شادمان (د). خۆشا: (شا) بەحاڵی فیسار کەس، واتە خۆشا بەحاڵی ئەو (د). اسمی فعلە بەمانای (تەماشاکە): (شا) کە، واتە تەماشاکە.
شاباز: بازی گەورە.
شاباش: دراوێکە کە هەڵدرابێ بەسەر یەکێکدا لە رووی خۆشەویستییەوە.
شاباشکردن: هەڵدانی دراو بەسەر یەکێکدا لە رووی خۆشەویستییەوە. وتنی (شاباش) لەلایەن گۆرانیبێژی هەڵپەرکێ و بۆ ئەوەی کە دراوی بدرێتێ.
شاباڵ: باڵی گەورەی پەلەوور. ئەندازەی باڵێکی گەورەی مەردووم لە شتێک: شا باڵێکم بلووری بدەرێ.
شابست: بلۆسکێکە لە سەرەوە تا خوار ئاسن بێ.
شابک: ز. چۆغەی رانک.
شابوو: کوندەبەبوو.
شابوون: ز. شادبوون.
شا بەروو: د. کەستانە.
شابەندەر: نوێنەری دەوڵەتێکە بۆ ناو دەوڵەتێکی تر بۆ ئەمەی کە لەوێ سەرپەرشتی کاروباری دەوڵەتەکەی خۆی و خاوەنداری هاوولاتییەکانی بکا. بریتییە لە ئافرەتی بێ شەرم.
شابەندەرخانە: کۆشکێکە کە شابەندەر تێیدا دانیشێ.
شابەنەر: شابەندەر.
شاپ: د. لێدان بە بەری دەست.
شاپرزا: شپرزە.
شاپلیتە: دارێکە سەرێکی پەڕۆی پێوە پێچرابێ و نەوتی پێداکرابێ بۆ داگیرساندنی.
شاپووراخ: ل. پەپوولە.
شاپە: ز. پارچەیەکی گەورەیە لە بەفر کە لەسەر شاخەوە هەرەس بێنێ. تاوێرێکە کە لە شاخێکەوە برووخێ.
شاپەڕ: پەڕی گەورە و درێژی باڵدار.
شاپەسەن: د. شاپەسەند.
شاپەسەند: گوڵێکی جوانە گەڵێ جۆر رەنگی هەیە.
شاپینۆز: پینەی کالآ.
شات: تووڵی یەکساڵە لە درەخت (هـ). شاتە (د).
شاتار: د. جۆرە تارێکی گەورەیە.
شاتاڵ:د. شالآو.
شاتاندن: قیژاندن.
شاتاوڵ: شاتاڵ.
شاتر: تەتەر.
شاتلوورە: تایەرە گلگل.
شات و شووت: شاتە شات کردن.
شاتوو: جۆرە توویەکی مۆری خڕی دەنک گەورەیە.
شاتە: هەرا و دەنگە دەنگی بێ شەرمانە.
شاتەشات: شاتەی یەک لە دوای یەک. جۆرە نانێکی تەندوورییە (د).
شاتەڕە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک شویت وایە ئارەقی دەگیرێ و دەخورێتەوە بۆ فێنکی دەروون.
شاجوان: لاوی شۆخ و شەنگ.
شاخ: کێو. شتێکی رەقی درێژە بەپشتی سەری گا و بەران و بزن و هێندێ گیانداری ترەوە. دەفرێکی دارینە باروتی تێ دەکرێ و دەکرێتە مل (ز).
شاخاندن: شریخە کردن.
شاخانن: د. شاخاندن.

شاخانە: پارەیەکە دەسێنرێ لە خاوەن ئاژاڵ بەرانبەر بەلەوەڕی شاخ.
شاخاو: جێی چرنووک لە ئەندام.
شاخاوی: شوێنێکە کە کێو و شاخی زۆر بێ.
شاخدار: جۆرێکە لە بەری دارمازوو لە (پانکە) دەچێ بەڵام ئەم درێژکۆلەیەکی قژ قژە. گیاندارێکە کە شاخی بێ.
شاخ سپی: جۆرە ترێیەکی سپیە وەک (مام برایمە) بەڵام ئەم سەر دەنکەکانی باریکە.
شاخستان: شاخاوی.
شاخکردن: هەستانە سەر پاشووی ماین و ئەسپ.
شاخ و بەڵەک: د. قەمزە و نان.
شاخە: دەنگێکە وەک دەنگی ڕووخانی خانووی بەرز و هەرس هێنانی تلی زۆر گەورەی قەد شاخ. لق و چڵی درەخت (د).
شاخەوان: گیاندارێکە کە باش بەشاخدا هەڵگەڕێ.
شاخی: شتێکە کە هەر لە شاخدا بێ: پڵنگ و بەوور، یابەڕەزا و ڕێواس (شاخی)ن، واتە هەر لە شاخ دەبن.
شاد: کەسێکە کە بەئارەزووی خۆی گەیشتبێ.
شادانە: د. تۆوی گوش.
شادبوون: بەئاوات گەیشتن.
شادمان: شاد.
شادمانی: شادی.
شادەمار: دەماری گەورەی گیاندار و درەخت.
شادەمەرگ: کەسێکە لە خۆشیاندا بمرێ.
شادەمەرگبوون: مردن لە خۆشیاندا.
شادە مەرگی: شادەمەرگبوون.
شادەنوێژ: پەنجەی دۆشاومژە.
شادی: کەیفخۆشی.
شار: چەند خانوویەکی زۆری ڕێکوپێکە کە لە دێ گەورەتر و جوانتر و ڕێکوپێکتر و ئاوەدانتر بێ. هێلانەی زەردەواڵە و مێروولە. شوێنێکی تایبەتی نیشانە کراوە لە هێندێ یاریدا وەک (چاوشارکێ) و (قەلە مردارێ) کە لێی کۆدەبنەوە.
شارا: کۆمەڵێکە لە کولۆش کە لە (مەلۆ) گەورەتر و لە خەرمان پچووکتر بێ.
شاران: ز. گوێز و بادامێکە وەک ملوانکە دروست دەکرێ.
شارانگەڕ: کەسێکە کە زۆر گەڕابێ و شارانی دیبێ.
شارانگەشت: شارانگەڕ.
شاراوە: شتێکە کە پەنهان کرابێ.
شاربەدەر: کەسێکە کە لە ئاواییەک دەرکرابێ لەبەر خراپی، (شاربەدەرکردن) دەرکردنی یەکێک لە ئاواییەک لەبەر خراپی.
شاردار: متصرف.
شاردراوە: شاراوە.
شاردن: شاردنەوە.
شاردنەوە: حەشاردان و ونکردنی شتێک.
شاراوە: شتی حەشاردراو.
شا ڕەگ: شادەمار.
شا ڕێ: ڕێگای زۆر پان و درێژکە ڕێگا و کۆڵانی زۆری بەسەرەوە بێ.
شا ڕێگە: د. شا ڕێ.
شا ڕیشە: د. شادەماری درەخت.
شارسان: د. شارستان.
شارسانی: د. شارستانی.
شارستان: شاری گەورەی ئاوەدان. شارێکی گەورەیە کە شارداری تێدا دابنیشێ.
شارستانێتی: ژیری و چاوکراوەیی.
شارستانی: کەسێکە کە لە شار دانیشێ. بریتییە لە مەردوومی زیری چاوکراوە.
شارگڕ: وتەیەکە دەوترێ لە یاری (چاوشارکێ)دا لە کاتێکدا کە بێتەوە سەر شار.
شارۆخ: چەمیلە ترۆزی.
شارەدێ: دێی زۆر گەورە.
شارەزا: کەسێکە کە ئاگادار و بەڵەد بێ بەشتێک (شارەزابوون) ئاگاداربوون بەشت.
شارەزایی: ئاگاداری و بەڵەدی بەشت.
شارەزوور: ناوچەیەکی گەورەیە لە کوردستانی عێراق.
شارە زەردەواڵە: کونێکە زەردەواڵە هێلانەی تێدا کردبێ.
شارە مرۆچە: د. شارە مێروولە.
شارە مێروو: کونێکە کە مێروولە هێلانەی تێدا کردبێ.
شارەمێروولە: شارە مێروو.
شارەوان: کەسێکە کە سەرپەرشتی ئاوەدانی و پاک و تەمیزی شارێک بکا.
شارەوانی: بلدیە.
شارپاگەوە: شاراوە.
شاریان: د. ونبوون.
شاری: شارستانی.
شارینەوە: شاردنەوە.
شازادە: نەوەی شا.
شازدە: شانزە.
شازدەمین: شانزەمین.
شازدەهەم: شانزەهەم.

شازدەهەمین: شانزەهەمین.
شا ژن: ژنی شا. بریتییە لە ژنی دەرهاتووی کارامە.
شاسوار: مەردوومی سوارچاک. مەردوومی چالاکی ئازای کارامە.
شاسە: شەستە.
شاسەیوان: خێوەتی شا.
شاش: شتێکە کە سفت نەبێ. سەرپێچ (با).
شاشخاپێن: ز. کەسێکە لەژێر پەردەی ئایندا دەستی مەردووم ببرێ.
شاشک: با. سەرپێچی پیاو.
شاشوویش: شتی زۆر شاش.
شاشە: شاسە.
شاشیک: شاشک. مێزەر.
شاف: شتێکی باریکە لە هێندێ دەرمان دروست دەکرێ، مایەسیری دار دەیکا بەکۆمیدا بۆ لابردنی ئازاری مایەسیریەکەی.
شاف پێ هەڵگرتن: بریتییە لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێک بەزمانی لووس.
شاف هەڵگرتن: شافکردن بەکۆمدا.
شاڤا: با. هەنگاو.
شاڤەشین: با. شینە شاهۆ.
شاڤین: با. دەنگی کەروێشک.
شاقاو: هەنگاو.
شاقروان: بۆق.
شاقڵ: چاکڵی کەوا.
شاقۆڵ: د. شاووڵ.
شاقولاب: قولاپی گەورەی چقە دار.
شاقولی ئاغا: دەعبایەکی ڕەشی پچووکە زۆرتر لە چاوی هەنجیردا دەبینرێ.
شاقووت: ز. پەلی دارگوێزێکە کە براب‌ێ.
شاقوول: فاقە (ز). شاووڵ.
شاقەل: شاقڵ.
شاقەڵ: قەبارەی گیاندار.
شاقەڵدار: گیانداری گەورەی بەخۆوە.
شاکار: کردەوەی گەورەی گرنگ.
شاکوڵ: ز. پێڵاو.
شاکۆل: دار دەست.
شاگرد: منداڵی بەردەستی وەستا.
شاگردانە: دراوێکە بدرێ بەشاگرد لە کاتێکدا کە شتێکی تازەی دروستکراوت لای وەستاکەی بۆ بهێنێتەوە.
شاگردە: دارێکی درێژی قەڵانگەدارە جۆڵا بژاری ڕایەڵی پێ دەکا.
شاگونج: گونچێکی گەورەی دارینە دەبرێتە دەم نێ و گونجی تری تێ دەبرێ.
شاگوڵ: گوڵی زۆر گەورە لە شت.
شاگە: شەگە.
شاگەردانی: د. پاشاگەردانی.
شاگەشکە: چەمۆڵە.
شاڵ: جۆرە تەنراوێکی خورییە گەڵێ جۆری هەیە.
شالاو: پەلاماردانێکی بێ شەرمانەیە لەگەڵ جوولانەوەی دەستدا.
شالوور: بلبل.
شالیار: د. پاشا. وەزیر.
شاڵیگا: د. مەرەزە جار.
شاڵینە: چەپاڵێکی چوارگۆشەی خورییە.
شام: د. ئێوارێ. نانی ئێوارێ.
شامار: ئەژدەها.
شامبۆز: مەردوومی دانای ئازا.
شامخواردن: شێوکردن.
شامکردن: نانخواردنی ئێواران.
شامۆیی: ز. جۆرە تووتنێکی بی کەڵکە.
شامێر: کەڵەمێروو.
شامێروو: شای مێروولان.
شامی: شووتی.
شان: ئێسقانی ڕاست و چەپی خوار مل کە هەردوو قۆڵی پێوە بەندە. شتێکی کون کونی گردە هەنگ و زەردەواڵە هەڵی دەبەستێ. تەنشت تەوقەسەری گرد و شاخ. گەورەیی و شکۆهی ئادەمی.
شانا: ل. شانە.
شانازی: نازین و خۆهەڵکێشانی یەکێک بەسەر یەکێکی تردا لەبەر شتێک.
شانای: هـ. تەکاندنی درەخت بۆ هەڵوەرینی بەری.
شان بەشان: بوونی دووکەسە بەڕەنگێک کە شانیان بەشانی یەکەوە بێ.
شانپۆش: دەسماڵی ژنان. شتێکە کە بدرێ بەشاندا.
شان داچەکان: شل و شێواوی یەخەی کالا.
شان داچەکاو: کەسێکە کە یەخە و ملیوانی کالاکەی شل و شێواو بێ.
شان دادان: بریتییە لە نووستنێکی کەم. بریتییە لە مردنی یەکێک و، لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ.
شان داهێشتن: د. شان دادان.
شاندن: چاندنی تۆو. ناردن (ز).

شانزه: ناوه بۆ ژمارەیەک کە شەش و دەیە.
شانزەمین: شتێکە کە لە پایەی شانزە دابێ.
شانزەهەم: شانزەمین.
شانزەهەمین: شانزەهەم.
شانس: بەخت.
شانشین: دوو سەکۆی پچکۆلەیە لای ڕاست و چەپی پێپیلکەیەکەوە کە پێیدا سەر دەکەوێت بۆ کۆشک. پایتەختی دەوڵەتێک. شکەم دوریدە.
شانۆ: شوێنێکی بەرزە لە تەختە دروست دەکرێ. سۆزانی لە سەری سەما دەکا. شوێنێکە تەمسیلی لەسەر دەکرێ.
شان و شەپیلک: وتەیەکە لە ڕووی گاڵتەپێکردنەوە بەیەکێکی شان داچەکاو دەوترێ: فیسار کەس (شان و شەپیلکێکی) ناشرینی هەیە.
شانوو: شانۆ.
شانە: شتێکی دانەدانەیە مووی پێ دادەهێنرێ. سەرکار (با).
شانەکار: ئافرەتێکە کە سەری ژنان ڕێک بخا.
شانەکردن: داهێنانی موو بەشانە.
شانەگەر: کەسێکە شانە دروست بکا.
شانەوشان: ڕۆین بەلەنجە و شان بادان.
شانەی جۆڵا: دەفەی جۆڵا.
شانی: ل. شانە.
شانین: د. فرێدانی شت.
شاواز: د. شاباز.
شاواش: د. شەباش.
شاوانە: د. جۆرە گیایەکە.
شاوۆڵ: ئاسنێکی خڕی قورسە بەپەتێکەوە، وەستا خواری و گێڕی دیواری پێ بەراورد دەکا.
شاه: شای دەوڵەت:. ناوە بۆ داشێک لە داشەکانی شەترەنج.
شاهانە: شتی پاشایانە.
شاهۆ: شینەشاهۆ: ناوە بۆ کەژێکی بەرز کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتێکی خوارووی هەڵەبجەوە.
شاهنشاه: شایەکی گەورەیە کە قەڵەمڕەوێکی زۆری هەبێ.
شاهەنگ: هەنگێکی گەورەیە لەناو پوورە هەنگدا کە شان هەڵ دەبەستێ.
شاهێن: باڵندەیەکی بۆری گۆشتخۆرە لە باز گەورەترە.
شاهینەت: ز. کەیفخۆش.
شاهی: شایی.
شایار: د. شالیار.
شایان: شایستە.
شایانی: بوونی شتێک بەوەی کە شتێکی ترێ لێ بوەشێتەوە.
شایستە: شایان و سزاوار.
شایستەکار: شتێک یا چەند شتێکە دەبێ بەهۆێ شایانی و سزاواری بۆ شتێک (مؤهلات).
شایستەیی: شایانی.
شایسە: د. شایستە.
شایەتی: شهادەت.
شایەتیدان: شهادەتدان لەسەر شتێک.
شایەد: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (بەشکوو).
شایەر: گۆرانیبێژی شایی.
شایەن: تەرازوو.
شایی: کۆبوونەوە و هەڵپەڕین لە خۆشیدا بۆ ژن هێنان یا خەتەنە سووران. هەڵپەڕکێ. ناوە بۆ دراوێکی زیوینی پچکۆلە.
شاین: د. شاهێن. میلی ترازوو.
شاییکەر: کەسێکە کە بچێ بۆ شایی.
شایلۆغان: هەڵپەڕکێ و دەهۆڵ و زوڕنا لە شاییدا.
شپرێو: شپرزە.
شپرێوی: شپرزەیی.
شپرزە: گیانداری هەڵبزڕکاوی سەرلێشێواو، (شپرزە بوون) هەڵبزڕکان و سەر لێشێوان.
شپرزەکردن: هەڵبزڕکاندن و سەرلێشێواندن. شێواندن و بڵاوکردنەوەی شت: شتەکانم (شپرزە) مەکە.
شپرزیاگ: د. شپرزە.
شپرزەیی: هەڵبزڕکاوی و سەرلێشێواوی.
شپک: ز. دارێکەماڵەی زەوی پێ دەدرێ.
شت: ئەوەیە کە بگونجێ بزانرێ و باسی لێوە بکرێ.
شتران: ز. جۆرە بەردێکی نەرمە.
شتن: شۆرین. بریتییە لە جنێودانی زۆر بەیەکێک: فیسار کەسم (شت) واتە پڕ جنێوم کرد.
شتنەوە: پاککردنەوەی دانەوێڵە بە ئاو.
شتۆ: وتەیەکە سەگی پێ بەر دەدرێ لە شت.
شتومەک: وتەیەکە لەجێی وتەی (کەلوپەل) بەکاردێنرێ.
شتوو: ز. جۆرە هەرمێیەکە تا زستان دەمێنێ.
شتووک: ز. ئاوێکی زەردە کە دەکەوێتە سەر دۆ و دەکوڵێنرێ و دەدرێ لە جەستەی هەتاوبردوو.
شتەو: شتۆ.
شتێن: کەسێکە هەمیشە چاوی لە شتی مەردوومەوە بێ و، بەبێ شت هیچ بۆ کەس نەکا.
شحنە: ز. داروغە بازاڕ.
شخارتە: شقارتە.
شخره: ز. شەخرە.

شخوو: با. خۆڕایی.
شرتک: ز. تۆڵی مێو.
شرت و شۆڵی برین: بریتییە لە جنێودانی زۆر بەیەکێک.
شڕ: شتی دڕاوی هەلا هەلا. وتەی گاڵتە پێ کردن: (شڕ) لە پیاوەتیت، واتە شێر (د).
شڕپۆش: کەسێکە کە هەرچی لەبەردا بێ شڕو وڕ بێ.
شڕکردن: بریتییە لە جنێودانی زۆر بەیەکێک. هەلاهەلاکردن و دڕاندنی شتێک.
شڕم بڕم: وتاری بێ سەر و پێ.
شڕ و پڕ: شڕ و شیواڵ.
شڕ و دڕ: مەردوومی دڕی هار.
شڕ و شیتاڵ: شتومەکی شڕی هەلا هەلا.
شڕ و شیواڵ: شڕ و شیتاڵ. شڕۆڵ.
شڕۆڵ: مەردوومی ڕیپاڵی شڕپۆش.
شڕو وڕ: شتی زۆر شڕ.
شڕە: شڕو شیتاڵ.
شڕها: وتەی تیتاڵییە وەک (شیرها).
شڕەگر: میراتگر.
شڕە و بڕە: شڕە و پڕە.
شڕە و پڕە: شڕ و شیتاڵ.
شڕە و شیتاڵ: شڕ و شیتاڵ.
شڕە و مڕە: شڕە و پڕە.
شرشر: دەنگی چۆڕاوگە.
شرقە: قرمە.
شرک: ز. پلوسکی چۆڕاوگە.
شرن: ز. کەڵبەی بەراز.
شرنگە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی شیر و خەنجەر کە بوەشێنرێ.
شروە هەلاڵێ: هـ. گوڵێکی سوور و سپییە لە (هەلاڵە برمە) دەچێ بەڵام ئەم پچووکترە.
شرەق: د. درز.
شرەقیان: د. درز بردن.
شرینقە: شتێکی تایبەتییە دەرمانی شلی تێ دەکرێ و بەدەرزی لە جەستە دەدرێ.
شریت: پەتێکی ئەستووری بەهێزی دەزووینی بادراوە.
شریخاندن: شریخەکردنی هەور. قیژاندنی یەکێک زۆر بەتوندی.
شریخانن: شریخاندن.
شریخە: دەنگێکە وەک دەنگی هەورە بروسکە، (شریخە شریخ) شریخەی یەک لە دوای یەک (شریخ و هوور) شریخە شریخی زۆر.
شریقە: شریخە.
شژ: کێم و زووخ.
شست: ز. سست.
شست و شۆ: شوست و شۆ.
شست و شۆدان: شوست و شۆدان.
ششت: شت.
ششتن: شتن.
ششتنەوە: شتنەوە.
شعەفی: ز. جۆرە ترێیەکی زوو ڕەسە .
شغاب: ز. مەتەی دارتاش.
شغارتە: شقارتە.
شفتە: خواردەمەنییەکە وەک کەباب لە گۆشتی قیمەکراو و ئارد دروست دەکرێ و لە ڕۆندا سوور دەکرێتەوە.
شفتەژە:د. شفتە ژێ.
شفتە ژێ: سک پڕبوونەوەی ژن لە کاتێکدا کە منداڵی شیرەخۆرەی بە بەرەوە بێ.
شفتێل: ز. تووڵی تەڕی باریک کە لە شت بپێچرێ.
شفتی: با. شووتی.
شفرە: برەی بەراز.
شڤ: با. شوێنی نزم و نەوڕێ.
شڤارێ: ز. زەلامەرێ.
شڤان: ز. شوان.
شڤر: با. فیلە گێژە.
شڤک: ز. شووڵ.
شڤن: با. بزنە کێوی.
شڤیلە: ز. شڤارێ.
شق: با. ماندوو: (شقێتە) خوا هێزت بدا.
شقارتە: قوتوویەکی دوو پارچەی تەنکی پچووکە براونەتە یەک، چەند دانەیەکی باریکی تێدایە سەرەکانیان دەرمانێکی پێوەیە دەدرێ لە دەرمانی تەنشتی قوتووەکە و دادەگیرسێ.
شقام: ز. شەقازللە.
شکار: ڕاو. کۆمەڵە بەرد. زەوی بەردەڵانی.
شکارتە: پەڵە دانەوێڵەیەکی پچووکە کە هەژارێک بۆ خۆی یا یەکێک بۆ دۆستێکی داچەند بێ.
شکارتە کێل: ئەندازەیەکە لە زەوی کە کێڵدرابێ بۆ شکارتە.
شکارگا: د. شوێنی شکار.
شکان: لەتبوونی شتی ڕەق. نەمانی ڕۆژوو بەهۆی خواردن یا خواردنەوەوە. بریتییە لە هاتنە خوارەوەی نرخی شت: گەنم (شکاوە). بریتییە لە ڕیسوابوونی یەکێک: بەدرۆکردن مەردووم (دەشکێ).

شكاندن: لەتكردنی شتی ڕەق. نەهێشتنی ڕۆژوو بە خواردن یا خواردنەوە. بریتییە لە هێنانە خوارەوەی نرخی شت. بریتییە لە ڕیسواكردنی یەكێك. بریتییە لە كوڵدان بەلەشكر. بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و بەڵێن.
شكاندنەوە: شكاندنی لقی درەخت. گەڵا ڕنكردنی تووتن حەڵێك كە زەرد بێ. هێنانە ژێر باری منداڵ كاتێك كە كزر بێ بۆ ئەوەی كە فێری كارێك بێ: منداڵەكەت زوو (بشكێنەرەوە). ڕۆكردنی هێندێ لە چای تازە لێنراو و، تێكردنەوەی بۆ سەرەوخوار بوون و دەمكێشانی.
شكانن: شكاندن.
شكانەوە: پەژمووردەبوونی گیاندارێک كە لەوە پێش بەدەماخ بووبێ.
شكاو: شتێكی ڕەقە كە لەت بووبێ. شتێكە كە نرخی هاتبێتە خوارەوە. مەردوومێكە كە ڕیسوا بووبێ.
شكاوی: ئاستی شكانی شت.
شكس: د. شكست.
شكست: شتی زەردی درزبردوو.
شكستە: جۆرە نووسینێكی تایبەتی تێ هەڵكێشە وەک خەتی دیوانی. تاقێكی كەوانەییە كە كەوانەكەی نزم هێنرابێتەوە. شكست (د). لەشكری شكاو.
شكستی: شوێنی زەرد لە شت.
شكڵ: دیمەن و دروشمی شت.
شكڵنووس: نووسینەوە لەبەر شكڵی نووسراوێک بێ ئەمەی بزانیت دەڵێ چی.
شكۆ: د. سام و سامان گەورەیی. فیساركەس زۆر بە(شكۆ)یە، واتە بەسامە و شەرمی لێ دەكرێ.
شكۆفە: گوڵووكی هێندێ درەخت كە تازە پشكووتبێ.
شكۆفیانەوە: د. پشكووتن و گەشانەوە .
شكووک: ز. هەرمێ.
شكوولک: شكەلووک.
شكەبەر: ز. دیوارێكە لە بەردی ڕووت دروست كرابێ.
شكەست: شكست.
شكەستن: ز. شكاندن.
شكەفت: ز. ئەشكەوت.
شكەڤ: ز. كاسەی چێشت تێدا خواردن.
شكەلک: با. پارچەی كووپە و گۆزەی شكاو.
شكە لووک: با. توێكڵی شت.
شكەم دووپیدە: لادانێكی گەورەیە لەناو دیواری ژووردا شووشەبەند دەكرێ و لە زستاناندا تێیدا دەنوون.
شكەنجە: د. ئەشكنجە.
شكەو: كاسە.
شكیاگ: د. شكاو.
شكیان: د. شكان.
شكیانەوە: د. شكانەوە.
شكێر: ز. بەردی بەسەریەكدا كەوتوو.
شكێڕ: شكێر.
شگۆفە: شكۆفە.
شل: شتی ڕوونی تراو. شتی لەق. ئەم سنگە یا ئەم بزمارە (شل)ە. كەسێكە كە لە كارێكدا گیر نەبێ: فیساركەس بۆ ئەو كارە (شل)ە واتە گیر نییە. شتێكە كە توند نەبێ: پشتێنەكەم (شل)ە، یا دەستم شل بوو.
شڵ: شتی سوور پڕ نۆڵی پڵپڵ.
شلاڵ: كۆكی درومان.
شلانە: د. شێلانە.
شلانەكوت: د. قەپسی وشكەوەكراو.
شلبوون: بێ هێزی و خاوبوونەوەی ئەندام. لەقبوونی شت.
شلبوونەوە: خاوبوونەوە.
شڵپ: مشتێک ئاو كە بدرێ بەدەموچاودا.
شڵپاو: د. شەپۆلی ئاو.
شڵپ و كوت: شڵپە و گرمەی لێدان: فیساركەس (شڵپ و كوت) منداڵەكەی داگرت.
شڵپە: دەنگێكە لە لێكەوتنی شتێک لە شتێكی شل یا تەڕ پەیدا دەبێ، (شڵپە شڵپ) شڵپەی یەک لەدوای یەک (شڵپ و هووڕ) شڵپە شڵپی زۆر. بریتییە لە چێشت و گۆشتی زۆری مشە: لە ماڵی فیساركەس (شڵپە)یە.
شڵخە: پوورەی هەنگ.
شڵغە: د. شڵخە.
شلف: ز. نوكی خەنجەر و كێرد.
شلفە: شفرەی بەراز.
شڵقە: دەنگێكە وەک دەنگی مەشكە لە كاتی ژەندنیدا (شڵقە شڵق) شڵقەی یەک لەدوای یەک (شڵق و هووڕ) شڵقە شڵقی زۆر.
شڵقیاگ: شتی فلیقاوەی زۆر بەسەر یەكداچوو (د). شڵەقاو (د).
شڵەقیاو: د. شڵقیاگ.
شلک: گیانداری شلە پەتە. تەپڵی سەر: شلكاسەر واتە تەپڵی سەر (ز).
شلكاک: ز. جۆرە باڵدارێكە لە كۆتر گەورەترە.
شلكردن: خاوكردنەوەی شت. بریتییە لە خاوبوونەوەی یەكێک و بەدەستەوەدانی شتێک كە لەوە پێش گیرەگیری لەسەر كرد بێ.

شلکردنەوە: خاوکردنەوەی شتی توند.
شلکوتی مـەرگکردن: بریتـیـیـە لە لێـدانی زۆر لە یەکـێک بەرەنگێک کە شل ببێ.
شلکە: گوڵمە گۆشت.
شلکێنە: جۆرە نانێکە هەویرەکەی بەکەوچک دەکرێتە سەر ساج و پان دەکرێتەوە و دەبرژێنرێ.
شڵنگ: د. تەکان و هەڵمەت.
شلۆر: ز. میوەیەکی ترشە وەک هەڵووژە .
شل و شۆڵ: شل و شێواو.
شل و شێواو: مەردوومی شەپ و شۆڕی شان و مل داچەکاو.
شلۆڤە: با. باران و بەفرێکە کە بەیەکەوە بباریێ.
شلۆق: شلووق.
شل و مل: شتی نەرم و شل.
شلووق: شتێکە لە جێی خۆی لەقیبێ.
شلووقبوون: تێکچوون و شێوان: جیهان چاک (شلووق بووە).
شلووقیان: د. شلووقبوون.
شل و ول: د. د. شل و مل.
شلوێ: ئاوی لێڵ.
شلە: چێشـتی شل. جۆرە تەنراوێـکی تەنکی شاش و وێشـە ژنان دەیکەن بەکاڵا.
شڵە: بەڵەک.
شلەپەتە: شلک.
شلەپین: ز. هەڵخلیسکان.
شلەتێن: شتێکی شلە کە کەمێک گەرم بێ
شلە جاف: جۆرە لەوەڕێکی زۆر باشە بۆ ئاژاڵ.
شلە جاو: د. جوونی شت بەوردی.
شلەحەیحەی: بریتییە لە شتی شلی ناشرینی ناخۆش.
شلەختە: د. شلەپەتە.
شڵەژان: پەشۆکان.
شڵەژاندن: پەشۆکاندن.
شڵەژە: د. شڵەژاو.
شڵەژین: شڵەژان.
شڵەژیو: شڵەژاو.
شلە شاری: شارستانی خاو و خلیچک.
شلەشل: خاوە خاو.
شڵەقان: هاتوچۆکردن و جووڵانی شتی شل لەناو دەفرێکدا.
شڵەقاندن: ڕاوەشاندن و جووڵاندنی شتی شل لەناو دەفرێکدا.
شڵەقانن: د. شڵەقاندن.
شڵەقاو: شتێکە کە شڵەقابێ.
شلەقاورمە: چێشـتێکە لـە قەیسی و کشـمیش و گۆشت دروست دەکرێ.
شڵەقیان: د. شڵەقان.
شڵەقین: شڵەقان.
شلەک: ز. شلکێنە.
شڵەمار: جۆرە مارێکی شڵە.
شلیتک: با. تەناف.
شلێـر: گولێکی بەهاری شـاخییە بنکەکەی وەک سـەلکە پیـاز و گوڵی وەک لاولاو وایە. ناوچەیەکی درێژکۆلەیە لە ڕۆژهەڵاتی پێنجوینەوە.
شلێقانن: د. فلیقاندنەوە.
شلێقیاگ: د. فلیقاوە.
شلێقیان: د. فلیقان.
شلێل: ز. جۆرێکە لە جۆ.
شڵێوە: د. شلۆڤە.
شڵێویان: د. ئاشووب و ئاژاوە و تێکچوون.
شماردن: د. ژماردن.
شمارۆن: ز. مێو و ڕۆن.
شمارە: د. ژمارە.
شمامۆک: ز. شەمامۆکە.
شمتن: شووتی.
شمتوو: شمتن.
شمتی: با. شووتی.
شمش: سپڵ. سی گیاندار.
شـمـشـاد: جـۆرە دارێکی جـوانی بێ گـرێ و قـۆرتـە کـەوچک و لەنگەری لێ دروست دەکرێ.
شمشاڵ: لوولک. شمشاد.
شـمـشـە: دارێکی چوارگـۆشـەی ڕاسـتـە وەسـتـای سـواغ بەکـاری دەهێنێ بۆ ڕاستی سواغەکەی.
شمشەکاری: سواغێکە کە بەهۆی شمشەوە درابێ.
شـمـشـێر: تیـغـێکی برندەی تیـژی درێژی دەمـپـانی کـەوانەدارە. شمشێرە.
شمشێرە: دارێکە لە پشـتی دەرگادا جێی کولۆمی لێ لەلە کراوە لە (کـیـسـەڵە)وە ڕەت دەکـرێ و دەرگـای پێ دادەخـرێ. پارچەیەکە لە پارچەکانی یەرەقی جووت.
شمقارِ: باڵندەیەکی گۆشت خۆری ڕاوکەری چوست و چالاکە.
شمک: ز. سۆل.
شملی براکە: د. شەنگڵە.
شملی بەرەکەت: د. شەنگڵە بەرەکەت.
شـملی: شـتـێکی بۆنخـۆشـە وەک زیرە وایە دەکـرێتـە ناو نانەوە. شەنگڵە (د).
شمۆرتک: د. شتێکە کە وترا هەر مەبەست لە خۆی بگەیەنێ و هیچی تر (جزئی).

شمووز: چەمووش.
شمە: هـ. ئێوە.
شناس: ناسیاو.
شناسایی: شناسی.
شناسنامە: دەفتەرێکی پچکۆلەیە ناوونیشان و جێگا و ڕێگای خاوەنەکەی تێدا دەنووسرێ (هویة).
شناسیار: ناسیاو.
شناسی: ناسیاوی.
شناسین: ناسین.
شناو: شنۆی زۆرخانە.
شناوە: پەڵەی پچووک لە کشتوکاڵ.
شنکی: شەن.
شنگ: گیایەکی بەهاری لق باریکی گەڵا لوولی بنکدارە دەخورێ.
شنگڕ و شیواڵ: پڕوپاتاڵ.
شنۆ: جۆرە جوولاندنێکی تایبەتی ئەندامە پاڵەوانان دەیکەن بۆ بەهێزبوونی ئەندامیان. ناوە بۆ شارێک لە ناوچەی سابلاخ لە کوردەواری ئێران. شنەی با (د).
شنە: لەرینەوەیەکی هێواشی لەسەرخۆ: (شنە)ی با دێ، (شنەشن): شنەی یەک لەدوای یەک.
شنەفتن: ل. شنەوتن.
شنەوا: د. بیسەر (سمیع).
شنەوتن: بیستن.
شنیان: د. شنینەوەی منداڵ.
شنین: د. شنیان.
شنینەوە: گۆشەکردن و شنەشن کردنی منداڵ. لەرینەوەی درەخت.
شۆ: شتێکی لینجە وەک کەتیرە دەدرێ لە هێندێ تەنراو بۆ دەق بەستن. شێف. شتی نمدار.
شواشینک: درەختێکی بەهاری هەمیشە سەوزە گەڵای وەک مۆرد وایە، بەرێک دەگرێ وەک چواڵە تاڵە. ناوە بۆ جۆرە ترێیەک (با). ناوە بۆ جۆرە هەنجیرێک (با).
شواڵک: خەڵفەدارێکی تازەی باریک و درێژە کە لەناو چەند خەلفێکی تردا هاتبێتە دەرەوە.
شوان: کەسێکە کە ئاژاڵ بلەوەڕێنێ.
شوانانە: شتێکە کە بدرێ بەشوان.
شوانخەڵەتێنە: باڵندەیەکی بۆرەقنەیە لە چۆلەکە گەورەترە هەڵ نافڕێ تا نزیکی نەبیتەوە.
شوانشوان: د. جۆرە یارییەکی مندالانەیە.
شوانشوانەکێ: د. شوانشوان.
شوانکارە: کەسێکە پیشەی هەر شوانی بێ. ناوی تیرەیەکە لە جاف.
شوان هەڵخەڵەتێنە: شوان خەڵەتێنە.
شۆب: ز. بەڵگە و ڕێوشوێنی شت.
شوبات: مانگی دووەم لە ساڵی ڕۆژی کە لە ناوەندی کانوونی دووەم و مارت دایە و بیست و نۆ ڕۆژە لە ساڵی (کبیسە)دا و بیست و هەشت ڕۆژە لە ساڵانی تردا.
شۆبە: ز. بێ هۆشبوون لەبەر نەخۆشی.
شۆپ: تیکە و پارووی زل: هیچ بەرگەی (شۆپ)ی تۆ ناگرێ. شەپی دەست.
شوپاژۆ: کەسێکە کە شوێن پێ هەڵگرێ.
شۆت: هـ. شیری گیاندار.
شۆتک: شۆرتکە.
شۆتیلە: هـ. گیایەکی بەهاری شیردارە لە سالمە دەچێ.
شۆتین: هـ. چێشتی شیر برنج.
شۆتینە: فرنی.
شۆباو: شۆربا.
شۆخ: مەردوومی باڵا بەرزی جوانی شەنگ و شۆخ.
شۆخی: گاڵتە و گەپ، (شۆخیکردن) گاڵتە کردن.
شۆدار: شتێکە کە شۆی پێوە بێ.
شۆدان: ئاوکردنی هێندێ شت و نمدانی.
شۆر: سویر. گیانداری زۆر ڕەوان. جۆرە مقامێکی خۆشە. کەرەکێوی. شۆدار. عەشق: فیسار کەس (شۆر)ێکی هەیە، واتە سۆز و عەشقێک.
شۆران: شتن.
شۆراو: شتێکە کە بەئاو شۆرابێتەوە.
شۆراوە: دانەوێڵەیەکە کە بەئاو شۆرابێتەوە.
شۆربا: جۆرە چێشتێکی شلی تراوە.
شۆرباڕێژ: دۆخاوکردنی شوێنێک بەگەچ یا بەچیمەنتۆ یا بەقسڵ.
شۆربە: ز. شۆربا.
شۆرتان: جۆرە پەنیرێکە.
شۆرتک: شۆرتکە.
شۆرتکە: جۆرە پشتێنێکی جوانی پانی ئاوریشمینە. سەر شۆرک.
شۆردراوە: شۆراوە.
شۆردن: شتن.
شۆردنەوە: شتنەوە.
شۆڕ: شتێکە کە لە شوێنێکی بەرزەوە داڕۆچکە بووبێ (شۆڕبوونەوە) داڕۆچکەبوونی شتێک لە بەرزییەکەوە (شۆڕ کردنەوە) داڕۆچکەکردنی شتێک لە بەرزییەکەوە.
شۆڕاوگە: چۆڕاوگە.
شۆڕگە: جێی شت شوشتن لە ماڵدا.

شۆڕە: چۆڕە، (شۆڕە شۆڕ) چۆڕە چۆڕ.
شۆڕەبی: جۆرە بییەکە لقەکانی سەر بەرەوخوار دەبنەوە و ڕوو دەکەنە زەوی.
شۆڕەژن: ژنی شۆخ و شەنگی جوان.
شۆڕەسوار: سوار چاکێکە کالآی شۆڕی جوانی لە بەردابێ و بەسەر زینەکەدا هاتبێتە خوارەوە.
شۆڕەوبووگ: د. شتی شۆڕبووەوە.
شۆڕەوەبوون: شۆڕبوونەوە.
شۆڕش: هەرا و ئاژاوە.
شۆڕشگێڕ: کەسێکە کە شۆڕش هەڵگیرسێنێ.
شۆرمەزە: جۆرە چێشتێکە بەنۆک و جاترە و گیا و دانوو دروست دەکرێ وەک چێشتی (دانەڕۆکە) بەڵام ئەم گەنمی تێ ناکرێ. شتی سوێر خوێ.
شۆروا: د. شۆربا.
شوروارێژ: د. شۆربارێژ.
شۆرە: شتێکی سپییە وەک زاخ دەکرێتە ئاو بۆ جل پێ شوشتن و، باروتیشی لێ دروست دەکرێ.
شۆرەزار: شورەکات.
شۆرەک: ز. شۆرەکات.
شۆرەکات: زەوییەکە خاکەکەی لەبەر سوێری گیای کەم لێ سەوز ببێ.
شۆریاگ: د. شۆراو.
شۆریان: د. شۆران.
شۆرین: شتن.
شۆرینەوە: شتنەوە.
شوست و شۆ: شتن.
شوست و شۆدان: بریتییە لە سەرزەنشت و سەرکۆنەکردنی یەکێک.
شۆستە: شۆسە.
شوس و شۆ: شوست و شۆ.
شۆسە: زەلامەرێ لە لای ڕاست و چەپی شار ڕێوە.
شۆسیەخ: د. چلوورەی گوێسوانە کە شۆڕ ببێتەوە.
شوش: هـ. سی گیاندار.
شۆش: هۆش (ز). تاڤگە.
شووشتن: ششتن.
شۆشیەهەر: هـ. سی و جگەر.
شوفار: جاسووس.
شوغال: ل. چەقەڵ.
شۆڤ: ز. شێف.
شۆق: سەروەشاندنی مەڕ و بزن و گا.
شوقاق: د. شوقاقی.
شوقاقی: دەردێکە لە چوارپەلی ئاژاڵ دەدا شەقار شەقاری دەکا.
شۆق تێهەڵدان: لێدانی مەڕ و بزن و گا بە سەر.
شۆقدان: شۆق وەشاندن.
شۆقل: ز. پۆڵکە.
شۆق وەشاندن: شۆق تێهەڵدان.
شۆق وەشێن: گیاندارێکە کە شۆق بوەشێنێ.
شۆق هاویشتن: شۆق وەشاندن.
شوقەللەت: شتێکە وەک سەکۆیەکی باریک لای سەرووی ژوورەوە دروست دەکرێ ژێرەکەی بۆش و خانخانە شتیان تێدا دادەنرێ و لە سەریشی شتومەک دادەنرێ.
شۆق هەڵدان: شۆقدان.
شۆک: جۆرە شیرینییەکە لە گەڵای مازودار و داربەڕوو دەنیشێ.
شۆکە: شۆک. دەردێکە دەدا لە گەڵای توتن و هێندێ شتی تر زەبوونیان دەکا.
شۆڵ: سوێر. وتەیەکە هەمیشە لە دوای وتەی (شل)ەوە بەکاردێنرێ:
شل و شۆڵ: واتە زۆر شل.
شۆڵاو: سوێراو.
شۆلەکە: دەفرێکی دوولاییە لە جەواڵ گەورەترە.
شۆم: شۆو.
شۆن: شوێن.
شوناس: شناس.
شوناسی: شناسی.
شۆن کۆمەکێ: شوێنەونی.
شۆن نیان: د. شوێن هەڵگرتن.
شۆن هەڵکردن: د. شوێن هەڵگرتن.
شوو: مێردی ژن.
شۆو: شێف.
شووار: شتێ: سوێندم بەم ئاوە کە (شووار)ی هەموو کەسێکی پێ دێ. لێدانی دەمار.
شووارگرتن: دەست خستنە سەر دەمار بۆ زانینی لێدانی.
شووال: د. شەرواڵ.
شووالپیس: د. شەرواڵپیس.
شووبرا: برای مێرد.
شووبراژن: هێوەرژن.
شۆو برین: شێف برین.
شووپایی: د. تەمەڵیت.
شووپەکان: جۆرە یارییەکی کچانەیە.
شووت: شتی لووس.

شووتک: ز. شۆرتکە.
شووتی: میوەیەکی خڕی گەورەی لووسە ناوەکەی شیرین و سوور و ئاودارە.
شووتی کۆڵە: شووتی پچکۆلەی گەیو .
شوور: شیری بڕندە (ز) فیلە گێژە.
شوورا: شوورە.
شوورتان: هیزە.
شوورک: شتی خوار.
شوورە: دیوارێکی پانی بەرزە بەگردی شار یا جێگایەکدا دروست دەکرێ بۆ قایمی.
شوورەیی: نەنگ: ئەم کارە بۆتۆ (شوورەیی)یە.
شووژن: سووژن.
شووژن ئاژن: سووژن ئاژن.
شووش: شتی باریک و ڕاست و جوان. سیپەلک: (هـ).
شووشو: هـ. شمش.
شووشوویەهەر: هـ. سی و جگەر.
شـووشــە: شــتــێکی لووسی ڕەقی تورتی ڕووناکــە دەخــرێتــە پەنجەرەوە. پارچە زێڕ و زیوی داڕێژراو.
شووشەبەند: شوێنێکە شووشەی زۆر لە دار و دیواریدا بێ.
شووشەکاری: شووشەبەند. خەریکبوون بەکاری شووشەوە.
شووشەگەر: کەسێکە کە شووشە دروست بکا.
شووشەیی: شتی لووسی ڕاستی جوان.
شووکردن: مێردکردنی ئافرەت.
شوول: با. شـووڵ. ئیشوکار: (شوول)م هەیە، واتە کارم هەیە، لە شغلی عەرببییەوە وەرگیراوە.
شووڵ: تووڵ.
شوولاق: قامچی.
شوولاندن: فیراندن.
شوولک: تووڵی پچووک.
شووڵک: شوولک.
شووڵ لێ هەڵکێشان: بریتییە لە دەرچوونی مەردووم لە ئەندازەی خۆی لە هەموو کارێکدا.
شوولە: ئەندازەیەکە لە قوڕ کە بەبێڵ هەڵبگیرێ.
شوون: ز. شوێن.
شوونک: ز. گەڵا کوتک.
شـوونەوار: ئەتەری مــەردووم و گــیــاندار: فــیــســار کــەس (شوونەوار)ی نییە.
شو هۆڕ: د. شووڵی تەڕ.
شوێڵ: د. زەمینی باریک.
شوێن: جێگایەکە بگونجێ شتێکی تێدا دابنرێ.
شوێن بە شوێن: دوابەدوا.
شـوێنخـستن: ناردنی یەکـێک بەدووی یەکـێکدا بۆ جـوست و جۆکردنی ئیشوکاری.
شوێنک: با. گەڵا کوتک.
شـوێنکردن: جێکردنی شـتـێک لە ئەندام بەهۆی تەسکی و زۆر چەسپ بوونییەوە: ئەموستیلەکە یا پشتێنەکە ئەوەندە توندە (شوێنی کردووە).
شوێن کەفتن: د. شوێن کەوتن.
شوێن کەوتن: دووکەوتن.
شوێنەزا: ئەو وڵاتەیە کە تۆی تێدا لە دایک بوویت.
شوێنە گومکێ: شوێنە ونێ.
شوێنەوار: شوونەوار.
شوێنەونکە: شوێنەونێ.
شوێنەونێ: شوێنەونی.
شـوێنەونی: سـەرشـێـواندن لە کـەسـێک بەکـردار یا بە وتـار بۆ شاردنەوەی کارێک لێی.
شـوێن هەڵگرتن: دۆزینەوەی شـتی دزراو بەهۆی شـوێن پێـوە لە زەوی.
شویت: گـیـایەکی گـەڵا وردی تام و بۆن خۆشە دەکـرێتە چێشـتی یاپراخەوە.
شە: شێ: شەکرەکە (شە)ی هێناوە. شانە (با).
شەباقە: دەلاقە.
شەبەق: ڕوونی کەناری ئاسمان لە بەیاندا. کونی گەورە لە کاڵاو دیوار.
شەبەق تێبوون: شەبەق تێکەوتن.
شەبەق تێکەوتن: کونبوونی کاڵا و دیوار بە گەورەیی.
شەبەقدان: ڕووناکبوونەوەی کەناری ئاسمان لە بەیاندا.
شەبەق شەبەقبوون: کون کون بوونی دیوار و کاڵا بەگەورەیی.
شەبەقی: بەیانیان کاتی شەبەق.
شـەبەندە بەڕۆژ: جـۆرە خـامــەکـێکی زۆر جـوانە بەگـەڵێ ڕەنگ دەنوێنێ.
شەبەنگە بەڕۆژ: شەبەندە بەڕۆژ.
شەبەیخوون: بەسەر دوژمن دادان لە شەودا.
شەبیکێن: ز. ڕەقیتە.
شەبیک: ز. نەقیزەی وڵاخ لێخوڕین.
شـەپ: بەری دەست: شەپێکی پێدادا واتە لەپێک. پڕ بەچنگێک لە شتێـک: (شـەپ)ێک کـەرە، واتە پڕ بەچنگێک. پڕ (ل). وتەیەکە هەمیشـە لە پێش وتەی شۆڕەوە بەکاردێنرێ: (شـەپ و شۆڕ). شەپاڵە.
شەبازللە: کێشان بەڕوومەتی یەکێکدا بە بەری دەست بەتوندی.

شەبال: ز. شتی جوانی باش.
شەپالمە: شەپالە.
شەپالە: لێدان بەبەری دەست لە ئەندامی گیاندار.
شەپرەوی: چەپرەوی (یساری).
شەپرێو: مەردوومی شپرزە.
شەپریو: مەردوومی شەپ و شۆڕ.
شەپرزە: شپرزە.
شەپشەپان: د. شەپلی شۆپێن.
شەپقە: جۆرە کلاوێکی لێوارداره سێبەر لە دەموچاو دەکا.
شەپک: چۆغەی ڕانک.
شەپکە: پارچەیەکە لە پارچەکانی جۆلایی. شەبقە (د).
شەپلاخ: شەپازللە.
شەپلاخە: شەپلاخ.
شەپلە: دەردێکی کوتوپڕی گرانە دەدا لە ئەندامی گیاندار و وشکی دەکا.
شەپلی شۆپان: شەپلی شۆپێن.
شەپلی شۆپێن: یاریکردن بە سێو یا بە شتێکی وەک تۆپ لە حەوادا.
شەپلی شەپان: د. شەپشەپان.
شەپۆتە: دەفەی جۆلا.
شەپۆپە: شەپۆتە.
شەپۆڕ: شیوەنی تێکراپی بە کوڵ.
شەپ و شۆڕ: کەسێکە کە شل و شێواو و، داوێنی بەسەر زەویدا بخشێ.
شەپۆکان: د. پەشۆکان.
شەپۆکیان: د. شەپۆکان.
شەپۆل: تەکاندانی ئاو بە هۆی شتێکەوە.
شەپۆلدان: قۆندەرەکردنی ئاو.
شەپە: کۆمەڵە بەفر.
شەپەڕ: با. باڵی پەلەور و فڕۆک.
شەپەزللە: شەپازللە.
شەپە شەپ: دەنگی دڕ و داوێنی شۆڕ کە تەڕ بووبێ.
شەپەلۆخ: گیانداری چاوبرسی زۆرخۆر.
شەپەلووح: درەختێکی گەرمیانییە بەرێک دەگرێ وەک هەنجیر دەخورێ و، لقە گەورەکانی وەک شووتی تەرز دەهاوێ.
شەت: ڕووباری گەورە.
شەتاو: ئاوی سارد دان بەژێر سک و گەڵوگونی وڵاخی بەرزەدا لە کاتی گەرمادا. شەت.
شەترنج: جۆرە یارییەکە وەک دامە بە شەش جۆر داش دەکرێ کە هەموویان سی و دوو داشن کە پێیان دەڵێن: (ڕوخ، ئەسپ، فیل، شا، وەزیر، پیادە).
شەتڵ: سەوزاییەکە لە شوێنی خۆی بەڕیشەوە هەڵکەندرابێ بۆ ڕواندنی لە جێگایەکی تر.
شەتڵجاڕ: شەتڵگا.
شەتڵگا: د. شوێنێکە کە شەتڵی تێدا بروێنرێ.
شەتوپەت: شتی لەت و پەت.
شەتوکوت: شەتوپەت.
شەتوور: با. شەفتوول.
شەتەرە: شاتەرە.
شەتەکدان: پێچانەوە و بەستنی شتێک بەتوندی.
شەخت: ز. گیاندارێکە شەلی لە هەردوو دەستیدا بێ.
شەختۆ: تەمەڵ. شتی تێکەڵ و پێکەڵ.
شەختە: سەهۆڵ.
شەخرە: شتێکە لە دار دروست دەکرێ وەک دوو پەیژەی لە یەک دراو وایە کرشەی پێ دەبرێتە سەر خەرمان.
شەخس: گۆڕی پیاوی گەورە ئاینی.
شەخسان: تێکچوون و گۆڕانی ئەندامی گیاندار بەهۆی ناساغییەکی گرانەوە.
شەخساو: گیاندارێکە ئەندامی شەخسی بێ.
شەخسین: شەخسان.
شەخسیو: شەخساو.
شەخف: ز. سواغی سەربان بەگەچ یا بەقوڕ.
شەخەڵ: چەم و چوغوردی خڕ و بەردەڵانی.
شەخەڵان: جێگایەکە کە قەرەمی تێدا ڕووابێ.
شەدار: شتی شێدار.
شەدانە: تۆوی گیای گونیە.
شەدە: مشکی سەرپێچ.
شەرا: بایەکی ناسازی گەرمە دەدا لە مەرەزە و هێندێ میوە وشکی دەکا.
شەراب: خواردنەوەیەکە لە مێوژ دروست دەکرێ و سەرخۆشی دەدا.
شەرابخانە: شوێنێکە کە شەرابی تێدا بفرۆشرێ یا تێیدا بخورێتەوە.
شەرابخۆر: کەسێکە کە خووی گرتبێ بەخواردنەوەی شەرابەوە.
شەرابردگ: شەرابردوو.
شەرابردوو: شتێکە کە شەرا لێی دابێ.
شەرابردە: شەرابردوو.
شەرابی: ڕەنگێکە کە وەک ڕەنگی شەراب وابێ.
شەرالێدراو: شەرابردوو.
شەراو: د. شەراب.
شەربک: ز. شەربە.

شــەربە: گــۆزەڵەیەکی گــڵــینی تەنکی بەچەرخ گــێــڕدراوی سوورەوەکراوی سپییە ئاوی تێ دەکرێ.
شەربەت: شیلەی شتی شیرین کە لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بکرێ بۆ خواردنەوە.
شەربەتچی: کەسێکە کە شەربەت بگرێتەوە بۆ فرۆتن.
شەرپەزە: ز. شپرزە.
شەرانی: گیانداری شەڕ فرۆش.
شەرفرۆتن: بریتییە لە بیانووگرتن بەیەکێک بۆ ئەمەی کە بچیت بەگژیدا.
شەرفرۆش: بریتییە لە کەسێک کە بیانوو زۆر بگرێ بەمەردووم بۆ بەگژدا چوونیان.
شەرفرۆشتن: شەرفرۆتن.
شەرواڵ: د. شەرواڵ.
شەرە تۆپ: جۆرە یارییەکە بەتۆپ لە یەکتری دەدەن.
شەرەتۆپەڵ: جۆرە یارییەکە تۆپەڵە بەفر دەگرنە یەک.
شەرەجنێو: جنێودانی دوو کەس بەیەک.
شەرە دەنووک: بریتییە لە وتنی قسەی ناشیرینی دوو کەس یا زیاتر بەیەکتری: بووک و خەسوو هەمیشە (شەرە دەنووک) یانە.
شەرەشۆق: شەرە قۆچ.
شەرەشەق: زرمەزلێی چەند کەسێک.
شەرەقوچ: شەرکردنی دووگیاندار بە سەر.
شەرە قۆچەقانی: شەرکردن بەهاویشتنی بەرد بە قۆچەقانی.
شەرە گەرەک: شەرکردنی منداڵی دوو گەرەک لەگەڵ یەکتری.
شەرەنگێز: شەرفرۆش.
شەرهۆملکێ: هەرا و هۆریا کردن.
شەرم: ڕوونەهاتن و ئابروو.
شەرمدار: د. شەرمن.
شەرمسار: د. شەرمەزار.
شەرم ساری: د. شەرمەزاری.
شەرم شکان: نەمانی شەرمی یەکێک.
شەرمکردن: ڕوو نەهاتن بۆ کردن یا وتنی شتێک.
شەرمگا: د. بریتییە لە پاش و پێشی ئادەمی.
شەرمگە: شەرمگا.
شەرمن: کەسێکە کە خاوەن شەرم بێ.
شەرمندە: شەرمن. شەرمەندە.
شەرمنە: د. شەرمن.
شەرمنی: شەرمکردن.
شەرمۆک: شەرمن.
شەرمە: د. شەرم.
شەرمەزار: کەسێکە تەریق بوویێتەوە.
شەرمەزاری: تەریقی.
شەرمەسار: شەرمەزار.
شەرمەساری: شەرمەزاری.
شەرمەشکانێ: بریتییە لە خۆ نواندن و خۆ دەرخستنی یەکێک کە بیەوێ شەرمی خۆی بشکێنێ.
شەرمەندە: شەرمەزار.
شەرمێوون: شەرمۆک.
شەرواڵ:دەرپێ. دەمەر قۆپان.
شەرواڵ بەکۆڵ: گیایەکی بەهاری سەلکدارە گەڵای وەک شاتەرە و تامی وەک شێلم وایە خواردنی ڕەوانی دەدا.
شەرواڵپیس: داوێن پیس.
شهرەزا: ز. شارەزا.
شەس: د. شەست.
شەست: ناوە بۆ ژمارەیەک کە شەش جار دەیە.
شەستپەڕ: گوڵێکی تۆپی زەردی بۆنخۆشە وەک گوڵە جۆری وایە بەڵام ئەم گەورەترە. گوڵەباخ.
شەستتیر: چەکێکی جەنگییە شەست گوللە دەخوا.
شەستکردن: بارین بە لێزمە و بەخوڕ.
شەستە: مانگی نیسان کە سی ڕۆژە.
شەستە باران: شەستە.
شەستە کردن: گۆل گۆلکردنی زەوی بە(ونار) بۆ ناشتنی توتن.
شەستەم: شتێکە کە لە پایەی شەستدابێ.
شەستەمین: شەستەم.
شەستهەم: شەستەم.
شەستهەمین: شەستەمین.
شەس: د. شەست.
شەسکردن: د. شەستکردن.
شەش: ناوە بۆ ژمارەیەک کە لە ناوەندی پێنج و حەوت دایە.
شەش ئاگر: جۆرە دەمانچەیەکە شەش گوللە دەخوا.
شەشپاڵور: د. شەشگۆشە.
شەشپەڕ: جۆرە جۆیەکە گوڵەکەی هەشت ڕیز دەنکی تێدایە.
شەشتیر: شەش ئاگر.
شەشخان: شەشخانە.
شەشخانە: ز. جۆرە تفەنگێکە لە ناوەوە شوێنی فیشەکی ببێ.
شەشدانگ: زەویوزارێکە کە هیچ بەشێکی لێ جیا نەکرابێتەوە، هەموو زەویوزارێک بە شەش دانگ دادەنرێ: (شەشدانگ)ی ئەو دێیەم کڕیوە، واتە هەمووی یا سێ دانگی ئەو دێیە هی منە، واتە نیوەی. بریتییە لە کەری چوار پەل قەوی بەرزی بەخۆوە.

شەشدەر: هەر شەش لاکە سەر و خوار و ڕاست و چەپ و پاش و پێشە.
شەشک: شەشەڵان (ز). ناوە بۆ دێیەک لە ناوچەی هەڵەبجە. مێژەر (با).
شەشکان: شەشەڵان.
شەشکلک: د. شەشە.
شەشگۆشە: شتێکە شەش سووچی بێ.
شەشلا: شەشدەر.
شەشۆ: شەشە. ناوی دێیەکە لە کوردستانی ئێران.
شەشە: کەسێکە کە شەش بەنجەی دەست یا پێی بێ.
شەشەڵان: مانگی دوای مانگی ڕۆژوو.
شەشەم: شتێکە کە لە پایەی شەشدا بێ.
شەشەمین: شەشەم.
شەشهەم: شەشەم.
شەشهەمین: شەشەمین
شەشیەک: لە شەش بەش بەشێک.
شەشیەکی: لە شەش بەش بەشێکە کە هێندێ میراتگر دەیبا.
شەعمووز: ز. وڵاخی سەرکێش.
شەعن: ز. بزنی بەڵەک.
شەغرە: شەخرە.
شەغرەکێش: جۆرە دەستەبەرەیەکە شەخرەی پێ دەگوێزرێتەوە.
شەفت: چەوت.
شەفتالوو: ل. هەڵووژە سیقەتۆرە.
شەفتر: پێرێ شەو.
شەفتوور: د. شەفتوول.
شەفتی: چەوتی.
شەفەلاح: شێفەلە.
شەفەلە: شەفەلاح.
شەڤ: ز. شەو.
شەڤخشک: با. کالیار.
شەفخوونی: با. شەبەیخوون.
شەڤدەر: ز. کەسێکە بەشەو بەدەشتەوە بێ.
شەڤرۆنک: با. جەژنێکە لە جەژنەکانی تیرەی یەزیدی.
شەڤرەڤیک: ز. شەمشەمەکوێرە.
شەڤشەڤۆک: شەڤرەڤیک.
شەڤکوێر:ز. شەوکوێر.
شەڤگێر: ز. کەسێکە کە بەشەو بگەڕێ.
شەڤنەم: با. شەونم.
شەڤە: با. شەوە.
شەڤی: ز. شەواژۆ.
شەق: هەڵدان لە شتێک بە قاچ. شتی لەق.
شەقار: قڵیشی شت، (شەقار شەقار) شتی زەنگ زەنگی قڵیش قڵیش.
شەقازللە: شەپەزللە.
شەقاشەق: د. شەقشەقە.
شەقاقلووس: د. خۆرە.
شەقال: پێڵاوی کۆن.
شەقام: شارێ.
شەقان: شەقێن.
شەقانشەق: لە شوێنی وتەی (سەرانسەر) بەکاردێنرێ لە کاری گرنگ و بەئەرکدا.
شەقاو: هەنگاو. شەقام.
شەقاوشەق: د. شەقشەقێن.
شەقبردن: هەڵپچڕان و درز بردنی شت.
شەق تێهەڵدان: هەڵدان لە شتێک بەشەق.
شەقشەقان: د. شەقاوشەق.
شەقشەقە: تەنەکەیەکی سەر خڕی کلکدارە چەند زیخێک لە ناوەکەیایەتی منداڵ ڕای دەوەشێنێ و خۆی پێ ژێر دەکا. ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
شەقەقە: دەنگێکە لە ناوەندی تەقە و شڵپەدا وەک دەنگی قۆچەقانی.
شەقکردن: لەتکردنی هێندێ شت.
شەقل: ز. شەقڵ.
شەقڵ: جۆرە نەخشێکە بە(شەقڵە) لە خەرمانی سوورکراو دەکێشرێ بۆ ئەوەی دزی لێ نەکرێ. چاپ (د).
شەقڵ شکاندن: بریتییە لە ئابڕووبردنی یەکێک و شکاندنی لەناو مەردوومدا.
شەقڵکردن: نەخشکردنی خەرمان بەشەقڵ.
شەقڵە: تەختەیەکی نەخشکراوە شەقڵی پێ لە خەرمان دەدرێ.
شەق و پەق: شتی لەتوپەت، (شەق و پەقکردن) لەتوپەتکردنی شتێک.
شەق و شڕ: شتی شڕی لەقبوو.
شەق و شۆق: شتی شەق و شڕ.
شەقۆق: پەنا و پەسێو. هەرمێ کێویلە.
شەقووق: ز. درەختی قەزوانی زڕ.
شەق: چەوتەکی مێو. شەقە مشار. شەقەقە، (شەقەشەق) شەقەقەی یەک لە دوای یەک (شەق و هووڕ) شەقە شەقی زۆر. دەفەی جۆڵا (د).
شەقەبەند: ڕەختی وڵاخ.
شەقەزللە: شەقازللە.

شەقەکردن: لەتکردنی شت بە شەقە.
شەقەکێش: کەسێکە کە هەر دار شەق بکا.
شەقە گل: د. گلکردنی چاو.
شەقەمشار: مشارێکی دوو دەستەکییە بەدوو کەس داری زلی پێ دادەهێنرێ.
شەقەمێو: چەوتەکی مێو.
شەق وا شەق: د. شەقشەقان.
شەقێن: جۆرە یارییەکی دوو دەستەییە گۆیەکی خڕی دارین لە دەستێکدا دادەنێن، هەر دەستەی بەدارێکی چەوتاوەوە هەوڵ دەدا بۆ ئەوەی لەسەر شاری دەستەکەی ترەوە دەری بکا.
شەقیلە: پارچە چەرمێکە ژنان دەیگرن بەلای ڕاستیانەوە بۆ ئەوەی تەشی لەسەر با بدەن تا کالایان نەدڕێ و باش بخولێتەوە.
شەک: بەرخێکە پێی نابێتە ساڵی دووەم. دیوێکە لە میچ.
شەکار: مێرگ.
شەکاڵ: ز. پێڵاوی دڕاو.
شەکان: د. تەکان.
شەکاندن: جوولاندن و هێنان و بردنی شت بەهۆی باوە: درەختەکە با دەی (شەکێنێ).
شەکاندنەوە: ڕاوەشاندن و هەڵگۆفتنی یەکێک هی یەکێک. شەکاندن.
شەکانن: د. شەکاندن.
شەکانەوە: لەرانەوەی شت.
شەکر: شتێکی سپی یا زەردی زۆر شیرینی خۆشە لە قامیش یا چەوەندەر دروست دەکرێ.
شەکراو: ئاوێکە شەکری تێ کرابێ.
شەکراو خواردنەوە: بریتییە لە خوازبێنی یەکێک بۆ یەکێک و دابەشکردنی شیرینی بەو هۆیەوە.
شەکر پەنیر: جۆرە نوقڵێکی پانە لە شەکر دروست دەکرێ و کاکڵەیەک گوێز دەخرێتە سەری.
شەکرخەندە: زەردەخەنە.
شەکرخەنە: شەکرخەندە.
شەکردان: دەفرێکی تایبەتییە هەر شەکری تێ دەکرێ.
شەکر شکاندن: بریتییە لە قسەکردن.
شەکرشکێن: ئاسنێکی دەم پانی تیژە وەک تەشوێ هەر شەکری پێ دەشکێندرێ.
شەکرلەمە: جۆرە خواردەمەنییەکە لە شەکر و گوێز و ئارد دروست دەکرێ.
شەکرۆک: ز. شەکرۆکە.
شەکرۆکە: شتێکی سپی شیرینچکە لە کەرتەشی پەیدا دەبێ.

شەکرە: جۆرێکە لە گیای (گوێنی) کە پێی دەڵێن (جەباری). شەکرۆکە.
شەکرەباوی: با. چواڵە.
شەکرەپیاو: پیاوی خۆشخووی زبان شیرین.
شەکرەخەنە: شەکرخەندە.
شەکرەژن: ژنی خۆشخووی زبان شیرین.
شەکرەسێو: جۆرە سێوێکی شیرینچکە.
شەکشەکان: د. لەرەلەری شت بەدەم باوە.
شەکمەڕ: شەکەمێیەکە کە سکێکی کردبێ.
شەکە: بەرازی مێی یەک ساڵە (ل). جۆرە کڵاوێکی تووکنە لە پێستی بەرخ دروست دەکرێ. لەرە، (شەکە شەک) لەرەی یەک لە دوای یەک.
شەکەت: ماندوو، (شەکەتبوون) ماندووبوون، (شەکەتکردن) ماندووکردن.
شەکەتی: ماندوویەتی.
شەکەر بادام: د. جۆرە حەڵوایەکە.
شەکەر بۆرە: د. جۆرێکە لە حەڵوا.
شەکەر پەنیر: د. شەکر پەنیر.
شەکەرخەن: د. شەکرە خەنە.
شەکەر گریان: د. گریانێکە لە خۆشی و شادییەوە بێ.
شەکەرگری: د. شەکەر گریان.
شەکەرۆکە: ژن یا کوڕێکە کە خۆی جوان بکا و لەناو کۆمەڵێکدا سوور بدا و سەما بکا.
شەکەری: جۆرە ڕەنگێکی زەردباوە.
شەکەشەک: دەنگی دڕ و داوێنێکی دڕاوە کە تەکەتەکی بێ.
شەکە مەڕ: شەکەمێ.
شەکەمێ: بەرخە مێیەکە کە پێی نابێتە ساڵی دووەم.
شەکەمێنگە: شەکەمێ.
شەکەنێر: بەرخە نێرێکە پێی نابێتە ساڵی دووەم.
شەکی کاڵ: شەکەمێیەکە کە هێشتا نەزابێ.
شەکێن: یاری قاپێن.
شەکیلە: وتەیەکە شتی تەڕی شەپوشۆڕی پێ دەشوبهێنرێ.
شەگە: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی مەرحەبا، لە (شاگاه)ەوە هاتووە واتە کاتت وەکو کاتی شا خۆشبێ.
شەگەل: ڕانێکە کە هەمووی شەکەنێر بێ.
شەگێن: شەکێن.
شەل: گیانداری پێ لەنگ. قالێ و بەڕەی چرچی خوار. تاخەرار. پارچە زەوییەکە لە پاڵ جۆگە ئاوێکدا کە هەمیشە بەهۆی ئاودەلاندنەوە سەوز و نمدار بێ. ڕانک.
شەلاخ: زللە (ل). قامچی (د).

شەلاخکاری: د. لێدانی یەکێک بەشەلاخ.
شەلاق: هەڵمەت. شەلاخ.
شەلاقە: باڵندەیەکە بەقەد کۆترە باریکەیەک هەر لە بەهاراندا پەیدا دەبێ.
شەلاڵە: کۆکی درومان.
شەلاندن: ز. ڕووتکردنەوە لە لایەن جەردەوە.
شەلایی: د. جۆرە سەرپێچێکە ژنان دەیبەستن بەسەریانەوە، وەک هەوری وایە.
شەڵتاخ: د. گێچەڵ و تەشقەڵە.
شەڵتان: شەڵتە.
شەلتە: زوقمی پایز: (شەلتە) لێی داوە، یا (شەلتە) بردوویەتی.
شەڵتە: دەفرێکی دوولای گەورەی دەم بەرەڵلایە دەدرێ بەسەر پشتی وڵاخدا و شتی تێ دەکرێ. جۆرە دەرپێیەکی ژنانەیە لە ژێر دەرپێی ترەوە لە پێ دەکرێ (د). شەڵتە (د). نیوە نمەکێکی گەورە یا بروێشێکی کوڵاو یا سرێشێکی گەرمە کە بخرێتە سەر پەرۆ و لە شوێنێکی بەئازار بپێچرێ.
شەڵخە: شەڵغە.
شەڵغە: پوورە هەنگ.
شەڵغەم: شێلم.
شەلکە: دەردێکە تووشی سمی بزن و مەڕ دەبێ و شەلی دەکا.
شەلم: ز. شێلم.
شەلە: ز. زیوانی ناو دەغڵ.
شەلوار: شەرواڵ.
شەڵوار: شەرواڵ.
شەل و پەت: شتی لەت و پەت.
شەل و شێت: مەردوومی شێتۆکەی شلەپەتە.
شەلووف: کەڵەشێری پچووک (ز). زۆڵ.
شەلە: ئاوەشکێنە. حەوتەمین ئەستێرەی حەوتەوانەی گەورەیە کە دەکەوێتە لای خواروو.
شەلە شەل: ڕۆیشتن بەلەنگە لەنگ.
شەلەگە: کەلەبەرێکە لە جۆگەی مەرەزەدا کە ساڵێک لەوە پێش ئاوی لێ کرابێتە سەر قاڵبێک و ئیمساڵ گیرابێ بۆ ئەوەی ئەو قاڵبە بەیاری بمێنێتەوە و، لە خوارترەوەی کەلەبەرێکی تر کرابێتە ئاوەکەوە بۆ سەر قاڵبێکی تازە.
شەلەم: شێلم.
شەلەم شێوێن: د. دارێکی سەرپانە شێلمی کوڵاوی پێ ئەمدیو ئەودیو دەکرێ لە مەنجەڵدا.
شەلەمە: د. گیایەکی ڕەوانە بنکەکەی وەک سێوی بن ئەرز وایە.
شەلەمین: چێشتی چەنسووتەکە.
شەلەمینکەرە: د. جۆرە گوڵێکی زۆر جوانە.
شەلیک: ز. پەڕۆیەکە دەدرێ بەسەر دەمی دەفرێکدا کە شیری تێ بدۆشرێ بۆ ئەوەی شتی تێ نەکەوێ.
شەلی: لەنگی لە ڕۆیشتندا. سپیدار (د).
شەلین: لەنگین.
شەم: جێی سێبەر (هـ). شەمع (د).
شەمار: هەزارپێ.
شەماڵ: بایەکە لەلای ڕاستی قیبلەوە دێ.
شەماڵپا: بریتییە لە وڵاخی خێرای تیژڕەو.
شەمالە: دانیشتنی ئافرەتە لە شەوی شەمەواندا لە سێ ڕیانێک لەگەڵ گرتنی نیازێک لە دڵدا، ئینجا ئەگەر ڕێبوارێک لەو ڕێگایانەوە هات و قسەیەکی خۆشی کرد ئەوا دەیکا بەنوقلانەی پێکهاتنی نیازەکەی و، ئەگەر قسەی ناخۆشی کرد ئەوا دەیکا بەنوقلانەی پێک نەهاتنی.
شەمالێ: شەمالە.
شەمامۆک: شەمامۆکە.
شەمامۆکە: شەمامە.
شەمامە: شتێکی خڕی خاڵخاڵی بۆنخۆشە وەک کاڵەک وایە بەڵام ئەم پچکۆلانەیە.
شەمبلیلک: ز. قومام.
شەمبووز: با. وڵاخی چەمووش.
شەمبە: شەمە.
شەمبی: با. جۆرە توویەکی دەنک سپی درێژکۆڵەی کەم ناووکە. شەمە (با).
شەمتین: هەڵخلیسکان.
شەمچک: فێڵباز.
شەمچە: شقارتە.
شەمدان: د. شەمعدان.
شەمزان: شەمزین.
شەمزاو: شتێکە کە شەمزی بێ.
شەمزین: تێکچوونی چەرم بەهۆی زۆر هەتاو لێدانیەوە.
شەمزیو: شەمزاو.
شەمسان: شەمزان.
شەمساو: شەمزاو.
شەمسین: شەمزین.
شەمسیو: شەمزیو.
شەمشەڵە: د. شەمشەمەکوێرە.
شەمشەڵەکوێرە: د. شەمشەمەکوێرە.
شەمشەمەکوێرە: باڵندەیەکی پچووکە سک و زا دەکا و قاچی بەباڵەکانیەوەیەتی.

شەمع: مۆم. بەرەمێو.
شەمعدان: شتێکە مۆمی بەداگیرساوی لەسەر دادەنرێ.
شەملک: با. بەرماڵ.
شەممە: ڕۆژی یەکەمی حەفتە لە هەینی بەدواوە.
شەمۆ: شەموو.
شەمۆز: چەمووش.
شەمۆس: شەمۆز.
شەموو: شەممە.
شەمووله: قوتیلەی نەوت.
شەمە: شەممە (د). ناوی دێیەکە لە ناوچەی تانجەڕۆ.
شەمە بازاڕ: د. شوێنێکی تایبەتییە لە هێندێ جێگە هەموو شەمووانێک شتی تێدا دەفرۆشن هەروا لە ڕۆژەکانی تریشدا دەبێژرێ یەک شەمە یا دووشەممە یا سێ شەممە یا چوارشەممە یا پێنج شەمە یا هەینی بازاڕ بەپێی دەستوور و باوی ئەو شوێنە.
شەمەتلێنکە: هەنگوینێکی جیری خۆشی شانە پچکۆلەیە لە جۆرە هەنگێکی تایبەتی پەیدا دەبێ.
شەمەد: پۆپەشمین.
شەمەلەکۆرە: شەمشەمەکوێرە.
شەمەنیخە: چنگدانە چنگی یەکتری.
شەمێ: مێوی خلتەی هەنگوین.
شەمیتین: ز. هەڵشلەپین.
شەمیخین: ز. ترشانی چێشت لە گەرمادا.
شەمیراندن: ز. دەست هەڵگرتن لە کارێک .
شەمی: ز. شەموو.
شەن: دارێکی پێنج پەنجەیە خەرمانی پێ بەبا دەکرێ. وردە تەلاش و پشقلێکە کە لە کاتی ساردبوونەوەی تەنووردا تێی دەکرێ بۆ گەرم داهاتنەوەی.
شەنکردن: بەباکردنی خەرمانی کوتراو بەشەن بۆ سوورکردنی.
شەنگ: مەردوومی شۆخ. وردە کەلوپەلی ناو ماڵ (د). فیشەک (د).
شەنگڵە: دوو گوێز یا دوو مازوو یا دوو شتی تری وایە کە بەیەکەوە نووسابن.
شەنگڵە بەرەکەت: شەنگڵە.
شەنگۆڵ: شەنگڵە. شەنگ.
شەنگە: شەنگ.
شەنگە بەرە: شەنگە بەرەکەت.
شەنگەبی: شۆڕەبی.
شەنگە سوورە: زەردەواڵە.
شەن و کەوکردن: بریتییە لە کردنی کارێک یا وتنی گوفتارێک بەجەختی و تۆخی: فیسار کەس ئەمڕۆ لە نانخواردندا (شەن و کەوی کرد) یا لە باسی فیسارە شتدا (شەن و کەوی کرد) واتە حەشری کرد.
شەنە: د. شەن.
شەو: کاتی ڕۆژئاوابوونە تا ڕۆژبوونەوە.
شەوار: شەوگار.
شەوارە: شەو و ڕۆژکردنەوە لە ئاهەنگدا. گرتنی پەلەوەر لە تاریکەشەودا بەچرا: ئیمشەو چووم بۆ (شەوارە) گەلێ پەلەورم گرت، گیاندارێکە کە شەو بەچرا کەوتبێ: ئەو چێرگە (شەوارە)یە.
شەوارەبوون: سەر تێکچوون لە گیاندار لە تاریکە شەودا بەهۆی بینینی ڕووناکییەکی نزیک و نەمانی ڕووناکییەکەوە.
شەوارەکەوتن: شەوارەبوون.
شەواژۆ: لەوەڕاندنی ئاژاڵ بەشەو.
شەواشینک: دارێکە بەرەکەی وەک چواڵە وایە خۆش دەکرێ و دەخورێ و، پێی دەڵێن بایەف.
شەواڵ: ل. شەرواڵ.
شەواڵ بین: ل. بەندە خوێن.
شەواڵە سوورە: شەرواڵ بە کۆڵ.
شەواندەر: چەوەندەر.
شەوبۆ: گیایەکە گەڵای وەک بی وایە گوڵێکی زۆر بۆنخۆش دەگرێ و بەشەو بۆن دەداتەوە.
شەوبەن: شەوبەند.
شەوبەند: شەوژەن. کۆسەکی خەنجەر.
شەوبێدار: کەسێکە کە بەشەو نەنوێ و ئاگادار بێ.
شەو بێداری: نەنوستن و ئاگاداری لە شەودا.
شەو بێری: شەوە ناشەوێک.
شەوت: ز. ئازارێکە پەیا دەبێ لە گوێی مەڕ و گادا.
شەوتا: تایەکە هەر لە شەودا تووشی مەردووم دەبێ.
شەو جومعانە: خواردەمەنییەکە لە شەوی جومعاندا دەبەشرێتەوە بەخێری مردوو.
شەوچرا: چرایەکە لە شەودا ڕاوی پێ دەکرێ.
شەوچەرە: خواردەمەنییەکە لە شەوگاری زستاندا دوای نانخواردن دەخورێ لە میوەی وشک و تەڕ.
شەوچەرەز: شەوچەرە.
شەوچەلە: شەوچەرە.
شەوخونی: شەبەیخوون.
شەوخەف: کالایەکە هەر لەکاتی نووستنندا لەبەر دەکرێ. پێخەف.
شەودێر: کەسێکە کە بەشەو ئاودێری بکا.

شەودێری: ئاودێری لە شەودا.
شەودێز: بریتییە لە شتی ڕەشباو.
شەوڕۆ: شەوڕەو.
شەوڕەو: کەسێکە کە بەشەو بڕوا.
شەوڕەوی: ڕۆیشتن لە شەودا.
شەوزستان: د. یەکەم شەوی زستان کە لە هەموو شەوێک درێژترە.
شەوژەن: دارێکە وەک مەچەکی دەست دەکرێ بەکونی سەر دەرگادا بۆ داخستنی.
شەو سکڵ: پێخوێی شکێنەکراوی وردەکوت نەکراو لە خەرمان.
شەوسۆ: د. سۆزی.
شەو سوتکە: جۆرە برینێکی بەسوێیە وەک (بەورەشینکە) لە پەنجەی دەست و قاچ دێ.
شەوسۆتەکە: جۆرە مێشوولەیەکی وردی بەئاڵۆشە.
شەوسوو: بەیانی زوو.
شەوشین: ز. ترنج.
شەوق: ڕووناکی و بریقەی هێندێ شت.
شەوقدار: شتی خاوەن شەوق.
شەوقدانەوە: پەیدابوونی شەوق لە شتێکەوە.
شەوک: ز. کرمەکی زێڕ.
شەوکار: کارێکە کە بەشەو بکرێ.
شەوکراس: کراسێکە کە هەر لە شەودا لەبەر بکرێ.
شەوکڵاو: جۆرە کڵاوێکە هەر لە شەودا لەسەر دەکرێ.
شەوکوێر: شەوکوێر.
شەو کۆک: د. کەسێکە لە نیوەی شەودا لە شوێنێکی بەرزەوە مەردووم بانگ بکا بۆ هۆشیاربوونەوە.
شەوکوێر: گیاندارێکە بەشەو چاوی نەبینێ.
شەوگا: د. پەچەیەکە کە ئاژاڵ لە شەو تێیدا بحەسێتەوە.
شەوگار: ماوەی شەو لە ڕۆژئاوابوونەوە تا بەیانی.
شەوگڕ: د. چراخان.
شەوگەرد: دەعبایەکە وەک مارمێلکە بەڵام ئەم پێوە دەدا. شەوگەڕ (د).
شەوگەڕ: د. حەسحەس.
شەولەبان: بریتییە لە بانگردێن.
شەو لەوەڕ: لەوەڕێکە بەشەو بکرێتە بەرگیاندار.
شەومەندە: شەوە سار.
شەومەنە: د. شەومەندە.
شەونخونی: شەونوخوونی.
شەونشین: کەسێکە بەشەو نەنوێ.
شەونم: دڵۆپە ئاوێکە لە بەهاراندا بەشەو دەکەوێتە سەرگیا.
شەونەخوونی: شەوڕۆژکردنەوە لەسەر نەخۆش.
شەونوێژ: نوێژێکە کە لە بەشی دوایی شەودا بکرێ لە دوای نووستن و هەستانەوە.
شەونەخووس: د. شەوبێدار.
شەونوخووسی: د. شەوبێداری.
شەووگ: د. بەردی شەوە.
شەوە: دەردێکە تووشی منداڵی ساوا دەبێ ئەندامی شین دەکاتەوە و دەمرێ. بەردێکی زۆر ڕەشی جوانی لووسی بەنرخە ژنان دەیکەن بەملوانکە.
شەوەر: سێپەرە.
شەوەڕ: شەوەر.
شەوەزەنگ: تاریکە شەوی ئەموستەچاو.
شەوە سارە: چیشتێکە لە ئێوارەوە مابێتەوە بۆ بەیانی.
شەوەکی: کردنی کارێک لە بەشی دواییی شەودا.
شەوی بین: ز. وشکبوون و پێگەیشتنی گوڵی دانەوێڵە لە پێش کاتی خۆیدا.
شەویتاندن: ز. سووتاندن بەئاگر.
شەویلاک: شەویلە.
شەویلکە: شەویلە.
شەوی: کراس (ل). شتی شەو کە کەوتبێتەوە ڕۆژ: ئەم ئاوە (شەوی)یە.
شەویلاک: شەویلە.
شەویلگە: شەویلە.
شەویلە: ئێسقانی ئەم لاو ئەو لای دەم کە دانی خواروی لەسەر دەڕوێ.
شەوین: شەواژۆ. شەوێکی خۆشە لە بەهاردا کە باران بارببێ و خۆشی کردبێتەوە.
شەهـ: ز. شانە.
شەهبەلووت: ز. جۆرە خورمایەکی ڕەشە.
شەهک: ز. شانەی پچووک.
شەهکردن: ز. شانە کردن.
شەهلەوەند: هەرزەکار.
شەهمار: هەزار پێ.
شەهمێر: کەڵەمێرد.
شەهن: شەهـ.
شەهێن: شاهێن. دارێکی کێوی بێهێزی کولۆرە لە داری قەرە قاچ دەچێ وە لە پێش هەموو درەختێکدا سەوز دەبێ.
شەهین: ز. تەرازوو.
شەی: ل. کراس.
شەیپوور: پارچەیەکە لە پارچەکانی مۆزیقە.

شەیتان: هێزێکی خراپە لە ئادەمیدا بیری خراپی بەدڵدا دەهێنێ.
بریتییە لە پیاوی خراپ.
شەیتانپەرست: تیرەیەکن لە کورد لە ناوچەی مووسڵ لە ترسی شەیتان ناوی بە گەورە دەبەن.
شەیتان پێ پێکەنین: بریتییە لە شەیتانیبوونی منداڵ یەکەمجار.
شەیتانۆکە: شتێکە لە کووژەکە کەرانە دەچێ و کرمێکی تێدایە.
شەیتانلغاو: قەمتەر.
شەیتانی: فێڵبازی و دەست بری.
شەیتانیبوون: بەسەرچوون و ڕەحەتبوونی ئادەمی لە خەودا.
شەیدا: کەسێکە کە لە خۆشەویستی شتێکدا شێت بووبێ.
شەیدایی: شێتی و سەرگەردانی بۆ شتێک .
شهێن: حیلەی وڵاخ.
شهی: ل. نزگەرە.
شێ: وڵاخێکە ڕەنگی سوورێکی کاڵ بێ: نم: ئەم زەوییە (شێ)ی هەیە. ڕەش (ل).
شیارۆک: هیزە. مەشکە.
شیارە: ز. کایەکە لەناو چاڵدا و لەژێر گەنمدا ڕۆ دەکرێ بۆ ئەوەی کە گەنمەکە نم هەڵنەهێنێ.
شیاق: جۆرە تەنراوێکی تەنکە گەلێ ڕەنگی هەیە.
شیاندن: ز. ڕەوانەکردن.
شیایین: با. تۆپین.
شێپێو: شتێکە ئەندازەی شێ و تەڕی نیشان دەدا.
شێت: مەردوومی بێ ژیری مێشک تێکچوو.
شێتانە: گوفتار و کردارێکە کە لە هی شێت بچێ.
شێتبوون: تێکچوونی مێشکی مەردووم و نەمانی ژیری.
شێتخانە: شوێنێکە کە شێتی تێدا تیمار بکرێ.
شێتکە: شێتۆکە.
شێتگیر: بریتییە لە کەسێک کە هان درابێ لەسەر کردنی شتێک: (شێتگیری) مەکە.
شێتۆکە: مەردوومی دەلووکار.
شێت و وێت: مەردوومی دەلووکاری بەرەڵا.
شێتە پەتەڕی: شێت و وێت.
شێتە و ژیرە: بریتییە لە کەسێک کە هەردەمە لەسەر بیرێک بێ.
شێتێتی: شێتی.
شێتی: شێت بوون.
شێخ: پێشەوای ئایینی خواپەرست.
شێخانە: جۆرێکە لە هەڵپەڕکێ.
شێخانی: شێخانە. ناوی تیرەیەکە لە کورد.
شێخەڵ: دار و درەختێکە کە هەڵپاچرابێ بۆ باڵاکردن.
شێخەڵکردن: هەڵپاچینی دار و درەخت بۆ باڵاکردن.

شێدار: شتێکە کە نمی بێ.
شێر: درندەیەکی شان و مل ئەستووری پاشوو پووتی ئازای بەهێزی شکێنەرە.
شێرزایی: ز. شیرازەی کتێب.
شێرانە: کردارێکی ئازایانەیە کە لە کرداری شێر بچێ.
شێرپەنجە: برینێکی گەورەی بەسوێیە درەنگ چاک دەبێتەوە.
شیرداخ: پارچە تەنراوێکی میل میلی ئاوریشمی جوانە دەکرێ بەکەوا.
شێردڵ: بریتییە لە مەردوومی ئازای بەجەرگ.
شێردەم: د. بەلووعەی ئاو.
شیرشیرۆکە: خوژیلک.
شێرکوژ: د. بریتییە لە مەردوومی ئازا. ناوە بۆ گردێکی گەورە لە ڕۆژئاوای دەستە چەپی سلێمانییەوە.
شێرکۆڵ: د. دارێکی چوار پاڵووە لە ژێر کۆڵەکەدا دادەنرێ.
شێرکۆڵە: د. شێرکۆڵ.
شیروانی: دارەڕای دوو قەدە لەسەر یەک ڕایەڵ.
شێر و خەت: جۆرە یارییەکە بەدراو دەکرێ.
شێر و گورگە: چەند دارێکە لە هەر چوار لاوە دەدرێتە بەر کۆڵەکە یا بەر نیی ئاش بۆ ئەوەی تا دادەمەزرێ نەبزوێ.
شێرەبەفرینە: شێرێکی گەورەیە دروست دەکرێ لە بەفر.
شیرەت: ز. ئامۆژگار.
شێرە کوللە: جۆرە کوللەیەکی گەورەیە.
شێرە کولە: شێرە کوللە.
شێرەکی: جلی ئەسپە کە لە قاڵی دروست کرابێ بۆ جوانی.
شێرەوان: کەسێکە شێر بەرهەم بێنێ.
شیرین: ز. شیرین.
شێس: شەست.
شێست: شەست.
شێف: زەوییەکە بەیەک گاسن کێڵرابێ.
شێفبرین: کێڵانی زەوی بە یەکەم گاسن.
شێفدانەوە: شێفبرین.
شێفەلەتە: بەری گیای (مارگیر)ەکە سوور و شین و خۆشە و دەم دەداتەوە.
شیفیار: د. جووتیار.
شێڤ: ز. شەو.
شێڤدەست: با. جۆرە داوێکە کەوی پێ دەگیرێ.
شێکر: شەکر.
شێل: پێخوێیەک قوڕ. تاویرێک هەویر کە بەنۆرەیەک بشێلرێ.
وتەیەکە لە دوای هێندێ ناوەوە دێ دەیکا بەئیسمی فاعل: هەویر (شێل) قوڕ (شێل).

شیلاقە: شەلاقە.
شێلان: دەست یا پێنان بەشتێکدا بەتوندی.
شێلاندن: شێلان.
شێلانن: شێلاندن.
شێلانە: قەیسی.
شێلاوگە: تەرپییەکی زۆرە کە لە شتێک هەڵ نیشتبێ: بارە ترێکە (شێلاگە)ی لێ هەڵ نیشتووە لە کاتێکدا کە چووبێ بەسەر یەکدا و شیلەی لێ هاتبێتە خوارەوە.
شێلگ: دەسرێژی تفەنگ.
شێلم: گیایەکی پایزەی گەڵا پانە بنکێکی خڕی سپی هەیە و دەخورێ.
شێلم بەترش: جۆرە ترشیاتێکە لە گێزەر و شێلم دەگیرێتەوە.
شیلنگ: شێلگ.
شیلوو: با. قوڕاو. لێڵ.
شێلە: جۆرە تەنراوێکی دەزوو تێ هەڵکێشراوە وەک جامانە ژنان دەیکەن بە کاڵا.
شێمی: ز. تووە سوورە.
شێن: ز. ژنی جوان. هەموو شتێکی جوان.
شیندەبی: شینەبی.
شینکە: زەوی کڕینی شینکار. ناوی تیرەیەکە لە کورد لە ناوچەی شارباژێڕ. جۆرە تفەنگێکە لە دەمەوە دادەگیرێ.
شینکەبی: شینەبی.
شێنەبی: هێواشی و لەسەرخۆیی.
شێو: خواردەمەنییەکە کە ئێواران بخورێ. کاتی ئێوارە.
شێواز: شێوەی تایبەتی نووسین یا قسەکردن (اسلوب).
شێـوان: کـاتی شێـوکـردن. تێکچـوونی شت: خـوا سـەرت لێ (نەشێوێنێ).
شێواندن: تێکدانی شت.
شێوانن: شێواندن.
شێواو: شتی تێکچوو.
شێواوی: تێکچوویی.
شێوکردن: خواردنی نانی ئێواران.
شێو گۆڕ: گەرمە گۆڕ.
شێوە: جۆرە زەرە و ڕوخسارێکی تایبەتی شتە کە بەهۆی ئەوەوە بناسرێتـەوە و لە شتـی تر جیـا بکرێتـەوە: ئەم دوو منداڵە (شێوە)یان لە یەک دەچێ.
شێوەرد: زەمینی کێڵراو.
شێوەڕەش: ماشێنە.
شێوەقوڵە: چێشتە قولێ.
شێوەکردن: ناسینی شت بەهۆی شێوەوە.

شێوەڤا: د. سینەما.
شێویاگ: د. شێواو.
شێویان: د. شێوان.
شی: شتـێکە لە یەک جیـابووبێتـەوە: قـووڕەکـە یا خـورییـەکـە (شی)یە.
شیاکە: پیسی گا و مانگا.
شـیـان: گـونجـان: ئەم کـارە دەشێ وابێ. توانین: (دەشێم) واتە دەتوانم (با).
شیپ: لیسپی قۆچەقانی.
شیپان: چوارچێوەی دەرگا و پەنجەرە.
شیپانە: ز. لاشیپان.
شیپک: ژێر دەرگا.
شیپە: شیپ. پانایی (د).
شیـپە شیـپکردن: پارچەپارچە کردنی شت: یاخوا شیـپە شیـپە کرێ.
شیـتـاڵ: پارچەی دڕاوی کـاڵا: (شـیـتـاڵ)ی کـەواکـەی لە زەوی دەخشێ، (شیتاڵ شیتاڵ) کاڵای هەلا هەلا.
شیتان: د. زەوی نەرمان.
شیتانن: د. شاتاندن.
شیتک: با. پشتێن.
شیتە: قیژە، (شیتە شیت) شیتەی یەک لە دوای یەک.
شیخر: کێرد و چەقۆی تیژ.
شیر: شتێکی سپی شلی چەورە لە گوانی گیاندارێک دێتە دەرەوە کە ساوای بەبەرەوە بێ. تیغێکی دەمپانی درێژێ کەوانەدارە دەکرێ بەکاڵاندا. شێر (ل).
شیرا: د. ئاژاڵی شیردار.
شیراز: شیرازە.
شـیـرازە: جـۆرە چنینێکە کـەنـاری هێندێ شـتـی پێ دەچنرێ بۆ قایمی.
شیرازەبەن: د. شیرازەبەند.
شیرازەبەند: شتێکە کە شیرازە کرابێ.
شیرازی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
شیراژ: شیرێژ.
شـیـربایی: دراو یا شـتـێکی گـران مـایەیە کـە کـەسـوکـاری بووک بیسێنن لە زاواکەیان.
شیربرا: برای شیری.
شیر برنج: چێشتێکە لە شیر و برنج دروست دەکرێ.
شیر بۆدان: بریتییە لە خێردانەوەی یەکێک بۆ یەکێک.
شیر پارزونک: شیر پاڵێو.
شیرپاک: بریتییە لە مەردوومی دڵ و داوێن پاک.

شیر پاکی: بریتییە لە دەست و دڵ و داوێن پاکی.
شیـر پاڵۆک: کـونێکە دەهێـڵـرێتـەوە لە تەنشت (نیێ) وە بۆ ڕاییکردنی گیروگرفتی.
شیر پاڵوو: شیر پارزونک.
شیر پاڵێو: شتێکی تەنکی کون کونە شیری پێ دەپاڵێورێ.
شیرتێن: شیرتین.
شیرتێن: شلەتێن.
شیرخشت: شتێکی فێنکی سپییە لەگەڵ شیردا دەدرێ بەمنداڵ بۆ لابردنی گڕی دەروونی.
شیرخواردن: مژینی شیر لە لایەن ساواوە.
شیر خوژیلک: گیایەکی بەهاری شیردارە جۆرە گوڵێک دەگرێ و شیرەکەی زۆر ڕەوانە.
شیرخوشک: خوشکی شیری.
شیرخەس: گیاندارێکە لە کاتی شیرەخۆرەیدا خەسێنرابێ.
شیردار: گیانداری بە شیر.
شیردان: مەمک دان بەساوا.
شیردەر: گیاندارێکە کە شیر بدا بە بەچکەی.
شیڕ: وتەی تیتاڵی: (شیڕ) لە پیاوەتیت.
شیڕاندن: نەڕاندن بەتوندی.
شیڕە: قیژەی توندی مەردووم و هێندی گیانداری تر. دەنگێکە وەک دەنگی دادڕینی بلووری و هێندێ شـتی تر، (شـیـڕە شیڕ) شیڕەی یەک لە دوای یەک، (شیڕ و هووڕ) شیڕە شیڕی زۆر.
شیڕها: شڕها.
شیرکتک: گیاندارێکە کە زۆر بشیرێنێ.
شیرکوڕۆژ: بریتییە لە مەردوومی ئازا.
شیـرکێشـان: بریتیـیـە لە خۆئامادەکردن بۆ تێوەچوونی جەنگ: فیسار کەس بەرامبەر بە دوژمن (شیری کێشا).
شیرگەر: کەسێکە کە شیر و خەنجەر دروست بکا.
شیرمردە: گیاندارێکە لەبەر بێ شیری دایکی زۆر لاوازبێ.
شیرمژ: د. شیرەخۆرە.
شیرن: شیرین.
شیروا: شیربایی.
شیروایی: شیربایی.
شیر وەشێن: بریتییە لە مەردوومی ئازای دەستوەشێن.
شیـرە: شـیلەی شـتی شـیـرین. چەند دانێکی شـیـربیـە لە دەمی ڕەشـەوڵاخ و وڵاخی یەک سـەـدا لە تەمـەنی دوو سـاڵ و نیوەبییدا دەکەون. ڕۆن گەرچەک (د).
شیرە بەڕوو: د. لقی تەڕی داری بەڕوو.
شیرەپە: ئێرەق.
شیرەجۆ: جۆ شیرە.
شیرەخانە: د. شەرابخانە.
شیرەخۆرە: ساوای بەر مەمکانە.
شیرەدان: د. دیزەیەکە ڕۆن گەرچەکی تێدا هەڵدەگیرێ.
شیـرەمـاڵ: دانەوێڵـەیەکـە دوای خـەرمـان هەڵگرتن بەدەست کـۆ بکرێتەوە لە جێ خەرمان.
شیرەوا: شیر برنج.
شیرێژ: سیرێژ.
شیری: شتێکە ڕەنگی وەک ڕەنگی شیر وابێ: فیسار کەس برای (شریه).
شـیـرین: شـتـێکە کـە تامی وەک تامی شەکر وابێ. بریتـیـیـە لە شتێک کە کەم دەست بکەوێ: ئیمساڵ نان (شیرین)ە.
شـیـرین بوون: بریتـیـیـە لە خـۆشـەویست بوونی یەکـێک لای یەکێک.
شیرینچک: شتێکە کەمێک شیرین بێ.
شیرین خوێ: خواردنێکە کە خوێی کەم بێ.
شیرین زبان: بریتییە لە مەردوومی زبانخۆش.
شیرین شاتەڕە: شاتەڕە.
شیرین شاهۆ: د. شینە شاهۆ.
شیرینە: شۆکە.
شـیـرینی: شـتی شـیـرین. بریتـیـیـە لە خـۆشـەویسـتی. شـەکـر یا نوقوڵێکە کە لە شەکراو خواردنەوەدا دابەش دەکرێ.
شیرینی خواردن: د. شیرینی خواردنەوە .
شیرینی خواردنەوە: دابەشکردنی شیرینی لە خوازبێنی بووکدا.
شیش: جۆرە ئاسن یا دارێکی باریکی درێژە.
شیشان: ز. گیایەکە کە گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی هەیە.
شیشە: شووشە.
شیشەک: ز. شەک.
شـیـعـە: دەسـتـەیەکن لە مـوسـڵـمـانان کـە هەر ئیـمـامی عـەلی بەجێنشینی پێغەمبەر دەزانن.
شیڤ: ز. نانخواردنی شێوان.
شیڤک: با. کۆرە شیو.
شیڤێن: ز. دەنگی بەرز.
شیکراوە: قوڕ و خوری و لۆکەی خۆشکراو.
شـیـکردنەوە: لەیەک جـوێ کـردنەوە و خـۆشکردنی قـوڕ و لۆکـە و خوری.
شیکە: بەچکەی بەرازی یەک ساڵە. کەڵەگا.
شیلان: جۆرە مووررووبەکی سوورە. دلق. عەنناب.
شیلاووک: شیلاوگ.
شیلاوگ: پارچە گۆشتێکی لۆچ لۆچە لە سکی ئاژاڵدا وەک هەزار لۆغانە بەڵام ئەم پانترە پڕە لە پیسی.

شیلک: شیلاوگ.
شیلۆ: ز. ئاوی لێڵ.
شیلە: شیرە.
شیلەپە: سنگێکە دەکرێ بەکونی (لاجامە) و (عەرەبانە)دا بۆ توند کردنیان لە یەک.
شیلەتێن: شلەتێن.
شیلەجۆ: شیرە جۆ.
شین: جۆرە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی ئاسمان. شیوەن. ناشیرین (با) ڕۆین (ه). شوێن (با).
شیناو: ماستاو و دۆی زۆر ڕوون.
شیناهی: شینایی.
شینایی: سەوزییەکە کە لە زەویدا ڕوابێ.
شینباو: شتێکە بڕوانێ بەسەر شیندا.
شین بوون: ڕوان و سەوزبوون.
شین چوونەوە: دەرکـــەوتنی شت لە دوورەوە بەشین: دەریا لە دوورەوە (شین دەچێتەوە).
شینک: پشتێن. گەڵا کوتک (با) شواشینک.
شین کردن: شیوەن کردن. ڕەنگکردنی شتێک بەڕەنگی شین.
شین کردنەوە: شین چوونەوە.
شینکە: جۆرە تفەنگێکە لە دەمەوە دادەگیرێتەوە. زەوی لم و زیخەڵان.
شین و شەپۆر: شیوەن کردنی تێکڕایی لەگەڵ لەخۆ داندا.
شینەبی: شۆڕەبی.
شینەشاوە: شینەشاهۆ.
شینەشاهۆ: مەلێکی کەوەڵەی قاچ و مل درێژە.
شینەوارک: با. شوێنێکە کە شتی تێدا بوو بێ و کۆکرابێتەوە و لە پاشا بچیت بۆ شت تێدا دۆزینەوەی.
شیو: چەم. چێشت.
شیوارە: د. لاکێش.
شیواز: شێواز.
شیووت: شوویت.
شیوەخوار: لەوەڕاندنی ئاژاڵ ئێواران لە دوای تێ بەردان و جوێ کردنەوەیان.
شیوەڵۆکە: شیوی پچکۆلە.
شیوەن: گریانی بەکوڵ بۆ مردوو .
شیوەن کردن: شیوەن.
شیوەنگا: شوێنێکە کە بەکۆمەڵی شیوەنی تێدا بکرێ.
شیوەننامە: وتار یا پارچە هۆنراوەیەکە کە لە شیوەنی یەکێکدا بووترێ.
شیوی: با. نانخواردنی ئێواران.



عا: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ لێخوڕینی کار و بەرخ.
عابا: د. عەبا.
عاجباتی: شتێکە مایەی سەرسوڕمان بێ.
عارنان: چاوترسان لە شتێک و دەست لێهەڵگرتن و تەمێبوون.
عارەق: ئارەق.
عارەقچن: د. کڵاو.
عارەقچین: عارەقچن.
عارەقخۆر: ئارەقخۆر.
عارەق دەردان: ئارەق دەردان.
عارەق فرۆش: ئارەق فرۆش.
عارەق کردن: ئارەق کردن.
عارەق کردنەوە: ئارەق کردنەوە.
عارەق گرتن: ئارەق گرتن.
عارەقگیر: ئارەقگیر.
عازەب: کوڕ و کچی گەورەبووی لە خەم ڕەخسیو.
عازەبە: وردە برینێکی نێرکدارە لە دەموچاوی عازەب دەردێ.
عاسا: عەسا.
عاست: حەن: لەو (عاست)ە، واتە لەو حەنە.
عاستەم: ئەسپایی و سووک: بە(عاستەم) دەرگاکە پێوەدە.
عاسمان: ئاسمان.
عال: شتی چاکی نایاب.
عالوسال: مەردوومی هێدی لەسەرخۆ.
عامباز بوون: ئاوقەد بوون.
عامبازدبوون: عامبازبوون.
عان: حەل: سبەینێ ئەم (عان)ە دێم بۆ لات.
عایلەمەن: د. عەینە مەل.
عرک: با. معدة.
عشتر: ل. حوشتر.
علعوول: ز. شتی زۆر پچووک.
عوشاق: ناوە بۆ جۆرە مقامێک.
عوشاقی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
عومەرەگێلە: جۆرێکە لە مقامی قۆریات.
عوور: ز. ورگی گیاندار.
عوورە: ز. گەنمێکە کە ئامادە کرابێ بۆ بەباکردن.
عوورێن: ز. دەنگی بەرزی گا و گامێش.
عوولی: ز. ژوور. قاتێک لە خانوو.
عویرگ: با. ورگ.
عە: وتەیەکە ئاژاڵی پێ لێ دەخوڕدرێ.
عەبا: کاڵایەکی پانوپۆڕێ فراوانی بێ قۆڵە لەسەر هەموو کاڵاوە دەدرێ بەشاندا.
عەبداڵ: عەوداڵ. پۆڕی نێر.
عەبدۆیی: ناوە بۆ عێلێکی کورد.
عەبرەش: ئەبرەش.
عەبوور: ز. خۆژیاندن.
عەبووری: ز. پارچەیەکی ئاوریشمە دەبەسترێ بە سەرەوە.
عەبەنووس: جۆرە دارێکی زۆر سەختی ڕەشی بەنرخە هێندێ شتی نایابی لێ دروست دەکرێ.
عەپی: ز. وتەیەکە بەمنداڵی ساوا دەوترێ بۆ ئەوەی کە شت بخوا.
عەتفک: ز. تیلماسکە ترێ.
عەجەم: فارس.
عەجەمی: چەیە جاخی گۆشت کوتانی کەبابچی. بریتییە لە ئادەمی ناشی لە هەموو کاروبارێکدا.
عەجەنە: د. جنۆکە.
عەداب: ز. کێم بەتەنیا یا لەگەڵ خوێندا.
عەرد: زەوی.
عەڕە: زەڕە (عەڕعەڕ) زەڕەزەڕ.
عەڕەبانە: شتێکە وەک گالیسکە بەڵام ئەم ئەسپ ڕایدەکێشێ.

عەرزێل: ز. هەرزاڵ.
عەرعەر: سپیداری ڕاستی بێ گرێ و قورت.
عەرن: ز. ڕق هەستان.
عەرنۆکی: ز. کەسێکە زۆر تووڕە ببێ .
عەرەق: ئارەق.
عەرەقچن: عارەقچن.
عەرەقچین: عارەقچین.
عەرەق خواردنەوە: عارەق خواردنەوە.
عەرەقخۆر: عارەقخۆر.
عەرەق دەردان: عارەق دەردان.
عەرەق فرۆش: عارەق فرۆش.
عەرەق کردن: عارەق کردن.
عەرەق کردنەوە: عارەق کردنەوە.
عەرەق گرتن: عارەق گرتن.
عەرەقگیر: عارەقگیر.
عەزرەت: ئارەزووکردنی زۆر بۆ شتێک بەئاواتەوە.
عەزرەتی: کەسێکە کە زۆر ئارەزوومەند و ئاواتەخوازی شتێک بێ.
عەزنەوور: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ گەورە و سەرکۆماری گەلێک. وتەیەکە بەکار دێنری لە باتی وتەی دەعبا و جانەوەر.
عەزیزی: شەوکراس.
عەسپ: ل. ئەسپ.
عەسرین: ز. ڕقگرتنی منداڵ بەجۆرێک کە درەنگ ژێر ببێتەوە.
عەسسە: ز. شتی ڕاست کە گاڵتەی تێدا نەبێ (جدی).
عەسکەری: جۆرە ترێیەکی کشمیشی زۆر ناسکی دەنک درێژە.
عەسەلا: دەوار بەخۆی و هەموو تفاقیەوە.
عەشامات: مەردوومی زۆری کۆبووەوە.
عەشرەفی: د. ئەشرەفی.
عەشیران: جۆرە مقامێکە.
عەعا: وتەیەکە منداڵی ساوا بەکاری دێنێ بۆ پیسی.
عەعە: عەعا.
عەفارە: ز. بن خەرمان. میوەیەکە بەدرەختەوە مابێ لەبەر خراپی.
عەفت: ز. حەپەی سەگ.
عەڤداڵ: ز. هەژاری ئاوارەی عەوداڵ.
عەگ: ز. بزنێکە زۆر سپی نەبێ.
عەلبەکی: ز. دەفری مسینی بنکدار.
عەلتۆش: ز. کردەوەی بێ سوود.
عەللە: ز. عال.
عەلۆ و جەلۆ: بریتییە لە مەردوومی هیچ و پووچ.
عەلووعەلوو: ز. عەلیشیش.
عەڵەم: د. جێی بەشکردنی ئاو.
عەلەولەمانی: با. جۆرێکە لە هەنجیر.
عەلیخانی: شتێکە وەک مشکی سەر بەڵام ئەم تەختی ڕەش و قەراغی ڕەنگاوڕەنگە.
عەلیشیش: بۆقلەموون.
عەلیبوردە: ز. نانی مزەئاش.
عەلیفورنە: ز. کاغەزی زبری ئەستوور.
عەمار: ژوورێکی گەورەی تایبەتییە کە شتی تێدا هەڵبگیرێ.
عەماراو: دەفرێکی گەورەی قووڵە ئاسنگەر و پینەچی پڕی دەکەن لە ئاو لە کاتی کاردا. شتێکی گەورەی تایبەتییە کە پڕ بکرێ لە ئاو بۆ بەکارهێنانی.
عەمارتە: خانوویەکی یەک قاتە کە تەختەکەی کەمێک لە زەوی بەرز بووبێتەوە.
عەمارکردن: شت هەڵگرتن بەزۆری لە عەماردا.
عەمارەپۆ: تەنراوێکە لەبەر زۆر مانەوەی لە عەماردا پۆرتکابێ.
عەمانج: ز. نیشانێکە نرابێتەوە بۆ پێکانی.
عەمبار: عەمار.
عەمبازبوون: عەمبازدبوون.
عەمبازدبوون: ئاوقەد بوو.
عەمبە: عەمە.
عەمرۆکە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک گێلاخە وایە بەڵام ئەم ناخورێ.
عەمە: بەری درەختێکی گەرمیانییە.
عەنتەر: مەیموونی نێر.
عەنتیکە: شتی نایابی بەنرخ.
عەنتیکەچی: کەسێکە لە شتی عەنتیکەدا پسۆڕ و شارەزابێ.
عەنتیکەخانە: شوێنێکە کە شتی عەنتیکەی تێدا دابنرێ.
عەنتیکە فرۆش: کەسێکە کە هەر شتی عەنتیکە بفرۆشێ.
عەنزەرووت: شتێکە وەک چەوی توێسی.
عەنناب: درەختی شیلان. شتێکە وەک خورما بەڵام پچووکتر و تۆزێک شیرینچکە.
عەنوا: ئەنوا.
عەنەزە: جۆرێکە لە وڵاخی ڕەسەن.
عەو: وتەیەکە شوان ڕانی پێ لێ دەخورێ.
عەوتەعەوت: ز. وەڕەی سەگ.
عەوداڵ: کەسێکە کە بەدووی شتێکدا بگەڕێ و نەیدۆزێتەوە.
عەوارڤ: ز. هەورێکە لەگەڵ سایەقەدا تێکەڵ بێ.
عەوە: حەپە (عەوە عەو) حەپە حەپ.
عەیار: ئافرەتی زۆرزانی فێڵباز. پێستی مەڕ و بزن (ز).

عەیار شیرک: ز. مەشکە.
عەیارە: ئەندازەیەکە دانرابێ بۆ پێوانی شت بەتێکردنی.
عەی عەی: ز. دەنگێکە ئاژاڵی پێ لێ دەخوڕدرێ.
عەین: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
عەینەمەل: باڵندەیەکی بۆرەقنەی دەنووک تیژە بەقەد ڕیشۆڵەیەک دەبێ و زۆر مێملّی کوللەیە.
عیسک: با. نزگەرە.
عێل: چەند هۆزێکە کە بچنەوە سەر یەک باپیرە گەورە.
عێڵ: د. عێل.
عیلالەت: کۆمەڵێکی زۆر گەورە لە مەردووم.
عێلجاڕی: گەلەکۆمەکێ.
عیسان: ئینسان.
عینسان: ئینسان.
عیوارش: ز. گێژەڵووکە.

# غ

غائیز: دڵ سستبوون بەهۆی سەرمابوون یا گەرمای زۆرەوە.
غار: ڕاکردنی ولاخ: ولاخەکە (غاری) خۆشە.
غارا: جۆرە پارچەیەکی ئاوریشمی جوانە وەک خامەک.
غاران: خاران.
غاراندن: خاراندن.
غاراو: خاراو.
غاردان: تاودانی ولاخ.
غارغارێن: هێنان و بردنی ولاخ بەتاو.
غارکردن: تاودانی ولاخ.
غارین: خارین.
غاریو: خاریو.
غـازی: دوو جـۆرە لە دراو یەکـێکیـان پچکۆلە و زێڕ ئەوی تریان گەورە و زیوە.
غالیگە: بۆشایی کەلەکە.
غلتاندن: قسەکردن بەغلتە: نەخۆشەکە دەغلتێنێ.
غـلـتـە: قـسـەکـردنی نەخـۆش بەگـەروو لە کـاتی گـیـانەلاودا، (غلتەغلت) غلتەی یەک لە دوای یەک.
غوباب: گیانداری قەلەوی بەکەیف.
غولغولە: هەرا و هوریا و تێکرژانی مەردووم.
غـولە غـولێ: دەنگی خـوێندنی یەکـێک لە دوور کـە پیت و وتەی جوێ نەکرێتەوە.
غونچە: خونچە.
غەریبۆک: ز. جۆرە هەرمێییەکە.
غەزایی: عەینەمەل.
غەزرین: تۆران و قسەنەکردنی یەکێک لەگەڵ یەکێکی تر: فیسار کەس زۆر (دەغەزرێ) یا زۆر حەزی لە (غەزرینە).
غەز و بەز: گۆشتی زۆر چەوری قەڵەو.
غەزەتە: ڕۆژنامە.
غەزەتەچی: کەسێکە کە ڕۆژنامە دەربێنێ.
غەزەتەنووس: ڕۆژنامەنووس.
غـەزەل: پارچەیەکی ئاوریشـمـینی مـیل مـیلی ڕەنگاوڕەنگە وەک شیرداخ. هەشت نۆ شیعرە کە لە باسی دلداریدا وترابێ.
غـەزنە: شـوێنێکی قـایمە کـە دراو و شـتی گـران مـایەی تێـدا هەلگیرێ. شتی گران بەها وەک پارە و چەکی زۆر.
غەزنەکردن: ئاودز کردنی شوێنێک لە ئەندام و پڕبوونی لە کێم.
غەزێم: خەزێم.
غـەزێنە: شـوێنێکی تایبـەتیـیـە لە حـەمـام کـە پڕ دەکـرێ لە ئاوی گەرم. شوێنێکە کە غەزنەی تێدا دانرابێ.
غەزێنەکردن: غەزنەکردن.
غەڵبەغەڵب: دەنگی زۆری مەردووم و ژاوەژاویان.
غەڵدی: توولە.
غەمزە: ناز.
غەنە: بردن و دەرکردنی گۆی (شـەقێن)ە لەسـەر شار بە(قـاشۆ) کەم کەم بەخشکەیی.
غـەوارە: بێگانە. ناوی تیـرەیەکی کـۆچەری کـوردە لە ناوچەی سرۆچک.
غـەور: کـێم و زووخی ناو برین: ئەم دەرمـانـە (غـەور)ی برین دەکێشێ، واتە چڵکی ناوی پاک دەکاتەوە.
غەوربوون: ڕۆچوون بەناخی زەویدا.
غەوغەرە: ز. ناوەندی نوستن و بێداری.
غەیدین: ز. ڕق هەستان.
غەین: ناوی پیتێکە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.



فابریقە: کارگەیەکە کە بەزۆری شتی تێدا دروست بکرێ.
فاتنک: قومری.
فاتەبۆر: فاتە بۆرە.
فاتەبۆرە: جۆرە کاڵەکێکی ڕەشە. گیایەکی گەڵا پانە وەک کاڵەک بەرێکی درێژکۆلەی شیرین دەگرێ.
فارزک: کەسێکە زۆر حەزی لە خواردن بێ و هەمیشە خەریکی خواردن و کردن بێ.
فارس: گەلێکی کۆنی تایبەتی ئارییە. وڵاتێکە کە گەلی (فارس)ی تێدا دادەنیشێ.
فارن: با. خواردن.
فاسۆلیا: بەری گیایەکە وەک پاقلە وایە، دەنکەکانی لە ماشە سپی دەچێ و دەکرێ بەچێشت.
فاسۆن: جۆرە تەنراوێکی بەنرخە لە خوری دروست دەکرێ.
فاسۆنیا: فاسۆن.
فاش: دەنگوباسێکە کە بڵاوبووبێتەوە، (فاشبوون) بڵاوبوونەوەی دەنگوباس.
فافۆن: جۆرە کانێکی سووکی سپییە دەفری لێ دروست دەکرێ.
فاق: فاقە. لقی درەخت. جۆرە عەبایەکی ڕەشە ژنان دەیدەن بەسەریاندا (د).
فاقدان: بەناوداچوون و زەبوونبوونی گیاندار.
فاقە: دارێکە وەک قەفی گۆچان ژێیەک دەبەسترێ بەهەردوو سەریەوە، چەڵەمەیەک دەکرێ بەم سەر و بەوسەری ژێیەکەوە چۆلەکە و ڕیشۆڵەی پێ دەگیرێ.
فاک: فێڵ: هەزار (فاک)م بە(فیکێکت).
فاکوفیک: کەڵکەڵە: فیسار کەس کەوتۆتە سەر (فاکوفیک)ی ژنهێنان. هەوەس و ئارەزوو: فیسار کەس لە (فاکوفیک)ی خۆی ناکەوێ.
فاڵ: هاتنە بای ماکەر. نوقڵانەی باش.
فالا: ز. خاڵی.
فاڵچی: کەسێکە فاڵ بۆ مەردووم بگرێتەوە.
فاڵچێتی: خەریکبوون بە فاڵگرتنەوە.
فاڵگر: فاڵچی.
فاڵگرتن: هاتنە فاڵی ماکەر.
فاڵگرتنەوە: بەخت گرتنەوە.
فاڵگەر: فاڵچی.
فاڵۆزە: فڕنی.
فاڵهاتن: هاتنە فاڵی ماکەر.
فام: تێگەیشتن.
فامیلیا: خێزان و بنەماڵی بەناوبانگ.
فامیدە: مەردوومی تێگەیشتوو.
فامین: تێگەیشتن.
فانۆز: چرای دەستی شووشەدار.
فانۆس: فانۆز.
فانیلە: جۆرە تەنراوێکی دەزوو یا خورییە لەبەر دەکرێ.
فت: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتی فڕێدانی گۆرەوی یا فنجان لە یاری گۆرەوییبازی و فنجانێندا: ئەم گۆرەوییە یا ئەم فنجانە (فت) واتە بۆشە و هیچی تێدا نییە.
فتبوون: تێکەوتن و دەرچوون لە یاریدا.
فتخۆش: قەنگە.
فتراق: دڵ.
فتراندن: ز. بینین.
فترک: ز. قارچک.
فتروونە: ئەو شتەیە کە لە شتێکی تر متوربە بکرێ (لقاح).
فت کردن: فڕێدانی گۆرەوی و فنجان لە یاری گۆرەوییبازی و فنجانێندا. فڕێدانی سووتووی سەبیل و قلیان بەفوو پێدا کردنی. دەرکردنی یەکێک لە یارییەکدا.
فت و فراوان: زۆر و زەبەند.
فتە فت: د. سرکە سرک.

فتێڵە: پڵێتە. فتیلە.
فتیلە: قوتیلەی نەوت.
فجووزکردن: با. ڕۆینێکی ئێجگارییە کە هاتنەوەی لەدوا نەبێ: فیسار کەس (فجووزی کرد) واتە بەئێجگاری ڕۆی یا مرد و کۆچی دوایی کرد.
فجووڕکردن: فزرینی کەو و سوێسکە.
فجووق: دەنگێکە لە کەوەوە دێ لە کاتی دەرپەڕیندا.
فجووقکردن: دەرپەڕین و باڵگرتنەوەی کەو.
فچک: دەنگێکە لە دەستی جۆڵاوە دێ لە کاتی کارکردنیدا: چوومە لای فیسار کەس (فچک فچک) جۆڵایی دەکرد.
فراژی: بەخۆداهاتن و گەشە کردن.
فراڤین: ز. خواردنێکە لە ناوەندی قاوەتی و ئێوارەدا. نانی نیوەڕۆ (با).
فراوان: شتی گوشادی گەورە.
فراوانی: گوشادی.
فراوین: با. نانخواردنی نیوەڕۆ.
فرتاندن: دەرپەڕاندنی شت.
فرتانن: د. فرتاندن.
فرتک: کونی لووت (ز) هێڵنج.
فرتوونەک: ز. فەرتەنەی دەریا.
فرتە: پرتەی چرا. جووڵە و بزووتنەوە، (فرتە فرت) بزووتنەوەی یەک لە دوای یەک، (فرت و هووڕ) فرتە فرتی زۆر.
فرتەکردن: دەرپەڕینی شتێک لە شتێکی تر بەگورجی.
فرتێنە: فەرتەنە.
فرچک: فریشک.
فرچە: فڵچە.
فرچیل: دانەوێڵەیەکە کە نیوەکوڵ بووبێ: نۆکەکە (فرچیل) بووە.
فڕ: قومێک لە چا یا لە قاوە کە لێوی پێوە بنێیت و بیخۆیتەوە. پەیوەندی شتێک بەسەر شتێکی ترەوە: فیسار کەس (فڕ)ی بەسەر ژنەکەیەوە نەماوە، واتە تەڵاقی کەوتووە.
فڕان: هەڵمەت و ڕاکردن: بە(فڕان)ێک بچۆ بۆ ماڵەوە.
فڕاندن: ڕفاندن.
فڕان فڕان: بریتییە لە ڕاوەڕووت و بێ ئاسایشی لە شوێنێکدا.
فڕانن: د. فڕاندن.
فڕفڕۆک: فڕفڕۆکە.
فڕفڕۆکە: خولخولۆکەیەکە منداڵان لە کاغەز دروستی دەکەن و دەیکەن بە سەری دارێکەوە کە با لێی دەدا دەخولێتەوە.
فڕفڕە: فڕفڕۆکە. نێرگەڵە.
فڕفینگ: هەڵامەت.
فڕکافڕکا: هەڕاکردنی مەردووم لە ترسدا لە کاتی تێکچوونی ئاسایشدا.
فڕکان: فڕکە: بە (فڕکان)ێک بچۆ بۆ بازار.
فڕکان فڕکان: فڕان فڕان.
فڕک و هووڕ: گێز و هووڕی بەرد و گوللە و پلاری هاوێژراو. هاتوچۆکردنی زۆر بەفڕکە.
فڕکە: چوون بۆ شوێنێک بەگورجوگۆڵی و چالاکی، (فڕکەفڕک) فڕکەی یەک لە دوای یەک، (فڕک و هووڕ) فڕکەفڕکی زۆر.
فڕگە: ڕێگای دەربازبوون (د). جێی نیشتنەوە و هەڵفڕینی فڕۆکە.
فڕن: کوورەی نان برژاندنی نانەوا.
فڕندە: باڵندە.
فڕنەگولە: فیڕنەگولە.
فڕوفێڵ: فێڵ فەرەج.
فڕنی: خواردەمەنییەکە لە شیر و شەکر و برنجی هاڕاوە دروست دەکرێ.
فڕۆ: گەروو.
فڕۆک: شتێکی باڵ و پەروانەدارە بەئاگر و بەنزین دەفڕێ و زەلام هەڵ دەگرێ.
فڕۆکە: فڕۆک. باڵندە (د).
فڕۆکەخانە: شوێنێکە کە فڕۆکەی تێدا بنیشێتەوە.
فڕۆکەوان: کەسێکە کە فڕۆک لێ بخوڕێ.
فڕووج: باڕۆکەی مریشک.
فڕووجاو: گۆشتاوی فڕووج.
فڕووکە: دەستەچیلە.
فڕوون: فڕن.
فڕە: دەنگی باڵی پەلەوەر، (فڕەفڕ) فڕەی یەک لە دوای یەک، (فڕ و هووڕ) فڕەفڕی زۆر. فڕکە: بە(فڕە) یەک بچۆ بۆ بازاڕ.
فڕەدان: فڕێدان.
فڕەکردن: دەرچوون و تێپەڕینی گیاندار: ئا (فڕەیەک بکە) ئەو شتە بێنە.
فڕێدان: دوورخستنەوەی شتێک لە خۆت بەهاویشتنی.
فڕی فڕی: جۆرە یارییەکە چەند کەسێک دەیکەن یەکێکیان دەبێ بە وەستا و دەڵێ (فڕی فڕی) فیسارە شت فڕی و پەنجەی بەرز دەکاتەوە، ئینجا ئەگەر شتێکی وای وت کە فڕندەبێ ئەوی پەنجە بەرز نەکاتەوە لە گەڵیدا تێ دەکەوێ و، ئەگەر شتێکی وای وت کە فڕندە نەبێ ئەوی پەنجە بەرز بکاتەوە لە گەڵیدا تێ دەکەوێ.
فڕین: باڵگرتنەوە و حەواکەوتنی باڵدار. لێدانی دەمار.
فڕیوە: جۆرە یارییەکە ئەوی تێدەکەوێ بەهەنگڵە شەلێ دەبێ بڕواو ئەمانی تر تێی هەڵ بدەن ئەمیش لەوان هەڵ بدا، ئینجا ئەوی شەقی ئەمی بەرکەوت تێ دەکەوێ.

فرژین: ز. پرمەی وڵاخ.
فرس: هەرێز.
فرسادە: د. فرستادە.
فرستادە: کەسێکە لە لایەن یەکێکەوە نێردرابێ بۆ لای یەکێکی تر بۆ گەیاندنی قسەیەک.
فرسک: فرچک.
فرسەق: فرسەنگ.
فرسەنگ: ماوەی سێ میلە لە رێگاوبان کە هەر میلێک چوار هەزار گەزە.
فرشتە: فریشتە.
فرشک: فرسک.
فرشە: فلچە.
فرفات: ز. کاڵای دڕاوی هەلا هەلا.
فرک: ز. فرێک لە ئاو و شتی شل.
فرکبوون: ز. زانی ماین.
فرکردن: ز. قومدان لە شتی شل.
فرمان: ئیشوکار.
فرمانکردن: ئیشکردن.
فرمانکەر: ئیشکەر.
فرمانگوزار: کەسێکە کە بەردەستیت بکا.
فرمێسک: دڵۆپەی ئاوی چاو.
فرمێسک بزە: گریانێکە لە خۆشییەوە بێ.
فرو: با. فرۆ.
فرۆ: ژەکی کوڵاوی توندبووەوە.
فرۆتن: دانی شت بەدراو.
فرۆتەنی: شتی فرۆشتن.
فرۆخت: برەوی شت لە فرۆتندا.
فرۆش: فروخت: کوتاڵ (فرۆش)ی نییە.
فرۆشتن: فرۆتن.
فرۆشتەنی: فرۆتەنی.
فرۆشیار: کەسێکە شت بفرۆشێ.
فرووزوو: هەرێز.
فرووزیی: ز. شتی پچکۆلە.
فرە: زۆر.
فرەبەش: شتێکە کە بەشی زۆری تێدا بێ.
فرەبێژ: سازندە.
فرەخۆر: زۆرخۆر.
فرەخەیاڵ: کەسێکە کە ئاواتی زۆر بێ.
فرەڕوو: دووڕوو.
فرەز: قەیفە.
فرەزان: زۆرزان.
فرەگەڕ: کەسێکە زۆر بگەڕێ.
فرەماگ: شتی کۆن.
فرەوان: فراوان.
فرەوەڕ: بریتییە لە مەردوومی سازندە. سەگی هەڵەپاس.
فرەیی: زۆری شت.
فریاخستن: گەیاندنی شتێک بەکەسێک لە کاتێکی زۆر پێویستدا.
فریاڕەس: کەسێکە بگا بەهاواری یەکێکدا.
فریاکەوتن: گەیشتن بەهاواری یەکێکدا .
فریاگەیشتن: د. فریاکەوتن.
فرێتوون: با. جۆرە شیرینییەکە لە ئارد و هێلکە و شەکر دروست دەکرێ وەک پەنجەرە کون کونە.
فرێزە: کشتوکاڵێکە کە دروێنە کرابێ.
فریشتە: دروستکراوێکی فەرمانبەری خوان بەموو لانادەن لەوەی کە پێیان سپێردراوە.
فریشک: ژەکێکە کە لە سکی کار و بەرخ دەرهێنرابێ بۆ هەوێنی پەنیر.
فریبخواردن: هەڵفریوان.
فریبخۆر: کەسێکە زوو هەڵخەڵەتێ.
فریبدان: هەڵخەڵەتاندن.
فریبیاگ: د. هەڵخەڵەتاو.
فریبیان: د. هەڵخەڵەتان.
فریز: فریزوو.
فریزوو: گیایەکی باریکی بەیەکداچووی پان بووەوەی هەمیشە سەوزە.
فریو باز: فێڵباز.
فریوخواردن: لاس خواردن و هەڵخەڵەتان.
فریوخۆر: کەسێکە زۆر هەڵخەڵەتێ.
فریودان: لاس دان و هەڵخەڵەتان.
فریویاک: د. هەڵخەڵەتاو.
فریویان: د. هەڵخەڵەتان.
فز: د. فزە.
فزدووک: عازەبە.
فزرە: فزە.
فزە: جووڵە. نووکە و نقە: (فزە) نەکەیت، واتە نقەت لێوە نەیەت.
فزە لێ برین: بریتییە لە جووڵەخستنی یەکێک.
فس: تس. فس.
فستان: جۆرە عەزیزییەکی ژنانەی ئاودامانی ناوقەد باریکی داوێن والایە.

فستک: ز. کەسێکە کە لە ڕۆیندا پێی هەڵخلیسکێ.
فستوقی: ز. کەسێکە کە گەرۆک بێ و ڕێی نەکەوێتە ماڵی خۆی. سەگی خوێڕی.
فسدان: بریتییە لە دەرکردنی یەکێک: فیسار کەسم (فس دا) واتە دەرم کرد. خۆ دانەواندن و خۆ فشکردنی مریشک بۆ کەڵەشێر.
فس دانەوە: بریتییە لە دەست هەڵگرتن و پەشیمانبوونەوە لە کارێک لەبەر سەرنەگرتنی. بەردانەوەی تس.
فس: وتەیەکە پشیلەی پێ دەر دەکرێ.
فسە: فس.
فسەفس پاڵەوان: بریتییە لە یەکێک کە هیچی لەباردا نەبێ و کەچی هەر خۆی هەڵبکێشێ.
فسقە: فسکە.
فسکاگوری: ز. جۆرە گیایەکە.
فسکوول: گوڵنگەی فێستی سوور.
فسکە: پیازی فیسقە.
فسکین: ز. پێ هەڵخلیسکان.
فسن: تسن.
فسنان: بریتییە لە دەرکردنی یەکێک .
فسۆس: گەندە دەڵەک.
فسە: چپە، (فسەفس) چپەچپ، (فسەکردن) چپەکردن.
فسەزمان: زمانپس.
فسەی فسە: هـ. شیلانی مووروو.
فسین: تسین.
فش: شتێکە کە بلاو بێ و نەنیشێتە سەر یەک. چلمی لووت (ز).
فشبوون: هەڵۆڵبوونی شت. بریتییە لە نەرمبوون و هاتنە باری یەکێک لە کارێکدا کە لەوە پێش نەیویستبێ بیکا. دەرچوونی با لە تایەی ئۆتۆمۆبێل و شتی تر.
فشقیات: فیشقیات.
فشکردن: بریتییە لە نەرمبوون و هاتنە بار بۆ کردنی کارێک.
فش و فۆڵ: شتی فشی شل و شێواو.
فشۆڵ: فشەڵ.
فشە: گاڵتە و گەپ: هەروا بە(فشە) مەیبەرە سەر. جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی تس. فش فش: فشەی یەک لە دوای یەک.
فشە کردن: بریتییە لە خۆ هەڵکێشان. گاڵتە و گەپکردن. دەرچوونی دەنگ بەفشەوە لە شتێک.
فشە کلاونە: چنگەڵە.
فشەڵ: زەمینی ستەک و هەموو شتێکی فشۆڵ.
فکلە: ناوچەوان. چاڵایی پشتی مل.
فل: د. گیانداری سستی شل و شێواوی تەمەڵ. بڵ (با).
فلت: فراوان.
فلتاندن: گفتوگۆ کردن بەفلتە.
فلتە: دەنگێکە لە دەم و لێوی هێندی کەسەوە دێ لە کاتی گفتوگۆدا، (فلتە فلت) فلتەی یەک لە دوای یەک.
فلتە دەمە: کەسێکە لە گفتوگۆدا هەر فلتەی بێ.
فلتیرم: نیوەی ئالتیرمە کە سەد و بیست و هەشت یەکی هۆقەیە.
فلچە: شتێکی موویینی زبرە دەم و دانی پێ دەشۆرێ یا پێلاو و کالای پێ پاک دەکرێتەوە. جۆرە دەنگێکە لە پێلاوەوە دێ لە کاتێکدا کە ناوەکەی تەڕ بێ، (فلچەفلچ) فلچەی یەک لە دوای یەک، (فلچ و هووڕ) فلچەفلچی زۆر. فلتە.
فلس: دراوێکی مسینی کەم نرخی عێراقییە.
فلفل: مەیموون.
فلق: ناوە بۆ کەمترین دراوێکی بابانی. شتێکە کە گەورەتر بێ بەوەی کە دەچێتە ناوی: پێلاوەکە بەپێم (فلق)ە.
فلقن: مێینەیەکە کە جار جار دەنگ لە زێیەوە بێ.
فلقنە: فلقن.
فلقە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی کاڵەکی بڵ کە بدرێ بەزەویدا، (فلق و هووڕ) فلقەفلقی زۆر.
فلقەفلق: وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بەیەکێک کە قسە بکا بۆ ئەوەی کە بێ دەنگ بێ، (فلق و هووڕ) فلقەی یەک لە دوای یەک.
فلقێ: فلقن.
فلوفا: کەڵکەڵە.
فلوفاو: فلوفا.
فلووت: شمشاڵی لێدان.
فلەه: فەلە.
فلەهن: جۆرە ماسییەکە.
فلێقان: د. لقی دووپەلی درەخت.
فلیتە: مەردوومی سەرسەری.
فلیقاندنەوە: پان کردنەوەی هەنجیر و ترێ و هێندێ شتی تر.
فلیقانن: د. فلیقاندنەوە.
فلیقانەوە: پانبوونەوە و بەیەکداچوونی ترێ و هێندێ شتی تر.
فلیقاو: شتێکە کە فلیقابێتەوە.
فلیقاوە: فلیقاو.
فلیقیاگ: د. فلیقاوە.
فلیقیان: د. فلیقانەوە.
فلین: گرژبوون و هاتنەوەیەک.

فمکردن: لووت سڕین.
فنجان: شووشەیەکی پچووکی دەم واڵی قووڵە قاوەی تێدا دەخورێتەوە. پیاڵە.
فنجان بڕ: جۆرێکە لە ئیشی هەویر کە بەفنجان دەکرێ.
فنجانێن: جۆرە یارییەکە بەفنجان دەکرێ.
فند: مۆم. شقارتە.
فندانک: شمعدان.
فندق: شتێکە وەک بستە بەسوێرکراوی دەخورێ.
فندک: فند.
فندەگولە: فیرنە گولە.
فنق: فندق.
فنچقە: د. گۆپکە.
فنق شکانن: بریتییە لە چەقەنە لێدان.
فنکە فنک: فینگە فینگ.
فوارە: ئاوێکە لە کونێکەوە سەر بەرەوژوور هەڵقوڵێ.
فۆتک: ز. سەرپۆشی ژنان.
فۆتە: جۆرە مەرحەمەیەکە.
فورتان: ز. خۆ هەڵکێشان.
فۆدل: شتی جوان.
فۆرت: نازین.
فۆرتەک: مەردوومی بەخۆناز.
فۆقل: مەردوومی ڕێکوپێک.
فوو: بایەکە کە ئادەمی بەدەم و لێو بیکا لە شت.
فووت: فیکە. دوانزە ئینجە کە دەکاتە سی سانتیم و نیو.
فووتوو: پەیمان. بڕیاردانی شتێک لەسەر خۆت لە دڵدا (نذر).
فوودان: فووکردنە ناو شتێک بەزۆری. هاتنە دەرەوەی فوو لە شتێکی فوودراو بەهۆی کونبوونیەوە.
فوورهە: تاڤگەی پچووک.
فووکردن: فووکردنە ناو شتێک.
فووگرە: فووکردن لە ئاگر یەک لەسەر یەک بۆ خۆشکردنی.
فوولەدۆنە کردن: بریتییە لە نەسڵەمینەوە لە هەموو گوناحێک.
فوولێکردن: فووکردن بەدەم لە شتێک.
فوونکاهی: فێنکی.
فۆیە: جۆرە دەرمانێکە لە جیوە و هێندێ شتی تر دروست دەکرێ و دەخرێتە ژێر نقێمی شووشەوە بۆ ئەوەی وەک ئەڵماس بنوێنێ.
فەتاح پاشایی: جۆرە هەڵپەڕکێیەکە (د). جۆرە قوماشێکە لە کارگەی فتاح پاشا دەردەچێ.
فەتار: شەقار، (فەتار فەتار) شتی شەقار شەقاری هەلا هەلا.
فەتارەت: لەناوچوون: فیسار کەس بە(فەتارەت) چوو، یا سەری بە(فەتارەت) چوو، یا سەری بە(فەتارەت) دام.
فەتیر: هەویرێکە کە هەڵ نەهاتبێ. نانێکە کە هەویرەکەی هەڵ نەهاتبێ.
فەتیرە: نانی فەتیری هەڵ نەهاتوو.
فەخفووری: دەفری چینی.
فەدی: شەرم.
فەراشە: قفڵ.
فەراشین: با. هاوینەهەوار.
فەرامۆش: شتێکە لەبیرچووبێ: ئەم کارە با (فەرامۆش) بێ، (فەرامۆشبوون) بیرچوونی شت، (فەرامۆشکردن) لەبیردەرکردنی شت.
فەرامۆشکار: کەسێکە شت زۆر فەرامۆش بکا.
فەرامۆشی: بیرچوونەوەی سەغڵەتی و ئازار بەهۆی شتێکی خۆشەوە.
فەرامۆشی دان: لەبیربردنەوەی سەغڵەتی و ئازار.
فەرامۆشی هاتن: لەبیرچوونەوەی سەغڵەتی و ئازار.
فەراهەم هاتن: پێکهاتنی شتێک.
فەراهەم هێنان: پێکهێنانی شتێک.
فەرتووت: شتی پەڕپووت.
فەرتەنە: ئاشووب. وەیشومە.
فەرخەس: ز. گیانداری نیوە خەس.
فەرخی: جۆرە ترێیەکی کشمیشی ناسکە دەنکی لە (عەسکەری) پچووکترە.
فەردە: تایەک لە بارێک.
فەردەش: کۆمەڵ کۆمەڵکردنی (جیز)ی دانەوێڵە بەبێژنگ یا سەرەن بۆ ئەوەی کە یەکێکیان پێورا ئەندازەی ئەوانی تر دەرکەوێ
فەڕ: کەڵک: ئەم شتە بێ فەڕە. پیت و بەرەکەت.
فەڕاقە: جۆرە پیوەندێکە دەکرێتە پێی بەندی.
فەڕدار: شتی بە کەڵک.
فەڕ و فیت: د. پیت و بەرەکەت.
فەڕەنگ: دانیشتوانی ڕۆژئاوا.
فەڕەنگستان: وڵاتێکە کە فەڕەنگی تێدا دادەنیشێ.
فەڕەنگی: ئاتەشەک.
فەرز: فەرزین.
فەرزین: داشێکە لە داشەکانی شەترەنج کە پێی دەڵێن (وەزیر).
فەرژاندن: پچڕاندن و دڕاندن.
فەرژین: پچڕان و دڕان.
فهرس: فەهرست.
فهرست: فەهرست.
فەرش: ژێرەخەر.
فەرشک: مووچەی دەست.

فەرشكردن: تەختە پۆشكردنی ناو حەوش و ژوور بەخشتی سوور یا بەكاشی یا بەشتێكی تر.
فەرشە: پنە.
فەرفووت: پەرپووت.
فەرقان: پیران. هاتنەوەیەكی قورگ لەبەر زۆر گریان یا خەفەت.
فەركار: تێخورین و گەیاندنی فەرمان (ایعاز).
فەركاندن: وێنەگرتنەوەی نووسراوێك. پەی بردن بەشتێكی نووسراوی گران. فەرمان دان.
فەركەم: پەركەم.
فەرمان: داواكردن و خورینی گەورە بەسەر پچووكدا بۆ شتێك. كاغەزێكە كە فەرمانی پاشای تێدا نووسرابێ.
فەرمانبەر: كەسێكە فەرمانی گەورەیەك بەجێ بێنێ (موظف).
فەرمانبەردار: فەرمانبەر.
فەرماندار: كەسێكە كە فەرمان لەسەر فەرمان بدا.
فەرماندەر: فەرماندار.
فەرمانڕەوا: كەسێكە كە فەرمانی بڕ بكا.
فەرمانكردن: فەرماندان: بەشتێك.
فەرمانگە: دائیرەی دەوڵەت.
فەرمانگێڕ: حكومەت.
فەرماننامە: تۆماری دەوڵەتی (سجل).
فەرمایش: قسە و گفتوگۆی پیاوی گەورە.
فەرمایشت: فەرمایش.
فەرموو: وتەیەكە بەكاردێنرێ بۆ بانگكردنی یەكێك بۆ لات یا بۆ ڕێدانی یەكێك بۆ قسە كردن لە ڕووی گەورەییەوە: (فەرموو) واتە وەرە یا بڵێ.
فەرموودە: فەرمایش.
فەرموون: فەرمایش.
فەرمەسۆن: كەسێكە كە هیچ ئاینێكی نەبێ.
فەرهاند: ترساندن.
فەرەجی: فەرەنجی.
فەرەشخانە: ز. دارێكە تەختەیەك دەدرێ لە سەرەكەی و زبڵی پێ كۆ دەكرێتەوە.
فەرەنجی: جۆرە كاڵایەكی سەردەرییە لە خوری یا بەرگنی سووراوە دروست دەكرێ.
فەرهەم: فەراهەم.
فەرهەنگ: كتێبێكە كە وتەی زبانێك بگرێ و ڕاڤەی بكا.
فەرهەنگۆك: فەرهەنگی پچووك.
فەریاد: هاواركردن و لاڵانەوە (فەریاد كردن) فەریاد.
فەریادڕەس: فریاڕەس.
فەریك: دانەوێڵە و بەری هێندێ درەختە كە بەتەواوی پێ نەگەیشتبێ.
فەریكبوون: كزربوونەوەی شتی تەڕ.
فەریكە خورما: خورمایەكە هێشتا بەتەواوی پێ نەگەیشتبێ.
فەریكە قەزوان: قەزوانی سەوزی نە بەكام.
فەریكە گوێز: گوێزی سەوز كە هێشتا بەتەواوی كامڵ نەبووبێ.
فەریكە نۆك: نۆكی سەوز كە هێشتا ڕەق نەبووبێ.
فەساڵ: شێوە.
فەساڵدان: جێبەجێكردن و ڕاپەڕاندنی كارێك.
فەقفەقە: نەخۆشی كوشندە.
فەقێ: قوتابییەكە كە لە مزگەوتدا بخوێنێ.
فەقیانە: سۆرانی.
فەقی: د. فەقێ.
فەكلە: لاجانگ.
فەگڵ: د. ملپێچ.
فەلاقە: شتێكە دەكرێتە هەردوو قاچەوە و بادەدرێ بۆ دار لە بەری پێ دان.
فەلاقەكردن: لێدان لە بەری پێی یەكێك لە (فەلاقە)دا. بریتییە لە داركاری كردنی یەكێك.
فەلە: ز. هۆزێكە لە ئاسووری.
فەلەڕەش: فەلە.
فەلەڕەشكە: فەلە ڕەش.
فەلەڕەشە: فەلە ڕەشكە.
فەلیت: ز. هەرزەكارێكە كە بەتەواوی ژیرنەبووبێ.
فەلیتە: ئافرەتی سەڵیتە.
فەنا: پەنا.
فەنا بێدەنگە: پەنا بێدەنگە.
فەنباز: فێڵباز.
فەنتازی: شتی جوانی مۆدە.
فەند: با. فانۆز.
فەن و فێڵ: د. فڕ و فێڵ.
فەننەر: فەنەر.
فەنەر: شتێكە وەك فانۆز لە جاو یا لە كاغەزی چەوركراو دروست دەكرێ و مۆمی تێدا دادەگیرسێنرێ. گوێزانی تەراش. جۆرە تیغێكی نەرمە دەنوشتێتەوە وەك تیغی مشار.
فەهرس: فەهرست.
فەهرست: ئەو سەرباسانەن كە لە كتێبدا هەن و لەپێش یا لە پاشیەوە بەڕیزكراوی دەنووسرێن لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەكاندا بۆ دۆزینەوەی ئەو باسانە لە كتێبەكەدا بەئاسانی.
فەهۆ: شەرم و پاكداوێنی.
فەهێتكردن: ز. شەرم كردن.
فەهێتۆ: ز. شەرمن.
فهێت: ز. شەرم.

فهێتبوون: ز. فهێتکردن.
فهێتوو: ز. شەرمن.
فەیلی: ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد.
فێ: جــۆرە دەردێکە کــوتوپڕ تووشی هێندێ کــەس دەبێ وکــەف دەچێنێ و بێ هۆش دەکــەوێ. ناوە بــۆ پیــتــێک لــە بیــست و حەوت پیتەی کوردی.
فیـتکە: فوویەکە دەکرێ بەسەبیلدا بۆ فـڕێدانی سـووتووەکەی: سەبیلەکەم (فیتکە)ی دوورە.
فیچقە: لوولەیەکە کە ئاو فڕێ بدا. پیازی فیسقە.
فیـچقـە بەستن: بازرەقـە بەسـتنی شتی شل لە مـەشکە و کوندەدا بەهۆی کونبوونیەوە.
فیـچـقـە کـردن: دەرچوونی شـتی شل لە دەفـرێک بەباریکی و توندی.
فێخستن: داگیرساندنی ئاگر و چرا.
فێدار: کەسێکە کە فێی لەگەڵ بێ.
فێر: کەسێکە کە هۆگری شتێک بووبێ.
فێرا: ز. وتەیەکە بەکاردێنری لە جێی وتەی (لەگەڵ).
فێربوون: شارەزابوون لە شتێک. هۆگربوون بەشتێک.
فیرنەگولە: باڵندەیەکی بچووکی کەوەڵەی درێژە.
فێرز: پەلە.
فێرس: ز. بەهێز.
فێرکردن: شارەزاکردن. هۆگرکردن.
فێرگە: شوێنێکە کە شتێکی تێدا فێر ببیت.
فێس: فێست.
فێست: جۆرە کڵاوێکی سفتی سووراوەیە .
فیسقە: فیرنەگولە. پیازی ورد. فیچقە.
فیسقە بەستن: فیچقە بەستن.
فیسقە گولە: فیر نەگولە.
فێش: هـ. زۆر.
فیشتەر: هـ. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (زۆرتر).
فیـشقـە: د. دەنگی ئاو لە کـاتێکدا کە بەدەم یا بەفیـچقـە فڕێ بدرێ.
فیشقی: کەسێکە کە هەر لە خۆیەوە تووڕە بێ.
فیـشکە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی مـار، (فیـشکەفیـشک) فیـشکەی یەک لە دوای یەک، (فیـشک و هووڕ) فیـشکە فیشکی زۆر.
فێق: د. شتی لەڕ و باریک.
فێقن: د. فێق.
فێقی: میوە.
فێگرتن: فێ لێهاتن.

فێڵ: ز. دەفری دەم واڵ.
فـێڵ: بەکـارهێنانی شـتی درۆ و چاوبەست بۆ سـەر تێکدان لە مەردووم. فیل (د).
فێڵاوی: فێڵباز.
فێڵباز: کەسێکە کە فێڵ بکا.
فێڵبازی: بەکارهێنانی فێڵ لەگەڵ مەردوومدا.
فێڵزان: فێڵباز.
فیلکە فیلک: حیلکە حیلک.
فێڵ و تەڵەکە: فێڵ و قوماربازی.
فێڵ و فەرەج: فێڵ و تەڵەکە.
فێڵەزان: فێڵزان.
فێڵەگێجە: د. فیلەگێژە.
فیلیا: د. فیلپایە.
فێ لێهاتن: دووچاربوونی مەردووم بەدەردی (فێ).
فیناز: ز. کردەوەی ناشیرین.
فـینجـە: د. وتەیەکـە هەمـیـشـە لە دوای وتەی (ئینجـە)وە بەکاردێنرێ بەمەعنای زیادە لە قسەدا: کە قسەت گێڕایەوە (ئینجە و فینجە)ی پێوە مەنێ.
فێنک: شتێک یا شوێنێکە نە سارد بێ و نە گەرم.
فێنکاوی: فێنکایی.
فێنکایی: شوێنی فێنک.
فینکە: فینگە، (فینکە فینک) فینکەی یەک لە دوای یەک.
فێنکی: فێنکایی.
فینگە: دەنگی گریان بە لووت (فینگەفینگ) فینگەی یەک لە دوای یەک.
فیهرست: فەهرست.
فیت: هۆی سووچ و گوناح: ئەمە هەمووی (فیت)ی تۆیە. پیت و بەرەکەت (د).
فیتفیتە: فیقفیقە. تیفتیفە (ل).
فیتۆ: عەرەبە.
فـیـتـە: جۆرە دەنگێکە لە چوونە ژوورەوەی هێندێ شـتـەوە دێ بەکونێکدا: ئەم کونە (فیتـە)ی دێ واتە بەهوروژم بای پێدا دێ، فیتە فیت: فیتەی یەک لەدوای یەک.
فیج: گیاندارێکە دانی پێشووی کەوتبێ. شتی لار (هـ).
فیچان: وەرگەڕان و پێچکردنەوە.
فیراندن: پیسی کردنی گیاندار بەشلی و تەوژم.
فیرانن: د. فیراندن.
فیرکان: فیراندن.
فیرکە: دەردێکە بەگیاندار دەگا و بەخۆیدا دەفیرێنێ.
فیرن: گیاندارێکە کە زۆر بفیرێنێ.

فیرۆ: لە دەستچوونی شت بەخۆڕایی: پارە بەفیرۆ مەدە.
فیرە: دەنگێکە لە کۆمی گیانداری ڕەوانەوە دێ لە کاتی پیسی کردنیدا، (فیرەفیر) فیرەی یەک لەدوای یەک، (فیر و هووڕ) فیرەفیری زۆر.
فیز: دەعیە و دەمار.
فیزن: مەردوومی بەفیز.
فیزفیزۆک: فیکفیکە.
فیزە: دەنگێکە وەک فیکە.
فیس: فیز.
فیسا: فیز زل.
فیسار: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ یەکێک کە نەتەوێ ناوی ببەیت: فیسار کەس هات، واتە ئەو کەسەی کە خۆم و خۆت دەیزانین.
فیسارە: فیسار.
فیساندن: خووساندن.
فیسانن: د. فیساندن.
فیساو: شتی خووساو.
فیساوە: فیساو.
فیسقە: فیچقە.
فیسەڵ: د. شتی پووچ.
فیسیان: د. خووسان.
فیشاڵ: درۆی زل.
فیشاڵباز: خاوەن فیشاڵ.
فیشاڵچی: کەسێکە کە فیشاڵی زۆر لێ بدا.
فیشاڵکار: فیشاڵباز.
فیشاڵکردن: درۆ هەڵبەستن.
فیشەڵکەر: فیشاڵچی.
فیشاڵ لێدان: فیشاڵکردن.
فیشانن: د. پژاندن.
فیشە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی فیشەکە شێتە، (فیشە فیش) فیشەی یەک لەدوای یەک، (فیش و هووڕ) فیشە فیشی زۆر.
فیشەک: گوللەی تۆپ و تفەنگ و دەمانچە.
فیشەکبەند: چەرمێکی پان و درێژە فیشەکی پێدا دەکرێ و دەبەسترێتە پشت یا ڕاست و چەپ دەکرێتە مل.
فیشەکدان: فیشەکبەند.
فیشەک فرێدەر: پارچەیەکە لە دەمانچە و تفەنگ فیشەک فرێ دەداتە دەرەوە.
فیشەک گیر: شتێکە چەند دانەیەک فیشەکی تێ دەخرێ و دەخرێتە پاشی تفەنگ و دەمانچەوە.
فیشەک لغ: فیشەکبەند.
فیشەک لۆخ: د. فیشەک لغ.
فیشەکەشێتە: شتێکە وەک فیشەک لە کاغەز و بارووت دروست دەکرێ و ئاگری پێوە دەنرێ و فیشە دەکا و دەچێ بە حەوادا.
فیشەنگ: فیشەک.
فیقاندن: فیقەکردن.
فیقانن: فیقاندن.
فیقفیقە: شتێکە منداڵان فووی پێدا دەکەن و فیقەی لێوە دێ.
فیقن: گیانداری لاواز.
فیقنە: قامیشێکە سەرێکی پتەوە و سەرێکی واڵە، لە سەرە پتەوەکەیەوە فووی پێدا دەکەن و فیقەی لێوە دێ.
فیقە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی فیقفیقە، (فیقە فیق) فیقەی یەک لەدوای یەک.
فیقەنە: فیقفیقەیەکە لە قامیش دەکرێ بەسەر زوڕناوە و فووی پێدا دەکرێ.
فیقی: با. میوە.
فیک: فێڵ: هەزار فاکم بە(فیک)ێکت.
فیکاڤووی: ز. هەنگوین.
فیکاندن: فیکەکردن.
فیکانن: د. فیکاندن.
فیفیکە: فیقفیقە.
فیکە: جۆرە دەنگێکی باریکە بەلێو لێ دەدرێ، (فیکەفیک) فیکەی یەک لەدوای یەک، (فیک و هووڕ) فیکەفیکی زۆر.
فیکەکونێ: وتەیەکە لە یاری (قەڵاقەڵا)دا دەوترێ بۆ خۆشاردنەوە.
فیکە وا کونا: فیکەکونێ.
فیکەوەکونێ: فیکەکونێ.
فیل: گیانداریکی گەورەی گەرمیانی سەر و مل قەوییە، دەمی ناگاتە زەوی لوولە گۆشتێکی گەورەی درێژ بە دەمیەوەیەتی، بەوە شت کۆ دەکاتەوە و دەیخوا. پایەی پچووکە لەناو ئاودا دروست دەکرێ بۆ بەش بەش کردنی. ناوی داشێکە لە داشەکانی شەترەنج.
فیلپایە: پایەیەکی ئەستوورە مار و دوو دروست دەکرێ لە بەردەمی دیوارێکدا کە ورگی دابێ.
فیلەتەن: گیانداری گەورەی زەبەللاح.
فیلەگێجە: فیلەگێژە.
فیلەگێژە: دەعبایەکی کێوییە بەقەد کەڵەکێوییەک دەبێ، دوو شاخی یەک لقی هەیە.



ڤا: ئەمە (ز). با.
ڤاچ: ناوچە. کەنار. منطق (ز).
ڤادار: بادار.
ڤادان: بادان.
ڤاران: باران.
ڤارک: ز. بارۆکە.
ڤاری: تەنها.
ڤارین: بارین.
ڤاژی: با. شتی هەڵگەڕاوەی ئاوەژوو.
ڤالا: با. شتی بۆشی والا.
ڤالادکردن: ز. خاڵی کردنەوە.
ڤالاهی: ز. ڤالەهی.
ڤالە: ز. شوێنی چۆڵ.
ڤالەبوون: ز. خاڵی بوون.
ڤالەهی: ز. خاڵێتی.
ڤان: ویستنی شتێک و نیازکردنی (ز). ئەوان.
ڤتن: با. وتن.
ڤر: ز. درۆ. بوختان.
ڤرا: ز. ئێرە.
ڤراسەی: ز. دروون.
ڤراڤە: ز. وڕێنە.
ڤرال: با. ئیمپراتۆر.
ڤرتوڤین: ز. مەردوومی بێ مایە و نرخ.
ڤرچالە: ز. ترسنۆک.
ڤرچقین: ز. لاوازی گیاندار.
ڤرڤراندن: جوولاندن. تلدان بەشت.
ڤرڤرە: ز. بۆرە پیاو. درۆزن. سەرسەری.
ڤرە: جۆرە دەنگێکە پەیدا دەبێ لە شتێک کە بخولێتەوە یا بهاوێژرێ، (ڤرەڤر) ڤرەی یەک لەدوای یەک، (ڤر و هووڕ) ڤرەڤری زۆر. درۆ (ز).
ڤرسهاندن: ز. حەواندنەوە.
ڤرڤرۆ: با. ڤرڤرە.
ڤرڤرە: ز. زرنگە و ویزەی شت.
ڤرک: شۆربای دانەوێڵەیەک کە کوترابێ (ز). سنگی ئەستووری درێژ.
ڤرکا: ز. درۆ.
ڤرکرن: ز. درۆکردن.
ڤرکەر: ز. درۆزن.
ڤرگولی: ز. شتێکە کە ڕەنگی خەناوی بێ.
ڤرنی: ز. بەرخێکە دایکی درەنگ بووبێتی.
ڤروکەر: ز. ڤرکەر.
ڤرووڤی: ز. گۆشتی قەڵەوی کولاو.
ڤرە: ز. ئێرە.
ڤزاڤز: ز. دەنگی پوورەی هەنگ.
ڤزبوون: ز. سستی لە کارێکدا کە پێت سپێردرابێ.
ڤزک: ز. تیغی گەورەی دەم پان.
ڤزە: دەنگی لووت لە کاتی نووستندا، (ڤزەڤز) ڤزەی یەک لەدوای یەک.
ڤزەک: ز. کەسێکە کە سست بێ لە کارێکدا کە پێی سپێردرابێ.
ڤزین: ز. خوڕەی ئاو.
ڤژاب: ز. هەژدیها.
ڤژاندن: بووژاندنەوە.
ڤژانەوە: بووژانەوە.
ڤژۆکەر: دەرمانی ڕەوانی.
ڤنگە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی بەردی قۆچەقانی و ژێی کەوان، (ڤنگەڤنگ) ڤنگەی یەک لەدوای یەک، (ڤنگ و هووڕ) ڤنگەڤنگی زۆر.
ڤلۆشە: با. بڕوێش. ساوەر.

ڤۆک: با. میز.
ڤه: با. ئێوه.
ڤەبرک: با. گاڵگاڵی.
ڤەبری: با. شتێکه نەگۆڕێ و هەر لە جێی خۆی بێ.
ڤەبوور: با. پاشەکەوتی.
ڤەبوون: ز. کرانەوەی دەرگا و شتی تر.
ڤەپچراندن: ڕوونکردنەوە و دەرخستنی شتێک بۆ زانین.
ڤەپڕلاندن: با. دەمقاڵی و ڕۆیشتن لەسەر قسەیەک.
ڤەپیرین: ز. برینەوەی سەودا و مامەڵە.
ڤەترسین: ز. چابوونەوە لە نەخۆشی.
ڤەچقین: ز. ڕاچڵەکین.
ڤەجنقاندن: ز. بازدان.
ڤەجنقین: ز. ڤەجنقاندن.
ڤەچناندن: ز. چنینەوەی شتی هەڵوەشاو.
ڤەچنین: ز. خۆ پاراستن لەشت. چنینەوەی گۆرەوی و شتی تر.
ڤەرخارن: با. ڤەخواردن.
ڤەخواردن: ز. خواردنەوە.
ڤەخواندن: ز. بانگێشتن.
ڤەخوماندن: ز. ڕاوەشاندن و تێکدانی شت.
ڤەخومین: شڵەژان و سەر لێ تێکچوون.
ڤــەدان: ز. هەڵکەندنی زەوی بۆ خــێــوەت هەڵدان یا بۆ تەڵە نانەوە. خۆشکردنەوەی باران.
ڤەداندەر: ز. داهێنەر. خوا.
ڤەراڤەر: با. بەرانبەر.
ڤەڕووتاندن: ز. ڤەرووچکاندن.
ڤەرساندن:ز. کردنەوەی تەوق و پێوەند.
ڤەرسین: ز. ڕزگاربوون.
ڤەرڤە: ز. بەفر.
ڤەرق: ز. ڤەرک.
ڤەرقلین: ز. دواکەوتن لە کارێک.
ڤەرک: ز. گورگ.
ڤەرملین: ز. ماندووبوون.
ڤەرەشان: ز. ڕشانەوە.
ڤەرەشاندن: ز. هێنانەوەی خواردن.
ڤەرووچکاندن: ز. ئاوەرووتکردن.
ڤەریچاندن: با. ڤەرووچکاندن.
ڤەرێس: با. پێچکردنەوە بەشتێک.
ڤەزڤڕاندن: ز. ناردنەوەی شتێک.
ڤەزڤڕین: ز. گەڕانەوە.
ڤەزەلاندن: ز. فڕێدان. تلدان بەشتێک.
ڤەژاندن: ز. بووژاندنەوە.
ڤەژین: ز. بووژانەوە.
ڤەسهاندن: ز. پشوودان و حەسانەوە.
ڤەشارتن: ز. شاردنەوەی شت.
ڤەشارن: ز، ڤەشارتن.
ڤەفر: ز. شکاندنی پەیمان.
ڤەڤتاندن: ز. کردنی کەمێک لە کارێک.
ڤەکرن: ز. کردنەوەی شت.
ڤەکوشتن: ز. کوژاندنەوەی ئاگر و چرا.
ڤەکووداد: ز. بەرباد.
ڤەکێش: با. کێشان.
ڤەگرتن: با. داگیرکردن.
ڤەگەڕ: کەسێکە کە دوای کارێک کەوتبێ.
ڤەگەڕاندن: با. گێڕانەوە.
ڤەگەڕین: با. گەڕانەوە.
ڤەگەشبوون: با. گەشەکردن و بەخۆداهاتن.
ڤەگەڤزین: ز. پیا هەڵتەقین.
ڤەلا: با. قامچی.
ڤەمراندن: ز. کوژاندنەوەی ئاگر.
ڤەمرتی: ز. ڕەنگ هەڵبزڕکاو.
ڤەمرین: ز. کووژانەوەی ئاگر.
ڤەمستن: ز. هەڵقوڵین.
ڤەنشتن: ز. نیشتنەوە.
ڤەنهراندن: ز. هەستاندن.
ڤەنهرین: ز. هەستان.
ڤەنی: ز. ڤەزوانی شین.
ڤەور: با. بەفر.
ڤەوەژارتن: ز. بژاردنی دانەوێڵە.
ڤەهاتن: ز. شێ هەڵهێنانی دانەوێڵە لە شوێنی نمدار.
ڤێ: ناوە بـۆ پیـتـێک لە بیـست و حەوت پیـتـەی کـوردی. ئەوێ (ز).
ڤیاد: ز. خاکێکە کە زوقم هەڵی تەکاندبێ.
ڤیـان: با. خۆشـەویستی و مـحبت: من تۆ (دەڤی) واتە تۆم خۆش دەوێ.
ڤێخستن: با. هەڵواسین. داگیرساندن.
ڤێرک: ز. پەرگی کەلاش.
ڤێرێ: ز. ئیرە.
ڤێسین: ز. جوێن.
ڤێڤراندن: ز. ڕاکێشان. دەرخستن.
ڤێڤرین: ز. دەرکەوتن. ئاشکرابوون.

**ڤێک:** ز. پێکەوە.
**ڤێک ئێخستن:** ز. کۆکردنەوەی شتی پەراگندە.
**ڤێکدان:** ز. کۆکردنەوەی شت.
**ڤێکەتن:** ز. ڕێکەوتن.
**ڤێل:** ز. نزم.
**ڤێن:** ز. ئارەزوو. داواکردنی شتێک.
**ڤێنی:** ز. ئەوە.
**ڤی:** ز. ئەوە.
**ڤیان:** ز. خۆشەویستی. خواست.
**ڤیژک:** ز. گووی شل.
**ڤیس:** ز. بسیت.
**ڤیل:** ز. جۆرە قاپ و قاجاخێکە.
**ڤین:** ز. داخوازی.

# ق

قاپ: قاپ.

قابلەمە: مەنجەلۆکەیەکە کە سەر و قنگی وەک یەک وابێ.

قابلەمەکردن: گرتنەوەی پشت بە کاڵای کۆندا، گرتنی خشتی سوور بەپانی و لەسەر شان بە ڕووی دیواری خشتی کاڵا.

قابوور: ز. بنەگۆزەی شکاو.

قاپ: دەفری چێشت تێ کردن. قولەپێ. میچ. قەپاڵ. چوار چێوە (د). سەری سەعات: قاپی سەعاتەکە داخە.

قاپ ئاوێژ: قاپاوێژ.

قاپارگە: قولەپێ.

قاپان: د. قاپێن.

قاپانە: قاپێن.

قاپاوێژ: کەسێکە لە ڕۆیشتندا قولەپێی قاچی لە یەک بدا.

قاپچی: د. دەرگەوان.

قاپقاپ: پێڵاوێکی سەرپێیی دارینی بەرزە چەرمێکی باریکی بەسەرەوەیە پێی پێدا دەکرێ.

قاپک: د. ئاوسانی قولەپێ.

قاپکزێنە: گیایەکی بەهاری گەڵا وردە بەکوڵاوی دەخورێ.

قاپگرتن: بریتییە لە بەگژداچوونی یەکێک بەیەکێکدا بەناڕەوا.

قاپلۆخ: د. قاپووڕ.

قاپۆڕ: قەواغی فیشەکی بۆش.

قاپوقاچاخ: بە هەموو جۆرە دەفرێکی ناوماڵ دەوترێ.

قاپووت: سەربەرگێکی زستانی ئەستووری ئاودامانە. فەرەنجی ئاودامان.

قاپووتکردن: بریتییە لە گرتنی سەد و بیست (سایە) لە یاری ئەسکەملدا.

قاپووڕ: شتێکە ناوەکەی دەرهاتبێ و بەبۆشی مابێتەوە.

قاپوولە: قولەپێ.

قاپ هاوێژ: قاپاوێژ.

قاپەڕقە: قولەپێ.

قاپەکەوەلە: هـ. قەیتەران.

قاپێن: یاریکردن بەمیچ.

قاپێوان: قاپیوان.

قاپی: دەرگا.

قاپیوان: کەسێکە کە ئاگاداری قاپی بکا بۆ کردنەوە و داخستنی.

قاپیەوان: قاپیوان.

قات: نهۆمی خانوو: ئەم خانووە دوو یا سێ (قات)ە. توێ: ئەم بۆیەکارییە دوو (قات)ە. باد: ئەم فاسۆنە دوو قاتە واتە دوو بادە. دەستێکی تەواو لە کاڵا یا نوێن: (قات)ێک بەرگم دروست کرد واتە دەستێک. شتێکە کە دەست نەکەوێ: ئیمساڵ برنج (قات)ە.

قاتر: ئێستر.

قاترچی: کەسێکە کە قاتر لێ بخورێ.

قاتغ: ز. شیر و ئەو شتانەی کە لە شیر دروست دەکرێن.

قاتقات: زەمینی تەم تەم.

قاتمە: قانگڵە.

قات و قڕ: کاتێکە کە دانەوێڵەی ساڵی کۆن نەمابێ و هی ساڵی تازەش پێ نەگەیبێ.

قات و قڕی: نەمانی زەخیرە و خواردەمەنی.

قات و قەیماغ: پەڵوولەیەکی چەوری شیرینە بۆ زەیستان دەکرێ. جۆرە پەڵوویەکە دەخرێتە سەربرین و شوێنی بەئێش.

قاتۆڵی: دۆشاوی هەنار.

قاتە: قەڵداسی دارۆجان.

قاتەلێوە: خاکەلێوە.

قاتە و لێوە: قاتەلێوە.

قاتی: ساڵی کووری بێ دەغڵودان. ئاوێتە. قاتی کە، واتە تێکەڵی کە.

قاتی و قڕی: قات و قڕی.

قاچ: پێ . بەرد (ز). بەردێکە کە یاری قاچێنی پێ دەکرێ.

قاچاخ: شتێکە باجی دەوڵەتی بەسەرەوە بێ و لەبەرئەوە بەدزییەوە بفرۆشرێ. گامێشی سێ ساڵانە.

قاچاخچی: کەسێکە کە شتی قاچاخ بکڕێ و بفرۆشێ.

قاچان: مەردوومی جرپنی بزێو. قاپێن.

قاچاندن: دەربازبوون: فیسار کەس (قاچاند)ی واتە دەربازبوو.

قاچاو: شوێنێکی بەرزە کە ئاوی پێوە ڕانەوەستێ.

قاچک: خێزەرە (ز). قارچک.

قاچ و قول: لە ئەژنۆ بەرەوخواری مەردووم.

قاچ و قووچ: دزی بە فڕ و فێڵ، قاچ و قووچ کردن: دزی کردن بە فڕ و فێڵ.

قاچێن: هەڵمەقۆ.

قاچی: قەیچی.

قاچین: د. هەڵپاچین بەقەمچی.

قاخ: د. شتی چەوتاوە.

قاخڵی: کاخڵی.

قادێ: ز. مەیدان.

قار: دەوی فەقێیان (ز).

قین. مووچەیەکە هەموو ڕۆژ بدرێ بەهەژاران.

قارپچۆک: ز. مەردوومی زۆر لاواز.

قارپۆز: د. قەڵپووس.

قارچ: قارچک.

قارچک: شتێکی ناسکی نێرکداری سەرپانی پەرە پەرەیە لە بەهاراندا هەڵ دەتۆقێ لە دار و لە زەوی و لە گیا و دەخورێ.

قارچکە کولانە: قارچکەمارانە.

قارچکەمارانە: جۆرە قارچکێکە ناخورێ.

قاڕاندن: قاڕەکردنی مەڕ و بزن.

قارگە: سەر شار لە یاریدا.

قاڕنان: دەستەیەکە لە یاری (قەلە مرداری)دا کە درەنگ تێ بکەوێ.

قاڕ و قووڕ: قاڕەقاڕی زۆر.

قارۆونە: د. کرمی ناو میوەی وشکەوەبوو.

قاڕە: دەنگی باڕەی بزن و مەڕ، (قاڕەقاڕ) قاڕەی یەک لەدوای یەک.

قاڕێن: یاری قەلە مرداری.

قارژنگ: د. قرژانگ.

قارس: کەسێکە لە شتێک وەڕس بێ: بەدوکەڵی جگەرە (قارس)م. شوێنێکە لە کاڵا کە هەڵ دروابێ بۆ کورتبوونەوەی.

قارسبوون: سەغڵەتبوون.

قارسکردن: سەغڵەتکردنی یەکێک. کورتکردنەوەی کاڵای درێژ بەنوشتاندنەوە و دروونی.

قارقار: ز. دەنگی بەرزی گیاندار.

قارقارۆک: ز. قارپچۆک.

قارنج: د. بابۆڵەپێچ.

قارووشە: ز. گەسکی پووش.

قارۆونە: د. مۆرانە.

قارەمان: مەردوومی جوامێری ئازا.

قارەوانە: قەرەوانە.

قاز: مەلێکی گەورەی مل درێژی دەندووک پانی پێ پەڕەداری مەلەوانە لە مراوی گەورەترە.

قازاخ: جوان. پاک.

قازان: مەنجەڵی گەورە.

قازانج: سوودێکە لە کڕین و فرۆتنەوە دەست بکەوێ. قازانج بە(نیوەیی) کڕین و فرۆختنی دوو کەس یا زیاترە بە سەرمایەی هەردوو لایانەوە بۆ ئەمەی کە قازانج بکەن بە دوو بەش یا زیاتر.

قازانجکردن: دەسکەوتنی قازانج.

قازانچە: مەنجەڵۆکە.

قازانقوڵفی: د. نێر و مێیەکە کە یەخەی پێ دادەخرێ.

قازانگ: قازان.

قازانە سەر: د. مەلێکی چنکداری بەهێزە، سەری مەلی تری پێ هەڵ دەکەنێ.

قازلاخ: د. قازلاخی.

قازلاخی: باڵندەیەکی کێوییە لە چۆلەکە گەورەترە لە سەرەتای بەهاردا دەردەکەوێ.

قازم: ز. بەنێکە کە لە کورک و خوری ڕێسرابێ.

قازمانە: هەڵووژە.

قازمەکی: جۆرێکە لە بەری دارمازوو وەک دەنکە تەزبیح وایە.

قازەوان: شوانی قاز.

قازیاخە: گیایەکی بەهاری گەڵا پانە بەکوڵاوی دەخورێ.

قازی قوڵنگ: د. قوڵنگ.

قاژ: باڵندەیەکە وەک قەلەڕەش بەڵام ئەم گۆشتی دەخورێ. برۆ (ل).

قاژر: د. گرینۆک.

قاژقاژە: کەندەسمە.

قاژوو: قاژ.

قاژە: دەنگی قاژووی زۆر.

قاژە قاژ: قاژەی زۆر. دەنگی کوللە (د).

قاژی: قاژوو.

قاسپە: دەنگی خوێندنی کەو، قاسپە قاسپ: قاسپەی یەک لەدوای یەک.

قاسک: لاسک.
قـاسناخ: دەفـرێکە لە تەختـە دروست دەکرێ و دانەوێڵـەی پێ دەپێورێ.
قـاش: پـارچەیەک لە مـیـوەی بە چەقـۆ لەتکراو. شـەقـەمـێـو. بەردێکی بەنرخە کە لە زێڕ یا لە زیو گیرابێ.
قاشاخ: جۆرە لەوەڕێکە لە کەنگر دەچێ (د). بنجی گەنمەشامییە کە گوڵەکەی لێ کرابێتەوە.
قاشاو: هێنانی پەڕۆی زبری تەڕ بەسەر ئەندامی ولاخی یەکسمدا دوای ڕنەککردنی.
قاشقاش: شتی کووز کووز.
قاشقونجی: ئافرەتی جرپنی بێ شەرم.
قاشکردن: لەتکردنی میوە و هێندێ شتی تر بەقاش.
قاشم: ز. گیایەکی بۆنخۆشە.
قاشنە: جۆرە ماسییەکە پوولەکەی زەردی ڕەقی پێوەیە.
قاشۆ: دارێکە کە یاری (قاشوان)ی پێ دەکرێ. شەقەمێو.
قاشوان: شەقێن.
قاغەز: کاغەز.
قاغەنەک: ل. فرۆ.
قـاف: ناوی پیـتـێکە لە بیـست و حەوت پیـتـەی کـوردی. هەل: لە(قاف)دا گرتم واتە لە هەلدا.
قافقلۆز: ز. قاپ و قاچاخی گڵێن.
قافک: ز. سواڵەت.
قافکردن: گرتنی مەردووم بۆ سەربازی.
قافڵە: کاروان.
قافوو: ز. دارێکە کە لافاو بیهێنێ.
قاڤەرەش: ز. جۆرە کوولەکەیەکی ڕەشباوە.
قاق: د. وشک.
قـاقـا: دەنگی پێکەنینی بەرز. کـاکـە (د). وتەیەکـە منداڵ بەخواردنی دەڵێ (با).
قاقلە جنۆکە: هێلکە شەیتانۆکێ.
قاقلە سۆنە: قاقڵە سوێنە.
قاقڵە سوێنە: قەپانجەرە.
قاقم: سەمووری سپی.
قاقوم: قاقم.
قاقە: د. قاقا.
قـاقـەز: شـتـێکی تەنکی سپی لووسـە لە لۆکـە یا پووش دروست دەکرێ بۆ لێ نووسینی.
قاقیشک: ز. قاژوو.
قاگەز: کاغەز.
قـاڵ: شـتـی پوخت بوو: ئەم ڕۆنە یا ئەم پیـاوە (قـاڵ)ە، واتە پوختە. قوولە (د).

قـالاخ: ز. تەپاڵـەیەکـە لەپاش شـێـلان پان کـرابێـتـەوە بۆ سووتەمەنی.
قالاخی: د. کراسی ڕەش.
قالاخی پۆش: د. ڕەشپۆش.
قالان: ز. شیربایی.
قالانقۆزیلێ: هـ. گوڵێکی زۆر سووری بەهارییە لە گوڵەباخ دەچێ بەڵام ئەم پچووکترە.
قالاو: قەلەڕەش.
قالاوە بووڵێنە: د. قەلەڕەش.
قالایی: د. قەڵایی.
قـاڵب: جەسـتـە. پارچە زەوییـەکە کـە بە بەیار هێڵـرابێتـەوە بۆ داچاندنی مەرەزە. چوارچێـوەیەکـە شـتـی تێدا دابڕێژرێ وەک قاڵبی خشت.
قاڵبوون: پوختبوون و دەرهاتنی مەردووم.
قاڵتاخ: قەڵتاغ.
قاڵدرمە: پێپیلکە.
قاڵس: مەردوومی وەڕس.
قاڵسبوون: وەڕسبوون، قاڵسکردن: وەڕس کردن.
قالسی: سەغڵەتی.
قالک: ز. توێکڵی گوێز و شتی تر. قاوغ.
قاڵکردن: پوختە و زرنگکردنی ڕۆن.
قاڵماسک: قۆچەقانی.
قالۆ: ز. خشتێکە لەسەر ئاگر دادەنرێ و نانی پێ دەبرژێنرێ.
قالۆچە: قالۆنچە.
قالۆر: قاپوور. ساقی گیایەکە کە کلۆر بێ.
قالۆرە: لاسکی چاوبازە.
قـالۆنچـە: دەعـبـایەکی ڕەشی چنگ چنگە گـەلێ جـۆری هەیە، هێندێکیان باڵدار و هێندێکیان بێ باڵن.
قالە: د. باڕەی بزن.
قاڵە: قسەی زۆر لەگەڵ دەنگ بەرزکردنەوەدا: فیسار کەس کردی بە(قـاڵە) یا بە(قـاڵە)ی دەم ترسـانی، (قـاڵە قـاڵ) قـاڵەی یەک لە دوای یەک.
قالە قنگ: د. کالا قنگ.
قاڵی: ژێرەخەرێکی تەنراوی تووکنی بەنرخە.
قاڵیچە: قاڵی پچووک.
قام: مقام.
قامچێ: چەرمێکی هۆنراوەیە لە مەردوومی پێ دەدرێ.
قامک: ئەموست.
قـامـیش: گـیـایەکی ڕەقی ئەسـتـووری قـەفـقـەفی ناو کـولۆری باڵابەرزی گەڵا پانە. بریتییە لە چووکی ئادەمی.

قامیشبەند: ڕیزی قامیشی ڕێکی چنراو.
قامیشەڵان: شوێنێکە کە قامیشی زۆری تێدا ڕوابێ.
قامیشی شەکر: جۆرە قامیشێکە شەکری لێ دروست دەکرێ.
قان: شتێکە کە لە خوێنی یەکێکدا بدرێ. پوویتی توور.
قانتر: ز. ئێستر.
قانچە: گوێسوانە.
قانزاج: قازانج.
قانزاج بەنیوەیی: قازانج بەنیوەیی.
قانزاجکردن: قازانجکردن.
قانگ: خەربەنگ (د). پوویتی توور.
قانگدان: دوکەڵ کردن بەگژ شتێکدا. جارێک یاریکردنەوە لەگەڵ کەسێکدا کە دۆڕاندبێتی.
قـانگڵە: بەن و دەزوویەکە لەسـەر پەنجـە گەورە و پەنجـە تووتەی دەست هەڵکرا بێ. دارێکی لووتدارە باخـەوان لقی درەخـتـی بەرداری پێ ڕادەکێشێتە خوارەوە.
قـانگە: خـەندەق دانەوەی دیوار و شـتی تر. قـانگەی خـانۆکـەی داوەتەوە.
قانگەڵە: قانگڵە.
قانە: قەدێکی قوماشە لە قەدی کارخانەی. یارد (د).
قاو: پووشوو. دەنگوباسێکە کە بڵاوبووبێتەوە.
قاوتاندن: ز. قاودان.
قاو داخستن: بڵاوکردنەوەی دەنگوباسێک.
قاودان: دەرکردن.
قاوکردن: بانگکردن بەدەنگی بەرز.
قاولەمە: د. قابلەمە
قاووت: ئاردی دانەوێڵەی برژاو.
قاووڕ: قاپووڕ.
قاوورمە: گۆشتی سوورەوەکراو بۆ هەڵگرتن.
قاووغ: قاپووڕ.
قاو و قریشک: قیژ و هووڕ و دەنگەدەنگ.
قاو و قوو: د. قاوەقاو.
قاو و قیژ: قاو و قریشک.
قـاوە: بەری گـیـایەکی گـەرمیـانییـە دەنکی خڕ و سەوزە لە دوای برژاندن و کوتانی لێ دەنرێ بۆ خواردنەوە.
قاوەبرێژ: د. دەفرێکی تایبەتییە قاوەی تێدا دەبرژێنرێ.
قاوەتوون: قاوەلتی.
قاوەتی: نانخواردنی نیوەڕوان.
قاوەجاخ: شوێنێکە کە قاوەی تێدا لێ بنرێ.
قاوەجۆش: گومگومەی قاوە.
قاوەچی: کەسێکە کە هەر قاوە لێ بنێ.
قاوەخانە: شوێنێکە کە قاوەی لێنراوی تێدا بفرۆشرێ.
قاوەدان: تێکردنی قاوە بۆ خواردنەوەی.
قاوەسینی: سینیەکی تایبەتییە قاوەی لەسەر دەگێڕدرێ.
قاوەقاو: بانگە بانگ.
قاوەڵتوون: قاوەڵتی.
قاوەڵتی: قاوەتی.
قاوەیی: شتێکە کە ڕەنگی لە ڕەنگی قاوەی برژاو بچێ.
قای: ز. پیتی پرسیار.
قایخ: جۆرە بەلەمێکە لە ئاودا پێی دەپەڕنەوە.
قایخەوان: کەسێکە قایخ لێ بخوڕێ.
قایغ: قایخ.
قایغەوان: قایخەوان.
قایش: چەرمی خۆشکراوی ڕەنگکراوی گوێرەکە و پارێن.
قایم: شتی بەهێز.
قایمکار:کەسێکە کە شت قایم و باش هەڵگرێ.
قـایمکردن: توندکـردنی شت. شـاردنەوەی شت: شـتـەکـانت(قـایم کە).
قایم نوێژ: کەسێکە نوێژی نەچێ.
قـایمە: خـۆکـۆکـردنەوە و ئامـادەبوون بۆ شـتـێـک: فـیـسـار کـەس خـەریـکی (قـایمە)یە. کـاتی تەنگانە: زەخـیـرەکـە هەڵگرە بۆ (قایمە). زۆربەی شت: (قایمە)ی لە شەکرەکە هاتووە. یاساو دەسـتـوورێکە لە یاری دامـە و شـەترەنجـدا کـە هیـچ لایەک نەیبەنەوە.
قایمەکاری: هەڵگرتن و قایمکردنی شت.
قایمەکردن: قایمەکاری.
قایمی: توندی و بەهێزی شت.
قبراخ: یەکێکە کە بکەوێتە ناوەندی دوو کەسەوە بۆ یەکخستنیان (واسطە).
قت: فت: لە یاری گـۆرەوی بازیدا دەوترێ لـەم گـۆرەوییـە (قت)، (قتبوون) فتبوون لە یاریدا، (قتکردن) فتکردن لە یاریدا.
قتاو: د. کتێب.
قتاوخانە: د. قوتابخانە.
قتوفت: د. جووڵەجووڵ.
قـجی: گـیـایەکی گـەڵا وردی هەمـیـشـەییـیـە لە قـەد شـاخی نمدار دەڕوێ، بنجەکەی زۆر بەکەڵکە بۆ ژانی (لێهاتن).
قجیلک: پەنجە تووتە.
قجیلە: جۆرە کوللەیەکە.
قخ: وتەیەکـە منداڵی سـاوای پێ دەگـێـڕدرێتـەوە لە دەستـبـردن بۆ شتی پیس.
قخخە: قخە.

قخه: قخ.
قده قد: قرتەقرتی مریشک.
قدیلکانی: خووتووکه دان.
قدیلکه: قدیلکانی.
قدیک: ز. دڵتەنگبوونی مەردووم.
قدیله: قدیلکه.
قر: ز. زوقم.
قراج: ز. زەوییەکه گیای تێدا نەڕوابێ یا تێیدا ڕوابێ و ئاژاڵ خواردبێتی.
قراقر: ز. قڕەقڕ.
قراش: د. قاشی شت، قراش قراش: شتی قاش قاش.
قربووز: ز. کەسێکه که ڕیشی ماش و برنج بووبێ.
قـڕپ: تالاّن، (قـڕپکردن) تالاّنکردن. خـەرجکردنی پاره و بەکارهێنانی خواردەمەنی زیاد له ئەندازه: فیسارە ژن دەستی بەقـڕپه. قـڕقـێنه. دەسکەنه کـردن (د). لق و پۆپکردنی دار (د). قرمەی داری شکاو (د).
قرپاندن: هەڵپاچین.
قرپنه: خرپنه.
قرپۆک: مێوژی وشکەڵ. قرپۆق.
قرپۆڵ: مێوژی وشکەڵ.
قرپه: د. دەنگی شکانی دار.
قرپێنه:قرقێنه.
قرت: د. مەردوومی جلّفن.
قرتاڵه: قەرتاڵه.
قرتان: پچڕانی شت بەهۆی لێکەوتنی شتێکەوه.
قرتاندن: بڕینی شت بەقەیچی یا بەشتێکی تر. شکاندنی قەزوان و دەنکه کـوولەکـه به ددان بۆ دەرهێنـانی نـاوکـەکـەی. قرتەقرتکردنی مریشک.
قرتانن: د. قرتاندن.
قرتکردن: بڕینی شتێک بەخشتی وەک مووی ئەگریجه و سەر. قرخکردنی موو (د).
قرتکه: د. پارچەیەکی پچووکه له شتی قرتاو.
قرتماخه: د. قەتماغه.
قـرته: دەنگی مـریشکه بەکـڕ. جـۆره دەنگێکه وەک دەنگی داخسـتنی قـرتێنه، (قـرتەقـرت) قـرتەی یەک لەدوای یەک، (قرت و هووڕ) قرته قرتی زۆر.
قرته لێبڕین: بڕیتییه له نەهێشتنی شتێک: وڵاّخەکه (قرتەی له ئالیکەکه بڕی).
قرتیان: د. قرتان.
قرتێنکه: قرتێنه. ئاوەخۆرەی مریشک و کـەڵەشێر که له کاتی سەربڕیندا چەقۆی پێدا دەهێنرێ.
قرتـێنه: دوگمـەیەکی نێـر و مێـیه، دەچێ بەیەکدا و قـرتەی لێوه دێ. شتێکی ڕەقی تەنکه له ڕەگی وشکەوەبوو یا ئێسقان که قەڵەمی قامیشی لەسەر ڕێک دەکرێ.
قرتیل: پاشا خوڕ.
قـرچ: لێـدانی تیلکەری دووەم له دەسکەلای تیلکەری یەکـەم له یاری (مـووشێن)دا کـاتێ که یەکەم مـووشی نەخواردبێ. چرچ (د). ڕۆنی قرچاو.
قرچاندن: داخکردنی ڕۆن لەسەر ئاگر.
قرچانن: د. قرچاندن.
قرچاننەوه: برژاندنەوەی برین.
قرچاو: ڕۆنێکه لەسەر ئاگر داخ کرابێ.
قرچ و برێژ: د. قرچ و هووڕێ شت لەسەر ئاگر.
قـرچۆک: دار و بەن و دەزووی نـاقـایم. مـەردوومی چرووکی پیسکه.
قرچۆڵ: شتی وشکەوەبووی چرچ بوو.
قرچۆڵه: د. قرچۆڵ.
قـرچه: دەنگێکه وەک دەنگی شکاندنی دار و برژاندنی برێشکه لەسەر ئاگر، (قرچەقرچ) قرچەی یەک لەدوای یەک، (قرچ و هووڕ) قرچه قرچی زۆر. گەنم و جۆی درواوه.
قرچەشکێن: پەلخوردبوونی کرشەی خەرمان بەگێره.
قرچ هەڵاّتن: چرچ هەڵاّتن.
قرچیان: د. هەڵقرچان.
قرح: ز. نەنگی هەموو شتێک.
قـرخ: گـۆزه و کـووپەیەکـه لەبەر ئـاو زۆرتێکردنی لووس بووبێ. تووکی سەر و ڕیشێکه که زۆر کورت کرابێتەوه. مەردوومی لەڕ و لاوازی قرچۆڵ. ئاوی وێستاوی لیخن.
قرخاندن: قرخەکردن.
قرخکردن: له بنەکۆتەرەدانی مووی ئەندام.
قرخن: گیاندارێکه که زۆر بقرخێنێ. قرخ (د).
قرخنه: قرخن.
قرخۆڵ: د. قرخن.
قرخۆڵه:د. قرخن.
قـرخـه: دەنگێکه له گـەرووی گـیـاندارەوه دێ له کـاتێکدا کـه شتێکی تێ گیرابێ، (قرخه قـرخ) قرخەی یەک لەدوای یەک، (قرخ و هووڕ) قرخەقرخی زۆر.
قرخەمەرەسی: ڕاکێشانی یەکێک بەزۆر و له دوو نەچوونی.
قردێله: تیلمه تەنراوێکی جوانه کچـان دەیدەن له مـووی سەریان دوای داهێنانی بۆ ئەوەی تێک نەچێ.
قڕ: مەرگی تێکڕایی.
قڕاک: قەلەڕەش.

قڕاکە: باڵندەیەکی سەوزە بەقەد (قژاکە) یەک دەبێ.
قڕاڵێ: هـ. گوێزێکی پووچەڵە کە بەدارەوەبێ.
قڕان: ناوە بۆ جۆرە دراوێکی زیوین. قڕبوون.
قڕاندن: قڕەکردنی قەلەڕەش. بریتییە لە نوقلآنەی خراپ: بۆمان مەقڕێنە واتە نوقلآنەی خراپمان بۆ لێ مەدە.
قڕانن: د. قڕاندن.
قڕباق: قڕبۆق.
قڕبۆق: بۆق.
قڕبوون: مردنی گیاندار بەکۆمەڵی و زۆری.
قڕپۆک: قڕپۆک. قڕبۆق.
قڕپۆڵ: قڕپۆڵ.
قڕ تێخستن: کوشتاری تێکڕایی.
قڕتێکەفتن: قڕ تێکەوتن.
قڕتێکەوتن: قڕ کەوتنە ناو گیاندارەوە.
قڕقڕۆک: قووڕقووڕاگە.
قڕقڕە: کندری بەکرە. چەرخی پچووک.
قـڕقـێنە: بـایەکـە لە دەروونەوە هەڵ دەقـوڵێ و بەدەنگەوە لە دەم دێتە دەرەوە.
قڕک: ز. قوڕگ.
قڕکردن: قڕ تێخستن.
قڕناتە: پارچەیەکە لە پارچەی مۆزیقە.
قڕنوو: گەنە.
قڕنە: قڕنوو.
قڕنی: قڕنوو.
قڕواق: بۆق.
قڕ و قەپ: بێ دەنگی و قسە نەکردن.
قڕ و قـەپۆز: وتەیەکـە لە ڕووی سووکـییـەوە دەوترێ بەدەم و پلی یەکێکی ناشیرین.
قڕ و نیـمقڕ: کالآیـەکە ژنان دەیپۆشن چین چینە و هەر چینەی لە جۆرێکە.
قڕە: هەرا و دەنگەدەنگ.
دەنگی قـەل و بۆق، (قڕەقڕ) قڕەی یەک لەدوای یەک. دواهەمین کەس کە سەرەی پێیە سەر.
قڕهاتن: قڕ تێکەوتن.
قڕێژ: با. کرێش.
قرژاڵ: دەعبایەکی ئاوی چنگ چنگی ڕەقی دوو سەرە.
قرژانگ: قرژاڵ.
قرژە: جۆرێکە لە بەری دارمازوو دەباخی پێ دەدرێ.
قرسان: تەخمین.
قرساندن: ز. ترنجاندنی شتێک لە ناو شتێکی تردا.
قـرش: ز. پـووشی هەڵـوەریو. لق و پۆپی درەخت کـە لە خـۆیەوە هەڵوەریبێ.
قرشە: کرشە.
قرقرتۆک: کرکراگە.
قرک: ز. قورک. قەلەڕەش.
قرم: د. مرخ: (قرم)ی لێ خۆش کردووە.
قرماندن: خوڕین بەدەنگی بەرز لە یەکێک: تێی قرماند.
قرمز: ئاڵ.
قرمزی: شتێکە کە ڕەنگی قرمز بێ.
قرمژن: دەنگی تەق و هووڕی چەک بەزۆری.
قـرمـە: دەنـگێکە وەک دەنگی شکـانی داری گـەورە بەگـردەبڕی، قــرمـــەقــرم: قــرمـــەی یەک لەدوای یەک، (قــرم و هـووڕ) قەرمەقرمی زۆر.
قرمچی: با. شتێکە کە سیس بووبێ.
قرنجان: رووشان و برینداربوونی شت.
قرنجاندن: ڕووشاندن و بریندارکردنی شت.
قرنجانن: قرنجاندن.
قرنگە: دەنگێکە وەک دەنگی (خرنگە)، (قرنگەقرنگ) قرنگەی یەک لەدوای یەک، (قرنگ و هووڕ) قرنگەقرنگی زۆر.
قرپیک: با. سێ شەشی بەهار.
قرێژ: چڵک. شتی چڵکن (ز).
قرێژاهی: ز. قرێژ.
قــریشکە: دەنـگێکە لە قـیــژە گـەورەتر، (قـریشکەقـریشک) قـریشکەی یەک لەدوای یەک، (قـریشـک و هووڕ) قـریشکە قریشکی زۆر.
قرێن: ز. جەنگ و دەمقاڵێ.
قریواندن: قریوەکردن.
قریوانن: قریواندن.
قریوە: دەنگێکی بـەرزە کە لە خۆشـییەوە پەیا ببێ، (قریوەقریو) قریوەی یەک لەدوای یەک.
قریوەکردن: قریواندن.
قزگە: شوێنێکە یەکەمجار گۆی (شەقێن)ی لێ دادەنێن و بەدار لێی دەدەن.
قزە: ترسنۆک. ژنانی.
قژ: مووی درێژی سەر. کەفی شت (د).
قـژاکـە: بـاڵـندەیەکی دەنوک درێژی سـەر ڕەشی بەرسنگ سـپـیـیـە بەقەد کۆترە باریکەیەک دەبێ.
قژاڵکە: قژاکە.
قژبەسەرە: بریتییە لە ئافرەت.
قژقژ: شتێکە لق و چڵی زۆری لێ بووبێتەوە.

قژقژاوی: قژقژ.
قژقژۆکە: شتی قژقژاوی.
قژقژە: جۆرێکە لە بەری دارمازوو و، قژقژاوییە.
قژگ: ز. قەلەباچکە.
قژکردن: د. ترشانی دۆ و کەفکردنی.
قژکە: قژقژە.
قژگە: قژقژە.
قژلاندن: ز. تواندنەوەی ڕۆن
قژن: کەسێکە کە قژی بەسەرەوەبێ.
قژنەسەر: سەر قژن.
قژە: د. کەف.
قژەسەر: قژێکە کە لە سەر بووبێتەوە.
قژە کردن: د. ترشانی شت.
قژیاک: ز. قەلەڕەش.
قسر: مێینەیەکە کە سالێک بەبێ ئاوسی مابێتەوە. شتی بێ بەر (د).
قسکل: د. جۆرێکە لە بەری دارمازوو.
قسل: شتێکی تیژی سووتێنەری سپییە لە سووتاندنی جۆرە بەردێک پەیدا دەبێ.
قسن: کەلەکەبەردێکە کە بەگردی گۆڕێکدا کرابێ.
قسنی: شتێکی ڕەشباوە، وەک مێوی هەنگوین بۆنێکی خۆشی هەیە.
قسە: گفتوگۆ.
قسەبردن: گێڕانەوەی قسەی یەکێک بۆ یەکێکی تر.
قسەبڕین: بڕینی قسە لەناوقەددا بەیەکێک.
قسەبڕینەوە: دەنگ دابڕینی یەکێک لەگەل یەکێکی تردا لەبەر زوویربوونی لێی.
قسەبەر: کەسێکە کە قسەی یەکێک ببا بۆ یەکێکی تر.
قسە بەسەر قسە داهێنانەوە: گوڕێزکردن لە قسەدا بۆ سەر قسەیەکی تر. قسەبڕین بەیەکێک.
قسە تال: کەسێکە قسەی ناخۆش بێ.
قسەخواردنەوە: قوتدانەوەی قسە و نەکردنی لەبەر شتێک.
قسەخۆش: کەسێکە گفتوگۆی خۆش بێ.
قسەدابڕین: دەنگ دابڕین.
قسەدروست: کەسێکە کە قسەی ڕێکوپێک بێ و درۆی تێدا نەبێ.
قسەدۆڕاندن: دەربڕینی قسەیەکی نەهێنی. شکانی قسەی یەکێک لای یەکێک.
قسە دەرهاوردن: قسە دەرهێنان.
قسە دەرهێنان: دەرهێنانی قسەیەکی پەنهانی لە یەکێک بەفێل.
قسەڕاست: کەسێکە لە قسەیدا ڕاست بێ.
قسەڕەق: کەسێکە کە قسەی قورس و ناخۆش بێ لەگەل مەردوومدا.
قسە ڕەوا: کەسێکە لەناو کۆمەلەدا قسەی بڕ بکا.
قسەڕەوان: کەسێکە لە قسەدا دانەمێنی.
قسەزان: کەسێکە لە شوێنی خۆیدا بزانێ قسە بکا.
قسەزل: کەسێکە کە قسەی لە خۆی زلتر بێ.
قسەسارد: بریتییە لە کەسێک کە قسەی خۆش نەبێ.
قسەشکاندن: بەقسە نەکردنی یەکێک و لە فەرمان دەرچوونی.
قسەقوت: قسە نەستەق.
قسە قووتدانەوە: قسەخواردنەوە.
قسەکردن: گفتوگۆ کردن لەگەل یەکێکدا.
قسەکەر: کەسێکە گفتوگۆ بکا.
قسە گێڕانەوە: گێڕانەوەی قسەی یەکێک بۆ یەکێکی تر.
قسە لە ڕوو: کەسێکە کە هەموو قسەیەک لە ڕووی مەردوومدا بکا با دلگیریش ببێ.
قسە لەسەر داکێشان: قسە دەرهێنان لە یەکێک بە فێل.
قسە لێ کردن: دوان لە بابەت شتێکەوە.
قسە نەستەق: کەسێکە کە قسەی خۆش و قوت بێ.
قسە و باس: دەنگوباس.
قسەوەرگرتن: لە گوێ گرتنی قسەی یەکێک.
قسە هەلبەست: کەسێکە قسەی درۆ هەلبەستێ.
قسە هەلبەستن: ڕێکخستنی قسەی درۆ.
قسەهێنان: هێنانی قسەی یەکێک بۆ یەکێکی تر.
قسەی نەستەق: قسەی بەرزی بەکەلک.
قشپل: پشقل.
قشت: قشتیلانە.
قشتیلانە: شتی پچکۆلانەی جوانکیلە.
قشتیلە: قشتیلانە.
قشقەڕە: قەلەباچکە.
قشکە: جۆرێکە لە بەری دارمازوو قژقژاوییە.
قشلاخ: هەواری زستانەی دەوارنشین. ناوی دێیەکە لە جوانڕۆ.
قفل: ئاسنێکە دوای ئەلقەڕێزکردن دەدرێ لە دوولای دەرگا و سندوق بۆ قایمی و بەکلیل هەلدەگیرێ.
قفلدان: داخستنی دەرگا و سندوق بەقفل.
قفە: کۆکە.
قفین: کۆکین.
قل: دەنک: قلێک ترێ واتە دەنکێک.
قلاخ: کۆگای تەپالە.
قلاشتن: قلیشاندنی شت.

قلاشکەری: داری وشکی زەنگە قڵیشە.
قلاق: ل. قەلەڕەش.
قڵپاندنەوە: قڵپکردنەوە.
قڵپبوونەوە: ڕژان و دەمەوخواربوونەوەی شت.
قڵپکردنەوە: ڕژاندن و دەمە و خوارکردنەوەی شت.
قڵپ و قۆپ: دەنگی هێڵنج لەکاتی ڕشانەوەدا.
قڵپە: دەنگی ڕژانی شت بەزۆری، (قڵپەقڵپ) قڵپەی یەک لە دوای یەک، (قڵپ و هووڕ) قڵپەقڵپی زۆر.
قڵخ: ز. برنگ.
قلغ: د. ڕێخت و سوروشت.
قلقل: ل. بەری گیایەکە لە نیسک دەچێ بەبرێشکەیی دەخورێ.
قلکە جەوت: کلاوە بەڕوو.
قڵمبوونەوە: د. قڵپبوونەوە .
قڵمە: د. قڵپە.
قلە: گەشی ئاگری پشکۆ کە خاڵی ڕەشی تێدا نەمێنێ: ئاگرەکە (قلە)ی دێ، (قلەقل) قلەی ئاگر بەزۆری.
قلیان: قەنگە.
قلیان ئاوی: نێرگەلە.
قلیاناوی: قلیان ئاوی.
قڵیانخۆر: کەسێکە کە قلیان بکێشێ.
قلیاندار: کەسێکە هەر قلیان تێ بکا بۆ یەکێکی تر.
قلیان دێمی: د. قەنگە.
قلیانکێش: قلیانخۆر.
قڵیاو: د. قلیە.
قلێ بلێ: قلی و بلی.
قلیچکە: هـ. کلک.
قلێچە: گیایەکی بەهاری گەڵا وردە گوڵێکی زەرد دەردەکا.
قـڵـێـزەنگیـسی: جـۆرە چێـشـتـێکە لە برنج و هەڵـووژە دروست دەکرێ.
قلێل: ز. کونی هەموو شتێک.
قلێنچک: کلێنچکە.
قلێنچک: د. برای تووتە.
قلێنچکە: د. قلینچک.
قڵیە: گیایەکی تیژە سابوونی پێ دەکرێ. قڵێزەنگی (د).
قلینج: پەنجە تووتە.
قلینچک: قلینج.
قڵیش: درزی گەورەی شت.
قڵیشان: درزبردنی شت.
قڵیشاندن: لەتکردنی دار و شتی تر بەتیغ.
قڵیشاندنەوە: درز تێکردنی شت بەتیغ.
قلیشانەوە: دەم دانەوە و درز تێبوونی شت.
قڵیشاو: شتێکە کە قڵیشی تێ بووبێ.
قلیشاوە: قڵیشاو.
قڵیشبردن: قڵیشان.
قڵیف: د. کێلان.
قلیک: ز. داخستنی شمشێرەی دەرگا.
قلی و بلی: قسە یا نووسینی بێ مەعنای شڕم بڕم.
قم: قوم.
قمار: قومار.
قمارباز: قومارباز.
قمباو: بەسەرداکشانی ئاوە بەزۆری بەسەر کشتوکاڵدا.
قمقۆک: ز. قومقمۆکە.
قمقمۆکە: قومقمۆکە.
قملاخ: خمخۆرکی زەوی.
قمیش: قومووش.
قنج: شتی قیت. شتی چاک (با).
قنجبوونەوە: قوتبوونەوە.
قنجکردنەوە: قوتکردنەوە.
قنجە قنج: قوتەقوتکردن.
قنچک: لاسکی میوە و هێندێ سەوزی. کلێنچکە (د).
قنچکان: د. چیچکان.
قنچکە: زیپکە.
قنچکەسلاو: د. سیچکەسلاوە.
قنچکەسلاوە: قنچکەسلاو.
قنچکەکرد: دانیشتن بەچیچکانەوە.
قنک: ز. کولانەی مریشک.
قنگ: کونێکە لە ناوەندی هەر دوو سمتی گیانداردا پیسی لێوە دەکا.
قنگانیسک: د. ئانیشک.
قنگاو: ئاوێکە کە لە خوار کشتوکاڵەوە دەربچێ.
قنگاوڵە: گیـایەکی بەهارییـە کەمـێک بەرز دەبێـتـەوە گەڵای لە گەڵای بی دەچێ و ڕەوانە.
قنچکاو: د. قنچکی چاو.
قنگدانەوە: بریتییە لە دانیشتنێکی کەم.
قنگدەر: بریتییە لە مەردوومی حیز.
قنگر: کنگر.
قنگرپاچ: بنجی کنگر.
قنگرتن: بریتـییـە لە دانیـشـتنی منداڵی شیـرەخۆرە لەسـەر قنگ یەکەمجار.
قنگرواچ: قنگرپاچ.

قنگرەزا: د. جۆرە جەوییەکە لە کنگر پەیدا دەبێ.
قنگلاشک: بنجە درکی کنگری وشکەوەبوو.
قنگ لێ کەوتوو: بریتییە لە مەردوومی بێ هۆش و گۆش کە هەمیشە شتی لێ بکەوێ.
قنگەبان: بانی خانوو لە پشتەوە کە لە زەوییەوە نزم بێ.
قنگەجنۆکە: بریتییە لە شوێنی زۆر تەسک و تروسک و تەنگەبەر.
قنگەجووڕێ: قنگ قووچاندنی گیاندار بەهۆی زۆر گوو هاتنی یا هێلکە کردنیەوە.
قنگەخشکێ: لەسەر قنگ خۆخشاندن.
قنگەخلیسکێ: لەسەر قنگ هاتنە خوارەوە لە شوێنی سەرە و لێژەوە.
قنگە خورۆکە: نەخۆشییەکە لە هێندێ گیانداردا قنگی دێتە خوروو.
قنگەخەو: نووستن بەقنگەوە.
قنگەزە: د. پشتی هۆز: فیسار کەس لە قنگەزەی بابانە، واتە لەو نەژادەیە.
قنگەسووتەکە: دەردێکە دووچاری منداڵی ساوا و مەرەزەی کۆرپە دەبێ.
قنگەسووتەکێ: قنگە سووتەکە.
قنگەشەڕ: شەڕکردن لەگەڵ پێ دزکێدا پاشەوپاش.
قنگەقنگ: بریتییە لە دواخستنی کار بۆ نەکردنی: فیسار کەس لەم کارەدا (قنگەقنگ) دەکات.
قنگەگاز: برینێکە لەسەر کولۆکی وڵاخ پەیدا دەبێ بەهۆی گرتنی بار یا زین یا کۆپانەوە.
قنگەلاشک: قنگلاشک.
قنگەڵتس: قنگدانەوەیەکی کەم بەچیچکانەوە.
قنگەڵفس: قنگەڵتس.
قنگەنشینکە: منداڵێکە کە تازە فێری دانیشتن بووبێ لەسەر قنگ.
قنگەنشینە: قنگەنشینکە.
قنگە و تلوور: پاڵکەوتن بەجۆرێک کە قنگ دەرپەڕێ.
قنگ هەڵتەکێنە: د. کلک هەڵسەنگێنە.
قنیات: داکەوتن بەبەشی کەم، قنیاتکردن: داکەوتن بەبەشی کەم.
قوبا: ز. ماستی بزرکاو.
قوبکە: د. گومەز. لوتکەی شاخ.
قوبوولکردن: پەسندکردن.
قوبوولی: چێشتێکە وەک پلاو بەلام ئەم ناپاڵێورێ.
قۆپ: ز. کەسێکە دەستی یا قاچی شلەپەتە بێ.

قوپان: چاڵبوون و بەناوداچوونی هێندێ شت بەهۆی نهێمێکەوە.
قوپاندن: چاڵکردن و بەناودابردنی هێندێ شت بەنهێم.
قوپاو: شتێکە چاڵ بووبێ و بەناوداچووبێ.
قۆپچە: شتێکی پچکۆلانەی گردە بەیەخەدا دادەدروێ بۆ داخستن. جۆرێکە لە بەری دارمازوو.
قۆپز: د. هاشە و هووشە.
قوپکە: د. قوبکە.
قوپۆز: قەپۆز (د). گرێیەکە لە ناوەڕاستی نیلی جووتدا.
قوپەن: چەند بنجە سەوزییەکە لەناو پەڵەیەکدا، کە بەرزتر و بەهێزتر بێ لە دەوروبەرەکەی.
قوپیان: د. قوپان.
قۆپی: جێگایەکە ئاوی تێدا وەستا بێ و گیای لێ ڕوابێ. ناوی شوێنێکی فێنکە لە شاخی قەرەداخ.
قوت: شتی قنج و قیت. شتی کورت (ز). هەرزە و بێ ژێر (د). قۆتێن.
قوتابخانە: جێگای دەرس خوێندنی قوتابی.
قوتابی: منداڵێکە چووبێتە بەر خوێندن.
قوتار: ڕزگار، (قوتاربوون) ڕزگاربوون، (قوتارکردن) ڕزگار کردن. چەند ولاخێکە بەر و دوا بەرێدا بڕۆن.
قوتاسە: خشڵی زیوینی ژنانە.
قوتان: ز. کوتان.
قۆتان: هەرزاڵ.
قوتاوی: قوتابی.
قوتایی: شوێنی قوت لە زەوی.
قوتبوونەوە: قنجبوونەوە.
قۆتر: وڵاخی پیری پەککەوتە.
قوتومەپا: ھ. قولەپێ.
قوتحە: د. شتی زۆر چاک.
قوتفین: ز. سڕبوون لە سەرماندا.
قوتک: با. سوخمە.
قوت کردنەوە: قنج کردنەوە.
قوتکە: سەر لووتی شاخ و شوێنی بەرز.
قوتم: ز. کورتمە دارێکە کە لە زەویدا مابێتەوە دوای بڕینی.
قوتوو: شتێکی بۆشی سەرقاپدارە لە تەنەکە یا شتی تر دروست دەکرێ و شتی تێ دەکرێ.
قوتوولە: قووتوویەکی تەنەکەیە نەوتی تێ دەکرێ و پلیتەی تێ هەڵ دەکێشرێ و دادەگیرسێنرێ.
قوتە: د. قوتابی. مەردوومی قوت.
قوتەرە: کۆتەرە. دۆڵیانی ئاش.
قوتە قوت: قنجە قنج و هەڵپەڕ و داپەڕ.

قوتەک: ز. کالآیەکی کورتە لەسەر کراسەوە لەبەر دەکرێ.
قوتی: قوتوو.
قۆتی: قۆتین.
قوتیلە: قوتوولە.
قۆتین: سەری ڕووت، فیسار کەس سەری (قۆتین)ە.
قۆجە: د. جاوین.
قۆچ: قـوربانی. پرتاوی دوو سـوارە بۆ ئەوەی یەکـتـری بەجێ بهێڵن: ئەو دوو سوارە (قۆچ) دەکەن. تەڵەیەکە کە دڕندەی پێ بگیرێ (ز). شاخی گیاندار: شەڕەقۆچ.
قۆچاخ: مەردوومی خێرا.
قـۆچان: پسـوولەیەکـە لە دەوڵەتەوە بدرێ بەیەکـێک بەرامـبـەر بەباجێک.
قۆچبە هدر: گیایەکە بنکێکی ڕەوانی هەیە.
قۆچ تێهەڵدان: شوق تێهەڵدان.
قۆچدار: گیانداری شاخدار.
قۆچدان: قۆچ وەشاندن.
قۆچ قۆچانێ: شەڕە قۆچ.
قـۆچک: جـۆرە قـۆچکەیەکی ڕەشی چنراوە بەئاوریشـمی سـوور، ژنانی بلّباس دەیکەنە سەریان.
قـۆچکە: جـۆرە لەچکێکە دەکـرێ بەسـەری منداڵی سـاوادا. دەسماڵی سەری ژنان.
قۆچکەتاش: قۆچی تاش.
قۆچکە سۆرانی: د. فەقیانە.
قۆچ لێدان: قۆچ وەشاندن.
قۆچ وەشاندن: شۆق وەشاندن.
قۆچ وەشێن: شۆق وەشێن.
قۆچ هاویشتن: شۆق هاویشتن.
قـۆچەقـانی: شـتـێکی دوو لیـسـپی هۆنراوەیە لە بەن یا دەزوو دروست دەکـرێ، ناوەڕاسـتـەکـەی تۆزێک پانە بەردی پێ دەهاوێژرێ.
قـۆچیـتـاش: ڕێکخـسـتنی مـووی پێـشی ناوچەوان بەگـوێزان بۆ جوانی.
قۆخ: میوەیەکی خڕی مزری تووکنی سپاتی ناوک ڕەقە لە قەیسی گەورەترە. قۆختە. شتی چەماوە. (د) زیخ.
قۆختە: ژوورێکی پچووکی نزمە لەناو باخدا دەکرێ بۆ باخەوان.
قۆخدان: د. چەمانەوە.
قۆخڵ: خانووی پچکۆلانە.
قۆخە: کۆکە، (قۆخەقۆخ) کۆکە کۆک.
قۆدک: با. ئاوێنە.
قۆدی: قوتوو.
قۆدیلە: قوتیلە.
قۆر:ز. گیانداری لاواز.
قورئان: ئەو کتێبەیە کە بەسروش بۆ پێغەمبەری ئیسلام هاتووە.
قورئان خواردن: سوێندخواردن بەقورئان.
قورئان دان: سوێندانی یەکێک بەقورئان.
قورافتن: ز. ڕنینی ترێ و بڕینی گوڵی دانەوێڵە.
قـوربان: سـەرگـەرد. وتەیەکـە لە ڕووی گـەورەییـیـەوە دەوترێ بەو کەسەی کە قسەی لەگەڵ دەکەیت.
قوربانی: مەڕ و بزن یا حوشـتـر و گایە کە لە چوار ڕۆژەی جەژنی قورباندا سەر ببڕێ بەناوی قۆچەوە.
قـوربـانیـکردن: سـەربڕدرینی قـوربـانی لە چوار ڕۆژەی جـەژنی قورباندا بەناوی قۆچەوە.
قورپ: قرقێنە. هێڵنج (د).
قـۆرت: چەوتی و گـێـڕی لە هەمـوو شـتـێکدا، (قـۆرت قـۆرت) شـتـێکە کە قـۆرتی زۆری تێـدا بێ. چەپاڵەی ڕۆزگار: یاخوا هەرگیز قۆرت نەیەتە بەرت. چاڵ.
قورتاندن: هەڵقرچاندنی لچ.
قورتانن: د. قورتاندن.
قۆرتقۆرتاوی: شتی لق لق.
قورتم: قوڕقوڕاگە.
قۆرتم: د. قورتم.
قۆرتی: با. گۆترە.
قۆرچ: ز. توێکلی سەوزی فەریکە گوێز.
قورچمین: هەڵپچڕکاندنی گیا.
قورخ: ز. ئەستێرەی گەلاوێژ.
قۆرخ: قەدەغە، (قۆرخکردن) قەدەغەکردن.
قۆرخانە: گەنجینەی چەک.
قۆردوون: زریزەیەکە دەکرێتە سەعات و دەکرێ بە بەرۆکدا.
قوڕ: گڵێکە بە ئاو شل بووبێتەوە.
قۆڕ: کەسێکە کە ڕیخۆڵەی ڕژابێتە ناو گونیەوە. زەنگی گەورەی ملی پێشەنگ. بریتییە لە شتی هیچ و پووچ.
قوڕاچکە: د. قورقوڕاچکە.
قوڕاد: بەربەسێڵ.
قوڕادە: گـیـایەکی کـێوی توونی بەهارییـە وەک کـەوەر وایە دەکرێ بەکـەلانە. مسی شکاو. جۆرە پیـازێکە سەلکەکەی هەرگـیز گەورە و خڕ نابێ.
قوڕاڵە: گیای قوڕاوە.
قۆڕاندن: قۆڕەکردن.
قوڕاو: ئاوێکە بەهۆی قوڕەوە لێڵ بووبێ. بەربەسڵ.
قـووڕاویلکـە: باڵندەیەکـە وەک (بۆرە جرە) بـەلآم ئەم گـەورەتر و قاچی درێژترە.

قوراوی: شتێکە کە قوڕی تێوەچووبێ.
قوڕباق: بۆق.
قوڕبەسەر: بریتییە لە لێقەوماوێکی بەسەزمان.
قوڕبەسەری: لێقەوماوی و هەژاری.
قوڕبەست: قوڕێکە لەسەر شوێنێک ڕۆ کرابێ بەئەستووری.
قوڕبەستکردن: ڕۆکردنی قوڕ بەئەستووری.
قوڕپێوان: قوڕکردن بەسەردا بە هۆی خەفەت یا چورتمێکەوە.
قوڕپێوەدان: بریتییە لە وێرانکردن یا تێکدانی شتێک.
قوڕتێکەر: کرێکارێکە کە هەر قوڕ تێکدا بۆ قوڕکێش.
قۆڕخانە: جبەخانە.
قوڕدادەر: کرێکارێکە کە هەر قوڕ دابدا لەسەر چینی دیوار بۆ وەستا.
قوڕشێل: کرێکارێکە کە قوڕ خۆش بکا بەپێ.
قوڕقوڕاکە: قوڕقوڕاگە.
قوڕقوڕاچگە: لوولەیەکە لە ملی گیانداردا هەناسەی لێوە دەدا.
قۆڕقۆڕە: جۆرە مزراحێکە کونێک لە تەنیشتیەوەیەتی لە کاتی داکوتانیدا قۆڕەی لێوە دێ.
قوڕقوشم: جۆرە کانێکە وەک زیو بەڵام ئەم نەرم وکەم نرخە.
قوڕقێنە: قڕقێنە.
قۆڕک: ز. پشت مل.
قوڕکێش: کرێکارێکە کە هەر قوڕ بکێشێ بۆ وەستا.
قوڕکێشان: بردنی قوڕ بۆ وەستا.
قوڕکێشی: قوڕکێشان.
قوڕگ: قوڕقوڕاگە.
قوڕگدڕاو: بریتییە لە مەردوومی دەنگ زلی چەنەباز. بریتییە لە مەردوومی چاوبرسی زۆرخۆر.
قوڕگدڕیاک: د. قوڕگدڕاو.
قوڕگرتنەوە: کردنی گڵ بەقوڕ بۆ کارکردنی.
قوڕمساخ: گەواد.
قوڕمساغ: قوڕمساخ.
قۆڕن: د. تاوان و گوناح.
قوڕنازک: ئانیشک.
قوڕنانە سەرچاو: بریتییە لە داخ و خەفەتکردن بەدڵی یەکێکدا.
قوڕناویلکە: دەعبایەکی درێژی پچکۆلەی ئاوییە لە بەهاراندا پەیدا دەبێ و دەنگێکی زلی هەیە.
قوڕنە: گۆشەی ژوور یا حەوش.
قوڕنەت: با. قوڕنە.
قوڕواق: قوڕباق.
قوڕ و قسڵ: شتێکە دەگیرێتەوە لە گڵ و قسڵ بۆ بەکارهێنانی لە بناغەی دیواردا.
قوڕوقوشم: قوڕقوشم.
قووقە: د. بڵاوبوونەوەی چەند سوارێ لەکاتی هێرشدا.
قوڕ و قەپ: قڕ و قەپ.
قوڕ و قەپۆز: قڕ و قەپۆز.
قوڕۆڵ: کولۆر.
قوڕۆڵی: کولۆری.
قوڕونچک: نوقورچ.
قوڕوو: قورگ.
قوڕووگ: قوڕگ.
قورە: ز. دۆشای بەرسیلە.
قۆڕە: دەنگی ڕەشەوڵاخ. جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی قۆڕقۆڕە، (قۆڕەقۆڕ) قۆڕەی یەک لە دوای یەک. دەردێکە تووشی ڕەشەوڵاخ دەبێ و دەیکوژێ.
قوڕەڕەش: جۆرە قوڕێکی ڕەشە بەنی پێ ڕەش دەکرێ.
قوڕەسوور: جۆرە قوڕێکی سووری پاکە گڵاوی پێ دەردەکرێ و بۆ لیر دەدرێ لە جەستە.
قوڕەکاری: خەریکبوون بەکاری قوڕەوە.
قووریانە: د. گیاندارێکە کە پێی دەڵێن قۆڕی.
قۆڕیانە زەردە: د. بزمژ.
قۆڕی: دەعبایەکە وەک مارمێلکە بەڵام ئەم گەورەترە. بوونی مەردووم بە قۆڕ. قۆڕیە (د).
قۆڕیجان: د. کۆڵنجان.
قۆڕیتان: وتەیەکی سووکە بەهێندێ ئافرەت دەوترێ.
قوڕین: شتێکە لە قوڕ دروست کرابێ.
قورس: شتێکە لە هەڵگرتندا گران بێ. گوێیە کە بەگران شت ببەیت. بریتییە لە مەردوومی سەنگین.
قورسایی: گرانی و سەنگینی شت.
قورس و قۆڵ: د. شتی دارێژراوی قایم.
قورس و قەمەر: بریتییە لە مەردوومی سەنگین و گران.
قورسی کەمەر: بەری گیایەکی گەرمیانییە ناوکێکی سپی هەیە بەکوتراوی دەکرێ بەدەمی منداڵی ساوادا بۆ ڕەوانی.
قورسی نەعنا: نوقڵێکی پانی گردە لە شەکر و ئارەقی نەعنا دروست دەکرێ.
قورسی: قورسایی. بریتییە لە سەنگینی و گرانی مەردووم. کورسی.
قورعان: قورئان.
قۆرغ: حەمامێکی تێکراییە کە بۆ یەکێک یا خێزانێک تەرخان کرابێ.
قۆرغکردن: تەرخانکردنی حەمامێکی تێکرایی بۆ یەکێک یا بۆ خێزانێک.

قۆرگ: ز. کلێنچکەی مەردووم.
قورم: با. بنکی درەخت.
قورمیش: کۆکی سەعات: سەعاتەکەم قورمیشە. دێیەکە لە موکریان، (قورمیشکردن) کۆککردنی سەعات.
قورنچک: نوقورچ.
قورۆ: د. زوقم.
قورواق: بۆق.
قوروان: قوربان.
قوروانی: قوربانی.
قورسکان: نوسکانەوەی سەگ لە کاتی ئازار پێ گەیشتنیدا.
قورسکە: دەنگی سەگ لە کاتی ئازار پێگەیشتنیدا، (قورسکە قورسک) قورسکەی یەک لەدوای یەک.
قورۆک: کولۆر. کورۆک.
قورۆڵ: کولۆر.
قورۆمە: هەوجار.
قورووقە: د. ڕاکردنی کۆمەڵێک و بڵاوبوونەوەیان.
قۆرە: بەرسیلە.
قۆرەقۆر: ز. قۆڕەقۆڕ.
قۆریات: جۆرە مقامێکە.
قورینگ: قوڵنگ.
قۆریە: شتێکی دەسک و لوولەدارە لە شووشە یا لە فافۆن چای تێدا لێ دەنرێ. ناوی گەرەکێکە لە شاری کەرکووک.
قۆری: قۆریەی چا. کادانێکە دروست دەکرێ لە تەنشت ماڵانەوە بەگردی لە تەیمان و، ناوەکەی پڕ دەکرێ لە کا و سەرەکەی بەقۆقزی سواغ دەدرێ. لۆدەی گزرە گیا.
قوز: جێی میز و زانی مێینە.
قۆز: شتی زۆر چاک. گیانداری شەنگ و شۆخ.
قۆزاخە: گوڵی بەری پەمووە کە ناوەکەی پڕە لە لۆکە. شتێکی خڕە کرمی ئاوریشم هەڵی دەپێچێ.
قوزبرکە: دووکلکە. بریتییە لە چەقۆی پچووک. مڵە.
قۆزتنەوە: گرتنەوەی شت بەدەست و بردی.
قۆزراوە: شتێکە کە بەپڕ پێداکردن بەحەواوە بگیرێتەوە.
قوزەڵقورت: جۆرە دەردێکە وەک سندان لە گیاندار و کاڵەک و شووتی و ترۆزی دەدا. وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە لە وەرامی یەکێکدا دەوترێ.
قۆزڵاخ: د. قۆزاخە.
قۆزڵاخە: د. قۆزاخە.
قۆزڵەمینە: چێشتی چەنسووتەکە.
قوزوڵقورت: د. قوزەڵقورت.
قۆزە: کۆکە، (قۆزەقۆز) قۆزەی یەک لەدوای یەک.
قۆزەڕەشە: د. کۆکەڕەشە.
قۆزە قوڕواق: د. قەوزە.
قوزەسووتەکێ: سووتانەوە و سووربوونەوەی زێی کچی منداڵ.
قوزەڵقورت: قوززەڵقورت.
قۆزێتی: کوڕێنی و خۆ بەقۆز نیشاندان.
قۆزێنی: قۆزێتی.
قۆزی: قۆزێتی.
قۆزین: کۆکین.
قوژبن: قوڕنە.
قۆژیانە: د. سووسەمار.
قوس: قوز.
قۆستنەوە: قۆزتنەوە.
قوسان: ز. ئاوسان و کوترانی پێ لەبەر زۆر ڕۆیشتن.
قوش: ز. خەرمانێکە ئامادەکرابێ بۆ کوتان.
قوشقن: قایشێکە لە کلکی ولاخ هەڵدەکێشرێ و لە قەڵتاخ قایم دەکرێ.
قوشقنبوون: قوشقیبوون.
قوشقنە: قوشقن.
قوشقی: مەردوومێکە کە تووڕە بووبێ، (قوشقیبوون) تووڕە بوون، (قوشقیکردن) تووڕەکردن.
قۆشمە: مەردوومی گاڵتەچی.
قۆشە: دراوێکی کەم نرخی ئێرانییە. گێژخواردنی مووی ناوچەوانی ئەسپ و ماین، ئینجا ئەم مووە ئەگەر لە یەک لاوە بوو ئەوا باشە و ئەگەر لە دوو لاوە بوو ئەوا شوومە و پێی دەڵێن جووت قۆشە (د).
قۆشەن: د. لەشکر.
قۆشەنیان: د. لنگدانی ولاخ: ئەم شوێنە مەیدانی قۆشەنیانە.
قوفڵ: د. قفڵ.
قوفلین: ز. زۆر سەرمابوون و ڕەقبوونەوە لە سەرماندا.
قوففە: قایغ.
قوفە: قوففە.
قوفەوان: قایغەوان.
قۆق: ز. یەک سەر لە ئاژاڵ.
قۆقز: شتی زەق و دەرپەڕیو.
قۆقزایی: عاستی قۆقزی شت.
قۆقزی: قۆقزایی.
قول: مەردوومی زۆر ڕەش. لە ئەژنۆ بەرەوخواری گیاندار تا قاپی. باقە: (قول)ێک گیام درووە. کونی دیوار و شتی تر (ز). باش وێستانی هەلووک بەجۆرێک کە ژێرەکەی بۆش بێ بۆ ئەوەی کە بەدار هەلووک لێت دا باش بەرزبێتەوە.

قوڵ: شتی کوڵ. قوڵپی شت لەسەر ئاگر. سەری تیژی هێلکه.
قۆڵ: قۆڵ.
قۆڵ: ناوەندی شان و ئانیشک. ئێشکچی شەو کە بەناو ئاواییدا دەسووڕێتەوە. دەستەیەک لە مەردووم: لەشکرەکە (قۆڵ قۆڵ) بوو. داری ئەم لاو ئەولای عەرەبانە. شتی ئەستوور (د). ناوچە: لە قۆڵی مەڵکەندی.
قولاپ: دەوشێکی چقەداری تیژە بەلووتەکەی چەرمی پێ کون دەکرێ و بەچقەکەی دەزوو لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە دەرەوە. ئاسنێکی لووت تیژی چەوتاوەیە شتی پێدا دەکرێ. قولەپێ (د).
قولاپ دۆز: د. کەسێکە بەقولاپ شت بدروێ.
قولاپ دۆزی: دروونی شت بە قولاپ.
قولاپە: شتێکی لووت چەماوەی تیژە دەگیرێنرێتە هێندێ شت. قولەپێ.
قولاج: د. قولانج.
قۆلاچ: د. قولانج.
قولاچە: قالۆنچە.
قولاخ: جێگای دابەشکردنی ئاو بۆ مەرەزە لای سەرووییەوە. پارچەیەک لە ئەندامی ئاژاڵە کە دڕندە خواردبێتی یا مردار بووبێتەوە و شوان بە بەڵگە هێنابێتیەوە بۆ خاوەنی. کەوڵ و پێستی گیاندار (د). مۆڵبوونی ماسی و ئاژاڵ.
قولاخە: مۆڵبوونی ماسی و ئاژاڵ.
قولاخەدان: کۆمەڵبوون و بەسەر یەکداکەوتنی ماسی لە سەرمادا. کۆمەڵبوونی گیاندار.
قولانج: ماوەی پانی دەست لە سەری پەنجە گەورەوە تا سەری پەنجەی دۆشاومژە.
قۆلانج: د. قولانج.
قۆلانچە: قالۆنچە.
قولب: قوڵف.
قولبوون: ز. کونبوونی شت .
قۆڵبەست: بەندییەکە لە پشتەوە هەردوو قۆڵی بەسترابێ، (قۆڵ بەستکردن) بەستنی هەردوو قۆڵی بەندی لە پشتەوە بۆ ئەوەی کە ڕانەکا.
قۆڵبەن: بازیبەند (د). قۆڵبەست.
قۆڵبەند: قۆڵبەن.
قوڵپ: قولفی شت. بڵقی شتی شل لەسەر ئاگر. بڵقی ئاو لەکاتی هەڵقوڵانیدا. هەنسکی گریان.
قوڵپدان: بڵقدانی ئاو لە کاتی هەڵقوڵان یا کوڵانیدا. هەنسکی گریان.
قوڵپن: مەردوومی خڕپنەی قەڵەو.
قوڵپنە: قوڵپن.
قوڵپە: دەنگی کوڵینی شتی شل، (قوڵپەقوڵپ) قوڵپەی یەک لەدوای یەک. قوڵفە.
قوڵپەژێر: ه. بەری گوڵە هێرۆ.
قۆڵپێچ: شتێکی درێژە نان پێوەدەر دەیپێچێ بەقۆڵیدا بۆ ئەوەی قۆڵی نەسووتێ.
قۆڵت: قۆرت.
قۆڵتر: وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بەمەردوومی پیری داکەوتوو.
قوڵتە: مەلێکی کەوەلەی خاڵ و میلدارە لە (دارکونکەرە) پچووکترە بەشوێنی سەختەوە هێلانە دەکا وەک هێلانەی پەڕەسێلکە. جۆرە دەنگێکە لە کاتی خواردنەوەی شتی شل لە گەرووی هێندێ کەسدا پەیدا دەبێ ،(قوڵتەقوڵت) قوڵتەی یەک لەدوای یەک. دەنگی نقومبوونی شتێک لە ئاودا. قوڵپەی گەورەی شتی شل لەسەر ئاگر.
قوڵتەخۆرە: د. ژێردەریایی.
قوڵتەش: د. مەردوومی بێ شەرم.
قوڵتەشە: د. قوڵتەش.
قوڵتیان: د. قوڵتە کردن بۆ ژێر ئاو.
قولچماخ: ه. مەردوومی قسەخۆشی قسەڕەوان.
قۆڵچی: کەسێکە باجی دەوڵەتی بسێنێ.
قۆڵچێتی: بوونی مەردووم بەقۆڵچی.
قۆڵداخ: بازن.
قولدر: د. مەردوومی بێ شەرمی بێ حەیا.
قولغ: جوان.
قولف: ز. قولب.
قوڵف: جێگا دەست لە هەموو شتێکدا کە پێی هەڵبگیرێ. قفڵ (د). ئەڵقەیەکە دەنرێ لە هێندێ شت.
قوڵف لێ نان: بریتییە لە سەنگێن و گران ڕاگرتنی یەکێک کە سەنگێن و گران نەبێ. پیاگرتنی قوڵفە بەهێندێ شتدا.
قوڵفە: جۆرە گرێیەکە کە بەڕاکێشانی لایەکی بکرێتەوە. ئەڵقەیەکە دەنرێ لە هێندێ شت.
قولقولان: جۆرە یارییەکی دوو دەستەییە پەنجەی قاچی چەپ دەگرن لە پشتەوە بەدەستی ڕاست و لەسەر پێی چەپ بەهەنگڵە شەلێ دەچن بۆ یەکتری.
قولقولانچکە: د. قولقولانە.
قولقولانە: د. باڵینە.
قوڵقوڵە: د. قوڵەقوڵی شت لەسەر ئاگر.
قولکرن: ز. کونکردن.
قووڵه: قەڵای بەرز.

قوله: کوللەی مەشکە درە.
قۆڵمە: د. لوولاق.
قۆڵنج: کۆلنج.
قـوڵنگ: باڵندەیەکی قـاچ و مـل درێژە لە شـینەشـاهۆ دەچێ. قوڵنگە.
قوڵنگە: پاچێکی کلک کورتی دەم خڕی لووت تیژە.
قولۆر: د. کلۆر. شتی نالەباری نارێک.
قولۆق: کلکی گەنمەشامی.
قولولولو: د. چاوشارکێ.
قولووج: چاڵە قووتە.
قولووچان: د. جۆرە یارییەکە.
قولووچ قولووچ: شوێنی چاڵ و چۆڵ.
قوله: تەپلە سەری شاخ و درەختی بەرز. قولله.
قـوڵە: سەری تـیـژی هێلکە. ناوی دێیـەکـە لە سنووری خـانەقین. گیانداری کلک کورت.
قۆلە: د. قۆلانچە.
قولەبازەڵە: د. قەلەباچکە.
قولەبانک: با. بەرهەیوانێکە لەسەربان دەکرێ نوین و شتی تری تێدا دادەنرێ.
قوڵەبنە: کوڵەبنە.
قولەپسکێ: د. سستی لە ڕۆیندا.
قولەپە: د. قولەپێ.
قولەپێ: ئێسقانێکی ڕەقەڵەی بەرزە بەم دیو و بەودیوی قاچەوە.
قوڵەشێن: کەروێشک.
قولەفیسقە: د. قولەپێ.
قولەقاچ: قولەپێ.
قۆڵە قۆڵ: کوڵەکوڵی شت لەسەر ئاگر.
قولەک: ز. گیایەکی گەڵا پانە بەسەر زەویدا پان دەبێتەوە.
قولەمشت: قولی مشت.
قولەمشتێ: شتێکە بەپەنهانی بیخەیتە قولی مشتی یەکێکەوە.
قوڵەنگ: قوڵنگ.
قوڵەنگە: قوڵنگە.
قۆلە نەخشینە: د. جۆرە قالۆنچەیەکی ڕەنگاوڕەنگە.
قۆڵەوانە: بازووبەند.
قول هەڵکراو: گیانداری بەقولی گورجوگۆڵ.
قۆڵ هەڵماڵراو: قۆل هەڵکراو.
قوڵیان: د. کۆڵان.
قولی مست: ناوبەری دەست بەقووچاوی.
قولیک: ز. بەندیخانە.
قــوم: پڕ بەگـــووپ لە ئاو و شـــتی شل. لم. دیزەی دۆ (ز). دەفرێکی گەورەیە ئاوی تێ دەکرێ بۆ ئاژاڵ (د).

قـومـاتە: پارچە تەنراوێکە منداڵی تـازەبووی پێ دەپێـچـرێتـەوە، (قـوماتەکردن) پێچانەوە و شـەتەکـدانی منداڵی تـازەبوو لە مەرحەمە یا شتێکی تردا.
قـومـار: چەند یاری کـردنێکی تـایبـەتـیـیـە دەکـرێ لەسـەر پارە بردنەوە. یاری.
قومارباز: بریتییە لە مەردوومی فێڵباز.
قوماربازی: بریتییە لە فێڵبازی.
قۆمارچی: کەسێکە یاری قومار زۆر بکا.
قومارخانە: شوێنێکە کە هەر قوماری تێدا بکرێ.
قومارکردن: خەریکبوون بەقومارەوە.
قومارکەر: قومارچی.
قوماش: کوتاڵ. ناوە بۆ جۆگە ئاوێک لە شارەزوور.
قومام: گیـایەکی سەلکداری بەرزی قەفقەفی بەهارییە سەلکەکەی شیرینچکە گوڵی وەک گەنم وایە بەڵام ئەم شیرەی کەمە.
قومـامە: تەقـەڵێکی گەورەی ئەم دیو و ئەو دیوە کە نـاو بەناو لە دۆشەک دەدرێ.
قۆمان: قەومان.
قۆماندن: بەرپاکردنی کارێکی گرنگی ناخۆش.
قۆمانن: قەوماندن.
قومپارە: د. گوللە تۆپێکە کە ساچمەی زۆری تێدا بێ.
قومپاژنە: پاژنەی پێ.
قومپانی: قومپاژنە.
قومری: باڵندەیەکی پلپلی باریکی زۆر جوانی دەنگ خۆشە لە کۆتر پچووکترە. قەرنابیت (د).
قومقمۆک: قومقومۆکە.
قومقمۆکە: قومقومۆکە.
قومقومۆکە: دەعبایەکی پچکۆلەیە وەک مـارمێلکە. گۆزەڵەیەکی مل باریکی بەرزە ناوملەکـەی کـون کـونە لەکـاتی ئاو لێ ڕۆکردنیدا بلقەبلقی لێوە دێ.
قومقومە: دەفرێکی مسینی قوڵفداری مل باریکی بن پانە.
قومـلاخ: قورێکی مڵی ئەستوورە کـە پەیدابووبێ لە باران یا لە ئاوی ترەوە.
قـوملێدان: وەرگـرتن و هەڵمـژینی شـتی شل بەدەم بۆ خـواردنەوە. مژدان لە جگەرە و سەبیل.
قوموش: قومووش.
قوموش لێدان: د. قومووش لێدان.
قــومــووش: زەوییــەکی هەڵدڕاوی قــوولـە لە بـاری درێژی لەژێر زەویدا.
قومووش لێدان: هەڵکەندنی قومووش لە زەوی بەیەخە درێ.
قومەزە: د. زۆڵ.

قۆمیان: قەومان.
قۆمین: قەومان.
قۆناخ: قۆناغ.
قۆناخە: قۆناغە.
قۆناخەپێچ: قۆناغەپێچ.
قونار: لقی وردی مێو کە بەری نەبێ و لقە بەردارەکانی بێ هێز بکات، (قونارکردن) کردنەوەی قونار لە مێو.
قۆناغ: دیواخان: ماڵی فیسار کەس (قۆناغ)ێکی گەورەیە. ڕۆژەرێییەک: ئێرە و کەرکووک سێ (قۆناغ). لای خوارووی تفەنگ کە دارێکی پانە.
قۆناغە: منداڵێکە لەناو مەرحەمەیەکدا پێچرابێتەوە و قوماتە کرابێ.
قۆناغەکردن: شەتەکدانی منداڵ و قوماتەکردنی.
قۆناغەپێچ: پارچە تەنراوێکە منداڵی پێ قۆناغە دەکرێ.
قونتاخ: ز. قۆناغی تفەنگ.
قونتک: ز. یاپراخ.
قونجک: ز. قوژبن.
قونجرکە: پەیکوڵ.
قونچرک: چرنووک، نوقورچ.
قونچک: قنچک، ئەغرەجگەرە.
قونچکە: قنچکە، (قونچکەکردن) قنچکەکردن.
قوندا: ز. قنگدەر.
قۆنداخ: قۆناغەی تفەنگ.
قۆنداخە: قۆنداخ.
قوندە: گیاندارێکە کە کلکی زۆر کوڵ بێ.
قۆندەرە: جۆرە پێڵاوێکی پاژنەدارە لە چەرم دروست دەکرێ.
قۆندەرەچی: کەسێکە هەر قۆندەرە دروست بکات.
قۆندەرەچێتی: خەریکبوون بەدروستکردنی قۆندەرەوە.
قۆندەرەکردن: بەرزبوونەوەی ئاوی خوڕ لە ناو چەم و ڕووباردا بەهۆی خڕەبەردی ناویەوە.
قۆنگرە: شوێنی بەرز بۆ چاودێری شتێک.
قونە: جۆرە ڕۆینێکە کە بەهەنگاو نەبێ: چۆلەکە بە(قونە) دەڕوا، قونەکردن: ڕۆینی بەقونە، قونەقون: قونەی یەک لەدوای یەک.
قۆنەقۆن: ڕۆیشتن بەهەنسکە برکێ و تەکەتەک: فیسار کەس بە(قۆنەقۆن) هات.
قۆنیاغ: جۆرە خواردنەوەیەکی گران مایەیە کە سەرخۆشی دەدا.
قونێر: دومەڵ.
قونیک: قولەپێ.
قوو: باڵندەیەکە گۆشتی دەخورێ و تووکی زۆر نەرم و شلە دەکرێ بەسەرین. قوولە و هەرا (د).

قوواش: ز. قوشقن.
قوواقوو: د. قاوەقاو.
قووپک: بەرزییەکە لە ناوەڕاستی تەختانییەکدا. پشتی دەرپەڕیو.
قووت چوون: چوونە خوارەوەی شت بەناو شتێکی تردا: پارووەکە یا زەلامەکە لە ئاوەکەدا (قووت چوو).
قووتدان: بردنە خوارەوەی خواردەمەنی لە دەمەوە بۆ ناوسک.
قووتکردن: قووتدان. ڕووتکردن. نوقومکردن.
قووتە: ڕووتەڵ. نوقومبوون.
قووتەڵ: ڕووتەڵ.
قووتەڵە: قووتەڵ.
قووتی: ز. قوتوو.
قووجانن: د. قووچاندن.
قووچ: شتی بەرزی کەڵەگەت.
قووچان: لێک نراوی دەست و دەموچاو.
قووچاندن: لێکنانی دەست و دەموچاو.
قووچانن: قووچاندن.
قووچاو: دەست و دەموچاوی لێکنراو.
قووچەک: چەند شتێکە لەسەر یەک دابنرێ بەقووچی.
قووچەکە: ئەموستیلەی دروومان .
قووڕاندن: هاوارکردنی سەگ و تانجی لە کاتی ئازار پێ گەیشتنیاندا.
قوڕانن: قووڕاندن.
قووڕە: دەنگی سەگ و تانجی لە کاتێکدا کە ئازاریان پێ بگا بەڕەنگێک کە لە (قوروسکە) گەورەتر بێ، (قووڕەقووڕ) قووڕەی یەک لەدوای یەک.
قوری: ل. قۆریەی چا.
قووزە: قووڕە، (قووزە قووز) قووڕەقووڕ.
قووس: با. جۆرە کولێرەیەکی بێ ڕۆنە.
قووقاندن: تێ هەڵکردنی کەڵەشێر بەخوێندن.
قووقانن: قووقاندن.
قووقە: دەنگی خوێندنی کەڵەشێر، (قووقەقووق) قووقەی یەک لەدوای یەک.
قوول: قووڵ.
قووڵ: شوێنی زۆر چاڵ.
قوولاندن: بانگەوازی یەکێک لە دوورەوە: تێی قوولاند.
قوولانن: قوولاندن.
قووڵایی: عاستی قووڵی شت.
قووڵک: چاڵی پچووک.
قووڵکردنەوە: بریتییە لە زۆر وردکردنەوەی قسەیەک.

قــوولکە: قــوولک. چالێکە لە تەنیــشت دۆلّیــانی ئاشــەوە ئاردەباری ئاشەوانی تێ دەکرێ. ئاگردان (د).
قوولە: جۆرە دەنگێکی بەرزی درێژە مەردوومی لە دوور پێ بانگ دەکــرێ، (قــوولە قــوول) قــوولەی یەک لەدوای یەک. ناوی دێیەکە لە ناوچەی سەنگاو.
قوولەکردن: قــوولاندن. بریتییە لە پێ هەلّبڕین لە هەمــوو کردار و گوفتارێکدا.
قوولّی: قوولاّیی.
قوولّینە: دەفرێکی شوولّینی قوولّی دەم واڵە.
قوون: قنگ.
قوونار: قونار، (قوونارکردن) قونارکردن.
قووندان: قنگدان. سمتەجۆلّەی مریشک و کەلّەشێر.
قووندەر: قنگدەر.
قوونەبان: قنگەبان.
قوونە و تلوور: قنگە و تلوور.
قوونێر: دومەلێکە کە لە دەوروبەری کۆم پەیدا دەبێ.
قوولّی: چێشتی قوبوولّی.
قوێخا: کوێخا.
قوێخایانە: مووچەیەکە دەدرێ بەکوێخا.
قویل: قوولّ.
قویلە: د. قوولە.
قوین: قنگ.
قەب: ز. زۆرانبازی.
قەبا: ز. قەبە.
قەباخ: بەرگی ڕەقی شت.
قەبارە: بارستایی شت.
قەبالە: ز. قەبالە.
قــەبالــە: نووســراوێکی مــۆرکــراوە لە خــرید و فــرۆشــتــدا دەدرێ بەیەکتری.
قەبر: گۆڕ.
قەبران: گۆڕستان.
قــەبراوقــەبرکــردن: ناشــتنی مــردوویەکی تازە بەســەر مــردوویەکی کۆندا لە قەبرێکدا.
قەبرسان: قەبرستان.
قەبرستان: گۆڕستان.
قەبرخە: قەبرغە.
قەبرغە: کەلەکە.
قــەبر هەلّبــەستن: هەلّبــەستن و چنینی قــەبر بەبەرد یا بە خــشــتی سوور.
قەبر هەلّکەن: کەسێکە کە هەر گۆڕ بۆ مردوو هەلّ بکەنێ.
قەبر هەلّکەندن: هەلّکەندنی گۆڕ بۆ مردوو.
قەبز: کەسێکە کە ڕەوان نەبێ. مەردوومی دلّتەنگ.
قەبزە: قەوزەی ناو ئاو.
قەبزەنوشتە: شتێکە کە بەسێ سووچی نوشتێنرابێتەوە.
قەبزی پایز: ناوەڕاستی پایز.
قەبزی: دلّتەنگی. بوونی گیاندار بەجۆرێک کە ڕەوان نەبێ
قەبقاب: قاپقاپ.
قەبقەبۆک: جۆرە گیایەکە بەرێکی خڕی وردی سوور دەگرێ.
قــەبلاندن: ئەندازەدانان بــۆ شــتــێــک لە بابەت نرخــیــەوە یا چەندێتییەوە.
قەبلین: ز. پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی کشتوکالّ.
قەبۆقەبۆ: قەبووقەبوو.
قەبووقەبوو: ز. وتەیەکە دەوترێ لەکاتی داواکــردنی زۆرانبــازی و جەنگدا، واتە وەرە مەیدان.
قەبە: شتی زلی ناشیرین.
قەبەدایی: مەردوومی قەبەی درشت.
قەبەیی: زلی و ناشیرینی.
قەپ: قەپالّ.
قەپاتکردن: داخستنی هەموو شتێک.
قەپاخ: قاپۆڕی شت.
قەپالّ گرتن: پڕ بەدەم ددان گیرکردن لە شتێک.
قــەپان: شــتــێــکە وەک تەرازوو بەلاّم ئەم شــتی قــورسی پێ دەکێشرێ.
قەپانجەرە: بالینە.
قەپانچی: کەسێکە کە شت لە قەپان بدا.
قــەپاندنەوە: خــواردنی هێندێ شت بە لەوێچ وەک قــاووت و برێشکە .
قــەپانکردن: لە قــەپاندنی شت. هەلّچنینەوەی ڕووی دیواری ڕووخاو.
قەپانن: د. فڕاندن.
قەپانی: مزی شت لە قەپاندان.
قــەپ داگــرتن: بریتــیــیــە لە داواکــردنی ئەندازەیەکی زۆر لە نرخی شتێکدا.
قەپرخە: قەبرغە.
قەپگرتن: گازگرتن.
قەپلاخ: جۆرە کلاوێکی تووکنە لە پێستی بەرخ دروست دەکرێ.
قەپوڕ: د. قات و قڕ.
قەپوچک: پارەنان کە وەک کەوچکی لێ بکرێ و ماست و شتی شلی پێ هەلّگیرێ بۆ خواردن.
قەپوچکە: قەپوچک. بەرزبوونەوەی ئاو لە کاتی لێکەوتنی دلّۆپی باران بەلێزمە.

قەپۆز: دەم و لووتی هێندێ گیاندار.
قەپوقڕ: کش و مات: منداڵەکان هەموو (قەپوقڕ) دانیشتبوون.
قەپۆل: قەپۆلە.
قەپولکە: ترۆزی و خەیار و باینجانی هەڵکۆڵراوە کە لە هاویندا وشک دەکرێتەوە بۆ یاپراخی زستان.
قەپۆلە: مەردوومی ناشیرینی دەموچاو نالەبارە.
قەپوو: چەمۆڵە. قاوغ: قەپووی ئەو بەرووە فڕێدە.
قەپووک: قرپۆڵ.
قەپوولک: پاشقول.
قەپێلک: قاوغی رەق. پێڵوو.
قەت: وتەیەکە هەر لە نەبوونی کارێکدا بەکاردێنرێ، وەک وتەی (هەرگیز).
قەتار: جۆرە مقامێکی خۆشی کوردییە. چەند وڵاخێکی بارییە کـە بەر و دوا برۆن. هۆدەی شـەمـەندەفـەری یەک لە دوای یەک.
قەتاربەستن: ریزبوونی گیاندار بەر و دوا.
قەتارچی: کەسێکە کە ئاگاداری قەتاری وڵاخ بکات.
قەتارکردن: ریزکردنی شت.
قەتارە: شتی بەریز وەستاو.
قەتارەبەستن: ریزبوونی گیاندار.
قەتارەکردن: ریزکردنی شت.
قەتاندن: با. قرتاندن: سەرێ وی بقەتینە واتە بیقرتێنە.
قەتران: تیژاوێکی زۆر رەشە.
قەتک: خەیاری دێمی (ز). پارچەیەک لە شتێک (با).
قەتماخە: قەتماغە.
قەتماغە: توێژی سەربرین.
قەتمەر: مۆری تێر.
قەتێ: کوڕ کوڕ.
قەتیە: قەتێ.
قەتیز: د. قەتیس.
قـەتیس: کـەسێکە کە لەسەر کـارێک دامـابێ، (قـەتیـسبـوون) دامــان لەســەر کــارێک، (قــەتیــسکردن) بەندکــردن و دەستەوسان کردنی یەکێک لەسەر کارێک.
قەجەری: جۆرە کۆپانێکە.
قاچاغ: با. قاچاخ.
قەچاغچی: با. قاچاخچی.
قەحبک: قەحبە.
قەحبە: ئافرەتی سۆزانی.
قەحبەچی: کەسێکە کە قەحبەی ببێ.
قەحبەخانە: شوێنێکە کە هەر قەحبەی تێدابێ.
قەحفک: ز. دەفری گڵێن.
قەد: تەنیـشـتی شت: خەنجەرەکـە بکە بە(قـەد)ت. باڵا: فـیسـار کەس (قەد)ێکی بەرزی هەیە. چەند دێراوێکە کە (ئاوبڕ)یان لەیەک جـۆگـەوە بێ. دەق: لەســەر (قــەد)ی خـۆی داینێ. ئەندازە: ئەمە بە(قەد) ئەوە. چێن: ئەمە (قەدقەد)ە واتە چێن چینە. هەرگیز: قەد درۆ ناکەم واتە هەرگیز.
قەدبڕ: نزیکترین رێگایە بۆ شوێنێک کە چەند رێگایەکی تریشی بۆ بچێت.
قەدبەن: د. قەدبەند.
قەدبەند: د. پشتێن.
قەدپاڵ: لاپاڵی گرد و شاخ.
قەدرە: کچێک یا کوڕێکە کە تۆزێک بەساڵدا چووبێ.
قـەدکـردن: نوشـتـاندنەوەی شت بـەرێکی. برینەوەی دار: ئەو دارە (قەدقەدکە) واتە بیبڕەرەوە بەچەند پارچەیەک.
قەدەح: گوڵی پرتەقاڵ و لیمۆ.
قەدەخە: د. قەدەغە.
قەدەغە: دارسـتـان یا پووش و پاوەندێکە کە خاوەنی نەیەڵێ لێی ببرێ، (قەدەغەکردن) نەهێشتنی توخنکەوتنی یەکێک بەلای شتێکدا.
قەدەک: قوماشێکی ئێرانی رەنگکراوە دەکرێ بەکەوا.
قەدەم خێر: کەسێکە کە هاتنی بەخێر بگەرێ.
قەدەم شەر: کەسێکە کە هاتنی بەخێر نەگەرێ.
قەدیفک: با. خاولی.
قەدیفە: قەیفە.
قەر: با. قەرد.
قەراج: قەرەقاج. ناوچەیەکە لە لیوای هەولێر.
قەراخ: قەراغ.
قەرادان: بڕیاردان.
قەرارگا: جێگایەکە کە لەشکر لێی هەڵ دابێت.
قەراغ: کەناری شت.
قەراغگرتن: گرتنی شتێک بەلێواری شتێکی تردا بەتەقەڵ.
قەراغەگرتن: قەراغگرتن.
قەرافل: ز. لووتەوانەی ژنان.
قەرام: ز. پارچە چەرمێکە دەخرێتە سەر دەمی گۆزە و دەفری تر بۆ ئەوەی شتی تێ نەکەوێ.
قەران: قرانی دراو.
قەراو: د. شەونم.
قەربوونە: بەر و ورگی خڕ و پڕ.
قەرپال: ز. بەرگی زۆر پیناوی.
قەرپۆز: قەرپووز.

قەرپۆس: قەرپووز.
قەرپووز: شتێکی بەرزە لە زین، دەکەوێتە بەردەمی سوار.
قەرپووس: قەرپووز.
قەرتاڵە: پەرچنۆکە. سەبەتە.
قەرتماخە: قەرتماغە.
قەرتماغە: قەتماغە.
قەرد: قەرز.
قەردار: قەرزار.
قەررازە: زنجیرێکە گوێدرێژی پێ دەبەسترێتەوە.
قەراڵ: پاشا.
قەراڵیچە: ژنی قەراڵ.
قەران: شوێنێکی پانی تەختە کە چەند سوارێک تاوی تێدا بدەن بۆ تاقیکردنەوەی خێرایی ولاخەکان.
قەرقەشە: د. گێچەڵ.
قەرەم: نەیجوول.
قەرز: دراو و هێندێ شتی ترە کە بۆ ماوەیەک بدرێ بەیەکێک.
قەرزار: کەسێکە کە قەرزی لەسەر بێ.
قەرزاری: بوونی مەردووم بەقەرزار.
قەرزدار: قەرزار.
قەرزدان: دانی قەرز بەیەکێک.
قەرزدانەوە: دانەوەی قەرز بەخاوەنی.
قەرزکردن: سەندنی شت بەقەرز لە یەکێک.
قەرز کوێر: کەسێکە کە قەرز درەنگ بداتەوە بەخاوەنی.
قەراسە: قەررازە.
قەرز کوێری: بوونی قەرزار بەڕەنگێک کە قەرز بەگران بداتەوە.
قەرز و قۆڵە: قەرزێکی زۆرە کە بتبێ بەسەر ئەم و ئەوەوە.
قەرژنگ: ل. قرژاڵ.
قەرساندن: با. بەستن و مەین.
قەرسەقول: تەرسەقول.
قەرسەقول تلەوەکەر: د. گووخلێنکە.
قەرسیل: گەڵا و لاسکی گەنم و جۆی سەوز.
قەرسین: ز. بەستن لە سەرماندا.
قەرفین: ز. شکانی دار لە خۆیەوە.
قەرقاش: ز. مەڕی سپی چاوڕەش.
قەرقاووڵ: مریشکە کێوی.
قەرقەش: قەرقەشە.
قەرقەشە: گێرە و کێشە.
قەرقەمێ: هـ. مەشکە کۆنێکە کە میوەی وشکی تێ کرابێ.
قەرمیچین: ز. چرچبوونی پێستی ئەندام یا کاڵا.
قـەرمین: ز. قـەرسین. ڕەقـبـوونی ئەندام لەبەر مـاندوویەتی یا سەرما یا باداری.

قەرواش: ز. کارەکەر.
قەرواقە: ل. بۆق.
قـەرە: دارەت: خـۆی لەو (قـەرە)یە نادا، واتە خـۆی لەو دارەتە نادا، توخن. گـۆبەنگ و بڕ و بیـانوو: ئەم شـتـەی بۆ (قـەرە) داناوە، واتە بۆ ئەوەی کە بیکا بەگۆبەنگ.
قەرەباغی: جۆرە نقامێکە.
قەرەباڵغ: جەماوەر و جەنجاڵی زۆر.
قەرەبرووت: شتێکە ئەوەندە سووتابێ ڕەش هەڵگەڕابێ.
قەرەبوو: شتێکە کە بدرێ لە تۆڵەی شتێکی تردا.
قەرەبووکردنەوە: دانی شتێک بەکەسێک لە تۆڵەیٔ شتێکدا.
قەرەبوون: د. دەم چەشتبوون.
قەرەبەشە: جۆرێکە لە مراوی.
قەرەبینا: جۆرە دەمانچەیەکی کۆنە لە دەمیەوە دادەگیرێتەوە.
قەرەج: تیرەیەکی کۆچەرین بێژنگ و هێڵەک دروست دەکەن.
قەرەچ: قەرەج.
قەرەچناخ: مەردوومی چەنەبازی بێ شەرمی ڕووهەڵماڵراو.
قـەرەچۆڵ: ڕەگـەز و بنەچەی هۆزێک یا کـەسـێک: (قـەرەچۆڵ)ی نەما، واتە ڕەگەزی نەما.
قەرەچەناخ: قەرەچناخ.
قەرەچی: قەرەچ.
قەرەخەرمان: گەنمێکە بەسەوزی سووتێنرابێ.
قەرەداشی: جۆرە هەڵپەڕکێیەکە.
قەرەزاخ: د. گرینۆک. هەرزەبێژ.
قـەرەسـەوە: د. جۆرە گـومگومـەیەکی مـسینی مـل درێژە ئاوی تێ دەکرێ.
قەرەقاچ: دارێکی پچووکە کرمی کەژ هەر بەوەوە قۆزاخە دەکا و، لە تووڵەکانی بەرچنە و سەبەتەی لێ دروست دەکرێ.
قەرەقاژ: گرینۆک.
قەرەقوش: د. دەردێکە لە بن دەست یا پێی ئەسپ پەیدا دەبێ.
قەرەکردن: بەدیکردنی شتێکی دوور.
قەرە قەرە: یاری چاوشارکێ.
قەرەکەوتن: توخنکەوتن.
قەرەمینا: قەرەبینا.
قەرەنتوو: تارمایی.
قەرەووڵ: پێشڕەوی لەشکر. نیشانەی تفەنگ.
قەرەوونە: کرمێکی ڕەشی پچکۆلەیە لە کەشک پەیدا دەبێ.
قەرەوێڵە: چار پایە.
قەرەوی: کاڵەکی قەرەیی. قەرەبوو (د).
قەرەیی: جۆرە کاڵەکێکی گۆشت ئەستووری خۆشە.
قەزاتمە: جۆرە گۆشتاوێکە پیاز و لەتکە نۆکی تێ ناکرێ.

قەزاتە: ڕۆژنامە.
قـەزاز: کـەسـێکە کـە قـەراغـی چەفـتـە و مـشـکی هەڵبـەسـتێ بەسورمە. جۆرە نقامێکە.
قەزازی: هەڵبەستنی قەراغی جەفتە و مشکی بەسورمە
قەزازیکردن: قەزازی.
قەزان: ل. مەنجەڵ.
قەزاوەگێڕ: شتێکە کە قەزا لە یەکێک بگێڕێتەوە.
قەزخوان: د. قەزوان.
قەزقان: قەزوان.
قەزقوان: قەزوان.
قەزقەوان: قەزوان.
قەزک: با. داری قەرەقاچ.
قەزکوان: قەزوان.
قەزوان: بەری دارەبەن.
قـەزوان سم: دەروشـێکی تایبـەتیـیـە قـەزوانی پێ دەسـمـڕێ بۆ تەزبیح.
قەزەب: ز. جگەر.
قەژەکردگ: د. شتی ترشاو.
قەساب: کەسێکە ئاژاڵ سەربڕێ بۆ فرۆشتنی گۆشتەکەی.
قەسابخانە: کوشتارخانەی ئاژاڵ.
قـەسـابی: سـەربڕینی ئاژاڵ و شـەق و پەق کـردنی گـۆشـتـەکـەی.
قەسابی کردن: قەسابی.
قەساو: قەساب.
قەساوخانە: قەسابخانە.
قەساوی: قەسابی.
قەسپ: جۆرێکە لە خورما.
قەسپەتوو: جۆرە توویەکی شیرینی دەنک گەورەی سپییە.
قەستۆر: جۆرە تەنراوێکی تووکنی ئەستوورە.
قەستەقول: قەرسەقول.
قەستی: گوفتار یا کردکارێکە بەتایبەتی بکرێ: تۆ بەقەستی ئەو قسەیەت کرد.
قەسخوان: قەزوان.
قەسران: کەسیرەبوون لە سەرماندا.
قەسـریک: با. تەنەکـەیەکـە دەخرێتـە بێشکەی منداڵەوە بۆ مـیـز تێکردنی.
قەسرین: قەسران.
قەسسان: ز. قوسسان.
قەسفاندن: ز. پارچە پارچە کردنی گۆشت بۆ فرۆشتن.
قەسفین: ز. قەسرین لە سەرماندا.
قەسقان: قەزوان.
قەسقەوان: قەزوان.
قەسکان: قەزوان.
قەسکوان: قەزوان.
قەسناخ: قاسناخ.
قەسناغە: قاسناغ.
قەسنی: شتیکە وەک بەرەمێو بۆنی زۆر خۆشە.
قەسوان: قەزوان.
قـەسـەتۆرە: تیـغـێکە وەک شـمـشـێـر بەڵام ئەم کـورتە و دەمـەکـەی پانە.
قەسەڵی: جۆرە تفەنگێکە.
قەسیان: د. هەژاری لات.
قەسیل: قەرسیل.
قەسیلە: کەوچک.
قەش: گیانداری چوارپێی ناوچەوان سپی. نەگبەت.
قەشا: ز. سەهۆڵ.
قەشان: بزنی ناوچەوان سپی. ناوە بۆ دێیەک لە ناوچەی ماوەت. گیانداری گوڵۆلی بەدبەخت.
قەشاووش: قاشاو.
قەشقە: کولۆڵی بەدبەخت.
قەشمەر: مەردوومی گاڵتەچی. بەچکەی مەیموون (د).
قەشمەری: گاڵتەکردن.
قەشە: پیاوی پێشەوای ئاینی گاوران.
قەشەنگ: شتی زۆر چاک.
قەشەنگی: چاکی و جوانی شت.
قەشەم: ز. قەشا.
قەشتین: ز. ڕۆینی یەکێک کە حەز لە مانەوەی نەکەیت.
قەف: چەماوەی گۆچان. لوولەی قامیش و حەیزەران. قەف قەف: قەفی یەک لەسەر یەک. قاپی مەردووم (د). کەورک (ز).
قەفـانجـەرە: مـاشـەی توولـێنـی مـاسـی گـرتـن. باڵێنەیەکی توولێنە لەژێر دیزە و شتی قۆقزدا دادەنرێ بۆ وێستانی. قەپانچەرە.
قەفت: با. چەپکێک لە گیا یا لە گوڵ.
قەفش: ز. لەوەڕی کەم.
قەفلک: ز. ملوانکەی مەرجان و کارەبا.
قـەف و گوڵ: کاتێکە کە دەغڵ بەتەواوی قـەفی کردبێ و کەم کەم گوڵیشی کردبێ.
قەفەز: قەفەس.
قـەفـەزە: جـۆرە دۆڵابێکە کـتـێب و هێندێ شـتـی تێ دەخـرێ. قـەفـەزێکی گـەورەیە لەسـەر هێندێ گـۆڕ دادەنرێ بۆ پـاسی گۆڕەکە.
قەفەزەی سنگ: بۆشایی ناو سنگە بەپەراسۆکانەوە کە دەورەیان داوە.

قەفەس: شتێکی پەنجەرەدارە لە دار یا لە ئاسن دروست دەکرێ بۆ تێخستنی هێندێ باڵدار.
قەفەنگێو: چەند شیشە تووتنێکە کە لەسەر یەک دانرابێ بۆ گەین و ڕزیبێ.
قەڤد: ز. مشتووی خەنجەر.
قەقنەس: دەڵێن گوایە باڵندەیەکی زۆر دەنگ خۆشە بەسۆزی خۆی دەسووتێ.
قەل: باڵندەیەکی زۆر ڕەشە بەقەد مریشکێک دەبێ. عەلیشیش. بزن و مەڕێکە کە تاقە گوێیەکی بڕابێ. یەکێکە کە چاوێکی کوێر و پووچ بێ. قەفێک لە قامیش. بریتییە لە مەردوومی زباندار: فیسار کەس زۆر (قەل)ە واتە بەزبانە. سەرشار لە یاری (قەلە مرداریێ)دا.
قەڵا: خانوویەکی قایمە بەشوێنێکی بەرزەوە. قەڵایی. قەل (ل).
قەلائیکچی: ز. کەسێکە کە دەفری مسین بەقەڵایی سپی بکاتەوە.
قەڵاپەچن: دەفرێکە کە پڕ کرابێ لە شتێک بەجۆرێ کە بەرز بووبێتەوە.
قەڵات: قەڵای بەرز.
قەڵاتە: قایشێکە دەکرێتە ملی تانجی بۆ ڕستکردنی.
قەڵاچن: قەڵاپەچن.
قەلاچۆ: قڕانی گیاندار: ئەمساڵ ئاژاڵەکەم (قەلاچۆ)ی تێ کەوت، (قەلاچۆکردن) قڕ تێخستن.
قەڵاخی: د. شتی زۆر ڕەش.
قەلادۆشان: د. قەلاندۆشکان.
قالاس: قەڵداس. گیایەکی بەهارییە وەک کەرخنکێنە وایە.
قەڵاش: قڵیش.
قەڵاشبوون: نابووتبوون.
قەڵاشتن: قڵیشاندن.
قەڵاشدن: قەڵاشتن.
قەڵاشکەری: داری زەنگەقڵیشە.
قەڵاشکێن: تۆپێکی بەهێزە قوللە و قەڵا دەڕووخێنێ. بریتییە لە مەردوومی بەهێز.
قەڵافەت: قەد و باڵای گیاندار.
قەڵاقەڵا: وتەیەکە لە یاری (چاوشارکێ)دا وەستا دەیڵێ.
قەڵاکردن: پڕکردنی شتێک لە شتێک بەجۆرێک کە بەرز بێتەوە
قەلاکە:قەلانگ.
قەلان: ز. هەڵکەندنی گیا.
قەلانچە: قەلەباچکە.
قەلاندن: ز. قەلان. کوڵاندنی چێشت.
قەلاندۆش: قەلاندۆشکان.
قەلاندۆشکان: هەردوو سەرشانی مەردووم لە کاتێکدا کە منداڵێکی بخرێتە سەر و هەردوو قاچی بەم لاو بەولای ملیدا شۆڕ بووبێتەوە.
قەلانقۆچ: قەلاندۆشکان.
قەلانکردن: دابوون و سەر بەناودا بردن لە یاری (سنگەوباز) و (یەکە و حەیزەران)دا.
قەلانگ: دارێکی درێژی لووت چەماوەیە مازووی پێ دادەگیرێ.
قەلای: ل. قەڵایی.
قەڵایی: شتێکە وەک زیو لەحیمی پێ دەکرێ و دەفری مسینی پێ سپی دەکرێتەوە.
قەڵب: دراوێکە کە نەچێ. گیانداری بێ فەڕ.
قەڵباز: د. قەڵەمباز.
قەڵبە: سەرەلووتێکی تیژە بەدار و دیوار و ئاسنەوە لە هەرچی بکەوێ برینداری دەکا. جێگەیەکە لە کاڵا یا لە جەستە کە (قەڵبە) لێی دابێ.
قەڵبەز: ڕیزە بەردێکی زلە لە گرد یا لە شاخ کە ژێری هەڵۆڵ بێ. قۆندەرەکردنی ئاو.
قەڵبەزە: قۆندەرەکردنی ئاو. ناوی دێیەکە لە سنووری سەنگاو.
قەڵبەزەن: کەسێکە کە دراوی قەڵب لێ بدا.
قەڵبەژەن: قەڵبەزەن.
قەڵبەن: د. پشتێن.
قەلبیر: د. قەڵبیر.
قەڵبیر: شتێکی کون کونە لە بێژنگ شاشترە، دانەوێڵەی پێ دەبێژرێتەوە.
قەلبیرە: د. قەڵبیر.
قەڵپ: قەڵب.
قەڵپاخ: قەپڵاخ.
قەڵپ و قوڵاپ: شتی خراپ. خوار و خێچ.
قەڵپووت: چاوێکە کە گلێنەی نەمابێ. گوێزێکە کە بەدارەوە ناوەکەی خورابێ.
قەڵپووز: قەرپووز.
قەڵپووس: قەڵپووز.
قەڵپە: د. قەڵپ.
قەڵپاخ: قەڵتاخ.
قەڵتاخ: قەڵتاغ.
قەڵتاخە کۆن: بریتییە لە مەردوومی پیری ڕزیو.
قەڵتاغ: چوارداره بەچەرمی خاو دادەبەسترێ و دەخرێتە سەر (تەکەڵتووی) زین.
قەڵتاغ لێدان: زینکردنی وڵاخ.
قەڵتاندن: دەرکردن و ڕاڕفاندن.

قەڵتە: د. قورمساخ.
قەڵتەبان: د. مەردوومی نەفام.
قەڵخ: پێستەی گیاندار.
قەڵخان: قەڵغان.
قەڵداس: قەڵڵاس.
قەڵداسوو: قەڵڵاس.
قەلس: گیانداری لاواز (ز). چرووک (با).
قـەڵس: قـاڵس، (قـەڵسـبـوون). قـاڵسـبـوون، (قـەڵسکردن) قاڵسکردن.
قەڵسۆک: ز. لاوازی بێ هێز.
قەڵسی: قاڵسی و سەغڵەتی.
قەڵش: قڵیش.
قەڵشان: قەڵشین.
قەڵشاندن: قڵیشاندن.
قەڵشین: لەتبوونی دار لە سەرباری درێژی.
قەڵغان: شتێکی گردی پانە لە چەرمی ئەستوور دروست دەکرێ و لەکاتی جەنگدا دەکرێ بە بەرهەڵستی شیر و تیری دوژمن.
قەڵغانبازی: بەکارهێنان و هەڵسووڕاندنی قەڵغان زۆر بەباشی.
قـەڵغـانە: نەقـشـێکە لە وێنەی (قـەڵغـان) دروست دەکـرێ لە چیغدا.
قەلفرکردن: بریتییە لە دەربازبوونی یەکێک.
قەڵفەز: تاڤگە.
قەلقولە: ز. لووتەوانەی دەرگا.
قەلقیشک: با. قەلەباچکە.
قەلکردن: هەڵپاچین و قرخکردنی موو. کەلکردن (د).
قەڵڵاس: پرژی گوڵی گەنم و جۆ و برنج.
قەللاش: د. بێ ئابروو.
قەڵماسک: قۆچەقانی.
قەڵماسن: قەڵماسک.
قەڵماسە: قەڵماسن.
قەڵماسەنگ: قەڵماسک.
قەلمراو: باڵندەیەکی ڕەشی مەلەوانی ماسی خۆرە.
قەلنە: قەنگە.
قـەلوبەرد: بریـتـییـە لە دەست تەنگبـوونـی یەکـێک بەجـۆرێک کـە دەستی بە پوولێکەوە بلەرزێ: فلان کەس کەوتۆتە قەلوبەرد.
قەلودەل: قسەزانی بەدەم.
قەلۆکە: پۆڵکە.
قولولوولوو: د. چاوشارکێ.
قەلوون: قەنگە.
قەڵوەز: قۆندەرەکردنی ئاو.
قەڵوەزە: قەڵبەزە.
قەلەباچکە: باڵندەیەکی ڕەش و سپی کلک درێژە بەقونە دەڕوا.
قەلەبازەڵە: قەلەباچکە.
قەلەپڕ: ژەکێکە کە کرابێتە ناو لوولە قامیشێک و بە ئاگر گەرم کرابێ تا بووبێ بە فرۆ.
قەلەخەرمان: قەرەخەرمان.
قەلەڕەش: باڵندەیەکی گەورەی ڕەشی یەک لەتی دەشتییە.
قەلەژارە: قەلەباچکە.
قەلەسابوونی: جۆرە قەلێکی دەنگ ناخۆشی بۆرەڵووکە.
قەڵەش: قڵیش.
قەڵەشان: قڵیشان.
قەڵەشاندن: قڵیشاندن.
قەڵەش بردن: قڵیش بردن.
قەڵەشت: قڵیش.
قەڵەشتن: قڵیشاندن.
قەلەفڕ: قەلەپڕ.
قەڵەم: شتێکی درێژی لووتدارە پێی دەنووسرێ. پارچە پۆڵایەکی لووت درێژە دەخرێتە ناو لووتی (قەڵەمگیر)ەوە و بیرازی پێ دەکـرێ. لقـێکی بێ ڕیشـەیە لە چنار و گـوڵەباخ و هێندێ درەختی تر کە وەک قـەڵەم دادەدرێ و دەڕوێنرێ. ئەندازەیەک لە شـتێک: ئیـمرۆ (قـەڵەم)ێک تووتن یا گـۆشتم کـڕی واتە ئەندازەیەک.
قەڵەمان: قەڵەمدان.
قەڵەمـانێن: جۆرە یارییەکە بەقەڵەمدان دەکرێ، بەم ڕەنگە لە هەر ڕوویەکی ژمـارەیەک دەنووسـرێ و وەک مـۆرەی تاوڵە هەڵ دەدرێ، ئینجـا ژمارەی هەر کـامیـان زۆرتر بێ ئەوەندە دار یا گورز لەوی تر دەدا.
قەڵەمباز: قەڵەمبازد.
قەڵەمبازد: بازدانی گەورەی بەگوڕ.
قەڵەمبڕ: جۆرە چەقۆیەکی تیژە قەڵەمی پێ دادەدرێ.
قەڵەمتاش: قەڵەمبڕ.
قەڵەمتراش: قەڵەمتەراش.
قەڵەمتەراش: قەڵەمبڕ.
قەڵەمچی: کەسێکە هەر خرید و فرۆختی تووتن بکا.
قەڵەم دادان: دادانی قەڵەم بەجۆرێک کە پێی بنووسرێ.
قەڵەمدان: شتێکی درێژکۆڵەی ناو بۆشە قەڵەمی تێ دەخرێ.
قەلە مردارێ: جۆرە یارییەکی دوو دەستەییە بەتۆپ دەکرێ.
قەڵەمڕەو: ناوچەیەکە کە دەسەڵاتی کاربەدەستێک بیگاتێ.
قەڵەمکردن: تاشـینی سەر و ژێری ڕیش بەرێکی. پەیوەندکـردنی درەختێک لە درەختێکی تر. بڕینی سەر لقی دار و درەخت.

قەڵەمگیر: چەکوشێکی لووت کلۆرە قەڵەمی بیرازی تێ دەبرێ.
قەلەموون: بۆقلەموون.
قەلەموونە: قەلەموون.
قەلەندەر: کەسێکە کە دەربەستی جیهان و خواردن و پۆشین و دەستوور و باوی مەردووم نەبێ.
قەلەندەری: بوونی مەردووم بەقەلەندەر.
قەڵەنگ: قەڵاتە.
قەڵەو: گیانداری گۆشتن.
قەڵەوبوون: گۆشت گرتنی گیاندار.
قەڵەوەز: د. قەڵبەزەی ئاو.
قەڵەوی: گۆشتنی.
قەڵێتە: قەڵاتە.
قەلیسێل: ز. گۆشتێکی برژاوە کە ماست و سیری کرابێ بەسەردا.
قەلینجەک: پەنجە تووتە.
قەلین: با. قەلوون.
قەم: لەوح یا تەنەکە یا دارێکی درێژی هەڵکۆڵراوە کە لە بەرزییەکەوە بۆ بەرزییەکی تر ئاوی پێدا بپەرینرێتەوە. کۆتە دارێکی گەورەی ناو هەڵکۆڵراوە ئاوی تێ دەکرێ یا ترێی تێدا هەڵدەگوشرێ. پووتی توور: ئەم توورە قەمە، واتە پووتە.
قەمار: قومار.
قەماندن: با. وشککردنەوەی داری تەڕ بۆ سووتاندنی.
قەمت: ز. دووگوێزە کە بەیەکەوە نووسابن.
قەمتار: د. کەمتیار.
قەمتەر: ئاسنێکە وەک لغاو دەکرێتە دەمی ئێستر و مەیموونەوە.
قەمتەربوون: بریتییە لە زۆر ڕژدی یەکێک بەجۆرێک کە دڵی نەیەت هیچ بخوات.
قەمتەرکردن: قەمتەر خستنە ناودەمی ئێستر و مەیموون. بریتییە لە دەمکوتکردنی یەکێک.
قەمتەرە: بەرگرتنی جۆگەلە ئاوە بەقات قات بە بەرد و گەڵا و گیا و، پلوسک دانانە لە هەموو قاتێکیدا بۆ ئەوەی ئاوەکە بەهێواشی دارژێتە خوارەوە. تا زەوییەکە دانەدرێ.
قەمتەری: بریتییە لە مەردوومی زۆر ڕژدی هیچ بەدەمدا نەچوو.
قەمچ: پێچ و گیر: پارەکەم کەوتە (قەمچ)ی فیسار کەسەوە. لەوێچ (ز).
قەمچان: ل. هەڵمەقۆ.
قەمچاندن: پێچدان.
قەمچک: ز. کلێنچکەی بزن.
قەمچکردن: د. هەڵپاچینی موو بەمەقەست.
قەمچین: چەرمێکی درێژی هۆنراوەیە وڵاخی پی لێ دەخورێ.
قەمزە: غەمرە.
قەمزە نوشتە: قەبزە نوشتە.
قەمک: د. دزی چالاک.
قەمکە: د. قەمک.
قەموور: مەردوومی پشت دەرپەریوی مل بەناودا چوو.
قەمە: تیغێکی دەم پانی درێژە نانوشتێتەوە.
قەمەری: دراوێکی کەم نرخە.
قەمەزەن: فێڵبازی بێ نامووس (د). شیعەیە کە لە شینی دەی محەرەمدا قەمە لە خۆی بدات.
قەمیش: قامیش.
قەن: د. قەند.
قەنارە: دارێکی بەرزی درێژە مەردوومی پێدا هەڵدەواسرێ بۆ خنکاندن. دارێکە چەند قولاپێکی پێوەیە گۆشتفرۆش گۆشتی پێدا هەڵدەواسێ.
قەناری: د. مەلێکی پچووکی دەنگ خۆشە.
قەناس: د. قەنگاس.
قەنج: ز. شتی باش.
قەند: شەکری کەللە یا کولۆ.
قەنداخ: شەکر و ئاوی لە کوڵ.
قەنداغ: قەنداخ.
قەندان: شەکردان.
قەنداو: قەنداغ.
قەندشکێن: شەکرشکێن.
قەندە: قەنگە.
قەندی ئاوی: نێرگەلە.
قەندەدار: کەسێکە کە هەر قەنگە بۆ یەکێک تێ بکا.
قەندەرێژ: تووتنی هەڵتەکاوی پوختەکراو.
قەندەکێش: قەنگەکێش.
قەندەهاری: جۆرە گەنمێکی دەنک وردی بەپێزە.
قەندیلە: نۆکی کوڵاو. قوتیلە.
قەنگاس: ژوور یا جێگایەکە کە سەرێکی پان و سەرێکی تەسک بێ.
قەنگە: سەبیلێکی دارینی کلک درێژە تووتنی پێ دەکێشرێ.
قەنگەدار: قەندەدار.
قەنگەڕێژ: قەندەڕێژ.
قەنگەکێش: کەسێکە کە هەر قەنگە بکێشێ.
قەنگەڵاشک: دڕکی کەنگرە دوای وشکبوونی.
قەنگەهاری: قەندەهاری.
قەنگیلە: قەندیلە.

قەنته: د. قەنگە.
قەنەفلێ: ھ. گوریسی تەنگەی کۆپان.
قەنەفە: کورسییەکی تەسکی درێژی تەنشت و پاڵپشتدارە لە سەری دادەنیشن.
قەنەواچە: تەنراوێکی کەمێک ڕەقە دەخرێتە ناو دووتوێی کاڵاوە بۆ جوان وێستانی.
قەنەوز: تەنراوێکی ئاوریشمینی جوانی لووس و پووسی تەنکی بریقەدارە.
قەینی: گیسکی نابووتی پایزەزێ. هەموو گیاندارێکی پچکۆلانە.
قەنیلە: قەندیلە.
قەواخ: د. قاوغی شت.
قەوارۆک: ز. کاکڵەی فەریکە گوێز.
قەوارە: قەبارە.
قەواش: ز. کەوگیر.
قەواق: ز. کەسێکە کە گۆزە و دیزە دروست بکا.
قەواڵە: قەباڵە.
قەوان: شتێکی تەنکی گردی پانە دەخرێتە سەر سندوقی گۆرانی و پێی لێ دەدرێ. قاپووڕی فیشەک. بریتییە لە دەنگوباسی هەڵبەستراو: ئەمە قەوانی ئەمڕۆیە.
قەوانچە: د. حەوانچە.
قەوانچەدان: د. حەوانچەدان.
قەوتی: ز. چاودێری و سەرپەرشتی شت (وصایة).
قەوتیکردن: وەسیەت کردن.
قەوچە: دەم بەیەکدادانی کەر، قەوچە قەوچ: قەوچەی یەک لەدوای یەک.
قەوچەبوون: بریتییە لە گەوشەکبوون.
قەوچەکردن: بریتییە لە گەوشەککردنی یەکێک. دەم بەیەکدادانی کەر.
قەور: قەبر.
قەوران: گۆڕستان.
قەورخە: د. قەبرغە.
قەورسان: قەبرستان.
قەورکەن: قەبر هەڵکەن.
قەورکەنە: گۆڕ هەڵکەنە.
قەورە: ل. بڕبەند.
قەوزە: جۆرە ملتەیەکی سەوزە لەناو ئاودا پەیدادەبێ.
قەولانن: قەبلاندن.
قەول و بڕ: پەیمان بەستن لەگەڵ یەکێکدا بۆ کردنی کارێک.
قەول و بڕی: قەول و بڕ.
قەولەق: ز. کلتور.
قەومان: ڕوودانی شتێکی ناخۆش.
قەوماندن: بەرپاکردنی کارێکی گرنگی ناخۆش.
قەوماو: کارێکی ناخۆشی گرنگ کە ڕووی دابێ.
قەومە: د. ڕووداوێکی ناخۆشە کە ڕوویدا (کارثة) لە قەومانەوە وەرگیراوە.
قەومیان: قەومان.
قەومین: قەومان.
قەوی: بەهێز.
قەوین: قەوی.
قەهبک: با. قەحبە.
قەی: ترس: قەی ناکات، واتە ترسی تێدا نییە.
قەیاخ: گیایەکی بەهارییە وەک گەنم وایە لە گەڵا و باڵادا، بۆ ئاژاڵ زۆر باشە. قەیاغ.
قەیاخەوان: کەسێکە کە قەیاغی ئاوی لێ بخوڕێ.
قەیار: زیادەی سمی وڵاخی یەکسم. پنج (ز).
قەیارە: قەمە.
قەیاسە: پارچە کەژوویەکی پانە، سەری پارچە گوریسێک یا قایشێکی تێ هەڵدەکێشرێ، سەرەکەی تری ئەڵقەیەکی پێوەیە لەسەر بارەوە تەنگەی وڵاخی پێ دەدرێ.
قەیاغ: جۆرە کەڵەکێکە ئەم بەر و ئەوبەری ئاوی پێ دەکرێ.
قەیاغەوان: قەیاخەوان.
قەیتان: چەند تاوە دەزوو یا ئاوریشمێکی هۆنراوەیە دەگیرێ بەلێواری هێندێ کاڵادا.
قەیتەران: گیایەکە، گەڵای وەک گەڵای کەرەوز وایە لاسکەکەی وەک موو باریک و ڕەشە، بەقەد شاخێکەوە سەوز دەبێ کە ئاوی پێدا بێتە خوارەوە، بۆ دەردی گورچیلە زۆر باشە.
قەیچی: مەقەست.
قەید: ئاسنێکی تەنکی پانی درێژە، فەردەی کوتاڵی پێ قایم دەکرێ. قەی: قەیدی نییە، واتە قەی ناکات.
قەیدک: ز. ناوەندی قاپ و سمی وڵاخ.
قەیران: ماوەیەکە لە کات کە لە لایەن پزیشکەوە دادەنرێ بۆ مردن یا ڕزگاربوونی کەسێک کە زۆر نەخۆش بێ.
قەیرە: قەدرە.
قەیسەر قووکردن: بریتییە لە چاوەڕوانی کردنی یەکێک لە شوێنێک بەتەنهایی.
قەیسەری: چەند دوکانێکە کە سەریان بەتاق گیرابێ.
قەیسی: میوەیەکی خڕی زەردی مزری ناوک ڕەقە وەک قۆخ وایە بەڵام ئەم پچووکترە.
قەیسی و ڕۆن: خواردەمەنییەکە لە قەیسی و ڕۆنی داخکراو دروست دەکرێ.

قەیفە: پارچە تەنراوێکی لووس و پووسی تووکنە.
قەیفەیی: شتێکە ڕەنگی وەک ڕەنگی قەیفە وابێ.
قەیلۆک: داهۆڵ.
قەیماخ: قەیماغ.
قەیماغ: چەند توێژاڵێکی شیرە دەدرێ بەسەر یەکدا. پەڵوولەیەکی چەورە دەکرێ بۆ زەیستان.
قەیناغ: ز. دەسکێشی سەپان.
قیبلە: خانەی خوا لە شاری مەککە کە هەموو موسڵمانێک لە نوێژدا ڕووی تێ دەکا.
قیبلەنما: شتێکە وەک سەعات قیبلەی پێ دەدۆزرێتەوە.
قیتکە: پارچە گۆشتێکی زیادە لەناو زێی ئافرەتدا.
قیچ: کێچ.
قیخا: ز. کوێخا.
قیدقید: قرتە قرتی مریشک.
قێز: هەڵشێوانی دڵ لە شتێک.
قێزشێوانەوە: دڵ هەڵشێوان.
قێزشێویانەوە: د. قێزشێوانەوە.
قێزکردنەوە: دڵ هەڵشێوان لە شتێک.
قێزەوون: د. شتێکە کە دڵی لێ هەڵبشێوێتەوە.
قیسب: لقەدارێکی باریک و درێژە دەکرێ بەخێزەرەی خانوو. قۆرت و چورتم (د).
قیست: تووڵە زەرە.
قیفاڵ: ڕەگێکە لە ئەندامدا. لە هێندێ نەخۆشیدا خوێنی بەر دەدرێ.
قیلکە: د. چیلکە.
قیلومک: ز. کرژبوونی ئەندام.
قێلیچ: با. توێکلی گوێز و بادام و قەزوان.
قیت: شتی قوت. ڕۆنێکە کە بە (دۆخە) وەرگیرێ (ز).
قیتک: ز. قولی مەردووم.
قیتە قیت کردن: مل قوتکردنەوە و تەماشاکردنی یەک لەدوای یەک.
قیتەڵ: گیانداری قوتی پچکۆلەی نەشمیلە.
قیتەڵە: قیتەڵ.
قیچ: شتی قنج. خێل و خوار. شتی کەم: (قیچ)ێکم ئاو بدەرێ واتە کەمێک.
قیچک: ز. قیتک.
قیچکردنەوە: تەماشاکردن بەنیوە قووچاندنی چاوێک لە ڕووی گاڵتە پێکردنەوە.
قیر: جۆرە کانێکی ڕەشی شلە ڕێگای پێ قیرتاو دەکرێ.
قیراخکردن: ز. خۆکۆکردنەوە و داوێنکردن بەلادا بۆ ڕێ ڕۆین.

قیر بەقەرەس: قیروسیا.
قیرپاچ: قەمچی.
قیرتاو: شوێن یا شتێکە کە قیری تێ هەڵسووراب‌ێ.
قیرتاوکردن: هەڵسوونی قیر لە شتێک.
قیرتەبەق: سەلەیەکی پووشبینە کە قیرتاو کرابێ.
قیڕ: قیر. ژاری سەبیل و قەنگە.
قیڕاندن: قیڕەکردنی گیاندار.
قیڕانن: قیڕاندن.
قیڕە: دەنگی قەبەی بەرزی ناساز، (قیڕەقیڕ) قیڕەی یەک لە دوای یەک، (قیڕ و هووڕ) قیڕەقیڕی زۆر. مەردوومی قۆڕ: ئەوەندەی هاوارکرد (قیڕە) بوو.
قیڕە بوون: بریتییە لە دەنگ دەرهاتن لەبەر زۆر قیڕاندن. قۆڕبوون.
قیڕەکردن: قیڕاندن.
قیڕەکەر: بریتییە لە گیاندارێک کە لە باریدابێ بقیڕێنێ.
قیڕەگون: کەسێکە لەبەر زۆر قیڕاندن قۆڕبووبێ.
قیرسیا: قیروسیا.
قیرسیچم: قیرسیچمە.
قیرسیچمە: مەردوومێکە کە لە کاروباردا لاسار و بەگیروگرفت بێ.
قیرقاج: د. قیرقاچ.
قیرقاچ: وەرگەڕانەوەی سوار بەهەموو لایەکیدا لە کاتی تاودا بۆ تفەنگ تەقاندن.
قیروسیا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتێکدا کە کارێکی خراپ قەومابێ وتۆش ڕقت هەڵسابێ و لە ڕقاندا ئەو کارە خراپەت لەلا مەبەست نەبێ.
قیروقاچ: قیرقاچ.
قیرەتاو: قیرتاو.
قیری: شتێکە لە ڕەنگدا وەک قیر وابێ.
قیرین: شتێکە لە قیر دروست کرابێ.
قیزشێویانەوە: د. قێزکردنەوە.
قیزەوون: د. قێزەوون.
قیژاندن: قیژەکردن.
قیژانن: قیژاندن.
قیژۆک: ز. باڵندەیەکی سەوزە دەقیژێنێ.
قیژ و واژ: د. قیژ و هووڕ.
قیژە: جۆرە دەنگێکی بەرزی باریکی ناسازی گیاندارە، (قیژەقیژ) قیژەی یەک لەدوای یەک، قیژ و هووڕ: قیژەقیژی زۆر.
قیژەکردن: قیژاندن.

قیسکە تەنگ: مەردوومی کەم چیکڵدانە.
قیڤار: ز. گیایەکە دڕکاوییە کەر زۆری حەز لێ دەکات.
قیقبوون: ز. لاوازبوون.
قیقی: ز. دارکونکەرە.
قیقیداوکە: زیقاولە.
قیلکە: د. چیلکە.
قیمە: گۆشتی کوتراو.
قیمە قیمە: شتی لەت لەتی ئەنجن ئەنجن.
قیمەکردن: وردکردنی گۆشت و کردنی بەقیمە.
قیمەکێش: ئاسنێکی دەمپانی تیژە گۆشتی پێ قیمە دەکرێ.
قین: ڕق.
قیناوی: کەسێکە ڕقی ئەستووربێ.
قین ئەستوور: کەسێکە کە ڕقی هەستا درەنگ دامڕێتەوە.
قین جواندن: د. ڕق هەستاندن.
قین جوین: ڕق هەستان.
قین خواردنەوە: ڕقخواردنەوە.
قینکێشان: ڕق هەڵگرتن لە یەکێک.
قین لە دڵ: قیین لە سک.
قین لە سک: مەردوومی قیناوی.
قینوون: د. قیناوی.
قینەبەری: ڕقەبەری.
قینەقینەدان: قین هەستاندنی یەکێک.
قینەکێشان: ڕقە کێشان.
قینە ون: د. ڕق ئەستوور.
قین هەستان: ڕق هەستان.
قین هەستاندن: ڕ قهەستاندن.
قین هەڵسان: قین هەستان.
قین هەڵساندن: قین هەستاندن.
قین هەڵگرتن: ڕق هەڵگرتن.



کا: لاسکی وشکەوەبووی گەنم و جۆ و کزن و گەلێ شتی تر.
کـاک: (کـا) مـحـەمـەد. کـوانێ (ز) بکا: بە نەریمان بلــێین زوو (کا) واتە زوو بکا.
کائین: ز. کاوێژی وشتر و گیانداری تر.
کاب: با. میچ.
کابان: کەیبانوو.
کابانی: با. میچێن.
کــابرا: بریـتــیـیــە لە کــەسـێـک کــە نەتەوێت ناوی بەریت یا نەیناسیت.
کابە: خانەی خوا لە شاری مەککە کە لە نوێژدا ڕووی تێ دەکرێ.
کاپان: ز. ڕێگای تەسک و تەنگەبەر.
کاپک: ز. پارچە گوریس.
کـاپۆخ: ز. کـەسێکە کـە بەکرێ گـیـرابێ بۆ کـۆکـردنەوەی گـیـای دروێنەکراو و کردنی بەخەرمان بۆ گزرە.
کاپۆل: ز. کایەکە کە زۆر ورد بووبێ و خۆڵی تێکەڵ بووبێ.
کاپۆڵ: د. کەپوو.
کاپۆڵک: د. کاپۆڵ.
کاپێچ: ژانێکە دووچاری ئاژاڵ دەبێ لە زۆر خواردنی کا وە.
کـات: دەمـێـکی کـەم. گـەنم و جـۆیەکـە کـە لە جـاری پێـشـووی ڕوابێتەوە.
کاتار: ز. پۆینەی کەڵەشێر.
کاتژمێر: سەعاتێکە کە کات دەژمێرێ.
کاتە: با. وەچ.
کاخڵی: گیایەکی بەهاری بەرزە گوڵێکی زەرد دەردەکا، دەدرێ لە ڕووی گاڵگاڵی بۆ زەردی و جوانی.
کادان: کایەن.
کادز: ز. کێڕی کاکە شان لە ئاسمان.
کادوو: دوکەڵی کا.
کادە: با. کولیچە.
کادێن: کایەن.
کادی: با. کادوو.
کادین: ز. کادان.
کــادین مــێـشـی: ز. ژوورێکی پچکۆڵەیە پوورەی هەنگی تێـدا دادەنرێ.
کـار: سـاوای بزنە تا دوو سێ مـانگانە. ئیش و فرمـان. پیـتـێکە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بەئیشکەر (فـاعـل): کرێکار، بەد (کار).
کاراک: ز. کانی ئاسن.
کارامە: مەردوومی دەرهاتووی کارزان.
کارامەد: کارامە.
کارامەیی: وریایی و ئامادەیی یەکێک لە کارێکدا.
کاربڕ: د. بریتـیـیە لە یەکـێک کە کاروباری مـەردووم ببڕێتەوە، وەک قازی و حاکم.
کاربەدەس: کاربەدەست.
کاربەدەست: کەسێکە لە کاروباردا هەرخۆی حل بێ.
کار پێ سپاردن: سپاردنی کارێک بەیەکێک.
کار پێسپێراو: کەسێکە کە کارێکی پێ سپێردرابێ.
کـارت: سـەوزاییـیـەکـە لە جـاری پێـشـووی ڕوابێـتـەوە. پارچە نووسراوێکی چاپکراوە بەناوی یەکێکی تایبەتییەوە.
کارتمۆک: ز. گوڵێکی زەردە پێی دەڵێن چاوەگا.
کارتە: کارتی سەوزایی. وەچی توتن.
کارتێ: هەسان.
کارتێکەوتن: حەوجەتێ کەوتنی یەکێک بە یەکێک لە کارێکدا.
کارتێنک: د. پەسپە سەکۆڵە.
کارتێنە: د. کارتێنک.
کارتیخ: جۆرە برپەندێکی وردە.
کارتیغ: کارتیخ.
کارتیک: ز. کارتیغ.

کارچین: ز. جۆرە هەرمێیەکی زۆر خۆشە.
کارخانە: شوێنێکە کە وەستا و شاگرد هەمیشە کاری تێدا بکەن وەک کارخانەی شەکر و جگەرە. بریتییە لە قەحبەخانە.
کارخانەچی: بریتییە لە کەسێک کە خاوەنی قەحبەخانە بێ.
کارخستن: خستنەکاری شتێک: برۆ بەکارخستنی خۆتەوە خەریک بە.
کارد: چەقۆ (ھ). کێرد.
کاردانەوە: کردار یا گوفتارێکە کە لە یەکێکەوە دەرچێ لە وەرامی کردار یا گوفتاری یەکێکی تردا کە بەعەرەبی پێی دەڵێن: (رد الفعل).
کاردروست: کەسێکی ژیری زانای دانای وردی تێبین.
کاردۆژە: د. کاردەوەژە.
کاردوو: گیایەکی بەهارییە گەڵایەکی لاسک درێژی هەیە بەکاڵی زۆر تیژ و بڕندەیە لە پاش زەردکردنی دەخورێ.
کاردو و پەنێر: د. بریتییە لە دوو شت کە هەرگیز کۆنەبنەوە.
کاردووە ڕەشە: جۆرە کاردوویەکی گەڵا پانە دەکرێ بە یاپراخ.
کاردووە کوڕانە: جۆرە کاردوویەکە.
کاردوومارانە: جۆرە کاردوویەکە ناخورێ.
کاردەپەلە: د. مەلێکە پێی دەڵێن تەڕنە ئەبابیلە. زبر بوونی ئەندام لە سەرمان.
کاردەوەژە: هەڵکۆڵینی شت بەچەقۆ. بریتییە لە ملۆمووش و زۆر خواردن لە شتێک: ئەمەندە لەم خواردنە (کاردەوەژە) مەکە. فەریکە گوێز (ھ).
کاردی: کاردوو.
کاڕک: میوەی کاڵ و نەگەیو.
کاڕووش: گیایەکە لە هەرزن دەچێ بەڵام ئەم تۆوەکەی ڕەشە و باڵای بەرزترە.
کارزان: کارامە.
کارزۆرەکی: د. بێگاری.
کارژۆلە: بەچکەی ساوای بزن.
کارژەلە: کارژۆلە.
کارژێلە: کارژۆلە.
کارس: ز. هەرزن.
کارساز: ناوی خوایە: ئەی کەریمی کارساز.
کارک: کارگ. کاڵە (با). کارژەلە (ز).
کارکردن: جێگیربوونی قسەیەک لە دڵدا: قسەی پیاوی ڕاست (کاردەکا). تائسیرکردنی دەرمانێک یا خواردنێک لە جەستە بەچاکی یا بەخراپی.
کارکردە: کەسێکە لە پیشەیەکدا شارەزابێ.
کارکەنار: کەسێکە بەپێی تەمەن ماوەی فەرمانی دەوڵەتی تەواو کردبێ و لێ خرابێ (متقاعد).
کارکەناری: لێکەوتن لە کارێک.
کارگ: قارچک.
کارگا: د. کارگە.
کارگوزار: کەسێکە کە کارێکی پێ سپێردرابێ (ساعی) کەسێکە ئەو کارەی کە پێی بسپێردرێ باشی بکا.
کارگوزایی: بەجێ هێنانی کار بەباشی.
کارگە: کارخانەی پیشەسازی.
کارگەچێ: کەسێکە کە فەرەنجی و لباد دروست بکا.
کارگەر: کەسێکە کە لە (کارگە)دا پیشەسازی بکا.
کارماخ: ز. بێژنگی گەورە.
کارناس: کەسێکە لە باسێکی زانستیدا بکۆڵێتەوە (باحث).
کارنامە: د. دەفتەرێکی تایبەتییە کە کاروبارێکی تایبەتی تێدا دەنووسرێ.
کاروا: د. کارەبا.
کاروان: چەند وڵاخ و بار و زەلامێکە لە جێگایەکەوە بچن بۆ جێگایەکی تر.
کاروان ئاشی: چێشتی هێلکاو.
کاروانچی: کەسێکە کە کاروان لێ بخوڕێ.
کاروانسەرا: خانوویەکی گەورەیە کە کاروان تێدا بخا.
کاروان قڕان: کاروانکوژە.
کاروانکوژ: د. کاروانکوژە.
کاروانکوژە: ئەستێرەیەکی گەشە هێندێ جار زۆر لە پێش بەیاندا هەڵدێ و کاروانچی بەئەستێرەی بەیانی دەزانێ و بار دەکات.
کاروانە: د. جۆرە باڵندەیەکی دەنووک درێژە بەقەد مراوییەک دەبێ.
کاروانە کردن: بریتییە لە زۆر هاتوچۆکردنی شوێنێک.
کاروانی: کەسێکە لەگەڵ کارواندا بێ.
کاروبا: د. کارەبا.
کاروبار: ئیشوکار.
کارووس: ز. گیایەکی بۆن خۆشە تێکەڵی هێندێ خواردن دەکرێ.
کارووش: ز. کاڕووش.
کارەبا: شتێکی زەرد یا ڕەشە دانەی تەزبیحی لێ دروست دەکرێ و پووش و کا ڕادەکێشێ. هێزێکە لە گەلێ شتدا هەیە و بەمەکینەی تایبەتی وەردەگیرێ ئینجا یا ژووری پێ ڕووناک دەکرێتەوە بەگوڵۆپ یا مەکینەی پێ دەخرێنە کار، هەروەک گەلێ شتی تریشی پێ دەکرێ.
کارە ڕەهات: پەرێشانی بەهۆی زۆر لێدان یا زۆر جنێودان یا زیان پێگەیاندن یا سەرنانە سەرەوە.
کارەسات: کارە ڕەهات لە عەرەبییەوە وەرگیراوە.

کارەکەر: ئافرەتی بێگانەی بەردەستی ئیشکەر لە ماڵدا.
کارەکەو: ز. ڕاوکردنی کەو بەکۆمەڵ.
کارەگا: د. کارگا.
کارەوا: د. کارەبا.
کارەوان: شوانی کار.
کارپێچ: ز. شەن.
کاریز: ئاوێکە کە لە بیر و لەغەم لێدانی زەوی پەیدا بووبێ. شوێنی فێنک (ز).
کاریزاو: ئاوێکە لە کاریز بێتە دەرەوە.
کاریزکەن: کەسێکە کە کاریز لێ بدا.
کاریزلێدان: هەڵکەندنی کاریز .
کاریزە بازاڕ: سەرکانی و ئاوێکە کە دێهاتی دەچن شتی تێدا دەکڕن و دەفرۆشن.
کاری: دەردی کاریگەر دەردەکەم (کاری)یە، کاردوو (با). جۆرە گیایەکی ئاوییە (ز). دوکەڵ (با).
کاریتە: نیرگەی خانوو.
کاریگەر: وەستایەکە لە کاری خۆیدا شارەزا و ئیشکەر بێ. دەرمانێکە کە کار بکا لە جەستەدا بەچاکی یا بەخراپی.
کاریلە: کارژۆلە.
کارین: ز. توانین.
کازێوە: کازیوە.
کازیوە: بەرەبەیان.
کاژ: توێکڵێکی تەنکە لە پێستی هێندێ گیاندار دەبێتەوە. داری سنەوبەر (با). بەکرەی کندر (ز).
کاژاوی: جۆرە ترێیەکی ڕەشی بزمارکوتی مزرە.
کاژەڕە: کاژەڵە.
کاژەڵاک: کاژەڵە.
کاژەڵە: کاسەی سەر.
کاژێر: دەلاقەی ناودیوار. شەویلە. گۆشە و سووچ.
کاژێڵە: د. کاخڵی.
کاس: گیانداری وڕ و گێژ. کەڕ (ل). شتی کولۆر و بۆش.
کاساڵاشینکە: کەندەسمە.
کاسبوون: وڕوگێژبوون.
کاسبی: خەریکبوون بەکسب و کارەوە.
کاسک: سەوزی مەیلەو زەرد. گڵێنە (ز).
کاسمە: نانێکی تیرییە کە ڕۆن کرابێتە هەویرەکەیەوە.
کاسنی: د. گیای چەقچەقە.
کاسۆ: قەشۆ.
کاسە: جۆرە دەفرێکی دارینە.
کاسە ئاوسێ: دوو دراوسێن کە ناو بەناو چێشت بۆ یەکتری بنێرن.
کاسەسفرە: چێشتێکە کە بنێردرێ یەکەم جار بۆ دراوسێیەکی تازە.
کاسەسەر: ئێسقانێکی گەورەی خڕە مێشکی گیانداری تێدایە.
کاسە سم: کاسەی سمی وڵاخی دووسم.
کاسە شۆر: گیایەکی گەڵاپانی ئەستووری زبرە.
کاسەشەن: جۆرێکە لە بێڵەدارینە بەڵام ئەم دەمی درێژە، خەڵەی پێ ئەم دیو و ئەودیو دەکرێ.
کاسەلێس: بریتییە لە مەردوومی پاشماوە خۆر.
کاسەلێسی: خەریکبوون بەخواردنی پاشماوەوە.
کاسەمەن: جۆرە کاسەیەکە هەر شتی پێ دەپێورێ.
کاسەی ئەژنۆ: چاڵاییەکە لە سەری خوارووێ ئێسقانی ڕاندا کە سەری ژوورووی لوولاقی تێدا دەجووڵێ.
کاسەی سمت: چاڵاییەکە لە لای ڕاست و چەپی ئێسقانی سمتەوە کە ئێسقانی ڕانی تێدا دەبزوێ.
کاسەی سەر: کەللەی سەر.
کاسەی فەقیران: د. سفرەی فەقیران.
کاسەی هەتیوان: د. کاسەی فەقیران.
کاسی: گێژی و وڕی.
کاش: شیشی گۆشت برژاندن. کێڵانی زەوی (د). تەپۆڵکە (ز).
کاشخانک: با. بنمیچ.
کاشکای: کاشکی.
کاشکایە: کاشکی.
کاشکایەکوو: کاشکی.
کاشکایەکی: کاشکایەکوو.
کاشکرن: ز. ڕاکێشانی شت لە بەرزییەوە بۆ نزمی.
کاشکی: بریا.
کاشمە: گیایەکی کوێستانی بەهاری بۆن خۆشە بەسوورەوەکراوی دەخورێ و، دەکرێتە ناو کەشک و سوێرەکەوە.
کاشوانێ: با. شەقێن.
کاشوو: با. دارێکە کە یاری شەقێنی پێ دەکرێ.
کاشی: دەفرێکی لووس و پووسی گڵینی بەئاگر سوورەوەکراوی تەنکی جوانە.
کاشیساز: کەسێکە کە کاشی دروست بکا.
کاغەز: قاقەز.
کاغەزدان: بەرگێکی مقەبایە کە وردە کاغەزی تێ بکرێ.
کاغەزساو: شتێکی قورسی لووسە کاغەزی پێ لووس دەکرێ.
کاف: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
کافرمان: گوێزانی سەرتاش.
کافرۆش: کەسێکە کە پیشەی هەر فرۆتنی کا بێ.
کافوور: شتێکی سپی ساردی بۆن خۆشی بەنرخە بۆ گەلێ شت بەکاردێنرێ.

کاڤر: ز. کاوڕ.
کاڤڕی: با. ناوە بۆ جۆرە هەناریک.
کاڤل: ز. کەلاوە.
کاسە ئاوسێ: دوو دراوسێن کە ناو بەناو چێشت بۆ یەکتری بنێرن.
کاک: برای گەورە. جۆرە نانێکی ناسک و خۆشە بەبەرچایی دەخورێ (د).
کاکاو: شتێکە وەک قاوە لێ دەنرێ و بەشەکرەوە دەخورێتەوە.
کاکشان: د. کاکەشان.
کاکڵ: کاکڵە.
کاکڵە: ناوکی گوێز و بادام و شتی تر.
کاکڵە شێران: د. یاریی چاوشارکێ.
کاکڵە قووچە: کاکڵەی گوێزە کە بەچوارگۆشەیی بێتە دەرەوە.
کاکڵە مووشان: د. پەسپە سەکۆڵە. تاوی جاڵجاڵۆکە. حەمامۆکێی منداڵان.
کاکڵی: گوێز.
کاکنج: د. بووکی پشت پەردە کە هێشتا زاوا نەچووبێتە لای.
کاکوچ: ز. چەکوش.
کاکوچیل: ز. چێشتی ترخێنە.
کاکۆڵ: مووی پشتی سەری پیاو کە بەقرتاوی هێڵرابێتەوە.
کاکۆڵ مەل: د. فشە کلاونە.
کاکە: کاک.
کاکەشان: کێرێکی سپی پانی دوورودرێژە لە ئاسماندا بەهۆی زۆری ئەستێرە و کۆبوونەوەیان لەو جێیە پەیدا بووە.
کاکەلێ: وتەیەکە لە رووی خۆشەویستییەوە دەوترێ بەمەردووم .
کاکەیی: ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد.
کاکێژ: د. قەڵبیر.
کاکێشان: کاکەشان.
کاکی: کاکە.
کاکی بەکاکی: دەشتی پانی دوورودرێژی چۆڵ و هۆڵ.
کاکیلە: شەویلە. کاکەلێ.
کاگڵ: سواغی قوڕ.
کاگەز: د. کاغەز.
کال: ز. پیر. خزم و خوێش.
کاڵ: شتی نەگەیو. ڕەنگێکە کە تێر نەبێ: ئەم سوورە یا ئەم سەوزە (کاڵ)ە. نەکوڵاو: گۆشتەکە هێشتا کاڵە. لەدوای وتەی کشتەوە بەکاردێنرێ: کشتوکاڵ. پیر. باپیر.
کالا: کەلوپەلی پۆشین. کوتاڵ.
کالات: د. تالان: بەکالات چوو.
کالاقنگ: گیایەکی کوێستانی بەهارییە لە ناوەڕاستدا نێرکێک دەردەکا پێی دەڵێن ڕێواس.

کالان: کێلان.
کالانە: چالاییە کە گلێنەی چاوی تێدایە.
کالانی: ز. کێردێکە کە کالانی ببێ.
کالبوون: ز. پیربوون.
کاڵبوونەوە: چوونەوەی ڕەنگ.
کالک: دبا. کاڵە.
کاڵک: کاڵ.
کالۆش: شتێکە لەسەر پێڵاوەوە لە پێ دەکرێ بۆ ناو قوڕ.
کاڵ و کرچ: شتی زۆر کاڵی نەگەیو.
کالومە: ز. شمشێری ژەنگاوی کێلان شکاو.
کاڵە: چەرمێکی خاوە لە بەفر و باراندا لە جیاتی پێڵاو لە پێ دەکرێ و بەبەن دەپێچرێ.
کاڵە بروێش: د. بروێش.
کاڵەپێ: ئەندازەیەکە لە بەفر کە ببارێ بەقەد ئەستووری کالایەک: کاڵەپێیەک بەفر باریوە.
کاڵەپێچ: پەڕۆیەکە لە پێوە دەئاڵێنرێ و کاڵەی لەسەرەوە لە پێ دەکرێ.
کاڵەشێف: زەمینێکێ کێڵراوە کە لە پاش کێڵانی باران لێی نەدابێ.
کالەک: ز. خزم و خوێش.
کاڵەک: میوەیەکی خڕی گۆشتنی خۆشی گەورەیە ناوەکەی تۆوی تێدایە. کلاش (با). کاڵە (با)
کالەکال: ز. بارەباری مەڕ لە کاتێکدا کە بەرخەکەی ببینێت.
کاڵەکوت: مێژێکە کە بەدەسک و دۆڵ یا بەدەسکەوان کوترابێ و کرابێ بە شەربەت.
کاڵەکەمارانە: گیایەکی دێمییە دوو جۆری هەیە، یەکێکیان وەک مێو تەرز دەهاوێ و بەرێکی خڕ دەگرێ و دەخورێ، ئەوی تریان بەرەکەی وەک شووتی کۆڵە وایە و زۆر تاڵە پێی دەڵێن (کووژاڵک)
کاڵەمستانە: کاڵەمستێ.
کاڵەمستێ: جۆرە یارییەکە یەکێک شتێک دەشارێتەوە لە قوولی مستیدا. هەرکەس دۆزییەوە دەیباتەوە.
کاڵەمشتێ: کاڵەمستێ.
کاڵەوبوون: د. کاڵبوونەوە.
کاڵەهێش: د. زەمینێکە کە یەکجار تۆوی پێوەکرابێ.
کالێ: د. منداڵی سپیکەلە. دەکرێ بەناوی کچ.
کالیار: ترۆزی گەورەی گەیو.
کالیماست: ز. گەنمێکە لەسەر خەرمان بدرێ بەهەژار بەلام بەناوی زەکاتەوە نەبێ.
کالیان: د. هەڵکالین بەسەر یەکێکدا.

کالیسکە: د. گالیسکە.
کالیۆش: د. جۆرە خواردەمەنییەکە لە کشمیش و گوێزی کوتراو و ڕۆن و کەشک دروست دەکرێ.
کالّی: نەگەیوی میوە. نەکولاّوی گۆشت: میوە، یا گۆشت بەکالّی ناخورێ.
کالیت: د. کۆلیت.
کالیتگا: د. شوێنی کۆلیت.
کالّێن: د. کێلان.
کام: وتەیەکە پرسیاری پێ دەکرێ بۆ ناونووس (تعین)کردنی شتێک لە ناو چەند شتێکدا: ئەمانە (کام)یان کوڕی تۆیە. ئارەزوو: بە(کام)ی خۆی گەیشت.
کام ئاژنین: شووژن کردن بەمەلاّشووی کەردا لەکاتێکدا کە کامی کردبێ.
کاماخ: ز. سمتی ئادەمی و گیانداری تر.
کامار: ز. کەمەی بێژنگ و دەف.
کاماش: ز. تووتنێکە بەسەوزی وشک کرابێتەوە.
کاماف: ز. ئاوێکە کە لە جۆگەدا مابێتەوە دوای برینی لە سەرچاوەوە.
کامباخکردن: ز. وێرانکردن.
کامکردن: هەلاّوسانی مەلاّشووی ولاّخی یەکسم لە حەلێکدا کە ولاّخێکی تر لەبەرچاوی ئەم ئالیک بخوا.
کامڵ: شتی پێگەیشتووی گەیو.
کامۆخ: ز. کەسێکە کە ترێ بگوشێ.
کامۆیی: با. کامکردن.
کامە: وتەیەکە پرسیاری پێ دەکرێ بۆ ناونووس (تعین)کردنی شتێک لە ناو چەند شتێکدا: ئەمانە (کامە)یان هی تۆیە.
کامەتا: کامە.
کامەتانێ: کامە.
کامەتە: کامە.
کامەران: کەسێکە کە بەئاواتی خۆی گەیشتبێ.
کامەرانی: بەئاوات گەیشتن.
کان: کونێکە کە دارتاش بەئەسکەنە لە دار هەڵی دەکەنێ. جێگایەکە لە زەویدا کە دەستی سروشت شتێکی تێدا دروست کردبێ وەک زێڕ و زیو و بەرد و نەوت.
کانگا: شوێنێکە کە شتێکی تێدا پەیدا ببێ بەزۆری: سلێمانی (کانگا)ی لۆکە و تووتن و میوەیە.
کانگە: کانگا.
کانوون: دوو مانگە لە ناوەندی تشرینی دووەم و شوباتدا لە ساڵی ڕۆژی، کانوونی یەکەم مانگی دوازدەهەمە سی و یەک ڕۆژە، کانوونی دووەم مانگی یەکەمە و سی و یەک ڕۆژە.
کانوونی: باڵندەیەکی ئاوی ماسی خۆرە وەک قەلمراو وایە بەلاّم ئەم بۆرە.
کانە زبانە: کانێکە کە زبانەی داری تێ دەخرێ.
کانە زووانە: کانەزبانە.
کانە شکاف: کانە شکافە.
کانە شکافە: کانێکی درێژکۆلەیە دارتاش بەشتێکی تایبەتی هەڵی دەکەنێ لەسەر باری درێژی بۆ تێبردنی شووشە یا تەختە.
کانەشکاو: د. کانەشکاف.
کانەنیا: د. ڕواندن.
کانێ: ز. کوانێ.
کانیاو: ئاوی کانی.
کانی: ئاوێکە لە خۆیەوە هەڵ قوڵێ.
کانیلە: کانیاوی پچووک.
کاو: کەژی گری دڕ. کەوورگ: (د). مەردوومی بەدەعیە و دەمار (ز). تاقی ناو شاخ. قین و ڕقێکە کە لە دڵدا پەسمەندە بووبێت دەربارەی یەکێک و پێی بڕێژێت: کاوی دڵی خۆی پێ ڕشت، واتە بەدڵی خۆی قسەی پێ وت و، دڵی خۆی سارێژکرد. زەرد.
کاواتر: هـ. کۆتر.
کاوان: هـ. ملە.
کاوانەوە: چووزانەوە.
کاودان: قاورمە.
کاولاش: کاول، لە کەلاوەی ئاشەوە وەرگیراوە.
کاولی: قەرەج. بێ شەرمی بێ ئابڕوو.
کاوڵی: کاولی.
کاووڕ: ساوای مەڕە لەپاش برینەوەی بەرگنەکەی تا یەک ساڵانەی.
کاوول: جێگای وێرانی چۆڵ.
کاوول بوون: وێرانبوون .
کاوول کردن: وێرانکردن.
کاوە: ئازار و ئێشێکە کە لە ئەندامی مەردووم پەیدا ببێ بەهۆی ئیشی زۆرکردنەوە. ناوە بۆ ئاسنگەرێکی کورد کە (زوحاک)ی کوشت.
کاوەخۆ: هێواشی لەسەرخۆ: فیسار کەس زۆر کاوەخۆیە، واتە لەسەرخۆیە.
کاویان: د. چووزانەوە.
کاویانەوە: د. کاوانەوە.
کاوێژ: جوونەوەی ئاژاڵ شتی ناو سکی خۆی بەیەق کردنەوەی بۆ ناو دەمی.

کاوێژکەر: گیاندارێکە کە کاوێژ بکا.
کاویر: ز. وشتر خوار.
کاوین: د. مارەیی ژن.
کاهوو: گیایەکی گەڵا پانی بەهاری ناوەڕۆک چەوری سەلکدارە، زۆرتر بە سرکەوە دەخورێ.
کاهەرزانی: هـ. هەنجیری ڕەشی زل.
کاهێڵ: د. مەردوومی تەمەڵی سست .
کاهێڵی: د. سستی و تەمەڵی.
کاهی: جۆرە خواردەمەنییەکە لە نیشاستە دروست دەکرێ.
کاهی چی: کەسێکە کە کاهی بۆ فرۆتن دروست بکات.
کایلۆش: د. دۆکەشک. کالیۆش .
کایە: نۆرەیەک لە یارییەک. یاری.
کایەکلێ: د. کایەی یاری.
کایەگا: د. شوێنی یاری.
کایەڵ: مەردوومی خاو و خلیچک.
کایەن: ژوورێکە کە کای تێ بکرێ.
کپ: گـوێی گـران: گـوێم (کپ)ە. دەرگـا و پەنجـەرەی چەسپ کـە بوێری نەبێ. بێ دەنگی و کشوماتی: دنیا (کپ)ە.
کپبوون: گوێ گرانبوون. جووت بوونی دەرگا و پەنجەرە و گەلێ شتی تر بەجۆرێک کە با بوێری نەبێ. بێ دەنگبوون.
کپەوبوون: کپبوون.
کپی: بێ دەنگی.
کت: کتە: تاکێک لە شتی جووت (ز).
کتان: ز. کوتان.
کت بەچە: هـ. بەچکە پشیلە.
کـتـە: وتەیەکـە بەکـاردێنری لە کـاتێکدا کـە منداڵ بکۆکێ یا شتێکی لە بین بگیرێ. ختە (ز).
کتری: چاپەز.
کتک: پشیلە.
کتکاڵ: وتەیەکە گفتوگۆی پێ دەکرێ لەگەڵ ئافرەتدا وەکو وتەی: (کچێ): (کتکاڵ) ئابێ، واتە کچێ وەرە.
کتکە کێفیلە: د. پشیلە کێوی.
کتکە نەفتینە: د. کتکە نەوتینە.
کـتکە نەوتـینە: بریتـییـە لە یەکـێک کـە ببێ بەهۆی ئاژاوە و هەرایەکەوە.
کتۆ: وتەیەکە بەکاردێنری لە جێی وتەی چۆن.
کتوپڕ: کوتوپڕ.
کت و کوێر: کوت و کوێر.
کتومت: کوتومت.
کتووت: ز. نانی وشکەوەبووی کۆن.
کتۆیی: چۆنێتی.
کتە: پشیلە (هـ). کتە (ز).
کـتـێب: نووسـراوێکی ڕێکخـراوی چەند پەڕەییـیـە لە هەمـوو زانیارییەک کە گۆڤار و ڕۆژنامە نەبێ.
کتێبخانە: شوێنێکە کە کتێبی زۆری تێدا بێ.
کتێو: کتێب.
کتێوخانە: کتێبخانە.
کچ: ئافرەتێکە کە هێشتا شووی نەکردبێ. نەوەی مێینەی باوک و دایک.
کچانە: شتێکە کە هەر بۆ کچ بشێ.
کچانی: کوڕێکە کە خووی کچی ببێ.
کچک: پچووک.
کچکە: د. شتی پچکۆلە.
کچۆڵە: کچی پچکۆلانە.
کچەزا: منداڵی کچ.
کچەزازا: منداڵی منداڵی کچ.
کچێنە: ڕەشێنەی چاو.
کچێنی: ماوەیەکە کە ئافرەت بەکچی تێدا بمێنێتەوە. چۆنێتییەکە لە زێی کـچدا بەیەکەم جـار چوونە لای نامـێنێ و خـوێنی لێ دێ. خوێنێکە لە زێی کچ دێ لە کن چوونە لای یەکەمجار.
کخ: قخ.
کخس: با. پیازی فیسقە.
کخە: قخە.
کدارک: ز. کارگ.
کدوو: کوولەکە.
کدوولفکە: لفکەشامی.
کر: ڕایەڵی جۆڵا. شاڵی ڕانک و چوغە.
کراس: جۆرە کاڵایەکی قۆڵ و بەرۆکدارە لەژێرەوە لەبەر دەکرێ.
کـراسی زرێ: شـتـێکە لە زرێ لە وێنەی کـراس دروست کـراوە لە کاتی جەنگدا لەبەر دەکرێ.
کـراسـەکردن: بەسـابوونێکی بەزی دەڵـێن کـە بەتەواوی کـولابێ و بڵقی گەورە گەورە هەڵ بدات.
کرانباوگاو: جۆرە جنێوێکی کوردییە.
کراو: کارێکە کە کرابێ.
کراوە: لۆکەیە کە هەلاجی کرابێ. شتی واڵ.
کراهە: د. کرێ.
کراهەپا: د. پێ مز.
کرتان: ز. گامێشی خەساو.
کرتاندن: قرتاندنی شت بە ددان.
کرتانکرن: ز. خەساندنی گامێش.

کرتکرن: ز. نیشانه کردنی دار به لەلەکردنی بەمشار.
کرتمرت: ز. کەلوپەل.
کرتناک: ز. تیرۆک.
کرتوپان: ز. کالاو بەرگێکە کە باش دروست نەکرابێ.
کرتوو: گیایەکی باریکی قایمە وەک زەڵ دەسکەگوڵ و شەتڵێ پێ دەبەسترێ.
کرتە: دەنگێکە وەک دەنگی شت خواردنی مشک، (کرتە کرت) کرتەی یەک لەدوای یەک، (کرت و هوور) کرتەکرتی زۆر.
کرتەک: ز. بەفرێکە کە بەستبێتی و بەهۆی بارانەوە درناڵ درناڵ بووبێ.
کرتی: کرتوو.
کرچ: گۆشت و میوەی کاڵ. شتی سیس (د).
کرچە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی پچڕینی دەزوو یا دەرکێشانی ددان، (کرچەکرچ) کرچەی یەک لە دوای یەک، (کرچ و هوور) کرچەکرچی زۆر. کرشە.
کرچیان: د. چرچبوون و ژاکان.
کردار: کردەوە.
کردگار: خوای گەورە. کردار.
کردم: وتەیەکە لە باتی وتەی (گیرەم) بەکاردێنرێ: تۆ بچۆ بۆ لای فیسار کەس (کردم) لەوێ نەبوو، واتە گیرەم.
کردن: بەجێهێنانی کارێک.
کردنەوە: شێی کردنەوەی لۆکە و خوری بە چەکە و کەوان. خاوکردنەوە و هەڵگرتنی قفڵی داخراو بەکلیل. خاو کردنەوەی گرێ و شتی پێچراوە: گرێکە یا بارەکە (بکەرەوە). خستنە سەر پشتی پەنجەرە و دەرگای پێوەدراو. رزگارکردنی پیاوێک کە لە ژنەکەی بەسترابێ بەرەنگێکی وا کە بتوانێ لەگەڵیدا دروست ببێ. کردنی کارێک دووبارە و سێبارە: نوێژەکەت (بکەرەوە). چنینی میوە و گوڵ: گوڵەکە یا ترێیە کە (بکەرەوە). شکاندن و لەتکردنی دار: هێندێ دار (بکەرەوە). دەستکردن بەکارێکی گرنگ: حەفلەکەی بەوتارێک کردەوە.
کرد و کۆشی: هەوڵ و تەقەلا بۆ ژیان.
کرد و کێش: د. ئاسنێکی دەم پانی کلک درێژە بەدوو کەس دێراوێکی پێ هەڵدەدرێتەوە.
کردە: کردەوە: کردەپەشیمان بە، نەکردە پەشیمان مەبە.
کردەپەشیمان: کەسێکە لە کردەوەیەکی خۆی پەشیمان بووبێتەوە.
کردەوە: ئەوکارەیە کە مرۆڤ بیکا.
کر: مریشکێکە ئارەزووی کەوتنی سەر هێلکەی ببێ بۆ هەڵهێنانێ. گیانداری بێ دەنگ: منداڵەکە (کر)ە، واتە بێ دەنگە. (کربوون) بێ دەنگبوون (کرکردن) بێ دەنگکردن.

کراژ: د. مێوی هەنگوین.
کراش: د. گراژ.
کراک: د. کرکراگە.
کراکە: د. کراک.
کرال: د. کرێن.
کراندن: لابردنی شتێک لەسەر شتێک بە لووتی شتێکی تیژ.
کراندنەوە: گۆشت کردنەوە لە ئێسقان و داڕووتاندنی بە ددان یا بەچەقۆ.
کرانن: د. کراندن.
کراننەوە: د. کراندنەوە.
کرانەوە: کراندنەوە. ترۆخانەوەی قوڕگ بەهۆی سەرمابوونەوە
کراو: شتێکە کە کرێنرابێ.
کراوە: ئێسقانێکە کە کرێنرابێتەوە.
کربوون: کشوماتبوون: (کر بە) واتە بێ دەنگ بە.
کربوونەوە: نەمانی دەنگە دەنگ. نەمانی دەنگوباسێک کە بلاوبووبێتەوە.
کرخەو: کەسێکە کە بەتەواوی خەوی لێ کەوتبێ.
کرراو: شتێکە کە کربێت.
کرکردن: بریتییە لە کوشتنی یەکێک بەدزییەوە.
کرکراگە: ئیسقانێکی تەنکی نەرمە لە گوێچکەی گیانداردا.
کرکرانە: با. کرکراگە.
کرکرک: با. کرکراگە.
کرکرە: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک (با). لوولەی هەناسە.
کر کەفتن: د. کرکەوتن.
کرکەوتن: کەوتنی مریشک بەسەر هێلکەدا بۆ هەڵهێنانی.
کر کەوتوو: مریشکێکە کە کەوتبێ لەسەر هێلکە بۆ هەڵهێنانی.
کرندە: کڕیار.
کرنک: کرنگ.
کرنگ: دەعبایەکی سوورکەلەیە وەک گەنە بەلاّم پچووکترە، گەرچەک (د).
کرنوو: کرنگ. کرنووش بردن.
کرنووش: کرنووش بردن.
کرنووش بردن: سەر دانەواندن و چەمینەوە لەبەردەمی یەکێکدا بۆ بەگەورە ڕاگرتنی.
کرنە: کرنگ.
کروک: ڕەگ و ڕیشە.
کر و کاش: د. کرد و کۆشی.
کرووز: د. کوڕووز.
کرووس: د. کەڕ.
کرووش: وتەیەکە کە کەری پێ بانگ دەکرێ.

کـرە: شـتـێکە وەک بەرداش بازنکەی سـەرەوەی لە تـووڵی مـێـو دروست دەکـرێ، لە پاشـا بەچەند دارێکی بی ناوەکـەی پڕ دەکرێتـەوە و، کرەی چەڵتـووکی پێ دەکرێ. جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی لە یەک خشانی دوو بەرد بەنهێم، کرەکر: کرەی یەک لە دوای یەک، (کر و هوور) کرەکری زۆر.
کرە کردن: چەڵتـووک سپی کردن. بریتـییە لە بوونی کەسێک بە مەمنوون لە شتێک: فـیسـار کەس بە فیسارە شت کرە دەکا، واتە زۆر حەزی لێیەتی.
کریار: کەسێکە کە بیەوێ شتێک بکرێ.
کریاک: کرراو. کراو.
کرێژ: کرێش.
کرێژاوی: کرێشاوی.
کـرێش: چڵکی بەسـەر یەکـدا کـەوتووی وشکەوەبوو. وشکەڵی شانە هەنگوین.
کرێل: مەردوومێکە کە قسە وەرنەگرێ.
کرێڵ: د. شوێنی کرێن.
کرێن: زەوی چەولگی سەخت.
کرێوکرێو: هـ. ترەوەژە.
کرێوە: کاتێکی زۆر ساردە کە بەفر یا باران بەباوە بیارێ.
کرین: سەندنی شت بەپارە.
کـرینەوە: بریتـییـە لە ڕزگـارکـردنی یەکـێک لە چورتمێک: ئەم پاڵتۆیە ئیمسـاڵ منی (کریبیەوە) یا تۆ منت (کرییەوە) واتە ڕزگارت کردم.
کـرژ: هەودای زۆر بادراو. شـتـی هەڵقـرچاو: چەرمـە کـە هەتاو (کـرژ)ی کـردووە. خـێـرا و چەسـپـان (د). مـووی لوول، (کرژبوون) با خـواردن. هەڵقرچان. لوولبـوونی مـوو، (کـرژ کردن) لوولکردنی موو. خێرا کردن (د).
کرژهەڵاتن: هەڵقرچان.
کرژی: بوونی شت بەکرژ.
کرشە: کوڵۆشە.
کرک: شوێنی تەختی ڕووتەن .
کرکایکرک: کاکی بەکاکی.
کرم: گیانداریکی باریکی درێژی پچکۆلەیە.
کرماج: د. کرمانج.
کرماجی: د. کرمانجی.
کرمانج: ناوی هۆزێکی گەورەیە لە کورد.
کرمانجی: زبانێکە کە هۆزی کرمانج قسەی پێ دەکەن.
کرماندن: وردکردنی شت بە ددان.
کرمانن: د. کرماندن.
کرماوی: کرمێ.
کرمخواردوو: شتێکە کە کرم تێی دابێ و خواردبێتی.
کرمخوارده: کرمخواردوو.
کرمژنە: شتێکە کە کرم تێی دابێ.
کرمشین: ز. چرچبوونی کاڵا.
کرمکار: د. بەڵەد و شارەزا بە کارێک.
کرمکوژە: ڕێواسی.
کرمکە: جۆرە نەخشێکە لە چیغ دروست دەکرێ لە وێنەی کرمەکی ژنان. کرمەک (د).
کرمکیز: ز. نەخۆشییەکە لە کرمی زۆری ناوسکەوە پەیدا دەبێ.
کرمن: بریتییە لە مەردوومی قێز لە سک.
کرمۆکە: کرمەک.
کرمۆڵ: شتێکە کە کرم خواردبێتی.
کرمووژن: د. کرمژنە.
کرمە: دەنگێکە وەک دەنگی خواردنی هێندێ شتی ڕەق بە ددان، (کرمەکرم) کرمەی یەک لە دوای یەک، (کرم و هووڕ) کرمە کرمی زۆر.
کرمەژن: کرمژنە.
کرمەژنە: کرمژنە.
کـرمـەک: جـۆرە خـشـڵـێکی زێڕینی دانەدانەی هۆنراوەیە، ژنان دەیدەن لەژێر چەنەیان. زبانەی شت (د).
کرمێ: کرمەژنە.
کرمی ئاوریشم: جۆرە کرمێکە ئاوریشم هەڵدەپێچێ.
کرن: ز. کردن.
کرناس: ز. مەردوومی دەم و چاو ئاوڵاوی.
کرنگ: کرنگ.
کرینی: ز. کرنگ.
کرۆزرۆ: هـ. گیا تویسی.
کرواس: کراس.
کرۆتن: کورۆشتن.
کروچ: شتی لەتوکوت.
کرۆژتن:کورۆشتن.
کـروسـک: درەخـتـێکە لە هەرمێ مـوتوربە دەکرێ بەرێک دەگـرێ وەک هەرمێ کێویلە وایە.
کـرۆسک: کـروسـک. خـەنجـەری کـۆنی ژەنگاوی (ز). هەرمێ کێویلە .
کرۆشتن: کورۆشتن.
کرویت: د. کبریت.
کرێ: مزێکە بەرامبەر بەکردنی کارێک بدرێ.
کریانەوە: د. کرانەوە.
کرێبار: کرێیەکە کە بدرێ بۆ هەڵگرتنی بارێک.

کرێت: شتی ناشیرین (با). کولّۆ و کەرسەک (ز).
کرێچ: ز. سواڵەت.
کرێچی: کەسێکە بەکرێ لە شوێنێکدا بێ.
کرێداسی: سەپانی.
کریسک: با. پزیسک.
کرێشە: جۆرە تەنراوێکی کرژی تەنکە لە لۆکە دروست دەکرێ.
کرێڤ: ز. کەسێکە کە منداڵ بگرێتە باوەشی بۆ خەتەنەکردنی.
کرێڤا: ز. کرێڤ.
کرێکار: کەسێکە بەرۆژانە کار بکا.
کرێکاری: ئیشکردن بەکرێ.
کرێگرتە: کرێچی. شتێکە بەکرێ گیرابێ.
کرێو: دۆستێکە کە خزمایەتی ببێت.
کریس: وتەیەکە کارژۆلەی پێ بانگ دەکرێ.
کریڤ: با. هاورێ.
کرین: ز. گریان.
کرینچک: پەرچەم.
کز: گیاندار و سەوزایی بێ کەیف. هێندێ شتی کەم: ئیمساڵ ترێ یا ئاو (کز)ە. هێندێ شتی بێ هێز: ڕەشەباکە (کز)ە. چرا یا ئاگرێکە کە گڕی کەم بێ. چاوی کەم هەنا.
کزاندنەوە: چووزاندنەوە.
کزانن: د. کزاندنەوە.
کزاننەوە: د. کزاندنەوە.
کزانەوە: چووزانەوەی ئەندام.
کزبوون: بێ کەیفبوون. کەمبوونی شت. بێ هێزبوون. کەم تینبوونی چاو. بێ شەوقبوونی چرا و ئاگر.
کزخاندن: ز. هەڵپاچینی درەخت بۆ جوانی و بەخۆداهاتن.
کزر: شتێکی تەڕە کە کەمێک وشک بووبێتەوە. گیاندار یا سەوزاییییەکە کە بەخۆیدا هاتبێ و لە خەم ڕەخسیبێ.
کزران: شوێنێکە کە هەرچەند باران بباریێ ئەو هەر کزربێ.
کزراندن: ز. هەڵپرووزاندنی خوری.
کزربوون: خڕەڵەبوون و بەخۆداهاتنی گیاندار و سەوزایی.
کزربوونەوە: کەمێک وشکبوونەوەی شتی تەڕ.
کزری: بوونی شت بەکزر.
کزک: ز. چزڵیک.
کزکردن: کەمکردنەوەی گڕی چرا و ئاگر.
کزکۆڵە: د. کزۆڵە.
کزکۆڵەکردن: د. کزۆڵەبوون.
کزکە: د. کزکۆڵە.
کزگرین: ز. داچڵەکینی تاڵی هاتوو.
کزمک: ز. سەرکۆزەری گەنم.

کزن: دانەوێڵەیەکە وەک ماش گەڵای وەک نیسک وایە، بەخووساوەیی لە زستاندا دەدرێ بەڕەشەوڵاخ.
کزۆڵە: گیانداری کزۆڵ.
کزووری: ز. کاڵای خوری هەڵپرووزاو.
کزە: سرووەی با. جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی گۆشتی سوورکراوە لەسەر ئاگر، (کزەکز) کزەی یەک لە دوای یەک، (کز و هووڕ) کزەکزی زۆر.
کزەبا: بای سووک.
کزەڵۆک: کزۆڵە.
کزەی جەرگ: بریتییە لە ڕۆڵەی خۆشەویست.
کزیان: د. چووزانەوە.
کزیانەوە: د. کزانەوە.
کزێنکە: هەویرێکی شلە بەدەست پان دەکرێتەوە بەسەر ساجدا بۆ برژاندنی.
کزی: زەبوونی و بێ کەیفی.
کزیر: ز. گزیر.
کژ: مووسم: ئێستا کژی تۆوە، یا کژی شەتڵی تووتنە.
کژبلۆک: ز. گیایەکە بنکێکی هەیە بەپاککراوی دەخورێ.
کژک: د. کەژوو.
کژگ: هـ. تیلمەیەکی درێژە دروست دەکرێ و تەنگە و قەیاسەی وڵاخی پێ دەدرێ.
کژوورەک: ز. خێزەرە.
کژەبارانە: بارانێکە کە لەکاتی خۆیدا بێ.
کس: وتەیەکە مەڕی پێ لێ دەخوڕێ.
کسپوکۆ: گڕ و گەرمییەکە لە دەروونڈا پەیدا دەبێ بەهۆی تووڕەبوون و ڕق هەستانەوە: ئەوەندەم قسە پێ وت تا (کسپوکۆ)ی دڵی خۆمم پێ ڕشت.
کسپە: دەنگێکە وەک دەنگی کردنی ئاو بەسەر ئاگردا، (کسپەکسپ) کسپەی یەک لە دوای یەک، (کسپ و هووڕ) کسپەکسپی زۆر.
کسس: کس.
کسکس: وتەیەکە سەگی پێ تێ بەردەدرێ لە شت.
کسک: با. چزڵیک.
کسکۆڵە: د. کزۆڵە.
کسکە: د. کزۆڵە.
کسکیانەوە: د. کزانەوە.
کسۆک: تووتکە سەگ. سەگ.
کش: وتەیەکە باڵندەی پێ دەردەکرێ. سواربوونی یەکێک لە ئەندامەکانی شەترەنج بەسەر شادا.
کشان: ڕۆین. و تێپەڕینی شتێک بەگورجی: ئەو ئەستێرەیە یا ئەو زەلامە (کشا). کەشهاتنی شت.

کشاندن: خشاندن. کەشهێنان بەشت: لفکەکە (بکشێنە).
کشان کشان: وردە وردە کشان و تێپەڕینی شت: فیسار کەس (کشان کشان) هات.
کشانەوە: گەڕانەوەی شت بۆ دواوە: ئاوەکە یا لەشکرەکە (کشایەوە).
کشپل: پشقل.
کشت: دانەوێڵەی چێنراو. کرژ.
کشتسازی: إصلاحی زراعی.
کشتگە: مەزرەعە.
کشتوکاڵ: تۆوکردن و چاندنی شەتڵ لە زەویدا.
کشتەک: چەند هەودا دەزوویەکی بەیەکدا بادراوە.
کشتیار: خاوەنی کشتوکاڵ.
کشش: کش.
کششە: کش.
کشکش: د. هەڵپەڕین.
کشکە: هـ. بژار.
کشمیش: وشکەوەبووی ترێی دەنک وردی بێ ناوک.
کشمیشی: جۆرە ترێیەکی سپی دەنک وردی بێ ناوکە.
کشنیژە: د. گژنیژە.
کشومات: شتی بێ دەنگی بێ خشە.
کشوماتی: بوونی شوێنێک بەکشومات: کشوماتی جیهانی داگرتووە.
کشە: وتەیەکە پەلەوەری پێ دەردەکرێ.
کفت: ماندوو. شتێکی زەردی جوانە وەک زێڕ وایە لە رووی هێندێ شت دەدرێ بۆ جوانی. خۆرە (د).
کفتک: ز. شقارتە.
کفتکاری: بەکارهێنانی کفت لە هێندێ شتدا بۆ جوانی.
کفتوکۆ: سفتوسۆ. کسپوکۆ.
کفتە: جۆرە خواردەمەنییەکە دروست دەکرێ لە قیمە و برنج و خڕ هەڵدەدرێ و دەکوڵێنرێ یا سوور دەکرێتەوە.
کفتە شۆربا: چێشتی کفتە.
کفتتە شۆروا: کفتە شۆربا.
کفتی: ماندوویێتی.
کفر: دارێکی گەڵا وردە لە خڕ و چەم و رووباردا دەڕوێ و بۆ سووتاندن بەکاردێنرێ.
کفرێن: جۆرە یارییەکە بەمیچ دەکرێ.
کففە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی هاتنە دەرەوەی خوێن لە کاتی سەربڕینی ئاژاڵدا.
کفکێ: کێکف.
کفن: بلووری یا خامێکە کە لە مردووەوە بپێچرێ.
کفن دز: کەسێکە گۆڕی مردوو هەڵ بداتەوە بۆ دزینی کفنەکەی.
کفە: کففە، (کفەکف) کففەی یەک لە دوای یەک.
کڤارک: با. قارچک.
ککەو: کەووت.
کل: سورمەی چاو. شتی کلا. گومەز (ز). ناردن: (کلم کرد) واتە ناردم.
کڵ: گۆزە و دیزەی لەسەر یەک کەڵەکەکراوی ئاگر تێ بەردراو بۆ سوورکردنەوە. تاقی پرد. گڕی ئاگر: (کڵ)ی ئاگرەکە لە دوورەوە دیارە. کل (د).
کلا: شتێکە کە کەوتبێتە کەنارەوە، (کلابوون) کەوتنە کەناری شت.
کلاش: جۆرە پێڵاوێکە ژێری لە پەڕۆ دروست دەکرێ و سەری لە بەن یا لە دەزوو دەچنرێ.
کلاشچن: کەسێکە کە سەری کلاش بچنێ.
کلاشدروو: کلاشچن.
کلاشدم: دووپشک.
کلاشەکردن: هەڵگیرانی قوڕ بە پێڵاوەوە لە کاتێکدا کە زەوی بووبێ بە قوڕ.
کلاشبێن: د. خوراندن.
کلاف: د. کلافە.
کلافە: چەند هەودا دەزوو یان ئاوریشمێکە کە پێکەوە هەڵ کرابن بۆ ئەوەی تاوتاو دەرکێشرێ و کار بکرێ. شتێکە لە بەن دەهۆنرێتەوە و جوانووی پێ دەبەسترێتەوە بۆ ئەوەی دابێن و دەستەمۆ ببێ: ئەم نۆما بە (کلافە) نەکراوە بۆیە وا سرکە.
کلافەکردن: بەستنەوەی نۆما بە(کلافە).
کلافە هەڵکەر: گوڵەژەن.
کلاکردن: لاخستنی شتێک.
کلانە: قۆپچەی گەورە.
کلاو: شتێکی تەنکی گردە دەکرێتە سەر و سەرپێچی لەسەر دەبەسترێ.
کلاوئاڵتوون: کلاوێکی ژنانەیە غازی یا لیرەی پیادا دروابێ.
کلاوبۆرگە: کلاوێکی لبادینە بەسەر فەرەنجییەوە شوان لە باراندا دەیکاتە سەری.
کلاوبۆرە: کلاوبۆرگە.
کلاوچن: کلاودروو.
کلاودار: باڵندەیەکە کە لە تووکی سەری کلاوی ببێ.
کلاودروو: کەسێکە کە هەر کلاو بدروێ.
کلاوڕۆژنە: کونێکە لە ناوەڕاستی باندا بۆ رووناکی و دوکەڵ لێوە دەرچوون دەهێڵرێتەوە.
کلاوڕەش: دەردێکی کوشندەیە دووچاری بزن دەبێ، ناوسکی هەڵ دەئاوسێ و خوێنی تێ دەزێ.

کڵاوزرێ: جۆرە کڵاوێکی زرێدارە لە ڕۆژی جەنگدا دەکرێتە سەر.
کڵاوزەڕ: کڵاوزێڕ.
کڵاوزێڕ: کڵاو ئاڵتوون. جۆرە کڵاوێکی ئاڵتوونە ژنان وەک تاس دەیکەنە سەریان لەسەر کڵاوەوە .
کڵاو فەرەنگی: کڵاوێکە دەدرێ بەسەر لوولەی سۆپادا بۆ ئەوەی کە دوکەڵەکەی باش دەرچێ و با نەیگێڕێتەوە.
کڵاو کڵاوێن: یارییەکی دوو دەستەییە وەک یاری گۆرەوی بازی، بەڵام ئەم بەکڵاو دەکرێ. پشکیلان.
کڵاوکورە: باڵندەیەکی پچکۆڵەیە بەقەد چۆلەکەیەک دەبێ کڵاوێکی لەپەڕ بەسەرەوەیە.
کڵاوگەرە: کڵاوبۆرە.
کڵاونە: کڵاودار.
کڵاوە: ئاخڵەیەکە دروست دەکرێ لە قوڕ یا لە هەویر بەدەوری گوێرووی بەرداشدا بۆ ئەوەی (دانەرێز) نەکات. تەوقەسەری شاخ. پووچەکی زەڕات. زەڕاتی ئەمساڵمان هەمووی (کڵاوە)یە. کڵاونە (د). کەڵەمەی جووت.
کڵاوەسوورە: گیایەکی بەهارییە وەک پیشۆک بەڵام ئەم تویکڵی زۆر سوورە.
کڵاوەکردن: بریتییە لە باران و بەفری دەنک گەورە.
کڵاوەی بەیاخ: د. ئاسنێکی لووت تیژە دەکرێ بەسەری بەیاخدا.
کڵاوێن: کڵاو کڵاوێن.
کلب: ز. کەلبە.
کلبوون: گواستنەوەی یەکێک لە شوینێکەوە بۆ شوێنێک.
کلپە: دەنگێکە لە گڕی ئاگر پەیدا دەبێ، (کڵپەکڵپ) کڵپەی یەک لە دوای یەک، (کلپ و هووڕ) کڵپەکڵپی زۆر.
کلتوور: توورەکەیەکی پچکۆلانەیە کلی هاڕراوەی تێ دەکرێ.
کلچان: ز. فانۆزی دەستی.
کلچۆڤ: ز. کلچێوک.
کلچێوک: شتێکی باریکی لووسە دەکرێ بەکلدا و چاوی پێ دەرێژرێ.
کلچیڤ: با. کلچێوک.
کلدان: کلتوور.
کڵدان: کلدان.
کڵفت: د. شتی ئەستووری زل. شتی زۆر: فیسار کەس پارەیەکی (کڵفت)ی هەیە.
کڵفتی: د. زۆری. ئەستووری شت .
کڵفەت: د. بریتییە لە خێزان و ماڵ و منداڵ. کارەکەر.
کڵفەتبار: مەردوومی خێزاندار.
کلک: شتێکی باریکە وا بەعاستی سمتەجۆڵەی هێندێ گیاندارەوە. قەڵەم (د). پەنجە.
کلکاف: د. مازوو.
کلکانی: بریتییە لە مەردوومی شێت و وێت: فلان کەس پیاوێکی کلکانییە.
کلک بەس: د. بریتییە لە کەسێک کە دەستەشکێن کرابێ. پەتێکە لە پەنجە گرێ دەدرێ بۆ بیرخستنەوەی شتێک.
کلک بەسە: د. کلک بەس.
کلک پێوەکردن: بریتییە لە گاڵتەکردن بەیەکێک. پەنجە کردن بەقنگی یەکێکدا.
کلک تەقێنە: کلک هەڵسەنگێنە.
کلکدار: شتی خاوەن کلک. هێندێ شتی دەسکدار: ئەو ناوە (کلکدارە)م بدەرێ.
کلکردن: د. کەنارەگرتن. ناردنی یەکێک بۆ شوێنێک.
کلک گرتن: کلک بەرزکردنەوەی وڵاخی بەرزە لەکاتی سواربوونیدا.
کلکگیر: د. قوشقنە.
کلک نما: د. ئەنگوشت نما.
کلک نیشان: د. ئەنگوشت نیشان.
کلکوانە: د. کلکەوانە.
کلکە: شتێکە وەک مرۆر بەڵام ئەم پچووکترە و کلکێکی باریکی هەیە. داوێنی کێو.
کلکەتووتە: د. پەنجە تووتە.
کلکەرەقە: نەخشێکە لە تەون دروست دەکرێ لە وێنەی کلکی ڕەقەدا.
کلکەرێوی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
کلکەسووتەکە: کلکە لەقێ.
کلکەسووتەکێ: کلکەسووتەکە.
کلکەقنگێ: بریتییە لە جووڵاندنی یەکێک بەکردار یا بەگوفتار: (کلکەقنگێ)ی مەدە، واتە مەیجوولێنە یا سەر مەکەرە سەری.
کلکەکەڵە: د. کلکەگەورە.
کلکەگەورە: د. پەنجەی گەورە.
کلکەلەقە: کلکەلەقێ.
کلکەلەقێ: بریتییە لە یاری و ڕووپامایی یەکێک بۆ یەکێکی تر بە گوفتار یا لەگەڵ کرداردا.
کلکەمار: بریتییە لە شتی زۆر تاڵ.
کلکە مارکردن: زەقنەکردن.
کلکەنما: د. کلک نما.
کلکەوانە: ئەموستیلە. ئەموستیلەی دروومان.
کلک هەڵسەنگێنە: باڵندەیەکی پچووکی کلک درێژە هەمیشە کلکی هەڵدەسەنگێنێ.

کڵگە: پرد.
کڵم: چڵمی خەستەوەبوو.
کڵمن: چڵمن.
کلمیش: با کڵمیش.
کڵمیش: ز. چڵم.
کڵناشک: دڕک و داڵی دەشتە کە لە هاویناندا وشک دەبێتەوە و با دەیشکێنێتەوە و دەیباتە ناو دۆڵ و دەرەوە.
کلۆ: کوللە.
کڵۆ: کوڵۆ.
کڵۆت: کوڵۆت.
کلۆچ: ز. جۆرە مارمارۆکەیەکی پێچ پێچە وەک بازن.
کلۆخ: ز. یەک سەر لە ئاژاڵ.
کڵۆخ: با. کاسەی سەر.
کلۆر: ز. کلۆچ.
کلوسک: با. کووپەڵە.
کڵۆش: کوڵۆش.
کڵۆفت: د. کڵفت.
کڵۆک: کڵۆت.
کڵۆل: کوڵۆل.
کڵولاش: هـ. گیایەکی بەرزە قۆزاخەیەکی دەنک دەنکی باریک دەگرێ و دانی پێ دەناژنرێ.
کڵۆم: کوڵۆم.
کلوو: کولوو.
کڵووک: گوڵووک.
کڵە: کل (د). کڵی پرد.
کلەپێچ: ز. خشتی کاڵ.
کڵەدان: د. کلدان.
کڵەو: ئاوێکە لە ڕووبارێکی گەورەدا کە بێ بەسەر بەستێکدا و بەزەقی بکشێ بە سەریدا: ئاوەکە (کڵە)و دەکات.
کلێجە: کلێنچکە.
کڵێس: شتێکە کە بنەبڕ بووبێ: تیرەی هەمەوەند (کڵێس) بوو، (کڵێس بوون) بنەبڕبوون.
کلێسمان: ز. کلێکە کە بۆ جوانی بەکار بهێنرێ.
کڵێسە: جێی خواپەرستی گاوران. ناوی دێیەکە لە ناوچەی قەرەداخ.
کڵێڵ: د. کلیل.
کڵێڵ و کۆم: کلیل و کوڵۆم.
کڵێڵە: د. کلیلەی بەفر.
کڵێڵەبوون: د. دەم چوونە کلیلە.
کلێنچکە: ئێسقانێکی باریکی گرێ گرێی کورتە بەژوور قنگی بزن و مەڕ و هێندی گیانداری ترەوە لە جیاتی کلک.
کلیسا: کڵێسە.
کلیسە: کڵێسەی گاوران.
کڵیسە: کلیسە.
کڵیش: شارای خەلە و خەرمان.
کڵیشە: بن باخەڵ. وێنەی شت کە بەقەبارە دەربهێنرێ بۆ ئەوەی کە وێنەی زۆری لەسەر کاغەز پێ دەربهێنرێ.
کلیل: شتێکی زبانەدارە قفڵ یا کڵومی دەرگای پێ دەکرێتەوە.
کلیل بەدەست: کلیلدار.
کلیلدار: کەسێکە کە کلیلی شوێنێکی بەدەست بێ.
کلیلدان: داخستنی شتێک بەکلیل.
کلیل و کۆم: کلیل و کوڵۆم.
کلیلە: بەفرێکی زۆرە کە با لە پەنایەکدا پێچی دابێ و کۆی کردبێتەوە.
کماخ: کاماخ.
کمکمە: با. قۆڕی.
کن: لای شت: لە کن تۆیە واتە لای تۆیە. شتی کورت (ز).
کنا: د. کناچە.
کناچە: هـ. کچێکە کە شووی نەکردبێ. وتەیەکە وەکو وتەی (کچێ).
کناچێ: هـ. کناچە.
کنج: د. شتی کاڵ و کرچ.
کنجڕ: با. پەڕۆ.
کندر: جۆرە دەزوویەکی باریکە بەمەکینە دروست دەکرێ. کنگر. گۆشی شەکر و شریتی ئەستوور.
کندر دڕک: کەرتەشی.
کندڕ: کندر دەزوو.
کندرە: کندری دەزوو.
کنر: کندر.
کنگ: قنگ.
کنگر: گیایەکی بەهاری دڕکاوییە هەڵدەکەنرێ و دەخورێ.
کنگرەکەرانە: کەرتەشی.
کنوکۆ: د. کرد و کۆشی.
کنە: کارکردن لە پێکهێنانی کارێکدا هەمیشە و لەسەرخۆ: هەر (کنە)یەتی.
کنێر: داری مەڵحەم.
کنێرە: کنێر.
کنیواڵ: جۆرێکە لە قووڕادە.
کۆ: کۆمەڵە ئەستێرەیەکی بەناوبانگە بەناوەڕاستی ئاسمانەوە.
کۆمەڵ: منداڵەکان هەموو (کۆ)ن. دەردێکە دەدا لە چاوی وڵاخی بەرزە و ئاژاڵ هێندێ جار کوێریان دەکات. کوێ. کەژ (د).

کوا: وتەیەکە داوای پیشاندانی شتێکی پێ دەکرێ. کەوا (د).
کوارک: قارچک. دومەڵان (د).
کوان: دومەڵ و برین.
کوانک: ئاگردان.
کوانگ: کوانک.
کوانوو: کوانگ.
کوانێ: کوا.
کوانی خورما: برینێکە لە کاتی پێ گەیشتنی خورمادا بەئەندام هەڵدەپەڕێ.
کۆبوون: د. کۆبوونەوە.
کۆبوونەوە: گردبوونەوە.
کۆبە: پەراوێزی کەوا.
کۆپار: د. کۆپارە.
کۆپارە: گوڵمە گۆشتێکی گەورەی بەرزە بەسەر پشتملی حوشتر و ولاخەوە. کۆسپایی و بەرزییەکی کەم لە زەوی.
کۆپان: شتێکە ناواخنەکەی پووشە لەسەر پشتی کەر و ئێستر قایم دەکرێ و باری لەسەر دەبەسترێ .
کـۆپان ئاخن: شـیـشـێکی سـەر دوو پەلە پووشی کـۆپانی پێ دەئاخنرێ.
کۆپاندروو: کەسێکە هەر کۆپان بدروێ.
کۆپاندوور: کۆپاندروو.
کۆپانە: خورییەکە کە بهێڵرێتەوە بەسەر پشتی مەڕ و بەرخەوە.
کۆپەڕ: هـ. کاتی پووشپەڕ .
کـوت: سـۆک. پارچەیەک لە شت: (کـوت)ێک گـۆشت یا نانم بەرێ، (کوت کوت) شتی پارچە پارچە. کۆڵووی نان(ز).
کۆت: جۆرە پێوەندێکە دەکرێتە دەست و پێ. دوو تەختەی پانی پچکۆلانەیە دەدرێتە بەر کونی مەشکە و هیزە، لە دیوی دەر و ناوی و توند دەبەسترێ. کۆتە. وتەیەکە بەکاردێنرێ لەگەڵ وتەی سەردا بەمەعنا سەرقۆتێن.
کۆتا: د. شتی باڵا کورت.
کۆتاسی: ز. کۆتاهی.
کوتان: لێدان لە شتێک بەدەست یا بە لیس: گەزۆکە (بکوتە). وردکردنی شت: گۆشتەکە یا قاوەکە (بکوتە). دەرزیکردن بەشوێنێکدا لە ئەندامی منداڵ بەمـاکی ئاوڵەوە بۆ دەردانی ئاوڵەکـە. خاڵ هەڵکەندن لە ئەندام بەدەرزی. لێ کـردنەوەی ئارد لە برنج بەدیبەگ یا بەمەکینە. سفتکردنی شتی تەنراو. بریتـییـە لە لێـدانی زۆر: ئەگەر نەخـوێنیت (دەتکوتم) واتە زۆرت لێ دەدەم.
کۆتان: شوێنێکە کە مەڕ و ماڵاتی تێدا مۆڵ بدرێ بەشەو.
کوتاندن: کوتان.
کوتاندنە چاو: کوتانەچاو.
کوتاندنەوە: سفتکردنی شتێکی چنراو. پەستاندنەوەی شوێنێکی فشەڵ.
کوتانک: با. پەچەی ئاژاڵ.
کوتانن: د. کوتاندن.
کوتاننەوە: د. کوتاندنەوە.
کوتانەچاو: شت بەچاودا دانەوە.
کوتانەماووش: د. لە خەرکەماندان.
کوتانەوە: کوتاندنەوە.
کۆتاهاتن: د. دوایی هاتنی شت.
کـۆتاهی: بڕانەوەی شت. درێغی کـردن لە کـارێکدا: (کـۆتاهی) مەکە لە خزمەتی نیشتماندا.
کۆتایی: کۆتاهی.
کوتر: د. کورت.
کۆتر: باڵندەیەکی جوانە لە کەو پچووکترە و، گەلێ ڕەنگی هەیە.
کوتران: گووانی شوێنێک لە ئەندام بەهۆی ئازار پێگەیشتنەوە.
کۆترباز: کەسێکە کە کۆتر ڕابگرێ.
کۆتربازی: ڕاگرتنی کۆتر و بەخێوکردنی.
کـۆترە: داریکی پانە لە ناوەندی (هەسـوون) و (کـۆمـانج)ی دەواردا دادەنرێ. دیرەک.
کۆترهاتن: د. کۆتایی هاتنی شتێک .
کۆترە باریکە: جۆرە کۆترێکی بۆری پچووکی باریکە خوێندنی لە خوێندنی کۆتری ماڵی ناچێ.
کۆترە بەرجیلە: کۆترە باریکە .
کۆترە کێویلە: جۆرە کۆترێکە.
کوتک: توتکە سەگ. بەچکەی ورچ و گورگ و هێندێ گیانداری تر (ز) چەکەی هەلاجیی (د). کوتەک.
کۆتک: کەمۆڵە.
کـوتکردن: لەتکردنی شت. داکوتانی سنجووق بەزەویدا لە یاری سنجووقێندا.
کۆتکە: تەشپییەکی گەورەی قووڵی دەم واڵە.
کوتلک: ز. کفتە.
کۆتن: کەوتن. کراندنەوەی گۆشت لە ئێسقان بە ددان (ز).
کوتوپڕ: وتەیەکە بەمەعنا وتەی (دەستبەجێ).
کوتوکوڵک: وردە خورییەکی ناشرینە کە بڕێسرێ بۆ دروونی دەمی فەردە.
کوتوکوێر: مەردوومی چاوکز.
کـوتومت: وتـەیەکـە بـەکـاردێنرێ بۆ هاووێنەیی دوو شت لەگـەڵ یەکتری: نەژاد (کوتومت) دەڵێی فەرهادە .
کوتومزرەقی: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی کوتوپڕ.

کـوتە: دەنگێکە وەک دەنگی کـوتانی شت، (کـوتەکـوت) کـوتەی یەک لە دوای یەک.
کۆتە: مووڕەداری گـەورەی بێ بار. دارێکی درێژی بەگـوڵمـێخ لە زەوی داچەقاوی لەلەکراو لە ڕاستی هەر لەلەیەکی قوڵفێکی ئاسنی تێدایە پێی بەندی تێ دەخرێ. کـۆتەرەدارێکی بەرزە گۆشتفرۆش گۆشتی لەسەر لەت لەت دەکات.
کـۆتەرە: پارچەدارێکی خڕی ناڵەبار. سـەرەبزووت. بریـتـییـە لە پەلەورێک کە باڵی نەمابێ.
کۆتەشکێن: د. پارچە ئاسنێکە لەبەردەمی مـوغـەیریدا دادەنرێ بۆ شکاندن و تەکاندنی بزووت.
کوتەک: داردەستێکی سەرخڕە .
کوتەکوت: ز. وەڕینی سەگ .
کوتە کەلەکە: د. سواڵەت.
کۆتەڵ: سەرکۆزەری دانەوێڵە. هەڵواسینی کاڵای مردوو بۆ شیوەن لەسەرکردنی. کۆمەڵە دار و درەختێکی داربەڕو یا مازووە کە چڕوپڕبێ. ناوە بۆ شـوێنێـک لە بەردەمی دێی (سـووڕداش)دا کـــە دار و دەوەنی زۆرە. نێی ئاش. گـــەنمێکە کـــە لەناو قاپۆڕەکەیدا مابێتەوە دوای کوتان و شەنکردنی. پەیکەر.
کـۆتەڵبـوون: گـەورەبوونی منداڵ: منداڵەکـە کـۆتەڵ بووە، واتە بەخۆیدا هاتووە و لە خەم ڕەخسیوە.
کوتیاگ: د. کوتراو.
کوتیان: د. کوتران.
کوتیلک: با. کفتە.
کوتی: ز. گول.
کۆتیلە: هـ. درەختێکی پچکۆلەیە لەبەر کزی بەرز نەبێتەوە.
کـوجـەڵە: کـاسـەی پچـووک. شـتـێکە لە قـوڕ دروست دەکـرێ لە وێـنەی لالـەوێچ، دەنـرێ بـەقــــەدی دارەبەنـەوە بۆ ئـەوەی بنێشتەکەی تێ بچێت.
کوجیلە: کوچوولە.
کۆجیلە: کۆجەڵە.
کوچ: کوچک (ز). کەسێکە کە دەردی (شەپلە) لێی دابێ.
کۆچ: کەلوپەلی کۆچەرییە بەبارەوە. مـووڕەدار (ز). بزن و بەرانی بێ شاخ.
کـۆچاوکـۆچ: گـواسـتنەوە لەم کـۆچەوە بۆ ئەو کـۆچ: جـاف هەر خەریکی (کۆچاوکۆچ)ە.
کۆچای کۆچ: د. کۆچاوکۆچ.
کوچچک: ل. بەرد.
کوچک: بەردی نە زۆر گەورەی نە زۆر پچووک. ئاگردان (با).
کۆچک: تووتک (ز). قۆچک.
کوچکتاش: د. بەردتاش.
کوچکچن: د. کەسێکە کە دیواری بەرد بەوشکە کەڵەک دروست بکا. دیواری وشکە کەڵەک.
کۆچکردن: بارکردن بەماڵ و منداڵەوە لە شوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تر. بریتییە لە مردن.
کوچکرێژە: د. جۆرە بەردێکە شووشەی لێ دروست دەکرێ.
کـوچکـوچ: ز. وتەیەکـە وەک وتەی (کـووت کـووت) سـەگی پێ بانگ دەکرێ.
کوچک و کـوانگ: د. بریتـییـە لە وەجاخی ئاگـر: بەم (کوچک و کوانگە) ڕازی نییە.
کوچک و کەڵەک: شوێنی بەردەڵان و ناخۆش.
کوچکە: سێ بەردە دەخرێتە ژێر مەنجەڵ و دیزە، لە باتی سێپا.
کۆچکە: قۆچکە.
کۆچڵە بەس: چەند بەربەستێکە دەکرێ لە بەردەمی تیـرەی مەرەزە لە زەوی بەرز و نزمدا بۆ ئەوەی کە ئاوەکە پۆنگ بخواتەوە و یەکسان مەرەزەکە ئاو بدا.
کوچکەهەسان: د. بەردەهەسان
کۆچڵەبەست: کۆچڵەبەس.
کۆچوبار: ماڵی کۆچەری کە لە وڵاخ نرابێ.
کۆچوماڵ: کۆچوبار.
کوچوولە: دەرمـانێکی بۆری کـوشندەیە. باقـەیەکە لە گـیـای گـوش کە نرابێتە ناو ئاو بۆ نەرمبوونی بۆ ڕستن (ز).
کوچووڵە: کوچوولە.
کۆچە: هـ. جۆرە هەنجیرێکی وردی سووری زۆر شیرینە.
کۆچەر: کۆچەری.
کۆچەری: کەسێکە کە نیـشـتەجێ نەبێ و، گەرمیـان و کـوێسـتـان بکا.
کـۆچەک: کـورێکی جـوانە کـە جلی ژنانەی لەبەردا بێ و لەناو پیاواندا سەما بکا.
کۆچەکاو: هـ. جۆرە هەنجیرێکە وەک (کۆچە) بەڵام ئەم زەردە.
کۆچەکە: فێستی سەری ژنان.
کوچەڵە: کۆچەڵە. چاڵاو (د).
کـۆچەڵـە: کـۆجـەڵە. شـتـێکە وەک دەمـەکـەوچک لە قـوڕ دروست دەکـرێ و دەنرێ بەقـەد دار قـەزوانەوە لەکـاتێکدا کـە دارەکـە بریندار دەکرێ بۆ ئەوەی بنێشت دەربدا و بچێتە ناوی .
کـۆچەڵەبەس: چەند کـۆچەڵەیەکی قـوڕینە، دروست دەکـرێ لەناو جۆگە ئاوی تەنیشت (تیر)ی مەرەزەدا، بۆ ئەوەی ئاوەکە لەو کۆچەڵانەوە دابەش ببێ بەسەر تیرەکەدا بەیەکسانی.
کۆچ هەڵکۆچ: کۆچاوکۆچ.
کۆچی دوایی: بریتییە لە مردن.
کۆخ: زنجێکی پچکۆلەیە لەناو باخدا دەکرێ.

کۆخا: کوێخا.
کۆختە: قۆختە.
کوخک: ز. کۆکە.
کۆخک: ز. کۆکە. سەرپێچێکی ئاوریشمە دەبەسترێ بەسەری بووکەوە .
کوخێکی: ز. کەسێکە کە کۆکەی تووش بووبێ.
کۆخن: کەسێکە کە زۆر بکۆکێ.
کۆخواردنەوە: د. پارێزکردن و سڵەمینەوە لە شتێک.
کۆخە: کۆکە.
کۆخەڕەشە: گۆکەڕەشە.
کوخین: با. کۆخین.
کۆخین: کۆکین.
کۆد: کاسەیەکی پچووکە شوان شیری تێ دەدۆشێ (ز). قفڵ.
کوداندن: ز. جێبەجێ کردنی کار.
کۆدک: قفڵی پچووک.
کودوو: کەدوو.
کۆدە: ز. پووشانە.
کودەری: جۆرە تەنراوێکە کاڵای لێ دروست دەکرێ. جۆرە چەرمێکی تایبەتییە دەکرێ بەسەری پێڵاو.
کودی: کەدوو.
کور: ز. کوڕ. مەڕی کەڕیلە. شوێنی قووڵ لە زەوی.
کۆر: کوێر.
کۆراندنەوە: سەرزەنشت کردنی یەکێک چەند جارێ لەسەر یەک.
کۆراننەوە: کۆراندنەوە.
کۆرانەوە: کوڕووزانەوە.
کۆراو: کوێرەکانی.
کۆرایی: کوێرایی.
کۆریە: ساوای گیاندار و سەوزایی. دارێکە هەڵپاچرابێ و تازە لق و پۆپی دەرکردبێتەوە: نزاری فیسار کەس بەشێکی کۆرپەیە و بەشێکی بڕەیە .
کۆرپەلە: منداڵێکە کە لەناو منداڵداندا بێ (جنین).
کورت: شتێکە کە درێژ نەبێ. چاڵ (ز).
کورتان: کۆپان.
کورتاندروو: کۆپاندروو.
کورتبڕی: وتن یا نووسینی مەبەستێک زۆر بەکورتی (ایجاز) .
کورتبوونەوە: کەمبوونەوەی شت لە باری درێژی.
کورتخەس: قرتاندنی نێرکی تووتن لەسەر گەڵاوە بۆ ئەوەی باڵا نەکات.
کورتکردنەوە: کەمکردنەوەی درێژیی شت.
کورتم: شتێکی کورتی ئەستوورە.
کورتمە: کورتم.
کورت و کوێر: کاڵای کورتی تەسک.
کورتە: وڵاخی نارەسەن (ز). کورتەک. کورتکراوەی شتێک.
کورتەباڵا: شتێکە کە باڵای نزم بێ.
کورتەبنە: کورتە باڵا.
کورتەک: کاڵایەکی یەخە و قۆڵداری پڕ لە ناوی کورتە تا سەر ئەژنۆ. کەوا (با).
کورتە کەلەکە: بۆشایی عاستی کەلەکە.
کورتەکەوا: کەوایەکی کورتی پڕ تەریبی ناودارە لە لبادە درێژتر و لە کەوا کورتترە.
کورتەڵە: کورتە بنە.
کورتەوکردن: د. کورتکردنەوە.
کورتی: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (بەلای کەمەوە): فیسار کەس (کورتی) حوقەیەک ترێی خوارد. بوونی شت بەکورت. درێغ و کۆتاهی (د).
کورتیلە: کورتەڵە.
کورد: گەلێکی کۆنی ئارییە کەوتۆتە ناوەڕاستی ئاسیاوە، لە بیست ملیۆن زۆرترە.
کوردانە: وەک کورد: کوردانە و مەردانە وەرە پێشەوە.
کوردایەتی: خەریکبوون بەکاروباری کوردەوە.
کوردپەروەر: کوردێکە کە هەوڵ بدا بۆ خزمەتی گەلی کورد.
کوردپەروەری: هەوڵدان بۆ خزمەتی گەلی کورد.
کوردستان: ئەو جێگایەیە کە گەلی کوردی تێدا دانیشتووە کە سنووری نەختێک لە ژوور کەنداو (خلیج)ی فارسییە و بەدیوی ئێراندا دەست پێ دەکات تا نزیک دەریای ڕەش و، لە کرماشانەوە تا کەنداوی ئەسکەندەروونە و، چوارسەد هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە.
کوردشناسی: خەریکبوون بەباسێکەوە کە دەخلی بەسەر کوردەوە بێ (الدراسات الکردیة).
کوردکوژە: ناوە بۆ جۆرە خورمایەک. جۆرە ترێیەکە.
کوردۆ: جۆرێکە لەنقامی قۆریات.
کۆردەرە: ناو دۆڵ و دەرەیەکە کە دەرنەچێ.
کوردە کوژە: د. کوردکوژە.
کوردەواری: شوێنێکە کە کورد تێدا دانیشتبێ.
کوردی: زبانێکە کە کورد قسەی پێ دەکات. جۆرە خواردەمەنییەکە کە لە هەرزنی کوتراو و دۆ و ڕۆن دروست دەکرێ (ز).
کوڕ: نێرینەیەکە کە هێشتا ژنی نەهێنابێ. نەوەی نێرینەی باوک و دایک. کوڕوو. قوڕ (با).
کۆڕ: کۆمەڵی گیاندار: مەچۆرە ناو (کۆڕی) قومارکەرەوە.

کوڕاده: قوڕاده.
کۆڕاندن: پڕماندن و حیلاندنی ئەسپ.
کوڕانه: شتێکه که هەر بۆ کوڕ بشێ.
کوڕانی: کچێکه که خووی کوڕی بێ.
کۆڕپێگرتن: سەرنانه سەر یەکێک و بەزم پێ گرتنی.
کوڕش: کوڕوو.
کـوڕکـوڕ: باڵندەیەکـه بەقـەد کـۆتر، تووکی له هەمـوو تووکـێک نەرمتره و، گۆشتی دەخورێ.
کوڕکوڕۆچکه: کڕکڕاگه.
کوڕکه: قیتکه.
کوڕگ: د. جوانوو.
کۆڕگه: جێی کۆبوونەوەی چەند کەسێک.
گوڕنوو: کڕنووش.
کوڕنووش بردن: کڕنووشبردن.
کـوڕوکـاڵ: بەچەند کـوڕێکی گـەنجی تازه پێگەیشـتـوو دەڵێن کـه کۆبووبنەوه.
کوڕوو: وتەیەکه وڵاخی یەکسمی پێ بانگ دەکرێ. جاشەکەر .
کوڕووز: گیاندار و درەختی سیسی بێ کەیف.
کـوڕووزانەوه: باسی نەبوونی و نەدارایی کـردن لەلای یەکـێک. ناڵه و گریانی منداڵ بەهۆی نەخۆشییەوه.
کوڕووزه کوڕووز: کوڕووزانەوه.
کوڕووله: جاش.
کـۆڕه: پڕمـەی ئەسپ لەکـاتی غـوبابیـدا. دەنگی بەرزی گـریان بەکوڵ، (کۆڕەکۆڕ) کوڕەی یەک له دوای یەک.
کوڕەبەشه: مەلێکی گۆشتنی قەڵەوه.
کوڕەپا: د. پێ کوڕه.
کوڕەدار: دارێکه که مێوێک پێیدا هەڵگەڕابێ و، ئەو داره بۆ ئەو مێوه تەرخان کرابێ.
کۆڕەدار: کۆمەڵه دارێکی چڕی بەیەکدا چووه.
کوڕەزا: منداڵی کوڕ.
کوڕەزازا: منداڵی منداڵی کوڕ.
کوڕەزاگ: د. کوڕەزا.
کوڕەکەڵ: نێری حەیوانه کێوییه که پێی نابێته دوو یا سێ ساڵه.
کوڕیژگه: کوڕی پچکۆله.
کوڕێنی: تافی گەنجیی کوڕ.
کـوڕی: مـەڕێکه کـه بێ گـوێچکەبێ یا نیـوه گـوێچکەی ببێ. وتەیەکـه دەبێـژرێ بۆ لێـخـوڕین و بانگ کـردنی جـاش و جوانوو. جاشەکەر. مەڕێکه که خورییەکەی لێ کرابێتەوه.
کوڕیله: کوڕووله.
کوڕیس: کاوڕێکه کـه گوێچکەی پچووک و دەموچاوی سوورکـاڵ بێ.

کۆرس: ز. جۆڵا.
کورسکەر: ز. جۆڵا.
کـورسی: تەخـتـێکه له دار دروست کـرابێ بۆ لەسـەر نووستن یا دانیشتنی.
کـورسی کـورسی: شـتـێکه وەک چەرخ و فـەلەک چوار کـورسی پێـوەیه منداڵان دەچنه ناوی و دەخـولێنرێتـەوه و بەرز و نزم دەبنەوه.
کورشک: کەروێشک.
کورشهەڵاتن: چیچکه کردن بەکزییەوه.
کورک: تووکێکی زۆر نەرمه له بن مووی بزنەوه دەردێ. مریشک و باڵندەی کڕ.
کورکاندن: کورکه کردن.
کورکانن: کورکاندن.
کورکوڕۆژه: کڕکڕاگه.
کۆر کۆره: باڵندەیەکی بۆرەقنەی بێ بیره له کوندەبەبووی پچووک دەچێ. کـونێکه له پاڵ دۆڵـیـانی ئاشـدا، ئاشـەوان هاتوچۆی پێدا دەکا بۆ ژێر (دۆزەقه).
کورکه: دەنگی گریانی هێواشی. دەنگێکه له وڵاخی بەرزەی یەک سـمـەوه دێ له کـاتێکدا کـه وەخـتی ئالیکی هاتبێ، (کورکەکورک) کورکەی یەک له دوای یەک.
کورکه نیسان: گوڵاڵەسووره.
کۆرگ: د. کوێرووی دەغڵ.
کورکیان: د. کورکەکردنی وڵاخ.
کورن: ز. دۆڵی بەردەکه ئاوی تێ بکرێ.
کۆرنۆش: کوڕنووش.
کورۆتن: کورۆشتن.
کورۆچانن: د. کورۆشتن.
کورۆچ کرۆچ: د. کڕکڕاگه.
کوروزمان: با. بەچەی مەڕ.
کۆرۆژتن: کورۆشتن.
کورۆژین: کورۆشتن.
کورسک: با. هەرمێ کیویله.
کورۆسک: هەرمێ کیویله.
کورۆش: کولۆش.
کورۆشتن: داکرماندنی شتی ڕەق به ددان.
کورۆشه: کرمێکی سوورکەلەیه له دەمی قەف و گوڵ دەدا له گەنم و وشکی دەکا. کولۆش.
کورۆک: نێرک. کاکڵه.
کورۆڵ: کولۆڵ (د). کولۆر.
کوروور: د. کولوور.

کۆرە: کوێر. فیسار کەس کۆرەیە .
کۆرە بەشک: ز. جۆرێکە لە مشکە کێوی.
کورەک: د. کورۆک. زبانەی شت.
کۆرەکە: کـۆرکـۆرەی ئاش. نێی ئاش: ناوی بە(کـۆرەگە)ی ئاشدا چێ.
کۆرەڵاش: هـ. گیایەکی بەهارییە لە شنگ دەچی بەڵام ئەم گەڵای پانترە.
کۆرەمار: کوێرەمار.
کۆرەمشک: ز. مشکە کوێرە.
کۆرەوەری: کوێرەوەری.
کۆریانەوە: د. کۆرانەوە.
کۆری: کوێری.
کۆریت: کولانەی مریشک.
کوریشک: لۆچی کاڵا و هەموو شتێکی تر.
کوز: قوز.
کـۆز: جێ مـۆڵی ئاژاڵی وردە کـە بەتەیان تەنرابێ. هەوارگـە. لەوەڕگا.
کۆزانە: ز. جۆرە ترێیەکی دەنک گەورەی خڕە.
کۆزانێ: مەجمەعی عیلمی.
کوزبڕکە: قوزبڕکە.
کۆزر و بەربانان: بریتییە لە لێدانی زۆر لە یەکێک.
کوزکەش: بریتییە لە مەردوومی گەواد.
کۆزەڵاخ: ز. خانووی پچووکی نزم.
کوزماڵ: پاککردنەوەی جۆگەی پچووک.
کۆزمان: ئەنجومەنێکە کە لە وتەی زمانێک بکۆڵنەوە (مجمعي لغوي).
کۆزە: جێ مۆڵگەی کار و بەرخ.
کۆزەر: پووش و پەڵاشێکە لە دانەوێڵە گیرابێ بەگێژکردنی.
کۆزەرە: کۆزەر.
کۆزەریشە: یەکێکە ریشێکی بۆزی هەڵپرووزاوی بێ.
کوزە سووتەکێ: قوزە سووتەکێ.
کوژاندن: کوژاندنەوە.
کوژاندنەوە: نەهێشتنی گڕی ئاگر و چرا. تێکدانی پیتی نووسراو یا کێڕی سەرزەوی. بریتییە لە نەهێشتنی هەرا و ئاژاوەیەک.
کوژاننەوە: کوژاندنەوە.
کوژاو: کوژراو.
کوژاوە: نووسراو و کێڕێکە کە تێک درابێ.
کوژتن: د. کوشتن.
کوژران: کوشتن.
کوژراو: گیانلەبەرێکە کە بێ گیان کرابێ. بریتییە لە یەکێک کە لێی درابێ بەزۆری.
کوژنە: د. کوشندە.
کوژیاگ: کوژراو.
کوژیان: کوژران.
کوژیانەوە: کوژانەوە.
کوژیرک: با. گۆشە و قوڕنە.
کوژی: با. قوژبن.
کوژین: کوشتن.
کوس: قوز.
کۆس: د. کۆست. کۆسپایی.
کۆسار: د. شوێنێکە کە شاخوداخی زۆربێ.
کۆسپ: بەرزایی کەم لە زەوی. قۆرت و گرێی ڕۆژگار.
کۆسپایی: کۆسپ.
کۆسپە: کۆسپایی.
کۆست: بەڵای گەورە.
کـۆست کـەوتن: بریتـیـیـە لە هاتنی بەڵایەکی گـەورە بەسـەر یەکێکدا.
کۆستە: پیـاوێکە کە مـووی ڕیشی نەبێ یـا زۆر تەنک بێ. ناوی دوو دێی نزیک لە یەکن لە ڕۆژئاوای سلێمانی.
کـۆسـتـەک: قـولفـەیەکی چەرمـینە بە کـێـلانی خـەنجـەرەوە لە مشتووەکەی هەڵدەکێشرێ بۆ ئەوە کە نەیەتە دەرێ.
کۆستە کۆستە: بریتییە لە چاو و ڕاوکردنی چەند کەسێک لەگەڵ یەکێک بۆ دەست برین و هەڵخەڵەتاندنی.
کۆستەوەوی: دوو زەلامن لە کاتی بێ بارانیدا یەکـێکیـان ڕووی خۆی ڕەش دەکا و ئەویتریان بەرگی بووک لەبەر دەکا و دەست دەدەنە دەسـتی یەکـتـری و مـاڵـەومـاڵ دەسـووڕێنەوە و ئاویان دەکەن بەسەردا بۆ نوقڵانەی باران بارین.
کوسک: ز. مەردوومی چاوشین.
کوسکەش: بریتـییە لە مەردوومی گەواد. بریتـییە لە یەکێک کە کلکە لەقێ بکا بۆ یەکێکی تر.
کوسکەشی: گەوادی.
کۆسکەفتن: د. کۆست کەوتن.
کوسکی: ز. نۆێڵی ئاسن.
کوسۆک: کسۆک.
کۆسە: مەردوومی کۆستە. جۆرە ماسییەکە.
کۆسەک: کۆستەک.
کوش: ز. وریایی و خۆپاراستن.
کۆش: ماوەی بەر ورگ و ڕانی مەردووم لە کاتی دانیشتندا.
کوشبوون: ز. هاتنە پێشەوە. بزووتنەوە.
کوشتار: کوشتنی زۆر لە مەردووم یا لە گیانداری تر: لە فیسارە جەنگدا (کوشتار)ێکی زۆر کرا، یا گۆشتفرۆشەکان ئیمڕۆ زۆریان (کوشتار) کردووە.

کوشتن: دەرکردنی گیان لەبەر گیاندار. بریتییە لە لێدانی زۆر و بەئازار.
کوشتنەوە: بریتییە لە سەربڕینی ئاژاڵ: ئیمڕۆ سەد مەڕیان (کوشتەوە). کوشتنی یەکێک لە خوێنی یەکێکی تردا.
کوشتوو: ئاژاڵی سەربڕاو.
کوشتە: گەچێکی گیراوەی کوژراوی بێ هێزە لەسەر گەچکارییەوە سواغی پێ دەدرێ و بەماڵە لووس دەکرێ.
کوشتەرا: ڕەندەیەکە دارتاش داری پێ لووس دەکا.
کوشتەرە: د. کوشتەرا.
کوشتی: کوشتوو.
کۆشش: هەوڵدان و قەڵاشکردن بۆ شتێک.
کۆشک: خانووی بەرزی خۆش. گڵێنەی ئاو خواردنەوە (ز).
کۆشکار: ز. پینەچی.
کۆشکە: ز. جۆرە هەرمێیەکە. ناوی دێیەکە لە بۆتان.
کوشکەکردن: کورش هەڵاتن.
کوشکەڵاتن: کوشکەکردن.
کوشکەڵاتوو: کەسێکە کە کورش هەڵاتبێ.
کوشکەڵان: کۆگای تەپاڵەیە کە بەگردی دانرابێ و ناوەکەی بەبۆشی مابێتەوە. سەرەنوێلک (د).
کوشکهەڵاتن: کوشکەڵاتن.
کوشندە: شتێکە کە مایەی کوشتنی گیاندارێ.
کۆشە: کۆشین.
کۆشەڵان: د. گومەزێکە لە تەپاڵە ناوەکەی پڕ دەکرێ لە تەپاڵە بۆ سووتەنی.
کۆشەوە: د. کۆشش.
کۆشین: د. هەوڵدان.
کوفت: د. کفت.
کۆفی: ز. جۆرە گرتییەکە ژنانی کوردستانی زازا دەیدەن لە سەرپێچیان لە عاستی ناوچەوانیان بۆ جوانی.
کۆڤک: با. ڕەحەتی نەوت.
کۆک: جۆرە تەقەڵێکی زلە لە کاڵا هەڵدەدرێ لە پێش دروونیدا بۆ ڕێک وەستانی. شتی سازی لەبار: مەکینەکە زۆر (کۆک)ە. ڕەگ و ڕیشە (ز) پەڵپ.
کۆکردن: سڵەمینەوە لە شتێک. کۆکردنەوە.
کۆکردنەوە: کۆمەڵەکردن و گردکردنەوەی شتی بڵاو.
کۆککردن: قورمیشکردنی سەعات. سازکردنی شت.
کۆکگرتن: پەڵپ گرتن. تەقەڵ هەڵدان لە کاڵا بەدرشتی بۆ ڕێک ویستانی.
کۆکلاش: گیایەکی کوێستانییە لاسکەکەی بریندار دەکرێ و شتێک دەردەدا وەک بنێشت دەجوورێ.

کوکو: کوو کوو.
کوکوختی: گوگوختی.
کۆکە: دەنگێکە لە گەرووی گیاندارەوە دێتە دەرەوە بەتەکان بەهۆی خوروویەکەوە کە لە گەروویدا پەیدا دەبێ، (کۆکە کۆک) کۆکەی یەک لە دوای یەک. ناوی دێیەکە لە کوردستانی ئێران.
کۆکەڕەشە: جۆرە کۆکەیەکە بەمنداڵ دەگات دەنگی وەک کەڵەشێر دێ.
کۆکەن: ئالف بڕین.
کۆکەنار: توێکڵی خاشخاشە بەهاڕراوەیی لەگەڵ شەکردا دەدرێ بەمنداڵی کەم خەو بۆ ئەوەی خەوی لێ بکەوێ.
کۆکی: بوونی شت بەکۆک و ساز.
کۆکین: کۆکەکردن.
کۆگا: کۆمەڵێکی گەورە لە هەموو شتێک. شوێنێکە کە بەزۆری شتی تێدا دابنرێ (مخزن).
کۆگابازی: د. جۆرە یارییەکە شتێک لە ژێر خۆڵدا دەشارنەوە، هەر کەسێک دۆزییەوە دەیبا بۆ خۆی.
کۆگادان: د. کۆکردنەوەی شت و کردنی بەکۆگا.
کۆگە: کۆگا (د). کوێ (ھ).
کۆگەوان: مەئمووری مەخزەن.
کول: تیغێکە کە شت نەبڕێ. گیایەکە وەک خەرتەلە بەڵام ئەم لووسە. ئەندامێکی نەخۆش (ز). ماندوو: ئەوەندم هەوڵ دا (کول) بووم. گل: چاوم کول دەکات، واتە گل دەکات. کەسەر: دڵم کولە واتە خەمبارم.
کۆل: قەم (ھ). تەختەیەکە وەک سندوق نانەوا هەویری تێدا دەشێلێ. کۆڵ (ز). دۆڵیانەی ئاشە کە دانەوێڵەی تێ دەکرێ بۆ ئەوەی کە بەرەبەرە بچێتە ناو چەرەخۆرەوە. ئەندازەیەکە وەک قاسناغ دانەوێڵەی پێ دەپێورێ.
کوڵ: جۆشی شتی شل لەسەر ئاگر. جۆش و هەنسکی گریان: (کوڵ)ی گریانی نەدەنیشتەوە. شتێ کورت. هێندێ گیانداری بێ کەڵک.
کۆڵ: شتێکی نووکدارە کە نووکەکەی کول بێ. ئاژاڵی بێ شاخ. گیانداری گوج. شتێکی قورسە کە بەکۆڵی ئادەمی هەڵبگیرێ. پشتی ئادەمی بەلای هەردوو شانیەوە: ئەو منداڵە بکەرە (کۆڵ)ت. بەچکەی گیاندار: کەر (کۆڵ) واتە جاشەکەر. گیایەکی کوێستانییە گەڵای درێژکۆلەیە، بنکەکەی سوورە، دەکرێ بە کەلانە.
کولاب: ز. چنگی گیاندار و باڵندە.
کولابە: ڕ. ئەو دوو دارەیە کە دەکەوێتە سەر ملی گای جووت.
کولات: ز. کولۆی پچووک لە گڵ یا لە بەفر.

کولاتگ: شتێکە هاتبێتە کوڵ.
کۆلارە: باڵندەیەکی گۆشتخۆری زیاندارە لە داڵ دەچێ. جۆرە شتێکە منداڵان لە قاقەزی ڕەنگاوڕەنگ دروستی دەکەن و هەڵی دەدەن بەئاسماندا بەدەزوو.
کولافک: با. قارچک.
کولافە: مەردوومی بێ ورە.
کولاڤ: لباد (ز). کڵاو (با).
کولان: د. کولانە.
کولان: قولپدانی شتی شل لەسەر ئاگر. پووختەبوون و پێگەیشتنی شت لەسەر ئاگر.
کۆڵان: دەربوونەیەکە کە چەند دەرگایەکی لەسەر بێ.
کولانچکە: کڵاوڕۆژنە.
کولاندن: پوختەکردنی شت لەسەر ئاگر.
کولاندنەوە: ئازار گەیاندن بەبرین بەهۆی دەست لێدانیەوە.
کۆلانکوت: بریتییە لە مەردوومی گەڕۆک.
کولانکە: کڵاوڕۆژنە.
کولانگ: د. کولاندن.
کولانن: کولاندن.
کولاننەوە: کولاندنەوە.
کولانە: شوێنێکی پچکۆلەی سەرگیراوە، کۆتر و مریشک تێیدا هەڵدەنیشێ.
کولانەوە: ئازار گەیشتن بەبرین بەهۆی کەوتنی لە شتێک.
کولاو: ل. تەورداس.
کولاو: شتێکە لەسەر ئاگر پوختە بووبێ.
کولبوون: نەمانی تیژیی تیغ. بریتییە لە ماندووبوون لە کارێکدا. ئیشکردن (ز). ئاوسان و کێمکردنی ئەندام (ز).
کۆڵبەند: کۆڵوانە.
کولپ: با. گرانی.
کولپیچ: با. خشتی سوور.
کۆڵ پێدان: بەزاندن.
کولجە: د. کولۆجە.
کولخان: توون.
کولخواردن: د. جۆشخواردنی شت بەسەر یەکدا. بریتییە لە ڕق هەستان و جۆشخواردنی دەروون.
کولدان: جۆشدان و کولاندنی شت لەسەر ئاگر.
کۆڵدان: وەڕس بوون لە شتێک و دەست لێ هەڵگرتنی.
کولغا: با. گیانداری زۆر برسی.
کولغت: د. ئەستوور. زۆر.
کولک: دڵێکە کە زۆر خەفەتبارێ. چاوێکە کە زۆر بیەشێ و ماندوو بووبێ. دومەڵ. هۆدەیەکە کە لە حەسیر و قامیش دروست کرابێ (با).

کوڵک: مووی کورت کە نەشێ بۆ ڕستن. کورک (د). تووش و دووچار: بووە بە (کوڵک)یەوە، واتە بووە بەتووشیەوە.
کۆلک: کۆتەرەداری ڕزیو. مزراحێکی بێ کەڵکە دادەنرێ و مزراحی بەسەردا دادەکوترێ. شتی کۆنی بێ کەڵک. کەپری پچووک. بنکی ددانی ڕزیو.
کولکانە: ل. ئەموستیلە.
کوڵکردن: کالاشتن.
کۆڵکردن: کوڵکردن. کردنە کۆڵی شت (د).
کولکردن: ز. پاڵ پێوەنان.
کوڵکن: شتێکە کە کوڵک و مووی پێوەبێ. ماستاوی خەستی گورۆگورۆ.
کوڵکنە: کۆڵکن.
کوڵکە: د. کوڵک.
کوڵکەر: جل شۆر.
کوڵکەڕن: ڕنینەوەی خوری و مووی ئاژاڵ بە دەست.
کۆڵکەزێرینە: پەڵکەزێرینە.
کۆڵکێش: کەسێکە بەکۆڵ شت هەڵبگرێ.
کولگە: ڕەبەت. جێی کۆبوونەوەی چەند ڕاوچییەک بۆ حەسانەوەیان.
کۆڵگێر: کەسێکە بە کۆڵ شت بگێڕێ بۆ فرۆشتن.
کوللە: گیانداریکی باڵداری درێژکۆلەی قاچ زبرە، سەوزایی دەخوا و گەلێ جۆری هەیە، پەردەیەکی تەنکە لە هاویناندا بەدەوری جێی نووستندا دەگیردرێ.
کوللەبەجەڕ: بریتییە لە یەکێک کە ئەوەندە لاوازبێ ئەندامەکانی وەک بەجەڕ لێکدرابێ وابێ.
کوللە زەردە: جۆرە کوللەیەکی زەردی بەزیانە.
کوللەک: ز. کڵاوڕۆژنە. شەل.
کوللە مسکە: جۆرە کوللەیەکی وردە گەنم و جۆ دەخوا.
کول لێدان: مردنی شتێک بە ناخونەک.
کولم: ز. لەوێچ. مستەکۆڵە (با).
کوڵم: ڕوومەت.
کوڵمە: گوڵمەی گۆشت (د). کوڵم.
کۆڵنج: ئازارێکە لە شان و مل و پشتدا پەیدا دەبێ بەهۆی سەرماوە. تووی نەگەیو.
کۆڵنجان: گیایەکی گەرمە دەکوترێ و دەدرێ لە ئەندامی یەکێک کە تووشی ڕەقیتە بووبێ.
کۆڵنجکردن: ئازار پەڕینە ناو شان و مل و پشت بەهۆی سەرماوە.
کۆڵنجگە: د. ناوشان.
کۆڵنجە: تووی نەگەیو.

کولندەر: ز. کوولەکە.
کولَنگ: قولَنگ.
کولۆ: با. کوللە.
کولۆ: پارچەیەکی ڕەقی خڕە لە هەموو شتێک: (کولۆ)یەک شەکر یا گڵ.
کۆڵوانە: پارچە تەنراوێکی چوار سووچە ژنان لەسەر کالاوە دەیگرنە کۆڵیان.
کولۆت: ئێسقانێکە کە نەرمەی گۆشتی سمتی پێوەیە. کولۆ.
کولۆج: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە دوای وتەی بە(هیچ)ەوە بۆ نەبوونی کارێک: بە(هیچ کولۆج)ێک ئەم کارە ناکەم، واتە بەهیچ ڕەنگێک.
کولۆجە: سەردەرییەکی کورتی ناودارە، لەسەر سوخمەوە لەبەر دەکرێ
کولۆخ: با. کاسەی سەر.
کولۆر: شتێکە کە ناوی هەڵۆڵ و پووچ بێ.
کۆلۆز: ز. کلاوێکە کە لە خوری دروست کرابێ.
کۆلۆزبانە: هـ. گیایەکی بەهارییە گوڵێکی زردی هەیە بەجۆش دراوی دەخورێتەوە بۆ ژانەسک.
کولۆزرک: د. کوڵەزرک.
کولۆش: دواوەی دانەوێڵە.
کولۆشە: کولۆش.
کولۆفت: د. کولفت.
کولۆک: کولۆتی گیاندار. نیسک و نۆک و ماشێکە کە زوو بکولێ.
کولۆکار: دیوارێکە کە بەکولۆ کرابێ. وەستایەکە کە هەر دیواری کولۆ بتوانێ بکا. شتی ڕێکوپێک (د) .
کولۆکاری: خەریکبوون بەدیواری کولۆوە.
کولۆکۆ: کڵپەی گڕی ئاگر: کولۆکۆ: ی دامرد.
کولۆکۆدامردن: سووتانی شت بەئێجکاری.
کولۆڵ: مەردوومی بەدبەخت. مەڕی ناوچەوان سپی.
کولۆڵی: بەدبەختی.
کولۆم: چەند پارچەدارێکە لە ناو کیسەڵەی دەرگادا بەڕەتبوونی شمشێرەی دەرگاکە دەکەونە ناو لەلەکانییەوە و دەرگاکە دادەخرێ.
کولۆمکردن: داخستنی دەرگا بەکولۆم.
کولۆنجە: کولۆجە.
کولۆندە: کولۆجە.
کولوو: لووکەی تازەی کراوەی نواڵەکراو.
کۆلوو: پارچە نانێکە کەوتبێتە ناو تەنوورەوە و لۆچ بوو بێ و هەڵپرووزابێ. بنکی گیای تاڵووە لە شوێنی کەم داردا دەکرێ بەسووتەمەنی.

کولووچە: د. کولیچە.
کولووچەمەژگە: د. جۆرە کولیچەیەکە ناوەکەی شەکر و گوێز یا خورمای تێ دەکرێ.
کولوور: ناوە بۆ پێنج (لەک) کە دەکاتە پێنج سەد هەزار.
کولوورە: پوورەی هەنگ.
کولووز: د. گیانداری پەڕپووتی بێ تین.
کولووزیانەوە: د. کوڕووزانەوە.
کولووکی: د. پەلەپەل و تاڵووکەکردن.
کولوە: ل. گۆڕیچە.
کولە: کوللە.
کوڵە: ڕەبەت. جێی خۆحەشاردان لە مەردووم بۆ گوێگرتن و قسە دزین: فیسار کەس (کولە)ی لێ گرتووم. ژیشک (د). شتی کوڵ.
کۆلە: بەندە.
کۆڵە: شووتی پچووک. بەچکەی گیاندار: کەر (کۆڵە)، شێر (کۆڵە) واتە بەچکەی شێر و کەر. کۆڵوو (د).
کوڵەبار: د. کۆڵەکەیەکە کە درابێتە بەر لقێک کە بەری زۆری گرتبێ تا نەشکێتەوە.
کوڵەباڵ: فەرەنجییەکی کورتی گوێچکەدارە قۆڵ دەکرێ بەبن گوێچکەی کانیدا.
کوڵەباڵە: کوڵەباڵ.
کوڵەبرک: د. کورتەدارێکە دەگیرێتە بەرزە درەخت بۆ خستنە خوارەوەی بەرەکەی.
کوڵەبنە: مەردوومی خڕیلانە.
کوڵەبەس: منداڵی ژن لە مێردی تری.
کۆڵەبەست: کۆڵەبەس.
کۆڵەبی: درەختی کوڕووز. ناوی دوو دێیە لە ناوچەی سەنگاو و تانجەڕۆ.
کوڵەپرە: د. مەردوومی خڕی چوارشانە.
کوڵەپێچکردن: ڕاپێچکردن و بردنی یەکێک یا زیاتر. چنگ لە سەرشان.
کوڵەجە: کولۆجە.
کوڵە چوارشەموو: دواترین چوارشەمووی مانگی سەفەرە کە دانی پێغەمبەری تێدا (شکێنراوە).
کوڵەخرتە: د. کوڵەپرە.
کۆڵەر: کەسێکە شت باش بکۆڵێتەوە.
کوڵەرم: ڕمی پچووک. بەرچیغ.
کوڵەزرک: د. سیقەتۆرە.
کۆڵەسی: دارێکی ئەستووری کولۆرە کە هەنگ شانی تێدا هەڵبەستێ. مێوێکە کە لە نەمامی تێپەڕبووبێ و قەدەکەی ئەستوور بووبێ.

کولەش: د. کولۆش. مەردوومی بێعاری بێ ئابروو.
کولەک: با. پەنجەرەی پچووک کە پێی دەڵێن پەنجەرەی هەوایی. تاقی ناودیوار.
کولەک: ز. لێسکەی کەوچک تاش.
کۆڵەکەجەڕە: دارێکە دەدرێتە بەرچەرخی سەربیر بۆ ئەوەی کە نەخولێتەوە.
کوڵەکردن: بریتییە لە گوێ هەڵخستن بۆ قسە دزین.
کوڵە کوێرۆ: سفرەمار.
کوڵە کەوا: دیرەگێکە درابێتە بەر نیرگە.
کۆڵەکە زێڕینە: پەلکە زێڕینە .
کوڵەکەوا: کورتەک.
کوڵەماڵە: دارێکە ناوەڕاستەکەی کونێکی تێدایە، زبانەی ئێرەقی پێدا دەکرێ و ماڵەی زەوی پێ دەدرێ.
کوڵە مانگ: مانگی شەعبان.
کولەمەرگێ: کولەمەرگی.
کولەمەرگی: گوزەرانکردن بەکەموکوڕی.
کوڵەنانی: کەسێکە کە پیاوێک لە ژنی بەسترابێ بیکاتەوە.
کۆڵەنجە: کولۆنجە.
کوڵەنجی: دووپشک.
کۆڵەوار: گیاندارێکە کە بەبرینێکی گەورە بریندار بووبێ.
کۆڵەوانە: کۆڵوانە.
کۆڵەووژ: دارێکی باریکی درێژە ئاگری تەنووری پێ تێک دەدرێ و نانی لە تەنوور پێ دەکرێتەوە.
کۆڵەوەس: کۆڵەبەس. دەغڵێکە زوو لە پێش پەڵەدا دا چنرابێ و بنجی داکوتابێ.
کوڵەوەبیاب: جۆرە مارێکی کورتی زۆر پیسە. بریتییە لە مەردوومی بەئاشووب.
کوڵەوەی وا: کوڵەوەبیاب.
کوڵەوەی واو: کوڵەوەبیاب.
کۆڵەوێژ: د. شیعری لەنگی نارێک.
کولی: با. کوللە.
کوڵیاگ: شتی کوڵاو.
کوڵیان: د. کوڵان.
کولیانەوە: د. کولانەوە.
کوڵی دڵ: سۆزی دڵ. بە(کوڵی دڵ) خۆشم دەوێ.
کولێرە: جۆرە نانێکی خڕی ئەستوورە.
کولێرەچەورە: جۆرە کولێرەیەکە کە ڕۆن درابێ لە ڕوویەکی. کوولکە دەروێشی.
کولێرە مەژگە: جۆرە کولێرەیەکە ناوەکەی گوێزی کوتراوی تێ دەکرێ.
کولیلک: با. گوڵووک.
کولین: با. موغەیری ئاگر.
کولێن: سووچێکە لەناو دەواردا بەچیغ بڕ دەدرێ بۆ تێدا دانانی شتی بەنرخ. کولانە (د).
کۆڵێن: دەفرێکی گڵینی سوورەوەکراوە، کە لەدیزە گەورەترە، دۆشاوی تێ دەکرێ.
کولێنگ: قوڵنگە.
کولێنە: د. کولێن.
کولی: ز. کوللە. کاکۆڵ.
کۆلی: ز. شوێنێکە لە وڵات کە داگیرکرابێ لەلایەن دەوڵەتێکی بێگانەوە. (موستەعمەرە).
کۆڵی: مەردوومێکە کە لە کارێکدا ناشی بێ.
کۆلیت: کولانەی مریشک و سەگ و شتی تر. دارێکی گەورەیە ناوەکەی هەڵ کۆلراوە ترێ و هەناری تێدا دەگوشرێ.
کۆڵیت: ڕەبەت. هۆدەیەکە لە کۆڵەکە و دار و گەڵا دروست دەکرێ و گڵەبانێکی کەم دەکرێ. کۆلیت.
کۆڵیتە: هـ. کولانە و مریشک.
کولیچە: خواردەمەنییەکە لە هەویر و شەکر و گوێز دروست دەکرێ وەک شەکرلەمە.
کولیچەمەژگە: کولووچەمەژکە.
کۆلیدار: ز. داگیرکەر. (مستعمر).
کۆڵی سوار: کەسێکە کە سواری باش نەزانێ.
کولیلک: ز. گوڵووک.
کولیمک: ز. هەردوو سمتی مەردووم.
کوڵین: کوڵان.
کۆڵین: هەڵکەندن.
کۆڵینەوە: هەڵکەندن و دانەوەی بێخی شت. وردکردنەوە و لێکدانەوەی شتێکی ونی نادیار بەبیر و هۆش: دەرسەکەت جوان (بکۆڵەرەوە) یا هەموو قسەیەک (بکۆڵەرەوە) تا تێی دەگەیت.
کوم: ز. کڵاو.
کۆم: قنگ. مەردوومێکە پشتی چەمابێتەوە. کولۆم (هـ). ناوی دێیەکە لە ناوچەی سەنگاو کە کانی خوێی تێدایە.
کۆماج: کۆمانج. قنگەبان (د). جۆرە کولێرەیەکی نەرم و شلی زەردوزۆڵە بەچاوە دەخورێ (د). کوورە (د).
کۆماجە: د. تەپڵەکی سەر کۆڵەکە .
کۆمار: چەند ڕەشماڵێکە کە پێکەوە لە شوێنێک هەڵیان دابێ. کۆمەڵ. گەل.
کۆمارێتی: جمهوریە.
کۆمانج: دارێکی درێژە بەناوەڕاستی دەواردا ڕایەل دەکرێ و هەسوونی دەدرێتە ژێر.

کۆماو: کۆماوە.
کۆماوە: کەسێکە کە کۆم بووبێتەوە.
کۆمبوونەوە: چەوتانەوەی پشت بەهۆی پیری یا نەخۆشییەوە.
کومسا: هـ. کاتی باران بڕان.
کۆمە: کۆمەڵەیەک لە شت.
کۆمەک: یارمەتی. یارمەتیدەر: فیسار کەس (کۆمەک)مە.
کۆمەککردن: یارمەتیدان.
کۆمەکی: کۆمەککردن.
کۆمەڵ: چەند شتێکی گردەوەبوو.
کۆمەڵایەتی: چۆنێتییەکی جوانە لەناو کۆمەڵێک لە ئادەمیدا کە بەیەکیانەوە ببەستێ: ڕاستگۆیی بۆ (کۆمەڵایەتی) باشە.
کۆمەڵبوون: گردبوونەوەی چەند شتێک.
کۆمەڵتە: د. کۆمەڵ.
کۆمەڵکردن: کۆکردنەوەی چەند شتێک.
کۆمەڵە: کۆمەڵ، (کۆمەڵەبوون) کۆمەڵبوون (کۆمەڵەکردن) کۆمەڵکردن.
کۆمەڵەبەستن: کۆمەڵبوون.
کون: دەلاقەیەکی پچووک یا گەورە لە شتێکدا (کونبوون) پەیدابوونی کون لە شتێکدا (کونکردن). پەیداکردنی کون لە شتێکدا.
کۆن: شتی زۆر ماوە. خێوەتی پچووک (ز).
کونا: کون. کلاوڕۆژنە (د).
کونار: درەختێکی گەرمیانییە دڕکێکی درێژی هەیە دەکرێ بەپەرژین.
کوناڕۆچن: کوناوچە.
کونارشک: ئانیشک.
کوناوچە: کلاوڕۆژنە.
کوناوەدر: شتێکە کە کونێکی ئەم دیو و ئەودیوی تێ بووبێ.
کوناوەجگە: کوناوچە.
کونبوون: دەلاقە بوون لە شت.
کونبڕ: شوێنێکە کە با بوێری نەبێ، (کونبڕکردن) گرتنی کونی شوێنێک بەجۆرێک کە با هاتوچۆی پێدا نەکا.
کون بەفر: با. چاڵە بەفر.
کونج: قوژبن و پەنا: فیسار کەس (کونج)ی تەنیایی گرتووە. شتی خاڵدار: مریشکەکە (کونج)ە. مەردوومی دەموچاو ئاوڵاوی. ئینجانەی گوڵ.
کونجر: شتی کونجی خاڵ خاڵ.
کونجڕ: کونجوور.
کونجرە: دڕکی پەیکوڵ.
کونجرکە: کونجڕ.
کونجرک: ز. نوقورچ.
کونجرە: گیایەکی بەهاری زبرە بەبارێک دەگرێ وەک پەیکول بەڵام ئەم دڕکەکانی وردترە.
کونجکاو: د. کەسێکە کە زۆر پرسیار لە شت بکا.
کونجکاوی: د. بوونی یەکێک بەپرساو بەجۆست و جۆ.
کونجکونجێن: یارییەکە چەند کەسێک هەریەکە لە کونجێکدا دەوەستێ لە پاشا جێگەگۆڕکێ دەکەن لەو حەلەدا ئەگەر بۆیان ڕێکەوێ لە یەکتری هەڵ دەدەن.
کونجووڕ: کونجی تەسک و تەنگەبەر.
کونجووڵ: د. کونجووڕ.
کونجیت: ل. کونجی.
کونجی: شتێکی وردی دەنک زەردی ناسکی چەورە دەکرێ بەکولێرەوە و، بەگەڵێ جۆری تر دەخورێ.
کوند: ز. کوندەبەبوو.
کوندر: ز. کوولەکە.
کوندک: با. کوندە. کوولەکە.
کوندووش: دەرمانێکە وەک بڕنووتی دەکرێتە لووتەوە، بەڵام ئەم کەسکینتر و بە پژمەترە. سووژن.
کوندە: پێستی بزنە کە بەساغی دەرهاتبێ و خۆش کرابێ بۆ ئاوتێ کردن.
کوندەبوو: کوندەبەبوو.
کوندەبەبوو: باڵندەیەکی گۆشتخۆری دەنووک قولاپەیی چاو جوانە، هەر لە چۆڵی و کەلاوە دادەنیشێنەوە
کوندەڵان: جێگایەکی نسرمە هاوینان کوندەی پڕ لە ئاوی لێ دادەنرێ بۆ ئەوەی کە ساردبێ.
کون زووان: د. مەردوومی تری زبان لاڵ.
کون زەین: د. مەردوومی تێ نەگەیشتووی کەودەن.
کۆنساڵ: بریتییە لە مەردوومی پیر.
کونکردن: سمینی شت. لابردنی کچێنی کچ بەچوونەلای.
کۆنکرێت: چیمەنتۆ و لم و چەوی گیراوەیە کە بەکار هێنرابێ.
کۆنکرێتی شیشدار: کۆنکرێتێکە کە شیشی تێدا ڕاکیشرابێ.
کونگ: ز. گرێیەکە لەناو داری گوێزدا هەڵ دەکەندرێ و دەکوترێ و شتی پێ زەرد دەکرێ.
کۆنگرە: کۆنگەرە.
کۆنگەرە: موئتەمر.
کوننە: کوندە.
کوننەلان: کوندەڵان، تەپۆڵکە (د).
کوننەی زرانی: د. کاسەی ئەژنۆ.
کونۆش: مەردوومی ڕژد (ز). کوندووش (د).
کونۆشە: ز. گەسک.

کونوڕ: د. کونووڕ.
کونووڕ: د. جەوییەکە کە لە داری قەزوان نەبێ.
کونووچکە: کونی زۆر ورد.
کۆنووس: نووسراوێکە کە چەند کەسێک لە بارەی شتێکەوە بینووسن و مۆری کەن (محضر).
کۆنە: کاڵای کۆن. ئاگردان (ل).
کۆنەپۆش: کەسێکە کە هەر کۆنە لەبەر بکا.
کۆنەپۆشی: ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد کە لە سنووری پێنجوین دادەنیشن.
کۆنەپەرست: کەسێکە کە بیروباوەڕی کۆنی خۆش بوێ با ناڕەواش بێ (رجعي).
کۆنەپەرستی: پەرستنی باوی کۆنی ناڕەوا.
کۆنە چەکمە ڕەق: بریتییە لە پیاوی بووەی لێکەوتووی بەفیز.
کۆنەسوار: کەسێکە لەکاتی زۆر خانەدا دومەڵەک لێ بدا. کەسێکە لە کۆنەوە سوار بێ.
کۆنەفرۆش: کەسێکە پیشەی هەر کڕین و فرۆشتنی کۆنە بێ.
کۆنی: بوونی شت بەکۆن.
کۆنینە: شتی زۆر کۆنی مێژوویی.
کوو: وتەیەکە بەکاردێنرێ لەجیاتی وتەی (چۆن).
کۆوار: ڕۆژنامە.
کووارک: کارگ.
کووپ: دەفرێکی قوڵفەداری پچووکە شیر و چای و قاوەی پێ دەخورێتەوە. جۆرێکە لە کاغەزی قومار
کووپە: گۆزەی زۆر گەورەی دوو قوڵف. جۆرێکە لە کاغەزی قومار کە خاڵەکەی لە کووپە دەچێ.
کووپەڵۆکە: کووپەی پچکۆلانە.
کووپەڵە: کووپەڵۆکە.
کووت: وتەیەکە سەگی پێ بانگ دەکرێ. خاک و خۆڵی ناو ماڵە کە بەدەم گەسکەوە کۆ دەکرێتەوە و، لەگەڵ چێشت و وردە ناندا تێکەڵە دەکرێتە ناو شینایییەوە بۆ هێزی زەوی، ئەمەش لە شوێنێکدا وایە کە شیاکە و پشقلی وڵاخ و ئاژاڵ بسووتێنرێ لەبەر بێ داری. زبڵ. پەین. سەماد.
کووتاڵ: چەند پارچە تەنراوێکی بەنرخە بازرگان لە دووکانیدا دایدەنێ بۆ فرۆشتنی.
کووتاڵفرۆش: بازرگانێکە کە کووتاڵ بفرۆشێ.
کووت کووتە: پارچە پەڕۆ یا گوشێکە منداڵان بەردێکی پێوە دەبەستن و هەڵی دەدەن بەحەوادا.
کووتە: قەزوان و تووی بەیەکداکوتراو (ه). توتکە سەگ.
کووتەڵ: با. دۆڵیانی ئاش.
کووتەڵە: توتکە سەگ.

کووجی: ه. کۆڵانی تەنگەبەر.
کووچاک: ز. خێزەرە.
کووچە: کۆڵان.
کووخک: کۆکە.
کوودک: ز. ئەژنۆ.
کوودەڵە: بەچکەی بەراز.
کوور: گیسکی دوو ساڵەی نێر. قووڵ (ز).
کووڕ: شتێکی درێژە کە کەمێک خواربووبێتەوە: پەنجەم یا پشتم (کووڕ) بووە. شوێنێکە کە ڕێی تێ نەکەوێ. شوێنێکە کە زۆر لێژ بێ.
کوورە: کەلەبەرێکە لە زەوی یا لە دیوار ئاگری تێدا دەکرێتەوە. شتێکێ کون کونی پێچکەدارە لە تەنەکە یا لە گڵی سوورەوەکراو ئاگری تێ دەکرێ و چێشت و چای لەسەر لێ دەنرێ.
کوورە پەزخانە: کوورەی خشت سوورکردنەوە.
کوورەخانە: کوورەی ئاگری ئاسنگەر. کوورە پەزخانە.
کوورەدان: پوورەدانی هەنگ.
کوورەدەمێن: شاگردێکە کە بەمووشە و دەمە هەر کوورە بدەمێنێ.
کوورەفەرەنگی: جۆرە کوورەیەکە بەنەوت دەگرێ و چێشت و چای لەسەر لێ دەنرێ.
کووز: قاشی میوە. جۆگەلە (ه).
کووزاندنەوە: چووزاندنەوە.
کووزانەوە: چووزانەوە.
کووزکردن: قاشکردن.
کووزکووز: شتێکە لە خۆیدا قاش قاش بێ بەڵام لێک نەبووبێتەوە: ئەم کاڵەکە (کووزکووز)ە.
کووزلێدان: خانخانکردنی زەوییە بەگاسن بۆ دێراو و گۆل.
کووزە: ز. گیاندارێکە بەقەد پشیلەیەک دەبێ کلکی درێژ و چوار پەلی کورتە، پێستەکەی دەکرێ بەکەوڵ .
کووزەڵە: گیایەکی توونی ئاوی بەهارییە، لە گوێ ئاو دەڕوێ، گەڵای وەک کەرەوز وایە.
کووژە: ئەو کونەیە کە دەغڵی لێ دێتە خوارەوە بۆ ناو گوێرووی بەرداش.
کووژەرە: د. غەنزەڕووت.
کووژەکە: قۆپچەیەکی شینە بۆ جوانی دەدروێ بەسەر شانی منداڵدا.
کووژە کەرانە: مووروووەکەرانە.
کووش: وتەیەکە پرسیاری شوێنی پێ دەکرێ: لە (کووش) بوویت واتە لەکوێ بوویت. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی: (هیچ).

کووفک: ز. ڕەحەتی.
کووفی: سەرپێچی ژنان. کووپە (ز).
کووڤان: ز. داخ و خەفەت. ئێش و ئازار.
کووڤە: ز. کەی.
کووکوو: جۆرە هێلکە و ڕۆنێکی دوو دیوە جاترەی تێکەڵ دەکرێ. جۆرە کۆترێکی دەنگ خۆشە (د).
کووکووکەرە: کۆترە باریکە.
کــووکــە: هەرا و ئاژاوەیەکــە کــە بەرپا ببێ بەهۆی پەیدابوونی شــتــێکی ناشــرینەوە: یاخــوا هەزار کــووکــەی لێ هەســتێ. قووقەی کەڵەشێر .
کـوول: تەخــتــەیەکــە وەک سندوق نانەوا هەویری تێدا دەشــێلێ. زاخە. ئەشکەوت: (د). فیلی شەترەنج (د). تەویلە (با).
کووڵک: کولانەی مریشک.
کوولەکە: بەری گــیــایەکی گەڵا پانە وەک کاڵەک وایە بەچێشــتی دەخورێ و گەلێ جۆری هەیە.
کوولەکە ئاوی: جۆرە کولەکەیەکی پچکۆلەی باریکی سپییە.
کــوولەکــە باڵقــە بــاغی: جــۆرە کــوولەکــەیەکی ملدارە نــاوەکــەی دەردەهێنن و شتی تێ دەکەن.
کوولەکە دمە: هە. جۆرە هەنجیرێکە لە هەرمێ دەچێ.
کوولەکە دۆشاوی: جۆرە کوولەکەیەکی گەورەی شیرینی سوورە، دەکرێ بەچێشت.
کــوولەکــە دەرویشی: جــۆرە کــولەکــەیەکی قنگ خــڕی مل بــاریکە، دەرویش ڕۆنــی ســواڵی تێ دەکــا. گــیــایەکــە لەناو دەغــڵــدا دەڕوێ بەرێک دەگرێ وەک کوولەکە دەرویشی وایە بەڵام ئەم وردە.
کوولەکە سەندەڵی: جۆرە کوولەکەیەکی گەورەی خڕی قاشقاشە دەکرێ بەچێشت.
کوولەکێن: د. چێشتی کوولەکە .
کوومڕ: با. خەڵووز.
کوون: قنگ.
کوونە: ل. مەقەڵی.
کوونی: مەردوومی حیز. گیانداری تەمەڵی ئیش لێ نەهاتوو.
کووهـ: د. ئەستێرەی کۆ.
کوهـ: با. ئاڵبوونەوەی ددان: دانم (کوهـ) بووە.
کوێ: وتەیەکە پرسیاری پێ دەکرێ لە شوێن: لە (کوێ) بوویت، واتە لە چ جێگایەک؟
کوێت: وڵاخێکە ڕەنگی سوورێکی تاریک بێ.
کوێخا: دەم ڕاست و کاربەدەستی دێ .
کوێخایانە: مووچەیەکە دەدرێ بەکوێخا.
کوێخایەتی: کوێخایی.
کوێخایی: دەم ڕاستی و کاربەدەستی دێیەک.
کــوێر: گــیــانداریێکە کـە چاوی نەبینێ. گــوێزێکە کــە ناوکــەکــەی درەنگ دربەێ.
کوێرانە: وەک کوێر.
کوێراو: چاوگەیەکە کەمی لەبەر بڕوا.
کوێرایی: کوێری.
کوێرایی داهاتن: کوێربوون.
کوێربوون: نەمانی بینایی چاو.
کــوێربوونەوە: نەمــان و ونبــوونی ڕێ و شــوێنی شت: ڕێگاکــە یا کــارێزەکــە یا بیــرەکــە، یا دەمی برینەکــە، یا کــونی گــوێچکە ســمــراوەکــە (کــوێر بووەتەوە). نەمــان و بنەبڕبوونی وەچەی یەکێک: خانەدانی فیسار کەس (کوێربووەوە).
کوێردڵ: مەردوومی تێ نەگەیشتوو.
کوێڕا: وتەی سەرسوورمان لە کردنی کارێک زۆر بەدەستوبردی: کوێڕا ئەو کارەت کرد.
کوێرک: کوێروو.
کــوێر کــوێرانە: وتەیەکــە دەوترێ بەیەکــێک کە کــارێک بکا بەبێ تێبــینی و لێکدانــەوە: هەروا (کــوێر کــوێرانە) دەســتم دایە ئیشەکە.
کوێرک: کوێرووی دەغڵ.
کوێرنان: بریتییە لە کەسێک کە نان بدە نەبێ.
کوێروو: پووچەکی دانەوێڵەیەکە کە ناوکەکەی ڕەش بووبێ.
کوێرەدێ: دێیەکی پچکۆلانەی کەم ئاوە کە چەند ماڵە هەژارێکی تێدابێ.
کوێرەڕێ: ڕێگایەکی باریکە کە کەم هاتوچۆی پێدا بکرێ.
کوێرەک: کوێروو.
کوێرەکانی: کانییەکە کە پڕ بووبێتەوە و ئاوێکی کەمی مابێ. ناوی دێیەکە لە سوورداش.
کوێرەمار: جۆرە مارێکی کوێری زۆر پیسی کوشندەیە.
کوێرە مووشە: مەردوومی چاوکز.
کوێرەوەبوون: کوێربوونەوە.
کوێرەوەری: سەغڵەتی و دەردی سەری لە کاروباردا.
کوێرێتی: کوێری.
کوێری: بوونی گیاندار بە کوێر.
کوریشک: کەروێشک.
کویژرک: با. قوژبن.
کوێسان: کوێستان.
کوێستــان: وڵاتی بەهاوین فێنکی بەزستــان ساردی بەفر و باران زۆر.
کوێستانی: شتێکە لە وڵاتی کوێستانەوە هاتبێ.

کوێشتیر: چتیر.
کوێشکە: چۆلەکە پاساری.
کۆیلە: بەندەی زەڕ خرِیدە.
کوێن: تەختەی دەوار.
کوێندەری: وتەیەکە پرسیاری جێی لە دایکبوونی یەکێکی پێ دەکرێ: نەریمان (کوێندەری)یە، واتە خەڵقی کوێیە؟
کوێنک: تەختەیەکە لە دەوار .
کوێنە: کوێ.
کوێو: تاوێرەبەرد.
کوێوسان: کوێستان.
کوێوە: وتەیەکە داوای دیارکردن (تعین)ی شوێنی شتێکی پێ دەکرێ: مانگ لە (کوێوە)یە؟
کوێوسان: کوێستان.
کویر: با. قووڵ.
کویسان: کوێستان.
کە: پیتێکە دەکەوێتە ناوەندی دوو وتارەوە، وتاری دووەم دەکا بەتەواوکەری وتاری یەکەم: مەردووم کەسێکە (کە) گیانی خۆی بەخت بکا لە رێی بەرزی نیشتمانیدا. وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بەستنەوەی شتێک بەشتێکی ترەوە لە کاتێکدا: (کە) تۆ هاتیت من دەڕۆم. پیتێکە جیاوازی شتێک لە شتێکی تر دەگەیەنێ وەک وتەی (تر): یەکێکی کە، واتە یەکێکی تر. (اسمی موصولە) ئەو میوانانەی کە هاتن ڕۆیشتن.
کەباب: گۆشتی کوتراوی لە شیش دراوی برژاو.
کەبابچی: کەسێکە پیشەی هەر کەباب برژاندن بێ.
کەبابخانە: شوێنێکە کە هەر کەبابی تێدا ببرژێنرێ.
کەبابە: کەبابەی چینی.
کەبابە بوون: بریتییە لە گەورەبوونی جووجەڵەی مریشک و قەلەموون و باڵندەی تر بە جۆرێک کە لەوانەبێ گۆشتەکەی وەک کەباب ببرژێنرێ و بخورێ.
کەبابەی چینی: شتێکی دەنک وردی گەرمیانییە وەک کونجی بۆ بەربوونی دەنگ دەخورێ.
کەبات: شتێکە وەک نارنج بەڵام ئەم گەورەتر و توێکڵی ئەستوورترە.
کەبادە: د. کەوانەیەکی ئاسنینە زنجیرێکی ئەستووری پێوەیە زۆر خانەچی لەکاتی وەرزشدا هەڵی دەسووڕێنێ
کەبانوو: کەیبانوو.
کەبانی: ز. کەیبانوو.
کەبلەمە: کەپلەمە.
کەبەر: جۆرە دڕکێکی هاوینییە. دەبێ بەگەبەڵ و، لق و گەڵاکانی وەک تووترک وایە.
کەپ: چەمۆڵە. کەپوو.
کەپر: سێبەرێکە لە دار و کۆڵەکە و گەڵا دروست دەکرێ لە هاویناندا.
کەپرۆکە: کەپری پچووک.
کەپرۆکە بەستن: کۆبوونەوەی کەف و مڵتە لەسەر شتی شل: پرگی ترشیانە کە (کە پرۆکەی بەستووە).
کەپرە سەوزە: کەپرە شینە.
کەپرە شینە: جەڕنێکی جوولەکانە لە دەمە دەمی پایزدا هەر ماڵە کەپرێک دەکا و میوەی پێدا هەڵدەواسێ، لەپاش برانەوەی جەژنەکەیان میوەکە دەخۆن.
کەپک: قوتکە.
کەپلەمە: دەرمانێکی هاڕراوەی وردە کە بکرێتە سەر بەری دەست و بخورێ، (کەپلەمە کردن) خواردنی کەپلەمە.
کەپ لێگرتن: چەمۆڵەنان لە شتێک .
کەپن: کەسێکە لە قسە و گفتوگۆدا کەپەی لێوەبێ.
کەپۆ: لووت.
کەپۆڵ: د. کاپۆڵ.
کەپۆڵک: د. کاپۆڵک.
کەپوو: کەپۆ. دان. چەمۆڵە. پیری بێ دان (د).
کەپوورە: د. دەنگە دەنگ و قەڵەباڵغ.
کەپووکەرە: ناوە بۆ جۆرە مەلێک کە لەکاتی خوێندندا دەڵێ: (کەپوو).
کەپوولە: دەفرێکی دارینە کە مزەی ئاشی پێ دەگیرێ.
کەپە: دەنگی کەسێکە کە دانی نەمابێ، (کەپەکەپ) کەپەی یەک لەدوای یەک.
کەپەر: کەسێکە کە دانی پێشووی نەمابێ.
کەپەک: توێکی گەنم و جۆ و هێندێ شتی هاڕراو کە بەهێڵەک گیرابێ.
کەپەلەک: ز. کرمی مافەتە.
کەپەلەکی: ز. مەڕێکە کە مافەتە لێی دابێ.
کەپەنک: فەرەنجی.
کەپەنە: با. کەپەنک.
کەپەنەک: کە پەنک.
کەپەنەکداڵ: کەرگەس.
کەپی پان: با. ناوە بۆ جۆرە هەنارێک.
کەپیلە: کەپوولە.
کەت: لادانێکە لە نانەواخانەدا ئاردی تێ دەکرێ. وێنجە (ز). شان، زۆرتر لەگەڵ وتەی (کۆڵ)دا بەکاردێنرێ: (کەت) و (کۆڵ) واتە شان و کۆڵ.(د). یەک (با).
کەتان: جۆرە تەنراوێکی سپی ناسکی بەنرخە ژنان دەیکەن بەکراس و سەرپۆش. جۆرە گیایەکی بەکەڵکە وەک گوش لە لاسکەکەی هێندێ شتی تەنراو دروست دەکرێ.

کەتان و کەوان: د. پەردە و کوللە .
کەتانە: جۆرە نقامێکە.
کەتانی: جۆرە بادامێکی توێکڵ تەنکە.
کەترە: د. نەنگ و بەدی.
کەتری: کتری.
کەتک: با. هەنجیری وشکی ناو مەشکاڵە.
کەتکەتە: با. یەکە یەکە.
کەتن: تەڕن. کەوتن.
کەتن پێکردن: تەڕن پێکردن .
کەت و کلَفت: گیانداری زەلامی تێکسمڕاو.
کەتوو: ئاسنێکی دەمپانی چوار سووچی درێژکۆلەیە، کلکێکی دارینی هەیە، دێراوی پێ هەڵدەدرێتەوە. ناوی کێوێکە لە شارباژێڕ. بەردی بەرداشی زۆرە.
کەتوون: د. کەمەند.
کەتە: شتی زلی قەبە. کەتی نانەواخانە (د).
کەتەپلاو: وشکەپلاو.
کەتەو: ز. دەردێکە دەکەوێتە ناو ولاخی یەک سمەوە دەیکۆکێنێ.
کەتی: قەتی.
کەتیبە: گوێسوانەی خشتی سوور.
کەتیر: د. شەخرە.
کەتیرە: جەوی گەوون کە گەلێ جۆری هەیە.
کەجان: کەچۆ.
کەجی: ز. کشتەکی بادراوی لووسکراو.
کەچ: شتی لار. کەل. کچ (ز).
کەچایی: عاستی کەچی شت.
کەچک: با. کەوچک.
کەچۆ: ز. وتەیەکە بە ئافرەت دەوترێ وەک وتەی: (کچێ).
کەچە: فەرەنجی بێ قۆڵی ئاو دامان. ئاژاڵی شاخ خوار.
کەچەشاخ: بزنێکە کە شاخێکی شکابێ.
کەچەڵ: گیاندارێکە کە سەری بریندار بێ و تووکی لێ نەڕوێ.
کەچەڵە: جووجەڵەیەکە کەمێک گەورەبووبێ و تووکی پێشووی وەری بێ.
کەچەڵەبوون: گەورەبوونی جووجەڵە بەجۆرێک کە تووکە زۆرەکەی وەری بێ.
کەچەڵی: دەردێکە بە سەری گیاندار دەگا و تووکی دەوەرێنێ.
کەچی: وتەیەکە وتارێکی وا بەسەر دەگرێتەوە لە گفتوگۆدا کە گوێگر بەجۆرێکی تر تێی گەیشتبێ: چوومە لای نەریمان (کەچی) لەوێ نەبوو، لە کاتێکدا کە گوێگر وا بزانێ لەوێ بووە. خواری شت.
کەچیچ: ز. جێگای چینەی مریشک لە سەرەنوێلک.
کەحلان: ئەسپی ڕەسەن.
کەخس: ز. پیازی فیسقە.
کەخسە: با. کەخس.
کەد: لق: کەدە دارێکم بدەرێ .
کەدوو: کوولەکە.
کەدوون: ز. جەرەی پچووک.
کەدە: ز. مندالَی نێرینە.
کەدینک: جەرە (ز) کووپەڵە (با).
کەدێنە: گلێنە.
کەدی: ز. گیاندارێکی کێوییە کە مالَی بووبێ.
کەر: گیاندارێکی یەکسمی بارەبەری بەسزمانی گوێ درێژە. پیتێکە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بەئیشکەر: کارە(کەر)، نوێژ(کەر)، چێشت(کەر). گەلە(با). کەڕ(ز). قەرز (ز). پارچەیەک لە شت (ز).
کەرانباوگاو: کرانباوگاو.
کەرانە: جۆرە باجێکی دەوڵەتییە لە هەموو بارێک دەسێنرێ.
کەربەش: ز. دڕکێکە کەر زۆری حەز لێ دەکا.
کەرپەسە: گیاندارێکە وەک مارمێلکە هەمیشە ڕوودەکاتە ڕۆژ.
کەرت: لەتی شت، (کەرتبوون) لەتبوون، (کەرتکردن) لەتکردن.
کەرتڕ: بریتییە لە مەردوومی نەزان دووی قسە ڕەق.
کەرتڕێنە: د. دواهەمین دەست لە یاری گۆرەوی بازیدا.
کەرتک: کەرت.
کەرتوپە: پەتاتە.
کەرتوو: کەتووی دێراو هەڵدانەوە.
کەرتە: پارچەیەک لە ئاژاڵ.
کەرتەڕ:د. کەکرە.
کەرتە شی: گیایەکی بەهاری دڕکاوییە نێرکێکی بارێکی بەرزی هەیە لە سەرەوە دەیکا بە تۆپێکی دڕکاوی. تۆوی کنگر.
کەرتەک: ز. شتی زۆر.
کەرتەلە: هـ. سەبەتوولکەیەکە لە تووڵ دروست دەکرێ.
کەرتەلەڕ: ولاخی بەرزەی لاواز .
کەرتێنە: د. کاکڵە مووشان.
کەرچلاندن: ز. تێکەڵکردن.
کەرخ: دەفرێکی گلێنە کە لەبەر زۆر ئاو تێکردنی لووس بووبێ و قەوزەی گرتبێ. سنوور.
کەرخبوون: دەنگنووسان.
کەرخنکێنە: جۆداس.
کەرخێن: ز. لەپێش چاوکەوتنی خواردەمەنییەک لەبەر زۆر خواردنی.

کەردار: کەسێکە کە کەری ببێ و بەکرێ ئیشی پێ بکا.
کەرداری: ئیشکردن بەکەر بەکرێ.
کەردڕ: گیایەکە وەک قامیش گوڵێک دەردەکا دەنکەکانی دەکرێ بەنان.
کـەرد و کـێش: د. ئاسنێکی دەم پانی کلک درێژە بەدوو کـەس دێراوی پێ هەڵدەدرێتەوە.
کـەردوو: د. دێراو. جـۆرە خـاکـەنازێکی دەم پانە بەدوو کـەس دێراوی پێ هەڵ دەدرێتەوە.
کەر: گیانداری گوێ گران.
کەران: ز. چەکوشی گەورە.
کەرانە: ز. مەردوومی دەوڵەمەندی ماڵدار.
کەربوون: گوێ گرانبوون. بریتییە لە زۆر ساردبوونی ئاو بە بەفر یا سەهۆڵ تێکردنی: بەفراوەکە کەربووە: بریتییە لە زۆر خێرا خولانەوەی مزراحی قۆڕ قۆڕە.
کەرک: کەرەک. میوەی کاڵ (با).
کـەرکـردن: زۆر سـاردکـردنی ئاو بەبەفـر یا سـەهۆڵ. چاک خولاندنەوەی مزراحی قۆڕ قۆڕە.
کەرواوی: شتێکە کە کەرووی هەڵهێنابێ.
کـەروو: شـتـێکی سـەوزی بۆن ناخـۆشـە لەسـەر رووی کـولێـرە و هێندێ شتی تر پەیدا دەبێ کە شێی ببێ.
کەرووهەڵهێنان: پەیدابوونی کەروو لەسەر شتێک.
کەرە: قەلەفڕ. ئاژاڵی گوێ. پچکۆلە.
کـەرەپوو: داری زۆر وشکی گەندەڵ. بەری گـیـای لەبان کـە وەک وردە لۆکە وایە.
کەرەپووسەر: مەردوومی پیری گێژ و وێژی ساویلکە.
کەرەسیسە: بارینی بەفر بەوردی لە ڕۆژی زۆر ساردا.
کەرەپووە: د. کەرەپوو.
کەرەک: جۆرە فەرەنجییەکی ئاودامانی بێ قۆڵ و کونە.
کەرەکونتێ: مەردوومی زۆر کەر.
کەرەگۆشە: گولی.
کەرەکیفە: د. کەروو.
کەرەمار: جۆرە مارێکی کەری پیسی کوشندەیە.
کەرەنا: زورنا. بۆریەی سەماوەر.
کەرەنسۆ: مرۆڤێکە کە گوێرایەڵ نەبێ.
کەرەواڵە: مەلێکی بۆری بێ کلکی جوانە لە سوێسکە پچووکترە لە کـاتی فـڕینیدا دەنگی باڵی زۆر دێ و، یەکسـەر دەفـڕێ. بریتییە لە مەردوومی ساویلکەی بەسزمان.
کەرەوان: کەرەواڵە.
کەرەووڵ: کەرەکیفە.
کەرە هەنجیر: تەقلە هەنجیرێکە کە بەسەوزی هەڵوەریبێ.
کەری: گوێ گرانی. کەریلە.
کەریل: د. کەریلە.
کەریلە: بزن و مەڕی بێ گوێچکە.
کـەرسـمـە: ڕەگـێکی ئەسـتـوورە لەناو لووتی هێندێ گـوێدرێژدا بەڕەنگێکی وا کە نەیەڵێ هەناسەی بەڕەوانی دەرچێ، ئینجا دێن ئەو ڕەگـەی دەسـمـن و دەری دەهێنن و، بەو جـۆرە چاک دەبێ.
کەرسۆنە: تەپاڵە.
کەرسەپ: کەرەوز (د).
کەرسەڕ: مەلێکی سوورە بەقەد مراوییەک دەبێ، گۆشتی دەخورێ و دەنگی وەک زەڕەی کەر وایە. مزراحی قۆڕقۆڕەی دەستەکی (د).
کەرسەک: گلمتگی گەورە.
کـەرسەگ: کـەرسـەک. مـەردوومێکە بۆ هێندێ شت کـەر بێ و بۆ هێندێ شتیش زۆرزان بێ.
کەرشێن: د. کەسێکە بەدرۆ خۆی کردبێ بەنەوەی پێغەمبەر.
کەرک: ز. عەبای بێ قۆڵ.
کەرکن: ز. قەرزکردن.
کەرکوژ: د. ژاڵە.
کـەرکـۆڵ: گـیـایەکی پایزییـە، گـوڵێکی شـینی دڕکـاوی دەردەکـا، گەڵاکەی دەکوترێ و دەکرێ بە پووشوو. جاشەکەر (د).
کەرکیت: کەڵکیت.
کەرگ: هـ. مریشک.
کەرگراڤ: شبهی جزیرة.
کەرگەداس: دارێکە دەبرێتە کلکی داس.
کەرگەدەن: کەرگەدەنگ.
کەرگەدەنگ: گیاندارێکی زۆر زلی قاچ و مل ئەستوورە شاخێک وا بەسەر لووتیەوە.
کەرگەس: داڵە کەرخۆرە.
کـەرگـەلارێ: هـ. باڵندەیەکی بۆری دەنووک درێژە لە قـژاڵکە پچووکترە.
کەرمە: ز. پارچە تەپاڵەی وشکەوەبوو.
کەرمێش: ز. مێشە کەرانە.
کەرۆکە: مەردوومی گێلۆکە.
کەروو: د. کاکڵەمووشان.
کەروێشک: دەعبایەکی تیژڕەوی کێوی دەست کورتی قاچ درێژە، گوێی وەک گوێی کەر وایە.
کەروێشکەخەو: بریتییە لە نووستنێک کە چاو هێشتا بەتەواوی نەقووچابێ.
کـەروێشـکە کـردن: جـوولانەوەی سـەوزایی هەراش بەدەم باوە بەڕەنگێک کـە مـەردووم لە دوورەوە وا ببـینێ کـە ئەو سەوزاییە دەڕوات و شەپۆل دەدا.

کەرە: چەورییەکە کە بەژەندن لە ماست گیرابێ.
کەرەپوول: ز. داگیرکردنی موڵک و ماڵی یەکێکە، کە لەلایەن خاوەنییەوە سەرپەرشتی نەکرێ.
کەرەتوو: کرد و کێش.
کەرەجی: د. کەشتی پچووک.
کەرەدان: دەفرێکە کە کەرەی تێدا کۆبکرێتەوە.
کەرەز: گیایەکی کوێستانی بەهارییە گەڵای لە کەرەوز وردترە دەکرێتە ترشیاتەوە.
کەرەستە: کەرەسە.
کەرەسە: چەند پارچەیەکە کە شتێکی تایبەتی لێ دروست بکرێ وەک دار و بەرد و گەچ بۆ خانوو و بەر و پشت بۆ کاڵا.
کەرەشێڵ: د. کەڵەشێر.
کەرەکێفی: د. کەرەکێوی.
کەرە کێوی: دەعبایەکی کێوی زۆر خێرایە، لە کەری ماڵی دەچێ.
کەرەکی: شتێکە کە هەر بۆ کەر بەکاربهێنرێ: ئەم کورتانە (کەرەکی)یە.
کەرەلیاس: د. جارچی.
کەرەم: کەڵک: بە(کەرەم) نایەت، یا بە(کەرەم) کەوتووە.
کەرەنتوو: داسێکی کلک دارینی درێژی پانە، بەپێوە گیای پێ دەدروونەوە.
کەرەنگ: جۆرە مێشێکی گەورەیە لە هەنگ پەیدا دەبێ و هەنگوینی نییە.
کەرەوان: کەسێکە کە هەر کەر بلەوەڕێنێ.
کەرەوس: د. کەرەوز.
کەرەوز: گیایەکی توونی گەڵا پانە بەگۆشتەوە دەخورێ.
کەرهەنگ: جۆرە هەنگێکی بێ چزووی بۆرەڵووکی بێ هەنگوینە، هەمیشە لە پوورەدا شان هەڵدەبەستێ. جۆرە مێشێکە وەک خەرەنگەزە وایە.
کەرەهوو: ز. بای بەتەوژم لە هاویناندا.
کەرهێ: با. کۆکلاش.
کەرێ: کەرە.
کەرێتی: بێ ژیری.
کەری: کەرێتی. ڕانی مەڕ (ز). پارچەیەک لە هەموو شتێک (ز).
کەز: ز. قەوزە.
کەزاختێ: ز. کزخاندن.
کەزاخە: با. بڕینی مێو لە بەهاراندا.
کەزان: با. قەزوان.
کەزنەزان: دارێکی کوێستانییە وەک دارگەز وایە بەڵام لە چەماندنەوەدا نەرمە.
کەزوان: ز. قەزوانی کێوی دەنک ورد.
کەزەب: ز. جەرگی گیاندار.
کەزی: پرچ.
کەژ: چیا. جۆرە شتێکی قایمی جوانی بریقەدارە وەک ئاوریشم وایە. تەنراوێکی پانی درێژکۆلەیە سەر و قنگی چیغ و حەسیری پێ دەگیرێ. شتی سپی جوان. (با).
کەژاڵ: کەژەڵ.
کەژاوە: دوو ژووری پچکۆلەیە لە تەختە لەسەر پشتی وڵاخ دادەنرێ بۆ ئەوەی لە ڕێ ڕۆیندا هەر ژوورەی یەکێکی تێدا دابنیشێ.
کەژک: قەیاسە.
کەژگ: کەژوو.
کەژماڵکردن: هاتنە دەرەوەی زەلام لە هەموو ماڵێکەوە و چوونیان بۆ کەژ بۆ گەڕان بەشوێن شتێکی ونبوودا.
کەژۆک: کەژێکە وەک ئاوریشم وابێ. نەخۆشی (عرق النساء).
کەژوو: کەژگ. کەژێکە کە سەر و قنگی چیغ و حەسیری پێ دەگیرێ.
کەژە: د. قوڵنگەی فیلەوان.
کەژەڵ: شتی بەڵەک.
کەژەوان: شاخەوان.
کەژی: کەژوو. شتی کێوی.
کەس: یەکێک لە ئادەمی: (کەس)م لەلا نییە. خزم و خوێش: خۆ بێ (کەس) نیم.
کەساس: گیانداری زەبوونی بێ نەوا.
کەساسی: زەبوونی و بێ نەوایی.
کەساندن: حەواندنەوە. دڵنیاکردن. هەڵگرتنی گۆشت بۆ خواردنی لە زستاندا (ز).
کەسایەتی: خزمایەتی.
کەسپ: کۆسپ. قوڕپەستی سەربان لەسەر زەلەوە.
کەسپک: ز. هێلکە شەیتانۆکە.
کەستک: کەرسەک.
کەستەک: کەستک.
کەسخاندن: ز. کەزاختێ.
کەسک: سەوز.
کەسکاو: سڵقێکە کە لەناو دۆڵدا کوترابێ بۆ ناو چێشتی سڵقاو.
کەسک و سۆر: کەسک و سوور.
کەسک و سوور: پەڵکە زێڕینە.
کەسکون: د. کەسکوون.
کەسکوون: خواردەمەنی توند و تیژ وەک سرکە.

کەسکە: ئافرەتی بێ شەرم.
کەسکە سۆر: ز. پەڵکەزێرینە.
کەسکێن: کەسکوون.
کەسمە: د. کاسمە.
کەسناو: کونیە.
کەسنەدار: شتی نایاب کە کەس نەیبێ.
کەس نەناس: کەسێکە لە شوێنێکدا کە کەس نەیناسێ: برۆ شوێنێکی کەس نەناس، خۆت هەڵکێشە پڕ بە کراسێ.
کەسوکار: خزم و خوێش.
کەسەپشت: ل. ژیشک.
کەسەر: خەفەت و پەژارە.
کەسیرە: گیاندارێکە لە سەرماندا کرژ هەڵاتبێ، (کەسیرەبوون) کرژهەڵاتن لە سەرماندا.
کەسیف: د. چەپەڵ.
کەش: درێژبوون و کشانی هێندێ شت: ئەم هەویرە (کەش)ی هەیە. خۆشیانی ناوەندی دووباران: دەمێکە دەبارێ هێشتا (کەش)ێکی تێ نەخستووە. چیا (ه). زەمینێکە کە کزر بووبێتەوە (د). ئەستێرەی زوحەل (د). بەمەعنا (بن) باخەڵە لە کاتێکدا کە لەگەڵ (بن) یا (ژێر)دا بەکار بێنرێ: بن (کەش) واتە بن باخەڵ (ه). سەرکردنی گوللە یا تیر بەلای ڕاست یا چەپدا (ز).
کەشاکەش: دەردی سەری و سەغڵەتی.
کەشان کەشان: بگرە و بەردە و پاڵەپەستۆ.
کەشاو: د. ئاودانی زەوی بۆ ئەوەی بکێڵرێ و تۆوی پێدا بچێنرێ تا سەوز ببێ.
کەشتێڵە سەرە: بەچکەی قومقومۆکە.
کەشتی: پاپۆڕ.
کەشتی جەنگی: جۆرە کەشتییەکی زرێدارە لە جەنگدا بەکاردێنرێ.
کەشتی زرێدار: جۆرە کەشتییەکی جەنگییە هەموو ڕوویەکی لە ئاسن گیراوە، هیچ شتێک کاری تێ ناکا.
کەشتیوان: پاپۆڕەوان.
کەشتیوانی: خەریکبوون بەکەشتی لێخوڕینەوە.
کەشتییەوان: کەشتیوان.
کەشتییەوانی: کەشتیوانی.
کەششە: ز. قەشە.
کەشک: شتێکی مێچۆڵە مێچۆڵەیە لە خەستەی دۆ دروست دەکرێ. پشتی پەنجەی باڵابەرزە کە بیمالێت بە سەری یەکێکدا: کەشکێکی مالی بەسەریدا.
کەشک پا: ل. ئەژنۆ.
کەشک و سوور: د. شتی سوور و سپی.
کەشکۆڵ: جۆرە دەفرێکە لە داری گوێزی هیندستان دروست دەکرێ و زریزەیەکی تێ دەخرێ، زۆرتر دەروێش دەیکا بەقۆڵیدا و ئاوی پێ دەخواتەوە. ملوانکەیەکی زێڕ یا زیوینە دەکرێتە ملی منداڵ. کتێبێکە کە هۆنراوەی گەلێ شاعیری تێدا نووسرابێ.
کەشکە: چەمۆڵە.
کەشکە ئەژنۆ: کلاوەی ئەژنۆ.
کەشکەزرانی: کەشکە ئەژنۆ.
کەشکەزەنگوڵ: کەشکەزرانی.
کەشکە ژنۆ: کەشکە ئەژنۆ.
کەشکەسەر: قومقومۆکە.
کەشکەسەرە: کەشکەسەر.
کەشکەشان: کاکەشان.
کەشکەک: چێشتێکە لە گۆشت و گەنمەکوتاو دروست دەکرێ.
کەشکەلان: شوێنی زۆر بەرز کە دەست نەیگاتێ: تۆ لێم چوویتە کەشکەلانی فەلەک.
کەشکێن: دۆکەشک (ز) چێشتی دۆکەشک (د).
کەشماکەش: د. کەشمەکەش
کەشمان: ڕاکێشانی شتێک لە دوو سەرەوە بۆ ئەوەی کە بکشێ.
کەشمان هاتن: کشان و فراوانبوون و درێژبوونی شت.
کەشم و نەشم: ناز و عیشوە. لەنجە و لار.
کەشمەکەش: کەشاکەش.
کەش و تووش: برین یا درین یا خەتکێشانی شتێک لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەکی تری: (کەش و تووش) کراسەکە ببڕە یا لێفەکە تەریب بدە.
کەش و فش: دەعیە و دەمار و فیزکردن.
کەش و قنگ: د. کەش و فش.
کەشۆل: ز. پاقلەی دێمی.
کەشە: د. جار: چەند (کەشە)هاتم واتە چەند جار. قەشە.
کەشهاتن: کەشمان هاتن. وشکبوونەوەی زەوی بەجۆرێک کە بکێڵرێ.
کەشەنگ: گیانداری ماندووی کفت.
کەشەهەور: هەورێکی پەڵەپەڵەیە کە بکەویتە ڕووی ئاسمان لەگەڵ خۆشی هەوادا.
کەشیدە: جۆرە پارچەیەکە بەئاوریشمی زەرد دەچنرێ و حاجی بەسەریەوە دەبەستێ. خەتێکی پچکۆلەی درێژە بەسەر هێندێ پیتی عەرەبییەوە دەنووسرێ.
کەشیش: قەشە. گەواد.
کەف: شتێکی سپی سووکی بێ نموودە دەکەوێتە سەر ئاو و هێندێ شتی شل و، لە سابوون و ئەسپۆن و هێندێ شتی تریش پەیدا دەبێ. قەراغی حاجەت (ز).

کەفاک: د. تەوقەسەری شت.
کەفاندن: ز. دروونی چواردەوری کالاّ.
کەفتار: ز. کەمتیار.
کەفتارۆ: با. کەفتار.
کەفتانی: سەبیلەدارێکی ساکاری سەرخڕی تۆکمەیە، تووتنی پێ دەکێشرێ.
کەفتن: کەوتن.
کەفتوو: با. کەوتوو.
کەفتە: د. کەوتوو.
کەفتەکار: مەردوومی کەوتووی زەبوون.
کەفتەکاری: زەبوونی و لە کارکەوتنی مەردووم.
کەفتەیی: د. کەوتوویی.
کەفچاندن: کەف هاتنە دەرەوە لە دەم بەهۆی تووڕەبوون یا ئازارێکەوە.
کەفچک: ز. کەوچک.
کەفچی: ز. کەوچک.
کەفر: با. تاشەبەردێکی گەورە کە بەقەد شاخێکەوە بێ.
کەفرەتاش: با. بەرداش.
کەفرێژ: پڕبوونی شتێک یا شوێنێک لە شتێکی شل و هاتنە خوارەوەی بەلێواریدا.
کەفز: ز. قەوزە.
کەفش: کەوش. بن هەنگڵ (با).
کەفشێف: ز. سوێنەی کەشک تێدا سوونەوە.
کەفشێل: ز. لیکی دەم.
کەفکانی: ز. بەردەقانی.
کەفکردن: پەیدابوونی کەف لە شتێکەوە.
کەفکەنۆک: ز. ئەسپۆن.
کەفگیر: کەوگیر.
کەفلەمە: د. کەپلەمە.
کەف لێدان: بریتییە لە بردنی شتێک بەناخونەک.
کەفماڵ: سواغێکە کە بەدەست درابێ.
کەف و کوڵ: چڵک و کەفێکە لە کاتی کوڵیندا دەکەوێتە سەر شت.
کەفە: ئاسنێکە کۆپاندروو دەیکاتە دەستی لە کاتی کاردا.
کەفە ژیلکە: گۆشتی شلی چەرمە چەقاڵتە.
کەفەڵ: سمت.
کەفەڵپۆش: پارچەیەکە بەزینەوە دەکەوێتە سەر کەفەڵی وڵاخ.
کەفەڵووک: کەفەڵووکە.
کەفەڵووکە: کەفێکی کەمە کە لەگەڵ تەڕییەکدا تێکەڵ بووبێ.
کەفەلوولکە: کەفەژیلکە. کەفەڵووکە.
کەفی دەریا: شتێکی پفەڵە وەک پووشوو، دەموچاوی پێ دەشۆرێ.
کەفی: ز. دەسەسر.
کەڤارک: با. قارچک.
کەڤان: ز. کەوان.
کەڤانژەن: ز. هەلاج.
کەڤتک: ز. دەسەسر. سەرپۆشی ژنان.
کەڤر: بەرد (ز). تاشەبەردی گەورەی قەد شاخ.
کەڤرکانی: ز. بەردەقانی.
کەڤشک: با. کرێشی سەر.
کەڤک: کەوچک.
کەڤگیر: ل. کەوگیر.
کەفلکرن: با. کەوڵکردنی گیاندار.
کەڤن: با. کون.
کەڤنار: با. شتی زۆر کۆن.
کەڤۆت: ز. داری کەووت.
کەڤۆک: ز. کۆتر.
کەڤووت: با. کەڤۆت.
کەڤەر: ز. بزنی بەڵەک. کێو.
کەڤەل: ز. پێستی ئاژاڵی وردە.
کەڤینک: با جامانەی سەر .
کەڤی: با. بەفرێکە کە بەزۆری کەوتبێ بەسەریەکدا.
کەک: کێچ (هـ). کاک (با).
کەکرە: جۆرە خەیارێکی کێوی زۆر تاڵە.
کەکلی: هـ. کەوی باڵندە.
کەکەو: کەووت.
کەل: شتی لاشکاو. کێو: مانگ لە دەم (کەل)ە. لق: (کەل)ە دارێکم بدەرێ واتە لقێک. فرمان: (کەل)و کارم نییە واتە بێ کارم (د). کەلک: بە(کەل) نییە واتە بەکەڵک نییە. شتی زۆر گەرم (ز). مەڕی شاخدار (ز). بەرانی شاخ پچووک (ز). پەچەی ئاژاڵ (هـ).
کەڵ: نێری ڕەشەوڵاخ و گامێش و بزنەکێوی.
کەلا: هەڵماتێکە کە تیلی پێ بکرێ. شتێکە کەوتبێتە کەنارەوە.
کەلائەنگوچک: فەقیانە.
کەلاتی: د. چەند خانوویەکە کە بەسەر بەرزییەکەوە کرابێ.
کەلاج: ز. مەردوومی دووڕووی بوختانکەر.
کەلاخ: ز. گیانداری لاواز.
کەلار: چەند شیشە تووتنێکی زۆرە کە وەک خەرمان لەسەر یەک دانرابێ. ناوی دێیەکە لە ناوچەی کفری.
کەلارە: دەفرێکی قووڵە لە شیاکە دروست دەکرێ پووش و پەلاشی ناوماڵی تێ دەکرێ.

کەلاس: ز. لاشەی مردارەوەبوو.
کەلاش: کلاش.
کەلاشتن: ز. قەلاشتن.
کەلاشچن: کەسێکە کە کلاش بچنێ.
کەلاش چنین: چنینی سەری کلاش.
کەلاشە کردن: کلاشەکردن.
کەلافە: کلافە.
کەلافەت: د. قەلافەت.
کەلاک: لاکی مردارەوەبوو.
کەلام: هـ. خەرمانی دەغڵوودان، یا گزرەگیا.
کەلان: د. شتی گەورە.
کەلانتەر: د. گەورەی گەڕەک.
کەلاندن: با. کولاندن.
کەلانگوچک: فەقیانە.
کەلانە: جۆرە نانێکە تەڕەپیازی چنراو دەکرێتە سەر نیوەی و نیوەکەی تری دەدرێتەوە بەسەریدا و بەساج دەبرژێنرێ.
کەلانە: کلانە.
کەلاو: کەلانگوچک.
کەلاوە: خانوویەکە کە ڕووخابێ و کەسی تێدا نەبێ.
کەلایانی: هەڵماتێن.
کەلایی: کەلی شت.
کەلاێن: کەلایانی.
کەڵب: کولێوی شەکر.
کەڵبە: چوار ددانی درێژی تیژی بەهێزە لە ددانی پێشەوەی هێندێ گیاندار، دووانیان لە سەرەوەیە و دووانیان لە خوارەوەیە و، لە ناوەندیاندا چوار ددانی ورد هەیە.
کەڵبەی زین: د. قەڵپووسی زین.
کەڵپ: کەڵبە.
کەڵپک: ز. کەپەک.
کەڵپۆس: د. پێستەیەکە تووکەکەی پێوە مابێ.
کەڵپە: کەڵبە.
کەڵدان: بەردانی ڕەشەولاخ و گامێش بۆ سەر مێکەیان.
کەڵدڕ: کەردڕ.
کەلفیچ: کەسێکە ددانی پێشەوەی کەل بووبێ و باش قسەی بۆ نەکرێ.
کەلک: کەڵک.
کەڵک: قازانج و سوود. گوێسوانە. مەلێکی کێوی سپییە لە کۆتر دەچێ. سەربان (د) سەقاقوش.
کەڵک تێکەوتن: پێویست بوونت بەیارمەتی یەکێک.
کەلکردن: پەلکردنی شت: گوێچکەی (کەل کرد).
کەڵک گرتن: قازانج و سوود گەیاندن بەیەکێک.
کەڵکەڵە: خولیا کەوتنە سەر بۆ شتێک.
کەڵکیت: شتێکی دەسکدارە شانەی ئاسنی تێ براوە، وەک پەنجەی دەست، تەونی پێ دەکوترێ بۆ سفت بوونی.
کەللە: سەلکی گیاندار. قسلێ کولێ.
کەللەبا: د. بریتییە لە مەردوومی خودسەری کەللەڕەق.
کەللەبایی: د. خودسەری.
کەللەبۆش: بریتییە لە مەردوومی بێ ژیری.
کەللەبێژنگ: د. کەلە بێژنگ.
کەللەپاچە: د. کەلە پاچە.
کەللەتەزێن: بریتییە لە شتی زۆر سارد وەک ئاو و ماستاو و هێندێ شتی تر.
کەللەچاخ: د. مەردوومی سەر زل.
کەللەڕەق: بریتییە لە مەردوومی ڕق ئەستوور.
کەللەزاوور: بریتییە لە مەردوومی ترسنۆک.
کەللەشەق: بریتییە لە مەردوومی تووڕە و تڕۆ.
کەللەشەکر: شەکرێکی دارێژراوە کە سەرێکی پان و سەرێکی باریکە .
کەللە قەند: د. کەللەشەکر.
کەللەکۆن: بریتییە لە مەردوومی کۆنەپەرست.
کەللەیی: دەنگی گەورەی قەبە کە کار بکاتە سەر مێشک، چ خۆش چ ناخۆش. کەلەگی (د). بریتییە لە مەردوومی شێت.
کەل لێکەفتن: د. کارتێکەوتن.
کەلواز: سەرمای زۆر بەتین.
کەڵواڵک: گیایەکی بەهارییە گوڵێکی سووری هەیە، وەک پیاڵە وایە بنکێکی خڕی سپی شیرینی هەیە.
کەڵوان: گزگل.
کەل و پا: سەر و پێی ئاژاڵی وردە.
کەل و پاچکە: کەل و پا.
کەل و پوور: د. کەلوپەل.
کەلوپەل: نوێن و جلوبەرگ.
کەڵۆس: کەسێکە کە ددانی پێشەوەی کەوتبێ.
کەلوکۆم: شتی کۆنی شەق و شڕ.
کەلوو: پۆرگی پاقلە و ماش و پۆڵکە و فاسۆلیا. قولفەی تێ هەڵکێشی ئەو شتانەی کە بەشیش دەچنرێن، وەک گۆرەوی و لفکە. پۆڵکە. برجی ئاسمان.
کەڵووڕ: ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد .
کەڵووڕی: جۆرە نقامێکی کوردییە کە تیرەی کەڵووڕ قسەی پێ دەکەن.
کەلووز: فندق. بەری کاژ.

کەلووک: نیوەی چارەکە خشت .
کەلە: قەلەفڕ. کەمە.
کەڵە: برنجی پلاوی.
کەڵەئەنگوست: پەنجەی گەورەی دەست و پێ.
کەڵەئەنگوشت: کەڵەئەنگوست.
کەڵەئەموست: کەڵەئەنگوست.
کەلهاتن: د. بەکارهاتن.
کەڵەباب: کەڵەشێر.
کەلەبەر: کونێکی گەورەیە لە دیوار کە لەوانەبێ هاتوچۆی پێدا بکرێ.
کەلەبێژنگ: کەمەی بێژنگ.
کەلەپاچە: سەر و پێی ئاژاڵی سەربڕاو.
کەلەپاچە کردن: بریتییە لە شەق و پەق کردنی گیاندار.
کەلەپچە: ئاسنێکە دەکرێتە دەستی بەندییەوە، (کەلەپچەکردن) بەستنی هەردوو دەستی بەندی بە(کەلەپچە).
کەڵەپشکۆ: پشکۆئاگری گەورە.
کەلەپوور: ئەو شتانەیە کە لە مردوو بەجێ دەمێنێ بۆ کەسوکار.
کەڵەپەتر: قسەی هەڵەی زۆر زل و ناقۆڵا.
کەڵە پیتاک: شتێکە ئاغا لە مسکێنی خۆی بسێنی ساڵی جارێک یا زیاتر، لە دراو یا دەغڵودان یا شتی تر لەکاتی کەم دەستیدا.
کەڵەپیاو: کەڵەمێرد.
کەلەخ: با. لاکی گیانداری مردارەوەبوو.
کەڵەدار: داری گەورەی ئەستووری زل.
کەلەرم: گیایەکی گەڵا پانی خڕی پێچراوەی کوێستانییە دەکرێ بە یاپراخ.
کەڵەز: دەمی تێپەربوونی مەڕە کێوی.
کەڵەزەڕی: زۆرەملی.
کەڵەژ: دارێکی پەلپەلاوییە دادەچەقێنرێ و مێوی لە بەهاراندا دەخرێتە سەر.
کەڵەس: گوریسێکە ڕادەنگێورێ بەسەر ئاوێکی زۆردا لەم سەر و لەو سەرەوە قایم دەکرێ بۆ ئەوەی ڕێبوار دەستی پێوە بگرێ و بپەڕێتەوە. کەڵەکی ئاو (د).
کەڵەسوو: مانگا و گامێشێکە کە لەبەر زۆر لێ پەڕینی کەڵ هەراسان بووبێ.
کەلەش: کەچەڵ (ز). گیانداری زۆر جوان (ز). پیاوخراپ (ز) جەستە. کەلاک.
کەڵەش: د. کولۆش. مەردوومی بێ عاری بێ ئابڕوو.
کەڵەشاخ: شووشەیەکە وەک پیاڵە کلکێکی کولۆری هەیە خوێن و باکەشی پێ دەگیرێ.

کەڵەشێر: باڵندەیەکی جوانی پۆپنەداری دەنگ خۆشی ماڵییە لە وێنەی مریشک بەڵام ئەم نێرە.
کەڵەشێرباز: کەسێکە کە حەزی لە کەڵەشێری باش بێ بۆ شەڕ پێکردنی.
کەڵەشێرە: شتێکە لە وێنەی کەڵەشێر لەسەر کۆپانی وڵاخی پێشەنگ دروست دەکرێ بۆ جوانی.
کەلەشیر: ل. کەڵەشێر.
کەلەف: ز. کەلافە.
کەلەقەند: د. کەللەشەکر.
کەلەک: قولاخەی کەوش.
کەڵەک: چەند دارێکە دەبەسترێ بەچەند کوندەیەکی گەورەی فوو دراوە و لەناو ئاودا بۆ پێ پەڕینەوە و هاتوچۆ پێکردنی. فێڵ. دیواری بەردە کە بە وشکی هەڵچنرابێ.
کەڵەکباز: فێڵباز.
کەڵەکەبازی: فێڵبازی.
کەڵەکبوون: کۆبوونەوەی شت و بەسەر یەکدا کەوتنی.
کەڵەکچی: کەڵەکەوان. کەڵەکباز.
کەڵەکردن: د. کۆبوونەوەی چەند کەسێک. کوڵەکردن.
کەلەکۆتک: کاسەی کەل.
کەلەک کردن: د. کۆکردنەوەی شت و بەسەر یەکداخستنی. فێڵکردن.
کەلەکە: تەنیشتی گیاندار لە بن دەستیەوە تا ژوور کولۆتی. کاسەی کەل کە ئاوی تێ دەکرێ بۆ سەگ و مریشک.
کەڵەکە: تەڵەکە.
کەڵەکەبوون: کەڵەکبوون.
کەڵەکەبەستن: خڕبوونەوە و کۆمەڵبوونی گیاندار.
کەڵەکەترێ: خۆ بەسەر یەکدادانی چەند کەسێک.
کەڵەکەکردن: کەڵەک کردن.
کەڵەکەڵە: وتەیەکە کەڵەگای پێ هان دەدرێ بۆ سەر مانگا بەکەڵ.
کەڵەکەوان: کەسێکە کە کەڵەک لێ بخوڕێ.
کەڵەکێوی: نێری مەڕ و بزنەکێوی.
کەڵەگا: نێرەگای بەگون.
کەڵەگایی: ئیستبداد و خودسەری.
کەڵەگەت: شتی باڵابەرز.
کەلەگی: ژووری تەنیشت هەیوان.
کەلەلا: کەسێکە برینێکی گەورە بەجەستەیەوە بێ، (کەلەلابوون) برینداربوونی جەستە بەبرینی گەورە .
کەلەلاکردن: بریندارکردنی جەستەی گیاندار بەبرینی گەورە.
کەڵەلان: د. پشتێر.

کەلەم: کەلەرم. قەڵبەی دار و شتی تر (با).
کەڵەم: د. کەڵەمەی جووت.
کەڵەموست: کەڵەئەموست.
کەڵەمە: دارێکە دەکرێ بە کونی ئەمسەر و ئەوسەری (نیل)دا و دەبەسترێتە ملی گای جووت.
کەڵەمەکردن: خستنی کەڵەمە بۆ ملی گاجووت. بریتییە لە بەیدەستکردنی گیاندار.
کەڵەمێرد: پیاوی دەمڕاستی ئازای دەرهاتوو.
کەڵەمێروو: مێروولەی گەورەی لۆقن.
کەلەمێش: ز. مێشوولە.
کەلەیی: با. کەلەرم.
کەڵەن: د. کەڵەم.
کەڵەنج: جۆرێکە لە بەری مازوو لە چەکەی هەلاج دەچێ، بەڵام ئەم کلکی نییە.
کەلەندین: ز. کۆمەڵە بەفرێکە کە لە بانماڵینەوە کۆبووبێتەوە.
کەڵەوانە: کلاّنە.
کەڵهوڕ: کەڵوور.
کەلەوەر: کەلەبەر. دەرگا.
کەلەوەر ڕەشکردن: بریتییە لە دزی کردن: کەلەوەری ئەو ماڵەی ڕەش کردن واتە دزی لێ کرد.
کەڵەوی: گیایەکی گەڵا پانی بەرزە دڕکێکی تیژ دەردەکا.
کەلهە: با. قەڵا.
کەڵەهەرز: کاتی تێبەڕبوونی بەرانەکێوی.
کەڵەهێڕ: کۆبوونەوەی کەڵەگای زۆر بۆ سەر مانگا بەکەڵ.
کەڵەهێڕکردن: بریتییە لە گەلەکۆمەکێ کردنی چەند کەسێک لە یەکێک.
کەلی: فەریک: کەلی نۆک واتە فەریکەنۆک.
کەلێن: کەلەبەر. بەناو داڵدە: فیسار کەس لە کەلێنی فیسارداپە، واتە لە پەناپایەتی. کەمێن گا: فیسار کەس لە (کەلێن)دا بۆی دانیشتووە.
کەڵێن: قایشێکە دەکرێتە ملی تانجی.
کەلی: عاستی کەلایی شت. خواردەمەنی کەم خوێ (ز). گیانداری کلک کورت (ز). گیانداری گوێ کورت (ز).
کەلیژ: ز. کلێنچکەی مەڕ.
کەلیلان: ز. گەرمی.
کەلین: ز. کولاّن.
کەڵێن: د. شتی گەورەی زەلام.
کەم: شتێکە کە زۆر نەبێ.
کەما: گیایەکی لاسک ئەستووری گەلاّوردی بەهارییە، گزرە دەکرێ بۆ ئاژاڵ.
کەماجار: شوێنێکە کە کەمای زۆر بێ.
کەماچە: ز. کەمانچە.
کەماخ: سمت (با). کامۆخ.
کەمان: کەمانچە. سینە کەمان. کەوان.
کەمانچە: پارچەیەکە لە پارچەی مۆزیقە، چەند ژێیەکی پێوەیە، دارێکی تایبەتی دەهێنرێ بە ژێکاندا، دەنگێکی خۆشی لێوەدێ.
کەمانچەژەن: کەسێکە کە کەمانچە باش لێ بدا.
کەمانە: تیرێکی هاوێژراوە کە بگەڕێتەوە بەهۆی کەوتنی لە شتێکەوە .
کەماو: چێشتی پیتە.
کەمایەتی: شتێکی کەم لەناو شتێکی زۆردا: تورکمان لە کەرکووکدا کەمایەتییە.
کەمایەسی: کەمبوونەوەی شت و نزیکبوونەوەی لە بڕانەوە.
کەمایی: کەمایەسی.
کەمباخ: ز. زۆرداری ستەمکار. کەلاوە.
کەمبارە: د. کەم بەهرە.
کەمبوون: نزیکبوونی شت لە بەسەرچوونی: ترێ (کەم بووە) واتە هاکا بەسەرچوو.
کەمبوونەوە: هاتنە کەمایەسی شت.
کەمبەت: ز. گومەز.
کەمتابێژ: کەمێک لە شتێک: (کەم تابێژ)ێک دانیشت یا قسەی کرد یا خواردی.
کەمتار: ل. کەمتیار.
کەمتەرخەم: کەسێکە شتی زۆر مەبەست نەبێ.
کەمتەرخەمی: گوێ نەدانە شت.
کەمتیار: دەعبایەکی کێوییە یاڵ و سمی لە هی کەر دەچێ.
کەمتێ: گیانداری بێ هێز.
کەمچک: ل. کەوچک.
کەمچە: ئاسنێکی درێژە دەسکەکەی دارە ئاگری توونی پێ دەکرێ. ماڵە (د).
کەم چیکڵدانە: بریتییە لە مەردوومی تووڕە.
کەمخۆر: گیاندارێکە کە خواردنی کەم بێ.
کەمخە: ز. کالاّیەکە کە لە ئاوریشمی سووری ڕەشباو دروست کرابێ.
کەمدوو: کەسێکە کە کەم قسە بێ.
کەمر: بەرد.
کەمراوێژ: کەمتابێژ.
کەمروو: بریتییە لە مەردوومی شەرمن.
کەمرە: گەمرە.

کەمقنیات: کەمخۆر.
کەمکردن: لاوازبوون. کورتهێنانی شت.
کەمکۆڵ: تویکڵی سەوزی گوێز. کەرکۆڵ.
کەمۆ: دەستەمۆ.
کەمۆت: ز. بێ گوێی لاسار.
کەموسکە: زۆر کەم لە شتێک.
کەموکوور: شتی کەمی نیوەچڵ.
کەموکووری: بریتییە لە نەدارایی.
کەمۆڵە: کاسەی گەورەی دارین.
کەمە: کەلە بێژنگ. تەختەی کەوانەداری ئەمسەر و ئەوسەری بێشکە. پەرەی خەرەک.
کەمەچکرن: ز. هەڵپاچینی کەمێک لە خوری پشتی مەڕ بۆ نیشانەکردنی.
کەمەر: ناوقەدی شت. خرەبەرد.
کەمەربەست: کەمەربەستە.
کەمەربەستن: خۆ ئامادەکردن بۆ پچووکی یەکێک.
کەمەربەستە: بریتییە لە بەندە. بریتییە لە کەسێک کە ئامادەی فرمانێک بێ.
کەمەربەن: کەمەربەند.
کەمەربەند: جۆرە پشتێنێکی دوو توێیە دراوی تێ دەکرێ.
کەمەرچین: جۆرە پاڵتۆیەکی ژنانەیە کە بەسورمەدا دروابێ.
کەمەردووخ: د. بەرەتەشی.
کەمەرکەش: د. دەرپێیەکی کورتە. لەژێر شەرواڵەوە لە پێ دەکرێ.
کەمەرە: پشتێنێکی زیوین یا زێرینی گۆدارە، ژنان دەیبەستنە پشتیان. لاوانەیەکە لەناوقەدی منارەدا بانگدەر بانگی لەسەر دەدا. ناوقەدی شاخ. چەند تەختەیەکە دەدرێن لە رووکاری دۆڵیانی ئاش. ناوەڕاستی زەوی.
کەمەک: کەمێک.
کەمەن: کەمەند.
کەمەند: گوریس یا زنجیرێکی درێژە ئەم سەر و ئەوسەرەکەی بەسنگێکەوە دەبەسترێ، ئینجا بەرپزە ولاخی پێوە دەبەسترێتەوە. شتێکە وەک عەگاڵ لەکاتی دانیشتندا دەکرێتە پشت و بەرئەژنۆ بۆ ئەوەی کە بەملا و بەولادا نەکەوێ.
کەمەندکێش: بریتییە لە کەسێک کەرمووده و گرفتاری رەوشت و خووی بەرزی پیاوێکی خواشناس بووبێ.
کەمەندهاویشتن: هاویشتنی کەمەند بۆ گرتنی شتێک.
کەمیک: ز. دەسەسرێ دەموچاو سڕین.
کەمێڵ: تیسکە خوریەکە لە ژێر دووگی ئاژاڵەوە ریخی پێوە وشک بووبێتەوە.
کەمێڵە: کەمێڵ. قەرتماغە (د).
کەمی: بوونی شت بەکەم.
کەمین: حەشار.
کەمینگا: شوێنی خۆ تێدا حەشاردان.
کەن: کەند (د). پێکەنین (ز).
کەنار: قەراغی شت . مۆرد.
کەناراو: بریتییە لە ئاودەستخانە.
کەنارگرتن: خۆ دوورخستنەوە لە کارێک.
کەنارە: کەنار. لاکێشی باریک کە لەملا و لەولای میان فەرشەوە رادەخرێ. پەراوێز.
کەنارەگیر: کەسێکە کە هەمیشە خۆی کەنار بگرێ.
کەنارەگیری: گۆشەگیری.
کەناری: با. دڕکەزی.
کەناو: دادرگەی ئاو.
کەند: کەنگ.
کەندال: ز. تەپۆلکە.
کەنداڵ: کەندەڵان (د). گێژ (با).
کەنداو: شوێنێکە لە قەراغی دەریا کە ئاو دایدڕیبێ و ماوەیەک چووبێتە ناوەوە (خلیج).
کەندڕ: بوودرێکە لە زەوی، کە ئاو دایدڕیبێ.
کەندن: هەڵکەندن. بەردانەوەی تریاتس.
کەندۆ: مانگایەکی قسرە کە هێشتا وشکی نەکردبێ.
کەندوو: شتێکی بۆشی بەرزی گەورەی پێچکەدارە لە قوڕ دروست دەکرێ بۆ دەغڵودان تێکردن.
کەندەسمە: باڵندەیەکە لە ریشۆڵە گەورەترە هەر بەقەد کەندەوە هێلانە دەکا.
کەندەکار: کەسێکە کە کاری هەر هەڵکەندن بێ.
کەندەڵان: قەدپاڵێکە ئاو بۆشی کردبێ و دایدڕیبێ.
کەنراوە: ئاژاڵێکە کە قەڵەو بووبێ و بەخۆیدا هاتبێ: ئەم مەڕە باشی (کەنراوەتەوە).
کەنسی: د. ڕژدی چرووک.
کەنشتە: جێی خواپەرستی جوولەکە.
کەنگ: کەندەڵان.
کەنگر: کنگر.
کەنگەڵان: کەندەڵان.
کەنگێ: کەی.
کەنگێن: کەی: کەنگێن تۆ ڕۆیشتی هەنگێن منیش دێم.
کەنگینێ: کەی.
کەنن: هەڵکێشان. داکەندن. پێکەنین. کردنەوەی بەری میوە و سەوزایی.

کەنۆ: کەندۆ. گوێرەکەی یەک ساڵە .
کەنۆش: د. کون دووش.
کەنوو: کەندوو. پێکەنین.
کەلووی شانی هەنگوین (د).
کەنە: کنە.
کەنەسمە: د. کەندەسمە.
کەنەفت: زەبوونی بێ دەسەڵات، کەنەفت بوون: زەبوونبوون.
کەنەفت کردن: زەبوونکردن.
کەنەفتی: زەبوونی.
کەنەک: کەند (د). گابەرد.
کەنەنە: تەشوێیەکی پچکۆلانەی دەم کەوانەییە، ناوی کەوچک و ئەسکوێی پێ هەڵدەکەندرێ. ئینجا بەلێسک لووس دەکرێ.
کەنێر: دارێکی کوێستانییە، گەڵای وەک داری کەووت وایە، لە کاتی سووتاندا بۆنی خۆشە.
کەنێرە: گیایەکی بەهاری بۆن خۆشی گوڵ زەردی گەڵا خڕە.
کەنیشک: مێینەیەکە کە هێشتا شووی نەکردبێ، نەوەی مێینەی باوک و دایک.
کەنیشکە زاگ: د. کچەزا.
کەنیشکی: کچێنی. کچێنەی چاو.
کەنی: وتەیەکە وەک وتەی (کچێ) بەکاردێنرێ.
کەنیز: ل. کەنیزەک.
کەنیزەک: کارەکەر.
کەنیلە: د. کەنی.
کەنین: پێکەنین. بەردانەوەی تروتس.
کەو: باڵندەیەکی خاڵ و میلداری قاچ و دەنووک سووری بۆرە، لە کۆتر گەورەترە. شتێکە لە (گڵگیر) شاشترە، خەرمانی پێ پوختە دەکرێ. هەڵگوشینی برین بۆ پاکبوونەوەی.
کەوا: جۆرە کاڵایەکی قۆڵ و چاکەلداری درێژە.
کەوابوو: کەواتە.
کەواتە: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە وەرامی وتارێکدا کە لەبەر ئاشکرایی فڕێ درابێ: (کەواتە) وەرە لام، لە وەرامی یەکێکدا کە بڵێ ئیمشەو ئیشم نییە، واتە کە ئیشت نییە وەرە لای من.
کەوان: دارێکی چەوتاوەیە تیری پێ دەهاوێژرێ. دارێکی درێژی کەمێک خوارە ژێیەکی پێوەیە هەلاج چەکەی پێدا دەماڵێ لە کاتی هەلاجیدا، دارێکی کەوانەدارە چەرمێکی درێژی بەسەرەوەیە لە (مەتە) دەئاڵێنرێ و داری پێ کون دەکرێ. نیشانەیەکە وەکو: ( ) بەگردی وشەیەک یا ژمارەیەکدا دەنووسرێ کە گرنگییەکی ببێ.
کەوان پیتک: د. شتێکە وەک دارلاستیک بەردی پێ دەهاوێژرێ.
کەوانگۆشە: نیشانەیەکە وەکو: [ ] کە ئەمیش وەک کەوان بەکار دێنرێ.
کەوانە: کەوان. دارێکی دوو لقە بەگوریسێکی باریک دەبەسترێ بەهەردوو پێچکەی شەخرەوە، بۆ ئەوەی قرچەی پێ بگوێزرێتەوە بۆ سەر خەرمان. پێچ و دەرەی سەربەرەو ژوورە. هەموو شتێکی کەوانەیی. لای ژووروی هەموو شت. دوو تەختەی پان و درێژە دەبەسترێن بە ژێر پێوە بۆ ئەوەی بەسەر بەفردا برۆن و نەچەقن.
کەوانەدار: شتی کەوانەیی.
کەوانەیی: شتێکە بەرێکی چەوتابێتەوە.
کەواو: کەباب.
کەواوچی: کەبابچی.
کەواوخانە: کەبابخانە.
کەوایە: کەواتە.
کەوبار: بەچکە کەو.
کەوباز: کەسێکە کە حەز لە ڕاگرتنی کەو بکا.
کەوبووار: شوێنێکە کە کەو پێیدا بڕوا. کاتێکە کە پۆلە کەو بەرەو کوێستان دەگەڕێتەوە.
کەوبەدار: بەهارێکی درەنگە کە کەو لەبەر گەنەشینکە هەڵنیشێتە سەر دار.
کەوتن: بەلاداهاتنی شتێک بۆ سەرزەوی.
کەوتنەخۆ: خۆ ئامادەکردن.
کەوتنەخوارەوە: کەوتنی شتێک لە بەرزییەکەوە بۆ نزمییەک.
کەوتنەوە: دواکەوتنی کەسێک لە ڕۆین و مانەوەی: نیازم بوو بچم بۆ لادێ کەچی (کەوتمەوە) واتە پەکم کەوت. وازهێنانی یەکێک لە شتێک: لێم (بکەرەوە). هەڵدانەوەی گرانەتا لە گرانەتێ دار دوای ئارەق کردنی.
کەوتوو: کەسێک یا شتێکە کە کەوتبێ.
کەوتوویی: گرانەتێ.
کەوجز: د. کەوجێز.
کەوجێز: د. ئاوگردان. ئەسکوێ .
کەوچ: هـ. مەنی پێوانە.
کەوچک: شتێکی کلکداری دەم پانە شتی پێ دەخورێ.
کەوچکتاش: کەسێکە کە کەوچک دروست بکا لە دار: لێسکە. ناوی دێیەکە لە شارەزوور.
کەوچکە: کەوچکێکە دەبەسترێ بە(چەرەخۆرە)وە، دانەوێڵەی لێ دەچێتە گێڕی ئاشەوە.
کەوچە: د. کەوچک.

کەوداو: ماکەوێکە کە بنرێتەوە بۆ ئەوەی نێرە کەو دەوری بدەن تا ڕاو بکرێن. چەند داوێکە دادەنرێن لە نزیک ماکەوێکە و بۆ ئەوەی ئەگەر ماکەوەکە خوێندی کەوی تر بێن بەدەنگییەوە و بکەونە ناو ئەو داوانەوە.
کەودەری: جۆرە کەوێکی گەورەیە زۆر حەزی لەناو بەفرە.
کەودەن: مەردوومی نا زیرەک.
کەورک: ز. جۆرێکە لە هەرمێ.
کەورنگان: ز. جۆرە دانەوێڵەیەکە لە گرانیدا تێکەڵی گەنم دەکرێ و دەخورێ.
کەورێشک: کەروێشک.
کەورێشکە: د. کەروێشکە.
کەوسەل: ز. کیسەڵ.
کەوش: جۆرە پێلاوێکی بێ پاژنەی لووت هەڵگەڕاوەیە. سەر بەرەوخوارە. هەنگڵی گیاندار.
کەوش دروو: کەسێکە کە هەر کەوش دروست بکا.
کەوش دۆز: کەوش دروو.
کەوش کەن: شوێنێکە کە کەوشی تێدا دابکەنرێ.
کەوشەک: یاری سێ بازد.
کەوشەن: مەیدانی کشتوکاڵ و ئاژاڵ و لەوەڕاندنی ئاوایی.
کەوشێن: کەوشەک.
کەوک: ل. کەو.
کەوکردن: لە کەودانی دانەوێڵە.
کەو کەمانە: برینێکە لە مەلاشوودا پەیدا دەبێ.
کەو کەندەر:با. جۆرە کەوێکی گەورەی زەرد باوە.
کەوگیر: شتێکی کلک درێژی دەم پانی کون کونە لە مس یا لە فافۆن چێشتی توندەی پێ تێ دەکرێ و کەفی چێشت و گۆشتی پێ دەگیرێ.
کەوگیرە: برینێکە بەقەد دەمە کەوگیرێک پان و کون کونە.
کەوڵ: پێستی گیراوەی هێندێ گیاندار. شتێکە وەک پاڵتۆ پێستی تووکداری خۆشەکراوی بەبەردا دەگیرێ و بۆ گەرمی بەزستان لەبەر دەکرێ. کەوڵ پۆست. مشەمما یا تەنراوێکی چوار سووچە لەسەر تەنوور دادەخرێ بۆ نان لەسەر کردنی.
کەوڵ پۆست: کەوڵێکی تایبەتی خۆشکراوی تیسکنە بۆ لەسەر دانیشتن.
کەوڵکردن: گووونی گیاندار. بریتییە لە بەیدەست و زەبوونکردنی گیاندارێک: فەرهاد نەریمانی کەوڵ کرد.
کەوڵۆس: شوێنێکە ئاو دایدڕیبێ. ناوی دێیەکە لە ناوچەی خورماڵ.
کەوڵە: د. شتی شینی کەوەلە. شوێنی ڕووتەنی زیخەڵانی شین.
کەوڵەکۆن: بریتییە لە مەردوومی پیری قرخنی پەککەوتە.
کەولێدان: کەوکردن.
کەومار: جۆرە مارێکە وەک کەو دەخوێنێ.
کەون: کۆن.
کەونە: کۆنە.
کەونەفرۆش: کۆنە فرۆش.
کەونینە: بە شتی کۆن دەڵێن.
کەووت: دارێکی سەختە کەوچکی لێ دروست دەکرێ.
کەوور: بزنی سپی.
کەوورگ: ئەشکەوت.
کەووگ: د. شتی شین.
کەوە: کەووگ. کەوی دەغڵ پێوان .
کەوەت: کەووت.
کەوەر: گیایەکی توونی گەڵا پانی بێ لقە. کەوورگ (د).
کەوەڕۆژ: ڕۆژێکە کە بەری ئاسمان تەنکە هەوری ببێ و سەرمابێ.
کەوەڕێ: بێزار بوون لە لەشی خۆت: لە لەشی خۆم کەوەڕێ بووم، بەڵام نابێژرێ لە فلان شت کەوەڕێ بووم.
کەوەسێر: مەڕێکە تووکی دەموچاوی سپییەکی شینباو بێ.
کەوشەن: سنوور.
کەوەگی: د. گەنەیەکە دەداتە مەڕ و بزن.
کەوەل: جۆرێکە لە بەری مازوودار گەڵا پان و تووکنە.
کەوەلە: گیاندارێکی وردە وەک ڕشک دەداتە ئاژاڵ. شتی شینکار. زەوی و شاخی ڕووتەنی شینکار.
کەوەمار: شینە مار.
کەوێ: کەوا.
کەوێژە: کەوچکەی ئاش.
کەوێڵ: خانووی ناو باخ. ئەشکەوتی پچووک.
کەویە: نزم.
کەوی: باڵندەیەکە لە ماڵدا دەستەمۆ بووبێ، (کەویبوون) دەستەمۆبوون، (کەویکردن) دەستەمۆکردن. ڕنووی بەفر.
کەویچە: کەوێژە.
کەویر: د. دەشتی زیخەڵانی بێ ئاو و بێ سەوزایی.
کەویژ: دەفرێکە شتی پێ دەپێورێ: چ کەویژێ چ مەویژێ.
کەویژە: کەوێژە.
کەه: ل. کا.
کەهاڵ: د. تەمەڵ.
کەهروبان: ز. کارەبا.
کەهرێز: کارێز.
کەهریز: ل. کارێز.
کەهنی: ز. کانی.

کەهیا: گەورە. سەرۆک.
کەهێڵ: مەردوومی سست و تەمەڵ لە کاردا.
کەهی: با. گیاندارێکە کە لە ماڵدا ڕام بوویێ.
کەی: پیتی پرسیار لە کات: (کەی) دەڕۆیت. یاری و کایە(ھ).
شا: کەیخوسرەو.
کەیارک: ز. کارک.
کەیاندن: ز. ژەندنی مەشکە.
کەیبانوو: ژنێکە لە ماڵدا سەرپەرشتی ئیشوکار بکا.
کەی بەکەی: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ باسی ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش لە کات: (کەی بەکەی) هاتووم، واتە زۆر دەمێکە.
کەیس: با. هەل.
کەیف: خۆشی دڵ: فیسار کەس بە(کەیف)ە یا بێ (کەیف)ە.
کەیفکردن: بەخۆشی ڕابواردن.
کەیک: کێچ.
کەیکف: کێکف.
کەیکووا: د. مەردوومی کارزانی ڕاوێژ پێکراو.
کەیل: پڕ: دڵم (کەیل)ە واتە پڕە لە خەم و خەفەت، (کەیلبوون) دڵ پڕبوون لە خەم و خەفەت، (کەیلکردن) پڕکردنی دڵی یەکێک لە خەم و خەفەت. کەلاوە.
کەیلان: د. ئافرەتی تەڕلان.
کەین و بەین: تەگبیر و ڕازێکە کە بکرێ لەناو چەند کەسێکدا بۆ کردنی کارێک بەپەنهانی: چ (کەین و بەین) ێکتان بەدەستەوەیە؟
کەینێ: کەی.
کەیوان: ئەستێرەی (زوحەل) .
کەیوانوو: کەیبانوو.
کەیەڵ: خانوویەکە بەهاوینان لەناو باخدا دەکرێ.
کەیی: کەوی.
کەێر: ز. درەختی مۆرد.
کێ: پیتی پرسیارە بۆ دەستنیشانکردن (تعین)ی تاقە کەسێک: کێ بوو هات؟. دێ: (کێ) خوا، واتە کوێخای دێ. پیتێکە بۆ خۆشەویستی دەنرێ بەدوای هێندێ وتەوە: کناچە (کێ) واتە خوشکە لێ. پیتێکە دەنرێ بەو کارانەی کە لە یاریدا دەکرێ و دەیکا بەمصدری یاری: چاوشار(کێ)، دایە لۆ (کێ).
کیار: ھ. بێستانی کاڵەک و شووتی و ترۆزی و خەیار و بامیە و باینجان و تەماتە.
کیاستن: ناردنی یەکێک بۆ شوێنێک.
کیانا: ھ. ناردن.
کێتک: با. پشیلە.
کێچ: گیاندارێکی ڕەشی وردی قاچ برگەبرگەی بەئاڵۆشی خاوەن قەڵەمبازە، بەهاران دەژێتەوە.
کێچ کەوتنە کەوڵ: بریتییە لە پەلەپەل پێکەوتنی یەکێک.
کێچە ڕەشکە: دەعبایەکە بێستان و شینایی دەخوا.
کێچ هەڵهێنان: بریتییە لە پەلەپەل پێکەوتنی یەکێک بۆ بەجێهێشتنی شوێنێک.
کێخا: د. کوێخا.
کێخوا: د. کوێخا.
کێر: جێگای نەتەوە خستنەوە و میزکردنی نێرینە. کار، کەڵک(ز). کێرد (ز). شتی کاڵی نەگەیشتوو.
کێران: ز. داری درێژی ئەستوور.
کێرخۆر: بریتییە لە ئافرەتی جۆشن.
کێرد: تیغێکی دەم پانی مشتوودارە نانوشتێتەوە.
کێردگەر: کەسێکە کە کێرد دروست بکا.
کێڕ: خەتی کێشراو لەسەر زەوی یا کاغەز.
کێڕا: کوێڕا.
کێرزل: بریتییە لە مەردوومی زۆردار.
کێرزلی: بریتییە لە زۆرداری.
کێرسم: ز. شێوەی ئادەمیزاد .
کێرک: ز. کێردی پچووک.
کێرکەر: کارەکەر.
کێرکەڵە: د. گیاکەڵە.
کێرهاتن: ز. بەکارهاتن.
کێرەفیل: بریتییە لە قامچی هۆنراوە کە دەکرێتە دەست.
کێرەکەڵەگا: گیایەکی یەک لقە باڵای هەمووی گوڵە و لەناو تووتندا دەردێ و زەبوونی دەکات.
کێریشک: با. کەروێشک.
کێز: با. گووخلێنکە.
کێزان: ژەندنی مەشکە.
کێزاندن: کێزان.
کێزر: کۆمەڵە خەڵفێکە کە بەپڕی لە زەوی هاتبێتە دەرەوە. کەسێکە لە کرداردا هەڵەشە بێ و بەخودسەری ئیش بکا.
کێزری: هەڵەشەیی و خودسەری لە کاروباردا.
کێزک: ز. کێز.
کێزم: با. تاقە دارێکە کە مێوێکی خرابێتە سەر.
کێزە: با. قالۆنچە.
کێزەر: کێزر.
کێزەری: کێزری.
کێزێن: ز. لوولەیەکە بەژێر زەویدا برابێ بۆ ئاو پێدا بردن.

کێزی: ز. گەسک.
کێژوولە: چۆلەکە.
کێس: کەس (ز). کیس (د).
کێش: ڕەشتی. تەواناییی: لە (کێش)ی مندا نییە. نۆرەیەک لە شتی بەتەرازوو کێشراو: ئەمە دوو یا سێ (کێش)ە. وەزنی شیعر. مشکی. پێز: ئەم هەویرە بە (کێشە).
کێشان: ڕاکێشانی شت. قوم دان لە جگەرە و سەبیل و نێرگەلە. ئەندازە گرتنی شت بەسەنگ و تەرازوو. پەڕاندنی وڵاخی نێر لە مێ.
کێشانن: د. کێشان.
کێشانە: ئەندازەگرتنی شت بەسەنگ و تەرازوو.
کێشانەکردن: کێشانە.
کێشانەوە: هێنانە دواوەی شت: ئاگرەکە یا لەشکرەکە (بکێشەرەوە).
کێشران: کێشان.
کێشراو: شتێکە کە کێشرابێ.
کێشک: ئێشک. وتەی پرسیارە وەک وتەی (چی) (ز).
کێشکچی: ئێشکچی.
کێشکردن: ڕاکێشانی شت.
کێشک گرتن: ئێشک گرتن.
کێشکە: با. چۆلەکە.
کێشماکێش: د. کێشمەکێش.
کێشمان: کشان و فراوانبوونی شت: فانیلەکە (کێشمان)ی دێ.
کێشمەکێش: بگرەوبەردە و دەردی سەری.
کێشندە: هێزێکە لە هێندێ شتدا هەیە شتی تر ڕادەکێشێ بەلای خۆیدا.
کێشواکێش: د. کێشمەکێش.
کێشوولە: چۆلەکە.
کیشوەر: حکومەت.
کێشە: بردنی کوڵۆشە لە شاراوە بۆ سەر خەرمان. هەرا و کێشمەکێش.
کێشهاتن: کێشمانی شت.
کێشەکێش: کێشمەکێش.
کێشە و بەرە: کێشمەکێش.
کێشەوە: گواستنەوەی شتێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.
کێشەوێ: کێشەوە.
کێشیاگ: د. کێشراو.
کێشیان: کێشان.
کێف: کێو.
کێفرۆشک: ز. کەروێشک.
کێفزال: ز. قرژاڵ.
کیڤژاڵە: با. قرژاڵ.
کێفژاڵە: کێفزال.
کێفساز: د. کێوسار.
کێفسان: د. کێوسال.
کێفش: ز. شتی ئاشکرای نمایان.
کێفکی: با. شتی بۆگەن.
کێفی: کێوی.
کێفیلە: د. کێویلە.
کێڤریشک: با. کەروێشک.
کێڤی: ز. کووپەڵۆکە.
کێڤیی: ز. دەفرێکی گڵینە ڕۆن یا هەنگوینی تێ دەکرێ.
کێکف: تیروو.
کێکوو: کێکف.
کێل: دوو تەلەبەرد یا دوو میلە لە سەرین و پێینی گۆڕەوە دادەچەقێنرێ. شتی بەرز، (کێلبوونەوە) بەرزبوونەوە، (کێلکردنەوە) بەرزکردنەوە.
کیڵ: کەیەڵ (ھ). میلی ڕەنگاوڕەنگی بەڕە. کێل (د).
کێلان: بەرگی خەنجەر و شیر.
کێڵان: هەڵگێڕانەوەی زەوی بەگاسن بۆ کشتوکاڵ.
کێلانە: کێلان.
کێلدان: ز. دروومان.
کێڵران: کێڵان.
کێڵراو: شوێنێکە کە کێڵرابێ
کێلک: کەلەکە.
کێڵگە: زەوییەکە دەست بدا بۆ کێڵان. زەوی کێڵراو.
کێلووک: با. ژنێکە کە موسوڵمان نەبێ.
کێلوون: ئاسنێکی زمانەدارە دەدرێ لە دەرگا و سندووق و بەکلیل دادەخرێ.
کێلە: د. کەویژ.
کێلەبەردانێ: یارییەکی دوو دەستەییە، هەر دەستەی چەند کەس بن دەبێ ئەوەندە تەنکە بەردی پچووکی بەقەد دەستێک ئامادەبکەن، دەستەیەکیان بەردەکانیان دادەچەقێنن و دەستەکەی تر تەنکە بەردەکانی خۆیانی تێ دەگرن.
کێلەندی: ز. جۆرە داسێکی گەورەیە بەهەردوو دەست دەگیرێ و دروێنەی پێ دەکرێ.
کێلێژە: کۆڵەکەی چارداخی تووتن.
کێم: خوێنی گەڕاوەی خەستی سپییە لە برین دێتە دەرێ. کەم (ز).
کێماسی: ز. کەمایەسی.

کێماو: کێمی ڕوون.
کێماهی: کەمی.
کێمایی: کەمی.
کێمپەڕ: تەنینەوەی برین بەهۆی کێمەوە.
کێمکردن: پەیابوونی کێم لە برین.
کێمی: کەمی.
کێندەر: کوێندەر.
کێندەرێ: کوێندەرێ.
کێو: چیای بەرز.
کێوسار: د. شوێنی شاخاوی.
کێوسان: کوێستان.
کێومالْ: هەرەوەزکردن بەدووی شتێکی ونبوودا لە دەشت و کێو.
کێووژ: کەویژ.
کێووستان: کوێستان.
کیون: سەختە پۆڵایەکی لووتداری قورسە کلکێکی دارینی هەیە، بەردی گەورەی پێ دەشکێندرێ.
کێوە: بۆ کوێ.
کێوی ئاگرپژێن: کێوێکە بەهۆی جۆش و خورۆشی ناویەوە لەت بێ و ئاگر و شتی تواوەی لێ بێتەدەرەوە.
کێوی ئاگرفشان: کێوی ئاگرپژێن.
کێوی: گیا یا گیاندارێکە کە هەر لە کەژ و کێودا بێ. بریتییە لە مەردوومی سرکی سڵکردوو لە شت.
کێویلە: سەوزیایی و دارودرەختێکە کە لە دەشت و کێو ڕوابێ و بەدەست نەچەقابێ.
کێهانە: کامیان.
کی: ل. کێ.
کیتەڵە: گۆزەی پچووکی خڕەڵە.
کیر: کێری گیاندار. کێرد و چەقۆ (ز).
کیر ڕنج: با. هەلاج.
کیرە: جۆرەج دەنگێکە لە یەککەوتنی هێندێ شتەوە پەیدا دەبێ.
کیرە کیر: کیرەی یەک لەدوای یەک.
کیژ: کچ.
کیژۆڵە: کچۆڵە.
کیس: جۆرە بلۆقێکە لەبن ددان پەیدا دەبێ.
کیسک: ز. کیسە.
کیسکردن: پەیابوونی کیس لەژێر ددانداا. بریتییە لە پیش خواردنەوەی یەکێک لە ڕقاندا.
کیسۆ: ز. ڕەقە.
کیسە: توورەکەیەکە شتی تێ بکرێ.
کیسەبڕ: د. گیرفانبڕ.
کیسەکێش: ناترێکە لە ژووری حەماما بەکیسەیەکی تایبەتی مەردووم بشوا.
کیسەکێشان: هێنانی کیسە بەلەشدا بۆ لێکردنەوەی چڵک.
کیسەڵ: دەعبایەکی دێمییە وەک ڕەقەی ناو ئاو.
کیسەڵە: دارێکی قۆقزە دەدرێ لە پشتی دەرگا و شمشێرەی پێدا دەکرێ. دارێکە (مازە) و (لاجامە) بەیەکەوە دەنووسێنێ.
کیسە لە مل: بریتییە لە کچی جوانکیلانە.
کیسە و کەمەر: جۆرە کەمەربەندێکە، چەند کیسەیەکی پێوەیە شتی تێ دەخرێ.
کیسەهەڵدروون: بریتییە لە تەماداری یەکێک بۆ شتێک: فیسار کەس (کیسەی بۆ هەڵدرووە) واتە بەتەمایەتی.
کیف: چەرمێکی دووتوێی هەڵدرواوە، هێندێ شتی تێ دەخرێ.
کیفاندن: د. فیکەکردنی مار.
کیفانن: کیفاندن.
کیفکردن: هەڵکفانی شت.
کیفن: شتی هەڵکفاوی پفەڵ.
کیفۆک: پیشۆک.
کیفە: د. فیکەی مار.
کیڤار: با. کرێشی ئەستووری سەری کەچەڵ.
کیڤی: با. گیانداری کێوی.
کیلۆ: سەنگێکە کە هەزار غەرامە.
کیلە: ئەندازەیەکە بۆ دانەوێڵە کە چوار تەنەکەیە.
کیلەرک: با. گەنجینەی ژوور.
کیم: کێم.
کیمیا: زانیارییەکە باس لە دروستکردنی هێندێ شت دەکا بەلێکدان و جوێکردنەوەیان. دروستکردنی ئاڵتوون و زیو بەدەرمان.
کیمیاگەر: کەسێکە کە کیمیایی بکا.
کیمیاگەری: خەریکبوون بەکیمیاوە.
کیمیایی: کیمیاگەری: ئەم پیشەیە (کیمیایی)یە.
کین: ڕق.
کینە: کین.
کینەدار: خاوەنی کینە.
کینەکێشان: ڕق کێشان لە دڵدا لە یەکێک.
کینەکێش: کەسێکە کە کینەی زۆربێ لەگەڵ مەردوومدا.
کیوار: گیایەکی بەرزی کوێستانی بەهارییە، گەڵای وەک بی وایە، دەکوترێ و دەدرێ بەوڵاخی بەرزە. جۆرە جەوییەکە لە لا قەدی گیای کیودا پەیدا دەبێت دوای برینداركردنی و، دوای مەیینی وەک بنێشت دەخورێ.
کیبوون: پیک.



گ: گـشت: (گ) جـارێ یا (گ) جـۆرێ واته هەمـووجـارێ یا هەمـووجـۆرێ. پیـتـێکه له شـوێنێ (و)ی (إسـمی مـفـعـول) دەنووسێ بەدوای هێندێ وتەوە: گـــەییی(گ)، ڕویی(گ) واته گەیو، ڕۆیو.

گا: ڕەشەولاخێکی نێره که پێی نابێته سێ ساڵه. پیـتێکه بەهەر ناوێـکەوه نـرا دەیـکا بـه(إســــمی مـکان): ڕێ(گـــا)، سەیران(گا) واته جێی ڕۆین و سەیران. کات: هەر(گا) واته هەر کات.

گـائەنگێـو: جـۆره مـارێکه وەک زەردەمـار بەڵام ئەم شـینه و بێ وەزەنده.

گابڕەسەوزه :گیایەکی ئاوییه له لەبان دەچێ بەڵام ئەم سێ کووزه و گەڵای تەنکه.

گابۆڕ: بۆڕەبۆڕی گاگەله لەسەر خوێنی ڕەشەولاخێکی سەربڕاو. بریـتـیـیـه له گـریانی چەند کـەسـێک بەدەنگی بەرز بەهۆی مردنی خۆشەویستێکیانەوه.

گابەرد: بەردی زۆر گەوره.

گاپەڵ: جۆره کۆترێکی شینی کێوییه.

گاپێ: بریتییه له مەردوومی تەمەڵ له ڕۆیندا.

گاپێڵ: گـایەکه که شاخەکانی چەمابنەوه بەدەوری گوێ یا چاویدا بەجۆرێک که پێویست بێ بەبڕینەوه.

گاتوو: شاتوو.

گاجفت: د. گاجووت.

گاجووت: گایەکه لەوانه بێ که جووتی پێ بکرێ.

گاچاڵ: د. چاڵی زۆر گەوره.

گـاچاوه: جـۆره گـوڵێکه له شـتی چنراو دروست دەکرێ لـه وێنەی چاوه گا.

گاچوان: گۆچانی زلی ئەستووری ناقۆڵا.

گاچێرین: ز. کلک هەڵسەنگێنه.

گادار: ز. شوێنی لەوەڕی گاگەل.

گادانه: د. کزن.

گادمه: گیایەکه وەک هەڵەکۆک، بەڵام ئەم سەڵکی نییه و بۆ ژانه سک دەخورێ.

گـادۆش: دەفرێکی گڵێنه وەک دیزه، دوو قوڵفی هەیه، پەتی تێ دەخرێ و پێی هەڵدەگیرێ.

گادۆشکه: جامی شیر دۆشین.

گـادەمه: گـیـاکی گـەڵاپانی پایزی زۆر تاڵه، دەکـوترێ و دەکـرێتـه گۆماوەوه بۆ ماسی کوشتن.

گادێری: ز. گاوان.

گــار: پیـــتـــێکه دەنرێ به هێندێ ناوەوه دەیکا بەئیـــشکەر: ئامــۆژ(گــار)، پارێز(گــار)، کــرد(گــار). بەهێندێ ناوەوه دەنووسێ، مـاوەیەک له کـات پێـشـان دەدا: ڕۆژ(گار)، شـەو (گار).

گاران: ز. گاگەل.

گاراندن: گارەکردنی مریشک.

گارانن: د. گاراندن.

گاڕام: د. گاڵۆک.

گـاڕان: گـاگـەل. دارێکی درێژی نەقـیـزەداره، جـوتیـار له جـووت کردندا گای پێ لێ دەخورێ. ناوی دێیەکه له ناوەندی (سنه) و (مەریوان)دا.

گارس: با. مەرزن.

گارنگ: ز. گووگره.

گاره: دەنگی مریشک، گارەگار: گارەی یەک لەدوای یەک.

گـاریه: دەفرێکی تایبـەتی گەورەیه، پڕ دەکرێ لـه ئاو و دەنرێ له ولاخ.

گاریته: با. کاریته.

گـاز: قـەپگرتن له شت بەددان. ئاسنێکی دوو دەمی کـەوانەداره، دان و بزمـاری پێ هەڵدەکـێـشـرێ. تۆزێک پووشـوو کـه بۆ داگـیـرسـاندن بکرێتـەوه. بانگەواز. باسکی ئادەمـیـزاد و گیاندار (ز) نەوت. هەڵم.

گازانده: گلەیی: گازاندەم لێ مەکە.
گازرکردن: شووشتنی جاو و هەڵکوتانێتی بۆ سپیبوونەوە.
گازرکەر: کەسێکە کە شت گازر بکات.
گازک: با. مەقاش.
گازکردن: بانگکردن بەدەنگی بەرز.
گازگاز: ز. هاوارکردنی زۆر.
گازگرتن: قەپگرتن بەددان.
گـازن: ئاسنێکی دەم تیـژە، زین دروو چەرمی پێ زویڵ زویڵ دەکات. گلەیی (ز).
گازندۆک: ز. کەسێکە کە زۆر سەرکۆنەی مەردووم بکا.
گازنده: گلەیی.
گازۆز: ز. مۆریانەیەکە کە دەداتە کالا.
گازۆڵک: گوخلێنکە.
گازووک: قامیشێکی ئەستووری درێژە کـە سەرێکی دادرابێ و دوو فاق کرابێ بۆ مارگرتن و کوشتنی.
گازەرا: ناوەڕاستی شت.
گازەنده: گازنده.
گازی پشت: موورەغەی پشت.
گازی: ز. هاوار. بانگ.
گازیز: ز. گازۆز.
گازیکرن: ز. هاوارکردن. بانگکردن.
گازیکەر: با. بانگکەر.
گاسک: با. گازک.
گاسکە: دەنگی هێندێ گیـانداره لەکاتی کـەساسیدا، (گـاسکە گاسک) گاسکەی یەک لەدوای یەک.
گـاسن: ئاسنێکی پانە وەک بێڵ دەکـرێ بە هەوجـارەوە و جـووتی پێ دەکرێ.
گاسنۆق: د. یەغدانی گەورە.
گاشە: کەشاکەش و دەردی سەری. خڕەبەرد.
گاف: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
گاڤ: ز. کات. هەنگاو.
گاڤان: ز. گاوان.
گاڤانی: ز. گاوانی.
گاڤدان: ز. هەنگاونان.
گاڤەک: ز. کات.
گاقڕ: گاقڕان.
گاقڕان: دەردە گا.
گاقۆڕ: گابۆڕ. کاتی وشکبوونی ئاو لە دەمەدەمی پایزدا.
گاکۆتر: جۆرە کۆترێکی کێوییە.
گاکوچک: د. گابەرد.
گاکێڤی: د. گاکێوی.
گاکێوی: دەعبایەکی کێوییە لە گا دەچێ بەڵام ئەم زلترە.
گـاگـا: جارجـار: (گـاگـا) دەچمە دەرەوە. دەم دەم: شـەو (گـاگـا) دەنووم و (گاگا) هەڵدەستم.
گـاگـۆڕ: د. گـۆڕێکی گـەورەیە کـە لە تەنیـشـتـەوە لادر بـکرێ و ئەلحەدی بۆ هەڵ نەکەنرێ.
گاگۆز: شتێکە وەک پۆڵکە بەڵام ئەم دەنکی گەورەترە.
گـاگـۆڵکێ: ڕۆیشـتـنی منداڵ لەسـەر چوار چنگۆڵە لە پێش پێ گرتنیدا.
گاگۆڵە: گاگۆڵکێ.
گاگوێ: گیایەکی کوێستانییە لە گوێی گا دەچێ.
گاگەل: کۆمەڵێ گا و مانگا کە بلەوەڕێنرێ.
گاگەلە: گاگەلە: د. گاگەل.
گاگێرە: گایەکە کە بەتایبەتی گێرەی پێ بکرێ.
گاڵ: هەرزن.
گاڵتە: وتن یا کردنی شتێک بۆ پێکەنین.
گـاڵتـەچی: کـەسـێکە کـە زۆر گـاڵتـە بکا لەگـەڵ ئەم و ئەودا. کەسێکە کە گاڵتەی پێ بکرێ: بۆچ (گاڵتەچی) تۆیە؟
گاڵتە پێکردن: گاڵتەکردن بە شتێک.
گاڵتەکردن: وتن یا کردنی شتێک بەقەشمەری.
گـاڵتـە لێ پژان: وەرگـرتن و زانینی هەمـوو کـردار و گـوفـتـارێک بەگاڵتە.
گاڵتێن: شتێکە کە بکرێ لە ڕووی گاڵتەوە.
گاڵدان: هاندانی کەسێک لە کەسێک بۆ زیان پێ گەیاندنی.
گـاڵگاڵی: جـۆرە کـولێـرەیەکی پچـووکـە لە هەویر و ڕۆن دروست دەکرێ و زەردێنەی هێلکە لە ڕووی دەدرێ.
گاڵۆش: د. کاڵۆش.
گاڵۆک: گۆچان.
گاڵە: ل. خشتی کاڵ.
گاڵەبەنگ: د. جۆرە لەوەڕێکە کە خواردنی گێژی دەدا.
گاڵەپێکردن: حەشرکردن بە شتێک.
گاڵەدان: داخستنی دەرگا.
گـاڵەکـردن: کـردنی کـارێک بەچاپوکی و چالاکی: فـیـسـار کـەس (گاڵە) دەکا، واتە کارەکەی چاک دەکات.
گاڵەگاڵ: دەنگە دەنگ.
گاڵە و گیڤە: هەرا و هەرەشە و خۆ تووڕەکردن.
گالیسکە: عەرەبانەیەکە کە بەگا بڕوا.
گالینە: نانی هەرزن.
گـامـارۆ: باڵندەیەکی مـەلەوانی ڕەشی کـونج کـونجی ناوچەوان سپییە بەقەد (قەلڕاو) دەبێ.

گامل: ز. دوورخستنەوەی شت بە شان.
گـامەلاس: مـانگرتنی گـا و خۆ بەزەوی دادانی. جۆرە یارییـەکی دوودەستەییيە.
گامێش: جۆرە ڕەشەوڵاخێکی مەلەوانە، لە گا گەورەترە.
گامیش: گامێش (ل).
گان: دروستبوونی نێر لەگەڵ مێدا. گیان: ناساغەکە (گان) دەدا، واتە گیان دەدا.
گاندەر: کەسێکە کە گان بدا.
گانکەر: کەسێکە کە گان بکا.
گانەگۆڵ: بریتییە لە بەزم و هەرا. ئەم (گانەگۆڵە) چییە.
گاو: کات. پینەی کاسە و تەشپی. هەنگاو.
گاوارە: د. بێشکەی منداڵ.
گاواسن: گاسن.
گاوان: کەسێکە کە گاگەل بلەوەڕێنێ.
گاوانە: هـ. گڵێنە.
گاوانی: مزێکە کە دەدرێ بەگـاوان. ڕیشـۆڵە (د). ناوی دێیـەکە لە ناوچەی بازیان.
گاوخان: د. گاوەخان.
گاودانە: د. بەری گیایەکی بەهارییە دەدرێ بەڕەشەوڵاخ.
گـاودومــە: د. گـیــایەکــە وەک کلکی گــا وایە بۆ ســووتـاندن بەکاردەهێنرێ.
گاوزاڵک: ل. قالۆنچە.
گاوشە: د. گۆزەی گەورە.
گاوور:کەسێکە لەسەر ئاینی عیسا پێغەمبەر بێ. بێ باوەڕ (ز).
گاوەس: گاوەس.
گــاو و گــەردوون: قــوربانی: بە(گــاو و گــەردوونت) بم، واتە بەقوربانت بم.
گاوولێکێ: د. گاگوڵکێ.
گـاوەخـان: دووکـێـرە جـووتـیـار لێی دەدا لەمــســەر و لەوســەری زەوییەوە بۆ ئەوەی کە لە کاتی جووتدا لێی نەچێتە دەرەوە. گەورێکە گا و مانگای تێ بکرێ.
گاوەزبان: گۆزروان.
گاوەزوان: گاوەزبان.
گاوەس: مەشکەیەکە لە پێستی گا کرابێ.
گاوەسپووک: هـ. گیایەکی کوێستـانییـە گوڵێکی سوور دەگرێ بنکێکی سپی هەیە وەک پیشۆک دەخورێ.
گاوەسن: د. گاوەس.
گاوەسەر: د. تۆێز.
گاوەکی: د. ئێسترە گایلکە.
گاوەناز: برینێکە لە قوڕگی ڕەشەوڵاخ خڕ دەبێ.

گاویلکە: باڵندەیەکی پچووکە هەمیشە بەشوێن هێڵی جووتیاردا دەگەڕێ بۆ کرم خواردن.
گاه: کات.
گاهەس: د. شایەد.
گای بنە: ئەو گا گێرەیەیە کە دەکەوێتە لای خەرمانەوە. بریتییە لە یەکێک کە پەنجەی لە کـارێکدا بێ: هەمـووی قەباحـەتی گای بنەیە.
گایلکە: جۆرە ئێسترێکی باڵا پچووکە.
گاینجە: دارێکە وەک خەنجەر دەکرێ بەکونی مژاندا بۆ ئەوەی کە لە (وێژانبەر) دانەماڵێ.
گایەل: گاگەل.
گاین: پەڕینی نێر لە مێ.
گپ: گووپ. پیت (ل).
گت: د. شتی قوت. وێستان و ئیستکردن.
گتایی: د. قوتی شت.
گتە: د. شتێکی قوتە کە لە دوورەوە دیاربێ.
گـجک: دوگـمـەیەکـە لە زێی مـانگادا وەک گـوڵەنگ بۆ وڵاخی بەرزە.
گجی: هـ. کراس.
گچچە: وتەیەکە ڕەشەوڵاخی پێ لێ دەخوڕدرێ.
گچک: پچووک.
گچکۆکە: پچکۆلە.
گچکۆلە: گچکۆکە.
گچکە: پچووک.
گچکەڵە: گچکە.
گچکەیی: پچووکی.
گلاندن: ز. کۆکردنەوەی خواردەمەنی بەسواڵ.
گدووک: ز. گردۆڵکە.
گدە: گدێ.
گدێ: د. بزن.
گدێ گدێ: گدی گدی.
گدی: وتەیەکە بزنی پێ بانگ دەکرێ: (گدی گدی) لە کاتێکدا کــە بتــەوێ بزن بانگ بکەیت. وتەیەکــە بۆ مــەدح و زەم بەکـاردێنرێ بەم ڕەنگە بەپیـاوی گێل دەوترێ: (گدی گـدی) واتە وەک بزن وایت. یا بەمنداڵی خۆشەویست دەوترێ (گدی گدی) لە خۆشەویستیدا (ز).
گدی گدی دان: خوتووکەدان.
گر: پیتێکە بە هێندێ ناوەوە دەنووسێ دەیکا بەسیفەتی مشبە: بەرگە(گر)، فرە(گر). ڕق: فیسار کەس زۆر بە(گر)ە واتە ڕق ئەستوورە. هێز: فیسـار کەس زۆر بە(گر)ە واتە زۆر بەهێزە. فـێـڵ: (گـر)ی دا واتە هەڵی خـەڵەتاند. گـەڕ (ز). تەپۆڵکە (با). شتی زلی زبر (ز).

گرار: با. چێشتی توندە.
گراز: ز. چێشتی ساوەر یا برنج.
گراگر: ز. گەورە و سەرکۆمار.
گرامەفۆن: سندووقی گۆرانی.
گران: شتی قورس. شتێکە لە کڕیندا بەپێی خۆی نرخی زۆر بێ، (گرانبوون) سەرکەوتنی نرخی شت. گرانکردن: زۆرکردنی نرخی شت. گوێچکەی قورس و سەنگین. شتێکە کە تێگەیشتنی سەخت بێ: وانەکەی ئیمڕۆمان زۆر (گران بوو). مەردوومی قورس و قەمەر.
گرانایی: قورسایی.
گرانبار: بریتییە لە کەسێک کە باری ژیانی قورس و گران بێ.
گرانبایی: گرانایی.
گرانبەها: شتی زۆر بە نرخ.
گرانجان: کەسێکە شت بەگران بفرۆشی.
گرانمایە: گران بەها.
گرانە: با. رووتانەوەی مووی پێشی ناوچەوان تا ناوەڕاستی سەر (أصلع).
گرانەتا: تایەکی زۆر بەتینە تووشی هەر کەس ببێ تا ئارەق نەکا یا باوێشک نەدا یا نەپژمێ بەری نادا.
گرانەتێ: گرانەتا.
گرانەوە: گێڕانەوە.
گرانی: کاتێکە کە هەموو شت تیایدا کەم و گران بێ. گرانایی.
گراو: ئافرەتێکە کە حەزت لێ کردبێ (معشوقة) (ز). کەسێکە کە گیرابێ.
گراوە: د. جزیرة.
گراوی: دڵداری و خۆشەویستی بەدڵ. دەزگیران. دڵدار.
گرپە: گرفەی ئاگر، (گرپەگرپ) گرپەگرپی زۆر.
گرتک: پارچە ئێسقانێکە کە گۆشتی پێوەبێ. پریاسکە (د).
گرنگە: جێگایەکە لە شاخ و دەشت کە بزن و مەڕەکێوی تێدا نووستبێ و سمکۆڵی تێدا کردبێ و، لەبەر ئەوە لە بەهاردا گیای لێ نەڕوابێ. گونکە هەویر (د).
گرتن: دەست بگیرکردنی شتێک و هێنانە ژێر چنگ: ئەو شتەم لێ (بگر)ە. بەند (حبس) کردن: فیسار کەسیان (گرت). بەڕۆژوو بوون: هەموو ساڵێک ڕۆژووی ڕەمەزان (دەگرم). بەربەستکردنی کون و دەلاقە، کورتکردنەوەی شتێک بەمەقەست: کەمێک سمێڵت (بگرە). برینداربوونی شوێنێک لە ئەندام بەهۆی نهێم کەوتنە سەری: پێلاوەکە قاچمی (گرتووە).
گرتنە دڵ: نیازگرتنی شتێک بەدڵ. بریتییە لە دڵگیربوون لە شتێکی ناخۆش و نەچوونە دەرەوەی لە دڵ.
گرتنە ناو: گرتنی یەکێکە لە لایەن چەند کەسێکەوە بەجۆرێک کە نەتوانێ لە دەستیان دەرچێ.
گرتنەوە: گرتنی شتێک لە حەواوە: تۆپەکەی (گرتەوە). هێنانەوەی ئەندامی شکاو یا لەجێ چوو بۆ جێی خۆی. ڕێکخستنی تەرازوویەکە کە سەربکا بەهۆی پارسەنگەوە بەڕەنگێک کە هەردوو تاکەی بەرامبەر بوەستن. وەرگرتنی سەنگێک بەوێنەی سەنگێک: لەسەر ئەم حۆقەیە حۆقەیەک (بگرەوە). دروستکردنی هێندێ شت بەتێکەڵکردنی شتی تر لەگەڵیدا: خەنەکە یا دەرمانی چاوەکە (بگرەوە). پێچانی مەرحەمە و شتی تر بە بەر کۆشەوە: هەمیشە لە حەمامدا مەرحەمە بگرەوە. بەڕۆژووبوونەوەی ڕۆژێکی ڕەمەزان لە مانگێکی تردا کە لەکاتی خۆیدا بەڕۆژوو نەبووبێت. گەیشتنی یەکێک بەیەکێکی تر لە کارێکدا و بوون بە هاوڕێی لەو کارەدا: نەریمان لە پۆلی شەشدا سالاری (گرتەوە). لابردنی زین لەسەر پشتی ولاخ: زینەکە لە ئەسپەکە (بگرەوە). پاککردنی هێندێ شت: توێکڵی خەیارەکە (بگرەوە).
گرتمان: گریمان.
گرتەکان: ل. گوێز.
گرخبوون: کەرخبوون.
گرد: تەپە. شتی خڕ. چەند شتێکە کە بەیەکەوە کۆمەڵ بن: قوتابییەکان هەموو (گرد)ن. دەور و قەراغی شت.
گرداڤ: ز. گەرداو و چورتم.
گرداو: د. گێژاو.
گردبوونەوە: کۆبوونەوە.
گردکردنەوە: کۆکردنەوە.
گردوکۆ: کۆکردنەوە.
گرد و کۆشی: کرد و کۆشی.
گردۆڵک: خەرمانێکی کوتراوە کە هەڵدرابێتەوە بەگردی بۆ شەنکردنی. گردۆڵکە.
گردۆڵکە: گردی پچووک لە زەوی.
گردە: جۆرێکە لە بنکی سەلکە. برنجێکە کە سەدری و عەنبەرنەبێ.
گردەبا: د. گێژەڵووکە.
گردەبڕ: شتێکە کە لەسەر باری پانی بەگردی شکابێ یا بڕابێتەوە. جۆرە مشارێکە کە داری هەر لەسەرباری پانی پێ ببڕێتەوە.
گردەپیاو: پیاوی کورتەبالا.
گردەڵ: باگردێن.

گردەڵە: شتی خڕەڵە. خەرمانێکە کە هێشتا گردبێ و نەکرابێ بەتارم. دارێکە وەک باگــــردێن بەڵام ئەم هەردوو ســــەری تاشراوە و ناوەڕاستەکەی لەلەکراوە، حەلێک کە بەرداش بێزار بکرێ دەدرێتە ژێری و تلی پێ دەدرێ ئینجا بەسووکی بەردەکەی سەرەوەی دادەگیرێ. ئەو دارە چوار پاڵووەیە کە جۆلا تەنراوی خۆی لەسەر هەڵدەکات.

گردەنشین: یەکێکە کە لە پێ کەوتبێ.

گردەوبوون: د. گردبوونەوە.

گردەوەبوون: گردبوونەوە.

گردی: هـ. هەموو.

گردیلە: شتی پچووکی خڕ.

گڕ: بلێسەی ئاگر و شەوقی چرا. شتی زبر: ئەم تەختەیە یا ئەم بەردە (گڕ)ە. مەردوومی، دان ڕیچ. دەنگێکە کە ساف نەبێ. دەنگی منداڵێکە کە لە یاری چاوشارکێدا بگاتە سەر شار.

گڕاڵک: قنگەلاشک. ئاگرێکی گڕی خۆشی کەم.

گڕان: سووتاندنی ئاگر و چرا: ئاگرەکە یا چراکە (دەگڕێ).

گڕخواردن: گەڕان و سووڕانەوە.

گڕدان: دەستکەوتنی ئەو کەسانەی کە لە یاری (چاوشارکێ)دا تێ کەوتوون لە ئەندامی ئەو کەسانەی کە تێ نەکەوتوون، کە بەو دەست لێکەوتنە ئینجا ئەوان تێ دەکەون. هاتنەوە سەر شاری ئەو کەسانەی کە لە یاری چاوشارکێدا تێ نەکەوتوون و دەستخستنیان بۆ سەر شارەکە: شێرکۆ شاری (گڕ)دا.

گڕسەندن: گڕگرتن.

گڕک: با. جۆرە دەستارێکی سووکەڵەیە کرەی پێ دەکرێ.

گڕکە: کاڵەکی پچکۆلە. کەچەڵی ئاژاڵ.

گــڕکــە زەوی: د. زەمــــینێکی بەرزی ڕووتەنە، کــە هیــچی لێ نەڕوابێ.

گڕگازۆڵە: گیای کەڵەوێ.

گــڕگــرتن: بەرزبوونەوەی گــڕ لە شــتی ســووتاو. بریتــیـــە لە سووربوونەوە و تووڕەبوونی یەکێک.

گڕگڕ: جۆرە پاقلەیەکە (د). دووبارە مێوانەکان ئەمڕۆ ڕۆیشتن، ئێواری گڕگڕ هاتنەوە سەرم.

گڕگران: د. ئاگربازی.

گڕگە: دەردێکە تووشی پشتی مەڕ دەبێ و کرێشی لێ دەنیشێ.

گڕناڵ: شتی زبری دڕ.

گڕناڵ گڕناڵ: شتی زۆر دڕی چاڵ چاڵ.

گڕنای: هـ. سووتان. کڵپەی ئاگر.

گڕنی: شتی زبر.

گڕۆ: ز. مەردوومی گەڕ.

گــڕ و پف: گــڕێکی خــۆشــە کــە زوو دابمرێتــەوە. بریتــیـــە لە پەیدابوونی شـــتـــێک و نەمـــانی بە دەســــتــــوبردی دەوڵەمەندییەکەی (گڕ و پف)ێک بوو، واتە زوو بەسەرچوو.

گڕۆز: منداڵی گرینۆکی ڕقگر.

گڕۆزی: گرینۆکی و بێ خەوی.

گڕ و ڤڕ: گڕ و پف.

گڕ و ڤڕ: با. شتی خڕی گرد (مدور).

گڕۆک: منداڵێکە کە زۆر بگری. کەژ (د).

گڕ و کف: گڕ و پف.

گڕوگاڵ: ورتەورتی منداڵی ساوا لە پێش زبان گرتنیدا.

گڕۆسک: با. هەرمێ کێویلە.

گڕۆل: د. گوڕۆڵە.

گڕوو: ورک گرتنی منداڵ. گڕوێ. دەموچاو ئاولاوی.

گڕووسک: با. گڕۆسک.

گڕوێ: گیانداری گەڕ، (گڕوێبوون) گەڕبوون.

گڕوێیی: گەڕۆلی.

گڕە: هالاوی گەرما. جۆرە دەنگێکی ناقۆلایە لە (کرە) قەبەترە.

گڕەگڕ: گڕەی یەک لەدوای یەک .

گڕەپێچە: تەندوورێکی داخراوە کە گڕ و کڵپەی دانەمردبێ.

گڕیان: د. سووتان و شەوق دانەوە.

گڕی: زبری. ڕیچی دان. قەبەیی و ناخۆشی دەنگ.

گرژ: گیانداری مۆن. کرژ.

گــرژبوون: دڵ تەنگبــوونی یەکــێک بەجــۆرێک کــە چرچی بکەوێتــە ناوچەوانی. کرژبوون.

گرژهەڵاتن: چوونەیەکی هێندێ شت.

گرژی: مۆنی.

گرژینەوە: زەردەخەنە.

گرس: گەورە (با). شتی سفتی پتەو (د).

گرسان: گیرسان.

گرسانەوە: گیرسانەوە.

گرسک: با. گرۆسک.

گرسیاک: د. گیرساو.

گرسیان: د. گیرسان.

گرسیانەوە: د. گیرسانەوە.

گرش: ز. نیرگەی خانوو.

گرشە: پێخوێی گێرەنەکراو لە خەرمان. ورشە، (گرشە گرش) ورشە ورش.

گــرفت: نەخــۆشــیــیــەکــە پەیا دەبێ لە زۆرمــانەوەی خــواردن لەناو ڕیخۆڵەدا.

گرفتار: کەسێکە دووچاری ناخۆشییەک بووبێ.

گرفتاری: دووچاری بەناخۆشییەکەوە، (گرفتاربوون) دووچار بوون، گرفتار کردن: دووچارکردن بەناخۆشییەکەوە.
گرفنچک: گرێ کوێرەی ڕیس.
گرفە: دەنگی بڵێسەی ئاگر. گرفەگرف: گرفەی یەک لەدوای یەک.
گرک: هێز و تەوانایی دڵ: (گرک)ی دڵم نییە. گونک (ز). ئاشی کرە (ز).
گرگن: مەردوومی پچووکی ورگن .
گرگنە: گرگن.
گرماندن: گرمەکردن.
گرمانن: گرماندن.
گرمژنە: چەند زیپەکەیەکی پچووکە لە ئەندام پەیدا دەبێ لە گەرماوە.
گرمژە: گرمژنە.
گرمۆتە: د. گرمۆڵە
گرمۆڵە: شتی پێچراوەی خڕ هەڵدراو، (گرمۆڵەبوون) پێچ خواردن و تۆپەڵەبوونی شت، گرمۆڵەکردن پێچاندن و تۆپەڵەکردنی شت.
گرمووله: مووره سەنگ.
گرمە: دەنگی گەورە وەک دەنگی هەور، (گرمەگرم) گرمەی یەک لە دوای یەک، (گرم و هووڕ) گرمەگرمی زۆر.
گرمەژنە: گرمژنە.
گرنج: شتی چرچ و لۆچی زبر، گرنج گرنج: شتی زۆر گرنجاوی.
گرنگ: شتی زۆر مەبەست.
گرنگی: بوونی شت بەگرنگ.
گرنۆر: ز. شتی زبر.
گرواندن: گورروون.
گرۆبوون: د. هۆگربوون.
گرۆز: ز. گرنۆر.
گر و فڕ: با. شتی خڕ.
گرۆڤەر: ز. شتی خڕ. کێری جغزێن.
گرۆڵی: هـ. گوللە.
گرووڤ: ز. قانگڵەیەک لە ڕێسراو.
گرووک: د. کەژێکە کە وەک ئاوریشم وایە.
گروون: گورروون.
گروێس: گوریس. ناوی دێیەکە لە ئالان.
گرە: د. گرێ. گوێرووی بەرداش.
گرهان: ز. گیرانی کونی شت.
گرەو: بڕیار و پەیمان بەستنی دوو کەس یا دوو دەستەیە لەسەر شتێک کە هەر لایەک بە جۆرێک قسەی لێ بکات بەم ڕەنگە قسەی هەر لایەکیان دەرچوو لاکەی تر بیدۆڕێنێ.
گرەوای: هـ. گریان.
گرەوبردنەوە: سەرکەوتن لە گرەودا. بریتییە لە سەرکەوتنی یەکێک لە کارێکی گرنگدا.
گرەوکردن: بەستنی پەیمان و بڕیاری چەند کەسێک لەسەر شتێک.
گرێ: جۆرە پێچێکە دەکەوێتە بەن و دەزوو شتی ترەوە بەڕەنگێک کە دەبێ بەنینۆک بکرێتەوە. قۆرتێکە لە قەد داردا: ئەم دارە (گرێ گرێ)یە. قۆرتی ئەندام، قۆرتی گەز کە شانزە یەکە.
گریان: هەنسک هەڵدان و هاتنە خوارەوەی فرمێسک لە چاو لە خەفەتێکەوە .
گرێچک: با. گرێی پەنجە.
گرێچن: چنینی شتێک بەگرێ تێهەڵدانی.
گرێدار: شتی گرێ گرێ.
گرێدان: قایمکردنی شت بەگرێ تێهەڵدانی.
گرێدران: گرێدان.
گرێدراو: شتێکە کە گرێ درابێ.
گرێیدراو: شتێکە کە گرێ درابێ.
گرێژەنە: پێچکەیەکە بەلاشیپانی دەرگاوە دەبرێتە سەر و ژێری دەرگا و پێی بەند دەبێ.
گریشمە: تەماشاکردن بەکلایی چاو لەگەڵ ناز و عیشوەدا.
گرێ کۆرە: د. گرێ کوێرە.
گرێ کوێرە: گرێیەکە کە زۆر بەگران بکرێتەوە.
گریۆ: گرەو.
گری: د. گریان.
گرێیاوی: شتی گرێ گرێ.
گریک: هێز و تەوانایی: ئەو ڕۆنە هیچ (گریک)ی نییە.
گریمان: وتەیەکە لە گفتوگۆدا بەکاردێنرێ لە باتی وتەی (گیرەم)، (گریمان) ئەم کارە وابێ واتە گیرەم وابێ.
گریمانە: گرێ.
گرین: گریان.
گرینۆک: کەسێکە کە زۆر زوو بگری.
گز: گزی. خولیا و ئارەزووی شت: فیسارکەس (گز) قومارە، واتە ئارەزووی قوماری زۆرە (د).
گزگچار: د. گەزیچار.
گزرە: گیای درواوەی وشک بۆ خواردنی ئاژاڵ. داری سووتەنی وشک.
گرک: گەسک.
گزگ: گەسک: پووشێکە کە گەسکی لێ دروست دەکرێ.
گزگچە: د. دەفەی جۆلایی.
گزگدان: د. گەسکدان.
گزگزە: گیایەکی گەڵا باریکی وردە لە هاویندا بنج دەکا و لە پایزدا دادەپاچرێ بۆ سووتاندن و، بۆنی خۆشە. شووشە.

گـزگل: جـۆرێکە لە بەری مـازوودار لە هەمـوو بەرەکـانی تری گەورەترە.
گزگلاگە: ئێسقانێکی خڕە لە پشت کرکراگەی گوێوە.
گزموولە: جۆرە هەڵماتێکە لە قوڕ دروست دەکرێ.
گـزنگ: تیـشکی ڕۆژە لە بەیانیـاندا کـە یەکـەم جـار دەدا لە شوێنێکی بەرز .
گزنگدان: هەتاوکەوتن لەسەر شوێنێک یەکەم جار لە بەیانیاندا.
گزنی: بوختان و گیچەڵ.
گزوفت: زۆر ئارەزووکردنی شتێک و تامەزرۆبوون بۆی: گزوفتی بۆ دەدا.
گزە: گزی.
گزەر: د. گێزەر.
گزەگز: کوڕووزانەوەی منداڵی ساوا.
گزەوون: گزیکەر.
گزینک: ل. بیلبیلەی چاو.
گزینگ: گزنگ.
گزی: فێڵ و چا و وڕاو. گەسک (هـ).
گزیچار: د. گەزی چار.
گزیر: کەسێکە کە کاروباری دێیەک ببینێ.
گزیرانە: مووچەیەکە دەدرێ بەگزیر.
گزیکەر: کەسێکە کە فێڵ بکا.
گژ: وتەیەکە دەوترێ بۆ بانگکردنی کەڵەگا بۆ سەر مانگا. شتی گیڤ: مووی (گژ)ە. تووڕەیی: فیسار کەس زۆر بە(گژ) ە.
گژاچوون: د. بەگژاچوون.
گژاندن: ئاژاوەنانەوە.
گژڤامۆک: ز. مووی هۆنراوە.
گژک: با. تەرزەی دەنگ پچووک.
گژ کردن: د. گڤبوون.
گژکە: چەمۆڵە.
گژلووک: با. گژک.
گژن: د. شتی گیڤ.
گژنەسەرە: سەرقژن.
گژنیژ: گیـایەکـە بەرێکی تاڵی هەیە زۆرتر لەناو گـەنمدا دەڕوێ. جـۆرە مـووروویەکی خـڕی گـرنج گـرنجـە. بەری درەخـتـێکی گەرمیانییە وەک زیرە .
گژنیژە: شتێکە وەک مووروو لە زێڕ یا لە زیو یا لە زەرد دروست دەکرێ و ژنان لەگەڵ مووروی تردا دەیهـۆننەوە. پیرخەنیلە. گژنیژ. کاردە پەلە (د).
گژۆژ: مەردوومی چەپەڵی کوڵکن.
گژوگیا: لەوەڕ.

گـژە: دەنگێکە وەک دەنکی ڕەشـەبا، گـژەگـژ: گـژەی یەک لەدوای یەک. شتێکە کە هەڵکفابێ وەک ماستی ترشاو (د).
گژیان: د. گژبوون.
گس: د. کس.
گسک: گەسک.
گسکدان: پاککردنەوەی شوێنێک بەگەسک.
گسکدەر: کەسێکە کە هەر پیشەی گسکدان بێ.
گشت: هەموو.
گشتک: .با. گونکی هەویر.
گـشـتـەک: کـشـتـەک (با) بەن یا دەزووی بادراوی دوعـا بەسەرداخوێنراو.
گشتی: شتی تێکڕایی (عمومی).
گشک: گژک: (با). چنگ. چەمۆڵە.
گشکە: گژکە.
کغنی: د. کێچەڵ و تەشقەڵە
گغفە: گغە.
گـغـە: وتەیەکـە منداڵی شیـرەخـۆرە لەکـاتی ئازار پێگەیشـتندا دەیلێ.
گفت: بەڵێن.
گفتار: د. گوفتار.
گفتدان: بەڵێندان.
گفتوگۆ: قسەکردن لەگەڵ یەکێکدا.
گفتە: د. قسەی وتراو.
گڤ: شتی کرژ و لوول.
گڤاشتن: با. وشین.
گڤاندە: با. کەناری زەوی.
گڤر: ز. نێرە پشیلە.
گڤڤە: دەنگی شتێکە کە زۆر بەتیژی تێپەڕێ.
گـڤگـڤـە: د. فـرفـرۆکـەیەکـە منداڵان کـشـتـەکـێکی تێ دەخـەن و بەهەردوو دەست دەیخولێننەوە.
گڤە: گڤڤە، (گڤە گڤ) گڤەی یەک لەدوای یەک.
گل: ژانی چاو: چاوم (گل) دەکا. یارییەکە بەتۆپ دەکرێ. جار: ئیمڕۆ دوو (گل) هاتمە لات. جووڵە: لە (گل)کەوت، واتە لە جووڵە کەوت. ناوی تیرەیەکە لە کورد لە ناوچەی کەرکووک.
گڵ: خاک.
گڵ ئاهەک: قوڕ و قسڵ.
گلادە: ل. گەلاحە.
گلار: بۆڵی ترێی هەڵوەریو.
گلاراو: ماخۆلان.
گلارکۆ: گەلاکوتک (هـ). جلشۆرک.

گلاره: ز. مووری دار.
گلاڤێژ: با. ئەستێرەی گەلاوێژ.
گـلالە: د. شـتی گـەلالەبوو، گـلالەبوون: گـەلالەبوون، (گلالەکردن) گەلالەکردن.
گـلان: لەسەر ولاخ کەوتنە خوارەوە. یارییەکە شتی تێدا تلۆر دەکرێتەوە (د).
گـلاندن: بریتییە لە دووچارکردنی یەکێک بەزیانێکی گەورە. بریتییە لە خواردنی شت بەهەڵپە: فیسار کەس هەر تیکە (دەگلێنێ). خستنە خوارەوە و تلدانی شت،
گلاو: کەسێکە لە ولاخ کەوتبێتە خوارەوە.
گلاو: شتێکە کە بەتەڕی لە بەراز یا سەگ کەوتبێ، (گلاوبوون) کەوتنی شت لە بەراز یا لە سەگ بە تەڕی. بریتییە لە شتی زۆر پیسی خراپ: فیسار کەس زۆر (گلاو)ە.
گلاوکردن: شۆردنی شتی گلاو بە قوڕاو.
گلاوگل: د. تلاوتل: بەردەکە گلاوگل هاتە خوارێ.
گلاوی: بوونی شت بەگلاو. گلاوی دەرکردن: گلاوکردن.
گڵ ئەرمەنی: گڵە ئەرمەنی.
گلبوونەوە: تلۆربوونەوە.
گڵپە: کڵپە، (گڵپە گڵپ) کڵپە کڵپ.
گلخواردن: د. گلخواردنەوە.
گلخواردنەوە: مانەوەی یەکێک لە شوێنێک.
کـلـخۆرکە: کرمێکی سووری درێژی بێ قاچە لە خاکی پیسدا پەیدا دەبێ و، خۆراکی هەر خاکە.
گلدانەوە: هێشتنەوەی شتێک لای خۆت.
گڵفەرک: چوار خشتەکی بنقۆڵی کراس.
گلک: قاپۆڕی گەنمەشامی کە دەنکی تێدا نەمابێ. گیایەکە وەک پیشۆک بەڵام گەڵا و سەڵکی لەو پانترە.
گڵکار: وەستای دیواری گڵ (د).
گڵکاری: د. دروستکردنی دیوار لە گڵ. قوڕەکاری.
گلکردن: هاتنە ئێش و ئازاری چاو .
گڵکەند: گڵنجان.
گڵکۆ: گۆڕ.
گڵگیر: شتێکە وەک قەڵبیر، بەڵام ئەم شاشترە، گڵمتکی ناو دانەوێڵەی پێ دەگیرێ.
گڵمت: گڵمتک. کولۆیەک شەکر.
گڵمتک: کولۆی گڵ.
گڵنجان: شوێنێکە کە گڵی لێ هەڵکەنرابێ.
گلۆ: ز. بۆچی؟
گڵواز: جۆرێکە لە مازوو.
گلوان: جۆرێکە لە بەری دارمازوو.

گـڵـوان: ئەسپۆن. جۆرە بەرێکی قژقژاوی دارمازووە کە لە مازوو گەورەترە.
گلۆت: کولۆ.
گل و خول: د. گەرد و خول و چەرخەدان بەدەوری شتێکدا.
گلۆر: ز. جۆرە مارمارۆکەیەکە وەک بازن.
گلۆربوونەوە: تلبوونەوەی شت سەر بەرەوخوار.
گلۆک: گـولـۆڵـەی ڕێسـراو (ز). شـتـێکە کـە زۆر بکەوێ و گل ببێتەوە.
گل و گوێز: د. جێگۆڕکێ.
گلۆل: ز. زیزانە.
گلۆڵە: گولۆڵە.
گلۆلی: ز. شتی خڕی تل بووەوە.
گلوول: با. دۆکەشک.
گلوەڕ: گوڕۆڵەی کراس.
گلوێز: هـ. تف.
گلویی: هـ. قوڕگ.
گلە: گلەیی. ناوی جۆگەیەکە لە ئاوی تانجەڕۆ برنجی چاکی لێ دەبێ. ناوی دێیەکە لە مەریوان.
گڵە ئەرمەنی: جۆرە گڵێکی سووری وردە لەگەڵ سمڵ و زاخدا تێکەڵ دەکرێ و دەدرێ لە دەم و ددان.
گڵەبان: گڵڕێژی سەربان بەئەستووری لەسەرزەلەوە بەئەندازەیەک کە لە زستاندا دڵۆپە نەکا.
گڵەبەرانە: جۆرە گڵێکی سووری سەختی ڕەقە دەکرێتە ئاو، گۆزە و دیزەی پێ ڕەنگ دەکرێ.
گڵەجانێ: د. گڵەنجان.
گڵەخۆرکە: د. گڵخۆرکە.
گڵەدۆشاو: جۆرە گڵێکی تایبەتی زەردباوە، دەکرێتە شیلەی ترێ و وەک هەوێن. بۆ ئەوەی دۆشاوەکە نەترشێ.
گڵـەسپی: جـۆرە گـڵـێکی سپی وردە، وەک سپـیـاو دەدرێ لە ئەندامی منداڵی ساوا، بۆ ئەوەی کە نەسووتێتەوە.
گڵەسەر: جۆرە گڵێکی فێنکی نەرمی بۆرە لە حەمامدا دەدرێ لە ســەری بریندار یا لە ســەرێک کــە مــووی ئاڵـۆسکابێ تا بەئاسانی دابێ.
گـڵـەکـوێربیت: وتەیەکـە لە کـاتی باسی مـردوویەکی زۆر خۆشەویستدا دەوترێ.
گلە لێکراو: ئەو کەسەیە کە گلەیی لێ کرابێ.
گڵەمارە: جۆرە گڵێکی بێ هێزی بێ پێزە.
گلەمەن: د. گلەمەند.
گڵەمەند: کەسێکە گلەیی ببێ لە یەکێک.
گڵەنجان: گڵنجان.

گلەودان: د. گلدانەوە.
گلەیی: باسی ناڕەزایی و داگیری یەکێک لە یەکێک لای خۆی یا لە پاشملە. (گلەیی کردن) گلەکردن لە یەکێک.
گلیار: ز. گوڵنار.
گلیان: د. گلان.
گلێجە: چاڵایی ناوەندی سک و ئێسقانی سنگ.
گلێخە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک گەڵای سریش وایە بنکێکی هەیە لە پیشۆک دەچێ.
گلێر: کۆمەڵ: ئاژاڵەکە (گلێر)ە. تەرزە.
گلێران: د. یاری کردن بەگلکردنەوەی شتێک.
گلێربوونەوە: گلۆربوونەوە. کۆبوونەوە.
گلێرکردنەوە: تلکردنەوە. کۆکردنەوەی شت.
گلێرەوبوون: د. گردبوونەوە.
گلێم: گلیم. شاڵینە (ھ).
گلێنجان: گلەنجان.
گلێنە: شتێکی خڕی تویێ توێیە لەناو کالانەی چاودا کە بیبیلەی تێدایە. کزن.
گلێنە: کۆچەڵەی قوڕینی سوورەوەکراو.
گلیش: شارای خەلە و خەرمان.
گلی: ز. گلەیی.
گلیزە: با. چلوورە.
گلیم: بەڕەی باریکی درێژکۆلەی تەنک.
گلێن: شتێکە لە گڵ دروست کرابێ.
گلێنە: گلێن.
گم: ون، (گمبوون) ونبوون، (گمکردن) ونکردن.
گمانن: د. خوێندن و ناڵەناڵکردنی کۆتر.
گمە: ناڵەی کۆتر، (گمەگم) ناڵەناڵی کۆتر.
گمەگم کردن: گڕ و گاڵکردنی منداڵ.
گمێز: میز.
گمێزدان: میزڵدان.
گمێزن: مەردوومی میزن.
گمێزە چۆڕتکێ: د. میزەچووڕکێ.
گن: مەردوومی منگن، (گنەگن) گنەی یەک لە دوای یەک.
گنجی: ز. کەمێڵ.
گنخ: بۆخنک.
گندۆر: کاڵەک.
گندۆڕ: گوندووڕ. گوندۆرە.
گندۆرە: کاڵەکی پچووک.
گندۆش: شووژن.
گندوورە: د. گندۆرە.
کنگنۆک: مەردوومی منگن.
گنۆڕ: گیای گوندووڕ.
گنۆیی: ز. قۆڕی و گەدەوولی.
گنێخە: گیانداری مل ئەستوور.
گۆ: شتێکی گردی لووسی خڕە لە شووشە یا لە دار. گۆپکە (د).
هێز و تەوانایی: دەستم لە (گۆ) چووە واتە لە سەرماندا هێزی نەماوە. خڕی سەری مەمک.
گوارە: جۆرە خشڵێکە ژنان دەیکەنە گوێیان.
گواستن: هەڵگۆزین.
گواستنەوە: گوێزانەوەی شتێک لە شوێنێک بۆ شوێنێکی تر.
گواسن: د. گووراسن.
گواندێن: دەوروبەری گووانی ئاژاڵ.
گوایا: گوایە.
گوایە: وتەیەکە دەچێتە سەر وتارێک کە بەڕاستی نەزانیت: دێوبەند نوشتەیە کە بەهەر کەسێک بێ (گوایە) دێوزیانی پێ ناگەیەنێ واتە دێو هەر نییە تا زیانی پێ بگەیەنێ.
گۆبازی: یاری شەقێن.
گۆبردنەوە: بریتییە لە سەرکەوتنی یەکێک لە کارێکدا.
گۆبەن: د. گۆبەند.
گۆبەند: هەرا و هوریا و دەنگەدەنگ .
گۆبەنگ: گوبەند.
گوپ: د. گووپ. کوڵم.
گۆپار: د. کۆپارە.
گۆپارە: د. گۆپار.
گۆپاڵ: گورزی سەرخڕ. گۆچان (با). گۆپار (د).
گوپچڕگوپچڕ: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتی ڕزگاری لە تەنگ و چەڵەمەیەکدا: بە(گوپچڕ گوپچڕ) ڕزگارم بوو.
گۆپکە: چرۆیەکی وردی خڕە درەخت لەپێش گەڵاکردندا دەری دەکا. دارێکە دەخرێتە کونی ئەستێڵەوە.
گۆپیتە: گۆپکەی درەخت. ناوی دێیەکە لە ناحیەی سەرچنار.
گۆت: گیاندارێکە ئەندامی جەمام بوو بێ. گوژم و تەکان.
گۆتاڵ: گۆتاوەڕوو. وتەیەکە زۆر جار لەدوای وتەی (گا)وە بەکاردێنرێ، ئەو حەلە مەعنای ئاژاڵ دەبەخشێ: (گاو گۆتاڵ) واتە ئاژاڵ. شتی پیسی خراپ (د).
گۆتاوەڕۆ: گۆبەند و تەشقەڵە.
گۆتبوون: جەمامبوونی جەستە بەهۆی ماندوویێتییەوە.
گۆتدان: گوژمدان و گۆتوەشاندن .
گۆترە: کڕین و فرۆتنی شت لە بڕ بەبێ کێشان و پێوان و ژمارە.
گۆترەکاری: کڕین و فرۆتنی شت بەگۆترە.
گوتل: ز. کۆمەڵ لە هەموو شتێک .

گوتن: گفتوگۆکردن. گۆرانی وتن.
گۆتن: گوتن.
گۆتوەشاندن: گۆتدان لەشت.
گوتە: وتە.
گۆج: گیانداری قاچ و دەست گیر. گیانداری کۆڵ.
گوجوولە: گوجیلە.
گۆجی: د. گووجوو.
گوجیلە: توتکە سەگ.
گۆچان: داردەستی ڕاستی قەف چەماوە.
گوچک: پچووک. گوێ (با).
گـۆچکردن: د. مـەڵاشـوو هەڵدانەوەی منداڵ بەشـیـرینیـیـەوە. گۆشکردن.
گۆچەوەن: هـ. سووژن.
گۆخڵ: کەسێکە مەرەزە بهێنێتە بەرهەم بۆ خاوەنی.
گۆخلانە: مووچەیەکە دەدرێ بەگۆخڵ.
گۆد: کەسێکە ئەندامی گۆت بووبێ. گۆج.
گۆداڵ: د. چاڵ.
گودلە: مووی درێژی پێشەسەر.
گودە: د. کولووی لۆکە.
گور: ز. گورگ.
گۆر: گۆڕ. گوێرەکە.
گـۆران: ناوە بۆ هۆزێکی کـورد کـە لە (داڵەهو) دادەنیـشێ. دێ نشین. مەردوومی پەست (ز).
گوراندن: ز. گورروون.
گۆرانی: وتاری هەڵبەستراوی ڕێک خراوە کە بەئاوازەوە بووترێ.
گۆرانیبێژ: کەسێکە کە گۆرانی باش بڵێ.
گۆرانیچڕ: گۆرانیبێژ.
گۆرانی وتن: وتنی گۆرانی.
گوربز: د. چالاک.
گوربزە: بووژاوە: بەرخەکە گوربزەبووە واتە هاتووە بەخۆیدا.
گورپ: د. مەردوومی مات و کزۆڵە.
گورپە: خورپە، (گورپەگورپ) پەلەپەلکردنی دڵ. پشـیلەی نێری قەڵەو. شتی زل (ز).
گـورج: گـیـانداری چالاکی بەدەسـتوبرد. شتی کـورت: کەواکـەت (گـورج)ە، (گـورجـبـوونەوە) کـورتبـوونەوە، (گـورجکردنەوە) کورتکردنەوە.
گورجوگۆڵ: گیانداری چالاکی بەدەستوبرد.
گورجەوبوون: د. گورجبوونەوە.
گورجی: بریتییە لە ئافرەتی زۆر جوان. گورجوگۆڵی.
گورچک: گورچیلە.
گورچوو: گورچک.
گورچوڤیلە: د. گورچیلە.
گورچەوێڵە: گورچیلە.
گورچەویلە: گورچیلە.
گورچیلک: گورچەویلە.
گورچیلە: دوو پارچە گۆشتی سووری گردە لەناو سکی گیانداردا بەلای ڕاست و چەپێوە.
گـورد: پاڵـەوان. دارێکە لە کـەمـەری تەوندا دادەنرێ. گـورج. شتـێکە وەک (دانە)ی جـۆڵا بەڵام ئەم لە بەن دروست کراوە، هەودای ڕایەڵی پێدا دەڕوا و، لە کـاتی جـۆلاییـدا بەرز و نزم دەبێتەوە بۆ تێهەڵکێشی و تەنین.
گـوردگرتن: بەشـبـردن لە شت بەئـازایی: هەرچی ببـینێ (گـورد)ی خۆی لێ دەگرێ.
گوردە: منداڵی ژنت کە لە تۆ نەبێ.
گوڕ: هێز و تەوژم.
گـۆڕ: چاڵێکە کـە مردووی تێدا بنێژرێ. شـوێنێکی تەختـایی و پانە کە نزمتر بێ لە هەر چوار لای خۆی .
گۆڕان: تێکچوون.
گۆڕانەوە: د. گۆڕینەوە.
گوڕبەستنەوە: هاتنە دواوە بۆ هەڵمەتدان و چوونە پێشەوە بەگوڕ.
گۆڕ بەگۆڕبوون: وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ بەمردووی خراپ.
گۆڕخانە: گۆڕستان.
گۆڕستان: شوێنێکە مردووی زۆری تێدا نێژرابێ.
گورکە: ئاگردانێکە کە لە دیواردا نەبێ.
گۆڕکەنکە: د. کەمتیار. گۆڕهەڵکەنە. کفن دز.
گورگرتنەوە: هێز پەیداکردنەوە و بەخۆداهاتنەوەی گیاندار.
گۆڕگومبوون: بریتییە لە ونبوون و نەمانی ناوونیشانی یەکێک: فیسار کەس (گۆڕی گوم)ە.
گوڕنەتەڵە: شـتـێکی خـەیاڵـییـە، مـەردوومی زیتـەڵە و بزێوی پێ دەشوبهێنرێ.
گوڕۆز: گرۆز.
گوڕۆزی: گرۆزی.
گوڕۆڵە: پارچەیەکی پچووکە دەکەوێتە بن دەستی کراسەوە.
گوڕە: دەنگێکە لە ڕۆینی هێندێ شتەوە بەتیژی پەیدا دەبێ وەک ڕەشەبا و دەنگی بەردی قۆچەقانی و ئاوی زۆر، (گوڕەگوڕ) گـوڕەی یەک لەدوای یەک. خـوڕین بەسـەر یەکـێکدا: ئەم (گوڕەگوڕەت) لە چییە؟
گۆڕەپان: با. مەیدانێکی گەورە لە زەوی.
گوڕەشە: هەڕەشە.

گوڕەگوڕ: پەلەپەل.
گۆڕەوان: زێدەوان.
گۆڕەوشار: هاتنەوەی گۆڕ لە مردوو.
گۆڕەوکەنە: گۆڕهەڵکەنە.
گۆڕ هەڵئاخنین: بریتییە لە جنێودانی زۆر بەگۆڕی یەکێک.
کۆژرهەڵبەستن: هەڵبەستنی گۆڕ بەبەرد یا بەخشتی سوور.
گۆڕهەڵکەن: کەسێکە کە گۆڕ هەڵ بکەنێ بۆ مردوو.
گۆڕهەڵکەنە: دەعبایەکی کێوی ڕەشە لە پشیلە پچووکترە، گۆڕی مردوو هەڵ دەداتەوە بۆ خواردنی جەستەی.
گوریاگ: د. گۆڕراو.
گۆڕیان: گۆڕان.
گۆڕی: گەڕی. گڕی ئاگر (با).
گۆڕیچە: جۆگەلەیەکە ئەملا و ئەولای بەبەرد هەڵچنرابێ و تەختە پۆش کرابێ.
گۆڕین: تێکدانی شتێک بەشتێکی تر: ئیمڕۆ تا نیوەڕۆ خۆش بوو کەچی لە پاشا (گۆڕی). تەبدیلی شتێک بەشتێکی تر.
گۆڕینەوە: دانی شتێک و وەرگرتنی شتێکی تر لە جێی.
گورز: پەتێکی ئەستوورە کە سەرێکی خڕو گرێ درابێ. گورزەیەک لە پووش یا لە گەڵا (ز).
گورزان: د. یاریکردن بەگورز.
گورزک: گورزەی پچووک.
گورزە: دەستەیەک لە شتێکی بەستراو، وەک قامیش و زەل.
گورزەکوێرە: جۆرە یارییەکە بەگورز دەکرێ.
گورزەهۆن: جۆرە هۆنینەوەیەکە کە دەبێ چوار لیسپ بێ و، هۆنراوەکە چوارگۆشە بوەستێ.
گورزی بن مێخ: یارییەکە مێخێک دادەکوترێ و پەتێکی پێوە دەبەسترێ و یەکێک سەری دەگرێ و دەسووڕێتەوە، ئەوانی تر بەگورز لێی دەدەن، ئەمیش دەستی بەر هەر کامیان کەوت لە جێی ئەم تێ دەکەوێ.
گورزی ژێر بەرێ: د. جۆرە یارییەکە لەژێر بەڕەدا دەکرێ.
گورگ: دەعبایەکی بەزیانە بەقەد سەگێک دەبێ مێملی مەڕ و ئاژاڵە.
گورگان خواردوو: بریتییە لە کەسێک کە لەلایەن یەکێکی ترەوە بەفێڵ دووچاری چورتمێک کرابێ: (بەگورگان خواردن)ی دا.
گورگانە شەوێ: جۆرە گۆرانییەکە منداڵی پێ دەکرێتە خەو.
گورگکوژە: گیایەکی گەڵاپانی بکوژە لەگەڵ گۆشتی کاڵدا دەکوترێ و دادەنرێ بۆ گورگ و دەعبای تر کە بیکوژێ.
گورگ نەخۆرە: سپل. بریتییە لە پیرێژنێکی ناشرین کە کەس تەمەعی تێ نەکا.
گورگ و تاو: فڕان فڕان: کە دیم (گورگ و تاو) بوو، واتە فڕان بوو بەجێم هێشت.

گورگە: دارێکی درێژە لەسەر دیوار بەروکاری دەرەوەدا دادەنرێ و گەڵاو خیزەرە و زەلی لەسەر دادەنرێ و گڵەبان دەکرێ. گیاکەڵە. گیانداری قوشقی. فێڵباز (د). مرۆر.
گورگە بوون: قوشقی و تاربوونی گیاندار.
گورگەپشت: د. شتی قۆقز.
گورگەخەو: جۆرە خەوێکی سووکە کە خەوتووەکە گوێی لە قسە و گفتوگۆبێ.
گورگەزێ: کاتێکە کە هەتاو بێ و بارانیش بباریێ.
گورگەشەوێ: د. گورگانە شەوێ.
گورگەلۆق: د. گورگە لۆقە.
گورگەلۆقە: هەڕاکردن بەهەنگاوی کورت بەخێرایی.
گورگەلوور: لووراندن وەک گورگ.
گورگەمزە: گۆزروان.
گورگەمێش: سەگێکە کە لە تۆوی گۆڵەگورگ و دێڵەسەگ پەیدا بووبێ. یەکێکە زمانی خۆش بێ و دڵی ناپاک بێ (د).
گورگی باران دیدە: بریتییە لە مەردوومی فێڵبازی دنیا دیدە.
گورگی داودیدە: د. گورگی باران دیدە.
گورگیلە: کەندووی پچووک.
گورمزین: با. بزە و زەردەخەنە.
گورۆ: هۆگر، (گۆرۆبوون) هۆگربوون. گرەو.
گۆروا: د. گۆرەوی.
گۆروابازی: د. گۆرەوی بازی.
گۆرواچن: د. گۆرەوی چن. جۆرە باڵندەیەکە.
گورۆ گورۆ: شتێکە کە بزڕ بزڕ و گرێ گرێ وەستابێ وەک ڕۆن.
گوروون: پێست گرتنەوەی گیاندار.
گورویێس: گوریس.
گورە: با. گۆرەوی.
گۆرە: گۆرەوی (ز). گەورە.
گۆرەکە: گوێرەکە.
گۆرەوا: د. گۆرەوی.
گۆرەوی: شتێکی چنراوە لە بەن یا دەزوو دەکرێتە پێ.
گۆرەوی بازی: جۆرە یارییەکە شتێک لەناو یەکێک لە دە گۆرەویدا دەشاردرێتەوە، هەر کەس بیدۆزێتەوە دەیباتەوە.
گۆرەویلە: جۆرە چۆلەکەیەکی پچووکە هێلانەکەی وەک گۆرەوی دەتەنێ.
گورێ: ز. وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ جیابوونەوەی ئاژاڵی چەند ماڵێک کە تێکەڵ بووبن.
گورێختە: چەوری ناوسک و سەر و پێی ئاژاڵ.
گوریز: لادان لە شتێک یا شوێنێک: فیسار کەس بە(گوریز)ە.
گوریزکردن: لادان لە شت.

گوریس: گوریس.
گوریس کێشەکێ: گوریس کێشەکێ.
گوریە: گۆڕەوی.
گوریس: شتێکی ئەستووری درێژە لە چەند هەودایەکی بەن یا موو دەهۆنرێتەوە و باری پێ شەتەک دەدرێ.
گوریس کێشەکێ: یارییەکی دوو دەستییە، هەر دەستەی سەری گوریسەکە ڕادەکێشن، کامیان دەستەکەی تری ڕاکێشا دەیباتەوە.
گوری کرن: با. خۆبەختکردن لە پێناو شتێکدا.
گورین: گوروون.
گۆرین: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە باتی وتەی (هێ) و (یارۆ).
گۆز: گوێز.
گوزارە: د. مەعنا.
گۆزان: پڕکردنی شتێک لە شتێکی شل: ئەو مەشکەیە بـ(گۆزە). گوێزان.
گۆزان گۆزان: سەر ڕاوەشاندنی منداڵی ساوا لە ڕووی یاری و کەیفەوە.
گۆزانن: هەڵگۆزانی شت. گواستنەوەی شت (د). پاراستن (د). لێدان: هەرکە نەیـ(گۆزێ) خوا بیـ(گۆزێ) واتە هەر کەسێک نەیپارێزێ خوا لێی دا (د).
گۆزاننەوە: د. گواستنەوە.
گۆزانەوە: د. گوێزانەوە.
گۆزاوڵە: د. هەڵتۆقین.
گۆزتن: د. گواستنەوە.
گۆزتنەوە: د. گواستنەوە.
گۆزروان: گیایەکی بەهاری گەڵاپانە، گوڵێکی شینی پچووکی پەڕەدار دەگرێ، جۆش دەدرێ و بۆ کۆکە دەخورێتەوە.
گوزک: با. شەربە.
گۆزک: ز. قۆزاخەی لۆکە.
گۆزکە: کووپەی شین.
گوزگی: ل. ئاوێنە.
گۆزە: دەفرێکی گەورەی گڵێنی دەسکداری سوورەوەکراوە، ئاوی تێ دەکرێ.
گۆزەبانە: گوێزەبانە.
گوزەر: دەربوونەیەکە کە دەربچێ.
گوزەران: ڕابواردن و ژیان بەو ڕۆژییەی کە چنگ دەکەوێ.
گوزەراندن: د. ژیاندنی یەکێک.
گوزەرانکرن: گوزەران.
گوزەرکردن: تێپەڕین بەشوێنێکدا.
گوزەرگا: شوێنی گوزەرکردن .

گۆزەک: ز. پاژنە.
گۆزەگەر: کەسێکە کە هەر گۆزە دروست بکا.
گۆزەڵە: جۆرە گۆزەیەکی دەسکداری پچووکە. گیایەکی کوێستانییە ئاژاڵ بیخوا دەیکوژێ.
گۆزیانەوە: د. گوێزانەوە.
گۆزێڵکە: هەنارێکە کە تازە خڕ بووبێ و هەڵی پێچابێ.
گۆزینگ: قولەپێ.
گۆزین: هەڵگۆزین.
گۆزینەوە: د. گواستنەوە.
گۆژگیرە: د. پشتی پاڵ پێوەدان.
گوژم: تەکان.
گوژمە: گوژم. خورما و کاکڵە گوێز، یا گوێز و مێوژ، یا کونجی و خورمای بەیەکدا کوتراو. ئەندازەیەک لە پارە: ئەمڕۆ فڵان کەس گوژمە پارەیەکی باشی دەست کەوت.
گۆژنە: هـ. دەرخۆنە.
گۆژنەوە: هـ. گڵێنە.
گوساخ: د. گوستاخ.
گوساخی: د. گوستاخی.
گۆسارە: د. گوڵ ئەستێرە.
گۆساڵە: گوێرەکە.
گۆسان: ز. ویزویزە.
گوست: ئەنگوست.
گوستاخ: مەردوومی قسە زانی بێ شەرم. چالاک.
گوستاخی: بێ شەرمی. چالاکی.
گۆستنەوە: د. گواستنەوە.
گۆستێر: ز. گوڵە ئەستێرە.
گوستیل: ز. ئەموستیلە.
گوستیلە: گوستیل.
گۆسک: با. گۆزەڵە. شەربە.
گۆسوانە: گوێسوانە.
گوش: گیایەکە لاسکەکەی بەکوتراوی دەڕێسرێ و دەکرێ بەگونیە.
گوش: گوێ.
گوشاد: شتی فراوانی گەورە.
گوشادی: فراوانی.
گوشان: د. گوشین.
گۆشاوگۆش: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ سەربڕینی گیاندارێک لەم گوێیەوە بۆ ئەو گوێی.
گۆشپاق: قاپێکی تایبەتییە گۆشتی تێ دەکرێ.
گۆشت: شتێکی نەرمی سوورە لەژێر پێست و لەسەر ئێسقانی گیاندارە .

گۆشتاو: چێشتێکە لە گۆشت و ئاو و نۆک دروست دەکرێ.
گۆشت برژە: چەند شیشێکی تێکخراوە گۆشتی لەسەر ئاگر پێ دەبرژێنرێ.
گۆشتپارە: زیادە گۆشتێکە لەسەر هێندێ ئەندام پەیا دەبێ بە هۆی نهێمێکەوە. منداڵی نەبەکامە لە منداڵداندا کە هێشتا گیانی نەکرابێ بە بەردا.
گۆشتپرە: ز. گیاندارێکە کە هێشتا گۆشتپارە بێ لە سکدا.
گۆشتپیس: بریتییە لە کەسێک کە برینی درەنگ چاک ببێتەوە.
گۆشت تاڵ: بریتییە لە مەردوومی ئێسک قورس.
گۆشت تەندووری: گۆشت تەنووری.
گۆشت تەنووری: جۆرە دیزەیەکە گۆشتی تێدا لێ دەنرێ لەناو تەنووردا.
گۆشتخۆر: پەلەور و درندەیەکە کە گۆشت بخوا.
گوشتخۆش: بریتییە لە کەسێک کە برینی زوو چاک ببێتەوە.
گۆشتگا: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
گۆشتگرتن: قەڵەوبوون.
گوشتن: کوشتن: (بیگوژ)ە.
گۆشتن: شتی نەرمی قەڵەو: ئەم مەڕە یا ئەم کاڵەکە (گۆشتن)ە واتە گۆشتی زۆرە، یا ئەم زەوییە (گۆشتن)ە واتە نەدمافە.
گۆشتەزوون: گۆشتەوزوون.
گۆشتەزوونە: گۆشتەوزوون.
گۆشتەزەوی: زەوی نەرمان.
گۆشتەزەوین: د. گۆشتەزەوی.
گۆشتەگیرە: جۆرە نەشەو شنەشنێکە ناوبەناو تووشی منداڵی ساوا دەبێ، گۆشتی پێ دەگرێ.
گۆشتەوزوون: گۆشتێکی ناسکە بەسەر بریندا دێ پاش چاکبوونەوەی: برینەکە گۆشتەوزوونی هێناوەتەوە.
گۆشتی خۆخۆشکردن: بریتییە لە خۆ خۆشەویست کردن.
گۆشتی سەر چەپەر: بریتییە لە شتی کەم نرخی بێ نموود.
گۆشتی قەڵەو: یاری سەبەتە بەسەرێ.
گۆشتی: ز. گۆشتی خوێ کراوی هەڵگیراو بەکاڵی بۆ زستان.
گوشران: قووبووڵکردنی شت بۆ گوشین.
گوشراو: شتێکە گوشرابێ.
گۆشقاپ: دەوری پچووک.
گۆشکردن: یەکەمجار شیردان بەمنداڵی تازەبوو.
گۆشگەڵوو: د. ئاڵوو.
گۆشگیرە: د. گۆژگیرە.
گۆشوارە: د. گۆشەوارە.
گۆشە: قوژبن. پارچەی خشت کە لەسەر سووچ دادەنرێ لە خشت کاریدا. شتێکی سێ سووچە دارتاش و وەستای دیوار بۆ راستی سەر سووچ بەکاری دەهێنن. جۆرە پشتییەکی تەنکە لەسەر سووچی کورسی دانیشتن دادەنرێ. دیزە (هـ).
گۆشەدار: شوێنێکە کە گۆشەی ببێ.
گوشەک: ئاڵوو.
گۆشەگیر: کەسێکە کە تێکەڵی مەردووم نەبێ.
گۆشەگیری: دەست هەڵگرتن لە تێکەڵی مەردووم.
گۆشەنشین: گۆشەگیر.
گۆشەنشینی: گۆشەگیری.
گۆشەوارە: گۆنیا. گۆشەی خشت. گوارە.
گۆشەی چاو: قنگی چاو.
گۆشێ: هـ. کیتەڵە.
گوشیاک: د. گوشراو.
گوشیان: د. گوشران.
گۆشی: د. تەلەفۆن.
گوشین: بادان و وڵێنی شت بەنهێم.
گوفت: گفت.
گوفتار: قسە و گفتوگۆ.
گوفتدان: گفتدان.
گفتوگۆ: قسەکردن.
گوفک: گۆفک.
گۆفک: با. سەرەنوێلک.
گوفەک: با. گۆفک.
گۆڤ: ز. جێ مۆڵگەی ئاژاڵ لە ماڵ یا لە ئەشکەوت.
گۆڤار: چەند پەڕە نووسراوێکی چاپکراوە کە حەفتە و حەفتە یا مانگەومانگ دەربچێ (مجلة).
گۆڤاشتن: ز. گوشینی شت.
گۆڤان: ز. مەیدان و گۆڕەپان.
گۆڤەند: با. گۆبەند. شایی. کۆبوونەوە بۆ کارێکی گرنگ.
گۆڤیشک: ز. جۆرە خواردەمەنییەکی شیرینە هەڵدەشێلرێ و خڕ هەڵ دەدرێ و دەخورێ.
گۆک: د. گوپیتە.
گۆگجە: هەڵووژە زەردە.
گۆگرد: شتێکی زەردی ترشە لەکان دەردەهێنرێ و بەکاری گەلێ شت دێ.
گوگوختی: جۆرە کۆترێکی گەرمیانی دەنگخۆشە.
گۆگەم: گیایەکی کوێستانی بەرزە گوڵێکی زەرد دەردەکات.
گول: کەسێکە کە تووشی نەخۆشی گولی بووبێ. گیاندارێکە کە جەستەی پچووک بێ. شتی تام ناخۆش: چاشتەکە (گولەنە) هـ. ناشیرین (هـ). گوڵ (با).
گوڵ: شتێکی جوانی پەڕەدارە هێندێ سەوزایی دەری دەکا و، گەلێ ڕەنگی هەیە. وتەیەکە دەوترێ لە یاری گۆرەوی بازیدا لەکاتێکدا کە دەست بخەیتە سەر پشکەکە.

گۆل: چاڵێکە کە ئاوی تێدا وەستابێ.
گـۆڵ: گـەمـاڵ. وتـەیەکـە لەگـەڵ وتەی (گـورج)دا بەکـاردێنرێ: (گورجوگۆڵ).
گولاڤ: ز. گوڵاو.
گوڵاڵە: گـوڵێکی سـووری بەهاری لاسک سـەوزی درێژە ناوەکەی خاڵێکی ڕەشی تێدایە.
گوڵاڵەسوورکە: گوڵاڵە.
گوڵاڵەسوورە: گوڵاڵە.
گولان: با. مانگی مایس کە سی و یەک ڕۆژە.
گوڵان: گولان. ناوی چوار دێیە لە ناوچەی سرۆچک و هەڵەبجە و وارماوا و شاورایەتی لە ڕانیە.
گولانە: شتی پچووک: قارچکە (گولانە).
گوڵاو: ئارەقی گوڵەباخ.
گۆلاو: گۆل.
گوڵاوپاش: گوڵاو پرژێن.
گوڵاوپرژێن: گوڵاوپژێن.
گـوڵاوپژێن: شـتـێکی قنگ خـڕی مل باریکە چەند کـونێـک لە دەمەکەیایەتی گوڵاوی پێ دەپرژێنرێ لە مەردووم.
گوڵاودان: گوڵاوپژێن.
گوڵاو گرتن: ئارەقگرتنی گوڵ.
گوڵاوەتوون: سیمێکی زەردی ڕێسراوە ژنان گوڵی لێ دەچنن.
گـوڵبـاران: پەخـشـانکردنی گـوڵ بەسـەر یەکـێکدا لەبەر خۆشەویستی.
گوڵبانوو: جۆرە مـێشێکی چزووداره، هێلانە لە بنمیچ و کون و قوژبندا دەکا.
گۆلبڕ: کەسێکە کە گۆل بۆ مەرەزە ببڕێ.
گۆلبڕین: هەڵبەستنی گۆلی مەرەزە.
گـوڵبـەدەم: ترۆزی و خـەیاری زۆر ناسک کـە هێشـتـا گـوڵەکـەی نەوەریبێ.
گوڵبێنە: کونێکە لە بنکی تەنوورەوە دەردەکرێ بۆ باکێشان .
گوڵچن: د. بریتییە لە هەڵبژاردنی شت.
گوڵچیسک: با. گورچیلە.
گوڵخار: جۆرە ڕەنگێکە.
گـوڵخـونچـە: گـوڵێکە کـەمێ دەمی دابێـتـەوە بەڕەنگێـک کـە لە ناوەندی گوڵ و خونچەدابێ.
گوڵخەندەران: جۆرە گوڵێکی جوانە .
گوڵدار: شتی گوڵ گوڵی.
گوڵدان: شووشەیەکی جوانە دەسکە گوڵی تێ دەخرێ. ئینجانەی گوڵ. کیتەڵەی میز (د).
گوڵڕووت: گوڵە رووتە.

گوڵزار: شوێنێکە کە گوڵی زۆری تێدابێ.
گولستان: باخێکە کە گوڵی زۆری تێدابێ.
گوڵستان: گولستان.
گوڵشەن: د. گوڵزار.
گۆلک: گوێرەکە.
گوڵکار: د. باخەوانی گوڵ.
گوڵکردن: پەیدابوونی گوڵ لە سەوزی. خشـتبـوونی گەنم و جۆ و مەرەزە.
گۆلکڤان: با. گۆلکەوان.
گۆلکەوان: شوانی گۆلک.
گوڵکاوزوان: د. گوڵێکی بەهارییە لە زبانی گا دەچێ.
گوڵگرتن: پەیدابوونی گوڵ لە سەوزی.
گوڵگوڵاو: د. گوڵەباخێکە کە گوڵاوی لێ دەگیرێ.
گوڵگوڵی: شتێکە کە وێنەی گوڵی زۆری تێدابێ.
گوڵگوون: گوڵگوڵی.
گوڵگەز: جۆرە ڕەنگێکە.
گوڵگەزی: د. ڕەنگی سووری تاریک.
گوللە: پارچە قوڕقوشم یا مسێکی خڕە بەسەر فیشەکەوە.
گوللەباران: دەستڕێژکردن لە شتێک بە گوللە.
گـوللەبەند: نوشـتـەیەکـە بەهەر کـەسـێک بێ دەڵـێن گـوایا گـوللە نایبڕێ.
گوللە پژێن: شەستتیر.
گوللەی وێڵ: گوللەیەکە بەبێ نیشان بڕوا.
گۆلم: لەوێچ.
گوڵمە: پارچە گۆشتی پتەو.
گۆڵە: قولەگیای گەورە.
گۆڵمەز: گۆپەنگ.
گوڵمێخ: بزمارێکی درێژی ئەستووری سەرپانە.
گوڵمێـخەک: د. گوڵێکە زۆر جۆری هەیە و بۆنی لە بۆنی مێخەک دەچێ.
گوڵنار: جۆرێکە لە گوڵی هەنار بەڵام ئەم خڕی هەڵنادا و تێکەڵی دەرمـانی دەم و هێندێ دەرمـانی تر دەکـرێ و، پێی دەڵـێن (گوڵناری فارسی).
گوڵنگ: گوڵەنگ. گوڵنگە .
گوڵنگ بڕین: بریتییە لە هەڵخەڵەتاندن و دەستبڕینی یەکێک.
گوڵنگە: شتێکی لیپ لیپە لە ئاوریشم یا لە کەژ دروست دەکرێ و، بەهێندێ شتدا دەگیرێ بۆ جوانی.
گوڵنم: پرژاندنی ئاو لە شتێک گوڵ گوڵ: ئەو زەوییە، یا ئەو نانە گوڵنم بکە.
گوڵۆ: گوڵبێنەی تەنوور.

گوڵواخن: تۆپەوانەیەکە گوڵبێنەی تەنووری پێ دەئاخنرێ.
گوڵۆپە: د. کڵپەی ئاگر.
گولوپیسی بەهار: خاکەلێوە .
گولۆربوونەوە: تلۆربوونەوە.
گولۆرکردنەوە: تلۆرکردنەوە.
گولۆفتن: وڵینی چاو بەدەست.
گوڵۆڵە: هەودای هەڵکراوی خڕ لە بەن یا لە دەزوو.
گوڵۆڵەبوون: بریتییە لە کرژبوونی جەستە لەبەر ئازارێک.
گلۆڵەکردن: بریتییە لە کرژکردنی جەستەی گیاندارێک بەئازار پێ گەیاندنی. هەڵکردنی هەودا و کردنی بەگوڵۆڵە.
گوڵۆڵەکەوتنە لێژی: بریتییە لە دووچاربوون بەمەینەت.
گوڵۆنە: د. گوڵبێنە.
گوڵووک: گوڵی بەرزەدرەختێکە کە لە پێش گەڵاکردنیدا پەیدا دەبێ و لە پاشا دەوەرێ و دەبێ بەبەر. شاگوڵ.
گوڵووکە فەقێیانە: ڕیحانە کێویلە.
گولوول: با. چێشتی دۆکەشک.
گوڵوێنک: ملوانکەی ملی گوێرەکە و کار و بەرخ.
گوڵوێنە: گوڵبێنە.
گۆڵە: گرمەی هەور (گۆڵەگۆڵ) گرمەگرم.
گوڵەئەستێرە: جۆرە دەعبایەکی باڵداری پچووکە گرێکی ڕووناکی سەوز بەقنگەکەیەوەیەتی.
گوڵەباخ: گوڵێکی گەورەی سووری بۆن خۆشی بەهارییە ئارەقی دەگیرێ.
گوڵەبەبەشە: جۆرە گوڵێکە.
گوڵەبەڕۆژە: گیایەکی باڵابەرزی لاسک ئەستوورە، گوڵێکی پانی گەورە دەگرێ هەمیشە رووی لە ڕۆژە، تۆوەکەی وەک دەنکە کوولەکە بەسوێرکراوی و برژاوی دەخورێ.
گوڵەبەڕۆنە: جۆرە گوڵێکی زەردی بۆن خۆشە.
گوڵەپرووزە: قەرەخەرمان.
گوڵەپێغەمبەرە: گیایەکیماڵییە، گوڵێکی درێژ دەگرێ، بە چوار دەوری گوڵەکەدا شتێکی خڕ دەردەدا، وەک نۆک بەفەریکی دەخورێ و، بەوشکی دەهاڕدرێ و دەکرێ بە نان.
گۆڵەتاجی: نێرەتانجی.
گۆڵەچاوێشە: د. گوڵە بابوونە .
گـوڵەداس: چەند دڕکـێکە لەســەر زبانی گـا پەیدا دەبێ، وەک پووڵەکەی ماسی دەبێ بتاشرێ.
گوڵەدۆمە: گوڵێکی زەردی زلە پەڕەکانی درێژکۆلەیە.
گـوڵەڕۆنینە: گـوڵێکی بەهاری زەردە، گـەڵای لە گـەڵای جـاترە کێویلە دەچێ.
گوڵەرووتە: گوڵەگەنمێکە کە پژی نەبێ.
گوڵەزەرد: گوڵەزەردە.
گوڵەزەردە: جۆرە گـوڵێکی زەردی بەهاری گەڵا شاشی بۆن خۆشە وەک گوڵەباخ وایە دەکرێ بەحەڵوا .
گوڵەژەن: جۆرە دارێکە شتی ڕێسراوی لەسەر دەکرێ بەگلۆڵە.
گوڵەسەگانە: د. دلیق.
گولەش: ز. زۆرانبازی.
گوڵە شلێرە: گوڵێکی سوورە لەسەر گۆڕی خۆشەویست دەڕوێنرێ.
گولەفەقێ: گوڵەبەیبوونە.
گوڵەک: پەڵەگیایەکە کە هەمووی گوڵی کردبێ.
گوڵەکابە: گەنمەشامی.
گۆڵەگرێ: هـ. ئاردەتوو.
گۆڵەگۆل: د. خاوەخاو.
گۆلەکە: گوێرەکە.
گوڵەگەنم: گوڵێکی پژپژە دانەی گەنمی تێدایە.
گـوڵەنگ: دوگـمــەیەکـە لەناو زێی ولاخی بەوزەدا پەیدا دەبێ و نایەڵێ ئاوس بێ. گوڵنگە.
گوڵەنگ برین: گوڵنگ برین.
گوڵەنگە: گوڵنگە.
گوڵە نیسان: گولاڵە سوورە.
گوڵەواژ: گـیایەکی ئاوی هاوینییە گەڵا و لقی وەک لاولاو وایە، بەڵام ئەم ئەوەندە بەرز نـابێـتـەوە، پۆرگـێکی سـوور دەگـرێ، دەنکێکی سووری تێدایە .
گوڵەوەچینی: چنینەوەی گوڵەگەنم و جۆ دوای دروونەوەیان.
گوڵ هەناری فـارسی: گـوڵێکە وەک گـوڵی هەنار بەڵام ئەم گەورە ترە و پەڕەی زۆرترە و، دارەکـــەشی وەک داری هەنـار وایە، بەهارڕاوەیی لەگەڵ سمڵ و زاخدا دەکرێ بەدەرمانی پووک.
گولێر: با. سیچکە.
گوڵی گـاوزبان: گـوڵێکی مۆرە وەک وەنەوشە، وەک چا لێ دەنرێ و دەخورێتەوە بۆ گورچیلە زۆر باشە.
گولێن: زل. زاوزێ کردن: مەڕەکـان (گولێن) دەکەن، واتە زاوزێ دەکەن.
گوڵێنە: گوڵبێنە.
گـولی: دەردێکی پیـســە تـووشی هەر کـەسـێک بـبێ ئەندامی دادەوەشێنێ. گوڵی گەنم و جۆ و برنج و شتی تر (با).
گوم: شتی ون، (گومبوون) ونبوون، (گومکردن) ونکردن.
گۆم: گۆلی قووڵ.
گومان: شک.
گومانبار: کەسێکە گومانی تاوانێکی برابێتێ (متهم).
گومانباری: بوونی مەردووم بەگومانبار (إتهام).
گومانبردن: شکچوون بۆ شتێک .

گومانن: د. خوێندن و ناڵە ناڵکردنی کۆتر.
گومانە: دواهەمین بیری کارێزە کە دووسێ پەلی لێ دەبێتەوە.
گۆماو: گۆلاوی قووڵ.
گومبوون: بێ سەر و شوێن و نادیاربوونی شت.
گومبەز: گومەز.
گومپ: ز. روومەتی قەڵەوی جوان.
گـومـڕا: کـەسـێکە کـە ڕێی ڕاسـتی خـوای لێ تێکچـووبێ،
گومڕابوون: تێکچوونی ڕێی خوایی لە یەکێک، (گومڕاکردن) تێکدانی ڕێی ڕاستی خوایی لە یەکێک.
گومڕایی: ڕێی ڕاستی خوایی ونکردن.
گومرگ: د. گوومرگ.
گومرکچی: کاربەدەستی گوومرک .
گومرگخانە: د. شوێنێکە کە گومرگی تێدا دەسێنرێ.
گومرە: ز. مەردوومی دەوڵەمەندی دەست ڕۆیو.
گومریک: گومرگ.
گومکردن: بێ سەر و شوێنکردن و لەدەستدانی شت.
کومگمۆکە: قومقمۆکە.
گومگوم: ز. گومگومە.
گومگومـە: شـتێکە وەک جەزوەی قـاوە بەڵام ئەم گەلێ گەورەترە گوڵاوی پێ دەگیرێ و، بەکاری گەلێ شتی تر دێ.
گوملەتە: د. گۆترە.
گومە: گمە، (گومە گوم) گمەگم. ناوی دێیەکە لەوبەر سیروان .
گومەت: گومەز.
گومەتە: قەڵەم بازدی ئاسک و مەڕەکێوی.
گومەتەدان: قەڵەمبازبردنی ئاسک و مەڕەکێوی.
گومەد: گومەز.
گومەز: کۆشکێکە بنمیچەکەی بەقۆقزی هاتبێتەوە.
گومەزە: د. بڵقی سەر ئاو .
گومەزی: شتێکە وەک گومەز قۆقز و قیت بێ.
گۆمەڵ: گۆبەند.
گۆمەڵتە: د. شتی کۆمەڵبوو.
گۆمەلیقە: دەرمانێکە دەدرێ لە داری کورسی و دەرگا و پەنجەرە بۆ جوانی.
گـون: دوو هێلکەی خڕە لە توورەکـەیەکی گـۆشـتـیندا بەناو لنگی گیانداری نێرینەوە. گوند.
گونا: د. گوناح.
گۆنا: کولم.
گونابار: د. گوناحبار.
گوناح: وتن یا کردنی شتی خراپ.
گوناحبار: کەسێکە کە گوناح بکات.
گوناحکار: گوناحبار.
گوناکار: د. گوناحکار.
گۆناگۆن: شتی ڕەنگاوڕەنگی هەمەجۆر.
گوناه: گوناح.
گوناهبار: گوناحبار.
گوناهکار: گوناحکار.
گونتک: گونک.
گونتولە: جۆرە ترێیەکی سپی دەنک و هێشوو درێژە.
گـونج: لوولەیەکی گـەورەی قـوڕینی سـوورەوەکـراوە لەژێر زەویدا ئاوی پێـدا دەبرێ. گـونجـێکی دارینی پچـووکـە دەبرێتـە شاگونجی ئاشەوە.
گونجان: بوونی شت بەڕەنگێکی وا کە بوون و نەبوونی وەک یەک وابێ، واتە نەبوونی پێـویست بێ وەک (خـوا)و نە نەبـوونی پێـویست بێ وەک شـتی مـەحـاڵ. دەسـتـدان و بەکـارهاتنی شـتێک بۆ شـتێکی تر: ئەم بەردە بۆ ئەو شـوێنە (دەگـونجێ) واتە دەست دەدا و بەکار دێ.
گـونجـایش: ژیانی ڕێکوپێک، هەر لە نەبووندا بەکـاردێنرێ: ئەو ژنە گونجایشی نییە لەگەڵ مێردەکەیدا، واتە لە گەڵیدا ناژی، یا ئەو شوێنە جێی گونجایش نییە، واتە ناژیم لەناویدا.
گونجکاری: ڕاکێشانی گونج بەژێر زەویدا بۆ ئاو پێدابردنی.
گونجە: زەمبوورەی ئاش.
گونجەنە: هـ. بەندەخوێن.
گونجین: گونجان.
گونچڕ: د. پارچەیەکی پچووک لە شتێک.
گوند: دێ.
گوندک: گونک.
گوندۆر: گوندۆرە.
گوندۆرە: کاڵەکی پچووک.
گندووڕ: گیـایەکی بەهاری کوێستـانییە گەڵای وەک گەڵای قەزوان وایە، نێـرکێکی بەرزی بۆش دەردەکا و دەخورێ و، گـوڵێکی زەرد دەگرێ.
گووندووش: سووژن.
گوندە: نووسراوی ڕێکی گرد و گۆڵ. مەردوومی خڕوپڕ.
گـوندەڵبـەست: هەڵبـەسـتنەوە و سـاغـکردنەوەی دیواری ڕزیوی داڕووخاو بەگەچ یا بەقوڕ.
گوندەڵە: کفـتـە. توورەکەیەکی پچکۆلانـەیە لە چەرم، شـتـومـەکی ڕاوی تێ دەخرێ.
گوندێنە: گونگێنە.
گوندی: با. لادێیی.
گونشەیتان: د. قورسی کەمەر.

گونک: هەویری خڕ هەڵدراو بۆ کردنەوەی بە نان. قۆڕ.
گونک ژمێر: بریتییە لە یەکێک کە لەناو ماڵ و منداڵیدا ڕژد و چرووک بێ و، لە شت زۆر بپرسێتەوە.
گونک گرتن: خڕهەڵدانی هەویر بۆکردنەوەی بە نان.
گونکە: جۆرە ترێیەکی دەنک گەورەی مۆرە.
گۆنگەر: گۆبەند.
گونگێنە: ترێتێکە کە بووبێ بەهەویر.
گونۆڕ: گیای گوندووڕ.
گونۆش: سووژن.
گونۆڵە: د. گوڵۆڵە.
گونووش: ل. سووژن.
گۆنە: گۆنا. جۆر و تەحر.
گونەتوولە: جۆرە هەڵووژەیەکی زەردی دەنک درێژی شیرینە.
گونەسوورە: تەماتە.
گونەسەگانە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک گەڵای (عەمرۆکە) وایە، نێرکێکی دووفاق دەردەکا، گوڵێکی زەردی هەیە، بەنی پێ ڕەنگ دەکرێ.
گونە کەڵەباب: گیایەکی بەهاری جیرە پەلکەکانی وەکو گوێ بەرخە وایە، لە پایزاندا بنکەکەی گوڵێکی سپی بێ گەڵا دەردەکا پێی دەڵێن گوڵە جووتیارە.
گونە کەڵەشێرە: گونەسەگانە.
گونەڵ: د. گونەڵە.
گونەڵان: د. دوومەڵان.
گونەڵبەست: گوندەڵبەست.
گونەڵە: کفتە.
گونەوێڵە: قەبارەی گون بەخۆی و چەرم و کیسەیەوە.
گونێ: گوناح.
گۆنیا: دارێکی دووپەلی سووچدارە ڕاستی و چەوتی گۆشەی دیواری پێ تاقی دەکرێتەوە.
گۆنێنە: چێشتی دۆینەی خەست. گوندێنە.
گەنیە: دەفرێکی تەنراوە لە گوش دروست دەکرێ.
گۆنی: د. گەوون.
گوو: پیسی هێندێ گیاندار.
گۆو: با. گوو.
گووار: گۆڤار. بەچکەی کەو (ه).
گواڵە: د. گونیە.
گووان: پارچە گۆشتێکە لەناو لنگی هێندێ گیانداری مێینەدا، شیری لێ دێ. ئازارێکە دەگا بەجەستە بەهۆی زۆر دەستە پێداهێنان و هەڵگوڵۆفتنیەوە: ئەوەندە دەستیان بەشانغدا هێناوە هەموو شانم (گوواوە).
گواندێن: ناوگەڵی ئاژاڵی خاوەن گووان.
گوواو: ئاوێکە لەگەڵ گوودا تێکەڵ بووبێ.
گوواوی: بریتییە لە شتی زۆر پیسی خراپ.
گووبۆق: د. قەوزە.
گوو بەخۆداکردن: ڕیان و خۆپیسکردنی مەردووم لە خۆیەوە.
گووپ: چەرمی ئەملا و ئەولای دەم کە بەسەر دەم و دداندا هاتووە.
گووپن: کەسێکە لەبەر قەڵەوی گووپی هەڵئاوسا بێ.
گووپنە: گووپن.
گووتێکردن: بریتییە لە تێکدانی کارێک.
گووجوو: د. بەخە.
گووجی: ه. گووجوو.
گووخلێنکە: دەعبایەکە لە قالۆنچە دەچێ، شیاکە خڕ هەڵ دەدا.
گووخواردن: بریتییە لە قسەی ناشیرین کردن، لە ڕووی سووکییەوە دەوترێ.
گوودروون: گووروونی.
گۆودەڵەکە: جۆرە خشڵێکە ژنان دەیدەن لە قەراغی سوخمە، زرەی دێ و دەلەرێتەوە.
گوور: ل. گوێرەکە.
گووران: گیرسان: نەمامەکە گووراوە، واتە ڕوواوە، یا منداڵەکە لە سکی دایکیدا گووراوە، واتە گیرساوە (تکون).
گووراسن: خڵتەی ئاسن کە لەناو کوورەی ئاسنگەرەوە دای دەداتە ژێرەوە.
گووروونی: پارچەیەکی ئاوریشمی جوانی گوڵ سورمەیە، ژنان دەیکەن بە کاڵا.
گوورە: با. گۆرەوی.
گووری: کەسێکە کە سەری لە پێناوی کارێکدا بەخت بکا (ز). قوربان: ئەز (گووری) واتە بەقوربان: (با). گری ئاگر (با).
گووز: گوێز.
گووزان: گوێزان.
گووزەک: با. قولەپێ.
گووژاڵک: جۆرێکە لە کاڵەکە مارانە، بەرێکی تاڵ دەگرێ وەک شووتی کۆڵە.
گووژە: د. عەنزەرووت.
گووسک: با. شەربە.
گووشان: د. گوشین.
گووشانن: د. گووشان.
گووشت: ل. گۆشت.
گووفک: با. سەرەنوێلک.

گووکردن: ڕیانی گیاندار.
گـووگـرە: دارێکی سێ پەلە وەک پلوسک دەتەنرێ و لەکـاتی گێرەدا دەدرێتە ژێر کلکی گاگیرە لە حەلی شیاکەکردنیدا.
گوومرگ: شوێنێکی دەوڵەتییە باجی کوتاڵ و شتومەکێکی تێدا دەسێنرێ کە لە دەوڵەتێکی ترەوە هاتبێ. باجی دەوڵەتی کە لە شتومەکی دەوڵەتێکی تر دەسێنرێ.
گوومرگچی: کاربەدەستی گومرگ.
گـوومـرگ کـردن: سـەندنی باجی کـوتاڵ و شـتـومـەکـێک کـە لە دەوڵەوتێکی ترەوە هاتبێ.
گوومەت: گوومەز.
گوومەتە: گومەتە.
گوومەتەدان: گومەتەدان.
گوومەز: گومەز.
گوونیی: گونیە.
گۆوەند: گویەند. شایی و زەماوەند.
گووینە: د. منداڵی پیسی چەپەڵ.
گوە: با. گوێ.
گۆە: گوێ (با). گۆێکە (د).
گوهار: ز. گوارە.
گوهارتن: با. گۆڕین.
گوهارک: با. گوارە.
گوهاستن: ز. گواستنەوە.
گوهان: ز. گووان.
گوهبەل: ز. جاسووس.
گوهبەلی: ز. جاسووسی و گوێ قوڵاغی.
گوهپێل: ز. سەر و گوێ داتەپیو.
گۆهتن: با. وتن.
گوهتێل: ز. کاتی تێپەربوونی نێرەی حەیوانە کێوی.
گوهدار: ز. مەردوومی گوێڕایەڵی سووکەڵە.
گوهدان: ز. گوێگرتن لە شت.
گوهدێر: ز. گوهدار.
گوهسارە: د. گوڵە ئەستێرە.
گوهشک: ڕەفیسک.
گوهۆڕین: با. گۆڕین.
گوهێر: ز. گوهتێل.
کوهۆڕ: جێگایەکی نزمە لە زەوی کە پاکژی زۆربێ.
گوهەر: ز. گەووڕ.
گوهەراندن: ز. گۆڕینەوەی شت
گوهەرین: ز. گوهەراندن.
گوهیشک: با. گۆێژ.
گوهێژ: ز. گۆێژ.
گوێ: دووپارچە گۆشتە بەلای ڕاست و چەپی سەری گیاندارەوە، کونێکی تێدایە دەنگی پێ دەبیەت.
گۆیا: گوایە. مەردوومی قسەڕەوان.
گوێبرە: پشقل و پەین و ڕیخێکە کە دەکرێتە ناو زەوی بۆ ئەوەی بەهێز بێ (سماد).
گوێبەرخە: گیایەکی بەهاری خۆشە گەڵاکەی لە گوێی بەرخ دەچێ.
گوێ بەگـوێ: شـان بەشـان: گـوێ بەگـوێ دەڕوا لەگـەڵ کـەر پێی دەڵێ: نعم الرفیق.
گوێ بەل: بزنی گوێ لوولی قوت.
گوێ بیست: کەسێکە کە گوێ هەڵخا بۆ جوست و جۆی قسە.
گوێ تەقێ: گوێ هەڵخسن بۆ قسە.
گویچ: ه. گۆێژ.
گوێچک: گوێ.
گوێچگە: گوێ. قۆچکە (د).
گـوێچکە پچـڕکێ: جـۆرە یـاریـیـەکـە منداڵ دەیکەن بەم ڕەنگە گـوێچکەی یەکی تـێدا ڕادەکـێـشن (د). پچـڕینی قـەراغ و بیـجـاغی نـان و هێندێ شـتی تر: بەس بەنانەکـە (گـوێچکە پچڕکێ) بکە.
گوێچکە پڕوچکێ: پەلەپڕووسکێ.
گوێچکە پڕووسقێ: د. گوێچکە پچڕکێ. یارییەکە هێندێ مێوژ یا خورما دادەنێن لەناو چەند کەسێکدا، هەر کەسێک دەستی بۆ بەرێ یەکێک گوێی دەگرێ تا نەتوانێ بیبا.
گوێچکە تەقێ: د. گوێ تەقێ.
گوێچکە تەکانن: د. گوێ شلکردن بۆ قسەیەک و وەرگرتنی.
گوێچکە خەفانن: د. بێدەنگبوون لە شتێک.
گوێچکەدان: د. گوێدان.
گوێچکە زرنگیان: د. گوێ زرنگانەوە.
گوێچکە شلکردن: د. گوێ شلکردن.
گوێچکەگرتن: د. گوێگرتن.
گوێچکەماسی: جۆرە سەدەفێکی خاڵداری بۆشی جوانە کاغەزی پی دەسووڕێتەوە.
گـوێچکە نەلەقـیـان: د. بریتـیـیـە لە گـوێ نەدانی یەکـێک لە کارێک: گوێچکەی لێ نالەقێ.
گوێچەنە: چەرمێکێ خڕە دووخی خەڕەکی پێدا دەکرێ.
گوێدار: گوێدەر.
گوێداری: گوێدانە قسە.
گوێدان: گوێگرتن بۆ قسە.
گوێدرێژ: بریتییە لە کەر.
گوێدەر: کەسێکە کە گوێی لە گفتوگۆیەکەوە بێ.

گوێدێر: گوێدەر.
گوێر: گەێرەکە. ناوی دێیەکە لە ناوچەی مەخموور لە هەولێر.
گوێرایەڵ: مەردوومی ژێری قسە لە گوێ گر.
گوێ ڕایەڵی: ملکەچی و فەرمانبەری.
گـوێ ڕەپە: دەردێکە دووچاری کـەر دەبێ و گـوێی ڕەپ دەکـا و دەیکوژێ.
گوێرمە: گوێرەما.
گوێروو: کونی بەردی سەرەوەی دەسـتاڕ و بەرداش کە دانی پێدا دەچێتە خوارەوە
گوێرەکە: ساوای یەکساڵانەی مانگا.
گوێرەکە سوورە: خاڵخاڵۆکە.
گوێرەما: تێبەردانی گوێرەکەیە لە دایکی بۆ ئەوەی کە شیـرەکەی دابدا بۆ دۆشین.
گوێرەمێژ: بەردانی گوێرەکەیە بۆ مژینی دایکی چەند جارێ لەسەر یەک بۆ ئەوە نا کە شیـر بخوا، بەڵکو بۆ ئەوەی کە شیـرەکە بدا بۆ دۆشین.
گـوێرەوسـار: پەتێکە بەسـتـراوە بەسنگێکەوە گـوێرەکـەی پێ دەبەسترێتەوە.
گوێز: بەری درەختـێکی بەرزی گـەڵاپانی بۆن خۆشـە توێکڵـێکی ڕەقی هەیە، ناوکێکی چەوری خۆشی تێدایە.
گوێزان: تیغێکی زۆر تیژە مووی پێ دەتاشرێ.
گوێزانەوە: گواستنەوە.
گوێزبەلە: تەڕلە.
گوێزر: کۆزەری دەغڵودان.
گـــوێ زرنگـانەوە: زرنگانەوەیەکـــە ناو بەناو لە خــۆیەوە لە گوێچکەدا پەیدا دەبێت.
گوێ زرینگانەوە: گوێ زرنگانەوە.
گوێزلک: قولەپێ.
گوێزنگ: قولەپێ.
گوێزوو: کلاوەی لەمپا.
گوێزەبانە: گوێز و مێوژ و خواردەمەنییـەکـە لە شـەوارەی کوردا دەخورێ.
گوێزەڕەش: درەختی پەڵک.
گـوێزەنێـرگـەلە: شـتـێکی پچکۆلەی قـوتی خڕە لەناو شـووشـەی نێرگەلەدا بۆ جوانی.
گوێزەڵان: شوێنێکە کە داری گوێزی زۆری تێدابێ.
گوێزەوان: گوێزەبانە.
گـۆی زەوی: ئەم ئەسـتـێرەیەیە کە وەک گـۆ خڕە و ئێـمەی لەسـەر دەژین.
گوێزین: واغێن.
گوێزی ناو بێژنگ: بریـتـییە لە کەسێک کە بەناچاری هەر دەمەی لە شوێنێک بێ.
گـوێزی ناو دەغـیـلە: جـۆرە گـوێزێکی زۆر پچکۆلەیە بۆ جـوانی دەیخەنە ناو دەغـیلەوە. بریتییە لە مەردوومی پچکۆلەی زیت و زرنگ.
گوێزی: جۆرە ڕەنگێکە لە ڕەنگی دارگوێز دەچێ.
گۆێژ: بەرێکی خڕی زەرد و سووری مزرە ناوکێکی ڕەقی هەیە، لە پایزاندا لە درەختێکی کێوی پەیا دەبێ. داری گۆێژ.
گوێسوانە: ڕیزە گورگە و زەڵێکە کە نرابێ لە دیوار.
گوێ سووک: کەسێکە کە گوێی زۆر سووک بێ.
گوێسەبانە: گوێسوانە.
گوێ شلکردن: بریتییە لە گوێگرتن.
گوێ شۆڕ: د. مەردوومی سادە.
گوێ قوڵاخ: کەسێکە کە گوێی هەڵخستبێ، (گوێ قوڵاخبوون) گوێ هەڵخستن.
گوێگر: کەسێکە کە گوێ بۆ قسەیەک شل بکا.
گوێ گران: بریتییە لە مەردوومی کەڕ.
گوێ گرتن: گوێ شلکردن بۆ بیستنی قسەیەک.
گوێل: لەوێچ.
گوێلک: گوێرەکە.
گوێلم: گوێل.
گوێ لەق: د. گوێ شۆڕ.
گوێ لە مست: بریتییە لە یەکێک کە قسەی هەموو کەس بچێ بەگوێچکەیدا.
گوێ لە مشت: گوێ لە مست.
گوێ لێبوون: بیستنی قسەیەک یا دەنگێک.
گـوێ لێ خـەفـاندن: بریـتـییـە لە گـوێ نەدانە شـتـێک و لەبیـر دەرکردنی.
گـوێ مـشکە: گـیـایەکی گـەڵا وردە وەک نیـسک بەڵام ئەم تەرز دەهاوێ و گوڵێکی زەردی ورد دەگرێ.
گوێ مشکەبوون: بریتییە لە تازە گەڵا دەرکردنی درەخت.
گوێ مەمک: گرێی مەمک کە شیری لێ دێتەدەرەوە.
گۆینده: گۆرانیبێژی دەنگ خۆش.
گوێننە: د. گۆیندە.
گوێنوو: گونیە. گەوون.
گوێ نەدان: پشتگوێ خستنی شت.
گوێنی: گیایەکی کوێستانییە کەتیرەی لێ دەگیرێ.
گـوێنیـیـە ڕەشـە: جـۆرێکە لە گـیـای گـوێنی، دەکرێ بە پەرژین و سووتەمەنی.
گویە: ل. گوێ.

گویز: با. گوێز.
گۆین: گوییێن. مەلێکە خوێندنی لە نالێن دەچێت (با).
گۆییێن: شەقێن.
گویێ یێشە: ئازاری گوێ.
گە: جومگە. پیتێکە بەدوای هێندێ وتەوە دەنووسێ دەیکا بەناو بۆ جێگا (اسمی مکان): مۆڵ(گە) جێ(گە) ڕوان(گە).
گەبر: ل. گاوور.
گەبرگە: جۆرە یارییەکی پاڵەوانانەیە کە لە زۆر خانەدا دەکرێ. مەردوومی ورگنی خڕی قەڵەو.
گەبەڵ: ژاژوبێشە.
گەبەڵە: درەخت یا سەوزاییەکە کە دابێتیەیەک، (گەبەڵەبوون) بە یەکادان و چڕبوونی دارودرەخت.
گەپ: گاڵتە، (گەپکردن) گاڵتەکردن. گەورە: فلان کەس پیاوێکی گەپە (ل).
گەپلە: گیایەکە دەخورێ و زوو پیر دەبێ.
گەپە: وەڕەی سەگی پیری بێ ددان. (گەپەگەپ) گەپەی یەک لە دوای یەک.
گەپەک: ز. پارووێەک لە خواردن.
گەپین: وەڕینی سەگی پیری بێ ددان.
گەجەر و گوجەر: بریتییە لە شتی هیچ و پووچ. بریتییە لە مەردوومی هەرچی و پەرچی.
گەچ: جۆرە بەردێکی زۆر سپییە لە دوای سووتاندن و کوتانی سواغی پێ دەدرێ و بەردکاری پێ دەکرێ.
گەچاو: جۆرە ئاوێکی سپی واشە دەچێتە ناو پەردەی چاوەوە و کوێری دەکا و، میلی لێ نادرێ.
گەچکاری: سواغدان بەگەچ.
گەچلان: ژاکان.
گەچلاندن: ژاکاندن.
گەد: ز. قەد و باڵا.
گەدا: مەردوومی هەژاری بێ نەوا.
گەداقۆز: د. هەژارێکە کە خۆی بە دارا بداتە قەڵەم.
گەدایی: هەژاری و بێ نەوایی.
گەدگ: د. گەدە.
گەدگر: وڵاخێکە هەرچەند بۆ پێشەوە لێی خوڕیت ئەو هەر بۆ پاشەوە بگەڕێتەوە.
گەدگن: د. مەردوومی گەدەدار.
گەدگیر: کەسێکە کە ڕق بگرێ.
گەدگین: د. چێشتی سەر و پێ.
گەدە: بۆشایی سک لە ناوک بەرەوخوار.
گەدەبەل: مەردوومی لاسار.
گەدەبەلی: لاساری.
گەدەفشە: جۆرە ماسییەکی لەڕی ورگ زلی پێست تەنکی گۆشت ناخۆشە.
گەدەک: ز. بەچکەی نێری گامێش.
گەدەوڵ: کەسێکە کە قۆڕ بووبێ.
گەدەووڵی: دەردی قۆڕی.
گەر: پیتێکە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بەئیشکەر (فاعل): چەقۆ(گەر) مز(گەر) زەڕ(گەر). ئەگەر: (گەر) دەپرسی من لەبەرچی کەم دەخۆم. گوێرووی دەستاڕ (ه). دیوێکە لە میچ. شوێنی قووڵ لە جۆگەی گەورە (ز).
گەرا: تۆوی هێندێ گیانداره کە دەژێتەوە وەک خۆی گیانداری لێ پەیا دەبێ.
گەراج: شوێنێکی تایبەتییە کە ئوتۆمۆبیلی تێدا دەوەستێ.
گەرا خستن: گەرا دانان.
گەرادان: هێلکەدان.
گەرا دانان: گەرانان.
گەراس: هەڵووژە زەردە.
گەراگەرا وێستان: زۆر بەزۆربوونەوەی سکی ئافرەتی ئاوس.
گەرانان: دانانی گەرا لە لایەن گیاندارێکەوە لە شوێنێکی تایبەتی بۆ ژیانەوەی.
گەرچەک: گیایەکی گەڵاپانی لاسک بۆشە، بەرێکی چەور دەگرێ، ڕۆنەکەی بۆ ڕەوانی دەخورێ.
گەرچی: ئەگەرچی.
گەرد: تۆز. کەم.
گەردان: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ دەستاودەست کردنی شتێک بەزۆری: ئیمرۆ لە بازاڕ شەکر (گەردان) دەکا، واتە ئەم دەیبا و ئەو تەماشا دەکات، تۆز هەستان: ئەسپەکە گەردان دەکا، واتە تۆز هەڵدەستێنێ.
گەردانە: ملوانکەیەکی زێڕینی پلپڵەدارە ژنان دەیکەنە ملیان.
گەرداو: چورتم و تەنگانە.
گەردبین: زەڕەبین.
گەردش: گەڕان و سووڕانەوە. شۆڕش و ئاشووب: فیسار کەس زۆر بە(گەردش)ە.
گەردش نانەوە: ئاشووب هەڵگیرساندن.
گەردن: ملی گیاندار بەڕووکاری پێشەوەیدا.
گەردن ئازاکردن: دەست هەڵگرتن لە مافێکت کە بەسەر یەکێکەوە بێ.
گەردن ئازایی: گەردن ئازاکردنی دووکەس لە یەکتری.
گەردنبەن: د. گەردنبەند.
گەردنبەند: گەردانە.

گەردنکەچ: بریتییە لە مەردوومی فەرمانبەر.
گەردنکەچی: بریتییە لە فەرمانبەری.
گەردنگرتن: بریتییە لە یەخەگرتنی یەکێک. چوونە ملی شتێک بۆ یەکێک: قەرزەکە (گەردنی گرت).
گەردنگیر: شتێکە کە بچێتە گەردنی یەکێکەوە: قەرزەکە (گەردنگیر)م بوو.
گەردنگیری: چوونە گەردنی شتێک بۆ یەکێک.
گەردنلغ: گەردانە.
گەردن لە موو باریکتر: بریتییە لە مەردوومی گەردن کەچ.
گەردن لە موو نەرمتر: گەردن لە موو باریکتر.
گەردنە: د. سەرملە.
گەرد و خول: سوورانەوە بەدەوری ئیشێکدا.
گەرد و گول: کاتێکە کە تازە گزنگ دەکەوێتە سەر شاخە بەرزەکان.
گەردولوول: گەردەلوول.
گەردوون: رۆژگار. ئاسمان.
گەردە: ئاوریشمێکی رەشی خاوە، گولنگەی چەفتە و پۆشینی لێ دروست دەکرێ. خەلوزێکی هاڕراوە یەخەنی پێ دەکێشرێ (د).
گەردەکان: ل. گوێز.
گەردەلوول: گێژەلووکەیەکە کە لوول بخوا و سەرکەوێ.
گەردەمل: ئێسقانی ملی گیاندار.
گەردەن: گەردن.
گەردەنگۆ: ملەگۆ.
گەردەنە: گەردانە.
گەردەنی: ز. گەردانە.
گەردیلە: هەرە وردیلە.
گەڕ: تەشقەلە. گەڕۆڵ. گەڕان: ئاشەکە کەوتە (گەڕ). شوێنێکی تەختە کە لە ناوچەیەکی تەختدابێ. گۆمی گەورە کە ئاوەکەی گێژ بخوا (با). نۆرە (با).
گەڕا: د. گەڕۆک.
گەڕاج: گەراج.
گەڕاجخانە: گەڕاجێکە کە ئوتومۆبیلی زۆری تێدا بوەستێ.
گەڕافک: با. گۆلاو.
گەڕان: هاتوچۆکردنی شت. ترازان و جوولانی هێندێ شت لە جێی خۆی: دیوارەکە یا سکی ژنە ئاوسەکە (گەڕاوە). گۆڕانی شتێک بەشتێکی تر: شەرابەکە (گەڕاوە) بەسرکە.
گەڕاندن: خستنەکاری هێندێ شت. گێڕان.
گەڕانن: د. گەڕاندن.
گەڕانەوە: هاتنەوەت بۆ شوێنێک کە لێی بووبیت. هێدی بوونەوەی مەردووم دوای هەڵەیی و هەرزەیی: نەریمان کە جاران زۆر چەتوون بوو ئێستا باش (گەڕاوەتەوە). بوونەوەی سرکە بە شەراب.
گەڕانی: هەڵپەرکێی رۆینە. وتەی نزاکردن لە یەکێک کە شتێک بخوات یا بخواتەوە واتە بەگیانت خۆش نەبێ.
گەڕاو: شتێکە لە جێی خۆی جوولابێ. جۆرە ئاوێکی بۆگەنی ترشە لە هێندێ شوێن هەڵدەقوڵێ، کەسێک خارشتی بێ دەچێتە ناوی و لێی دەخواتەوە.
گەڕاوە: سرکەیەکە کە بووبێ بە شەراب. بریتییە لە مەردوومی سەرەی تێگەیشتوو.
گەڕک: د. شتی لەڕی لاواز.
گەڕڵ: د. مەردوومی لەڕی لاواز. گەڕۆڵ.
گەڕندە: گەڕۆک.
گەڕۆک: کەسێکە کە زۆر بسوورێتەوە.
گەڕ و گوڕ: فڕ و فێڵ: فیسار کەس زۆر بە(گەڕ و گوڕ)ە.
گەڕ و گێچەڵ: فڕ و فێڵ و تەشقەڵەکردن بەیەکێک.
گەڕۆڵ: گیانداری گەڕ.
گەڕۆڵی: دەردێکی بەئالۆشە تووشی هێندێ گیاندار دەبێ و وشکە برینی کرێشاوی لێ پەیدا دەبێ.
گەڕووس: ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد.
گەڕەپێچ: گەڕەپێچە.
گەڕەپێچە: گێژەلووکە.
گەڕەک: چەند خانوویەکی نزیک لە یەکن لە شارێک یا لە دێیەک.
گەڕەکوێرە: د. شەوکوێری.
گەڕەلاوژە: گۆرانی وتنی کۆمەڵێک بە نۆرە.
گەڕەلاوژێ: گەڕەلاوژە.
گەڕەلاوێژێ: د. گەڕەلاوژە.
گەڕیان: د. گەڕان.
گەڕیانەوە: د. گەڕانەوە.
گەڕی: گەڕۆلی.
گەڕیدە: کەسێکە کە زۆر بگەڕێ.
گەرک: ز. گەسکێکە لە داری گەزی چارکرابێ.
گەرم: شتێکە کە سارد نەبێ.
گەرما: کاتی گەرمی لە رۆژگار.
گەرمابردوو: شتێکە کە گەرما کاری تێ کردبێ.
گەرماپێو: شتێکە پلەی گەرما نیشان دەدا.
گەرماژۆ: د. گەرما بردوو.
گەرماڤ: ز. گەرماو. حەمام.

گەرماگە: گەرماوە.
گەرمانی: شوێنی گەرم.
گەرماو: ئاوێکە لە کاتی سەرمادا گەرم بێ. حەمام.
گەرماوگەرم: شتی گەرمی تازە بەتازە.
گەرماوە: حەمام.
گەرمایی: تینی شتی گەرم.
گەرمبوون: گەرم ڕاهاتنی شت. بریتیە لە تووڕەبوون.
گەرم بوونەوە: تەشق شکانی سەرما لە شتێک.
گەرمچەک: د. مەچەک.
گەرم داهاتن: گەرم ڕاهاتن.
گەرم ڕاهاتن: نەمانی ساردی و پەیابوونی گەرمی لە شتێکدا.
گەرمک: برنجێکە کە لە شوێنێکی گەرم و لەبەر ئاوێکی گەرمدا کرابێ. جێگای گەرمەڵووک. وتوو. گەرمکاو.
گەرمکاو: گەرماو.
گەرمکردن: داخکردنی شت بەئاگر. بریتییە لە قسە زۆر کردنی یەکێک: فلان کەس کۆڕەکەی گەرم کردووە.
گەرم کردنەوە: تەشق شکاندنی شتی ساردەوەبوو بەئاگر.
گەرمڵەین: چێشتی گەنمەکوتاو.
گەرموگوڕ: شتی گەرمی تازە بەتازە.
گەرمووک: کانیاو.
گەرمە: کاتی زۆری شت: ئێستا گەرمەی ترێیە. مەرەزەیەکە کە مانگێک لە پێش هەموو مەرەزەیەکدا پێ بگات.
گەرمە بۆق: د. هەڵم و بۆقی گەرم.
گەرمەبرین: بریتییە لە کەسێک کە تازە بەتازە خەفەتێکی زۆر قورسی تووش بووبێ.
کرمەتەندوور: نانێکی تیرییە کە لەکاتی گڕی تەندووردا بکرێ .
گەرمەخول: د. ئاشێکە کە خێرا بسووڕێتەوە.
گەرمەژنە: گرمژنە.
گەرمەسووت: جۆرە پارچەیەکی ناسکی لووسی هاوینییە لە خۆیدا گوڵ گوڵ و بریسکەدارە.
گەرمەسێر: گەرمیان.
گەمەشین: ماتەمی تێکڕایی. گریانی بەکوڵ.
گەرمەگل: وتەیەکە بەکاردێنرێ وەک ونەی یەک لەسەر یەک: بەقسە (گەرمەگل) دایگرتم.
گەرمەگۆڕ: خواردەمەنییەکە کە لەسەر گۆڕی مردوویەک لە کاتی ناشتنیدا ببەشرێتەوە.
گەرمەڵووک: شوێنی کرمی وشکەڕۆ.
گەرمەوزە: گورزەی گەرمی (الطاقة الحرارية).
گەرمیان: وڵاتی گەرمی کەم بەفر و سەرما.
گەرمیانی: شتێکە کە لە وڵاتی گەرمیان پەیدا ببێ.
گەرمێن: گەرمیان.
گەرمێنی: گەرمیانی.
گەرمی: گەرمایی.
گەرناس: مەردوومی چەتەووڵی لەندەهوور.
گەرناڵ: د. زەنگی گەورە.
گەرنگ: ز. جۆرە گیایەکە.
گەروانکە: جۆرە قوتوویەکی تەنەکەی سەر بەمۆری پڕ لە چای وشکە.
گەروو: قوڕگ. کونی بەرداشە کە دانی پێدا دەچێتە خوارەوە.
گەرووئێشە: قوڕگ ئێشە.
گەروودرێژکردن: بریتییە لە گەزارە کێشان.
گەرووگیر: شتێکە کە گەروو بگرێ.
گەرووهاتن: د. قورگ هاتنەوە یەک.
گەرووهاتنەوە یەک: نەخۆشییەکە تووشی قوڕگ دەبێ، شتی بۆ قووت ناچێ.
گەرەک: پێویست: (گەرەک)مە یا (گەرەک)ە وابێ.
گەرەکناگەرەک: د. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتاری: بتەوێ یا نەتەوێ.
گەرەنگ: دارێکی دوو پەلە دەخرێتە ناو دوو پەلی (دار گەڵ)ێکەوە کە پەلێکی کورتتر بێ لەوی تری بۆ ئەوەی هەردوو پەلەکەی بەقەد یەک بوەستنەوە و گەڵای تا سەر تێدا هەڵچنرێ.
گەری: با. گەروو.
گەز: ئەندازەیەکە کەلوپەلی پێ دەپێورێ. گەزبچار. گەزۆ (د). گاز (با).
گەزارە: زبان.
گەزارە کێشان: بریتییە لە زباندرێژی.
گەزاف: خۆ هەڵکێشان و درۆی زل کردن.
گەزتن: گەستن.
گەزک: با. گەسک.
گەزکردن: پیوانی شت بەگەز.
گەزگەزباڵاکردن: بریتییە لە کەیفخۆشی زۆر.
گەزگەزک: د. گەزگەزۆک.
گەزگەزکە: گەزگەزۆک.
گەزگەزۆک: گیایەکی بەهاری گەڵا زبرە. کە لە ئەندام بکەوێ دەیهێنێتەوە خوروو.
گەزمازگ: د. تۆوی گەزبچار.
گەزندە: گیاندارێکە کە بگەزێ. بریتییە لە مەردوومی بە زیان.
گەزننە: د. گەزندە.
گەزنە: د. گەزگەزک.

گەزۆ: جۆرە شیرینییەکی سپی زۆر خۆشە لە هێندێ شوێن لە ناوەندی بەهار و هاویندا دەنیشێتە سەر گەڵای هێندێ دار و درەخت.
گەزەر: گیایەکی بەهاری باڵابەرزی دووسێ پەلە، گوڵێکی سپی دەگرێ، سەری گیا کە پاک دەکرێ و دەخورێ (ھ). گێزەر (ل).
گەزەک: د. بیانوو.
گەزەندە: ئێش و ئازار.
گەزنە: گیایەکی بەهاری گەڵا پانە، بەناسکی دەخورێ، کە پیر بوو دڕکێک دەردەکات.
گەزیچار:دارگەز.
گەزیزە: گوڵێکی حەوت ڕەنگە لە وێنەی گوڵە نەورۆزە، هەر دەمێ ڕێوی بیخوا توولەک دەکا: دەڵێی ڕێوی (گەزیزان) خواردووە.
گەزین: گەزتن.
گەژکرن: ز. گازگرتن.
گەستن: گازگرتن لە شت بەددان.
گەسک: جۆرە پووشێکی بەستراوە یا چنراوە ناومالّی پێ دەماڵرێ.
گەسکدان: پاککردنەوەی شوێنێک بەگەسک.
گەسکدەر: کەسێکە پیشەی هەر گەسکدان بێ.
گەسک لێدان: گەسکدان. بریتییە لە بردنی شتومەک و پاکۆ لێدانی: دز گەسکی لە ماڵی فیسار کەس دا، واتە هیچی تێدا نەهێشت.
گەسکە شاری: گیایەکی باڵابەرزی گەڵا پڕە هەر لقێکی دەکرێ بەگەسکێک.
گەش: گوڵی پشکووتوو. ئاگری خۆش کە قلەی بێ. خوێنی سووری روون. سەوزایی نازاو. بریتییە لە گیانداری بەکەیف.
گەشاندنەوە: کردنی خەڵووز بەئاگر. فووکردن بەخونچەی گوڵدا بۆ دەمدانەوەی.
گەشانەوە: گەشبوونەوە.
گەشبوونەوە: دەمدانەوەی گوڵ. تێراوبوونی سەوزایی. بریتییە لە کەیفخۆشی و بەدەقی یەکێک. بوونی خەڵووز بەئاگر.
گەشت: ڕۆیشتن بەملا و بەولادا بۆ ڕابواردن و سەیران.
گەشتنامە: کتێبێکە نووسرابێ لەلایەن یەکێکەوە لە ڕووی گەشتی خۆیەوە.
گەشتیار: کەسێکە کە هەمیشە لە گەشتوگوزاردا بێ (سیاح).
گەشتی: د. پاسەوان.
گەشک: چەمۆڵە.
گەشکردنەوە: گەشاندنەوە.
گەشکە: دەردەکۆپان. گەشک .
گەشکەدار: کەسێکە تووشی گەشکە بووبێ.
گەشکەگرتن: تووشبوونی دەردەکۆپان.
گەشە: کەیفخۆشی: فیسار کەس بە(گەشە)یە. تەرزی تازەی مێو (د).
گەشەکردن: بەخۆداهاتن و زلبوونی گیاندار و سەوزایی و دار و درەخت.
گەشەگرتن: کەیف خۆشبوون: فیسار کەس هەر (گەشە دەیگرێ).
گەشەوبوون: د. گەشبوونەوە.
گەشیان: د. گەشبوونەوە.
گەشیانەوە: د. گەشانەوە.
گەشی: سووری ئاگر بەجۆرێک کە قلەی بێ. بەدەقی و کەیفی گیاندار. نازاوی دار و درەخت و سەوزایی. کرانەوەی گوڵ.
گەشینەوە: گەشانەوە.
گەف: گەزاف. تەزوو. هەڕەشە: (گەف)یم لێ دەکا. هەر زەوی. حەپەی سەگ، گەپ، ترساندن (ز). فێڵ (ز).
گەفکردن: گاڵتەکردن. هەڕەشەکردن.
گەفۆک: هەرزەگۆ.
گەف و گڕ: با. هەڕەشە.
گەفە: گەپە. گەپ (د).
گەفین: گەپین.
گەڤرک: پۆڕی مێ.
گەڤزین: ز. گەوزین.
گەڤەز: ز. گیایەکە شتی پێ سوور دەکرێ.
گەڤێژ: با. گەلاوێژ.
گەگرتن: مانگرتنی گیاندار.
گەگەکردن: جومگە جومگە کردنی گیاندار.
گەل: کۆمەڵێکی گەورەیە لە ئادەمی کە پێکهاتبێ لە چەند تیرە و عێل و هۆز و خێڵێک و، هەموو بەیەک زبان قسە بکەن. وتەیەکە بەدوای هێندێ وتەوە دەنرێ مەعنای زۆری ئەو شتە دەگەیەنێ: کوڕ(گەل) پیاو(گەل) ژن(گەل).
گەڵ: ناولنگ. گەڵای داربەڕوو و مازووە کە لە پایزاندا بەلقەوە دادەپاچرێ و لەناو پەلی درەختدا هەڵدەگیرێ بۆ زستانی ئاژاڵ. تەک لە (گەڵ) خۆت بیهێنە.
گەڵا: بەرگی درەخت و سەوزایی.
گەڵاحە: ملوانکەیەکە بۆ جوانی دەکرێتە ملی ولاخ.
گەڵاخەزان: د. گەڵاڕێزان.
گەڵادار: درەختێکە کە گەڵای پێوەبێ.
گەڵا دەرکردن: پشکووتنی درەخت و پەیابوونی گەڵای.

گەلارِن: کردنەوەی گەلا لە میّو بۆ ئەوەی کە بەرەکەی هەلّەم نەکا.
گەلاریّزان: مانگی تشرینی یەکەم کە سی و یەک رۆژە. کاتی هەلّوەرینی گەلای درەختە. هەلّوەرینی گەلا لە کاتی سەرمادا.
گەلاریّژان: د. گەلاریّزان.
گەلاز: هەلّووژە.
گەلاس: گیّلاس.
گەلاکردن: گەلادەرکردن. گەلارِنین.
گەلاکوتک: داریّکی پانی کلکدارە هیّندیّ شتی پیّ دەکوتریّ.
گەلاکەوتن: کاتی گەلاریّزان.
گەلالە: شتیّکە کە سەروبەندی گیرابیّ و هیّشتا تەواو نەبووبیّ، ناوی دوودیّیە لە ناوچەی ماوەت و چۆمان.
گەلالە بوون: هاتنە ناونیوە تەواوبوونی شت.
گەلالەکردن: سەروبەند گرتنی شت.
گەلالەنامە: لائحە.
گەلالەی یاسا: لائحەی قانوونی.
گەلاوگەلّ: رِۆین بەبلاوکردنەوەی هەردوو لنگ وەک رِۆینی قۆرِ.
گەلاویّژ: ئەستیّرەیەکی گەشی بەپرشنگە لە ناوەرِاستی هاویندا لە کەلووی خۆی دەترازیّ. مانگی ئاغستۆس کە سی و یەک رۆژە.
گەلاویّژی: گەنم و جۆ و مەرەزەیەکی درواوەیە کە بەدریّژکۆلەیی لەسەر زەوی دانرابیّ بەدوو ریز بەرِەنگیّک کە گولّەکانیان رووی لە یەک بیّ. خەیار و ترۆزییەکە کە لەپاش گەلاویّژ کەوتن بیّنەوەبەر.
گەلبەستن: د. کۆبوونەوە.
گەلحۆ: مەردوومی گیّژ و ویّژ.
گەلدار: ز. داری گەورەی ئەستوور.
گەلش: ز. مشتومرِ.
گەللاسی: ز. فیتنە و فەساد.
گەلۆ: ئاخۆ (ز). وتەیەکە لەکاتی قسەکردندا دەیلّیّیت بەبەرانبەرەکەت وەک وتەی فلان کەس.
گەلّواز: ز. گەلّوازە.
گەلّوازە: ریزە گویّزیّکی کون کراوە دەکریّ بەپەتیّکدا و دەبەستریّ بەم سەر و بەوسەری بیّشکەی منداڵەوە بۆ پیّ ژیربوونی.
گەلّواگەلّوا: د. گەلاوگەلّ.
گەلّوالّک: گیایەکی کویّستانییە گولّیّکی جوان دەگریّ و بنکیّکی خۆشی هەیە.
گەلۆر: گەلحۆ.
گەلۆرە: گەلۆر.
گەلوو: ل. گەروو.
گەلّوو: د. گەروو.
گەلّووگر: د. شتیّکە لە گەرووداا یا لەسەر دلّدا ناخۆش بیّ.
گەلە: کۆمەلّیّک لە ئاژالّ یا ولاخ. ورگ (ھ).
گەلەجووت: هەرەوەزکردن بەجووت بۆ کیّلانی زەوی یەکیّک بۆ باربوویی.
گەلەخان: ژووریّکی تایبەتییە بۆ ئاژالّی وردە لە زستاندا.
گەلەدرەو: هەرەوەزکردن بۆ دروونەوەی دەغلّی یەکیّک بۆ باربوونی.
گەلەرِاویّژیّ: د. رِاویّژکردنی چەند کەسیّک بەکۆمەلّی.
گەلەک: گەلیّک.
گەلەکۆمە: گەلەکۆمەک.
گەلەکۆمەک: گەلەکۆمەکیّ.
گەلەکۆمەکیّ: قسەکردن بەیەک و کۆبوونەوەی چەند کەسیّک لە یەکیّک یا لە چەند کەسیّک بۆ بەگژداچوون.
گەلەوان: شوان.
گەلیّ: گەلیّک.
گەلیّر: ز. گەل. شتیّک یا کەسیّکە پەیوەندی بەگەلەوە بیّ: فیسار کەس یا فیسارە شت (گەلیّر)ە. واتە گەلیّ (شعبی)یە.
گەلیّک: وتەیەکە بەکاردیّنریّ لە جیاتی وتەی زۆر.
گەلی: دەربەند. شتیّکە کە پەیوەستی لەگەلّ گەلدابیّ.
گەلّی: دەربەند.
گەلّیش: کلّیش.
گەمار: ز. دەرمانیّکە دەباخی پیّ دەدریّ (ز) پیس. چلّکن.
گەمارۆدان: پەلاماردانی چەند سەگیّک لە شتیّک.
گەمالّ: سەگی زلی نیّر.
گەمالّ فس: دانیشتن وەک گەمالّ.
گەمراندن: ز. شیّواندنی شیّوەی جوانی شتیّک.
گەمرە: تەختە شیاکەیەکە لە گەوورِ لە ژیر پیّی ئاژالّدا پەسترابیّتەوە. قەتماغەی برین.
گەمرەبەستن: زۆربوونی کریّش و چلّک وەک گەمرە.
گەمژ: گیانداری نابووتی پچووک.
گەمژە: گەمژ.
گەمژالّ: گەمژ.
گەمۆر: ز. خواردەمەنییەکە کە رەگی تالّی بیّ.
گەموورە: جۆرە لینجییەکە کە ببیّ بەهۆی نووسانی لیّو بەیەکدا.
گەمە: گالّتە (گەمەکردن) گالّتەکردن، (گەمەپیّکردن) گالّتەکردن بەیەکیّک. یاری.
گەمیّ: گەمیە.
گەمیە: کەشتی.

گەمیەوان: کەشتییەوان.
گەمی: د. گەمیە.
گەن: د. گەند.
گەناو: ئاوی گەڕاو. ناوی دێیەکە لە پشدەر.
گەنج: دراو یا شتی زۆری بەنرخ کە لە شوێنێکدا دانرابێ، گیانداریکە کە هەوەڵی دەمی بێ.
گەنجایەتی: گەنجی.
گەنجە: یاری و گاڵتە. گەنجینە.
گەنجەفە: تیتاڵی. جۆرە قوماریکە بەکاغەز دەکرێ (د).
گەنجیتی: گەنجی.
گەنجی: لاوی.
گەنجینە: ژووری پشت ژووری نیشتەمەنی کە شتی بەنرخی تێدا دادەنرێ.
گەنجینەوان: مدیری خەزێنە.
گەند: شتی ناپوختی بێ نرخ.
گەندم: گەنم.
گەندوگوو: بریتییە لە شتی هیچ و پووچی ناپوخت.
گەندە: گەند.
گەندەپەڵە: بارانی سەر پەڵەیە کە زەوی پێ نەرم نەبێتەوە.
گەندەتا: تایەکی سووک.
گەندەخۆر: کەسێکە هەر شتی گەندە بخوا.
گەندە دەڵەک: دەعبایەکی بازەڵەی بۆگەنە، لە دەڵەک پچووکترە.
گەندەژە: ڕێوی تووڵەک کردوو.
گەندەڵ: داری وشکی کەڕەپووی کولۆر.
گەندەموو: تەنکە موویەکی نەرمە لەسەر ڕوومەتی کوڕی منداڵ دێ.
گەنگاو: گۆلاوێکە کە بۆنی کردبێ.
گەنگ: گەند.
گەنگ و گوو: گەند و گوو.
گەنگە: گەندە.
گەنگەپەڵە: گەندەپەڵە.
گەنگەخۆر: گەندەخۆر.
گەنگەدەڵەک: گەندەدەڵەک.
گەنگەژە: گەندەژە.
گەنگەڵ: گەندەڵ.
گەنگەموو: گەندەموو.
گەنم: دانەوێڵەیەکی زەردی دەنک وردە دەکرێ بەنان و مەردووم پێی دەژی و، گەلێ جۆری هەیە. گیایەکی سەوزی گەڵا درێژە گوڵێکی قەڵداسدار دەردەکا لە هەر چوارلاوە.
گەنم درەو: کاتی دروێنەی گەنم.
گەنم ڕەنگ: مەردوومی سەوزە.
گەنم گرد: گەنم گردی.
گەنم گردی: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە هێندێ شوێندا لە جێی وتەی (یەک لەسەر یەک): چوومە لای فیسار کەس (گەنم گردی) دایگرتم.
گەنم گەنم: جۆرە یارییەکە چەند کەسێک هەر یەکە ناوی ژمارەیەکی تاک لە خۆی دەنێ لە پاشا وەستاکەیان دەڵێ: (گەنم گەنم) لە فیسارىان بێ، ئینجا ئەگەر ئەوەیان باشی جواب نەدایەوە تێ دەکەوێ و ناوێکی ناشیرینی لێ دەنێن.
گەنم و جۆ: بریتییە لە ڕیشی ماش و برنج.
گەنمە: بالووکە.
گەنمە بەهاروو: گەنمە بەهارە.
گەنمە بەهارە: گەنمێکە کە لە بەهاردا بچێنرێ.
گەنمەپێغەمبەرانە: گەنمەپێغەمبەرە.
گەنمەپێغەمبەرە: گەنمەشامی.
گەنمەحۆلە: گەنمێکی گوڵ گەورەی دەنک زلە، زۆر بەگران لە پۆرگەکەی دێتە دەرەوە.
گەنمە زەرتکە: گەنمێکی سەختی گوڵ ڕەشە.
گەنمە قەندەهاری: گەنمێکی وردی سپی بەپێزە لە گەرمیان دێتە بەرهەم.
گەنمە کوێستانی: جۆرە گەنمێکی ناسکی سووربا وە لە کوێستانان دەکرێ.
گەنمەشام: گەنمەشامی.
گەنمەشامی: بەری گیایەکە گەڵای وەک گەڵای قامیش وایە، دەنکەکانی زەرد و خڕ و گەورەیە.
گەنمەگێلانە: د. جۆرە گەنمێکە تۆوەکەی لە (گێلان)ەوە دەهێنن.
گەنووس: ڕ. مەردوومی ڕژد.
گەنە: دەعبایەکی پچووکی بۆری بەئالۆشە، بەئاژاڵەوە دەنووسێ.
گەنەکار: د. کەسێکە کە ئیشوکاری پاک و تەمیز نەبێ.
گەنەکەوەڵە: جۆرە گەنەیەکی شینکارە، بەهەر کەسێکەوە بدا درەنگ چاک دەبێتەوە.
گەنەگەنە: دارێکی تاڵە ئاوەکەی بۆ لەرز و تا دەخورێتەوە.
گەنی: ز. شتی بۆگەن.
گەنیگ: د. گەنیو.
گەنین: بۆگەن بوون و بەسەر یەکدا ترشانی شتێک لەبەر زۆر مانەوەی.
گەنیو: شتی بۆگەنبووی داوەشاو.
گەو: ل. گا.
گەواد: کەسێکە کە ژن بۆ ئەم و ئەو تاو بکا.
گەوادی: ژن تاوکردن بۆ ئەم و ئەو.

گەواشە: ز. خێزەرە.
گەواڵ: دەفی پچووک. دەستە، گەواڵ گەواڵ: دەستە دەستە.
گەواڵە: پەڵە هەورێکی باوەندەیە کە بێت و بڕوا.
گەواه: شاهد.
گەواهنامە: شەهادەتنامە.
گەواهی: شاهیدی.
گەوج: مەردوومی کەرۆکە.
گەوجە: جۆرە هەڵووژەیەکی زەردە .
گەوجەگەوج: قسەی پڕوپووچی بێ مایە، بەجۆرێ کە کەس تێی نەگات.
گەوجی: بێ ژیری.
گەور: گاوور. ڕەنگی سپی واش. (ز). ڕەنگی خۆڵەمێشی (با).
گەورۆنە: وتەیەکە منداڵ بەکاری دێنی بۆ شتی گەورە.
گەورە: شتی زل. مەردوومی خاوەن دەسەڵاتی سایەدار.
گەورەبوون: زلبوون. دەسەڵات پەیداکردن، (گەورەکردن) پێگەیاندن و بەرهەمهێنان.
گەورەچۆڵ: فشە کلاونە.
گەورەکچ: کچێکە کە زۆر مابێتەوە و شووی نەکردبێ.
گەورەماڵ: بنەماڵی گەورە.
گەورەیی: دەسەڵات و سایەداری.
گەورەیی: ز. قورگ. سپێنەی چاو.
گەوز: تل و پێچی گیاندار لەبەر ئازار.
گەوزان: تەپ و تلکردنی گیاندار لە زەویدا بۆ پشت خوراندن.
گەوزدان: گەوزان.
گەوزلێدان: چۆنێتی دەست بردنی سەپان بۆ قولە دەغڵ و داوەشاندنەوەی داس بۆی.
گەوزین: گەوزان.
گەوشەک: کەسێکە کە سەری لێ شێوابێ لە کارێکدا. شتی شلەپەتەی نەمەیو (ز). (گەوشەکبوون) سەر لێ شێوان لە کارێکدا، (کەوشەک کردن) سەر شێواندن لە یەکێک لە کارێکدا.
گەووڕ: پشتیر.
گەوورک: جۆرە مەڕێکی دووگ کوڵی قوڵ هەڵکراوە. تیرەیەکە لە کوردی ئێران لە نزیک سەردەشتەوە.
گەورگە: د. تەپڵێکی گەورەیە لەسەر پشتی وڵاخ دادەنرێ و لێی دەدرێ.
گەوون: گیایەکی دڕکاوییە جەوی لێ دەگیرێ.
گەوە: ڕێکای پێچاوپێچ لە شاخدا. نیوە بازنەیەک لە هەموو شتێک .

گەوەزن: گاکێوی.
گەوهەر: بەردێکی زۆر جوانی زۆر بەنرخە.
گەوهەرشناس: کەسێکە لە ناسینی گەوهەردا شارەزابێ. بریتییە لە مەردوومی وریای دانای ژیر.
گەوهەر فرۆش: کەسێکە کە هەر گەوهەر بفرۆشێ.
گەوهەری: گەوهەرشناس.
گەهـ: جمگە (با). کات. نۆرەیەک.
گەهاندن: با. گەیاندن.
گەهریک: ز. کارژۆلە.
گەهەک: ڕەبەت.
گەهیشتن: با. گەیشتن.
گەهین: با. گەینی میوە.
گەی: د. مانی و هۆکگرتن.
گەیاندن: بردنی شتێک بۆ شوێنێک و دانانی لەوێ. بەخشین و وەشانەوەی مەعنای دوور لە وتارێکەوە: ئەم وتارە بێجگە لە مەعناکەی خۆی ئەم مەعنایەش دەگەیەنێ.
گەیانن: د. گەیاندن.
گەیشتن: گەینە جێ و هاتنە پێشەوە. پوختە بوون و خۆشبوونی میوە و ترشیات و هێندێ شتی تر. نەرمبوونی برین.
گهیشک: با. گۆیژ.
گەیک: د. گەیو.
گەیگر: مانگر. مەردوومی تور.
گەیگرتن: مانگرتن. زبانگرتنی مەردووم لە گفتوگۆدا.
گەیگە: هـ. حەشاری ڕاو.
گەین: گەیشتن.
گەینەوە: گەیشتنەوەی هەردوو سەری شتێک بەگردی شتێکی تردا: پشتێنەکە بەپشتمدا (گەیشتەوە).
گەیو: میوەی پێگەیشتوو. شتێکە کە بەجێی خۆی گەیشتبێ. برینێکە کە نەرم بووبێ.
گێ: گوێ. پیتێکە بەدوای هێندێ ناوەوە دەنووسێ دەیکا بەئیشکەر (فاعل): دایکی خۆ (گێ).
گیا: سەوزاییێکە کە لە خۆیەوە سەوز بووبێ.
گیا ئادەمە: گیایەکی بنکدارە بنکەکەی لە ئادەمی دەچێ.
گیابرین: گیایەکی گەڵا وردی بەهارییە گوڵێکی زەرد دەگرێ، بەوشکی دەکرێ بەبرینەوە.
گیابۆگەنە: گیایەکە گەڵایەکی بۆگەنی هەیە لە گەڵای تەماتە دەچێ.
گیابەن: گیایەکی بۆن خۆشە دەکرێتە چێشتی دانوولەوە.
گیابەند: وەرکەمەر.
گیاجارِ: د. مێرگ.

گیاچا: چای وشک.
گیاچناره: جۆره گیایەکە بخرێتە سەر شوێنێک لە ئەندام لە ماوەی سەعاتێکدا دەیسووتێنێ، زۆرتر بۆ سووتاندنی مایەسیری بەکار دەهێنرێ.
گیادانوو: گیایەکی لاسک باریکی گەلاخڕە، بۆنی لە جاتره تیژتره، دەکرێتە ناو هێندێ چێشتەوە.
گیارەش: بریتییە لە ناوەڕاستی بەهار کە گیا و سەوزایی لەو حەلەدا دەشت و دەر دادەگرێ و لە شەوارەش دەنوێنێ.
گیارەنج: ئەو گیایەیە کە قۆزاخە دەگرێ و مافەتەی تێدایە.
گیارەنگ: گیایەکی هەمیشەییییە لە قامیش دەچێ، گەلایەکی درێژکۆلەی هەیە وەک سیس عەمبەر، ڕانکوچۆغەی پێ ڕەنگ دەکرێ بەڕەنگی کاهی.
گیا سالمە: گیایەکی بەهارییە لە مێرگدا دەڕوێ، بنکەکەی وەک پەنجەی منداڵی ساوا وایە، وشک دەکرێتەوە و بەهاڕراوەیی دەکرێ بەهەوێنی دۆندرمە.
گیاسپی: گیایەکی بەهارییە بنکێکی هەیە وەک پیاز، بەهاڕراوەیی دەکرێ بەبرینەوە، بۆ گۆشتە و زوون زۆر باشە.
گیاکندر: جۆره گیایەکی ڕیشاڵ ڕیشاڵە لە بەهاراندا دەچێنرێ و گونیەی لێ دروست دەکرێ.
گیاکەفە: گیایەکی گەلا وردە، بەزەویدا پان دەبێتەوە، وەک سابوون کوف دەکا.
گیاکەڵە: کێرە کەڵەگا.
گیاکەن: د. بێڵەکانێکی ئاسنی پچکۆلەیە گیای پێ هەڵ دەکەندرێ.
گیاگەنان: مانگی مایس کە سی و یەک ڕۆژە و، لە گەرماندا گیا زەرد دەبێ.
گیاگەنمە: گیایەکە بەناسکی لە گەنم دەچێ.
گیالاوە: با. بەڕەزا.
گیان: هێزێک لە ئەندامی گیانداردا بەهۆی ئەوەوە دەژی و گەورە دەبێ. بریتییە لە جەستە و ئەندام: هەموو (گیان)م ئێشێ.
گیاندار: گیانلەبەر.
گیاندان: مردن و گیان سپاردن.
گیان دەرچوون: مردن.
گیان سپاردن: مردن.
گیان سەخت: بریتییە لە کەسێک کە بەئاسانی گیان نەدا بەدەستەوە. بریتییە لە کەسێک کە زوو خۆی نەدا بەدەستەوە.
گیان کەنشت: د. کاتی سەرەمەرگ.
گیان کەنن: د. گیانکێشان.
گیانکێشان: گیاندان.
گیانلەبەر: زیندوو.
گیانە: وتەیەکە دەوترێ بەیەکێک لە ڕووی خۆشەویستییەوە.
گیانەسەر: بریتییە لە کەسێک کە لە کارێک وەڕس بووبێ، (گیانە سەربوون) وەڕسبوون، (گیانەسەر کردن) وەڕسکردن.
گیانە گووینە: بریتییە لە کاتێک کە گیاندار نووزەیەکی تێدا مابێ.
گیانەلا: گیانەلاو.
گیانەلاو: کاتی سەرەمەرگ.
گیانە مەژگ: د. مۆخی گەردن (نخاعی شوکی).
گیانەوەر: گیاندار.
گیانێ: د. گیانە.
گیانی گیانان: ناوی خوایە.
گیانی: بریتییە لە دۆستی ڕاستەقینی و یەک ماڵی.
گیانی گیانی: گیانی.
گێپەڕ: گێپەڕە.
گێپەڕە: ئەستوورایی مل.
گێتاڵ: د. شتی ڕیپۆڵی بێ نرخ.
گێتی: جیهان.
گێتکە: خەپلەی هەرزن.
گێتە: هـ. گێتکە.
گێتەر: د. گەدای شرۆڵ.
گێتێ: هـ. کولێرە.
گێج: گەج (با). گێژی وڕ، (گێجبوون) گێژبوون. گێژاو.
گێجاو: د. گێژاو.
گێج خواردن: د. گێژخواردن.
گێجدان: د. گێژدان.
گێجەبا: د. گێژەڵووکە.
گێجەگێج: گێژەگێژ.
گێجەڵووکە: گێژەڵووکە.
گێجەنە: د. گرێژەنە.
گێچ: گەچ.
گێچکاری: گەچکاری.
گێچکە: د. چەرخە و خولخواردن.
گێچەڵ: تەشقەڵە.
گێچەڵی: د. خورییەکی شیکراوەیە کە دەکرێ بەدەسپێچک بۆ ڕستن.
گێر: گوێروو. ژنی قەڵەوی پان و پۆڕ: فیسارە ژن (گێر) و بمارە.
گێڕ: چەوت. جەرخ: (گێڕ)ێکی پێ بدە. شەل. پیتێکە بەهێندێ ناوەوە دەنرێ دەیکا بەئیشکەر: بەزم (گێڕ)، شایی (گێڕ).

گـێـران: کـوتانەوەی بان بەبانگردێن. هێنان و بردنی گـیـانداریێک لەگەڵ خۆت: منداڵەکە یا وڵاخەکە (بگێرە).
گـێـراندنەوە: هێنانەوەدوای شـتـێک بۆ لای خـۆت. گلدانەوەی شتێک لە شتێک: لە خەرجییەکەت (بگێرەرەوە).
گێراننەوە: گێراندنەوە.
گێرانەوە: گێراندنەوە. باسکردنی شتێکی ڕابووردوو بۆ یەکێک.
گێربوون: خواربوون. شەل بوون.
گێری: خواری. لەنگی.
گـیـرسان: ڕووان و ڕیشە داکـوتانی نەمام و قـەڵەم. بەندبوون و خۆگرتنی هەموو شتێک: سواغەکە یا پنجی گۆزەکە یا تۆوی نێـرەکـە لە منداڵدانی مـێی کـەیدا (گـیـرساوە). سـووتان و تروسکەی ئاگر.
گیرسانەوە: بەندبوون و شۆڕبوونەوەی شتێک بەشتێکی بەرزەوە.
گیرفان: کونێکە لە کاڵادا شتی تێ دەخرێ.
گـیـرفـانبـڕ: کـەسـێکە شـتـێکت لێ بدزێ کـە بەخـۆت بێ و پێی نەزانیت.
گێرڤان: ز. کەسێکە گاگێرە لێ بخورێ.
گێرک: ز. مێرووله.
گێرکە: جۆرە مێروولەیەکی سووری زۆر وردە.
گێرمەکێش: کێشمەکێش.
گێرووسە: ز. دەستاڕ.
گێرە: گێرانی وڵاخ یا جەنجەڕ بەسەر خەرماندا بۆ کوتانی.
گێرەشێوێن: بریتییە لە کەسێک کە کاری مەردووم تێک بدا.
گێرڤان: با. گیرەوان.
گێرەکردن: کوتانی خەرمان بەوڵاخ یا بەجەنجەڕ.
گێرە نەکەر: بریتییە لە مەردوومی تەمەڵ.
گێرەوان: ئەو کەسەیە کە کای گێرە لێ بخورێ.
گێرە و کێشە: بریتییە لە کەشمەکەش و دەردی سەری.
گیریست: گریان.
گیرستن: گریان.
گێزان: کێزان.
گـێـزبەلە: گـیـایەکی بەهاری بنکدارە وەک پیـشـۆک، بنکەکـەی دەخورێ.
گێز و گوڵنگ: گوڵنگەی شۆڕەوەبووی زۆر.
گێز و گوڵنگە: گێز و گوڵنگ.
گـێـزەر: گـیـایەکی پایزییـە دەچێنرێ، بنکێکی شـیـرینی درێژی هەیە.
گێزەرە: گێپەرە.
گێژ: گیانداری وری کەم هۆش. گێژاو.
گێژان: ز. پیتی پرسیار. پیتی شەرت.
گێژاو: شوێنێکە لە گۆم کە پێچ بخوا.
گێژبوون: وڕبوون.
گـێـژدان: خـولدانی دانەوێڵـە لە بێـژنگ و قـەڵبی ڕا بۆ سـەر کۆزەرگرتنی.
گێژکردن: گێژدان.
گێژکە: گێژکردن.
گێژنە: جەژن.
گێژ و وێژ: مەردوومی وڕی بێ هۆش.
گێژەگێژ: بریتییە لە قسەکردن بەگێژ و وێژی.
گێژەڵووکە: گێژەڵووکە.
گـێـژەڵووکە: بایەکـە بەگـردی خـۆیدا دەخولێـتـەوە و تەپوتۆز بەرز دەکاتەوە، گێژ و وێژ.
گێژەن: ئاژاوە و ناخۆشی.
گێژەنە: گرێژەنە.
گێژی: وڕی. نەخۆشییەکە تووشی مەڕ و بزن دەبێ، کوتوپڕ دەبێ سەر ببڕدرێ.
گیسک: بێچووی بزنە لە تەمەنی سێ مانگییەوە تا ساڵێک.
گێسک: گیسک. گەسک (با).
گیسکەزا: ئاوسبوون و زانینی بەچکەی بزن بەگیسکی.
گێسکەزا: گیسکەزا.
گیسکەموو: د. گیسکێکە کە مووەکەی زبربێ.
گیسکە مەرەز: گیسکێکە کە مووەکەی نەرم بێ.
گیسن: ز. گاسن.
گێسوو: ئەگریجە.
گێسووبڕێ: بریتییە لە ئافرەتی بێ شەرمی بەدخوو.
گێشە: ز. شارا.
گیفی: ز. شیری هەوێنکراو.
گێل: گیانداری گێژ و وێژ.
گێـلاخە: گـیـایەکی بەهاری سێ پەلە، زۆرزوو دەڕوێ و بەکوڵاوی دەخورێ.
گێلاس: میوەیەکە وەک بەڵاڵووک، بەڵام ئەم گەورەترە و خۆشترە.
گێلاس: د. گێلاس.
گێلاسی: شتێکە ڕەنگی وەک ڕەنگی گێلاس وابێ.
گێلان: هـ. گەڕان.
گێلای: هـ. گەڕان.
گیلک: ز. قیتکە.
گێلک: خوری شیکراوە بۆ ڕستن.
گێلکە: جۆرە مێروولەیەکی سووری وردە.
گێلگێلە: چەند مووروویەکە ژنان دەیدروون بەکڵاوەکەیاندا و شۆڕ دەبێتەوە.

گـێلوو: گـەچکارییـەکـە لەژێر سـەقـفـەوە بەشـمـشـە بەبن دارەڕادا دەکرێ.
گێلووکاری: شوێنێکە کە گێلووی بۆ کرابێ.
گیلە: ز. گلەیی.
گێلەکی: جۆرە نقامێکی کوردییە.
گێلەگێل: گێژەگێژ.
گێڵیان: ھ. گەڕان.
گینگڵ: بێ ئارامی لەبەر ئازار یا خەفەتێک.
گینگڵخواردن: پێچ و تل لەبەر ئازار یا خەفەتێک.
گینگڵدان: گینگڵخواردن.
گینگڵە: گینگڵ.
گینگە: قیتکە.
گێنۆ: د. زەرتک.
گیواو: ھ. گیا.
گێوژ: گۆێژ.
گیهان: ز. گەیشتن.
گی: گوو.
گیپاڵ: سکی زل: فیسار کەس گەد و گیپاڵێکی سەیری ھەیە.
گیپن: گیانداری خڕپنی قەڵەو.
گیپنە: گیپن.
گـیـپـە: پارچە ورگی ئاژاڵی وردەیە کـە ھەڵدر وابێ و برنجی تێ کرابێ و لە ئاوی سەر و پێدا کوڵێنرابێ.
گیت: ز. وەیشومە و کرێوە.
گیتر: ز. لاق.
گیتک: ز. لاق.
گیچ: با. گەچ.
گیچ: ل. گۆێژ.
گـیـر: مـەردوومی ڕژدی چرووک. جـۆرە پەتێکە دەواری پێ دەبەسترێتەوە. گوێز و بادام و ڕۆنی تیژ. شتێکە بەشوێنێک توند بێ و بەنھێم پێیدا پچێ: کلیلەکە بەکێلوونەکە (گیر)ە، واتە پێی توندە. ھێز و نھێم: فیسار کەس بە(گیر)ە.
گیرا: نزایەکە کە جێگیر ببێ لای خوا، (گیرابوون) جێگیربوونی نزا لە بارەگای خوادا.
گیرام: وتەیەکە لەجێی وتەی (فرضنا)ی عەرەبی بەکاردێنرێ.
گیران: ترنجانی شتێک لەناو شتێکدا. پۆنگ خواردنەوەی ئاو بەھۆی کـوێربوونەوەی ڕێگاکـەیەوە. نەمـانی ڕووناکی ڕۆژ بەھۆی قـەبارەی مـانگەوە. نەمـانی ڕووناکی مـانگ بەھۆی قەبارەی زەوییەوە. بەندکردنی یەکێک لە بەندیخانە. گرفت کردن.
گیراو: شتێکە کە گیرابێ.
گیراوە: دەرمانێکە کە گیرابێتەوە.
گیراوێ: نیشانەیەکی سێ چوکڵەیە، لەسەر ھێندێ پیتی عەرەبی دادەنرێ. قەبزی.
گـیـربوون: توندبوونی شـتـێک لە شـتـێک. بەندبوون و مـانەوەی یەکێک لە شوێنێک و قەتیسبوونی.
گیرخستن: د. گیردان.
گیرخواردن: گیربوون.
گیردان: قەتیسکردن.
گیڕ: با. نووزەدرێژ.
گیڕە: ویڕە، (گیڕەگیڕ) ویڕەویڕ.
گیرکردن: گەلاڵەکردن و نانەوەی شتێک. قەتیسکردن. ترنجاندنی شتێک لە شتێک.
گیرکەوتن: چنگکەوتن.
گـیـرگـە: ئەشکەنجـە. دارێکی ئەسـتـووری دووپەڵە گـۆچانی پێ دەچەمێنرێتەوە.
گیرنەدەر: کەسێکە کە بای سکی نەتوانی ڕابگرێ.
گیروبەند: تەعمیرکردنەوەی شتی کۆن.
گیرودار: د. زەبر و زەنگ: فیسار کەس بەگیرودارە.
گـیـرۆدە: کـەسـێکە کـە بەناخـۆشـیـیـەکـەوە گـرفـتـار بووبێ، (گیرۆدەبوون) گرفتاربوون بەناخۆشییەکەوە .
گیرۆدەکردن: گرفتارکردن.
گیرۆدەیی: گرفتاری.
گیروگرفت: قۆرت و گرێیەکە کە بێتە ڕێت.
گیرە: ئەشکەنجەی دارتاش. چەند مـەنێک گـەنم و جۆیە تێکەڵی ھەرزن کرابێ بۆ نان. چەند قوڵفەیەکە بەدەوارەوە تەختەکانی پێ قایم دەکرێ. گیراوێ (د). بەڕولەیەکە دەخرێتە جاوپێچی جۆلاوە بۆ ئەوەی نەسوورێتەوە.
گیرەم: گیرام.
گیرەوە: گیرۆدە.
گیرھە: با. ئەو بەڵغـە ڕەقەیە کە لەناو کتری و سەماوەردا پەیدا دەبێ بەھۆی کولاندنی ئاوەوە.
گیریاک: د. گرفتار. شتێکە کە گیرابێ.
گیریان: د. گیران. گریان.
گیز: پشت مل. گوێز. زڵف. مەستی سەرخۆش (د).
گیزان: گوێزان.
گیزگیزە: د. قۆڕقۆڕە.
گیز و گوڵەنگ: د. گێز و گوڵنگ.
گـیـزە: جـۆرە دەنگێکە وەک دەنگی مـێش و کـوللە، (گـیـزە گـیـز) گیزەی یەک لەدوای یەک. (گیز و هووڕ) گیزەگیزی زۆر.
گیزەڵ: توورە.

گیس: ل. قژەسەر.
گییسک: گیسک.
گیشە: تایەی تووتن و لیژنەی دار و هەموو شتێکی تر. لۆدەیەکە کە سەری نەگیرابێ.
گیفک: با. گووفک. گوڵنگەی چەفتە و زین و شتی تر.
گیڤ: گڤ.
گیڤژاڵە: قرژاڵ.
گیڤ گیڤە: د. گیزگیزە.
گیڤە: گڤڤە، (گیڤەگیڤ) گیڤەی یەک لەدوای یەک، (گیڤ و هوورِ) گیڤەگیڤێکی زۆر.
گین: پیتێکە بەدوای هێندێ ناوەوە دەنووسێ دەیکا بەئیشکەر: غەم(گین)، دوا(گین) واتە غەمبار و دواهەم.
گیووژ: گۆێژ.
گیوە: جۆرێکە لە کلاشی ژێر پەرۆین.
گیوەگیو: قسەی بێ سەر و پێ.



لا: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ لاچوونی یەکێک لە لات: (لا) واتە لاچۆ. تەنشت: وەرە (لا)م. شتێکە کە کلا کەوتبێ: نەریمان (لا)یە لە هەرا و ئاژاوە. نیـــوە لە شت (لا)یەکم بەگـــیـــر وەستاوە. لۆنە: ئەم کشتەکە دوو (لا)یە.

لائین: ز. لاسایی کردنەوەی یەکێک لە گوفتار یا لە کرداردا بۆ ئەوەی کە دانیشتوان پێبکەنن.

لابار: لاباری.

لاباری: وڵاخ بەکرێ دان. بەنیوەی باری وڵاخەکە.

لابردن: هەڵگرتنی شتێک لە جێگایەک و نەهێشتنی.

لابڕ: جۆرە ئاگردانێکە کە پێشەکەی نەبێ.

لابوون: کلابوون.

لابەر: کەسێکە کە شتێک لابەرێ لە شوێنێک.

لابەرە: قـایشـێکی دووفـاقـە لەبەر سنگی وڵاخـەوە لە ڕاست و چەپی قەڵتاخ توند دەکرێ.

لابەلا: ڕێگا و هەمـوو شـتێکی خوار و خێچ. مەردوومی بێگانە بەکـارێک: یەکـێکی (لابەلا) هات سـەری لێ تێکدام. لابەلایی.

لابەلایی: شوێنی لابەلا. مەردوومی بێگانە بەکارێک.

لاپا: د. لاپاڵ.

لاپار: د. تەنکە بەردێکە منداڵان سافسافێنی پێ دەکەن.

لاپاران: د. یاریکردن بەلاپار.

لاپاروو: سەرەمەقەستی سابوونی بەزی.

لاپاڵ: قەدی شاخ و گرد.

لاپاڵوو: کەلەکە.

لاپاو: د. لافاو.

لارەسەن: لاپلەرسەنگ.

لاپلا: هـ. لابەلا.

لاپلار: د. لاپلەرسەنگ.

لاپلەرسەنگ: بێگانەی خۆ تێهەڵقورتێن لە کارێکدا.

لاپواز: د. لاپلەرسەنگ.

لاپۆرە: گەدایەکە کە لەلاوە هاتبێ بۆ گەدایی.

لاپوولە: د. دراوێکە کـــە ژنان لەگـــەڵ مـــووروودا دەیکەن بەسەریاندا.

لاپەڕ: شتێکە کە کەوتبێتە کەنارەوە. زوێڵی چەرمی کاڵە.

لاپەڕە: ڕوویەک لە پەڕەیەک کاغەز.

لاپەڕە وەرگێران: بریتییە لە گۆڕین و کۆنکردنی قسەیەک.

لاپەڕە هەڵدانەوە: لاپەڕە وەرگێران.

لاپەڕە هەڵگێڕانەوە: لاپەڕە هەڵدانەوە.

لاپەلە: د. لاپەڕە.

لاپێ: زەلامەڕێی سەخت لە شاخ و هەرددا.

لات: هەژاری بێ نەوا. گـــیـــانداری لاواز. بانەیەکـــە لە زەوی جـوتیـار دەیکێـشێ بۆ ئەوەی تۆوی پێـوە بکا و بیکێـڵێ. لووتێکە لە شاخ کە دەربچێ و سەرەکەی تەخت بێ.

لاتار: د. تلێکە کە لەسەر بەرەوژوورەیەک تلۆر بکرێتەوە.

لاتانە: کردن و وتنی شتێکە کە هەر لات بیکا و بیڵێ.

لاتبوون: هەژارکەوتن. لاوازبوون.

لاتخـانە: شـوێنێکە کـە تەرخـان کـرابێ بۆ تێـدا بەخـێـوکـردنی مەردوومی لات.

لاترقەوچەپێچ: بریتییە لە شتی نارێکی نالەبار.

لاتروسکە: لاتریسکە.

لاتریسکە: دوورکەوتنەوە و سڵەمینەوە و خێسەکردنی گیاندار لە شتێک.

لاتفرۆشتن: بریتـیـیە لە شەڕ فرۆشتنی لات بەمەردووم بۆ ئەوەی شتێکی دەست کەوێ.

لاتکەوتن: لاتبوون.

لاتولووت: کەسانێکن کە بێ ئیش و بێ کار بسووڕێنەوە.

لاتولەوار: لاتولووت.

لانە: جۆرە جبەیەکی تەسکی بەدەن چەسپە. دەردێکە لە سنگدا هەناسەی توند دەکا (د).
لاتەبەق: لاپەڕە.
لاتەراف: گۆشتی تەنکی کەلەکەی گیاندار.
لاتەریزە: لاتەراف.
لاتەری: د. لاتار. گۆترەکاری.
لاتەک: تەنیشتی شت.
لاتەنشت: تەنشت.
لاتەنیشت: لاتەنشت.
لاتەوەق: لاتەبەق.
لاتێر: د. مۆڕبوونەوە بەتیلایی چاو.
لاتیلاگ: لایەک لە کەللەی سەر.
لاتی: هەژاری. لاوازی.
لاتیگەری: ڕابواردن بەلاتێتی.
لاج: ز. لاو.
لاجامە: دارێکی درێژە لە عەرەبان دەدا کە بەولاخەوە دەبەسترێ. وێنەی مەردووم بەنیوەیی (د).
لاجانگ: ئەملا و ئەولای سەر لە ناوەندی گوێ و چاودا.
لاجڵەو: ولاخێکە کە لە ڕەوتدا خوار بڕوا. ولاخی سەرکێش.
لاجیوەرد: جۆرە بەردێکی شینە دەکرێ بەنقێمی ئەموستیلە.
لاجیوەردی: ڕەنگێکە کە لە ڕەنگی لاجیوەرد بچێ.
لاچک: لاسک.
لاچلاچک: با. لاشەویلە.
لاچناکە: د. لاشەویلە.
لاچۆپاچۆ: د. پروپیت.
لاچوون: ڕۆیشتن و بەجێهێشتنی شوێنێک.
لاچەنە: قایشێکە سەرێکی لە لغاو و سەرێکی لەسەر کەللە قایم دەکرێ. لاچناکە.
لاچن: ز. کاڵە.
لاخستن: خوارکردنەوەی هێندێ شت: کوپەکە (لاخە). گلدانەوەی شتێک لە شتێک: لە مانگانەکەت شتێک (لاخە).
لاخوار: شتێکە کە لایەکی خواربێ.
لاخوراو: شتێکە کە لایەکی نەمابێ.
لاخەکرن: ز. دروێنەی لەوەڕ و بڕینی لقی درەخت بەبێ ئەوەی کە کۆبکرێتەوە.
لاخێز: د. هەستان لەبەر یەکێک بەجۆرێک کە بەتەواوی پشت ڕاست نەبێتەوە.
لادار: نیرگە.
لادان: کەلەبەرێکە لە دیواردا دەهێڵرێتەوە لە تاق گەورەترە شتی تێدا دادەنرێ. خستنە کەنار. کەنارکەوتن لە ڕێڕۆیندا: کە ماندوو بوویت لە ڕێ (لادە). دەست هەڵگرتن لە خوویەک: فیسار کەس باش (لایداوە).
لادایەن: ئافرەتێکە کە ژەم ژەم شیر بدا بەمنداڵ بەمانگانە.
لادایەنی: شیردان بە منداڵ ژەم ژەم بەپارە.
لادڕ: قوموشی لابەلای قەدی دیوار و زەوی.
لادڕگە: د. لادڕ.
لادە: د. دیوارێکە کە لە تەپاڵە دروست کرابێ.
لادەستی: جۆرە کولێرەیەکی تەنکە بەدەست دەخرێتە سەر ساج.
لادەگا: د. لادێ. شوێنێکە کە مەردووم تێیدا بحەوێتەوە.
لادێ: دێهات.
لادێیی: کەسێکە کە لە لادێ دابنیشێ.
لار: شتی خوار. لەڕ. گەووری گا و گامێش (ز).
لاربوونەوە: بریتییە لە مردن و، هەر بۆ سووکی دەوترێ. خواربوونەوە.
لارکردنەوە: خوارکردنەوە.
لاڕان: ئەملا و ئەولای ڕان.
لاڕکە: لاڕێی هەڵەت.
لاڕەشە: دەردێکە تووشی بزن و مەڕ دەبێ و گۆشتەکەی لە کەڵک دەخات.
لاڕێ: شوێنێکە کە ڕێگا نەبێ.
لاڕێ گرتن: لادان لە ڕێی ڕاست.
لاروالاروا: د. لارەوە لارەوە.
لاروایی: د. شتێکە لەلایەن چەند کەسێکەوە بکرێ بۆ دابەشکردنی لەناو خۆیاندا.
لارولەنجە: لەنجەولار.
لارە: دارێکە لە باتی ئێرەق کاری پێ دەکرێ. گیاندارێکی پچووکی بۆرەقنەیە لە ئاودا ئەگەر بچێتە قوڕگەوە ئازاری گیاندار دەدا. جۆرە زیوانێکە لە گەنم و جۆدا. جۆرە گەنمێکە. لەنجە.
لارەجڵەو: لاجڵەو.
لارەسەنگ: لاسەنگ.
لارەسێبەر: سێبەرێکە کە لە نیوەڕۆ بەدواوە لار دەبێتەوە.
لارەمل: بریتییە لە مەردوومی مل کەچی بێ دەسەڵات.
لارەوبوون: د. لاربوونەوە.
لارەوکردن: د. لارکردنەوە
لارەولار: ڕۆین بەلەنجەولار. لارەولارەوە.
لارەوەبوون: لاربوونەوە.
لارەوەکردن: لارکردنەوە.

لارەولارەوە: ڕۆیشتنی ناساغ بەلەقەلەق.
لاری: خواری. بریتییە لە دڵ دەرنەهاویشتن و ویستنی یەکێک: من (لاری)م لێت نییە.
لازوان: د. مەردوومی گێلۆکە کە نەزانێ قسە بکات.
لازەبوون: بێ کەسبوونی مەردووم.
لاژک: گیانداری تەمەڵی بێ فەڕ.
لاژگ: د. لاژک.
لاژە: لۆژە.
لاس: شیاکە، دارێکی دڕکدارە، گەڵای وەک گەڵای بی وایە بەقەڵەم دەنێژرێ و بۆنی زۆر خۆشە. خەرمانی گزرەگیا. بەدەورداهاتنی گەماڵ بۆ دێڵەکەی (د).
لاسار: گیانداری سەهندە.
لاساریی: سەهندەیی.
لاسامە: د. ڕەهێڵە. لافاو.
لاسایی: دەمەلاسکێ. چاو لە مەردووم کردن لە کردار و گوفتاردا، (لاسایی کردنەوە) لاسایی.
لاستیک: شتێکی نەرمی جیڕی بەکێشە تایەی ئۆتۆمۆبێل و گەلێ شتی تری لێ دروست دەکرێ.
لاسخواردن: تەفرە خواردن.
لاسدان: تەفرەدان.
لاسک: قەد و باڵای سەوزایی. شیاکە (د). بەدەورداهاتنی گەماڵ بۆ دێڵەکەی (د).
لاسکردن: ز. لاخەکرن.
لاسوڕ: د. قاچ هەڵخلیسکان.
لاسەرە: د. لاپوولە.
لاسەنگ: شتێکە لایەکی لە لایەکی قورستر بێ.
لاش: د. لاشە. لاک.
لاشاخ: هـ. ئانیشک.
لاشان: قەدپاڵ. تەنشت.
لاشخۆر: د. داڵی کەرخۆر.
لاشە: جەستەی مەردوومی مردوو.
لاشەڕ: بریتییە لە مەردوومی هێمنی لەسەرخۆ.
لاشەویلکە: لاشەویلە.
لاشەویلە: لایەک لە شەویلە.
لاشیپان: باهوی ئەملاو ئەولای دەرگا.
لاشیپانە: لاشیپان.
لاعیدە: بەشتێک دەڵێن کە لە شتێکی تر جیاواز بێ.
لاف: گەزاف.
لافاو: باراناوی زۆر.
لافلێدان: خۆ هەڵکێشان.
لاف و گەزاف: لافلێدان.
لاڤ: با. لاو.
لاڤایی کرن: ز. تکاکردن بەپاڕانەوەوە.
لاڤکرن: ز. تکاکردن.
لاڤلاڤک: ز. لاولاو.
لاڤە: ز. هیوا.
لاڤەکرن: ز. ئومێدکردن.
لاڤەلاڤ: با. پاڕانەوە: بەس (لاڤەلاڤ) بکە.
لاق: لە ڕان بەرەوخواری گیاندار.
لاقرتی: گاڵتەکردن.
لاقردی: لاقرتی.
لاقەبرغە: لایەک لە کەلەکە.
لاقەفرتێ: لەقەفرتێ.
لاک: لاشەی بێ گیانی چوارپێ. چێشتێکە لە ئاردی جۆ و کەپەک دەکرێ بۆ سەگ و وڵاخ (ز). لۆک.
لاکردنەوە: ئاوڕدانەوە.
لاکۆ: هەرەوەزکردن بۆ پەموو چنین.
لاکوت: داوێن پیسی کردن بەدزییەوە لەگەڵ ژنی ئەم و ئەودا. لاوورگە.
لاکۆشکە: د. لایەنگیر.
لاکۆشی: د. لایەنگیری.
لاکۆڵان: کۆڵانی لابەلای تەسک و تروسک.
لاکە: لۆژەی سەر لە برسا یا لەبەر ناساغی: فیسار کەس (لاکە)ی سەری دێ.
لاکەل: جۆرە تفەنگێکە. شتێکە کە لایەکی کەل بێ.
لاکەن: د. لاکەند.
لاکەند: لادڕ.
لاکەوتن: کلابوون و جیابوونەوەی شت.
لاکەوتە: پەککەوتە.
لاکێش: قاڵی و حەسیری باریکی درێژ. جگەرەخۆرێکە کە خۆی جگەرە هەڵ نەگرێ و هەر لەم و لەوی بسێنێ. نەمامێکە کە تووڵکێش کرابێ (د).
لاکێشە: شتی چوارگۆشەی درێژکۆلە (مستطیل).
لاکین: ز. دەفرێکە چێشتی (لاک)ی تێ دەکرێ بۆ سەگ و وڵاخ.
لاگا: د. جێگایەکە کە لێی لابدرێ بۆ حەوانەوە.
لاگایی: د. دێهاتی.
لاگر: د. لایەنگر.
لاگرتن: د. لایەنگرتن. حەسانەوە.
لاگوێل: لالوێچ.
لاگیر: کەسێکە کە لایەنی یەکێک بگرێ.

لاگـیـره: جـۆره خشـڵـێکه ژنان لەسـەر سـەرپێـچەوه دەیدەن لە سەریان.
لاگیری: لایەنگیری یەکێک.
لاڵ: کەسێکە زبانی لە گوفتوگۆدا بگیرێ یا هەر نەتوانێ قسە بکا.
لەعل (د). شـتی زۆر سـوور (د). ترێ و هەڵـووژه و هەناری زۆر گەیو (د).
لالا: چرایەکی باڵابەرزه تەلێکی کـەوانەداری تێدایە مـۆمی تێ دەخرێ و کاسە شووشەیەکی دەکرێ بەسەردا.
لالا کـردن: نـوستن، ئەم وتـەیە منداڵی سـاوا بـۆ نووستن بەکـاری دەهێنێ.
لالانەوه: پاڕانەوه.
لالایی: زبانگیـران بەجـۆرێک کـە قـسـەی پێ نەکـرێ: یاخـوا لالاییت داێی.
لالغاوه: دابڕاوی ئەملا و ئەولای دەم.
لالکەر: ز. یاری (پەنای بێ دەنگی).
لالۆ: برای دایک.
لاڵ و پاڵکەوتن: کەوتنی چەند گیاندارێک بەناڕێکی.
لالۆزا: خاڵۆزا.
لالۆژن: خاڵۆژن.
لالوو: ل. لالۆ.
لالووت: کەسێکە لە یەکێک یا لەشتێک دڵگیربێ.
لالووتی: د. دڵگیری لە شتێک.
لالوێچ: لالەوێچ.
لالە: لالا. لالۆ. جۆره گوڵێکە.
لاڵە: لالانەوه.
لاڵەپەتره: لاڵێکی وایە کە بەئاستەم قسەی بۆ بکرێ.
لاڵەپەته: لاڵە پەتره.
لالەزار: باخچەیەکە کە گوڵ و گوڵزاری زۆری تێدابێ.
لالە عەباس: جۆره گیـایەکی گەڵاپانە گوڵێک دەگرێ وەک لاولاو بەڵام ئەم پچووکتره، بەیانیان و ئێواران دەگەشێتەوه.
لالەعەباسی: د. لالەعەباس.
لالە لاڵ: قسەکردن بەلاڵی.
لالەنگەر: دووداری باریکن بەتەنشتی دەفەی جۆلاییەوه.
لالەنگی: جـۆره خـواردەمـەنیـیـەکی نەرم و شلی پچکۆلەیە، لە هەویر و زەردێنەی هێلکە دروست دەکرێ و لەناو ڕۆندا سوور دەکرێتەوه و شیلەی شەکری پێدا دەکرێ. جۆره پرتەقاڵێکی پچکۆلەیە توێکڵەکەی زوو لێ دەبێتەوه.
لالەووڕ: د. گەوجی نەفام.
لالەوەڕ: کـەسـێکە زۆر لەسـەر قـسـە بڕوا و بیـرەنگێنێـتـەوه. مەردوومی گێل و گـەوج. کەسێکە کە هێندێ خواردەمـەنی نەخوا.
لالەوێچ: پڕ تاقەدەستێک لە شت.
لاڵیان: د. پاڕانەوه.
لاڵیانەوه: لاڵیان.
لالێ بڕینەوه: تەنگ هەڵچنین بەیەکێک.
لالێ سەندن: لالێ بڕینەوه.
لالێ کردنەوه: بریتییە لە یارمەتی و دەستگیرۆیی یەکێک.
لالی: ز. دەوری مسین.
لاڵیی: زبانگیران لە قسە و گوفتوگۆدا.
لام: ناوی پیـتـێکە لە بیـست و حـەوت پیـتـەی کـوردی. بیـانوو: (لام)ی تێ هێنا، واته بیـانووی هێنایەوه. گووپ (با). لای من.
لام: ز. ڕوومەت.
لامپا: چرای بلووردار.
لامـژ: منداڵێکە کـە ناوبەناو مـەمکی ئافـرەتێکی شـیـردار بمژێ، جگەرەکێشێکە کە خۆی هەرگیـز جگەره هەڵنەگرێ و، لەم و لەو داوا بکات.
لامسەرلایی: بریتییە لە کردنی کارێک بەنابەدڵ و ناپوختی.
لامشت: د. لالەوێچ.
لامل: لایەک لە مل: دای بەلامـلیـدا. مـەردوومی کـەللەڕەق کـە گوێ نەداتە شت.
لام و جیم: بریتییە لە سەرپێچی و بەهانە هێنانەوه: لام و جیمی نەکەیت .
لامۆیی: بەئاژاڵێک دەوترێ کە تازه کەوتبێتە ناو ڕانێکەوه.
لامەلە: جۆره مەلەیەکە لەسەر تەنیشت دەکرێ.
لامەمک: لادایەن. دوو منداڵی هاوشیر.
لامەمکە: لامەمک.
لامێژی: تێبەردانی بێچووی ئاژاڵێکە کە دایکی نەمابێ، یا بێ شیربێ - لە ئاژاڵێکی تر (طفیلی).
لان: بێشەی شێر. لایەن: (لان)ی من بەرمەده (د).
لان: پیـتـێکە بەهێندێ ناوەوه دەنووسێ دەیکا بەنـاوی جـێگە: هەنگە(لان)، کەنگە (لان). لانە.
لاندک: با. بێشکە.
لانک: بێشکە.
لانکە: لانک.
لانکەیی: دارەڕاکردنی ژووره لە باری پانی.
لانگرتن: د. لایەن گرتن.
لانگیر: د. لایەنگیر. نهێنگر.

لانگیری: لایەنگیری.
لانە: لانی شێر. لۆنە: دوو(لانە).
لانەواز: کەسێکە جێگا و ڕێگای خۆی لێ شێوابێ.
لانەوازی: دەربەدەری لە جێگا و ڕێگا.
لانە و بانە: جێگا و ڕێگای حەسانەوە.
لانەولان: چوون لە لانەیەکەوە بۆ لانەیەکی تر.
لانی: پیتێکە بەهێندێ ناوەوە دەنرێ دەیکا بەناوی جێگا: بەردە(لانی)، سەوزە(لانی) زیخە(لانی).
لاو: کوڕی گەنج. کوڕ (با). لافاو (هـ).
لاواز: گیانداری لەڕ.
لاوازی: لەڕی.
لاواندن: دڵنەوایی کردن.
لاواندنەوە: بەسەر مردوودا هەڵوتن بەدەم گریانەوە. دڵنەوایی کردنی زەبوونێک: ئەو منداڵە بلاوێنەرەوە.
لاوانن: د، لاواندن.
لاواننەوە: لاواندنەوە.
لاوانە: لێواری شت کە بەرزبێ. لاشیپان. دوو تەختەن بەجەمسەری تۆپی جەنجەڕی گێرەوە دەبەسترێن.
لاوانەوە: لاواننەوە.
لاوچاک: کوڕی قۆچاغی جوان.
لاوژا: کاکە.
لاوژۆکە: گەنج.
لاوژە: لاوکێکە کە سەرگوزەشتی دڵداری نیشان بدا. بۆچی؟.
لاولاو: گیایەکی گەڵاپانە تەرز دەهاوێ و بەقەد شتدا هەڵدەگەڕێ. گوڵێکی دەمپانی قنگ تەسک دەگرێ و بە بەیانیان دەگەشێتەوە.
لاونیو: شتی کەش و تووش.
لاووژ: زانین.
لاووک: جۆرە گۆرانییەکی خۆشی کوردییە.
لاووکبێژ: کەسێکە کە لاووک باش بڵێ.
لاولووسە: د. ئارایشتکردن.
لاونا: هـ. لاواندن.
لاوورگە: کەسێکە کە خۆی هەڵواسیبێ بەیەکێکی ترەوە و، هەمیشە لە گەڵیدا بێ و، بەبۆنەی ئەوەوە بەهرەمەند بێ (طفیلی).
لاوە: د. دڵنەوایی. لابە.
لاوەکردن: لاکردنەوە. دڵنەوایی کردن (د).
لاوەکی: بەشتێک دەوترێ کە لە لاوە هاتبێ.
لاوەلا: لابەلا.
لاوەلایی: لابەلایی.
لاوێج: لەوێج.
لاوێژە: با. لاوێکی پچکۆلە.
لاویتە: بێڵەکان.
لایلای: د. لایلایە.
لایلایە: گۆرانییەکە منداڵی ساوای پێ دەکرێتە خەو.
لاین: د. لایەن.
لایەز: ئاومالک.
لایەن: بابەت: لە (لایەن) خوێندنەوە بدوێ. کن: لە (لەلایەن) فیسار کەسەوە هاتووم، یا (لایەن)ی بەرنادەم.
لایەنگر: لایەنگیر.
لایەنگیر: کەسێکە بەکردار یا بەگوفتار لەسەر یەکێک بکاتەوە.
لایەنگیری: گوفتار یا کرداری چاک بۆ یەکێک و لەسەرکردنەوەی.
لایی لایی: د. لایلایە.
لایین: د. لایەن.
لباد: ژێرەخەرێکە لە بەرگنی سووراوە دروست دەکرێ.
لبادە: جۆرە کالایەکی قۆڵداری ناوداری پڕ تەریبە لەسەر کالای ترەوە لەبەر دەکرێ.
لبێ: ل. دەڵەمە.
لپ: لێ: ئەم دارە دوو(لپ)ە.
لچ: لێوی خوار ڕووی گیاندار. قەراغی شت.
لچان: لکانی دوو شت بەیەکەوە. بەستنی ئاو.
لچانلیچ: د. لیپاولیپ.
لچ بردنەوە: د. لچ هەڵقرچاندن لەبەر گریان.
لچ خوارکردنەوە: کۆکردنەوە و خوارکردنەوەی لچ و لێو لەبەر پێ ناخۆش بوونی کارێک.
لچ خوارەوەکردن: د. لچ خوارکردنەوە.
لچ خولدان: د. دەم بادان لە کاتی قسەکردندا.
لچخەنە: د. زەردەخەنە.
لچک: لفکەی مێزەر و سەرپێچ.
لچن: کەسێکە کەلچی ئەستوور بێ.
لچو لێوکردن: برینی لچ و لێوی یەکێک بۆ ڕیسواکردنی.
لچە: لچن. جۆرە ماسییەکە.
لچ هەڵقرچاندن: لچ خوارکردنەوە.
لچ هەڵقورتاندن: لچ هەڵقرچاندن.
لچ هەڵقوڵتاندن: د. لچ هەڵقورتاندن.
لچ هەڵقوڵتانن: د. لچ هەڵقوتاندن.
لرچە: د. نکە و ناڵە، (لرچەلرچ) لرچەی یەک لەدوای یەک.
لرخاندن: لرخەکردن.
لرخن: کەسێکە زۆر بلرخێنێ.

لرخە: جۆرە دەنگێکە وەک کەسێک کە دەست نرابێتە بینی. (لرخەلرخ) لرخەی یەک لەدوای یەک، (لرخ و هوور) لرخە لرخی زۆر.
لرفدان: خواردنی شت بەدەستوبرد.
لرفە: دەنگێکە لە دەمەوە پەیا دەبێ. لە کاتی زۆر سەرمابوون یا شت خواردن بەهەڵپە، (لرفەلرف) لرفەی یەک لەدوای یەک. (لرف و هوور) لرفەلرفی زۆر.
لستن: لستنەوە.
لستنەوە: لابردنی خواردەمەنی شل لە دەفر بەپەنجە یا بەزبان.
لستە و پستە: خواردنی شتێک و لستنەوەی قاپەکەی.
لستە و پستەدان: لستە و پستە.
لغاف: با. لغاو.
لغاو: ئاسنێکی ئەڵقەدارە دەکرێتە دەم و لغاوەی وڵاخەوە و دەستە جڵەوی پێوە دەکرێ و سوار دەیگری بەدەستیەوە.
لغاو شلکردن: بریتییە لە زیادە سەربەستیدان بەیەکێک.
لغاوکردن: بریتییە لە جڵەوگرتنی یەکێک. کردنی لغاو بەسەر وڵاخدا.
لغاو گرتن: بریتییە لەجڵەوگرتنی یەکێک.
لغاوە: دابڕاوی ئەملا و ئەولای دەم.
لغاوبڕکێ: جۆرە برینێکی پچووکە لە لغاوەی مەردووم دێ.
لغاوبڕێ: لغاوبڕکێ.
لغاو هەڵبڕین: توندکردنی لغاوەی وڵاخ.
لغاو هەڵکێشان: لغاوهەڵبڕین.
لف: وێنە و ماندن: من (لف)ی تۆ نیم.
لفانە: گیانداری دووانە. شەنگڵە بەرەکەتە.
لفک: با. لفکەی مێزەر و جامانە.
لفکە: شتێکی زبری شاشی چنراوە لە بەن یا لە گوش مەردووم بەسابوون خۆی پێ دەشوا. کلکی سەرپێچ.
لفکەشامی: بەری گیایەکە وەک لفکە زبرە، خۆی پێ دەشۆرێ.
لفگرتن: د. جووتگرتن.
لفگیری: د. لفگرتن.
لفلف: هەڵەکۆک.
لفە دوانە: د. لفانە.
لڤاندن: ز جووڵاندن.
لڤین: ز. جووڵان.
لق: چڵی درەخت، (لقلق) شتی چڵ چڵ.
لقاو: لغاو.
لقلقی: جۆرە ترێیەکی ئاوییە وەک (مام برایمە) بەڵام ئەم جیرە.
لک: گۆشەی شت: (لکی) بوخچەکە گرێ دە. لق. گرێ.
لکان: نووسانی دوو شت پێکەوە.
لکاندن: نووساندنی دوو شت بەیەکەوە.
لکانن: د. لکاندن.
لک لێبوونەوە: وەچە کەوتنەوەی زۆر لە یەکێک. لق و پۆپ دەرکردن لە درەختێک.
لکمل: د. ئاڵوو.
لکولۆ: چەند گرێیەکە کە لە ئەندام دەرچێ.
لکە: هـ. گرێ.
لکیاگ: د. شتی لکاو.
لکیان: د. لکان. پێوەبوونی سەگ.
لگن: خشتی کاڵ.
لم: زیخی شینکاری زۆر ورد. سک (هـ).
لمبۆز: لمۆز.
لمبیز: با. لمبیس.
لمبیس: با. خورطووم.
لمت: د. جۆرە ملتەیەکە وەک قەوزە.
لمۆز: دەم قەپۆزی هێندێ گیاندار، وەک سەگ و بەراز.
لمووز: لمۆز.
لنج: لینج.
لنجق: ل. لینج.
لنگ: لاق. لنگە.
لنگاران: لنگدان.
لنگاولنگ: گەلاوگەڵ ڕۆین. پێلاوی تاکەوتاک.
لنگداران: د. لنگدان.
لنگدان: تاودانی وڵاخ.
لنگوو: هەویر ترشێکی کەمە کە لە ئێوارەوە بکرێتە ئاو و ئاردی تێکەڵ بکرێ بۆ ئەوەی تا بەیانی بترشێ و لەگەڵ هەویردا تێکەڵ بکرێ.
لنگە: جەواڵێکی گەورەی یەکتاییە، خەلە و خەرمانی پێ دەپێورێ.
لنگەشە: د. گورگەلۆقە.
لنگەشەلێ: هەنگڵەشەلێ.
لنگەفرتێ: لنگدان بەیەکدا لە پاڵەوە .
لنگەفرە: لنگەفرتێ.
لنگەفرێ: لنگەفرتێ.
لنگەوتلوور: پاڵکەوتن و لنگ ڕاکێشان.
لنگەوژوور: کەوتن و لنگ بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان.
لنگەوقووچ: لنگەوژوور.
لنگەلەرزێ: لنگەلەرێ.
لنگەلەرێ: لەرزینی لنگ لە ترسا یا لە سەرما.

لۆ: گیایەکی بەهارییە وەک کەما بەڵام ئەم باڵای بەرزتر و گەڵای وردترە، دەدرێ بەئاژاڵ. هەودایەک لە ڕێسراو. لایەک لە شتێکی نوشتاو: جاجمەکە دوو (لۆ) کە. پیتی پرسیارە وەک (بۆچی)؟.
لیسپ: (لۆ)یەکی پرچی بگرە وتەیەکە مەردوومی هیچ و پووچی پێ بانگ دەکرێ(ز). وتەیەکە نێرینەی پێ بانگ دەکرێ(ز).
لوان: لووان.
لۆبت: مەردوومی قۆچاغی ئازا.
لوبیا: ماشە سپی.
لۆپ: ز. پۆشاکێکی ئاودامانی ئەستوورە.
لۆپت: لۆبت.
لۆپک: ز. داهۆک.
لۆترەوان: کەسێکی تەڵەکەبازە کە قسەی هیچ و پووچی بێ پەردە بکات.
لۆترەوانی: تەڵەکەبازی و ساختەچێتی و قسەی بێ کەڵک و سوودکردن.
لۆتک: ز. هەڵپەڕین لە خۆشیاندا.
لوتکە: ملەی سەرشاخ.
لۆتە: ترێی بۆڵ سیس.
لۆتەخۆر: بریتییە لە مەردوومی پیسخۆری پاشماوەخۆر.
لۆتەخۆری: پیسخۆری و پاشماوەخۆری.
لۆتەر: لۆبت. تەشی.
لۆتیانە: پارەیەکە کە لۆتی دەیسێنێ.
لۆتێتی: لۆتێنی.
لۆتێنی: گەڕان و پارە بەفیڕۆدان و کەیفکردنی کوڕی گەنج بەکاڵای جوانەوە.
لۆتی: کەسێکە کە شایی بگێڕێ یا مەیموون و ورچ هەڵپەڕێنێ. کوڕی گەنج کە خۆی جوان بکا و سەرسەری بسووڕێتەوە.
لۆتی خۆر: کەسێکە شتی ئەم و ئەو بەڕیسوایی بخوا.
لۆتیگەری: گوزەرانکردن بەشایی گێڕان و مەیموون و ورچ هەڵپەڕاندن.
لۆچ: چرچی شت، (لۆچ لۆچ) چرچی زۆر. وتەی پرسیارە وەک (بۆچی)؟.
لۆچاو: د. شەپۆلی ئاو.
لۆچکە: د. لەواشەی لچی کەر.
لۆچی: بۆچی.
لۆخ: پێستێکی تەنکە لە ناوەندی گۆشت و پێستی گیاندارادا (د).
کەرەپوو (د). بەفرێکە بەهوی باران یا گەرماوە ئاوی لێ هەڵنیشتبێ.
لۆخانە: د. هەزار لۆغانە.

لۆدە: کادانێکی درێژە لە تەنشت ئاواییەوە لە قوڕ بەرز دەکرێتەوە تا پشتێنەیەک و پڕ دەکرێ لە کا و بەقۆقزی سەرەکەی سواغ دەدرێ.
لۆر: لۆرک. مەڵبەند(د). باری گران: کەوتووە بە(لۆر)ی خۆیدا (د).
لۆراسی: د. لۆریاسی.
لۆرت: مەردوومی زۆر دەوڵەمەند.
لۆرتە: لۆتە.
لۆرد: لۆرت.
لوڕ: تیرەیەکی گەورەیە لە کورد لە نزیک کرماشانەوە.
لۆڕک: ژاڵە.
لوڕی: زبانێکە کە تیرەی لوڕ قسەی پێ دەکا. جۆرە کورتانێکی درێژکۆلەیە.
لۆرک: جۆرە خواردەمەنییەکە لە ئاوی پەنیر دروست دەکرێ. فرۆ (با).
لۆرکە: ناوە بۆ جۆرە گۆرانییەک.
لۆرە: لەبەرخۆوە گۆرانی وتن. لۆرەلۆر: لۆرەی یەک لەدوای یەک.
لۆرە لەپ: دوو دارە بەمسەر و بەوسەری مەشکەوە (دۆژەنک) یان تێ دەبرێ و، لەکاتی ژەندنیدا دەستی پێوە دەگیرێ.
لۆریاسی: جۆرە کاڵەک و شوتییەکی درێژکۆلەی زلە.
لۆری: سابرێنێکە کە لە ڕانێکەوە بچێ بۆ ڕانێکی تر بۆ تەگە و سواربوون. ئۆتۆمۆبێلی گەورەی بار.
لۆزەندەر: مەردوومی زەبەلاح.
لۆزەو: هەڵڕژان بەزۆری.
لۆژ: پیاوی سستی تەمەڵ.
لۆژە: بێ هێزی و بێ تینی گیاندار بەهۆی نەخۆشی یا برسێتییەوە، (لۆژەلۆژ) لۆژەی یەک لەدوای یەک.
لۆس: چەند دارێکە ڕاست و چەپ بەگوریس هەڵبەسترابێ لە شتێکی قورس کە دەست لێی گیر نەبێ بۆ هەڵگرتنی لۆسەکە. گیانداری تەمەڵ. (لۆسبوون) تەمەڵبوون.
لۆسبوون: ئامۆژگاری وەرنەگرتن: مێشکی لۆس بووە، قسەی پێوە ناوەستێ.
لوسکە: کوڕی لووس و پووس کە لای پیاوێک بێ.
لوسکەبازی: د. هەتیوبازی.
لۆسەکە: گیایەکە بنکەکەی وەک بنکی هەڵەکۆک وایە بەڵام تۆزێ گەورەترە دەخورێ.
لۆش: ز. نانێکە هەویرەکەی هەڵ نەهاتبێ.
لۆشکە: جۆرە دەنگێکە لە ولاخی یەکسمەوە دێ لە کاتێکدا کە ئالیک یا ئاوی بۆ دەبەی یا بەچکەی خۆی دەبینێ. جۆرە گریانێکە بە لووت، (لوشکە لوشک) لوشکەی یەک لەسەر یەک. جووتە وەشاندنی ولاخ.

لۆشکە: د. لۆچکە.
لۆشمە: د. جۆرە گیایەکە.
لۆغە لۆغ: دەردێکە پەیدا دەبێ لە گەروودا: یاخوا لۆغەلۆغت پێ کەوێ.
لۆق: لە ئەژنۆ بەرەوخواری گیاندار. لۆقە (د).
لۆقاندن: د. لۆقەکردن.
لۆقانن: د. لۆقاندن.
لۆقلۆقی: شتی لۆقن.
لوقمە: قاپشێکە لە قەڵتاغی ئاوزەنگی وڵاخ هەڵدەکێشرێ.
لوقمەکردن: گرفتکردن.
لۆقن: شتی لۆق درێژ.
لۆقــە: ڕۆینی وڵاخــە لە ناوەندی ڕەوت و چوار ناڵەدا، (لۆقــە کردن) غارکردن بەلۆقە، (لۆقەلۆق) لۆقەی زۆر.
لۆق هەڵهێنان: ڕۆیشتن بەخێرا و بە هەنگاوی زل.
لۆق هەڵهێنانەوە: لۆق هەڵهێنان.
لۆقین: ز. ڕۆیشتن بەخێرا و بەشپرزەیی.
لۆک: جـۆرە دەرمـانێکی سـوورە کـاغـەز و هێندێ شـتـی تری پێ چەسپ دەکرێ بۆ ئەوەی کـە دەسـتـکاری نەکـرێ. مـەردوومی ئازا (ز). حوشتری ڕەسەن (ز) حوشتری نێر.
لۆکاندن: گەوزاندن و دەستبازیکردن. بریتییە لە گاین (ز).
لۆککردن: لۆکنان بەکاغەز و شتی تردا.
لۆکە: بەری پەموو.
لۆلکە: قەپاغی زەیستان.
لۆلۆ: ز. جۆرە گۆرانییەکە.
لۆلە: وتەیەکە لە رووی خۆشەویستییەوە بەمنداڵ دەوترێ.
لۆلەپ: لۆرە لەپ.
لۆمە: سەرزەنشت.
لۆنگ: کەوڵپێۆست (هـ). پەشتەماڵ (د).
لۆنە: لۆی شـتی باریکی ڕێسراو لە دەزوو یا بەن یا لە شـتی تر: کشتەکی دوو(لۆنە) یا سێ(لۆنە).
لوو: گۆشتـپـارەیەکی خڕی ڕەقە لە ئەندامی هێندێ گـیـاندار پەیا دەبێ. وتەیەکــە بەکــاردێنرێ لە جــیــاتی وتەی (ئەو) بۆ نێرینەیەک کە نادیاربێ، یا ڕووی گفتوگۆی تێ نەکرێ (ز). گیای لۆ (د).
لووا: بەرگن.
لووان: گونجان و هەڵسووڕان: بۆم (نالوێ). ڕۆیشتن (هـ).
لووای: هـ. ڕۆیشتن.
لووت: ئەندامـێکی بەرزە بەناوەڕاسـتی دەمـوچاوی گـیـاندارەوە، دوو کونی تێدایە بۆنی لێوە دەکا.
لووتاوێژ: د. لووت هەڵکردن لە شتێک لەبەر حەز لێ نەکردنی.
لووت بەبەرخۆداهاتنەوە: بریتییە لە عارنان و پەشیمانبوونەوە لە شتێک.
لووت بە خۆداهاتنەوە: لووت شکان.
لووتپژان: خوێنی لووت بەربوون.
لووتچووزانەوە: بریتییە لە زۆر پێ ناخۆشبوونی قسەیەک.
لووتخـواری: بریـتـیـیـە لە دڵـگـیـری و ناڕەزایی لە شـتـێک: فـلان کەس لووتی لێم خوارە.
لووت داژەندن: بریتییە لە ماتی و زویری.
لووتسۆڵانەوە: د. لووت چووزانەوە.
لووت شکان: بریتییە لە دەماخ شکانی یەکێک.
لووت شکاندن: بریتییە لە دەماخدانی یەکێک.
لووت لێخوران: بریتییە لە ئارەزووکردنی شتێک.
لووت لێخوریان: لووت لێخوران.
لووتوبزووت: وتەیەکـە لە هێندێ شـوێندا بەکـاردێنرێ لە جـیـاتی وتەی (کوتوپڕ): دوێنێ (لووتوبزووت) تووشی فیسـار کـەس بووم.
لووتوپووت: بریتییە لە پرت و بۆڵ.
لووتوو: جۆرە ماسییەکی زلی لووت درێژە.
لووتە: مەردوومی لووت کورتی پچکۆلە. لوتکە (د).
لووت هاتنەخوارەوە: د. لووت شکان.
لووتەلا: مەردوومێکە کە لووتی لێت خواربێ.
لووتەلایی: بوونی یەکێک بەلووتەلا.
لـووتـەوانـە: ئـەڵـقـــــە یـا سـنـگـێـکـی زێڕ یـا زیـوە، ژنـان دەیـکـەنـە لـووتـیـــان. زبـانـەیـەکـی دارینـە لـەســـەر بـاری درێژی دەدرێ لـە دوودەری و پەنجەرە بۆ ئەوەی نەکرێتەوە.
لووت هەڵکردن: بریتییە لە زویری و دڵگیری لە یەکێک.
لووراندن: تێهەڵکردنی سەگ و گورگ بەلوورە.
لوورانن: د. لووراندن.
لووڕ: با. ژاڵە.
لوورک: با. لووڕ.
لوورە: جــۆرە دەنگێکی درێژە لە ســەگ و گــورگـــەوە دێ، (لوورەلوور) لوورەی یەک لەدوای یەک.
لوورەکردن: لووراندن.
لووزەو: ڕێژەوی زۆر (تیار). بەتوندی هەڵرژان.
لووس: شتێکە کە زبر نەبێ. تاڤگە. بریتییە لە کوڕێک کە مووی لێ نەهاتبێ.
لووساووک: پلوسک.
لووسایی: شوێنی لوس لە شتێک.
لووسکاری: پەرداخکردنی شت.
لووسکردن: نەهێشتنی زبری شت.

لووس و پووس: شتی زۆر لووس.
لووسی: لووسایی.
لووشاندن: لووشەکردن.
لووشە: دەنگێکە لە دەمەوە دێ لەکاتی هەڵقوراندنی شتی شلدا، لووشە لووش: لووشەی یەک لەدوای یەک. گیایەکی بەهاری گەڵا پانە، دەکرێتە دۆکولێوەوە. جۆرە دەردێکە تووشی ولاخی بەرزە دەبێ.
لووشەکردن: پەیاکردنی لووشە لە دەمەوە.
لووشین: د. لووشەکردن.
لووق: با. قونەی باڵدار.
لووگی: مەردوومی سەرسەری.
لوول: شتێکە لە خۆیا گرژبێ و پێچی خواردبێ. مەست (د).
لوولاق: ئێسقانی خوار ئەژنۆ تا قولەپێ.
لوولبوون: کرژبوون و پێچخواردنی شت. بریتییە لە قەڵەوبوون.
لوولدان: لولکردنی شت. بریتییە لە خواردنی شتێک بەهەڵپە و دەستوبرد.
لوولک: جۆرە لوولەیەکە لە قامیش، یا شتێکی تر، چەند کونێکی تێدایە، فووی پێدا دەکرێ و دەنگێکی خۆشی لێ پەیا دەبێ، لوولوو.
لوولکردن: پێچانەوەی شت.
لوولک ژەن: کەسێکە کەلوولک باش لێ بدا.
لوولکە: لوولوو.
لوولگ: لوولک.
لوولوو: بەکرەیەکە کە ریسی لەسەر هەڵکرابێ بۆ خستنە ناو مەکۆی جۆلاییەوە.
لوولە: جۆرە شتێکی بۆشی باریکی کوناودەرەی ڕاستە.
لوولەبەند: لوولە و زنجیر.
لوولەدار: بزن و مەڕێکە کە گوانی ئەستوور و درێژ بێ.
لوولەژەن: لوولک ژەن.
لوولەساز: ئاسنگەرێکە کە لوولەی تفەنگ داڕێژێ.
لوولەک: لوولەیەکی بۆشە، هەردوو سەری کراوەیە، بەڵام ئەم گەورەیە وەک بۆڕیەی سۆپا (اسطوانە) .
لوولەکردن: لوولکردن.
لوولەکی: شتێکە وەک لوولەک وابێ.
لوولە و زنجیر: جۆرە خشڵێکی زێڕینە چەند لوولەیەکی تێدایە ژنان ڕاست و چەپ دەیکەنە ملیان.
لوولەینە: د. لوولێنە.
لوولێ: هـ. لوولک.
لوولیان: د. پێچران و لوولبوونی شت.
لوولێنە: گۆزەڵەی دەسک و لوولەدار.

لوێچ: لەوێچ.
لوێخەڕوو: ل. ڕیخۆڵە.
لوێشک: با. کولێرە. لووشە.
لۆیە: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (بۆیە).
لە: پیتێکە بۆ گەلێ مەبەست هاتووە، (١) بۆ دەستکردن بەشتێک کە خاوەنی بڕانەوەبێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک یا لە کاتێکەوە بۆ کاتێک، (لە) سەرەتای کتێبەکەوە تا دواییم خوێندەوە، یا (لە) بەیانییەوە تا نیوەڕۆ ڕۆیشتم. (٢) بەمەعنای (هێند) هاتووە: (لە) هەموو میوەیەک بخۆ واتە لە هەر جۆرە هێندێک. (٣) بۆ باسکردنی ئەسڵی شتێکە: ئەم گوارەیە (لە) زێڕ و ئەم بازنە (لە) زیوە، واتە لە زێڕ و زیو دروست کراون. (٤) دەچێتە سەر هۆی شت: (لە)بەر تۆ هاتم، واتە بوونی تۆ مایەی هاتنی من بوو. (٥) دەچێتە سەر باو بەسەردادراو (مفضل علیە): نووسینی من لە هی تۆ جوانترە: (٦) لە سەرەتای وتارەوە بەگەلێ مەعنای تر دێ وەک بڵێیت: (لە) کوێ بوویت؟ یا (لە)چی دەگەڕێیت؟ یا (لە)بەرت مرم، یا (لە)چاوی منت کەوی. (٧) زیاد دەبێ لە وتاردا. بەم ڕەنگە لە فرێدانیدا زیانێک پەیا نابێ مەگەر لە هۆنراوەدا نەبێ کە وەزنەکەی تێک بچێ: (لە)بۆ خەڵقی خەڵات بەخشانی ماچە، واتە بۆ خەڵقی.
لە ئاودان: بریتییە لە فیرۆدانی شت.
لهازە: با. نوێڵ.
لەب: لێو.
لەبا: بەبا: ئەو دەڵەسەگە (لەبا)یە، واتە بەبایە.
لەباتی: لەجیاتی.
لەبادە: د. لبادە.
لەبار: شتێکە کە بۆ کارێک باش بگونجێ: نەریمان بۆ خوێندن (لەبار)ە.
لەبارابوون: تەوانایی یەکێک بۆ کارێک: سالار (لە بارایەتی) بخوێنێ.
لەباربوونەوە: د. بریتییە لە منداڵبوونی ئافرەت.
لەبارچوون: منداڵ فڕێدان بە نەبەکامی.
لەبارچوونەوە: د. لە سک وەستانەوەی ئافرەت.
لە بارە: لە بابەت: دوێنێ لە بارەی فلان کەسەوە دوایت، واتە لە بابەت ئەوەوە.
لەبان: گیایەکی گەڵا پانی ئاوی درێژە حەسیری لێ دروست دەکرێ.
لەبڕ: لە گۆترە: (لەبڕ) ئەم کارەم بۆ بکە.
لەبڕ بوونەوە: بریتییە لە لەڕبوون و لاوازبوون بەهۆی نەخۆشییەوە.

لەبرێژ: شتێکە کە پڕ بێ و بەلێواریدا بێتە خوارەوە.
لەبرەچوون: زۆر برژانی هێلکە. زۆر سـوورەوەبـوونی (کڵ) بەجۆرێک کە زۆر لە ئەندازەی خۆی تێپەڕیبێ.
لە برێتی: لە بریتی.
لە بری: لەجیاتی.
لە بریتی: لەباتی.
لەبزەرینە: د. چێشتێکە لە ساوەر و نیسک دروست دەکرێ.
لەبزینە: جۆرە خواردەمەنییەکی شیرینە، لە شەکر و ئارد و گوێز، یا بادام دروست دەکرێ.
لەبلەب: جۆرە کۆترێکە.
لەبلەبی: نۆکی سوێرکراوی برژاو.
لەبۆ: وتەیەکە بەکاردێنرێ لەجیاتی وتەی (بۆچی). بۆ.
لەبە: گۆشتی چەوری بەزاوی.
لەبەر: وتەیەکە هۆی شتی پێ باس دەکرێ: (لەبەر)تۆ هاتم. وتەیەکە پرسیاری هۆی شتی پێ دەکرێ: (لەبەر)چی هاتیت؟.
لەبەرچاو: شتێکی دیاری ئاشکرایە کە بەرچاوی هەموو کەس بکەوێ.
لەبەرچاوکەوتن: بێزرانی شت لە مەردووم.
لەبەرچوون: سووکی کارێک لەسەر شان و تەواوبوونی بەئاسانی: کاری تۆم زوو (لەبەر دەچێ) یا ئەم فرمانەم هەر (لەبەر ناچێ).
لەبەرچوونەوە: د. لەبارچوونەوە.
لەبەرچی: بۆچی.
لەبەردان: بریتییە لە بەفیڕۆدان و لەناوبردنی دارایی: فیسار کەس هەرچی بوو (لە بەردی دا).
لەبەررۆیشتن: لەبەرچوون.
لەبەررۆین: لەبەررۆیشتن.
لەبەرکردن: پۆشینی کاڵا. خستنە یاد و جێگیرکردنی شتی نووسراو، یا بیستراو لە مێشک و دڵدا: دەرسەکەم (لەبەر کرد).
لەبی: لەبێ.
لەبێ: با. بەڵێ.
لەبیتاندن: ز. جووڵاندن.
لەبیتین: ز. جووڵان.
لەبیخە: با. لە پەیەکە لە ئارد، یا لە برویش، کە بخرێتە سەر پارچە قوماشێک بۆ ئەوەی کە لەسەر ئێش و ئازارێک دابنرێ.
لەبیربوون: مانی شتێک لە بیرت.
لەبیرچوون: دەرچوونی شت لە یاد.

لەبیرچوونەوە: لەبیرچوون.
لەپ: بەری دەست. لێوی ئەستوور (د). (لەپەلەپ) پەلەکوتی.
لەپارە: پارچەیەکی پانی ئەستوورە لە هەموو شتێک کە بەقەد لەپەدەستێک بێ. گۆژمەی گوێز و توو (ه).
لەپاش: وتەیەکە بەکاردێنرێ لەکاتی تەواوبوونی وتارێک و دەستکردن بەوتارێکی تر.
لەپاشا: لەپاش.
لەپاشان: لەپاش.
لەپاشانا: لەپاشان.
لە پاکەوتن: د. لە پێ کەوتن.
لەپان: د. پاژنەی پێ.
لەپڕ: ناکاو.
لەپڕا: لەپڕ.
لەپکە: جۆرە کووژەکەیەکی شینە بەناوچەوانی منداڵدا هەڵ دەواسرێ بۆ چاوەزار، گوێچکە ماسی.
لەپماڵ: سواغدان بە لەپی دەست.
لەپۆرت: ه. پەپکە هەنجیر.
لەپ و لەوس: دەم و قەپۆز.
لەپە: چێشتی نە زۆر شلی نە زۆر توند. لەتکەنۆک. سواغ (د). لەبرێژ (د).
لەپەتیر: ز. کەشکەک.
لەپەکوتێ: دەستکوتان لەبەر نەبینین.
لەپەوروو: بەسەر دەدما پاڵکەوتن.
لە پێست چوونەدەرەوە: بریتییە لە تووڕەبوون و دڵتەنگ بوون لە شتێک: لە داخی نەریمان کە ناخوێنێ وەختە لە پێست بچمە دەرەوە.
لە پێست دەرچوون: لە پێست چوونەدەرەوە.
لەپێش: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بوونی شتێک لەپێش شتێکی تردا: ئەو لەپێش ئەمدا هات.
لەپێک: ز. دەستکێشێکە دەکرێتە دەست.
لەپێکردن: پێ کردن بەپێلاو و گۆرەوی و دەرپێدا.
لەپێ کەوتن: نەمانی هێزی ڕۆین.
لەت: کەرتی شت. (لەت لەت) شتی لەتوپەت.
لەتان: بێ دەنگبوون. نەجووڵان.
لەتاو: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (لەبەر) و هەمیشە پێویستە هۆکەی لە دوایەوە بێ: (لەتاو) ئازار خەوم لێ ناکەوێ.
لەتاوا: لەتاو، بەڵام ئەم هۆکەی پێشی دەکەوێ: ئیمشەو سەرم زۆر دەیەشا (لەتاوا) خەوم لێ نەکەوت.
لەتاوان: لەتاوا.

لەتاوانا: لەتاوا.
لەتبوون: دووکەرتبوونی شت.
لەتر: ڕەت: بە(لەتر) ڕۆی.
لەتربردن: ڕەتبردن.
لەتردان: ڕەتدان.
لەتک: د. لەتی پچووکی شت.
لەتکردن: دووکەرتکردنی شت.
لەتکە: لەتی هەرمێ، یا تەماتەی وشک کراو.
لەتکەنۆک: نۆکی دوولەتکراوی پووش لێ گیراو.
لەتکەوەچوون: بەمنداڵێکی یەک ساڵانە، یا دوو ساڵانە دەوترێ کە بگری بەکوڵ بەجۆرێک کە چەند هەناسەیەک دەنگی دەرنەچێ لەبەر جەختی گریانەکەی.
لەتوپەت: شتی لەت لەتی ونجڕ ونجڕ، (لەتوپەتبوون) لەتبوونی شت بەزۆری، (لەتوپەتکردن) لەتکردنی شت بەزۆری.
لەتوکەت: لەتوپەت.
لەتە: د. لەت.
لەتەچن: د. سواڵکەرێکە کە لەتە نان بچنێتەوە.
لەتەچنی: د. سواڵکردن بۆ کۆکردنەوەی لەتە نان.
لەتەر: لەتەرە. بەلەک.
لەتەرە: هـ. تەشی.
لەتەرە بۆق: د. بریتییە لە مەردوومی سک زل.
لە تەک: د. لەگەڵ.
لە جووت چوون: باش ئیش نەکردنی ئاشە بەهۆی نارێکی تەوەرەوە: ئەم ئاشە لە جووت چووە.
لەجەر: گیانداری لاواز. ڕژدی چرووک.
لەجیاتی: لەباتی.
لەجێ چوون: ترازانی جومگەی ئەندام.
لەجێگەچوون: د. لەجێ چوون.
لەچاو: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بەرامبەری کردنی دوو شت بەیەک لە شتێکدا: ئەمە (لە چاو) ئەوەدا باشە یا خراپە.
لەچاوچوون: بەچاوەوەبوون: زۆر خۆت هەڵ مەکێشە (لە چاو دەچێیت).
لەچاو گیران: وتەیەکە چاکەی یەکێکی پێ دەدرێتەوە بەچاوی یەکێکدا کە سوپاسی ئەو چاکەیە نەکا.
لەچک: پارچەیەکی چوارگۆشەیە لەسەر و مل دەئاڵێنرێ و گرێ دەدرێ. دەسماڵی کۆڵی ژنان.
لەچک بەسەر: لەچک بەسەرە.
لەچک بەسەرە: بریتییە لە ئافرەت
لەچککردن: ئاڵاندنی لەچک لە سەر و ملەوە.
لەچەر: ڕژدی چرووک.
لەچەری: ڕژدی و چرووکی.
لەچەک: لەچک.
لەچی: لەبەرچی.
لەحیم: شتێکە لە قەڵایی و نەوشاتر دروست دەکرێ، تەنەکە و مس و هێندێ شتی تری بەئاگر پێ لێک دەدرێ، (لەحیم کردن) پێکەوە لکاندنی دوو شت بەلەحیم.
لەحیمکاری: کاری لەحیم کردن.
لە خرتکە چوون: لەجێ چوونی جومگەی ئەندام.
لەخرین: با. کەسێکە کە بەیانی هیچی نەخواردبێ.
لەخشان: لەخشین.
لە خشتەبردن: بریتییە لە هەڵخەڵەتاندن و لە ڕێ دەرکردنی یەکێک.
لەخشتەچوون: هەڵخەڵەتاندن.
لەخشە: جووڵەی شت لەجێی خۆی.
لەخشیان: د. لەخشان.
لەخشین: تێکچوون و جووڵانی شت لەجێی خۆی.
لەخۆبووردن: دەست هەڵگرتن لە ژیانی خۆت لەسەر شتێک.
لەخۆ ڕابینین: دەسەڵات و بەخۆدا ڕاپەرموون لە کارێکدا.
لەخۆڕادیتن: لەخۆڕابینین.
لەخۆبوونەوە: عوزر هێنانەوە بۆ یەکێک لەگەڵ تەریقیدا.
لەخۆچوون: بێ هۆش کەوتن.
لەخۆخەفتن: کەسێکە کە ئاگاداری پاک و تەمیزی خۆی بکات.
لەخۆدەرچوون: د. بریتییە لە فیز پەیاکردن.
لەخورێن: لە خرین: لە خورێنی چامەخۆرەوە.
لەخۆکردن: دڵگیرکردنی یەکێک لە خۆت.
لەخۆگۆڕان: بریتییە لە فیز پەیاکردنی یەکێک.
لەخۆوە: بەشتێک دەوترێ کە کەس دەستی تێدا نەبێ: لە خۆمەوە چووم، یا لە خۆیەوە هات.
لە خەم ڕەخسین: بریتییە لە کزربوون و پێگەیشتنی شتێک.
لەداردان: هەڵواسینی مەردووم بەداردا.
لەداودەرهاتن: د. ڕزگاربوون لە تەنگانەیەک.
لەدوودان: لغاو شلکردن بۆ یەکێک.
لەدەستچوون: بریتییە لە نەمان و لەناوچوونی شتێک.
لەدەستدان: بریتییە لە لەناوبردنی شتێک.
لەدەستدەرچوون: دەرچوونی شتێک لەژێر دەستت کە بۆی پەشیمان بیت.
لە دەست کەفتن: د. لەدەست کەوتن.
لەدەستکەوتن: بریتییە لە دەوڵەمەندبوون.
لەدەستهاتن: دەسەڵات و تەوانایی یەکێک بەسەر کارێکدا: فیسار کەس لە دەستی دێ یارمەتیت بدات.

لەدەفی: د. هەرزەیی.
لەدەم دەرپەڕین: دەرپەڕینی وتە لە دەم بەڕەنگێک کـــە لێی پەشیمان بیت.
لەدەم دەرچوون: لەدەم دەرپەڕین.
لە دەماخدان: شکاندنی لووتی یەکێک و لە کەیفدانی.
لەدەماغدان: لە دەماخدان.
لەدەمەوەدان: دووچارکردنی یەکێک بەتێچاندن بۆی لای یەکێکی تر.
لەدەورگەڕان: خۆگێڕان بەدەوری یەکێکدا بۆ ئەوەی بەڵاکەی ئەو لەو کەسە کەوێ.
لەراندن: جووڵاندنی شت.
لەراندنەوە: جووڵاندنەوە.
لەرانن: د. لەرانن.
لەراننەوە: د. لەراندنەوە.
لەرانەوە: لەرینەوە.
لەڕ: گیانداری لاواز. ناوی تیرەیەکی گەورەیە لە کورد (ز).
لەڕک: لاکی لەڕی لاواز.
لەڕوو: شتێکە بەڕووەوەبێ و دیار بێ.
لەڕوودا دامان: ڕووگیربوونی یەکێک بەرامبەر بەیەکێک.
لەڕوودان: دانەوەی شتێکی ناشیرین بەڕووی یەکێکدا.
لەڕەبا: جۆرە بادارییەکە دووچاری گیـاندار دەبێ و، تا دێ لەڕی دەکا.
لەڕێ دەربردن: بریتییە لە هەڵخەڵەتاندن و هەڵفریودانی یەکێک.
لەڕێ دەرچوون: بریتـییـە لە لادانی یەکـێک لە ڕەوشت و خـووی جوان.
لەڕێ لادان: لەڕێ دەرچوون.
لەڕی: لەجەری و کەم گۆشتی.
لەرز: نەخـۆشـیـیـەکـە دووچاری هێندێ کـەس دەبێ هەمـوو لەشی دێتە لەرزە لە سەرماندا.
لەرزان: شتێکە کە بلەرزێ: لەرزانە ئەوریشە.
لەرزانە: پۆیلەی سەری ژن. جۆرە گۆرانییەکی کوردییە (د).
لەرزانەوە: لەرزینەوە.
لەرزبرین: نوشتە نووسین بۆ یەکێک، کە تووشی لەرز بووبێ.
لەرز بۆ برین: بریتییە لە تۆقاندنی یەکێک.
لەرزک: با. لەرزۆک.
لەرزگرتن: لەرزهاتن لە یەکێک.
لەرز و تا: جۆرە نەخۆشییەکە لە پێشەوە بە لەرز و لە پاشا بە تا دەیگرێ.
لەرز و تادار: کەسێکە دووچاری لەرز و تا بووبێ.
لەرزۆک: گیاندارێکە کە ئەندامی بلەرزێ.
لەرزە: لـەرینـەوەی ئەندام یا شــتی تر، (لـەرزەلەرز) لـەرزەی یەک لەسەر یەک.
لەرزهاتن: لەرزگرتن.
لەرزەک: بوومەلەرزە، زەوی سستەک.
لەرزین: جـوولانـەوەی ئەندامی گـیــاندار، یەک لـەسـەر یـەک لە سەرما یا لە ترسا.
لەرزینەوە: لەرینەوە.
لەرۆک: شتێکە لەوانەبێ کە بلەرێتەوە.
لەرە: جــووڵە و لەرینـەوەی شت، لـەرەلەر: لـەرەی یەک لە دوای یەک.
لەرینەوە: لەرەلەری شت.
لەز: با. پەلە و خێرایی: نەریمان بە(لەز)ە. واتە بەدەستوبردە.
لەزاندن: ز. پەلەکردن.
لە زک: نزیک: لە زک بوو بێم بۆ لات.
لەزکرن: ز. لەزاندن.
لە زک وەستانەوە: سک نەکردنی ئافرەت لەبەر پیری.
لە زک وێستانەوە: لە زک وەستانەوە.
لە زکەوچوون: د. لە سک وەستانەوە.
لە زگ وەستانەوە: لە زک وەستانەوە.
لە زگ وێستانەوە: لە زک وێستانەوە.
لەزگین: کەسێکە کە زۆر بەپەلەبێ.
لەزین: ز. لەزاندن.
لەسەر: وتەیەکە بۆ بڵندی بەکاردێنرێ: باگردێنەکە (لەسەر) بانە.
لەسەرچوون: د. لەبیرچوون.
لەسەرخۆ: گـیانداری هێدی و شێنەیی، (لەسـەر خۆبوون) بوونی گیاندار بەهێدی و شێنەیی.
لەسەرخۆچوون: بێ هۆشکەوتنی گیاندار.
لەسەرخۆیی: هێدیێتی و شێنەیی.
لەسەردەستان: ژنێکە کە ژانی پێدابێ و منداڵی ببێ.
لەسەرڕۆیشتن: بریتییە لە درێژەدان بەقسەیەک.
لەسەرڕۆین: لەسەرڕۆیشتن.
لەسەر قەراخ: بەرداشێکە کە لەبەر زۆر ئیشکردن ناوەڕاستەکەی چاڵ بووبێ و، زەبر هەر لەسەر قـەراغی بێ: ئەم ئاشە لەسەر قەراغە.
لەســەرکـردن: کـردنی یەکـێک بەهاوبەش، یـا هاوبیـری خـۆت لە شتێکدا.
لەســەرکـردنەوە: یـارمـەتیـدانی یەکـێـکی زەبوون کـە زۆرێکی بۆ هاتبێ.
لەسـەرگرێ: بەرداشـێکە کـە ناوەڕاسـتـەکـەی قۆقـز بێ: ئەم ئاشـە لەسەر گرێیە.

لەسەرەوكردن: د. لەسەركردنەوە.
لەش: جەستە و ئەندامی گیاندار. بریتییە لەپاش و پێشی مەردووم.
لەش بەبار: بریتییە لە كەسێک كە هەر نەخۆش و دەردەداربێ.
لەش بەدۆشاو: بریتییە لە یەكێک كە بەبایەک نەخۆش بكەوێ.
لەش پێس: كەسێكە بەهۆی چوونە لای خێزانی یا بەهۆی شەیتانی بوونیەوە مەلەی كەوتبێتە سەر.
لەش پیسی: بوونی مەردووم بەجۆرێک كە مەلەی لەسەربێ.
لەشی سووک: كەسێكە زۆر بەسووكی هەڵسووڕێ.
لەش قورس: بریتییە لە مەردوومی تەمەڵ. بریتییە لە مەردوومی لەش پیس .
لەش قورسی: تەمەڵی. لەش پیسی.
لەشكر: كۆمەڵی سەرباز.
لەشكر ئارا: گەورەی لەشكر.
لەشكردار: لەشكرەوان.
لەشكرشكێن: مەردوومی ئازای جەنگاوەر.
لەشكركاری: لەشكر كۆكردنەوە و هێنان و بردنی.
لەشكرگا: شوێنی لەشكر.
لەشكرەوان: د. سەرلەشكر.
لەشكری: سەرباز.
لەشكەر: با. لەشكر.
لەش گران: لەش قورس.
لەش گرانی: لەشقورسی.
لەشۆر دەركردن: بریتییە لە دەركردنی شت لە ئەندازەی خۆی.
لەشولار: جەستە و ئەندامی جوانی ئادەمی.
لەشیر برینەوە: برینەوەی منداڵی شیرەخۆرە لە مەمک.
لەعل: جۆرە بەردێكی ئاڵی بەنرخە .
لەعلە: د. لالە.
لەعوزرچوونەوە: لە خوێن وەستانەوەی ژن لەبەر پیری.
لە عوزروەستانەوە: لە عوزرچوونەوە.
لەغاو: لغاو.
لەغاوە: لغاوە.
لەغاوەبڕكێ: لغاوەبڕكێ.
لەغاوەبڕێ: لغاوەبڕێ.
لەغاوهەڵبڕین: لغاوهەڵبڕین.
لەغاوهەڵكێشان: لغاوهەڵكێشان .
لەغەر: ز. گیانداری لەڕ. گۆشتی لەڕ.
لەغەم: قومووشی قووڵی سەر گیراو .
لەغم لێدان: هەڵكەندنی قومووش.
لەڤان: ز. بێ دەنگبوون و دامركان.
لەڤەن: با. قامیش.
لەق: شتێكە كە لەجێی خۆی بجووڵێ: لق (د). گاز (با).
لەقاندن: جووڵاندنی شت لە جێی خۆی.
لەقانن: لەقاندن.
لەقاو: شتی لەقیو. لغاو.
لەقبوون: شلبوون و جووڵانی شت لەجێی خۆی.
لەقكردن: شلكردن و جووڵاندنی شت لەجێی خۆی.
لەقلەق: باڵندەیەكی لۆق و دەنووک و ملدرێژی ڕەش و سپییە. چێشتێكە لە گەنم و كونجی دروست دەكرێ (د).
لەقلەقی: جۆرە ترێیەكی بۆڵ زلی خڕی پێست ئەستووری بۆرە
لەقماڵ: شلبوونی دەستەدووی هەوجارە بە جۆرێک كە گاسن باش نەچێ بەزەوییدا.
لەقمكردن: با. پاچەكۆڵەكردنی بنكی كاڵەک و شووتی و تەماتە و هێندێ شتی تر و، پاڵخستنی لقەكانی و خۆڵكردن بەسەریدا بۆ تەرزهاویشتن.
لەقولۆق: چەند شتێكن كە لە جێی خۆیان ترازابن و لەق بووبن: ددانەكانم (بەقولۆق) بوون.
لەقولەوار: لەقولۆق.
لەقە: لێدان لە شت بەلاقێک. جووڵە، (لەقەلەق) جووڵەجووڵ.
لەقەشێل: شتێكە بەلەقە شێلرابێ.
لەقەفرتێ: لەقە داوەشاندنەوەی زۆر لە پاڵەوە.
لەقەفرە: لەقەفرتێ.
لەقەفری: لەقەفرتێ.
لەقەمگرتن: ڕەخنەگرتن.
لەقەوەشێن: وڵاخی چەمووش.
لەقین: بزووتنی شت لەجێی خۆی.
لەک: ناوە بۆ سەد هەزار. ناوە بۆ تیرەیەک لە كورد.
لە كارتە: د. بێكارەی لەكاركەوتە.
لە كارخستن: پەكخستنی شت لە كار.
لەكۆڵبوونەوە: لە كۆڵكەوتن.
لەكۆڵخستن: بریتییە لە ڕزگاركردنی یەكێک لە شتێكی ناخۆش.
لەكۆڵكردن: بەكۆڵ هەڵگرتنی یەكێک.
لەكۆڵكردنەوە: لەكۆڵخستن.
لەكۆڵكەوتن: بریتییە لە ڕزگاربوونی یەكێک لە شتێک.
لەكۆڵگرتن: لەكۆڵكردن. بەستنەكۆڵی كۆڵوانە.
لەكوێ: وتەیەكە پرسیاری پێ دەكرێ بۆ دیاری كردنی شوێن.
لەكە: پەڵەی چڵكنی شت.
لەكەرەم كەفتگ: د. لە كەرەم كەوتوو.
لە كەرەم كەوتن: لەكاركەوتن.
لەكیسچوو: شتێكە كە لە دەست چووبێ.

لە کیس چووک: د. لەکیسچوو.
لە کیسچوون: لە دەست چوونی شتێک.
لەگام: کەسێکە کە زۆر کلکەلەقێ و ڕووپامایی بکات.
لەگان: لەگەن.
لەگرسە: د. شتی مەیو وەک خوێن.
لەگرە: لێرە.
لەگرەودوا: لە ئێستا بەدواوە.
لەگژ: خەریک: چووم بۆ لای نەریمان دیم لە گژ دەرسەکەی بوو.
لەگلەگ: ز. لەقلەق.
لەگۆچوو: ئەندامێکە لە سەرماندا سڕبووبێ.
لەگۆچووگ: د. لەگۆچوو.
لەگوچوون: سڕبوون لەسەرماندا.
لەگۆڕهاتن: بەرامبەری کردنی یەکێک و زاڵبوون بەسەریدا.
لەگۆکەوتن: لەگۆچوون.
لەگوویدان: وتەیەکە بەیەکێک دەوترێ لە ڕووی سووکییەوە کە لە بابەت شتێکەوە نائومێد بووبێ: برۆ هەر لە گوویی خۆت بدە.
لەگەچوون: دەرچوونی جومگە و لەجێ چوونی.
لەگەڵ: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بوون و هاوڕێیی شتێک لەگەڵ شتێکی تردا: (لەگەڵ) نەریماندا ڕۆیشتم.
لەگەن: دەفرێکی مسینی دەم واڵە.
لەگیرچوون: د. لەگۆچوون.
لەل: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ دەربڕینی مەبەست یا دەرنەبڕینی: ناتوانیت بڵێیت (لەل) یا من ئەو کارە دەکەم تۆ دەتوانیت بڵێی (لەل).
لەلۆ: د. لەلوو.
لەلوو: هـ. جۆلانە.
لەلووک: جۆلانە.
لەلە: کەسێکە کە تەرخان کرابێ بۆ ئامۆژگاری و ئاگاداری کردنی منداڵ، شوێنێکە لە شت کەوا بڕابێ، لەلە کردن: دابڕینی هێندێ شت بۆ مەبەستێک.
لەلەیی: ئامۆژگاری و سەرپەرشتی منداڵ لەلایەن یەکێکەوە کە بۆ ئەوە تەرخان کرابێ.
لەم: سک (هـ). بڕکی ترۆزی و کوولەکە (ز).
لە ماکۆدان: دروێنەی دەغڵ و گیایە بەکەرەنتوو.
لەمپا: چرای بۆریەدار.
لەمپە: با. لەمپا.
لەمپەر: شتێکە کە بکەوێتە ناوەندی دوو شتەوە بەرەنگێک کە لە یەکیان جیا بکاتەوە (حاجز).
لەمساندن: ز. هەردوو دەست خستنەبەر باخەڵ لە سەرماندا.
لەم لاوە: وتەیەکە ئاماژە (ئیشارە)ی پێ دەکرێ بۆ لایەکی نزیکتر لە لایەکی تر.
لەمەڕ: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ پەیوەندی شتێک بەشتێکەوە: ئەمە وڵاخەکەی (لەمەڕ) فەرهادە.
لەمەزەڕینە: هـ. نیسکێنەی سەر بەڕۆن.
لەمەوبەر: بەر لە ئێستا.
لەمەودوا: لەمەولا.
لەمەولا: لە ئێستا بەدواوە.
لەمەولاوە: لەمەولا.
لەمێ: لێرە.
لەمیانە: لەمێ.
لەمێژ: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (دەمێکە). نوێژ و خواپەرستی (ز).
لەن: زیخەڵان و وشکەڵانێکە لەناو چەم و ڕووباردا وەک دوورگە (جزیرە) پەیدابووبێ بە هۆی جیابوونەوەی قۆڵێکی کەم لە ئاوەکە.
لەناوبردن: بریتییە لە نەهێشتنی شتێک لە ئارادا.
لەناواچوو: شتێکە کە نەمابێ لە ئارادا.
لەناوچووگ: لەناوچوو.
لەناوچوون: بریتییە لە نەمانی شتێک.
لەناودان: لەناوبردن.
لەنج: د. ڕق و قین.
لەنجباز: د. قین لە سک.
لەنجە: خۆبادان لە ڕۆیندا.
لەنجەولار: خۆ لارکردنەوە و خۆبادان بەناز.
لەند: دەشتاییەکی نەختی بەرزە لەناو کێڵگەدا کە ئەملا و ئەولاکەی ئاو گرتبێتیەوە، بەڵام ئەو شوێنە بەوشکی مابێتەوە (جزیرە).
لەندک: ز. لانک.
لەندەهوور: مەردوومی درێژی زلی کەتە.
لەنگ: شەل. شیعری نارێک. وێستان لە شوێنێک.
لەنگوچک: فەقیانە.
لەنگە: لەنگین، (لەنگەلەنگ) شەلە شەل. نوێڵ.
لەنگەر: ئاسنێکی قورسە بەزنجیرێکی ئەستوورەوە کەشتیوان لەکاتی وەستاندنی کەشتیدا داڕۆچکەی ناو ئاوی دەکا بۆ ئەوەی کە بوەستێ. وەزن و کێش: ئەم دوو شیعرە هاولەنگەرن.
لەنگەرگا: شوێنێکە کە کەشتی لەنگەری تێدا بهاوێ.
لەنگەر فڕێدان: لەنگەر هاویشتن.
لەنگەرگرتن: وەستان و نەبزووتنی باڵدار لە حەوا و کەشتی لە ئاودا.

لەنگەر هاویشتن: لەنگەرگرتنی کەشتی.
لەنگەری: شتێکی دارینە وەک سینی، دانەوێڵەی پێ تەتەڵە دەکرێ.
لەنگەکردن: شەلیین لە ڕۆیندا.
لەنگێزە: بارانی خوڕەمی بەتاو.
لەنگی: شەلی.
لەنگین: شەلین.
لەنێوبردن: لەناوبردن.
لەنێوچوون: لەناوچوون.
لەو: لێو (ل). لە ئەو: لەوی وەرگرە، واتە لە ئەو.
لەوازە: ئەو تێلاّیانەن کە وەک (لەنگە) بەیارمەتی (گردەڵە)وە بەرداشی پێ دادەگرن و سەری دەخەنەوە.
لەواسە: بەری دەست و پێ.
لەواش: پەلی گیاندار. لەواشە (د).
لەواشە: جۆرە نانێکی ئەستوورە. دارێکی دووفاقە دەکرێتە لچی کەر و ئێسترەوە لەکاتی ناڵکردنیاندا و سەرەکەی توند شەتەک دەدرێ.
لەوان: لەبان، وتەیەکە ئاماژەی پێ دەکرێ بۆ چەند کەسێکی نادیار.
لەوانە: وتەیەکە ئاماژەی پێ دەکرێ بۆ چەند کەسێکی دیار.
لەوتاندن: با. پیسکردن.
لەوج: د. گەوج.
لەجڕ: چەنەباز.
لەوچە: قــــوچە، (لەوچەلەوچ) لەوچەی یەک لەدوای یەک. چەنەباز (ز).
لەوح: تەختەی پان.
لەوحە: لەوح.
لەودوا: د. لەوەدوا.
لەوەدە: د. گاڵتەچی. گەوج. لۆدە.
لەورە: لەوێ.
لەوزینە: د. لەبزینە.
لەوس: لچ: دەم و (لەوس)ی خواتەوە.
لەوساوە: لەودەمەوە.
لەوسن: با. لێوئەستوور.
لەولاو: د. لاولاو.
لەولاوە: وتەیەکە ئاماژە (ئیشارە)ی پێ دەکرێ بۆ لایەکی دوورتر لە لایەکی تر.
لەوما: وتەیەکە بەکاردێنرێ وەک وتەی (چونکە).
لەون: جۆر: بەم لەونە نابێ.
لەوە: وتەیەکە ئاماژەی پێ دەکرێ بۆ تاقە شتێکی دیار.
لەوەبەر: لە پێش ئێستاکەوە.
لەوەپاش: لەمەودوا.
لەوەپێش: لەوەبەر.
لەوەدوا: دوای ئەوە.
لەوەڕ: گیا و پووشێکە کە ئاژاڵ بیخوا. لەوەڕین: ئاژاڵەکە چووە بۆ لەوەڕ.
لەوەڕان: لەوەڕین.
لەوەڕاندن: بردنی ئاژاڵ بۆ لەوەڕخواردن.
لەوەڕانن: لەوەڕاندن.
لەوەڕگا: شوێنێکە کە ئاژاڵ تێیدا بلەوەڕێ.
لەوەڕیان: د. لەوەڕین.
لەوەڕین: خواردنی گیا و پووش لەلایەن ئاژاڵ و وڵاخەوە بەدەمی خۆی.
لەوەن: قامیش (ز). سۆزانی .
لەوەند: شۆخ و شەنگ.
لەوەندە: لەو ئەندازەیە.
لەوەندی: با. فەقیانە.
لەوهەندە: لەوەندە.
لەوێ: وتەیەکە ئاماژەی پێ دەکرێ بۆ شوێنێکی دوور.
لەویانە: لەوێ.
لەوێچ: قوولّی تەنها دەستێک کە پەنجەکانی پێکەوە بنووسێنرێ: پڕ (لەوێچ)ێک مێوژم بدەرێ.
لەوێرا: لەوێوە.
لەوێندەرێ: لەوێ.
لەوێنە: لەوێ.
لەهلهاک: ل. مارمێلکە.
لەهن: ز. لانی ورچ.
لە هۆش خۆ چوون:بوورانەوە.
لە هەڤهاتن: ز. ڕێکەوتن و ئاشتبوونەوە.
لەی: هـ. بەڕە.
لهێرت: مەردوومی شاقڵداری چوارشانە.
لە هیکڕا: لەپڕ.
لەهی: لافاو. سێلاو.
لەیرە: لێرە.
لەیز: ز. یاری و گاڵتە.
لەیزووک: با. لەیزین.
لەیزین: ز. یاریکردن.
لەیستن: ز. یاریکردن.
لەیلاخ: کوێستان.
لەیلوپەڕ: لیل و پەڕ.

لەیلووک: جۆلانە.
لەیلەدۆنێ: د. ژنی هەرزەی گەرۆک.
لهێم: لەحیم.
لەینە: لەوێ.
لەیەکبوون: لێکبوون.
لەیەک بەربوون: جیابوونەوەی شت لەیەک. بەیەکداهاتنی دووکەس و بەگژیەکداچوونیان.
لەیەک بەردان: جیاکردنەوەی دووشت لە یەک: کورسییەکەی لەیەک بەردا. بەگژ یەکداکردنی دووکەس یا زیاتر.
لەیەکچوون: چوونی دووشت لەیەک.
لەیەکدان: تێکەڵاوکردنی دووشت لەگەڵ یەکتری: گەنم و جۆکە (لەیەک بدە). درروونی دووشت بەیەکدا: تەختەکانی جاجمەکە (لەیەک بدە).
لێ: وتەیەکە مێینەی ئاوەدەمی پێ بانگ دەکرێ (ز). بەڵام (ز). وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (با واش بێ). پیتێکە بەدوای هێندێ وتەوە دەنووسێ خۆشەویستی ئەو شتە دەگەیەنێ: بابە(لێ)، دایە(لێ). پێشگرێکە دەچێتە سەر هێندێ کردار وەک لێخستن، لێکردن، لێبردن.
لێبردن: پیابردن. بریتییە لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێ: چاکی (لێ برد).
لێبران: کورتهێنانی شتێک لە شتێک: جاجمەکە بەنی (لێ براوە). دەستدانە کارێک و پشتێن بەستن بۆ کردنی بەڕاستی: فیسارکەس چاک بۆ خوا (لێبڕاوە).
لێبریان: د. لێبران.
لێبڕین: بڕینی شتێک لە یەکێک.
لێبووردن: لێخۆشبوون.
لێبوردوو: کەسێکە کە زۆر چاوپۆشی بکا.
لێبوورده: کەسێکە لێبووردنی زۆربێ.
لێبوونەوە: تەواوکردنی کارێک و دەست لێ هەڵگرتنی. جیابوونەوەی شتێک لە شتێک: کتێبەکە بەرەیەکی (لێ بۆتەوە).
لێپ: ز. فێڵ و کەڵەکە.
لێپرسراو: کەسێکە کە ئەرکی جێبەجێکردنی کارێکی بەسەرەوە بێ
لێپرسراوی: بەرپرسیاریەتی یەکێک لە کارێک.
لێپرسینەوە: پرسیارکردن لە یەکێک یا لە شتێک بەوردی.
لیپۆک: ز. کەسێکە شێوەی خۆی بگۆڕێ بەجۆرێک کە پێی پێ بکەنن.
لێ پێچانەوە: لێ پرسینەوە.
لێ پیسکردن: گۆڕانی نەخۆشی بەنەخۆشییەکی تر (مضاعفات).
لێ تۆژینەوە: لێ پرسینەوە.
لێ تێکچوون: شێوانی کارێک لە یەکێک.
لێچ: ز. گوڵاو.
لێچوو: شتێکە کەشتێکی تری پێ بشوبهێنرێ.
لێچوواندن: تەشبیھ کردنی شتێک بە شتێکی تر.
لێچوون: دەلاندنی دەفرێک کە شتی شلی تێدابێ. بریتییە لە پەڕینی ولاخی یەکسم لە مێکەی. چوونی شتێک لە شتێک لە دیمەندا: پەروین و نەرمین (لەیەک دەچن).
لێچوونەوە: لە هێلکە وەستانەوەی مریشک. بریتییە لە یەکێک کە نوێژکەر بووبێ و دەستی لێ هەڵگرتبێ.
لێخراو: کەسێکە لە پیشەیەک دەرکرابێ.
لێخستن: دەرکردنی یەکێک لە پیشەکەی. هێنانی شتێک بەسەر شتێکدا. لێدان (ز).
لێخشاندن: هێنانی شتێک بەسەر شتێکدا بەئاستەم.
لێخواردن: بریتییە لە لایەن بەردانی یەکێک: من لە فیسارکەس (ناخۆم) واتە لایەنی بەرنادەم.
لێخور: کەسێکە کە ئۆتۆمۆبێل و فڕۆکە و هەموو جۆرە مەکینەیەک ببا بەڕێوە.
لێخورین: بەرێگادابردنی چوارپێ. تێ خوورین و هەڕەشە کردن.
لێخۆشبوون: خۆشبوونی یەکێک لە شتێک.
لێخەفتان: لێخەفتن.
لێخەفتن: ئاگاداری پاک و تەمیزی.
لێدان: کێشانی دەست یا قاچ یا شتێکی تر بەشتێکدا. بەناو ئاو رۆین و پەڕینەوە: (لە چەمەکە بدە). بریتییە لە دزین: فیسارکەس چاکی (لێدا) بریتییە لە ترکەندن.
لێدزینەوە: گلدانەوە و بردان: دیوارەکە قەنگا سە بەرەبەرە (لێی بدزەرەوە)، یا کالاکە فراوانە لە درووندا (لێی بدزەرەوە) یا لە رۆژانەکەت (بدزەرەوە) بۆ دوارۆژت.
لێدوان: دوانی یەکێک لە یەکێک یا لە کارێک.
لێدەر: مەردوومی بزەن.
لێ دەرکردن: دەرکردنی شتێک لە شتێک.
لێر: ل. لیک.
لێرانە: لێرە.
لێڕ: کەلەپوور. لێڕەوار.
لێڕەوار: دارستانی پڕی چڕ.
لێرک: ز. ڕشتنی ئاو.
لێرە: وتەیەکە ئاماژەی پێ دەکرێ بۆ ئەو شوێنەی کە تۆی تێدایت.
لێرە بەدواوە: لەمەولا.
لێزان: کەسیکە لە کارێکدا شارەزابێ.

لێزانین: شارەزایی لە کارێکدا.
لێزگە: مووڕووی هۆنراوە.
لێزم: د. لێزمە.
لێزماو: د. لافاوێکە کە لە بارانی لێزمەوە پەیدا ببێ.
لیزمە: بارانی بەخوڕ.
لێزین: ز. یاریکردن.
لێژ: سەربەرەوخوارە.
لێژایی: شوێنی سەربەرەوخوارە.
لێژنە: داری سووتاندنی لەسەر یەک هەڵچنراو. ئەنجوومەن.
لێژی: لێژایی.
لێسانەوە: د. لێسانەوە.
لێسانەوە: لستنەوە.
لیسب: لۆی هۆنراوەی پرچ. لۆی هۆنراوەی قۆچەقانی.
لێسپا: سێپای ئاگر.
لێستن: د. لستنەوە.
لێستنەوە: لستنەوە.
لیسک: گورزەی تیشکی خۆر.
لێسک: تیغێکی کەوانەییە ناو کەوچک و کاسەی پێ هەڵدەکۆڵرێ.
لێسکە: لێسک.
لیسۆکە: بەردێکە کە لە چەمدا ئاوەسوو بووبێ و، زۆر گەورە نەبێ.
لێسە: بریتییە لە خواردەمەنی زۆری خۆڕایی: فیسار کەس هەر (لێسە)ی ببێ بەسیەتی. بەردێکی لووسی گردە شتی پێ لووس دەکرێ.ماڵەیەکە زەوی کێڵراوی پێ تەخت دەکرێ.
لێشاو: ئاوی زۆربەی زۆر. بریتییە لە هەموو شتێکی زۆر.
لێشرێ: هـ. قازیاخە.
لێشێوان: شێوان و تێکچوونی شتێک لە یەکێک.
لیغاب: ز. لغاو.
لیغین: ز. شتی لینج.
لێف: لێفە.
لێفکە: لفکە.
لێڤۆک: با. کەسێکە کە زۆر داوای شت بکا لە مەردووم.
لێفۆکە: لێفەی پچکۆلە.
لێفە: پێخەفێکی بەر و پشتداری لۆکە، یا خوری لەناوی، پڕ تەریبە.
لێفە درووو: کەسێکە هەر لێفە بدروێ.
لیڤ: با. لێو.
لیڤا: ز. بەرخ.
لێق: د. لیق.

لێقۆمیان: د. لێقەومان.
لێقە: د. لیقە.
لێقەومان: سەر لێ شێوان و تێکچوونی ژیان لە یەکێک.
لێقەوماو: کەسێکە ژیانی لێ تێکچووبێ.
لێک ئانین: ز. ڕێکخستنی دوو کەس.
لێکبڕان: دوورکەوتنەوەی دوو گیاندار لە یەکتری بەڕەنگێک کە دەنگیان بەیەک نەگا.
لێکبوون: جیابوونەوە و لێکبڕانی دوو کەس بەزۆری.
لێکبوونەوە: یەکلابوونەوەی هێندێ شت: مەشکەکە (لێک بووەوە) جیابوونەوەی دوو گیاندار لەیەک لە کاتی بە گژ یەکدا چوون.
لێکترازان: ترازان و جیابوونەوەی دوو شت لەیەک.
لێک خەفتان: بەدووی سەری یەکتریدا گەڕان.
لێکدا لێکدا: پەیتاپەیتا.
لێکدان: لە یەکتری دانی دووگیاندار. ئاوێتە و تێکەڵکردنی دوو شت بەیەک. گۆڕینەوەی دوو شت بەیەکتری لەگەڵ باقی دانەوەدا .
لێکدانەوە: بیرکردنەوە لە شت و وردکردنەوەی لە دڵدا.
لێکردن: باراش ڕۆکردن لەسەر ئاش بۆ هاڕینی. خستنی شتێک بۆ سەر پشتی وڵاخ: زینەکە یا کورتانەکە یا بارەکەی (لێکە). تەکاندنەوەی یەکێک لە یەکێک: چاک فیسار کەست (لێ کردم).
لێکردنەوە: کردنەوەی شتێک لە شتێکی تر.
لێکڕەوینەوە: دوورکەوتنەوەی پارچەی شت لە یەکتری: کورسییەکە (لێک ڕەویوەتەوە) واتە پارچەکانی لێک ترازاون. ڕەپپوونی ئەندامی گیاندار لەبەر قەڵەوی یا ئاوساوی.
لێککران: ڕەنجاندنی دووکەس لە یەک.
لێککردنەوە: جیاکردنەوەی دوو شت لە یەک.
لێککەوتن: کەوتنی دوو شت لە یەکتری.
لێکنان: قووچاندنی چاو یا دەم. پێوەدانی کتێب: کتێبەکە (لێکنێ).
لێکوپێکبوونەوە: هەڵوەشان و پارچەپارچەبوونی شت.
لێکۆڵینەوە: بۆست کەندەکردنی شتێک.
لێکهاتن: ز. ڕێکەوتنی دووکەس یا زیاتر.
لێکەفتگ: د. لێکەوتە.
لێکەفتن: د. لێکەوتن، لێککەوتن.
لێکەفتە: د. لێکەوتە.
لێکەوتن: ونکردنی شت: پارەکەم (لێکەوت). لێککەوتن. نەمانی دارایی یا پیشەی دەوڵەتی یەکێک: فیسار کەس (لێ کەوتووە) واتە هەژار بووە یا لێ خراوە.

لێکەوتوو: لێکەوتە.
لێکەوتە: کەسێکە دارایی یا پیشەی دەوڵەتی نەمابێ. مەردوومی دەستەوسان.
لێگرتن: لە دڵەوە زویربوون لە یەکێک: فیسار کەس منداڵە (لێی مەگرە). هەر لە نەبووندا بەکاردێنرێ.
لێگرتنەوە: لێدزینەوە. بڕینی مووچەی یەکێک.
لێگۆڕان: گۆڕانی شتێک لە یەکێک.
لێگەڕان: وازهێنان لە شتێک.
لێ گێڕانەوە: کەمکردنەوەی شتێک لە یەکێک.
لێڵ: ناوی لیخن. بریتییە لە مەردوومی زویر، (لێڵبوون) بریتییە لە زویربوون.
لێلافک: با. لاولاو.
لێلاڤ: ز. بەفری تواوە.
لێلاو: لێلایی.
لێلاویی: لێلایی.
لێلای: کوێرایی.
لێلایی داهاتن: کوێربوون.
لێڵکردن: ز. لابردنی توێکڵی سەوزی گوێز و فندق.
لێڵە: کاتێکە لە بەیانیان و ئێواراندا کە جیهان نە زۆر تاریک و نە زۆر رووناک بێ. خڵتەی بنکی هەنگوین و شتی تر. قوڕاوێکە دەکرێتە سەر سەوزایی بۆ بەهێزبوونی .
لێڵی: لیخنی.
لێم: لەمن: (لێم) لادە.
لێمشت: با. لافاو.
لێنان: دەمکردنی چایی. خستنە سەر ئاگری چێشت بۆ کوڵاندنی. دەرمان خستنە سەر برین. نووساندنی هێندێ شت بەشتێکەوە: دەسکی (نالە کۆزەکە). بارخستنە سەر پشتی ولاخ.
لێنیان: د. لێنان.
لینج: شتێکی تەڕە کە دوو شت بەیەکەوە بنووسێنێ وەک سرێش.
لینجاو: شتی لینجی شل.
لینجی: بوونی شت بەلینج.
لینچق: لینچک.
لینچقاو: لینچکاو.
لینچک: شتێکە کە کەمێک لینج بێ.
لینچکاو: لینجاو.
لیندوو: لنگوو.
لێنیان: د. لێنان.
لێنیشتن: سواربوونی گوریس و چەرخ و فەلەک. دەستکردن بەجل شوشتن.

لێو: قەراغی سەرەوەی دەم . لێوار.
لێوار: لچ و کەناری شت.
لێوارە: د. لێوار.
لێوان: دەفرێکە تا لێوەکەی پڕ بێ لە شت. پەرداخ.
لێوانلێو: دەفری لێوان.
لێوانە: لێوانلێو.
لێوبردن بەدەما: بریتییە لە تووڕەبوون بەجۆرێک کە لە عەزرەتدا لێو بەرێ بەدەمدا.
لێوبەبار: بریتییە لە مەردوومی خەفەتبار.
لێودار: شتێکە کە لێوی بێ.
لێودان: هاتنە خوارەوەی شتی شل لە لێوی دەفر بەئاسانی کە نەڕژێ.
لێوکورۆشتن: لێو بەدەمدا بردن.
لێوە: شێت (ل). فرۆیەکە کە شیری تێکەڵ کرابێ بۆ ئەوەی کە زۆر توند نەبێ. خاکەلێوە. فێ (د). خورپە (د).
لێوەرگرتن: وەرگرتنی شتێک لە یەکێک یا لە شتێک: ئەم قسەیەم لە فلان کتێب وەرگرتووە و، کتێبەکەشم لە فیسار کەس وەرگرتووە.
لێوەشانەوە: لێوەشینەوە.
لێوەشینەوە: گونجانی کارێک لە یەکێک و لەبارابوونی.
لێوەشۆ: شوێنێکی زیبخەڵانە کە بەدەم ئاوەوە خۆی نەگرێ.
لێوەلەرزە: لێوەلەرە.
لێوەلەرە: بریتییە لە ترسان بەجۆرێک کە لێو بێتە لەرزین.
لێوەلەرێ: لێوەلەرە.
لێویاگ: د. فێدار.
لێویان: د. فێ لێهاتن. داخوریان.
لێهاتن: پەیابوونی ئازارێکی کوتوپڕی کوشندە لە گیاندار. پێکەوتنی کاڵا لە یەکێک. وەشانەوەی شتێک لە یەکێک.
لێهاتوو: کەسێکە کە هەموو کارێکی باشی لە دەست بێ.
لێهاتن: د. لێهاتوو.
لێهەڵسان: تەوانایی و دەسەڵات بۆ کردنی کارێک: (لێم هەڵناستێ) خانوو بکەم.
لی: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (ئەو) بەڵام هەر بۆ مێینە بەکاردێنرێ.
لیپ: پارووی گەورە. فێڵ. شەپۆل (د).
لیپان: دەفری زۆر پڕ.
لیپانلیپ: لیپاولیپ.
لیپاو: د. شەپۆل.
لیپاولیپ: دەفرێکە کە پڕ بێ لە شتێک تا لێواری.
لیپلێدان: پارووی گەورەگرتن.

لیت: ل. لووت.
لیتاو: لیتەی زۆر شل.
لیتە: قوڕی شل.
لیچ: حەوز (ز). مێوژێکە کە کوترابێ بۆ دۆشاو (با). لینج.
لیچاڵ: د. مرەبا.
لیخن: ئاوی لێڵ.
لیر: جۆرە ئاوساوییەکی پەڵە پەڵەی بەئاڵۆشە لە جەستە پەیدا دەبێ.
لیرکردن: لیردەرکردن.
لیرگ: لیر. شەرا (د).
لیرگدار: د. شەرابردوو.
لیرە: دراوێکی زێڕینی بەنرخە.
لیزگ: د. تیشک، تاڵێک لە بەن و شتی تر.
لیس: داری ئەســتــووری درێژی بێ قــۆرت و گــرێ. کــولانەی مریشک و باڵندە (ز).
لیس تێکوتان: بریتــیـــیــە لە زۆر هاتوچۆکــردنی یەکــێک بۆ شوێنێک.
لیس تێهاویشتن: لیس تێکوتان.
لیفک: ز. لفکە.
لیفکە: د. لفکە.
لیفە: د. کیسەی حەمام. کەلکیت.
لیڤ: ز. لێو.
لیق: شتێکی نەرمە کە خۆی نەگرتبێ وەک ماستی تازە مەیو و گۆشتی لەجەر.
لیقن: ترێیەکە کە لەبەر زۆر گەین بڵ بووبێ.
لیـقە: پارچەیەکی نەرم و شلە دەخرێتـە ناو مـەرەکەبی دوێتـەوە. گیایەکی پایزی گەڵا باریکە بۆ ئاژاڵی وردە خراپە.
لیـقـەلیق: پێکەنین و هێلکە هێلک، (لیق و هووڕ) لیـقـە لیـقی زۆر.
لیک: تف و لینجاییەکە بەدەمدا بێتە خوارەوە.
لیکن: کەسێکە کە لیکی زۆربێ.
لیکە: گیای ناسکی نازاو.
لیلق: د. گۆشتی چەرمە چەقاڵتە.
لیلک: گیانداری تازەبووی شلەپەتە کە هێشتا خۆی نەگرتبێ.
لیلوپەڕ: لیلوفەڕ.
لیلوفـەڕ: گـوڵێکە لەناو ئاودا دەڕوێ و بەرز دەبێـتـەوە تا سـەر ئاوەکە دەکەوێ ئینجا گوڵێکی سپی دەکا وەک دەرخۆنە.
لیلەنگ: خوم.
لیمان: جۆرە تەڕی و زرینجکاوێکە لە کۆمی هێندێ مایەسیری دارەوە دێ.
لیمۆ: میوەیەکی خڕی زەردی بۆنخۆشی ترش یا شیرینە.
لیمۆیی: شتێکە کە ڕەنگی وەکو ڕەنگی لیمۆ وابێ.
لینک: با. کووپەی گەورە.
لیو: لم.
لیە: ز. لافاو.



م: ڕاناوی لکاوە بۆ قسەکەری تەنیا (متکلم وحدە)، دەلکێ بەدوای ناو و کردارەوە: کوڕ(م)، ڕۆیشت (م)، دەڕۆ(م). ژمارەی ئەسڵی دەکا بەژمارەی تەرتیبی: یەکە (م)، دووە(م).

ما: مێ. وتەیەکە بەکار دێنرێ لەجێی وتەی (بۆچی): (ما) وا دەکەیت، واتە بۆچی؟. دروستی و پێکهاتنی دۆکولیو: (ما)ی دۆکولیوەکەی هێنایەوە. شاخ و کێو (د). ئەشکەوتێکە لە کێو کە حەیوانەکێوی تێ بچێ (د).

مات: گیانداری بێدەنگ. شتی چەسپی جێگیر: ئەو بەردە (مات) کە واتە چەسپی کە، (ماتبوون) بێ دەنگبوون. چەسپ بوون.

ماتانێ: با. هەڵماتێن.

ماتاو: د. مانگەشەو.

ماتکردن: بریتییە لە کوشتن: مارەکەم (مات کرد) واتە کوشتم. چەسپکردن.

ماتەدان: ڕوونبوونەوە و دەرکەوتنی نیشانەی گەینی میوە و دومەڵ: کاڵەکەکە یا ترێکە یا دومەڵەکە (ماتەی داوە).

ماتەم: شیوەن. پرسە.

ماتەمات: خۆ متکردن و وردە وردە چوونە پێشەوە لە شتێک.

ماتەمین: مەردوومی خەفەتبار.

ماتەمینی: خەفەتباریی.

ماتیک: د. خەتانی ژنان.

ماتی: بوونی مەردووم بەمات.

ماجومی: جۆرە خواردەمەنییەکی ڕەق و جیرە لە شەکر دروست دەکرێ.

ماچ: دەمنان بەشتێکەوە و شڵپە لێ هەستاندنی بەلێو لەبەر خۆشەویستی.

ماچکردن: ماچ.

ماچ و مووچ: یەکتری ماچکردن.

ماچە: ئێستری مێ.

ماچیک: ز. ماچ.

ماچێن: میچێن.

ماخۆ: خاوەن.

ماخۆلان: نەخۆشییەکە تووشی هەر کەسێک بێ هەمیشە ئەندامی دەجووڵێ.

ماخولیا: ماخۆلان.

ماد: ناوی تیرەیەکە کە کورد دەچێتەوە سەری کە ئەویش کوڕی (مادا)ی کوڕی (یاپێث)ی کوڕی (نوح)ە.

ماداک: ز. گامێشی مێ.

مادام: جۆرە تەنراوێکی سفتی تەنکی دەزوویینە.

مادە: شتێکی خڕی پانە لە پەڕۆ دروست دەکرێ و نانی پێ پێوە دەدرێ. بریتییە لە شەق: (مادە)یەکی پێدادا، واتە شەقێکی تێ هەڵدا. ئاشک (د). دومەڵ (د). لوو (د).

مادەرزا: د. مادەرزاد.

مادەرزاد: شتێکە کە لە مەردوومدا بێ بەسروشت.

مار: دەعبایەکی درێژی بێ پێی زەهرداری بەوەزەندە بەهەر گیاندارێکەوە بدا زۆرتر دەیکوژێ.

مارانگاز: کەسێکە کە مار پێوەی دابێ و لەوەوە چاوترسێن بووبێ. بریتییە لە یەکێک کە لە شتێک چاوترسێن بووبێ.

مارپێچ: شتێکی درێژی کوندارە نێرگەلەی پێ دەکێشرێ.

مارت: مانگی سێهەمە لە ساڵی ڕۆژی لە ناوەند شوبات و نیساندا و سی و یەک ڕۆژە.

مارتاک: خێزەرە.

مارتووڵە: د. توولەمار.

مارچێوە: د. مارگیر.

ماردەم: هـ. تفەنگ.

مارس: گیانداری چەتوونی سەر ڕەق.

مارکە: ڕاوکە.

ماڕە: د. ماڕکە.
ماڕێ: هـ. چوخم.
ماڕین: شکاندن.
مارگرە: مارگیر.
مارگیسک: با، مارمێلکە.
مارگیر: گیایەکی گەڵا خڕی دڕکاوی کەم گەڵایە، بەرێکی سووری شیرینی هەیە پێی دەڵێن شێفەلە.
مـارمـارۆکـە: شــتـێکە وەک مـار لە هەویر دروست دەکـرێ و دەبرژێنرێ بۆ منداڵ.
مارماسی: جۆرە مارێکی ئاویی بەسزمانە لە ماسی دەچێ.
مارمزووک: د. توولەمار.
مـارمـژ: کـەسـێکە جـێگایەک لە ئەندام کـە مـار پێـوەی دابێ، برینداری بکا و بەکەڵەشاخ هەڵی مژێ.
مارمێلک: مارمێلکە.
مـارمـێلکە: دەعـبـایەکی باریکی پچکۆلەی بۆرەقنەی چنگداری بەسزمانە.
مارمیلۆک: مارمێلکە.
مارنەگەز: جزمە یا پووزەوانەیەکی لبادینە، دەکرێتە پێ بۆ ئەوەی کە مار پێوەی نەدا.
مـارۆ: مەڕ یا بزن یا ڕەشەوڵاخـێکە کـە خـۆی ڕەش و ناوچەوانی سپی بێ.
مار و دوو: شتی شەفتول.
مارە: پەیوەندی ژن و مێرد بەچەند وتەیەکی ئاینی.
مارەبڕ: کچێکە بەمنداڵی مارەکرابێ لە یەکێک.
مارەبڕانە: دراوێکە دەدرێ بەو کەسەی کە مارە دەبڕێ.
مارەبڕین: مارەکردن.
مارەزا: پیسی ساوای تازەبوو.
مارەزیو: هەزارپێ.
مـارەکردن: بەستنی پەیمانی ژن و مێردی بەچەند وتەیەکی ئاینی: ڕووخۆشیان (مارەکرد) لە نەریمان.
مارەکۆڵ: هـ. دووپشک.
مارەگیرە: مارگیر.
مارەیی: زێڕ یا زیو یا شتێکی ترە کە ژنی لەسەر مارە بکرێ.
ماریلە: مارمارۆکە.
مازگ: د. مازوو.
مازڵووخ: هـ. بەرماڵ.
مازماز: د. بەران.
مـازوو: شـتـێکی خـڕی سـەخـتی تـفـتی قـژقـژاوییـە لە گـزگل پچووکترە. دارێکە مازوو بگرێ.
مـازووبەرەڵا: کـاتێکە لە دوای بەهاردا کـە مـازووی تێـدا بەرەڵا دەکرێ بەم ڕەنگە هەموو کەس دەتوانێ بێ ترس و پرس بچێ بۆ مـازوو چنین. بریتییە لە بەرەڵایی و بێ سەر و بەرگیری لە شتدا: کە چووم باخەکە (مازووبەرەڵا) هەرکەس بۆ خۆی بوو.
مازووچن: کەسێکە کە مازوو لە دار بکاتەوە.
مازوودار: دارێکە مازوو بگرێ.
مازە: تەختەی ناوی عەرەبانە. پشت (هـ).
مازی: پشت (هـ) مازوو (با).
مازیر: ز. شەلکە.
ماس: ماست.
ماسان: ئاوسان.
ماساو: ماستاو. ماسی (هـ).
ماست: شیری گەرمکراوی هەوێن کراو کە ترش بووبێ.
ماستاو: ماستێکە بەئاو شل کرابێتەوە بۆ خواردنەوە.
ماستاو ساردکردنەوە: بریتییە لە ڕووپامایی کردن بۆ یەکێک.
ماستاوکردن: ماستاو ساردکردنەوە
مـاسـتـەڕۆن: با. چینێک مـاست و چینێک ڕۆنە کـە لە پایزاندا لەناو دیزەدا هەڵدەگیرێ و لە زستاندا دەخورێ.
ماسرێشم: د. هێلمێکە لە پێستی ماسی دروست دەکرێ.
ماسکە: د. کەسێکە کە ڕوخساری خۆی بگۆڕێ.
مـاسـولکە: مـاینچـە. خـەرمـانێکە لە پاش شـەنکردن بەدرێژی هەڵدرا بێتەوە.
ماسۆڵە: جۆرە ساجێکی ئەستوورە لە شاری (ماسۆڵە) دروست دەکـرێ. مـەکـۆی جـۆلا. قـامـیـشـێکە جـۆلا هەودای لەسـەر هەڵدەکا و دەیخاتە ناو مەکۆکەیەوە بۆ تەنینی. ماسولکە.
ماسوور: ز. بەری درەختێکی دڕکاوییە لە عەنناب دەچێ.
ماسە: د. لمی ورد.
ماسیان: ئاوسان.
ماسیەوچنە: د. ماسیگرە.
مـاسی: گـیـاندارێکی درێژکـۆلەی پەڕەداری مـەلەوانی ئاوییـە، گۆشتی خۆشە.
ماسیخۆرە: جۆرە مراوییەکە زۆرتر ماسی دەخوا.
مـاسیـگرە: باڵندەیەکی قـاچ و مل درێژە، لە ڕیشـۆڵە گـەورەترە لە ناو ئاودا ڕاوی ماسی دەکات.
ماسیگیرە: د. ماسیگرە.
مـاسیلە: د. شـتـێکە وەک مـارمـێلکە، لە شـوێنی شـێداردا پەیدا دەبێ.
ماسین: ئاوسان.
ماسییەپانکە: جۆرە ماسییەکی پانکەڵەی گۆشتنە.
ماسیەزەردە: جۆرە ماسیەکی زەرد باوە.

ماسییەوان: کەسێکە شارەزای ڕاوەماسی بێ.
ماش: دانەوێڵەیەکی وردی ڕەشە لە نیسک دەچێ.
ماشانن: د. ماشینەوە.
ماشاو: جۆرە ئاوێکە دەچێتە ناو پەردەی چاوەوە کوێری دەکا و، میل لێدانی دوو بەختییە.
ماشتن: ماڵین و گەسکدان.
ماشک: ز. ماش.
ماشڵێن: هـ. ماشێنە.
ماش و برنج: بریتییە لە ڕیشێک کە دەنکێکی سپی و دەنکێکی ڕەش بێ.
ماشە: قوولێنەیەکی زۆر گەورەیە لە خورگەی ئاودا دادەنرێ بۆ ئەوەی کە هەر ماسییەک هات تێی کەوێ و دەرنەچێ. مەقاش. پێی تفەنگ.
ماشەر: بەنێکە لەسەر ئەژنۆ کرابێ بەقانگڵە. ماشەرە.
ماشەڕەش: ماش.
ماشەرە: جۆرە برینێک بەدەموچاو دەگا و دەتەنێتەوە.
ماشەسپی: جۆرە ماشێکی دەنک گەورەی سپییە.
ماشێن: چێشتی ماش. مەکینەیەکە کە بەئاگر بڕوا.
ماشێنە: چێشتی ماش.
ماشین: ماشێن (د) گەسکدان.
ماشینەوە: خواردن و لستنەوەی شت بەناپلۆخی.
ماف: حەق: (ماف)م بەرێ یا (ماف)ی منی پێوە نییە.
مافندی: مافنگی.
مافنگی: کەسێکە نابووت بووبێ و هیچی نەمابێ.
مافوور: قاڵی.
مافوورە: مافوور.
مافەتا: مافەتە.
مافەتە: جۆرە کرمێکە لەناو پۆرگێکی پووشاویدا هەر حەلێک مەڕ بیخوا دەیکوژێ.
ماقڕ: دراوێکی کەم نرخە وەک (جلق).
ماقۆڕ: بەردێکە کە چاڵێکی تێدابێ و ئاوی بارانی تێدا بوەستێ.
ماقووڵ: شتی پەسند.
ماک: ئەتەری هێندێ نەخۆشییە، کە بداتە شوێنێک لە ئەندام: (ماک)ی ئاوڵەکە یا سوورێژەکە داوێتە چاوی یا قوڕگی. جێگای لێککەوتنی کەناری ئاسمان بەکەناری زەوی کە پێشی دەڵێن ئاسۆ. کان: فیسارە شوێن (ماک)سی نەوتی تێدایە. ڕیشە و بناغەی شت: (ماکی) دزی لەناو هێندێ تیرەدا هەر بنەبڕ نابێ. دایک. (با) هەنگێکە کە پوورە دەدا.
ماکاو: چەند کەلەبەرێکە لە جۆگەی توتن و مەرەزەدا دەبڕدرێ بەم بەر و بەو بەریا بۆ ئەوەی کە بە باشی ئاو بخواتەوە.
ماکووز: گیایەکی ئاوی هەمیشەییە لە کووزەڵە دەچێ، بەڵام ئەم گەڵای پانترە و تاڵە.
ماکەر: دێڵەکەر.
ماکەرمەلە: بریتییە لە دەڵەچەیی و کلکە لەقێ بۆ مەردووم بەسەرزاری.
ماکەو: کەوی مێ.
ماکینە: چەند پارچەیەکی لێک دراوە کە لە کارخانە دروست کرابێ بۆ جۆرە کارپێکردنێک.
ماکینەچی: کەسێکە کە بەماکینە کار بکا.
ماڵ: خانووبەرە. بریتییە لە زێی وڵاخ. دارایی.
ماڵات: ئاژاڵ.
ماڵاوایی: وتنی (ماڵت ئاوابێ) لەلایەن یەکێکەوە کە لەلات بێ و بڕوا.
ماڵبڕ: دیواربڕ.
ماڵبڕین: دیواربڕین.
ماڵپشکێن: د. پشکنینی ماڵان بۆ شتێک (تحري).
ماڵتاوسانی: د. خانووی هاوینە.
ماڵخۆ: کەسێکە کە سەر بەتۆ بێ و خۆماڵی بێ لەگەڵتدا. خاوەن ماڵ.
ماڵدار: ئاژاڵدار. دەوڵەمەند.
ماڵداریکردن: پاشەکەوتکردن بۆ دەوڵەمەندبوون.
ماڵشت: د. ماڵین.
ماڵشتن: ز. ماڵشت.
ماڵشتە: گەسکدەر.
ماڵکردن: سەرکێڵکردنی گاسنە لەکاتی جووتدا بەجۆرێک کە زەوییەکە نەکێڵێ، بەڵکو هەر ڕووی سەرەوەی بڕووشێنێ.
ماڵکو: دەسکی دیبیەگ.
ماڵ لەیەک: دوو کەسن کە ماڵیان لە یەکتری درێغی نەبێ.
مالم: مالووم.
مالمالەسوورە: هـ. خاڵخاڵۆکە.
ماڵماڵانێ: با. جۆرە یارییەکە لە لادێ دەکرێ، بەم ڕەنگە پرسیار دەکەن لە یەکتری و دەڵێن: ئەوە چ ماڵێکە کە ژنێک و مێردێکن، یا دایک و باوکێک و کوڕ و کچێکن.
مالمیزک: با. میزڵدان. بەر مووسڵدان.
ماڵنج: ماڵەی سواغ.
ماڵوبڕ: کۆکردنەوەی داری سووتاندن لە دراوسێ هەر ماڵەی بڕێک بۆ سوورکردنەوەی تەنووری تازە.
ماڵۆچکە: خانووی پچکۆلانە.

مالۆچە: مالۆچکە.
مالۆس: بەرازی مێی سێ ساڵە.
مالوسکە: ماسولکە.
مالۆسکە: مالوسکە.
ماڵ و منداڵ: خێزان.
مالوو: ماڵەی زەوی تەختکردن.
مالووم: پیاوی ئاینی و پێشەوای جوولەکە.
ماڵوێران: کەسێکە کە ماڵی لێ شێوابێ بەهۆی بەڵایەکی زۆر گەورەوە.
مالوێنچە: مالەوێچە.
ماڵە: ئاسنێکی دەم پانی کلک دارینە سواغی پی دەدرێ. چەپەرێکە زەوی کێڵراوی پێ تەخت دەکرێ لە دوای تۆ و پێوەکردنی. نەخۆشییەکە دێ بەسەر هێندێ ژنی ئاوسدا لەشی پڵپڵ دەکا.
ماڵە پیتان: د. ماڵە پیتک پیتکێنە.
ماڵە پیتک پیتکێنە: یارییەکی منداڵانەیە بەچەند کەسێک دەکرێ و هەر یەکە دەبێ سێ کۆمەڵ بەردی وردی لە بەردەمدا بێت کە ژمارەیان بەقەد یەک بێت، با بڵێین هەر کۆمەڵەی پانزە بەرد بێت، لە پێشەوە وەستاکە کۆمەڵە بەردی لای ڕاستی خۆی هەڵدەگرێت، تەنیا بەردێک نەبێت کە لە جێی کۆمەڵەکە بەجێی دێڵێت، ئینجا هەر لەلای ڕاستەوە بەردەکانی ناو دەستی کە (١٤)ن دابەشیان دەکات بەسەر کۆمەڵە بەردی یاریکەرەکاندا کە خۆشی یەکێکە لەوان، دوا بەردەکەیان کەوتە بەر کۆمەڵە بەردی کامیان - با هی خۆشی بێت - ئەو کومەڵە هەڵدەگرێ و بەردێک بەجێ دێڵێ لە جێی خۆی و ئەمیش لە ڕاستەوە دابەش دەکات بەسەر کۆمەڵە بەردەکاندا تا ژمارەی هەموو کۆمەڵەکان لەسەر یەک کۆمەڵی یاریکەرێک کۆ دەبێتەوە، ئەو حەلە ئەو یاریکەرە دەبێ بە یەکەمی یارییەکە.
ماڵە پیتێنێ: ماڵە پیتک پیتکێنە .
ماڵەکاری: ئیشکردن بەماڵە.
ماڵەکردن: ماڵەکاری.
ماڵەکێشان: ماڵەکاری.
ماڵەوکەن: د. دیواربڕ.
ماڵەو ماڵکردن: چوون لەم ماڵەوە بۆ ئەو ماڵ.
مالەوێچە: گیایەکی بەهارییە گوڵ و گەڵای وەک لاولاو وایە تەرز دەهاوێ و بە برژاوی و کوڵاوی دەخورێ بۆ ڕەوانی.
مالە وێنچە: مالەوێچە.
ماڵەهەنگ: د. شانی هەنگ.
ماڵیات: ماڵات.
ماڵیلە: ز. دارێکە وەک نوێڵ بەردی پێ هەڵدەکەنرێ.
مالینووس: جۆرە دەرمانێکی سوورە شتی پێ ڕەنگ دەکرێ و دەشکرێتە چاوی ئێشاوەوە.
ماڵی: گیاندارێکە هۆگر و رامی ناوماڵ بووبێ.
ماڵێن: پاککردنەوەی شوێنێک بەگەسک یا بە بەفرماڵ. پێداماڵین .
ماڵینەوە: پاککردنەوەی بەردەمی بەرداش لە ئارد.
مام: برای باوک.
ماما: هـ. نەنک.
ماماڵەگێجێ: هـ. باوەخولێ.
مامان: ئافرەتێکە سەرپەرشتی زەیستان بکا لە منداڵ بوونیدا.
مامەنە گێجێ: د. خولخواردن
مامانی: بوونی ئافرەت بەمامان.
مامبرایە: جۆرە ترێیەکی سپی دەنک درێژی گەورەی هێشوو شاشە.
مامجەژنە: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک شویت وایە، گوڵی وردی زەرد و سپی دەگرێ وەک مینا.
مامر: مریشک.
مام ڕێواس: گیایەکی بەهارییە، لە بەهاراندا دەخورێ بۆ کوشتنی کرم و ڕەوانی.
مامز: ئاسک. مامزە. ماسی مێ.
مامزە: پارچە ئاسنێکی لووت تیژە سوار لە پاژنەی پێڵاوی قایم دەکا بۆ ئەوەی لە کەلەکەی وڵاخێ پێ بدا بۆ لێخوڕینی.
مامش: بێ دەنگی خامۆش (د). ناوە بۆ تیرەیەک لە کورد.
مامشاخانە: ئاودەستخانە.
مامڵەپەشیمانی: دەست هەڵگرتن لە ئەندازەیەک لە پارە لە مامەڵەیەکدا، کە تێیدا پەشیمان بووبێتەوە و شتەکەت دابێتەوە بەسەر خاوەنیدا.
مامناوەندی: شتی ناوەنجی.
مامۆ: مام.
مامۆتک: گزیر و دەمڕاستی دێ، یا گەڕەک. إختیار. اْهلی خوبرە.
مامۆزا: ئامۆزا.
مامۆژن: ئامۆژن.
مامۆسا: مامۆستا.
مامۆستا: خوێندەوارێکە کە دەرس بڵێتەوە.
ماموتە: د. شیری خوژیلک.
مامەحووجی: تیکەی گەورە.
مامەخولینە: هـ. پیرێژنە سەر ئاسنینە.
مامەخەمە: کەسێکە کە بە هەموو شتێک خەفەت بخوا.

مامەڵە: شت کڕین و سەوداکردن لەگەڵ یەکێکدا.
مامەڵەپەشیوانی: مامڵەپەشیمانی.
مامەلینچک: برای تووتە.
مامێز: د. ئاسنێکە بەپاژنەی قۆندەرەی سوارەوە ولاخی پێ لێ دەخوڕدرێ.
مامیلان: گیایەکی ئاویی هەمیشە سەوزی دڕە، بەشتەوە دەنووسێ، گەڵای وەک مێو وایە، دەدرێ بەئاژاڵ.
مان: لەناو نەچوونی شت. دەبێ بەڕاناوی قسەکەری هاوڕێدار (متكلم مع الغير) دەلکێ بەدوای ناو و کرداری تێپەڕەوە. ماڵ(مان)، کرد(مان). نیشانەی مەسدەرە: گوریسەکە کێشـ(مان)ی دێ.
تەنراوە کە درو(مان)ی خۆشە.
مانا: مەبەست.
ماندک: ماندوو.
ماندگ: ماندوو.
ماندوو: گیاندارێکە لەبەر جوولانی زۆر ئەندامی کفت بووبێ .
ماندووبوون: کفتبوونی جەستە.
ماندوونەبوونی کردن: وتنی(ماندوونەبیت) بە یەکێک کە لە دوورەوە هاتبێ.
ماندوویی: ماندوێتی.
ماندوێتی: کفتی و ماندووبوونی جەستە.
ماندی: ماندوو.
مانگ: ئەستێرەیەکی نزیکە لە زەوی، بە ۱/۳ و ۲۷ ڕۆژێک چەرخەیەکی زەوی تێدا دەکات. ماداک (ز). ماندوو (د).
مانگا: ڕەشەوڵاخێکە کە کەوتبێتە سک و زا.
مانگار: د. شتێکی کەمە کە مابێتەوە لە شتێکی زۆر.
مانگانە: مووچەیەکی هەمیشەییە کە مانگەومانگ بدرێ.
مانگامژ: بەرخێکە بەکۆرپەیی دایکی نەمابێ و نرابێتە بەر مانگای شیردار.
مانگامژە: مانگامژ.
مانگاوەس: مەشکەیەکە لە پێستی مانگا کرابێ.
مانگر: گیاندارێکە کە مان بگرێ.
مانگرتن: خیشکردنی گیاندار و تووڕەبوون و ئیش نەکردنی.
مانگ گیران: نەمانی ڕووناکی مانگ بەهۆی بەرگرتنی زەوییەوە.
مانگ گیریان: مانگ گیران.
مانگۆڕ: د. گەورە کچێکە کە مابێتەوە و شووی نەکردبێ.
مانگەسەوە: جۆرە بەردێکە وەک ئەڵماس لە هێندێ شاخ دوای تەرزە و باران دەردەکەوێ.
مانگەشەو: شەوێکە کە سەرزەوی تێدا ڕووناک بێ بەتیشکی مانگ.
مانگەو: ل. مانگا.
مانگی: د. ماندووێتی.
مانگیلە: مانگی یەک شەوە.
مانن: د. ماندووبوون.
مانە: هـ. هەمانە.
مانەند: شتێکە کە لە شتێکی تر بچێ: ئەم شتە بێ (مانەند)ە.
مانەوە: گلخواردنەوەی یەکێک لە شوێنێک. قەتیسبوون: قوتابییەکە لە پۆلی شەش (مایەوە) یا کچەکە (ماوەتەوە) واتە قەدرەبووە و شووی نەکردووە.
مانیاگ: د. ماندوو.
مانیاگی: ماندوێتی.
مانیان: د. ماندووبوون.
مانیلووس: د. مالینووس.
مانی: جاسووس. هەمانە (هـ).
ماو: د. ماوە.
ماووت: چۆغەیەکی تەنراوی خاوداری بەنرخە.
ماووزەڕ: جۆرە تفەنگێکە.
ماووش: د. ئەشکنجەی دارتاش و ئاسنگەر. کونێکە کە بای پێدا بچێ.
ماووڵ: د. ماوەی کات.
ماوە: مەیدان و ڕێی هەڵسووڕانی شت لە شوێن یا لە کات: ئەم خانووە بێ (ماوە)یە، یا لە (ماوە)ی مانگێکدا خانوویەکم کرد. شتێکە کە مابێتەوە.
ماوەدان: جڵەو شلکردن بۆ یەکێک و ڕێدانی بۆ هێندێ کار.
ماوەوە: شتێکە کە مابێتەوە.
ماوی: جۆرە ڕەنگێکی شینی کاڵە.
ماویژ: ل. مێوژ.
ماه: ماهیزەرد. مانگ.
ماهاتنەوە: دروستبوونی دۆکولێو.
ماهجە: مانگی یەک شەوە. مانگی ناو بەیداخ.
ماهوو: ز. بەرازی مێ.
ماهوور: جۆرە نقامێکی خۆشە.
ماهەر: هـ. ماکەر.
ماهێنانەوە: تێکدانی دۆکولێو و دۆکەشک لەسەر ئاگر تا دێتە کوڵ، بۆ ئەوەی کە نەبزڕکێ.
ماهیزەرد: قەد شاخی لێژی بەردەڵانی لووسی سەخت.
ماهی: ماسی (ل). ئێسقانی ماسی. شاخی کووڕی سەخت.
ماهین: با. ماین.
مایچە: د. ماینچە.
مایس: مانگی پێنجەمە لە ساڵی ڕۆژی، لە ناوەندی نیسان و حوزەیراندا، کە سی و یەک ڕۆژە.

ماین: ولاخێکه له وێنەی ئەسپ که کەوتبێتە سک و زا.
ماینبەز: نێرەکەرێکە کە لە ماین بپەڕێ.
ماینچە: پارچە گۆشتێکی درێژکۆلەی لووسی بێ دەمارە، لە دەست و قاچی هێندێ گیانداردا.
ماینچەقەڵ: شتێکە وەک چەرخ و فەلەک، منداڵان سواری دەبن بەڵام بەگردی خۆیدا دەسووڕێتەوە.
ماینە: د. مێینە.
مایە: دراوێکە کە مەردووم خرید و فرۆختی پێوە بکا. هەوێن (د). هۆی شت. مادە (بەدالی کولۆر).
مایەبۆش: مایە پووچ.
مایە پووت: مایە پووچ.
مایە پووچ: نابووت.
مایەدار: داری سووتاندنی ئەستووری پتەو. خاوەن مایە.
مایەسیری: جۆرە نەخۆشییەکە لە کۆمی هێندێ کەسا جار جار چەند دوگمەیەکی لێ پەیدا دەبێ.
مایین: ماین (د). مان (بقاء) (ز).
مت: شتی مات. ڕژاندن (ه).
متبوون: مات و بێ دەنگبوون.
متربە: نەمامی موتوربەکراو (متربەکردن) نەمامکردنی درەختێک یا گوڵێک لە درەختێک یا گوڵێکی تر.
متک: ز. تەپۆڵکە.
متمانە: باوەڕ و دڵنیایی بەشت.
متومووورگ: د. متومووروو.
متوموورو: بەچەند جۆرە مووروویەک دەڵێن کە ژنان دەیکەن بەخۆیاندا.
متوموورە: د. متومووورگ.
متیل: بەرگێکی لاوەکییە بەلێفە و دۆشەک و سەریندا دەگیرێ.
مجرۆ: کوێر، (مجرۆبوون)، کوێربوون.
مجرۆیی: کوێرایی.
مجرۆیی داهاتن: کوێرایی داهاتن.
مجری: د. سندووق.
مجەوور: کەسێکە کە هەمیشە خزمەتی مزگەوت بکات.
مجیای: ه. ڕژاندن.
مجێفی: جۆرە هەنجیرێکی سەوزی دەنک پچووکی شیرینە.
مجێوور: مجەوور.
مچ: زج. قوری لینجی توند.
مچاندن: با. قووچاندن.
مچۆڵە: شتێکی نەرمە کە لە مشتدا کۆ بکرێتەوە بۆ وشککردنەوەی: ماستەکە مچۆلە مچۆلە بکە بۆ ئەوەی ببێ بەکەشک.
مچ و مۆڕ: مڕ و مۆچ.
مچوولە: د. ملۆوچە.
مچە: مووچە و بەرات.
مچینک: با. مووکێش.
محاڵ: ناوچە.
محەجەرە: لاوانەیەکە دروست دەکرێ لە دار یا لە شیشی ئاسن دەگیرێ بەپێشی هەیوان و ئەملا و ئەولای قالدرمەی بەرزدا، بۆ ئەوەی کەسی لێ نەکەوێتە خوارەوە.
محەللەبی: فرنی.
مخابن: با. وتەی داخ و خەفەت.
مخوڕ: دەمووکانە.
مخەت: دارێکە چەرمی پێ لووس دەکرێ.
مدبەق: ژوورێکە لە خانووکە هەر چێشتی تێدا لێ بنرێ.
مر: مریشک.
مرادخانی: جۆرە کالایەکی قۆڵداری داوێن کورتی ناوداری دوگمەدارە.
مرار: با. مردارەوەبوو.
مراز: مراد.
مراڤی: با. مراوی.
مراندن: کوشتن.
مرانن: مراندن.
مراوکە: د. گیایەکە وەک گەڵای قامیش ئاژاڵ دەیخوا.
مراوی: مەلێکی مەلەوانی دەنووک پانی پێ پەڕەدارە، نێریان سەری سەوزە.
مرتومووروو: وردە مووورووی ژنان.
مرچۆڵە: د. چۆلەکەیەکی کێوی ڕەشی پچکۆلەیە.
مرچە: با. دەنگی ماچکردن.
مرچە مرچ: مرچەی یەک لەدوای یەک.
مرچیلە: د. باڵدارێکی ڕەشە لە چۆلەکە پچووکترە.
مرخ: تەماع: (مرخ)ی خۆی لێ خۆش کردووە، واتە تەماعت تێ کردووە، ئارەزوو: (مرخ)ی لێ دەجووڵێ.
مرخاندن: مرخە کردن.
مرخ لێ پەڕین: د. ئارەزووکردنی شتێک.
مرخ لێ چوون: مرخ لێ پەڕین.
مرخن: گیاندارێکە کە بمرخێنێ.
مرخنە: مرخن.
مرخە: پرخە، (مرخەمرخ) مرخەی یەک لەدوای یەک، (مرخ و هووڕ) مرخەمرخی زۆر.
مرخەک: د. مەکۆی جۆڵا.
مرخێش: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ کەسێک کە خەریکی کارێک بێ و باش دەرەقەتی نەیەت: مرخێشمرخێش ڕایکێشا.

مردار: مردارەوەبوو. بریتییە لە مووی بەر. بریتییە لە گووی ئادەمی.
مرداربوونەوە: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ مردنی گیاندارێک کە ئادەمی نەبێ. بریتییە لە مردنی ئادەمی خراپ و، لە رووی سووکییەوە دەوترێ.
مردارخۆر: د. دالّی کەرخۆر.
مردارسەنگ: د. مرداسەنگ.
مردارکردنەوە: سەربڕینی گیاندارێک کە گۆشتی بخورێ بەڕەنگێک کە شەرعی نەبێ. بریتییە لە کردنی کارێک کە زۆر بەگرانی و نارێکی لەژێر دەست دەرچێ.
مردارەوەبوو: شتێکە کە مردار بووبێتە.
مردارەوەبووگ: د. مردارەوەبوو.
مردارەوەبوون: مرداربوونەوە.
مرداری: مردارەوەبوو. بریتییە لە پیسی ئادەمی.
مرداسەنگ: جۆرە گلّێکی سوورکاری سەختە دەکرێ بەهێندێ برینەوە بۆ وشکبوونی.
مرداو: د. گۆلاوێکە کە ئاوەکەی بەکاری خواردنەوە نەیەت.
مردگ: مردوو.
مردن: گیان دەرچوون. نەمانی هێزی گەچ و قسلّ و جیوە.
مردن و سووتان: هەولّ و تەقەلای زۆری بێ ئەنجام: مردم و سووتام فلان کتێبم دەست نەکەوت.
مردۆخ: مردەلۆخە.
مردۆخە: با. مردەلۆخە.
مردوو: گیاندارێکە کە گیانی تێدا نەمابێ. گەچ و قسلّ و جیوەیە کە هێزێ نەمابێ.
مردووشۆر: کەسێکە کە هەر مردوو بشوا. تاتەشۆر.
مردوومراو: کەسێکە کە مردووی مردبێ.
مردوو مردوو: د. مردوومراو .
مردە ئارەق: د. جواناو.
مردەشۆر: مردووشۆر.
مردەلۆخە: مەردوومی بێکارەی سستی سیسەمارە.
مردەلّە: مەردوومی سستی ئیش نەکەر.
مردەمالّ: قاپ و قاچاخ و شتی ناومالّ.
مردەمۆدار: د. تەعزیەدار.
مردەوزیندەکردن: بریتییە لە نوێکردنەوەی شتێک یا شوێنێک.
مردیی: مردوو.
مڕ: گیانداری تێری تەسەل. گیاندارێکە کە خۆی مەلاس کردبێ بۆ پەلاماردان.
مڕاندن: مڕەکردن.
مڕانن: مڕاندن.
مڕبردنەوە: مڕبوونەوە.
مڕبوون: تێر و تەسەلبوون خۆ متکردن.
مڕبوونەوە: د. مۆڕبوونەوە.
مڕمیاو: دەنگی پشیلەی نێر.
مڕناو: د. مڕمیاو.
مڕومشت: مشتومڕ.
مڕومۆچ: مەردوومی مۆنی گرژ.
مڕ و مووچ: مڕ و مۆچ.
مڕ و موش: ملّوموش.
مڕوو: مڕەیەکە کە دەداتە هێندێ خواردەمەنی وەک مێوژ و شانەی هەنگ.
مڕە: جۆرە دەنگێکە لە سنگی سەگ و پشیلەوە دێ لەپێش وەڕین و میاواندندا، (مڕەمڕ) مڕەی یەک لەدوای یەک. دەعبایەکی پچکۆلەی سوورکەلەیە وەک ئەسپێ وایە، دەداتە گەنم و جۆی وشک.
مرغ: ل. مریشک.
مرقاندن: مرقەکردن.
مرقانن: مرقاندن.
مرقلێدان: دەم هەلّدانی کار و بەرخ لە گوانی دایکی لەکاتی مژیندا.
مرقن: کەسێکە بمرقێنێ.
مرقە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی سابرێن (مرقەمرق) مرقەی یەک لەدوای یەک، (مرق و هووڕ) مرقەمرقی زۆر.
مرقەکردن: مرقاندن.
مرک: ل. ئانیشک.
مرکاندن: مرکەکردن.
مرکانن: مرکاندن.
مرکە: مرقە، (مرکەمرک) مرقەمرق، (مرکوهووڕ) مرقەمرقی زۆر.
مرکەکردن: مرکاندن.
مرمرک: ز. جۆرە مێشوولەیەکە .
مرن: ز. مردن.
مرۆ: ز. پیاو.
مروار: جۆرە ئاوێکی روونە وەک مرواری، دەچێتە ناو پەردەی چاوی هێندێ کەسەوە و کوێری دەکا بەلاّم بەمیل لێدان چاوەکە روون دەبێتەوە.
مرواری: جۆرە بەردێکی جوانی سپی زۆر بەنرخە.
مرۆچە: هـ. مێرووڵە.
مرۆچەکردن: هـ. مێرووڵەکردنی ئاو لەسەر ئاگر. مێرووڵەکردنی ئەندام.
مرۆخە: د. موورەغەی پشت. مۆخ

مرۆر: دانەیەکی ڕەشباوی تاڵە لەناو گەنمدا دەڕوێ.
مرۆشیان: د. خورۆشیان.
مرۆغە: د. مووڕەغە.
مرۆڤ: ز. پیاو. خزم. ئادەمی.
مرۆڤاتی: ز. پیاوەتی. خزمایەتی.
مرۆڤایەتی: با. مرۆڤاتی.
مرۆگی: ز. پیاوەتی.
مرووچەباڵدار: د. مێرووڵەیەکە کە باڵی لێ ڕوابێ.
مرووچەڕەشە: د. کەڵەمێروو.
مرووچەکردن: د. مرۆچەکردن
مروەت: وجدان.
مروێ: هـ. هەرمێ.
مرەبا: جۆرە خواردەمەنییەک وەک سێو و هەڵووژە و گەڵێ شتی تر کە لەناو شیلەی شەکردا پەروەردە کرابێ.
مرەڕەشتیی: د. جۆرە مریشکێکی کونجکونجی سەر پچکۆلەی دەنگ زلی دڕە کە پێ دەڵێن مریشکی هیندی.
مرەڕەشە: جۆرە مراوییەکی کێوییە. مریشکە ڕەشە (د).
مرەکێفی: د. مریشکە کێوی.
مرێبا: با. کەسێکە کە مەرەزە بچێنێ.
مرێچڵە: هـ. چۆلەکە.
مریشک: باڵندەیەکی ماڵییە وەک کەڵەشێر بەڵام ئەم هێلکەکەرە.
مریشکەڕەشە: جۆرە مەلێکی ڕەشە لە ڕیشۆڵە زلترە و گۆشتی دەخورێ.
مریشکەشامی: مرەڕەشتی.
مری: ز. مردوو.
مریچە: ل. مێرووڵە.
مریچەڕەشە: د. جۆرە چۆلەکەیەکی پچووکی ڕەشە.
مز: کرێ. قورقوشم. مزر(با).
مزاژ: مزەی ئاش.
مزاش: مزاژ.
مزبەر: کرێکار.
مزدەر: کەسێکە کە کرێی شتێک بدا.
مزر: شتی مێخۆش.
مزراح: پارچە دارێکی لە خەرت دراوی لووت درێژی تەمتەمە تێ براوە منداڵان بەکشتەک دەیخولێننەوە.
مزراحێن: یاری کردن بەمزراح.
مزراویلکە: با. مزرۆکە.
مزرۆکە: جۆرە چێشتێکە لە هێلکە و ترشاو دروست دەکرێ.
مزرەسێو: سێوی مزر.
مزرەقی: وتەیەکە هەمیشە لەگەڵ وتەی (کوتو)دا بەکاردێنرێ: کوتو(مزرەقی) واتە کوتوپڕ.
مزرێح: د. مزراح.
مزگانی: د. مزگێنی.
مزگت: د. مزگەوت.
مزگەر: کەسێکە لە مس دەفر دروست بکات.
مزگەری: خەریکبوون بەدروستکردنی دەفری مسەوە.
مزگەفت: مزگەوت.
مزگەوت: شوێنێکە کە دروست کرابێ هەر بۆ نوێژ تێداکردنی موسڵمانان.
مزگێنی: مژدە. مژدانە.
مزگی: هـ. مزگەوت.
مزگینی: با. مزگێنی.
مزوانی: د. مزگێنی.
مزۆکلە: دەعبایەکی پلـپلی چوارپێی ڕەش و زەردە لە مارمێلکە دەچێ و لە ئاوی زۆر ساردا دەبێ.
مزوور: نۆکەر. ناوی دێیەکە لە ناوچەی ئامێدی.
مزووک: هـ. مارمێلکە.
مزە: دانەوێڵەیەکە کە ئاشەوان لە باراشی هەموو کەسێکی گل دەداتەوە بەرامبەر بەهاڕینی.
مزەگرتن: سەندنی مزەی ئاش.
مزەمز: زۆر ڕنگانەوەی شت.
مزەمزکەر: کەسێکە کە زۆر شت بڕنگێنێتەوە.
مزەورە: چێشتی ترشی.
مزیار: کرێکار.
مژ: قوم: مژێکی لە ئاوەکە یا جگەرەکەدا. تەم.
مژان: دارێکی درێژی ئەستووره سەرێکی بەند دەکرێ بە(ئێرەق)ەوە و سەرەکەی تری دەکرێ بە(وێژانبەر). برژانگ (ل).
مژاندن: ز. مژین.
مژانک: ز. برژانگ.
مژانە: مژان.
مژدانە: شتێکە بیدەیت بەو کەسەی کە مژدەیەکت دەداتێ.
مژدە: خەبەرێکی خۆش کە پێت بدرێ.
مژمژ: د. پارچەیەکە وەک کەتان بەڵام ئەم تەنکترە.
مژمژووک: ز. شانەی هەنگە کە هێشتا کەلووەکانی پڕ نەبووبێ لە هەنگوین.
مژمژە: قەیسی (ز). جۆرە پەپوولەیەکی ڕەشی خڕە هەڵاڵەی گوڵ دەمژێ.
مژمۆر: مەردوومی مڕ و مۆچ. مەردوومی چاوپڕ و پووشاویی.

مژمۆڕ: مژمۆر.
مژن: هـ. بێزوو.
مـژۆک: کـاغـەزێکی ئەسـتـووری بفـەڵە مـەرەکـەب هەڵـدەمـژێ.
گوڵێکی سپی بێ بۆنی دڕکاوی بەهارییە (با).
مژۆڵ: برژانگ.
مژوو: ز. نانی کۆنی تام نا خۆش.
مژوول: ز. ئادەمی و گیاندارێکە کە بەکارێکەوە خەریک بێ.
مژوولاهی: ز. کارێکە کە مەردووم خۆی پێوە خەریک بکات.
مژوولبوون: . خەریکبوون.
مژوولکرن: . خەریک کردن.
مژە: گوێرەکە کەنۆ. برژانگ.
مژەک: فرۆکی نەفاثە.
مژیلانگ: با. برژانگ.
مژین: هەڵگوشینی شت بەدەم.
مـژیوەر: د. گـیـایەکی گـەڵا وردە گوڵێکی شین دەگرێ، لە کـەژ و
کێو دەڕوێ.
مس: شتێکە وەک ئاسن بەڵام ئەم سوورە، مەنجەڵ و دەفری تری
لێ دروست دەکـرێ. وەرگـرتن: (بمسـە) واتە وەریگرە (هـ).
بزنی نەخشین.
مساسک: با، نەقیزە.
مـساسە: ئەو دارەیە کە سەرێکی پارچە ئاسنێکی پانی پێوەیە و
سەرەکەی تری نەقـیزەیە، بە سەرە پانەکەی جووتیـار گـاسنی
پێ پاک دەکـاتەوە و بە سـەرەکەی تری گاجـووتەکـەی پێ لێ
دەخورێ.
مسافر: ز. کورێکە کە هێشتا ژنی نەهێنابێ.
مسای: هـ. فێربوون.
مـست: ناوبەری دەست و پەنجـەکـانێـتی کـە بەقـوولی بـەیەکـەوە
بنووسێنرێن.
مستاخ: ل. مشتاخ.
مستەقا: جۆرە چێشتێکی کەم ئاوە، لە سلق یا لە سپێناخ یا لە
هێندێ شتی تر دروست دەکرێ لەگەڵ گۆشتدا.
مسـتـەکۆڵە: دەسـتـێکە پەنجـەکانی قـووچابێ: مسـتـەکـۆڵەیەکی
پێدامالّی.
مسدان: ز. دەستهێنان بەنهێم بەسەر شتێکدا.
مـسـرانی: ز. چەند کـونێکە لە دارێکدا ڕەشـمـەی وڵاخی پێ
دەبەسترێتەوە.
مسری: با. ئافرەتی لاواز.
مسقاڵ: ئەندازەیەکی کەمە لە کێشانەی ئاڵتوون و زیو و هێندێ
شتی تردا، بەکاردێنرێ.
مسقالّیی: جۆرە بلوورییەکی ئەستوورە.
مسک: میسک.
مسکە: جۆرە کوللەیەکی بۆری شلّشلّە.
مسکی: لیمۆی ترش. جۆرە ترێیەکە.
مسگەر: مزگەر.
مسگەری: مزگەری.
موسڵمان: کەسێکە کە لەسەر ئاینی پێغەمبەری ئیسلام بێ.
مـشـار: ئاسنێکی دەمـپـانی کلکدارینی دانەدارە، داری پێ
دادەهێنرێ.
مشارە: جۆرە ماسییەکە لە پەنا گوێچکەیدا ئێسقانێکی برگە
برگەی پێوەیە شتی پێ بریندار دەکات. ئەندازەیەکە لە زەوی.
مشت: مست. شتی پڕ (ز).
مشتا: د. مشتاخ.
مشتاخ: شوێنێکە کە ترێی لەسەر هەڵبخرێ بۆ وشکبوونەوەی.
مشتاخنانەوە: ترێ هەڵخستن لەسەر زەوییەکی تایبەتی بۆ بوونی
بەمێوژ.
مشتاخە: ز. مشتاخ.
مـشـتـاک: ز. تەختـەیەکی پانە ئاردی پێ کـۆ دەکـرێتـەوە لە
دەوروبەری بەرداش.
مشتکردن: ز. پڕکردن.
مشت لێگرتن: نیشانگرتن لە شتێک بۆ پێکانی.
مشتن: ز. ماڵین بەگەسک.
مشت و درەوش: بریتـییـە لە دەمـقـاڵـێـیـەکی سـەخت لەناو دوو
کەسدا: مشت و درەوشی چێتانە.
مشتومڕ: دەمقاڵی دوو کەس لەسەر کارێک یا قسەیەک.
مشتوو: دەسکی خەنجەر و کێرد و چەقۆ.
مشتوماڵ: زاخاودانەوە و پاککردنەوەی خەنجەر و شیر و چەقۆ.
مشـتـە: ئاسنێکی سـەرپانی قنگ باریکی قـورسـە، کـڵاشکەر و
چەرم دروو پەرۆ و چەرمی پێ دەکوتنەوە.
مشتەکۆڵ: د. مشتەکۆڵە.
مشتەکۆڵە: مستەکۆڵە.
مشتیلە: دەستەدوو.
مـشـک: دەعـبـایەکی پچکۆلەی چوارپێی کلک باریکە، دیوار و
ناوماڵ کون دەکات.
مـشکگرە: باڵندەیەکی گـۆشت خـۆری چنگ زەردی قـاچ کـورتە
ناتوانێ لەسەر زەوی ڕاو بکات بەڵکو بەحەواوە دەیکات.
مشکولی: ز. پێڵووی چاو.
مـشکەخـۆرە: د. جـۆرە جـانەوەرێکە ڕاوی مـشـک و مـار دەکـا بۆ
خواردن.
مشکەکۆرە: مشکەکوێرە.
مشکەکوێرە: جۆرە مشکێکی کێوی کلک کولّە، لە مشکی مالّی
گەورەترە.

مشکی: ڕەشتی. خۆڵەمێش.
مشن: گیانداریێکە کە زۆر بمشێنێ.
مشوورخواردن: بەتەنگەوەبوون بۆ شتێک و هەوڵدان بۆ پێکهێنان و ڕاپەڕاندنی.
مشوورخۆر: کەسێکە کە بەتەنگ شتێکەوەبێ و هەوڵی بۆ بدا.
مشە: جۆرە دەنگێکە لە لووتی گیاندارەوە دێ، (مشەمش) مشەی یەک لە دوای یەک، (مش و هووڕ) مشەمشی زۆر. زۆریی شت: ئەمساڵ ترێ (مشە)یە. واتە زۆرە، دەردێکی کوشندەیە تووشی ئێستر دەبێ (د).
مشەخت: ز. کەسێکە کە لەبەر چەبۆکی ڕۆژگار نیشتمانی بەجێ هێشتبێ.
مشەما: مشەمما.
مشەمما: تەنراوێکە کە مۆم یا لاستیکی لێ درابێ کە ئاو دانەدا.
مشەممەر: زۆر: ئیمسال هەنجیر مشەممەرە.
مفت: شتی خۆڕایی.
مفتخۆر: کەسێکە کە بەشوێن شتی خۆڕاییدا بگەڕێ.
مفتە: مفت.
مفتەخۆر: مفت خۆر.
مفتەگی: د. خۆڕایی.
مفسک: با. سوزگی شت پالاوتن.
مقاش: مەقاش.
مقام: ئاوازی تایبەتیی بۆ هەموو جۆرە گۆرانییەک.
مقامبێژ: مقامزان.
مقامزان: کەسێکە کە مقامی گۆرانی باش بزانێ.
مقاندن: مرقاندن.
مقانن: مقاندن.
مقاو: دەردێکە تووشی ولاخی یەکسم دەبێ وەک هەلامەت وایە بۆ مەردووم.
مقکردن: د. خۆ گیفکردن.
مقۆمقۆ: مشتومڕی چەند کەسێک لەسەر شتێک.
مقە: د. مرقە، (مقەمق) مرقەمرق.
مقەبا: کاغەزێکی ئەستووری توێ توێی ڕەقە دەکرێ بەبەرگی کتێب.
مقەست: مەقەست.
مقەستە: مەقەستە.
مقەووا: د. مقەبا.
مکارە: ز. ئەسکەنە.
مل: لە چەناگە بەرەوخوار تا ئێسقانی چۆڵەمە. شان (با).
مڵ: شتێکی زۆر وردە کە لەبەر وردی کوڵۆکوڵو بوەستێ. مڵە (د).
ملاز: د. مەلاس.
ملاشک: د. مەلاشوو.
ملاک: کەوچک.
ملاککردن: بریتییە لە چەشتنی خواردەمەنی: ملاکی ناکەیت.
ملانە: زۆرانی و بەربەرەکانی و ڕقەبەری.
ملانێ: زۆران.
ملیان: بریتییە لە مەردوومی گەوج.
ملپێچ: پارچەیەکی تایبەتییە لە سەرمادا لە مل دەپێچرێ.
مڵت: د. مڵتە.
ملتاف: ز. نەخۆشی قورس و گران.
ملتە: خڵتەی لینجی ناوشتی تەڕ.
مڵچ: د. مڵچە.
مڵچاندن: مڵچەکردن.
مڵچانن: د. مڵچاندن.
ملچۆک: ملچێوک.
ملچە: دەنگی دەم لەکاتی شت خواردندا، (مڵچەمڵچ) مڵچەی یەک لەدوای یەک (مڵچ و هووڕ) مڵچەمڵچی زۆر.
ملچێوک: کلچێوک.
ملدان: بریتییە لە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری.
ملڕاکێشان: ملدان.
ملشکاندن: بریتییە لە ڕۆینی یەکێک لە شوێنێک، ئەم وتەیە بۆ سووکی دەوترێ. بریتییە لە خواردنی شتێک بەزۆری: فیسار کەس شەش کولێرەی (ملشکان).
ملشۆڕ: سەرشۆڕ (ملشۆڕکردن) سەرشۆڕکردن.
ملشۆڕی: سەرشۆڕی.
مڵق لێدان: مرق لێدان.
مڵکانە: بەشی خاوەن زەوی لە کشتوکاڵ.
ملکەچ: بریتییە لە فەرمانبەری گوێڕایەڵ.
ملکەچی: فەرمانبەری و گوێڕایەڵی.
مل لە چەقۆ هەڵسوون: بریتییە لە خۆخستنە گێژاو و مەترسییەوە.
مل لە موو باریکتر: گەردن لە موو باریکتر.
مل لێنان: دەست کردن بەکارێک و مانەوەی لەسەری.
ململانە: ملەملەکردن.
ململانێ: ململانە.
ملنان: سەرداخستن و ڕۆین بەرێگایەکدا بەبێ ئاوڕدانەوە.
ملنیان: د. ملنان.
ملۆ: ل. کوللە.
ملوان: ملیوان.
ملوانکە: شتێکە بۆ جوانی بکرێتە مل.

ملوانه: ملوانکه.
ملۆچه: د. ملۆوچه.
ملۆره: د. مێرووله.
ملۆزم: کەسێکه مەردووم تووشی زیان بکات.
ملۆمووچ: مڕ و مووچ.
ملۆمووش: گەڕان و مووشەکردن بەشوێن خواردندا.
ملۆمه: هـ. نێرکی ناوەڕاستی دەستاڕی خوارو.
ملۆوچەکردن: تەزین و مێروولەکردنی ئەندام.
ملوور: د. ملهوڕ.
ملوەن: د. ملوانکه.
ملوێن: هەزار هەزار.
ملوێنک: ملوانکه.
ملوێنەر: کەسێکه بە ملوێن دارایی بێ.
ملوێنێر: ملوێنەر.
مله: لوتکەی سەر گرد و شاخ.
ملـه: دەعبایەکی چنگ چنگه لەناو زەوی نماردا ڕەگی سەوزایی دەخوا. مشک (هـ).
ملەتاتکێ: د. سەرەتاتکێ.
ملەچۆچه: ملەقۆته.
ملەخڕه: دەردێکه بەمل دەگا لە ئاستی قوڕقوڕاگه دەیئاوسێنێ
ملەخڕێ: ملەخڕه.
ملەزەن: د. جەرده.
ملەقوقه: ملەقوتێ.
ملەقۆته: ملی باڵندەی سەربڕاو.
ملەقـوتێ: مل درێژکـردن و سـەرخـوارکـردنەوه بۆ وردبوونەوه و تەماشاکردنی شتێک.
ملەقۆرته: ملەقۆته.
ملەگا:هـ. مله.
ملەگۆ: جۆره خشڵێکه لە زێڕ وەک تەزبیحێکی دنک گەوره وایه ژنان دەیکەنه ملیان.
ملەگەوێ: ماڵەوێنچه.
ملەما: د. دەست کردنه ملی یەک.
ملـەما: کەل و کونی شت کە بای پێدا بچێ: (ملـەما)ی بڕی واته کونبڕی کرد.
ملەماسێ: د. ملەخڕه.
ملەملەکردن: بەرامبەری کردن و بەرهەڵست وەستانی یەکێک بۆ یەکێکی تر: (ملەمله)م لەگەڵدامەکه. مسابقة.
ملەنیر: لبادی ملەگا که لەژێر نیرەوه دادەنرێ.
ملەوانه: ملوانکه.
ملهوڕ: زەلامی مل ئەستووری کەته.
ملەوێچه: ماڵەوێنچه.
ملهیب: ز. شەن.
ملیار: هەزار ملێون.
ملیای: هـ. ڕۆیشتن.
ملێ ملێ: د. مله مله.
ملێون: ملوێن.
ملیونەر: ملوێنەر.
ملیۆنێر: ملوێنێر.
ملیوان: جێگای مل له کالادا.
من: وتەیەکه قسەکەر بەکاری دێنی بۆ دەلالەتکردن لەسەر خۆی. مەنی پێوان.
مناره: پایەیەکی بەرزی قـوچی گـردی کـەمـەرەداری پێپـیلکەداره بانگی لەسەر دەدرێ.
منداڵ: کەسێکه تەمەنی نەگەیشتبێته پانزه ساڵ.ڕۆڵه.
منداڵانه: گوفتار یا کردار یا شتێکی تره که لەهی منداڵ بچێ.
منداڵبازاڕ: شوێنێکه که هەر منداڵ و کوڕوکاڵی تێ چڕابێ.
منداڵبوون: زانی ئافرەت.
منداڵدار: کەسێکه که منداڵی وردی بێ.
منداڵدان: ئەو شـوێنەیه لەناو سکی مـێـینەدا کـه منداڵی تێـدا بەرهەم دێ.
منداڵۆچکه: منداڵی پچکۆلانه. بریتییه له کەسێک که بەتەمەن گــەوره و بەکــردەوه منداڵ بێ: تۆ(منداڵۆچکه)یت و ڕک دەگریت.
منداڵومەزن: کۆمەڵێک کەتێکەلاو بێ له منداڵ و گەورەی هیچ و پووچ
منداڵەبەر: ئافرەتێکه که منداڵی شیرەخۆرەی بەبەرەوەبێ.
منداڵەورتکه: کۆمەڵی منداڵ.
منداڵی: تەمەنێکه که مەردووم تێیدا منداڵ بێ.
منامنا: وتەیەکه بەکاردێنرێ بۆ شـتی ئاشکرای نمایان. (منامنا) شتەکه دیاره کەچی بەدوویدا دەگەڕێ.
منتک: نمتک.
منجڵ: پەڵـەیەکــه لە هێندێ دەفــر پەیا دەبێ بەهۆی ترش تێ کردنیەوه: ئەم مەنجەڵه (منجڵ منجڵ) بووه.
منجه: قـسـەکردن بە لووت و بەخـاوەخاو. (منجـەمنج) منجـەی یەک لەدوای یەک.
منداڵ: مناڵ.
منداڵانه: مناڵانه.
منداڵبازاڕ: منداڵبازاڕ.
منداڵدار: مناڵدار.
منداڵدان: مناڵدان.

مندالۆچکە: منالۆچکە.
مندالْ و مەزن: منالْ و مەزن.
مندالەورتکە: منالەورتکە
مندالی: منالی.
منگ: کەسێکە کە بەلووت قسە بکا.
منگن: منگ.
منگە: دەنگێکە کـە لە لووتەوە بێـتـە دەرەوە، (منگە منگ) منگەی یەک لەدوای یەک.
من و تۆیی: دووماڵەکی (من و تۆیی کردن) دووماڵەکی کردن.
منەت: چاکە: منەتم بەسەردا مەکە واتە چاکەم بەسەردا مەکە.
منەکردن: منەیی.
منەمن: منامنا.
منەیی: گەڕان بەدووی شتێکدا بەپەنهانی: (منەیی) مەکە.
منێ منێ: د. منا منا.
مو: ل. من.
مۆ: پشتی تەشوێ و پاچ و تەور.
موبل: د. شتی ناوماڵ.
مـوتاپچی: کـەسـێکە کـە مـوو لە شـانە بدا و بیـرێسێ و بیکا بەخەرار.
موتابخانە: شوێنێکە کە موتابچی کاری تێدا بکا.
موتالا: خوێندنەوەی کتێب و لێ وردبوونەوەی.
موتوربە: متربە.
موتورفە: مەردوومی زۆر جوان. متربە.
مۆتە: چەمۆڵە.
مۆتەکە: قورساییەکە لە خەودا دەکەوێتە سەر ئەندامی مەردووم ناتوانێ جووڵە و هاوار بکا تا تەواو بێدار نەبێتەوە.
مۆتی: ز. دۆشاو.
مۆجگاری: ئامۆژگاری.
مۆجیاری: مۆجگاری.
مۆچ: ماچ. مەردوومی مۆن.
مۆچیاری(د). خەتی سەر پەنجەی دەست.
مۆچانن: د. ئامۆژگاری کردن .
موچرک: تەزوو.
موچرکە: موچرک.
مۆچک: ز. پێوانەیەکی پچکۆلانەیە.
مۆچکردن: ماچکردن.
مۆچکرن: ز. گوێ خەفاندنی ولاخ لە ترساندا.
مۆچکە: د. ئامۆژگار.
مۆچە: د. جۆرە گیایەکە وەک سپێناخ، ئاژاڵ دەیخوا.
مۆچیاری: د. ئامۆژگاری.
مـۆخ: جـۆرە چەوربیـەکی خـەسـتی بۆرە، وا لەناو مـێـشـک و ئێسقانی گیانداردا.
مۆخ دەرهاتن: بریتییە لە تێن پێگەیشتن و ماندووبوونی مەردووم لە شتێکەوە.
مۆخل: ز. هێلەک.
موخوڕ: دەموکانە.
مۆدنە: شتێکی ڕاستی کوناودەرە لە دار یا لە کارەبا جگەرەی پێ دەکێشرێ. جێگا دەم لە قلیان.
مـۆر: جـۆرە ڕەنگێکە وەک ڕەنگی گـوڵەوەنەوشـە. شـتـێکە ناوی مەردوومی لێ هەڵدەکەنرێ. مۆرانە (د). مێرولە (د).
مۆرانە: گیاندارێکی وردە کەلوپەلی خوری و داری گەندەڵ دەخوا.
مۆرتک: مۆرد.
مۆرخانە: نقێمی ئەموستیلە.
مۆرد: درەختێکە گەلایەکی بۆن خۆشی هەیە.
مۆڕ: گیانداری مۆن.
مۆڕبوونەوە: چاو زەقکردنەوە لە یەکێک بەتووڕەیی.
مۆرک: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
مۆرکردن: مۆرنان بەکاغەزدا.
مورک لە خۆنان: خۆ بەسەنگێن و گرانگرتنی یەکێک کە لە خۆیدا وانەبێ.
مورکومایە: سەنگینی و گرانی مەردووم.
مـۆرە: شـتـێکی پـچـووکی شـەش ڕووە هەر ڕووەی چەند خالێکی پێـوەیە، یاری تـاوڵەی پێ دەکـرێ. کـوڵوپەکـە کـە دیواری پێ دروست دەکرێ (د). موورەغە (د). موورەدار (د).
مۆرە بەسەرچوون: بریتییە لە شتێک کە باوی نەمابێ.
مۆرەقە: جۆرە موورانەیەکە دەداتە دەغڵودان و دار و گەلێ شتی تر.
مۆرەمۆر: لەبەر خۆوە لۆرەلۆر کردن.
مۆرهەڵکەن: کەسێکە کە مۆر هەڵبکەنێ.
مۆریان: ئەسپێ.
مۆریانە: مۆریان (د). مۆرانە
مۆری: مسقالی موورروو. مێروولە (ز).
موریشی: با. گەنمە بەهارە.
مۆریلە: مێروولە.
مۆز: دەعبایەکی کەوەڵەی یەک ڕەنگە لە (خەرەنگەز) پچووکترە. چۆلەکـەیەکی پـچـووکی مـێـشـوولە خـۆرە. جـۆرە مـیـوەیەکی درێژکۆلەی گەرمیانییە بەهێشوو دەیگرێ. زەردەواڵە (ز).
مۆزکردن: ڕق هەستان و مۆڕبوونەوەی ڕەشەولاخ. بریتییە لە ڕق هەستان و خیشکردنی ئادەمی.
مۆزگرتن: مۆزکردن.

مۆزەخانە: عەنتیکەخانە.
مۆزیک: ز. پارێن.
مۆزیقا: مۆزیقە.
مۆزیقە: تەنەکەیەکی بۆشە فووی پێدا دەکرێ و دەنگێکی بەرزی لێوە دێ.
مۆزیقەچی: کەسێکە کە مۆزیقە لێ بدا.
مۆزیقە لێدان: فووکردن بەمۆزیقەدا بەجۆرێک کە دەنگێکی تایبەتی لێوەبێ.
موژدە: مژدە.
مۆژگاری: ئامۆژگاری.
مۆژیار: ئامۆژگار.
مۆژیاری: مۆژگاری.
موغازە: دوکانێکی گەورەیە کە هەموو شتێکی فرۆشتنی تێدابێ.
مۆغەرە: موورەغە.
موغەیری: کەلەبەرێکە لە دیوار ئاگری تێدا دەکرێتەوە و لەسەر بانەوە دوکەڵەکەی دەردەچێ.
موفت: مفت.
موفتخۆر: مفتخۆر.
موفتە: مفت.
موفتەخۆر: مفتەخۆر.
موفەڕک: شتێکی کەمە لە یەکێک یا لە شوێنێکی موبارەکەوە دەست بکەوێ .
موقرایی: لێڵایی.
موقرایی داهاتن: لێڵایی داهاتن .
مۆقک: ز. پشکی هیزەی ڕۆن .
مۆڵ: شتی گردی کۆمەڵ، (مۆڵبوون)، کۆمەڵبوون، (مۆڵکردن) کۆمەڵکردن.
مۆڵاقە: مۆلەقە.
مۆڵخواردن: مۆڵبوون.
مۆڵدان: کۆمەڵکردن و خڕکردنەوە.
مۆڵگە: جێگای مۆڵدانی ئاژاڵ.
مۆڵە: ز. قوڕی گیراوە بۆ سواغ.
مۆڵەت: ماوەدان بەئیش.
مۆلەق: ئەبڵەق.
مۆلەقبوون: ئەبڵەقبوون و چاو زەقبوونەوە.
مولەقە: دارێکی گردە بەقەد مەچەکێک ئەستوورە، سەری لای خوارووی ڕایەڵی جولای پێوەیە، سەرەکەی تری بە(نەوەرد)ە وەیە.
موڵەکردن: ز. سواغدان بەقوڕ.
مۆم: شتێکی درێژکۆلەیە لە پلیتە و پیو دروست دەکرێ و لە جیاتی چرا دادەگیرسێنرێ. مێوی هەنگوین.
مۆمدان: شتێکی بنکداری بەرزە مۆمی چرای لەسەر دادەنرێ.
مۆمکەرە: کەسێکە کە هەر مۆمی چرا دروست بکات.
مۆمنایی: شتێکە وەک قیر، لە هێندێ شاخ و ئەشکەوتدا دێتە خوارەوە بە قەد بەرددا، خواردنی زۆر باشە بۆ کەسێک کە گلابێ یا نهێمێکی پێ گەیشتبێ.
مۆمیا: جۆرە دەرمانێکی تایبەتییە دەکرێتە ناو جەستە و لاشەی مردووەوە، دوای پاککردنەوەی لە هەموو چەوری و گۆشتێک. بۆ ئەوەی کە بۆگەن نەکات.
مۆمیاکاری: بەکارهێنانی مۆمیا لە جەستەی مردوودا بەو جۆرەی کە پێویستە .
مۆمیاکراو: مردوویەکە کە مۆمیاکاری کرابێ.
مۆمینە: د. مشەمما.
مۆن: مەردوومی ڕووگرژ.
مۆنی: ڕووگرژیی.
موو: شتێکی لووسی باریکە لە خوری ڕەقترە لە جەستەی هێندێ گیاندارەڕوێ. برینێکی بەناسۆرە لە ئەندامی مەردووم دەردێ. مۆ (د).
مووبڕ: دەرگا و پەنجەرەیەکە کە زۆر جووت بێ و با نەدا.
مووتاو: د. مووڕێس.
مووچ: د. باسکی دەست.
مووچاخ: د. سەر و پرچی دەستکرد کە ژنی کەچەڵ لەسەری دەکەن.
مووچاندن: د. چەماندنەوەی شت.
مووچانن: د. مووچاندن.
مووچاننەوە: د. چەوتاندنەوە.
مووچانە: شتێکە کە بە مووچە بدرێ.
مووچڕک: مووچڕک.
مووچڕکە: موچڕکە.
مووچنک: ز. مووکێش.
مووچە: جومگەی لای مەچەک. جیرە. چەند ماڵێکە کە لە دێیەک جیابووبنەوە و لە نزیک دێکەوە لەسەر ئاوێک خانوویان کردبێ یا هەواریان هەڵدابێ. بەشێکە لە زەوی کە جیاکرابێتەوە بۆ کشتوکاڵ.
مووچەخۆر: کەسێکە کە لە لایەن یەکێکەوە مووچەی بۆ بڕابێتەوە. فەرمانبەری میری بەڕۆژانە.
مووچیا: د. قولەپێ.
مووچیانەوە: د. چەمینەوە.
مووخۆرکە: برینێکی پچووکە بەسەری منداڵ هەڵدەپەڕێ و مووی پێوە ناهێڵێ.

موودار: چاوێکە کە مووی ببێ.
موودنە: د. مۆدنە.
مووده: ز. پاڵەوان.
موور: گردەداری ئەستوور. بارستەکردنی قوڕ لەسەریەک بە درێژی تا دەبێ بەدیوار. بریتییە لە ڕۆژووەوان: زبانم بە(موور)ە واتە بەڕۆژووە. سووچ و قوژبن (ھ).
مووڕاستەوەبوون: بریتییە لە زۆر تووڕەبوون.
مووڕێس: کەسێکە کە موو بڕێسێ بۆ خەرار و گوریس.
موورگ: موروو. مووری.
موورگەبا: د. مووررووەبا.
موورنان: نیشانەکردنی شتێک بۆ ئەمەی دەستکاری نەکرێ.
مووروو: جۆرە شتێکی خڕی کوندارە ژنان بەھۆنراوەیی دەیکەنە ملیان بۆ جوانی.
موورووله: بەرکۆڵەی جووت. ھەموو شتێک کە وەک موروو خڕ ھەڵدرابێ
مووررووەبا: جۆرە مووررووەیەکی سپییە ژنان دەیکەن بەسەریاندا بۆ باداری.
مووررووه شین: دەرمانێکی تیژی شینی ڕەقە بۆ ھێندێ شت بەکاردێنرێ.
مووررووه شینە: مووررووه شین.
مووررووەکەرانە: کووژەکە کەرانە.
مووره: موورگ، پەلەپیتکە.
مووره سەنک: ئاسنێک یا بەردێکی خڕە، دەبرێتە ناو (خوانکەوە) بۆ ئەوەی (بلۆسک)ی لەسەر بسوورێتەوە و خوانکەکە کون نەبێ.
موورەغە: تیرەغەی پشت.
مووڕێ مازی: بڕبڕەی پشت.
مووری: مۆری.
مووز: ز. زەردەواڵە.
مووزک: با. کەوشی سوور.
موسایی: جوولەکە.
مووسڵدان: بەرمووسڵدان.
مووش: شتێکە لە یاری مووشێندا بەڕیزە دادەکرێ و بەھەڵمات تیلی تێ دەگیرێ.
مووشانە: مووشێن.
مووشکردن: د. خیشکردن.
مووشن: مەردوومی کوت و کوێر. چلێس.
مووشە: مووشەکردن: فیسار کەس ھەر خەریکی (مووشە)یە.
مووشەدەمە: دەمەی ئاسنگەر.
مووشەک: چلێس.
مووشە کردن: جوست و جۆکردنی گیاندار بۆ چنینەوەی خواردەمەنی.
مووشێن: جۆرە یارییەکە چەند مووشێک بەریز دادەکرێن و، لە تەنشتەوە بەھەڵمات تیلیان تێ دەگرێ ھەر چەندێکیان بئەنگێورێن، دەبرێنەوە .
مووکردن: بریتییە لە مەمنوونبوونی کەسێک بۆ شتێک کە لە پێشەوە وا نیشان بدا کە پێی ڕازی نییە و لە دڵیشدا زۆری پێ خۆش بێ. تیژی تیغ بەزۆری بەجۆرێک کە موو بتاشێ .
مووکێش: مەقاشێکی تایبەتی پچکۆلەیە، مووی پێ ھەڵدەکێشرێ .
مووم: مۆم.
موومی: ز. جۆرە سەرپێچێکی پیاوانەیە.
موونک: ز. جومگەی پەنجە.
مووه: مۆ. برینی موو.
مووەڕزه: د. نەخۆشییەکە بەھەر کەسێک بگا مووی ھەڵدەوەرێ.
موویینە: شتیکە کە مووی زۆربێ .
مووین: شتێکە لە موو دروست کرابێ.
موێش: ل. مشک.
مە: پیتی واز پێھێنان (نەھی)ە.
(مە)کە، (مە)خۆ. ئێمە.
مھاردێ: ھ. مادەی نان پێوەدان.
مھان: ل. ماین.
مھانە: بەھانە.
مەبادا: وتەیەکە دەکەوێتە ناوەندی دوو وتارەوە، ھۆیەتی (علیت) وتاری دوای خۆی بۆ پێش خۆی دەگەیەنێ: درۆ مەکە (مەبادا) ڕووزەرد ببیت، یا بخۆ (مەبادا) برسیت ببێت.
مەبەس: شتێکە کە بتەوێ ببێ.
مەبەست: مەبەس.
مەت: پووری خوشکی باوک.
مەتارە: دەفرێکە لە لباد یا لە چەرم دەگیرێ و ئاوی تێ دەکرێ.
مەتاڵ: قەڵغان.
مەتر: میتر.
مەترسی: ترسان لە شتێک کە ھێشتا ڕووی نەدابێ: (مەترسی) گرانی دەکەم، واتە بیمی گرانیم ھەیە.
مەترە: مەتر.
مەترەباز: ز. چەرچی.
مەترەلۆز: جۆرە تفەنگێکە ھەتا فیشەکی بدرێتە بەر، دەیتەقێنێ.
مەترەلوێز: مەترەلۆز.
مەتک: ز. مەت.

مەتە: ئاسنێکی لووت تیژە بەچەرخ یا بەژێ کەوان دەخولێنرێتەوە و داری پێ کون دەکرێ. مەت.
مەتەرێز: چەند کونێکە لە قەڵا دا دەهێڵرێتەوە بۆ ئەوەی شەڕە تفەنگی لێوە بکرێ. سەنگەر.
مەتەفەڕەنگی: د. برغوو.
مەتەل: ز. مەتەڵ.
مەتەڵ: وتارێکی مەبەست گرانی پێچراوەیە مەردووم لە یەکی دەپرسنەوە بۆ بەراوردی زیرەکی یەکتری.
مەتەڵ داهێنان: پرسینەوەی مەتەڵ لە یەکێک.
مەتەڵۆک: مەتەڵۆکە.
مەتەڵۆکە: مەتەڵ.
مەتەڵە: د. مەتەڵ.
مەتێ: هە. درەوش. مەتی.
مەتیە: د. مەتی.
مەتی: هە. پوور.
مەجرەف: موورەدارێکە کە بەکاری لەوح و داهێنان بێ.
مەجمەعە: سینی بچووک.
مەجیدی: جۆرە هەنجیرێکە (با). جۆرە دراوێکی زیوینی عوسمانییە.
مەچەک: باریکایی دەست.
مەچەکە: دارێکە سەرێکی دەبرێتە (دۆڵیانەوە) بەنی (دایەڵکە)ی تێ دەپێچرێ.
مەچیر: ل. دەزوو.
مەحچەچە: خڕنووک.
مەحفیرک: با. مافوور.
مەحموودی: جۆرە دراوێکی زێڕینی پانی عوسمانییە.
مەخابن: با. مخابن.
مەختە: د. پەیمان و بڕیار لەسەر شتێک.
مەختەر: ز. مەیتەر.
مەخسەرە: گاڵتە پێکردن.
مەخشەڵ: ئاگری گڕی زۆر خۆش
مەخشەڵان: چەند ئاگرێکی گڕی خۆشە، کە لەلای یەکەوە بگرێن.
مەخمەر: قەیفە.
مەخمەڵ: مەخمەر.
مەخەر: با. زەوی گەورەی تەخت.
مەخەل: با. ئەو شوێنە سێبەرەیە کە نیوەڕوان مەڕ و ماڵات لەژێریدا کۆدەبنەوە بۆ دۆشین.
مەدرەب: ز. دارستانی قەدەغەکراو. زەوی بەراو.
مەدفینی: با. خۆرشتی پلاو.
مەدەر: ز. تکا.
مەدەک: ز. ماداک.
مەر: بێڵ (ز). مەگەر.
مەراق: خەفەتی زۆر بەدەست شتێکەوە.
مەراقکردن: خەفەت چوونە سک.
مەراڵ: ئاسک.
مەران: ز. درەختێکە لقەکانی دەکرێ بەدار قەنگە.
مەرایی: ڕووپامایی.
مەرتاندن: ز. ڕووشاندنی شتێک.
مەرج: گرەو. شەرت و پەیمان.
مەرجان: جۆرە گیاندارێکی دەریایی لق لقە وەک درەخت، خۆی بەبنکی دەریادا دەنووسێنێ و خواردەمەنی وەردەگرێ پارچەکانی دەکرێ بەمووروو.
مەرحەمە: پەشتەماڵ.
مەرد: پیاوی ئازای جوامێر.
مەرداسەنگ: مرداسەنگ.
مەردانە: کردار و گوفتاری پیاوانە.
مەردایەتی: پیاوەتی و جوامێری .
مەردم: د. مەردووم.
مەردووم: ئادەمی.
مەردومازار: زۆرداری ستەمکار .
مەردومازایی: زۆرداری و ستەمکاری.
مەردە: هە. مردوو.
مەردەن: هە. مردن.
مەردەنگی: د. جۆرە کووپەیەکە لە شووشە، ناوقەدی تۆزێ ئەستوورترە لە سەر و قنگەکەی.
مەردەماڵ: د. داراییەکە کە گیانی لەبەردا نەبێ، وەک پارە و کوتاڵ و شتی تری وا.
مەردە و زیندە: د. بەشوێنێک دەڵێن نە بەکاری زیندوو بێ نە بەکاری مردووبێ.
مەردی: جوامێری و پیاوەتی.
مەڕ: گیاندارێکی مێینەی خوریداری دووگداری ماڵییە کە پێی نابێتە ساڵی چوارەم. بێڵ (با) ئەشکەوتێکە لە شاخ و کێو کە مەڕە کێوی تێ دەچێ (د).
مەڕانە: سەرانەیەکە کە لە لایەن دەوڵەتەوە لە خاوەن (مەڕ) دەسێنرێ بەرانبەر بەمەڕەکانی.
مەڕبەند: زنجیرێکی درێژە سەرێکی دەکرێتە دەستی وڵاخەوە و سەرەکەی تری بەزەوییدا دادەکوترێ .
مەڕبێر: مەڕەبێرە. خاکەنازی گەورە (با).
مەڕک: با. بێڵ.
مەڕمەڕ: جۆرە بەردێکی لووسی سەختی جوانە دەتاشرێ و پایە و دیواری لێ دروست دەکرێ.

مەڕمەڕۆکێ: جۆرە یارییەکی منداڵانەیە.
مەڕە: جۆرە هەنگێکی تەمەڵی کەم بەرهەمە.
مەڕبێرە: بێرە. کاتێکە کە مەڕی تێدا دەهێنرێتەوە بۆ بێرە.
مەڕەسوور: دەعبایەکی کێوی شاخدارە، لە ئاسک دەچێ، بەڵام ئەم نەختێک گەورەترە.
مەڕەکێوی: مەڕەسوور.
مەڕیای: هـ. شکان.
مەڕی: مەڕەکێوی. چاوێکە نە زۆر ڕەش بێ و نە زۆر کاڵ بێ.
مەرز: هـ. قەراغ و پەڕی شت
مەرزنجۆش: گیایەکە گوڵێکی کوڵکنی پەمەیی دەگرێ، بۆ ژانەسک جۆش دەدرێ و دەخورێتەوە.
مەرز و بووم: زەویوزار.
مەرزە: سنوور (هـ). گیایەکی هاوینییە گەڵای درێژکۆلەیە وەک شویت دەخورێ.
مەرزەوان: ئەوانەن کە سنووری خاکێک دەپارێزن.
مەرس: گای بنە. مەردوومی زویری بێ دەنگ (مەرسبوون) زویر بوون.
مەرسکردن: زویرکردن.
مەرغوزار: د. مێرغوزار.
مەرکانە: دەفرێکی گڵێنی سوورەوەکراوی قووڵی دەم زلە.
مەرگ: مردن.
مەرگبڕین: کوشتن. بریتییە لە کردنی کارێک بەچاکی: وای دروست کردووە (مەرگی بڕیوە).
مەرگ کردن بەجەژن: بریتییە لە ئازاردانی یەکێک بەجۆرێکی وا سەخت کە مەرگ لە چاویدا جەژن بێ .
مەرگەماسی: جۆرە زەهرێکە ماسی پێ دەکوژرێ.
مەرگەماهیی: مەرگەماسی.
مەرگەمووش: جۆرە زەهرێکی کوشندەیە دەدرێ بەمشک.
مەرگەمەلە: مەلەیەکە کە خاوەنەکەی لە خنکان ڕزگار نەکا.
مەرمەر: د. مەڕمەڕ. هەڵمات.
مەرمەریشۆک: ز. مارمێلکە.
مەرە: سەغڵەتی و ماندوێتی زۆر: بە(مەرە)یەکت دەبەم بەهەنگوین بلێیت زەهری مارە.
مەرەز: موویەکی نەرمە بەئەندامی جۆرە بزنێکەوە.
مەرەزە: برنجێکی سەوزە کە هێشتا نەدورابێتەوە.
مەرەس: ڕستێکە دەخرێتە ملی تانجییەوە.
مەرەک: ز. کادان.
مەرەکەب: ڕەنگێکی شلی تایبەتییە کاغەز و کتێبی پێ دەنووسرێ.
مەرەندی: جۆرە کاڵەکێکی درێژکۆلەی کووز کووزە.
مەرەنی: مەرەندی.
مەرێس: ز. جوانی و تریبفەی شت.
مەزات: فرۆتنی شت لەناو چەند موشتەرییەکدا بەزیادکردنی نرخی لەلایەن موشتەرییەکانەوە یەک لەسەر یەک.
مەزاتخانە: دەڵاڵخانە.
مەزاختن: لەناوبردنی شت (ز).
خەرجکردن (با).
مەزاق: گاڵتە.
مەزاق پێکردن: گاڵتەکردن بەیەکێک .
مەزخاندن: ز. مەزاختن.
مەزد: ز. کلاوڕۆژنە.
مەزرا: دەشتێکی پانە کە شینایی تێدا کرابێ.
مەزروکە: ز. مادەی نانکردن.
مەزرە: د. کێڵگە، دەبێ لە مەزرەعەوە وەرگیرابێ.
مەزرەقە: هـ. مەزروکە.
مەزرێح: د. مزراح.
مەزن: شتی گەورە. پیاوی گەورەی سەرۆک.
مەزناهی: با. گەورەیی.
مەزند: مەزن.
مەزندە: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ شتێک کە گومانت تێدا بێ: بەمەزندەی من ئەم کارە وایە، لە (مظنە)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە.
مەزنی: گەورەیی.
مەزووکە: هـ. مارمێلکە.
مەزە: خواردەمەنییەکە کە لەگەڵ ئارەقدا بخورێ.
مەزەبزووتن: بریتییە لە ئارەزووکردن و حەزکردن لە شتێک.
مەزەدار: خواردنی خۆشی بەتام. قسەی خۆشی بەتام.
مەزەدان: کەمێک سوێر، خوێکردن یا ترشکردنی خواردەمەنییەک: کەمێک (مەزە)ی سوێر یا ترشی چێشتەکە بدە.
مەژک: مێشک.
مەژگلە: هـ. گیایەکی سەوزە لە بزنە ڕیشە دەچێ بەکاڵی دەخورێ.
مەژگە: هـ. کاکڵە گوێز.
مەژی: مێشک (با). سەر (ز).
مەس: مەست.
مەساسە: بێڵەکانی لووت ئاسن. ئاسنێکی دەم پانە کلکێکی دارینی پێوەیە جووتیار لەکاتی جووتدا قوڕی هەوجاڕی پێ دەکرێنێ.
مەست: مەردوومی سەرخۆش. بریتییە لە گیانداری تێروتەسەل. بریتییە لە چاوی ڕەشی جوان.

مەستبوون: سەرخۆشبوون. تێروتەسەلبوون.
مەستوور: سەرخۆش.
مەستەکی: شتێکە وەک بوغورد وایە و تامی خۆشە، لەگەڵ (ئەنیسوون) و (رازیانە)دا دەهاڕرێتەوە و دەدرێ بەمنداڵ.
مەستی: سەرخۆشی. تێروتەسلی.
مەسقەڵ: شتێکە ژنان دەموچاوی پێ جوان دەکەن.
مەسکەت: خواردەمەنییەکی خۆشە لە شەکر و ئارد و گوێز دروست دەکرێ.
مەسە: پارچە پۆڵایەکی لووسی درێژکۆلەیە، گۆشتفرۆش کێردی پێ تیژ دەکاتەوە. خاکەنازی ئاگر (د).
مەسەب: ز. شوێنێکە کەوی ڕاوی تێدا دادەنرێ بۆ ئەوەی کە بخوێنێ و کەوی تری لێ کۆ ببێتەوە.
مەسەکی: د. مەستەکی.
مەسێ: خاکەنازی ئاگر. ئەستێوڵک (هـ). وتەیەکە بەتەوسەوە هێندێ جار لە گفتوگۆدا بەکاردێنرێ.
مەسێن: ز. مەسینە.
مەسینە: لوولێنەیەکی مسێن یا حەوجۆش یا تەنەکەیە.
مەش: هـ. مێش.
مەشتە: جۆگەیەکە بە تەنشت سێ چوار قەد تووتن و تەماتەدا دەکێشرێ و ئاوی ئەو قەدانەی لێوە دەدرێ.
مەشفەن: ز. تاتەشۆر.
مەشق: نووسینەوە لەبەر دێڕێکی جوان چەند جارێک لەسەر یەک بۆ خەتخۆشی. کردارێکی تایبەتییە کە ڕۆژێ چەند سەعاتێک بەسەرباز دەکرێ.
مەشک: ز. مەشکە.
مەشکاڵە: مەشکۆلەیەکە کە شتی وشکی تێدا دابگیرێ.
مەشکۆلە: مەشکەی پچووک.
مەشکۆڵە: مەشکۆلە.
مەشکە: پێستێکی دەرهاتووی خۆشکراوە ماستی تێدا دەژەنرێ.
مەشکەبڕە: مەشکە دڕە.
مەشکەدڕە: جۆرە کوللەیەکی ژێر باڵ سوورە.
مەشکەژەن: کەسێکە کە مەشکە بژەنێ.
مەشکە ژەندن: ژەندنی مەشکە بۆ گرتنی کەرە لە ماست.
مەشکەژەنە: مەشکەژەنێ.
مەشکەژەنێ: جۆرە یارییەکە چوار پەلی یەکێک دەگیرێ و بەرز دەکرێتەوە و وەک مەشکە دەژەنرێ.
مەشکە و مەڵان: ناوە بۆ مەشکە و ئەو سێپایەی کە لەسەری دەژەنرێ.
مەشکەی گاووس: مەشکەی چەرمی مانگا.
مەشە: مێش.

مەشەک: جۆرە چەکێکە لە زەوییەوە بۆ زەوی و، لە زەوییەوە بۆ ئاسمان و بەپێچەوانەکەشیەوە بەکاردێنرێ (صاروخ).
مەشیا: وتەیەکە لە جێی وتەی (دەبوایە) بەکاردێنرێ.
مەعاف: زۆر: فلان شت مەعافە واتە زۆرە.
مەعلان: شارەزای بەبەهرە.
مەعین: ز. ماین.
مەغز: مۆخ: پیاوێکی بێ مەغزە واتە بێ مێشکە. کاکڵەی گوێز و بادام و هێندێ شتی تر.
مەغەل: ز. پەچەی مەڕ لە دەشتدا.
مەفرەق: جۆرە کانێکە وەک فافۆن، قاپ و قاچاخی لێ دروست دەکرێ.
مەفسک: ز. کەوگیر.
مەفەرە: جۆر ترێیەکی خڕە وەک (پایزە) وایە بەڵام ئەم هەر لە هاویندا پێ دەگات.
مەڤیژ: با. مێوژ.
مەقاش: ئاسنێکی دوو پەلە، پشکۆ ئاگری پێ هەڵ دەگیرێ.
مەقەست: تیغێکی بڕندەی دوودەمە، شتی پێ دەبڕدرێ و مووی پێ دەقرتێنرێ.
مەقەستکردن: هەڵپاچینی موو بەمەقەست: بەرسمێلت (مەقەست کە).
مەقەستە: غارکردن لەسەر کێڕێک بەچەپ و چڕی لە وێنەی مەقەستدا.
مەقەڵە: جۆرە یارییەکە.
مەقەڵی: شتێکی پێچکەدارە، لە زستاندا ئاگری تێ دەکرێ.
مەک: د. خوێ.
مەکات: خەرجێک بوو جاران ساڵەوساڵ لە سەری هەموو ئاژاڵێکی گەورە دەسێنرا بۆ دەوڵەت.
مەکارە: بەکرەی خەیاتی. وڵاخێکە کە بەکرێ گیرابێ بۆ هەڵگرتنی کەلوپەل و شتومەک.
مەکارەچی: کەسێکە کە مەکارە لێ بخوڕێ.
مەکر: نازونووز.
مەکرباز: نازونووزکەر.
مەکرکەر: مەکرباز.
مەکۆ: شتێکی سەرو قنگ باریکە جۆڵا لوولەی تێ دەخاو جۆڵایی پێ دەکا.
پەنایەکەدزو جەردە خۆی تێدا حەشاربدا.
مەکۆک: مەکۆی جۆڵایی.
مەکوو: د. مەکۆی جۆڵایی.
مەکووک: مەکوو.
مەکووکە: مەکووک.

مەکی: هـ. خوێ.
مەکینە: ماکینە.
مەکینەچی: ماکینەچی.
مەگرتی: با. گیرەم.
مەگریجەنی: قەیچی.
مـەگەر: وتەیەکە لە دوای وتەی بوونەوە نەبوون و لە دوای وتەی نەبوونەوە بوون دەگەیەنێ: ئیمشەو دێم بۆ لات (مەگەر) میوانم بێ، واتە ئەگەر میوانم هات نایەم، یا ئیمشەو نایەم (مەگەر) میوانەکانم بڕۆن، واتە ئەگەر ڕۆیشتن دێم. تومەز: چوومە لای فیسار کەس وتیان لێرە نییە (مەگەر) لە ژوورەوە بووە و ئەوان نەیانزانیوە واتە (تومەز).
مەگەز: ل. مێش.
مەگەزە: د. جۆرە چاوئێشەیەکە .
مەگەس: مەگەز.
مەگەن: د. موقناتیس.
مەگیرانی: بێزووکردنی ژنان.
مەل: گیانداری باڵدار.
مەلا: خوێندەواری ئاینی بەرز. ناوکی خەرمان.
مەلا: مەلا.
مەلابانگان: کاتی شەبەقدان کە بانگدەر بانگی تێدا دەدا.
مەلابەزێن: بریتییە لە کەسێک کە لە هەموو قسەیەکدا بەرزە بلێیس بوەستێ.
مـەلا تەقتەقێنە: جۆرە یارییەکە چەند کەسێک بەدوو بەرد دەیکەن.
مەلاخۆر: شتێکە کە بەتەوایی هەرزان بووبێ و دەست بکەوێ. شتی حەڵاڵ کە لەوانەبێ مەلا بیخوات.
مەلازادە: منداڵی مەلا.
مەڵاس: شتێکە کە نووسابێ بەزەوییەوە و مت بووبێ: گاکە خۆی (مەڵاس)کردووە (مەڵاسبوون) متبوون بەزەوییەوە، (مەڵاسکردن) متکردن.
مەڵاشک: مەڵاشوو.
مەڵاشگ: مەڵاشک.
مەڵاشوو: ئاسمانەی ناودەم. تەپڵی سەر لە عاستی مەڵاشوو.
مـەڵاشووکەوتن: دەردێکە تووشی مەردووم دەبێ مەڵاشووی دادەکەوێ و بەپەنجە هەڵی دەدەنەوە.
مـەڵاشووهەڵدانەوە: بە پەنجەی دەست هەڵدانەوەی مەڵاشووی منداڵی تازەبوو یا یەکێک کە مەڵاشووی کەوتبێ.
مەلاڤی: ز. جۆرە هەرمێیەکی پایزەی گەورەیە.
مەڵاک: د. مێڵاک.
مەڵاککردن: مێڵاککردن.

مەلامەت: مەبەست: هاتنت بەم شەوە بێ(مەلامەت) نییە.
مەڵاو: مەلوولاو.
مەڵبەن: مەڵبەند.
مەڵبەند: ناوچە.
مەلتیک: ز. جۆرە سێوێکی پایزەیە.
مەڵحەم: جۆرە دەرمانێکی تەڕی توندە دەخرێتە سەر برین. بەری گیایەکی بۆن خۆشە دەکرێتە ناو نانەوە. جۆرە دارێکی بۆنخۆشی کوێستانییە داردەستی لێ دروست دەکرێ.
ماڵڵا: مەلا.
مەڵکەنی: د. مەرکانە.
مـەلمەل: جۆرە تەنراوێکی تەنکە وەک کرێشەی سەرپۆشی ژنان وایە.
مەڵۆ: چەند باقەیەکی گەورەیە لە شتێک کە بەداس دروابێ، یا بەدەست دەسکەنە کرابێ.
مەلۆتک: د. مەلۆتکە.
مەلۆتکە: منداڵی ساوای قۆناغەکراو .
مەلوو: ز. مەڵۆ.
مەلووچک: د. مەلیچک.
مەلوولاو: ئارداوێکە هێندێ جار بۆ ئاژاڵ دەگیرێتەوە و دەرخواردی دەدرێ .
مەڵوەن: د. مەڵبەند.
مـەلە: بەناو ئاودا ڕۆیشتن و کەوتنە سەر ئاو بەهۆی جووڵاندنی پەل و پۆوە. خۆشووشتن بەئاو.
مەلەس: جۆرە پارچەیەکی جوانی ئاوریشمی لووسە، ژنان دەیکەن بەکالا.
مەلەسی: ناوە بۆ جۆرە هەنارێک.
مەلەڤان: ز. مەلەوان.
مـەلەکردن: چوونە ناو ئاو و پەل و پۆ جووڵاندن بۆ هاتوچۆکردن بە سەریدا. بریتییە لە چوونە ناو ئاو و خۆ تێ هەڵکێشانی.
مەلەکوڕ: هـ. کوللە.
مەلەگەوی: هـ. مەلەوێچە.
مەلهەم: د. مەڵحەم.
مەلەوان: کەسێکە کە مەلە بزانێ.
مەلەوانی: زانینی مەلە.
مەلەوێچە: مالەوێنچە.
مەلیە: ل. کوللە.
مەلیچک: د. چۆلەکە.
مەم: د. مەمک.
مەمرە و مەژی: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ ژیانێکی کەموکوڕی وا کە لە ناوەندی ژیان و مردنابێ، واتە نە بەژیان بژمێردرێ و نە بەمردن: فیسار کەس (مەمرە و مەژی) دەژی.

مەمک: دوو گۆی خڕ و پڕی گۆشتنی سەر بەمۆرن بەسەر سنگی ئافرەتەوە کە منداڵی بوو شیری تێ دەزێ.
مەمک خواردن: بریتییە لە شیرخواردنی منداڵ بەدەمنانی بەمەمکەوە.
مەمکخۆر: منداڵی شیرەخۆرە.
مەمکدان: بریتییە لە شیردان بەمنداڵ بەخستنی مەمک بۆ ناودەمی .
مەمکدەر: بریتییە لە ئافرەتێک کە شیر بدا بەمنداڵ.
مەمککردن: پەیابوونی مەمک لەسەر سنگی ئافرەت.
مەمکۆڵە: مەمکی پچکۆلەی جوان .
مەمکە: مەمک. دوو دەنکە لە تەزبیح کە لەسەر باری پانی کون کرابێ.
مەمکەبەند: شتێکە دەخرێتە هەردوو مەمکەوە و لە پشتەوە دەبەسترێ بۆ ئەوەی کۆی بکاتەوە.
مەمکەخۆرە: منداڵی بەر مەمکانە .
مەمکەفەرەنگی: مەمکێکە لە لاستیک دروست کراوە، دەخرێتە دەمی منداڵی شیرەخۆرەوە بۆ ژیربوونی.
مەملە: مەمکۆڵە.
مەملەدەمێ: د. منداڵی شیرەخۆرە.
مەمە: وتەیەکە منداڵی شیرەخۆرە بەمەمکی دەڵێ.
مەمۆتێ: د. مەمکۆڵە.
مەمۆڵە: مەمۆتێ.
مەمە: مەمک. مەمکەی تەزبیح .
مەمێ: مەمک.
مەن: دەفرێکی تایبەتییە دانەوێڵەی پێ دەپێورێ. سەنگێکی تایبەتییە. مەنگ. مەند (د).
مەنجەڵ: دەفرێکی مسینی قوولی لێوداره، چێشتی تێدا لێ دەنرێ.
مەنجەڵۆک: با. سەتڵ. دەستە مەنجەڵ.
مەنجەڵۆکە: مەنجەڵی پچووک.
مەنجەڵی هەڵم: جۆرە مەنجەڵێکە لە هیچ لایەکەوە هەناسە نادا و لە ماوەیەکی کەمدا هەموو جۆرە خواردەمەنییەکت بۆ ئەکوڵێنێ.
مەنجەنیق: ئامێر (آلة)ێکە بۆمبا و ئاگری پێ فڕێ دەدرێتە ناو دوژمنەوە، لە فارسییەوە وەرگیراوە.
مەنجێڵ: د. مەنجەڵ.
مەند: مەنگ. پیتێکە بە دوای هەر ناوێکەوە نرا دەیکا بەسیفەتی موشەبەهە: دەوڵە(مەند)، بەهرە(مەند)، خێرەو(مەند).
مەند: خێرەو(مەند).

مەندۆڵ: بەندۆڵی سەعات.
مەندۆڵە: جۆرە تەنراوێکی ئەستوورە دەکرێ بەکالا. زەنگوڵەیەکی پچکۆلەیە لە زێڕ یا لە زیو دەخرێتە پاوانەی منداڵەوە.
مەندوونە: ئەستیو.
مەندێ: گیایەکە وەک هەڵز دەدرێ بەئاژاڵ و ولاخ.
مەندی: بوونی ئاو بەمەنگ. هێدێتی و لەسەرخۆیی مەردووم.
مەندیل: تەنراوێکی سپییە لە بلووری تەنکترە. دەسەسڕ. مێزەرەی سپی.
مەنزڵ: قۆناغێکە کە لێی بخرێ.
مەنزڵ بەگی: د. مەنزڵ و قۆناغ.
مەنزڵگا: شوێنی کاروان لێخستن.
مەنسووری: جۆر نقامێکە.
مەنقەڵە: مەقەڵی.
مەنقەڵی: مەقەڵی.
مەنگ: ئاوی پەنگاو. مەردوومی لەسەرخۆ.
مەنگۆڕ: د. کچی قەدرەی ماوەوە.
مەنگۆڵە: مەندۆڵە. زەنگوولە (د). گوڵنگە (د).
مەنگەڵ: د. مەنگەڵی.
مەنگەڵی: مەقەڵی. پەنجا فلسی.
مەنگەن: مەنگەنە.
مەنگەنە: گیرگەیەکی تایبەتییە کە لەکاتی جزوبەندا کتێبی پێ دەگیرێ.
مەنگی: پەنگاویی ئاو. هێدێتی و لەسەرخۆیی.
مەنۆڵە: مەندۆڵە.
مەنەر: نیشانە و سەر و شوێن: فیسار کەس (مەنەر)ی نییە واتە بێ سەر و شوێنە .
مەنێ: گیایەکی ترشی بەهاریی بۆن خۆشە وەک شویت وایە دەخورێ.
مەنی: د. مەنێ.
مەوج: پێخەفێکە وەک جاجم، بەلام ئەم لە دەزوو دروست دەکرێ.
مەودا: تیژی دەمی تیغ. مەیدان: مەودام بدە.
مەوێژ: ز. مێوژ.
مەویژ: مێوژ.
مەویژە: د. دەنکێکی ڕەشباوە بەسەر سووردا دەڕوانێ و ناوەکەی سپییە.
مەهـ: مانگ.
مەها: مێ.
مەهار: پەتێکە وەک ڕەشمە دەخرێتە لووتی وشتر و ولاخی سەرکێش.
مەهاربەن: د. مەهاربەند.

مەهاربەند: مەهار.
مەهارکردن: مەهارخستنە ناو لووتی ولاخ.
مەهانە: بەهانە.
مەهتاو: د. مانگەشەو.
مەهدەر: ز. تکا.
مەهدەرچی: ز. تکاکەر.
مەهرکرن: ز. مارەکردنی ژن.
مەهک: با. حەیزی ژنان کە هەموو مانگێک تێی دەکەوێ.
مەهمێز: د. مامزە.
مەهیر: ز. دۆکولیو.
مەهینی: ز. ئێسترەماچە.
مەی: مەڕ (هـ). شەراب. حوشتری مێ (ز).
مەیا: ز. ئێسترەماچە.
مەیان: مەیدان. جۆر ترێیەکە (ز).
مەیانە: دۆستایەتی: فلان و فلان مەیانەیان خۆشە، واتە بەینیان هەیە.
مەیتەر: خزمەتکاری ولاخ.
مەیتەری: خزمەتکردنی ولاخ.
مەیخانە: شوێنێکە کە ئارەقی تێدا بفرۆشرێ.
مەیخانەچی: ئارەقفرۆش.
مەیخۆر: کەسێکە کە شەراب بخواتەوە.
مەیخۆش: مێخۆش.
مەیفرۆش: کەسێکە کە هەر شەراب بفرۆشێ.
مەیدان: دەشتایی و پانایییەکی گەورە.
مەیدانبازی: یاریکردن لە مەیدانێکدا.
مەیداندار: کەسێکە کە لە مەیدانێکدا یاری بکات.
مەیداندارێ: مەیدان نانەوە.
مەیدان نانەوە: ئامادەکردنی مەیدانێک بۆ یاری تێداکردن.
مەیرە: جۆرە پەنیرێکی وردە وەک سیرێژ.
مەیکوت: مێکوت.
مەیڤان: د. میوان.
مەیڤانخانە: د. میوانخانە
مەیڤانی: د. میوانیی.
مەیموون: گیاندارێکی چوارپێی کلکداری گەرمیانییە دەست و پێی لە دەست و پێی ئادەمی دەچێ. میوان.
مەیموونەوان: کەسێکە کە مەیموون ڕابگرێ و فێری یاری بکات.
مەینەت: تالاو و دەردی سەری.
مەینەتی: تالاوی و دەردی سەرێتی.
مەیین: توندبوونەوەی شتی شل بەهۆی هەوێن یا سەرماوە.
مەیو: شتێکە کە مەیبێ: وەک ماستی مەیوی لێ هاتووە.

مێ: گیاندارێکە کە نێرنەبێ. مەڕ .
میاو: میاوە.
میاواندن: دەست بەمیاوەکردنی پشیلە.
میاوانن: د. میاواندن.
میاوە: دەنگی پشیلە (میاوەمیاو) میاوەی یەک لەسەر یەک.
مێباز: کەسێکە کە حەز لە ژنان بکا و چاو باشقالیان لەگەلدا بکات.
مێبازی: حەز لە ژنان کردن و چاوباشقالیکردن لەگەلیاندا.
مێتاوی: د. کەپرێکی سەرگیراوە لەبەردەمی خانووی دوونهۆمدا دروست دەکرێ بۆ ئەوەی هاوینان لەسەری بنوون .
میتر: ئەندازەیەکە کە بریتییە لە سەد سانتیم.
مێتکە: مێتولکە.
مێتن: ز. مژین.
مێتوکە: مێتولکە.
مێتولکە: ئەسپێی وردی پچووک .
میتێل: ز. قومامەی دۆشەک.
میجک: ز. خێرایی و چەسپانی لە کاردا.
میچڕاندن: ز. هەلگولۆفتنی هەردوو دەست.
مێچکە: مێینەی پچووکی هێندێ گیاندار.
مێچکە مێچکە: بەدەوروپشتی یەکێکدا هاتن و قسەی نەرمکردن لەگەلیدا بۆ ئەوەی کارێکی پێ بکەیت .
مێچلگە: ز. مەرجکردن لەسەر شتێک .
مێخ: سنگ.
مێخ زنجیر: سنگێکی ئاسنە دادەکوترێ و ولاخی پێ دەبەسترێتەوە.
مێخ سندان: دەزگای ئاسنگەر.
مێخلەمە: جۆرە خواردەمەنییەکە لە ڕۆن و قیمە و هێلکە دروست دەکرێ .
مێخۆش: شتی مزر.
مێخەک: بەری درەختێکی گەرمیانییە بۆنی زۆر خۆشە. جۆرە گولێکی ڕەنگاوڕەنگی جوانە بۆنی وەک بۆنی مێخەک وایە.
مێخەکبەند: ملوانکەی مێخەک.
مێخەکە: جۆرە دوگمەیەکی ڕەقە لە دەست و قاچی هێندێ کەس دەردێ.
مێخەکی: شتێکە کە ڕەنگی وەک ڕەنگی مێخەک وابێ.
مێر: با. پیاوی ئازا.
میرار: ز. گیانداری مردارەوەبوو، (میراربوون) مرداربوونەوە. (میرارکردن): مردارکردنەوە.
مێرانە: پیاوانە.
مێرانی: با. پیاوەتی.

میرتال: قەڵغان (ز).
میرج: ز. جۆرێکە لە گەنم.
میرچ: ز. دەنگی ماچ.
میرخاس: با. پیاوی ئازا.
میرخوز: جۆرە ماسییەکی شینی باریکە.
مێرد: هاوسەری ژنی مارەکراو.
مێردترێنە: جۆرە مووروویەکە ژنان دەیکەن بەسەریاندا.
مێردرەوە: دیوارێکە بە بەرزی گەز و نیوێک دەکرێ بەگردی سەربانەدا بۆ ئەوەی ئەگەر ماڵ و منداڵ لەسەر بان نوستن نەبینرێن (ستارە).
مێردکردن: شووکردن.
مێردەزمە: حۆڵی بیابان. بەردە عازەبە: (د).
مێردی: پیاوەتی.
مێڕیان: هـ. شکان.
میرزا: یەکێکە کە هەر خوێندنەوە و نووسین بزانێ.
میرغوزار: چیمەن و سەوزایی.
مێرک: با. مێر.
مێرگ: با. چیمەن.
مێر و چێر: د. دۆست و برادەر.
مێروستان: هێلانە مێرووله.
مێروو: مێرووله. مرۆڤ (د).
مێرووچە: مێرووله.
مێرووله: گیاندارێکی پچووکی سەر زلی قنگ خڕی ناوقەد باریکە.
مێروولەکردن: مڵووچەکردنی ئەندام بەهۆی سڕبوونیەوە. وردە قوڵپدانی شتی شل لەسەر ئاگر لەپێش هاتنەکوڵیدا.
مێری: با. مێرووله.
میرنشین: إمارە.
میری: حکوومەت.
مێز: تەختێکی چوارپێی بەرزە شتی لەسەر دادەنرێ. مێز. باوەش: (مێز)ێک دار، واتە باوەشێک.
مێزن: میزن.
مێزەر: مەندیلێکی سپییە کە بەسترابێ بەسەرەوە. سەرپێچ.
مێزەرە: مێزەر.
مێزفک: با. پلوسک.
مێزیان: د. میزتن.
میزتن: با. میزکردن.
مێژ: نوێژ (ز) شتی ڕابوردووی کۆن (د).
مێژتن: با. مژین.
مێژکرن: ز. نوێژکردن.
مێژکەر: ز. نوێژکەر.
مێژوو: تأریخ.
مێژووشناس: تأریخ زان.
مێژووڤان: با مێژووناس.
مێژووناس: با. مێژووشناس.
مێژووناسی: با. زانینی مێژوو.
مێژوەرد: جۆرەس گیایەکە بۆ ئاژاڵ و ولاخ باشە.
مێژەلاک: مێشکەسەر. لاسک و چڵ و پۆپی هێشووەترێ کە دەنکی پێوە نەمابێ.
مێژەلۆک: مێولاک.
میساب: ز. مشتە.
میساخە: ز. شوێنی ئارد لە دەوروپشتی بەرداش.
میساس: ز. نەقیزە.
مێش: گیاندارێکی پچووکی باڵداری خورتداره.
مێشان: د. یارییەکە بەگوێز دەکرێ.
مێشپەڕ: کاتی ڕشانەوەی ترێ.
مێش تێدان: مێش مرووکان بەزۆری لە شتێک.
مێشڕەوێن: چەرمێکی هۆنراوەی پژپژە دەکرێ بەناوچەوانی ولاخدا بۆ ئەوەی بەجووڵانەوەی مێشی لێ دوور بکەوێتەوە.
مێشقەپاندنەوە: بریتییە لە بێ ئیشی یەکێک.
مێشک: شتێکی سپی چەورە لەناو کاسەی سەری گیانداردا.
مێشکوژ: شتێکی کلکداری دەمپانی کون کونە مێشی پێ دەکوژرێ.
مێشکۆڵە: بەشێکە لە مێشک دەکەوێتە پشتی سەرەوە بۆ لەنگەرڕاگرتنی لەشی ئادەمی.
مێشگرە: کاغەزێکە دەرمانێکی لینجی پێوەیە مێش دەگرێ.
مێش لە دەمی خۆدەرنەکردن: بریتییە لە گێلی و بەسزمانی.
مێشلەزەرگۆ: هـ. مێشلەزەرگوون.
مێشلەزەرگوون: هـ. گیایەکی کوێستانییە گەڵای وەک ئەرخەوان وایە، وەک لاولاو بەقەد شتدا هەڵدەگەڕێ و بەقەد دار و بەردا ڕیشە دادەکوتێ، لاسکەکەی بەچەند ساڵێک وا ئەستوور دەبێ دارجگەرەی لێ دروست دەکرێ.
مێشن: چەرمی مەڕ و بزن کە خۆش کرابێ و ڕەنگ نەکرابێ. شتی مێشاوی.
مێشۆ: مەردوومی گەلۆر.
مێشوولە: دەعبایەکی باڵداری زۆر پچووکی بەئاڵۆشە.
مێشە: بێشە.
مێشەڕەوێ: د. مێش دەرکردن لەبەر بێ ئیشی.
مێشەرۆ: شوێنێکە کە مێشی زۆر بێ. ناوە بۆ دێیەک لە هەورامانی ئەودیو.

مێشەسەگانە: جۆرە مێشێکی پانکەڵەی سوورکاری چنگ چنگە بەھەر شتێکەوە نووسا درەنگ لێی دەبێتەوە و، زۆرتر بەسەگەوە دەنیشێ.
مێشەسی: چێرگ.
مێشەقەبری: جۆرە مێشێکی سەوزە لە زەوی ھەڵکەنراو دێتە دەرەوە.
مێشەکەرانە: جۆرە مێشێکی گەورەیە ھەر لە وڵاخ دەنیشێ.
مێشەگیرە: د. جۆرە جاڵجاڵۆکەیەکە مێش دەگرێ.
مێشەلان: بێشەلان.
مێشەمر: ز. شتێکە کە خاوەنەکەی بەجێی ھێشتبێ. شتی فرێدراو.
میشەوش: ز. نیسک.
مێش ھەنگ: جۆرە ھەنگێکی بێ ھەنگوینە.
مێش ھەنگوین: ھەنگ.
مێشێن: جۆرە یارییەکە بەمێش دەکرێ.
مێڤان: با. میوان.
مێڤانی: با. میوانی.
میقەسووک: ز. پەرەسێلکە.
میقەور: ز.کوولەکەی درێژی ملدار.
میکرۆب: گیاندارێکی زۆر وردیلانەیە بەچاو نابینرێ.
میکرۆسکۆپ: ھۆکار (آلة)ێکە شتی زۆر وردی پێ بەدی دەکرێ.
مێکوت: دارێکی گردە کلکێکی تێ براوە.
مێکوتە: نەخۆشییەکە تووشی منداڵ دەبێ زیپکەی سەر خڕ لە ئەندامی پەیا دەبێ.
مێکووک: گیای بەلەک. مەکۆی جۆلایی.
مێکووکە: مێکووک.
مێگەل: ڕانی مەڕ و بزن.
مێگەلەوان: شوان.
مێڵ: کلچێوک. پایەیەکە بۆ نیشانکردن لە ڕێ و باندا دروست دەکرێ. جۆرە ئاسنێکی تایبەتییە ئاوی لە چاو پێ دەردەھێنرێ. ئەندازەیەکە لە ڕێ و بان کە ھەزار و حەوت سەد و شەست یاردە. شتێکی درێژی خڕی لووسی قورسە زۆر خانەی پێ دەکرێ. کێری ڕاست. کەواکەی (مێڵ مێڵ)ە. داری تەرازوو.
میلاق: ھەلاڵە برمە. ترێیەکە لە ژوورێکی نە زۆر ساردی نە زۆر گەرمدا بەپەتێک ھەڵواسرابێ بۆ ئەوەی بەرودوا لە زستاندا بخورێ. لالەنگەر.
مێلاقە: جۆرە گوڵێکی سوورە لە گوڵاڵەسوورە پچووکترە.
مێلاک: کەوچک.
مێلاککردن: بریتییە لە چەشتنی خواردەمەنییەک.
میلکان: ھەوارگە.
مێڵوکڵەدان: د. کلچێوک و کلتوور.
مێلوو: جۆلانە.
مێلوورە: مێرووله.
مێلە: د. مێڵ.
مێلەگورگانە: جۆرە کاردوویەکە گەلای وەک کلتوور وایە نێرکێکی ھەیە لە کلچێوک دەچێ.
مێمڵ: دوژمنی مەرگبری شت: پشیلە (مێمڵ)ی مشکە، یا چەقەڵ (مێمڵ)ی مریشکە.
مێنگوین: ڕەشەوڵاخی تازە بەر کەڵ.
مینگە: منگە.
مێنەکە: ئەموستیلەیەکە لە شاخی گیاندار دروست کرابێ.
مێو: درەختی ترێ. تلپەی ھەنگوین. مێ.
مێوان: میوان.
مێوانی: جۆرێکە لە حەلوای شەکر بەلام ئەم کەمێک شلە. میوانی (د).
مێودان: مێوکردن.
مێوژیلک: مێلاک.
مێوکردن: ھەڵسوونی مێولە کشتەک و مشەمما.
مێولاک: چڵ و چێوی مێوە کە لە بەھاراندا دەبڕدرێ.
مێولاکە: مێولاک. ناوە بۆ ڕێیەک لە ناوچەی ماوەت.
مێولاو: د. دارێکە کە دەچێتە ناو ئاوی نیرگەلەوە.
مێو و ڕۆن: جۆرە مەڵحەمێکە لە مێو و لە ڕۆن دروست دەکرێ بۆ نەرمبوون دەدرێ لە دەست و پێی قەڵەشاو.
مێووژ: ترێی وشککراو.
مێووک: ز. قۆپچەی کالا.
مێوە: میوە. مێ.
مێوەمارانە: جۆرێکە لە کاڵەکە مارانە بەلام دەخورێ و وەک مێو تەرز دەھاوێ.
میھ: مێ (ز). مەڕ (با).
میھرەبان: مەردوومی دڵنەرمی خاوەن بەزەیی.
میھرەبانی: دڵنەرمی و بەزەیی ھاتنەوە بەمەردوومدا.
میھرەوان: د. میھرەبان.
میھرەوانی: د. میھرەبانی.
میهڤان: ز. میوان.
میھمان: میوان.
میھمان بەڕێکردن: میوان بەڕێکردن.
میھمانخانە: میوانخانە.
میھمانداری: میوانداری.

میهمانی: میوانی.
می: موو.
میان: ناوەڕاستی شت: لە (میان)ی قسەدا قسە مەکە.
میـانفـەرش: لاکـێـشـێکی باریکە لە ناوەندی دوولاکـێـشـدا ڕادەخرێ.
میانە: میان. شتی ناوەنجی.
میانفەرش. ناوە بۆ دێیەک لە هەورامان.
میانەڕەوی: د. ڕۆین لە هەموو گوفتار و کردارێکدا بەناوەنجی.
میت: پەنجەی برای تووتە. مووش.
میتک: قیتکە.
میتکە: قیتکە.
میتۆڵ: د. میتک.
میتۆڵە: د. میتۆڵ.
میتێن: مووشێن.
میچ: ئێسقانێکە لە قاچی گیاندارادا. بنمیچی بان.
میچلە سەرگرتن: وڕکگرتن لەسەر شتێک و لانەدان لێی: لەسەر ئەم ئیشە ئەوەندە (میچ مەگرە).
میچۆلکە: میچۆڵە.
میچۆڵە: شتێکە کە خڕ هەڵدرابێ وەک کەشک، (میچۆڵەکردن) خڕ هەڵدانی شت وەک کەشک.
میچی قومارخانە: بریتییە لە مەردوومی زۆرزانی فێڵباز.
میچێن: یاریکردن بەمیچ.
میخی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
میر: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ گەورە: (میر)م واتە گەورەم. ناوە بۆ ڕوویەک لە میچ لە یاری (میچێن)دا. دەوڵەت.
میرات: کەلەپوورێکە کە مردوو بەجێی بێڵێت.
میراتبەر: کەسێکە کە میراتی مردووی بەر بکەوێ.
میراتگر: میراتبەر.
میراتگرتن: بەشبردن لە میراتی یەکێک.
میراتی: شتێکە کە بەمیرات بەجێ مابێ.
میراخوڕ: گەورەی مەیتەران.
میراڤ: با. میراو.
میران: وتەیەکە لە ڕووی ڕێزەوە بەپیاوێکی گەورە دەوترێ.
میرانە: ڕەسمێکە بۆ میری وەردەگیرێ.
میرانیی: با. ناوە بۆ جۆرە ترێیەک
میراو: کەسێکە کە بەشکردن و زیاد و کەمکردنی ئاوی بەدەست بێ.
میرفان: د. میوان.
میرفانی: د. میوانی.
میرکوت: با. مێکوت.
میرگزیرکێ: د. میر و گزیر.
میرنشین: وڵاتێکە کە میرێک بەڕێوەی بەرێ.
میرۆڤ: ز. میراو.
میر و گزیر: یارییەکی دوو دەستەییە، هەردەستەیەی وەستایەکی هەیە، ئەو دەستەیەی کە یارییەکە وەردەگرێت ئەموستیلەیەک هەڵ دەدات دەبێ بەپشتی دەست بیگرێتەوە و، لەسەر پشتی دەستی بەبێ یارمەتی دەستەکەی تری ئەموستیلەکە بجووڵێنێت تا دەیکاتە یەکێک لە پەنجەکانی، ئینجا ئەگەر کردییە پەنجەی بالابەرزەی ئەوا دەبێت بەمیر، ئەگینا دەبێ بەگزیر، وەستا لەسەر یاریکردنی خۆی درێژە دەسێنێت تا ئەموستیلەکەی لە هەڵدان، یا لە کردنە پەنجەیدا دەکەوێتە خوارەوە، ئەو حەلە یاریکەری دووەم لەو دەستەیە یاری پێ دەکات، کە ئەمیش لە دەستی کەوتە خوارەوە، ئینجا یاریکەرێکی سێیەم تا هەموو دەستەی یەکەم دەیدۆڕێن ئینجا دەستەی دووەم وەری دەگرێت، هەر بەو ڕەنگە.
میروو: د. مووروو.
میرە: د. گەورەی ئاوایی.
میرەدێ: کوێخا (د) . ناوی دێیەکە لە ناوچەی وارماوا.
میرەوانی: د. میهرەبانی.
میری: حکوومەت.
میز: ئاوێکی سوێرە لە چووک و زێی گیاندارەوە دێتە دەرێ.
میزاو: بریتییە لە ئاوێکی کەم کە بڕوا.
میز بەزاندن: هاتنە دەرەوەی میزی منداڵ و سەرکردنێتی لە دەمی بلوێرەوە لەناو بێشکەدا.
میـزتن: دادانی دانەوێڵـەیە بەپاڵ (بلـۆسکە)دا لە کـاتێکدا کـە (گێر) شل بووبێتەوە بەجۆرێک کە دانەی لێ بچێتە خوارەوە بۆ ناو ئاو.
میزدان: میزڵدان.
میزکردن: بەردانەوەی میز.
میزگیران: گیرانی میز و نەهاتنە دەرەوەی.
میزڵدان: توورەکەیەکی پچووکە لە سکی گیانداردا میزی تێدا کۆ دەبێتەوە.
میزن: گیاندارێکە کە زوو میز بکا.
میزەچڕکێ: میزەچوڕکێ.
میزەچوڕکێ: زوو زوو میزکردن بەهۆی ترسان یا سەرمابوونەوە.
میزەڵ: ز. کەسێکە کە میز بکا بەخۆیدا.
میژۆک: ز. بەرخێکە کە هەموو مەڕێک بمژێ.
میژویی: هـ. نیسک.
میژوین: هـ. نیسکێن.
میستن: میزتن.

میسمیسک: با. میزڵدان.
میش: ل. مشک.
میل: میێڵ.
میلبازی: یاریکردن بەمیل.
میلچێووک: کلچێوک.
میلدان: کلدان.
میلکان: ل. هەواری زستانە.
مـیـل لێـدان: مـیـلکردن بەژێر گلێنەی چاودا بۆ هێنانە دەرەوەی ئاوی ناو پەردەکانی.
میم: پیتێکە لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. پوور.
میمار: ز. برینی موو.
میمزا: پوورزا.
میمک: پووری خوشکی دایک.
میمکزا: پوورزا.
میمی: پوور.
مینا: گـوڵێکی هەمەڕەنگی جوانە، بەزەویدا پەخشـان دەبێـتەوە. شووشە. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (وەکو).
مینابەند: شوێنێکە شووشەکاری زۆری تێدا کرابێ.
میناکاری: مینابەند.
مینالغ: پارچە مینایەکە کە لە هەموو ڕەنگ تێکەڵ بووبێ.
مینەک: کـەرێکە لە کـارواندا کـە ئاو و شـتـومـەکی کـاروانچی لێ بار دەکرێ.
میوان: کەسێکە کە بێتەلات بۆ دیدەنی .
میوان بەرێکردن: خزمەتی میوانکردن بەباشی.
میوانخانە: دیواخان. ئوتێل.
میواندار: کەسێکە کە میوانی زۆربێ .
میوانداری: میوان ڕاگرتن و باش بەرێکردنی.
میوان داکردن: دامەزراندنی میوان .
میوان ڕاگرتن: میوانداری.
میوانی: بوون بەمیوانی یەکێک: هاتمەلات بە(میوانی).
مـیـوە: بەری هێندێ سـەوزایی و بەرزە درەخـتـە وەک کـاڵەک و هەرمێ و ترێ و گەلێ شتی تر.
میوەجات: میوەهات.
میوەگەنان: مانگی تەمموز کە سی و یەک ڕۆژە.
میوەهات: گەلێک جۆر لە میوە.
مییە: با. مەڕ.
مێیە: مێینەی هێندێ شت: ئەم کەوە (مێیە)یە.
مێینە: گیانداری مێ.



ن: دەبێ بە(ضمیر متصل) بۆ (جمعی مخاطب) و (غائب): ئێوە دەخوێنـ(ن)، ئەوان دەنووسـ(ن). ئێوە بخوێنـ(ن)، ئەوان بنووس(ن). دەنووسێ بەدوای هێندێ ناوەوە دەیکا بەسیفەتی مشبە: چلێکـ(ن) کولێکـ(ن) ورگـ(ن). دەبێ بەڕاناوی قسەکەر لەگەڵ غەیری خۆی (متکلم مع الغیر) وەک (مان) لای هێندێ لە تیرەکانی کورد: ئەسپەکە (ن) هانی، واتە ئەسپەکە(مان). دەبێتە پەیوەند (رابط) لە ڕستەیەکدا کە کرداری تێدا نەبێ: ئەوان پێشمەرگەن.

نا: پیتی نەفییە بۆ ئێستا و لەمەولا: (نا)خۆم، (نا)ڕۆم، نەء: (نا) لە وەرامی یەکێکدا کە لێت بپرسێت ناخۆیت؟ واتە نەء.

نائۆمێد: کەسێکە کە ئومێدی بڕابێ لە شتێک.

نائومێدی: ئومێدبڕان لە شتێک.

نابو: د. نابووت.

نابووت: کەسێکە کە دەستمایەی نەمابێ. گیانداری گەمژی پچووک.

نابووتی: بێ دەستمایەیی. گەمژەیی و پچووکی.

نابوود: نابووت.

نابوویی: د. نابووتی.

نابەجا: شتێکە کە لە جێی خۆیدا نەبێ .

نابەجایی: شتی نابەجا.

نابەجێیی: وتن یا کردنی شتێک کە لە جێی خۆیدا نەبێ.

نابەدڵ: شتێکە کە لە کانی دڵ نەیەتە دەرەوە.

نابەکار: مەردوومی بەدکار.

نابەکاری: بەدکاری.

نابەکام: شتی ناکامڵ: ئەم قەزوانە (نابەکام)ە. کەسێکە کە بەئاوات نەگا.

نابەکامی: نەگەیشتن بەئاوات.

نابەڵەد: نەشارەزا.

نابەڵەدی: نەشارەزایی.

نابینک: با. جۆرە تیرۆکێکی ئەستوورە لە پێشەوە گونکی پێ پان دەکرێتەوە لەسەر پنە، لە پاشا بەتیرۆکێکی باریکتر دەکرێتەوە بە نان.

نابینا: مەردوومی کوێر.

نابینایی: کوێری.

ناپاک: کەسێکە کە دڵ و دەروونی پیس بێ دەربارەی مەردووم.

ناپاکی: دڵ و دەروون پیسی دەربارەی مەردووم.

ناپەسەند: مەردوومی ناوەجاخ.

ناپەسەندی: ناوەجاخی.

ناپیاو: نامەرد.

ناپیاوی: نامەردی.

ناتار: د. نادروستی ناپوخت.

ناتاری: د. نادروستی.

ناتانین: د. نەتوانین.

ناتر: کەسێکە کە لە حەمامدا خزمەت بکا.

ناترە: ڕیزە چیلکەیەکە دادەچەقێنرێ لەسەر خەرمان لەکاتی شەن کردندا، لە ناوەندی کاوداندا، بۆ ئەوەی کە تێکەڵ نەبن.

ناتف: با. پلێتەی دەرمانە کە دەکرێ بەبریندا.

ناتۆرە: نەتۆرە.

ناتۆرەبێژ: نەتۆرەبێژ.

ناتەبا: ناڕێک.

ناتەبایی: ناڕێکی.

ناتەمیز: شتی پیس و چەپەڵ.

ناتەمیزی: پیسی و چەپەڵی.

ناتەوان: مەردوومی ئیفتادەی بێ هێز.

ناتەوانی: ئیفتادەیی و بێ هێزی.

ناتەواو: شتێکە کە تەواو نەبووبێ. بریتییە لە مەردوومی کەم دەست.

ناتەواوی: بریتییە لە کەم دەستی و هەژاری.
ناجۆر: د. بە دوو شت دەوترێ کە لەیەک نەچن وە زۆر جیابن لە یەک.
ناجەستە: شتی نابووتی نالەبار.
ناجەسە: د. ناجەستە.
ناچار: کەسێکە کە لە کردن یا نەکردنی کارێکدا بێ دەرەتان بێ.
ناچاری: بی دەرەتانی لە کردن یا لە نەکردنی کارێکدا.
ناچە: د. کونێکە کە دانەوێڵەی لێ دێتە خوارێ بۆ گێری ئاش.
ناچیز: مەردوومی ناکەس.
ناچیزە: ئافرەتی ناکەسی نارەسەن .
ناحەز: کەسێکە کە حەزت لێ نەکا.
ناحەزی: دوژمنایەتی.
ناخ: ناو دەروونی شت: ئاوەکە چوو بە(ناخ)ی زەویدا.
ناخار: د. ناڕاست.
ناخر: ز. ڕەووگ.
ناخرقەوان: ز. ڕۆژی دەیەم لە کانوونی یەکەم کە وڵاخ و ئاژاڵ لەبەر سەرما ناکرێتە دەرەوە.
ناخوا: ناخودا.
ناخودا: دارێکی ئەستووری بەرزە لەناو کەشتیدا. مەردوومی ستەمکار. کەشتییەوان.
ناخودایی: ستەمکاری.
ناخۆش: شتێکە کە دڵ نەیگرێ. نەخۆش.
ناخۆشی: بوونی شت بەناخۆش. ناکۆکی: ئەو دوو کەسە (ناخۆشی)یانە. نەخۆشی.
ناخۆشین: نەخۆشی.
ناخون: نینۆک.
ناخونکردن: ناخونگرتن.
ناخونگرتن: د. نینۆک کردن.
ناخونە: ناخونەک.
ناخونەک: خواردنی شتی مەردووم بەهەوانتە. جۆرە دەردێکە لە چاو پەیا دەبێ (د).
نادان: نەزان.
نادانی: نەزانی.
نادروست: شتی نارێکی نالەبار.
نادروستی: نارێکی و نالەباری.
نادوروس: د. نادروست.
نادوروست: نادروست
نادوروستی: نادروستی.
نادوروسی: د. نادروستی.
نادۆڵ: د. ناچە.
نادیار: شتێکە کە لێتەوە دیار نەبێ.
نادیاری: دیارنەبوونی شت لێتەوە.
نادیدە: شتێکە کە نەت دیبێ. نادیار.
ناراو: د. جەخار و خەفەت.
نارجیێل: نەرجیل.
ناردراو: نێرراو.
ناردن: ڕەوانەکردنی شتێک بۆ شوێنێک.
ناردنەوە: گێڕانەوەی شتێک کە نێردرابێ بۆت بۆ لای خاوەنی.
ناڕاس: د. ناڕاست.
ناڕاست: مەردوومی سەرچەوتی درۆزن.
ناڕاستی: درۆزنی و سەرچەوتی .
ناڕاسی: ناڕاستی.
نارراو: نێرراو.
ناڕەوا: شتی ناشایستە. پارەی قەلب .
ناڕەوان: دەرسێکە کە ڕەوانت نەبێ .
ناڕەوانی: گیروگرفتی لە زانینی دەرسدا.
ناڕەوایی: ناشایستەیی.
نارێک: شتی خواروخێچ. بریتییە لە کەسێک کە لێت دڵگیربێ.
نارێکی: خواروخێچی. بریتییە لە ناکۆکی دوو کەس.
نارگیل: د. نارجیل.
نارگیلە: نێرگەلە.
نارنارۆکە: نارۆکە.
نارنارۆکێ: نارۆکە.
نارنج: شتێکە وەک پرتەقاڵ بەڵام ئەم ترشە.
نارنجۆک: بۆمبای دەستی.
نارنجەک: نارنجۆک.
نارنجی: شتێکە ڕەنگی وەک ڕەنگی نارنج وابێ.
نارنگی: لالەنگییەکە وەک پرتەقاڵ وابێ.
نارۆکە: جۆرە گۆرانییەکە.
نارەون: نارەوەند.
نارەوەند: دارەوەند.
نارياگ: د. نێرراو.
ناری عەلی: ڕەنج و زەحمەتی زۆر: بەهەزار ناری عەلی تا دۆزیمەوە.
ناری: جۆرە مقامێکە.
نارین: با . گۆرانییەکە کە خەم و خەفەت بێنێ.
ناز: خۆفرۆشی و خۆ خۆشەویستکردنی یەکێک لای یەکێک. درەختی سنەوبەر (د).
نازار: نازدار.
نازاو: سەوزایی تێراوی پاراو.

نازپەروەر: نازدار.
نازدار: کەسێکە کە زۆر خۆشەویست بێ و نازی بکێشرێ.
نازداری: خۆشەویستی و ناز کێشانی یەکێک.
نازفرۆشتن: نازکردن.
نازفرۆشی: نازکردن.
نازک: ناسک. بریتییە لە مەردوومی شەرمنی لەسەرخۆ. شتی تەنک.
نازکردن: خۆفرۆشی و خۆ خۆشەویست کردن.
نازک کار: د. وەستایەکە کە لە گەچکاریدا نەقشی جوان بکا.
نازکەر: کەسێکە کە ناز بکا .
نازکێشان: ناز ڕاگرتنی نازدار.
نازکی: بوونی شت بەنازک.
نازگ: نازک.
نازناز: جۆرە گوڵێکی هەمەڕەنگە هەر بەیانیان دەگەشێتەوە و گەڵا سەوزەکەی وەک پەڵپینە وایە.
نازنامە: نازناو.
نازناو: لەقەب.
ناز و نووز: نازفرۆشتن.
ناز و نیوناز: ناز.
نازە: د. شوێنی زیندوو لە نینۆک.
نازەنین: ئافرەتی زۆر جوان.
نازێ: د. نازکەر.
نازی: ز. نازکردن.
نازین: خۆ هەڵکێشان بەیەکێکەوە. تۆ بەکێوە (دەنازیت).
ناس: شتێکە لە تووتن دروست دەکرێ و هێندێ کەس لە جیاتی جگەرەکێشان دەیخاتە ژێر زمانی.
ناساز: ناخۆش: ئەم ئاوە (ناساز)ە. نەخۆش (ناساز)م واتە نەخۆشم. کەسێکە کە لەگەڵ یەکێکی تردا ناکۆک بێ: فیسار کەس لەگەڵمدا (ناساز)ە.
نازسازی: ناخۆشی. نەخۆشی. ناکۆکی.
ناساغ: نەخۆش.
ناساغی: نەخۆشی.
ناساق: ناساغ.
ناساقی: ناساغی.
ناسزا: ناشایستەی ناڕەوا. بریتییە لە جوێن: (ناسزا)ی پێ وتم، واتە جنێوی پێ دام (د).
ناسک: شتێکە کە زوو لەت ببێ. مەردوومی شەرمنی لەسەر خۆ. شتی تەنک: پەرداخەکە (ناسک)ە واتە تەنکە.
ناسکبوونەوە: پنربوونەوەی ئەندام.
ناسکرن: ز. ناسین.
ناسکۆڵە: شتی پچکۆلەی ناسک.
ناسکەنان: جۆرە لەواشەیەکی ناسکی چەورە هەویرەکەی بەڕۆن دەشکێنرێتەوە.
ناسنامە: پارچە کاغەزێکە کە وێنە و ناو و شۆرەت و پیشەی یەکێکی تێدابێ.
ناسۆر: برینێکە کە درەنگ چاک ببێتەوە: برینەکەی بەناسۆر کەوتووە.
ناسیار: ناسیاو.
ناسیاری: ناسیاوی.
ناسیاگ: ناسیاو.
ناسیاگی: ناسیاوی.
ناسیاو: ئاشنا.
ناسیاوی: ئاشنایی و ناسینی یەکێک.
ناسین: بینینی شتێک و شارەزایت لێی بەڕەنگێک بۆ جارێکی تر جیای بکەیتەوە لە شتی تر.
ناسینەوە: دووبارە ناسینی شتێک کە لەمەوپێش ناسیبێتت.
ناشارەزا: نابەڵەد.
ناشارەزایی: نابەڵەدی.
ناشایس: د. ناشایستە.
ناشایستە: شتی بێ جێی نالەبار.
ناشایسە: د. ناشایستە.
ناشتا: خاڵێتی سک لە بەیانیاندا: بەیانیان بە(ناشتا) جگەرە مەکێشە. خواردەمەنییەکە کە لەسەر سکی ناشتا بخورێ.
ناشتاکردن: خواردنی نانی سەر لە بەیانی.
ناشتن: مردووکردن بەژێر گڵەوە. درەخت و گوڵ ڕوواندن.
ناشناس: بێگانەی نەناسراو.
ناشێتی: بوونی مەردووم بەناشی: فلان کەس بەناشێتی ئەو کارەی کرد.
ناشیرین: شتێکە کە جوان نەبێ.
ناشیرینی: بوونی شت بەناشیرین.
ناشی: مەردوومی کۆڵی نەشارەزا لە کاروبارێکدا.
ناعاڵ: مەردوومی نالەبار.
ناعالی: نالەباری.
نافک: ز. ناوکی مەردووم و گیانداری تر .
نافەرمان: مەردوومی لاساری گوێ نەگر.
نافەرمانی: گوێ نەگرتن بۆ فەرمان.
نافەک: عاستی ناولنگ لە دەرپێ.
نافەکبڕین: بریتییە لە ئەتککردنی یەکێک.
ناڤ: ناووک (ز). ناو (با).
ناڤ ئێش: ز. ڕەوانی و سکچوون.

ناڤبارک: با. سەلەیەکی پچووکە میوەی تێ دەکرێ.
ناڤبڕ: با. ناوەندی دوو شت.
ناڤدار: با. ناودار.
ناڤک: با. ناووک.
ناڤماڵ: با. ناوماڵ.
ناڤنج: با. ناوەند.
ناڤنجی: با. ناونجی.
ناق: د. قوڕگ.
ناقایل: نارازی.
ناقڕ: ل. بینەقاقە.
ناقۆڵا: شتی نارێک.
ناقولچ: هە. نوقورچ.
ناک: وتەیەکـە دەنرێ بەدوای هێندێ وتەوە دەیکا بەسـیـفـەتی (مشبە): خەم(ناک)، دەرد(ناک).
ناکا: د. ناکاو: فیسار کەس (ناکا) هات واتە لە ناکاودا.
ناکام: کەسێکە کە بەکام و خواستی خۆی نەگەیشتبێ.
ناکامی: نەگەیشتن بەئاوات.
ناکاو: کوتوپڕ.
ناکاوی: کوتوپڕی.
ناکۆک: ناساز.
ناکۆکی: ناسازی.
ناکوڵۆکار: د. شتی نالەبار.
ناکەس: ناوەجاخ.
ناکەس بەچە: ناوەجاخ.
ناکەسی: ناوەجاخی.
ناگا: ناکا.
ناگزووری: نامانگووری.
ناگونا: د. بێ گوناح.
ناگوناه: د. ناگونا.
ناگەهان: ناکاو.
ناڵ: ئاسـێـکی پانە بەبزمـار دەدرێ لەژێر پەلی وڵاخی یەکـسم، پاژنەی پێڵاو.
ناڵاندن: هاوارکردنی نەخۆش.
ناڵانن: د. ناڵاندن.
ناڵبەکی: د. دەوری پچووک. ژێرپیاڵە
ناڵبەند: کەسێکە وڵاخ ناڵ بکا.
ناڵبەندخانە: شوێنێکە کە وڵاخی تێدا ناڵ بکرێ.
ناڵبەندی: خەریکبوون بەپیشەی ناڵبەندییەوە.
ناڵچە: پارچە ئاسنێکی تەنکە دەدرێ لەژێر پاژنەی قۆندەرە.
ناڵدار: وڵاخی یەکسم.
ناڵکردن: ناڵدان لە پەلی وڵاخ. بریتـیـیـە لە هەڵخـەڵەتاندنی یەکێک: چاکی ناڵ کردم.
ناڵە: نکەی بەرزی نەخۆش، (ناڵەناڵ) ناڵەی یەک لەدوای یەک. دەنگی بەرزی بەهێز وەک دەنگی تفەنگ: تفەنگەکە. ناڵەی کرد: یا دەمانچەکە (ناڵەی هات).
نالەبار: شـتـی بێ باری نـاقـۆڵا. بریتـیـیـە لە مـەردوومی بەدی ساختەچی.
نالەباری: ناقۆڵایی. بریتییە لە سەرچەوتی و ساختەچێتی.
ناڵەکردن: ناڵاندنی نەخۆش. تەقین و دەنگدانەوەی شت بەبەرزی.
ناڵەکیی: د. پاژنەی کەوش.
ناڵین: ناڵاندن.
نام: نـاو. وتەیەکـە وەک وتەی (یا) بەکـاردێنرێ بۆ دوودڵـی لە ناوەندی دوو شـتـدا: ئەو تارمـاییـیـە (نام) زەلامـە (نام) وڵاخە.
ناماقووڵی: قسەی بێ جێی دوور لە ژیری.
نامانگووری: نەدارایی.
نامدار: مەردوومی گەورەی ناودار.
نامراد: ناکام.
نامرادی: ناکامی.
نامۆ: غەریب.
نامـۆیی: بێ خەوی و بێ کەیفییەکە کە لە ڕانەهاتنی شـوێنێک پەیابێ. غـەریبی: فـیـسـار کـەس نامـۆیی دەکات واتە هەست بەغەریبی دەکات.
نامە: کاغەزێکی نووسراوە کە بۆ یەکێک بنێردرێ.
نامەبەر: کەسێکە کاغەز بگەیەنێ بەم و بەو.
نامەبەری: پۆستەچێتی.
نامـەخانە: شـوێنێکی تایبـەتییـە کە کـتـێبی زۆرت تێدا دانابێ (مكتبة).
نامەخوا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (ماشائەڵڵا).
نامەد: د. بەدبەخت.
نامەدی: د. بەدبەختی.
نامەرد: مەردوومی ناپیاو.
نامەردی: ناپیاوی.
نامێلکە: کتێبی پچووکی چەند پەڕەیی.
نامیدە: شتی بەناوبانگ.
نامییە: نامیدە.
نان: هەویرێکە کە پان کـرابێـتەوە بەسـاج یا بەتەنوور برژێنرابێ. پیـــتـــێکە بەدوای هێندێ ناوەوە دەنووسێ دەیکا بەکـــار (مـصـدر):دا(نان)، ناو(نان). چەقـاندن و ناشـتـنی شت: نەمامەکان (بنێ).

نانبده: کەسێکە کە نان زۆر بدا بەمەردووم.
نانبدەیی: نانداں بەمەردووم بەزۆری.
نانبرێشک: دارێکی درێژکۆلەی لووت تیژە نانی لەسەر ساج پێ وەردەگێردرێ.
نانپێژ: ز. نان پێوەدەر.
نان پێوەدان: نان برژاندن بەتەنوور.
نان پێوەدەر: کەسێکە کە نان بەپارە ببرژێنێت.
نانچایی: د. جۆرە کێکێکە بۆ بەرچایی دەکرێ.
نانخوا: د. جۆرە زیرەیەکە.
نانخۆرشت: د. پێخۆر.
نانداں: نانداں: ناندەر.
نانداں: بەخشینی نان بەمەردووم بەخۆرایی.
ناندەر: نانبدە.
ناندێن: نانگێن.
نانکردن: نان برژاندن.
نانکردنەوە: پانکردنەوەی نان بەتیرۆک.
نانکوێر: کوێرنان.
نانکەر: کەسێکە نان بکاتەوە
نانکەرەوە: کەسێکە کە نان بەتیرۆک پان بکاتەوە.
نانگیر: ز. زەوییەکە کە گەنم و جۆی باش بهێنێ.
نانگێن: دەفرێکی گەورەیە کە نانی تیری تێدا هەڵدەچنرێ.
نانووخ: ناخون.
نانەوی: د. نانێکە کە لە ماڵی بووکەوە دەچێ بۆ ماڵی زاوا تا سێ رۆژ.
نانەبەرە: پارچە پەڕۆیەکی گەورەیە رێبوار نانی رێگای تێ دەخا.
نانەپاڵ: بوختانکردن بۆ یەکێک و شتێکی ناشرین دانە پاڵی.
نانەرەق: نانی وشکەوەبوو.
نانەرەقە: نانەرەق.
نانەسکی: ئیشکردن بۆ یەکێک بەرامبەر بەنان خواردن و هیچی تر.
نانەشان: سەلە.
نانەشانە: نانەشان.
نانەشوێن: بریتییە لە دواخستنی قسەیەک بەشوێن یەکێکدا: قسەی خراپ مەنێرە (شوێنم).
نانەقەیسی: قەیسی زۆر گەیوە کە بەتیرۆک پان کرابێتەوە وەک نان.
نانەلەم: د. نانەسکی.
نانەمریچلە: ه. کولێرە چەورە.
نانەمل: بریتییە لەوەی کە شتێک بخەیتە ئەستۆی یەکێک و بە سەریدا ساغ کەیتەوە: دینارەکەت (نایەملم) واتە لەسەرت کردم بەماڵ.
نانەوا: کەسێکە کە نان و کولێرە و لەواشە دروست بکا بۆ فرۆتن.
نانەواخانە: شوێنێکە کە نانەوا نانی تێدا ببرژێنێ.
نانەوایی: خەریکبوون بە نان پێوەدانەوە.
نانەوە: ئامادە و سازکردنی ئاش. سازکردنی داو و تەڵە: داوەکە یا تەڵەکەی (ناوەتەوە). دۆزینەوە و بنەکردنی شتێک لە شوێنێک بۆ دزین: دزەکە ماڵەکەی (ناوەتەوە). هێلکەنانە ژێر مریشکە بەکڕ بۆ هەڵهێنانی.
نانەیەک: تێکبردنی چەند شتێک بەناو یەکدا.
نانی نانی: بریتییە لە مەردوومی کوێرنان.
ناو: ئیسمێکە کە بۆ شتێک دانرابێ تا بەو ئیسمە ئەو شتە بناسرێ. لۆکەیەکی کراوەیە کە خرابێتە دوو توێی لێفە و کالاوە. کاکڵە: گوێزەکە یابادامەکە (ناو)ی نییە. نێی ئاش (ه). سواغ (ه). پیتی ظرفیة: فرۆک بە(ناو) بادا و ماسی بە(ناو) ئاوا دەڕوا. ناوی دێیەکە لە هەورامان.
ناواخن: شتێکە کە ئاخنرابێتە دووتوێی شتێکی ترەوە.
ناوازە: ناوداو.
ناوان: ناوەند.
ناوبار: سەربار.
ناوبانگ: شۆرەت و ناوڕۆیشتنی شتێک.
ناوبانگ دەرکردن: بڵاوبوونەوەی ناو و شۆرەتی یەکێک یا شتێک.
ناوبانگ سەندن: ناو دەرکردن.
ناوبجی: د. ناوبژی.
ناوبراو: شتێکە کە ناوی هاتبێ.
ناوبردن: باسکردنی شتێک.
ناوبرە: تەپانێکە کە لە ناوەڕاستی ژوورێکدا کرابێ بۆ ئەوەی کە ببێ بەدوو ژوور.
ناوبریاگ: د. ناوبراو.
ناوبرێشک: نان برێشک.
ناوبژەکردن: لە شیرە پابوونەوەی وڵاخ و ڕەشەوڵاخ.
ناوبژی: کەوتنە ناوەندی دوو کەس کە بەگژ یەکدا چوون تا هەرا نەکەن.
ناوبژی کردن: ناوبژی.
ناوبژیکەر: کەسێکە کە ناوبژی بکا لە ناوەندی دوو کەسدا.
ناوبگیر: د. ناوبردن: (ناوبگیر)ی کە واتە ناوی بەرە.
ناوبەناو: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ شوێن یا کاتی پچڕپچڕ: (ناو بەناو) وەڕەلام، یا نەمامەکان (ناوبەناو) بنێژە.
ناوپا: د. ناوگەڵ.
ناوپارە: خانوویەکە کە هەموو لایەکی لەناو خانووی تردابێ.

ناوپشته: بنەچە.
ناوپەل: ناوەندی دوو پەلی درەخت. ناوەندی هەردووسمی ڕەشە ولاخ.
ناوپەنچک: پەردەیەکی گۆشتینە لە ناوەندی سی و جگەر و ناوسکدا.
ناوتا: ناوبار.
ناوتاق: پەتێکە دەخرێتە قوڵفی جەواڵەوە لە تەمووەکەیەوە بۆ بەندکردنی بەسەر ولاخەوە.
ناوتوێڵ: د. ناوچەوان.
ناوتێلانە: د. جیازی بووک.
ناوجەرگە: ناوپارە. ناوەڕاست لە (ناوجەرگە)ی شەڕەکەدا بوو.
ناوجژنان: مانگی ذي القعدة.
ناوجی: د. ناوبژی.
ناوجیکەر: د. ناوبژیکەر.
ناوچاو: ناوچەوان.
ناوچاوان: ناوچەوان.
ناوچاوپاک: پیاوی چاکی پاکی ناوچەوان ڕوون. بەختیار (د).
ناوچاوترش: بریتییە لە مەردوومی ڕووگرژ.
ناوچاوترشاو: ناوچاو ترش.
ناوچاودێز: بریتییە لە مەردوومی مۆنی بەد.
ناوچاوڕۆشن: د. ناوچەوان ڕوون.
ناوچە: ناحیەیەکە کەمودیری تێدا دابنیشێ. مەڵبەند. ناچە (د).
ناوچەدار: قایمقام.
ناوچەوان: تەختایی ژوور هەردوو برۆ.
ناوچەوان بەیەکادان: بریتییە لە تووڕەبوون.
ناوچەوانپاک: ناوچاوپاک.
ناوچەوان دێز: ناوچاودێز.
ناوچەوان ڕوون: ناوچەوان پاک.
ناوچەوان قۆقز: بریتییە لە مەردوومی بەدبەخت.
ناوچەوان قەشقە: ناوچەوان قۆقز.
ناوچەوان گرژ: ناوچاوترش، (ناوچەوان گرژکردن) ڕووگرژکردن.
ناوچی نکردن: کردنەوەی گەڵای ناوەڕاستی توتن.
ناوخۆ: ناو کۆمەڵێکی گەورە یا پچووک: لە ئێران شتێک ڕوویداوە لە خۆیا، یا لە ماڵی فلان کەس ئاژاوەیەک کەوتۆتە ناو خۆیانەوە (داخلی).
ناوخوا: نامەخوا (د).
ناوخوان: جێی دانیشتن لە زین. ناوە بۆ ناوچەیەک لە (شلێر).
ناوخوین: ل. ناخون.
ناودار: کەسێکە کە ناوبانگی ڕۆیبێ. شتێکە کە ناواخنی ببێ. کەوای (ناودار)، کفتەی (ناودار).

ناودان: د. پلووسک.
ناودۆک: دۆژنک.
ناودەرکردن: ناوبانگ دەرچوونی کەسێک یا شتێک.
ناودەس: د. ناودەست.
ناودەست: بەری لەپی دەست.
ناودێر: کەسێکە کە ناوی لەناو ناواندا بێ: یاخوا هەر (ناودێر) بیت.
ناورانەوە: پاڕانەوە.
ناوڕاست: د. ناوەڕاست.
ناوزڕان: ناودەرکردن بەخراپی.
ناوزین: جێی دانیشتن لە زین.
ناوساجی: جۆرە کولێرەیەکە لەناو ڕۆندا سوور دەکرێتەوە.
ناوسێڵی: ناوساجی.
ناوسێلی: ناوسێڵ.
ناوشان: ناوەندی هەردووشان.
ناوفەرش: میانفەرش. چەرمێکی پانە لەناو پێڵاودا ڕادەخرێ.
ناوقەد: کەمەری شتێک کە باڵای ببێ.
ناوکار: ڕیزە خشت و بەردێکە کە لەناو چینی دیواردا دادەنرێ. ڕاستە تەریبێکە کە لە کاڵا دەدرێ.
ناوکردن: تێپەڕبوون و لەچاو ونبوونی شت: کەروێشکەکە (ناوی کرد).
ناوکۆ: ناوکۆڵ. هاوبەش (شریک).
ناوکۆڵ: ناوبار.
ناوکوێربوونەوە: بریتییە لە مردن و نەمانی ناونیشانی یەکێک.
ناوکۆیی: شەراکەت: ئەم خانووە (ناوکۆیی)مانە، واتە شەراکەتمانە.
ناوکە: بەردێکە چلێک گیا (چەقچەقە)ی پێوە دەپێچرێ و خەرمانی بەسەردا دەبێژرێتەوە بۆ پیت و بەرەکەت. ناووک.
ناوکەبر: کچێکە کە لەکاتی بوون و ناوک بڕیندا درابێ بەکوڕێک.
ناوکەبڕانە: سەرناوکانە.
ناوکەبڕە: ناوکەبڕ.
ناوکەخۆش: د. ناوکی بەری درەخت کە لە خۆیدا شیرین و خۆش بێ.
ناوکەڕەشە: د. ناوکەڕێژ.
ناوکەڕێژ: ولاخێکە کە پشتی لە ئاستی ناوکی بریندار بووبێ بەهۆی گرتنی بار یا زین یا کورتانەوە، (ناوکە ڕێژبوون) برینداربوونی پشتی ولاخ بەهۆی گرتنی بارەوە.
ناوکەڕێش: ناوکەڕێژ.
ناوکەف: چەرمێکە دەخرێتە ناو پێڵاوەوە.

ناوکی بووکێ: جۆرە گوڵێکە پەڕەکانی بەناودا دەچێ.
ناوکێش: جۆگەیەکە لە ناوەڕاستی قاڵبی مەرەزەدا ڕادەکێشرێ لە کاتی ئاو کەمبووندا بۆ ئەوەی کە تیربەتیر ئەمبەر و ئەوبەری ئاوی پێ بدرێ.
ناوگڵ: د. ناوگەڵ.
ناوگوڵاڵانە: تۆیانە.
ناوگەرە: د. کاکڵە. شتێکە لە ناوەندی دوو شتدا کە لە یەکیان جیا بکاتەوە.
ناوگەڵ: ناولنگ.
ناوگیر: ناوبگیر.
ناوگین: ناوەڕاست.
ناولنگ: ناوگەڵ.
ناولنگان: تاوە.
ناولەپ: بەری دەست.
ناولەپان: ناوپەلی درەخت.
ناولەقان: د. ناولەپان.
ناولێنان: ناوی خراپ نان لە یەکێک.
ناوماڵ: شتومەکی ماڵ. ژووری ئازووخە. ناو کەشیدەی هێندێ پیت: ناوماڵی: جیمەکە یا نونەکە جوانە. بریتییە لە ناوزێی وڵاخ.
ناومشت: د. ناولەپ.
ناونان: دانانی ناوێکی تایبەتی بۆ منداڵێکی تازە بوو یا بۆ شتێکی تر.
ناوناو: ناوبەناو.
ناونووس: بریتییە لە تەعینی شت. نووسینی ناوی گەلێ شت بەتێکڕایی: فیسار کەس چووە بۆ (ناونووس)، (ناو نووسکردن) ناونووس.
ناونیان: د. ناونان.
ناونێرک: دۆژەنک نێرکی هەموو شتێک.
ناونێرۆک: د. ئاوەخۆرەی درەخت. نێرەژن (د).
ناونیشان: نیشانە هەڵدانی شتێک. ناو دیارکردنێکە کە لە پشتی پاکەت دەنووسرێ بۆ ئەوەی کە بگا بەخاوەنی (عنوان).
ناونیشانە: ناونیشان.
ناووداو: شۆرەت و ناوداری: فیسار کەس پیاوەتییەکی کردووە بە(ناووداو) بگێڕێتەوە.
ناوک: دەمارێکە لە ناوەڕاستی سکی گیانداردا ساوا لە سکی دایکدا لەوەوە خواردن وەردەگرێ. کاکڵەی گوێز و بادام و قەزوان و شتی تر. دەنکی ڕەقی ناو خورما و هەڵووژە و هێندێ شتی تر. مەرکەزی دائیرە.
ناوکبڕ: کەسێکە کە ناوکی منداڵ ببڕێ.
ناوکبڕین: بڕینی ناووکی منداڵ و گرێدانی لەکاتی لە دایک بوونیدا.
ناوک کەوتن: وەرگەڕانی دەماری ناوک.
ناوک گرتنەوە: هێنانەوە جێی دەماری ناوک. بریتییە لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێک: چاک ناوکی گرتمەوە.
ناووگ: د. ناوگین.
ناوونجی: شتی مامناوەندیی.
ناو و نەتۆرە: ناوی ناشیرین نان لە یەکێک.
ناوونیشان: ناونیشان.
ناوونیشانە: ناونیشانە.
ناووەردە: ڕیزە دروومانێکە لە کاڵادا .
ناوە: د. شتێکە لە تەختە دروست دەکرێ، بنکەکەی تەسک و سەرەکەی واڵە قوڕی پێ دەکێشری. برنجی چوار دانگی.
ناوهانین: ناوهێنان.
ناوهاوردن: ناوهێنان.
ناوەبەرە: دارێکی پچووکە دەخرێتە ناوەڕاستی (وێژانبەر)ەوە بۆ ئەوەی کە (گاینجە) ئەمدیو ئەودیو نەکا. ڕایەڵی تەیمانی. چەپەر.
ناوەجاخ: مەردوومی نارەسەن.
ناوەجاخی: نارەسەنی.
ناوەخت: بێ وەخت.
ناوەڕاست: ناوەندی شت بەڕەنگێک کە لە هەموو لایەکەوە چوون یەک دووربێ.
ناوەڕۆک: کرۆکی شت.
ناوەڕۆکە: ناوەڕۆک.
ناوەسار: د. ئەو بەردانەیە کە بۆ ئاش هەڵدەبەسترێ بۆ ئەوەی تەنوورەی لێ دروست بکرێ یا نێی پێوە بنرێ.
ناوەسەر: پارچەیەکە لە دەسماڵی سەری ژن کە دەکەوێتە پشتی سەریەوە.
ناوەسەرە: ناوەسەر.
ناوەشکێنە: ناسکەنان. وتووی گەرم هێنان بەسەر (رۆز)ی کاڵادا بۆ ماتکردنی.
ناوەکوتە: جۆرە نەخۆشییەکە تووشی مەڕ و بزن دەبێ.
ناوە کێش: د. ئەو کرێکارەیە کە (ناوە) دەخاتە سەرشانی.
ناوەند: ناوەڕاست.
ناوەندیار: کەسێکە بکەوێتە ناوەندی دوو کەسەوە بۆ ڕێکخستنیان (وسیط).
ناوەندیاری: کەوتنە ناوەندی دوو کەسەوە بۆ ڕێکخستنیان (وساطة).

ناوەندێتی: میانەڕەوی لە هەموو شتێکدا.
ناوەندی: بەهەمووو شتێک دەوترێ کە لە ناوەندی دوو شتدابێ.
ناوەوە: ناوەرۆک و ناوشت: ئاژاڵەکە لە ناوەوەیە یا لە دەرەوەیە.
ناوهێنان: ناوبردن.
ناوێرە: ناوازە.
ناوێژ: کەر گەلەوان.
ناوین: د. سواخ.
ناوینەوە: د. سواخدان.
ناهاڵ: د. ناقۆڵای ناعال.
ناهلیک: با. دۆشەک.
ناهومێ: د. ناهومێد.
ناهومێد: ناکام.
ناهومێدی: ناکامی.
ناهەموار: شتی خراپی نالەبار.
ناهەمواری: خراپی و نالەباری.
ناهەنجار: نەگونجان.
ناهەنجاری: نەگونجانی.
نای: شمشاڵ.
نایاب: شتی زۆر چاکی هەڵکەوتوو.
نایاب بێژی: بدیع.
نایافت: نایاب.
نایژەن: شمشاڵژەن.
نایەب: نایاب.
نایسین: نەگران. نەسووتان: ئاگرەکە نایسێ، واتە ناگرێ یا ناسووتێ.
نتم: هێمنی و لەسەرخۆیی.
نچ و ناڵ: د. ناڵە و نکە.
نچە: وردە نکە و ناڵەیەکی سووکە کە لە نەخۆشییەکی سووکەوە پەیدا ببێ، (نچەنچ) نچەی یەک لەدوای یەک.
نچەتا: لەش داهێزران بەتایەکی سووکەوە.
نخافتن: با. داپۆشین.
نخری: ز. نۆبەرەی منداڵ چ نێر چ مێ.
نخوری: ز. نخری.
نخۆشەر: هـ. لەتکە نۆک.
نخون: نوخون.
نخوون: نخون.
نخە: نۆک.
نرت و نوێ: شتی زۆر تازەی نوێ.
نرخ: قیمەتی شت.
نرخبڕین: نرخ دانان.
نرخدار: شتی بەنرخ.
نرخدانان: دانانی نرخی شت لەلایەن دەوڵەتەوە.
نرخە: د. لرخە.
نرقە: د. نرکە، (نرقەنرق) نرکەنرک.
نرکاندن: نرکەکردن.
نرکانن: نرکاندن.
نرکە: جۆرە دەنگێکی قەبەی بەرزە لەسنگەوە دێتە دەرەوە، (نرکە نرک) نرکەی یەک لەدوای یەک، (نرک و هووڕ) نرکەنرکی زۆر.
نزا: پاڕانەوە.
نزاخوان: دوعاگۆ.
نزار: شوێنی نسێ لە شاخ.
نزانی: مزگێنی.
نزاو: د. شتی گەیو. نزیک (هـ).
نزبە: با. ڕەزی تازە پێگەیشتووی دێم .
نزدیک: نزیک.
نزدیکایی: نزیکایی.
نزدیکبوونەوە: نزیکبوونەوە.
نزدیکخستنەوە: نزیکخستنەوە.
نزدیککردنەوە: نزیککردنەوە.
نزدیککەوتنەوە: نزیککەوتنەوە.
نزدیکی: نزیکی.
نزرگە: جێگایەکە پیاوچاکێک تێدا دانیشتبێ و نیشانە کرابێ.
نزگ: د. ژیان و زیندەگانی.
نزگرە: نزگەرە.
نزگەرە: جۆرە دەنگێکە هێندێ جار لەناو سنگی مەردوومەوە پەیا دەبێ و تەکانی پێ دەدا.
نزم: شتی نەوی.
نزمان: شوێنی نزم.
نزمایی: عاستی شوێنی نزم.
نزمبوونەوە: نزیکبوونەوەی شتێکی بەرز لە زەوی.
نزوولە: ناڵەی خەفەتبار.
نزووڵە: د. نزوولە.
نزیک: شتێکە کە لێتەوە دوور نەبێ.
نزیکایی: کاتی زۆر نزیک. عاستی نزیکی شت.
نزیکبوونەوە: نزیککەوتنەوە.
نزیکخستنەوە: نزیککردنەوە.
نزیککردنەوە: هێنانە بەرەوەی شتێک.
نزیککەوتنەوە: هاتنە بەرەوەی شتێکی دوور.
نزیکی: بوونی شت بەنزیک.

نژدار: ز. بەزشکێکە کە نەشتەرکاری بکا (جراح).
نژدە: با. دەستەی چەتە (عصابة).
نژناندن: ز. پڕکردن.
نژنین: ز، پڕبوون.
نژی: با. نیسک.
نسار: نسرم.
نسرم: شوێنێکە کە هەتاوی تێ نەکەوێ.
نسک: د. نزگ. مەردوومی پەرێشان. هەژار. نیسک.
نسکۆ: نووچبڕدن بەتوندی.
نسکوناهومێ: د. نکوئاهومێد.
نسکە: د. هەنسک، (نسکە نسک). هەنسکی یەک لەدوای یەک.
نسگەرە: د. نزگەرە.
نسێ: نسرم.
نسێو: د. قەزاوقەدەر.
نسیە: د. زەمینی کەم بڕشت.
نش: ز. کوتوپڕ.
نشتەر: د. نەشتەر.
نشتن: د. نیشتن.
نشس: د. نوشوست.
نشک: ز. نش.
نشکێفە: ز. شتی کوتوپڕی.
نشینگە: ئەو ولاتەیە کە تۆ تێیدا دادەنیشیت بەئێجگاری.
نشۆف: ز. نشێویی.
نشێو: نزمایی ناودۆڵ و دەرە.
نشێوی: سەرەولێژی.
نشیڤ: نشۆف (ز). دەستەڕاست (جنوب) (با).
نشیڤی: با. نشێوی.
نشیمەن: شوێنێکە کە لەوەدا نەبێ تێیدا دابنیشیت.
نشیمەنگا: د. نشیمەن.
نشین: د. دانیشتن. شانشین.
نفرۆ: نوغرۆ.
نفت: د. شتی نوێ: نفت و نوێیە.
نفتک: ز. کفتک.
نفت و نوێ: نرت و نوێ.
نفر: ز. نزای خراپ لە یەکێک.
نفرین: نفر (ز). نەفرین (د).
نفسی: ز. جاوی ئاوەڕێس.
نفش: ز. نەتەوە: ئەمە (نفش)ی تۆیە واتە نەتەوەی تۆیە.
نفوورات: نەفوورات.
نڤاندن: نواندن.
نڤرشت: ز. نوشتە.
نڤز: ز. نزم.
نڤستن: ز. نوستن.
نڤێژ: با. نوێژ.
نڤیسار: با.نووسراو.
نڤیستن: با. نڤستن.
نڤێسین: با. نووسین.
نڤین: ز. نوێن.
نقار: زویری و دڵگیری.
نقام: مقامی گۆرانی.
نقاندن: نقەکردن.
نقانن: نقاندن.
نقم: نقوم.
نقن: د. کەسێکە کە هەر بنقێنێ.
نقوجڕ: نقەنقکردن بەدەست شتێکی قورسەوە.
نقە: دەنگێکە لە هێز بەخۆدانەوە پەیا دەبێ، (نقەنق) نقەی یەک لەدوای یەک. نق و هووڕ: نقەنقی زۆر.
نقێم: جۆرە بەردێکی بەنرخە بۆ جوانی دەخرێتە ئەموستیلە و گوارە و شتی ترەوە.
نقیم: د. نقێم.
نک: دەنووک (ل). وتەیەکە بەمەعنای (لەکن) ز.
نکاندن: نکە کردن.
نکانن: نکاندن.
نکل: ز. دەنووکی باڵندە.
نکن: د. کەسێکە کە هەر بنکێنێ.
نک و ناڵ: نکە و ناڵەی نەخۆش.
نک و ناڵە: نک و ناڵ.
نک و ناهومێ: د، نک و ناهومێد.
نک و ناهومێد: کەسێکە کە بەتەواوی ناهومێد بووبێ لە شتێک.
نکە: ناڵەیەکی سووکە لە نەخۆشەوە دێ، (نکە نک) نکەی یەک لەدوای یەک.
نک و هووڕ: نکەنکی زۆر.
نگادار: د. پاسەوان و چاودێر.
نگاداری: پاسەوانی.
نگار: وێنە و دروشمی شت. دلبەری جوان.
نگاهێشتن: پارێزگاری و ئاگاداریکردنی شتێک: وەک چاو (نگای دێڵم).
نگم: د. نوقوم، (نگمبوون) نوقومبوون، (نگمکردن) نوقومکردن.

نگمەسار: د. نوقمەسار.
نگین: بەخت و ئامەد. نقیم.
نم: شێ و تەڕیی.
نما: نوێژ (هـ). وتەیەکــە بەدوای هێندێ وتەوە دەنووسێ دەیکا بەکـارکـەر (إسم فـاعل): بالا (نما)، قـیـبلە (نما)، واتە بالا و قیبلە پیشاندەر.
نماز: نوێژ.
نمانا: د. نموونە.
نماندن: با. نەرم کردنەوەی شتێک بەهۆی خستنە ئاوەوە.
نماو: د. ئاوێکە کە لە ناوەندی پێست و کورۆکی دار و درەخت و سەوزاییدا بێ.
نماوی: نمدار.
نمایان: شتی ئاشکرا.
نمایش: نمایشت.
نمایشت: خۆپیشاندان.
نمایشتگا: شوێنێکە کە مەردووم خۆی تێدا پیشان بدا (مسرح)، (معرض).
نمایشگا: نمایشتگا.
نمتک: نم و تەڕییەکە کە لە شتێک بێنە دەرێ: گۆزەکە (نمتک) نادا.
نمدار: شتی شێدار.
نمدان: دەڵاندنی شت: گـۆزەکـە (نم دەدا). تەڕکـردنی شـتـێک بەکەمی: سواغەکە (نمدە) ئینجا هێلە ساوی کە.
نمدەر: ل. دۆشەکڵە.
نمرە: ژمـارەیەکی تایبـەتیـیە لەسـەر هیندێ شت دادەنرێ: بۆریەی چراکە سێ (نمرە)یە.
نموود: بریتـییـە لە نرخ و ڕێز: فـلان کـەس نموودی نییـە، یا بێ نموودە، واتە بێ نرخە لەناو کۆمەڵدا.
نموونە: شـتـێکی کـەم لە شـتـێکی زۆر کە چۆنێتی شتە زۆرەکە نیـشـان بدا لە چاکی و خـراپی: لە ویـچـێک نموونەی خەرواریکە.
نمە: بارانی ورد.
نمەد: لباد.
نمەدزین: لبـادێکە دەخـرێتـە ژێر زین بۆ ئەوەی کـە شـتی ولاخ بریندار نەبێ.
نمەدماڵ: کەسێکە کە نمەد بسووێتەوە.
نمەک: ل. خوێ.
نمەک بەحەرام: بەدنمەک.
نمەکدان: خوێدان.
نمەککردن: بریتییە لە خواردنی نانی یەکێک و لەپێش چاو بوونی پیاوەتی ئەوەیە کە لەبەر ئەو نانەی: (نمەکم کردووی) هەرگیز خرابەت نالێم.
نمەک کردوو: کەسێکە کە نمەکی کردبێت.
نمەکگیر: کەسێکە گیرۆدەی نمەکی یەکێک بووبێ لەبەر خراپەکردن لەگەڵیدا.
نمەکین: مەردوومی خوێن گەرم.
نو: نەء.
نۆ: ناوە بۆ ژمارەیەک کە لە ناوەندی هەشت و دە دایە. نوێ. نەء (ز).
نوء: ز. نەء.
نوارین: تەماشا کردن.
نواڵە: نۆردوو قـولێک لە دەغـڵی دروێنە کـراو. بەسـتـەیەک لەگەڵای کراوە. جێگای نەرمان لە چیا.
نواڵە کردن: پێچانەوەی شت.
نواندن: نیشاندانی شتێک بەیەکێک خەو لێ خستنی منداڵ.
نوانن: نواندن.
نۆبە: نۆرە.
نۆبەبر: کەسێکە کە نۆبەت لێ داگیر بکات.
نوبەبریی: داگیرکردنی نۆرەی یەکێک لە شتێکدا نۆرەی هاتبێ.
نۆبەتێ: نۆرەتا.
نۆبەتێدار: کەسێکە کە نۆرە تا بیگرێ.
نۆبەچی: ئێشکچی.
نۆبەخت: د. کەسێکە کە تازە بەخت ڕووی تێ کردبێ.
نۆبەخش: یەکـەمـجـار چاو پۆ شـیـکردن لە تاوانێک ئەمـجـارە (نۆبەخش)ت بێ.
نۆبەدار: با. پاسەوان.
نۆبەر: د. نۆبەرە.
نۆبەرە: میوەیەکە کە تازە پێ بگا و یەکەمجار بخورێ. یەکەمین منداڵێکە کە ئافرەت بیبێ.
نۆبەرەکردن: خواردنی میوەیەکی تازە پێگەیشتوو یەکەمجار.
نۆبەن: نۆبەند.
نۆبەگرتن: گرتنی نۆرە لە شتێکدا.
نۆبەند: گوێرەکەی دووساڵەی نێر.
نۆپێچکە: منداڵێکی ساوایە کە تازە کەوتبێتە سەرپێ.
نۆت: با. نەوەد.
نۆتە: د. پاشەکەوت.
نۆتەکردن: د. پاشەکەوتی کردن .
نۆتەکەر: د. کەسێکە کە شت پاشەکەوت بکا.
نوجەژن: یەکەمین جەژنە کە بەسەر مردنی مردوویەکدا بڕوا.

نوچکەبردن: نووچبردن.
نۆچکەدان: نووچدان.
نۆچوان: د. نەوجەوان.
نۆچە: د. نەوجەوان.
نوخانن: د. نوخنکردنەوەی شت.
نوخاننەوە: د. نوخنکردنەوە.
نوختە: نقطة.
نوختە و خاڵ: د. ئارایشی ڕووی ئافرەت.
نوخشە: دانەوێڵەی تازە پێگەیو.
نوخوت: ل. نۆک.
نوخۆشەر: د. نخۆشەر.
نوخوماندن: ز. خۆداپۆشین بەشتێک.
نوخومین: ز. خۆ داپۆشین.
نوخون: دەفرێکە دەمەوژێر بووبێ.
نوخونبوونەوە: دەمەوخواربوونەوەی دەفر. بریتییە لە نەمانی سامان و لێکەوتنی یەکێک لە گەورەیی.
نۆد: نەوەد.
نۆردوو: نانێکە بەنەرمی وەک بوخچە چوارقەد کرابێ.
نۆردی: نۆردوو.
نۆریزکێن: جۆرە یارییەکە وەک سێ ریزکێن، بەڵام لەمدا، یەکی نۆ داشیان پێیە.
نۆرین: ڕوانین.
نۆرە: سەرە هاتنە سەر لە کارێکدا. جار: ئیمرۆ سێ (نۆرە) هاتمە لات.
نۆرەبڕ: نۆبە بڕ.
نۆرەبڕین: نۆبەبڕین.
نۆز: وتەیەکە بەکار دێنرێ لە جێی وتەی (دیسان) لەکاتێکدا کە یەکێک کردارێک یا گوفتارێک چەند جارێک بکا و تۆ پێت ناخۆش بێ.
نۆزدە: ناوە بۆ ژمارەیەک.
نۆزدەمین: شتێکە لە پایەی نۆزدە دا بێ.
نۆزدەهەم: نۆزدەمین.
نۆزدەهەمین: نۆزدەهەم.
نۆزکە: نۆسکە.
نۆزگە: نۆزکە.
نۆزین: وڵاخێکە کە تازە زینی لێ کرابێ.
نۆژ: با. جۆرە گەنەیەکە دەنووسێ بەبن دووگی مەڕەوە.
نۆژەن: ز. شتی تازە داڕێژاو لە ئاسن یا لە مس. دەستکردنەوە بەکارێک دوای لێ وێستانی.
نوستگ: نوستوو.
نوستن: جۆرە ماتی و بێ هۆشییەکە بەسەر گیانداردا دێ و پێی دەحەسێتەوە. لەکارکەوتنی ئاش و سەعات.
نوستوو: گیاندارێکە کە خەوی لێ کەوتبێ.
نوستی: نوستوو.
نووسراو: کاغەزێکە کە شتێکی لێ نووسرابێ.
نرسکانەوە: دەنگی منداڵ لە کاتی زەبوونیدا.
نوسکە: نوسکانەوە، (نوسکە نوسک) نوسکەی یەک لە دوای یەک.
نۆسکە: منداڵی نۆبەرەی ئافرەت.
نوسیار: کەسێکە کە باش بنووسێ.
نووسیاری: بوون بەنووسیار.
نۆش: وتەیەکە دەوتری بەخۆشەویستێک لەکاتی خواردنەوەی ئاو یا قرقێنەدانەوەیدا.
نۆشاتر: نەوشتار.
نۆشادر: نۆشاتر.
نوشتاندنەوە: قەدکردنی شت.
نوشتانەوە: قەدبوونی شت.
نوشتاوی: ئاستی نوشتانەوەی شت.
نوشتوو: نوشتە.
نوشتە: کاغەزێکە چەند ئایەتێکی قورئان یا چەند نزایەکی لێ دەنووسرێ و بەنوشتاوەیی بۆ موفەڕک هەڵدەگیرێ.
نوشتی: نوشتە.
نوشخۆر: ز. پاشاخور.
نۆشکردن: خواردنەوەی شت بە خۆشی.
نوشوست هێنان: کزبوونی هێز و تەوانایی. کەمبوونەوەی دارایی و دەسەڵات.
نوشوستیی: نامەد و نەهاتی.
نۆشین: نۆشکردن.
نوغرۆبوون: ڕۆچوون و نوقوومبوون بەناخی زەویدا. نوقومبوون لە زەرەر و زیاندا: فیسار کەس لە زیانی لۆکەکەیدا (نوغرۆبوو).
نوقرا: ل. نوقرە.
نوقرە: زیو.
نوقرەکفت: د. ئاڵدووزدانی شت بەزیو.
نوقڵانە: وتنی شتێکی باش یا خراپ بۆ کەسێک لە پێش بوونی شتەکەدا.
نوقڵانەلێدان: نوقڵانە.
نوقمەسار: د. کەسێکە کە سەرنگوون بووبێ.
نوقورچ: گرتن و گوشینی جێگایەک لە جەستە بەدوو پەنجە.
نوقورچک: د. نوقورچ.

نوقـورچکانه: د. نوقـورچێکه دەگـیـرێ لە ژنێک کـە کـاڵایەکی تازەی لەبەر کردبێ و بەردرکانەی نەکردبێ.
نوقوڵ: جۆرە خواردەمەنییەکی دانەدانەیە لە شەکر دروست دەکرێ.
نوقوڵدان: دەفرێکە هەر نوقوڵی تێ دەکرێ.
نوقڵە کوردی: بە گەنمەشامییەک دەڵێن کە برژابێ و پشکوتبێ.
نوقوم: شتێکە کە لەناو ئاودا ون بووبێ .
نوقومبوون: بن ئاو کەوتنی شت.
نۆقیبوون: ز. نوقومبوون.
نوک: ز. نۆک.
نۆک: دانەوێڵەیەکی خڕی زەردەبە کوڵاوی و بەبرژاوی دەخورێ.
نۆکاو: چێشتێکە لە گۆشت و نۆک دروست دەکرێ.
نوکتەباز: یەکێکە کە قسەی جوان بکا .
نۆکەحۆلە: جۆرە نۆکێکی دەنک گەورەیە.
نۆکەر: خزمەتکار.
نۆکەرایەتی: بوون بەنۆکەر.
نۆکەڕەشکە: نۆکێکی وردی توێکڵ ڕەشە، دەکرێ بەلەتکە.
نۆکەری: خزمەتکاری.
نۆکەزۆردە: د. فەریکەنۆک.
نۆکەڵ: جوانەگایەکە کە پێی نابێتە ساڵی سێیەم.
نۆکەن: جۆگە یا کارێزێکە کە تازە هەڵکەنرابێ.
نۆکەند: نۆکەن.
نۆکیسە: د. بریتییە لە کەسێک کە تازە دەوڵەمەند بووبێ.
نوگوم: نوقم، (نوگومبوون) نوقمبوون، نوگومکردن: نوقومکردن.
نۆگە: د. نۆرە.
نۆگەچی: د. نۆبەچی.
نۆما: جوانووی دوو ساڵە.
نۆماڵ: کەسێکە کە تازە ماڵی پێکەوە نابێ.
نۆمسڵمان: کەسێکە کە تازە مسڵمان بووبێ.
نۆمینە: مانگی ذي الحجة.
نونگ: د. بەڵگە و نیشانە، (نونگەکردن) سووسەکردنی بەڵگەی شت.
نۆنۆ: نۆنە.
نۆنۆڵە: کەسێکە کە ڕەفتاری وەک ڕەفتاری منداڵی ساوا وابێ.
نۆنە: وتـەیەکـە منداڵی سـاوا بەکـاری دێنێ بۆ هەمـوو خواردەمەنییەک کە دانەوێڵە بێ.
نوو: نوێ.
نووا: پێش و بەردەم. ئەشکەوت.
نوواکێش: مـەڕێکە کـە شـوان بانگی ڕانەکـەی کـرد ئەو لـە پێش هەموویاندا دوای کەوێ.
نوواڵ: تەپڵەسەری کێو.

نوواندن: دەرخستن و پیشـاندانی شـتێک بەیەکێک: وڵاخەکە لە مەیدان (بنوێنە). خەوخستن لە یەکێک: منداڵەکە (بنوێنە).
نووتەک: وتـەیەکـە هەمـیـشـە بەکـاردێنرێ لە دوای وتەی (تاریک)ەوە بۆ (تاکید): تاریک و (نووتەک).
نووچانەوە: نووچیانەوە.
نووچبردن: هەڵ ئەنگووتن.
نووچدان: نووچبردن.
نووچیانەوە: د. چەوتانەوە.
نوود: د. حاڵ و ئەحواڵ: فلان کەس خۆش نوودە، واتە خۆشحاڵە.
نووڕە: دەنگی سەگ لەکاتی ئازار پێ گەیشتنیدا، (نووڕە نووڕ) نووڕەی یەک لەدوای یەک.
نووز: وتەیەکە هەمیشە لەگەڵ وتەی (ناز)دا بەکاردێنرێ: (ناز و نووز).
نووزاندن: نووزە کردن.
نووزانن: نووزاندن.
نووزانەوە: کورووزانەوەی منداڵ.
نووزە: جۆرە دەنگێکی باریکی نزمە وەک دەنگی نەخۆش لەکاتی لاوازیدا، (نووزەنووز) نووزەی یەک لەدوای یەک.
نووزەبڕین: کۆتایی هێنان بەنووزەنووزی یەکێک.
نووزەدرێژ: مەردوومی درێژدادڕ.
نووسان: بەیەکدا لکانی دوو شت.
نووساندن: لکاندنی دوو شت بەیەکەوە.
نووساو: دوو شتە کە بەیەکدا لکابن. دەنگێکە کە گیرابێ.
نووسخانە: د. شوێنێکە کە نووسەران شتی تێدا بنووسن.
نووسەر: کەسێکە کە بزانێ بنووسێ.
نووسەک: شتێکە کە لە خۆیەوە بنووسێ بەشتێکی ترەوە.
نووسـەکـە: گـیـایەکی بەهارییـە لەناو دەغـڵدا دەڕوێ و بەشتـەوە دەنووسێ و بەرێکی تووکن دەگرێ.
نووسەنەک: نووسەکە.
نووسیان: د. نووسان.
نووسین: پیت خستنە سەر کاغەز بەقەڵەم لەلایەن نووسەرێکەوە.
نووسینخانە: نووسخانە.
نووسینگا: نووسخانە.
نووسینگە: نووسینگا.
نووسینەوە: وێنە وەرگرتنی شتێکی نووسراو بەقەڵەم.
نووقاندن: قووچاندن.
نووقاو: چاوی لێکنراو.
نووک: لووتی تیژی شت.
نووکاندن: نووکەکردن.
نووکانن: د. نووکاندن.

نووکن: د. کەسێکە کە زۆر بنووکینێ .
نووکە: دەنگێکی پچکۆلەی باریکە کە لە گریانێکی هێواشەوە پەیا ببێ، (نووکەنووک) نووکەی یەک لەدوای یەک. هەنووکە (با).
نووکەبڕین: کۆتایی هێنان بە نووکەنووکی یەکێک.
نووکەر: ل. نۆکەر.
نووکەنیا: پۆڵانیای دەمی گاسن.
نوون: نان (ل). ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. بریتییە لە نەنگی شتێک، ئەم شتە (نوون)ی تێدا نییە واتە بێ نەنگە.
نۆوەن: نۆیەن.
نۆوەند: نۆیەن.
نووەی: هـ. نۆک.
نوها: ز. ئێستە.
نوهال: با. شیو و دەرە.
نوهت: ز. نەوەد.
نوهک: ز. نۆک.
نوهلیک: با. دۆشەک.
نوهۆم: تەبەقەی خانوو.
نۆهەد: نەوەد.
نۆهەم: شتێکە کە لە پایەی نۆدا بێ.
نهۆم: نوهۆم.
نۆهەمین: نۆهەم.
نۆهەوار: هەوارگەی تازە.
نۆهێلکە: بارۆکەیەکە تازە هاتبێتە هێلکە.
نوێ: تازە.
نوێبوونەوە: تازەبوونەوە.
نوێرد: هـ. تیکی دروومان
نوێردوو: نانێکی تیرییە کە چوارگۆشە وەک بوخچە قەد کرابێ.
نوێردووەحەلوا: حەلوایەکە کە کرابێتە ناو نوێردووەنانەوە.
نوێژ: چەند کردار و گوفتارێکی تایبەتی ئاینییە شەو و ڕۆژێ پێنج جار بۆ خواپەرستی دەکرێ.
نوێژان: نوێژیان.
نوێژبوون: هاتنی کاتی نوێژ.
نوێژچوون: نەمانی کاتی نوێژ.
نوێژقایم: کەسێکە هەرگیز نوێژی نەچێ.
نوێژکردن: بەجێهێنانی نوێژ.
نوێژکەر: کەسێکە کە نوێژ بکا.
نوێژەبارانە: نوێژێکە دەکرێ بۆ باران بارین.
نوێژەبارانێ: نوێژەبارانە.
نوێژیان: دوای بانگی بەیانی تا دەمی زەردە کەوتن.
نوێژی: شتێکی پاک و خاوێنە کە لەوانەبێ نوێژی پێوە بکرێ.
نوێکردنەوە: تازەکردنەوەی شت .
نوێکرن: ز. تازەکردنەوەی شت.
نوێگن: ز. گایەکە پێی نابێتە سێ ساڵە.
نوێڵ: ئاسن یا دارێکی بەهێزی درێژە دەدرێتە ژێر شتی زۆر قورس بۆ بەرزکردنەوەی.
نوێڵدان: نوێڵکردن بەژێر شتی قورسدا .
نوێن: پێخەف. ناوی دێیەکە لە هەورامان.
نوینک: ئاوێنە.
نوێنگین: نێوون.
نوێنە: د. نوێنەر.
نوێنەر: کەسێکە کە لە دەوڵەتێکی بێگانەدا جێداری دەوڵەتی خۆی بکا. کەسێکە لە دەوڵەتەکەی خۆیدا جێداری گەلەکەی بکا (نائب).
نوێنەری: بوونی مەردووم بەنوێنەر.
نۆیەک: لە نۆیەش بەشێک.
نۆیەم: نۆهەم.
نۆیەمین: نۆهەمین.
نوی: نوێ (با). نەوی.
نوویسگە: نووسینگا.
نویسندە: نووسەر.
نویسنە: د. نویسندە.
نویسین: نووسین.
نویشک: ل. کەرە.
نوین: نوێن.
نە: پیتی نەفییە لە ڕابووردوودا: (نە)ی خوێند یا (نە)ی خوێندەوە. پیتی نەفی سیفەتە لە یەکێک: فلان کەس نەزانە یا نەزۆکە، یا نەخوێندەوارە. پیتی نەهییە بۆ حازر و غایب، (نە)ڕۆیت، (نە)ڕوا، لە: (نە) ژوورسەرینی واتە (لە) ژوور سەرینی. نەء.
نەء: وتەیەکە وەرامی نەبوونی شتێکی پێ دەدرێتەوە: (نەء) لە وەرامی یەکێکدا کە بپرسێ نەریمان دەخوێنێ؟ واتە ناخوێنێ.
نهانی: با. لانە و بانە.
نەبات: جۆرە شەکرێکی تایبەتی شیرینی زۆر سەختە وەک لیمۆدۆزیی وایە.
نەباتی: شتێکە ڕەنگی وەک ڕەنگی نەبات وابێ.
نەبادا: مەبادا.
نەبان: چوارپێیەکە کە ساوای خۆی نەوێ.
نەبڕ: تیغی کول. بریتییە لە مەردوومی کەم بڕشت.

نەبوون: نەهاتنەدی شت.
نەبوونی: نەدارایی و هەژاری.
نەبەرد: کەسێکە کە بەپشووبێ لە هەموو کاروبارێکدا و هەرگیز نەبەزێ. بریتییە لە کاری گرنگی دژوار: فیسار کەس تووشی (نەبەرد) هات.
نەبەردی: نەبەزین لە کاروباردا.
نەبەز: مەردوومی نەبەرد.
نەبەکام: منداڵ یا میوەی پێگەیشتوو.
نەپا: شتی ناپایەدار.
نەپۆر: د. شتی نالەبار کە بۆ هیچ شتێک نەگونجێ.
نەپۆریان: د. نەگونجان.
نەپەنی: با. شتی ونی نادیار.
نەتراندن: ز. بێ دەنگکردن و لە جووڵەخستن.
نەترس: مەردوومی ئازای چاوقایم.
نەترک: ز. بەرچاوگەی زیوینی ژنان.
نەترە: زەندەق. ورە.
نەترەبۆق: مەردوومی قەبەی ناشرین.
نەترین: ز. بێ دەنگبوون و لە جووڵەکەوتن.
نەتڵ: د. ملۆزم.
نەتۆرە: ناوی ناشیرین کە نرابێ لە مەردووم. هەڵخۆندن بەسەر مەردوومدا.
نەتۆرەبێژ: کەسێکە کە بەسەر مەردوومدا هەڵبخوێنێ.
نەتوو: ز. مەردوومی ناپەسند.
نەتەوایەتی: نەتەوەپەرستی.
نەتەوە: وەچەی گیانلەبەر.
نەتەوەپەرستی: خۆشەویستی نەتەوەی خۆت.
نەتەوەنامە: نامەیەکی دەوڵەتییە کە نەتەوایەتی تۆ بگەیەنێ بۆ ئەو دەوڵەتە (جنسية).
نەجم: شتێکە کە نەجووڵێ (ساکن).
نەچار: با. ناچار.
نەچیر: نێچیر.
نەچیرکردن: نێچیرکردن.
نەچیرەڤان: با. ڕاوکەر.
نەچیرەوان: نێچیرەوان.
نەخ: ز. هەودای ڕێسراوی خوری.
نەخاسم: با. نەخوازەڵا.
نەخت: کەمێک لە شت: (نەختێک) بخۆ یا (نەختێک) دانیشە. نەختینە. زەوی بەهێز. مارەیی پێشەکی (با).
نەخت و پوخت: شتی مایەداری بەنرخ
نەختە: با. ڕۆژی سەرما و سۆڵە.
نەختینە: شتی بەنرخی گرانبایە.
نەخری: با. یەکەمین منداڵی باوک و دایک.
نەخش: جۆرە کایەیەکە لە قومار کە دەستی یەکێکیان تەواوبێ: فیسار کەس دەستی (نەخش)ە.
نەخشاندن: نەقشکردنی شت.
نەخشاوی: شتێکە کە نەخشی پێوە بێ.
نەخشە: خەریتەی شوێنێک.
نەخشەکێشان: ڕێبازدانان بۆ پرۆژەیەک لە سەرەتاوە تا دوایی (تخطيط).
نەخشین: شتی نەخشاوی.
نەخۆ: نەوەک. مەچۆرەدەرێ نەخۆ میوانەکان بێن. ئەگینا: دانیشن نەخۆ لێتان دەدەم.
نەخوازەڵا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی بە(تایبەتی): کورد مەردن. (نەخوازەڵا) خوێندەواریان.
نەخۆش: گیانداری ناساغ.
نەخۆشبوون: نەخۆشکەوتن.
نەخۆشخانە: خەستەخانە.
نەخۆشکەوتن: دووچاربوون بەنەخۆشی .
نەخۆشی: لەش تێکچوونی گیاندار و ناساغ کەوتنی.
نەخۆشین: نەخۆشی.
نەخۆتە: د. نەخوێندەوار.
نەخوێندەوار: کەسێکە کە نەیخوێندبێ.
نەخوێندەواری: نەخوێندن.
نەخەسەلا: نەخوازەڵا.
نەخەمە: ز. وتەیەکە لە جێی وتەی (قەی ناکات) بەکاردێنرێ.
نەخێر: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ نەبوونی ئەو شتەی کە پرسیاری لێ دەکرێ. نەخێر لە وەرامی یەکێکدا کە بڵێ: دەرست خوێند؟.
نەدار: نەدارا.
نەدارا: هەژاری کەمدەست.
نەدارایی: هەژاری و کەمدەستی.
نەداری: نەدارایی.
نەدان: نادان.
نەدانی: نادانی.
نەدوو: مەردوومی کەم قسە.
نەدی بدیی: د. نەدیویدی.
نەدیتە: نەدیدە.
نەدیدە: شتێکە کە دیار نەبێ و باسی بکرێ: لە (نەدیدە) ئەسپەکەت بەچەند؟
نەدیگ: نەدیوی نەناسراو.

نەدیو: نەدیگ. شتێکە کە لێتەوە دیار نەبێ.
نەدیویدی: کەسێکە کە شتی بەخۆیەوە نەدیبێ و ئێستە شتی ببێ وزۆری خۆش بوێ.
نەدیوی: شوێنێکە کە لێتەوە دیار نەبێ.
نەرد: دوو تەختەی بیست و چوار خانییە بە سی پوول و دوو زار یاری لەسەر دەکرێ.
نەردان: د. نەردێن.
نەردە: د. نەردەبان.
نەردەبان: پەیژە.
نەردەوان: نەردەبان.
نەردێن: یاری کردن بەنەرد.
نەڕ: نێر: شێری (نەڕ) واتە نێر.
نەڕاندن: قـــیـــڕاندنی گـــیـــانداری زەلام بەتوندی لە کـــاتـی تووڕەبوونیدا.
نەڕانن: نەڕاندن.
نەڕنایش: ئافرەتی زلی کەتەی قەبە.
نەڕ نەڕەشێرە: بریتییە لە گیانداری نەڕەزل.
نەڕە: قـیـڕەی گـیـانداری زەلام بەتوندی، (نەڕەنەڕ) نەڕەی یەک لەدوای یەک. سەری شت: دارەکەی ناوە بەنەڕەی شانییەوە.
نەڕەدێو: بریتییە لە پیاوی کەتەی زلی قەبە.
نەڕەی شان: سەرشان.
نەڕی شان: نەڕەی شان.
نەرگز: نەرگس.
نەرگس: نێرگس.
نەرگسە: هـ. کێلنچکەی مەڕ.
نەرگسەجاڕ: نێرگسە جاڕ.
نەرگسی: نێرگسی.
نەرم: شـتـێکە کە ڕەق نەبێ. بریتـیـیـە لە مـەردوومی لەسـەرخۆی هێدی.
نەرمان: زەوی نەرمی بێ بەرد و زیخ.
نەرمانی: نەرمان.
نەرمایی: شوێنی نەرم لە ئەندام: نەرمایی گوێی گرت.
نەرمـبـوون: بریتـیـیـە لە هاتنەسـەر ڕای یەکـێک. لاچوونی ڕەقی شت.
نەرمژاندن: ز. نەرمکردنەوەی شتی ڕەق.
نەرمژین: نەرمبوونەوەی شتی ڕەق.
نەرمک: نەرمە.
نەرمکێشی: ئاسانی بەکـارهێنان: فـیـسـار کەس زۆر نەرمـەکێشی لەگەڵ کردم.
نەرم و شـل: شــتی زۆر نەرم. بریتـــیـــیـــە لە مـــەردوومی هێــدی لەسەرخۆ.
نەرمۆڵە: شتی نەرم و شل.
نەرم و نۆڵ: نەرم و شل.
نەرم و نیان: مەردوومی هێواشی لەسەرخۆ.
نەرموو: با. مەردوومی نەرم و نیان.
نەرمووک: نەرمە.
نەرمە: گۆشتی بێ ئێسقان.
نەرمەبڕ: د. بریتییە لە مەردوومی زبان لووسی فێڵباز.
نەرمەبێژ: د. والابێژ.
نەرمەزین: لبادێکە لەژێر تەکەڵتووی زینەوە دادەنرێ.
نەرمەساو: پارچە پۆڵایەکە قەساب کێردی پێ تیژ دەکات.
نەرمەغار: غاری هێواشی لەسەرخۆ.
نەرمەقووت: خواردەمەنی نەرم و شلە کە جوون و قووتدانی ئاسان بێ.
نەرمەکۆکە: جۆرە کۆکەیەکی سووکی هەمیشەییە.
نەرمەگا: زەمینێکە کە دوو سێ جار بەجووت کێڵرابێ.
نەرمەلیقە: تەنراوێکە کە زۆر تەنک و تیواڵ بێ.
نەرمـەنەرمـە: وردەوردە: (نەرمـەنەرمـە) دەبارێ، یا (نەرمـەنەرمـە) بۆم بلێ واتە وردەوردە.
نەرمی: نەرمایی.
نەرمین: شتی نەرم و نۆڵ.
نەرە: هـ. داربەڕوو.
نەریت: شـتـێکە کە تاز داهێنرابێ و کـرابێ بەباو و تۆ حـەزی لێ نەکەیت: هەر ڕۆژە (نەریت)ێکمان بۆ دادەهێنێ.
نەزا: د. نەزۆک.
نەزان: مەردوومی بێ ئاگا لە شت.
نەزاندوو: مەردوومی قسە ڕەق.
نەزانست: د. کارێکە کە بەهەڵە کرابێ.
نەزانستە: د. کەسێکە کە کارێکی بەهەڵە کردبێ.
نەزانکار: د. مەردوومی کۆڵی و ناشی لە ئیشدا.
نەزانی: نەزانین.
نەزانین: بێ ئاگایی لە شت.
نەزدیک: نزیک.
نەزدیکایی: نزیکایی.
نەزدیکبوونەوە: نزیکبوونەوە.
نەزدیکخستنەوە: نزیکخستنەوە.
نەزدیککردنەوە: نزیککردنەوە.
نەزدیککەوتنەوە: نزیککەوتنەوە.
نەزدیکی: نزیکی.
نەزگرە: نزگەرە.
نەزڵە: سەریەشەی سەخت.

نەزم: لێدانی دەمار.
نەزۆک: مێینەیەکە کە زاوزێ نەکا .
نەزۆکی: بوونی مێینە بەجۆرێک کە زاوزێ نەکا.
نەزێ: د. نەزۆک.
نەزیک: د. نەزدیک.
نەزیکایی: د. نەزدیکایی.
نەزیکبوونەوە: د. نەزدیکبوونەوە
نەزیکخستنەوە: د. نەزدیکخستنەوە.
نەزیککردنەوە: نزدیککردنەوە.
نەزیککەوتنەوە: د. نەزدیککەوتنەوە.
نەزیکەوبوون: د. نەزدیکبوونەوە.
نەزیکی: د. نەزدیکی.
نەژاد: ڕەسەن و بنەچەی مەردووم.
نەژد: د. شتی چرچی پەژمووردە.
نەژنەوا: کەڕ. بریتییە لە مەردوومی بێ گوێ.
نەژنەوایی: گوێ گرانی. بریتییە لە بێ گوێیی.
نەساغ: ناساغ.
نەستۆ: د. مەردوومی کەللە ڕەق.
نەستەق: شتی ئەنتیکە.
نەسرەوت: گیاندارێکە کە سرەوتی نەبێ.
نەسرین: جۆرە گوڵێکی پەڕەوردی بۆنخۆشی سپییە.
نەسۆز: د. شتێکە کە نەسووتێ.
نەسوو: د. تیغێکە کە هەرگیز تیژ نەبێ.
نەشارەزا: نابەڵەد.
نەشتەر: تیغێکی تیژی لووت باریکە برینی پێ هەڵدەدڕن.
نەشتەرکاری: خەریکبوون بەهەڵدڕینی برینەوە بەنەشتەر.
نەشتەرگەری: زانینی نەشتەرکاری.
نەشـرە: شـتـێکی درێژی جـوانە لە واڵای ڕەنگاوڕەنگی قـەبزە نوشتـەیی و مـووروو دروست دەکـرێ و بەچوار دەوری ژووردا دەگیرێ بۆ جوانی.
نەشمیل: جوانکیلە.
نەشمیلانە: جوانکیلانە.
نەشمیلە: نەشمیل.
نەشناس: بێگانە.
نەشۆر: د. نەزۆک.
نەشە: کەیف و هەوەس.
نەشەگرتن: پەیابوونی نەشە بۆ یەکێک.
نەعتک: ز. ناوچەوان.
نەعرەتە: قریوەی بەرز و گەورە.
نەعنا: گـیـایەکـە وەک پونگە، بەڵام ئەم گـەڵاکـەی کـاڵتـرە و تامەکەی توونترە.
نەفام: مەردوومی تێ نەگەیشتوو.
نەفامی: تێ نەگەیشتوویی.
نەفت: نەوت.
نەفتخانە: نەوتخانە.
نەفرین: لەعنەت.
نەفوورات: مەردوومی هار و هاجی زۆرزان.
نەڤرۆژ: نەورۆز.
نەڤـسی: با. کـوڕی ژن لە مـێـردێکی تری بـۆ باوەپیـاوە و کـوڕی مێرد لە ژنێکی تری بۆ باوەژن.
نەڤیساندن: ز. نووسین.
نەڤی: با. کووڕەزا.
نەڤیچرک: با. کووڕەزازا.
نەقارەخانە: مۆزیقەخانە.
نەقتاندن: ز. ئارەقگرتنی شت.
نەقر: ز. تەشتی قووڵ. دەفری گەورە.
نەقشە: نەخشە.
نەقیزە: داردەستێکی درێژە بزمارێک بەلووتەکەیەوەیەتی، وڵاخی پێ لێ دەخوڕن.
نەقیزەدان: لێخوڕین بەنەقیزە.
نەک: نەوەک.
نەکا: نەک.
نەکردوو: کەسێکە کە فێری ئیشوکار نەبووبێ.
نەکردە: نەکردوو.
نەکردەپەشیمان: کەسێکە کە پەشیمان بووبێتەوە لەسەر نەکردنی کارێک.
نەکس: ز. دەردێکە دووچاری سی دەبێ لە سـەرمـاوە (ذات الرئة).
نەکوت: نەکوتە.
نەکوتە: جۆرە جوێنێکە دەدرێ بەکەسێک کە قسەت لەگەڵ بکا و نەتەوێ لەوحەلەدا بیدوێنی.
نەکولۆک: دانەوێڵەیەکە کە درەنگ بکوڵێ.
نەکوو: نەوەک.
نەکی: نەوەک.
نەگـبەت: گـیـانداری کـوڵۆڵ. شـتی بەدفـەڕ: ئەو خـانـووە یا ئەو وڵاخـە (نەگـبـەت)ە واتە بەدفـەڕ و شـوومـە. کـوڵۆڵی: یاخـوا هەرگیز (نەگبەت) ڕووت تێ نەکا.
نەگبەتی: کوڵۆڵی.
نەگریس: گیانداری لاساری سەرسەخت.
نەگریسی: لاساری و سەرسەختی.
نەگۆڕ: شتێکە کە لە ئەندازەی خۆیدا وەستابێ و نەگۆڕابێ.

نەگۆمە: د. کەسێکە کە شەپلە لێی دابێ.
نەگەویس: کەسێکە کە کەس نەیەوێ.
نەگەویست: نەگەویس.
نەگەیشتوو: نەگەیو.
نەگەیو: میوەیەکە کە هێشتا نەگەیبێ. کەسێکە کە هێشتا نەگەیشتبێتە ئەو شوێنەی بۆی دەچێ.
نەگیراو: ولاخێکە کە هێشتا زین یا باری لێ نەکرابێ.
نەگیریاک: د. نەگیراو.
نەمازە: بەتایبەتی.
نەمام: درەختێکی پچووکە کە بەریشەوە هەڵکەنرابێ بۆ ناشتنی لە شوێنێکی تر.
نەمامکردن: کوشتنی مەردووم بەخستنە ناو چینی دیوار بەپێوە.
نەمان: لەناوچوونی شت.
نەمر: بریتییە لە خوا. پەیمانێکە لە ناوەندی خاوەن ئاژاڵ و شوانکارەیدا دەبەسترێ بۆ ماوەی ساڵێک یا زیاتر کە ئەو ئاژاڵەی دەیداتێ بەنەمر بۆی بەخێو بکا بەبێ پارە و لە پاشا بەتەواوی بیداتەوە و بەروبوومەکەی لەناویاندا دوو کەرتی بێ: مەڕەکانم دا بەفیسار کەس (بەنەمر) واتە ئەگەر یەکێکی لێ مرد لە بەرەکەی بیخاتەوە جێی. بەیەکێک دەوترێ کە ناوی هەرگیز نەکوژێتەوە.
نەمیانەوە: د. چەوتانەوە.
نەمێر: با. پیاوێکە کە نەتوانێ بچێتە لای ژن (عنین).
نەمیر: ز. نەمێر.
نەناس: نەشناس.
نەنک: دایکی دایک و دایکی باوک.
نەنکە: نەنک.
نەنگ: شوورەیی.
نەنگنامە: د. هەڵخوێندنی خراپ بەسەر یەکێکدا بەشیعر (هەجو).
تەنگەویست: نەگەویست.
نەنگین: نەنگداری ڕیسوا.
نەنە: نەنک.
نەهۆ: ز. ئێستا.
نەوا: جۆرە گۆرانییەکی خۆشی کوردییە. نەوەک (د). جێگا و ڕێگا.
نەوات: نەبات.
نەوادە: د. نەوە.
نەوار: د. بافتەیەکی تەنکە کچان پرچی پێ دەبەستن (قردێلە).
نەوازش: دڵخۆشی دانەوەی دڵتەنگێک بەگوفتار یا بەکردار.
نەوازشت: نەوازش.

نەوال: ز. شیو و دەرە.
نەوان: نەبان.
نەوباوە: د. نوخشە.
نەوت: شتێکی شلە دەکرێتە چراوە و دەسووتێنرێ و بەکاری گەلێ شتی تر دێ و لەژێر زەوی دەردەهێنرێ.
نەوتخانە: شوێنێکە کە نەوتی تێدا بفرۆشرێ.
نەوتی: شتێکە کە ڕەنگی لە نەوت بچێ. ناوی دێیەکە لە ناوچەی قەرەداخ.
نەوجوان: مەردوومی گەنجی جوان چاک.
نەوجەوان: د. نەوجوان.
نەور: زەمینێکی چاڵە لەناو شاخ و داخدا.
نەوڕەس: لاوی تازە پێگەیشتوو. میوەی نۆبەرە.
نهۆرم: شوێنی چاڵ لە زەوی.
نەورۆ: کاتی جووتگرتنی پشیلە.
نەورۆز: یەکەم ڕۆژی بەهارە کە ڕێکەوتی ڕۆژی بیست و یەکی مارت دەکا.
نەورۆزانە: دراوێکە کە قوتابی دەیبا بۆ مامۆستای لە ڕۆژی نەورۆزدا. دیارییەکە کە بەبۆنەی ڕۆژی نەورۆزەوە دەنێردرێ بۆ ئاشنا.
نەورۆزنامە: هەڵبەستێکە کە هەڵبدرێ بەسەر ڕۆژی نەورۆزدا.
نەورۆزە: گوڵێکە لە وێنەی گوڵە گەزیزە، بەڵام ئەم دوو ڕەنگە.
نەورۆزی: نەورۆزە.
نەوزاد: کەسێکە کە تازە لەدایک بووبێ.
نەوژن: هـ. نوێنگی بەرکەڵ.
نەوس: چنۆکی و ئارەزووکردنی خواردن: فیسار کەس (نەوس)ی تیژە.
نەوسن: مەردوومی چنۆکی چڵێس.
نەوسنی: چنۆکی و چڵێسی.
نەوشاتر: شتێکی سپییە وەک زاخ، مزگەر لەگەڵ قەلاییدا دەفری پێ سپی دەکاتەوە.
نەوشادر: نەوشاتر.
نهۆم: قاتی خانوو: ئەم خانووە دوو (نهۆم)ە.
نەووسک: با. خانووی لە شاخ داتاشراو .
نەووک: گەروو.
نەووگ: لباد.
نەوە: کوڕەزا و کوڕەزازا.
نەوهاڵ: د. نەوجوان.
نەوەد: ناوە بۆ ژمارەیەک کە نۆ دەیە.
نەوەرد: دارێکی چوار پاڵووی ئەستوورە جۆلا تەنراوی لەسەر هەڵدەکا. وەردێنە (د). نەبەرد (د).

نەوەش: هـ. نەخۆش.
نەوەشی: هـ. نەخۆشی.
نەوەک: مەبادا.
نەوەکا: نەوەک.
نەوەکوو: نەوەک.
نەوەکی: نەوەک.
نەوەن: گوێرەکەی نێری دوو ساڵە. شاتر (د).
نەوەندە: دەغڵێکی پایزەیە کە درەنگ چێنرابێ.
نەوێر: ترسنۆک.
نەوێران:ترسان و پرکێشی نەکردن .
نەوی: شتی نزم، (نەوی بوونەوە) نزمبوونەوە، (نەوی کردنەوە) نزمکردنەوە.
نەویس: د. مەردوومی بێ ڕێز.
نەوین: نیشتن. بانەکە (نەویوە) واتە نیشتووە. نزمبوونەوە. فرۆکە کە (نەوی) بووەوە واتە نزم بووەوە. کوێر (د).
نەهە: ز. ئێستەکە.
نەهـ: با. نۆ.
نەها: ز. ئێستا.
نەهات: کاتێکە کە شتی تێدا کەموکورِ بێ. نەگبەتی: فیسار کەس (نەهات)یتی.
نەهاتی: نەگبەتیی و سەغڵەتی.
نەهار: خواردەمەنی نیوەڕۆان.
نەهارکردن: خواردن لە نیوەڕۆاندا.
نەهبەرک: ز. جۆرە یارییەکە.
نەهەنگ: نەهەنگ.
نەهویت: ز. نەوەد.
نەهە: هـ. ناوک.
نەهەک: ز. نۆمینە.
نەهەنگ: ماسی زۆر گەورە.
نەهێشتن: لەناوبردنی شتێک. قەدەغەکردن.
نەهێنبڕ: نهێنبڕ.
نەهێنگر: نهێنگر.
نەهێنی: نهێنی.
نەهیو: د. شاتاڵ.
نەی: دەزوو (هـ). لوولک. قامیش.
نەیار: ز. دوژمنی ئاشکرا.
نەیاری: با. دوژمنایەتی.
نەیجوول: جۆرە قامیشێکی باریکی کولۆرە.
نەیجە: قامیشی باریکی ناوپڕە چیغی لێ دروست دەکرێ.
نەیچی: نەیژەن.
نهێرد: زەوی دەمار دەماری بەردەڵانی.
نەیزە: د. نێزە.
نەیزەباز: د. کەسێکە کە نێزە باش بەکار بهێنێ لە جەنگدا.
نەیزەدار: د. سەربازێکە کە نێزەی بەدەستەوەبێ.
نەیژە: قامیش.
نەیژەن: کەسێکە کە شمشاڵ باش لێ بدا.
نهێم: هێز: بە (نهێم) تێی نەوە.
نهێنبڕ: کەسێکە کە بەنهێنی ئیش بکا .
نەینک: با. ئاوێنە.
نهێنگر: سەگێکە بێ وەڕە پەلامار بدا.
نەینۆک: نینۆک (با) ئاوێنە.
نەینووک: ز. نینۆک.
نهێنی: پەنهانی.
نێ: دارێکی گەورەی درێژی کولۆرە ئاوی ئاشی پێدا دەچێتە خوارەوە. نە. ناوی دێیەکە لە مەریوان.
نیاتە: د. نۆتە.
نیاتەکردن: د. نۆتەکردن.
نیاتەکەر: د. نۆتەکەر.
نیاز: ئارەزووی کردن یا وتنی شتێک . نیازبوون: ئارەزووبوون (نیازکردن) ئارەزووکردن.
نیازگرتن: گرتنە دڵی ئاوات و مەبەستێک .
نیان: دانان. کاغەزەکەم نیایە ناو کتێبەکە (د). نەرم: نەرم و نیان.
نیانە شوێن: د. نانە شوێن.
نیانەمل: د. نانەمل.
نیانەوە: د. نانەوە.
نیانەیەک: د. نانە یەک.
نیاوەزیان: د. لێ نەهاتن و سەلیقە پێ نەشکانی شت.
نێچیر: گیاندارێکە کە لە ڕاو بگیرێ یا بکوژرێ.
نیچیرڤان: با. نێچیرەوان.
نێچیرکردن: ڕاوکردن.
نیچیرەوان: ڕاوکەر.
نێر: گیاندارێکە کە مێ نەبێ. بریتییە لە مەردوومی جوامێر.
نێرانە: کردار یا گوفتارێکە کە لەهی پیاوی جوامێر بچێ.
نێربلۆکێ: ئافرەتێکە کە کاڵای پیاو لەبەر بکا و لاسایی پیاوان بکاتەوە.
نێربوونەوە: پتەوبوونەوەی زەوی لە سەرەتای بەهاردا. پیربوونی شێلم و توور و چەوەندەر لەکاتی بەسەرچوونیدا.
نێرتک: نێرک.
نێرتن: ز. تەماشاکردنی شتێک.

نێرک: کورۆکی پیاز و کاهوو و گەڵێ شتی تر. کێمێکی زۆر خەستە لە ناوەڕاستی هێندێ بریندا وەک پلێتە وایە.
نێرکەبرە: کرمێکە نێرکی سەوزایی تازە دەخوات.
نێرگز: نێرگس.
نێرگزەبان: دەبانی جووهەردار.
نێرگزەجار: نێرگسەجار.
نێرگس: گیایەکی بەهاری لاسک بەرزی کولۆرە، گوڵێکی پەڕەسپی و زەردی بۆنخۆش دەگرێ.
نێرگسەجار: شوێنێکە کە نێرگسی زۆری لێ بروێ. ناوی دێیەکە لە ناوچەی وارماوا.
نێرگسی: شتێکە وەک نێرگس وابێ .
نێرگەلە: جۆرە قلیانێکە سەرێکی تووتنی تێ دەکرێ و سەرەکەی تری دەکرێ بەشووشەیەکدا کە هێندێ ئاوی تێدایە و کونێکی بەتەنشتەوەیە مارپێچێکی تێ دەبرێ و هەڵدەمژرێ.
نێرگەلەچی: کەسێکە کە هەر نێرگەلە تێ بکا بۆ یەکێک.
نێرۆ: هێز.
نێرۆک: د. نێرکی سەختی شت.
نێروما: د. نێرەمووک.
نێروو: نێرۆ.
نێرە: نێری هێندێ گیاندار. جۆگەیەکە بەناوەڕاستی بەراودا بڕوا (مەشتە)ی لێ جوێ دەکرێتەوە. نێرینەی تاو.
نێرەحەیتە: مەردوومی زەبەلاح.
نێرەژن: د. نێربلۆکێ.
نێرەژەن: دۆژەنگ (هـ). نێرۆک (د).
نێرەکورکە: نێربلۆکێ.
نێرەکەر: کەری نێر.
نێرەکەری: بریتییە لە زۆرداری و کێزری: فیسار کەس بە(نێرە کەری) خانووەکەی داگیرکرد.
نێرەکەو: کەوی نێر.
نێرەکێ: ئێستری نێر.
نێرەمووک: گیاندارێکە کە نیشانەی نێریش و مێشی پێوەبێ.
نێرەو: مەشتە.
نێرە و مێیە: دوو قرتێنەن کە بەناو یەکدا دەچن.
نێرەوەز: نێرینەی ڕەشەوڵاخ.
نێری: سابرێن. کەڵەکێوی.
نێرین: ز. ڕوانین.
نێرینە: ئادەمی نێر. ناوەڕاستی هەموو شتێک: چوومە (نێرینە)ی ئاوەکە یا جەنگەکە.
نێز: ز. برسی. برسێتی.
نێزک: د. نزیک.

نێزە: جۆرە تیغێکی تیژی دەمپانی برندەیە هێندێ جار دەکرێ بەسەری تفەنگەوە.
نێزەباز: د. کەسێکە کە یاری بەنێزە بکا.
نێزەبازی: یاریکردن بەنێزە.
نێزەدار: نەیزەدار.
نێزیک: نزیک.
نێزیکی: نزیکی.
نیسک: دانەوێڵەیەکی وردی پانکەڵەی سوورە دەکرێ بەچێشت.
نیسکان: یاریکردن.
نێسکە: لەنجەولاری ئەسپ.
نیسکێن: چێشتی نیسک.
نیسکێنە: نیسکێن.
نیسکین: د. نیسکێن.
نێش: ئازار.
نیشاستە: جۆرە ئاردێکە لە مەغزی گەنم دەگیرێ.
نیشاسە: د. نیشاستە.
نیشان: شتێکی جوانە هێندێ پیاوی سەربازی دەوڵەتی لە خۆی دەدا بۆ دەرکەوتنی پایەی سەربازێتی. شتێکە دادەنرێ بۆ ئەنگاوتنی بەتفەنگ.
نیشانچی: کەسێکە کە نیشان بئەنگێوێ.
نیشاندان: پیشاندان.
نیشانکرد: شوێنێکە کە دیاری کرابێ.
نیشانکردن: دانانی نیشانەیەک لە شوێنێک بۆ شتێک.
نیشانگا: دوگمەیەکی بەرزە بەسەر لوولەی تفەنگ و دەمانچەوە نیشانی پێ دەگیرێ.
نیشانگرتن: ڕاستگرتنی لوولەی تفەنگە بۆ نیشانە.
نیشانگە: شوێنێکە کە شتی تێدا پیشان بدرێ (معرض).
نیشان ناو: لەقەب.
نیشانە: شتێکە کە ڕێ نموونی بکا بۆ شتێک و پێی بناسرێتەوە، ئەو شتانەن کە دەدرێن لەسەر سنگی لەشکری بۆ نیشاندانی پایەی خزمەتی.
نیشانەکردن: دانانی نیشانەیەک لەسەر شتێک بۆ تێک نەچوون و ون نەبوونی. بردنی شتێک بۆ بووک دوای خوازبێنی لەلایەن زاواوە.
نیشتمان: جێگایەکە کە ئادەمی تێدا لە دایک ببێ و بەبەروبوومی بژی.
نیشتمانپەرست: کەسێکە کە نیشتمانی خۆی خۆش بوێ و هەمیشە هەوڵ بدا بۆ پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی.
نیشتمانپەرستی: خۆشەویستی نیشتمان.
نیشتمانپەروەر: نیشتمانپەرست.

نیشتمانپەروەری: نیشتمانپەرستی.
نیشتمانی: نیشتمان پەرست. شتێکە کە هی نیشتمانی خۆت بێ.
نیشتمەن: شوێنێکە لەوانەبێ کە مەردوومی تێدا بحەوێتەوە.
نیشتن: داکەوتنی هێندێ شت: پایەکە یا کۆڵەکە یا بانەکە (نیشتووە). هەڵنیشتنی باڵندە. کۆبوونەوەی خڵتە لەبنی شتی شلدا: ئاوەکە (نیشتووە) واتە خڵتەکەی کەوتووەتە بنی. دانیشتن: بنیشە. ئاوابوون: ڕۆژیشتووە.
نیشتنەسەر: ڕاونان: تانجییەکە نیشتە سەر کەروێشکەکە.
نیشتنە سەریەک: کەوتنە سەر یەکی چەند شتێک و چەسپبوونیان لە یەکتری: خەروا هەنجیرەکان نیشتوونەتە سەریەک.
نیشتنەمل یەک: نیشتنە سەریەک.
نیشتنەوە: هاتنە خوارەوەی باڵندە بۆ سەر زەوی. دامردنەوەی ئاوسایی. کەمبوونەوەی ئاوی لافاو. وشکبوون و نەمانی دڵۆپەی بان.
نیشتنەیەک: چەسپینی شت لەیەک. بەگژیەکداچوونی چەند کەسێکی زۆر: ژنی گەڕەکەکە (نیشتوونەتە یەک) واتە لەیەک بەربوون.
نیشتوو: مڵتەیەکە بکەوێتە بنکی شتی شلەوە.
نیشتەجێ: کەسێکە کە کۆچەری نەبێ و هەمیشە دانیشتووی جێگایەک بێ.
نیشتمەن: خانوو یا وڵاتێکە کە لەوانەبێ تێیدا دابنیشیت.
نیشتەمەنی: نیشتمەن: ئەم خانووە (نیشتەمەنی) نییە.
نیشتەنی: نیشتەجێ.
نیشخۆ: با. بەڵێ.
نێڤشک: با. کەرە.
نێک: شتی چاک. ئێسقانی لای ڕاست و چەپی سمت.
نێکبین: کەسێکە ئەنجامی هەموو کارێک بەباشی ببینێ.
نێکمسمار: ز. لووتەوانەی تەشی.
نیگار: وێنەی شت لەسەر کاغەز (رسم).
نێڵ: ز. شوێنێکی ئاوەزێیە بەلاپاڵێکی بەرزەوە.
نێڵە: کڵپەی ئاگری خۆش، (نێڵەنێڵ) کڵپە کڵپ. نیلی جووت.
نێم: ز. کێم.
نیمچەدورگە: پارچە زەوییەکە کە سێ لای ئاوبێ و لایەکی وشکانی بێ (شبه جزیرة).
نیمر: ز. نزم.
نێو: ناو. نێوانی شت.
نێواخن: ناواخن.
نێوان: ناودووتوێی شت.
نێوبار: ناوبار.
نێوبانگ: ناوبانگ.
نێوبردن: ناوبردن.
نێوبرێشک: ناوبرێشک.
نێوبژەکردن: ناوبژەکردن.
نێوبژی: ناوبژی.
نێوبژیکەر: ناوبژیکەر.
نێوپارە: ناوپارە.
نێوپەل: ناوپەل.
نێوتا: ناوتا.
نێوتاق: ناوتاق.
نێوجەرگە: ناوجەرگە.
نێوجەژنان: ناوجەژنان.
نێوچاو: ناوچەوان.
نێوچاوپاک: ناوچاوپاک.
نێوچەوان: ناوچەوان.
نێوچەوان پاک: ناوچەوان پاک.
نێوچەوان ڕوون: ناوچەوان ڕوون.
نێوچەوان قۆقز: ناوچەوان قۆقز.
نێوچەوان قەشقە: ناوچەوان قەشقە.
نێوچەوان گرژ: ناوچەوان گرژ.
نێوخۆ: ناوخۆ.
نێودار: ناودار.
نێودۆک: دۆژەنک.
نێودەرکردن: ناودەرکردن.
نێودەست: ناودەست.
نێوزڕان: ناوزڕان.
نێوساجی: ناوساجی.
نێوشان: ناوشان.
نێوفەرش: ناوفەرش.
نێوقەد: ناوقەد.
نێوکار: ناوکار.
نێوکۆڵ: ناوکۆڵ. پاچە کۆڵەی دیراو.
نێوکوێربوونەوە: ناوکوێربوونەوە.
نێرکەبڕ: ناوکەبڕ.
نێوکەبڕانە: ناوکەبڕانە.
نێوکەڕێژ: ناوکەڕێژ.
نێوکەف: ناوکەف.
نێوگەڵ: ناوگەڵ.
نێولنگ: ناولنگ.

نێولنگان: ناولنگان.
نێولەپ: ناولەپ.
نێولێنان: ناولێنان.
نێومالّ: ناومالّ.
نێونان: ناونان.
نێونووس: ناونووس.
نێونیشان: ناونیشان.
نێووک: ناوک.
نیووکبڕ: ناوکبڕ.
نێوک بڕین: ناوک بڕین.
نێوککەوتن: ناوککەوتن.
نێووکە: ناوک.
نێوون: گوێرەکەی مێی دوو سالّە.
نێونجی: د. ناونجی.
نێو و نەتۆرە: ناو و نەتۆرە.
نێوونیشان: ناونیشان.
نێوەڕاست: ناوەڕاست.
نێوەرۆک: ناوەرۆک.
نێوەند: ناوەند.
نێوندیار: ناوەندیار.
نێوندیاری: ناوەندیاری.
نێوەندی: ناوەندی.
نیهاد: نیاز: فلآنە کەس نیهادی باشە.
نیهانی: نهێنی.
نی: ز. نوێ.
نیخ: ز. گەروو.
نیخن: کەسێکە بەکارێکەوە هەر نیخەی بێ.
نیخە: دامان و نقاندن بەدەست کارێکەوە: فیسار کەس هەر (نیخە)ی دێ، نیخەنیخ: نیخەی یەک لەدوای یەک .
نیر: نیلی جووت. کات و دەم (با).
نیرک: با. نیلی سەرملی گاجووت.
نیرگە: ڕایەڵێکی ئەستووره کە سەری دارەڕای لەسەربێ.
نیره: نیر. خێزەری سەر دارە ڕاکە لە جیاتی قامیشبەند دادەنرێ (با).
نیزک: د. نزیک.
نیسان: مانگی چوارەمە لە سالّی ڕۆژی لە ناوەندی مارت و مایسەوە سی ڕۆژە.
نیڤ: با. نیو.
نیڤرۆ: ز. نیوەڕۆ.
نیڤشک: ز. نێڤشک.
نیڤشەڤ: با. نیوەشەو.
نیڤەشەڤ: با. نیوەشەو.
نیڤەک: با. ناوەڕاست.
نیڤەکار: با. نیوەکار.
نیڤەکاری: با. نیوەکاری.
نیڤی: با. شتی ناونجی.
نیڤیکردن: ز. دوولەتکردنی شت.
نیک: ز. دارێکە پێی ئاشی پێ بەرز و نزم دەکرێتەوە.
نیکرن: ر. تازەکردنەوەی شت.
نیل: دارێکە دەخرێتە سەر ملی دوو گا یا دوو ولآخی تر بۆ جووت پێ کردن. خوم.
نیلوپەڕ: لیلوپەڕ.
نیلە: نیر.
نیلی: ڕەنگی خومی.
نیم: نیوەی شت.
نیمبرژ: شتی نیوەبرژاو.
نیمبرێژ: د. نیم روو.
نیمپوخت: د. نیمپەز.
نیمپەز: د. چێشتی نیوەکولّ.
نیمتەنە: د. سەلّتە. سوخمەی قۆلّدار.
نیمچە: ناونجی لە هەموو شتێک: ئەم قالّییە (نیمچە)یە واتە نە زۆر تازە و نە زۆر کۆنە، یا نە زۆر گەورە و نە زۆر پچووکە. یا نە زۆر جوان و نە زۆر ناشیرینە. پیالّە (د).
نیمداشت: نیوەداشت.
نیمڕوو: هێلکە و ڕۆنێکە کە هەر دیوێکی برژابێ.
نیمڕووە: نیمڕوو.
نیمسۆز: د. سەرەبزووت.
نیمقڕ: نیوقڕ.
نیمکوشت: گەچێکە کە لە گرتنەوەدا لە (کوشتە) کەمتر کوژرابێ.
نیمگەز: د. نیوگەز.
نیمە: لەتێک لە خشتێک. نیوە لە شت.
نیمەچلّ: نیوەچلّ.
نیمەڕۆ: نیوەڕۆ.
نیمەڕۆژ: نیوەڕۆ.
نیمەشۆر: نیوەشۆر.
نیمەشەو: نیوەشەو.
نیمەکار: نیوەکار.
نیمەکارە: نیوەکار. نیوەچلّ.
نیمەکاری: نیوەکاری.

نیمەگیان: نیوەگیان.
نیمەنمەک: نیوەنمەک.
نینۆر: هـ. گونۆڕ.
نینۆک: ئێسقانێکی پانی تەنکە بەسەر پەنجەی دەست و پێی ئادەمییەوە.
نینۆککردن: قرتاندنی نینۆک بەتیغ. بریتییە لە کزکردن و زەبوون کردنی یەکێک.
نینۆکی خانم: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک .
نیو: بەشێکی ڕاست لە دوو بەشەی هەموو شتێک.
نیوبرژ: نیمبرژ.
نیوتەنە: نیمتەنە.
نیوداشت: شتی نە زۆر کۆنی نە زۆر تازە.
نیوڕان: نیوڕۆ.
نیوڕۆ: نیوەڕۆ.
نیوڕو: نیمڕو.
نیوڕو وە: نیمڕو وە.
نیوقڕ: د. جۆرە ئاوەڵ کراسێکی ژنانەیە.
نیوگەز: نیوەی گەزی پێوان.
نیونیرە: گۆپکەیەکە لە ناوەڕاستی نیردا (وێژە)ی بەقوڵفە تێ دەبەسترێ.
نیوە: نیو.
نیوەچڵ: کارێکە بەناتەواوی مابێتەوە .
نیوەچڵکردن: نیوەیی کردنی شت: چێشتەکەت بەبەر کوڵ (نیوەچڵ کرد) .
نیوەڕۆ: کاتی ناوەڕاستی ڕۆژ.
نیوەڕۆژ: نیوەڕۆژە.
نیوەڕۆژە: نەهار. نەهارکردن.
نیوەشۆر: بنیسکە سابوونێکە کە مابێتەوە.
نیوەشەو: کاتی ناوەڕاستی شەو.
نیوەشەوی: جۆرە نقامێکی کوردی خۆشە.
نیوەکار: ڕەنجبەرێکە کە بەنیوەیی ئیشت بۆ بکا.
نیوەکارە: نیوەکار.
نیوەکاری: خەریکبوون لە کارێکدا بەنیوەیی.
نیوەگیان: گیاندارێکە کە بەهۆی ناساغی یا ترسەوە نیوە مردوو بووبێ.
نیوەمردوو: نیوەگیان.
نیوەنمەک: هەویرێکی نیوەبرژی کەم خوێی گەرمە دەنرێ لە شوێنی بەئازار.
نیوەیی: بوونی شت بەدوو بەشی ڕاست لە ناوەندی دوو کەسدا: ئەم زەوییە لە ناوەندی دوو کەسدا: ئەم زەوییە لە ناوەندی من و تۆدا (نیوەیی)یە.

# و

و: پیتی بەستنەوە (عطف)ی دوو وتار بەیەکەوە: سالار (و) نەریمان چوون بۆ قوتابخانە. پیتێکە دەکەوێتە ناوەندی دوو وتەوە، جوێ نەبوونەوەی یەکەم لە دووەم دەگەیەنێ: مەلا (و) مزگەوت، دەروێش (و) تەکیە، واتە ئەم دووانە زۆر پەیوەندییان لەگەڵ یەکدا هەیە، و دەبێ مەلا هەمیشە لە مزگەوت و دەروێش هەمیشە لە تەکیە بێ. پیتێکە دەنووسێ بەهێندێ وتەوە دەیکا بەسیفەتی مشەبە: مردو (و)، بابردو (و)، گورگان خواردو(و). دەکەوێتە ناوەندی دوو وتەوە دووری یەکەم لە دووەم دەگەیەنێ: من (و) قومار، تۆ (و) ئارەق خواردنەوە، واتە من لە قومار و تۆ لە ئارەقخواردنەوە زۆر دوورین. پیتی ئیملایە دەبێ بەبۆر بۆ پیتی پێش خۆی: کول، کوڵ گول، گوڵ.

وا: پیتێکە کاتی قسەکردن (زەمانی حاڵ) دەگەیەنێ: (وا) دەنووسم واتە ئێستاکە. دەنووسێ بەهێندێ ناوەوە دەیکا بەکارکەر: نانە(وا). دەنووسێ بەهێندێ ناوەوە دەیکا بەسیفەتی مشەبە. ئاردە(وا)، دۆخە(وا). وەها: (وا) بنووسە. سەرەتای کات: لە (وا)ی بەیانییەوە چاوەڕوانم. شتی کراوە: دەرگاکە (وا)یە. با. (د).

واتا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لەناو وتاردا لە جێی وتەی یەعنی: جەنگ کۆتایی هات (واتا) برایەوە. مەبەست و (مەعنا)ی شت.

واتانێ: واتا.

واتو وری: دەنگوباسێکە کە پەیدابێ و بەسەردەمی مەردوومەوە بێ.

واتە: واتا. وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ پێ باوەڕ کردنی یەکێک لە قسەیەکدا: (واتە) لە وەرامی یەکێکدا کە بڵێ من ڕاست گەم، یەعنی ڕاست دەکەیت. قسە: بە(واتە)ی مەردووم لەگەڵ مەکە، یا بوو بە(واتە)ی ڕۆژگار.

واتەگۆری: مەجاز.

واتەواتە: واتو ورێ.

واتە و ویرە: د. واتو ورێ.

واتەی: هـ. گفتوگۆ!

واجە: کلاوڕۆژنە.

واچە: هـ، وتە.

واخ: ز. ئاخ.

واخوا: د. بەسەرگرەوە (مستأنف).

واخوایی: بەسەرگرتنەوە (استئناف).

واخێن: د. واغێن.

وادار: کەسێکی شارەزای تێگەیشتوو لە کارێکدا. ئاگادار بەشتێک.

واداربوون: تێگەیشتن لە کارێک. ئاگاداربوون بەکارێک.

وادارکردن: ئاگادارکردنی یەکێک بەشتێک. تێگەیاندنی یەکێک لە کارێک.

وادارکردنەوە: د. بێدارکردنەوە.

واداشت: د. وادار.

وادە: گفت، (وادەدان) گفتدان.

وار: جێ هەوار (با). خوارەوە (هـ). پیتێکە بەدوای هێندێ ناوەوە دەنرێ دەیکا بەکارکەر: خوێندە(وار). پارەیەکە لەکاتی بردنەوەدا لەلایەن خاوەن قومارخانەوە وەردەگیرێ.

واران: باران.

وارانن: باران بارین.

واردن: د. خواردن.

واردەی: هـ. خواردن.

وارن: خوری دەسکەنەکراو.

وارە: د. قەرز.

وارەس: د. قازی شەرع.

وارەسە: د.گۆشەگیر.

وارش: دیوارێکە کە بەچوار قەراغی شتێکدا کرابێ.

وارشت: بارشت.
وارشه: وارش.
وارگە: هەوارگە. بارگە.
وارۆ: د. بارۆکە.
وارۆک: هـ. بارۆکە.
واروو: د. شتی هەڵگەڕاوە.
واروون: د. واروو.
وارە: خـوشک هـ. جـار: چەند (وارە) هـاتم بۆ لات، (وارەوارە) جارەجارە. بەشێکە کە بەقـەول و بڕێ دانرابێ (قسط): دوو (وارە)م بەسەرەوە ماوە لە قەرزەکە.
وارەزا: هـ. خوشکەزا.
وارین: د. بارین.
واز: بەشێکی کـەمـە لە ئاوێکی زۆر کـە لێی جـوێ بووبێـتـەوە و دوورگــە (جـزیرة) یەکی پچـووکی پەیداکـردبێ و لە پاشـا چووبێـتـەوە سـەر ئاوەکـەی تر. کـراوە: دەرگـاکـە وازە. واتە لەسەر پشتە.
وازنی: د. قیاسکردن.
وازتن: د. خواستن.
وازڕ: د. نێچیرێکە کە لە ڕاوچی ترسابێ و زوو بسڵەمێتەوە.
وازهانین: وازهێنان.
وازهاوردن: وازهێنان.
وازهێنان: دەستگرتن لە شت .
وازی: یاری.
واژ: د. مەردوومی سەرلێشێواو.
واژاو: واز، ئاودانـی شـەتڵی تووتن و هێندێ شـتی تر دوو سێ ڕۆژ لەسەر یەک بۆ ئەوەی کە بگیرسێ. قنگاو د.
واژکـــردنەوە: ئـارەزووکـــردنەوەی مـــەڕ بـۆ بەران جـــاری دووەم و سێیەم: مەڕەکان (واژیان کردۆتەوە).
واژ: هاژە. وتە د. ناوی دێیەکە لە شارباژێڕ.
واژەبەس: د. پیـتـێکە کـەووتە بەیەکـەوە بیـەسـتێ: من (و) تۆ، خانوو(ی) تۆ.
واستن: د. خواستن.
واستە: هـ. داواکردن.
واسە: وتەیەکە بۆ باوەڕکردن (تصدیق) بەیەکێک بەکاردێنرێ.
واشە: باڵندەیەکی ڕاوکەرە لە باز پچووکترە.
واشێرە: بەری کاڕووش.
واغێن: جۆرە یاریکردنێکە بە گوێز.
وافوور: تلیاک.
وافوورکێشان: تلیاک کێش.
وافوورکێش: کێشانی وافوور وەک جگەرە.
وافوورە: وافوور.
واق: مەردوومی سەرسام، (واقبوون) سەرسامبوون.
واقاندن: واقەواقکردن.
واقپەڕین: د. واقبوون.
واق مرمان: سەرسوڕمان.
واقواق: د. مەلێکی کاکۆڵدارە ماسی دەخوا.
واق وڕمان: واقمڕمان.
واق و ویق: د. واقەواق.
واقـە: دەنگێکە وەک دەنگی ڕێوی و چەقـەڵێک کـە زۆریان بۆ هاتبێ، (واقە واق) واقەی یەک لەدوای یەک.
واقەکەر: بریتییە لە مەڕ و بزن: (واقەکەر) لە ماڵمدا نییە.
واک: هێن.
واکفت: د. کەوتنەوەی نەخۆش.
واگل: د. ئەواگل.
واگۆ: د. دووبارە وتنەوەی قسەیەک. تۆمارکردن (تسجیل).
واڵ: شتی کراوەی دەم پەل.
واڵا: پارچەی شتی ڕەنگاوڕەنگە کە منداڵان دەیکەن بەجلەبووکی منداڵانە، واڵ. واڵابێژ.
واڵابێــژ: هێـــڵـــەکـــێکی زۆر وردی ســـخـــە هێندێ شـــتی پێ دەبێژرێتەوە.
واڵاوێت: شتێکە کە بە واڵا بێژرێتەوە.
واڵە: د. وردەی شت. خوشک.
واڵەکێ: هـ. خوشکەلێ.
واڵێ: هـ. خوشک.
والی نشین: ولایەت.
وام: قەرز.
واماگ: د. داماو.
وامدار: قەرزدار.
وامداری: قەرزداری.
وامی: هـ. بادام.
وان: پیـتـێکە بەهێندێ ناوەوە کـە نووسـا چاودێری و پاسـەوانی دەگەیەنێ: باخە(وان)، ئاشە(وان)، گا(وان)، واتە چاودێری باخ و ئاش و گا. پیتێکە بەهێندێ ناوەوە کە نووسا پسپۆڕی (تخـصص) و ئامـادەیی یەکـێک دەگـەیەنێ لەو شـتـەدا کـە پیـــتی (وان)ی پێـــوەیە: دارە(وان)، شـــاخـــە(وان)، فرۆکە(وان)، واتە ئەو کەسە لە هەڵگەڕان بەدار و شاخدا و، لە فرۆک لێخوڕیندا ئامادە و وەستایە. ئەوان. ناوی شارێکە لە کوردستانی تورکیا.
وانای: هـ. خوێندن.
وانن: لاواندنی ئاژاڵ بۆ بەچکەی خۆی.

وانە: دەرس.
وانەک: وانێک.
وانێک: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (هێن).
وانێها: ز. ئەو دووانە.
واو: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
واوێژ: د. کەسێکە کە شتێکی وتراو بلێتەوە (مبلغ). وەرام.
واهەر: د. خوشک.
وای: وتەی داخ و خەفەت: (وای) لە دەست ڕۆژگار.
وایش: وای.
وو: بۆری درێژە: بوون، جوون، چوون.
وتاخ: د. وەتاخ.
وتار: گوفتار.
وتن: قسەکردن. گۆرانی وتن: دەنگ خۆشەکان خەریکی (وتن)ن.
وتنەوە: دووبارەکردنەوەی قسە. دەرسدان. فیسار کەس خەریکی (وتنەوە)یە واتە دەرس دەڵێتەوە.
وتوو: کوورەیەکی ئاسنینی ژێر لووسە بەداخی بەسەر کالادا دەهێنرێ بۆ دەق گرتنی.
وتووچی: کەسێکە کە کالاّ و وتوو بدا بەپارە.
وتوودان: وتووهێنان بەسەر کالاّدا.
وتووزبوونەوە: خلبوونەوە.
وتووکردن: وتوودان.
وتووکێشان: وتوودان.
وتو ویرە: د. واتو ورێ .
وتە: قسە. وشە. نووستن (ھ).
وتەڵە: مەردوومی زیتەڵە.
وتەووت: واتو ورێ. ورتەورت.
وتە و ویرە: د. وتو ویرە.
وجاخ: د. وەجاخ.
وجاخدار: د. وەجاخڕوون.
وچاخڕوون: د. وەچاخڕوون.
وجاخزادە: د. وەجاخزادە.
وجاخکوێر: د. وەجاخکوێر.
وچان: پشوو و حەسانەوەیەکی کەم.
وچاندان: پشوودان. مۆڵەتدان.
وچانگرتن: حەسانەوەیەکی کەم.
وۆخە: ئۆحە.
ودم: بەهرەیەکە گۆیا هێندێ کەس هەیەتی بۆ چاککردنەوەی هێندێ دەرد و ئازار: فیسار کەس (ودم)ێتی دەست بەکۆڵنجی هەر کەسێکدا بێنێ چاک دەبێتەوە.

ودمانە: شتێکە دەدرێ بەودمدار لە پاداشی ئەو ڕەنجەیدا کە دەیدا.
ودمدار: کەسێکە کەودمی بێ.
ورازین: د. دروونی شت.
ورتکە: وردکە. بریتییە لە منداڵی وردەڵە: فیسار کەس (ورتکە)ی زۆرە واتە منداڵی وردی زۆرە.
ورتە: لەبەر خۆوە قسەکردن.
ورتەورت: ورتەی یەک لەدوای یەک.
ورچ: دڕندەیەکی تووکنی گەورەی کێوییە بەقەد جاشەکەرێک دەبێ دەست و پێی وەک دەست و پێی ئادەمی وایە.
ورچە کۆڵە: بەچکە ورچ.
ورد: شتێکە کە درشت نەبێ. بریتییە لە مەردوومی زیرەک.
وردبوون: پارچەپارچەبوونی شت زۆر بەپچوکی.
وردبوونەوە: بیرکردنەوە لە شتێک بۆ هاتنەوە بیر یا بۆ زانینی. تەماشاکردنی شتێک بەوردی و سەرنجدانی.
وردبین: بریتییە لە کەسێک کە لە هەموو کارێکدا ورد و زیرەک بێ.
وردبینی: زیرەکی بەڕەنگێک کە لە هەموو شت ورد ببێتەوە.
وردکار: کۆڵەر (مدقق).
وردکاری: کۆڵەری (تدقیق).
وردکردن: پارچەپارچەکردنی شت بەپچووکی.
وردکردنەوە: گۆڕینەوەی پارە بەوردەتر لە خۆی. کۆڵینەوە و قسە کردن لە شتێک بۆ ئاشکرابوونی.
وردکە: وردە.
ورد و خاش: شتێکە کە بەتەواوی ورد بووبێ.
ورد و خان: د. ورد و خاش.
وردە: شتی ورد لە هەموو شت.
وردەئاهەنگ: بریتییە لە وردەبایەک کە لە هێندێ کەس دەبێتەوە.
وردەبابەت: شتی وردی ناوماڵ و دوکان. وردە ئاهەنگ.
وردەبزە:زەردەخەنە.
وردەبین: کۆڵەر (مدقق).
وردەتەریب: جۆرەتەریبێکی وردە لە کالاّ دەدرێ.
وردەدان: دانەوێڵەی ناوماڵ وەک برنج و گەنم و شتی تر.
وردەفرۆش: کەسێکە کە شت بە کەم کەم بفرۆشێ (عطار).
وردەکاری: وتن یا کردنی شتی جوانی وردی پەسند.
وردەکوت: زۆر کوتانی کۆڵۆش تا دەبێ بە کا.
وردەگلەیی: گلەیی کردن لە چەند شتێکی هیچ و پووچ.
وردەگیر: د. ڕەخنەگر.
وردەڵە: شتی وردی پچکۆلە. جومگەی ئەندام(د).

وردەمردە: د. وردەوالا.
وردەوالا: وردەبابەت.
وردەواڵە: وردەوالا.
وردەوبوون: د. وردبوونەوە.
وردەووالە: د. وردەواڵە.
وردەوردە: کەم کەم: باران (وردە وردە) دەبارێ.
وردی: بریتییە لە زیرەکی و تێبینی. پچووکی شت.
وردیکلانە: د. شتی وردیلانە.
وردیلانە: جوانکیلانە.
وردیلە: جوانکیلە.
وڕ: گیانداری کاس، (وڕبوون) کاس بوون، (وڕکردن) کاسکردن. زەمینی فشی سستەک. وتەی نابەجێ. فلان کەس (وڕ) لێ دەدا، واتە قسەی بێ سەر و پێ دەکا.
وڕاج: د. چەنەباز.
وڕاق: ژووری گەورەی بەرز.
وڕاوە: وڕێنە.
وڕک: پەڵپ.
وڕکاوی: منداڵی خاوەن وڕک.
وڕکگرتن: پەڵپگرتن.
وڕمان: سەرسوڕمان.
وڕوڕە: د. پیرێژنی چەنەباز.
وڕە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی فڕۆک. (وڕەووڕ) وڕەی یەک لەدوای یەک. لۆکەی کراوە. گەلەی بەراز. هوودڕە. گڕە. بەردەلانی سەخت.
وڕەو: گەلەی بەراز: تووشی (وڕەو)ێک بەراز بووم.
وڕێنکە: وەنەوز. وڕێنە.
وڕێنە: قسەکردن بەدەم بێ هۆشییەوە.
وڕی: کاسی.
وڕین: د. بڕین.
وڕینە: د. وڕێنە.
وڕژان: بڕژان.
وڕژاندن: وڕژانن.
وڕژانن: بڕژانن.
ورشە: بریسک و هووڕێکە لە هێندێ پارچەی ئاوریشمینەوە دێ، (ورشەورش) ورشەی یەک لەدوای یەک.
ورشەدار: شتێکە کە ورشەی ببێ.
ورشەدان: بریقەدانەوەی هێندێ شت .
ورکە: نقە، (ورکە ورک) نقەنق. قسەیەکە لە دڵدا بێ و نەهاتبێتە سەرزمان.
ورگ: توورەکەیەکە لەناوسکی هێندێ گیاندارا پیسی تێ دەچێ.
ورگدان: هاتنی دیوار بەدیوی ناوەوە یا دەرەوەدا بەڕەنگێک کە ناوەکەی بۆش ببێ.
ورگدڕاو: بریتییە لە مەردوومی زۆرخۆر.
ورگن: گیانداری ورگ زل.
ورگ نانەسەر: بریتییە لە خواردنی شتێک بەزۆری.
ورگنە: ورگن.
ورگهاتن: بریتییە لە زلبوونێ ورگ.
وورمان: ڕووخان و کەوتن.
ورمایی: نهۆرم.
ورمێ: د. ئیجازە و ڕوخسەت.
ورمێدار: د. کەسێکە کە ئیجازە و ڕوخسەتێکی پێ درابێ.
ورنگ: پشوو.
ورنگدان: پشوودان.
ورنگ گرتن: ورنگدان.
وروورە: وڵووڵە.
وروژان: هاتنە دەرەوەی زەردەواڵە و هەنگ و مێرووولە لە هێلانەکەیان و بەیەکداهاتنیان بەزۆری.
وروژاندن: دارکردن بەکونی زەردەواڵەدا بۆ هاتنە دەرەوەیان بەزۆری. تووڕەکردنی گیاندار. دەستکاری نەخۆشی بەدەرمانی خراپ: ئەم حەبەم خوارد نەخۆشییەکەمی وروژاند.
وروژم هێنان: هورووژم هێنان.
ورووکان: کۆبوونەوەی چەند گیاندارێک و داباریینیان بەسەر شتێکدا.
ورە: تەوانایی و خۆڕاگرتن: فیسار کەس زۆر بە(ورە)یە. دەنگوباسێکە کە بلاوبووبێتەوە.
ورەبەردان: نەمانی هێزی خۆڕاگرتن لە ترساندا.
ورەچوون: ورەبەردان.
ورەوور: لەبەرخۆوە گۆرانی وتن. ورتە ورت.
ورەووردە: بیرکردنەوە لە شتێک.
وریا: گیانداری ئاگاداری زیت و زرنگ.
وریابوونەوە: بێداربوونەوە و ئاگاداری.
وریاکردنەوە: بێدارکردنەوە.
وریایی: زیتی و زرنگی.
وریایی کردن: ئاگاداری کردنی شتێک و پاراستنی.
ورینگ: د. ورنگ.
ورینگە: د. ورینگ.
ورێنگە: دەنگی نەرم و خۆش.
وریشن: د. شتی ورشەدار.
وریشە: ورشە.
وریکلانە: د. وردیلانە.

وزاق: تەکان و هەڵمەت.
وزاق بەستن: وزاقدان.
وزاقدان: تەکاندن و خۆهەڵدان.
وزای: د، خستن.
وزتن: د. ویستن.
وزم: د. دارە ڕەش.
وزە: تەوانایی: ئەم کارە لە (وزە)ی مندا نییە.
وزەنگی: د. ئاوزەنگی.
وزەنگی تەقین: د. ئاوزەنگی تەقین.
وزەنگی لێدان: د. ئاوزەنگی لێدان.
وزەوز: مزەمز و زرنگانەوەی قسە.
وزین: د. فڕێدان.
وژاردن: بژاردن.
وژانن: د. هەڵبژاردن. برژاندن.
وژاو: هـ. واژاو.
وژنگ: د. ئەژنۆ.
وژە: جۆرە دەنگێکە وەک دەنگی بای بەهێز، (وژەوژ) وژەی یەک لەدوای یەک. چوارداری لۆرەلەپ ئاسایین لە ڕانگەی بەرداش دەبەسترێن لەکاتی بردنی بۆ شوێنێکی دوور.
وژەک: هاژەک.
وس: وتەیەکە بەدیەن ناوە و وەکی تر کردارە، واتە بێ دەنگ بە.
وسا: د. وەستا.
وسبوون: بێ دەنگبوون.
وستا: وەستا.
وستان: وێستان.
وستن: د. خواستن.
وستە: د. خوازراو.
وسڵ: مـەلەکـردن لەناو ئاودا، یا ئاوکـردن بەخـۆدا بۆ لابردنی لەشپیسی.
وسمە: شتێکە وەک خەنە ژنان دەیگرنە سەریان بۆ ڕەشکردنەوەی موویان.
وۆش: وتەیەکە کەری پێ ڕادەوەستێنرێ.
وشاردن: گوشین. بریتییە لە ڕاکردن لە ترساندا.
وشت: وتەیەکە سەگی پێ بەردەدرێتە شت.
وشتر: حوشتر.
وشتراو: قەڵبەزەی گەورەی ئاو .
وشترالووک: حوشترخوار.
وشترانە قولقولێ: حوشترانە قولقولێ.
وشترخوار: حوشترخوار.
وشتردانە: د. وشتردیانە.
وشتردیانە: د. جۆرە گەنمێکە.
وشتر قولێ: د. یارییەکی دوو دەستـەییـیـە، دەسـتـەیەک بەپێوە دەوێستن و تۆزێ ملیاندا دەنەوێن، ئینجا ئەودەستەیەی کە سوار دەبن دەڵێن: (وشتر قولێ، وشترانە قولقولێ) و هەر یەکێک خۆی فڕێ دەداتە سەرشانی یەکێک، هەر یەکێک لەو سـواربوونەدا ئەگـەر یەکـەم جـار نەیتـوانی بچـێـتـە کـۆڵی یەکێکەوە، دەستەی ئەو تێ دەکەوێ.
وشترقین: د. بریتییە لە مەردوومی ڕق ئەستوور.
وشتر گاپڵنگ: د. گیاندارێکی گەورەی قاچ و قول و مل درێژی سەر پچکۆلانەی پڵپڵی سمدارە وەک گاجووت، ملی درێژ ترە لە ملی حوشتر (زەرافە).
وشترگەروو: حوشتر گەروو.
وشترمر: د. حوشترمرغ.
وشترمرغ: حوشترمرغ.
وشترەوان: حوشترەوان.
وشتە: وشت.
وشتەی: وشتە.
وشر: دەیەکی هەموو شتێک.
وشک: شتێکە کە تەڕ نەبێ.
وشکامە: د. وشکەوەرد.
وشکان: کـاتـێـکە کـە زەوی تێـدا وشک بـوویـێـتـەوە لەبەر دوورکەوتنەوەی باران. وشکایی.
وشکانی: وشکان.
وشکاوەس: ئاژاڵی قسر.
وشکاوی: گیاندارێکە کە لەناو ئاویش و وشکانیشدا بژی.
وشکایی: شوێنێکە کە تەڕ نەبێ .
وشکایی داهاتن: وشکبوونی ئاوی چەم و کانی و کارێز.
وشکایی هاتن: وشکایی داهاتن.
وشکبوون: زڕبوونی درەخت و سەوزایی و نەمانی تەڕییان. دامان و ماتبوون لە خەفەتدا یا لە تەریقیدا.
وشکبوونەوە: کززبوونەوەی شتی تەڕ. لاوازبوون لەبەر برسێتی یا نەخۆشی.
وشک ساڵ: وشکەساڵ.
وشک کردن: هەڵخستنی بامیە و تەماتە و گەڵێ شتی تر لەبەر هەتاو بۆ وشکبوون و هەڵگرتنی بۆ زستان.
وشک کردنەوە: نەهێشتنی تەڕی شت.
وشکە: دانـەوێڵـەی وشکی نـاومـاڵ: نە تەڕە و نە(وشک)ە لە ماڵمدانییە. ئاژاڵی بێ شیر. دەردێکە لە ئاژاڵی شیردار دەدا و وشکی دەکـا. خـواردەمـەنیـیـەکـە کـە چێـشت نەبێ. بەسـامـاڵێک دەوترێ کـە هەر بـارەی وشک بێ: فـلان کـەس هەر لە (وشکە) واتە پـارەی وشـک دە هەزار دینـاری لەپاش بەجێ ماوە.

وشکەبار: د. میوەی وشکەوەکراو لە هەموو جۆرێک کە بەبار دەبرێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.
وشکە برین: جۆرە برینێکی وشکە وەک بیرۆ هەر کاژ فرێ دەدا.
وشکەپلاو: د. پلاوێکە وەک هەموو پلاوێکی تر برنجەکەی لە ئاودا دەکولێ، ئینجا دەپاڵێورێ و دەکرێتەوە مەنجەڵ و لەسەر ئاگر دەم دەکێشێ بێ ئەوەی ڕۆنی قرچاوی بکرێ بەسەردا، دوای تێکردنی ئینجا پارچەیەک کەرە لەسەر برنجەکە دادەنرێ.
وشکەجاو: خواردنی نان بەوشکی و بەبێ پێخۆر.
وشکەجوو: وشکەجاو.
وشکەچن: وشکە کەڵەک.
وشکەدان: دانەوێڵەی وشک.
وشکەڕن: ڕنینەوەی سەوزایی بە وشکی.
وشکەڕۆ: وڵاخی کەم ڕەوت.
وشکەرۆ: شوێنی دێمەرۆک.
وشکەساڵ: ساڵی کەم باران.
وشکە سۆفی: کەسێکە بەناوی لە خواترسانەوە لە هەموو شتێک سڵ بکا و خۆی بگێڕێتەوە.
وشکەسەرما: سەرمای بێ تەڕ و تووشی.
وشکەسی: ڕێگایەکە کە بەردڕێژ کرابێ.
وشکەڵ: لقی وشکی درەخت. پووچەڵی مێوژ و خورما و لەتکە و هێندێ شتی تر.
وشکەتن: وشکهەڵاتنی گیاندار یا دارودرەخت.
وشکەڵاتوو: گیاندار یا دارودرەختێک کە وشک هەڵگەڕابێ.
وشکەمز: دانی ئاژاڵە بەیەکێک بەنەمر بەبێ ئەوەی کە ڕۆنی لێ وەرگرێ. ڕاگرتنی ڕەنجبەر و جووتیار هەر بەمانگانە بەبێ بەرگ و خواردەمەنی.
وشکەوەبوو: شتێکە کە وشک هەڵگەڕابێ.
وشکەوەبوون: وشکبوونەوە.
وشکەوەرد: وەردێکە کە بەراونەبێ و ئەو تۆوەی کە پێوە دەکرێ هەر بەباران بێتە بەر.
وشکەوەکردن: وشککردنەوە.
وشک هەڵاتن: وشک هەڵگەڕان.
وشک هەڵگەڕان: کزبوون و زەبوونبوونی گیاندار و سەوزایی و دارودرەخت.
وشکەیی: ڕووپامایی، (وشکەیی کردن) ڕووپامایی کردن.
وشکی: وشکایی.
وشوو: گوڵی گەنم و جۆ کە چنرابێتەوە .
وشووگەر: گوڵەوەچن.
وشە: وتە. جۆرە دەنگێکە لە وژە پچووکترە، (وشەوش) وشەی یەک لەدوای یەک.
وشیار: گیانداری وریا.
وشیاربوونەوە: بێداربوونەوە.
وشیارکردنەوە: بێدارکردنەوە.
وشیاری: زیرەکی و ئاگاداری.
وشێردن: وشاردن.
وشی: وشوو. هێشوو.
وشین: گوشین.
وفە: برینێکی پیسە لە چوار پەلی وڵاخی بەرزە یا لەسەر پشتی مەڕ دێ.
ول: دڕکێکە وەک شیلان گوڵی زەرد و سوور دەگرێ. گوڵ (ھ). خونچە (د). وتەیەکە لەدوای وتەی شلەوە دێ: شل و ول، واتە شل و مل (د).
وڵ: کون (ھ). ون (ل).
وڵات: ناوچەیەکە چەند شار و دێیەکی تێدابێ.
وڵاخ: چوارپێیماڵییە کە بزن و مەڕ نەبێ.
وڵاخدار: کەسێکە کە خاوەنی وڵاخی یەکسم بێ.
وڵاخداری: گوزەرانکردن بەهۆی وڵاخ ڕاگرتنەوە.
وڵاشم: د. شتی نەپێچراوەی نەبەستراو.
وڵاغ: وڵاخ.
وڵاغدار: وڵاخدار.
وڵاغداری: وڵاخداری.
وڵاڵە: شتێکی گردی تەختی تەنکە لە تەختە یا لە مقەبا دەکرێ بەدووخا بۆ ڕێکی تەشیلە.
وڵام: د. وەڵام.
وڵاو: د. بلاو.
وڵاوین: د. ماڵین.
وڵایەت: د. وڵات.
ولحێ: د. مەردوومی کەمتەرخەم.
وڵحێ: د. ولحێ.
وڵس: ئاژاڵ.
وڵسات: ماڵات لە ڕەشەوڵاخ و وڵاخی یەکسم.
وڵک: ھ. گورچیلە.
وڵمە: د. گوڵمە.
وڵنگەواز: د. دەستەپاچە.
وڵۆ: د. گوڵبێنەی تەندوور.
وڵۆش: ھ. برویش.
وڵوڵە: هێلکەی نەرمی نەبەکام.
وڵە: گوڵمە گۆشت. مڵە.
ولەرە: ھ. زیوانی ناوخەلە.
ولیرە: د. خلیرە.

ولێفەت: وەڵێفەت.
ولێفەتانە: وەڵێفەتانە.
ولێن: وردکردنی شتی وشک لە دەستدا. هەڵگولۆفتن.
ون: شتی پەنهانی گوم. خوێن (ه).
ونار: دارێکە کون دەکرێ و دەکرێ بەزبانەی ئێرەقاشاشەی جێی تووتنی پێ لێ دەدەن.
ونبوون: بێ سەر و شوێن و نادیاربوونی شت.
ونجر: پارچەی شتی دڕاو. ونجڕونجڕ: شتی لەتوپەت.
ونی: ه. خوێن.
ون: ه. خوێن.
وە: پیتی بەستنەوە (عطف) دەکەوێتە ناوەندی دوو وتارەوە کە پەیوەستی زۆر لە ناوەندیاندا نەبێ. بە: (وە) چەند، واتە (بە) چەند.
وەتاخ: وەتاغ.
وەتاغ: دیواخان.
وەتراخ: دارێکە ئاسنێکی تیژ بە سەرێکیەوەیەتی، بازەوان دایدەچەقێنێ بۆ ئەوەی بازەکەی بەسەرەوە بنیشێتەوە.
وەتراخچی: کۆنەفرۆش.
وەتووزبوونەوە: خلبوونەوە.
وەتە: د. گون.
وەتەبا: د. قۆڕی گون.
وەتی: د. ئەوەتی.
وەج: با. قازانج، کەڵک: فلان کەس بێ وەجە، واتە بێ کەڵکە. نرخ.
وەجاخ: ئاگردان، بریتییە لە منداڵی نێرینەی مەردووم.
وەجاخدار: وەجاخڕوون.
وەجاخڕوون: کەسێکە کەدوای خۆی منداڵی نێرینەی باشی ببێ.
وەجاخزادە: منداڵی پیاوی گەورەی خانەدان.
وەجاخکوێر: بریتییە لە کەسێک کە دوای خۆی کوڕی نەبێ.
وەچ: خەڵفی پچکۆلەی بن لقی درەخت و سەوزایی. نەوەی نەوەی مەردووم. سوود (د). بەهرە (د).
وەچە: نەوە .خەڵفی درەخت و سەوزایی.
وەح: وەحە. پیتی سەرسووڕمان (ز).
وەحە: وتەیەکە کە ڕەشەوڵاخی پێ لێ دەخوڕن (وەحەوەح) وەحەی یەک لەدوای یەک.
وەخت: بەخت: ڕەشە (وەخت)م. کات .
وەختار: د. کات: وەختارێک هاتیت.
وەختاوەخت: لە وەختێکەوە بۆ وەختێکی تری وەک خۆی: من وەختاووەخت نان دەخۆم، واتە نیوەڕۆ و نیوەڕۆ یا ئێوارە و ئێوارە.
وەختا وەخت: کات کات.
وەختە: بەختە.
وەر: خۆر (ه). پیتێکە بەمەعنا خاوەن: جانە(وەر)، پەلە(وەر) واتە خاوەنی جان و پەل = پەڕ. تەختەیەکە لە قوتابخانەدا دەرسی لەسەر دەنووسرێ.
وەراز: ل. بەراز.
وەرام: پاسخ. مەبەست و مەرام.
وەرامدانەوە: پاسخ دانەوە.
وەرامین: د. نانی گەنم و جۆین.
وەراندن: خستنەخوارەوەی بەر و گەڵای درەخت. هەڵوەراندنی هەنار.
وەرانن: وەراندن.
وەرب: ه. بەفر.
وەرپێچان: با. پێچانەوە.
وەرپێچک: با. نۆردوو.
وەرتە: شتی ناونجی نە زلی نە پچووک. وتەیەکە دەوترێ بەگای جووت لەکاتێکدا کە لە هێڵ لابدا بۆ لای زەوی نەکێڵراو، بۆ ئەوەی کە ڕوو بکاتەوە کێڵگەکە. تاکە قاڵیەکی پڕ بەژوور.
وەرجس: د. وەرزش.
وەرچەرخان: هەڵگەڕانەوە بەملا و بەولادا.
وەرچەرخین: وەرچەرخان.
وەرد: زەوی دووجار کێڵراو. هەڵتەکاندنی کۆلۆشی ژێر پێی گاگێرە.
وەردبڕین: کیلانی زەوی جاری دووهەم.
وەرددانەوە: وەردبڕین.
وەردەک: ز. مراوی.
وەردە و یەخسیر: بریتییە لە هەست و نیستی ناوماڵ: (وەردە و یەخسیر) یان بردم .
وەردیان: پاسەوانی بەندیخانە.
وەردێنە: جۆرە دەردێکە تووشی چاوی منداڵ دەبێ. گیایەکی بەهارییە گەڵایەکی خڕی پانی هەیە گوڵێکی سپی دەگرێ تۆوەکەی وەک نیسکی هاڕراو سوورە، بەگەرم کراوی دەخرێتە ناو مەندیلێکی پاک و دەخرێتە سەرچاوی وەردێنەدار دەیتەقێنێ و چاکی دەکاتەوە.
وەڕاز: گۆخڵ (با). ناوی دێیەکە لە شارباژێڕ.
وەڕز: وەڕس.
وەرزی کردن: یادکردنی شتێک.
وەڕس: جاڕس، (وەڕسبوون) جاڕسبوون، (وەڕسکردن) جاڕسکردن.
وەڕست: وەڕس.

وەڕووڕێک: د. منداڵی تازە پێ گرتوو.
وەڕوەڕە: ڕەوڕەوە.
وەڕوێرک: د. وەڕوێرکە.
وەڕوێرکە: وەڕووڕێک. دەست.
وەڕە: گەفەی سەگ، (وەڕەوەڕ) وەڕەی یەک لەدوای یەک.
وەڕەز: وەڕس.
وەڕین: گەفینی سەگ.
وەرز: زەمینێکە کە کێڵرابێ و تۆوی پێوەکرابێ. بریتییە لە ساڵێک: دوو (وەرز)ە ڕەنجبەرم، واتە دوو ساڵە. زەوییەکە کە کرابێ بەکاڵەک و ترۆزی دێم (ز).
وەرزش: وەرزشت.
وەرزشت: چەند جووڵاندنەوەیەکی تایبەتی پەلوپۆی ئەندامە بۆ لەشساغی دەکرێ.
وەرزشەوان: کەسێکە لە وەرزشدا شارەزا و کارامەبێ.
وەرزیار: وەرزێر.
وەرزیاری: وەرزێری.
وەرزێر: سەپان.
وەرزێری: سەپانی.
وەرزین: جووڵان.
وەرسووڕان: وەرچەرخان.
وەرشاو: جۆرە کانێکە وەک زیو سەماوەر و قاپ و قاچاخی لێ دروست دەکرێ .
وەرشەو: وەرشاو.
وەرکۆڕیە: هـ. بەرخی ساوا.
وەرکەمەر: بەرکەمەر. بەردێکی گەورەیە لە شاخ کە ژێری هەڵوڵ بێ و لە کاتی باراندا شوان و ڕێبوار دەچنە ژێری.
وەرکەفتن: وەرکەوتن.
وەرکەوتن: پاڵکەوتن.
وەرگ: هـ. گورگ.
وەرگان: هـ. گەلەگورگ.
وەرگر: کەسێکە شت وەربگرێ لە مەردووم.
وەرگرتن: گرتنی شتێک بەدەست لە یەکێک. باوەڕکردن بەشتێک و جێگیربوونی لە دڵدا: دەرسەکەت باش (وەرگرە).
وەرگەڕان: وەرچەرخان. لادان لە بیروباوەڕێک.
وەرگەشەوێ: گورگێکە کە بەشەو بگەڕێ بۆ مووشە.
وەرگێڕ: وەرد. کەسێکە کە نووسراوێک لە زمانێکەوە بباتە سەر زمانێکی تر (مترجم).
وەرگێڕان: هەڵگێڕانەوەی شت. تەرجەمەکردن.
وەرگێڕانەوە: د. هەڵگێڕانەوە.
وەرگێڕکە: وەڕوێرکە.
وەرگێڕ و داگێڕکردن: خوار و ژوورکردن بەشتێک.
وەرم: هـ. خەو.
وەروە: هـ. بەفر.
وەروەر: جۆرە دەمانچەیەکە.
وەروەرە: بەفرماڵ.
وەروەماڵ: هـ. بەفرماڵ.
وەروەوە: هـ. بەربەرۆک.
وەرە: هـ. بەرخ.
وەرەتاو: هـ. خۆرەتاو.
وەرەستا: د. وەقف.
وەرەق: د. سیخوار.
وەرەم: دەردەباریکە.
وەرەمدار: کەسێکە تووشی دەردەباریکە بووبێ.
وەرهەم: د. ئاوسان. وەرەم.
وەرێس: هـ. گوریس.
وەریسک: با. گوریس.
وەریس: ز. گوریس.
وەرین: کەوتنە خوارەوەی گەڵا و بەری درەخت و هێندێ شتی تر. کۆن (هـ).
وەز: هـ. بەر.
وەزن: وەزند (د)، بارووتدانێکە کە ڕاوچی لەگەڵ خۆی دەیبا بۆ ڕاو.
وەزند: زیان.
وەزنە: سەنگی شت کێشان. ناوی دێیەکە لە لاجانی موکریان.
وەزە: د. پێوەدانی مار و دووپشک. ئازار.
وەزەرای: هـ. دابەزین.
وەزەمەژگلێ: هـ. گیایەکە گەڵاکەی لە گەڵا بێ دەچێ، شیرینە و دەخورێ.
وەزەند: وەزند.
وەزنی: د. وەزند.
وەزەوان: هـ. کەسێکە کە باش بەدار گوێزدا هەڵبگەڕێ.
وەزەوای: هـ. جۆرە کولێرەیەکە هەویرەکەی لەگەڵ گوێزی کوتراودا تێک هەڵدەشێلرێ.
وەزی: هـ. گوێز.
وەزیر: کار هەڵسووڕێنەری دەوڵەت دوای پاشا و سەرەک کۆمار.
وەزیری: ز. جۆرە هەنجیرێکی دەنک گەورەی زۆر خۆشە.
وەژارە: د. پەژارە.
وەزین: بەزین و کۆڵدان. دابەزین.
وەژەب: د. بست.
وەژینگ: وەنەوز.

وەس: د. بەس.
وەسا: بەم ڕەنگە (با). وەستا .
وەسان: وەستان، هەروەها (ز).
وەسایە: با. وایە.
وەستا: کەسێکە کە لە کارێکدا پسپۆڕ بێ.
وەستان: ڕاوەستان بەپێوە. لە جووڵەکەوتن: سەعاتەکە یا ئاوەکە (وەستا). ماندووبوون: ئەوەندەم کار کردووە (وەستا)وم.
وەستاندن: بەپێوە ڕاگرتنی شت. لە جووڵەخستنی شت. ماندووکردنی شت.
وەستانەوە: گیرسانەوەی خوێن و دڵۆپەی بنمیچ.
وەستایی: پسپۆڕی لە کارێکدا.
وەستیان: با. وەستان. ماندوێتی.
وەسە: واتا، وەکو.
وەش: وتەیەکە کەری پێ ڕادەوستێنری. خۆش (ه).
وەشان: بڵاوکردنەوە.
وەشاندن: چاندنی دانەوێڵە و تۆ بەزەوییەوە. لێدان: فیسار کەس دەست (دەوەشێنێ). درێغکردن لە دانی شت بەمەردووم: فیسار کەس هیچ (ناوەشێنێ) لە کەس، واتە درێغی لێ ناکات.
وەشانن: وەشاندن.
وەشانەوە: وەشینەوە.
وەشت: دەستەراستێکی ڕۆژهەڵاتی (جنوبی شرقی): بای (وەشت) بەبارشتە .
وەشڵە: ه. خۆزگە. جوانکەڵە.
وەشە: وەشێکە کە بەکەر دەوترێ.
وەشیاگ: د. زەمینێکە کە تۆوی پێوەکرابێ. تۆوێکە کە وەشێنرابێ.
وەشیان: د. بڵاوبوونەوە.
وەشیانەوە: وەشینەوە.
وەشێن: کەسێکە کە دەست بوەشێنێ: فلان کەس دەست (وەشێنە).
وەشینەوە: گونجانی کارێک لە یەکێک و لە بارابوونی: ئەم کارە لە تۆ (دەوەشێتەوە) یا (ناوەشێتەوە).
وەفر: بەفر.
وەفرە: بافرە.
وەقرە: دان بەخۆداگرتن.
وەقە: حۆقە.
وەقی: ز. وەقە.
وەک: پیتی تشبیە کردنی شتێک بەشتێکی تر: نەریمان (وەک) شێر وایە.

وەکار: بەکار.
وەکشین: کشانەوە: وەکشێ واتە بکشێرەوە.
وەکو: وەک.
وەکی: وەکو.
وەگلۆزبوون: گلۆزبوونەوە. تلخواردن .
وەل: وێڵی سەرگەردان.
وەڵام: وەرام.
وەڵامدانەوە: وەرامدانەوە.
وەڵامە: شرح و تەفسیر.
وەلبوون: سەرگەردان بوون.
وەڵک: ه. گەڵا.
وەڵکرد: هەڵکردن و گوزەران.
وەلە: وتەیەکە کە گوێرەکەی پێ بانگ دەکرێ.
وەلەک: داردەستێکە کە سەرێکی دووپەل بێ.
وەلێ: بەڵام. هەروا (ز).
وەڵیفەت: پاداشێکە دەدرێ بەوەدەمدار لەپاش چاکبوونەوەی نەخۆش.
وەڵیفەتانە: وەڵیفەت.
وەم: وتەیەکە وەک (وام): (وەم)زانی واتە وامزانی.
وەن: داری قەزوان (ه). بەند: بازی (وەن) واتە بازی بەند.
وەناق: دەردێکە لە قورگدا پەیا دەبێ و زۆرتر مەردووم دەخنکێنێ.
وەنجەنە: ه. بەندەخوێن.
وەند: ئازار و ئێش. لاوچاک: کوڕی (وەند).
وەندەن: ه. پردێکە لە لقی مێو دروست دەکرێ بەسەر ڕووبار یا بەسەر دۆڵێکدا.
وەنگ: د. جومگە.
وەنگە: د. بەندە.
وەنەتەق: درەختێکی پچکۆلەیە بەرێک دەگرێ وەک قەزوان، بەڵام ئەم وردتر و ناسکترە.
وەنەمشک: وەنەتەق.
وەنەوز: خەوەنوچکێ.
وەنەوزبردنەوە: نووچبردن بەدەم خەوەوە.
وەنەوزدان: وەنەوزبردنەوە.
وەنەوزە: وەنەوز.
وەنەوزەکوتێ: وەنەوزدان.
وەنەوش: قەزوان (ل). وەنەوشە.
وەنەوشە: گیایەکی بەهاری بۆن خۆشە گوڵێکی مۆری بۆنخۆش دەگرێ.
وەنەوشەیی: شتێکە کە ڕەنگی وەک ڕەنگی وەنەوشە وابێ.

وەنەوشیلە: بنەوشیلە.
وەنەوڵە: بەندۆکە.
وەنی: هـ. قەزوان.
وەو: بەو.
وەوڵە: د. بووکی منداڵانە.
وەڵەبارانێ: د. بووکە بەبارانێ.
وەوی: ز. بووک. وەوڵە.
وەویلە: د. وەوڵە.
وەویلەبارانێ: وەوڵە بارانێ.
وەهـ: وتەی سەرسوڕمان.
وەها: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ پێ نیشاندانی چۆنێتی کارێک بەیەکێک: ئەم کارە (وەها) بکە.
وەهار: د. بەهار.
وەهـ وەهـ: بەهـ بەهـ.
وەی: زیان: فیسار کەس بێ (وە)یە، وتەیەکە لەکاتی ئازار یا ترسدا دەوترێ. ئیسمی ئیشارەی نزیکە: (وەی) جۆر پێم ئامان واتە (وام) لێ هات. پیتی سەرسوڕمان (ز).
وەیخرە: د. بریتییە لە مەردوومی شەڕەنگێز.
وەیش: وتەیەکە لەکاتی ئازارێکدا دەوترێ.
وەیشومە: بەفر و باران و سەرما و تۆف.
وەیلان: د. ئاوارەی سەرگەردان.
وەیووڵە جنانێ: هـ. گێژەڵووکە.
وەیووڵێ: وەوڵە.
وەیوە: هـ. تازەبووک.
وەیەنە: هـ. قووڵینە.
وەیەوگەڕێن: د. خێرێکە کە بکرێ بۆ گێڕانەوەی بەڵایەک.
وێت: خۆت (هـ). وتەیەکە هەمیشە لە دوای وتەی شێتەوە دێ: شێت و (وێت).
وێتان: هـ. خۆتان.
وێجا: ئینجا.
وێچن: هـ. بێژنگ.
وێچوون: ڕێ تێچوون: ئەم قسەیە وێ دەچێ وابێ، واتە ڕێی تێ دەچێ.
وێدان: پێدان.
وێر: پارەدان بەشتێک بۆ کەسێک بەپیاوەتی، (وێرکردن) وێر.
وێرا: لەگەڵ.
وێران: شوێنی ڕووخاوی کاول. پرکێشی و نەترسان: فیسار کەس (دەوێرێ) یا نا(وێرێ). پەرێشـان: چاوم (وێرانە). سـیل (ز).
وێرانبوون: کاوولبوون.
وێرانکردن: کاولکردنی شوێنێک.
وێرانە: کەلاوە.
وێرانی: کاولی و ڕووخاوی شوێنێک.
وێرت: د. لەوەڕگا.
وێرد: د. کێرد.
وێردن: د. تێپەڕین.
وێردە: د. ڕابوردوو.
وێڕ: بوار (هـ). مەعنا و مەبەست (د).
وێڕا: لەگەڵ.
وێرغە: یەرغە، (وێرغەکردن) یەرغەکردن.
وێرەگە: هـ. ئێوارە.
وێرێ: با. ئەوێ.
وێرێنگە: گیایەکی پنجداری کوێستانییە بۆ زستانی ئاژاڵ دەکرێ بەتفاق.
وێرین: ز پرکێشی و نەترسان.
وێزە: گیان و جەستە: بەدار هاتە (وێزە)ی واتە شلکوتی مەرگی کرد.
وێژ: د. بێژ.
وێژامبەر: د. وێژانبەر.
وێژان: وتن.
وێژانبـەر: دارێکی چەمـاوەیە بە(وێژە) دەبەسـترێ بەناوەڕاستی نیلی جووتەوە.
وێژاندن: قسەکردن.
وێژنگ: وەنەوز: فلان کەس وێژنگ دەدا.
وێژنە: د. بوێژ. گۆیندە.
وێژە: زویلی چەرمی خـۆشکراوە. (وێژانبـەر)ی پێ دەبەسـترێ بەنیلەوە. ئەدەبی خوێندەواری (د). شیعر (د). قسە (د).
وێژەر: د. ئەدیب. شاعیر. قسەکەر.
وێژەن: هـ. بنێشت.
وێژەوان: وێژەر.
وێژباگ: د. بێژراو.
وێژەیی: ئەدەبی.
وێساک: د. وێستاو.
وێسان: وەستان.
وێساندن: وەستاندن.
وێسانن: وێستاندن.
وێساو: وێستاو.
وێستان: ڕاوەستان بەپێوە. لە جووڵە کەوتن.
وێستاندن: بەپێوە ڕاگرتنی شتێک. لە کارخستنی شتێک.
وێستانن: وێستاندن.

ویستانەوە: وەستانەوە.
ویستاو: شتێکە بەپێوەبێ. شتێکە نەجوولێ.
ویستن: پێویستی یەکێک بەشتێک.
ویسە: د. ئیست.
ویش: هـ. خوێ.
ویشان: هـ. خۆیان.
ویکچوون: بوونی دوو شت بەجۆرێک کە لەیەک بچن.
ویکردنەوە: تۆڵەکردنەوە.
ویکرا: تێکرا.
ویککەوتن: یەککەوتن.
ویکەوتن: لێکەوتنی دوو شت. ویککەوتن. سـۆراخکردن و پۆستکەندە کردنی شت.
ویڵ: ڕەوشت و خووی باش: فیسار کەس بە(ویڵ)ە. گیانداری ئاوارە. شەرم (ل).
ویڵبوون: ئاوارەبوون. ونبوون.
ویڵکردن: ئاوارەکردن. ونکردن.
ویلنگە: گیایەکی کوێستانییە لە لۆ دەچێ، گزرە دەکرێ بۆ ئاژاڵ.
ویڵی: ئاوارەیی.
ویم: هـ. خۆم.
ویمان: هـ. خۆمان.
وینا: د. بیرکەوتنەوە.
ویناکردن: د. سۆراخکردن. کەوتنەوەبیر.
ویناییی: د. بیناییی.
وینجە: سێپەڕە.
ویندەرێ: ئەوێ.
وینە: مانەند: لە (وینە)ی ئەمەم نەدیوە. فۆتۆغراف. قوولینە (د). دێیەکە لە ناوچەی پێنجوین.
وینەکار: وینەگر.
وینەکاری: خەریکبوون بەگرتنی وینەوە.

وینەکردن: بیرکەوتنەوەی دیمەنێک بەنەناسراوی، یەکێک دەبینیت و ناینا‌سیـتەوە، بەڵام شێوەی دەکـەیت، ئەویش دەڵێ: نامناسیت؟ تۆش دەڵێیت: نەوەڵڵا بەڵام وینەت دەکەم، واتە وینەیەکی وەک تۆم دیوە بەڵام ناچمەوە سەری.
وینەگر: کەسێکە کە بەماکینە وینەی شت بگرێ.
وینەگرتن: گرتنی وینەی شت بەماکینە.
وینەگری: فێربوونی وینەگرتن و کردنی بەپیشە.
وینەگەر: وینەگر.
ویوولْ: دارێکی باڵا بەرزە وەک چنار گەڵای وەک مازوو دار وایە بەڵام ئەم ڕەشتر و پچووکترە، جەوت و بەڕووی تاڵ دەگرێ.
وی: وەی. بی (هـ).
ویی: هـ. خۆی.
ویاردە: هـ. ڕابوردوو.
وییان: هـ. خۆیان.
ویتەویت: دەنگی جووجەڵەی مریشک و بەچکە کەو.
ویر: د. بیر و یاد. بیری ئاو.
ویرە: دەنگی گـریانی نەرمی منداڵ، (ویرەویر) ویرەی یەک لەدوای یەک. دەنگی هاویشتنی بەرد و دار.
ویرەویرکردن: گیرەگیرکردن و زۆر لە شت ڕۆین.
ویرە: د. بیرکردنەوە.
ویزویزە: جۆرە قالۆنچەیەکی سەوزی باڵدارە لە فریندا دەویزێنێ.
ویزە: دەنگێکە وەک دەنگی باڵی ویزویزە، (ویزەویز) ویزەی یەک لەدوای یەک.
ویس: هـ. بیست.
ویقاندن: واقەکردن.
ویقە: واقە.
ویکۆڵ: هـ. بیکۆڵ.
وینا: د. بینا. کونێکە کە تەماشای شتی پێ بکرێ بۆ بینین.
ویناییی: د. بیناییی.



ه: پیتێکه دەبێ بەسەر بۆ پیتەکەی پێش خۆی: و(ە)ر(ە) د(ە)ر(ە)و(ە). (ضمیری مفرد)ی (مذکر) و (مؤنث)ی غائبه: نەریمان زیرەک(ە) و ئەختەر زرنگ (ە).

ها: هانێ. وتەی بێدارکردنەوە: (ها) هەرگیز قسه بەگەورەتر له خۆت نەڵێیت. ئاها. بەڵێ (ز) وا: (ها) له ماڵەوە، واته وا له ماڵەوە.

هاپۆ: ز. مام.

هات: بەخت و نگینی باش: فیسار کەس (هات)یتی. بەدوای هێندێ وتەوە دەنرێ و دەبێ بەنیشانەی (جمع): دێ (هات) میوه (هات).

هاتن: جوڵانی گیاندار له جێی خۆیەوە بۆ لای تۆ. هەرەسهێنان: دیوارەکە (هاتووە).

هاتن بەخۆدا: بووژانەوە و قەڵەوبوونی گیاندارێک: فیسار کەس هاتووە بەخۆیدا، واته جاران لەڕ و لاوازبوو ئێستا قەڵەو و جوان بووە.

هاتن و چوون: هاتوچۆ.

هاتنەبا: ئارەزووکردنی سەگ و بەراز و پشیلەی مێ بۆ نێرەیان.

هاتنەبەر: گەورەبوونی سەوزایی و بەرزەدرەخت بەجۆرێ کە بەر بگرێ.

هاتنەبەربار: بریتییه له ڕامبوون و سەر نەرمبوونی یەکێک بۆ کارێک.

هاتنەخوار: دابەزین.

هاتنەدەر: دەرچوون له ژوورەوە.

هاتنەدی: پەیدابوونی شتێک کە چاوەڕوان کرابێ لەپێش بوونیدا.

هاتنەرێ: دووچاربوون بەشتێک: فیسار کەس ئەوەی لێی دەترسا (هاتەرێی).

هاتنەسۆ: د. هاتنەسوێ.

هاتنەسوێ: پەیدابوونی ئازار له شوێنێک .

هاتنەسەر: چوونی یەکێک بۆ سەر یەکێک بەهەڕەشەوە یا بەگلەیییەوە.

هاتنەسەرچۆک: بەچۆکداهاتن و لەسەر ئەژنۆ دانیشتن.

هاتنەسەرڕا: هاتنه بەربار.

هاتنەسەرشەک: لەسەر چۆک دانیشتن و قوتبوونەوە. وێستانی میچی قاپێن لەسەر شان.

هاتنه سەر کلک: وەستانی مار لەسەر کلک.

هاتنه کڕین: بوونی شت بەجۆرێک کە بکڕێ: فلان شت له کڕین نایەت، وانە ئەمەندە گرانە ناکڕدرێ، یا فیسارە شت هاتۆتە کڕین.

هاتنەلا: هاتنی یەکێک بۆ لات.

هاتنەوە: هاتنی شتێک بۆ شوێنێک جاری دووەم.

هاتنەوەیەک: پچووکبوونەوەی دەمی شت: برینەکە دەمی هاتۆتەوە یەک.

هاتنەهەی: لەخۆگۆڕان بەهۆی شتێکەوە: بەم ئۆتۆمۆبێلەوە فیسار کەس چاک (هاتووەتەهەی).

هاتوچۆ: ئامشۆکردن له شوێنێکەوە بۆ شوێنێک چەند جارێک.

هات و نەهات: شتی دوو بەختییە کە ئاکامی دیار نەبێ: سەفەرەکەم ڕێی (هات و نەهات)ە.

هاته: د. هات و ئامەد.

هاتهات: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتێکدا کە شتێک باسی هاتنی لەناودا بێ و کەچی هەر نەیەت.

هاتەهات: هات هات.

هاتی: ساڵی خۆشی بەپیت و برشت.

هاج: وتەیەکە هەمیشە لەدوای وتەی (هار)ەوە دێ: هار و (هاج).

هاج و واج: د. مەردوومی مات و سەرگەردان.

هار: گیاندارێکە تووشی دەردی هاری بووبێ، (هاربوون) دووچاربوون بەدەردی هاری. بریتییە له گیانداری بزێو. بەرداش.

هاراسیاو: هـ. بەرداش.
هارت و هووت: د. هاش و هووش.
هارد: هـ. ئارد.
هاڕاندن: زۆر بەتوندی هاوارکردن.
هاڕاوە: هاڕڕاوە.
هاڕڕاو: شتێکە کە هاڕرابێ .
هاڕراوە: شتێکە کە زۆر ورد هاڕرابێتەوە بەدەسکەوان.
هاڕە: دەنگێکە وەک دەنگی ئاوێکی زۆر کە هەڵبڕژێتە خوارەوە، (هاڕەهاڕ) هاڕەی یەک لەدوای یەک.
هاڕەکردن: ڕووخانی شوێنێکی بەرز بەجۆرێ کە هاڕەی لێوەبێ.
هاڕیاگ: د. هاڕڕاو.
هاڕیان: د. وردبوون.
هاڕیاو: د. هاڕڕاو.
هاڕیە: هاڕییە.
هاڕین: وردکردنی دانەوێڵە بە بەرداش یا بەدەستاڕ.
هاڕینەوە: وردکردنی شت بەدەسکەوان.
هاڕییە: جۆرە کرمێکی بۆرکەڵەی کورتەڵەیە شینایی دەخوا.
هاروو: پووک (هـ). خەیار.
هارووژان: وروژان.
هار و هاج: گیانداری زۆر چەتوون.
هاروێ: خەیار.
هارە: د. بەرداش. دەستاڕ.
هارەگل: دەستاڕ. (هـ) بەردێکی پانی گەورەیە دانەوێڵەی لەسەر دادەنرێ و بەبەردێکی تر وردەدەکرێ.
هاریکار: یاریدەدەر.
هاریکاریی: با. یارمەتیدان.
هاریی: دەردێکی پەرەسێنە دەگا بەسەگ و گورگ و ئەو گیاندارەی کە ئەمان بیگەزن. چەوتوونی. یاریدەدان (ز).
هاز: کاردوو.
هازەپەلک: جۆرە کاردوویەکە گەلاکانی پەل پەلە.
هازەخووگانە: جۆرە کاردوویەکە ناخورێ.
هازەڕەشە: جۆرە کاردوویەکی گەلا پانە نێرکێکی بەرزی ڕەشی هەیە. گەلاکەی دەکرێ بەیاپراخ.
هازەکوڕانە: جۆرە کاردوویەکە گەلای وەک گەلای قامیش وایە.
هازەکوڕە: هازەکوڕانە.
هازەمارانە: جۆرە کاردوویەکی گەلا لوولە.
هاژ: د. مەردوومی سەرسامی واق ورماو.
هاژۆتن: با. لێخوڕین.
هاژ و واژ: د. هاج و واج.
هاژە: دەنگێکە وەک دەنگی ڕەشەبا و درەختی گەورە کە با بیشەکێنێ، (هاژەهاژ) هاژەی یەک لەدوای یەک.

هاژەک: صاروخ.
هاژەکردن: دەنگی هاژەی شتێک کە لە بەرزییەکەوە بکەوێتە خوارەوە.
هاژیان: هاژین.
هاژێڵە: د. کووژەکە.
هاژین: هەناسەبڕکێ لەبەر ماندوویەتی.
هاس: هاز.
هاسان: ئاسان.
هاشرمە: شتێکی پانە لەدوای کورتان و زینەوە دەکەوێتە سەر کولۆکی ولاخ.
هاشوهووش: درۆ و دەلەسەی قەبەی بێ جێ.
هاشە: خۆهەڵکێشان بەقاڵەی دەم .
هاشەکەر: کەسێکە کە هاشەوهووشەی زۆربێ.
هاشەوهووشە: هاشوهووش.
هافڕ: با. ئاخوڕ.
هاڤاڵ: ز. هاوەڵ.
هاڤل: ز. بەروبوومی کردەی ئادەمی.
هاڤە: ز. ئەوێ.
هاڤێتن: با. هاویشتن.
هاڤیل: ز. شتی بێ کەڵک.
هاڤێن: با. هاویشتن.
هاکا: وتەیەکە نزیکی بوونی شتێک دەگەیەنێ: (هاکا) ڕۆژبووەوە.
هاکۆ: قسەکردن یا کارکردن لەبەر بوورە. تۆ هەر لە(هاکۆ)قسە دەکەیت.
هاڵ: ئاڵێکە کە وەک شەوە تووشی زەیستان دەبێ. شوێنێکی سەختی بەرزە کە لەبەر بەرزی سەری تێدا گێژ بخوا (د). ڕێگی بیابان (د). ئەشکەوت (د). ڕەنگی ئاڵ. حاڵ.
هالا: د. هەواڵ. هانا و پەنابردن.
هالان: تێکئالان.
هالاو: هەڵمی گەرمی.
هاڵبردنەوە: ئاڵبردنەوە.
هاڵبووەنەوە: ئاڵبوونەوە.
هاڵۆ: د. کێتەڵەی دووقوڵف.
هاڵوبلاڵووک: د. هاڵەبەلاڵووک.
هاڵوبەلاڵووک: هاڵوبلاڵووک.
هاڵوێنکردن: خۆشەکردنی هیزەی ڕۆن بەدۆشاوی توو.
هاڵە: بەرسیلە. برینێکی پیسی سپی واشە دەگا بەزێی ولاخی بەرزە ئاتەشەک. ناوی دێیەکە لە ناوچەی بازیان.
هاڵەبەلاڵووک: دارێکە وەک هەڵووژە زەردە، بەرێکی سووری مزردەگرێ.

هاڵەپرووز: د. گۆشتێکە کە هەڵپرووزابێ و ناوەکەی هێشتا کاڵ بێ.
هاڵەژێر: د. هاڵەژێڵ.
هاڵەژێڵ: د. ژێڵ.
هاڵەکۆک: هەڵەکۆک.
هاڵەوبوون: د. ئاڵبوونەوەی دان. هێمن بوونەوەی گیاندار.
هاڵەوکردن: د. هێدی کردنەوە و تەسکینی دان.
هاڵی: د. خاڵی.
هام: وتەیەکە بۆ هاودەمی و هاوکاری دوو گیاندار بەکاردێنرێ: (هام)سەر، (هام)ڕاز، (هام)ڕێ.
هامار: د. زەوی تەخت.
هاماری: د. تەختایی.
هاماو: د. هەموو.
هامڕا: هـ. هاوڕێ.
هامڕاز: هاوڕاز.
هامڕازی: هاوڕازی.
هامڕایی: د. هاوڕێیی.
هامزاد: بەدوو کەس دەوترێ کە لە یەک دەمدا لەدایک بووبن.
هامزار: هاودەم.
هامسا: هاوسێ.
هامسایی: دراوسێتی.
هامسەر: هاوسەر.
هامشۆ: هاتوچۆ بۆ لای یەکێک.
هامشیر: هاوشیر.
هامشیرە: هاوشیرە.
هامن: هـ. هاوین.
هاموشۆ: هامشۆ.
هامێز: باوەش.
هانا: شالاو و تکا. هیوا و ئومێد.
هانابردن: پەنابردن.
هاندان: پڕکردنی یەکێک لە یەکێک و تیژکردنی بۆ زیان پێ گەیاندنی.
هانکەهانک: هەنکەهەنک.
هانە: هـ. کانی.
هانەدرۆزنە: کوێرەکانی.
هانەهانەدان: هاندان.
هانێ: وتەیەکە بەدیمەن ناو و، وەکی تر (فعلی امر)ە: (هانێ) واتە بگرە.
هانین: هێنانی شتێک بۆ لات.
هانینەوە: هێنانەوەی شتێک بۆ شوێنێک جاری دووەم. بردنەوەی جومگەی لە خرتکەچوو بۆ جێی خۆی.
هاو: د. هام.
هاوار: بانگی بەرز لە تەنگانەدا بۆ فریاکەوتن، (هاوارهاوار) هاواری یەک لەدوای یەک. ناوی دێییەکە لە ناوچەی هەڵەبجە.
هاواربردنەبەر: هاواربردن بۆ یەکێک کە فریات کەوێ.
هاوارکردن: بانگکردن بە بەرزی لەکاتی تەنگوچەڵەمەدا.
هاوارکەر: کەسێکە کە هاوار بکا.
هاوار و بانگ: هاوارکردنی یەکێک بۆ ئەوەی خەڵق بەدەنگییەوە بچن.
هاوان: دەفرێکە شتی تێدا دەکوترێ.
هاوانتە: ئاوانتە.
هاوانتەچی: ئاوانتەچی.
هاواڵ: هاوڕێ.
هاوبەش: شەریک.
هاوبەشی: شەراکەت.
هاوپا: د. هاوپایە.
هاوپشت: ئاوپشت.
هاوپشتە: هاوپشت.
هاوپەیمان: چەند کەسێکن کە سوێندخۆری یەک بن.
هاوتا: دوو شتن کە وەک یەک وابن.
هاوتەحر: دوو شتن کە لە دیمەندا وەک یەک وابن.
هاوتەک: هاوڕێ.
هاوتەمەن: دوو کەسن کە لە عومرێکدا بن.
هاوتیرە: بەدوو کەس دەوترێ کە لەیەک تیرەبن.
هاوجفت: د. هاوتا.
هاوجۆر: هاوتەحر.
هاوجووت: هاوتا.
هاوچاخ: کەسێکە کە لە ژیانی تۆدا ئەو ژیابێ.
هاوچڕە: د. کەسێکە کە لە گۆرانی وتندا بۆت بسێنێتەوە.
هاوچەرخ: هاوچاخ.
هاوچەشن: هاوتەحر.
هاوخۆراک: کەسێکە هەمیشە لەگەڵتابێ لە نانخواردندا.
هاوخەف: د. هاوسەر.
هاودەرد: دوو کەسن کە بەدەردێک گرفتاربن.
هاودەم: دوو کەسن کە هەمیشە پێکەوە بن و هاوڕازی یەک بن.
هاودەمی: هاوڕێیی.
هاودەنگ: ئاودەنگ.
هاودەنگی: ئاودەنگی.
هاوڕاز: کەسێکە کە نهێنی دڵی خۆی لەلات بکاتەوە.
هاوڕوو: د. ئابڕوو.

هاوڕێ: کەسێکە کە لە ڕێڕەودا لەگەڵتدا بێ.
هاوڕێگە: د. هاوڕێ.
هاوڕێیەتی: بوونی دوو کەس بەهاوڕێ.
هاوڕێیی: هاوڕێیەتی.
هاوزا: د. مامزاد.
هاوزاوا: د. ئاوەڵزاوا.
هاوزبان: هاوزمان.
هاوزکە: د. مندالّی دووانە.
هاوزگ: هاوزکە.
هاوزگە: هاوزکە.
هاوزمان: کەسێکە بەزمانی تۆ قسە بکات.
هاوزە: هاوتەمەن.
هاوزێ: هاوزید (د). هاوتەمەن.
هاوزێد: د. هاونیشتمان.
هاوسا: ل. دراوسێ.
هاوساڵ: بەدوو کەس دەوترێ کە لە ساڵێکدا بووبن.
هاوسایی: دراوسێتی.
هاوسەر: ژن و مێرد.
هاوسەر کەمی: بوونی یەکێک بەکەمتر لە هاوشانی خۆی.
هاوسەری: بوونی ژن و پیاوێک بەهاوسەری یەک.
هاوسەفەر: دوو کەسن کە پێکەوە سەفەریان کردبێ.
هاوسەنگ: هاوکێش.
هاوسێ: دراوسێ.
هاوسێیەتی: دراوسێتی.
هاوسێیی: هاوسێیەتی.
هاوشارێتی: بوونی دوو کەس بەهاوشاری یەک.
هاوشاری: هاوشارێتی.
هاوشان: کەسێکە کە لە پایەی تۆدابێ .
هاوشیر: کەسێکە کە شیری لەگەڵتدا خواردبێ.
هاوشیرە: هاوشیر.
هاوقەتار: د. چەند کەسێکن کە خزمەتی گەورەیەک بکەن.
هاوکات: هاوچەرخ.
هاوکار: کەسێکە کە لە پیشەدا وەک تۆ وابێ.
هاوکاری: یەکێتی پیشەی دوو کەس .
هاوکاسە: د. هاوخۆراک.
هاوکەوشەن: هاوسنووری دێهات لە زەویوزاردا.
هاوکێش: بەدوو شت دەڵێن کە لە کێشاندا وەک یەک وابن.
هاوگا: دوو (گا)ن کە هێزیان لە جووتدا وەک یەک وابێ: ئەمە هاوگای ئەوە نییە.
هاوگیان: هێوەرژن.

هاولف: دووانە: ئەم دووبەرخە (هاولف)ن واتە بەسکێک بوون. هاوشان .
هاوڵە: د. ئاوڵە.
هاوڵێ: هـ. ئاوڵە.
هاوماڵ: دراوسێ.
هاومل: کەسێکە کە لە شتێکدا جووت کرابێ لەگەڵتدا.
هاوناو: کەسێکە کە ناوی وەک ناوی تۆ وابێ.
هاونشین: هاودەم.
هاونیشتمان: کەسێکە کە لەگەڵ تۆدا دانیشتبێ لە نیشتمانێکدا.
هاونێڵە: د. هاونیلە.
هاونیلە: د. هاوسەر.
هاوور: ئاور.
هاووردن: هێنان.
هاووس: ئاووس.
هاوولاتی: کەسێکە کە خەڵقی ولاتەکەت بێ.
هاووەزن: دوو شیعرن کە لەسەر یەک وەزن بن.
هاوەڵ: ئاوەڵ.
هاوەن: هاوان.
هاوێر: لێک جیاکردنەوەی بەرخ و مەڕ.
هاویشتن: هاوێتن.
هاوینکە: سووکە دەوار.
هاوی: ز. ئاوارەی پەتیارە.
هاوێتن: فڕێدانی شتێک بۆ شوێنێک.
هاوێژتن: د. هاوێتن.
هاوین: سێ مانگەی دوای بەهار.
هاوینە: کالایەکە لە هاویندا لەبەر بکرێ.
هاوینەهەوار: شوێنێکی فێنکە کە لە هاویندا لێی ڕابوێریت.
هاوینی: هاوینە.
هاها: ئاها.
هاهاو: د. هۆهۆ.
های: وتەیەکە هێندێ شتفرۆش لەکاتی بانگکردنی شتێکدا کە بیفرۆشێ دەیڵێ: (های) ترێ. ئاگاداری: (های)م هەیە بەو کارە واتە ئاگادارم پێی. وای (د).
های بەخت: قورعە.
هایوهووی: هەرا و زەنا.
هبربار: هەووڕ.
هجنان: ز. سوێنەی جل شوشتن.
هرچ: با. ورچ.
هڕ: د. وتەی گاڵتەپێکردن: (هڕ) لە پیاوەتیت واتە شیر.

هرهر: وتەیەکە شوان پێش ڕانەوە دەیڵێ بۆ بانگکردنی ڕانەکە.
هری: با. خوری.
هژان: هاژیان.
هژاندن: ژەندن و جووڵاندن.
هژمار: با. ژمارە.
هژیر: با. هەنجیر.
هستیفک: با. خاکەنازی پچووک.
هسسە: کسسە.
هش: ز. وتەی بێدارکردنەوە (وس). زەحمەت.
هشتن: ز. هێشتن.
هشدان: د. تێبردن.
هشک: ز. وشک. شتی ڕەق.
هشکەمز: با. مزە. وشکەمز.
هشیار: ز. هوشیار.
هلاڤێتن: با. هەلاڤێتن.
هلدایی: ز. وریایی و پارێزگاری.
هللۆ: ز. هەڵووژە.
هللۆبوون: ز. لووسبوون.
هلهلۆک: ز. بەری درەختێکە وەک بەری درەختی مۆرد دەخورێ.
هلەهتن: ز. بەرزبوونەوە.
همبان: ز. هەمانە.
همبز: ز. شتێکە کە بەباوەش هەڵبگیرێ.
همبەران: ز. شتی بەرامبەر.
همێ: د. ئومێد.
همیداد: کۆمەکی.
هن: ز. هێند.
هنار: ز. هەنار.
هنارتن: ز. ناردن.
هناڤ: ز. هەناو.
هنجنین: با. ئەنجنین.
هنداق: ز.هاوتا. بەرامبەر.
هندوو: ز. ناوەوەی شت.
هندوویی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک.
هندە: ز. هێندە.
هندەک: با. هێندێک.
هندەکۆ: گیایەکە گەڵاکەی سێ پەڕەی هەیە.
هنگاڤ: با. هەنگاو.
هنگاڤتن: ز. ئەنگاوتن.
هنگرتن: ز. هەڵگرتن.
هنگستووک: ز. ئەموستیلەی دروومان.
هنگڤ: ز. هەنگوین.
هنگڤین: ز. هەنگوین.
هنگل: ز. هەنگڵ.
هنگۆری: ز. لە ڕۆژئاواوە تا کاتی نووستن.
هنگوستیل: با. ئەنگوستیلە.
هنگوور: با. هنگۆری.
هنگووری: با. دوای نیوەڕۆ.
هنگێ: ز. هێندێک کاتی ڕابوردوو.
هنگی: ز. هەمووکەس. هەمووشت.
هنەر: ز. هونەر.
هنەک: هێند.
هنین: با. سواخ.
هۆ: وتەیەکە جووتیار و گاوان بەکاری دێنن بۆ گێڕانەوەی گاکانیان. بۆنە: بە(هۆ)ی تۆوە هاتم. وتەیەکە هەڕەشەی پێ دەکرێ: (هۆ) واپێت دەڵێم درۆ نەکەیت. بەرز (ز).
هۆبران: دەست بران لە هەموو شتێک .
هۆبە: کۆمار. چەند ڕەشماڵێکە کە لە شوێنێکدا هەڵدرابێ.
هۆپەڵ: د. تۆپەڵ. کوڵۆیەکە کە بهاوێژرێ.
هۆپەلان: د. شەڕە تۆپەڵ.
هۆجەنە: هـ. بەندەخوێن.
هوجەنە کێش: هـ. داربەندەخوێن.
هۆجەنەگا: هـ. سەرپێزووی دەرپێ کە بەندەخوێنی تێ هەڵ دەکێشرێ.
هۆچنە: ل. هۆجەنە.
هۆدار: ز. فاقە.
هۆدانەوە: خێردانەوە: فلانەکەس هۆی دایەوە.
هۆدە: ژوور.
هور: ز. شتی ورد.
هۆر: ز. ژوورێکە تەنیا مەڕ و بزنی تێ بکرێ (ز). خۆر.
هورا: د. هەرا.
هۆراسان: هەراسان.
هۆرنە: وتەیەکە جووتیار بەگای جووتی دەڵێ لە کاتێکدا کە بێتە ناو هێڵەوە بۆ ئەوەی کە بچێتەوە جێی خۆی. وەرتە.
هۆرتە و بەرەزانین: بریتییە لە زانینی مەردووم بۆ پێ ویستانی سەر شانی خۆی: من هۆرتە و بەری خۆم دەزانم.
هورچ: ورچ.
هورد: ورد.
هۆرداشتن: هەڵماڵین.
هۆردان: دەوارهەڵدان.
هۆردڕوون: هەڵدڕین.

هۆردوو: لەشکر.
هوڕ: وڕ. ئەستوور: (مل هووڕ). قوڕ (با).
هۆڕ: دەفـرێکی چنراوی دوولایییـە لە جـەوالْ گـەورەتر و لە تێـر پچووکترە .
هۆڕاو: گۆلاوی زۆر زل.
هۆڕاوە: وڕاوە.
هوڕە: هوودڕە. هوڕەو. ڕەشەبا (با).
هوڕەم: د. هوڕەو.
هوڕەو: وڕەوە. بەراز.
هوڕێنە: وڕێنە.
هوڕی: وڕی.
هۆرزای: هـ. هەستان.
هۆرشگرتن: هەڵگرتن.
هۆرکریان: هەڵکردن. داگیرساندن.
هۆرکنیان: هەڵکەنران.
هۆرکەندن: هەڵکەندن.
هۆرکێشان: هەڵکێشان.
هورگ: ورگ.
هۆرگرتن: هەڵگرتن.
هورگن: ورگن.
هورگنە: ورگنە.
هورمان: واق وڕمان.
هۆرنگ: د. برنگ.
هورروژم: هـاتنی شـتـێک بەتەوژم و بەزۆری: ئاوەکـە هـورروژمی هێنا.
هوررووژ: د. هورروژم.
هوررووژان: وررووژان.
هورە: ورە.
هۆرە: جۆرە گۆرانییەکی جافەکییە. پوواز.
هورەبا: با. ڕەشەبا.
هورەبەردان: ورەبەردان.
هۆرەهۆر: لەبەرخۆوە گۆرانی وتن.
هۆرێزیای: هـ. هەستان.
هوری: با. قوڕ.
هۆز: چەند ماڵێکە کە بچنەوە سەر یەک تیرە.
هۆزان: ز. هەڵکەوتووی بلیمەت (علامە).
هۆزەروو: گیایەکی گەڵا وردی ئاوییە، گەڵای لە کەرەوز دەچێ و کەمێک سوێرە.
هۆزەڵاو: گیایەکی کوێستانییە، گەڵایەکی باریکی هەیە دەخورێ.
هوژم: د. تەکاندان: هوژمێ بدە، واتە تەکانێک بدە.
هوژووم: د. هوررووژم.
هوژە: د. وژە.
هوژەبر: شێری دڕندە.
هوژەم: د. هوڕەم.
هوستە: وەستا.
هوسوورە: د. خەزوورە.
هۆش: یاد و بیـر: فـیـسـار کـەس بێ (هۆش)ە واتە شـتـی لەبیـر نامێنی. وتەیەکە دەوترێ بەکەر بۆ وەستانی.
هۆشمەند: مەردوومی ژیری هوشیار.
هۆشە: د. هێشوو.
هۆشەچن: گوڵەوەچن.
هوشیار: کەسێکە کە خاوەنی هۆش و بیر بێ.
هۆشیار: هوشیار.
هوشیاربوونەوە: هاتنەوەهۆش.
هۆشیاربوونەوە: هوشیاربوونەوە.
هوشیارکردنەوە: هێنانەوەهۆش.
هۆشیارکردنەوە: هوشیارکردنەوە.
هوشیاری: زیرەکی و بەهۆشی.
هۆشیاری: هوشیاری.
هۆقە: حۆقە.
هۆک: د. ئارەزوو. مان.
هۆکردنەوە: بریتییە لە کەڵک گرتنی شتێک یا کەسێک لەکاتی پێویستیدا: فیسار کەس (هۆی کردەوە) واتە لەکاتی خۆیدا بەکەڵک هات.
هۆککردن: مانگرتن.
هۆکڵ: خزمەتکار.
هۆکن: مانگر.
هۆکەڵ: هۆکڵ.
هۆکێ: د. کەسێکە کە دوای ئارەزووی دڵی خۆی بکەوێ.
هۆگـر: گـیـاندارێکە کـە خـووی گرتبێ بەشـتـێکەوە، (هۆگـربوون) ڕمووەدەبوون بەشتێکەوە.
هۆگرتن: ڕامبوون.
هۆگری: ڕمووەدەیی.
هۆل: ز. یاری شەقێن.
هۆڵ: جـاش (هـ)، سـەرشـار لە یاری شـەقـێنـدا. زاخـە. سـاڵۆن. وتەیەکـە هەمـیـشـە لەگـەڵ وتەی چۆڵدا بەکـاردێنرێ: چۆڵ و (هۆڵ). تۆپی یاری (با).
هۆلاندن: قۆڕاندنی ڕەشەولاخ.
هولۆڵ: د. شتی هەڵۆڵ.
هەڵونج: د. هێلنج.

هولوو: د. جۆرە قۆخێکی زۆر ناسکە بەرەنگێک کە لە شوێنی خۆی نابرێ بۆ شوێنێکی تر.
هۆلە: وتەیەکە کە گوێرەکەی پێ بانگ دەکرێ. قۆڕەی ڕەشەوڵاخ، (هۆلە هۆل) قۆڕەقۆڕی زۆر.
هۆڵە: گێرە. ناوە بۆ دێیەک لە جوانرۆ.
هۆڵێن: جۆرێکە لە یاری شەقێن.
هۆلی: د. جاش.
هوما: باڵندەیەکی گەورەی گۆشتخۆری کێوییە کە پێشی دەڵێن (پیرۆزە).
هومایوون: جۆرە نقامێکی خۆشە.
هومایوونی: هومایوون. جۆرە نووسینێکە وەک نووسینی شکستەی فارسی.
هۆملکێ: بەربەرەکانی.
هومە: کوپە.
هۆمە: د. هومە.
هۆمەڵ غەزا: عەشاماتێکە کە زۆر چڕ و پڕ و تێکەڵ و پێکەڵ بێ.
هۆمەلێرە: د. گۆشت تەنوری.
هۆمەیی: مەڕی بۆزی تاریک .
هومێد: ئومێد.
هومێدەوار: ئومێدەوار.
هون: ز. ئێرە.
هۆن هۆن: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە کاتی گریانی یەکێکدا کە ئاو بەچاویادا بێتەخوارەوە: فیسار کەس دەگری هۆن هۆن فرمێسک بەچاویدا دێتە خوارەوە.
هوندور: ناوەوەی شت.
هۆنراو: شیعر.
هۆنراوە: شتێکی لیسپدارە کە لیسپەکانی تێک هەڵکێشرابێ بەجۆرێکی تایبەتی وەک پرچ و گوریس. چەند شتێکی کونداره کە دەزووی تێ هەڵکێشرابێ، وەک تەزبێح و مووروو. بریتییە لە شیعر.
هونگوستیل: ز. ئەموستیلە.
هۆنە: سازی و ڕێکوپێکی شت: ئەوشتە (هۆنە)ی دێ، یا (هۆنە)ی لێوە دێ یا (هۆنە) دەکا، واتە زۆر ساز و لەبارە.
هونەر: کردەوەیەکی جوانی پەسندە کە لە دەست هەموو کەس نەیەت.
هونەرمەند: خاوەن هونەر.
هونەرمەندی: بوونی مەردووم بەخاوەن هونەر.
هونەروەر: هونەرمەند.
هۆنەهۆن: هۆن هۆن. نرکەی گێژاوی ڕووبار.
هۆنیاگ: د. هۆنراوە.
هۆنین: د. هۆنینەوە.
هۆنینەوە: بەیەکدا هەڵپێچانی لیسپی پرچ و گوریس و شتی تر. تێهەڵکێشانی دەزوو لە دانەی تەزبێح و مووروو و شتی تر. دانانی شیعر.
هۆو: وتەیەکە وەرامی یەکێکی پێ دەدرێتەوە کە بانگت بکا. هۆی جووتیار .
هوودڕە: جۆرە مێشوولەیەکی قاچ و مل درێژی بەئالۆشە.
هوودەرە: د. مێشەسی.
هوور: با. ورد.
هوورد: ورد.
هووردە: وردە.
هووڕ: ل. هۆڕ.
هووڕە: هوودڕە. گڕە.
هوورک: ورگ.
هووشە: خۆهەڵکێشان لە قسە و گفتوگۆدا.
هووشەک: جۆرە دڕندەیەکە وەک پڵنگ بەڵام ئەم پچووکترە. بزمژ.
هووشەکاری: مبالغە و پێ هەڵبڕین لە هووشەکردندا.
هووشەکردن: خۆهەڵکێشان.
هووشەکەر: کەسێکە کە هاشە و هووشەی ببێ.
هووفە: جۆرە نەخۆشییەکە دەدا لە چوار پەلی وڵاخی یەکسم.
هووکارە: فێر.
هووکارەبوون: فێربوون.
هووکارەکردن: فێرکردن.
هوول: بۆز.
هووڵ: بزنی گوێ سوور. مەردوومی دەموچاو سوور.
هووڵاندن: قووڵاندن.
هووڵوەزە: هـ. توێکڵی سەوزی گوێز.
هوولە: قوولە، (هوولە هوول) قوولەقوول. گیانداری زۆر گەورە کە ئادەمی نەبێ: ئەمڕۆ لە دوکان (هوولە) ماسییەکیان کوشت.
هوولە: هـ. مڵە.
هوولەکردن: قوولەکردن.
هوون: خوێن: هـ. ئێوە.
هوونالوو: خوێناوی.
هووناو: هـ. خوێناو.
هوونی: خوێنرێژ.
هووها: وتەیەکە هەڵڵای پێ دەکرێ لە یەکێک بۆ سووکی.
هووهوو: وتەیەکە لەپێش ڕانەوە دەوترێ بۆ بانگکردنی ڕانەکە.
هۆوهۆو: هووهوو.

هووهووکەرە: جۆرە کوندەبەبۆیەکی چاوشینی سەرزلە هەر لە چۆڵی و شاخدا دەبێ، کە دەخوێنێ دەڵێ (هووهوو).
هۆهۆ: دەنگێکە مەردوومی پێ دەنگ دەدرێ لە دوورەوە.
هویرک: شاتوو.
هویرک: با. قولەپێ.
هویل: حۆل. هووڵ.
هە: هانێ.
هەء: نەء.
هەبان: ز. هەمانە.
هەبوو: بووە: فلانە کەس هەر هەبوو بووە.
هەبوون: بوون.
هەبێ: ز. کنگر.
هەپروونبوون: تێکشکان و وردبوونی شتێک کە لە بەرزییەوە کەوتبێتە خوارەوە.
هەپروون بەهەپروون: شتێکە کە لە بەرزییەوە کەوتبێتە خوارەوە و ورد و خاش بووبێ.
هەپش: هـ. ئەسپێ.
هەپک: جۆرە کەڵکێتێکە دەواری پێ دەکوترێ، گەلا کوتک (ز). پەلاسی ئەستوور.
هەپلۆک: هەڵەکۆک.
هەپوو: وتەیەکە منداڵی ساوا بەکاری دێنێ لە جیاتی وتەی (نەما) یا (نییە).
هەپە: دارێکە دەکرێ بەکونی مژان و ئێرەقدا.
هەپەنان: بریتییە لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێک و شت لێ دەرهێنانی.
هەتا: پیتێکە بەکاردێنرێ بۆ دوایی شتێک کە خاوەنی برانەوەبێ: (هەتا) دیاربەکر چووم، یا بەم کارەوە خەریک بە(هەتا) خوادەروویەکت لێ دەکاتەوە. بۆ هۆیەتی (تعلیل و سببیت)ە: هاتم (هەتا) بتبینم واتە هۆی هاتنەکەم بینینی تۆ بوو. بۆ شەرتە: (هەتا) تۆ نەیەیت من نایەم. بۆ بەستنەوەی شتێکە بەکاتێکەوە: (هەتا) لە جیهاندا بیت پێ بژیووت دەوێ.
هەتار: د. تاوێرەبەرد.
هەتارەگلگل: د. هەتار.
هەتاف: با. هەتاو.
هەتاکو: هەتا.
هەتاو: تیشکی خۆر.
هەتاوبردوو: شتێکە کە هەتاو شەمزاندبێتی.
هەتاوکەوتن: کاتی هەڵاتنی خۆر.
هەتاوگاز: شوێنێکە لە ئەندام کە هەتاو سووتاندبێتی.
هەتاوەکو: هەتاکو.
هەتاهەتایی: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ کاتێک کە نەبڕێتەوە.
هەتدان: د. تێبەردانی کار و بەرخ.
هەترە: تەرە: مریشکەکە هەترە بووە.
هەترەبوون: تەرەبوون (هەترەکردن) تەرەکردن.
هەترەش: زەندەق.
هەتوان: مەڵهەم.
هەتۆڵ مەتۆڵ: د. هەلوور بلوور.
هەتەد: وتەیەکە بۆ کورتی دەنووسرێ لەجێی وتەی (هەتا دوایی).
هەتەر: (حریص).
هەتەق: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بردنە دواوەی قسەیەک و باوەڕ پێ نەکردنی.
هەتەک: د. نافەک.
هەتیتە: کونێکی باریکە لە ئاسنێکدا زەڕەنگەر تەلی زێڕ و زیوی پێدا ڕادەکێشێ بەنهێم بۆ لووسی و باریکی.
هەتیم: د. هەتیوو.
هەتیمچە: هەتیوچە.
هەتیو: منداڵی باوک مردوو.
هەتیوبار: بێوەژنێکە کە هەتیوی بەسەردا کەوتبێ.
هەتیوباری: خەریکبوونی بێوەژن بەبەخێوکردنی هەتیوەوە.
هەتیوباز: کەسێکە کە حەزی لە هەتیوی لووس بێ.
هەتیوازی: حەزکردن لە هەتیوی لووس.
هەتیوچە: مەردوومی ناوەجاخ.
هەتیوچەیی: ناوەجاخی.
هەتیوخانە: شوێنێکە کە هەتیوی تێدا پەروەردە بکرێ.
هەتیوکەوتن: بوون بەهەتیوو بەهۆی مردنی باوکەوە.
هەتیومەتیو: وتەیەکە لە رووی سووکییەوە دەوترێ بۆ ئادەمیزادی گەجەر و گوجەر.
هەتیوە: هەتیوچە. تەختەدەوارێکی باریکە لە ناوەراستی تەختەدەوارەکانی تردا هەڵدەدرێ.
هەتیوی: بوونی منداڵ بەهەتیو.
هەجنین: ز. بێ هێزبوون و خاوبوونەوەی جەستە.
هەچ: بەمانا (هەر)ێکە کە بۆ عمومی ئەفرادییە: (هەچ) کەس بخوێنێ دەبێ بەپیاو.
هەچچە: هەچە.
هەچکوچ: هـ. مێوژ.
هەچکوچی: هـ. هەچکوچ.
هەچە: وتەیەکە کەر و ئێستری پێ لێ دەخورێ، (هەچەهەچ) هەچەی یەک لەدوای یەک. بریتییە لە کەر و ئێستر: سواری (هەچە) مەبە.

هەچی: هەرچی.
هەداداں: ئارامگرتن.
هەدار: ز. تارام.
هەدرین: ز. ئارامگرتن.
هەر: کەر (هـ) وتەی کورت هەڵهێنان (حصر): خوایە (هەر) تۆ دەپەرستم. وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ گرتنەوەی هەمـوو یەکە یەکـە یەک یەک (کلی افـرادی): (هەر) کـەس بخـوێنێ دەبێ بەپیـاو. بەمـانـا هەمـوو بەش بەشـێک (کلی مـجـمـوعی): هەردووکـمان، هەرسێکمان. وتەی یەک بینەیی (استـمرار): [هەر] دەخوێنم تا دەگەم بەئاواتی خۆم.
هەرا: دەنگ و ئاژاوە، (هەراهەرا) دەنگەدەنگی زۆر.
هەراژ: د. هێلنج.
هەراس: مەردوومی وەڕس.
هەراسان: وەڕس. ترسان.
هەراسانی: وەڕسی.
هەراسبوون: وەڕسبوون.
هەراسکردن: وەڕسکردن.
هەراسە: د. ترس و بیم. داهۆڵ.
هەراش: گیاندار و سەوزاییییەکە لە کۆرپەیی تێپەڕیبێ. هەراژ.
هەراش ئاوس: بەسکپڕێک دەوترێ کە لە مانگی نۆەمیدا بێ.
هەراشبوون: گەورەبوون و بەخۆداهاتن.
هەراش هەراش: هەلا هەلا.
هەرافتن: با. ڕووخاندن: بهەرفینە واتە بیروخێنە.
هەراکردن: دەنگە دەنگ کردن. بریتییە لە پێ هەڵبڕین لە هەمـوو کاروبارێکدا: فیسـار کەس لە نانخواردندا (هەرا دەکا) واتە قوولە دەکا.
هەراڵە: د. هەلاڵە.
هەرامە: وتەیەکە وەک وتەی (هێن) بەکاردێنرێ.
هەراوزەنا: هەراوهوریا.
هەرا و کێشە: هەراوزەنایەکە کە دەست وەشاندنی لەگەڵدابێ.
هەرا و هوریا: هەراهەرای زۆر.
هەربوون: د. هەتاهەتایی.
هەرتا: د. هەتا.
هەرتاکو: هەتا.
هەرتاکە: هەتا.
هەرتاوکو: د. هەرتاوەکو.
هەرتاوەکو: هەتاوەکو.
هەرتاکی: هەرتاکو.
هەرتک: د. هەردک.
هەرتە: هۆرتەیەکە کە دەنگی لە گای جووت پێ دەکرێ.
هەرجایی: گوڵێکی زۆر جوانە گەڵای وەک وەنەوشە وایە بەڵام ئەم تۆزێ گەورەترە .
هەرجن: دارێکی کوێستانییە وەک چواڵە، دەکرێ بەگۆچان.
هەرچلە: ڕەوڕەوەیەکە کە بەرداشی پێ دەبرێ بەڕێگادا.
هەرچن: د. هەرچەند.
هەرچۆن: وتەیەکـە بەکـاردێنرێ بۆ گـشت ئەحـواڵ: هەر چۆنی بێ هەر باشە.
هەرچەن: هەرچەند.
هەرچەند: وتەیەکە بەمانا (لەگەڵ ئەوەی): (هەرچەند) تۆ نایەیتە لای من بەڵام من هەر دێم بۆ لات.
هەرچەندە: هەرچەند.
هەرچەندێ: هەرچەند.
هەرچێ: د. هەرچی.
هەرچی پەرچی: د. هەرچی و پەرچی.
هەرچیی: وتەیەکـە بۆ گـرتنەوەی هەمـوو کـەسـێک بەکـاردێنرێ: (هەرچی) هەوڵ بدا بەئاوات دەگات.
هەرچی و پەرچی: مەردوومی ناکەس بەچە.
هەرچێوە: هەرچی.
هەرخۆت: ئەرخۆت.
هەرد: شوێنی هەڵەت و بەردەڵانی.
هەردک: د. هەردوو.
هەردووک: هەردوو.
هەردوو: وتەیەکە بەدوو شت دەوترێ .
هەردە: چۆڵ و بیابان. زەوییەکی گرداوی بەرز و نزمە.
هەردەبیر: د. مەردوومی ڕاڕا.
هەردەگێڵ: د. مەردوومی ئاوارە کە بداتە کێو.
هەردەم: هەمیشە.
هەردین: ز. زۆر کوڵانی گۆشت.
هەڕ: قوڕ (هـ). سەڕەی کەر (د).
هەڕاجکردن: فـرۆتنی شت لەناو چەند کـەسـێکدا بەزیادکـردنی نرخەکەی لەسەر یەک لەلایەن خۆیانەوە.
هەڕاکردن: ڕاکردن لە ڕۆیندا.
هەڕشاندن: با. پان و پلیشکردنەوەی شتێک.
هەڕفتن: با. ڕووخان.
هەڕک: هەڕگ (د). وتەی سەرسوڕمان (ز).
هەڕگ: قوڕ.
هەڕگاو: د. قوڕاو.
هەڕگکاری: د. قوڕەکاری.
هەڕگینە: د. گڵێنە.
هەڕلەبڕ نەکـردنەوە: بریتـییـە لە یەکـێـک کـە لە کـارێکدا زۆر نەشارەزا بێ .

هەرمـێن: بازاڕگـەرمی شـتێک: ئەمرۆ برنج زۆر بەهەرمێنە واتە برەوی هەیە، یا فلان کچ بەهەرمێنە، واتە داواکەری زۆرە.
هەرە: خشـتی ڕیزکراو لـەسەر شـان. دیواری تیـغە. مشـار سـەرەی کەر (د).
هەرەپۆپە: د. کەڵەشێرێکە کە پۆپنەی وەک مشار وابێ.
هەرەت: کاتی پێگەیشـتنی شت: هاوین (هەرەت)ی میـوەیە، یا نەریمان (هەرەت)ی ژن هێنانێـتی. هەل و پەرژان: هەرچەند دەکەم (هەرەت)م نییە واتە هەلم نییە و نام پەرژێت.
هەرەزاڵە: هەرەزەڵە.
هەرەزەڵە: تووڵەزەرە.
هەرەشـە: ترسـاندنی یەکێـک بەوتار یا بەکـردار، (هەرەشەکـردن) هەرەشە .
هەرەشە و گورەشە: هەرەشەی یەک لەسەر یەک.
هەرەکـان و مـەرەکـان: جۆرە یارییـەکـە منداڵان دەیکەن و، لەگـەڵ یارییەکەدا ئەم وتەیە دەڵێن.
هەرەکردن: ڕیزکـردنی خشت لەسـەرشان. برینەوەی دار بەمشـاری هەرە.
هەرەماسی: جۆرە ماسییەکە کلکی وەک مشار وایە.
هەرەمە: گەنمێکە کە لەگەڵ دانەوێڵەی تردا تێکەڵ کرابێ.
هەرەهەر: تێخورین و قرەقرکردن بەسەر یەکێکدا.
هەرییە: هارییە.
هەری: با. قوڕ.
هەرز: د. هەرێز.
هەرزاڵ: کـەپرێکی نزمـە لە مـاڵدا دەکـرێ بۆ شت لەسـەردانان، یا لەسەر نوستن.
هەرزاڵە: هەرزاڵ.
هەرزان: شتێکە لە کڕین و فرۆتندا نرخی کەم بێ، (هەرزانبوون) کەمبوونی نرخی شت، (هەرزانکردن) کەمکردنی نرخی شت.
هەرزان بەها: شتی هەرزانی کەم نرخ. هەرزانجان.
هەرزانجان: کەسێکە شت بەهەرزان بفرۆشێ.
هەرزانی: کاتێکە شتی تێدا هەرزان بێ .
هەرزبوون: د. وێڵ بوون.
هەرزن: دانەوێڵەیەکی وردی لووسی بێ پێزە دەکرێ بەنان.
هەرزڵهەرزڵ: شتی ڕزیوی هەلا هەلا.
هەرزە: مەردوومی هەڵەی چلفر.
هەرزەبێژ: کەسێکە کە هەمیشە قسەی هیچ و پووچ بکا.
هەرزەچەنە: د. هەرزەبێژ.
هەرزەکار: مەردوومی گەنج.
هەرزەکاری: دەمی گەنجی.
هەرزەکۆ: هەرزەبێژ.
هەرزەگۆیی: وتنی قسەی هیچ و پووچ.
هەرزەگی: د. هەرزەیی.
هەرزەل: د. هەرزاڵ.
هەرزەمەشق: نووسینی شت بەبێ مەبەست.
هەرزەنووس: کـەسـێکە کـە شـتی هیچ و پووچی بێ مـەبەست بنووسێ.
هەرزەنویس: هەرزەنووس.
هەرزە و هۆرزە: د. کوڕوکاڵی هەرزە.
هەرزەوێژ: د. هەرزەبێژ.
هەرزەیی: هەڵەیی و جلفری.
هەرس: ورچ. هەرسی (د).
هەرسی: ه. فرمێسک.
هەرشتە: نانێکی تەنکی نیوەبڕە دەجنرێ و دەکرێ بەچێشت.
هەرشتە بەترش: چێشتی هەرشتە.
هەرشەو: هەموو شەوێک.
هەرکۆ: هەرکوێ.
هەرکۆگە: هەرکوێ.
هەرگا: هەردەم.
هەرگاڤ: با. هەرگا.
هەرگـیز: پیـتی تێکڕاییـیە لە نەبوونیدا: (هەرگـیـز) لە خـوێندن دەست هەڵناگرم.
هەرگیس: د. هەرگیز.
هەرلە: د. هەزارپێ.
هەرمان: فرمان (ه). مان هەتا هەتایی.
هەرمەڵە: ه. هێرۆ.
هەرمێ: میوەیەکی زەردی خڕی قنچکداری شیرینە.
هەرمێ باڵەکی: هەرمێیەکی گەورەی شینکاری درێژکۆڵەیە.
هەرمێ پشکووان: مانگی مارت کە سی و یەک ڕۆژە.
هەرمیسک: چنگاڵ و ڕۆن.
هەرمێ شینکە: هەرمێ کێویلە.
هەرمێ کێویلە: جۆرە هەرمێیـەکە کە لە دەشت و شاخ لە خۆیەوە ڕوابێ.
هەرمێ گوڵاوی: جۆرە هەرمێیەکی بۆنخۆشی شیرینە.
هەروبار: ه. داڵیت.
هەر و گیڤ: هەرەشە و گورەشە.
هەرە: پردەڵە (ه). هەموو. زۆر.
هەرەس: پەڵەبەفـرێکی گـەورەی زۆرە کـە بەقـەد شـاخـەوە بێ و ببزوێ.
هەرەسبردن: هەرەسهێنان.
هەرەسهێنان: داخزان و ڕووخانی بەفری لاپاڵ و داڕووخانی گەلێ شتی تر.

هەرەوەز: کۆکردنەوەی چەند زەلامێک بۆ کردنی کارێک بەدەست و بردی.
هەرهەس: د. نەمر.
هەرێ: ز. بەڵێ.
هەرێز: فرووزوو.
هەرێکردن: ز. بەڵێندانی باوک و کەسی کچ بۆ بەشوودانی.
هەری: ز. خوری. کورک.
هەریسە: کەشکەک.
هەرێم: هەریم.
هەریم: ناوچە.
هەزار: ناوە بۆ ژمارەیەک کە دەجار سەدە.
هەزار بەهەزار: سەر بەرەوخوارە و هەڵدێرگەیەکی زۆر کوڕ و سەخت و دوورودرێژە.
هەزارپا: هەزارپێ.
هەزارپۆپە: د. هەزارپۆپنە.
هەزارپۆپنە: جۆرە کەڵەشێرێکە کە پۆپنەی تۆپ و پەل پەل بێ.
هەزارپێ: دەعبایەکی درێژکۆلەی زەردەپێی زۆری هەیە.
هەزار داستان: ڕیشۆڵە. بلبل.
هەزاڕەگ: د. زۆل.
هەزارلۆخانە: د. هەزارلۆغانە.
هەزارلۆغانە: پارچە تەڕافێکی لۆچ لۆچە لە سکی گیانداردا پڕە لە پیسی.
هەزارە: کەتیبەی خشتی سوور. لێواری حەوزە کە ئاوی بەسەردابڕژێ بە یەکسانی بۆ ناو ئاوەڕێژی دەوری.
هەرزەکردن: خەولێ زڕان و بێ ئارامی لە خەفەتدا: ئیمشەو لە داخا هەر (هەزارە)م کردووە.
هەزبێ: گیا دانوو.
هەزبێ کێفیلە: د. جاترە کێویلە.
هەزبێلە: هەزبێ.
هەزبییە: ئەزبییە.
هەزم: توانەوەی خواردن لە سیق (معدە)دا.
هەزوا: تاڵی شاری.
هەزوێلە: هەزبێلە.
هەزوییە: هەزبییە.
هەزێلک: با. هەرزاڵ.
هەزین: هاژین.
هەژار: مەردوومی بێ پارە و پوول.
هەژارکەوتن: دووچاربوون بەهەژاری.
هەژاری: بێ پارە و پوولی.
هەژان: هەژین.
هەژاندن: با. ڕاوەشاندن. ژەندن.
هەژدە: ناوە بۆ ژمارەیەک.
هەژدەمین: شتێکە کە لە پایەی هەژدەدابێ.
هەژدەها: هەژدیها.
هەژدەهەم: هەژدەمین.
هەژدەهەمین: هەژدەمین.
هەژدیها: ماری زۆر گەورە.
هەژگ: لق و پۆپی درەخت کە هەڵپاچرابێ. قاچ و دەستی گیاندار لە ئەژنۆ و ئانیشک بەرەوخوار: فیسار کەس [هەژگ]ی کورتە.
هەژگ و بژاڵ: چیلکەو چەوێڵ.
هەژگ و هەژاڵ: هەژگ و بژاڵ.
هەژمار: ژمارە.
هەژماردن: ژماردن.
هەژمەت: تووڕەیی و خەفەتخواردن.
هەژهار: د. ددانێکی زیادەیە کە لە تەنیشت ددانێکی ترەوە بڕوێ.
هەژیار: د. هەژار.
هەژیر: با. هەنجیر.
هەژین: با. هاژیان.
هەس: خەست.
هەسار: حەسار. ئەستێڵ (ه).
هەسارە: ه. ئەستێرە.
هەسارەزەڕینە: د. کۆڵەکە زێڕینە.
هەسارەگەڕێن: د. ئەستێرە شناس.
هەسارەناس: د. هەسارەگەڕێن.
هەسان: جۆرە بەردێکی لووسە تیغی پێ تیژ دەکرێ.
هەسان لێدان: بریتییە لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێک.
هەوساو: سایەقە.
هەسپ: ز. ئەسپ.
هەسپایی: ئەسپایی.
هەست: حس و پێزانین: بێ (هەست) بجۆرە ژوورەوە، واتە بەجۆرێک کە کەس پێت نەزانێ، ئێسقان (با).
هەستار: ز. فرمێسک.
هەستان: لە زەوی ڕاست بوونەوە و سەر پێ کەوتن.
هەستاندن: ڕاستکردنەوەی شتێک و هێنانە سەر پێیی. بێدار کردنەوەی نووستوو.
هەستانەوە: چاکبوونەوە لە نەخۆشی. بریتییە لە دەوڵەمەند بوونەوە دوای نابووتی.
هەستکار: ئەو شتەیە لە گیانداردا کە هەست بەشت دەکا (حاسة).

هەستکردن: سووسەکردنی شتی پەنهانی.
هەست و خوست: جووڵە و چپە، هەر لە نەبووندا بەکاردێنرێ: بێ هەست و خوست کردی بەڕووردا، یا هەست و خوستی نییە.
هەستونیست: بریتییە لە هەموو دارایی مەردووم: (هەستونیست)ی فیسارم بەدەستە.
هەستە: ز. ئەستێ. چەخماخی جگەرە داگیرسان.
هەستەم: د. هێواش: بەهەستەم واتە بەعاستەم.
هەستی: ئێسقان (ز). بوون (وجود).
هەستیف: ز. ئەستێووڵک.
هەسرەوە: هـ. خەسوو.
هەسس: د. هێز و تەوانایی.
هەسکۆ: با. ئەسکوێ.
هەسکوێ: یا. ئەسکوێ.
هەسکەهەسک: د. هەنک هەنک.
هەسکیان: د. هەنسکەبڕێ.
هەسنگ: ز. ئاسن.
هەسوورە: هـ. خەزوور.
هەسوون: ئەستوون. سونی تیغ بەهەسان.
هەسونیس: د. هەستونیست.
هەس و هۆڵ: د. خەست و خۆڵ.
هەسەر: هـ. ئێستر.
هەسەوبوون: د. خەستبوونەوە.
هەسێر: ئەستێڵ.
هەسێرە: ئەستێرە.
هەسێرەزێڕینە: هەسوونەزێڕینە.
هەسێڵ: د. ئەستێڵ.
هەسی: د. خەستی.
هەسیرە: ئەستێرە.
هەش: ورچ (هـ). خۆم.
هەشپش: ئەسپێ.
هەشپشی: هـ. هەشپش.
هەشت: ناوە بۆ ژمارەیەک کە لە ناوەندی حەوت و نۆدایە.
هەشتا: ناوە بۆ ژمارەیەک کە هەشت جار دەیە.
هەشتاڵوو: هـ. قۆخ.
هەشتاڵووکوت: د. قۆخی وشککراوە.
هەشتاو: کەسێکە کە پەلە بکا لە کارێکدا.
هەشتاوی: پەلە و دەست و برد.
هەشتتیر: دەمانچەیەکە کە هەشت گوللە بخوا.
هەشت دان: شەشپەڕ.
هەشتگۆشە: شتێکە کە هەشت سووچی ببێ.
هەشتەم: شتێکە کە لە پایەی هەشتدا بێ.
هەشتەمین: هەشتەم.
هەشتهەمین: هەشتەمین.
هەشتێ: ز. هەشتا.
هەشت یەک: لە هەشت بەش بەشێک.
هەشتیەکی: هەشت یەکێکە کە ژن لە کەلەپووری مێردی منداڵداری دەیبا.
هەشتی: هەشتگۆشە.
هەشتیر: هەشتتیر.
هەشەکە: د. هەڕەشە.
هەشین: ز. شین. شینایی.
هەشینبوون: ز. سەوزبوونی گیا.
هەفت: ل. حەوت.
هەفتا: حەفتا.
هەفتانە: حەفتانە.
هەفتە: حەفتە.
هەفتەکێش: حەفتەکێش.
هەفتەیی: ل. حەفتەیی.
هەفتیار: ل. کەمتیار.
هەفسار: ز. هەوسار.
هەڤشی: ز. شوێنێکە پەرژین کرابێ بۆ وڵاخ تێکردن.
هەفکین: ز. پەینکە.
هەخووری: ز. سابرێنی پیر.
هەڤ: با. هاو.
هەڤال: با هەڤاڵ.
هەڤاڵ: ز. هاودەم.
هەڤبەر: با. هاوتا.
هەڤبەهر: ز. شەریک.
هەڤدە: ز. حەڤدە.
هەڤراز: با. هەوراز. دەستەچەپ.
هەڤرازی: با. هەورازی.
هەڤران: با. باراش.
هەڤرست: با. دارێکە وەک سنەوبەر بەڵام ئەم زۆر بەرز نابێتەوە.
هەڤرنگ: برنگ.
هەڤرە: ز. وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (پێکەوە) و (تێکرا).
هەڤریشم: ز. ئاوریشم.
هەڤلنگ: با. ئاوەڵزاوا.
هەڤژتن: فێربوون.
هەڤژک: با. ڕستە.

هەڤیر: ز. هەویر.
هەک: ز. وتەی سەرسوورمان.
هەکە: ئەگەر (ز). خارشت.
هەگبە: خورجولکەیەکی دووتاییە دادەبەسترێ بەپاشکۆدا.
هەل: ڕێکەوتێکە کە قازانجێکی تێدا بکەی. نۆرە (د).
هەڵ: وتەیەکە دەچێتە سەر هێندێ وتەی تر، جووڵانەوەیەکی سەر بەرەوژوور دەگەیەنێ: (هەڵ)پەڕین، (هەڵ)ماڵین.
هەڵئاخنین: هەڵاخنین.
هەڵئاوسان: هەڵاوسان.
هەلات: درۆی زل.
هەلاتلێدان: درۆی زلکردن.
هەڵاتن: دەرکەوتنی مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە لە ئاسۆ. ڕاکردن لە ترساندا. کیفکردنی هەویر. پەڕینی نێر لە مێ: ئەسپەکە لە ماینەکە هەلات. تەواوبوونی ماوەی شت: ژنە تەڵاقدراوەکە عدەی هەلات.
هەڵاتە: هەویری هەڵاتوو.
هەلاج: کەسێکە کە لۆکە بەچەکە و کەوان بکاتەوە.
هەلاجی: کردنەوەی لۆکە بە چەکە و کەوان.
هەڵاخن: دەفرێکی چنراوە کە ئاخنرابێ لە شت.
هەڵاخنران: پڕبوونی دەفرێکی چنراوە لەو شتەی کە تێی دەکرێ.
هەڵاخنین: پڕکردنی ئەو دەفرانەی کە دەکشێن و پەستان و تێ ترنجاندنی بەجۆرێک کە هەڵبئاوسێ. بریتییە لە پڕ جوێنکردنی یەکێک: فیسار کەسیان (هەڵاخنی).
هەلار: د. شەقار، (هەلارهەلار) شەقارشەقار.
هەڵاژیان: پاڵکەوتن.
هەڵاژین: هەڵاژیان.
هەڵاش: زەل و گەڵایەکە کە لەسەر دارەڕاوە دابنرێ بەئەستووری.
هەلافێتن: ز. هەڵدانی شت سەرەوژوور.
هەڵاکان: د. هەناسەبڕکێ.
هەلاکەوتن: لاچوون.
هەڵاڵ: شتێکە دەکرێ بەپێستەوە بۆ ئەوەی زوو پێستە ڕن بکرێ.
هەڵاڵخانە: دەباخانە.
هەڵاڵە: هەڵاڵ. گوڵێکی جوانی بۆنخۆشی کوێستانییە. شتێکە هەنگ لە گوڵی دەگرێ و شانی پێ هەڵدەبەستێ. بانگەواز (د). تۆزی نێر و مێی ڕووەک بۆ مترەبەبوون.
هەڵاڵەبرمە: گیایەکی بەهارییە نێرکێکی درێژی هەیە گوڵێکی گەورەی سوور دەگرێ بنی پەڕەکانی لە دیوی ناوەوە ڕەشەو چاڵێکی سپی تێدایە.
هەڵاڵە کشکش: د. چۆپی و سەماکردن.
هەڵامات: هەڵامەت.
هەڵامسان: هەڵاوسان.
هەڵامەت: دەردێکە لەسەرماوە تووشی مەردووم دەبێ، ئاو بەلووتیادا دێتە خوارەوە.
هەڵامەتدار: کەسێکە کە تووشی هەڵامەت بووبێ.
هەڵاو: هاڵاو.
هەڵاواردن: جیاکردنەوە.
هەڵاواستن: هەڵواسین.
هەڵاواسین: هەڵاواستن.
هەڵاوسان: ئاوسان و بەرزبوونەوە.
هەڵاووردن: دەردی لێهاتن. هەڵهێنانی هێلکە. زانینی مەتەڵ.
هەڵاووردە: دەردی لێهاتن.
هەلاوە: گیایەکی کوێستانییە لە بەرەزا دەچێ لەناو دەوەندا دەڕوێ.
هەڵاوە: هـ. جاو.
هەڵاوەستن: هەڵاوەسین.
هەڵاوەسراو: هەڵواسراو.
هەڵاوەسین: هەڵواسین.
هەڵاوەگێڕ: هەڵگێڕاوە.
هەڵاوێر: هەڵاواردنی بەرخ و مەڕ. یا کار و بزن.
هەڵاوێردن: هەڵاواردن.
هەڵاوێز: د. ئاوێزان.
هەڵاوێژان: هەڵاوێشتن.
هەڵاوێستن: با. هەڵواسین.
هەڵاوێشتن: خواردن و قووتدانی شتێک بەهەڵپە. دەرکردنی شتێک لە شتێک (استثناء).
هەڵاوێتین: هەڵاوێشتن.
هەڵاوێژتن: هەڵاوێتن.
هەڵئەنگووتن: پێ هەڵکەوتن لە ڕۆیندا.
هەلاهەل: گیاندارێکی زەهردارە. زەهری کوشندە.
هەلاهەلا: شتی لەتوپەت، (هەلاهەلابوون) لەتوپەتبوونی شت، (هەلاهەلاکردن) لەتوپەتکردنی شت.
هەلایهەل: گیانداری هەلاهەل.
هەلایسان: هەڵگیرساندن.
هەلبچڕین: د. هەڵپچڕین.
هەڵبڕان: جوێبوونەوەی دووگیاندار لە یەک.
هەڵبرسقانن: د. ڕفاندنی شتێک لە یەکێک.
هەڵبرسکان: هەڵبزرکان.
هەڵبڕیان: د. هەڵبڕین و بەرزکردنەوەی شتێک.
هەڵبڕین: بەرزکردنەوەی شتێک. ڕاونان. هەڵدڕینی شت بەچەقۆ.
هەڵبرژان: د. هەڵقرچان لەبەر تینی گەرمی.

هەڵبرژیان: د. هەڵبرژان.
هەڵبرنگان: هەڵبرنگان.
هەڵبرینگان: هەڵبرنگان.
هەڵبزرکان: ڕەنگ پەڕینی مەردووم لە ترسا یا لە تەریقیدا. زەرد و سیسبوونی سەوزایی. تێکچوونی شیر.
هەڵبـژاردن: پەسندکـردنی شـتـێک لەناو چەند شـتـێکدا و هەڵگرتنی.
هەڵبژاردە: شتی یەکەیەکەی پەسندکراو.
هەڵبژانن: د. هەڵبژاردن.
هەڵبژنیاگ: د. هەڵبژێردراو.
هەڵبژنین: د. هەڵبژاردن.
هەڵبژیاگ: د. هەڵبژنیاگ.
هەڵبژێراو: شتی هەڵبژاردە.
هەڵبژین: د. هەڵبژاردن.
هەڵبگاردن: هەڵبواردن.
هەڵبلۆقان: هەڵبلۆقین.
هەڵبلۆقین: جووڵانەوەی گیـاندار لەسەر زەوی وەک جووڵانەوەی ماسی لەسەر زەوی و مار لەپاش سەر پانکردنەوەی.
هەڵبلۆقینەوە: هەڵبلۆقین.
هەڵبلووقانەوە: هەڵبلۆقینەوە.
هەڵبورنگان: ڕەوینەوەی هەور و نەمانی باران.
هەڵبواردن: بواردن و پەڕاندنی شتێک لەناو چەند شتێکدا ناو بەناو.
هەڵبوون: داگیرسان.
هەڵبـەت: وتەیەکە بەکـاردێنرێ لە شـوێنێکدا کـە مایەی شـتـێک دیار نەبێ: تەلەفۆنم کرد بۆ ماڵی فلانەکەس کەچی جوابیان نەبوو، تۆش دەڵێیت هەڵبەت لەوێ نەبوون.
هەڵبەتە: هەڵبەت.
هەڵبەز و دابەز: خۆبەرزکردنەوە و بازدەڵبازدی گیاندار.
هەڵبەزهەڵبەز: هەڵبەز و دابەز.
هەڵبـەزینەوە: بەرزبـوونەوەی شـتـێک بەهۆی کـەوتنی لە شـتـێکی ترەوە بەنهێم.
هەڵبەست: شتی درۆی دروستکراو. شیعر.
هەڵبـەسـتـراو: وتاری درۆی ڕێکخـراو. گـۆڕێکە کـە بەبەرد بەرز کرابێتـەوە لە زەوی. چەفتـە و مشکی و هێندێ شتی ترە کە ڕیشووەکەی بادرابێ. شیعر.
هەڵبەستن: ڕێکخسـتنی قسـەی درۆ. بەرزکردنەوەی گـۆڕ بەبەرد. بادانی ڕیشـووی قـەراغی چەفـتـە و مـشکی و شـتی تر. ڕێکخستنی شیعر.
هەڵبەستنەوە: گرتنەوەی شوێنی شکاو لە ئەندام.

هەڵبەستە: هەڵبەستراو.
هەڵبەسە: د. هەڵبەستە.
هەڵبەسیاگ: د. هەڵبەستراو.
هەڵپاچان: گیایەکی بەهارییە وەک سێپەڕە وایە بەکوتراوی لەگەڵ ڕۆندا تێکەڵ دەکرێ بۆ کەچەڵی زۆر باشە.
هەڵپاچین: بڕینی لقی قـەدی دار و درەخت. کورتکردنەوەی مووی گیاندار بەمەقەست.
هەڵپچڕان: لەیەک بەربوونی شتی درواو.
هەڵپـچـڕاندن: لەیەک بەردانی شتی بەیەکەوە درواو یا بەیەکەوە نووساو بەنهێم.
هەڵپچڕاوی: عاستی هەڵپچڕانی شت.
هەڵپچڕکان: هەڵوەرین.
هەڵپچڕکاندن: هەڵوەراندنی پەڕەی گوڵ و گەڵای درەخت و گیا.
هەڵپچڕین: هەڵپچڕاندن.
هەڵپچوڕکان: هەڵپچڕکان.
هەڵپچوڕکاندن: هەڵپچڕکاندن.
هەڵپرچانن: هەڵپروسکاندنی شتێک لە دەست یەکێک.
هەڵپروزقانن: هەڵپروسکاندن.
هەڵپروسقاندن: هەڵپروسکاندن.
هەڵپروسکاندن: فڕاندنی شتێک لە دەست یەکێک.
هەڵپـرووزان: نیـوە سووتانی هێندێ شت: لفکەکە یا گـەمەکـە یا گۆشتەکە (هەڵپرووزا).
هەڵپرووزاندن: نیوە سووتاندنی هێندێ شت.
هەڵپرووزانن: هەڵپرووزاندن.
هەڵپرووکان: هەڵپرووزان.
هەڵپرووکاندن: هەڵپرووزاندن.
هەڵپـڕژان: بڵاوبوونەوەی پڕیشکی ئاو بەهۆی شـتـێکەوە کـە تێی کەوێ.
هەڵپـڕواندن: پرواندنی گـوڵی گـەنم و جـۆ و هێندێ شـتی تر بەسەریەکدا.
هەڵپروانن: د. هەڵپرواندن.
هەڵپریواندن: هەڵپرواندن.
هەڵپزگران: بزرکانی شیر.
هەڵپشافتن: هەڵفلیقان. هەڵگلۆفتن.
هەڵپشاوتن: هەڵپشافتن.
هەڵپشکووتن: هەڵپەڕینی وردە برین بەئەندام.
هەڵپلۆخان: داپلۆخان.
هوڵپلۆسکانن: د. کوشتنی گیاندارێک .
هەڵپلۆسکیاگ: د. گیانداری مردوو.
هەڵپـە: پەلەپەلکردن لە خـواردن و کـاروبـاردا، (هەڵپـەهەڵپ) هەڵپەی یەک لەدوای یەک.

هەڵپەرداوتن: کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ناوماڵ. بەچاوەوەکردنی شت و زیان پێگەیاندنی. هەڵپاچینی لقوپۆپی دار و درەخت.
هەڵپەڕاندن: سەماکردن بەگیاندار. پەڕاندن و لێکردنەوەی کەمێک لە شتێک بەنهێم: لە بەردەکەیدا تۆزێکی لێ هەڵپەڕاند.
هەڵپەڕداپەڕ: هەڵپەڕ و داپەڕ.
هەڵپەڕکێ: هەڵپەڕینی چەند کەسێک بەڕیز.
هەڵپەڕ و داپەڕ: هەڵبەز و دابەز.
هەڵپەڕ هەڵپەڕ: هەڵپەڕ و داپەڕ.
هەڵپەڕین: خۆ هەڵخستنەوە لە خۆشیاندا. جوێبوونەوەی تەڵەزمێک لە شتێکی ڕەق.
هەڵپەرست: کەسێکە بۆ قازانجی خۆی هەرگیز هەل لە دەست نەدا.
هەڵپەساردن: پاڵدانی شتێک بەشتێکی ترەوە لەسەرباری درێژی بۆ ئەوەی کە نەکەوێ.
هەڵپەسارده: هەڵپەسێرراو.
هەڵپەسێرراو: شتێکە کە پاڵ درابێ بەشتێکی ترەوە.
هەڵپەل: دارێکە هەڵپاچرابێ تا نزیک تەوقەسەرەکەی بۆ ئەوەی ڕاست هەڵچێ.
هەڵپەنمان: هەڵئاوسان.
هەڵپەنمانن: د. داچلەکاندن.
هەڵپەنمین: د. داچلەکین. ئاوسان.
هەڵپێچ: لوولدانی سەری (بن تیک) و دروونی.
هەڵپێچان: خڕ هەڵدانی بەری میوە: ترۆزی و خەیارەکە بەریان (هەڵپێچاوە). تەنگەتاوکردنی یەکێک لەسەر شتێک: قەرزار (هەڵی پێچاوم). هەڵپێچکردنی کاڵا. نەمانی شتێک لە ئارادا: خوا ئەم دەور و دوکانە (هەڵپێچێ).
هەڵپێچران: تەنگەتاوکردنی یەکێک لەلایەن یەکێکی ترەوە: نەریمان چاک لێی هەڵپێچراوە.
هەڵپێچیاگ: د. هەڵپێچراو.
هەڵپێچیان: د. هەڵپێچران.
هەڵپێکان: ئەلقەریزکردنی دەرگا. هەڵپێچان.
هەڵپێکران: داخرانی ئەلقەریزی دەرگا و شتی تر.
هەڵپێکیان: د. هەڵپێکران.
هەڵپیت: هەڵپەل.
هەڵپیتاندن: هەڵپاچینی درەخت. هەڵجیپاندن.
هەڵتراندن: هەڵدان و هەڵکێشانی یەکێک بەدرۆ و ناڕەوا.
هەڵترنگانن: د. هەڵتوزانن.
هەڵتروشکان: چیچکە کردن و خۆ کزۆڵە کردن.
هەڵترەکان: د. هەڵپچران.
هەڵترەکیان: د. هەڵترەکان.
هەڵتلۆپان: هەڵتلۆپین.
هەڵتلۆپین: بریتییە لە مردن، ئەم وتەیە بۆ سووکی دەوترێ.
هەڵتلیشان: دڕانی شت لە ڕاستی سەربەرەوژوور.
هەڵتلیشاندن: دڕاندنی شت لە ڕاستی سەربەرەوژوور.
هەڵتۆڕان: هەڵتیزان.
هەڵتۆڕاندن: هەڵتیزاندن.
هەڵتوروشکان: هەڵتروشکان.
هەڵتۆقان: هەڵتۆقین.
هەڵتۆقیاگ: د. هەڵتۆقیو.
هەڵتۆقیان: د. هەڵتۆقین.
هەڵتۆقین: بەرزبوونەوەی شوێنێک لە ئەندام بەهۆی زەبر پێ گەیشتنییەوە. سەر دەرهێنانی کارگ و دومەڵان لە زەوی.
هەڵتۆقیو: شوێنێکە کە هەڵتۆقیبێ.
هەڵتووتان: چیچکەکردن.
هەڵتووتیان: د. هەڵتووتان.
هەڵتووڕان: هەڵتۆڕان.
هەڵتووڕاندن: هەڵتۆڕاندن.
هەڵتووزان: هەڵخلیسکان.
هەڵتووزیان: د. هەڵتووزان.
هەڵتەقان: هەڵپچڕانی دروومان. لەیەک کەوتنی دوو شت: ئەو دوو ئۆتۆمۆبیلە بەیەکدا (هەڵتەقان).
هەڵتەقیان: د. هەڵتەقان.
هەڵتەقین: هەڵتەقان.
هەڵتەکان: هەڵوەشان. سوختبوونی یەکێک لە دارایی: فیسار کەس (هەڵتەکاوە) واتە هیچی نەماوە.
هەڵتەکاندن: هەڵوەشاندن. دارایی نەهێشتن بەیەکێک و سوختکردنی. تەتەڵەکردنی برنج و تووتن و شتی تر بەسینی یا بەلەنگەری. ڕاوەشاندنی هێندێ شت. هەڵپچڕاندن.
هەڵتەک و پەڵتەک: زۆر هەڵگرتن و دانانی شتێک.
هەڵتەک و داتەک: بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی شتی سەرپشتی ولاخ.
هەڵتەک هەڵتەک: تەکەتەککردنی ئەندام و کالای مەردووم لە ڕۆیندا.
هەڵتەکیان: د. هەڵتەکاندن.
هەڵتەکین: هەڵتەکان.
هەڵتیزان: ڕاکردن و جووتە وەشاندنی گوێدرێژ.
هەڵتیزاندن: هەڵتیزان.
هەڵجووزان: د. هەڵتووزان.
هەڵجیپاندن: سازکردن و قوتکردنەوە و پێکهێنانی شت بەکەموکوڕی.

هەلج: هـ. قارچک.
هەڵچرچان: هەڵقرچان.
هەڵچرچاو: د. شتێکە چرچ بووبێ .
هەڵچرچیاگ: د. هەڵچرچاو.
هەڵچرچیان: د. هەڵچرچان.
هەڵچنراو: چەند شتێکە کە لەسەر یەک ڕیز کرابێ. شتێکە کە چنرابێتەوە.
هەڵچنیاگ: د. هەڵچنراو.
هەڵچنیین: دانانی چەند شتێک یەک لەسەر یەک و چین لەسەر چین. چنینەوەی شتی ڕژاو لەسەر زەوی بەدەست یا بەدەندووک.
هەڵچۆ: مەردوومی تێهەڵچۆ.
هەڵچۆڕان: هاتنەخوارەوەی شتی شل لە دەفری سەرەوخوارکراو.
هەڵچۆڕاندن: خوارکردنەوەی دەفر بۆ هاتنەخوارەوەی شتێکی شل لێی.
هەڵچۆڕیان: د. هەڵچۆڕان.
هەڵچۆڕین: هەڵچۆڕان.
هەڵچۆقان: هەڵچۆقین.
هەڵچۆقین: هەڵ لەرزین لە سەرماندا .
هەڵچوون: هەڵکفان و بەرزبوونەوەی شتی شل لەسەر ئاگر لە کاتی قوڵپدانیدا. بازدبردن بەسەر ئەو کەسەی کە لە یاریدا دەبێ، بەرزبوونەوەی دار و درەخت. بریتییە لە تووڕەبوون.
هەڵچەرخان: وەرچەرخان.
هەڵچەرخاندن: وەرچەرخاندن.
هەڵچەرخیان: د. هەڵچەرخان.
هەڵچەرخین: هەڵچەرخان.
هەڵچەقین: چوونی دڕک و دەرزی بەئەندامدا.
هەڵخراندن: خرەهەڵدانی هێندێ شت بەدەست وەک کفتە و سەلکە ترخێنە. بریتییە لە پێکهێنانی هێندێ شت بەپەنهانی.
هەڵخریاگ: د. هەڵخراو.
هەڵخریان: د. هەڵخران.
هەڵخزان: هەڵخلیسکان.
هەڵخزیان: د. هەڵخزان.
هەڵخزین: هەڵخزان.
هەڵخستن: بڵاوکردنەوەی شتی تەڕ بۆ وشکبوونەوەی. هەڵدانی میچ لە یاریدا. فڕێدانی شت. دروستکردن و بەرزکردنەوەی خانوبەرە: وەستاکە ئەم خانووەی جوان (هەڵخستووە).
هەڵخستنەوە: قونەکردن و هەڵپەڕین لە خۆشیاندا: فیسار کەس لە خۆشیاندا هەر خۆی (هەڵدەخاتەوە).

هەڵخلاتن: خرەخرکردن بەشت. هەڵخراندن.
هەڵخلەتان: هەڵخەڵەتان.
هەڵخلەتاندن: هەڵخەڵەتاندن.
هەڵخلیسکان: خزانی پێ لە شوێنی خز.
هەڵحلیسکاندن: خزاندنی پێی یەکێک.
هەڵخواز: هەڵپەرست.
هەڵخوراندن: خوراندنی شوێنێک لە ئەندام بەتوندی.
هەڵخۆزانن: د. هەڵبەزاندنەوە.
هەڵخۆزتن: د. هەڵبەزینەوە.
هەڵخۆزین: د. هەڵخۆزتن.
هەڵخۆستن: د. هەڵخۆزتن.
هەڵخۆندن: وتنی شتی خراپ بەسەر یەکێکدا.
هەڵخۆنن: هەڵخۆندن.
هەڵخەڵەتان: فریوخواردنی مەردووم.
هەڵخەڵەتاندن: فریودانی یەکێک بەقسەی درۆ.
هەڵداشتن: خستنە خوارەوەی شتێک لە بەرزییەکەوە.
هەڵدان: فڕێدانی شت بۆ لای ژووروو. ژمارەکردنی شت لەدوای یەک بەناوبردنیان: فیسار کەس چی بەسەر هاتبوو هەمووی (هەڵدا) . مەدحکردنی یەکێک بەدرۆ بۆ لاسدانی. هاتنە قسەی یەکێک بەبێ ئەوەی ڕووی تێ بکرێ: تا لێت نەپرسن لە هیچ قسەیەکدا (هەڵمەدەرێ).
هەڵدانەوە: لابردنی سەری شتی داپۆشراو. پەیدابوونەوەی برین یا نەخۆشی کۆن. سەوزبوونەوەی دار و درەخت و شینایی کۆن لەسەر ڕیشەکەیانەوە.
هەڵدڕان: دڕانی شت لە باری درێژی.
هەڵدڕاوی: عاستی هەڵدڕانی شت .
هەڵدڕیاگ: د. هەڵدڕاو.
هەڵدڕیان: د. هەڵدڕان.
هەڵدڕین: دڕینی کاڵا لەسەر باری درێژی. هەڵکەندنی زەوی بەدرێژی و قووڵی.
هەڵدرواو: شتێکە لە ڕاستە درواب‌ێ.
هەڵدروو: هەڵدرواو: هەڵدرووی کە واتە بیکە بە هەڵدروو.
هەڵدروون: لەیەکدانی پارچەی کاڵا بەتەقەڵ لەسەر شان.
هەڵدورواو: هەڵدرواو.
هەڵدوریاگ: د. هەڵدرواو.
هەڵدوروون: هەڵدروون.
هەڵدوریان: د. هەڵدروون.
هەڵدورین: هەڵدروون.
هەڵدۆشین: دۆشینی مەمکی ئافرەت.
هەڵدوورین: هەڵدورین.

هەڵدێر: هەڵدێرگە.
هەڵدێران: کەوتنەخوارەوە لە شوێنی بەرز.
هەڵدێراو: گیاندارێکە کە لە بەرزییەکەوە کەوتبێتە خوارەوە.
هەڵدێرگە: جێی سەختی زۆر لێژ.
هەڵدێریاگ: د. هەڵدێراو.
هەڵدێریان: د. هەڵدێران.
هەڵڕژان: ڕژانی شت سەربەرەوخوار بەهوروژم.
هەڵڕژاندن: هەڵڕشتن.
هەڵڕژاو: شتێکە کە بەهوروژم هەڵڕژابێ.
هەڵڕژیاگ: د. هەڵڕژاو.
هەڵڕژیان: د. هەڵڕژان.
هەڵڕشتن: ڕشتنی شت بەهوروژم.
هەڵڕوانین: ڕوانین و حاوبڕینە شت بەبەرزی.
هەڵز: ز. هەڵز.
هەڵز: گیایەکی کوێستانییە دەدرێ بەئاژاڵ و بەرزە وڵاخ و ڕۆنەکەی دەگیرێ بۆ کوشتنی کرمی برینی ئاژاڵ و، بەناسکی دەخورێ.
هەڵزران: د. جۆشدانی شتێک لەسەر ئاگر.
هەڵزڕان: هەڵتلیشان.
هەڵزڕاندن: هەڵتلیشاندن.
هەڵزرنگان: د. هاندانی یەکێک لەسەر شتێک.
هەڵزریان: د. جۆشدان.
هەڵزلەپان: هەڵزلەپین.
هەڵزلەپین: ئاوسان و سووربوونەوە و بلۆقکردنی ئەندام.
هەڵزنین: هەڵگەڕان بەقەد شتدا.
هەڵزووران: هەڵپرووزان.
هەڵزەقینەوە: هەڵبەزینەوە.
هەڵژلێویان: د. هەڵشێوانی شتێک. پێچخواردن.
هەڵژماردن: ژماردنی شت یەکەیەکە .
هەڵژماردە: شتی ژمێراو. شتی هەڵبژاردە.
هەڵژمێرراو: شتێکە کە ژمێررابێ. شتی هەڵبژێرراو.
هەڵسان: ڕاستبوونەوەی گیاندار بۆ سەرپێ. بریتییە لە بەرز بوونەوە و بەخۆداهاتنی سەوزی. بریتییە لە هاتن و زۆر بوونی ئاوی چەم. ڕەقبوونی چووکی نێر.
هەڵساندن: ڕاستکردنەوەی گیاندار.
هەڵسانن: هەڵساندن.
هەڵسانەوە: کەوتنەوە سەرپێی نەخۆش. بریتییە لە دەوڵەمەندبوونەوەی کەسێک کە هەژار کەوتبێ.
هەڵسپاردن: هەڵپەساردن.
هەڵسپێریاگ: د. هەڵپەسێرراو.

هەڵستان: هەستان.
هەڵسووڕان: چەرخین و خولاندنەوەی شت. ئامادەبوونی کارێک.
هەڵسووڕاندن: خولاندنەوەی شت. ئامادەکردنی کارێک.
هەڵسووڕیان: د. هەڵسووڕان.
هەڵسەنگاندن: تاقیکردنەوەی سووکی و قورسی شت بەبەرزکردنەوەی.
هەڵسەنگانن: هەڵسەنگاندن.
هەڵشاخان: تووڕەبوون و شاتاندن بەسەر یەکێکدا.
هەڵشاخین: هەڵشاخان.
هەڵشڵنگاندن: لاف لێدان بەکردنی کارێک و تەواونەکردنی: خۆی هەڵشڵنگان و کەچی هیچیش.
هەڵشنگاندن: هەڵشڵنگاندن.
هەڵشڵەپاندن: هەڵگوشین و بەیەکدادانی شت.
هەڵشماردن: د. هەڵژماردبن.
هەڵشەنگاندن: هەڵشڵنگاندن.
هەڵشێلان: شێلانی شت بەسەر یەکدا.
هەڵشێوان: تێکەڵاوبوونی شت بەسەر یەکدا. تێکچوونی دڵ.
هەڵشێواندن: تێکەڵاوکردن.
هەڵشێوانن: هەڵشێواندن.
هەڵشێویان: د. هەڵشێوان.
هەڵفرتاندن: د. دەست پێوەنان و دەرکردن.
هەڵفڕاندن: باڵ پێگرتنەوەی باڵدار. بریتییە لە ئاوارەکردنی یەکێک لە جێ و ڕێی خۆی.
هەڵفڕهەڵفڕ: باڵەفڕە کردنی باڵدار .
هەڵفڕین: باڵگرتنی باڵندە و کەوتنە حەوای.
هەڵفریوان: هەڵخەڵەتان.
هەڵفریواندن: هەڵخەڵەتاندن.
هەڵفلێقاندن: د. هەڵفلیقاندن.
هەڵفلیقاندن: شێواندن و گوشینی شت بەسەر یەکدا.
هەڵفلیقاوە: شتێکە کە بەسەر یەکدا فلیقابێتەوە.
هەڵفلیقیاگ: د. هەڵفلیقاوە.
هەڵفلیقیان: د. فلیقانەوەی شت.
هەڵقاچین: هەڵپاچین.
هەڵقرچان: کرژبوونی شت لەبەر تینی گەرمی.
هەڵقرچاندن: لێو هەڵقورتاندن لە یەکێک.
هەڵقرچاو: شتێکە کە کرژ بووبێ لەبەرتینی گەرمی. لێوێکە کە هەڵقورتابێ.
هەڵقرچیاگ: هەڵقرچاو.
هەڵقرچیان: د. هەڵقرچان.
هەڵقڵتیان: د. جۆشخواردنی شتی شل.

هەڵقڵیشان: لەتبوونی دار لەباری درێژی.
هەڵقڵیشاندن: لەتکردنی دار لە باری درێژی.
هەڵقورتان: خۆقوتکردنەوە و تێچوون لە کارێکدا.
هەڵقورتاندن: لچ خوارکردنەوە لە یەکێک بەمۆڕییەوە.
هەڵقورتیان: د. هەڵقورتان.
هەڵقوڕاندن:خواردنەوەی شتی شل بەڕەنگێک کە دەنگی لێوەبێ.
هەڵقوڕانن: د. هەڵقوڕاندن.
هەڵقوڵان: هەڵقوڵین.
هەڵقوڵتان: د. هەڵقورتان.
هەڵقوڵتیان: د. هەڵقوڵتان.
هەڵقوڵیان: د. هەڵقوڵان.
هەڵقوڵین: هاتنەدەرەوەی ئاو لە زەوی بەقوڵپ. بریتییە لە پەیدابوون و قوتبوونەوەی یەکێک کوتوپڕ: ئەوە لە کوێوە (هەڵقوڵایت).
هەڵقون هەڵقون: قونەقونکردنی گیاندار.
هەڵقونیان: د. پەیدابوونی شتێک کوتوپڕ .
هەڵقونین: خۆهەڵخستنەوە و قونەکردن .
هەڵقەمچان: خواربوونەوە و هەڵگەڕانەوەی شت.
هەڵقەندن: هەڵکەندن.
هەڵکاڵان: هەڵشاخان.
هەڵکاڵیان: د. هەڵکاڵین.
هەڵکاڵین: هەڵشاخان.
هەڵکرچان: هەڵقرچان.
هەڵکرچاندن: هەڵقرچاندن.
هەڵکرچیان: د. هەڵکرچان.
هەڵکرد: گوزەران و ڕابواردن: ئەمە بازاڕم بێ (هەڵکرد)م نابێ.
هەڵکردن: داگیرساندنی چرا و ئاگر. پەیابوونی با: ڕەشەبا (هەڵی کرد). هەڵدان و بڵاوبوونەوەی بەیداخ. لاودانی ئاو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر: ئاوەکە (هەڵکەرە) سەر مەرەزەکە. کۆکردنەوەی بەن و دەزوو لەسەر شتێک. گوزەرانکردن: لەگەڵ تۆ (هەڵناکەم). گورجکردنەوەی شت: داوێنت (هەڵکە).
هەڵکراندن: خوراندنی شوێنێک بەنینۆک بەجۆرێک کە کرەی لێوە بێ. بریتییە لە زانینی شتێکی کەم لە باسێکی نووسراوی گران: تۆزێکم لە دەرسەکەم (هەڵکران). پەیداکردنی شتێکی کەم بەچنگەکرێ: بەشی گوزەرانی ئیمرۆم (هەڵکران).
هەڵکرن: ز. هەڵکەندن.
هەڵکریان: د. هەڵکردنی ڕیس.
هەڵکزان: سووربوونەوەی شت لەسەر ئاگر.
هەڵکزاندن: سوورکردنەوەی گۆشت و دووگ لەسەر ئاگر.
هەڵکزانن: د. هەڵکزاندن.
هەڵکزیان: د. هەڵکزان.
هەڵکشان: بەرەوژووربوونەوەی شت .
هەڵکشاو: بریتییە لە مەردوومی باڵابەرز. شتی هەڵکێشراو.
هەڵکشاوی: ئەلفێکی پچکۆلەیە لەسەر پیتێکی عەرەبی دادەنرێ کە ئەلفی بەدەمەوە بێ.
هەڵکشیان: د. هەڵکشان.
هەڵکفان: هەڵزڵەپین و ئاوسانی جەستە. هەڵاتن و بەرزبوونەوەی هەویر. هەڵچوونی چێشت لەسەر ئاگر.
هەڵکفاندن: بەئەسکوێ هەڵگرتن و تێکردنەوەی شتێک کە لەسەر ئاگر هەڵچێ .
هەڵکفانن: د. هەڵکفاندن.
هەڵکفیان: د. هەڵکفان.
هەڵکفین: هەڵکفان.
هەڵکلاشیان: د. هەڵکلاشین.
هەڵکلاشین: د. هەڵکڕاندنی جەستە.
هەڵکنیاگ: د. هەڵکەنراو.
هەڵکوتان: شوشتنی کاڵا بەگرمۆڵەیی و کوتانی بەسەر شتێکدا. هەڵکوتانە سەر شتێک.
هەڵکوتاندن: شوشتنی کاڵا بەهەڵگلۆفتنی و دانی بەشتێکدا.
هەڵکوتانن: د. هەڵکوتاندن.
هەڵکوتانەسەر: پەلاماردان و چوونە سەر شتێک بەچالاکی.
هەڵکوت هەڵکوت: خۆکوتان و هاتن لە ڕێییەکی دوورەوە بۆ مەبەستێک.
هەڵکوتیان: د. هەڵکوتان.
هەڵکوڕووزان: هەڵپڕووزان.
هەڵکوڕووزاندن: هەڵپڕووزاندن.
هەڵکوڕووزانن: هەڵکوڕووزاندن.
هەڵکولۆشاندن: د. هەڵکۆڵین.
هەڵکولۆشانن: د. هەڵکولۆشاندن.
هەڵکولۆشیان: د. هەڵکۆڵین.
هەڵکولۆشین: د. هەڵکۆڵین.
هەڵکۆڵین: هەڵکەندنی شتێک بەقووڵی.
هەڵگەڕاننەوە: د. هەڵگەڕاندنەوە.
هەڵکەفت: د. هەڵکەوت.
هەڵکەفتگ: د. هەڵکەوتوو.
هەڵکەفتن: د. هەڵکەوتن. هەڵەنگووتن.
هەڵکەندن: دەرهێنانی شتێک لە شتێک بەنهێم. کۆڵینەوە و هەڵگێڕانەوەی هەموو شتێک. نووسین لەسەر مۆر.

هەڵکەنراو: شتێکە کە لەبن دەرهێنرابێ.
هەڵکەنن: د. هەڵکەندن.
هەڵکەنیاگ: د. هەڵکەنراو.
هەڵکەوت: ڕێکەوت.
هەڵکەوتن: هەڵئەنگوتن. ڕێکەوتن. پەیدابوونی شتێک لەناو چەند شتێکی تردا زۆر بەباشی.
هەڵکەوتوو: شتێکی زۆر چاکی نایابە لەناو چەند شتێکی تردا.
هەڵکەوتە: هەڵکەوتوو.
هەڵکەهەڵک: هەنکە هەنک.
هەڵکێشان: دەرهێنانی شتێک لە شتێکی تر بەنهێنی. هەڵدانی یەکێک بەدرۆ بۆ لاسەدانی. بەرزکردنەوەی شتێک لە چاڵاییەوە بۆ بەرزی.
هەڵکێشیان: د. هەڵکێشان.
هەڵگرتن: گرتنی شتێک بەدەست و بەرزکردنەوەی. هەڵکێشانی مووی دەموچاو بەکشتەک. ڕەدوخستنی ئافرەت بەدزی کەسوکارییەوە لەلایەن دۆستییەوە بۆ ئەوەی مارەی بکا. کردنی شاف بەکۆمدا.
هەڵگرتنەوە: سڕینەوەی شتی نووسراو. هەڵگرتنی مەڕ و بزنە بۆ کار و بەرخێک کە دایکیان نەمابێ.
هەڵگرتەیی: تیلکردنی هەڵمات بەجۆرێک کە لە زەوی بەرزبێتەوە.
هەڵگران: داگیرسان و گرگرتنی ئاگر. بریتییە لە دەوڵەمەندبوونی یەکێک زووبەزوو: فیسار کەس زوو (هەڵگرا).
هەڵگرسان: هەڵگیرسان.
هەڵگرساندن: هەڵگیرساندن.
هەڵگرسانن: هەڵگیرساندن.
هەڵگرسیاو: د. هەڵگیرساو.
هەڵگوتن: مدح.
هەڵگۆزان: هەڵگۆزین.
هەڵگۆزین: هەڵێنجانی ئاو لە بیر یا لە حەوز.
هەڵگۆستن: هەڵگۆزین.
هەڵگوشین: گوشینی شت پڕ بەچنگ .
هەڵگولۆفتن: گوشین و بەیەکدادانی شت بەدەست.
هەڵگولۆفین: هەڵگولۆفتن.
هەڵگواستن: هەڵگۆزین.
هەڵگەڕان: هەڵچوون بەقەد دار و درەخت و شوێنی بەرزدا.
هەڵگەڕاندنەوە: ئەم دیو ئەودیوکردنی شت. دەرکردنی یەکێک لەژێر فەرمانی یەکێک.
هەڵگەڕانەوە: ئەم دیو ئەودیوبوونی شت. ئاوڕدانەوەی گیاندار بەملا و بەملا یا دەرچوون لەژێر فەرمانی یەکێک.
هەڵگەڕاوە: شتێکە کە هەڵگەڕابێتەوە .
هەڵگێڕانەوە: ئەم دیو ئەودیوکردنی شت. پەشیمان کردنەوەی یەکێک لە یەکێک .
هەڵگێڕ و داگێڕ: ئەم دیو ئەودیوکردنی شت.
هەڵگێڕ و وەرگێڕ: هەڵگێڕ و داگێڕ.
هەڵگیرسان: داگیرسانی ئاگر و چرا. بریتییە لە دەست پێکردنی جەنگ و هەرا.
هەڵگیرساندن: داگیرساندنی ئاگر و چرا. بریتییە لە دامەزراندنی جەنگ و هەرا.
هەڵگیران: ڕەدووکەوتنی ئافرەت بۆ پیاو.
هەڵگیراو: شتێکە کە هەڵگیرابێ. ئافرەتی ڕەدووکەوتوو.
هەڵگیریاک: د. هەڵگیراو.
هەڵڵا: هەرا و هوریا، (هەڵڵا هەڵڵا) هەرا و هوریای زۆر.
هەڵڵمبڵڵم: ڕۆیشتن پێ بەپێ بەم ڕەنگە پاژنەی ئەو پێیە کە دەیگوێزیتەوە بینووسێنیت بەپەنجەی ئەوی ترتەوە.
هەڵلووشان: هەڵلووشین.
هەڵلووشین: هەڵمژینی شت بەدەم بەلووت بەجۆرێک کە دەنگی لێوەبێ.
هەڵلەرزین: لەرزین لە سەرما یا لە ترسا.
هەڵم: شتێکە وەک دوکەڵ لە تەڕی و گەرمی پەیدا دەبێ.
هەڵمات: شتێکی خڕی لووسی پچکۆلانەیە لەبەرد یا لە شووشە منداڵ یاری پێ دەکات.
هەڵماتان: د. هەڵماتێن.
هەڵماتێن: یاری کردن بەهەڵمات.
هەڵماسیان: د. هەڵاوسان.
هەڵماسین: د. هەڵماسیان.
هەڵماڵران: گورجبوونەوەی داوێن و دەرەلنگی کاڵا.
هەڵماڵیان: د. هەڵماڵران.
هەڵماڵین: گورجکردنەوەی قۆڵی کاڵا یا داوێن و دەرەلنگ.
هەڵماو: ئاوێکە کە بەهەڵم گیرابێ (ئاوی مقطر).
هەڵمژاردن: هەڵژماردن.
هەڵمژتن: هەڵمژین.
هەڵمژین: هەڵلووشینی شت بەدەم یا بەلووت بەتوندی.
هەڵمان: هەڵئاوسان.
هەڵمساو: هەڵئاوساو.
هەڵمشتن: هەڵمژتن.
هەڵملیسان: ماچکردن بەتاسە و هەڵمژینەوە.
هەڵملیسین: هەڵملیسان.
هەڵمەت: پەلامار.
هەڵمەتبردن: پەلاماردان.

هەڵمەتدان: هەڵمەتبردن.
هەڵمەتدەر: کەسێکە کە هەڵمەت بەرێ.
هەڵمەتەکاسە: بریتییە لە مەردوومی خۆ تێ هەڵقورتێن لە هەموو کارێکدا. بریتییە لە مەردوومی زۆرخۆری چنۆک.
هەڵمەقۆ: جۆرە یارییەکە بەهەڵدان و گرتنەوەی چەند بەردێکی ورد دەکرێ.
هەڵمەقووت: قووتدانی شتی گەرم.
هەڵمەڵە: هـ. هێرۆ.
هەڵمیزان: بەپێوە میزکردنی هێندێ گیاندار بەقەد شتێکی بەرزدا.
هەڵمیزتن: هەڵمیزان.
هەڵنان: هەڵپەساردن. مەدحکردن.
هەڵناوین: د. هەڵسوونی شتێک لە شتێک.
هەڵنج: د. هێڵنج.
هەڵنگافتن: با. هەڵەنگوتن.
هەڵنواڕین: هەڵڕوانین.
هەڵنۆشین: د. خواردنەوەی شتی شل .
هەڵنووتن: هەڵەنگووتن.
هەڵنووزان: لە خوا پاڕانەوە لەگەڵ نووزە و دەست بەرزکردنەوە و چاو برینە ئاسمان.
هەڵنیشتن: خۆ کزۆڵەکردن و سنگنانە زەوی باڵندە لە شەودا.
هەڵۆ: باڵندەیەکی ڕاوکەری دڕی گۆشتخۆری تیژ باڵە.
هەڵوا: حەڵوا.
هەڵواستن: هەڵواسین.
هەڵواسران: بوونی شت بەجۆریک کە هەڵواسرابێ.
هەڵواسراو: شتێکە کە هەڵواسرابێ.
هەڵواسین: بەندکردنی شتێک بە بەرزییەکەوە.
هەڵوایی: حەڵوایی.
هەڵۆدان: د. هەڵدانەوە.
هەڵۆدڕین: هەڵدڕین.
هەڵۆرک: د. جولانەی گوریس یا دار یا ئاسن.
هەڵۆڵ: شتی بۆشی کلۆر.
هەڵوو: هەڵووژەڕەشە.
هەڵووجە: هەڵووژە.
هەڵووچکە: هەڵوو.
هەڵووچە: هـ. هەڵووژە.
هەڵووربلوور: یارییەکی منداڵانەیە بەدانیشتنەوە بەڕیز قاچ درێژ دەکەن یەکێکیان بەقاچی هەموویاندا دەماڵێ و دەڵێ: (هەڵووربلوور تەکامە، زەرد و سوور و شەمامە، ئاوەبەرە، دەنکەزەرە، پێ لابەرە، مێخم کوتا، مێخ هەڵبەزی، تیکەی ڕاستم ئەوەی گەزی) ئینجا لەسەر قاچی کامیان بڕایەوە ئەو قاچە هەڵدەکێشرێ تا دوایی.
هەڵوورکە: د. دیلانێ.
هەڵووژە: میوەیەکی خڕی مزری ناوڕەقی زەرد یا مۆرە.
هەڵووژەڕەشە: جۆرە هەڵووژەیەکی ڕەشباوە.
هەڵووژەزەردە: جۆرە هەڵووژەیەکی زەردە.
هەڵووژە سیقەتۆرەیی: جۆرە هەڵووژەیەکی سەوزکاری گەورەی مزری ڕەقە.
هەڵووشە: گوڵێکی کوێستانی بۆنخۆشی جوانە.
هەڵووشین: هەڵگوشین.
هەڵووک: دارێکی کورتی دادراوە، منداڵان لە یاری هەڵووکێندا بە(دار هەڵووک) پێیدا دەماڵن و لەسەر شار دووری دەخەنەوە.
هەڵووکان: د. هەڵووکێن.
هەڵووکێن: یاری کردن بەدار و هەڵووک.
هەڵووڵین: وڵینی شت بەسەر یەکدا بەزۆری.
هەڵۆهاوردن: د. ڕشانەوە و هێنانەوەی خواردن.
هەڵوەران: هەڵوەرین.
هەڵوەراندن: داتەکاندنی گەڵای درەخت و دەنکی هەنار و شتی تر.
هەڵوەرین: کەوتنە خوارەوەی گەڵاو بەری درەخت.
هەڵوەزانەوە: د. هەڵبەزینەوە.
هەڵوەزنین: هەڵوێزنین.
هەڵوەزینەوە: د. هەڵبەزینەوە.
هەڵوەژارتن: د. هەڵبژاردن.
هەڵوەسان: هەڵوەستان.
هەڵوەست: هەڵبەست. وێستانێکی کەم بەدیار شتێکەوە.
هەڵوەستان: وێستانی یەکێک بەپێوە لە بەردەمی یەکێکدا کە دانیشتبێ.
هەڵوەستن: هەڵبەستن.
هەڵوەستە: هەڵبەستە.
هەڵوەشان: لە یەکبوونەوەی پارچەی شت.
هەڵوەشاندن: هەڵدانەوەی جێگای داپۆشراو. لەیەککردنەوەی پارچەی شت. ڕاوەشاندن: دەست (هەڵ مەوەشێنە).
هەڵوەشاندنەوە: بریتییە لە تێکدانی کارێک.
هەڵوەشانن: د. هەڵوەشاندن.
هەڵوەشانەوە: بریتییە لە تێکچوونی کارێک.
هەڵوێزنین: کەلاّمەکردنی گوریس و بەستنی.
هەڵوێست: شوێنێکی تایبەتییە کە مەردووم تێیدا بوەستێ (موقف).

هەڵوێستان: هەڵوەستان.
هەڵە: گیاندارێکە کە لە کاروباردا لەبەر تێ نەبینی تێ بکەوێ.
بێژنگ و قەلبیری شاش. شتی ناڕاست.
هەڵهاتن: هەڵاتن.
هەڵهاتوو: هەڵاتوو.
هەڵهانین: هەڵهێنان.
هەڵهانینەوە: هەڵهێنانەوە.
هەڵهاووردن: هەڵهێنانی شت.
هەڵهاووردنەوە: هەڵهێنانەوە.
هەڵهاویشتن: هەڵاویشتن.
هەڵهاویتن: هەڵاویستن.
هەڵەباش: گیانداری هەڵەی جلفڕ.
هەڵەبوون: ڕێ ونکردن.
هەڵەپاس: سەگی هەڵەوەڕ.
هەڵەت: شوێنی سەخت لە شاخ.
هەڵەتانج: باڵندەیەکی ئاوی سوور و سپی زۆر جوانە لە قاز پچووکتر و لە مراوی گەورەترە.
هەڵەخەرج: د. مەردوومی دەست بڵاو.
هەڵەداوان: ڕۆینی بەپەلە و پەشۆکاوی.
هەلەرە: د. هەلووکێن.
هەڵەشە: هەڵەباش.
هەڵەشەیی: جلفڕی گیاندار.
هەڵەفە: قوڵفە.
هەلەق مەلەق: د. هەللەق مەللەق.
هەلەک: ز. ئەلقەی ئاسن و شتی تر.
هەڵەکار: کەسێکە لە کاروباریدا هەڵەی زۆربێ.
هەڵەکردن: پەلەپەلکردن. غەڵەتکردن: هەڵەت زۆرە لە نووسیندا یا لە قسەکردندا یا لە ژماردندا.
هەڵەکۆک: گیایەکی بەهارییە گەڵای وەک بی وایە بنکێکی شیرینی خۆشی هەیە.
هەلەکە: د. هەلەکەسەما.
هەلەکە سەما: مشکگرە.
هەڵەگەڕ: د. کەسێکە کە زۆر بگەڕێ و ڕێی بکەوێتە هەموو شوێنێک.
هەڵەم: ترێیەکە کە دەنکەکەی ناوبەناو گەورە نەبووبێ و، بەوردی مابێتەوە.
هەڵەمکردن: وەرینی بەرسیلە لە کاتی ڕشانەوەیدا.
هەڵەمووت: کێوی زۆر سەختی هەزار بەهەزار.
هەڵەموور: با. ژیلەمۆ.
هەڵەنگووتن: هەڵئەنگوتن.
هەڵەودان: د. هەڵدانەوە.
هەڵەوگەڕ: هەڵەوگێڕ.
هەڵەوگەڕانەوە: د. هەڵگێڕانەوە.
هەڵەوگەڕیان: د. هەڵگەڕانەوە.
هەڵەوگێڕانەوە: د. هەڵگێڕانەوە.
هەڵەوهاووردن: د. هەڵهێنانەوەی شت بەهێڵنج.
هەڵەوەڕ: سەگی هەڵەپاس. بریتییە لە مەردوومی دەم پیسی بێ شەرم.
هەڵەوەڕی: زۆر وتن بەبێ شەرمانە.
هەلهەلووک: با. بەڵاڵووک.
هەلهەلە: چۆرە قریوەیەکە ژنان لە شاییدا دەیکێشن.
هەلهەلەکێش: کەسێکە لە شاییدا هەلهەلە بکێشێ.
هەلهەلەکێشان: قریوە کێشان لە شاییدا.
هەڵەهەڵ: قسەکردن بەپەلە و دەنگی بەرز.
هەڵهێنان: بەرزکردنەوەی پێڵووی چاو. کردنی هێلکە بەجووجەڵە بەهۆی کڕکەوتنی باڵندەوە لەسەری یا بەهۆی ماکینەوە. دۆزینەوەی قسەی ناو دڵ و شتی شاراوە: ئەوی لە دڵمایە یا ئەوی لە مستمایە (هەڵی بێنە).
هەڵهێنانەوە: برینی ملیوان و نافەک بەمەقەست. ڕشانەوە و هێنانەوەی خواردنی دەروون.
هەڵهێنجان: هێنانە دەرەوەی ئاو لە بیر بەدۆڵچە و گوریس.
هەڵەیی: تێ نەبینی لە کارووباردا.
هەلیسکان: هەڵخلیسکان.
هەلیسە: ل. هەریسە.
هەڵێنجان: هەڵهێنجان.
هەلینگ: دەرەلنگی دەرپێ.
هەڵیتر: هەڵیترگ.
هەڵیترگ: کارووش.
هەڵیت و پەڵیت: د. خڵیت و پڵیتی ناو ماڵ.
هەڵیز: هـ. مەشکە.
هەڵیزەبرە: هـ. مەشکەدرە.
هەلیلە: جۆرە دەرمانێکی تفت و تاڵی ڕەوانی گەرمیانییە. جۆرە گیایەکی باڵا بەرزە شتێکی درێژکۆلەی دانە دانە دەگرێ، ددانی پێ دەئاژنرێ.
هەلین: هەڵهێنان.
هەڵێن: کۆڵ.
هەم: دیسان.
هەمار: د. عەمار.
هەماراو: د. عەماراو.
هەمارکردن: د. عەمارکردن.

هەمارەپۆ: د. عەمارەپۆ.
هەماز: ل. مندالّدان.
هەمان: وتەیەکە بۆ شتێک بەکاردێنرێ کە لە ناوەندی قسەکەر و قسە بۆکراو لەوەپێش باس کرابێ و ناسرابێ: ئەو پیاوەی کەدوێ شەو هاتە لات ئیمشەو (هەمان) پیاو هاتە لای منیش. هەمووان.
هەمانە: پێستی دەرهاتووی خۆشکراوی مەڕ و بزنە کە شتی وشکی تێ دەکرێ.
هەمبان: هەمانە.
هەمبانە: هەمانە.
هەمبەر: بەرامبەر.
هەمبێز: ز. باوەش.
هەمپا: ز. بەرامبەر.
هەمتا: هاوتا.
هەمتایی: هاوتایی.
هەمتی: هەمدیسان.
هەمدەم: هاودەم.
هەمدەمی: هاودەمی.
هەمدیسرۆ: هەمدیسان.
هەمدیس: هەمدیسان.
هەمدیسان: دووبارە.
هەمدیسانەوە: هەمیسان.
هەمڕا: هاوڕێ.
هەمڕاز: هاوڕاز.
هەمڕایی: هاوڕێیی.
هەمرۆ: د. هەرمێ.
هەمرێشک: ئاژاڵی کەم شیر.
هەمزار: هاودەم.
هەمزەبەگی: جۆرێکە لە بەری دارمازوو.
هەمس: بزن و مەڕی ڕەش و سوور.
هەمسایە: دراوسێ.
هەمکە: د. حەمکە.
هەمنک: ئەو گوریسە کورتانەیە کە داوێنی دەواری پێ دەبەسترێ بەسنگەوە.
هەمووانی: بۆ گشتی (عمومی).
هەموو: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ داگرتنەوەی ئەفراد یا بەشەکانی شتێک: (هەموو) کەسێک دەمرێ، یا هەنارەکەم (هەموو) خوارد.
هەمە: ئێمە. هەموو: هەمەڕەنگ.
هەمهەمە: غەوغا.
هەمیان: د. هەمووان.
هەمی: ز. هەموو.
هەمیر: ه. هەویر.
هەمیز: باوەش.
هەمیس: هەمیسان.
هەمیسان: هەمدیسان.
هەمیسانەوە: هەمیسان.
هەمیشە: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ تێکڕایی کات (عمومی زمان): (هەمیشە) دەخوێنمەوە.
هەمیشەبەهار: گوڵێکی زەردی پەڕە پەڕەی گەڵاپانی هەمیشە سەوزە.
هەمیشەوەوی: د. ژنێکە کە زۆر شوو بکا.
هەمیشەیی: شتی بێ سەرەتا و بێ پایان .
هەن: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ بوونی چەند شتێک: گێلاس و ئالووبالّوو لە سلێمانی هەن.
هەنا: هێزی چاو و دەست: تاچاو (هەنا) دەکات سەوزییە، یا تا دەست (هەنا) دەکات کەڵەگەتە. ئارام: ئەم شەو (هەنا)م نەداوە.
هەنار: میوەیەکی خڕە بەقەد پرتەقاڵێک دەبێ ناوەکەی پڕە لە دەنکی خۆشی ئاودار. درەختی هەنار.
هەناردن: ناردن.
هەناردنەوە: ناردنەوە.
هەناسکەبڕکێ: هاژیان.
هەناسکەبڕە: هەناسکەبڕکی.
هەناسکەبڕێ: هەناسەبڕکێ.
هەناسە: بایەکە کە بەدەم یا بەلووت وەربگیرێ.
هەناسەبڕکە: هەناسەبڕکێ.
هەناسەبڕکێ: هەناسکەبڕکێ.
هەناسەبڕە: هەناسەبڕکێ.
هەناسەبڕین: بریتییە لە لێدان لە یەکێک بەجۆرێک کە نەتوانێ هەناسە بدا. بریتییە لە کونبڕکردنی شوێنێک.
هەناسەدان: بردنەژوورەوە و هێنانەدەرەوەی یا بەدەم یا بەلووت. بریتییە لە کەمێک پشوودان و حەسانەوە: دانیشە (هەناسەیەک) بدە. بریتییە لە هاتوچۆکردنی با لە شوێنێکەوە: پەنجەرەکە لە گەلێ لاوە (هەناسە دەدا).
هەناسەدانەوە: دەرکردنی هەوا لە سی لە ڕێگای لووتەوە.
هەناسەدەرهاتن: هاتنەدەرەوەی هەناسە، ئەم وتەیە هەر لە نەفیدا بەکاردێنرێ: سەرمام بووە (هەناسەم دەرنایەت) .
هەناسەسارد: بریتییە لە مەردوومی کلۆڵی بەدبەخت.
هەناسەسوار: کەسێکە کە هەناسەی بەگران دەرچێ.

هەناسەسواربوون: بریتییە لە هەناسەبڕکێ.
هەناسەکێشان: هەناسە هەڵکێشان.
هەناسە هەڵکێشان: بردنە ژوورەوەی با بۆ ناودەروون. بریتییە لە خەفەتخواردن: فیسار کەس هەر (هەناسە هەڵدەکێشێ).
هەناڤ: با. هەناو.
هەناو: هێز و تەوانایی.
هەنجن: شــتی وردی جنراو، (هەنجن هەنجن) شــتی زۆر وردی جنراو.
هەنجنین: جنین و وردکردنی شت بەسەر یەکدا.
هەنجووجک: د. ناوکی هەرمێ.
هەنجیر: میوەیەکی خڕی نەرمی زەرد یا مۆری شیرینە. درەختی هەنجیر.
هەنجیران: کاتی گەرمەی هەنجیر.
هەنجیرباوا: د. مۆز.
هەنجیرەوەرە: هـ. باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە هەنجیر دەخوات.
هەند: هێند.
هەندرێشە: گـیایەکی بەهارییە لە پێچک دەچێ بەڵام لقی زۆرە کەپێی دەڵێن قوڕادە.
هەندە: هێند.
هەندەک: هێندێک.
هەندێک: کەمێک لە شتێک.
هەنسک: هەناسە بەدەم گریانەوە، هەنسکە هەنسک: هەنسکی یەک لەسەر یەک.
هەنسکەبڕکێ: هەناسەبڕکێ.
هەنسکەبڕە: هەنسکەبڕکێ.
هەنسکەبڕێ: هەنسکەبڕکێ.
هەنک: شۆخی و گاڵتەچێتی.
هەنکەهەنک: نکەنک لەگەڵ هەناسەبڕکێدا.
هەنگ: جـۆرە مـێشـێکی گەورەی چزووداری زەردە شـەش قـاچی هەیە شــان هەڵدەبەســتێ و هەنگوینی تێ دەکـات. جــۆرە کرمێکە لە ناوەندی پێست و گۆشـتی ڕەشـەوڵاخ و وڵاخی یەکسـم پەیا دەبێ لە پاشـا پێسـتـەکـە کـون دەکـا و باڵ دەگرێتەوە. هەند.
هەنگانە: دەیەکی هەنگە کــە ئاغــا لە مــسکێنی دەســێنێ یا بەهەنگوینی یا بەپارەیی.
هەنگاو: ماوەی هەردوو قاچ لە ڕۆیندا.
هەنگاوبردن: هەنگاونان.
هەنگاونان: ڕۆین بەهەنگاو، بریتییە لە پێشکەوتن لە کارێکدا: فیسار کەس (هەنگاوێکی باشی نا).
هەنگبڕ: کەسێکە کە بزانێ هەنگ ببڕێ. شتێکە لە ئاسن یا لە دار هەنگوینی پێ دەبڕدرێ.
هەنگبڕین: بڕینی شوێنی هەنگ بۆ دەرهێنانی هەنگوینەکەی.
هەنگخۆرکە: باڵندەیەکی پچووکی دەنووک درێژە وەک ماسیگرە عەودالّی هەنگ خواردنە.
هەنگدان: کوورەی هەنگ.
هەنگدۆز: کەسێکە لە دۆزینەوەی پلوورەی هەنگی کێویدا پسپۆڕ بێ.
هەنگژاڵ: هەنگی پەروەردەی ناو شاخ.
هەنگڤار: ئێوارە وەختە.
هەنگڵ: گۆشەی هەمانە و جەواڵ. هەردوو باڵ و قۆڵی گیاندار تا شانی: کتێبەکە بخەرە بن (هەنگڵ)ت.
هەنگڵەشەلە: هەنگڵەشەلێ.
هەنگڵەشەلێ: قونەکردن و ڕۆین لەسەر یەک قاچ.
هەنگۆ: با. ئێوە.
هەنگوان: د. جۆرە گوڵێکی تۆپی باڵابەرزە.
هەنگۆر: هەنگوور.
هەنگوشت: ئەنگوشت.
هەنگوشتیلە: ئەنگوستیلە.
هەنگۆڵ: هەنگڵ.
هەنگولیسک: ئەموستیلە.
هەنگووچک: فەقیانە.
هەنگووچنە: د. کەندەسمە.
هەنگوور: ترێ.
هەنگوورە: د. جۆرە جاڵجاڵۆکەیەکە.
هەنگووڕێ مـەنگووڕێ: د. جـۆرە یـارییـەکی دوو دەسـتـەییـیـە منداڵان دەیکەن.
هەنگووژە: د. جەوی.
هەنگوون: هەنگوین.
هەنگوین: ڕەنگێکی شـیـرینی خـۆشـە هەنگ دەیکا تا شـانی هەڵبەستراوییەوە .
هەنگوینی بێ مـێش: بریـتـیـیـە لە دەسـتکەوتێکی بەنرخی بێ ئەرک.
هەنگە: با. هەنگۆ.
هەنگەبۆڵە: د. جۆرە هەنگێکی زلە کە هەنگوین ناکات.
هەنگەچینە: کەندەسمە.
هەنگەڕشکە: جۆرە هەنگێکی وردی بەکارە.
هەنگەژاڵ: هەردێکە کە هەنگی زۆری تێدابێ. کوورەی هەنگ . ناوی دێیەکە لە سنووری بانە.
هەنگەشەلە: هەنگڵەشەلە.
هەنگەشەلێ: هەنگڵەشەلێ.
هەنگەلان: خانووچکەیەکە پلوورە هەنگی تێدا دادەنرێ.

هەنگەماڵ: د. شانی هەنگوین.
هەنگەوچنە: د. هەنگەچینە.
هەنگەوون: هـ. گەوون.
هەنگێزە: هەنگڵی جەواڵ و تێر.
هەنگێن: هەنگینێ.
هەنگینێ: ئەو حەلە: کەی ئیشەکەت تەواوکرد هەنگینێ منیش دێم.
هەنووکە: ئێستاکە.
هەنوون: چەورکردنی شوێنێک لە ئەندام بەڕۆن یا بەدەرمان لەگەڵ دەست پێداهێنانیدا.
هەنەزا: منداڵی هەوێ.
هەنەزازا: منداڵی هەنەزا.
هەنەزاگ: د. هەنەزا.
هەنەهەن: هەنکە هەنک.
هەنیشک: ئانیشک.
هەنیە: ناوچەوان.
هەنی: هەینی. شووتی. ئێستە. بڕوا. ئیتر. کوتوپڕ.
هەو: ئەو. حەو. جار: (هەو)ێک هاتم واتە جارێک. گەڕانەوە (د).
هەوا: هەوەس و ئارەزوو. کەمێک: هەوایەک دەنگ بەرزکەرەوە.
هەوا جیوە: ڕەگی درەختێکی کوێستانییە بەکوتراوی دەگیرێتەوە و دەخرێتە سەر برینی ناسۆر، زۆر باشە.
هەواخوا: د. لایەنگر: من (هەواخوا)ی تۆم.
هەواخوایی: لایەنگری.
هەواخۆر: بۆشاییەکە هەوای لێ بچێتە ژوورەوە.
هەوادار: شوێنی باگر.
هەوار: کۆمەڵە ماڵێکی دەوارنشین. هاوار (ز).
هەوارکردن: چوون بۆ هەوار.
هەوارگە: جێ هەوار.
هەوارۆ: جۆرێکە لە باڵۆرێ.
هەواکێشان: ئاوسان و هەوکردنی برین.
هەواگا: هەوادار.
هەواڵ: هاوەڵ. ئەحواڵ.
هەواڵپرسی: هەواڵ پرسین.
هەواڵ پرسین: پرسیارکردن لە چۆنێتی یەکێک لە ڕووی دۆستایەتییەوە.
هەوانتە: ئاوانتە.
هەوانتەچی: کەسێکە ماڵی مەردووم بخوا بەهەوانتە.
هەوانتەخۆر: هەوانتەچی.
هەوانچە: د. هەمانەی پچووک.
هەوانە: هەمانە.
هەوایی: کەسێکە کە ئارەزوویەک لە سەریدا بێ.
هەبوون: ز. بڕانەوەی شت.
هەوتاش: ز. سەرۆکی سەپان.
هەوجاڕ: هێرەق.
هەودا: تاوی دەزوو یا بەن.
هەودان: ز. هەڵمەت بردنە سەر دوژمن.
هەور: تەمێکە هێندێ جار بەری ئاسمان دەگرێ و بارانی لێوە دەبارێ. شتێکی پفەڵە وەک پووشوو لە کەناری دەریا پەیدا دەبێ و وەک لفکە لەشی پێ دەشۆرێ. گۆم (ل).
هەوراز: شوێنێ سەر بەرەوژووری سەخت.
هەورازی: شوینی هەوراز.
هەوربردوو: جۆرێکە لە بەری دارمازوو وەک لۆکە وایە، ناوکێکی تێدایە لە (بەرەگەلا) دەچێ. مەرەزە و گەنم و جۆیە کە هەور لێی دابێ و پووچی کردبێ.
هەور لەسەر: هەور و هەلا.
هەورنگ: د. برنگ.
هەور و با: جۆرێکە لە بەری دارمازوو بەلام بێ کەڵکە.
هەور و هەلا: کاتێکە کە هەور بەری ئاسمانی گرتبێ.
هەورەبان: شوێنێکە لە خانوو بەپێپیلکە پێیدا سەر دەکەون بۆ سەربان.
هەورەبروسکە: هەورێکە کە بروسکەی لەگەڵ بێ.
هەورەتریشقە: بروسکەی ئاسمانە لەگەڵ گرمەی هەوردا کە لە شوێنێک بدا.
هەورێشم: ئاوریشم.
هەوێشە: هـ. کەروێشک.
هەورێنک: هەورنگ.
هەوری: سرکەیی. سابرێن.
هەوریشم: ئاوریشم.
هەوزینگ: گیانەلاو.
هەوسار: سەر کەڵلەیەکە کە بەڕەشمەوەبێ.
هەوش: بزنی ڕەش و سپی (ز). حەوش (د). باخچە (د).
هەوشان: گیایەکی گەلاوردی زۆر تاڵە لە هاویندا بنج دەکا و لە پایزاندا دادەپاچرێ بۆ سووتاندن.
هەوشە: د. حەوشە.
هەوشەنگ: مەڕ و بزنێکە کە بەرخ و کاری مردبێ و هێشتا شیری مابێ.
هەوک: قوڕگ. ئەوک.
هەوکردن: ئاوسانی برین لە ناوەوە .
هەوگ: د. گەردن.

هەوگیان: هێوەرژن.
هەوڵ: تەقەلاو کۆشش بۆ شتێک.
هەوڵدان: تەقەلادان بۆ شتێک.
هەوڵە: د. ئاوڵە. مەرحەمە.
هەوڵەزلزلە: د. ئاگرە. ئاتەشەک.
هەوڵەفەرەنگی: د. هەوڵەزلزلە.
هەوڕ: دەفر و قاپی گڵێنی سوورەوەکراو.
هەوڕگەر: کەسێکە هەوڕ دروست بکا.
هەوە: ئێوە. هەوێ (د).
هەوەڕ: گۆزە و دیزەی دروست کراو کە دانرابن بۆ سوورکردنەوە.
هەوەس: ئارەزوو.
هەوەسار: د. هەوێ سار.
هەوەساری: د. هەوێ ساری.
هەوەسیاگ: د. حەپەساو.
هەوەسیان: د. حەپەسان.
هەوەڵ: یەکەمی چەند شتێک. سەرەتای شت.
هەوەڵ پایز: مانگی ئەیلوولە کە سی ڕۆژە.
هەوەڵ زستان: مانگی کانوونی یەکەمە کە سی و یەک ڕۆژە.
هەوهەو: دەنگێکە سوار لە کاتی ڕمبازیدا دەیلێ بەهاوکاری خۆی.
هەوێ: ژنی مێرد.
هەویا: هیوا.
هەویان: هەیوان.
هەوێبار: هەوێسار.
هەوێباری: هەوێساری.
هەوێدار: هەوێبار.
هەوێدی: با. گەنمەزەرتکە.
هەوێر: جیاکردنەوەی کار و بەرخە دوای تێبەردان و شیر خواردنیان.
هەوێردە: د. باڵندەیەکی زۆر قەڵەوە کە پێی دەڵێن (کەرەواڵە).
هەوێرشێل: د. کەسێکە کە بەپارە هەویر بشێلێ بۆ نانەوا.
هەوێز: شوێنێکە لە قەراخ مالان کە لە بەهاراندا شەو ئاژاڵی تێدا مۆڵ دەدرێ.
هەوێس: هەوێز.
هەوێسار: ژنێکە کە هەوێی ببێ.
هەوێساری: ژیان لەگەڵ هەوێدا.
هەوێن: شتێکە دەکرێتە شیرەوە بۆ ئەوەی کە ببێ بە پەنیر یا بە ماست.
هەوێنکردن: مەیاندنی شیر بەهەوێن.
هەوی: هەوێ (ز). مانگ.
هەویر: ئاردی بەئاوگیراوەی شێلراو.
هەویرترش: گونکە هەویرێکی کۆنی ترشاوە تێکەڵ بەهەویری تازە دەکرێ بۆ ئەوەی زوو هەڵبێ.
هەویردە: جۆرە مەلێکە لەناو دەغڵدا دەبێ.
هەویرشێل: هەوێرشێل.
هەویرواتا: گونکە هەویر.
هەویرەپتە: نان یا کولێرەیەکە کە باش نەبرژابێ.
هەها: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە ڕووی سەرسوورمانەوە و لەکاتی بیستنی قسەیەکدا وەک وتەی ئەها.
هەی: پیتی بانگکردنە بۆ نزیک: (هەی) بەقوربانت بم، یا (هەی) هاوار یا (هەیداد)، (هەی بێ داد). پیتی سەرسوورمان (ز). وتەیەکە دەوترێ بەقسە لەگەڵکراو لەکاتێکدا کە بڵێ: من نیم، واتە تۆ هەیت.
هەیاران: یاران. پاڕانەوەیەکە منداڵان لەکاتی بێ بارانیدا دەیلێن بەکۆمەڵی و، دەڵێن: (هەیاران و مەیاران، یاخوا ببارێ باران)، لە هێندێ شوێنیش دەڵێن: (هەناران و مەناران، یاخوا دەکاتە باران، بۆ فەقیر و هەژاران).
هەیاسە: کەمەرەیەکی زێڕین یا زیوینە ژنان دەیبەستنە پشتیان.
هەیاهەیا: وتەیەکە لە یاری دوو دەستەییدا بەکاردێنرێ بەم ڕەنگە دوو دوو بەپەنهانی یەکی ناوێک لە خۆیان دەنێن، ئینجا کە دێنە بەردەمی وەستاکان، دەڵێن (هەیا هەیا) ئەمانیش دەڵێن لە خۆتان هەیا. ئەوانیش ئیتر لەبەر بوورە ناوەکان دەڵێن بەم ڕەنگە دەڵێن (کێ دەیەوێ ڕۆژ و کێ دەیەوێ مانگ) وەستاکانیش هەریەکە یەکێکیان هەڵدەگرن ئیتر بەم ڕەنگە هەتا هەردوو دەستەکە بەتەواوی هەڵدەبژێردرێ.
هەیبۆر: با. کاتی عەسر.
هەیتاهەیتا: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (خێراخێرا).
هەیتوهووت: شتی هیچ و پووچ.
هەیجوو: خوازبێنی.
هەیجوویی: د. هەیجوو.
هەیرۆ: وتەیەکە ژنان بەکاری دێنن لەکاتی داخ و خەفەت دەربڕینێکدا.
هەیڤ: با. مانگ.
هەیڤک: مانگی یەک شەوە.
هەیڤی: با. ئومێد.
هەین: وتەیەکە قسەکەر بەخۆی و یەکێکی تری دەڵێ لە وەرامی کەسێکدا کە بڵێ: ئێوەهەن؟ واتە بەڵێ هەین.
هەینوو: ڕۆژی جومعە.
هەینە: د. هەینوو. هەنگینێ (د).

هەینێ: هەینوو.
هەینی: هەینوو. شووتی.
هەیوان: شوێنێکە لە خانوو کە ڕوویەکی لەسەرباری درێژی چۆڵ بێ و دیواری نەبێ و، لەسەر کۆڵەکە و نیرگەبێ.
هەیوەجان: زڵف.
هەیوێ: با. مانگی یەکشەوە.
هەیوی: د. مانگ کە چوار هەفتەیە.
هەیها: وتەی داخ و خەفەت: لە کاتێکدا کە خۆشەویستێکت بمرێ: هەیها کۆستێکی گران بوو.
هەیهای: هایها.
هەیهۆ: هەیهوو.
هەیهوو: وتەی وەڕسبوون.
هەیهە: وتەیەکە وڵاخی بەرزەی پێ لێ دەخوڕدرێ.
هەیەهەیە: هەیاهەیا.
هەیهەی: وتەی سەرسوڕمان لە شتێک: (هەیهەی) لە وەرامی یەکێکدا کە بڵێ ناخوێنم.
هەین: ز. بوون (وجود).
هێ: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی.
هێتوێن: با. تووتن.
هیتیو: هەتیوو.
هێجبی: هەیجوو.
هێجبیکەر: خوازبێنیکەر.
هجران: د. مایە و هۆی شت.
هیجرانی: جۆرە مقامێکی کوردییە .
هێجویی: هێجبی.
هیجویکەر: هێجبیکەر.
هیچتایەکی: د. هێشتا.
هێچک: د. هیچک.
هێدەرە: گامێشی چوار ساڵە.
هێدی: شتی هێواش و لەسەرخۆ.
هێدی بوونەوە: هێواشبوونەوە.
هیدی کردنەوە: هێواشکردنەوە.
هێران: هارین.
هێڕ: وڕ.
هێڕک: ل. شتومەکی ناوماڵ.
هێڕی: د. وتەیەکە لە ڕووی سووکییەوە مەردوومی پێ دەردەکرێ: (هێڕی) واتە ون بە.
هێڕی هیڕی: وتەیەکە منداڵان بەکاری دێنن لە ڕووی گاڵتە پێکردن و تەریقکردنەوەی یەکێکەوە.
هێرش: ڕۆیشتنی شت بەهوروژم و لێشاو.
هێرشبردن: ڕۆیشتن بەهوروژم و لێشاو.
هێرشهێنان: هاتنی شت بەزۆری و لێشاو.
هێرۆ: گیایەکی بەرزی گەڵاپانە گوڵێکی گەورە دەگرێ و، گەڵێ ڕەنگی هەیە، لەناو شیردا دەسووڕێتەوە بۆ چاو ئێشە، بنکەکەشی دەنرێ لە برین زوو دەری دەکات.
هێرۆن: ز. هێلکە و ڕۆن.
هێرە: با. ئێرە.
هێرەق: ئێرەق، (هێرەقبوون) ئێرەقبوون، (هێرەقکردن) ئێرەقکردن.
هێز: تەوانایی.
هێزا: د. نەعنا.
هێزدار: شتی بەهێز.
هێزگرتنەوە: پەیدابوونەوەی هێز.
هێزم: هـ. داری سووتاندن.
هێزمدان: د. جێگای داری سووتەنی.
هێزۆک: با. جۆلانەیەکە لە گوریس دروست دەکرێ بۆ لێ نیشتن.
هێزیانەوە: د. هێزگرتنەوە.
هێژ: ز. کاتی ڕابوردوو، چ دوور چ نزیک .
هێژا: با. مەردوومی بەڕێز. شایستە (لایق). بەنرخ.
هێژان: ز. هێنانی شت بەو نرخەی کە پێی درابێ: ئەم قاڵییە ئەو پارەیە دەهێنێ کە پێی دراوە.
هێژایی: با. ڕێز.
هێژین: با. هاژیان.
هێس: د. هێز.
هێستر: ز. ئێستر.
هێسر: ئێستر.
هێسک: ئێسک.
هێش: مژان.
هێشتا: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ نیشاندانی کردار یا وتارێک کە نەت کردووە یا نەت وتووە تا کاتی قسەکردنەکەت بەڵام لە نیازتدایە کە ئەو کردارە یا ئەو وتارە بکەیت، یا کردووشتە بەڵام تەواوت نەکردووە: قسەکەم (هێشتا) پێ نەووتووە، یا فرمانەکەم (هێشتا) نەکردووە، یا (هێشتا) لە کارەکە نەبوومەتەوە.
هێشتاکو: هێشتا.
هێشتاکوونێ: هێشتاکو.
هێشتاکی: د. هێشتاکو.
هێشتان: هێشتا.
هێشتاوەکو: هێشتا.
هیشتر: حوشتر.

هێشتن: ڕێدان بۆ وتن یا کردنی شتێک.
هێشتنەوە: گلدانەوەی شت.
هیشخان: د. ژووری زەخیرە.
هێشرمە: هاشرمە.
هیشک: ئێشک.
هێشوو: ڤنچکێکە کە چەند دانە ترێ یا خورمای پێوەبێ.
هێشووکردن: گوڵەوەچینی.
هێشووکەر: گوڵەوەچن.
هێشە: هێش.
هێشەماڵ: د. خاکەنازێکی پچکۆلەیە ناومالی پێ پاک دەکرێتەوە.
هێڤار: ز. تێواریێ.
هیڤرست: ز. تووترک.
هێڤران: با. هەڤران.
هێڤێن: با. هەوێن.
هێڤی: تکا (ز). هیوا (با).
هێقم: د. شتی گەورەی قایم.
هێک: با. هێلکە.
هێگ: ز. هێلکە.
هێل: حێل.
هێڵ: کێڕی جووت: خەتی سەر کاغەز.
هیلاک: ماندوو: هیلاکم با تۆزێ بحەسێمەوە. کەشەنگ: نەخۆشەکە هیلاکە، واتە کەس بەتەمای نییە.
هیلالی: تاقی سەر دەرگا و پەنجەرە کە بەکەوانەیی بێتەوە.
هێڵان: هێشتن: (بهێڵە) قسە بکەم.
هێلانە: جێگایەکە باڵندەی دەشتی لە پوش و پەڵاش دروستی دەکات و بەشەو تێیدا هەڵدەنیشێ. کونێکە زەردەواڵە و زەردەزیڕەشان و گەرای تێدا دادەنێن.
هێلانەدۆزە: هێلانەدۆزێ.
هێلانەدۆزێ: گەڕانی مریشک لە کاتی هێلکەکردندا بۆ شوێنێک کە هێلکەکەی تێدا بکات.
هێلانەشێوان: بریتییە لە سەر لێ تێکچوون و ماڵوێرانبوونی یەکێک.
هێلانەواز: گیاندارێکە کە هێلانەی لێ شێوابێ.
هیلانین: ز. بەرزکردنەوەی شت.
هیلاویستن: ز. هەڵواسین.
هێلک: دڵ: (هێلک)ت برن. خەسوو (ز).
هێلکان: مەنجەنیق.
هێلکاو: جۆرە چێشتێکە لە ئاو و هێلکە دروست دەکرێ.
هێڵکردن: بیرکردنەوە و تێبینی و، هەر لە نەفیدا بەکاردێنرێ: فیسار کەس نە (هێڵی کرد) و نەگفت جوێنێکی دا.

هێلکە: شتێکی سپی خڕی درێژکۆلەی توێکڵ ناسکە، ناوەکەی لە دوو ڕەنگ، ئاوی تێدایە، زەرد و سپی، لە باڵندە و هێندێ گیانداری تری مێینە پەیدا دەبێ و، بێچووی ئەو گیاندارە لەو هێلکەیە دێتەدی.
هێلکەدان: توورەکەیەکی درێژکۆلەیە لەناو سکی هێلکەکەردا هێلکەی تێدا بەرهەم دێ.
هێلکەڕێوی: گیایەکە بەرێکی خڕ دەگرێ ئاژاڵ دەیخوات.
هێلکەشکانێ: د. هێلکەشکێنە.
هێلکەشکێنە: جۆرە یارییەکە بەهێلکە دەکرێ.
هێلکەشەیتانۆکە: جۆرە قەواغێکی ناو کولۆری سپی پچووکی دەشتییە، ناوەکەی کرمێکی تێدایە.
هێلکەکردن: دانانی هێلکە لەلایەن گیانداری هێلکەکەرەوە.
هێلکەکەر: باڵندەیەکە کە هاتبێتە هێلکە.
هێلکە و ڕۆن: خواردەمەنییەکە دروست دەکرێ لە هێلکە و ڕۆنی داخکراو و ئارد.
هێلکە و کەرە: جۆرە خواردەمەنییەکە دروست دەکرێ لە هێلکەی کوڵاو و کەرە بەتێکەڵکردنیان.
هێلگ: د. ورگ.
هێلم: دەرمانێکە وەک کەتیرە دارتاش درزی داری پێ پڕ دەکاتەوە. ریسێکی ڕەنگکراوی خاوە لە هەودای تەونی قاڵی هەڵدەکێشرێ و بەچەقۆ دەبڕدرێ.
هێلمکاری: پڕکردنەوەی درزی دار بە هێلم.
هێڵنج: یەقدانەوەیەکی بەتەکانە کە لە دڵ تێکهەڵاتنەوە پەیدا ببێ.
هێڵنجدان: هاتنی هێڵنج.
هێلۆل: با. مەردوومی گاڵتە پێکراو.
هێلە: ز. ڕاوی پەلەور و ماسی.
هێڵە: د. هێلکە.
هێڵەپەپە: جۆرە کولێرەیەکە دروست دەکرێ لە هەویرێک کە زەردێنەی هێلکەی تێکەڵ کرابێ.
هێلەساو: بەردێک یا تەختەیەکی لووسە گۆزە و دیز و سواغی پێ لووس دەکرێ.
هێلەساودان: لووسکردنی سواغ و گۆزە و دیزە بەهێلەساو.
هێلەساوکردن: هێلەساودان.
هێلەساوە: هێلەساو.
هێڵەک: شتێکی کون کونی زۆر سخە لە تەل، ئاردی پێ دەبێژرێتەوە.
هێڵەکچی: کەسێکە کە هێڵەک دروست بکات.
هێڵەوەی: هـ. گاکۆتر.
هێلی فانک: با. ڕاوکەری مریشک.

هێلینک: با. هێلانە.
هێم: بنچینە و بناغە.
هێما: هێشتا.
هێمان: هێشتان.
هێمای: هێشتا.
هێمن: گیانداری هێدی لەسەرخۆ.
هێمنایەتی: هێمنی.
هێمن بوونەوە: هێدی بوونەوە.
هێمن کردنەوە: هیدی کردنەوە.
هێمنێتی: هێمنی.
هێمنی: هێواشی و لەسەرخۆیی.
هێمە: دار. چڵ و پۆپی درەخت.
هێنا: د. بیرکەوتنەوە.
هێنان: هانینی شتێک بۆ لای خۆت.
هێنانەجێ: بەجێ هێنانی فرمانێک.
هێنانەوە: گرتنەوەی ئەندامێکی شکاو یا لە جێ چوو. نانکردن بەتەنووری گەرم خێرا و دەستوبرد: تەنوور بەگەرمی (نەیهێنیتەوە) بەساردی نایهێنیتەوە. هێنانی شتێک بۆ لای خۆت جاری دووەم.
هێنانەوەجێ: گرتنەوەی ئەندام.
هینجانە: سوێنە.
هێند: هێندە.
هیندویی: جۆرە ترێیەکە وەک بۆڵ مازوو بەڵام ئەم دەنکی گەورەترە.
هێندە: وتەیەکە ئیشارەی پێ دەکرێ بۆ ئەندازەیەکی ئاشکرا: (هێندە)م بدەرێ، لە کاتێکدا کە بەدەست ئیشارە بکەیت بۆ ئەندازەیەک، یا (هێندە) بخۆ کە نەخۆش نەکەویت.
هێندێ: کەمێک لە شتێک: (هێندێ)کم بدەرێ.
هێنک: ز. فێنک.
هینگا: ز. وتەیەکە لە جێی وتاری (لەوکاتەدا) بەکاردێنرێ.
هینگوور: دوای ئێوارێ.
هیوا: ئومێد.
هیوادار: خاوەن ئومێد.
هیواداری: ئومێدەواری.
هێوارە: ئێوارە.
هێواش: شتی هێمنی لەسەرخۆ: با. بارانەکە (هێواش)ە، (هێواشبوونەوە) هێدی بوونەوە، (هێواشکردنەوە) هێدی کردنەوە.
هێواشی: هێمنی و لەسەرخۆیی.
هێوان: د. هەیوان.
هێوربوونەوە: هێمن بوونەوە.
هێوەر: شووبرا.
هێوەرزا: منداڵی هێوەر.
هێوەرژن: ژنی شووبرا.
هێوەرەزا: د. هێوەرزا.
هێوێن: هەوێن.
هێوی: ز. شتی شێدار.
هی: پیتی تەملیک واختصاص، ئەم ئەسپە (هی) نەریمانە و ئەوزینە (هی) ئەسپەکەیەتی.
هێی: وتەیەکە لەگەڵ تووڕەییدا بەکاردێنرێ بۆ یەکێکی سووکی بێ نرخ.
هیت: جووت: (هیت)م دەگەڕێ.
هیچ: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی (شت): (هیچ)ت پێیە؟ واتە شتت پێیە. نەبوونی شت: تۆ پیاوێکی (هیچ)یت واتە پیاو نیت.
هیچتا: د. هێشتا.
هیچتاکێ: د. هێشتاکێ.
هیچک: چاکڵ.
هیچ و پووچ: شتی بێ نرخی بێ مایە.
هیچە: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (هیچ)ی بەمانا شتی نەبوو: تۆ لە (هیچە) زویر دەبیت.
هیر: گێژ و وێژ.
هیربار: با. دەفر.
هیروو: هـ. هەڵووژەڕەشە.
هیریاڵ: قاپوقاچاخی ناوماڵ.
هیز: حیز.
هیزار: چارەکەی کۆڵی ئافرەت.
هیزرە: شتێکی درێژکۆلەی پێچکەداری لێوداری دەم واڵە، لە قوڕ دروست دەکرێ، هیزەرۆنی لەسەر دادەنرێ. سایلۆ.
هیزە: پێستی خۆشکراوی بەساغی دەرهاتووی هێندێ گیاندارە کە رۆن و دۆشاوی تێ دەکرێ.
هیزەدان: شوێنێکی تایبەتییە لە قوڕ دروست دەکرێ بۆ تێدا دانانی هیزەی پڕ.
هیس: دووکەڵی نەوت.
هیشک: وشک.
هیڤ: ز. مانگێکە کە بەئاسمانەوەیە.
هیڤی: با. چاوەڕوانی کردن. هیوا.
هیک: هێلکە (ل). ناکاو: لە هیکڕا ڕاپیەڕاندم، واتە لە ناکاو.
هیلکە: دەنگی پێکەنینی نزم. هیلکەهیلک: هیلکە یەک لەدوای یەک. هیلک و هووڕ: هیلکەهیلکی زۆر.

هیلیان: ھ. هێلانە.
هیم: ز. هێم.
هین: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە باتی شتێک کە ناوی نەزانیت یا نەتەوێت بیلێیت.
هینان: هێنان.
هینبوون: ز. فێربوون.
هینکرن: ز. فێرکردن.
هیهیکەرە: باڵندەیەکە وەک (شوان خەڵەتێنە) کە دەخوێنێ دەڵێ (هیهی).



ی: بۆ گەلێ مەعنا هاتووە (١) بۆ پاڵدان (نسبت)ی شتێک بۆ شوێنێک: شارەزوور(ی)، دیاربەکر(ی)، کرماشان(ی). (٢) بۆ تاقە یەکێک یا شتێک بەکاردێنرێ: لە هەر کەسە(ی) ژیر(ێ) و لە هەر شتە(ی) بیر(ێ) وەرگرە (٣) دەبێ بەڕاناوی لکاو بۆ تاکی نادیار (ضمیری مفردی غائب): کرد(ی)، برد(ی) خوێند (ی) (٤) دەبێ بەئیسمی مەوسول و جملەیەکی دەوێ کە لە دوایەوە بێ تا ببێ بەصلەی: دەرس(ێ) کە خوێندت پێیدا بچۆرەوە، کار(ێ) کە کردت بیبەرەسەر. (٥) دەکەوێتە ناوەندی (صفت وموصوف ومضاف الیە) و، بەیەکیانەوە دەبەستێ: لیمۆ(ی) شیرین، دەرگا(ی) مزگەوت. (٦) دەنووسێ بەدوای صفەتەوە دەیکا بە(مصدر): شێت(ی)، ژیر(ی)، جوان(ی). (٧) پیتی ئیملایە دەبێ بەژێر بۆ پیتەکەی پێشی: گیرفان، سیروان، جیهان.

ێ: پیتێکە دەنرێ بەو کارانەی کە لە یاریدا دەکرێ و دەیانکا بە(مصدر)ی، یاری بوخچە بەگەردانێ، مەشکەژەنێ، قەلەمرداری، هەنگڵەشەلێ، ئاشە بەتەندوورێ، دێمونالێ. پیتێکە تاقە یەک شت دەگەیەنێ: پیاوێ، بەردێ، دارێ، واتە یەک پیاو، یەک دار، یەک بەرد.

یا: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ دوودڵی (تردد) لە ناوەندی دوو شتدا: ئەو تارماییە (یا) زەلامە (یا) وڵاخە. بەکاردێنرێ بۆ خاتر خۆیی (تخییر) لە ناوەندی کردنی دوو شتدا: (یا) دانیشە (یا) بڕۆ.

یابوو: ئێستر.

یاپراخ: چێشتێکە لە برنج و گەڵا مێو یا سلق یا کەلەرمی پێچراوە دروست دەکرێ.

یاپنجی: قاپووتی ئەستووری ئاو دامانی.

یاتاخ: نوێن و بەرەیەکە کە تێیدا دەنوویت .

یاخۆ: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ خاترخۆیی لە ناوەندیکردنی دوو شتدا: یا دانیشە (یاخۆ) بڕۆ.

یاخود: یاخۆ.

یاخە: یەخە.

یاخێتی: سەرکەشی و لە ئەندازە دەرچوون.

یاخی: گیاندارێکی سەررەقە کە لە ئەندازەی خۆی دەرچووبێ، (یاخیبوون) سەرکەشی و دەرچوونی گیاندار لە ئەندازەی خۆی.

یاخیگەری: یاخێتی.

یاد: بیر و هۆش.

یاداشت: د. یادداشت.

یاداوەری: بیرکردنەوە لە کرداری جوانی یەکێک لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتیدا.

یادداشت: نووسینێکە کە شتێکت بیر بخاتەوە.

یادکردن: بیرکردنی شتێک.

یادکردنەوە: بیرکەوتنەوەی شتێک.

یادگار: شتێکی جوانە کە یەکێک بیدا بەیەکێکی تر بۆ ئەوەی کە هەرچەند چاوی پێ کەوت خاوەنەکەی بێتەوە یاد.

یادگاری: بوونی شتێک لای یەکێک بەیادگار.

یادنامە: نامەیەکە کە شتێکت بیر بخاتەوە (مذکرة).

یار: هاودەمێکی زۆر خۆشەویست. پیتی کارکەر (فاعل)ە بەهەر ناوێکەوە نووسا دەیکا بەکارکەر: کڕ(یار)، جووت(یار)، فرۆش(یار)، بەخت(یار)، زان(یار).

یارا: دەسەڵات و تەوانایی: (یارا)ی ئەوەم نییە بێمە لات.

یاران: وتەیەکە مەردووم لەکاتی بیرکردنەوە لە قسەی یەکێکدا دەیڵێ لەبەرخۆیەوە (یاران) فلانە کەس ئەمڕۆ ئەو قسەیەی کە کرد دەبێ مەبەسی چی بێ .

یارد: ناوە بۆ ئەندازەیەک لە پێوانە کە سێ پێیە و پێیەکیش دوانزە ئینجە. ئارد.

یارده: یارد.
یارم: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ ناوبچێتی شتێک لە ناوەندی دوو شتدا: (یارم) کوێر، واتە نیمچە کوێرێک کە لە ناوەندی کوێری تەواو و چاوساغ بێ.
یارمباز: د. یارەمەز.
یارمەتی: یاریدە و کۆمەکی.
یارمەتیدان: یاریدەدان و کۆمەکی کردن.
یارمەتیدەر: کەسێکە کە یاریدەی مەردووم بدات.
یارۆ: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی شتێک کە نەتەوێ ناوی بلێیت.
یاروو: خەیار.
یارەمەز: مەردوومی هەرزەی جلڤر.
یاریە: یاریدە.
یاریەدان: یاریدەدان.
یاریەدەر: یاریدەدەر.
یاری: چەند کردەوەیەکی تایبەتییە بۆ ڕابواردن و خۆخلافانن دەکرێ، یاریدە (د).
یاریدە: یارمەتی.
یاریدەدان: یارمەتیدان.
یاریدەدەر: یارمەتیدەر.
یاریکردن: گەمە و ڕابواردن لەگەڵ یەکێک بەچەند کردەوەیەکی تایبەتی.
یاریکەر: کەسێکە کە یاری باش بکات.
یارییە: یاریدە.
یاریەدان: یاریدەدان.
یارییدەر: یاریدەدەر.
یازدە: ناوە بۆ ژمارەیەک.
یازدەمین: شتێکە کە لە پایەی یازدەدا بێ.
یازدەهەم: یازدەمین.
یازدەهەمین: یازدەم.
یاس: د. تەلەبەرد. یاسەمەن (د).
یاسا: شەریعەت و قانون. ڕەوشت. باو.
یاساخ: قەدەغە.
یاساوڵ: پاسەوان.
یاسایی: قانوونی.
یاساین: فیقە.
یاسەمەن: درەختێکی گەڵاوردی پچکۆلەیە، گوڵێکی وردی سپی بۆنخۆش دەگرێ، دارەکەی دەکرێ بەدارجگەرە.
یاسەمین: یاسەمەن.
یاشرمە: هێشرمە.
یافت: د. نیشانە و بەڵگە.
یافتبڕین: د. نەهێشتنی نیشانەی شت.
یاقووت: بەردێکی ئاڵی زۆر جوانی بەنرخە.
یاقووتی: ناوە بۆ جۆرە ترێیەک. شتێکە کە ڕەنگی وەک ڕەنگی یاقووت وابێ.
یاقە: یەخە.
یاگە: هـ. جێگا.
یاڵ: شانی شاخ و گرد وتەپە. مووی پشت ملی وڵاخ.
یاڵگەنیگ: د. بریتییە لە کەچەڵ.
یام: یان.
یان: یا. ڕاناوی لکاوە بۆ (جمعی غائب) دەلکێ بەئاخری ناو و کرداری تێپەڕەوە: دایکیان، خواردیان.
یانزە: یازدە.
یانزەمین: یازدەمین.
یانزەهەم: یازدەهەم.
یانزەهەمین: یازدەهەمین.
یانە: هـ. خانوو.
یانێ: یەعنی.
یانی: یانێ.
یاو: تای نەخۆشی. ئاو.
یاوان: گەیشتنەجێ (هـ). بیابان (د)
یا و لەرز: تا و لەرز.
یاونیشان: شتێکە کە نیشانەی تابێ، وەک ئەو توێخەی کە لەسەر لێوی تاداردا پەیدادەبێ.
یاوس: ئاوس.
یاوە: د. وڕێنە.
یاوەر: یاریدەدەر (معاون). مرافق.
یاوەرە: د. پزدان.
یاوەیاو: د. خاوەخاو.
یای: یایە. دوگمەیەکە لە هێندێ شتدا کە دەستی پێدا نرا لە خۆیەوە کار دەکات.
یایە: وتەیەکە کە بە ژنی سەرە دەوترێ بۆ گەورەیی.
یخ: وتەیەکە بزن و مەڕی پێ لێ دەخوڕدرێ. وتەیەکە حوشتری پێ یخ دەدرێ.
یخدان: بەزەویدادانی وشتر و ڕەشەوڵاخ.
یخە: یخ.
یخەلێکردن: بریتییە لە گرتن و ڕاپێچکردنی چەند کەسێک چنگ لەسەر شان.
ین: پیتێکە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بە(أسم منصوب): نیسک(ین) د. ماش(ین). پیتێکە بەهێندێ ناوەوە دەنرێ دەیکا بە(مصدر)ی یاری: گوێزین، سنجووقێن، هەڵماتێن،

مـزراحـێن، هەلووکـێـن، فنجـانـێن، تۆپێـن. پیـتـێکە بەدوای هێندێ نـاوەوە دەنووسێ دەیکا بەکـارکـەر: کـەرفـڕ(ێن) مـاین فڕ(ێن).
یو: هـ. یەک.
یۆز: دڕندەیەکی کـێـوییـە لە تـانجی دەچی زۆر بەچنگە و، هەمـوو دەعبایەک لێی دەترسێ.
یوسر: بەری دارێکی بۆن خۆشە دەکرێ بەتەزبیح.
یۆنجە: د. وێنجە.
یوو: یووە.
یووە: هـ. یەک.
یە: ئەمە (هـ). ئامرازی ناوبەند (أداتی ربط): ئەوی من کڕیومە ئەمەیە.
یەچک: چاکڵ.
یەحیابەگی: جۆرە هەنجیرێکی ڕەشباوی شیرینی پایزەیە.
یەخ: سەهۆڵ.
یەخاو: بەفراو و سەهۆڵاو.
یەخبەند: شوێنێکە سەهۆڵ تێیدا بەستبێتی.
یەخبەندان: سەهۆڵبەندان.
یەخـتـرمـە: ولاخـێکە کـە بەرەلا بووبێ بەهۆی گـلان یا کـوژرانی سوارەکەیەوە.
یەختە: بارگیری خەساو.
یەختەخانە: تەویلەی یەختە.
یەختەسـار: قڕ و مردنی هەرەوەز: ڕەشەگرانەتێ (یەختەسـار)ی خستەناو ئاواییەوە.
یەخدان: د. یەغدان.
یەخسیر: دیل.
یەخکردن: د. ڕچانی شتی شل و بوونی بەسەهۆڵ.
یەخنی: یەغنی.
یەخنی کێش: یەغنی کێش.
یەخە: بەرۆکی کالا. ملیوانی کالا.
یەخەچاڵ: د. چاڵەبەفر.
یەخەدادڕاو: جۆرە گەنمێکە.
یەخەدادڕین: بریتـیـیـە لە وەڕسـبـوون و بەجێ هێـشـتنی شـتێک. بریتـیـیـە لە ڕسـواکـردنی یەکـێـک: تۆ لەسـەر ئەم کـارە بیت (یەخەت دادەدڕم).
یەخەدڕ: شوێنێکە کە دادڕابێ و هەڵکەنرابێ بەقـوولی و تەسکی بەجۆرێک کە سەری واڵ بێ: کارێزەکەم (یەخەدڕ)ە.
یەخەکـێشـیـاگ: د. بریتـیـیـە لە منداڵێکی بێگـانە کـە کردبێتت بەمنداڵی خۆت.
یەخەگرتن: بریتییە لە دەمقاڵی و شەڕ پێ فرۆشتن.
یەخەگیر: بریتییە لە شتێک کە بووبێ بەکوڵکتەوە.
یەدەک: شـتـێکە لە وێنەی ئەو شـتـەی کـە بەکـاری دەهێنیت بۆ ئەوەی کە ئەم نەما ئەو لە شوێنی دابنێیت (بدل).
یەرد: یارد.
یەردە: یاردە.
یەرمە: هـ. شاڵێکە لە ناوەڕاستی کۆپانادا دەدروێ و پووشی تێ دەناخنرێ بۆ ئەمەی پشتی ولاخەکە بریندار نەبێ.
یەرە: هـ. سێ.
یەرەژن: هـ. ئەژنۆ. ئانیشک.
یەرەق: ئێرەقی جووت.
یەرەقان: نەخۆشی زەردوویی.
یەرەقبوون: ئێرەقبوون.
یەرقکردن: ئێرەقکردن.
یەرێ: هـ. سیان.
یەزدان: ناوێکە لە ناوانی خوای گەورە.
یەشان: ئێشان: پشتم (یەشێ).
یەشم: جـــۆرە بەردێکی ســـەوزی تۆخی جـــوانە مـــۆری لێ هەڵدەکەنرێ.
یەع: وتەیەکـە منداڵی ســاوا بەکــاری دێنێ بۆ شــتی پیس و ناخۆشی.
یەغان: د. یەغدان.
یەغدان: سندووقی گەورە.
یەغـر: گـیـانداری یاخی، (یەغـربوون) یاخـیـبـوون، (یەغـرکـردن) یاخیکردن.
یەغنی: گۆشتاو.
یەغنی کـێش: دەفـرێکی دەمـپـانی لێـوداری قـوولی بنکداری مسینە.
یەق: قرقێنە.
یەقخواردنەوە: پۆنگخواردنەوەی شتێک لە شوێنێکدا.
یەقدانەوە: قرقێنەدانەوە، یەقخواردنەوە.
یەقکردنەوە: شێ هەڵهێنانی هێندێ شت، وەک شەکر و تووتن و گەزۆ. هێنانەوەی خواردن لە دەمەوە. یەقخواردنەوە.
یەقە: یەخە.
یەک: ناوە بۆ هەوەڵ ژمارە.
یەکالا: شتی دادڕاوی لە یەک بووەوە.
یەکالابوونەوە: دادڕان و لەیەک جیابوونەوەی شت.
یەکــالاکـــردن: دڕینی شـــوێنێ لە ئەندام لە لایەن پەزشکی تایبەتییەوە (تشریح).
یەکالاکردنەوە: دادڕین و لەیەک جیاکردنەوەی شت.
یەکالە: د. یەکالا.

یەکاڵەبوونەوە: یەکالابوونەوە.
یەکاڵەکردنەوە: یەکالاکردنەوە.
یەکان: بەو ژمارانە دەوترێن کە دەکەونە خانەی یەکەوە.
یەکانە: بەرازی نێری بڕەدار.
یەکاوە: هـ. چێشتی قوبوولّی.
یەکاویەک: دووچەندانەی شت: لەم کڕین و فرۆشتنەدا (یەکاو یەک) قازانجم کرد، یا ئەم برنجە (یەکاویەک) ئاو دەخوا.
یەکباد: شتی تەنراوی تەنکی یەک لۆنە. بریتییە لە مەردوومی لاواز.
یەکبازد: جۆرە یارییەکە یەکبازدی تێدا دەبرێ، هەرکەس کەمتر بڕوا دادەبێ.
یەکباڵ: یەکتەن.
یەکبڕ: جوانووی دوو ساڵە.
یەکبوون: یەکێتی.
یەکبینە: وتەیەکە بەکاردێنرێ لەجێی وتەی (پەی دەرپەی): ئیمشەو (یەکبینە) نووسیومە.
یەکتا: شتی تاقانەی بێ مانەند.
یەکتایی: بێ مانەندی.
یەکتر: یەکتری.
یەکتری: وتەیەکە بەکاردێنرێ بۆ دوو کەس کە لە شتێکدا وەک یەک بەشداربن: من و فیسار کەس (یەکتری) باش دەناسین، واتە من ئەو باش دەناسم و ئەو من باش دەناسێت. یا نەریمان و فەرهاد (یەکتری) یان خۆش دەوێت.
یەکتوخم: یەک ڕەنگ.
یەکتەن: کەسێک کە یاریدەدەری نەبێ.
یەکتەنی: بوون بەیەکتەن: یەکتەنی هەر بۆ خوا باشە.
یەکجار: ئێجگار.
یەکجارەکی: ئێجگارەکی.
یەکجاری: ئێجگاری.
یەکچاو: گیاندارێکە کە تاقە چاوێکی مابێ.
یەکچاوبوونەوە: بریتییە لە لاچوونی دوودڵی و ساغبوونەوەی کار بەلایەکدا.
یەکدان: دانەوێڵەیەکە کە یەک توخم بێ.
یەکدڵ: هاوڕێیەکە کە بەدڵ لەگەڵتدابێ.
یەکدڵی: یەکێتی و ڕێکی لە ناوەندی دوو کەس یا زیاتردا.
یەکدەس: یەکدەست.
یەکدەست: کەسێکە کە تەنها دەستێکی ببێ. دوو شتن کە وەک یەک وابن: ئەم دوو فەرشە (یەکدەست)ن.
یەکڕوو: بریتییە لە مەردوومی یەکڕەنگ کە لە پاشملە و لە ڕوودا وەک یەک وابێ.
یەکڕووە: نیمڕوو.
یەکڕەنگ: بریتییە لە مەردوومی ڕاست و دروست لەگەڵ هەموو کەسێکدا.
یەکڕەنگی: بریتییە لە ڕاستی و دروستی لەگەڵ مەردوومدا.
یەکسان: بوونی چەند شتێک وەک یەک لە چۆنێتی یەکدا: ئادەمی هەموو (یەکسان)ن لە سروشتدا.
یەکسانی: چوونیەکی (مساواة).
یەکسم: ولاخی بەرزەیە کە یەکسمی ببێ، وەک ئەسپ و ماین و ئێستر و کەر.
یەکسەر: سەرانسەر: (یەکسەر)هەڵی دڕی. بێ پشوو: (یەکسەر) کارەکەی کرد واتە بەبێ وچان.
یەکسەری: شوێنێکی گوشاد کە هیچی لە بەیندا نەبێ: ژووری گەورەی (یەکسەری) خۆشە. ڕەشکەی گەورە.
یەکشەق: یەکسەر: (یەکشەق) کردی بەماڵدا، واتە بێ پرس.
یەکشەممە: ڕۆژی دووەمی حەفتە لە هەینی بەدواوە.
یەکشەموو: یەکشەممە.
یەکشەمە: یەکشەممە.
یەکشەوە: مانگی نوێ کە هەر ئەو شەوە دەرکەوتبێ. بریتییە لە کەسێک کە کوتوپڕ دەوڵەمەند بووبێ.
یەک قسە: کەسێکە کە هەر لەسەر قسەی خۆی بێ.
یەککەفتن: د. یەککەوتن.
یەککەوتن: بوونی چەند کەسێک بەیەک لە کارێکدا.
یەکگرتن: یەککەوتن.
یەکگرتوو: چەند شتێکن کەبووبن بەیەک.
یەکلا: شتێکە کە نوشتابێتەوە و دوولۆنە نەبووبێ.
یەکلایی: بوونی شت بەیەکلا.
یەکلنگە: جۆرە گیایەکە.
یەک لۆنە: یەکلا.
یەکڵەچاو: گیاندارێکە کە چاوێکی کوێربێ.
یەکماڵ: بریتییە لە دۆستی ماڵ یەک: من و تۆ (یەک ماڵ)ین.
یەکماڵی: بریتییە لە تێکەڵی دوو کەس کە درێغیان لەیەک نەبێ.
یەکە: یەکتا: فیسارەکەس (یەکە) پیاوە. یەکانە.
یەکەتی: د. یەکێتی.
یەکەڵەچاو: یەکچاو.
یەکەڵەچنبوون: نەمانی چەند شتێک بەر و دوا بەئێجگاری.
یەکەڵەچنکردن: نەهێشتنی چەند شتێک بەر و دوا بەئێجگاری.
یەکەڵەشاخ: گیاندارێکە کە هەر شاخێکی ببێ.
یەکەڵەگون: گیاندارێکە کە هەر هێلکەگونێکی ببێ.
یەکەم: شتێکە کە لە پایەی یەکدابێ.

یەکەمین: یەکەم.
یەکەندەردوو: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی کوتوپڕ.
یەکهۆ: د. کوتوپڕ: یەکهۆ چووە سەری.
یەکەوحەیزەران: جۆرە یارییەکە یەکێک دادەبێ و ئەوانی تر بەسەریدا هەڵدەچن، وەستاکەیان لە هەڵچووندا دەڵێ (یەکەوحەیزەران) تا جاری سێیەم کە دەڵێ (سێیەوحەیزەران) ئەوانی تریش دەبێ وەکو ئەو بڵێن، ئەوی لێی تێک بچێ تێ دەکەوێ و دادەبێ.
یەکەوڕاست: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جێی وتەی (ڕاستەوخۆ).
یەکەوکڵاوە: جۆرە یارییەکە وەک یەکەوحەیزەران بەڵام ئەم کڵاوێک لەسەر پشتی تێکەوتووەکە دادەنێن و بەسەریدا هەڵ دەچن، هەرکەسێک کڵاوەکەی خست تێ دەکەوێ.
یەکەوگۆتەکە: جۆرە یارییەکە وەک یەکەوحەیزەران بەڵام لەگەڵ هەڵچووندا گۆتێک دەدەن لە تێکەوتووەکە.
یەکهێشە: د. زەوییەکە کە یەکجار گاسنی لێ درابێ.
یەکە یەکە: یەک لە دوای یەک.
یەکێتی: ئاشنایی و بێ جیاوازی دوو کەس.
یەکیەک:یەکە یەکە.
یەکی یەکی: شتی هەڵبژاردەی نایاب.
یەگانە: شتی یەکتای بێ مانەند.
یەڵخی: د. گیاندارێکە کە بەدەمی خۆی بلەوەڕێ.

یەلغار: هێرش.
یەلەک: شتێکی بێ قۆڵە وەک سوخمە دەکرێتە بەر.
یەمەنی: کەوشی سوور.
یەن: یەند.
یەند: وتەیەکە بەکاردێنرێ بەمەعنا (ئەوەندە): یەند غەمبارم ئاگام لە خۆم نییە.
یەندە: یەند.
یەو: هـ. جۆ.
یەواش: د. هێواش.
یەهـ: وتەیەکە وڵاخی بەرزەی پێ هێدی دەکرێتەوە.
یەهەر: هـ. جگەر.
یەی: بۆچی (هـ). یەو.
یێ: ناوە بۆ پیتێک لە بیست و حەوت پیتەی کوردی. یەهـ.
یژگە: وتەیەکە دەنرێ بەدوای وشەی (کوڕ) و (کچ) و (پیاو) و (ژن)ەوە بۆ خۆشەویستی: کوڕیژگە، کچیژگە، پیاویژگە، ژنیژگە.
ین: پیتێکە بەهەر ناوێکەوە نرا دەیکا بە(إسمی منصوب): ئاسن(ین)، دار(ین)، پەشم(ین).
ینە: پیتێکە بەهەر ناوێکەوە نووسا دەیکا بە(إسم منصوب): زەرد(ینە)، زیو(ینە)، شاڵ(ینە).

بەیارمەتی خوا دەستم کرد بەنووسینی ئەم فەرهەنگە لە ڕۆژی ٦/٤/١٩٣٦ و لە ڕۆژی ١٩٥٩/٦/٣ تەواوم کرد، سوپاس بۆ خوا کە لەوەپێش ئامادەی کردبووم بەزانینی زبانی فارسی و عەرەبی و، بەئەندازەیەک لە زانینی (نحو) و (صرف) و (منطق) و هێندێ لە زانینەکانی تر، کە ئەمانە هەموو دەخلیان بوو لە دانانی ئەم فەرهەنگەدا. بەم ڕەنگە ڕاڤەی هەموو وتەیەکم بەپێی دەسەلات بەکۆکەرەوە «جامع» و دەرکەر «مانع» داناوە، ئینجا برای بەڕێز لە خوێندنەوەیدا ئەگەر خراپەیەکت بەدڵدا هات تۆزێ لێی وردبەرەوە نەوەک ڕاستێک بەچەوت و ساغێک بەهەڵە بزانیت لە پاشان کە بێگومان بوویت ئینجا پیاوانە و مەردانە ڕاستی بکەرەوە، چونکە هەر خوایە کە هەڵە ناکات.

# پاشکۆ

## چەند وتەیەکی کوردیی کۆن کە لە فەرهەنگێکی ماد دەرهێنراوە

لە ساڵی (١٩٤٣ز) قازی بووم لە چەمچەماڵ، خوالێخۆشبوو جەلال صائب بەقائیمقامی هات بۆ ئەوەی لە کاتێکدا کە من خەریکی نووسینی فەرهەنگی خاڵ بووم، لەلایەکەوە وتەی ئەو ناوچەیەم کۆدەکردەوە، لەلایەکی ترەوە ڕاڤە (شرح)م دەکردن، هەرچەند لەوەپێش زۆر شارەزای جەلال ئەفەندی نەبووم، بەڵام لەوێ کە لەگەڵیدا تێکەڵ بووم، تێگەیشتم کە خوێندەوارێکی بەرز و باڵا و شارەزایە لە کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی و ئینگلیزیدا کاتێ کە زانی من خەریکی کۆکردنەوەی وتەی کوردی و نووسینی فەرهەنگێکی تێکڕاییم، زۆری پێ خۆش بوو و وتی: منیش یارمەتییەکت دەدەم، وتم: لە چ ڕوویەکەوە؟ وتی لە ساڵی ١٩١٧، ١٩١٨ز کە دیل بووم لە هیندستان، فەرهەنگێکی فارسی- ئینگلیزیم دەست کەوت کە دانراوی (ف- ستاینگاس) ئستادی زانستگای مونیخ - چاپی لەندەن بەپوختەکردنێکی تەواو لەسەر فەرهەنگی فارسی و عەرەبی (جۆنسن) و (ریچاردسن) هاتۆتە ڕوو، ئەم فەرهەنگە وتەی سێ چوار هەزار ساڵ لەمەوپێشی (سەنسکریتی) و (ماد) و (زەند) و (پازەند)ی کۆکردۆتەوە، کە زۆر لەو وتانە لەگەڵ کوردی ئەمڕۆدا یەکەن و، زۆریشیان لە ئاهەنگ و شێوەدا زۆر لە کوردییەوە نزیکن و، من ئەو وتانەم بۆ خۆم دەرهێناوە، بەڵام دەیاندەم بەئێوە کە تێکەڵی فەرهەنگەکەی خۆتانی بکەن، منیش سوپاسم کرد و، بەپێی ئەلفوبێ ڕیزم کردن و، کردنم بەپاشکۆی فەرهەنگی خاڵ و وا لێرەدا چاپی دەکەین، ئینجا جەلال ئەفەندی وتەکانی چۆن ڕاڤە کردووە، منیش هەر ئەوەم نووسی بێ ئەوەی دەستکاری بکەم، ئینجا ئەگەر وتەی عەرەبی زۆر بەکارهێنابێ ئەوە لە منەوە نییە.

هەر وتەیەکی ناو قەوس کە لەلای چەپییەوە (ز) دانرابوو ئەوە نیشانەی (زەند)ە و، ئەگەر (پ) دانرابوو ئەوە نیشانەی (پازەند)ە و ئەگەر هەردووکیان دانرابوو ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە زەندیش و پازەندیشە، هیوادارم ئەگەر هەمووشی پەسند نەکرێ، بەشی زۆری پەسند بکرێ و هێندێ کەلێن و کەلەبەری زمانەکەمان پڕ بکاتەوە.

## پیتی: أ

ئابجەر: هاتن و کشانەوەی ئاوی دەریا «مدوجزر».
ئابخوست: دەرگەیەکە کە کاسی تێدا نەبێ.
ئابخوون: ئابخوست.
ئابەستە: جاسووس.
ئاتوون: موعلیمەیەکە کە دەرسی خوێندن و نووسین و نەقش بەکچان بلێ.
ئاخکوزە: دوگمە. قۆپچە.
ئاخکوژە: ئاخکوزە.
ئاخکوژنە: ئاخکوزە.
ئاخکون: کونی دوگمە و قۆپچە.
ئاخکونە: ئاخکون.
ئاروەند: جلالة، عظمت، سمو.
ئاروین: اختبار، امتحان، بەراورد.
ئازەب: عازەب.
ئاسی: ژنی هەوێدار.
ئاشینە: هێلەک.
ئافەند: جەنگ. جدال.
ئالاموت: هێلانەی هەلۆ.
ئالانە: باز. شاهێن. هێلانەی شاهێن، خوێندنی کەلەباب.
ئالووهـ: هەلۆ.
ئامار: إحصاء.
ئامارگر: مأموری أحصاء.
ئامارگیر: ئامارگر.
ئامارە: تدقیق و کۆلینەوە.
ئامارەگر: مدقق. محاسب.
ئامدانە:تصادف، قضاء بەرێکەوت.
ئاموتیا: ز. ب. کچی عازەب.
ئامووسنی: قەپاتمە.
ئامە: ژنێکە کە بەبێ مارە و نکاح لای یەکێک بێ.
ئامیا: کیسەی پارە.
ئانگارین: جەدوەلی حیساب.
ئاوار: دەفتەری یومیە.
ئاوارچە: ئاوار.
ئاوارە: ئاوار. خەزێنەی قایم لە ئاسن و شتی تر.
ئاوارەگر: (محاسب. أمین صندوق) مدیری مال.
ئاوارەگیر: ئاوارەگر.
ئاوپچەخانە: جێگای حەرەس. نقطەی محافظە و حەرەس.
ئاوەرجە: مقبوضی پارە، علم و خەبەر.
ئاوەرد: حرب. مصادمة. تێک هەلچوون.
ئاوەردگاە: مەیدانی حرب. صفی حرب. تعبیەکردن.
ئاوەزەند: ئەسلحەی عسکریە. عدەی عسکریە. تجهیزاتی عسکر.
ئاوژەند: ئاوزەند.
ئاوژەنگ: ئاوزەند.
ئاوی ڕەش: ز. پ. جرائمی زۆری گرنگ.
ئاهەنج: رسم. تصویر. ترتیب.
ئایشتە: جاسووس.
ئایشتەنە: ئایشتە.
ئوسقوور: ئاوی دەست نوێژ.
ئولام: وەلام. خەبەر.
ئەب فەرە: فەحل.
ئەرچین: محەجەرەی پەیژە و پێپیلکە. پەیژە.
ئەرخەندە: دەرمانیکی زۆر ئال و جوانە ژنان نینۆک و لێوی پێ سوور دەکەن.
ئەرزیز: قورقوشم.
ئەرسەن: کۆبوونەوە و اجتماع.
ئەرم: لە ئانیشکەوە تاشان.
ئەرووس: مۆبیلە.
ئەزرەخش: فەرتەنەی با و باران. بروسکە. تریشقە.
ئەزناوەر: گەورە و سەردار.
ئەستوانە: شتێکی گردە کە بەدەوری خۆیدا بخولێتەوە.
ئەستووان: قایم. قەوی. قابلی اعتماد.
ئەستویی: ئەستۆ.
ئەسرەب: قورقوشم.
ئەسک: ئەسپی پۆستە. ئەوشتەی کە پۆستەی پێ هەلدەگیرێ.
ئەسکدار: پۆستەچی. متعهدی پۆستە. کەسێکە کە پۆستە دابەش دەکات. جانتای پۆستە.
ئەسکەلە: بەندەر.
ئەشخار: پۆتاس. خوێی ئامۆنیاق.
ئەفشەک: ئاوونگ.
ئەفشەنگ: ئەفشەک.
ئەکبیا: ز. پ. پەی «عصب».
ئەلووم: دەستە. تاقم. جەماعەت، (ئەلووم ئەلووم) دەستە دەستە.

ئەمەد: وقت. فرسەت. هەلکەوت.
ئەنباز: شەریک. هاورێ.
ئەنبازناک: هاوسوێند.
ئەنبازی: شەراکەت. سوێندخواری. هاورێیی.
ئەند: هێند. ژمارەیەک لە ناوەندی سێ و دەدا. ماوەی ١٥٠٠ قەرن کە ١٥٠٠٠ ساڵە. عەقدەکە دە ساڵە.
ئەنداچە: ز. پ. ملاحظە. مطالعە. رأی و فکر.
ئەندامە: حافظە. ذاکرە. سەرگوزەشتی تأریخی.
ئەندەرز: مشوەرەت. نەصیحەت. وەصیت. کتێب.
ئەندەرووز: مفتش. مدقق. سیاح. ممتحن. جاسووس.
ئەندەز: رأی. فکر. مطالعە. اقتراح.
ئەندیشمار: محاضرە. إیضاح. مذکرە.
ئەندیشمال: ئەندیشمار.
ئەنفەت: زەرەر. ضیاع.
ئەنگاردە: حکایە. ماجری.
ئەنگارش: تاریخ.
ئەنگارە: جلدی مقبوضی مالیە. کتێبی حساب. إحصاء. ڕۆژنامە. سەرەتای تاریخ.
ئەنگامە: هیئتی تمثیل. أعضای تمثیلی حادثەیەک.
ئەنگەسبە: ملاک. رأسمالی.
ئەنگەشبە: ئەنگەسبە.
ئەنگەشتە: ئەنگەسبە.
ئەنیشە: جاسووس.
ئەهزوون: ژنی نەزۆک.
ئەیار: حساب. تەخمین.
ئەیارگر: محاسب.
ئەیارە: ئەندازە. سجلی محاسبە. قەید. دەرمانی ڕەوانی.
ئەیازی: پەچەی ژنان.
ئیسپەتکار: تەنەکەچی.
ئیسترەوەند: ژنی نەزۆک.
ئیسفەرە: ئیسقەرە.
ئیسقەرە: چەند شیشێکن لەسەر ئاگر دادەنرێن بۆ گۆشت لەسەر برژاندن.
ئیسک: ئەسپی پۆستە و هەموو شتێکی تر کە پۆستە هەڵبگرێ.
ئیسکالش: انطباع. فکر. تصویر.
ئیسکانە: ئێسقانی لە ئەژنۆوە تا ئەشکنج.
ئیسکدار: ئەسکدار.
ئیسکرک: کۆکەڕەشە.
ئیسکەرە: تیسقەرە.
ئیسکەلە: ئەسکەلە.
ئیسکەنە: ئەسکەنە.
ئێش: جاسووس.
ئیشکەفت: ئەشکەوت.
ئیشی: خانم، کابانی ماڵ.
ئیمشاش: مقیاس. قاعدة.
ئێنی: شکات حسبی حال. زولم.
ئێها: بێ ئیشی. دەست بەتاڵی .
ئیروون: گۆگرد.
ئیزارە: خاولی. پاڵپشت. دیواری کورت و نزم.
ئیزاربی: دەسەسڕی سەر ڕان. خاولی. پەچەتە.
ئیسا: ئێستا.
ئینەفت: عرضحال. استدعاء عرضی حاجەت.

## پیتی: ب

بابوار: فصل. مادة. فقرة.
بابواری: تصنیف. تەرتیبی فصول و مواد.
باتوو: پرتەقاڵ.
باتووس: باتوو.
باتووش: باتوو.
بادابرەنگ: باتوو.
باداڕەنگ: باتوو.
بادخەن: فەرتەنە. عاصفة.
بارچە: صالۆنی محکمة. دیوانی محاکم.
بارگاو: إتفاق. معاهدة. تەفاهم.
بارگە: پارچە.
بازان: اصطلاحێکی ئاینییە بۆ ئەو زەردەشتییانەی کە لەگەڵ هاتنی ئیسلام موسڵمان بوون.
بازێرە: ئەو سەعاتەیەکە کات نیشان دەدا. ماوەی سەعاتێکە لە کات کە ٦٠ دەقیقەیە.
بازێرەی أول: هەوەڵی شەو.
بازێرەی اخر: ئاخری شەو.
باژ: باج.
باسیرە: شاغر. حکایەتخوانی لەبەر.
بالەست: کچی باکرەی دەست لێ نەدراو.
بان: ئەمیر. حاکم. گەورە.

بانوو: ئەمیرە. خانم. بووک.
باهە: گۆل. دەریاچە.
برووسان: شعب. قوم. جمعیت. ملت. جالیە.
برووشان: برووسان.
برینش: مەقەست.
بزیشک: بیطار.
بشتالم: طفیلی حیوان و نبات.
بشتام: بشتالم.
بلاژ: بەلاش.
بلووس: ڕیاکار. فێڵباز.
بنیەست: بنێشت.
بنیجە: شرکە و کومپانیە. جماعتی مشترکە.
بنیچە بەستن: کومپانیە یا شرکە تشکیل کردن.
بولغور: ساوەر.
بولکەفد: بەرتیلێکە کە درابێ بەحاکم.
بولکەفدە: بولکەفد.
بوێژە: ئومێدەوار.
بەبەک: بیبیلەی چاو.
بەت: خطی تفریقی جدولی حسابات.
بەخشی جەز: مأموری تەوزیعی معاشات.
بەخشی خانە: دائرەی توزیعی معاشات.
بەخشی گەری: مدیریتی محاسباتی عامة.
بەرات: حواڵەی پارە. چەکی حواڵە.
بەرانغار: میمنەی جیش.
بەربەر: سەرتاش.
بەردال: پەرگار.
بەردە: دیل. ئەسیر.
بەردەفرۆش: دیلفرۆش.
بەردەک: چیرۆک. حکایت.
بەردیق: جاهل. بێ خەبەر.
بەرەبەند: إختصاصی. متخصص.
بەرفەندار: پرۆفیسۆر. داهی.
بەرگووک: عمارە. خانوو.
بەرگەس: وتەیەکە بەکاردێنرێ لە جیاتی وتەی: (پەنابەخوا).
بەرلاس: پیاوێکی ئازا و جەسوور لە فامیلیایەکی ناودار.
بەرماچ: قوەی لامسە. تماس.
بەرماس: بەرماچ.
بەرناس: بێ موبالات. بێ موبا. لاتی. جاهل. جهل. بێ تجربة.
بەرنامە: قاعدة. پروگرام. مرسوم. نظام وتعلیمات.
بەرنایشتی: اتحاد. حمایة.
بەروار: هاوینەهەوار.
بەروارە: ساڵۆنی ئیستقبال. ژووری باڵەخانە. ڕێگای تایبەتی بۆ ناو حەرەم.
بەروان: دەسەسڕی بەرسنگ بۆ نانخواردن. بەروانکە.
بەریج: میزانیة. اجمالیەی حساب.
بەرید: پۆستە. مراسل. واسطەی مخابرة.
بەژکەم: مانع. عائق.
بەژهان: غبطة.
بەساوەند: قافیەی شعر. مترادف متشابە لە أشعاردا.
بەستوو: کووپەلەی شین.
بەستەک: خدمەتکار. بۆی.
بەشکیر: بەروان.
بەکرەس: مشمای باران.
بەکسەمەد: جۆرە پسکویتێکە کە بۆ سەفەر هەڵدەگیرێ.
بەلادەر: خشڵی زێڕینی سەری ژنان.
بەلاش: صنعتکار. فني. ماهر.
بەلاغوور: ملتجیء. بێگانە.
بەلاق: غەزێمی لووتی ژنان.
بەلکەن: منجنیق.
بەلگەن: بەلکەن.
بەللار: بلوور.
بەلواژ: شووشە.
بەلووک: منطقة. ناحیة. جامی شەراب.
بەنتوومە: بنێشتەتاڵ.
بەندوور: قوەی مفکرە.
بەوێژە: وتەیەکە لەجێی وتەی «بالخاصة» بەکاردێنرێ.
بەهمەن: زۆر زیرەک. بلیمەت. هەوری باران. بەفرێکە کە بەباوە بباریێ. دەستدرێژ. زۆردار.
بەهو: هەیوان. باڵقۆن.
بەیات: حرص. مراق. إعتناء.
بیارە: سەوزییەکە کە بەسەر زەویدا تەرز بهاوێ و بەرز نەبێتەوە، وەک خەیار و ترۆزی.
بیاوار: مهنة. وظیفة.
بێ زینهار: بێ ئەمان.
بێژە: خالص. تایبەتی.
بێغەرزانە: جاهلی تێ نەگەیشتوو.

بێلا: پارەیەکە کە بەخێر ببەشرێتەوە.

بێوارە: غریب. فەقیر.

بێرەزەن: تەنوور.

بیزارە: شهم. غیور. محب. دڵسۆز.

بیمە: سیگۆرتە.

بینە: جێی خۆ رووتکردنەوە لە حەمامدا.

## پیتی: پ

پاچنار: نۆکەرێکە کە هەمیشە ئامادەی خزمەت بێ.

پاچنامە: لەقەب. حەلیف. رەفیق. ناوی مستعار.

پاچەنگ: ئەو کونانەن کە دەهێلرێنەوە لە قولله و قەلادا بۆ شەڕ لێوە کردن.

پاد: پاسەوان و حارس. بەقوەت.

پاژگەر: تحصیلدار.

پاژنامە: پاچنامە.

پاژوخ: پاسوخ.

پاساد: مدافعة. دفاع.

پاشنامە: پاژنامە.

پاکار: معاونی تحصیلدار.

پاڵەوان: مصفی = پلاوپاڵێو.

پاوپەڕ: قوة. سلطة. صلاحیة.

پایچەم: ترجومانی و تەرجەمەکردن.

پایخوان: پایچەم.

پایزە: وەزیری فـوق العـادە، وەزیری مـفـوض. سـفـیـر. إمـتـیـاز. بەرگی شەرەف.

پۆشنە: سەرقاپی مەنجەڵ و شتی تر.

پوودینە: نەعنا. پونگە.

پوولاب: حس. شعوور.

پوولایی: واضح. ئاشکرا. مکشوف.

پەچواک: تەرجومان. مترجم.

پەچوو: تەرجەمەکردن.

پەچوە: پەچوو.

پەربال: هاوینەهەوار «مصیف»

پەرباڵە: پەربال.

پەرخاش: حەرب. نزاع.

پەرداس: استهلاک و صرف.

پەرداغ: پەرداخ کردن.

پەردان: عاقل. متبصر. متأنی.

پەردەک: معمی. صمیمی. پاک.

پەردەکی: ژنی عفیفەی مخدرە.

پەرسا: محقق. مستنطقی.

پەرسان: پەرسا.

پەرسیاوەشان: بەرەزا.

پەرکار: بەرگار.

پەرگار: پەرگار.

پەرگەنە: قضا. ناحیە.

پەرگەنەدار: مدیر یا مأموری ادارەی پەرگەنە.

پەرگیبنی: جمهوری ناس. جماهیر.

پەرماس: تماس. دلک. دەست لێدانی سووک. معلومات. علم.

پەرماسە: تماسێکی سووک.

پەرمان: ئەمر. ایعاز. حکم. ارادة.

پەرموو: بەتەمابوونی شتێک.

پەرمە: پەرموو.

پەرمەهە: تەفرەدان.

پەروا: عطلة. فەراغەت. مأذونیت. مقاوەمەت. قوة. تصرف.

پەروار: معارف.

پەروارە: پەروار.

پەرواش: بێ موبالات.

پەروانچە: پاس. وەثیقە. اجازة. وەرەقەی هەوێت.

پەرووسانان: هاودین.

پەروەرش: مورەبای گوڵ. شیرەی گوڵ.

پەروەری: استادی تربیە اختصاصی لە تربیەدا.

پەروێز: غاڵب. فائق. بەختیار. محتشم. خۆشەویست.

پەروێزەن: مصفی. پلاوپاڵێو.

پەرێز: شکات و حسبی حاڵ.

پەژوودە: جاسووس.

پەژە: وڵاتی پڕ شاخ و داخ.

پەستا: دەوام لەسەر کارێک کە دەستی درابێتێ.

پەسترمە: بەستەڵەک: سەهۆڵ. زوقوم.

پەشتوو: بطلی شووشە.

پەشتە: گردۆڵکە. سد و موانع لە خۆڵ.

پەشتەبەند: پرد.

پەشخە: فرچەی جل.

پەگاه: فجر. شفق.

پەگاهتار: فجری کاذب.

بەگاهتەر: پەگاهتار.
پەلکە: بەلکەن.
پەلواژە: شووشە. قاپی بلوور.
پەناد: هەوا. کوورەی هەوا.
پەناوە: إستقالە.
پەنبوون: پیاسەکردن.
پەنتوومە: بنێشتەتاڵ.
پەی: عصب.
پەیغام: خەبەر. تقدیر. راپۆرت. ، إشاعة.
پەیک: قاصد. ناقلی بەرید.
پەیگ: مراسل. مخابری جریدة. ناقلی ئەخبار.
پێ خەس: سوئی ظن. تەخمین. کشف.
پیرمەهە: تەفرەدان.
پێش ئاران: رەچەتەی دکتۆر.
پێش گەهی: بەرچای.
پێغان: وعد. إتفاق. موافقت.
پیش بارە: کێکێکە کە لە ئارد و ڕۆن و هەنگوین و کەرە دروست کرابێ.
پیش پارچە: پیش بارە.

## پیتی: ت

تاسەواسە: ئارەزوومەند.
تالەت: چەخماخساز.
تاوبەک: هودەی قایم.
تاهوو: شەراب. مسکر. ئەو شتانەی کە موادی کحولی تێدابێ.
ترس ئەستوودان: لە قەبرترسانی زیندووان.
تورفان: تەرجومان. مترجم. خطیبی بلیغ.
نۆژی: جەولە قوتابی مکتب.
توماندار: سەرکردەی دە هەزار کەس.
تومەن: دە هەزار کەس.
توویەک: قاسەی پارە. خەزێنە.
تووزەک: قانوون. نظام. دەستوور.
تەبار: عەشیرەت. خێزان. ڕەگ.
تەبری: ترشی سماق.
تەتری: تەبری.
تەراج: وتەیەکە لە جێی (ئامین) یا (خوابکا وابێ) دەوترێ.
تەربەند: هەڵکێشانی پەڕۆیەکی پاکە لە ئاوێکی سارد و خەستنیەتی بۆ سەر چاوێکی ئێشاو، یا شوێنێکی ئاوساو «تضمیدی سارد». ئەو پارچە پەڕۆیەیە کە بەتەڕی دەخرێتە سەر شوێنی بەئازار.
تەرتیزەک: شهابی ئاسمان.
تەرخوون: پیاوکوژ. بەخوێن. تینوو. جەردە. بێ باک. جانی.
تەرزەفان: تەرجومان. مترجم. خطیب.
تەرغاق: حەرەسی شەو بەرامبەر بەدوژمن و جەردە.
تەرغاک: تەرغاق.
تەرغان: رەهبەر. دلیل. بەدرەقە.
تەرغەند: شەپلە. إفلیجی.
تەرفەندە: دعایەی درۆ. فیشاڵ.
تەرک: خووزە = کلاوزرێ.
تەرگ: تەرک.
تەروەند: إعتقادی باطل. خەرافە ئوسطوورە. وەعدی خلاف.
تەروەندە: میوە و محصولێکە کە زوو پێ بگا و بێتە بەردەست.
تەرهەندە: تازە. نازک. لطیف.
تەریر: ئەندازە. إخطار. هەڕەشە.
تەسلیخ: بەرماڵی نوێژ.
تەشلیخ: تەسلیخ.
تەغمە: داغمە . مۆر.
تەفەرچاغ: تەواو. حاضر. مهیأ.
تەفنوود: جرأت. ثبات. عزم.
تەگل: مەفرەزەی عسکر.
تەلف: ترخەکردن بەهۆی خواردنی ترێی زۆرەوە.
تەنخواه: مخصصاتێکە کە لە خەزێنە وەردەگیرێ. معاش.
تەنخواهدار: خاوەنی معاش یا مخصصات لە خەزێنە.
تەندەس: رەسم. پەیکەر.
تەندییە: شکلی ئادەمی.
تەنسوخ: تاسووق.
تەنکە: صفیحەیەکی زیو یا ئاڵتوونە. تەنەکەی عادەتی.
تەنووکە: تەنکە.
تەنەکە: تەنکە.
تەنکەرە: مەنجەڵ.
تەواجی: رئیس. قائد. سەرکردە.
تەوال: ئەنجام. نهایەت. ، ئەوسەری کار.
تەیان: تیان.
تیان: مەنجەڵی زۆر گەورە.
تێکشمیش: سلامی ملوکانە. تقدیمی هدایا بۆ ملک.

تیتاڵی: قەشمەری.
تیداک: جوولەکە.
تیداکی: جوولەکانە.
تیرەم: خانم. خانمی گەورە.
تیڤرەک: حەسادەت. حسد.

## پیتی: ج

جابلیق: کەسێکە کە تەعبیری خەو لێک بداتەوە.
جاو: بانقەنۆت.
جلق: یەک تقسیم هەزار و هەشتا یەکێکی سەعات ١/ ١٠٨٠. بیست و پێنج هەزار و نۆ سەد و بیست یەکی شەو و رۆژێک ١/ ٢٥٩٢٠.
جەبیرە: کۆبوونەوەی پیاوانی گەورە بۆ کارێکی زۆر گرنگ.
جەرگ: دائرە. کۆمەڵێک لە ئینسان یا لە حیوان. حەلقەیەک لە ئینسان.
جەرگە: جەرگ.
جەرمەزە: سەفەر.
جەلدوو: مکافأة و پاداش لەلایەن پیاوێکی گەورەوە.
جهمەرز: داوێن پیسی کردن «زنا».
جەنجال: قەڵەباڵغ.
جەندال:بۆرەپیاو. یەکێکی بێ نرخ.
جەندەل: تقویم. مفکرة.
جەنی وار: پردی سراط.
جەوانغار: مەیسەرەی جیش.
جەوتەرە: منارە. منارەی فانۆس. پارچەبنای بەرز و قووچ.
جەوحەگاه: مەیدانی جەنگ.

## پیتی: چ

چاپلووس: مەردوومی ڕیاباز.
چاپلووسی: ڕیایی.
چارت لێدان: نوستنێکی کەم لەپێش نیوەڕواندا «قیلولە».
چارەک: قائدی عسکری. جەنراڵ. سەرکردەی کاروان.
چاغ: چاخ. وەقت. مووسم. یەک تەقسیم دوانزەی ڕۆژ «سەعاتێک» مووسمی شت.
چامە: قصیدەیەک کە لە حەڤدە شعر زیاتر نەبێ. گۆرانی. مقام. قسە و حکایەت.
چامەبێژ: گوێندە. شایەر.
چامەدان: خطیب بلیغ. شاعر.
چەبیرە: حاضر. مجلس. اجتماع. تجمعی گەورە.
چەروەند: فانۆس، فانۆسی سەفەری.
چەروەندە: چەروەند.
چەغامە: شعر. شاعر. قصیدة.
چەغداوول: دومداری جیش. سەرکردەی دومدار. پەراگەندەی جەیش.
چەک: حوکمی حاکم کە إمضا کرابێ. قراری محکمە. قراری دیوانی. وثیقە. هویە. جوازی سەفەر.
چەکامە: قصیدەیەکە کە لە هەژدە شعر زیاتر بێ.
چەکنامە: سندی طاپۆ. حکمی تفویضی أراضی. قراری لەزمە.
چەکنویس: مأمووری طاپۆ، رئیسی تسویە.

## پیتی: خ

خاکا: پلان. مسودە. مخطط.
خاکە: خاکا.
خلیدە: پەنچەر.
خوردەگیر: ڕەخنەگر.
خوردەگیری: ڕەخنەگری.
خەبەر پەژوورە: جاسووس.
خەسکانان: تحقیقات و تحریاتی بەهێز.
خەشک ئامار: خەسکانان.
خەشکەماز: خەسکانان.
خەشەندە: زواحف.
خەفتو: مۆتەکە.
خەفتەک: خەفتو.

## پیتی: د

دامدار: حل و حسمی نزاع. تألیفی بین. توفیقی ئارا.
داروبەرد: قوت. طاقت. حرب. مصادەمە. أملاک واراضی.
دازە: لفظ.
دالابە: نقطەی عسکر و شرطة لە حراستدا «رابیة».
دوودە: دائرة. محیطی دائرة. خانەدانی قبیلە.
دوودەمان: قبیلەی گەورە. طائفة. فاملیا. فرع.
دووێر: کاتب. محرر. معلم مکتب. معلمی زمان.
دەشتان: ژنی بێ نوێژ.
دەمار: ضروریات. حوائجی ژنان. هەناسە. دوکەڵ. تۆڵە. محلی إقامت.

دەمدەمیا: ز. پ. دەریا.
دیلماب: شیرێکە کە بە کوڵاندن خەست کرابێتەوە، لەگەڵ هەنگوین یا شەکر تێکەڵ کرابێ.

## پیتی: ر

رووچەک: یانزەهەمی مانگی شەعبان.
رووکاز: تەشهیرکردنی دز یا جەردە یا پیاوخراپێک و گێرانی بەناو بازاڕدا.
رەبوون: قازانج. سلفە.
رەویە: عادەت. دأب. مۆدە. نظام. قانون. قاعدة. سلوک.
رەویز: رأی. فکر. مطالعة.
رەیت: حیات.
ریچار: هەڵبژاردەی میوەی هەڵگیراو «قۆنسێروە».
ریچال: ریچار.
ریچالە: ریچار.
ریشائیل: ریش درێژ.
ریلو: خۆڵەمێشێکە کە سابوونی لێ دروست دەکرێ.

## پیتی: ز

زانیج: شوێنی لەدایکبوون. وطنی اصلی.
زاو: وەستای بەننا، وەستای سواغ.
زاویل: بەننا و معمار.
زووپە: ز. پ. قەرز. اعادة. دەست قەرز .
زەراهـ: دەریا.
زەموو: قوڕ. هەوا. دەرەجەی تەڕی و وشکی هەوا.
زەمەنج: باگردێن.
زەو: شتێکە کە باسی بەسەردەمی ئەم و ئەوەوەبێ.
زەویج: باسترمەی گۆشت.
زیند: ز. پ. گیان.
زیباڵ: اسطول.
زیج: خفقانی قلب. لێدانی دڵ.
زیجەک: ریخۆڵەی کاوڕ کە پڕ بکرێ لە برنج و بەهارات و قیمە وەکو گیپە.
زیخ: بەدڵەکوتێیەک دەڵێن کە لە خۆشی یا لە ترسا پەیدا ببێ.
زیوار: شارێییەکە کە بەناو شار و دێدا بڕوا.

## پیتی: س

سا: خەرج و باج. جووتانە. ضریبة.
سابان: نیشانەی سەر ڕێگا. نیشانەی کیلۆمتر.
ساتگین: پیاڵەیەکی گەورەی شەرابە کە لە چاوی یەکێک بخورێتەوە.
ساتگین: ساتگین.
ساتیگین: ساتگین.
سارا: صاف. خالص و بێ غەش. ممتاز.
سارە: سابان.
ساڵ گرێ: بەگرێیەک دەوترێ کە ساڵەوساڵ لێ بدرێ بۆ ڕاگرتنی تەمەنی یەکێک.
سام: ئەستوونە زێڕینە.
سامسوار: سواری زۆر خێرا.
سان: قانون. نظام. دەستوور. قاعدة. شرف. شهرەت. عظمت.
ساو: سا.
سپاسە: بەهەموو شتێک دەوترێ کە سوپاس هەڵبگرێ لە لطف و اینسانیت و چاکە.
سپاسی: سواڵکەر.
سپسار: دەلاڵ. ژنێکە کە ئافرەتان بەشوویدات.
سپیدبالا: فجری کاذب.
سپیدپەهنا: فجری صادق.
سپیدە: شەفق.
سندباد: کتێبی دائر بەفنونی عملیە
سندکەش: ئەستوونەزێڕینە. ڕیگی ڕەوان «سەراب».
سۆگ: تعزیة. ماتەم.
سۆگا: ماتەمی گەورە.
سۆگدار: کەسێکە کە جلی ماتەمی لەبەردابێ.
سۆگنامە: تعزیەنامە.
سۆگیانە: بەرگی ماتەم.
سوول: ئاوبارە.
سوومە: ئەنجام، شرط، نەخشی ناو سککە.
سوێرە: دوژمن.
سەدووس: چویت.
سەرباک: ضابطی شرطە.
سەرپاش: خرەفان لەبەرپیری.
سەرکەلافە: جێبەجێکردنی کارێک.
سەرە: پارە. پارەی بەرەواج.

سەفرەنگ: شەرح. تەفسیر و إیضاح.
سەمێر: إمامەی تەزبیح.
سەنار: میناء = جێ وێستانی پاپۆڕ.
سەندارە: لقیطە.
سەنگار: هاوڕێ. قافڵەی پاپۆڕ.
سێبەندی: عەسکەرێکە کە خەرج و باج کۆ بکاتەوە.
سێپەهر: پاش نیوەڕۆ.
سێتوێ: معدەی حیواناتی کاوێژکەر.
سینار: سەنار.
سیندارە: سەندارە.

## پیتی: ش

شاماخچە: مەمک بەستی ژنان.
شامار: محلی عمومی بۆ اجتماع. ئاتەشکەدە.
شاماز: شامار.
شاماکچە: شاماخچە.
شاوار: ملوکانە. لائقی پاشا.
شەروین: قەڵای شیروان.
شەفا: خلال شرعی. قانوونی.
شەفوو: حەرام. بێ شەرعی ناجائز. بێ قانوونی.
شەفوود: شەفوو.
شەلە: حکمی اعدام بەقصاص.
شەمپوورگر: مجبر. ئامری جابر.
شەمپووری: إجباری. شتی غیرە طبیعی.
شەنبووسە: بۆرۆک.
شیفاد: شەفا.
شیروان: وڵاتی (مێد).

## پیتی: ف

فرسناف: یەکەم شەوی ساڵی تازە.
فرسنافە: فرسناف.
فرۆزە: جنس. نوع. وصف.
فرووهەر: مادە. خلاصە. جەوهەر.
فرهانە: بردنەوەی قومار و هەموو جۆرە یارییەک.
فوراتە: شەرابێکی تازەیە کە لەگەڵ ئاردی ورد و کاکڵە گوێز و ناوکە بادامدا بکوڵێنرێ و ساردبیێتەوە و بکرێ بە ماجووم بۆ خواردن.

فەدا: أصل. قاعدە. قانوون. منهج. نموونە.
فەراتە: شەرابێکە بە کوڵاندن خەست کرابێتەوە و لەگەڵ ئاردی بێژراو و ناوکە بادام، یا گوێز و هەنگوین و شەکر کرابێ بەمعجون.
فەربوود: جدی. کەسێکە کە بیروباوەڕی دامەزرابێ.
فەربوودی: جدیت. عقیدەیەکە کە لەوانە نەبێ بگۆڕدرێ.
فەرتاب: وحی. الهام.
فەرتاش: وجود. موجودیت.
فەرتوور: إنعکاس. عکسی صوت وضیا.
فەرجاد: ممتاز. عال. عالمی متبحر.
فەرجوود: معجزة. إعجاز.
فەرخاد: موفق. منتصر. غالب.
فەرخاش: محاربە. مصادمە. نزاع.
فەرخاگ: مێخلەمەی گۆشت و هێلکە.
فەرخەشتە: پاقلاوە.
فەرخەشە: کولیچەی بادام.
فەرخووی: أخلاق. طبیعت. غریزە.
فەردا: سبەینێ.
فەردەجان: مانگی تشرینی یەکەم.
فەرز: زانا. گەورە.
فەرزام: لائق. قابل. موافق.
فەرزان: فەن. زانین. زانا. قوت.
فەرزانە: عالم. ذکی.
فەرزانەگان: عولەما. متفنین. مشاوران. سەرکەوتووان.
فەرزانەگی: گەورەیی. عالمی.
فەرزوو: ذکاء. عاقڵی. تێگەیشتوویی.
فەرگاه: حضور. حضوری پادشا.
فەرگوفت: فەرمان. إرادە. ئەمر.
فەرگۆیا: شیفاهی.
فەرگەوهەر: عطر.
فەرنان: نا أصل. دەنی. خسیس.
فەرنوود: مظاهرە إثبات. دلائل. إظهاری مافی الضمیر.
فەرنوودسار: إنسیکلوپیدیا. (دائرة المعارف).
فەرنە: لعنت. لعنت لێکردن. جنێو پێدان.
فەروار: کۆشکی هەواداری دەرگا و پەنجەرە زۆر بۆ دانیشتنی هاوینان.
فەروارە: فەروار.
فەرواز: فەروار.

فەروال: فەروار.
فەرواله: فەروار.
فەروێش: سەهو. غلط. خطأ. زهول. عطالت. بەتاڵی. طلبی ئیش نەکردن.
فەرهەنجە: مەردوومی عاقڵی موئەدەبی زیرەکی تێگەیشتوو.
فەرهەنگ: قاموس. عالمی. عاقڵی. عظمت. ممتازی. نەجابەت. شیرپاکی. تووڵ کێشکردنی مێو.
فەرهەنگدار: رئیسی محکمە. حاکم.
فەرهەنگیان: علما. مشرعین.
فەرهەنگی: استادی قوانین و شەرائع (مدونی قانونی).
فەرید: جەجاڵ.
فەنجە: قسە. قسەکردن. وتار.
فیسا: طاووس.

## پیتی: ک

کارژوول: مفتشی ئەشغال.
کارەئەفژوول: ملاحظی ئەشغال. معاونی ملاحظ.
کارەوژوول: کارەئەفژوول.
کاز: مەقەست.
کازوود: کاز.
کاژە: حەشاری راوکەران.
کاموور: بسیط. واتە عکسی مرکب و مخلوط.
کردەک: عبارة. جملة. کلمة. معما. لەغەز.
کرواس: کردەک.
کلۆ: گەورەی حەرەس. گەورەی لایەک. (جناحێک) لە خەستەخانە. گەورەی شرطة. گەورەی حەسحەس باشی. گەورەی گوزەرێکی بازاڕ کە هەموو تابعی بن. محافظ. حاکم.
کۆتار: قیصری ناو بازاڕ.
کوریر: کارئەفژوول.
کەبار: کەسێکە کە داری سووتەنی بێنێ بۆ فرۆشتن.
کەبد: لەحیم. مادەی لەحیم کردن.
کەبدە: کەبد.
کەران گاھ: دەشتی تایبەتی بۆ سباق. جێگای ئیستعراضی جەیش و قوتابی.
کەرتاخ: مسئلەی گرنگ کە حەل نەکرابێ.
کەرتەلە: کوڕێکە کە هێشتا خەتی نەدابێ.
کەردا: دوێنێ.
کەردەک: عبارة. جملة. کلمەی گرانی عاصی. معما. لەغەز.
کەرزە: منداڵێکە کە نیشانەی نێری و مێی نەبێ.
کەرکوز: ئیشارەتی نیشاندانی ڕێگا.
کەرکەز: کەرکوز.
کەروپین: قسە. إفادە بیان. دلیل.
کەرەدان: سەرەنوێلک.
کەرەوین: کەروپیز.
کەریوون: قەرن. عصر.
کەشاک: رای. فکر. تدبیر. انطباع.
کەشانی: چادری یەک کۆڵەکە.
کەشتاو: رەحمەت. دڵ نەرمی.
کەشخەر: ئاب و هەوا. مناخ إقلیم.
کەشسە: ئەمری تەحری لە حاکمەوە.
کەشمیدە: خط. خطی هندسی. خەطێک کە نووسراوی پێ شطب بکرێ.
کەفشیر: لحیم. قورقوشم. تەنەکە. لحیم کردن.
کەفین: شت. مادە. وجود.
کەلاجوو: پیاڵە. فنجانی شەراب یا قاوە.
کیکوو: دەریاچە. حەوزی گەورە.
کیلوو: گۆم. بحیرە. کەناری نهرێک کە بگونجێ بۆخۆشتن.

## پیتی: گ

گارەندە: عامل. وکیل. بنکدار.
گاز: مەقەست.
گازە: کەپری پچووکی باخەوان کە سەری بەپەڕۆ داپۆشرابێ، کە جار جارە جیهان بەم کەپرە تەشبیە دەکرێ.
گاشەک: باسترمە.
گاگا: ئەو شتانەی وەک میوە و چەرەز کە لە زیافەتدا بۆ میوان دادەنرێ. مەزە. شەوچەرە.
گرداوا: حارس. کشاف.
گرداوەر: مراقبی شرطە. قۆڵچی گوومرگ. حارس. مراقب.
گریب: واحدی قیاسی ئەراضی پێوان.
گۆران نگار: صالۆنی رسوم و تصاویری حیواناتی وەحشی.
گۆرەب: گۆرەوی کورت.
گۆشان: شەربەتی مێوژ.
گۆشانە: قوژبن. پەلاماردان لە کەمینەوە.

گونیه: مسطرەی دارتاش. عمودی معمار. گۆنیای هندسی.
گوشتاسب: خەوبینین. احتلام بوون.
گووران: محلی اجتماعی جیش. قاعەی إجتماع.
گووشتاسب: گوشتاسب.
گەرداس: ظالم. غدار.
گەرداش: گەرداس.
گەردبان: سەرکردە. قائدی عام.
گەردش: إنقلاب. ثورة. حرکەی قلبی سیاسەت.
گەری: مقیاس. واحدی قیاسی بۆ اراضی و قوماش و حبوبات و مالیات و وقت. واحدی قیاسی وقت کە عبارە بێ لە بیست و دوو دقیقە و سی ثانیە.
گەزارەنامە: خەونامە.
گەزەرنامە: گەزارەنامە.
گەسی: عزلکردن.
گیارەنگ: جنراڵ. قائدی سەرکردە.
گیوەر: مۆرخ.

## پیتی: ل

لاچین: خزمەتکار. بەندە.
لاخێز: فیضان.
لەباچە: جبە. رۆبی حاکم کە لەکاتی محاکەمەدا لەبەری دەکات.
لەباد: مشەمای باران.
لەبان: شەریک.

## پیتی: م

ماچووچە: جۆرە شووشەیەکی لووت باریکی دابراوە، ئاو و دەرمانی پێ دەکرێتە ناودەمی منداڵەوە.
ماژ: سپۆرت. ریاضە. یاری.
ماطەک: شەکرێکە کە لە جۆ دروست بکرێ.
مانوو: دەنگەوەرە. شائعە.
مانە: مۆبیلیا. شتومەکی ناوماڵ.
مودام سیبەندی: موظفی دائمی.
مۆژ: تانکی ئاو. حەوض.
مۆژە: مۆژ.
مە: مانگ. قەڵەم.
مەت: شەربەتی مێوژ یا خورما.
مەتارە: دەفرێکی لاپانی دەم پچووکە لە لباد دەگیرێ و ئاوی تێ دەکرێ.
مەخێز: مامزی پێی سوار.
مەرە: تەخمین. ئەندازە. دەرەجە.
مەرێشم: مەشەمای برین.
مەشخ: سەرمەشق. نموونەی تدریب و تەعلیم.
مەها: بلوور.
مەهاباد: ناوی پێغەمبەرێکی زۆر کۆنی گەورەیە کە بۆ ئێران هاتووە و خاوەنی ئەو کتێبەیە کە پێی دەڵێن «دەساتیر».
میجری: قاپی داوودەرمان تێدا هەڵگرتن.
میها: گەورە.

## پیتی: ن

ناج: داری سەوز.
ناجوو: سنەوبەر.
ناخە: سواڵکەر.
نارەنگ: پرتەقاڵ.
نارەنگە: نارەنگ.
نارەنگی: لالەنگی.
ناژ: سەرو. سنەوبەر.
ناژوو: ناجوو.
ناسپاڵ: تۆێکڵە هەنار کە بۆ دەباغ بەکاردێنرێ.
ناسەرە: سکەی قەڵب.
ناشخود: دەست لێ نەدراو. کەسێکە کە فەرتەنەی دەریا کاری لێ ناکات. حکم.
ناشک: قەرزدار.
نالە: چم. چەمی پچووک.
نامویە: ژنی مێرداری بەناموسی ڕاست لەگەڵ مێردەکەیدا.
نانوو: بێشکە، لای لایە. گورگانە شەوێ.
ناوچە: قایخ. بەلەم. مۆتۆری نەهری.
ناوژە: ناوچە.
ناوە: ناوژە.
ناوەر: ممکن. قابل.
ناوەران: ناوەر.
نکال: خەڵووزی مەعدەن.
نگال: نکال.
نوورەند: تەرجەمە.
نوولە: قسە. تەنها وشەیەک.
نەبەس: کچەزا، چ کوڕ چ کچ.

نەبەشە: نەبەس.
نەبیر: کوڕی کوڕ.
نەبیرە: نەبیر.
نەبیسە: کوڕەزا، چ کچ چ کوڕ.
نەپراش: خاصیتی إقتداری حلی مشکلات بەئاسانی.
نەخشە: دلیل. قرنیە. ظواهر.
نەسبووت: ئەهلی خوبرە. خەبیر.
نەسوودی: زراع.
نەسیمەن: خواپەرستی. نوێژ.
نەشپیل: تۆڕی ڕاو. قولاپی ڕاوەماسی. قولاپی هەڵواسین.
نەشـخـار: ئەو ئەندازەیەی کـە گـیـانداری کـاوێژکـەر هەڵی دەهێنێتەوە بۆ کاوێژکردنی.
نەشخوور: کاوێژ.
نەفج: کاغزی نووسین.
نەماک: عادەت. ئەخلاق.
نەمشتە: عقیدە. باوەڕ.
نەوتاش: دائمی. ئەبەدی. هەتاسەر.
نیشپیل: نەشپیل.
نیشین: قطبی شمالی. بەرگی سەرین.
نیناو: سەبر. تحمل.
نیوار: ئاسمان. قوبەی ئاسمان.
نیوتوور: فخر. خۆ هەڵکێشان.
نیوەر: وجود. موجودات. کائنات.
نیـوەری نیـوار: مـوجـوداتی ئاسـمـانی وەکـو ئەسـتـێـرە و ئەو ئەستێرانەی کە دەکشێن و بەفر و باران و پەلکەزێڕینە و گەلێ شتی تر.

## پیتی: هـ

هاروون: ئەسپی سەرکێش. سەرکردە. گەورە. ناقلی أخبـار و بەرید. ساعی. بێکەسی و پەشۆکاوی.
هاری: گەسکدەری. کەسێکە کە هەموو فرمانێکی پیس و پۆخڵ إختیار بکات.
هامال: هاوفکر و هاورأی. هاوحزب.
هاوەرد: ڕەقیب. منافس.
هاوین: نوێژی بەیانی.
هوودل: ڕەصد.
هوودلبەند: ئالتی رصد.

هەجاوەر: کۆبوونەوەی خەڵق.
هەرپاسپ: ئەستێرەی گەڕۆک.
هەرپاسبان: سبعەی سیارە.
هەرماس: شیطان. ڕەهبەری بەد.
هەروانە: خەستەخانە. ئێش و ئازار.
هەرهەفت: حـەوت شتن کـە ژن خۆی پێ جـوان دەکات بەتەرتیب: (١) گیـایەکی جوانی هەمیشـە سەوزە، بەچەپک دەیدەن لە سـەریان (٢) گـیـایەکی شـینکارە (٣) سـووراو (٤) سپیاو (٥) کل (٦) زێڕ (٧) میسک.
هەرهەفت کەردە: ژنێکە کە بەهەر هەفت خۆی ئارایش دابێ.
هەری: زەوی دێم.
هەفت گەنجینە: بەحەوت جۆری تایبەتی دەڵێن لە کان: (١) زێڕ (٢) زیو (٣) تەنەکـە (٤) قـوڕقـوشم (٥) ئاسن (٦) مس (٧) زەرد.
هەلاج: لۆکە.
هەلیاک: شیرێکە کە بەکوڵاندن وشک کرابێتەوە.
هەماس: دۆست. شریک. هاوڕێ.
هەماک: هاوڕێی کار.
هەمال: هاوکار.
هەمسیراز: تەرجەمە.
هەنام: هیکل. تمثال.
هەنجار: شاووڵی بنا. ڕێگا. مادده. قانوون. اصول. عادە.
هەنجام: بێ ئیشوکار. سەرسەری.
هەنگ: تێگەیشتن. عقـل. مجد. سلطە. عظمت. مطلب. علو. معـهدی علمی. شەپۆل. ئەشکەوتی گەورە. وەزن و مقداری هەر شـتێ. عـاطفـە قـوت. اقـتـدار. حراست. شـدید. ذکی. فـامـیلیـا و عـشـیـرەت. جیش. عـسکر. زللە لێدان. ئازار. برین. سەرما و باداری. وشکی و بێ ئاوی.
هەنگامە: اجتـمـاع. کۆبوونەوەی تجـار. مرکزی اجتـمـاع. غرفـەی تجارە.
هەنگامەسێبەندی: موظفی وەقتی.
هەنگە: مەلهی. تیاترۆ.
هەواری: دیوان. ژووری ئیستقبال. چادری گەورە.
هەتیال: وڵاتی بەقوەت کە هیچ خەرج و باجی لەسەر نەبێ.
هیرسا: یەکێکە لە عومری خۆی توخنی ژن نەکەتبێ.
هینگ: سعادة. ڕۆژی شادی. ئازار لە ڕیخۆڵەدا.

## پیتی: و

وابا: عقل. فهم.
وات: پیت. وشه. کەوڵ و پۆست.
وادە: ڕەگ. بناغە. أساس.
وازیرە: وەقت.
واژ: کلمە.
واشینگ: رئیس الحراسین.
وانساز: قبلەنما.
وانسازە: وانساز.
وەبەردەک: مەتەڵ. معما.
وەجەر: حکمی حاکم. قراری محکمە.
وەجەرگەر: رئیس. رئیسی عدلیە. مترجمی قوانین. مفتی.
وەچەر: حکمی حاکم. ئەمری پێغەمبەر.
وەچەرگەر:حاکم. پێغەمبەر.
وەردەک: جیازی بووک.
وەرشاد: معاشی تقاعدی.
وەرشنان: أمتی پێغەمبەرێک.
وەرشەک: جانتایەکە کە داوودەرمانی تێدا هەڵبگیرێ.
وەرغ: سەددەی ئاو.
وەرگاز: میوەیەکە لە ساڵێکدا دوو جار ببێ.
وەرنامە: سەرلەوحە. عنوانی کاغەز.
وەروار: تەختی ملوکی. باڵقۆنی محتشم.
وەرەشتاد: متقاعد.
وەرەفان: واسطە. وسیط. شفیع.
وەرەنداز: مخطط. لوێلچی جل و پەراوەکردنی.
وەرەنگ: چنینەوەی جلی دڕاو.
وەستی: ترجەمە. إیضاحیە.
وەسکەردە: ساعی. سریع. اختصاصی قوی.
وەسنی: هەوێ.
وەشک دانە: تۆوی داری هەڤرس.
وەشمەک: نەعلی چەرم.
وەشنی: سووراوی ژنان.
وەشەنگ: جیکەنە.
وەشیان: تعویض. مکافات.
وەفتووک: پێستی پڵنگ کە بەسەر تەختی ملوکیداردا خرابێ.
وەلواکیێ: ڕیخۆڵەباریکەی مەڕ و بزن کە بەبرنج و گۆشت و بەهارات پڕ کرابێ و کوڵێنرابێ بۆ خواردن.
وەنانە: سەموونی خڕی گەورە.
وەوا: نیشانەی خێر و بەرەکەت.

## پیتی: ی

یادە: بەرتیل دان بەحاکم بۆبێ قانوونی. هێزی حافظە.
یاسە: قانوون. نظام. ئەمر.
یالوو: کەناری دەریا. کەناری چەم و ڕووبار.
یۆسە: دارتاش. مشار.
یەفتەر: ئاوێکی ڕوونی پاک کە ڕەنگ و تام و بۆنی نەگۆڕابێ.
یەلکەن: منجنیق.
یەمسوو: باروت.
یەندوو: ضیاء. حەزمەی شعاعیەی ڕۆژ. ڕووناکی ڕۆژ.

# پێڕست


ئـ ..... 1
ب ..... 21
پ ..... 61
ت ..... 91
ج ..... 119
چ ..... 129
ح ..... 149
خ ..... 155
د ..... 175
ر ..... 213
ز ..... 233
ژ ..... 247
س ..... 251
ش ..... 285
ع ..... 307
غ ..... 311
ف ..... 313
ڤ ..... 321
ق ..... 325
ک ..... 351
گ ..... 391
ل ..... 421
م ..... 441
ن ..... 465
و ..... 487
ه ..... 499
ی ..... 529